کتێب: «حاجی قادری کۆیی»
نووسەر: ئەندامی کارای کۆڕ: مەسعوود محەمەد
لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد

❖ بەرگی یەکەم : کۆری زانیاری کورد بەغداد- 1973، چاپخانەی کۆری زانیاری کورد. لە کتێبخانەی نیشتمانیدا ژمارەی 545 ی ساڵی 1973 ی دراوەتێ.

من مطبوعات المجمع العلمي الكردي، الحاج قادر الكويي، الجزء الأول،
مسعود محمد. بغداد 1973

وەشانی لە ئینتەرنێتدا: سایتی www.mamosta.net مارتی 2005

❖ بەرگی دووەم: چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد - بەغدا – 1974، لە کتێبخانەی نیشتمانیدا: ژمارەی 979ی ساڵی 1974ی دراوەتێ، نرخ 700 فلسە

من مطبوعات المجمع العلمي الكردي، الحاج قادر الكويي - الجزء الثاني،
العضو العامل: مسعود محمد. مطبعة المجمع العلمي الكردي - بغداد - 1974

وەشانی لە ئینتەرنێتدا: سایتی www.mamosta.net هاوینی 2006

❖ بەرگی سێیەم: چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد بەغدا - بەغدا 1976

من مطبوعات المجمع العلمي الكردي، الحاج قادر الكويي - الجزء الثالث،
مسعود محمد. بغداد 1976

وەشانی لە ئینتەرنێتدا: سایتی www.mamosta.net ساڵی 2006

## ڕوون کردنەوەیێک

1) لە سەرەتای دەستپێ کردن بە نووسین لە بارەی حاجی قادر ئامانجی کتێبدانان لە فکراندا نەبوو، نیازم بوو گوتارێک بنووسم و لە گۆڤاری کۆڕی زانیارییدا بڵاو بکرێتەوە. خۆ ئامادە کردنم لە گوێرەی نەفسی کورتی گوتار بوو. عەیبی بێ کەرەستەیی کە لە دانانی کتێب پەیدا دەبێ، لە نووسینەوەی گوتار بەدەر ناکەوێ. بە هۆی ئەوەوە درێژبوونەوەی نووسینی گوتارەکە پەراوێزی پێ فرەوان کرد بۆ بارستی کتێب، تەرازووی ئەرک و دەسەڵات خوار بۆوە. لە چەندین جێگە بێ سەرچاوەی نووسراو و کەم ماوەی تۆژینەوە و ئیمکان نەبوونی بەدوادا گەڕان تەنگی بە خامە هەڵچنیوە و پەکی خستووە. ڕوون کردنەوەی گەلێک باسی نەزانراو و بێ سەر و شوێن بوو بە فەرمانی دوارۆژ، جا یا من دەرفەتم پەیدا ببێ و بیکەم یا دڵسۆزێکی دیکە لە من بەختیارتر بە بەر خۆی هەڵبڕێ و قەرزی منی پێ بداتەوە.

2) تا توانیبێتم نووسینەکەم، بۆ مەبەستی ئاسانی و ئاشکرایی، بە وشەی عادەتی و ئاشنا لەبەر گوێی کوردەواری نووسیوە. بەکارهێنانی ڕستەی کوردیی پەتی لە دوا ئەو مەبەستە هاتووە. پەروام نەبوە لە ڕوون کردنەوەی واتا بە وشەی بێگانە.

3) وا بووە یەک وشە وەیا چەند وشەی لەیەکدی نزیک بە دوو جۆر ڕێنووس (إملاء) نووسراون. تا ڕادەیێک ویستوومە یەک ڕێنووس بەکار بێنم. بەڵام بەهۆی ئەوەوە تا ئێستا بڕیار لە سەر ڕێنووسێکی دیاریکراو نەدراوە، بەکارهێنانی دوو ڕێنووسم بە هەڵە نەزانیوە.

4) خوێنەر بۆخۆی سەرنج دەگرێ لەوە کە زوربەی بیروڕاکانم لە سەرچاوەی دەروونی خۆم و وتووێژی ناوەکی (حوار داخلی)یەوە هاتوون. هۆی ئەم

زاهیرەیە، ئەوەی ڕاستی بێ، تازەیی و بێ سابیقەیی ڕوانگەی لێوەتۆژینە بۆ سەر چەشمەنداز. گۆشەنیگای (زاوية نظر) یێک کە من پەسەندم کردوە بۆ تێرامان لە زۆر باسەکانی ئەم نووسینە، ڕەنگە لەگەڵ سەرپاکی گۆشەنیگای نووسەرانی دیکە جودا بێ. هەربۆیەیە بە دەگمەن نەبێ ناوی سەرچاوەیێکی نووسراوم نەبردووە. زوربە و زۆرینەی نووسراوی لێرە بە پێشەوە لەوانەن کە من لە باوەڕدا لەگەڵیان ڕێک ناکەوم. هێندەی کە نووسینەکەم بیگرێتەوە، حەز بەوە ناکەم دڵی نووسەران بڕەنجێنم و شەڕی لاوەکی (جانبی) بێلزووم بەرپا بکەم لە ڕێی بەهەڵەخستنەوەی سەرەنجی نووسینیان. نەگونجانێک کە هەیە لە بەینی بیروڕای من و ئەواندا بە بەراورد کردن و بەیەکدی گرتنی ڕای من و ئەوان ڕۆشن بێتەوە چاکترە لەوە پەنجە دابنێم لەسەر ناوی نووسەر و کتبەکەی یا نووسراوەکەی.

5) دوشمنی هیچ باوەڕێک یا بەشی باوەڕێک نیم کە لەگەڵ قەناعەتی خۆم ڕێک نەکەوێ. دەمەوێ بڵێم بڕیاری پێشەکیم نەداوە بە هەڵەبوونی هیچ فەلسەفەیێک، پێشەکیش ئالای تەسلیمبوونم هەڵنەکردوە.

6) لە موناقەشەی مەوزووعیی سەر بە باوەڕی ئاینی و فەلسەفی نەم ویستوە هەستی کەس بریندار بکەم. هەندێ جار پێویستی لەسەرخۆ کردنەوە و ئسپاتی قەناعەتی خۆم لێی داوا کردووم زیاتر لە عادەتی خۆم سەراحەت بەکار بێنم. لەو حاڵانەدا بەوە دڵی خۆم داوەتەوە کە بیروباوەڕ لە سەر کەس تاپۆ نەکراوە، بۆ هەموو ئادەمزاد میللیکراوە (موءمم). شتێکیش نەماوەتەوە باوەڕی ئاینی و فەلسەفی لێی نەدوا بێ، دەوجا یا دەبێ ڕخنە نەگری و بە تەواوی خامۆش بی، یا ئەگەر بەدەنگ هاتی و قەناعەتی تایبەتی خۆت هەبوو، بە ناچاری ناوناوە یاخود زۆر جاران پێک کەوتنەوەت دەبێ لەگەڵ باوەڕی حازر و بزر بێ.

7) هەر جارەو مەعلووماتێکی تازەم وەرگرتبێ خستوومەتە گەڵ ئەو مەوزووعەی کە پێوەندی پێوە هەیە، واتا نووسینەکەی کۆنم نەسڕیوەتەوە

بەهۆی هاتنی زانیاری[1] تازەوە. حەزم بەوە کردوە ڕشتەی بیر کردنەوەم بەر لەو مەعلووماتە نوێیە نەشێرمەوە.

8) وەک لە ناوەڕۆکی نووسینەکەمدا بە پێی داخوازیی جێگە گوتوومە، لە پێشەوە و بەر لە هەموو شتێکیش دەڵێم، ڕاستی شەرەفی گوتار و نووسین وکردارە. لەبەر مەشخەڵی ئەم دروشمە ڕێم داوە بە خۆم چی بە ڕاست بزانم ئەوە بنووسم.

[1]- زانیار: وشەیێکە وەک پرسیار، بڕیار، دزیار دەشێ پێیان بگوترێ «اسم الصدر» کە واتاکەی «تجرید»ی تێدایە، بێ ڕوودان. لە وشەی «دزین» دا ڕوودان هەیە، بەڵام لە «زانیار» دا ئەو واتایە هەیە کە لە «المعرفة» دا هەستی پێ دەکرێ.

**پێشەکی**

لەو باوەڕەدام تا ئێستا دیراسەیەکی ئەوتۆ لە بارەی فەلسەفە و خەبات و ژیانی حاجی قادر بڵاو نەکراوەتەوە لە قووڵی و فرەوانیدا بگا بە ڕادەی گرینگی و پێویستی مەوزووع. تا ئەوەی لە سنووری ئاسۆی ڕۆشنبیری ئێستاکەی کوردەواریش دێتە بەرچاوم هیچ عەلامەتێکی لێوە دیار نییە موژدەی دیراسەیێکی لایق بە حاجی ڕاگەیەنێ. گوتەی کوردی ئەگەر ڕاست کا کە دەڵێ «مانگەشەو سەر لە ئێوارە دیارە»، ئەو ئەرکەی ناساندنی حاجی قادر بە تایبەتی بە کورد و تێکڕای جیهان خەریکە لە ئەستۆی جیلی ئێمە دەترازێ و دەکەوێتە سەر شانی جیلی ئاینده. ئەوساش بە پێی دوورکەوتنەوەی ڕۆژگاری حاجی لە نیگای بینەران، کارەکە وەزەحمەتتر دەکەوێ... چەندین پەردەی حەقیقەتپۆشی تازە لە دەوری شوێنەواری حاجی دەئاڵێ و تاریکایی لێ دەتەنێ. سەرەڕای ئەو زەحمەت کەوتنە مەترسیێکی گەورەی بزربوونی حەقیقەت لەوەش پەیدا دەبێ کە داهاتنی فەلسەفەی جیاجیا مەیل و ئارەزۆی هەمەچەشنە دادێنێ بۆ پێوان و هەڵسەنگاندنی هەموو بابەتێکی عەلاقەدار لەگەڵ سیاسەت بە کێش و تەرازوییێک کە خزمەتی ئامانجە سیاسیەکانی خاوەن تەرازوەکە بکا. ئەو هێندە دەستکاری و گۆڕینی ئانقەست کە بە چاوی خۆمان دیومانە تائێستا بۆ خزمەتی مەبەسی سیاسی لە گێرانەوەی ڕووداوی کۆن و نوێدا کراوە ئومێد زۆر زەعیف دەکا بەوە کە لە دوارۆژدا ڕاستی و حەقیقەت لە چنگ داخوازیی سیاسەت بە سەلامەتی دەردەچێ.

بێگومان هاندەرێکی یەکجار بەهێز، کە پاڵی پێوە ناوم جورئەت بدەم بەر خۆم تا شەرمم لە حاجی بشکێنم و گوزارشتی ژیانی بگێڕمەوە، ترسی لەناوچوونی یەکجارەکی ئەو ڕاستییانە بوو کە من لەبارەی حاجیەوە دەیزانم و دەبینم لەگەڵ ڕەوتی زەمانە یەک یەک دەکوژێنەوە و چرای تازەی دروستکراو لە شوێنیان هەڵدەکرێ. لە ماوەی 75 ساڵ کە بەسەر مەرگی حاجیدا تێپەڕیوە، زوربەی گوزارشتی ژیانی لەناوچوە. بە گوێرەی ڕاگەیاندنی نووسینی بێ شوبهە زوربەی بەرهەمە نووسراوەکانیشی فەوتاوە. کەم تا کورتێک لە ئەحواڵی حاجی و هێمای شیعرەکانی کەوا لای چەند کەسێک ماوە تا ئێستا تۆمار نەکراون. جا ئەگەر ئەو کەمینەی ئەحواڵ و هێمایەش نەنووسرێن و لەناو بچن نووسەرێکی دوارۆژ بیشیەوێ لە عاست حاجیدا حەقپەرستی بکا و ڕاستی دەرخا چی ئەوتۆی دەست

ناکەوێ لە سەرچاوەی بێفێڵ بیکا بە چەکی هەڵمەت بردن بۆ سەر دەسکاری وەیا دیفاع کردن لە حەقیقەت.

من لە لای خۆمەوە، بە پێی توانین، چی بۆم ساغ دەبێتەوە دەربارەی حاجی و ژیان و شەخسییەت و ئەدەبی لەگەڵ بەڵگەی ماددی و زیهنی کە لە دەستمدا بێ بە تۆمارخانەی مێژووی ڕادەگەیەنم. هەرچەند پانتاییەکی فرەوان لە هەموو ڕوییێکی ئەو باسانە بە بەتاڵی و بێ ڕەنگی دەمێنێتەوە لەبەر نەبوونی سەرچاوەی مەعلوومات و تەسکیی دەرفەت، دیسانەوە ئەو هێندەی کە بۆم ڕووپێو (مساحة) دەکرێ ڕاستی ئەوتۆی تێدا دەبێ یارمەتی تۆژەرەوەی دوارۆژ بدا بۆ ڕووپێو کردنی مەیدانێکی فرەوانتر لە باسی حاجی.

دەڵێن بۆ تابلۆی نیگارکێش مانەوەی هەر جێگایەکی تابلۆکە بە بەتاڵی دەبێتە عەیبی هونەرکار و بەرهەمەکەی. بەداخەوە تابلۆی ژیانی حاجی قادر میقدارێکی ئەوەندە زۆری لە تاریکیدایە ئەگەر نیگارکێش ڕەنگی درۆزنی لێ نەدا بە ناچاری بێڕەنگ دەمێنێتەوە. بەلای بیروڕای منەوە بەشێکی کەمی تابلۆکە بە ڕەنگی ڕاستگۆ ڕەنگ بکرێ چاکترە، سەد جارانیش چاکترە، لەوەی بۆ مەبەسی خۆهەڵکێشان وەیان ڕواڵەتی بێ عەیبی، ڕەنگی درۆزن بەکار بهێنرێ، با لە ئەو بەکارهێنانەشدا تابلۆیەکی تێر ڕەنگ پێک بێ.

پێوستە لێرەدا ئەوەش بڵێم: نووسینی درۆزن گەلێک سەر شێوێنترە لە تابلۆی درۆزن، چونکە نووسین ڕاستەوخۆ دەبێتە سەرچاوەی لێکۆڵینەوە و تۆژینەوە و بڕیاری مێژوویی. ئەو هێندە خەڵقەی کە نووسین دەخوێننەوە دەیێکی ئەوان عاشقە تابلۆ پەیدا نابێ. لە فەرزی ئەو ژمارەیە پەیداش ببێ حیسابێکی کە بۆ واتا و ڕاگەیاندنی شتی نووسراو دەکرێ بۆ وێنە وەیا پەیکەر وەیا هیچ بەرهەمێکی دیکەی هونەری ناکرێ. وا دەبێ شتی نووسراو ببێتە کولانەی سەیر کردن نەک بۆ دیمەنێکی تەسک و مەحدود، بەڵکوو بۆ زەمینێک تۆوی باوەڕ و فەلسەفەی تێدا بڕوێ. دەمەوێ بڵێم هەندێ نووسین هەڵەی ئەوتۆیان تێ دەکەوێ کە خەڵق فریو دەدا بۆ باوەڕی چەوت یا بۆ ئینکار کردنی شتی ڕاست. دەگێڕنەوە جارێکیان شێخ ڕەزای تاڵەبانی لە زۆرانبازیدا ژێر کەوتووە بەڵکوو ڕیسواش بوە. لە وەرامی گلەیی وگازندەدا شێخ ڕەزا دەڵێ: تازە من ئەمەم کرد بە «تأريخ» بۆ خۆت هەرچی دەڵێی بیڵێ...

بەشێکی زۆر لە شتی نووسراو، وەک بەیتەکانی شێخ ڕەزا، دەبێتە «تأریخ» یاخود بیروباوەڕ. بەڵام مەرج نیە هەموو جاران ئەو نووسینانە بە دڵخوازی ناڕاستی بێ وەیا بۆ مەبەسی شاردنەوەی حەقیقەت بێ. هەندێ لە نووسەران دووچاری هەڵە دێن لە بەر هەڵەی سەرچاوەیێک کە مەعلووماتیان لێ وەرگرتووە یاخود بەهۆی سەهووی ناچاری وەیا بێ سەروشوونی مەوزووع وەیا لەبەر گەلێک هۆی جۆر جۆری دیکە کە نیگای نووسەر لێڵ دەکەن و خامەی دەخلیسکێنن. خۆ پاراستن لە سەهوو و هەڵە هەرچەندە لێشیان کەم کاتەوە بەجارێ پاکیان ناکاتەوە.

هەڵەی نووسەر کە لە نەزانین وەیا بە سەهوو چوونەوە بێ نابێتە جێی گلەیی بە مەرجێک کە هەستی پێ کرد لێی بکشێتەوە. پێ داگرتن لە سەر هەڵەی دوای ڕوونبوونەوەی، لە خوێندەوار ناوەشێتەوە چ جایێ ئەوەی بڵێین ڕەوا نیە. نووسەر هەیە لە ڕووی لایەنگیریی فەلسەفەییکەوە وەیا لەبەر نەویستنی یەکێکی دیکەوە چاو لە ڕاستی دەپۆشێ یاخود تەرجیحی شتی زەعیف دەدا بەسەر هی بەهێزدا. ئەم خوەی ڕاستپۆشی[2]، کە لە جێی پێویست بەگوێرەی باوەڕی خۆم لێی دەدوێنم، لای هەندێ کەس لە هەموو سنوورێکی عادەتی ویستن و نەویستن تێدەپەڕێ و دەرگا بە ڕادەی ڕووخاندن. خەتەری ڕاستپۆشی گەلێک زیاترە لەوە کە ڕاستیمان لەکیس دەدا، بەولای دۆڕاندنی ڕاستیەوە گوناهێکی گەورەتر دەکا. چونکە خوێنەری عادەتی توانای زیهنی و فکری ئەوتۆی نیە نووسراو وەیا گوتە بە تەرازووی زانست و مەنتیق هەڵسەنگێنی بۆیە مومکنە هەڵەی نووسراو لە مێشکیدا جێگیر بێ و لێی ببێ بە باوەڕ. جا ئەگەر کەسێک لە نووسیندا هەڵە دەدۆزێتەوە بۆی بلوێ بە نووسین ڕاستی کاتەوە بەوەدا خزمەتێکی گەورە دەکا بۆ ئێستا و دواڕۆژی میللەتەکەی، بەڵکوو هەموو ئادەمزاد بە سڕینەوەی هەر هەڵەیەک لە مێشکی خەڵق پەڵەهەورێکی ڕەشی جەهالەت دەڕەوێتەوە و چرایێکی حەقناسی هەڵدەکرێ.

نووسەری دڵسۆز تا بەسەر بابەتی نووسینەکەیدا زاڵ نەبێ دەستی بۆ درێژ ناکا. کە هەر چاری نەما، وەک من مەجبوور بوو بە نووسینی ناتەواو دەبێ فێڵ لە خەڵق نەکا بەوەدا ناتەواوییەکەی بشارێتەوە وەیا بەرگی خوازرایەوەی لەبەر بکا. پێویستە حەقیقەت چیە بە زۆر و کەمیەوە بخرێتە ڕوو.

---

[2] – ڕاستپۆشین: وەک عەیبپۆشین بە واتای شاردنەوەیە نەک لەبەر کردن.

من بەش بە حاڵی خۆم ماوەیێکی درێژ لەگەڵ گیانی «حاجی»دا ژیاوم و سرنجێکی وردم گرتووە لە کەلەپۆری نەنووسراو و دەماودەم کە لەوەوە بە جیلی ئێمە گەیشتوە. بەهۆی ئەوەیشەوە کە حاجی هاوڕێی باپیرم و سوختەی باوکی باپیرم بووە و وەک یەکێک لە بنەماڵەی «جەلیزادە» لە دوو مزگەوتەکەی ئەو بنەماڵەیەدا، «مزگەوتی گەورەی حاجی بەکر ئاغا» و «مزگەوتی مەلا ئەسعەد» لەگەڵ کەسانی هاوتەمەنی خۆی لەم بنەماڵەیەدا ژیانێکی تێکەڵاوی ڕابواردوە، دەرفەتم پتر بووە لە نووسەرانی دیکەی کورد بۆ شناسی لەگەڵ «حاجی»دا، جا بە پێی ئەم نزیکییەم لە حاجی هەستی نارەحەتی دەکەم لەو هەڵە و چەوت و چوێرییەی وەیا هەرشتێک پەیوەندیی بەوەوە هەبێ.

یەکەم سروشتی بایەخداری نووسین ڕاستییە. بەڵێ بوونی گیانی زانایانە و پەی بردن بە مەنهەجی زانستی تازە لە لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەدا پاڵپشتێکی زۆر بەهێزە بۆ نووسەر، لە هەندێ مەیدانەکانی نووسیندا بێ ئەم پاڵپشتە هەر مومکین نیە بەرهەمی بایەخدار پەیدا بێ. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ڕاستگۆیی لە ژوورووی هەموو بابەتێکەوە دێ کە دەبێتە بنیچەی بەرهەمی پاک و چاک. چی بکەم لە زانا و گیانەکە و شەهادەکەی کە زەکا و زانستی خۆی بۆ چەوتی و لایەنگیری و دوشمنایەتی بەکار بێنێ. خۆ ئەو تەرزە کەسە هەر بە سادەیی و بێ شەهادەیی بمێنێتەوە باشترە. هەر نەبێ لە لایەنگیری و دوشمنایەتییەکەیدا ناتوانێ فەلسەفە بە خەرج بدا و فەندی خلیسکێنەر بەکار بێنێ. زیرەکی و شەهادە و زانین کە خزمەتی ڕاستی نەکەن دەبن بە دەشمنی سوودی گشتی، شبهە نیە لەوەدا کە مرۆڤ بە تێکڕایی و لە ماوەی درێژ هەر لە ڕاستی سوود وەردەگرێ. درۆ و هەڵە هەرگیز خزمەتی زوربە و زۆرینەی مرۆڤ ناکەن.

نامەوێ خوێنەری بەرێز ئەوە بچێتە دڵیەوە کە من دەڵێم هەموو شتێ چەوت و هەڵەی نووسراو دەربارەی حاجی قادر بە ئانقەست هاتوون یاخود نووسەرەکانیان بە فەند و فێڵن. من ئەمەم مەبەس نیە. با لەوەش زیاتر بڵێم: هەندێ لەو نووسەرانەی ناسیاوی خۆمن و لەگەڵ بەعزێکیان کە ماوەی وتووێژ بووە گەیشتووم بە تەفاهووم تا وا بووە ڕاست کردنەوەی لێ سەلماندووم.

نووسەر هەیە تووشی هەڵە بووە لەبەر نەزانینی مەوزووع وەیا ڕووداو. مەعلوومیشە کە نەزانین پەردەی خستە سەر مەوزووع، نووسەر بە ناچاری دەکەوێتە سەر

لێکدانەوە و زەڕب و تەرح بەڵکوو پەردە لە ڕووی ڕاستی هەڵبداتەوە، کە ئەمە نەکا دەبێ واز لە تەقەللا بێنێ.

بەڵام لەم زەڕب و تەرحەدا خلیسکێک دێتە پێش نووسەر ئەگەر لێی بە پارێز نەبێ بە ئاسانی دەخلیسکێ. تۆ بڵێی خلێسکەکە چی بێ.

مرۆڤ بۆ خۆی کە لە باسێکدا باوەڕێکی تایبەتی هەبوو خەریک دەبێ بە شێوەیێکی عەفەویی بەڵگە کۆکاتەوە بۆ سەپاندنی باوەڕەکەی، جا ئەگەر باسەکە پەیوەندی هەبێ لەگەڵ مێژوو و گۆڕانی کۆمەڵایەتی حەز بەوە دەکا ڕووداوی لێرە بە پێشەوە بە جۆریک ڕووی دابێ کە خۆی ئارەزۆیەتی، بۆ ئەوە لە ئێستا و دوارۆژیشدا ئەو شتە ڕوو بدا کە بە چاکی دەزانێ. با میسالێک بێنمەوە لە ئەفسانە و سەرگوزەشتی کۆن کە گێڕانەوەیان کەس تووڕە ناکا. ئەوانەی گوێ دەگرنە داستانی ڕۆستەم و ئەسکەندەر و ئەرسەلان مەیلیان بۆ ئەوە دەچێ گورزی قارەمانەکە قورستر و شیرەکەی بڕندەتر و بازوەکەی بەهێزتر بێ. حیکایەتخوانێک ئەگەر شتێکی کەم کردەوە لە پایەی قارەمانەکە ڕەنگە خەڵقەکەی کە بە ئینتیزاری ئیعجازهێنی ئەو قارەمانە دەمە بەشکەیان گرتوە هەر لێی نەسەلمێنن و جارێکی دیکە نەیەنەوە لای بۆ گوێ گرتن. نووسەریش کە بۆ خۆی حەزی لە جۆرێک فەلسەفە کرد و ویستی جیهان بە گەزێکی تایبەتی بپێوێ، مەگەر پێشەکی بڕیاری دابێ گوێ نەداتە مەیلی خۆی و توانجی هاوبیرانی، دەنا بە ڕادەی خەریکبوونی لە نووسینی ئەسڵی مەوزووع بەڵکوو لەوەش زیاتر خەریک دەبێ مەوزووعەکە بە چەشنێک بنووسێ کەوا خزمەتی گەز و فەلسەفە بکا. ئا ئەمەیە خلیسکی کوشندە لە پێش نووسەر و ئەمەیە پەتی ڕاستیخنکێن کە دەبێتەوە بە بەندی دەست و پێی خەڵق و دەیانکا بە دیلی باوەڕی چەوت. مەلای گەورە لە دێڕە شیعرێکدا دەفەرمووێ:

ئێمە پابەندی وەهم و خەیاڵین
ئێمە خەریکی کەری دەجاڵین

دەجاڵێک خۆی نەبوو تا کەری هەبێ، کەچی هەزاران ساڵە خۆی و کەرەکەی دروست کراون و چوونە مێشکانەوە تا ئێستاش دێنە خەونی خەڵقیەوە، هێندەش ڕێزیان لێ گیراوە وا بووە یەکێک ئینکاری بوونی کردبان بۆتە قوربانی. ئەم مەیدانی

دیکەشدا هەیکەلی بۆ خۆی دروست کردوە و جلوبەرگی پێویستی ئەو جێگایەی لەبەر کردوە و خەریکی لەوەڕانە لەسەر حیسابی ئادەمزاد. دوێنێ ئایین لە برەو بوو، ئەورۆ فەلسەفە و سیاسەت و ئابووری لە باودان. ئیتر لە هەر مەیدانێکی سێ قۆڵیی «فەلسەفە - سیاسەت — ئابووری» سەیر دەکەی جۆرجۆر و پۆلپۆل لە «مەخلووقاتی دەجاڵ»ی دەبینی تێر، تەسەل، حەسایەوە، قەڵەو و بە برەو. «دەجاڵ»ی دوێنێ خۆی لکاندبوو بە فیکرەی قیامەت و بەهەشت و جەهەننەمەوە، هی ئێمرۆ لەگەڵ نیشتیمانپەروەری و پێشرۆیی و سوودی گشتی خۆ پەیوەست دەکا، ئیتر بە ڕادەی تۆقینی سۆفییەک لە ئاگری جەهەننەم نووسەر و خاوەن بیریش لە ترسی تاوانباربوون بە کۆنەپەرستی و دوشمنایەتیی گەل دەمکوت دەبێ لە عاست دەجاڵی نوێ، نە دەوێرێ ڕەخنەیێکی لێ بگرێ وەیا بە جۆرێک هەڵیسەنگێنێ چ جایێ ئەوە بە درۆی خاتەوە.

لەم زەمینەدا شتێکی عەلاقەدار لەگەڵ مەوزووعی حاجی قادر کە پێویستە ڕوونی کەینەوە و چەوتییەکەی دەرخەین ئەو ئارەزوە ئاشکرایە لای بەشێکی زۆر لە ڕۆشنبیرانی تازەی کورد بۆ ئەوە حاجی نیشان بدرێ وەک هەیکەلێکی داتاشراوی ئەوتۆ خزمەتی باوەڕی سیاسی ئێستاکە بکا. چالاکانە هەوڵ دەدرێ بۆ ئەوە حاجی بپچڕێتەوە لە کات و جێگە و ژیانی خۆی و بگوێزرێتەوە بۆ سەردەمی ئێستاکە تا بە پێی زەماوەندێک کە جیلی ئێمرۆ حەزی لێ دەکا، گۆرانی بڵێ و هەڵبەست ڕێک خا. دەبێ حاجی ڕۆڵەی هەژار و ڕەش و ڕووت بووبێ... لە دژی بۆرجوازی و دەرەبەگ بووبێ... سەیری هەموو گەلانی کردبێ... ڕەنگە ڕۆژەک بێ ئیسپاتی ئەوە بکرێ خەریکی ڕێکخستنی نەقابە بووبێ...

سەیرت بەم قسەی دواییەم نەیێ چونکە نووسین هەیە بڵاوکراوەتەوە دەڵێ باوکی خاتوو زین سەبارەت بە جیاوازیی چینایەتی ڕازی نەبوو زین بدا بە کاکە مەم گۆیا کاکە مەم سایقی تراکتۆر بوو لای باوکی زین.

لێرەدا نامەوێ، مەوداشم نیە، بچمە ناو موناقاشەی ئەو باوەڕە کە نووسەرێک هان دەدا بۆ دەسکاری لە ڕووداوی مێژوویی وەیا شاردنەوەی ئەو ڕووداوانەی کە خزمەتی باوەڕەکەی ناکەن. تەنها ئەوەندە دەڵێم هەر باوەڕێک کە پێویستی هەبوو بە گۆڕین و شاردنەوەی ڕاستی، خۆی لە خۆیدا هەستی بێهێزی دەکا و خاوەنەکەی دەیەوێ بە ڕاستپۆشی عەیبی باوەڕەکەی داپۆشێ. بە دەم ڕاستپۆشیشەوە هەنگاو بە

هەنگاو ناچار دەبێ تا خۆی و باوەڕی زمان دەرنەیێن دەکەوێتە شەڕ لەگەڵ سوود و بەرژەوەندی خەڵق چونکە هەر بەرژەوەندیێک درۆیەک سپی دەکاتەوە بەو مانایە کە ئیمکان نیە بەرژەوەندی لە درۆ پەیدا بێ. کەواتە مەرگی بەرژەوەند دەبێتە ژیانی ئەو درۆیە کە ڕاستی پۆشی بۆ دەکرێ. ئەم شریتەی ڕاستپۆشی و بەرژەوەدەکوژییە سەر بەوە دەگەیەنێ نەک هەر بەقسە بەڵکوو بە زەبری کوتەک و یاسا و نیزام گەل دەمکوت دەکرێ و ورتەی لێ دەبڕێ.

ئەم کارەی ڕاستپۆشی لەوە دەچێ لایەنێک بیەوێ ئیسپات کا: یەک و یەک دەکەن چوار «1+1=4» ئیتر سەپاندنی ئەم هەڵەیە بەسەر دەستووری حیسابدا دەبێ هەموو ڕاستیەک بە درۆ بخاتەوە کە هەڵەی مەسەلەکە دەردەخا. نابێ دوو و سێ بکەن پێنج «2+3=5» نەکا بەوە مەعلووم بکرێ دوو و دوو دەکەن چوار «2+2=4» چونکە ئەوسا یەک و یەک ناکەن چوار. هەموو مەسەلەیێکی دیکەی حیسابیش کە عەلاقەدار بێ لەگەڵ «1+1» دەبێ بە درۆ بخرێنەوە، خۆ دیارە ئەو هەموو بە درۆخستنەوەی شتێ ڕاست بە کوتەک نەبێ ناکرێ. ئەو کەسە وەیا ئەو لایەنە کە سوودیش وەردەگرێ لە پرسیارە چەوتەکە «1+1=4» سوودی تازەش وەردەگرێ لە بەدرۆ خستنەوەی هەر ڕاستییەک. بۆیە ڕۆژ لە ڕۆژ چالاکتر دەبێ لەو کارەی بەرژەوەندکوژی و ڕاستیپۆشییەدا.

پێی ناوێ من بڵێم لە خۆوە دیارە سوودی ئەو، ماڵوێرانیی خەڵق و پەرەسەندنی درۆ بەرهەم دێنێ. بۆیە مرۆڤی دڵسۆز دەبێ بڵێ «1+1=2». ئەگەر بۆ ماوەیێکیش لەو ڕاستییە غافڵ بوو وەیا لێی بە سەهوو چوو پێویستە لە سەهوەکەی بگەڕێتەوە، یاخود با بڵێم هەر کاتێک سەهوەکەی خۆی دۆزیەوە نابێ بایی چرکەی سەعاتێک لە سەری بوەستێ. بە مەشدا چ شتێکی زەحمەتم داوا نەکردوە. زوربەی ئەو کەسانەی قسەکەیان بەر دەکەوێ گەنجی ڕۆشنبیرن کە لە زۆر هەڵوەستدا هەند ئازان دەگەن بە پایەی خۆکوژی، ئیتر بۆ دەبێ ترسیان هەبێ لە ڕاست کردنەوەی چەوتی یاخود دوودڵ بن لە دان پێدا هێنان بە هەڵە. خۆ ئەگەر کەسێکی غەیبپەرست لە ترسی ئازاری جەهەننەم نەوێرێ ئینکاری دەجاڵ بکا گەنجێکی «علمانی» لەو مەیدانەی خەباتی تێدا دەکا وەیا خەریکی دۆزینەوەی ڕێی کامەرانییە بە پێی باوەڕی خۆی ترس و هیوای غەیبی نایبزوێنێ تا چاو لە حەقیقەت بپۆشێ.

جەهەننەم و بەهەشتی مرۆڤی «علمانی» لە سەر ئەرزە، بەهەشتی سەر ئەرزیش هەرگیز بە درۆ دروست نابێ. بۆیە من بە ڕادەی پەرۆش و ئەسەفم بۆ هەڵە و سەهوی کوردێکی ڕۆشنبیر ئەوەندەش بە گلەیم لە سووربوون و پێداگرتنی لەسەر هەڵە. هەموو هەوڵ و تەقەللاییێک و جانفیدایییەکی پێشکەشە بە هەڵە بکرێ دەچێتە هیچە و لە کیس گەل دەچێ و دەکەوێتە باغەڵی درۆزنان.

هەندێ جار نووسەرم دیوە لەو پلەی سووربوون لەسەر هەڵەی تێپەڕاندوە تا لە لوتکەی هەرە بەرزی ڕاستپۆشی سەرکەوتوە و بەودیودا شۆڕ بۆتەوە بەرەو زەلکاوی جنێوفرۆشی. وەک پەندێکی برایانە و حەقیقەتێکی بێ پەڵە بە گەنجی کورد دەڵێم جنێودان نیشانەی سووکایەتیی ئەو کەسەیە کە جنێو دەدا چونکە دیارە پەروای نیە لەوە کە لە مقابلەدا جنێوی پێ بدرێتەوە. متنبی ڕاستی گوتوە کە دەڵێ:

من یهن یسهل الهوان علیه
ما لجرح بمیت ایلام

ئەوەی سووک بوو سووکایەتی لێ خۆش دێ. برین لە مردوو ئازار نابەخشێ.

بێگومان مرۆڤی ڕەوشت پاک بەر لەوە ترس مەنعی بکا لە جنێو، سروشتی خاوێنیی خۆی قێزی هەڵدەستێنێ لە جنێودان، ئیتر لەبەر بەرزیی سروشتی زمانی خۆی دەپارێزێ و ڕێزی خەڵق ڕادەگرێ. سرنج بدە جنێوفرۆش دەبینی لەبەر پەستیی نەفسی یەخەگیری کەسی وەها یاخود لایەنی وەها دەبێ کە بێ دەسەڵاتیان دەزانێ و لێییان ناترسێ. کە بزانێ جنێودانەکەی دینارێکی لە کیس دەدا وەیا دوو شەوان دەیخاتە بەندیخانە دەمی خۆی دەدروێ و دەبێتە نموونەی شەرم و شکۆ.

وا دەبێ زارشڕی بۆ مەبەسی سوودی شەخسی بەکار دێ. کابرای زارشڕ دەیەوێ بە جنێوفرۆشی مەیدان بۆ خۆی چۆڵ کا چونکە دەزانێ زۆر کەس خۆ دەپارێزێ لەوەی کە قسەی سووکی پێ بگوترێ. مرۆڤی شەرم بە خۆ بە وشەیێکی بێ حورمەت نیوە مردوو دەبێ، زات ناکا نزیک بێتەوە لە جێگە و ڕێگەیێکی ترسی بێ حورمەتی تێدا بێ. شەخسی جنێودەر ڕاستەوخۆ وەک کەسیکە (بۆ خۆم یەکێکم دیوە لەو تەرزە) تف بکاتە ناو قاپی چێشت تا هاوبەشی نەبێ لە خواردندا. ئەو

شەخسە خۆی لە خواردنیش ناکا ئەگەر یەکێکی دیکە وەک ئەو چێشتەکەی پیس کرد.

بەنیسبەت گەلی کوردەوە ئەو ڕەوشتەی ڕاستپۆشی وەیا مەیدان لە خەڵق تەنگ کردنەوە و دەرپەڕاندنیان لە کۆڕی زانست و ڕۆشنبیری زیانێکی زلتری هەیە لە چاو گەلێکی دیکەی چەسپاوی خاوەن کیان و سامان، چونکە وەک «بدیهیە» وایە بە ڕادەی هەژاری پێویست هەیە بە ماڵ... بە ڕادەی نەزانین پێویست هەیە بە زانست ... بە ڕادەی نەخۆشی پێویست هەیە بە دەرمان. ئیمە لە سەرەتای هەموو کارێکداین. دوو هەزار ساڵە دەتلێینەوە... تروسکەی خۆشیمان نەدیوە... تازەبەتازە مەودایێک پەیدا بووە بۆ سوودی کوردەواری تێیدا هەڵسوڕێین، بۆیە لە گەلانی دیکە محتاجترین بۆ ئازادی لە گوفتار و نووسین و کردار و تۆژینەوە بێ ئەوەی یەکدی بترسێنین وەیا مەیدان لەیەکدی تەنگ کەینەوە. هەمووومان یەک دڵ و یەک دەست و یەک ئامانج بایی هەڵگرتنی ئەو ئەرکە ناکەین وا بەسەر شانی کوردەوەیە، دەوجا دەبێ حاڵمان چی بێ کە خەریکی دوشمنایەتی بین لەگەڵ یەکتر و بەوەدا دەرگەی کرایەوە لە ڕووی خۆمان داخەینەوە. ئەوەندە لە کاروانی گەلانی پێشکەوتوو دواکەوتووین ئەگەر لە شەقامی بێ کۆسپ و هەموارەوە بە ڕا کردن ماوە ببڕین دیسانەوە تا کاتێکی گەلێک دوورودرێژ ماوەیێکی ئەوتۆ نابڕین لەچاو ئاسمانگەردیدا خۆ بنوێنێ. کۆسپی سەر ڕێبازمان یەکدی ترساندن بێ، وەیا ڕاستی شاردنەوە بێ، وەیا هەڵە سەپاندن بێ، تێکڕایان هەنگاوی بەرە و پێشەوەمان کورت دەکەنەوە، یاخود دەی وەخرێنن، یاخود دەیوەستێنن.

ئەوەی پێشتر گوتم لە نیشاندانی حاجی وەک هەیکەلی داتاشراو، دوو خراپەی تێدا دەدیترێ: شاردنەوەی ڕاستی و تەرجیحی مەبەسی تەسکی تایبەتی بەسەر بەرژەوەندی گشتی. پچڕینەوەی حاجی لە واقیعی خۆی و بڕینی ڕەگی پەیوەندی لەگەڵ ئەو واقیعەدا زۆرینەی ڕاستی لە ژیان و شەخسییەتی حاجی دەسرێتەوە، وەک بلێی لە بەتاڵاییدا دەخولێتەوە. بەم پچڕینەوە و بڕینەوەیە حاجی ئەو مرۆڤە نامێنێ کە هەبووە و بەشێکی یەکجار بە نرخ لە ئەدەبەکەی سەراو دەبێ وەک بڵق و کەفەلوولکەی لێ دێ کە بێ عەلاقەیە لەگەڵ قووڵایی دەروون و ناخی کۆمەڵ. چەند حەیفە دەسکاری جەوهەر بکا بە کەف.

حاجی لە شیعرەکانیدا دەروونی خۆی کردۆتەوە و هەست و بیری دەربڕیوە. تا فکری تێی بڕ کردبێ بە دڵێکی پاک و قەناعەتێکی تەواوەوە ویستووەتی خزمەتی کوردەواری بکا. هەڵبەستەکانی لەم ڕەوە سادە و ڕەوانن، پەردە و گرێ واتاکانی نەشاردۆتەوە تاکوو تەئویلی دوور لە مەبەس هەڵگرن. مرۆڤێکی دڵسۆزی تێگەیشتووی ئەوسای کورد دەبوا ئەو شتانەی کە حاجی گوتونی یا شتی لەوە نزیکی گوتبا.

ئەگەر فێڵ لە خۆمان نەکەین تا ئێستا زوربەی بیرەکانی حاجی هەر لە کاردان و بە قەدەر ڕۆژگاری حاجی ئێستاش هەرەشە لە حازر و دواڕۆژی کورد دەکەن. لە باری ژیانی ئابووری و گۆڕانی ماددیشەوە کەمێکی کەم نەبێ لە سەرانسەری کوردستاندا ئەو گۆڕانە ڕووی نەداوە ببێتە بنکە بۆ گۆڕانێکی قووڵ لە بیر و ئامانج. جگە لەوە و سەرەڕای ئەوە کە کورد خۆی خاوەنی بێشریکی ئەو کەمە گۆڕانەش نییە و دەستی ئەوتۆ هەیە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بتوانێ تەفر و تونای کا، گیروگرفت و تەگەرە بە جۆرێک تێکەڵی واقیع و ڕێبازی ژیان و بزووتنەوەی بوە دەرفەت بەوەندە گۆڕانەش نادا کاری ئازادانەی خۆی بکا بۆ پێش خستنی هەنگاوەکانی، ئێستەش هەر لەبەر تیشک و لە ناو پەراوێزی ئەو گیروگرفت و تەگەرانەدا پەلەفرەیەتی. «وا ڕێگەتان دەبەسرێ عێلاتی جاف و بڵباس« مۆدێلی دروشمەکانی خەباتی کوردە لە ساڵی 1972دا (لەم ساڵەدا دەست بەو نووسینە کراوە). تا کاتی خوێندنەوەی ئەم دێڕانە حیسابی کورد لەوەدا نیە وەک خاوەن پەزی عادەتی لەگەڵ خۆیدا بڵێ «مەڕگەلەکەم زاوە داخوا کەی بێچوەکانی بفرۆشم قازانجی زیاترە». کورد جارێ خەریکی ئەوەیە لێکدانەوەیێکی دیکە بکا و بڵێ «گورگ لە مەڕگەلەکەمدایە… وا پێ دەچێ کەوتبێتە ناو کۆزی بێچووەکانیشەوە تۆ بڵێی چ بکەم خۆم و مەڕەکە لە ددان و چنگاڵی گورگ ڕزگار بکەم!».

بەڵێ ڕاستە تا کەرەستەی ماددی و مەعنەوی هەبێ بۆ خۆپاراستن، ئومێدی نەجاتبوون و سەرکەوتن زۆرترە، بەڵام وەک ئەو ڕاستییە و لەویش گرنگتر ڕاستییەکی دیکە هەیە دەڵێ «تا گیروگرفت و خەتەری کوشندە هەبێ دەبێ ئامانج نەهێشتنی ئەو گیروگرفت و خەتەرە بێ. خەریک کردن بە ئامانجی لابەلا لەگەڵ پێداویستی ژیان و بوونی میللەت ناگونجێ».

بۆ مەبەسی ڕوون کردنەوە میسالێک دێنمەوە: با بڵێین کاک پیرۆتێک هەژار بوو دەوڵەمەند بوو. ئا ئەم کاک پیرۆتە ناپەرژێ خۆشی لە دەوڵەتەکەی ببینێ تا خۆ ڕزگار دەکا لە زۆرداریێک کە خەریکە دەوڵەتەکەی لێ بسەنێ... ئێمە هەر بۆ کورت کردنەوەی موناقەشە وا ڕادەنوێنین کاک پیرۆت دەوڵەمەند بووە، خۆ ئەوەی ڕاستی بێ بە پێی زەمانە و لە چاو خەڵقی دیکە هەژارتر بووە. کاتێک کاک پیرۆت ئانەیێکی هەبوو کاک X بیست ئانەی هەبوو، ئێستا کاک پیرۆت بیست ئانەی پەیدا کردوە، کاک X بووە بە خاوەنی 100 دینار یا زیاتر. کاک پیرۆت خۆی و بیست ئانەکەشی وا لەبەر دەست و دەسەڵاتی کاک X دایە.

من لە پشت چاویلکەی ڕەشەوە سەیری جیهانی کوردەواری ناکەم. هێندەی هەر مرۆڤێکی دڵخۆش بە بوون و ژین و چارەنووس، ئومێدم هەیە کورد بە مافی نەتەوایەتی خۆی بگا. دەمێکە گەییوم بەو قەناعەتە کە زەمانی توانەوەی کورد بەسەرچووە. لە تەمووزی 1960 گوتارێکم لە ڕۆژنامەیێکی عەرەبیدا بڵاو کرایەوە ئەمە یەکێکە لە ڕستەکانی:

*«والكرد جاز العصور التي كانت تسيغ اضمحلال الشعوب وترقين قيدها من سجل الوجود وهو اليوم حقيقة مستعصية على الفناء وتدرج على مهل في مرقاة مطردة التصعيد نحو ذرى تشهده منها الدنيا كما تشهد بزوغ النجم المحتوم في حكم طبيعة الاشياء».*

لە هەمان گوتاردا ڕوو دەکەمە خاوەن بیروڕای عەرەب داوایان دەکەم بە نووسین کورد بە میللەتەکەیان بناسێنن چونکە زەمانە ئەو ناسینە هەر فەرز دەکا:

*«فستفرض الايام هذا التعريف في أمد قريب أو بعد أمد قريب. وخير لمصالح الشعوب ان ترقب مخاض المستقبل باحداث التاريخ على اهبة منها وابصار».*

سرنجێک بدە گوتەی «في أمد قريب أو بعد أمد قريب» واتە بەو نزیکانە یا نەختێک دوای ئەم نزیکانە، بەڵێنەکەم نەخستە دوای زەمەنێکی دوور.ساڵی تێ وەرنەسووڕایەوە سەرەتای ئاژاوە لە کوردستان دەستی پێ کرد. لە ئەیلوول شۆڕش بەرپا بوو. ئەمە دەگێڕمەوە تا لێم بسەلمێنێ بە هەموو دڵ و قەناعەتمەوە باوەڕم

هەیە بە نەفەوتانی کورد، قەناعەتەکەم لە سۆز و هەستی تەبعی کوردایەتییەوە هەڵناستێ و بەس، بەڵکوو لێکدانەوە و وردبوونەوەشی لەگەڵدایە. بەڵێ کورد میللەتێکی نەمرە، دەماری زیندووەتی لە فرکەدایە هەر دەڵێی ئەگەر بیشیەوێ ناتوانێ بمرێ. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا و بە ڕادەی لە دڵنیاییم لە ئەنجامی گەشەدار و سەرکەوتنی کۆتایی کار، ترسم هەیە لە هەنگاوی چەوت و بێکەڵک. مرۆڤی ئاسایی کە لێی نەشێوابێ نابێ لەبەر ئومێدی بە ژیانی دوارۆژی چەند برینێکی بێ لزووم بخاتە لەشیەوە، یاخود بۆ دڵ خۆشی بە خەلە و خەرمانی سالانی ئاینده خەرمانی وەرزی ئێستاکەی بسووتێنێ.

وا بووە دەوڵەتی بەهێز و سامان و پڕ چەک بەهۆی هەڵە و ڕەوتی چەوت دووچاری تەنگژەی کوشندە بوە، کەواتە گەلێکی وەک کورد، کە خۆی لە تەنگژەدا بێ و هێزی بەرگری و هەڵمەت بردنی لە پێداویستی هەڵکەوت کەمتربێ، دەبێ هەڵە و خلیسکان چی بەسەر بێنێ! کە ئەمە وابێ، بێگومان وایشە، دیارە خۆ بە سەهوو بردن یا سەهوو کردن لە ئاست ژیان و ئەدەبی بوێژێک – وەک حاجی – دەرگەی سەهووی گەورەتر دەکاتەوە لە کاری زلتردا، چونکە بە جۆرێک عەفەوی هەنگاوی نووسەر یاخود خشکەی خامەی لە ئەدەبەوە دەڕوا بۆ پرسیارەکانی فەلسەفی و سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی، کە ئەمانە هەموویان مەوزووعی ئەوتۆن دەبنە بنگە بۆ تەصەوری واقیع و دەستنیشان کردنی خەبات و جووڵانەوەی تایبەتی بۆ سەرخستن و پێشخستنی ئەو واقیعە. دەوجا نووسەرێک کە لە هەوەڵ پیتی نووسینی دەربارەی ئەو بوێژە لایەنی چەوتی گرت و حەقیقەتی خستە ژێر پێیەوە... کە نووسەر ڕازی نەبوو بە چۆنیەتی ڕاستەقینەی ژیان و فکر و ئەدەبی ئەو بوێژە و لە ڕێی ڕاستپۆشی و داتاشین و هەڵبەستنەوە شتێکی ساختەی پێکەوە نا، دیارە نووسینەکەی کە لە سەرەتاوە وەک جۆگەلەیێکی تەسکی درۆزن لە کانیاوی شەخسی بوێژەکە هەڵدەقوڵێ، بەرە بەرە زیاد دەکا بە تێکەڵبوونی لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەی هەمە چەشنەی دەسکرد و هەڵبەستراو لە هەموو مەیدانەکانی فکرەوە تا دەبێ بە ڕووبارێکی پان و قووڵ و شەپۆلاوی پڗاوپڗ لە هەڵە و فەند و فێڵ.

هەڵبەت نووسەرێک کە ڕازی نەبوو بە ڕاستییەکی پێش سەد ساڵ و دوو سەد ساڵ و لێی وەتەنگ هات تا بەرگێکی درۆی لەبەر دەکا کە خۆی کەیفی پێ دێ، دیارە ئەو نووسەرە لە عاستی ئێمرۆدا زیاتر وەتەنگ دێ و لە جیاتی بەرگێک چەندین

بەرگی درۆی لەبەر دەکا. بۆ میساڵ دەڵێم «ملحد»ێکی ئێمڕۆ هیچ لە «الحاد»ـەکەی کەم نابێتەوە ئەگەر حاجی قادر نوێژکەر و لە خواترس بووبێ. خواناسیی حاجی وەک ئەوە نیە ئێستا فەیلەسووفێک خەریک بێ ئیسپاتی بوونی کردگار بکا چونکە ئیسپاتەکە کرا ئیلحادەکە کە بە درۆ دەخرێتەوە. دەوجا کە «ملحد» بەوە ڕازی نەبێ حاجی قادری پێش سەد ساڵ نوێژکەر بووبێ دیارە دەرگای هەموو «مناقشە»یێک دەبەسێ لە ڕووی باسی لاهووتی: لەوەندەش ناوەستێ بەڵکوو کە دەسەڵاتی بوو سزای قورسیش دادەنێ بۆ پیاوانی لاهوت و هەموو جۆرە باوەڕێکیان. دەتوانین بڵێین ئەو تەرزە »ملحد«ـە لە ڕووی تەسکیی مێشک و بێحەوسەڵەییەوە وەک قەشەیێکی سەردەمی «گالیلۆ»یە کە بڕیاری سووتاندنی هەموو فەلەکناسێکی دەدا بیگوتبایە زەوی بە دەوری ڕۆژدا دەخولێتەوە. (ئەم میساڵەم هێنایەوە بە نیازی ڕوون کردنەوەی مەبەس. دەنا لێرەدا دەخلێکم نیە بەسەر ئیلحاد و ئیمانەوە و بە هیچ جۆر نامەوێ بچمەوە ناو گۆمی ئەو باسەوە).

خاوەن باوەڕی سیاسیش وەک کابرای «ملحد» و لەو دڵگەرمتر جەنگ دەکا لە دژی ئەو ڕاستییانەی کە حەزیان لێ ناکا، چونکە «الحاد» مەوزووعێکی نەزەرییە و دەخلی ڕاستەوخۆی بەسەر سوود و بەرژەوەندەوە نیە. لە فەرزی «ملحد» لە دەمەتەقەدا ژێریش کەوێ هەر قسە دەدۆڕێنێ، پارە و پوولێکی هەیبێ لە جێی خۆی دەمێنێتەوە. بەڵام سیاسەت نەزەرییە و بەرژەوەندە، بەقەدەر تێشکانی سیاسی لە نەزەرییەدا بەرژەوەندیشی تێدەشکێ. دەوجا بۆ خۆت سیاسی و «ملحد» بە یەکدی بگرە لە ڕووی پێداگرتن و سووربوون لە سەر هەڵە و دەسکاری.

دوور نیە فرچک گرتن بە دژکاری و لایەنگیری (خصومة وتحیز) لە ڕێی تەسکیی مێشکەوە مرۆڤ بگەیەنێ بە پلەی خۆ هەڵقوتاندن لە هەموو سەروبەرێکی ژیانی ڕۆژانەی خەڵق. ڕەنگە لە جۆری گوزەران و بەڕێوە چوونەوە تێی کا تا سەر دەگەیەنێ بە مۆدێلی جلک و شەکری چایە و خوێی چێشت. ئەوەی لێرەدا دەیڵێم چ «مبالغە»ی تێدا نیە. مێشکی تەسک کە دەسەڵاتی بوو جیهان بە پێی مێزاجی نالەباری خۆی لە قاڵب دەدا، هەر کاتێکیش ڕووداو وەیا میزاجی خەڵق ئەو قاڵبەی نەسەلماند ئەوسا بە هیمەتی کوتەک ڕووداو و مێژوو و خەڵقیش سەر نەرم دەکا بۆ کەیفی خۆی و هەژار و یەک بەڵگەش دێنێتەوە کە خۆی ڕاستە و جیهان چەوت.

له فەرزی خۆی پێی نەکرێ دەلیلان بێنێتەوە ئەو کارە بە قۆنتەرات دەدا و کرێ گرتەی زیرەک و پسپۆڕی بۆ دەگرێ.

بەڵێ سەرەڕای ئەوە کە مەنتیق و لێکدانەوە دەمانگەیەنێ بەو قەناعەتە کە سنوورێک نیە بۆ دژکاری و لایەنگیری، ڕووداوی مێژووش باسی ئەوتۆمان بۆ دەگێڕێتەوە لە هەوەسبازیی دەسەڵاتداران کە هەر بە جارێ بمانتۆقێنێ لەو ئافەتەی خۆ بە سەهوو بردن و سووربوون لەسەر هەڵە. قەسابخانەی کارەساتەکەی «خلقی قرأن» لە سەردەمی عەباسییەکەن یەکێکە لەو بەرهەمە جەرگبڕەی دژکاری و لایەنگیری. دوێنێ و پێرێش هاوتای ئەو ڕووداوە کۆنە ڕووداوی تازەمان دیوە بە چاوی خۆمان ئەندە دزێو و دڕندە بوە ئەگەر ڕەحمێکمان بە خۆماندا بێتەوە و ئیسافێک لە گەڵ ڕاستیدا بەکار بێنین لە خۆمانەوە دەکەوینە دژی «دژکاری»ی بێلزووم و «لایەنگیری»ی هەوەسبازانە، چونکە دەبێ ئەوە بزانین چیلکە و دارە سووتەمەنی ئەو جەهەننەمە من و تۆین یا کوڕ و برا و برادەرمانن. کە ڕەحممان بە مرۆڤی نەناسراودا نەیێ با ڕەحم بە خۆمان بکەین.

سەیر ئەوەیە زۆردارێک یا بابایێکی دەسەڵاتدار کە خەڵق دەتۆقێنێ تا سەریان پێ دانەوێنێ بۆ باوەڕی خۆی، وا دەبێ دوای کارەسات و ئازاردانی بێ سامان و نارەوا، واز لەو باوەڕە دێنێ و دەچێتە سەر باوەڕێکی تا بڵێی جیاواز، ئەوساش سەر لە نوێ ئازاری خەڵق دەدا بۆ ئەوە لەگەڵ خۆیدا باوەڕگۆڕییان پێ بکا. هەندێ جار قەوماوە ئەو شەخسە یا ئەو لایەنە چۆتە سەر باوەڕێک کە لەمەوپێش بە کفری حیساب دەکرد و خەڵقی لەسەر دەکوشت. چەند خۆش دەبوو ئەو لایەنە سزای خۆشی دابا وەک هی خەڵق چونکە ئەویش وەک ئەوان تاوانبارە بە گەز و گرێی خۆی، واتە بە قسە و کردەوەی خۆی دەیگێڕێ نەک بە هی من و تۆ.

ئەوانەی لایەنگیری و دژکاری دەکەن لە مەوزووعێکدا هەموویان لە یەک ڕادە و ئەندازەدا نین. هۆی ئەو جیاوازییەش یەک و دوو نیە بەڵکوو بە پێی چەند و چۆنیەتی بابەت و هەڵوەستی شەخس و ڕەوتی ژیانی و عەوامیلی دیکە جۆر جۆرە کە نایێنە ئەژمار دژکاری و لایەنگیری لە کەسێکەوە تا یەکێکی دیکە تەفاوتی دەبێ و توند و شلی پەیدا دەکا.

له عاست حاجی قادردا دژکاری و لایەنگیریی گەنجێکی کۆیی لە هی جێگەیێکی دیکە ئاشکراتر و بەهێزترە بە هۆی ئەوەوە کە هاوشارییەتیی کۆییێک لەگەڵ «حاجی» دا هەرجییێک بووبێ و هەرچۆنێک ژیابێ و ڕایبواردبێ لە ڕابردووی باپیرانی ئاکرەیی و خانەقینی و ئێستاکەی خۆیان کەم ناکاتەوە. بەڵام هەم بە حوکمی مەنتیق و هەم بە پێی ئەوە کە لە مەوقیف و نووسینی هەندێ کەسانی کۆیی دەبینم و دەخوێنمەوە دیارە بە لای ئەوان کۆییانەوە ئەگەر حاجی قادر بە جۆرێکی کە خۆییان دەیانەوێ بخرێتە پێش چاوان و پەیوەندی و دۆستایەتی لەگەڵ ناسراوانی کۆیەی سەردەمی حاجی تەفروتوونا نەکرێ، ئا ئەو حاجی قادرە و یاد و بیرەوەری و شیعری بەکەڵکی ئەوان نایێ، چونکە بەلایانەوە حاجی قادری ڕاستەقینە لە دەست ئەوان دەردەچێ و دەبێتە سامانێکی مەعنەوی بۆ شوینەواری ناسراوەکانی هاوچەرخی حاجی.

گەنجێکی کۆیی کاڵی تازە مێشک پژاو و خاوەن بیر و باوەڕێکی لایەنگیر خۆشییەک هەست پێ ناکا لەوەدا کە حاجی قادر دۆستی حەماغا بووبێ و یا شیعری بە ئەمین ئاغادا هەلگوتبێ. خۆ حەماغا و ئەمین ئاغا، خزم و کەس و باب و باپیری ئەو نین. نەک هەر هەستی خۆشی لەو دۆستایەتییە و پێدا هەڵگوتنە ناکا بەڵکوو حاجی قادری ئەوتۆیی هەر دەست نادا بۆ ئەو. بۆیە تا دەتوانێ خەریک دەبێ ڕووپەڕەی دۆستایەتیی حاجی لەگەڵ ناسراوانی ئەو دەمەی کۆییێدا دەسڕێتەوە و وێنەییێکی دەسکرد بۆ پەیوەندیی حاجی لەگەڵ زەمانەکەیدا دروست دەکا. وەنیە ئەمەش کارێکی ئاسان بێ، چونکە خۆشی بێ و ترشی بێ حاجی هەموو ژیانی کە لە کوردستانی عێراق و ئێراندا ڕابوواردبێ لە نێو مەلایان و ناودارانی ئەو دەمەدا بووە، دەسەڵاتی بوێژی و پژانی بلیمەتیشی هەر بەهۆی ئەو نزیکییەی لەگەڵ ئەواندا گەشەی کردووە. ئیتر مەعلوومە سڕینەوەی پەیوەندی حاجی لەگەڵ مەلاکان و ئاغاکانی ئەو دەمەی کۆییێدا ڕاستەوخۆ دەبێتە سڕینەوەی سەرپاکی ژیانی حاجی بەر لە سەفەری بۆ ئەستەمبوڵ.

بۆ بێتالیعیی پیاوی لایەنگیر دیوانەکەی حاجی هێندە شایەدی تێدایە بۆ ئەم ڕاستییە، خامۆش کردنیان بە سووتاندنی دیوانەکە نەبێ ناکرێ. بۆ هەر مەبەسێکی کە ئەو لایەنگیرانە حەزی لێ دەکەن ئەگەر حاجی یەک دوو بەیتی گوتبێ، بۆ

سەپاندنی عەلاقەی لەگەڵ ناودارانی دەوری خۆی چوار پێنج بەیتی گوتووە. وەزعێکی یەکجار نارەحەتە بۆ میزاجی مرۆڤی لایەنگیر.

بەلای یەکێکی وەک من، بێتەرەفی بێلایەنگیری، کە مەبەسی گوتنی حەقیقەت بێ و ئەو حەقیقەتە هەر چییەک بێ با ببێ و پێی وەتەنگ نەیێ، زۆر بە دڵی خۆشەوە دەڵێم کورد و حاجی بەختیان یار بوون لەوەدا کە حاجی کەوتە سەر خوێندنی مەلایەتی و ڕەفاقەتی پیاو ماقووڵانی دەوری خۆی. بەهۆی ئەو خوێندنەو ڕەفاقەتەوە بوو لە گەنجێکی عادەتی لادێوە بوە شاعیرێکی ناسراوی پەنجەنیشان و خاوەن کەرەسەیێکی زیهنی و مەعنەوی ئەوتۆ کە ڕێی ئەستەمبوڵی بۆ کردەوە و جێگە و مەقامی لەوێدا بۆ ئامادە کرد.

وەک دەزانین لە ڕووی وەفاکاری و بێ گرێوگاڵییەوە حاجی ئەو ڕاستیەی لەبیر نەچوو و تا ژیا دۆستەکانی دێرینی فەرامۆش نەکرد. تۆ بڵێی لەبەر کام هۆی جنۆکاویی دەبوا حاجی وا نەبێ؟ کە ڕابوردووی خۆی سڕیبایەوە و ڕەفیقەکانی خۆی لە دڵ دەرهاویشتبان ئەو بەتاڵاییەی بە چی چاکتر کردبایەوە؟ خۆ ئەوسا وەک ئێستا ماموٚستای لایەنگیری نەبوو بە خێری خۆیان حاجی باوێنە سەر ماخولیاییێک لەگەڵ مەیل و ئارەزۆی خوێن گەرمی ئێمرۆ بگونجێ. هێشتا کوردەواری بەهۆی تازە دەهاتوو فێری جنێودان نەبووبوو بە دەرەبەگ و بۆرجوازی و کۆنەپەرستی تاکوو حاجی قادریش لەو بەرەکەتە هەندێکی پێ گەشتبا و بیکردبا بەهانەی فەرامۆش کردنی ڕابردوو.

حاجی لە ڕەفاقەتی ئەمین ئاغا و حەماغا و حاجی مەلا عەولا لە سوود بەولاوە نەیدیبوو تا بکەوێتە دژی ئەو ڕەفاقەتە. بە پێی باوەڕی ئەو سەردەمەش هیچ کامێک لەوانە خراپەیان نەبووە تاکوو حاجی لە ڕێی نیشتیمانپەروەرییەوە پەیوەندی شەخسی و ڕەفاقەت لە بیرکا و بکەوێتە سەر باری دوشمنایەتییان.

حاجیی نیەتپاک بەخەیاڵیدا نەدەهات و لە غەیبیشەوە نیدای نەبیستبوو ڕۆژەک لە ڕۆژان گەنجی ئەوتۆ پەیدا دەبن لە شارەکەی، کە خۆیان بە خەسارەتمەند دەزانن لە چۆنیەتیی ڕاستەقینەی ژیان و ڕابواردنی ئەو. دەتوانم لێرەوە شایەدی بدەم بۆ حاجی ئەگەر ئەمەی زانیبا لە ڕووی دڵسۆزییەوە ئامۆژگاری دەکردن لە هێزی قەڵەم و زمان و فکریان بۆ خزمەتی ڕاستی بەکار بێنن چونکە ڕاستی نەبێ، بەکەڵک

زوربەی گەل نایێ. دروست کردنی شت لەسەر درۆ وەک کەڵەکی پەڕۆ وایە یا خێرا ژێرئاو دەبێ یا خود دەبێ بە ئەرکێکی هەمیشەیی سەروای کەی.

دوشمنایەتی ڕاستی جگە لەوە سەر دەکێشێتەوە بۆ دوشمنایەتیی گەل، تا بڵێی کارێکی بە سفت و سۆیە بۆ گیانی ئەو کەسەی دەکەوێتە دژی ڕاستی. لێرەدا میساڵێکت بۆ دێنمەوە بایی قەناعەت هێنان بکا. حاجی دەڵێ:

دوو ئاغای ماوە وەک بیستوومە ئەخبار
ئەمین ئاغا و حەماغای «صاحبی» کار

گومانت نەبێ ئەو بەیتە بەقەد خەنجەرێک لە ناخی دڵی هەموو کەسێک کار دەکا کە دژی دۆستایەتیی میانی حاجی قادر و ئەمساڵی ئەمین ئاغا بێ. بەڵام ئەو بەیتە بەنیسبەت گەنجێکی عادەتیی کورد، کە دژی ناودار و خاوەن دەسەڵاتی ئەو سەردەمە بێ، وەک خەنجەر بەیەک دەم بریندار دەکا ئەویش دەمی«موضوعی»، کەچی گەنجێکی ئەوتۆیی کۆیی لەو بەیتەدا بە هەردوو دەمی تیغەکە بریندار دەبێ، «ذاتی» و «موضوعی«، چونکە سەرەڕای ئێشێکی کە ڕاستەوخۆ لە واتای بەیتەکە بۆی پەیدا دەبێ جارێکی دیکەش هەست بە ئازار دەکا لەوەدا کە ڕابردووی خودی خۆی زامدار بووە بە ناو هێنان و ڕێز لێگرتنی ئینسانی ئەوتۆ لە شارەکەیدا کە بە هیچ جۆرێک لەگەڵ خۆیدا پەیوەندی نیە و لە هیچ ڕوییێکەوە بۆی ناکرێ لە ناو و شۆرەتی بەشدار بێ. وەک بڵێی درەوشانەوەی ناوی ئەو تەرزە کەسانە لە کۆیەی سەردەمی حاجی قادردا تاریکی و نادیاری و بێناویی باپیری ئەو ئاشکراتر دەکا، بۆیە زامی ئەو لە بەیتەکەدا لە زامی کەرکووکییەکی هاوباوەڕی خۆی بەئازارترە. ئەگەر کەرکووکی بۆ بابەت شین بکا، کۆییەکە بۆ خۆی و بابەتەکەی.

هەڵوەستی وەها ئەزموونێکی (امتحان) نەفسی بێ پێچە و پەردەیە بۆ مرۆڤ چونکە تا خۆی بەکەم بزانێ دەکەوێتە دژی گەورە. هەر بۆیەیە مرۆڤی بێدەسەڵات کاتێ دەسەڵاتی بوو لە خۆی دەردەچێ و ڕەفتاری لەگەڵ خاڵقدا دڕ دەبێ. دەیەوێ تۆڵەی سەردەمی لاتی و بێدەسەڵاتیی خۆی لە عالەم وەرگرێ. ئەو کەسەی مێژووی ڕاستەقینە دەسڕێتەوە و سەر لە نوێ مێژووی دەسکرد دەنووسێتەوە، نیازی ڕواڵەتی هەرچی بێ، لە قووڵایی دڵی خۆیدا خەریکە چوارچێوەیێک دروست دەکا لە دەوری

ناو و وێنەی خۆی تا لە ئارایشتی زیاد کا. بایی شاردنەوەی ناوی مرۆڤی بە شۆرەت، خۆی و ناوی دێنێتە پێشەوە و کورێنی پێوە دەکا. بچووکی شەخسییەتیشی هەستێکی حەسانەوەی پێ دەبەخشێ لە سڕینەوەی ناوی هەر ناودارێک. گەلێ جار لەم ڕەفتارەدا ڕەگێکی نەخۆشیی «سادیزم» خۆ دەنوێنی تا دەبینین کابرای مێژووگۆڕ وەک نەخۆشی سادیست کە لە ئازاردانی نێچیرەکەی لەززەت وەردەگرێ ئەویش لە گۆڕینی مێژوو و سڕینەوەی ناوی مرۆڤی گەورە پسپۆڕییەکی ئەوتۆ بەخەرج دەدا لە دەسەڵاتی »تمثیل و افتعال» دەردەچێ، وەک زەنەک لە میانی خۆی و کردارەکەی. دەوجا قوربەسەر ڕاستی و سوودی گشتی و گۆڕان و پێش کەوتن لە دەست مرۆڤی وادا.

سرنجێکی لە سەرەخۆ و بێ پەلەپەل بۆت دەردەخا ئەم نەخۆشییەی سادیزم گیانی ڕووخێنەر هۆی ئەوەیە لە هەموو هەرا و بگر و بکوژێکدا تاقمێک هەن لە ڕیزی هەرە پێشەوە خەنجەربازی دەکەن، هەرایەکە ڕەش بێ یان سوور یا زەرد. هەر هەمان هەوەسی لەوەڕگەی دڕکاوی و خوێناوییە ئەم تاقمە وا خۆش جڵەو دەکا بۆخۆگۆڕیی و جێگۆڕیی بە پێی گۆڕانی ڕەنگ و جێی زەماوەند.

لە ساڵانی 1958 و 1959 دا کە گیانی شۆڕشگێڕیی لای زۆر کەس گەیشتبووە پلەی «چەپڕەویی منداڵانە» دەستە و تاقمی ئەو خوێنکوڵاوانە و دەمار هەڵهاویشتوانە بە قەبرستانەکانی کۆییدا وەربوون و ئەو کێلەقەبرانەی تەوش و تراش کرابوون و شتێکیان بە سەرەوە نووسرابوو شکاندیان. یەکێک لەو کێلانە هینەکەی قەبری حاجی بەکرئاغا بوو، کە مێژووی مەرگی بە شیعر لێ هەڵقەندرابوو، شیعرەکەش هەڵبەستی حاجی قادر بوون. داوا دەکەم لە خوێنەری کورد لەگەڵ مندا نەختێک هەڵوەست بکا تا بەهۆی وردبوونەوە واتای تەواوی ئەم کارەساتە بنیشێتە دڵیەوە.

وابوە لە نێو میللەتێکدا شۆڕش بەرپا بووە و لە کاتی هەوەڵ تەقینەوەی شۆڕشەکەدا دەست درێژی کراوە بۆ ڕووخاندن و سووتاندن و کاری ناڕەوا. ئەوەی ڕووخاوە کاخێک بووە، ئەوەی سووتاوە فابریقەیێک وەیا مۆزەخانەیێک وەیا بنگەیێکی ئابووریی وەک بانق و سەرڕافخانە. شۆڕش بەرپابووە و خەڵق تێیدا خرۆشاوە و دەستی کردووە بە ڕووخاندنی کاخ و سووتاندنی فابریقە و بانق. کاخ و فابریقە و بانق هەبوون بۆ ڕووخاندن و سووتاندن. بەڵام لە کۆیەی ساڵی 1958 شتێک نەبووە بنیاد

نرابێ و کەڵکی ڕووخاندن و لەناوبردنی بووبێ لە کێلە قەبر بەولاوە. زیندووەکان شتێکی ئەوتۆیان نەبووە لێیان بە زیاد بگیرێ تا خوێنگەرمێک بەهۆی لەناوبردنی کرمی دڵی خۆی بکوژێ، ناچار کەوتە گیانی مردوو. تەنها دروشمێک بە جیهانی زیندوانی دەلکاند و شوێنەواری دەپاراست کێلە قەبرەکەی بوو، نە مڵک و نە ماڵ و نە منداڵ، هاوڕێی گۆڕستانی نەبوون. وەک تەزکەرەی نفوسی زیندوان ئەو هێندە بەردە نووسراوەی هەبوو پێی بناسرێتەوە، بە زەبری چەکوچ و کوتەک کاکی خوێنگەرم لێی ورد و خاش کرد.

وەی ئافەرینت لێ بێ ڕووداو، دەک دەستت خۆش بێ کارەسات، چەند جوان بە بەلاغەتی وشە و هونەری ڕیشە نوخشەی ئیفلاسی «ماددی و مەعنەوی» خۆمان بۆ دەکێشێ و بەتاڵیی وجودمان دێنیە پێش چاوان تا ڕادەی شیوەن بۆ خۆ کردن و بێز لەخۆ هەستان. «سالم» لە جوابەکەیدا کە بۆ «نالی» نووسیوە و داد و فیغانی کرد لە دەست ستەمی تورکەکان، لە بەیتێکدا ئەمە دەڵێ:

سالی هەوەڵ بوو دڕا بەرگ و باری شێخ هەواس
ڕۆمی ئەوەندە شوومە لە شەخسیش دەدا زەرەر

بە خەون و خەیاڵی «سالم» نەدەهات ڕۆژگار ئەوەندە گاڵتەچی بێ لە بن باخەڵیدا کارەساتی ئەوتۆ هەڵگرێ دوای سەد ساڵێک لە «شوومیی ڕۆمییان» بیکا بە چیرۆکێکی شانۆگەریی تراجیدی- کۆمیدی لە گۆڕستانی کۆیەدا ئاکتۆری چیرۆکەکەش گەنجی شۆڕشگێڕی تێگەیشتووی عیلمانیی کوردی کۆیی بێ، نەک جەندرمەیێکی داگیرکەری نەخوێندەواری بێڕەحمی عوسمانی.

ئەم بڕە شیعرەی کە بە سەر کێلە قەبرەکەی حاجی بەکر ئاغاوە بۆ مێژووی مردنی بە حیسابی ئەبجەد تێدا دیار کرابوو. وەنیە پەرۆشم بۆ بزربوونی خودی مێژووکە بێ، چونکە ساڵی مەرگی حاجی بەکر ئاغا ساڵێکی دیارە و لە چەند جێگایاندا تۆمار کراوە، بەڵام ئەوەی بۆی بە پەرۆشم بزربوونی بڕە شیعرەکەیە، چونکە لە نموونەی هونەری مێژوو دەرهێنان بە شیعر تاکە یەکێکی حاجی قادرمان بە دەستەوەیە کە بۆ مەرگی «کەیفیی جوانڕۆیی» دایناوە و لە دیوانەکەی نووسراوەتەوە. عادەتەن شاعیر بە یەک دوو نموونە دانامەزرێ هەڵبەت حاجیش لەو بابەتە هی تری هەبوە

و فۆتاون. جا ئەگەر ئەم مێژووەی مەرگی حاجی بەکر ئاغا مابا هەندێک یارمەتی دەداین بۆ دیار خستنی پایەی هێزی حاجی لەم جۆرە هونەرەدا.

لە بیرمە خوالێخۆش بوو «فەتاح ئاغای حەوێزی» شیعرەکانی لەبەر بوون و دەیخوێندەوە. بەداخەوە لەو زانینەی ئەو من سوودم وەرنەگرت و شیعرەکانم نەنووسیەوە. خۆ مرۆڤ وەنیە هەرچی بیستی تۆماری کا، بە بیریشیدا نایێ هەل کە لە دەست چوو نایێتەوە. تۆ بڵێی کوڕانی فەتاح ئاغا یا خزمانی نزیکی ئەو، کە هەموویان نەوەی حاجی بەکر ئاغان، ئەم شیعرانەیان نەپاراستبێ.[3]

---

[3] - دوای ماوەیێک لە نووسینی ئەم مەوزووعە لە تەرەف کاک کازمی فەتاح ئاغاوە شیعرەکانم بۆ هاتن. وا لێرەدا تۆماریان دەکەین لەگەڵ سپاسێکی پڕبەدڵ کە فریام کەوت و پەرۆشمی دامرکاندەوە:

شئیدم دیشب افغان زن و مرد
صدا اهکند بر طاق زبرجد

بگفتم چیست این افغان، مردی
کشید اهی ز سوز از سینهء سرد

پگفتا مر ندانی کز جهان رفت
ابو بکری انیس غار أحمد

بگفتم چیست تأریخ وفاتش
بگفت «وا ثانی ثنین محمد»

ڕستەی «واثانی ثنین محمد» بە حیسابی «ابجد»ساڵی 1270 دەگرێتەوە. بەڵام ئەوەی تێبینی دەکرێ کە وشەی «ثنین» هەمزەکەی پەڕیوە. حاجی دەستووری پەڕاندنی هەمزەکەی داوە بە خۆی لە ڕێی ئەوەوە کە هی «صل» ــە و هی «قطع« نیە و ناخوێندرێتەوە کە ئەمە لە عورفی شاعیران جایزە. ئەگەر هەمزەکە بگەڕێتەوە بۆ ناو شیعرەکە ساڵەکە دەبێتە 1271، ڕاستیش ئەوەیە حاجی بەکرئاغا لە 1270 دا مردوە.

خوێنەری کورد بانگێشتن دەکەم بۆ ئەوە هەرچی لە کەلەپۆری کۆن و بەرهەمی نوێ دێتە بەردەستی بیاننووسێ و لە گۆشەییێکی ماڵەکەیدا بیانپارێزێ، نەکا لە دواییدا پەرۆش و حەسرەتی لە ناوچوونیان ئەنگوستی نەدامەتی پێ بگەزێ.

لە باوکی خۆم بیستووە »ئیبراهیم ئەفەندی حەیدەری» کە سەردەمێک «شێخ الاسلام» بوو لە ئەستەمبوڵ و بە زۆری دیدەنی و ڕابواردنی لەگەڵ حاجی قادردا بووە گەلێ باس و لەتیفە و نەوادیری حاجی گێڕاوەتەوە. ئەوەندەی ئەو شارەزایی بە ژیانی حاجی بوە ئەگەر نووسرابایە یەک دێڕ لە ڕووپەڕەی ئەو ڕۆژگارە بە ناتەوایی نەدەمایەوە. ئیبراهیم ئەفەندی باسی کرد بوو کە حاجی لای پیاوە گەورەکانی ئەوسای ئەستەمبوڵ ڕێزی لێ گیراوە و لەلایەن دەسەڵاتدارانی دەوڵەتەوە وەک پیاوێکی گەورە و ناودار ڕەفتاری لەگەڵدا کراوە. هەر ئەویش باسی کرد بوو حاجی قادر تا مردن تەرکی نوێژ و تاعەتی نەکردوە و لەو زەمینەدا گوتوەتی وا بە ئومێدی بوونی دوارۆژێک ئەو نوێژ و پەرستنە دەکەم، خۆ ئەگەر ئومێدەکە گەیشتە جێ ئەوا پێی ناوێ شتێکی تێدا بڵێم. ئەگەر چەشنێکی دیکەش بوو زەرەرم نەکردوە. قسەی وا لە پیاوی دیکەش دەگێڕنەوە بەڵام مانیعێک نیە لەوەدا یەک قسە دوو کەس یا زیاتریش کردبێتیان.

من گومانێکم نیە لە ڕاستیی گێڕانەوەکانی ئیبراهیم ئەفەندی چونکە سەرەڕای ڕەوشتی بەرزی خۆی کە ڕێ نادا بە گومان کردن لە قسەکانی موجیبێکیش نیە بۆ گومان لێ کردن. لە بنەماڵەی حەیدەری ئەگەر کەسێک هەبێ خەبەرداری ئەو مەوزووعانە بێ کە لە ئیبراهیم ئەفەندی وەرگیراون وەک پێویستی میللی دەبێ بە نووسین بیپارێزێ.

بە پێی گێڕانەوەی دەماودەم و لە هەندێ زەواهیرەوە پێم گەییوە، زۆر و کەم ئەم مەیلەی شاردنەوەی ڕاستی و سڕینەوەی ڕووداو، لە بیرەوەریەکەی حاجی قادر کە لە هاوینی 1971 دا لە کۆیێ بەرپا کرا، خۆی خستە بەر هەست و پێش چاوی خەڵق. هەر چەند نەمتوانی بە بروسکە نەبێ تێیدا بەشدار بم بەڵام تا ڕادەییێک چۆنیەتیی بیرەوەریەکەم زانی. خۆ ئەوەی ڕاستی بێ لە ژیانمدا چ بە خوێندنەوە چ بە بیستن هێندە دەرسم وەرگرتوە کە ئەگەر حازریش نەبم لە ئاهەنگی وەهادا بتوانم بە چاوی «تصور» گوزارشتەکەی ببینم یاخود هەر نەبێ چاوەنۆڕی شتی نێزیک لە واقیعی ئاهەنگەکە بکەم.

بەداخەوە، وەک چاوەڕوان دەکرا، بیرەوەرییەکە بە جۆرک ئاڕاستە کرا ناوی هاوچەرخە ناودارەکانی کۆیەی سەردەمی حاجی قادری سڕییەوە و لەناوی بردن، کە ئەمە ڕاستەوخۆ مێژووی سەد ساڵێکی کۆیێ دەپێچێتەوە و کانیاوی سەرچاوەی ژیان و ئیلهاماتی حاجی قادر وشک دەکا. لەوەش واز بێنە، کە ناکرێ وازی لێ بهێنرێ، چەرخی نۆزدەم جێ بهێڵە بۆ چەرخی بیستەم کە لە بیرەوەریەکەدا موناسەبەی جۆر جۆر هێنابوویە باسەوە. لە زنجیرەی ناوی شاعیرانی کوردی دەوری ئێستاکە و ڕابردوییێکی تازەدا ناوی مەلای گەورە بەسەر زمانی خاوەن گوتاردا نەهاتبوو. ناوی بێ و نەیێ ڕووناکترین چرایەکی کوردی کەوا لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە تا ساڵی 1943 نەک هەر کۆیێ بەڵکوو ئاسۆی فکر و حەقیقەتپەرستنی سەرانسەری کوردستانی بە تیشکی تیژ و بێپەروای خۆی ڕوون کردبێتەوە مەلای گەورەیە.

نیسبەتی مەلای گەورە لەگەڵ کۆیێ ئەو نیسبەتەیە کە لە بەیتە شاکارەکەی «حمدی»دا دێتە بەرچاو:

یامەدینە بێ نەبی بێ یا نەجەف بێ بێ عەلی
شاری غەزنەش ئێستە بێ مەحموودە وەک «داری کەلی«

منیش لێرە دا بە پێی داخوازیی جێگە و بە ناوی عوزر هێنانەوە لە جیاتی سەرپەرشتیکەرەکانی بیرەوەریی حاجیەوە ئەم فەردە پێشکەش بە گیانی بەرزی «حمدی» دەکەم.

باوەقوش لێی خوێندوە ئەم شارە بێ زەوقە و سەدا
یا نەخۆ خامۆشە کۆیێ بێ چرای کاکی «جەلی»

مەلای گەورە بێ یا حەماغا یا حاجی بەکر ئاغا، ئەمانە تازە لە من و تۆ بێنیاز بوون! هەرچی بۆیان بکەین نوقتەیەک لە پەڕەی مردنیان ڕەش ناکاتەوە و زەڕڕەیێک لە خاکی سەر قەبریان کەم ناکاتەوە. بەڵام ئەسەف و سەد ئەسەف بۆ ئەو بێڕەحمییە لەگەڵ خۆمانی دەکەین لە دژکاریمان بەرانبەر کەسانێکی ناوێکیان بۆ کۆیێ دروست کردوە و لە سەردەمی خۆیاندا شۆرەتی پیاوەتی و جوانمەردییان شانازی

بۆکۆیێ پێکهێناوە. سەدان هەزار کەس هاتن و ژیان و مردن لە مەڵبەندی کۆیەدا وەک نەقشی سەر ئاو، نە ناو نە نیشانێکیان لی بەجێ نەما، نە خۆیان و نە ڕۆژگاریان بەبیری کەسدا نایەن و مێژوو وای فەرامۆش کردوون وەک هەر نەبووبن. جا ئەگەر هەموو کۆیێ بەوچەشنە بێ ناو و شوێنەوار ژیابان و مردبان دەبوا شیوەن بکەین بۆ ئەو ڕابردووە بێکەڵک و هیچ و پووچەمان. عەرەب گوتەنی «قحط الرجال» نەبێ بۆ دەبێ ناودارێک لە کۆیێ پەیدا نەبووبێ، کە ناودارێکیش هەبێ بۆ دەبێ ئێمە ئیعدامی کەین.

لەوەش زیاتر! کەسێک کە حاجی قادر خۆی مەدحی کردبێ و ڕێزی لێ نابێ چۆن ڕەوا یە ئێمە کە شانازی بکەین بە حاجی قادر ئەو کەسە لە ڕاستەی عومری حاجی دەرباوێین. ئەوش بخەمە سەر قسەکانم: کەسێک لەگەڵ مردوو ئینسافی نەبوو مومکین نیە لەگەڵ زیندوو چاکە بکا. کە یەکێک ئەوەندە بەرچاو تەنگ بوو، بە قسە چاکەی مردوو نەگێڕێتەوە چۆن دەچێتە عەقڵەوە بە ئەرک و بە ماڵ و خۆبەخت کردن خزمەتی خەڵق بکا. بێگومان ئەگەر شتێکیش بکا یا لەبەر ترسە یا لەبەر تەماع. نەفسی ئادەمزاد خۆ وەک «هەزار پیشە»ی تاقمی چایە نیە جێگەی ئەنواعی شتی لەیەک نەچووی تێدا بیێتەوە.

نەفسێک کە لەگەڵ ڕابردوو درۆزن بێ، چۆن لەگەڵ ئێستادا ڕاستی دەکا! کە پەروای نەبوو لە سڕینەوەی دەفتەری دوێنێ دیارە شەرم ناکا لە سڕینەوەی دەفتەری ئیمرۆ. کە مەسڵەحەتێکی دیت لە ئنکار کردنی چاکەی زیندوان، بە ئاسانی دەیکا وەک هی چاکەی مردوانی کرد. لە ئنکاری کردنی چاکەی زیندواندا چالاکتریش دەبێ چونکە هەرچۆنێک بێ مردوو نابێتە خاوەن پشک لە بەرژەوەند و سوودی ئێستاکە. بیرەوەریی حاجی بۆخۆی کارێکی هێندە پیرۆزە لەوانەیە شەفاعەت بکا بۆ کەموکوڕییەکی کە تێیدا هەبووە. بەتایبەتی لەو بیرەوەریەدا هەر سۆزی کۆمەڵەی سەرپەرشتیکەری ئاهەنگەکە هۆی پێکهێنان و بەرپا کردنی بوە، لە چ لایێکەوە یارمەتی بۆ کۆیێ نەچووە.

چی لێرەدا دەیڵێم لە ڕووی پەرۆشیەوە بۆ بەخەسار چوونی بەشێکی گرنگ لەو هەوڵ و تەقەللای پاک و مەردانەدا لەبەر سەیر کردنی جیهان گە نیگایێکی نادروست. ئومێد دەکەم لە دوارۆژدا کە بیرەوەری حاجی دووبارە بکرێتەوە لەگەڵ ئەوەدا هەناسەیێکی بووژانەوە هەڵێنن. چاوەنۆڕ دەکەم ئەم نووسینە یارمەتیی

دڵسۆزەکانی شاری کۆیێ بدا لەو ئەرک و زەحمەتەی خستوویانەتە سەرشانی خۆیان بۆ تەکاندنەوەی تۆزی فەرامۆشی لە ڕووپەڕە پڕ شانازییەکانی ڕابردووی کۆیێ بە هەموو ڕووداو و مێژووی تاک و کۆمەڵیەوە لەو سەردەمانەدا کە پەیوەندییان هەیە لەگەڵ حاجی قادر. ئێمە کە خەریک بین تۆز لە ڕابردوو بتەکێنێتەوە، بێگومان، دەبێ تۆزی بەسەهوو چوونیش لە مێشکی خۆمان بتەکێنینەوە. زاتەن لە گێڕانەوەی گوزارشی مێژوو و بیرەوەریی مەزنەپیاوی وەک حاجی قادر یەکەم کەس ڕوون کردنەوەی مێشکی زیندوانە... دیارە خستنی شوێن هەنگاوی خەباتکەرانی ئێمرۆیە... دەوڵەمەند کردنی سامانی فکری و ڕوحی سەردەمی ئێستاکەیە... بایی ئەوە ڕابردوو بخەینە بەر تیشکی ڕاستی، ئێستاکە و دواڕۆژمان ڕووناک دەکەینەوە چونکە ڕۆژگار لە کۆنەوە تا ئێستا و هەتا هەتایێ یەک زنجیرەی بە یەکەوە بەستراوە. لەوانە بوو ئەگەر مرۆڤ تەمەنی عادەتی 200 ساڵ با، سەردەمی حاجی بەنیسبەت زوربەی خەڵقی ئێستا هەر بە ئێستا لە قەڵەم درابا چونکە خەڵقەکەی ئەو سەردەمە هەر خۆیان هی ئیمڕۆ دەبوون. تێپەڕینی زەمانە وەک خشکەی مار هەستی پێ ناکرێ، بە مردنی مرۆڤەکانی چینی لە خۆت بە پێشەوە و براِنەوەیان لە بەرچاوت، زمانەکەشیان دەبێتە ڕابردوو و کۆنینە. تا خۆت و هاوتەمەنەکانت لە حەیاتدان ئەوا زەمانە بەلای خۆتەوە هەر ئێستاکە یە.

بە پێی تێگەیشتن و باوەڕی خۆم چی بە ڕاست بزانم ئەوە بە هاونیشتمان ڕادەگەیەنم. تا لە دەستم بێ قێزی هەڵدەستێنم لە کاری نارەوای دژی سوودی گشتی کە یەکێک لەو کارانە گۆڕینی ڕاستییە. حەزم بەوە دەکرد نووسینەکەم لەو ڕووەوە وبیخستبا سەر دوشمنایەتیی شت هەڵبەستن و حەقیقەتپۆشی. چەند کەسانێکی فێڵبازی خاوەن مەبەسی شەخسی نەبێ بۆ سوود وەرگرتن لە کاری ساختە، ئەوەی سوود بێ تێیدا نیە، لە زەرەر بەولاوە.

زۆر جاران مرۆڤی دڵپاک و بێفێڵ بە سافیلکەیی شوێن ئەو فێڵبازانە دەکەوێ و قسەکانیان وەک تووتی دووبارە دەکاتەوە وا دەزانێ بەو کارە خزمەتی زوربەی گەل دەکا چونکە لە زاهیردا قسەکان ئەگەر هەڵبەستراویش بن لە دژی دوژمنانی گەلە، بابڵێین لە دژی ئەو کەسانەیە کە نێویان لێ نراوە دوژمنانی گەل. کەچی ئەو مرۆڤە دڵپاکە ئاگادار نیە لەوە کە بە پێی بەرژەوەندی وەخت و سەعاتی فێڵبازان دوژمنانی گەل مۆدێلیان دەگۆڕێ، پاڵەوانی ئێمرۆی ڕۆژەک دێ پێی بگوترێ دوژمنی گەل

یاخود کە بەرژەوەندی فیڵبازان داخوازی کرد خاینی دوێنێ دەبێتەوە پاڵەوانی ئیمڕۆ و سبەینێ. کاری ساختەگەری وەک چەرخ و فەلەک لە گەڕدایە سروەتی نیە لەوانەیە خۆت نۆرەت بگاتێ سەرەوژێرت کاتەوە بۆ ناو چاڵی خیانەت بێ ئەوەی هیچت بە خۆت شک بێ.

من دیومە تۆش دیوتە، زۆر جاران دەنگ دلێری زارقەڵەباڵخ بە شانازییەوە گوتوەتی بۆ مەبەسی داخوازیی باوەڕەکەی خۆی و لە باربردنی ناحەزانی ئەو باوەڕە دوودڵی ناکا لە هەڵبەستنی توهمە و تاوان. ئەو تەرزە خەباتگێڕە نەک بۆ دوژمن بەڵکوو بۆ هاوڕێی خۆیشی درۆ هەڵدەبەستێ کە هات و ڕێگەی پێشکەوتن و سەرۆکایەتی لێ گرت. مومکینە درۆزنی وا لە ئەنجامی مەیدان بە خەڵق چۆڵ کردنەوە ببێتە یەکەم پاڵەوانی سەر شانۆی خەبات. بەڵام دەبێ بزانین درۆزن هەر درۆزنە با لە هەموو شار و دێیەکەشدا پەیکەری بۆ دروست بکرێ. درۆزن نەفسی بچووکە با خەڵق بیشی پەرستێ. ئەو کەسەی دەستی دەچێتە کێلەقەبران کە دەسەڵاتی بوو بۆ مەسڵەحەتی خۆی زیندووش لە قەبر دەنێ با برای خۆی بێ، یا هاوڕێی بیروباوەڕی بێ و لە سەنگەرێکدا بەیەکەوە شەڕ بکەن. بە هەر لایێکدا هەڵیدەسەنگێنم و دەیخەمە بەر حوکمی هەر ئیحتیمالێک دەگەمە ئەو ئەنجامە کە درۆزن و مێژووگۆڕ و ساختەچی مومکین نیە مرۆڤی چاک بێ. چاکەیشی وەک خۆی درۆزنە. نابێ گەل بەو تەرزە کەسانە هەڵخەڵەتێ دەنا ڕۆژەکی دێ ببێتە قوربانیی فەند و فێڵیان ئەوساش پەشیمانیی کەڵکی ناگرێ.

ئەم ڕاستییانە هەر لە کوردەواریدا نایێنە دی، حاڵی هەموو میللەتێک لە چنگ ڕاستیپۆشی و درۆهەڵبەستن بۆ مەبەسی سیاسەت و بە ناوی بەرژەوەندی گشتی وەک حاڵی کوردە، بەڵکوو دەشێ لەویش خراپتر بووبێ، وا بووە لە زەمانەی بە بیری خۆمان دێ درۆزنێکی ئەوتۆیی لە میللەتێکی گەورە و بەهێز و خاوەن کیاندا هەزاران کەسی کوشتووە بۆ هەوەسی خۆی و سەپاندنی هەل بەسەر خەڵقدا، قوربانییەکانیش هەموو مرۆڤی پێگەیشتوو و تێگەیشتووی میللەتەکە بوون بە یەک مرۆڤی عادەتی بازاڕی، بەر لە هەموو کەسێکیش برادەری نزیک و هاوڕێی خەبات و سوێند خوارانی خۆی کوشتوون. حاڵی هەوەسباز و ساختەچی هەر وایە دەوجا ئەو هەوەسبازە کورد بێ یا غەیری کورد بێ، بیناسی وەیا نەیناسی... بگرە برای خۆشت بێ.

باسەکەی ئێمە لە پەراوێزی مەوزووعی حاجی قادردا دەخولێتەوە و لە ڕووداوەکانی سەر بە ژیان و ناو و بیرەوەری ئەو نموونەی لێکۆڵینەوە دێنێتەوە، ترسی دوورکەوتنەوە لە مەبەس وا دەکا بە چەشنێکی خێرا و کورت لە شی کردنەوەی ئەو نموونانە بدوێین و نیوە پەندیان لێ وەرگرین دەنا دەبوا بەپێی گرنگی ئەو پەندە تا ڕادەی پێویست لەسەری بڕۆین. خۆ ئەو باسەی هەوەسبازی و ڕاستپۆشی پەیوەندی هەیە لەگەڵ مێژووت، لەگەڵ ئیمڕۆت... لەگەڵ دواڕۆژت... لەگەڵ باوەڕت... لەگەڵ گوزەرانت... لەگەڵ چارەنووسی منداڵەکانت. بەقەدەر پەژارەیی دوێنێت بە دەست هەوەسبازەوە، دواڕۆژیشت ڕەش دەبێ ئەگەر پەکی هەوەسباز نەخەی. کاریش نیە لەوە زەحمەتتر چونکە دوشمنت نیە لە هەوەسباز گەورەتر و لەو فێڵبازتر و بەردەوامتر. دەشێ لە چنگ بێگانە و داگیرکەر ڕزگاری بێ بەڵام تەڵەکەبازی ناوخۆیی دەر کردن و ڕزگاربوونی بۆ نیە: لەگەڵ هەموو عومرتە، ڕەفیقی عومری نەوەی نەوەشتە. دەمکوت و بێ دەسەڵاتی نەکەی وەک دەوالپێ تێتدەئاڵێ و فرزەت دەبڕێ و لە مرۆڤایەتیت دەخا.

لە ناو ماڵی خۆت، لە جیرانەکەت، لە ئەهلی گەڕەکەکەت و شارەکەت و وڵاتەکەت هەر کەسێک ڕاستی سەر بە مێژوو و باوەڕ و سیاسەتی لێ شاردیەوە و درۆی بۆ هەڵبەستی بزانە ئەمەیە دەوالپێ. ڕامت دەکا تا بتکا بە بارکێشی خۆی. دەسکاری کردن لە مێژوو و ڕووداو و واوقیع بە هەر ناوێکەوە بێ کاری دەوالپێ و خوێنمژ و جەردەیە.

با دەرسێکی سەرەتایی، کە لە ڕۆحی حاجی قادرەوە بۆمان ببێ بە پەند، ڕووت کردنەوە و ڕیسوا کردنی ڕاستپۆش و هەوەسباز بێ. پەیڕەوی کردنی ئەو پەندە یەکەم هەنگاوە لەسەر شەقامی بەرەو کامەرانی. ڕۆناکیی حەقیقەت چاو و مێشکی میللەت دەکاتەوە بۆ دۆزینەوەی ئامانجی پاک و پیرۆز. دز لە ڕۆناکایدا دزی پێ ناکرێ.

دەوجا با ڕوو بکەینە جیهانی حاجی قادر. جیهانی بوون و ژین و ئەدەب و ڕەوشت و خەباتی. بەڵام بەرلەوە بکەوینە ڕێ با ئەوەت پێ بڵێم چی لێرەدا دێتە بەر چاوت بەنیسبەت تەواوی مەوزووعەکان چەند لاپەڕەییێکن لە کتێبێک... چەند بەیتێکن لە قەسیدەیێک... چەند گوڵێکن لە باغێک... وەک ماجەرای »کەویژ و مەویژ« وایە.

- ئەم نووسینە باسی هەموو ژیانی حاجی نیە.
- لێکۆڵینەوەی هەموو ئەدەبی نیە.
- نرخاندن (تقیم) ی هەموو خەباتی نیە.
- تۆمار کردنی هەموو گوزارشتی نیە.
- دیراسەی ڕۆژگاری نیە لە ڕووی سیاسی و ئابووری وکۆمەڵایەتی و زانستی و هەموو ڕووەکانی دیکەی ئەو ڕۆژگارە.
- تەنانەت دەوری کتێبەکەی «سیووطي» یش هەڵنەهاتووە کەوا پڕە لە دەستنووس و حاشیە و وردە شیعر و لەتیفەی حاجی.
- لە هیچ مەیدانێکدا تا ئەوپەڕی نەچوە، نیوە و سێیەکیشی نەبڕیوە.
- لە هیچ گۆمێکدا بۆ تەختی بنی قووڵ نەبۆتەوە، لە تەنکاوی سەرووی تێپەڕ نەکردووە.

گەیشتن بەوپەڕی هەر یەک لەو سەرەباسانە ماندووبوون و کات و خوێندنەوە و پشکنین و وەزعی زیهنی و نەفسی ئەوتۆی دەوێ هیچی بۆ ئێستاکەی من بەردەست نیە. ڕێکوپێکی نووسین بەندە بەو هەموو مەرجانە و گەلێکی دیکەش کە ناوم بردوون. کە خەریک بم نووسینەکەم لە هەموو ڕوییەکەوە تەواو بێ تا ئەو مەرجانە پێک دێنم و کەرەستەی پێویست کۆ دەکەمەوە و تحقیقاتی ئەستەمبوڵ و باڵەکایەتی و کوردستانی ئێران دەگەیەنمە کۆتایی، عومرێکی درێژم پێ دەوێ. بۆیە چارم ناچار بوو یا دەبوا واز بێنم لە نووسین یا چاو بپۆشم لە کەموکوڕیی و ڕازی بم بەوەی کە هەیە وەلەو کەمیش بێ. خۆ دیارە وازهێنان جێگەی کەموکوڕی پڕ ناکاتەوە، بە پێچەوانە دەبێتە زیادبوونی کەموکوڕی، بەو مانایە کە نووسین لە ناوبردنی ئەوەندە مەعلووماتیشە کە لەبەردەستدایە. کەواتە عەرەب گوتەنی «ما لا یدرک کله لا یترک کله او جله» ئەوەندەی لە ئیمکاندایە دەور و پشتی باسەکان دەدەین. ناتەواوی نە زەرەر لە کەس دەدا، نە ڕێگەی تەواو کردن لە خۆم و لە کەسیش دەبڕێتەوە.

سەرەڕای ئەو بەرهەڵستانە ڕەنگە نووسینی تێروپڕ وەزعێکی سیاسی هێمنتر و لە بارتری بوێ لە هی ئێستاکەمان تا خامە سڵ نەکا لە ترسی توورە کردن و وروژاندنی ئەم لایەنە و ئەو لایەنە. ئێمەی ڕۆژهەڵاتی لە خۆشترین هەڵکەوتدا توندوتیژین. دەبێ لە حاڵی نارەحەتی و تەنگژەدا چۆن بین.

جا کە نووسینەکەم دەخوێنیەوە لەبەر تیشکی ئەم تێبینییانەدا بیخوێنەوە. دوای ئەم عوزرخوازییە لە منەوە و قبووڵ کردنی لە تۆوە، فەرمووو لە ڕێبازێکەوە کە بە دوو دەستەچیلەی ڕاستی و سۆز ڕوون کرابێتەوە کە هەنگاو هەڵێنین بۆ ناو بەهەشتی باسی حاجی قادر.

**حاجی قادر**

چەند کەسانێک هەن لە مێژووی کۆن و نوێی ئادەمزاد هەر کە ویستبێتم زمانی خامەیان بۆ بە دەنگ بێنم، ئەو شعوورە گرتوومیەوە کە گیانی ئەرکێک دەگرێتەوە لە میحرابی پەرستندا وەستابێ. لەودیو پەردەی و جوودی زیندەگانییەوە، لە مەڵبەندی سەرابی و تەماوی مەرگەوە، ئاورینگی خەیاڵی چاو خێرەکەر وەک تیشکی بەیانیان کە لە شەبەقی فەجرەوە باڵی فرەوانی سەر تاسەر ئاسۆی مەشریق دەگرێتەوە، بەو جۆرە دەکشێ بەسەر هەست و زانینم تا دەڵێم ڕۆشنایی ئیدراکم کز کز غەرقی ئەو دەریای نوورە بوو، لە ناو شەپۆلە تریفەدار و سامناکەکانی پەیدەرپەیدا نابوود بوو شەوقێکی خۆنیشاندەری نەما. تەکان دەدەم ڕشتەی فکرم سەر وەدەرنێ لە بن شەپۆلی نوورین و چاوێکی تەماشا و سرنجی هەڵێنێ، زەحمەتیی تەقەللا و تۆفانی مەوج دەرفەت نادەن و فکرم ئەسیری ئەو تەلیسمە نوورێنە و دەریایە بە لوورینە دەمێنێتەوە وەک لەککە لە ڕووی ڕۆژ. بە پێدزیلکەی ئاهیستە پەنای ئیدراکم دەبەمە بەر نوایێکی کەناری ئەو دەریایە تریفەدارە بۆ لەحزەیێک دیدەی نیوە خنکاومی لێ دەتروکێنم کەچی هەیهات.

کەعبە ئیشراقی وەکوو خورشید و من چاوم خەفیف لێم بووە ڕەوشەن کە بوعدی قوربی بوعدە بۆم. ناچار بە کوتەکوتی شەوکوێرانە و ترسی سەرەوبنبوون لێرە گەوهەرێک و لەوێ دەسکێک لە ڕەنگەکانی قوزەح و لەو لا چەپکێک لە گوڵی ئەفسووناوی و کۆشێک لە میوەی گیا پاکان بە شەرمەوە کۆ دەکەمەوە تا بیانکەم بەدیاری ناچاری لە مەلووکەتی عەدەمەوە بۆ دونیای ناسووت.

هۆی شەرم و شکۆی تەقدیسکارانەم بەرانبەر ئەو کەسانە پاکی و گەورەییانە. بە هەر مقیاسێکی وردی هونەرکێش و جەوهەرپێو ڕەوشت و کردەوە و ئەخلاقیان قیاس دەکەم سەنگ و نرخیان لە وزەی ئەندازەکێشان دەردەچێ.

- ڕاستگۆیی
- فیداکاری بۆ باوەڕی ئینسانانە
- خۆ بەخت کردن لە پێناو غەیر
- خۆ لە بیر کردن
- نەبوونی ئامانجی شەخسی لە کردەوەدا
- ئازایی لە پێهەڵسان بە واجیب
- گەردەن فیرازی لە عاست ترس و تەماع
- ئەمانە و ڕەوشتی ئەوتۆیی دروشمی گەورەیی ڕاستەقینەن.
- من چ بکەم لە قوماندانێک بەهۆی لەشکری زۆرەوە سەد وڵاتی کاو کردبێ!
- چیمە کە پاڵەوانی نەترساو بۆ ئارەزۆی نەفسی خۆی قەڵاتی لە کەللەی بەشەر دروست کردبێ!
- چیم بەسەر قاروونەوەیە لە ڕێی دەستبڕین و فەند و فێڵەوە باری هەزار حوشتر زێڕ و ئەڵماسی کۆمەڵ کردبێ!
- خەفرەع و خۆفۆم بۆ چیە بە زەبری قەمچی هەڕەمی سەرسووڕێنیان بنیاد نابێ!
- بە من چی سیاسیێک بەسەر کەلەشی هاوڕێکانیدا گەیێشتبێتە پۆپی هەرە بەرزی دەسەڵاتی.
- فێڵبازێک خۆ دەکاتەوە معبودی میللەتەکەی... چش.

زاڵم و زۆردار و خوێنڕێژ مێژوو دەهەژێنن و دونیا دەشڵەقێنن. ئەمانە هەموویان گورگ و دڕندەن. دوشمنی ئادەمزادن. گەورەی چەنگاڵ و ددانن. خوێنی خەڵق لە شادەماریان فڕکەی دێ. ئەمانە وەک شەمشەوەکوێرە لە تاریکەشەوی مێشکی من

و تۆدا پەرواز دەکەن. هەر چاومان هەڵێنین دەڕمێن. ئەمانە لەبەر بچووکی ئێمە زلن. ئەو لەحزەی من و تۆ خۆ بە کەم نەگرین دەبنە هیچ.

من و تۆ خەڵقمان بۆ کوشتوون، هەڕەممان بۆ کردوون... بۆیان کۆشاوین و جەنگاوین... پشتمان بۆ قەمچێکەیان چەماندۆتەوە... عەبدایەتیی من و تۆ کردوونی بە عفریتی تەئریخ.  مەڵێ خۆفۆ و قاروونم بە گەورە قبووڵ نەکردوون... مەلعوونی وەک ئەوان ئێستەش دەپەرسترێن.

تا گەورەییێکی درۆزن دەردەکەوێ دوو سێیەکی تازە دەبنە گەورە. کوردی قسەییێکی هەیە دەڵێ ئۆباڵی خۆت بە ئەستۆی خۆت. من و تۆش لە پەرستنی بووتی ڕووح لەبەردا ئۆباڵمان بە ئەستۆی خۆمان. سەدجار عوزری ئەوە بێنینەوە کە تێنەگەیشتین هۆی بووت پەرستییە، عوزری وا دادمان نادا. کە تێنەگەیشتوو بووین بە عوزر و بێ عوزر دەبینە خزمەتکار و مەڕ و باربەر...

حورمەت و ماف لە خۆوە بەرەو پیرت نایەن. پایەییێک هەیە لە هۆشیاری و ئازایەتی کە لەوە ژێرکەوتی نە حورمەتت دەبێ نە ماف. ئەگەر یەکێک پایەی لێ نای وەیا مافی پێ دای لە چاکەی خۆیەتی... خێرت پێ دەکا. پیاو بە و حورمەتی خۆت بسەپێنە و مافی خۆت بپارێزە. مەبە نۆکەری درۆزن و فێڵبازان.

لەبیرت نەچێ کورد دەڵێ کە جارێکت فێڵ لێ کردم خوا بتگرێ... کە دوو جارت فێڵ لێ کردم خوا بمگرێ. خۆت مەکە بە کێڵگەی تەجرەبە بۆ تەماعکار... تەماعی ماڵ بێ یا هی شۆرەت یا هی دەسەڵات. کە تێت ڕاخوڕن و بڵێی بەڵێ بەچاوان حەقی ئەوەت نامێنێ گلەیی لەم و لەو بکەی. بۆ خۆت ئامادەی ببی بە نۆکەر. کە ماڵت بخۆن و دەنگ نەکەی، دیارە ماڵەکە بە هی خۆت نازانی دەنا بۆ دەنگ ناکەی؟ دەڵێی تەنهام... ! نەخێر ڕاست ناکەی تۆ تەنهانی... تۆ زوربەی میللەتی... دەڵێی ماڵخۆرەکە چەکی هەیە؟ خۆ تۆ وەیا وەک هی تۆ چەکی بۆ هەڵگرتوە. هەر خۆت چەک هەڵدەگری بۆ زۆردارێکی دیکە دژی ڕووتەییێکی وەک خۆت. گوتم ڕووتە!! ڕووتە چی؟ کێ بێ لە نووسیندا ئاخاوتنی لەگەڵ بکرێ، خوێندەوار و خاوەن شەهادە نەبێ؟ تۆ کە ئەم قسانە بخوێنیتەوە یەکێکی لە بەرەی مومتازی ئەم میللەتە...

تو خوا شەرم مەکە و بڵێ چەند جاران ویژدانی خۆت ورتەت لێ بڕیوە وکاری ئەوتۆت کردوە، دەروێشی جەزبەدار وەیا بوتپەرست نەبێ نایکا؟ زۆرم دیوی بەرانبەر بوتێکی فێڵباز دەمەبەشکەت گەیشتۆتێ. وەی حەزم دەکرد کۆڵە مستێکی دڵسۆزانە لە بەری چەناگەت دەمەبەشکەی نەهێشتبای! براکەم، خۆشەویستەکەم هەمووی دونیای درۆزنان و فێڵبازان و بوت و سەنەمان یەک دانە تۆوی گەورەیی و یەک زەڕڕە جەوهەری مرۆڤایەتی تێدا نیە... هەر نمایشێکی تێیدا دەکرێ و چەپڵەڕێزانێکی بەرپا دەبێ لە حیلەگەریی «معبود»ـە کە و سادەیی و ترسنۆکیی بوتپەرستەکانەوەیە. ڕاستییش بە چەشمەبەندێ ناگۆڕێ، ڕەش بە قسە سپی نابێ. سەد ئەوەندە ئاهەنگی تقدیس بگەڕێ لە مەیدانی سافیلکاندا بۆ هەڵدانەوەی پاڵەوانی درۆزن، حەقیقەتی گەورەیی هەر دەمینێتەوە بۆ ئەو ڕەوشتانە کە لە پێشەوەی گوتم دروشمی گەورەیین. گەورەیی لەسەر حیسابی خەڵق و بەهۆی فەند و فێڵ و ساختەگەریی جەردەییە.

بەو مقیاسەی ڕاستگۆیی و فیداکاری و خۆبەخت کردن و نەویستنی سوودی شەخسی، حاجی قادر یەکێکە لە مرۆڤە هەرە زلەکانی سەردەمی نوێ.  حاجی قادر ڕاستگۆی مەحزە. پەیکەری خۆبەخت کردنە، نموونەی زوهدە، سەردەفتەری گەردەنفیرازانە لە عاستی ترس و تەماعدا.

لەو جیهانە بەرینەی پڕ لە ئەسبابی لەززەت و شەهوەتەدا، حاجی قادر بایی سەرەدەرزییەک ئومێدی خۆشی و حەزی جاهـ و شکۆهی نەبووە... نەک نەیتوانیوە هەیبێ... بە دڵی خۆی تەڵاقی داون، وازی لێ هێناون لە پێناوی ئەو شتانەی وان لە نوقتەی بەرانبەریان کە خۆنەویستی و عشقی میللەت و سەودای نیشتمانپەروەرییە.

وەک بێی کاسەی پڕ لە شەرابت بەتاڵ کەی و پڕی کەیەوە لە ژیلەمۆ، حاجی قادریش بەپێی داخوازیی ئەو واجیبەی خستۆتە ئەستۆی خۆیەوە، دوا دڵۆپی حەزی دارایی و کاخنیشتنی و ئاوریشمپۆشی لە دڵی خۆی تکاندوە لە جێی ئەواندا دەستەچیلە حەق پەرستی و وەتەن خواهیی و میللەت هەڵکردوە و خۆی پێ ڕوون کردۆتەوە و بۆی سووتاوە.

ئەم کارەی دڵ و دەروون و مێشک پاک کردنەوەیشی کارێکی تەواو بێ کەم و کەسری و سەد لە سەد بوە... چی دیکە بە بەرەوە نەماوە.

لەو هەموو پەیوەندییانەی خەڵق دەبەستێتەوە بە دونیا و جموجووڵیان پێ دەکا وەک پوورەهەنگ، حاجی قادر لە تاکە یەک پەیوەندیی زیاتر بە دونیاوەی نەبوە، ئەویش پەیوەندیی خولیای وەتەنپەروەرییە لە هەموو ڕووییێکەوە: خۆشویستنی خاکی کوردستان و خەڵقی کوردستان و زامنی کورد و مێژووی کورد و مافی کورد هەموو شتێکی کورد. حاجی کە دەڵێ:

هەر منم ئێستە وارسی عیسا
بێ کوڕ و ماڵ و بێ ژن و مەئوا

ئەگەر بۆ مەبەسی «مفارەقە«شی بێ بە ڕێکەوت تەرجەمەی ڕاست و ڕەوانی حاڵی کردوە، تەنانەت ئەوەندە ڕاستە دەتوانین هەندێکیشی لێ زیاد کەین و بڵێین لەگەڵ نەبوونی کوڕ و ماڵ و ژن و مەئوادا حەزی پەیدا کردینشیانی گۆڕیوەتەوە بە حوببی وەتەن تا وای لێ هاتوە بە غەیری سورەتی کاڵا و باڵای کوردەواری لە سەفحەی گیانی... لە پەڕەی دڵی... لە پەردەی وەهم و خەیاڵی... لە لەوحی خەون و بە خەبەریی ئەودا نەک هیچ سوورەت بەڵکوو تارمایی سوورەتیش بەبوە. «لیس في الدار غیره دیار».

لەو کارەی خۆنەویستییە و خۆبەخت کردنە و خۆ لەبیرچوونەدا حاجی قادر شەقڵێکی ئەوتۆی لە خەرمەنی شەرافەت داوە، بە کەس نەشکێ.

سەخاوەتت دەوێ؟ خزمەتی بێ مزەیە سەخاوەت.

وەتەنپەروەریی ڕاستت گەرەکە؟ خەباتی بێ ئامانجی شەخسییە.
خۆ سووتاندن بو ڕووناک کردنەوەی غەیر دڵسۆزیی تەواوە.

خولاسە بەخۆ وێران و نەفس بەزاندن پاڵەوانییە، گەورەییە. خۆ ئەگەر بە پاڵ ئەمەدا و لەگەڵ ئەمەدا سوودی میللەت و ئازادی نیشتمان و وەدەستهێنانی مافی نەتەوایەتیی و بەرز کردنەوەی ناو و حورمەتی خاک و گەل هەندەر بێ بۆ ئەو خۆنەویستییە، ئیتر تێکڕای ئەم کارە، کاری فریشتەیە سەرەڕای پاڵەوانەتی و قارەمانەتی.

بەو مقیاسە حاجی قادر پلەیێکی گەورەیی نەهێشتۆتەوە لێی سەرنەکەوتبێ. تا لەو هەموو پلانەش سەرکەوتووە هەرچی حەزی شکۆ و جاهـ و سامان و دەسەڵات و سوودی ماددی بوە لە ژێر پێی خۆی داناوە. بەوە نەبا لەو پلانە سەر نەدەکەوت.

هاوچەرخانی حاجی، ئەوەی ناو و دەسەڵاتێکی بوە خۆی هەڵکوتاوە بۆ ئەستەمبوڵ، ناوچەی خەلافەت، تا زۆروکەم شتێک زیاد کا لە پایە و دەسەڵات و دارایی خۆی. لەمەدا کەسیش عەیبی لێ نەگرتوە و لەوسەر کە هاتۆتەوە بۆ شارەکەی بە خۆ و بە ڕوتبە و نیشانی تازەیەوە هەموو کەس ڕێزی زیادی لێ ناوە و بۆ ڕوتبەی دەستەونەزەر وەستاون. خۆ ئەگەر حاجیش کارێکی وای کردبا و ڕوتبەیێکی وەرگرتبا لێی بە عەیب نەدەگیرا، ئەوڕۆش لێی بە عەیب ناگیرێ. بە تورک و عەرەب و بولغار و ئەرنەهووتەوە، بە پاشا و بەگ و والی و مەلا و شێخ و توجار و ئاغاوە ئاستان بۆسی «عبدالحمید خان وسلطان رشاد» یان بەلاوە ئەوپەڕیی گەورەیی و شانازیی بوو، ناوی کرێکار و فەللاح و عەتار و بەقاڵ ناهێنین چونکە ئەم هەژارانە لە وەزعێک نەبوون ئەوسا خەون بەو شەرەفەوە ببینن، وەک ئێستا، ئاواتیان لە گەیشتن بە قایمقامێک یا «متصرف»ێک تێپەڕی نەدەکرد.

ئەمەیە واقیعی بێ درۆی سەردەمی حاجی قادر. دەوجا کە حاڵ ئەمە بێ و کە نێوان گروهی سەرامەدانی ئەوساکەدا پێشبڕکێ لە یەکدی کردن مەودای تەسک دەکردنەوە لە گەیشتن بە پابۆسیی «خەلیفە» شەخسی حاجی قادری خاوەند کەرەستەی ئەدەبی خۆ ڕەپێش کردن و خامەی تیژ و فکری تێر و تەژی، لە هەمان کاتیشدا بێ پارە و پوول، لەجیاتی مەدح و تەقدیسی خەلیفە بەوپەڕی سادەییەوە بڵێ:

ئەمە کەر میزە دەڵێن وارسی شەرعی نەبەویین
هەموو عەبدی سەنەمن باسی مەکە گەورەکەیان

لەتەک ئەمەدا هەڵبەست بنووسێ لە مەدحی «عەلی بەردەشانی» کە شایەرێکی مردووی لاتی کوردە. ئا ئەم حاجی قادرە دەبێ حیسابێکی تایبەتی بۆ بکرێ لە ژووروی حیسابی گەورە و قارەمان و فریشتە کە ناویان بەسەر زمانەوەیە. دەبێ وەک بۆ کارێکی مقدس دەکرێ، بۆ نووسین لە بارەی حاجییەوە دەستنووێژێکی

پێشەکی بشۆرێ و تۆبە و استغفار بکرێ. دەبێ ئەو زمانە لاڵ بێ لە عاست حاجیدا بە خواری بگەڕێ. دەبێ ئەو پەنجەیە بشکێ و ڕیسوا بێ لەبارەی حاجییەوە بە بێ ئەدەبی شت بنووسێ. دەبێ میللەت شەرم بکاتەوە لە خۆی کە هۆشی بەوە نەشکێ قەرزی حاجی بداتەوە و چاکەی بکاتەوە.

کورد دەڵێ دار پیر دەبێ جارێک بازی لێ دەنیشێ. دەیانساڵیش تێپەڕ دەبێ تا میللەت یەکێکی وەک حاجی بەرهەم دێنێ یا نایەنێ. بەقەدەر گەورەیی حاجی عەیبی میللەتەکەی ناقۆڵا دەنوێنێ لە کەمتەرخەمی دەربارەی یاد و ناو و نیشانی. ئەو کەمتەرخەمییە لە ڕووی تێنەگەشتنەوە بێ یا لە ڕووی خۆ بەسەهوو بردنەوە بێ فەرقێکی ئەوتۆی نیە، چونکە بە ڕادەی خۆ بە سەهوو بردن تێنەگەشتنیش لە چشتی ئاشکرا عەیبە بۆ میللەت. چۆن ڕەوایە خەڵق بزانێ فلانە ئالاشڕ وا بەسەر قەبری دەروێش فلان و سۆفی فستانەوەیە و زیارەتی بکا و خۆ لە بەردەکانی هەڵسوێ، بەڵام نەزانێ فریشتەییێکی وەک حاجی لە جەرگەی جەرگییەوە پێ گەییوە و تێگەییوە و پێیدا هەڵگوتوە و بۆی تلاوەتەوە و جانفدانی بۆ کردوە تا ناوی بەرز کاتەوە و مافی بپارێزێ؟

لە فەرزی بڵێین زوربەی میللەت لە خۆوە پیاوی وەک حاجی ناناسێ لەبەر ئەم هۆیە و ئەو هۆیە کەوا بەلای منەوە مەرفووزن و هیچیان تەبریری نانکوێری و بێوەفایی ناکەن. خۆ خوێندەوار و نووسەر و ڕابەری فیکری ئەو چوارییێکە عوزرەشیان نیە کە بڵێین زوربەی میللەت هەیەتی. بۆ دەبێ ئەدیبێکی کورد خۆ خەریک نەکا بە حاجی قادرەوە وەک خەریک دەبێ بە پۆڵ ڕۆبنەوە؟ ڕۆبن و مرۆڤەی وەک ئەو هێندە خەڵقیان پێوە خەریکە لزووم بەوە نەهێڵێ کوردی قوڕبەسەر لوقمەی دەمی خۆیان بۆ بکا بە خێر و سەدەقە. حاجی قادریش لە گوێرەی نرخی ڕاستەقینەی خۆی ئەوەندە فەرامۆش کراوە کە ببێتە عەیب، ئەگەر ئەڵێم توهمە، بۆ ئەدیبانی کورد و بە دوای ئەواندا بو هەموو میللەتی کورد.

ئومێد دەکەم بۆت بەیان کەم لەم نووسینەدا حاجی قادر چەند پشت گوێ خراوە... چەند نەناسراوە... واجیبی ناسین و ڕێز لێگرتنی حاجی و ئەمساڵی حاجی وەک «فرض الکفایة» وایە، تەرک کردنی دەبێتە گوناهـ و جێی نەنگ و تەعنە بۆ هەموو کەس زانا بێ یا نەزان. دیارە ئەگەر ئەدیبانی کورد بەو واجیبە هەڵستن میللەتەکەش لە عەیبی نانکوێری و کەمتەرخەمی ڕزگار دەبێ چونکە هەڵبەت

ئەوانیش بە هۆی ئەدیبەکانەوە لە ڕێی بیستن و دیتن لەوانەوە ئاشنای حاجی و ئەمسالّی حاجی دەبن و گیانی میللیان بە ناسینی ئەو ڕۆڵە دڵسۆزانەیان هێژاتر و دەولەمەندتر دەبێ.

حەیفە شەوقی مەشخەڵی ئەدەب و خەباتی حاجی کز بێتەوە لەو دیو پەردەی نەزانین نەناسین. خۆ زیانێکیش بکەوێ بەهۆی ئەو نەزانین و نەناسینەوە لە خەڵقەکە دەکەوێ. حاجی هەموو عومری بەقەدەر دەنکی کونجی سوودی وەرنەگرت لە کردنەوەی خۆی. دوای مەرگی ئەگەر هەموو جیهانیشی بۆ بکەی بە تەبەقە چێشتێک و لای قەبرەکەیەوە دای نێی لێوی لێ چەور ناکا. تازە فۆتانی ناو و شۆرەت و ئەدەبی ناتوانێ زەرەر بەو بگەیەنێ، ئەوێک کە دەست لە جیهان بڕیاو بوو.

حاجی لە حاڵی ژیانیدا تەمای بە هیچ شتێک نەبوو بۆ شەخسی خۆی. هەموو ژیان و گیان بۆ کورد و کوردستان بوو. دەبێ کورد و کوردستانیش هەندەی لە باراندا ببێ ئەو ژیان و گیانە لە بیر نەکا هەر نەبێ بۆ سوودی خۆی.

دەوجا لە ڕووی وەفاداری بۆ ڕۆحی حاجی و بەهیوای ئەوە سوودێک وەرگرین لە ژیانی، پڕ بەو سوود وەرگرتنەمان ڕۆحی بحەسێنێتەوە، لە ڕێبازێکی ڕاست و بێفێڵەوە کە ئەوی لێ ڕازی بێ و لە ڕاستی و سۆز و خۆبەخت کردنی ئەو بوەشێتەوە وردە وردە پێ هەڵێنین و لە مەڵبەندی منداڵیی حاجیەوە تێکەین با پەنایی و هەوراز و نشێوی عومریدا گوزەر کەین تا ئەو ئاسۆیە بەرزەی کە دوا تیشکی ژیانی لێوە ئاوابوو... دڵ نەگۆڕین بۆ هەوەس، خامە خوار نەکەینەوە بۆ مەبەس، شوعلەی حەقیقەتپەرستی تاکە چراییک بێ شوێن هەنگاومانی پێ ڕوون کەینەوە، لە ژێر دروشمی سۆز و پەرۆش بۆ دەرخستنی ڕاستی.

**حاجی قادر کێیە؟**

ڕەنگە لە ژێر ئەو سەرە باسەدا ڕازێک ئاشکرا بێ کەم کەس زانیبێتی. بە ناوی «حاجی قادر» نەک یەک شاعیر بەڵکوو دوو شاعیر هەبوون، یەکێکیان ئەو حاجی قادرەی مەشهووری ئافاق، ئەوی دیکەیان شاعیرێکی ئاسایی وەک گەلێ لە شاعیرانی کوردزمان بەڵام نە ناوی ماوە نە نیشان، نە کەسیش شیعرێک لە هەڵبەستی ئەو دەڵێتەوە. لەبەر پرشنگی چاو خێرەکەری حاجی قادری کۆیی هەر دەڵێی ئەستێرەییێکە و لە شەوقی ڕۆژدا ون بووە.

حاجی قادری بێ ناو و نیشان بە سەر زاری هەندێ کەسی باخەبەرەوە باسی هەبوە و ناوی خوێندراوەتەوە بەڵام بە مردنیان شوێنەواری یەکجارەکی کوێربۆتەوە. کە دەڵێم یەکجارەکی، بۆیەیە لە هیچ لایێکەوە باسی نابیێم و چ خەبەرێکی ناگوترێتەوە.

یەک لەو کەسانەی بارەها ناوی ئەم شاعیرەی دەبرد و باسی دەهێنا ناوەوە و بەبیر خەڵقی دەهێنایەوە خوالێخۆش بووی حاجی مەلا کەریمی کۆیی بوو کە ساڵانی دوایی عومری بە دەرس گوتنەوە لە هەولێری ڕابورد و بەینێکیشە هەر لەوێ گیانی سپارد و نێژرا. گێڕانەوەی حاجی مەلا کەریم دەنگێکی نەدایەوە. ڕەنگە هۆی دەنگ نەدانەوەی ئەمە بێ کەسانێکی قسەکەیان دەبیست خەریکی نووسین و تەحقیقاتی ئەدەبی و مێژوویی نەدەبوون تاکوو لە ڕێی نووسینەوە و دووبارە کردنەوەی ببێتە خەبەرێکی زیندوو. بۆیە لەگەڵ تێپەڕینی کات وەک مردووی لێ هات.

ڕیوایەتەکەی حاجی مەلا کەریم بۆ خۆی بەسە بۆ سەلماندنی بوونی دوو حاجی قادر، چونکە ئەوەی ئەم مرۆڤەی ناسیبێ گومان لە ڕاستگۆیی ناکا. بەڵام جگە لە ڕاستگۆیی ئەو، دیوانەکەی حاجی قادریش شاهیدێکی تێدایە پاڵپشتی و ئیسپاتی قسەکە دەکا. سەیرێکی لاپەڕە 111 ی دیوانەکەی حاجی قادر بکە (چاپی هەولێر 1969) لە زیمنی ژماردنی شوعەرای کورد بە دوا گەلێک ناودا ئەم چەند بەیتە دەخوێنییەوە:

دوو عەلین شاعیرن وەکوو حەسان
بەردەشان و هەریرە مەسکەنیان

یەکی هاوتایی خۆمە خۆم دیبووم
شێخ وەسانی بوو پیاوێکی مەعلووم

وەکوو من بوو بە ظاهری جاهیل
باطینەن شاعیرێکی زۆر کامیل

ئەو چەند فەردەم نووسیوە بەو شکڵە کە لە دیوانەکەدا چاپ کراوە. ئاگاداری ئەوە بە تا وەزنی ڕێک بێ دەبێ وشەی «حەسان» بەگوشینی پیتی «س»ـەکە بخوێنینەوە کە حەقیقەتیشی هەر وایە «حسان». دەبێ بشخوێنیەوە «پیاوەکی مەعلووم» نەک «پیاوێکی مەعلووم» تاکوو لە نیوەلەنگی ڕزگار بێ. زاتەن کۆیی بەعادەت دەڵێن پیاوەک، دارەک، بەردەک. بۆ لاسایی کرنەوە وەیا ئارایشتی قسە نەبێ جۆرێکی دیکە ناڵێن. حاجیش کۆیی بووە، دیارە بێ لزووم لە لەهجەی کۆیی لانادا بۆ لەهجەیێکی دیکە بە تایبەتی کە بەو لادانە وەزنی هەڵبەستەکەی لەنگ بێ.

با بێینە سەر مەبحەس. دیققەتێکی کەم دەریدەخا بەیتی یەکەم بە هەردوو کەرتییەوە لە باسی «عەلی بەردەشانی» و «حەریری» دەبێتەوە.

دوو عەلین شاعیرن وەکوو «حسان»
بەردەشان و حەریرە مەسکەنیان

ئەم بەیتە ناو و جێگە و مەرتەبەی شاعیرییان بە تەواوی دەردەبڕێ. بە دوا ئەو بەیتەدا کە دەڵێ:

یەکی هاوتایی خۆمە خۆم دیبووم
شێخ وەسانی بوو پیاوەکی مەعلووم

شاعیرێکی نوێی مەبەسە کە لێرە بە پێشەوە باسی نە کردووە. ئیمکان نیە لەم بەیتەدا هیچ یەک لەو دوو عەلییانەی مەقسەد بێ چونکە دیارە هیچ کامێکیان «شێخ وەسانی» نین، یەکیان بەردەشانی ئەو دیکەیان حەریرییە. سەرەڕای ئەمە، هەردوو عەلی پێش حاجی ژیاون و مردوون ناشێ بڵێ، «خۆم دیبووم» چونکە نەیدیوون. ئەم شەرحەم دا چونکە بەلای هەندێ کەس، کە پەلە دەکەن لە وەرگرتنی واتای شیعر، مەبەسی حاجی لەو بەیتەدا یەکێکە لە دوو «عەلی»یەکە.

سەر لەنوێ دیققەت بگرە لە ڕستەی «هاوتایی خۆمە» وەک چاپکراوە لە دیوانەکەدا دەبینی کەموزۆر واتایەک بە دەستەوە نادا کە ناوی شاعیرەکە ڕاگەیەنێ.

کەچی دەزانین حاجی قادر لەو برِە شیعرەدا ناوی شاعیرانی کورد تۆمار دەکا تاکوو ناو و نیشانیان ون نەبێ، لەبەر ئەمە دەبێ ڕستەکە ئەم مەبەسە بە دەستەوە بدا: دەبێ ناوی شاعیرەکە لەو بەیتەدا دەرکەوێ. کە ئەم مەبەسە دەرکەوتنی ناوی شاعیر بکەین بە چرا و بەیتەکەی پێ ڕوون کەینەوە بێ ماندووبوونێکی زۆر دەگەین بەو ئەنجامە کە بە ئەسڵ دەبێ بەیتەکە جۆرێکی دیکە بووبێ و لە نووسینەوەی دەستاودەست گۆڕانی بەسەردا هاتبێ. ڕیوایەتەکەی مەلا کەریم لێرەدا یارمەتییمان دەدا وەک کلیلێک کە دەرگەمان بۆ بکاتەوە، چونکە دەرحاڵ زیهنمان بۆ ئەوە دەبا بەیتەکە دەبێ بەم جۆرە بووبێ:

یەکی هاوناوی خۆمە خۆم دیبووم
شێخ وەسانی بوو...

وشەی هاوناو ڕاستەوخۆ ناوی شاعیرەکەمان بۆ دەڵێ کە دەکا «حاجی قادر». زۆر شاعیرانە و هونەرکارانە حاجی قادر ناوی ئەم شاعیرەمان بۆ دێنێتە ڕیزی ناو شاعیرانی کوردەوە. بەم وشەی هاوناو سەرەڕای بە دەستەوەدانی ناوی شاعیر، خۆی لە ناقۆڵایی دووبارە کردنەوەی ناوی خۆیشی ڕزگار کردوە، نیشانێکی تریشی پێ ئەنگاوتوە لەوەدا «هاوناو» نەک یەک شاعیر بەڵکوو دوو شاعیر تۆمار دەکا واتە حاجی قادر بەوپەڕی ئەدەبی تەعبیرەوە ناوی خۆیشی خستە لیستەی شاعیرانی کوردەوە بێ ئەوە لێی بگیرێ کە خۆ نواندنێکی کردبێ.

بەپێی لێکدانەوەی خۆم وا دەزانم بە ئەسڵ حاجی قادر نووسیبێتی «یەکی همنامی خۆمە» بەپێی دەستووری نووسینی ئەوسا. لە نووسینەکەدا هەوەڵ جار بە هەڵە بۆتە همتایی خۆمە، بەو دواییە کە مەیل پەیدا بووە بۆگۆڕینی وشەی نیمچە فارسی بە وشەی کوردیی پەتی، کراوە بە «هاوتا».

هەڵەی وەها لە نووسینەوەدا بە زۆری دێتە بەرچاو. من بۆ خۆم گەلێ جار کە بە نووسینەوەمدا دەچمەوە چەندین هەڵە ڕاست دەکەمەوە، چەندێکی دیکەش بۆ دوەم جار پێداچونەوە دەمێنێتەوە، هەندێکیش هەر ڕاست ناکرێتەوە. وا دەزانم ساغ کردنەوەی وشەی «هاوتا» لەوە زیاتری پێ ناوێ، دەنا هەڵدەگرێ قسەی دیکەشی بەدوادا بێ. بەڵام بەهەمەحاڵ لەوەندە تەواو نابێ... هەویرەکە پتر ئاو دەخوا.

دوای نەهێشتنی ئیشکاڵی وشەیی (لفظی) ئیشکالێکی مەوزووعیمان دێتە پێش. تۆ بڵێی هەندێک لە شیعری حاجی قادری «شێخ وەسانی» نەچووبێتەوە دیوانەکەی حاجی قادری«کۆیی»یەوە؟ حاجی شێخ وەسانی دیوانێکی شیعری نیە مانیعی ئەم تێکەڵییە بێ، بەو مانایە ئەگەر دیوانی هەبا شیعرەکانی کۆ دەکردنەوە و نەی دەهێشت بەم لاو بەو لادا بپرژێن. ئەوساش ئیمکان هەر دەما شیعری یەکێکیان بچێتە دیوانی ئەوی دیکە بەڵام لە پەراوێزێکی زۆر تەسکتردا. ئەگەر بڵێین وا حاجی کۆیی دیوانی هەیە و لە لای خۆیەوە ساغی کردۆتەوە کە خۆی خاوەنی ئەو شیعرانەیە کە لە دیوانەکەیدا هەن، ئەو تەگەرەمان تووش دێ کە دیوانی حاجی قادری کۆیی بە شێوەیێکی گرد و کۆ لە حاجییەوە بە دەستمان نەگەیشتوە، بە هەوڵ و کۆششی ئەوانەی چاپیان کردوە و بە دەم زمانەوە لە چاپێکەوە بۆ یەکێکی دیکە شکڵ و بارستی ئێستاکەی وەرگرتوە. هەر بۆیەیە ئەو پرسیارەم هەڵستان و کردم بە ئیشکالی مەوزووعی. حاجی قادری کۆیی لە بەیتێکی دەڵێ:

کەیفی حاجەت نیە بکەم باسی
ئەم کتێبە بخوونی دەیناسی

بەیتەکە دەلالەتێکی ئاشکرای تێدایە کە حاجی لە ژیانی خۆیدا شیعرەکانی کۆ کردۆتەوە و ڕێکوپێکی خستوون کە پێیان بڵێ «ئەم کتێبە». بە گوێرەی قسەی «هەرە گوڵ ئازیزان - جەلادەت بەدرخان» کە لە گۆڤاری «هاوار» دا نووسراوە و قسەکە لە پێشەکیی دیوانەکەی حاجی (چاپی هەولێر 1969) دا دووبارە کراوەتەوە، دیوانی حاجی 800 لاپەڕەیێک بوە کە دەکا چوار پێنج هەندی بارستی دیوانەکەی کەوا لەبەردەستاندایە. وا پێ دەچێ حاجی قادر کە دەڵێ «ئەم کتێبە بخوونی» مەبەسی ئەوە بێ دیوانەکەی وەک گوڵستانی سەعدی شیعر و نەسر بووبێ. زاتەن 800 لاپەڕە کە هەمووی شیعر بێ، سنووری بارستی هیچ دیوانێکی کوردی ناهێڵێ کە لە شاعیرەکانی کوردەوە بە ئێمە گەییوە. لەگەڵ ئەمەشدا «جەلادەت بەگ» پێی دەڵێ دیوان. لێرە بە پێشەوە کە گوتم زوربەی نووسینی حاجی لەناوچوە بەبەڵگەی قەتعی ئەم دیوانە 800 لاپەڕەییە و شادیەدییەکەی جەلادەت بەگم مەبەس بوو.

کەواتە لە حاڵێکدا دوو شاعیر یەک ناویان هەبێ و هیچ کامێکیان دیوانێکی تحقیق کراوە و بێ دەمەتەقەی نەبێ ئەو پرسیارەی کردم وەک »بدیهیە« خۆ دێنێتە ڕوو و داوای وەرامدانەوە دەکا.

پەڕینی شیعری شاعیرێک بۆ ناو دیوانی شاعیرێکی دیکە زاهیرەیێکی جیهانییە. خۆ حیکایەتی «رباعیات»ی خەیام بەڵگەیێکی مەشهوور و سەپێنەری ئەم زاهیرەیەیە. هەر «رباعیە»یێک لە دەم و دووی خەیام چووبێ خراوەتە پاڵ ڕووباعیەکانی ئەو، واش بوە هی ئەوتۆی خراوەتە پاڵ کە هەر فڕی بەسەر مەشرەبی خەیامەوە نیە ئەوەندە نەبێ کە هەڵبەستەکە چوارینەیە و لە بەحری ڕوباعیەکانی خەیام خۆیەتی. خەیامدۆستان زۆر خەریکی ئەوەن بە ئەنواعی لێکدانەوە و سرنجدان و تحقیقاتی مێژوویی و ئەدەبی دابێشتنی وەها بکەن ڕوباعی ڕەسەن لە هی چرووک جودا کاتەوە و ڕەنگە لە کۆتایی کاردا نەشگەنە ئەنجامێکی بێ گرێوگاڵ.

بەداخەوە من کەسێک ناناسم لە نەوە و خزم و هۆزی حاجی قادری شێخ وەسانی تا لەو ڕووەوە بە کاغەز بێ یا بە ڕاسپاردە تحقیقاتێکی لەگەڵ بکەم و شتێک ساغ کەمەوە وەیا سەر و سۆراغێکی شاعیرەکە خۆی وەرگرم. لەوە زیاتر کە بزانم شێخ وەسان گوندێکە لە ناوچەی بالیسانی سەر بە قەزای ڕانیە هیچ مەعلووماتێکم نیە بای تۆسقاڵێک یارمەتیم بدا. هەر چەند لە دڵمدا هەیە بەهۆی ئەو ناسیاوانەی ڕێی هاتوچۆیان هەیە بەسەر ئەو دەوروبەرەدا هەوڵی تۆژینەوەیێک بدەم لە چەندوچۆنی ئەو باسە و بوون و نەبوونی کەلەپۆرێک وەیا کەس و خزمێکی حاجی شێخ وەسانی، بەڵام بەرهەمی ئەو هەوڵدانە ئەگەر بێتە دەستیش بە فریای ئێستاکەم ناکەوێ، کوردی گوتەنی ئەم درەنگە بەم زوە ڕاناگا، بۆیە مەوزووعەکە بەو شکڵی وا ناتەواو دەخەمە ڕوو. هەرکاتێک شتێکم دەست کەوت کە ڕووناکیەک بخاتە سەر تاریکی باسەکە هەڵبەت عەرزی خوێنەری کورد دەکرێ. سوودێکی دیکەش ڕەچاو دەکرێ لەو خێرایی کردنەم لەو ڕەوەوە بۆ تۆژینەوە و پشکنین و پرسین لە هەموو لایێکەوە تا ئەگەر کەسێک شتێکی سوودبەخشی دەستکەوت چ لە بارەی ڕوون کردنەوەی ژیان و شاعیریەتی حاجی قادری شێخ وەسانی چ لە باری پەڕینی شیعری ئەو بۆ ناو دیوانی حاجی قادری کۆیی یاهەر بارێکی دیکە سەر بەم باسەوە بێ بخرێتە سەر خانی ئەدەبی کوردییەوە و کەلەبەرێکی پێ بگیرێ.

بەهەمەحاڵ هیچ زەرەر بەکەس و بە چ مەوزووع ناگا لەوەی وا بە ناتەواوی باسم کرد، گریمان (فرضنا – لە سیغەی ئەمرٍۆدا دەگۆترێ «بگرە»). هەر بە ناتەواویی مایەوە و لە چ لایێکەوە دەنگێکی نەدایەوە. بەڵام کەس ڕێی ئەوەی نیە بێ بەڵگەی زۆر بەهێز لە خۆیەوە شوبهە باوێتە سەر ئەم غەزەلە و ئەو قەسیدەی حاجی قادری کۆیی لە ڕێی بوونی ئیحتیمالێکی نەزەریی کە لە حاجی شێخ وەسانییەوە هاتبێ.

جارێ لە مەعلووم مەعلوومترە هەموو ئەو شیعرانەی ناو دیوانی حاجی قادری کۆیی کە لەگەڵ کوردو کوردستان و گیانی تیشتیمانپەروەری خەریکە ماڵی حەڵاڵی بێشوبهەی خۆیەتی. بەشێکی زۆری دیکەی دیوانەکەشی دەوری مەوزووع وەیا کەسان وەیا جێگەی ئەوتۆ هەڵدێن پەیوەندییان لەگەڵ حاجییدا وەک پەیوەندی میانی نالی و «خاکوخۆڵ» وەیا شێخ ڕەزا و «تاڵەبان» ـە و زەرڕەیێک دەمەتەقەی گوماناویی هەڵناگرێ.

دوای جیا کردنەوەی ئەو دوو تەرزە هەڵبەستە چی دەمێنێتەوە لە دیوانەکەی، بە تایبەتی غەزەلەکان کە هەڵدەگرن هی ئەو بن یا هی غەیری ئەو، هەر دەبێ بە هی ئەو حیساب بکرێن تا بە جۆرێکی قەتعی و بێشوبهە خاوەنێکی تازەیان بۆ پەیدا دەبێ: لەمەشدا حاجی قادر و هەموو شاعیرێکی دیکە وەک یەک وان، هەر شیعرێک کە خاوەنێکی تازەی بە بەڵگەی بۆ پەیدا بوو لە خاوەنی کۆنی وەردەگیرێ و دەدرێ بە ماڵخۆی نوێ. ئەوجا با بێینەوە سەر ئەسڵی پرسیارەکەی کە کردمان بە عینوانی ئەم سەرە باسە و گوتمان حاجی قادر کێیە؟

**بەڕاست با بزانین حاجی قادری کۆیی کێیە؟**

هەرچەند پایەی شۆرەتی حاجی قادر ئەوەندەی بڵێی بەرزە و ناوی لەبەر گوێی هەموو کوردێک کە نەختێ ئاگاداری دونیا بێ ئاشنایە، دیسان کەم کەس هەیە لە ناوەکەی و کۆییبوونەکەی بەولاوە شتێکی ئەوتۆ بزانێ لە ئەسڵ و فەسڵ و تیرە و هۆزی. کەسێکی دیوانەکەشی خوێندبێتەوە لە چەند دێڕەکەی تەرجەمەی حاڵی بۆی ڕوون دەبێتەوە کەسوکاری بە «گۆڕە قەرەجی» مەشوورن، گۆڕە قەرەجیش گوندێکە لە ڕۆژئاوای خوارووی کۆیێ و ئێستا وێرانە. بەهۆی بەیتێکی خۆشیەوە دەزانرێ باوکی ئەحمەد و دایکی فاتێ بووە:

باوکم ئەحمەد بوو ناوی، بیرم دێ
خەڵقی لادێ بوو، دایکی من فاتێ

ئەوەی ڕاستی بێ منیش هەر هەندەم دەزانی بە دروستی و بێ گومان. هەرگیز ڕێکنەکەوت لە باوکم یا لە مامم یا ئەو کەسانەی وەک ئەون جیلێک لە حاجی نزیکتربوون تا جیلی ئێمە پرسیارێک بکەم وەرامەکەی نەختێک لە تاریکی و نەناسراوی ناونیشان و شوێنەوار و باوک و باپیرانی حاجی کەم کاتەوە. بەڵام دوای ئەمە کەوتمە سەر فکری نووسین و تۆژینەوە لە بارەی حاجی قادرەوە دەستم کرد بە پرسین و لەم و لەو و ڕاسپاردنی برادەران بۆ وەدەستهێنانی مەعلووماتی نوێ کە ڕووناکیەکی تازە باوێتە دەوروبەری گۆڕەقەرەج و ئەحمەد و فاتێ و زیاتر شارەزامان بکا بەو کێڵگە و تۆوەی حاجی قادری لێ ڕواوە.

بەخت یار بوو. دوای ماوەیێکی چەند مانگی سەرەتاتکە و قوتاغبوون لە کۆیە نامەیێک و نامیلکەیێکم بۆ هات، بوون بە بەری شیرینی ئەو چاوەنۆڕییە تاڵە. نامەکە هی برادەرێکمە کە ڕامسپاردبوو و تکام لێ کردبوو بۆم خەریک بێ، نامیلکەکەش مەبەس و سەمەرەی ئەو ڕاسپاردنەیە باس و خواسێکی بە نرخی شوێنەوار و تیرە و هۆزی حاجیمان بو دەگێڕێتەوە لەگەڵ چەند خەبەرێکی، بەنیسبەت من، نەبیستراو کە بەپێی جێگە دێنە ناو نووسینەکەمانەوە.

نامیلکەکە دەستنووسی مەلا ئەنوەری کوڕی مەلا عەبدوڵای کوڕی مەلا عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەحمەدی کوڕی موحەمەدی کوڕی مەلا ئەحمەدی

گەورەیە. ئەم مەلا ئەحمەدی گەورەیە بە پێی دەستنووسەکە باوکی باپیری حاجی قادرە. نامیلکەکە لە مەلا ئەحمەدی گەوەرەوە تا حاجی قادر و دەوروبەری مام و ئامۆزا و ئەولادیان بە چاکی ڕوون دەکاتەوە. بەکورتی دەبێتە درەختێکی خانەوادەیی لە مەلا ئەحمەدی گەورەوە سەرەوژێر دێ تاکوو ساڵی 1326 ی. ک. کە نامیلکەکەی تێدا نووسراوە.

وا لێرەدا بە پێی ڕاگەیاندنی دەستنووسەکە درەختی خانەوادەی حاجی قادر بە خۆی و خزمەکانیەوە تا سەر مەلا ئەحمەدی گەورەی دەبەینەوە بۆ ئەوە خوێنەر قسەیێکی لێرەدا دەیکەم بەراوردی بکا لەگەڵ درەختەکە و خزمایەتیی ناوخۆیی کەسانی بنەماڵەکە لەگەڵ یەکدیدا بناسێتەوە.

نووسەری ئەسڵی نامیلکە مەلا عەبدولڕەحمانە کە دەکا باپیری مەلا ئەنوەر. لە پلەی خانەوادەیی دەکەوێتە بەرانبەر حاجی قادر. هێندە هەیە خۆی لە سێیەم کوڕی مەلا ئەحمەدی گەورەوە هاتوە حاجی قادریش لە کوڕی یەکەمی، واتە کوڕە گەورەی. هەرچەندە مەلا عەبدولڕەحمان لەوە بێدەنگە داخوا ئەو لە تەمەندا نیسبەتی چۆن بوە لەگەڵ حاجی قادر بەڵام بە پێی ئەوە یانزە ساڵێک دوای مەرگی حاجی نووسراوە دەبێ لە تەمەندا حاجی گەورەتر بووبێ، چونکە چ باسێکی زێدەپیری مەلا عەبدولڕەحمان لە نامیلکەکە دیار نیە، ئەگەر هاوتەمەنی حاجی قادریش با لەو ساڵەی 1326 دا خۆی لە دەوری 87 ساڵ دەخشاند.


مەلا ئەحمەدی گەورە
مەلا ساڵح
مەلا ئەحمەد
حاجی قادر
عەبدولڕەحمان
شێخە
مولوود
ئەحمەد
محەمەد
ئەحمەد
محەمەد
مولا عەبدولڕەحمان
مەلا عەبدوڵڵا
مەلا ڕەسووڵ
عوسمان
مەلا ڕەسووڵ
ئەبوو بەکر
حاجی مستەفا
عەزیز
محەمەد
بەلقیس
ئەحمەد
عەلی

مەلا عەبدولڕەحمان گوزارشی لە پشتی کتێبێکی مزگەوت نووسیوە قسەشی لەگەڵ مەلا عەبدوڵای کوڕی خۆیەتی. بەپێی نووسینی مەلا ئەنوەر دەبێ بە بێ زیادوکەم خرابێتە ئەم نامیلکەوە کە مەلا ئەنوەر خۆی بۆ منی نووسیوەتەوە. سەرانسەری نووسینەکە ئیشارەیێک نیە بۆ ئەوە مەلا عەبدولڕەحمان حاجی قادری دیتبێ، وەک بڵێی زەمانێک کە حاجی ڕۆییوە بۆ تورکیا عەبدولڕەحمان یا لە تەمەندا گچکە بووە وەیا هێشتا نەهاتۆتە دنیا. بەمەدا جارێکی دیکەش لایەنی گەورەتری حاجی لە تەمەندا ڕوونتر دەبێتەوە، لە چل ساڵ زیاتر زەمان هەیە لە میانی چوونی حاجی بۆ ئەستەمبوڵ و نووسینەکەی مەلا عەبدولڕەحمان. دەشێ عەبدولڕەحمان لە دەوری چل ساڵی ئەمەی نووسیبێ. لە کۆتایی نووسینەکەی خەبەرێکی بەنرخ بە دەستەوە دەدا کە دەڵێ لە ساڵانە فەتاح ئەفەندی لە ئەستەمبوڵەوە باسی مەرگی حاجی قادری بۆ حاجی مەلا عەبدوڵا و خەڵقی کۆیێ هێناوە. بێگومان ئەم فەتاح ئەفەندیە هەمان کاکە فەتتاحە کە حاجی ناوی دەینێ:

شەوێ دانیشتبووم بێ شەمع و «مصباح»
ئەوتۆی هێناوە یادم کاکە فەتتاح

دوور نابینم مەرگی حاجی قادر دڵی کاکە فەتتاحی لە ئەستەمبوڵ تۆراندبێ و بەرەو وڵاتی گێڕابێتەوە، چونکە مەعلوومە ڕەفاقەتی ئەو لەگەڵ حاجی دووری کێشاوە لە ئەستەمبوڵ. وەک لێرە بە دواوە لە جێی مناسبدا لێی دەدوێین لە نووسینی ئەو «شەمع و میسباح و کاکە فەتتاح»ـەوە تا مەرگی حاجی 8-9 ساڵێکی خایاندوە. وا پێ دەچێ لەو ماوەیەدا کاکە فەتتاح لەگەڵ حاجیی بەسەری بردبێ، کە حاجی لە دونیا بۆی دەرچوە ئەویش لە ئەستەمبوڵ بۆی دەرچووبێ. وەفاداری کاری وای لێ دەوەشێتەوە.

نامیلکەکە دەڵێ «مەولوود» لە گۆڕەقەرەج کوژراوە، دوای کوژرانی ئەو، بنەماڵەکە تێکڕا گۆڕقەرەج جێ دێڵن و بڵاوەی لێ دەکەن. بەڵام لە هۆی کوشتنی مەولوود بێدەنگە. ساڵی قەومانی ئەو کارەساتەش باس ناکا. لە عاست ناوی بەشی زۆری خزمەکانی دەڵێ وا لە فڵانە دێ نیشتەجێ بوە. بۆ خۆی نیشیمەنی بووە بە دێی «قوڵ تەپە» لە دەشتی دزەییان. نامیلکەکە سەرەوژوور لە مەلا ئەحمەدی گەورە

تێ ناپەڕێنێ. لەوە زیاتر کە دەڵێ مەلا ئەحمەد لە عەشیرەتی«دەربەند» بووە لە ئەسڵ و فەسڵی نادوێ، ناشڵێ ئاخۆ مەلا ئەحمەد بۆخۆی «گۆڕقەرەج» ی بوە یاخود لە جێگەی دیکەوە بۆی هاتووە. هەر چۆنێک بێ ئەو هێندەی لەو نامیلکە وەردەگیرێ شتێکی کەم نیە و حاجی قادر لە تاریکییێکی مەیلەو تەواو دێنێتە بەر ڕووناکییێکی مەیلەو تەواو. کۆتایی نامیلکەکە بەم چەند وشەیە دێ: »عبدالله ئەوا ناوی هەموو خزم و کەسی خۆمانم بۆ نووسی لە پشتی ئەو کتابە لەساڵی 1326 هجری لە گوندی قول تەپە». بەڵام لێرەدا دەبێ ئەوە بڵێم لە خزمانی خۆی پیاو کەمن کە بەر نووسین نەکەوتوون، لە ساڵی 1326ی کۆچیدا ئەو تەمەنەیان بوە تێبخوێندرێتەوە: یەک لەوان کە خۆم ناسیومە و بە زۆری دیومە خوا لێ خۆشبووی حاجی فەقێ عەبدوڵا کە کوڕی مەلا ڕەسووڵی عوسمانی مەلا ڕەسووڵی مەلا ئەحمەدی گەورەیە. ژیان و مردنیشی هەر لە ناو دزەییان بوو. بەینێکی زۆر لە «هەڵەجە» ی شێخ مارفی شێخ کەریمی بەرزنجی وەک یەکێک لە کوڕانی شێخ مارف حیساب دەکرا، تا دوای مەرگی ناکامی شێخ عەزیزی شێخ مارف هەر لە هەڵەجە بوو. هۆی ناو نەهێنانی لە نامیلکەکەدا لە من مەعلووم نیە. خوا لە هەموویان خۆش بێ.

بەنیسبەت پەلەپەلی نووسینەکەی من دەبێ جارێ بەوەندە مەعلووماتە ڕازی بم دەربارەی ئەسڵ و خانەوادەی حاجی. بەڵام دڵ تەسکین نابێ تا نەزانرێ پێشتر لە مەلا ئەحمەدی گەورە وەزعی بنەماڵەی حاجی چۆن بوە و خەباتی هاتوچۆ و ڕاگوێستنیان لە کوێ بوە و هۆی بزووتنیان لە جێگەییێکەوە بۆ جێگەییێکی دیکە چی بوە! خاڵوانی حاجیش دەبێ بناسرێن: بەڵێ خەڵق دەڵێ و نامیلکەش دەڵێ خەڵقی «ئۆمەر گونبەد» بووە بەڵام ئەوەندە زانینە زۆرکەمە. پرسینێکی سەرپێی کە من ڕامسپارد لە خەڵقی ئۆمەر گونبەد بکرێ چ وەرامێکی دڵخۆشکەری نەهێنایەوە. کوردی گوتەنی بۆ ئەو کەسانەی پرسیارەکەیان لێ کراوە «نازانم ڕاحەتی گیانم» وەرام بوو بەڵام بۆ ئەو کەسانەی حەز بە زانینی هەموو خەبەراتی حاجی قادر دەکەن تابڵێی ئەو وەرامە گیانیان نارەحەت دەکا. با بزانین دوارۆژ چ پەیام و ڕاگەیاندنێکی پێیە.

ئێمە زۆر جاران دەگەڕێینەوە بۆ نامیلکەکە، هەر جارە بو مەبەسێک بەڵام وا ئێستا نۆرەی وەرگێڕانی ڕووپەڕەیێکی نوێ هات لە ماجەرای حاجی، با خەریک بین وەرامی پرسیاری ئەو سەرە باسە بدەینەوە.

**حاجی قادر کەی و لە کوێ هاتۆتە دونیا؟**

هەر چەند بۆ وەدەستهێنانی وەرامێکی یەکلایی لە عاست ئەو دوو پرسیارەدا کۆشام و جۆشام، نەمتوانی بگەمە ئاوات و خۆم دڵنیا کەم بە تایبەتی پرسیارەکەی ساڵی لەدایکبوونی. وەنیە شتێکی نووسراو لە حاجیەوە وە لە هاوڕێیەکی نزیکییەوە بە جێ مابێ و باسی «کەی و لەکوێ هاتنە دونیای»بکا. قسە لەم و لەو هەن دەربارەی هەردوو پرسیار یەک یەکیان ڕەت دەکاتەوە و لە ئەنجامدا نووسەر و پشکنەر ناچار دەکەن بکەویتە سەر ڕێی بەیەکدی گرتنی مێژووی بێگومان و ڕووداوی ساغ کرایەوە لەگەڵ گوتەی دەماودەم و ئەو نووسینانەی لەو گوتانەوە سەریان هەڵداوە بەڵکوو لەو ڕێبازەوە و بەهۆی تەخمین هەر نەبێ خۆ لە ڕاستی نزیک کاتەوە. یاخود، لای کەمی، ئەو ئەنجامەی پێی دەگا ئەنجامێکی پێوراو و کێشراو بێ.

بۆ دیار کردنی جێی لەدایکبوونی گوتەیێکی تەواتور هەیە دەڵێ حاجی لە گۆڕقەرەج بە وەلەد بووە. نامیلکەی باسکراوریش هەر ئەوەیە گوتەی دەماودەمیش لە هەوەڵەوە هەر لە نووسینەکەی مەلا عەبدولڕەحمان سەری هەڵدابێ و لە وێوە گەیشتبێتە ناو نووسراوی چاپکراو. لە ڕاستییدا ئەگەر نامیلکەکە بۆ مێژووی هاتنە دونیای ساڵێکی گوماناوی دیار نەکردبا شایەدیەکەی ئەوم بۆ دیار کردنی جێگەی لەدایکبوونی بە کافی دادەنا و دەمکردە پشگیریکەری تەواتورەکە و ئەوەم لە بیر خۆم دەبردەوە کە تەواتورەکە زادەی نامیلکەیە و پشگیری کردنی یەکێکیان لەوی دیکە دەبێتە شایەدی دان بۆ نەفی خۆی. بەنیسبەت چەند و چۆنیی ژیانی تاکە مرۆڤ ساڵی لەدایکبوون و جێگەی لەدایکبوونی دوو مەوزووعی لە یەکدی نزیکن، هەڵەی یەکێکیان دەبێتە هۆی شوبهە کردن لە ڕاستیی ئەوی دیکەیان. بۆیە چار نیە لەوەدا کە ڕیوایەتێک جێگەیێکی دیار کرد بۆ لەدایکبوونی غەیری ئەو جێگەی نامیلکەکە دیاری دەکا دەبێ دەوری هەڵێنین و ئەم دیو و ئەو دیوی پێ بکەین و بایەخێکی

بدەینێ کە لێی دەوەشێتەوە. جگە لە تەواتور و شایەدی نامیلکەکە بەیتێکی حاجی قادریش هەیە لێی بفامرێتەوە کە لە گۆڕقەرەج هاتبێتە دونیا.

باوکم ئەحمەد بوو ناوی بیرم دێ
خەڵقی لادێ بوو دایکی من فاتێ

حاجی ناوی دێیەکەی نەهێناوە کە باوکی خەڵقی ئەوێ بووە. «نالی» چەند جارێک لە دیوانی شیعرەکەیدا ناوی «خاکوخۆڵ» دەهێنێ و لە هیچ هەڵبەستێکدا ڕاناگەینێ کە جێگەیێکی دیکە بووبێ بە مەفتەنی، بە پێچەوانەی حاجی قادر کە لە سەرانسەری دیوانەکەی بە غەیری کۆیێ ناوی جێگەیێک ناهێنێ کە مەفتەنی بووبێ. بە ڕێکەوتیش ناوی گۆڕقەرەج ناهێنێ وەک لە موناسەبەتدا ناوی گەلێک دێی وڵاتی کۆیێ و غەیری کۆیێ دەبا. حاجی نەیویستووە لە کۆیێ بەولاوە بۆی بە مەفتەن حیساب بکرێ.

ئاخۆ ئەو دێیەی باوکی حاجی «گۆڕقەرەج» بوە یا غەیری ئەو هەر زاهیری حاڵ و ڕاگەیاندنی تەواتور هەیە ساغی دەکاتەوە. هەرچی سەرچاوەی خەبەر هەیە دەڵێ مەبەسی حاجی لەو دێیەی ناو بەیتەکەدا «گۆڕقەرەج» ـە، هەرچی باسی حاجی قادریشی کردوە بە قسە یا بەنووسین گوتوەتی مەفتەنی خانەوادەیی حاجی گۆڕقەرەج بوە. ئیتر بۆ دەبێ وەهم بۆ جێگەیێکی دیکەمان ببا؟ خزم وکەسی حاجیش تێکڕایان ئەو گوتە و نووسینانە بە ڕاست دەگێڕن و چەندین حیکایەتیان لێ دەبیسترێ لەو ڕووەوە کە یەکجارەکی مەسەلەی گۆڕقەرەج ساغ کاتەوە.

ڕواڵەتی بەیتەکە وا ڕادەگەیێنێ حاجی بیری هاتبێ کە باوکی لە لادێ ژیاوە بەو پێیە دەبێ خۆی لەو دێیە هاتبێتە دونیا و هەر لەوێش گەییبێ بە تەمەنی شت بە بیرهاتن.

ڕیوایەتی دوەم، کە ئەویش بە تەواتور پێمان گەیوە، دەڵێ حاجی قادر لە کۆیێ هاتۆتە دونیا، مەلا ئەحمەدی باوکی زووتر، واتە بەر لە وەلادەتی حاجی، گۆڕقەرەج ی جێهێشتووە. بەلای ئەم ڕیوایەتەوە بەیتەکەی حاجی کە دەڵێ «باوکم خەڵقی لادێ بوو» ئەو واتایە هەڵدەگرێ کە بە ئەسڵ لادێیی بووبێ بەڵام لە دەمی وەلادەتی حاجی و شت بە بیر هاتنی لە کۆیێ ژیا بێ. پشتگیریکەرانی ئەم ڕیوایەتە

بۆ بەهێز کردنی ڕای خۆیان ڕستەی »خەڵقی لادێ بوو» دەکەن بۆ ئیسپاتی بیر و باوەڕی خۆیان: بە لای ڕای وانەوە نابێ دایکی حاجی، «فاتێ»ش لادێیی بووبێ، بە اصطلاح «مفهوم المخالفة» وە کە بگوترێ باوک لادێی بوە لە خۆوە دێتە زیهنەوە کە دایک شارستانی بووە. وەک ئەوەی یەکێک بڵێ «لە نێوانماندا دارا خەڵقی هەورامانە» دیار دەکەوێ ئەوانی دیکە خەڵقی هەورامان نین. دیسانەوە شتێکی تریش ئیزافەی سەر قسەکانیان دەکەن و دەڵێن ئەگەر جارێکیان حاجی گوتبێتی باوکم خەڵقی لادێ بوو لە هەموو دیوانەکەی و سەرانسەری شیعرەکانی، خۆی بە کۆیی داناوە و سۆز و خۆشویستنێک نەماوە لە ناخی دڵیەوە بۆ کۆیێ و خەڵقی کۆیێ هەڵنەڕشتبێ. ئەگەر خەیاڵ و بیر کردنەوەی منداڵی گێڕابایەوە بۆ گۆڕقەرەج ، تا ئەو ڕادەیە نە گۆڕقەرەج ی فەرامۆش دەکرد نە بۆ کۆییانیش قاڵ دەبۆوە. حاجی خۆی مانیعە لەوەدا زادەی غەیری کۆیی بێ.

لەم زەمینەدا ڕاستی هەر لایەکیان بێ شتێکیان پێ ناگۆڕێ لە هیچ بارێکی ئەدەب و شەخسییەت و خەباتی حاجی، تەنانەت بایی تۆسقاڵێکیش لە کۆییاتییەکەی کەم ناکاتەوە. بۆیە لزووم نابینم باسی هەندێ بەڵگەی لا بەلا بکەم کە ئەوە دەگەیەنێ حاجی لە کۆیێ بە وەلەد بوە چونکە نە کۆتایی بە دەمەتەقە دێنی نە شتێکی ئەوتۆش ساغ دەکاتەوە تەئسیرێکی ببێ لە هیچ سەروبەری باسەکەمان. گۆیا ئەگەر حاجی قادر کۆیی نەبا و سەردەشتیی با وەیا ڕەواندزیی چ فەرقێکی دەکرد؟

بەنیسبەت کوردایەتی و گیانی میللیی کوردەوە، حاجی هەر دەمایەوە وەک یەکەم چرای شوعلەدار کە تاریکی شەوکوێری لە دەوری کوردایەتی بپێچێتەوە. فکر و فەلسەفەکەشی ئەو یەکەم سەرچاوەی تاقانەیە دەبوو کە دڵ و مێشکی کوردانی بە بیری وەتەنپەروەری ئاو دابێ و هەستی شانازی کردن بە کوردایەتی لە ڕۆحیاندا خەڵق کردبێ. بۆ ماوەی دەیان ساڵ حاجی قادر تاکە سوارەی ئەم مەیدانە بووە دەوجا کۆیی بووبێ وەیا «گۆڕقەرەج» ی وەیا «هەر کوێیی» لە کوردستاندا. هێندە هەیە بە پێی تێفکرینی خۆم کە لە دواییدا ڕوونی دەکەمەوە، دەرکەوتنی یەکێکی وەک حاجی قادر بێشکەیێکی دەوێ بو منداڵێکی وەک ئەو دەست بدا... شیر و غیزاییێکی فکری و مەعنەویشی پێویستە کە پێشەواییێکی دوارۆژ پێ بگەیەنێ. داری میوەدار لە سەر بەردی ڕەق شین نابێ.

بەڵام لەگەڵ ئەم ڕاستییانەشدا دەبێ بڵێین مرۆڤ حەز دەکا، حەقیشی هەیە، بزانێ پێشەوای نیشتمانپەروەری و خۆبەخت کردن و سۆز و سوویان بۆ کورد و کوردستان نەک هەر داخوا خەڵقی کوێ بوە و کەی بوە و چۆنی ڕابووردوە و کەی کەوتە سەر فیکری میللییەت و بۆچی چۆتە ئەستەمبوڵ، بەڵکوو ئەگەر بلوێ پێی خۆشە بزانێ چ لەبەر کردوە و چ خواردنێکی پێی خۆش بوە و گوێی لە کام گۆرانی ڕاگرتوە و چەند جار تووشی دڵداری هاتووە. خولاسە پەی بردن بە هەموو تەفسیلاتی ژیانی حاجی لە خودی خۆیدا لەززەتێکی ئەوتۆیە ئەوە دێنێ، نووسەر و پشکنەر خەریکی تۆژینەوە بێ لە هەموو سەرچاوەییێکی ون و ئاشکرا و دوور و نزیک کە مەعلووماتێک بە دەستەوە بدەن ئینجێک لە ڕێبازی ژیانی حاجی ڕوون کاتەوە هەر لە بوونیەوە تاکوو مردن. من لە لانی خۆمەوە دەڵێم ئەگەر ئیمکانی ئەوەم هەبا نووسینەکەم بکەم بە دیراسەییێکی بە قەدەر بابەت، گەلێ مەوزووع هەن هەڵم نەدەبواردن کە لێرەدا لەبەر بێ کەرەستەیی و کەم دەرفەتی نزیکیان نەکەوتووم. بەوەندەش ڕازی نەدەبووم بەڵکوو بە پێویستم دەدی سەرەتاتکە لە هەموو ئاسۆیەکەوە بکەم کە بەسەر هەر شوێنێکی تێدا ژیان و پێدا تێپەڕینی حاجیدا بنوارێ.

ئەم خەریکبوونە بۆ وەدەستهێنانی زانینی سەد لە سەدی هەموو بارێکی ماددی و مەعنەویی حاجی، ئەگەر بکرێ، وەنیە شتێک بێ بۆ غەیری ئەو نەکرابێ. میللەتانی زیندوو و پێشکەوتوو ئەمە و لەمەش زیاتر دەکەن بۆ پیاوی ئەوتۆیان کە بەنیسبەت پیاوە زلەکانیان بە شاگردێکی حاجی نابێ، ئەمما بۆ ئەدیب و پێشەواییێکی وەک حاجی مەپرسە چ مەجزووبانە دەجۆشێن و دەخروشێن... چەند ئابیدە و یادگاری پڕ بەهای هونەری لێرە و لەوێ بەرپا دەکەن و بە چ تەقدیسێکەوە بەرهەمەکانی دەپارێزن و دیانخەنە سەر خوانی ڕۆشنبیرییەوە. بڕوا دەکەم ئەگەر ناڵە و وڵاغێکی لێ بەجێ مابێ لە مۆزەخانەدا بیپارێزن. بەداخەوە لەو جۆرە خەریکبوونە ئێمەی کەمدەسەڵات، ئەگەربشمانەوێ، هیچی ئەوتۆمان بۆ ناکرێ.

بەهەمەحاڵ تا ئێستا بۆ پاراستنی یادی حاجی و شانازی کردن بە ناویەوە تا بیستبێتم، لە کۆیێ دوو سێ جێگە و فێرگەی بەناوەوە کراوەتەوە و بڕیارێکیش هەیە بۆ بەرپا کردنی پەیکەرێکی حاجی لە گۆڕەپانێکی کۆیەدا و بەس. لەمەدا گیانی

ناوچەپەرستی وەک کۆڵەوژ لە چاوان دەچەقێ و کە لێی ورد دەبیەوە بەزەییت بە کوردایەتیدا دێ. نەبوونی یادگاری حاجی لە غەیری کۆیێ نوقسانییەکی زلە، چونکە خۆبواردن و خەو لە خۆ خستن لە عاست حاجی قادردا وەک چاو نووقاندنە بۆ نەدیتنی ڕۆژ، ڕۆژیش وا بە تاقی ئاسمانەوە نە ئەستێرە لە تەکیدا نموودی هەیە نە مانگ. ئەگەر گیانی تەسکی ناوچەپەرستی نەبێ لەلایەن خەڵقەوە، حاجی قادر ئەو ناوچەپەرستە نەبووە هەر لە کۆیێ یادی بکرێتەوە. حاجی هەر بۆ کۆیێ نەژیاوە و نەسووتاوە... حاجی عاشقی هەموو کوردستان بووە، بۆ هەموو کوردێک تلاوەتەوە. بەڵام بەداخەوە، بە کردەوە دەردەکەوێ هێشتا کورد بە تێکڕایی ئەوەندە لە قاپێلکی ناوچەپەرستی دەرنەچووە ئەو وەفادارە بێ بەرانبەر حاجی کە دەبوا ببێ. دەبینی هەر جێگە و هەر شارەی شاعیرێکی تێدا پەیدا بووبێ، با لەوانەش بێ پێی بگوترێ کۆلکەشاعیر، وای هەڵدەداتەوە وەک غەیری ئەو خوا شاعیری خەلق نەکردبێ، کەچی لە عاست حاجی قادردا وەک نوستوو وایە.

وەنیە من ڕەخنە بگرم لە شانازیی کردنی ناوچە بە پیاوی هەڵکەوتووی خۆی، بەڵام زۆر نارەزام لە هەڵدانەوەی بێ ئەساس، نارەزاتریشم لە نزم کردنەوەی پایەی ئەدیبی گەورەی تێکڕای کورد بۆ خاتری ئەدیبێکی خۆیی ناوچە. نزم کردنەوەش هەر لەوەدا نیە ناوی بە بێ حورمەتی بێ، ئەوەندە بەسە بۆ نزم کردنەوە بەنیسبەت پیاوێکی وەک حاجی کە لە غەیری شاری خۆیدا بە قەدەر شاعیر و ئەدیبی دیکە ناوی نەیێ. گۆیا کەمتەرخەمی و بێباکی بەرانبەر بیرەوەریی حاجی قادر لەوە زیاتر چی بێ کە بە شارێکی کوردا تێپەڕت کرد و دەیان جادە و مەکتەب و شوێنت دیت ناوی ناوچەیی بەسەرەوە بوو خانە شڕێک و وێرانە جادەییێکت نەدیت یادی حاجی بکاتەوە؟ بەڵێ کە نووسەرێکی عادەتیی لە مەوزووعێک دوا نیشتمانپەروەریی کورد باس بکا وەیا کە موناسەبە لێی داخوازیی کرد ناوی حاجی ببا مەجبوور دەبێ دان بێنێ بە فەزل و هونەری حاجی، بەڵام ئەم تەرزە دانپێدا هێنانە بێتامە لە کوێ و پایەی حاجی قادر لەکوێ!!!

بێ ئەوە ناو بنێم، بەداخەوە دەڵیم، هەر شارێکی کورد بکەی بە نموونە و شاعرێکی پلە دوەم و سێیەمی لێ بگری چەندین جار ناو و نیشانی ئەو شاعیرە بەرزتر و پارێزراوترە تێیدا لە حاجی قادر. لەوانەیە تەرزەی شاعیری وەها ئەگەر خەڵقی شارەکی نەبوایە بە حورمەتیشەوە ناوی نەهاتبا چونکە دوور نەبینە لە ژیانیدا کاری

بێ حورمەتیشی کردبێ و لێشی ئاشکرا بووبێ بەڵام هاوشاریەتی بۆی بووە بە شەفاعەتکار، هەندێ جاریش ئەو شەفاعەتە هاوباوەڕی بۆی کردوە.

من تا ڕادەی عەیبپۆشینی مردووش حورمەتی چاوپۆشی دەگرم بە دوو مەرج: یەکەمیان کە چاوپۆشی نەک هەر بۆ خزم و دۆستان بێ بەڵکوو بۆ هەموو کەس، بە ئەدیب و نەخوێندەوار و گچکە و هەژار و دەسەڵاتدارەوە. خولاسە چاوپۆشی نەکرێ بە خەڵات بۆ چەند کەسێک. مەرجی دووەم ئەوەیە ئەو عەیبپۆشییە سنووران نەبەزێنێ. ڕەوای حەق نیە مرۆڤێکی عەیبپۆشراو سەرەڕای موجامەلەیێکی لەگەڵیدا کراوە ژوورووی کەسانێک بخرێ کە چ عەیبیان نەبووە.

ئەو قسانەی لێرەدا دەیانکەم وەک واجیبی ئێسکگران وان، تا بڵێی حەزیان لێ ناکەم بەڵام بەداخەوە نە گوتنیان، لە لای من، بێوەفاییە لەگەڵ ڕاستی و لەگەڵ خەڵقیش. با ئەوە بزانرێ کە بە خۆڕایی هەندێ کەس بەرز دەکرێنەوە و هەندێکی دیکەش یا ژێر دەخرێن وەیان گوێیان نادرێتێ کارێک نیە لەبەر چاوان بزر وەیا لە تێگەیشتن بەدەر. خۆ لە نەزەر ئینسافدا هەر کوفری ڕووتە، تەرازووی کوردایەتیش کە تەرازوویێکی سادەیە و هێشتا گرێوگاڵی ژیانی نوێی سەدەی بیستەم ئاڵۆز و بڵۆزی نەکردوە هەمیشە حکایەتەکەی مەلا و گۆشت و پشیلەکەمان بیر دێنێتەوە «ئەگەر ئەمە گۆشتە، کوا پشیلە؟ ئەگەر پشیلەیشە کوا گۆشت؟».

لە کۆیێ بترازێ، نەمبیستووە ناوی حاجی لە هیچ شوێنێکی کوردستاندا بەسەر شەقامێکەوە وەیا فێرگەیێکەوە وەیا هەر شتێکی دیکە بێ بە خەتی وردیش نووسرابێ. لەوەش وازبێنە نەوەک داوای لە حەد بەدەرمان کردبێ بە نووسینی ناوی حاجی لەسەر شتی بەردەوام و بە جۆرێکی هەمیشەیی جێگە تەسک کاتەوە لە ناوەکانی ناوچەیی، خۆ بیرەوەرییەکەی لە کۆیێ لە ماوەی دوو سێ ڕۆژ زیاتر بەردەوام نەبوو تا ترسی کز کردنەوەی غەیری خۆی لێ بکرێ، کەچی لە چاو بیرەوەریی کە بۆ هەندێ شاعیری دیکە کراوە وەک یاری منداڵان بوو لەتەک وەرزشی ئولێمپی. جارێکی دیکەش با «دان ئاش»ی گلەیی کەم کەینەوە واز لە داوا کردنی حورمەتی نیمچە پێویستیش بێنین و بۆ ناوی حاجی... هەموو پایە و ڕوتبە و ڕێز و حورمەت و نیشانی تایبەتی لە حاجی بسێنێتەوە و بیهێنێتە سەر «ساجی عەلی» ئا لەسەر ئەو ساجەش وابوە لەتەنانێکی پێ ڕەوا نەدیتراوە.

دیومە گەلێ جاران نووسەری کورد لە ژماردنی ناوی شاعیراندا هەر ناوی حاجیشی نەهێناوە وەک حاجی قادرێک هەردونیای نەدیبێ. ئەو نووسەرە لە شاعیرانی دەوروبەری شاری خۆی بەولاوە کەسی بە هیچ دانەناوە، ئەم کارەی بە کارێکی خراپیش لە قەڵەم نەدراوە. کەچی تێکڕای ئەدیب و شاعیری ئەو دەوروبەرە دەبێ شانازی بکەن بەوە کە بە قوتابیی حاجی قادر لە قەڵەم بدرێن. بەڵێ خودپەسەندی و بەخۆ نازین لە هەموو جێگە و کاتێکدا بووە و دەبێ، بەڵام کە هێندە تیر و تاریک بوو پەردەی «نسیان» بخاتە سەر ناوی قادر لە خودپەسەندی دەردەچێ و دەبێ بە «کفر» لە مەفهوومی ئەدەب و نیشتمانپەروەریدا.

ئەوەندەی تێدەفکرم نایێتە زیهنمەوە هیچ بوێژێک لە زیممەتی میللەتەکەی نیوە و سێیەکی ئەو قەرزەی هەبێ کە حاجی لە زیممەتی کوردەواریدا هەیەتی. بۆ بەراورد کردن دەڵێم بە سڕینەوەی ناوی هۆمیرۆس و شەکسپیر ئەو کەلەبەرە ناکەوێتە نێوان یۆنان و ئینگلیز. بەڵێ هەر یەک لەو دوو مەزنەشاعیرە لە مەیدانی خۆیدا سەرانسەر و ئەم پەڕ و ئەو پەڕی گرتۆتەوە، بەڵام مەیدانەکەی بەنیسبەت بوونی مەعنەویی میللەتەکەی پانایی مەیدانی حاجی قادری نیە لە ڕەقعەی کوردەواریدا. با من لێرە لە جیاتی ڕەخنەگر بڵێم هۆمیرۆس و شەکسپیر ئەوەندە زلن لە دەست یۆنان و ئینگلیز دەرچوون و بوو بە ماڵی هەموو ئادەمزاد، خۆ حاجی ئەو نرخەی وەرنەگرتوە! جارێ دەبێ ئەوە بسەلمێنین حاجی ئەگەر لە واقیعدا مامۆستای هۆمیرۆس و شەکسپیر با، چونکە ئەمرازی هونەر و خۆ بە خەڵق ناساندنی زمانی کوردی بوە، کوردیش قەومێکی هەژار و ژێردەست و دمکوت کراوە، زمانەکەی لە نووسیندا بەنیسبەت خۆی یا ساغ بوە چ جایی ئەوە میللەتانی دیکە بیخوێننەوە و تێبگەن، حاجی هەرگیز شۆرەتێکی جیهانی وەرنەدەگرت و ناوی نەدەچووە ڕیزی ئەو ناوانە کە لە دونیادا دەزرنگێنەوە. خۆ ئەگەر بە ئەمرازێکی غەیری زمانی کوردی خۆی بەخەڵق ناساندبا ئەوسا حاجی بە هەر پایەیێک بگەیشتبا ئێمە لێرەدا نە باسمان دەکرد و نە جێگەشمان بۆ دیار دەکرد لە قەوارەی کوردایەتیدا. تۆ سەیری نزیک بکەو دوور مەنوارە. حاجی کە خەڵقی شارەکەی خۆی نەبێ ناوی لە شارەکەت ونە، بێگومان ناوی شارەکەشت لە دیوانەکەیدا ون نیە، ئیتر چۆن ناوی دەچێتە ناو میللەتانەوە و دونیا دەیناسێ لە حاڵێکدا کە سەرەڕای خۆدانەپاڵ

میللەتێکی نەناسراوە وە هەر میللەتەکەی خۆی پشگیری لێ ناکا و حەقی خۆی ناداتێ.

بۆیەیە من کە بەراوردی حاجی دەکەم لەگەڵ هۆمیرۆس و شەکسپیردا بە تەرازوێکی قەومی نەک جیهانی هەڵیان دەسەنگێنم. کە ئەمە بکەم نە ورتە بە دڵمدا دێ و نە زەڕڕەیێکیش لایەنگیریم کردوە کە دەڵێم هیچیان و کەسی دیکەش غەیری وان ناچێتە تای تەرازووی حاجی قادرەوە. وەک حاجی کە بە ڕاستی و بێ کینایە و تەئویل باوکی میللەتپەروەریی کوردە چ ئەدیبێک و شاعیرێک و فەیلەسووفێک و سیاسیێک ئەو باوکە نیە بۆ میللەتێکی دیکە. دەوجا باوک چەندێک بێ بەرهەمهێن و پەیداکەرە بۆ ڕۆڵەی خۆی.

ئەم لاباسە هەرچەند لە ڕواڵەتدا پەیوەندی لەگەڵ جەرگە و ناوەڕۆکی باسەکەمان نیە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەمیش دیار کردنی شتێکە، شتێکی گرنگیشە، یارمەتیمان دەدا بۆ وەدەرخستنی لایەنێکی نرخدار لە پایە و شەخسییەتی حاجی، چونکە ڕاگرتنی کەسێک لە ڕیزی کەسانی دیکە کورتی و کەڵەگەتیی نیشان دەدا، هەڵسەنگاندنی لەگەڵ قورسایی پیاوانی هاوتای خۆی سەنگی ئینسانییەتی دەردەخا. ئەو بەراوردی کردنە نەک هەر پێویستە و بەس، بەڵکوو ئەگەر ماوە و زەرفی پێویست هەبا دەبوا تەواوێکی لە سەر بڕۆم، شاهیدی زۆری بۆ بێنمەوە و بە دەم باس کردنی مەوزووعەوە بڕۆم بۆ مقارنەی مێژووی کورد و ئەو میللەتانەی شاهیدیان لێ دێنمەوە و باری سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری کورد و ئەوان میللەتانە ڕوون کەمەوە تا بە شێوەیێکی متمانهبەخش سەنگی ئەدەبی و مەعنەویی حاجی قادر خۆ وەدەرخا لە کوردایەتیدا نەک ئەوەی لێرە دەیلێم ببێتە دەعوای بێبەڵگە، چونکە زۆر جاران گوتەی «ناوەڕاستی ئەرز جێی سینگی گوێدرێژەکەمە، ئەوەی باوەڕ ناکا با بۆ خۆی بچێ بیپێوێ» لە خوێندنەوەی ڕۆژانەی عادەتییمان ئەو تەرزە نووسینە عاتیفەکارە بەزۆری دەدیترێ. لە ئەنجامی تەجرەبەی تاڵ لەگەڵ خوێندنەوەی نووسراوی عاتیفەباز «رد فعل»م بۆ پەیدا بوە، وا دەبێ کە دێڕێکم لەو بابەتە خوێندوە تاقەتی خوێندنەوەی دێڕی دووەمم نامێنێ چونکە عاتیفەبازیی دێڕی یەکەم دوا دڵۆپی سەبرم دەمژێ. مەبەسم ئەوە نیە ڕەخنە بگرم لە نووسینی بەسۆز، نەخێر نووسینێک سۆزی نەبێ و لە دڵەوە هەڵنەڕژێ ناچێتە دڵانەوە. مەبەسم ئەو لایەنگیری و مەیلی ساکاری نووسەرە بۆ شتێک کە خۆی حەزی لێ دەکا و بەلایەوە

ڕاستی و جوانی ئەو شتە موناقەشە هەڵناگرێ و دەبێ وەک بدیهیە لێی بسەلمێ. ئیتر لەگەڵ دەربڕینی ڕایەکەی پڕیشک و ساچمەی توهمەش بەم لاو بەو لادا دەپرژێنێ نەوەک کەسێک جورئەت بکاو ڕەخنەی لێبگرێ. ئا ئەم عاتیفەکاریە فەلاکەتی کات و هەڵوەستی وەک ئێستای ئێمەیە کە پڕە لە دڵگەرمی و خوێن کوڵان و گیان جۆشان.

میللەتی لە ئێمە پێشکەوتووتر و زاناتر و بەهێزتر لە دەمی گۆڕان و کڵپەی شۆڕشدا بە دەم دەوری عاتیفەدا تێپەڕیون و لە پێناویدا زۆریان زەرەر کردوە. ئێمەی لەوان لاوازتر و کەمسامانتر هەم لەبەر خەتەری ڕەنجەڕۆیی و هەم بە حوکمی سوود وەرگرتن لە تەجرەبەی ئەوان دەبێ ئاگاداری کردەوەی دەست و گوتەی زمانمان بین، بۆ خاتری ڕایەکی ناپوخت و بێبەڵگە یاخود بە دەم هەوەسبازیەوە ڕەخنەگر تاوانبار نەکەین.

بابەتی کۆمەڵایەتی و دەستووراتی گۆڕان و پێشکەوتن وەک پرسیارێکی ریازی وەیا زانستی کیمیاوی موختەبەری نیە گەیشتبێتە ڕادەی ئیسپاتی تەواو کە ئیتر ڕەخنە و دەمەتەقە هەڵنەگرێ. دەبینی یاسا و دەستوورێکی دوێنێ بە پێشکەوتوو و شۆڕشگێرانە دادەنرا ئیمڕۆ نەک بە درۆ دەخرێتەوە بەڵکوو تاوانباریش دەکرێ. دەبینی هەروا پڕۆژەیە و ئیفلاس دەکا و تاقی کردنەوەیە و پووچ دەردەچی، کەچی لە پێشەوە وا ڕەچاو دەکرێ بۆ ماوەیێکی دوورودرێژ هەموو کامەرانی و حەسانەوە و تێری و خۆشی خەڵق بن چونکە لە ڕواڵەتدا ئەو پڕۆژە و تاقی کردنەوانە زادەی زانست و بەرهەمی فکری شۆڕشگێڕ و پێشکەوتوو بوون. دەوجا کە حاڵ وابێ، پێویستەکی زۆر پێویستە ئازادیی ڕەخنەگرتن و دەربڕینی بیروباوەڕ هەبێ لە سەرەتای دانان و خستنەکاری ئەو یاسا و پڕۆژانە، نەک لە دوای زیان و پاشکەوتن و ماڵوێرانی بە هۆی بێکەڵکی و نالەبارییانەوە. ڕەنگ بوو ئەگەر لە پێشەوە دەرفەتی ڕەخنەگرتن هەبا، هەڵەی پڕۆژەکان دۆزرابانەوە بەر لە تەتبیقیان.

ڕێ نەدان بە ڕەخنەگرتن لە دوای دەرکەوتنی ئیفلاسی مەوزووع کارێک نیە دڵ خۆش بکا. دەتوانم بڵێم ئەو ڕێدانە «نیرۆن» یش پێی ڕازی دەبوو، بەڵکوو لەوانەیە گلەیشی کردبا لە ڕەخنەگرتن بەنیسبەت کارە موفلیسەکانی تێپەڕیوەوە، چونکە بەو فێڵە ئۆباڵی بێکەڵکی پڕۆژەکان لە ئەستۆی خۆی دەکاتەوە و دەیخاتە ئەستۆی بێگوناهانەوە. ڕێدان بە ڕەخنە گرتن ئەگەر هەر لە کاری ڕابوردووی ئەوتۆ بێ

ئیفلاسیان دەرکەوتبێ، ڕاستەو ڕاست دەبێتە دەرگەی ڕەخنە بەستن لە هەموو ئەو کارانەی لە دواڕۆژدا ئیفلاس دەکەن واتە مەبدەئی پیرۆزبایی کردن لە ئیفلاس دەکا بە ئایین. مرۆڤ ئەگەر داوای خوایەتی نەکا نابێ ڕەخنەگرتن یا ساغ بکا.

هەر چەند بە سەهوو چوون لە دیراسەی دەربارەی بوێژێک، با حاجی قادریش بێ، لە ڕووی بەرهەمهێنانی زیانی ماددییەوە وەک هەڵە و ناتەواوی یاسا و پرۆژەی ئابووری و پیشەسازی و کشتوکاڵیش نەبێ، دیسانەوە خۆلێپاراستنی لە نووسیندا پێویستێکی ئەوتۆیە وەک ڕاستیی دیوار و خاوێنی چەمەنتۆ و پتەویی بناغەیە بەنیسبەت خانوو.

لە سروشتدا پەیوەندیی میانی ئاڵقەکانی زنجیرەی ڕاستی و واقیع ناپچڕێتەوە هەر یەک لەو ئاڵقانە لە دوو سەرەوە، وا دەبێ لە تەنیشتیانەوە، بە ئەڵقەی دیکەوە بەند و پەیوەستە. کە ئاڵقەیێکی ژەنگاوی وەیا ناتەواو بوو وەک نەخۆشی ساری کاردەکاتە شریتەهای زنجیرە و ڕشتەی ڕاستیەکانی ئەم سەر و ئەو سەر و تەنیشتەکانیەوە. ئیتر وا دەبێ کە خشتی یەکەمی خانوەکە بە خواری دانرا یا لەسەر سستەک نێژرا لە ئەنجامدا هەموو خانوەکە عەیبدار دەبێ، یاخود کە ئاڵقەی یەکەم لە پێشەکیی نەزەرییەکە هەڵە بوو بنیادی هەموو نەزەرییەکە لەگەڵ هەڵە تێکەڵ دەبێ.

هەرچەند شتی نەزەریش لە کاتی نووسین و دانانیدا کوتومت بەرهەمی ماددی ناهێنێتە دی، بەڵام هەر ئەو نەزەرییەیە دەبێتە پرۆژەی دروست کردن و سازدان، هەر خۆیەتی بنیادی ژیانی ماددی لەسەر هەڵدەستێ. پەراوێزی شتی نەزەریش یەکجار فرەوانە، هەر لە بابەتی مێژوویی و ئەدەبی و هونەری دەگرێتەوە تا هەموو ئەو زانستانە کە پێشکەوتن و گوزەرانیان پێوە بەندە. مرۆڤیش کە خووی گرت بە یاساغ کردن و تاوانبار کردنی ڕەخنە گرتن ئیتر بابەت فەقێی تایران بێ یا یاسای کشتوکاڵ بێ یا پلانی پیشەسازی و بازرگانی بێ یانیشتەجێ کردنی کۆچەران بێ یا هەر شتێکی دیکەی لەوانە گرنگتر بێ، ئەو یاساغ کردن و تاوانبار کردنە تێی هەڵدەپێچێ و نەفەسی دەبڕێ و پرۆژەی حازر و بزری خۆی دێنێتە کایەوە. کە ڕێگەی ڕەخنەگرتن و ڕاست کردنەوەش لە خاوەن بیر و ڕایان بەسترا ئەوسا باری سوود و زیان و سەرکەوتن و تێشکان دەچێتە ملی بەخت و تالع و ڕێکەوت واتە ئەگەر کوردی گوتەنی، خوا و ڕاستان، نەخشەی کارەکان ڕاست کێشراوبوون ئەوا

باشە دەنا خاک بەسەر ئەو کەسانەی ڕزق و ڕۆژیان بەندە بەو کارانەوە. فاتحەش بخوێنە بو گیانی خۆشی و پێشکەوتن.

من لە ژیانی فکریمدا ئەو تەرزە بیر کردنەوە ڕێگەم بۆ ڕوون دەکاتەوە و لەبەر تیشکی چراکەی هەنگاو هەڵدێنم. بۆیە حەز ناکەم شتێک لە بارەی فکر و ئەدەبەوە بڵێم و بنووسم تا خۆم بە تەواوی لێی ڕازی نەبم. کاتێک گوتەیێکیشم خستە بە گوێ و چاوی خەڵقەوە، ئەو گوتەیە لەگەڵ بەڵگە و ئیسپات بێ، ئەوسا هەقی ئەوە دەدەم بە خۆم چاوەڕوانی ڕێز لێ گرتن و بڕوا پێ کردنی بکەم. سەردەمی ئێستاکەش سەلماندنی بیروڕای بێتەرافانەی وەزەحمەت یەخستووە. لزووم نیە من بڵێم، لەخۆوە ئاشکرایە خاوەن ڕا و خوێندەوارانی بەرەی شۆڕشگێڕ لە باری باوەڕ و فەلسەفەوە بوون بە چەند بەشێک. ئەو بەشانە و بەرەیانە هەرچەند فەلسەفەکەیان لە بنەڕەتدا علمانیش بێ لە واقیعدا وەک ئایین چۆتە دڵیانەوە. سووربوونی هەر لایەنێک لەوان لایەنانەی فەلسەفیی شۆڕشگێڕ لەسەر بیروڕای خۆی زەڕڕەیێک کەمتر نیە. بە قەناعەتەوە بڵێم گەلێ جاران باوەڕی غەیبی باغەڵ فەراحتترە لەو فەلسەفانەی بە خۆیان دەڵێن عەلمانی. دەوجا چەند زەحمەتە، ئەگەر نەڵێم مستحیلە، یەکێک کە باوەڕێکی غەیبی هێنا بە شتێک، ئەو باوەڕە بگۆڕێتەوە بە یەکێکی دیکە وەیا تعدیلاتی تێدا بکا لە ئەنجامی خوێندنەوەی قسەی من یا غەیری من با قسەکەش ڕاستی موتلەق بێ. فەرموو لەگەڵ مندا سرنجێک بدە ئەو ڕووداوە کە ئێستاکە بۆت دەگێڕمەوە، بابڵێم بە بیرت دێنمەوە چونکە کەم کەس هەیە نەیبیستبێ، لە دواییدا ئەگەر پێت دەکرێ بێتەرەفانە و بێترس استعدادی خۆت هەڵسەنگێنە بۆ سەلماندنی حەقیقەتێک کە دژی باوەڕت بێ.

مێژوو دەگێڕێتەوە جارێکیان پێغەمبەر (ص) دیتی تۆزی خورمای نێرە دەتەکێنن بەسەر هی مێیەدا تا بەر بگرێ، ئەویش وەک مێژوو باس دەکا فەرمووی وازی لێ بێنن ئەگەر خوا حەز کا بەر دەگرێ... کەچی خورماکە بەری نەگرت. پێغەمبەر کە ئەمەی زانی سوور نەبوو لەسەر قسەی ساڵی پێشووی و بە خەڵقەکەی گوت جاران چۆنتان دەکرد هەر وا بکەن »انتم اعلم بأمور دنیاکم«. خۆ ئەگەر پێغەمبەر سوریش با لە سەر قسەی خۆی پاڵپشتێکی بەهێزی لەوەدا هەست پێ دەکرد کە ئەو لەغەیبەوە «وحی» بۆ دێ و دەیتوانی بە ئاسانی خەڵقەکە ئیقناع کا کە بویستبا.

بە پێی فکری ماددی کە گوێمان لە دەنگیەتی بە سەر زاری ڕۆشنبیرانەوە و «سوود و بەرژەوەند» دادەنێ بە هاندەر بۆ کردوەوە، چاوەنۆڕ دەکرا لە پێغەمبەر نەوەک خەڵقەکە شوبهە پەیدا کەن لەوە کە قسە و باسی ئەو عەلاقەدارە لەگەڵ غەیب، لە قسەکەیساڵی پێشووی نەگوێزێتەوە و هەمان سفارش بکاتەوە بۆ جاری دوەم و چوارەمیش تا کات و زروفێکی لە ڕێی «مێشک شووشتنەوە» خەتەری شک کردن و گومان بردن لە دڵی خەڵقەکە بە تەواوی دەردەکا ئەوسا بڵێ چ دەکەن بە ئارەزۆی خۆتان بیکەن. هەڵبەت لەو چەند ساڵانەدا هەژاری و برسیەتی و بێ خورمایی چەنگاڵی لە هەناوی هەژاران گیر دەکرد و ئەوەی پێ دەکردن کە نەکرابێ، کەچی بەوپەڕی سادەیی و بێ وەخران و گرێوگاڵ وازی هێنا لە ئامۆژگاریەکەی ساڵی پێشووی و خەڵقی ئازاد کرد بگەڕێتەوە بۆ تەجرەبەی خۆیان.

ئەمە پێش 1300 ساڵ ڕووی داوە لە لایەن مرۆڤێکەوە داوای پێغەمبەرایەتی دەکرد و پێغەمبەرایەتیش نازک و «حساس»ـە وەک قوماشی سپی هەموو لەککەیێکی پێوە دیارە، ئەوساش زیاتر لە ژمارەی پەیڕەویکەرانی دوشمن و ڕەخنەگری هەبوون. ئایا ئیمڕۆ لە سەردەمی زانست و تەکنیک و پیشەسازیی و دۆزینەوە چەند ئینسانی عیلمانیی شۆڕشگێڕ ئامادەیە بەو خێراییە و ئاسانییە واز لە ڕای خۆی بێنێ دەربارەی یەکێک لە کوێرەڕێیەکانی، ناڵێم شەقامەکانی، ئەو باوەڕەی خۆی پێوە بەستوە؟

با بە پێپلیکەی تەوازوعدا بێمە خوارێ و بپرسم ئەگەر لایەنێکی سیاسی دەربڕی کەوا دەشتی شارەزوور بۆ چاندنی پەتاتە چاکترە تا برنج و تووتن، دوایی بە تەجرەبە دەرکەوت- وەک حیکایەتی خورما- بەتاتەش باش ناڕوێ لە شارەزوور، ئاخۆ ئەم لایەنە سیاسییە بە خەڵق ڕادەگەیەنێ و بڵێ هۆ خەڵقینە بەسەهوو چووم بۆ خۆتان تووتن یا چی بە چاک دەزانن بچێنن، شارەزوور بۆ پەتاتە دەست نادا؟

من و تۆ و عەمر و زەیدیش دەزانێ جارەهای جار لە هەڵکەوتی وادا لایەنی سیاسی سوورتر بوە لەسەر چاندنی پەتاتە و کە بەرهەمیش نەهاتۆتە پێش، دەیان قوربانیی بێتاوان کراونە نرخی داپۆشینی ئەم غەڵەتە. فلانە کەس و دەماری خیانەت و ڕەگەزپەرستی و چینفرۆشی و ئیستعمار و کۆنەپەرستی بەڵکوو کە پێویست بوو دێو و جنۆکەش هۆی نەڕوان و گەشە نەکردنی پەتاتە بوون دەنا شارەزوور بۆ خۆی بەهەشتی پەتاتەیە. هەر بەو جۆرەش کارەساتەکە خراوەتە تەئریخەوە لەگەڵ تەقدیسی خاوەنی پڕۆژە بێکەڵک و فکرە غەڵەتەکە و ئابڕوو بردنی خەڵقە

بێگوناهەکە. دەوجا من و غەیری من لە دەربڕینی ڕاییک کە باو نەبێ لای خەڵق دەبێ چ ئومێدێکی هەبێ لێی بسەلمێنین با هەرچی بەڵگەی زیهینی و تەجرەبەش هەیە پشگیری بکەن؟

ئەمەی من دەیڵێم خۆت دەیزانی و لەگەڵیدا ژیاوی، بە زمان لێمی نەسەلمێنی بە دڵ بڕوای پێ دەکەی... بۆیە زۆر و کەم بە تەمای ئەوە نیم قسەکانم قەناعەتی بنچینەیی بەکەس بگۆڕن، شتێکی دەیڵێم خزمەتی ڕاستییەکی پێ دەکەم کە بەڕاستی دەزانم. تەنانەت لەو حاڵەشدا داوا ناکەم کەس هەنگاوێکم لەگەڵ باوێ، هەرچەند خەیاڵیش بێ، بەرەو ئەو بیروڕایەی دەیخەمە سەر کاغەز بێ ئەوە هەموو ملیمەترێکی ڕێگاکە بە مەنتیق و بەڵگە تەخت کرابێ و بەو گەز و گرێیە پێورابێ کە ئێمڕۆ بوون بە مقیاسی پێوان.

مەنتیق و بەڵگەش چەمەنتۆ و گەچ و بەرد نیە بکرێ بە دیوار و چاو ببینێ و دەست هەستی پێ بکا، ئەوەندە بۆ من بەسە، بەوپەڕی خۆ لەبیر کردن و بێتەرەفییەوە، خۆم دانێم لە جێی ئەوەی نووسینەکە دەخوێنێتەوە و وەک ئەو بە چاوی ڕەخنەگر، بەڵکوو ناحەز، سەیری کەم و بێڕەحمانە ئەم دیو و ئەو دیوی پێ بکەم و وازی لێ بهێنم تا قەناعەتی تەواوم پێی دێ... ئەمە بکەم تا ڕادەییک فکرم تێی بڕ دەکا. کە کار گەیشتە ئێرە ئیتر دەمێنێتەوە بۆ هێزی نووسینەکەم و بەڵگەکانی لە لایێکەوە و ئازادی لێکدانەوەی خوێنەر لە لایێکی دیکەوە. کە نووسینم زەعیف و بەڵگەکانی چرووک بن خوێنەر هەر چۆنێک بێ نابێتە شەفاعەت کارم، کە خوێنەریش لە ڕێی »التزام«ی باوەڕی تایبەتی خۆیەوە گوێ نەداتە چەند و چۆنیی ئەو نووسینە خۆ دژ دەنوێنێ لە عاست ئیلتیزامەکەیدا ئەوسا هەموو بەڵگەی دونیا بێنمەوە بۆ ئیسپاتی باوەڕەکەم چ تەئسیرێکی تێ ناکەن.

بەنیسبەت مرۆڤی «ملتزم» تا سەرچاوە و بارەگای خاوەن ڕای ئیلتیزامکراو فەتوایێکی نوێ نەدا ئەو وەک دەروێش زەرگ وەشێنی دەکا بۆ فەتوای کۆن. ئەمانە حەقیقەتی ئاشکرا و ڕووداوی ڕۆژانەمانن، بە گوتن و نووسینیان نهێنییەکم ئاشکرا نەکردوە. خوێنەری «ملتزم» ڕەنگە بە شانازییەوە شایەدیم بۆ بدا تا مردنی و برانەوە هەر لەسەر باوەڕی خۆی دەمێنێ، خۆ ئەگەر بە زاریش ئیعتیراف نەکا هەموو ژیانی شریتەیێکی نەپچڕاوەیە لە سووربوون و پێ داگرتن لەسەر ئەو ڕایەی کە لایەنی باوەڕپێکراو پەسەندی کردوە.

ترسی لایەنگیریی پەرەسەندووی جیهانییە ناچارم دەکا پەیتاپەیتا سوپێر و قەڵغان لە سەرانسەری ڕێچکۆڵەی نووسینەکەم ئامادە بکەم بەڵکوو لە تیر و شیری نارەوای بپارێزن یاخود هەر نەبێ لە تای تەرازووی مرۆڤێکی بێتەرەف سووک هەڵنەستێ، چونکە مەعلوومە ئەگەر نووسینی یەکێکی وەک من بکەوێتە تاییێکی تەرازووەوە، نووسینی نووسەرانی «ملتزم» وەک گەڵای دار دەرژێتە تایەکەی بەرانبەر.

ئەم قەناعەتە لێم داوا دەکا لە نووسینی خۆم ڕازی نەبم بە دەعوای بێبەڵگە و مەبدەئی «برۆ بۆ خۆت بیپێوە». لە زۆر شوێنی نووسینەکەم هەستم بەوە کردوە و دەریشم بڕیوە، ئەگەر لەبەر دوورکەوتنەوە نەبا لە ئەسڵی مەوزووع دەبوا بۆ ئیسپاتی تەواو، زیاتر لەسەری ڕۆشتبام و پتر وەرامی پرسیاری محتەمەلم دابایەوە، بەڵام وەک دەبینێ پڕ کردنەوەی هەموو کەلەبەرێک، سەرەڕای وەخت و دەرفەت، پێویستی هەیە بە نووسینی هێندە درێژ لە بارستی کتێبێکدا جێی نەبێتەوە، ئەگەر جێشی بۆ کرایەوە بە درێژە پێدان لە زۆر ڕووەوە خوێنەر ماندوو دەکا و ئەرکی قورسی دەخاتەسەر کە مافی ئەوە نادەم بە خۆم لێی داواکەم هەڵی گرێ.
بەهەمەحاڵ ڕەچاو کردنی بەڵگە هێنانەوە لە نووسیندا هۆی ئەوەیە کە تا ئێستا چەند هەنگاوێکی میانی کۆیە و «گۆڕقەرەج» م بۆ نەبڕا و یەکەم خەوی ساوایی حاجیم بۆ نەخرایە بێشکەی ئەمیان یا ئەویان. نە بۆ خۆم زانیم نە بۆ خوێنەر بۆم ڕوون کرایەوە. ئایا ئەم بەچکە دەستنیشانەی چارەنووسی کوردایەتی هەوەڵ هەنگاوەکانی ئاسوودەیی تەمەنی شەش حەوت ساڵی لە ڕێچکۆڵە و لەوەرگەکانی گۆڕقەرەج بە دوا گەلە و ڕاندا هەڵێناوە، یاخود پێشبڕکەی کەلا و جگینە و کەوشەک و سێبازی پێکردوە لە کۆڵانە و گۆرەپانەکانی کۆیێ؟ لە پێدەشتی کۆرپەییەوە تا سەرەو هەورازی بناری ئەو ژیانە پڕ بەهایەی ئایا لەمە کامیان بووە؟

داخم ناچێ شوێنی لەدایکبوون و چەند ساڵی سەرەتای عومری بۆ تەخمین دەمێنێتەوە، با ئێمە بە درێغ و پەرۆشێکی سووتێنەرەوە جارێ دوعاخوازی لە هەردوویان بکەین بۆ هەڵسوڕان لە دەوری پرسیارەکەی دی و هەوڵدەین بزانین ئایا حاجی قادر «کەی» هاتۆتە دونیا؟

دەک ماڵت شێوێ زمانە چەند ساحیرانە و نهێنکارانە پەردەی لەناوبردن دەتەنی و وەک شەوەزەنگ، دەی خەیە سەر برا جمرانەکەت، نەخێر زادەی کۆشی خۆت، کە بوون و ڕوودانە... تا تروسکە لێ دەبڕی و هاوتای نەبووی دەکەی. چەندین کەس و

حادیسه و هونەر و زانست و چاکە و خراپەت خستە بن باڵی ڕەشی «نسیان» و تاریکستانی فەرامۆشی، وەهات شاردنەوە هەر دەڵێی ڕۆژەک لە ڕۆژان پێیان ئاوس نەبووی، لە ڕووبەرە بەڵەکەکانی شەو و ڕۆژت وەک وشە درێژ پەخش و ڕیزت نەکردوون. خەیام لەو دوو کارە وێک نەچووەی سازدان و ورد کردنت زیرەی لێ هەستاو گوتی:

این کوزه‌گری دهر چونین جام لطیف
می سازد و باز بر زمین می زندش

وەک خەیامیش هۆشیار و هەستیارانی هەموو سەردەمێک ئەم گلەییەی بێ وەفایی و ڕۆڵەخۆرییەیان لێ کردووی تا ئێمەی سەردەمی، بە اصطلاح، ڕۆحی زانست و پشکنین و ساغ کردنەوە وەک سواڵکەر چاکەت دەڵێین تا خراپەت لە بیر بەینەوە و دەرۆزەی دووسێ ژمارت لێ دەکەین، هەر دوسێیەک نە زیاتر، لە نێو کەشکۆڵی هەمە بابەت و چیزەت دەریان بێنی، بیان خەیتە سەر لەپی توقعمان بەڵکوو بزانین یەکەم چرای نیشتمانپەروەریی کوردایەتی پەنجەی چ ساڵێکت بە کفریتی بوون فتیلەی ژینی ڕۆشن کرد! حاجی قادرت کەی تەسلیم بە نەتەوەی کورد و مەفتەنی کوردستان کرد!!

تا من بزانم دۆزینەوەی ئەو ساڵە وەک دۆزینەوەی دانە گەوهەرێکی نیشانکراوە لە بنی گۆمدا، چونکە بە جۆرەکی قەناعەتبەخش، نە بە نووسین و نە دەماودەم، ساڵی لەدایکبوونی حاجی نەزانراوە، بۆیەیشە هەریەک لە نووسەران بۆ خۆی ساڵێکی پەسەند کردوە و خۆی پێ دڵنیا کردوە. ئیتر خەڵقی دیکەش بە دوا ئەودا ڕۆییون و شوێنیان هەڵگرتووە.

بێگومان ڕۆیشتن لەسەر ڕێچکەیەک هاتۆچۆی لێ کرابێ و هەموار کرابێ خۆشترە لە کردنەوەی ڕێگەیێکی تازە کە هەر شەقڵی نەشکابێ. بەو پێیەش دووبارە کردنەوەی خەبەری مەشوور و چەسپاو ئاسانترە لە دواکەوتنی خەبەرێک سەر و شوونی لێرە بە پێشەوەی نەبێ. عادەتەن نووسەرێک کە بە ئومێدی بڵاو کردنەوەی نووسینەکەی بێ، پەلە دەکا زووتر لێی بێتەوە و کۆتایی پێ بێنێ، کەواتە بۆ دەبێ خۆ خەریک کا و کات بدۆڕێنێ بۆ دۆزینەوەی شتێک کەوا مەشوورە دۆزراوەتەوە.

لزووم چیە بۆ گومان کردن لەو خەبەرانەی وەک حەقیقەت بڵاوبوونەتەوە! ساڵی بەوەلەدبوونی حاجی، فڵانەکەس لە کتێبەکەیدا نووسیوەتی، ئیتر کە نووسەری تازەی بە پەلە شتێکی حازر و بزر لە بەردەستدا بێ چ لزوومی هەیە بە شتی ژێر پەردە و ناو تاریکی. نە خۆی و نە کەسیش ئەوەندە قووڵ نابێتەوە بۆ ئەوەی بزانرێ ئەم حازر و بزرە لەگەڵ ڕاستی و ڕووداوی مێژوویی و بێ گوماندا ڕێک دەکەوێ یان نا!

ئەوەندەی لەو بارەوە نووسینم هاتبێتە پێش چاو نەمدیت یەکێک بڵێ چۆن و بۆچی فڵانە ساڵی هەڵبژارد، ئایا بە بیستن یا بە خوێندنەوە یا بە تەخمین مەیلی بۆ ساڵەکە چوە. لە لای خۆمەوە تحقیقات نەما نەیکەم، بەڵام نەمتوانی ساڵێکی تاک و ناسراو دەستنیشان کەم و بڵێم ئەمەتە ساڵەکەی لەدایکبوونی حاجی. لەگەڵ ئەمەشدا هەندێ بنکە و دروشمی گوزارش هەیە بۆ لێکدانەوە و تۆژینەوە دەوروپشتی مەبەستمان هێندە بۆ دیار دەخەن هەر دەڵێی تیری تخمینان نیشان دەپێکێ. مەودای هەڵە ئەوەندە کورت دەکەن قسەمان خۆ لە ڕاستی دەخشێنێ، نەزانراو وا کەم دەکەنیەوە تارمایی زانراومان بۆ دیار دەکەوێ. لەگەڵ ئەمەشدا ڕاستیی تەواو وەک گەوهەرەکەی بنی گۆم دەمێنێتەوە.

چەند مێژوو و ڕووداوێک هەن بەبەڵگە و بێگومان لەگەڵ تەمەن و ژیانی سەرەتایی حاجیدا پەیوەندییان تا بڵێی بەتینە، لە شیعرەکانی حاجیش بەیتی ئەوتۆ هەن بە چەشنێک لەو ڕوودا و مێژووانە دەئاڵێن کە ئیتر ئەو نەتیجەی لێیان بەرهەم دێ بە لێکدانەوە و سەرنجدان خۆ لە دەست دەمەتەقەی گومانکارانە و نەسەلمێنانە ڕزگار دەکەن.

مێژوویکی بێ شوبهە و لە کتێباندا نووسراو ئەوەیە کە حاجی قادر و حاجی مەلا عەبدوڵا هاوڕێی خوێندن بوون. سەرەڕای ئەو بەدیهیە کە هەردوویان خەڵقی کۆیەن. حاجی قادر لە دیوانەکەیدا بە هەڵبەست خۆی بوە بە شایەدی ئەو ڕووداوە.

ساڵەکەی وەلادەتی حاجی مەلا عەبدوڵا و ڕەفاقەتی خوێندن لەگەڵ حاجی قادردا لێرە بەپێشەوە بوونەتە مەوزووعی لێدوان و نووسین. گوتارێکی خۆم لە جزمی دووەمی دەفتەری کوردەواریدا لە ژێر ناونیشانی »کەیفیی جوانڕۆیی« ئەم ڕاستیانەی تێدان. هاوڕێیی حاجی قادر لەگەڵ حاجی مەلا عەبدوڵا لە خوێندندا بەقەد دیوانەکەی مەشوورە چونکە سرنجێک بگریە ئەم بەیتە:

به بیرت دێ زەمانێ چووینە باڵەک
به پێخاوسی نە کەوشم بوو نە کاڵەک

بەهۆی دوو سۆزی گەورەی یاد کردنەوە و هەژاری، سەرەڕای ڕێکی و پاراوی و دارشتنی هونەری، لە هەموو زمانێک و زەمانێک خۆش هاتووە. دەتوانم بڵێم شاعیر و شیعردۆستی کوردیم نەدیوە ئەم بەیتەی لەبەر نەبووبێ. ساڵەکەی وەلادەتی باپیریشم (حاجی مەلا عەبدوڵا) لە چەندین جێگە بە خەتی خۆی و حاجی مەلا ئەسعەدی جەلیزادەی باوکی نووسراواتەوە. بۆیە هەردوو ڕاستی وەک دوو مۆم، با بڵێین مۆمێک و عەکسەکەی لە ئاوێنەدا، تا ڕادەیێکی بایەخدار دەور و پشتی مەبەس ڕووناک دەکەنەوە.

لە هەوەڵ نیگاوە مرۆڤ بۆ ئەوە دەچێ کە دوو کەس هاوڕێی خوێندن بوون دەبێ هاوتەمەنیش بن یاخود هەر نەبێ لە یەکدی نزیک بن، بەو پێیە لە ڕواڵەتدا فەرقی تەمەنی حاجی قادر لەگەڵ هی باپیرم، ئەگەر هەبووبێ، نابێ لە 4-5 ساڵ زیاتر بێ. دەوجا بابزانین ئەو گوتەی نووسراو کە تەواتوری دەماودەم دووبارەی دەکاتەوە و دەڵێ حاجی قادر لە ساڵی 1245 ی کۆچی لە دایک بووە، تا چەند لەگەڵ دەلالەتی شیعر و بەڵگەی ڕووداوان دەگونجێ؟ تۆ بڵێی ئەو ساڵەی 1245 ـە لە دوای بەیەکدی گرتن و بەراورد کردنیش هەر جێی قەناعەت بێ!

تا ئەو ساڵانەی دوایی، ڕاستییەکەی تا سێ چوار ساڵی دوایی، دڵی خۆم بەو فەرقی 4-5 ساڵی عومری هەردووکیان وەها تەسکین کردبوو پێویستم نەدەدیت بە سەیر کردنەوەی دووبارە. ئەگەر شەڕفرۆش نەبم بە ئەخبار و گوزارشتی دەماودەم بۆ دەبێ گومان بکەم لە ڕاستیی خەبەرێک کەوا لەگەڵ حەقیقەتی مەعلوومدا ئەوەندە ڕێک کەوتبێ. چنگی کێ دەکەوێ تەواتورێک بڵێ دوو کەسی هاوڕێی خوێندن لە تەمەنیشدا ئەوەندە لەیەکدی نزیک بوون کە فەرقیان 4-5 ساڵ بووە، لە هەموو زەمانێک ئەو تەرزە هاوڕێیانەی خوار و ژوور دێنە بەر چاوان بە تایبەتی لە خوێندنی مزگەوتان کە تا ئەو ساڵانەی دوایی عومری دیار کراو بۆ پلەی خوێندنی دیاریکراوی مەرج نەبوو. کتێبەکان هەر لە خوارێ تا سەرووی سەرێ بۆ هەموو کەس کرابوونەوە. تازەبەتازە مزگەوتەکان پەیڕەویی یاسای فێرگە ڕەسمییەکان

دەکەن لەوەدا هەر پلەییکی خوێندن بەند بێ بە پلەیێکی تەمەن و لێی تێنەپەڕێ. لەگەڵ خۆمدا بۆ زیادی قەناعەت ئەمەشم دەگوتەوە کەوا سەرچاوەی ئەم خەبەرە چ ئاگای لەوە نیە باپیرم کوڕی چ ساڵێکە تاکوو تێبینی عومری ئەوی کردبێ بە بنگە بۆ دیار کردنی ساڵی وەلادەتی حاجی قادر، دیارە سەر و سۆراغەی بێبنج نیە.

هەر ئەم باوەڕهێنانەی بێ دوودڵییە ببوە سەبەبی نەسەلماندم کە مەبەسی حاجی قادر باپیرم بووبێ لەوەدا کە دەڵێ:

ئەی عەتارید لە دەرت خادیمی سوججادە بە شان
وەی لە کۆیی فوساحادا قەڵەمت سنجقە شان

حاجی قادر نیە بەیتێکی وەکوو ئێوە بڵێ
ئەسپی کۆن زەحمەتە دەرچێ لەگەڵ ئاهوو ڕەوشان

چونکە جیاوازی بەینی «ئەسپی کۆن و ئاهوو ڕەوش» لە 4-5 ساڵ زیاتر دەگرێتەوە، تەواوەکیش زیاتر، بابڵێین هەر نەبێ 10ساڵێک. گەلێ لە شیعردۆست و مێژووناسەکانی کۆیێ بێ گرێ ئەم چوارینەیان بە مەدحی حاجی مەلا عەبدوڵا لە قەڵەم دەدا. یەک لەوانە خوالێخۆشبووی سمایل ئاغای مەلا ئەحمەد ئاغای غەفووری، کە پیاوێکی مونشیی خەت خۆش و باخەبەر لە تەواریخی کوردەواری و ڕووداو و ئەشخاسی دەوروبەری کۆیە و بابان و ئاگاداری نوکتە و لەتیفە و بابەتی ئەدەبی و فارسی و تورکیزان و لەگەڵ شیعر و شوعەرای کوردیش تابڵێی دۆست بوو، بێ پەروا لەو دیوانانەی کە بەخەتی خۆی دەینووسینەوە لە عاست ئەم چوارینەدا ئەمەی ئیزافە دەکرد «لە مەدحی حاجی مەلا عەبدوڵا». هەرچەند لزوومیشم نەدیبێ موعارەزەی ئەو ڕایە بکەم، لە قووڵایی دڵمدا پێی ڕازی نەبووم.

ئەم ڕەخنەی نیوە نوستوە نیوە بەخەبەر لە مێشکمدا هەروا مایەوە بە نیوەچڵی تاکوو لەگەڵ گوزەرەی ساڵەو ساڵی عومر و زیادبوونی خەریکیم بە لێکدانەوە و ساغ کردنەوەی تەواتور دەربارەی ئەدیب و زاناکانی کورد، تا ڕادەیێکیش بە جۆرێکی لاشعوری سرنجم لە خۆوە کشا بۆ بەراوردییەکی ئەوتۆ لە هەندێ بەیتەکانی حاجی قادر کەوا نزیکی کردمەوە لەوە بێدوودڵی بڵێم حاجی قادر هەر نەبێ 10 ساڵ بە تەمەن لە باپیرم گەورەتر بووە.

زاهیرەی قەناعەت پەیدا کردن بە جۆری لاشعوری ڕەنگە بۆ زۆر کەس ڕوو بدا هەر هەندەی پێ دەوێ مرۆڤ سرنج بداتە ڕای و باوەڕی تا هەست بکا بە گۆڕانی لاشعوری کە بەسەری دادێ چونکە کە لە بیری کرد پار و پێرار قەناعەتی لە فلانە پرسیاردا چی بوە هەست ناکا بەو گۆڕانە شعوری و لاشعورییەی کە بۆی پەیدا دەبێ. بە لایەوە خۆی و باوەڕەکەی هەر کوڕەکەی پار و پێرارن.

ئەغلەب خەریکبوونی زیهینی هەمیشەیی و بەردەوام بە شتێکەوە هۆشی ون (عقل باطن) ئەوەندە دەجمێنێ و بە شێوەییکی نهێنی دەیخاتە گەڕ تا وا دەبێ لە پڕ گرێیەکی فکری وەک تەلەسم لە خۆوە دەکرێتەوە. هەڵبەت قەناعەتێکی تازە بۆ من پەیدا بووبێ بە شکڵی لاشعوری دەربارەی فەرقی تەمەنی باپیرم و حاجی قادر دەبێ لە ڕێی بزووتنەوەی هەست پێ نەکراوی هۆشی ونەوە بووبێ. ئەم شەرحەم هێنا ناو نووسینەکەم نەوەک وشەی «لاشعور» کە شەرحی لەگەڵدا نەبێ وەک لوغز و مەتەڵ هەڵقوتێ لە پێش چاوی خوێنەر. بەداخەوە پەیڕەویکەرانی فەلسەفەی نوێ دەرگەی باس کردن لە هۆشی ون و سایکۆلۆجییان بەستوە، نەکا خەلەل بگەینێ بە تاوی فەرقی چینایەتی و عامیلی ئابووری لە پێکهێنانی دەروونی مرۆڤ. هۆشی ون سەر دەکێشێتەوە بۆ بەهێز کردنی عامیلی زاتی لە تەفسیری کردار و ڕەفتاری تاک، کەواتە با بەردێکی لە سەر دانرێ… سەد ئەسەف. هەرچۆنێک بێ شعوری، قەناعەتی کۆنم گۆڕیەوە بە یەکێکی تازە و فەرقی پێنجساڵی تەمەنیش گەیشتە دە ساڵ. خوێنەری بەڕێز لەگەڵ مندا سرنجی خۆی بداتە ئەم دوو بەیتە:

سەر و ڕیشم سەراپا بۆتە لۆکە<br>
بە شەو هەم ڕازمە پشمین و کۆکە

لەبەر پیریی ئەوەندە بێحەواسم<br>
دەڵێی ئەرکانی ئیسلامی ئیناسم

بەر لەوە لە ڕووی دەلالەتیانەوە بۆ پیری لێیان بدوێین، با لێرەدا فرسەتە و هەڵەیێکی مەشوور ڕاست کەینەوە لە گوتنەوە و نووسینی ئەو دوو بەیتە. مصرعی دوایی، لە دیوانە چاپکراوەکانی حاجی بە چەشنێکی جیا لەوەی من نووسیم دەدیترێ. لەدیوانەکان وەهای دەخوێنێتەوە:

دەڵێی ئەرکانی ئیسلام نەناسم

ئەگەر مصرعەکە وا با وەک لە دیوانەکەدا چاپ کراوە مانانەکەی زۆر سادە دەبوو، هیچ نوکتە و جوانکارییەکی تایبەیی تێدا پەیدا نابێ. نەک هەر هێندە بەڵکوو ئەگەر بەیتەکە بە چاوێکی ڕەخنەگری ورد سەروبن بکەی دەبینی ئەو مەعنا سادەیە بێهێزەیشی تێدا دیارە چونکە لە سەرپاکی نامەکەی بۆ باپیرمی نووسیوە و ئەم بەیتەی تێدایە، هیچ دەوری فکرەی ئایینڎۆستی و کۆنە مەلایەتی خۆی هەڵنەهاتووە تا لێرەدا نەناسینی ئەرکانی ئیسلام ببێتە عەلامەتێکی ئاشکرا بۆ پیری و بێحەواسی. دەمەوێ بڵێم حاجی ڕێگەی خۆش نەکردوە لە شیعرەکانیدا تا لە نێوان چەندین عەلامەتی پیریدا نەناسینی ئەرکانی ئیسلام ببێتە عەلامەت. دەیتوانی بڵێ ئەوەندە پیرم ناتوانم بڕۆم... یا بخۆم... تا بنووسم، یا ببینم، یابخوێنمەوە. دەیان »ناتوانم»ی ئەوتۆ هەن بۆ دەبێ یەخەی ئەرکانی ئیسلامی بگرێ بێ ئەوە نوکتەییێک با لەتیفەیێک یا پێشەکییەک یا هەر هۆیەکی دەستنیشان کردن ئەمیان بێنێتە ڕوو؟ بۆیە دەڵێم مصرعەکە بەو جۆری کە چاپ کراوە بێهێزی تێدایە لە لایەنی مەعناوە، ڕاستیەکەی ئەمەیە:

دەڵێی ئەرکانی ئیسلامی ئیناسم

وشەی «ئیناس» شکڵنووسی ئێستاکەی کوردیە بە ئەسڵ لە وشەی «اناث» هاتووە. مەعلوومە مانای »اناث» لەکوردیدا «ژنان»ـە، ئەم وشەی «اناث» کە بووە بە قافیە بۆ «حەواس» بە تلفطی کوردانە دەخوێنرێتەوە و دەبێتە «اناس» کە بە ڕێنووسی ئێستاکە «ئیناس» دەنووسرێ. ڕەنگە حاجی بۆ خۆی هەر بە گوێرەی تلفظی کوردی وشەکەی نووسیبێ، چونکە لە شوێنی دیکەش ئەمەی کردوە:

بەم «نحو» ـەیە »صرف» ی عیشقبازی
«مستقبل» ی کەمترە لە مازی

هەمان شکڵ لە مەدحەکەی بەروبارەگای حەمەد ئاغای مامەشیش وشەی«هەمزە، فیضە، ارضە، لەرزە... »ی کردوە بە قافیە و «ئەرز» و «فەیز» ی نووسیوە. کە دەڵیم ڕەنگە حاجی بۆ خۆی «اناس»ی نووسێبێ بۆیەیە چونکە دەستخەتەکەی لە ناودا نەماوە تا قسە بە یەقیین بکەم. بەڵام دەستخەتیشی نەمابێ ئەوەی لێرەدا دەیڵێم حەقیقەتە و شوبهەیێکی تێدا نیە. کەواتە بە ئەسڵ نووسراوە (بە پێی شکڵنووسینی کۆن): «دلی ارکان اسلام اناسم» لە نووسینەوەدا نووسەران وشەی «اناسم» یان کردوە بە «نەناسم» چونکە وایان زانیوە «اناسم» لەگەڵ واتای بەیتەکە ڕێک ناکەوێ لەوەشدا حەقیان بووە: هەڵبەت بۆ ئیسپاتی پیری و بێحەواسی ناگوترێ «ئەرکانی ئیسلامی ئەناسم». کەواتە لە ڕێی نووسینەوەی دەستاودەست وشەی «اناثم - ئیناسم» کە وەختی خۆی «اناسم» نووسراوە کراوە بە «نەناسم» بەو گوێرە ئەسڵی مەبەس و مانای بەیتەکە تێچووە. حاجی لە ئەسڵدا گوتوەتی:

لەبەر پیریی ئەوەندە بێحەواسم
دەڵێی ئەرکانی ئیسلامی «اناثم»

بەڵام وشەی «اناثم» لەبەر قافیەی شیعر کوردانە خوێندراوەتەوە و کراوە بە «اناسم-ئیناسم». بەم شکڵە و واتای بەیتەکە ڕوون دەبێتەوە کە ئەمەیە. لەبەر پیری ئەوەندە بێحەواس بووم وەک ئەرکانی ژنانم لێ هاتووە، کە ئەمە ئیشارەیە بۆ گوتەیێکی کۆن کە دەڵێ ژن دینیان نوقسانە. ئەگەر لەبەر قافیە نەبا مومکین بوو بگوترێ «دەڵێی ئەرکانی ئیسلامی ژنانم». واتای وا توێکڵدار لەسەردەمی حاجی زۆر باو بووە، ئیمڕۆش ئەگەر شاعیر بە توێکڵان بوێرێ و دەسەڵاتی هونەری ئەوەی هەبێ بیانکا بە جلی جوان، خێرا دەیانکاتە بە هەڵبەستەکانی و شانازیشی پێوە دەکا. شیعری ڕەمز هێندەی توێکڵ لە خۆ ئاڵاندوە خاوەنەکەی نەبێ، وا هەیە کەس تێی ناگا.

با بێینە سەر مەبەس، ناچاری تەواوێکی لێ دوورخستینەوە. حاجی بەو دوو بەیتە وەسفی پیریی خۆی دەکا. بە پێی سەراحەتی بێ «توێکڵ» و لەبەر هێزی دەلالەتی وشەکان، ئاشکرایەکی یەکجار ئاشکرایە کەوا هۆی ئەو بێحەواسی و سەروڕیش

بوونە لۆکەیە پیری و تەمەنی درێژە نەک ناساغی وەیا ناڕاحەتی وەزع وەیا هەر هۆیەکی دیکەی کە خەڵق بێهێز و فەرتووت دەکا. حاجی کە ئەمەی نووسیوە دەبێ پیر بووبێ و ڕێی ئەوە نیە لەو تەئکید و دووبارە کردنەوەیە کە بڵێین بۆ مبالەغە بووە یا خود مەبەسی شەکوای حاڵە لە دەستی ڕۆژگار و غەریبی. ئەگەر لەبەر چاوەدێری لایەنی شەکوای حاڵ شتێکیش کەم کەینەوە لە واتای دوو بەیتەکە دیسان ئەوەندە تێدا دەمێنێتەوە کە حاجی پیر بووە. دەوجا با بزانین حاجی کەی ئەمەی نووسیوە؟ کەی نامەی ناردووە بۆ حاجی مەلا عەبدوڵا؟

بەداخەوە لێرەشدا لە تخمین بەولاوە شتێکمان بەدەستەوە نیە بەڵام تخمینەکەمان، خۆشبەختانە، لەسەر بناغەی مەحکەمەوە هەڵدەستێ. لەم زەمینەدا دوو بەڵگە هەن لای من یارمەتیمان بدەن بۆ نزیکبوونەوە لە زانینی کاتی نووسینی هەڵبەستەکە.

یەکەمیان ئەوەیە باوکم دەیگێڕایەوە دەیگوت بە بیرم دێ نامەکەی حاجی هات و جوابەکەی نووسرایەوە و ڕەوانەکرا بۆ ئەستەمبوڵ. ئەم گوتەی «بەبیرم دێ» تەمەنێک دەگرێتەوە لە منداڵی زیاتر و لە باڵغی کەمتر. باوکم 1293 ی کۆچی هاتۆتە دونیا، با ئەمە لێرەبێ تا بەڵگەی دوەم باس دەکەین.

بەڵگەی دوەم »مسودە»ی جوابەکەی باپیرمە بۆ حاجی قادر. ئەم «مسودە»یە لە کاغەزی حوکمەتی ساڵەو ساڵ دەردەچێ و لەکار دێ بەڵام بەنیسبەت ئەم کاغەزەوە کە کەوتۆتە لای کەسێکی دەرەوەی ئاڵقەی حکومەت ئیمکان هەیە لە هەمان ساڵدا بەکار نەهاتبێ. لەگەڵ ئەو ئیحتیمالەش کە ڕواڵەتی ساڵێک و دوو ساڵ و سێ ساڵیش دەگرێتەوە ناشێ کاغەزەکە لە ساڵێک زیاتر مابێتەوە واتە نابێ جوابەکەی باپیرم لە 1307 دواکەوتبێ. چونکە ئەوسا جێی قسەکەی باوکم نابێتەوە کە فەرمووی«بەبیرم دێ». لە 1306 دا باوکم 13 ساڵی بووە. بەلای منەوە ئەم تەمەنە یاخود ئەوپەڕی تەمەنی 14ساڵی، بۆ یەکێکی وەک مەلای گەورە، کەڵکی پێوەیە بۆ مەفهومی «بەبیرم دێ» چونکە لەوە زیاتر دەیخاتە وەزعێک کە بە سەروبەری «تبیض» و ڕێکخستن و هەناردنەوەی کاغەزەکەوە خەریک بێ. باوکم لە 18 ساڵی ئیجازەی لە باوکی وەرگرتوە و لە جێگەی ئەو دەرسی گوتۆتەوە. بەڕاستی کە بە وردی وەزعەکە لێک دەدەمەوە ساڵی 1306 گەلێک لە بارتر و گونجاوترە بۆ جێبوونەوەی ئەو گوتەی «بەبیرم دێ».

دەوجا کە قەناعەت بێنین حاجی قادر لە 1306 وەیا 1307 نامەی بۆ باپیرم نووسیبێ ئەوسا باپیرم تەمەنی 56، 57 ساڵ بوە. تۆ بڵێی چەند ساڵان ئیزافەی 56، 57 بکەین تاسەر و ڕیش دەبێتە لۆکە و گوتەی «لە بەر پیری ئەوەندە بێحەواسم» جێی خۆی دەکاتەوە؟ هەرچەند مەودای قسە بۆ تحدیدی ئەو ئیزافەیە زۆر بەرینە و مرۆڤ دەتوانێ ژمارەیێک بڵێ کە ئارەزۆی خۆی هەڵی دەبژێرێ، بەڵام تێبینی ڕووداوی دیکە ئەو مەیدانە کورت دەکاتەوە، بە دەم نووسینەوە و لە جێی مناسبی خۆیدا باسی دەکەین. من لەو باوەڕەدام ئیزافەی کەمتر لە 10 ساڵ بۆ تەمەنی 56، 57 ساڵێ ئەم هەموو «لۆکە« و «بێحەواسییە» بەرهەم ناهێنێ. کە باپیرم ئەوسا 56 بووبێ، ئیزافەی 10 ساڵ عومری حاجی دەگەیەنێ بە 66 ساڵ. وا دەزانم ئەو تەمەنە لێی دەوەشێتەوە بە دەم سۆزی غوربەتیەوە شەکوای بێحەواسی و ڕیشسپیەتی لێ بکرێ. غوربەتیشی لێ دەرچێ، 66 ساڵ عومر گەلێک کەس بێحەواس و ڕیشسپی دەکا. وەک دیتمان و بۆی چووین فەرقی 10 ساڵ عومر تەوجیهی ئەوەش دەکا حاجی قادر خۆی دانابێ بە «ئەسپی کۆن» و باپیریشمی بە «ئاهوو ڕەوش» لەقەڵەم دابێ.

ئەگەر بگوترێ 66 ساڵ عومرێک نیە بۆ ئەو هەموو شەکوایە دەست بدا و فەرقی 10 ساڵانیش ئەسپی کۆن و ئاهوو ڕەوش توجیە ناکا ئەوسا دەبێ ساڵی لەدایکبوونی حاجی بەرەو دوا بگێڕینەوە و بیخەینە پێش 1240 چونکە مەجالی ئەوە نیە ساڵێ نامەکەی لە 1306 وەیا 1307 دواوەتر بێنین بە هۆی ئەوەوە کە ئەوسا باوکم لە عومرێکدا دەبێ دەست نەدا بۆ »بە بیرم دێ«.

لەوانەیە خوێنەر هەبێ بڵێ بۆ وا یەخەی ئەم «لۆکەی ڕیش» و گوتەی «بەبیرم دێ»ت گرتوە، بە هەموو ڕوویێکدا وەریاندەگێڕی و ئەم دیو ئەو دیویان پێ دەکەی! کەی بوە نووسەر خۆی خەریک کردبێ بە بەشی وەها سادە و ئاساییەوە. بۆ ناگوێزیتەوە بۆ باسێکی گرینگتر؟ ئەگەر ڕەخنە وا بگیرێ، بۆ وەرامدانەوەی مەیدانی قسە کردن فرەوانە. بەڵام ئەوەندە بەسە لێرەدا بڵێم کە ئێمە خەریک بین بە دۆزینەوەی ساڵی وەلادەتی حاجییەوە دەبێ بنکە و «سەرشار»[4]ێک هەبێ لەوێوە

---

[4] – یاری کلاسیکی کوردی هەیە لە سەرووی مەیدانی یارییەکەدا جێگەیێکی دیاریکراو تەرخان دەکرێ لە سەرەتاوە یاریکەران لەوێوە دەست دەکەن بە هەموو

جستۆجۆی مەبەس دەست پێ بکەین، ناکرێ سەروا بین وەیا ڕەهەوا کەوین و «تیار»ی ئاو و با ڕامالمان داو نەزانین بۆ کوێمان دەبا. بنکە و سەرشاریش مەحکەم نەبن جستوجۆیەکە نامانگەیەنێ بە ئامانجێکی خۆش. بە لای منەوە دۆزینەوەی سالی وەلادەتی حاجی قادریش مەبەسێکی کەم نیە. لەدایکبوونی مرۆڤ بەنیسبەت هەموو ژیان و جموجۆلیەوە وەک سەرچاوەی ئاو وایە. جوغرافیازانەکان تا دەزانن ڕووباری کۆنغۆ وەیا سەیحوون وەیا زێی بادینان لە چ ئەرز و کانیاوێک هەلدەقولن چەند زەحمەت دەکێشن، وەک ئەمانەتی گرانبەها مەعلووماتێکی کە بەردەستیان دەکەوێ جیلێکیان تەسلیم بە جیلی دوای خۆی دەکا. زۆرم دیوە زانای ئارکایالۆجی بۆ ساغ کردنەوەی کاتی نووسینەوەی یەک دوو ئیشارەتی سەر خشتێکی کۆن سالەهای تەقەللای بەسەر بردوە، لە ڕۆژهەلاتەوە بۆ ڕۆژئاوا سەفەری کردوە، سەری مۆزەخانە و کتێبخانەی گەورەی جیهانی داوە تاکوو بە شێوەیێکی مەیلەو ڕاست مێژوویێکی دەستنیشان کردوە، واش بوە نەگەیوە بە نەتیجە.

بەنیسبەت باسەکەی ئێمەیشەوە دۆزینەوەی ئەو سالی وەلادەتی حاجی وەک ئەوانە و لە وانیش گرینگترە. سەرەڕای نرخی مەعنەوی یەکجار زل، لە دۆزینەوەی ئەو سالەدا یا هەر نەبێ سالێکی لە حەقیقەت نزیک، نرخێکی ماددی مێژوویی بنجی ئەوتۆش هەیە بەنیسبەت تێکڕای باسەکە و هەموو باسێکی عەلاقەدار لەگەلیدا کە بە هیچ جۆر ئیمکان نیە بخرێتە پشگوێ. دوزینەوەی سالی وەلادەتی حاجی ڕاستی و درۆی زۆر گوتە و خەبەران ساغ دەکاتەوە کە خراونەتە گوزارشتی ژیانیەوە یا عەلاقەیان هەیە بەوەوە.

بۆ نموونە دەلێم کە گوترا لە فلانە سالدا حاجی ڕۆی بۆ ئەستەمبوڵ کەچی سالی وەلادەتی ڕاگەیاند حاجی لەو سالەدا منداڵ بوە دەرحاڵ هەلەی خەبەرەکەمان بۆ دەردەکەوێ بێ ئەوەی مەجبوور بین خۆمان بە بەلگەی دیکەوە ماندوو کەین، هەموو باس و خواسێکیش کە هەلبەسترابێ لەسەر ئەو هەلەیە لە خۆوە هەلدەوەرێن. مومکینە دۆزینەوی سالی وەلادەتی لەوەشدا یارمەتیمان بدا قەناعەت

---

پێشەکییەک و کۆتایی برگە و پشووی یاریەکەشدا هەر لەو جێگەیە کۆ دەبنەوە و دۆڕاو و سەرکەوتە ڕۆلیان بە یەکدی دەگۆڕنەوە. لێرەدا وشەی «سەرشار» بەرامبەر وشەی «منطلق»ی زۆر بەکارهاتووی عەرەبی دەوەستێ.

بێنین کە فڵانە قەسیدەی بەپێی شێوەی هەرزەکارییەکی تێدایە، یاخود وەقارێکی تێدایە، لە موناسەبەی فلانە ڕووداودا گوترابێ چونکە لەو تەئریخەدا حاجی هەرزە یا کامڵ بوە. خولاسە سوودی ساغ کردنەوەی ساڵی وەلادەتی شتێک نیە محتاجی ئیسپات کردن بێ.

کە ئەمە وابێ، بەداهەتەن وایشە، دوو بنکە سەرشاری وەک شایەدییەکەی باوکم و شیعری حاجی قادریش بۆ گەیشتن بە سەر ڕشتەیێکی پتەو، لەوانەنە هەموو کەسێک بیانکا بە پاڵپشتی هەوڵ و تەقەللای. تا من دیبێتم و بیستبێتم هاوتای ئەو پشاڵپشتەم نەناسیوە. شایەدی باوکم و شیعرەکەی حاجی، لە هەموو شتێک بترازێ، دوو بەڵگەی عەفووی بێ مەبەسن هیچیان خۆی نەهێناوەتەوە بۆ سەپاندنی سوودێک وەیا لەسەر کردنەوەی باوەڕێک. لە هیچ ڕوویێکەوە گومانیان لێ ناکرێ لە فەرزی هی پیاوی وەک مەلای گەورە و حاجی قادریش نەبان. شایەدی هەردوویان لە باری «ذاتی و موضوعی»یەوە سەرووی گومان لێ کردنن. ئێمە دەیانخەینە نێوان سێ مێژووی مەعلوومەوە کە 1250 وەلادەتی باپیرمە و 1293 وەلادەتی باوکمە و 1306 مێژووی کاغەزەکەی حکومەتییە و دەلالەتیان لێ وەردەگرین بەڵکوو بتوانین جغزێکی مەیلەو تەسک بکێشین لە دەوری ساڵی وەلادەتی حاجی، بۆ خاتری تیری نیشانمان لە هەر نوقتەیێکی ناو جغزەکە بکەوێ لە نوقتەی ڕاستەقینەی مەبەس دوور نەکەوێتەوە.

ئەم کارەی مێشک خەریک کردن بە لێکدانەوەی بەراوردی کردن بە یەکدی گرتن بۆ بەهێزبوونی مەلەکەی »قیاس»یش کارێکی ژیرانەیە، وەک وەرزشە بۆ لەش. چونکە کوردەواری تازەبەتازە کەوتۆتە سەر باری تۆژینەوە، تابڵێی پێویستی هەیە بە قووڵبوونەوە و درێژەدان بە سرنج گرتن نەکا خوو بگرێ بە مەلە لە تەنکاو وکێڵانی سەرڕەو. ئەوەندە هەیە، ماندووبوونم بۆ وەدەستهێنانی ئەنجام نابێ ببێتە هۆی «تعصب» بۆ ئەو ئەنجامە. مەبەس خزمەتی ڕاستییە، لە هەر کوێیێک سەر هەڵدا بە خێر بێ. دەبینی بیری یازدە گەزی ناگا بە ئاو کەچی وا دەبێ لە هەڵقەندنی چاڵە دەغڵ ئاو دەردێ.

لەگەڵ حیکایەتی «ئەسپی کۆن» یەک دوو قسە ماوە بیکەین و بەجارێ لێی ببینەوە. حاجی کە ئەم چوارینەی بۆ باپیرم دانابێ دەبێ پێش چوونی بۆ ئەستەمبوڵ

گوتبێتی، چونکە ماناکەی وا ڕادەگەیەنێ کە بۆ یەکێک گوترا بێ لەگەڵ حاجیدا شیعربازی کردبێ:

حاجی قادر نیە بەیتێکی وەکوو ئێوە بڵێ

لەو ڕووەوە شایەدییەکی بێ پەنا و پێچ دەدا. کەواتە لە کاتی هەڵبەستنی ئەم چوارینەیەدا دەبێ حاجی قادر لە تەمەنێکدا بووبێ ئەوپەڕی ئیحتمالی لە 42-43 ساڵ زیاتر نەبووبێ، چونکە بە پێی لێکدانەوە و زەواهیری حاڵ و دەلالەتی هەندێ ڕووداو دەبێ چوونی حاجی بۆ ئەستەمبوڵ لە سەرەتاکانی 1280 بووبێ (لە جێی مناسبدا ئەم لایەنە ڕوون دەکەینەوە) و لە 1283 دواتر نەکەوتبێ. هەڵبەت ئەو تەمەنەی 42-43 ساڵی لەوەوە دێ کە وەلادەتی لە 1240 بووبێ وەک من بۆی دەچم. بۆیەیش لای ژوورووی مانەوەی لە کۆیە دەکەین بە احتمالی ئەوە کە کاتی هەڵبەستنی چوارینەکە بێ تاکوو باشتر لەگەڵ مانای «ئەسپی کۆن» بگونجێ. ئەگەر ڕێ هەبا مانەوەی لە کۆیە بەرەو 84 و 85 بێنین قاڵبمان ڕێکتر دەکرد بۆ قەڵافەتی چوارینەکە چونکە پەڕاوێزی واتای «ئەسپی کۆن» بەلای پیریدا تا بڵێی خۆی لێک دەکێشێتەوە، بەڵام ئیمکان نیە ئەو خۆ لێککێشانەوە لە چەند ساڵێکی سەرەتای 1280 واوەتر هاتبێ لەبەر دەلالەتی شتی دیکەی بێ شوبهە کە ڕێی ئەو ئیمکان نادەن. کە دەشڵێم دەبێ پێش سەفەری ئەستەمبوڵ شعرەکەی دانابێ بۆیەیە چونکە دوای ئەو سەفەرە حاجی قادر باپیرمی نەدیتۆتەوە، هەر نەگەڕاوەتەوە بۆ کۆیێ تا کەسی کۆیێ ببینێتەوە، ئەڵوەدای یەکجارەکی بوە.

ئەم تێبینییەی دوایی لایەنێکی دیکەش ڕوون دەکاتەوە. حاجی کە ئەم چوارینەیەی لە کۆیێ گوتبێ چ بۆ حاجی مەلا عەبدوڵای دانابێ چ بۆ غەیری ئەو، حیسابی 1283 تێک ناچێ چونکە بە گۆڕانی شەخسی مەدحکراو ساڵی سەفەری ئەستەمبوڵی ناگۆڕێ.

دوا بەدوای ئەم بەراوردییە پرسیارێک خۆ دێنێتە پێش وەها چەسپاوە بە مەوزووعەوە هەر دەڵێی ڕووی دەمی سککەیێکە ئەگەر ئەوەی تازە ویستمان ساغی کەینەوە ڕووی یەکەمی بێ: کە بیسەلمێنین فەرقی تەمەنی حاجی قادر و حاجی مەلا عەبدوڵا لە 10 ساڵ کەمتر بێ، ئەدی چۆن وا ڕێککەوتوە هەردوویان ڕەفیقی

سەفەری خوێندن و فەقێیەتی بن؟ چۆن بەیەکەوە خوێندوویانە؟ لە ڕواڵەتدا پرسیارەکە وەک موشکیلە دێتە بەرچاو بەڵام بەدەم لێکدانەوەیێکی شارەزایانە پرسیارەکە وەرامێکی بێ گرێوگاڵ بە دەستەوە دەدا.

هەموو جاران هاوڕێیانی خوێندن یەک تەمەن نین، یەک ماددەش ناخوێنن. پلەی «مستعد»یەتی لە مزگەوت قۆناغێکی فرەوانە، میان ئەم سەر سەر ئەو سەری بەرینترە لە قۆناغی«کلیه»ی خوێندنی نوێ. هەروەک مومکینە لە کلیەدا قوتابیەک لە پۆلی یەکەم و برادەرەکەی لە پۆلی پێنجەم بێ هەروەهاش دەشێ مستعدێک لە خوێندندا چەند ساڵێک پێش هاوڕێکەی کەوتبێتەوە. هاوڕێیی لە خوێندندا مەرج نیە دوو کەسان بێنێتە سەر هەمان کتێب. لەبەر ئەمە دەشێ حاجی قادر هەندێک لە خوێندندا بەرەوژوورتر بووبێ لە باپیرم بەڵام ئەو فەرقەشیان نەبووبێ یەکێکیان بکا بە سوختەی ئەوی دیش بکا بە مستعد.

مەعلووماتی خانەوادەیی لای من هەیە، بەئیسپات و بێشوبهە، ئەوە دەگەیەنێ کە سەفەرەکەی باپیرم بۆ باڵەکایەتی لەگەڵ حاجی قادر بە «مستعد» بوە نەک فەقێیەتی، لە سوختەیی وازبێنە.

یەکیک لەو مەعلووماتانە ئەوەیە هەر لەو گەشتی خوێندنی لەگەڵ حاجی قادردا باپیرم بەینێک لای مەلای «خەتێ» ی خوێندوە کە لە مەلا هەرە زلەکانی سەردەمی خۆی بوە و لە عومریشدا گەورەتر بوە لە حاجی مەلا ئەسعەد، باوکی باپیرم، بە دەلیلی ئەوە کە حاجی مەلا ئەسعەدیش لەکاتی گەنجایەتی دەرسی خوێندوە لای مەلای خەتێ، حاشیەی نووسیوەتەوە بە دەوری کتێبانەوە و لەکۆتایدا دەڵێ لە مەدرەسەی مەلای خەتێ ئەم حاشیەم تدوین کرد. دیارە مەلایێکی وا زل دەرس بە فەقێ و سوختە ناڵێتەوە. مناسبی ئێرە لەتیفەیێک هەیە باس کردنی بێسوود نیە و تۆمار کردنی دەیپارێزێ لە فۆتان.

بۆ یەک دوو چرکەی سەعات ڕووخسەت دەخوازم لە گیانی حاجی قادر تا کە لەتیفەکە بە ئیزنی ئەو دەگێڕمەوە ئەوجا دێمە سەر ئەسڵی بابەت. مەلای خەتێ لەسەر مەوزووعی شێخ نەبیی ماویلی کە لە جێگەی خۆیدا بەقەدەر پەیوەندی بە حاجی قادرەوە باسی دەکەین دڵی شکا بوو لە حاجی مەلا ئەسعەدی باوکی باپیرم. هەرچەند لە سەرەتای عومریدا شێخ نەبیی لە مزگەوتی مەلای خەتێی خوێندوە

(کتێب هەیە لای ئێمە حاشیەی دەستنووسی شێخ نەبیی بەسەرەوەیە و لە هەندێ جێگەدا دەڵێ لە مەدرەسەی مەلای خەتێ لای شێخ مصطفی ئەمەم نووسیوە)، بەڵام لە دواییدا کە شێخ نەبی جەنبەی تەریقی نەقشبەندی دەگرێ و دەبێ بە «شێخ» و دەست دەکا بە «ارشاد»، مەلای خەتێ لێی دەڕەنجێ و دەکەوێتە دژیەوە. وەک بیستراوە مەلای خەتێ نەقشبەندی خۆش نەویستوون، بەتایبەتی ئەو شێخە نەقشبەندیانەی لەبەر تەماعی دونیا ارشادەکە بۆ دین ناکەن.

حاجی مەلا ئەسعەد هەرچەند بۆ خۆی ارشادی نەکردوە بەڵام مەشرەبی نەقشبەندی بوە، لە زۆر جێگەدا بەدەستی خۆی نووسیوەتی «الشافعي مذهبا و النقشبندي مشربا« مەیلی بۆ نەقشبەندییەتیی لە باوکییەوە[5] بۆ ماوەتەوە کە یەکێک بوە لە خەلیفەکانی «مولانا خالد». لە کتێبی «بغیة الواجد فی مکتوبات حضرة مولانا خالد»کە برازای مولانا خالد دایناوە و لە شام چاپ کراوە چەند کاغەزێکی مەولانای تێدایە کە بۆ باوکی حاجی مەلا ئەسعەدی نووسیوە. لەگەڵ شەرحی کاغەزەکان دانەری کتێب باسی هێندەش دەکا کە کوڕێکی «واثق بالله» برازاییێکی مەولانای مارە کردوە و بوە بە «داماد». بەو پێیە دەبێ دامادەکە برای حاجی مەلا ئەسعەد بێ. بەڵام ئەوەی ڕاستی بێ حاجی مەلا ئەسعەد یەک برای هەبوە، نازانم دانەری کتێب چۆن لە عاست زاوای خۆیدا ئەم سەهوەی تووش بوە.

ئەم مەیلەی نەقشبەندییەتی وای کردوە حاجی مەلا ئەسعەد یارمەتی «شێخ نەبی»بدا کە لە کۆیێ نیشتەجی بێ و ارشادی تێدا بکا. دەبێ ئەوەش بڵێین لەو کاتانەدا شێخ نەبی شتێکی بێشەرعی و نارەوای لێ نەدیترا بوو دەنا مومکین نەبوو پیاوێکی وەک حاجی مەلا ئەسعەد، نەک یارمەتی بدا، بەڵکوو کەمترین پەیوەندی لەگەڵدا پەیدا بکا.

هەرچۆنێک بێ ئەوەی گوتم ڕووی دا و بوو بە هۆی دڵشکانی مەلای خەتێ لە حاجی مەلا ئەسعەد. لە دەمی ئەم دڵشکانەدا بەدکار و فیتنەجۆ بە مەلای خەتێ

[5] - واثق بالله مەلا عەبدوڵلای کوڕی مەلا عەبدولرەحمانی کاکی جەلی. ئەویش لە حەقیقەتدا حاجی بوە بەڵام بۆی بە لەقەب نەماوەتەوە بەهۆی ئەوەوە کە نەوەی خۆی شۆرەتی بە حاجی مەلا عەبدوڵلا وەرگرت.

ڕادەگەیەنن کەوا حاجی مەلا ئەسعەد لە مەجلیسی خۆیدا گوتوەتی مەلای خەتێ پیر بوە خڵەفاوە بۆیە وا لە دژی نەقشییانە. کە باپیرم دەچێتە خزمەتی و خۆی پێ دەناسێنێ کەوا عەبدوڵای کوڕی حاجی کاک ئەسعەدم، مەلای خەتێ بەین بەینە پێی دەڵێ ئەرێ ڕۆڵە تۆ ناوت چی بوو هەر لەبیرم دەچێتەوە... یەک دوو جاران باپیرم دەڵێ قوربان چەند جاران عەرزم کردی من فڵانەکەسەم ئەگەر چ مەقسەدێکت هەیە لەو پرسیارانە بیفەرمووی پێم خۆشە! مەلاش دەفەرموێ کوڕم لێم مەگرە پیر بووم خڵەفاوم شتم لەبیر دەچێ... باپیرم دەزانێ مەبەسەکە چیە و قسەکە ئیشارەیە بۆ ئەوە کە گۆیا حاجی کاک ئەسعەد گوتبێتی مەلای خەتێ خڵەفاوە، ئەویش عەرزی دەکاتەوە ئەوەی بەدکاران نەقڵیان کردوە ئەگەر ڕاست با چۆن باوکم دەیناردمە خزمەتت بۆ خوێندن. جوابەکەی باپیرم دڵی مامۆستای تەسکین دەکا و قەناعەتی پێ دێنێ کە ئەوەی بە زاری حاجی کاک ئەسعەدەوە گوتراوە ئەسڵ و ئەوساسی نیە... ئیتر باپیرم بەینێک لای دەمێنێتەوە و بۆ دەرس خوێندن زۆریش بەینیان خۆش بوە. ڕەنگە جارێکی دیکەش باسی ئەم خوێندنەی باپیرم لای مەلای خەتێ بکەینەوە و ڕوون کردنەوەی بارێکی ژیانی حاجی لە کەینوبەینی خوێندندا.

جگە لەوەی باسم کرد لە ئیمکانی بوونی تەفاوت لە میانی سەرو بنی خوێندنی یەک قۆناغ، هۆیەکی بەتین هەیە بۆ ئەوەی تەفاوتی میانی حاجی قادر و باپیرم لە خوێندندا کەمتر دەکاتەوە لە تەفاوتی میانی عومریان کە دەساڵێک بووبێ. ئەو وەزعی کەوا بۆ حاجی مەلا عەبدوڵا ڕێک کەوتوە و یارمەتی داوە مەودای بەینی کتێبان خێرا تێپەڕ کا و قۆناغی یەک لەدوای یەکی خوێندن زووتر ببڕێ، ئا ئەو وەزعە بەنیسبەت حاجی قادرەوە وجودی نەبوە.

حاجی مەلا عەبدوڵای پشتاوپشت مەلایەتی و خوێندنی لە خانەوادەی خۆیەوە بە میرات بۆ هاتووە، باوکی «حاجی مەلا ئەسعەد» مەلاییکی گەورە و خاوەن دوو مەدرەسەی هەمیشە پڕ فەقێ و مستعد بوە و کتێبخانەی زۆر دەوڵەمەندی هەبوە، مەجلیسی دەرس و وەعز و ئەدەب و موناقەشەی زانستی کە بە دەوری دائیم لە گەڕدا بوو، هێندەی خوێندنی تایبەتی، یارمەتی حاجی مەلا عەبدوڵای داوە لە هەنگاوی بەرەو پێشەوە. هەڵبەت زەرفی وا لەبار کە بۆ یەکێک ڕێک کەوێت و بۆ یەکێک ڕێک نەکەوێت بەشێکی زۆر لە تەفاوتی میانی عومریان تێ دێنێتەوە.

حاجی قادر بە دەست ناگزووری و زەحمەتی گوزەرانیشەوە تێماوە و لە خوێندندا دواکەوتووە. فەقێی هەزار گەلێ جاران واز لە خوێندن دێنێ یاخود کەمتەرخەمی دەکا بەهۆی ناچاربوون بە پەیدا کردنی نان. باوەڕ دەکەم حاجی قادر لەم قاعیدەیە بەدەر نەبوە. بۆ ئەم لایەنە شایەدێکی باوەڕپێکراو، خوا لێی خۆش بێ، شێخ ڕەحیم بوو کە بە پێی قسەی خۆی و ڕاگەیاندنی ئەو گوزارشتەی دەیگێڕایەوە تەمەنی لە 110ساڵ تێپەڕی کردبوو، بەڵێ شێخ ڕەحیم باسی ئەوەی کردوە کە لە منداڵیدا لەگەڵ حاجی قادر بەیەکەوە شاگرد ئیمەنتی دروو بوون. شێخ ڕەحیم پیاوێکی مووسڵمان و ڕاستگۆی ڕێزلێگیراو بوو. قسەی جێی گومان لێ کردن نەبوو، چ موجیبێکیش نیە گومان لەوەدا بکرێ کە هاوتەمەن و هاوپیشەی حاجی قادر بووبێ لە کاتی منداڵیدا.

هاوتەمەنێکی دیکەی خۆیشی مابوو کە ناوی حاجی شێخ مەحموود و پیاوێکی مووسڵمان و بە حورمەت و لە بنەماڵەیێکی دینی ناسراو بوو لە کۆیێ، ئەمیان تاساڵی 1941 ژیا و بەگوێرەی کە لێی دەگێڕنەوە گوتبووی تەمەنی لە 120 ساڵ پتر بوە، قسەکەشی ڕاستە و بەڵگەی ڕاستیشی ئەوەیە کە خۆی یەکێک بوە لەوانەی حاجی بەکر ئاغا بۆ مووسڵی ناردوون لە ساڵی 1260 بە دوای وەستای بینا بۆ دروست کردنی مزگەوتی گەورە. ساڵی مردنی کە 1941 بێ و دەوەستێتە بەرانبەر 1360ی کۆچی سەد ساڵ دوای دروست کردنی مزگەوتی گەورەیە، هەڵبەت کە لەو ساڵەدا چوو بێ بەدوای وەستادا بۆ مووسڵ دەبێ تەمەنی لە 20 ساڵ زیاتر بووبێ. خۆی دەیگوت تەمەنی گەیوە بە 128ساڵ. لەگەڵ شێخ ڕەحیمیش دەمەتەقەیان بوە لەسەر عومر. هەر یەکەیان داوای کردوە کە خۆی عومری زیاتر بوە.

بەهەمەحاڵ شێخ ڕەحیم گوتوەتی کەوا نەک لەگەڵ حاجی قادر بەیەکەوە شاگرد بوون و بەس، گوتوشیەتی لە تەمەندا خۆی لە حاجی گەوەرەتر بوە. بالێرەدا ئەوەندەش بخەمە سەر نووسینەکەم لە قسەکانی حاجی شێخ مەحموود کە گوتبووی دوای تەواوبوونی مزگەوتی گەوەرە بە وڵاغی خۆی وەستاکانی بردۆتەوە مووسڵ لە ڕێی ناوچیا ڕەتی کردوون و لە گوندی «فاتمەلان»کە دەکەوێتە بەینی گوندی «کێشکە و ونکە« بیرێکی لێداوە و بە بەردی «نقار» ئەو وەستایانە هەڵیانناوە. جا ئەگەر بیرێک هەبێ لە فاتمەلان بەو شێوە دروست کرابێ کە ڕایدەگەیەنێ هەمان

بیره کە بە دوا تەواوبوونی بینای مزگەوتی گەورە و بەهۆی حاجی شێخ مەحموود و بە دەستی وەستای مووسڵی هەڵنراوە.

با بێینە سەر ڕاستە شەقامی باسەکەمان. خولاسەی قسە ئەوەیە حاجی قادریش وەک سەدان فەقێی بێماڵ ئەم کۆسپانە بەرهەڵستییان کردووە لە ڕەوتی خێرا و بێگرێ لە خوێندندا.

لێرەدا گوزارشتێک[6] کە مناسبی جێگەیە و دێرێک لە دەفتەری ژیانی حاجی دەخوێنێتەوە خۆ فەرزدەکا بۆ نووسین و بەو نووسینە لە دەست فۆتانیش دەترازێ. جارێکیان حاجی قادر و حاجی مەلا عەبدولا بەیەکەوە سەفەرێک بۆ دەرەوەی کۆیێ، بەپێی بیستنی خۆم بۆ چنارۆک چوون، حاجی قادر بەپێیان بوە و حاجی مەلا عەبدولا بە سواری. وەک چاوەڕوان دەکرێ حاجی لە ڕۆیشتندا دوا دەکەوێ. باپیریشم بە شۆخییەکەوە پێی دەڵێ حاجی خێراکە دامای. حاجیش فەوری بەدەم ڕۆیشتنەوە بەم فەردە وەرام دەداتەوە و دەڵێ:

تۆ خۆش دەبەزی ئەسپی بەزینت پێیە
من ناگەمە تۆ ئەسپی بەزینم پێیە

جناس و وردەکاریی فەردەکە حاجەت بە شی کردنەوە ناکا، لە خۆوە گەشەیانە و کالایەکن بەبەر حاجی قادرەوە شیرین. ئەم سواریی و پیادەییە شتێک لە باری ئابووری حاجی ڕوون دەکاتەوە.

پوختەی گوتار ڕادەگەیێنێ هۆی کورتب ونەوەی ماوەی خوێندن لە بەینی حاجی قادر و باپیرمدا لە یەکێک و دوان زیاتر بوە. کەواتە وەک لێکدانەوەی ورد دەری دەخا جیاوازی 10ساڵەی تەمەن لە میانی حاجی و باپیرمدا نەبۆتە مانیعی نزیکبوونیان لە لایەنی خوێندنەوە، بەڵکوو ئەو تفاوتە هەرچەند لە زاهیردا ناگونجێ لەگەڵ هاوڕێیی خوێندنیان کەچی لە ڕاستیدا و بە حوکمی واقیع وا ڕێک هاتوون و

---

[6] – ئەم گوزارشتە بەر لە بڵاوبوونەوەی ئەم نووسیە وەک یەکێک لە هەواڵە تازە و نەزانراوەکانی حاجی لە گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد بڵاو بۆوە.

لەگەڵ یەکدیدا گونجاون هەر دەڵێی ئەگەر وانەبا پەیوەندییەکەی میانی ئەو دوو مرۆڤە پەیدا نەدەبوو، واتە ئەگەر باپیرم لە تەمەندا ڕەفیقی حاجی قادر بە لە خوێندندا نەدەبوو بە ڕەفیقی بەڵکوو پێشی دەکەوتەوە لەبەر ئەو هۆیانەی کە تازە لە باس کردنیان بووینەوە.

ئەم ئەنجامەی لێرەدا پێی گەیوم گۆڕانێکی بنجیی بەسەردا هاتوە لە چاو ئەو ئەنجامەی پێش چەند ساڵێک پێی گەیشتبووم لە تەخمینی تەمەنی کەیفیی جوانڕۆیی و بە گوتار لە «دەفتەری کوردەواریی»دا بڵاو کرایەوە. بەنیسبەت «کەیفی»یەوە ئەوسا بۆ ئەوە چوو بووم کەوا لە تەمەندا دەبێ لە باپیرم گچکە تر بوو بێ بایی ئەوەندەی کە سوختە لە مامۆستای گچکەتر دەبێ، بە دوورم زانی بوو زەکای کەیفی ڕێی دابێ بە دواکەوتنی لە خوێندندا هێندەی بیکا بە سوختە لای هاوتەمەنێکی خۆی یا لە خۆی گچکەترێک. لە لێکدانەوەی ئەوسام هەر زەکای کەیفیم تێداخوێندبۆوە، ئیحتیمالی دواکەوتن بە دەست ناگزووریی و بێ وەزعییەوە نەهاتبووە بەر خەیاڵ و فکرم تا حیسابێکی بۆ بکەم کەسیش ئەو لایەنەی تێکەڵ بەو حیسابە نەکردبوو تا من پەندی لێ وەرگرم.

کەواتە من لە بیر و باوەڕی کۆنینەم دەگەڕێمەوە و ئێستای بە دووری نازانم کەوا کەیفی هاوتەمەنی باپیرم بووبێ وەیا نەختێکیش لەو بە عومرتر بووبێ و دەرسی لای خوێندبێ. بەڵام مومکینبوونی ئەم حاڵە نابێتە بەڵگە بۆ ڕوودانی چونکە مەرج نیە هەموو مومکینێک ڕووی دابێ. خوێنەر دڵنیا بێ لەوە کە ئەم تێبینیەم لەبەر قەناعەتی خۆم و دۆزینەوەی سەهوویەکی کۆنمە، کەموزۆر حیسابی ئەوەم تێدا نەکردووە کە پێش دەستی بکەم لەو نووسەرانەی سەهووەکەم دەدۆزنەوە و پێمی ڕادەگەیەننەوە. کێ دەڵێ نووسەران گوێ دەدەنە قسەیێکی تاقانەی لێرە بە پێشەوە گوتراوەی من و ئەوەندە فکری لێدەکەنەوە کە لە زیهنیان نەقش ببەستێ و لە دوارۆژدا بەراوردی دەکەن لەگەڵ گوتەیێکی دیکەم کە لەو نەچێ. زاهیر وا ڕادەگەینێ لێکدانەوەکەی ئەوسام وەک خۆمی ئیقناع کردبوو لای نووسەرانی دیکەش دژی قەناعەت نەبووە دەنا دەنگێکی ڕەخنەی لە لاییکەوە هەر بڵند دەکردەوە. بەنیسبەت منەوە هەڵکەوت و هەڵوەستێکی خۆشە دوو دیاری پێشکەش بە ئەدیبانی کورد بکەم و یەکێکیان عەیبی ئەوی پێشووترم بۆ بپۆشێ، عەیبێک کە خۆم لە دیارییەکی خۆمی ئاشکرا دەکەم.

جگە لەو ڕیوایەتە کە وەلادەتی حاجی دەگێڕێتەوە بۆ 1245ی کۆچی، ڕیوایەتی دیکە هەیە بۆ 1815ی ز. دەباتەوە، کە لە بەرانبەر 1231ی کۆچی دەوەستێ. نووسین هەیە وەلادەتی حاجی بە هەردوو ساڵی ک. ز. باس کردوە بەڵام لەوە ئاگادار نیە کە ساڵەکان یەکدی ناگرنەوە. هەمان سەهووی یەکدی نەگرتنەوە لە ساڵی مردنیشی هەر ئاشکرایە کە هەندێ لە نووسەران بێ وردبوونەوەی پێویست تۆماریان کردوون. من موناقەشەی یەک یەکی ئەو جیاوازیانە ناکەم ناوی نووسەرەکانیش نابەم.

نەبردنی ناوی نووسەران و موناقەشە نە کردنی سەهوەکان چ خەلەلێک بە نووسینی من ناگەینێ، بیر و باوەڕێکی لێرەدا کە بە وردی لە وەلادەتی حاجی دەدوێ ئەگەر نیشانی پێکابێ لە خۆیەوە جوابکاری ئەو ڕایانە دەکا کە لەگەڵی ڕێک ناکەون.
سەرەڕای نەبوونی خەلەل لەوەدا، نامیلکەکەی مەلا ئەنوەر بۆی ناردووم، خۆ دەکا بە چەپەرێک لە پێش تێکڕای ئەو نووسینانە کە لێیان بێدەنگ دەبم، بە جۆرێک هەموو ڕەخنەیێکی کە لەوان بگیرێ نامیلکەکە بەبەر خۆی هەڵدەبڕێ، چونکە ڕوواڵەتی حاڵی وا ڕادەگەینێ هەر خۆی سەرچاوەی ئەو نووسینانە بێ وەلەو لە لای کەسیشەوە ناوی نەبردرابێ. بەهەمەحاڵ سەرچاوە ئەو بێ یا ئەو نەبێ موناقەشەی من لێرەدا لەگەڵ نامیلکەی مەلا عەبدولڕەحمانە چونکە لە چەند ڕوویێکەوە بایەخی لە نووسینی دیکە زیاترە:

یەکەم: مەلا عەبدولڕەحمان لە خانەوادەی حاجی قادرە، مەودایێکی فرەوان لێی نێزیکترە تا خەڵقی دیکە.

دووەم: نامیلکەکە لە ساڵی 1326 ک – 1908 ز، نووسراوەتەوە، کە ئەمە حەقیقەتێکە لە هەموو نووسراوەکانی بڵاوکرایەوە نزیکتری دەخاتەوە لە سەردەمی حاجی قادر، واتە خۆی سەرچاوەیێکە لە هەموان کۆنتر و بە ناونیشانی «مێژوویی» لێوەشاوەتر.

سێیەم: شێوەی نووسینەکەی لەوانی دیکە «موضوعی»ترە بەوەدا کە مەعلووماتەکە دەگێڕێتەوە بۆ سەرچاوەیێک کە لێی وەرگرتوە، لە غەیبەوە قسە ناهێنێ...

زوربەی وردبوونەوەم لەگەڵ نامیلکەکەی مەلا عەبدولڕەحمان لەوانەن کە ئەویش لە ناودا نەبا هەر دەهاتنە ناو نووسینمەوە بۆ موناقەشە کردنی بیر و باوەڕی

نووسەرانی دیکە چونکە دیارە کە گوتەی هەموان یەکێک بوو هەموویان داخوازی یەک چەشنە هەڵسەنگاندن و پێوانە دەکەن، بەڵام هەندێ تایبەتی هەن لە نامیلکەکەدا لە نووسینەکانی دیکە نیە بەپێی پێویست لەگەڵی دەدوێین. وەک زیمنەن گوتم نامیلکەکەش ساڵی 1231ی کۆچی دادەنێ بە ساڵی لەدایکبوونی حاجی قادر.

خاوەنی نامیلکەکە دەڵی «ئەو حاجی قادرە بە قصەی باوکم لە ساڵی 1231ی هجری لە گورقەرەج لە دایک بووە» نووسینی نامیلکەکەم بۆ ئێرە گوێستەوە بەو ڕێنووسی کە پێی نووسراوەتەوە، ناشزانم داخوا مەلا ئەنوەر شکڵنووسی تەواو کردوە کە بۆی ناردووم یا خود لە نووسینەوەدا ناوناوە ئیملای خۆی تێخستوە. تۆ بڵێی مەلا عەبدولڕەحمان وەختی خۆی نووسیبێتی «گورقەرەج» چونکە ئەوسا ئەغڵەب ئەو نیشانەی «ـە»کەلە جێی «فتحە» دەنووسرێ پشت گوێ دەخرا، مەیلم بۆ ئەوە دەڕوا وشەی قەرەج بە ئەسڵ«قرج» نووسرابێ. هەروەها ناشزانم ئایا ڕەقەمی ساڵی 1231 هەمووی ئەو ڕەقەمە عادەتییە نووسراوە یاخود ژمارەی 3 بە شکڵی فارسی نووسراوە، لەوەڕا وەرامی ئە ئیحتیمالەش ناتوانم بدەمەوە کە مومکینە ئەم ڕەقەمە 3 نەبێ بەڵکوو ڕەقەم چوار بێ و بەشکڵی فارسی نووسرابێ و بە سەهوو 3 خوێندرابێتەوە.

بەداخەوە من ئەسڵی نووسینەکەم نەدیوە تا لەو ڕوانگەوە بڕیارێکی لە سەر بدەم یا شتێکی تێدا بڵێم. من لەگەڵ نامیلکەکەدا گومانکاری ناکەم، وەک بە من گەیشتوە وای ڕەفتار لەگەڵدا دەکەم بێ تەئویل. جودایی لە میانی دەستنووسی مەلا ئەنوەر لەگەڵ دەسنووسی مەلا عەبدولڕەحمان ئەگەر هەبێ من تێیدا بەرپرس «مەسؤول» نیم. ئەوەی ڕاستی بێ خەبەرێک لە بارەی حاجی قادرەوە بێ لە خزم و کەسی خۆی لە هەموو خەبەران پتر دەچێتە دڵەوە، مافی ئەوە هەیە ترجیح بدرێ بەسەر هی دیکەدا کە وەک خۆی لەیەک پلەی باوەڕ پێ کردن بن. خەبەری«بێگانە» ئەگەر بەڵگەی هەڵاوێردنی (ترجیح) لەگەڵدا نەبوو لە دوا خەبەری «خۆیی — خۆماڵی»یەوە دێ. بەڵام ناکرێ خەبەری خۆماڵی لەبەر خاتری خۆماڵیەتی بێ هەڵسەنگاندن وەربگیرێ بە تایبەتی کە خەبەرەکە بوە بنگە بۆ لێکدانەوەی مەوزووعی گرنگ ساغ کردنەوەی شتی دیکەی پێوە بوو. من کەر ڕاگەیاندنەکەی

نامیلکەکە دەربارەی ساڵی وەلادەتی حاجی قادر دەنرخێنم لەبەر تیشکی ئەو دوو «اعتبارە» تێوەی ڕادەمێنم:

1) خۆماڵیەتی
2) گونجانی لەگەڵ واقیع.

لەو گوتەی مەلا عەبدولڕەحمان لە زاری باوکی دەگێڕێتەوە ئەگەر نەگونجانێک، یا هەر کەموکوڕییەک هەبێ، گلەیی ناچێتەوە سەر ئەو، باوەڕ دەکەم چی بیستوە ئەوەی نووسیوە لە سەرانسەری نامیلکەکەدا. بەو نووسینەش خزمەتێکی زلی مێژووی کردوە لە زۆر ڕووەوە کە پێبەپێ لەگەڵ چونە ناو مەوزووع لە جێی مناسبدا باسی دەکەین. کاشکی چەندین نامیلکەی وەهامان هەبا دەربارەی حاجی و غەیری حاجی لەو ئەدیبانەی کورد کەوا کەمێک نەبێ لە خەبەر و ئەسەریان نەماوە. من لەگەڵ سڵاوم بۆ گیانی مەلا عەبدولڕەحمان و سپاسم بۆ مەلا ئەنوەر ڕێ بە خۆم دەدەم موناقەشەی ئەو ساڵەی 1231 بکەم کە گۆیا ساڵی بەوەلەدبوونی حاجی قادرە.

بەلای بیروڕای منەوە هەندێ ڕاستی بێ شوبهە هەن بە ئاسانی لەگەڵ ئەو ساڵەدا ناگونجێن، لەوانە دووی یەکجار بنجین، چاو لێپۆشینیان کاری کردە نییە:

یەکەمیان ئەوەیە ئەگەر حاجی لەو ساڵەدا هاتبێتە دونیا فەرقی تەمەنی لەگەڵ باپیرم دەبێتە 19ساڵ چونکە باپیرم لە 1250 بەوەلەد بووە، ئەمەشمان پێشتر گوتووە. بەڕاستی 19 ساڵ فەرقی میانی دوو جیلە، زۆر زەحمەتە مەودا بدا بەوە دوو کەس لە خوێندندا هاوڕێ بن. بەڵێ وەنیە زەحمەتیەکە بگا بە ڕادەی «استحالە» بەڵام نەسەلماندنی خەبەر هەموو جاران پێویستی بەوە نیە خەبەرەکە «مستحیل» بێ. بەسە بۆ نەسەلماندنی کەوا لەگەڵ ڕووداوی عادەتی نەگونجێ. زاتەن ڕاست نەبوونی خەبەرەکەش خۆی لە خۆیدا مستەحیلە، نە چ بەڵگەی ماددی وەیا زیهنی وەیا دەلالەتی ڕووداو هەیە ڕاستییەکەی بسەپێنێ.

هاوڕێیی حاجی قادر و باپیرم ئەگەر لە سەفەری عادەتی وەیا گەپ و سەیران با هەر فەرقێک هەبا لە میانی عومریان ئیشکالێ دروست نەدەکرد، ئەو ئیشکاڵە نەبێ کە فەرقێ زۆر گەورە لە عومردا دەبێتە مانیعی برادەریی نزیک و هاوڕازی، بە دەست خۆم نیە کە ئەم بەیتەی حاجی دەخوێنمەوە:

وەرە با بۆت بکەم باسی نیهانی
به یادی عەیش و ئەییامی جەوانی

ڕەفاقەتێکی هێندە نزیک لە وشەکان هەست پێ دەکەم بە حاڵ ڕێگە دەدا بۆ فەرقی 10ساڵ لە میانی تەمەنی ئەو و باپیرمدا چ جای لە 10 ساڵ پتر. لە گوتەی «یادی عەیش و ئەییامی جەوانی» شدا دەلالەتێک هەیە پشتگیری لە ڕایەکەی من دەکا ئێرە جێی لێدوانی نیە، جێگەی تایبەتی خۆی هەیە، کە پێی گەیشتین لێی دەدوێین.

دوەم ئەوەیە بە پێی ئەو حاشیانە کە حاجی بەدەستی خۆی لە کتێبەکەی «سیوطي» نووسیونی، ئەو تا کۆتایی ساڵی 1276 لە ناوەندی کتێبەکەی تێپەڕ نەکردوە، دەوجا کە وەلادەتی لە 1231 بێ دەبێ لە عومری 45 ساڵی و بەرەو دواتریش هەر خەریکی «سیوطي» بووبێ، کەچی «سیوطي» کتێبێکە لە ناوەڕاستەکانی خوێندنی مزگەوت دێ، لەگەڵ هەر وەخرانێک بێتە پێش خوێندنی مەلا و «مستعد»، «سیوطي» خۆی بۆ ئەو عومرە هەڵناگرێ، ئەوەی ڕاستی بێ عومری 36 ساڵیش هەر عومرێکی نارەحەتە بۆ کتێبی «سیوطي»، کە من ساڵی 1240 دادەنێم بۆ وەلادەتی حاجی گەلێک تێبینیم کردوە و زۆرم داشکاندوە بۆ تەئخیربوونی حاجی قادر لە خوێندندا بە دەست فەقیری و کەم دەستییەوە، بەو حاڵەش هەر لەگەڵ خۆمدا دەڵێمەوە تۆ بڵێی لە کەلێنێکەوە تیشکێک نەبێ و ئەو مەتەڵەی عومری36 ساڵی و کتێبی «سیوطي»یمان بۆ هەڵێنێ؟

حاشییەکانی حاجی گەلێک لێکدانەوە هەڵدەگرن، ڕەنگە زۆر مەعلووماتی نوێ بە دەستەوە بدەن لەو ڕێیانەی کە قیاس و بەراورد کردن و بەیەکدی گرتن لە بەیتی شت و دەلالەتەکەی زیهن بەرەو ڕووناکی دەبەن. بەڵام دیراسەی ئەو حاشیانە فەرمانێکی سەربەخۆیە پێوە خەریکبوونی هەموو چالاکییەکی دیکە دەوەستێنێ. ناچارم وازی لێ بێنم، جارێ، تا بتوانم لەگەڵ باسەکەی حاجیدا هەنگاو هەڵێنم.

بەرهەڵستی کردنی نەگونجان لەگەڵ ڕووداو با لە لایێک دانەنێین و سرنجێک بدەینە عەینی نووسینەکەی ناو نامیلکە و هێمای هەندێ باری بەهێز و بێهێزی شایەدییەکە بۆ ئەو ساڵەی 1321.

مەلا عەبدولڕەحمان دەڵێ «ئەو حاجی قادرە بە قصەی باوکم... » شایەدی وەلادەتی حاجی قادر لە ساڵی 1321، باوکی مەلا عەبدولڕەحمانە نەک خۆی. تێوە

ڕامانێکی خێرا لەو درەختەی خانەوادەیی کە دەرمان هێنا بەپێی ڕاگەیاندنی نامیلکەکە بۆمان دەردەخات چەند کەس لە بنەماڵەی حاجی قادر مەلا بوون. لە هەوەڵ نیگاوە دەردەکەوێ باوک و باپیری مەلا عەبدولڕەحمان هیچیان مەلا نەبوون واتە نەخوێندەوار بوون. بەلامەوە جێی پرسینەوەیە نەخوێندەوارێکی وەک باوکی مەلا عەبدولڕەحمان کە باوکی ئەویش نەخوێندەوار بووبێ ئەو ساڵەی 1231ی چۆن زانیوە؟

دەزانین مەلا و شێخ و خوێندەوار ئەغلەب لە عاست مێژوودا کەمتەرخەم بوون، تۆ بڵێی، باوکی مەلا عەبدولڕەحمان چۆن بۆی لواوە لە خەلە و خەرمان و جووت و کێڵگە و ئەو دڵ و دەروونە بڕوا بۆ ئەزبەر کردنی ساڵی بەوەلەدبوونێک کە بە هیچ جۆر تێکەڵ بە مەسڵەحەتی نەبێ؟ بەڵێ لە عەقڵ دوور نیە بابی حاجی قادر کە خۆی مەلا بووە لە گۆشەی کتێبێک مێژووی وەلادەتی حاجی نووسیبێتەوە، بەڵام بە ئاسانی ناچێتە دڵەوە فەللاح و جوتیار ئەو تەرزە خەبەرە بە هەند هەڵگرن و لەبیری نەکەن. با ئەوەش بڵێم ئەوسا کە حاجی لەدایکبوو کەس نەیدەزانی لە دوارۆژدا دەبێتە ئەو بوێژە نەمرە دەستنیشانە تا ئامۆزایێکی نەخوێندەواری باوکی لەگەڵ ڕۆژی وەلادەتی خەریک بێ. بە دڵی من، ناڵێم زانینی شتی وا «مستحیل»ە، بەڵام کە «مستحیل» نەبێ ئاسایش نیە بەنیسبەت پیاوی نەخوێندەواری لادێوە. مەلا عەبدولڕەحمانیش چ تەوجیهێک ناکا بۆ ئەو گوتەی «بە قصەی باوکم» داخوا ئەو باوکە چۆنی زانیوە و لەگەڵ نەخوێندەواریدا چۆنی فەرامۆش نەکردووە!

ڕەنگە بگوترێ ئیمکانی هەیە مەلا عەبدولڕەحمان مەلا بووبێ هەرچەند بە مەلا ناوی نەهاتوە لە نامیلکەکەدا. بەڵام ئەم زەننە بێ ئەساسە چونکە نامیلکەکە شەخس لانی مەلابوون و مەلا نەبوونی دەربڕیوە تەنانەت لە عاست کوڕی چوارەمی مەلا ئەحمەدی گەورەدا بەیانی ئەوە دەکا خۆی و نەوەی مەلا بوون، بەڵام کوڕی مەلا نەبوە. جگە لەمەش، عادەتەن پیاو بۆ باوکی خۆی هەرچی هۆیەکی حورمەت شک ببا لێی دریغ نیە، ئەگەر باوکی مەلا عەبدولڕەحمان نیمچە مەلا با وەیا ناو و لە قەبی مەلای پێوەبا لەوانەبوو بە مەلای ناو بردبا. زاتەن بنەماڵەیێکی وا بچووک هەر ئەوەندە مەلای لێ پەیدا دەبێ کە نامیلکەکە بە مەلای داناون.

هەڵبەت مەلایەتی، پشتاوپشت، هەموو خانەوادە بەخێو ناکا. لەگەڵ زۆربوونی کەسانی بنەماڵە خەڵقەکە بۆ وەدەستهێنانی گوزەران دەبێ خەریکی کار و کەسب بن

کە پێی بژێن، هەر ئەوەیشە لە نامیلکەکەدا خۆ دێنێتە بەرچاو. بە پێی لێکدانەوەی من گوتەی «بە قصەی باوکم» بەو جۆرەی لە نامیلکەکەدا نووسراوە بە گوتەی بێبەڵگە دەژمێررێ و نابێتە هۆی ڕەد کردنەوەی قەتعیی خەبەرێکی دیکە کە لەگەڵیدا نەگونجێ.

نیوە بەرهەڵستێکی تریش هەیە دەبێتە دوا ئاڵقە زنجیرەی ئەو بەرهەڵستانە. لە فەرزی حاجی لە 1240 بەوەلەد بووبێ، وەک من بۆی دەچم تەمەنی 61 ساڵی بوە کە نامەی بۆ باپیرم ناردووە و تێیدا شکات دەکا لە دەست پیریی و بێحەواسیی تا دەگاتە ڕادەیێک کە دەڵێ «منیش کاتێ دەزانی پێم هەڵ- ئەنگوت». لەوە بەولاوە حاجی 8 ساڵێک وەیا زیاتر ژیاوە، بەپێی ئەوە کە ڕۆژنامەی «کوردستان» ی «ثریا بدرخان» ڕادەگەیەنێ لە 1897 مردبێ کە دەکەوێتە بەرانبەر 1315ی کۆچی. خۆ ئەگەر لە 1231 بەوەلەد بووبێ دەبێ تەمەنی لە کاتی نووسینی نامەکە 75 ساڵ بووبێ، واتە 8-9 ساڵ ژیاوە بە دوا 75 ساڵان، چونکە مەعلوومە خۆ ڕاگرتن لەبەر ناخۆشی و بێتاقەتی بۆ ماوەی 8 ساڵ لەگەڵ نوێتر وێچووترە تا هی کۆن. بەڵام ئەم تێبینییەم ڕاگەیاندنێکی سستی «استئناس»ی هەیە و بەس، ڕێی ئیحتمالی دیکە کوێر ناکاتەوە. هەروەک مومکینە یەکێک لە دوا 66 ساڵ ماوەیێک بژی مومکینە دوای 75 ساڵیش هەمان ماوە بژی. بۆیە لە پێشەوە گوتم «نیوە بەرهەڵست»، دەتوانی لای خۆتەوە خەتێکی بەسەردا بێنی و ڕەشی کەیەوە.

لێکدانەوەیێک لەو ڕووبەڕوو کردنی ساڵی بەوەلەدبوون و مەرگی حاجی خۆ دێنێتە پێش دەبێ حیسابێکی بۆ بکرێ و بەلایێکدا ساغ ببێتەوە. ئەگەر ڕازی بین بەو ساڵەی 1231دەبێ چی دیکە نەگوترێ حاجی لە 77 ساڵیدا مردوە چونکە حیسابێکی سەرپێیی دەریدەخات ئەمە وانیە. 1231 دەکەوێتە بەرانبەر 1815-1816 ی زایینییەوە، دەوجا لەو ساڵانەوە یا 1897 کە ساڵی مردنییەتی 81-82 ساڵ دەگرێتەوە. خۆ ئەگەر لە 1231ـەوە تا مەرگی هەر لەسەر حیسابی کۆچی بڕۆین ئەوسا 1897 دەکەوێتە بەرانبەر 1314-1315 بەو پێیە دەبێ بڵێین تەمەنی حاجی 83-84 ساڵ بووبێ.

ئەمە لە لایێکەوە، لە لایێکی دیکەشەوە ئەگەر ڕازی بین بەوەی حاجی 77 ساڵان ژیابێ ئەوسا دەبێ بڵیی وەلادەتی 1820 ی زایین بوە (1897-77=1820) کە ئەویش دەکەوێتە بەرانبەر ساڵانی 1235-1236ی کۆچی. بەو پێیە چی دیکە باسی

1231 نەکرێ وەک ساڵی لەدایکبوونی. ئەوەی ڕاستیش بێ لە کەسم نەبیستوە و نەزانیوە حاجی گەیشتبێتە 80 ساڵ عومر.

وەک لە درێژەی ئەم لێکۆڵینەوە دەردەکەوێ تا من بزانم و بۆی بچم بە جۆرێکی دڵنیاکەر جێگە و ساڵی لەدایکبوونی حاجی قادر بە کەس ساغ نەکراوەتەوە، تا مەعلووماتی دیکەی یارمەتیدەریش پەیدا نەبێ بەو هێندە مەعلووماتەی لەبەر دەستاندایە ساغ کردنەوەی موشکیلە، هەر کەسە بۆ خۆی دەتوانێ زیهنکاری وردبوونەوەی تایبەتی خۆی بکا و ساڵ و جێگەیەک دەستنیشان بکا.

بەداخەوە ئەم ونی و نەزانراوییە پەردەیێکە بەسەر بەشی هەرە زۆری ژیانی حاجیدا کشاوە. تا 30-40 ساڵێکیش لەمەوبەر ئەگەر پرسیار و تۆژینەوەی چالاکانە کرابا و بەرهەمەکی نووسرابایەوە پیاوی ئەوتۆ مابوون لە چۆنیەتی ژیانی حاجی زۆریان دەزانی بە تایبەتی بەر لە سەفەری بۆ ئەستەمبوڵ. بێگومان مەعلووماتی ئەوان ئەغڵەب باری ژیانی حاجی ڕووناک دەکردەوە و ئێمە و خەڵقی دوا خۆمانی لە دەردی سەری تحقیقاتی دوو بەختی ڕزگار دەکرد.

یەکێک لەو پیاوانەی ئیمکان هەبوە مەعلووماتی لێ وەربگیرێ خوالێخۆشبووی «حاجی محەمەدی حاجی عەلی» بوو کە مەشوورە بە «حاجی گەورە» و هاوچەرخێکی حاجی قادر و حاجی مەلا عەبدوڵا بوو، هەرچەند لە تەمەندا شتێک لەوان کەمتر بوو. تا دوای 1930یش ژیا بەقەدەر کتێبێکی مناسب لە ئەخبار و گوزارشتی پیاوانی سەدەمی خۆی دەزانی، لە زیمنیان حاجی قادر. وا بووە ئەم حاجییە گەورەیە لەبەر شارەزایی و ئاگادارییێکی تایبەتی خۆی کە هەی بوو غەڵەتی دەماودەم وەیا نووسراوی لە شیعری حاجی قادر ڕاست دەکردەوە. ئەمە یەکێکە لەو ڕاست کردنانەوە. لە دیوانەکانی حاجییدا نووسراوە:

منیش ئەم نامەیەم نووسی بە تەعجیل

شڕ و وڕ وەک خرار و کۆنە زەنبیل

«حاجیە گەورە» لە خوێندنەوەی ئەو بەیتە و ڕاست کردنەوەی هەڵەی کە تێیدایە تووشی دڵگەرمی و عەسەبیەت دەهات، دەیگوت خەڵقەکە نازانن چ دەڵێن و چ دەکەن. دەبێ بگوترێ «شڕ و دڕ» نەک «شڕ و وڕ» چونکە وشەی «شڕ» خرار

دەگریێتەوە «درِ»یش بۆ کۆنە زەنبیلە. زەنبیل کە کۆن بوو شوەکانی لێک هەڵوەشان و هەندێک لەو شوانە شکان و وەک شانەی کەلۆسی لێ هات ئەوسا «درِ» دەبێ نەک «ورِ». کە گوتت «شرِو ورِ» هەر بۆ شتی ئەوتۆ دەگەرِێتەوە کە بدرِێ وەک قوماش وەیا جەواڵ وەیا خرار.

«حاجیە گەورە» بە زۆری لەگەڵ حاجی قادر گفتوگۆ و دیدەنی و رِابواردنی بوە زۆریش لە حاجی مەلا عەبدولا نزیک بوە، سەفەری کورت و درێژی لەگەڵدا دەکرد، بۆ خۆم دەمدی باوکم جەژنان وەیا هەر جارێک رِێی کەوتبایە نزیک ماڵی «حاجیە گەورە» دیدەنی و ئەحواڵ پرسی لێ دەکرد و تەواوێک لای دەمایەوە. ئەوسا کە من دەمدی چاوەکانی نەمابوون بزووتنەوەشی بە ئاسانی بۆ نەدەکرا، بەڵام لەو سەرلێدانانەی باوکم و ئەوەندەی لای دەمایەوە سۆز و جۆشێک ئەو مرۆڤەی دەگرتەوە هەر دەتگوت ئێستاکە ئاگری تێبەر دەبێ و خەڵقەکەش لەگەڵ خۆیدا دەسووتێنێ. هەرگیز نەبووە لەو دیدەنییانە کەسێک حازر بووبێ و لە کروژنی گریانی نەدابێ. هەستت دەکرد بەهۆی ئەوەوە کە مەلای گەورەی کورِی حاجی مەلا عەبدولا سەری بە ژووره تاریکەکەیدا کردووە و هاتۆتە ئەحواڵ پرسینی، هەموو رِابردووی لەو چەند دەقیقەیەدا کۆ دەبێتەوە، وەک کۆستکەوتووی کورِمردوو شین و شەپۆرِ دەکا بۆ ئەو کۆچکردوانە کە بەلای ئەوەوە وەک شەوچرا سەردەمی گەنجی و تافی جوانییان رِوون کردۆتەوە. وەک رِۆژ ئاشکرا بوو کە باوەشی بە باوکمدا دەگرت و تا ناخی دەروونی بۆنی هەڵدەمشت و لە قوڵپی گریانی دەدا، باوەش بە حاجی قادر و حاجی مەلا عەبدولا و حەمە ئاغا و ئەمین ئاغا و هەموو کۆچکردوەکاندا دەگرێ و شێوەن بۆ یادگاریان دەکا. وەی کە دەتلامەوە و مووچرِکی پەیتا پەیتا هەموو لەشمی دەگرتەوە و بێ ئیختیار وەک حازرانی مەجلیس دەکەوتمە گریان.

داخ و سەد داخ چەندین داستانی چۆنیەتی ژیان و رِابواردنی هاوچەرکانی خۆی، کە حاجی قادر یەکێکیان بوو، بە هەموو تەفسیلاتی گوزارشتی سەر بەو داستانە لەگەڵ مردنی حاجیە گەورە و ئەمساڵی ئەو مردن. وەی حەیفە مێژوو بمرێ لەبەر کەمتەرخەمی زیندوان. ئێمە لەو نووسینەدا جارێکی دیکەش سڵاو لە گیانی حاجیە گەورە دەکەین و لە شەخسییەتی ئەو بەڵگەی ماددی وەردەگرین بۆ ئیسپات کردنی رِاستییەک و سپی کردنەوەی هەڵەیێک دەربارەی رِووپەرِەیێکی زۆر گرینگ

لە دەفتەری و جودی ماددی و مەعنەوی شاری کۆیێ بە تایبەتی و هەموو کوردستان بە تێکڕایی.

بەڵێ بە مردنی یەک لە دوا یەکی ئەو کەسانە مەعلوومات دەربارەی حاجی قادر کەم بۆوە تا گەیشتینە حاڵێک چەند وشە و سەرگوزەشتی تەفرەقە نەبێ بەدەستمانەوە نەماوە. ئەوەندە مەعلووماتی کە هەیشە تاکتاکە نەبێ دەمەتەقەی بەسەرەوە هەیە و لە گومان دوور نیە. وا دەبێ بە زەحمەتێکی گران هەندێکیان دەخرێنە سەر هەندێکیان و گونجانێک لەمیانیاندا پەیدا دەبێ. بەڵام بەهۆی ئەوەوە ژیانی حاجی پەیوەندی هەبووە لەگەڵ کەسانی وەک باپیرمدا کەوا تا ڕادەییێک لە ئەحواڵ و گوزارشتی ژیانیان خەبەر و ئەسەری بێشوبهە بەجێماوە، نەختێک لە گوزارشت و ژیان و خوێندنی حاجی لە کۆیێ و شوێنەکانی دیکەی کوردستان پارێزراوە. بە پێی کەمبوون و نەمانی پەیوەندی ئەوتۆیی تاریکی لە دەوری حاجی زیاد دەکا و تێر دەبێ. ناوەناوە فەردێک یا زیاتر لە شیعرەکانی ئیشارەت دەکەن بۆ ئەو گوزارشتانە، لە هەندێ شوێنی ئەم نووسینەدا بە پێی داخوازی مەبەس و لە گوێرەی ئیمکان سوود لەو ئیشارانە وەردەگرین.

چارمان ناچارە لەبەر کەمی خەبەراتی ژیانی حاجی دەبێ خۆ خەریک کەین بە دەلالەتی هەموو ئیشارە و نیگاو نیونیگای قسە و تەواتورێک، چ لەدیوانەکەیدا و چ لە سەرچاوەی دیکە و چ لە گێڕانەوەی دەماودەمەوە پێمان گەییبێ. وەک شوێنهەڵگر بە وردبوونەوەی دووروودرێژ و پسپۆڕانەی خۆی لە نەختێک داڕووشانی خاکی لاڕێیەکەوە شوێن دەردەکا بۆ حەشارگەی ماڵی ونکراو، یاخود زانای ئاسار لە کەرتی وشەیێکی نیوە سواو بەسەر خشتێکی شکاوەوە پەیامێکی زۆر و زەبەندە لە ڕابردوییێکی کۆن و شراوەیەوە وەردەگرێ ئێمەش دەبێ دوا دڵۆپی واتا لە هەموو وشە و خەبەر و ڕووداوێک هەڵگوشین کە نەختێک ڕووناکی بخاتە سەر لایەنێکی تاریک لە ژیانی حاجی. ئەگەر شوێنهەڵگر و زانای ئاسار ورد نەبنەوە لەو نەختە داڕووشانە و کەرتە وشەیە نە ماڵی دزراو بەسەر دەگیرێتەوە و نە نهێنی مێژوو خۆ بەدەستەوە دەدا.

زاتەن تائێستا لە نووسینەکەمان بەگوێرەی دەسەڵات هەر وامان کردوە. بەڵام لەم کارەی وردبینییەدا دەبێ مانای دروست و لە باوەڕ نێزیک لە ڕەمز و ئیشارە و گوزارشت وەرگرین، نابێ وەک ئەو مەلایە بین لێیان پرسی مامۆستا مانای چیە

«وجر بالفتحة مالا يتصرف»، ئەویش سەیری کتێبانی کرد و بە زاهیر لێکی دایەوە و ئەوجا گوتی »مانای ئەوەیە جورە جورێ بە مەلا فەتحوڵڵای بێخن تا ئیسراف نەکا».

گوزارشتی مێژوویی و ڕووداوی لێرە بە پێشەوە، ئەویش وەک ڕووداوی بەردەمی خۆمان تا ئاسایتر و بێ تەئویلتر بێ لە ڕاستی نزیکترە. حیکایەتی دەسکرد و هەڵبەستراو جەمسەری تێک بەستن و پێکدا دروانی بە ئاسانی دیار دەکەوێ بۆ چاوی ڕەخنەگر، یاخود بابڵێم ئەگەر پیاو خۆی لێ نەناس نەکا لە چاو دەچەقێ. ڕابردووش وەک ئێستاکە وایە چ سیحر و تەلیسمی تێدا نیە، کە سەری کێشایەوە بۆ کاری پەری و جادوو یا هەر لە بەنەڕەتدا درۆیە و هەڵبەستراوە یاخود لە ناو درۆ شراوەتەوە.

لە کاری پەری و جادوو هەر حیکایەتی ئەفسانەیی مەبەس نیە، هەموو ئەحواڵ و ئەتواری مرۆڤ لەوانەیە بە گێڕانەوەی دەماودەم، یا لەگەڵ مەیل و ئارەزۆی لایەنگیر بەرگی ئەفسانەیی لەبەر بکرێ. ئەوەی لە سەرەتاوە گوتم دەربارەی «دژکاری و لایەنگیری» دەیخست کە حاجی قادریش بەدەست نووسینی تازەوە لەوانەیە بکەوێتە ناو تەم و جل و بەرگی ئەفسانەییەوە لە سەردەمی خۆیەوە ڕادەگوێزرێتەوە بۆ ڕۆژانی ئێستاکە. هەڵبەت نووسەرێکی دوارۆژیش بەکەڵکی سبەینێ نایێ، هی سبەینێش بەکەڵکی دووسبەی نایێ، هەروەها تا ئەو هەموو بەرگانەی لەبەری دەکرێن لە جیلێکەوە بۆ جیلێک بەقەدەر پەڕی تاوس یا شەبەندەبەڕۆژە ڕەنگاوی دەبن حاجیش لە ناویاندا وەک یەکێک لە هەزاران پیاوی مێژوویی لێ بەسەر دێ کە ئەسڵەکەیان بە تەواوی لە ناوچووە و بوون بە شیرەخۆری پەری و پەروەردەی ئاسمان.

ئێمە تا دەتوانین لە مەڵبەندی ئادەمزاد لانادەین بۆ بەهەشتی پەری و لانەی فرشتەی دەستکرد، گەرما و سەرمای سەخت و ناخۆشی کوێستان و گەرمێنی ڕاستەقینە وەک خۆیان دەهێڵینەوە، بە «کۆندێشن»ی تەکنیکی ئیمرۆ سازگاریان ناکەین (ئەگەر چمان لە باراندا هەیە با هاوین و زستانی حەقیقی بە کۆندێشن و تەکنیک سازگار کەین).

تا ئێره ئەو قسه و تەواتور و مێژووی که هەبوون لەگەڵ جێگەو کاتی لەدایکبوونی حاجی، عەلاقەدار به جۆرێکی بێتەرەفانه خستمانه سەر سەفحەی نووسین و بەر تیشکی ڕەخنه، ئەوەی ڕاستیش بێ درێژەی موناقەشه لەوه پتری دەخایاند بەڵام ئەو هێندەی که له نووسینەکەم کورت کردەوه بابەتی دیراسەیێکی قووڵتره، پەڕاندنی زیانی بێره نەگەیاندوه. تەنها شتێکم گل دابێتەوه و نەمخستبێته زنجیرەی قسان، تێبینی ئەوه پێی کردووم بەرژەوەندی گلدانەوەی پتر له سوودی بەرهەمەکەی چونکه شەڕە دەندوکێکی زۆر دەگێڕێتەوه و بێنه و بەرەیێکی فرەوان بەلاوه دەنێ و چ ئەنجام و بەرهەمێکیش له کیس نادا، ئەگەر بمزانیبایه گلدانەوەی زەرەر دەبەخشێ بێگومان چەندێکی ماندووی کردباین دەمهێنایه ڕوو، به تێروپڕی لێی دەدوام.

به دوا لێکۆڵینەوەی جێگه و ساڵی وەلادەتی حاجی باسی گوێستنەوەی له «گۆڕقەرەج» ـەوه بۆ کۆیێ دێته پێش. لێرەدا سێ ئیحتیمال دێته بەرچاو. یا دەبێ باوکی هاتبێته کوێی و ئنجا حاجی له دایک بووبێ، یا کوڕ و باوک به یەکەوه گوێستبێتیانەوه بۆ کۆیێ، یا دوای مردنی باوکی به منداڵی هاتبێ بۆ کۆیێ لەگەڵ دایکی. ئەو سێ ئیحتیماله خۆ نیشانی زیهن دەدەن بێ ئەوه چی لێره بەپێشەوه گوتمان له دوارۆژدا کەسێک بگاته یەکێک لەو قەناعەتانه که بەر یەکێک له ئیحتیمالەکان دەکەوێ، ئەوسا قسەیێکی من لێرەدا بۆ تێکڕای ئیحتیمالەکان دەینووسم ڕەنگه یارمەتی ئەو کەسه بدا لەو ڕێبازی تێیرا دەڕوا.

وەک گوتم ئیحتیماڵێک ئەوەیه، ڕیوایەتیش هەیه سووره لەسەری، که مەلا ئەحمەدی باوکی حاجی دوارۆژانی ژیانی له کۆیێ بەسەر بردوه و لەوێش مردوه. ئەگەر ئەم ڕیوایەته ڕاست بێ پرسیاری چۆنیەتی گوزەرانی ئەو خێزانه بچووکه لادێییه هەڵدەستێ له جێگەیێکی وەک کۆیێ بەنیسبەت لادێوه مەسرەفی زیاتر و گوزەران لێ کردنی زەحمەتتره. بەڕاستی پرسیاری گوزەران کردن لەگەڵ هەموو ئیحتیماڵێک هەر بەملەوەیه چونکه به هەر جۆر و شکڵێک گوێستنەوه بووبێ مەعیشەت له هەوا دەست ناکەوێ. له حاڵێک که مەلا ئەحمەد هاتبێته کۆیێ ئیشکالی گوزەرانی لەوەوه هەڵدەستێ که ئەو له کۆیێ خاوەن مزگەوت و جێگه و ڕێگه نەبوه تا باری مەعیشەتی پێ ڕاست کردبێتەوه. نەبیستراوه چ له گۆڕقەرەج بووبێ چ هاتبێته کۆیێ دەستمایەیێکی ئەوتۆی هەبووبێ کاری بۆ ئاسان کا و له

غەریبی پێی بژی وەیا مامڵەتی پێوە بکا بەسەر پێوە یا بەسەر دوکانێکەوە. دەمێنێتەوە ئەوە کە بگوترێ سادەیی ژیانی ئەو سەردەمە و قەناعەتی ناچاری لە لایێکەوە و کەم خێزانی و گەلان گەدانیش لە لاییکی دیکەوە پێویستی گوزەرانی ماڵی مەلا ئەحمەدی چی ئەوتۆ تێنەپەڕاندوە لە بەرهەمی ئەو کشتوکاڵە کە لە گۆڕقەرەج پێی ژیاوە.

ئەوسا و ئێستاکەش خێزانی لادێی کە تازە دێتە شار تا خوو دەگرێ بە عادەت و گوزەرانی شارستانی مانگا و بزنە و مەڕ بەخێو دەکا. لە شیر و ڕۆن و بێچوەکانی سوودێکی مناسب وەردەگرێ. جێی باوەڕە ئەگەر بگوترێ ئەو خێزانەی کە حاجی قادر تێیدا کۆرپە و ساوا بوە خێزانێکی لادێیی خاوەن ئاژەڵێکی کەم و لە دوورەوە تێکەڵ لەگەڵ خەلە و خەرمان و کشتوکاڵ بوە.

ئەم ڕیوایەتە لە قسەی دەماودەم بەولاوە هیچ بەڵگەیێکی نووسراو پشتگیری لێ ناکا. ئەوەندەی من بزانم هاتنی باوکی حاجی بۆ کۆیێ و مانەوەی لەوێدا تا کۆتایی ژیانی لە خۆوە وەرامی ئەو پرسیارە ناداتەوە داخوا حاجی لە کوێ هاتۆتە دونیا. ڕیوایەت بەرانبەر ئەم پرسیارە دەبێتە دوو جۆر یەکیان ئەوەیە کە حاجی دوای هاتنی باوکی بۆ کۆیێ و نیشتەجێبوونی لەوێ بەوەلەد بوە، ئەوی دیکەیان دەڵێ باوک و کوڕ بەیەکەوە هاتوون بۆ کۆیێ بەڵام کوڕ و منداڵ بوە نەک هەراش.

لەم ڕیوایەتەدا، بە هەردوو جۆریەوە، ساڵی مەرگی مەلا ئەحمەد بێ سەروشوون دەمێنێتەوە. هەڵبەت کە نەزانرێ کەی مردوە دیارە ناشزانرێ لە دەمی مردنیدا حاجی لە چ تەمەنێکدا بوە، هەروەها لەوەش بەدەنگ نایێ داخوا گوزەرانی حاجی دوای مەرگی باوکی چۆن گەڕاوە. بەڵام لەم بابەتەوە بە «استدلال» و وەرگرتنی بەند لە خودی ڕیوایەتەکەش هەروا دەڵێ، دوای مەرگی تەنها ژنێک و کوڕێکی لە پاش بەجێ ماوە، کە حاجی قادرە. لە حاڵی وەهادا زۆر جاران دیتراوە خێزان دوای مەرگی خاوەنی بەکولەمەرگیش بێ گوزەرانی پێکهێناوە و ژیانی تەئمین کردوە. دوور نیە خەڵقوخوا هەبێ ئەوە دڵشکەستەیی وەیا بەخۆداشکانەوە بەرهەم بێنن ئیشیان بەو خێزانە سپارد بێ بایی ئەوەی لەگەڵ کەم تاکورتێک داهاتی کە هەیەتی پێی بژی.

لێرەدا قسەی شێخ ڕەحیم دێتەوە یاد کە دەیگوت لەگەڵ حاجی قادر بەیەکەوە شاگرد ئێمەنیدروو بووین. جێی باوەڕە حاجی قادر بۆ بەڕێوەبردنی ئەو خێزانە دوو نەفەرییە دوای مەرگی باوکی ناچار بووبێ کە شاگردی بکا. نامیلکەی مەلا عەبدولڕەحمان دەڵێ «لە ساڵی 1231 ی هیجری لە گۆڕقەرەج لەدایک بوە. مەلا ئەحمەدی باوکی لە گۆڕقەرەج وەفاتی کردوە، لەو وەختە حاجی قادر عومری 9 ساڵان بوە قورئانی لە لای باوکی ختم کردوە. لە پاش مردنی باوکی، فاتێی دایکی لە گۆڕقەرەج ڕۆیشتوە چۆتە شاری کۆیێ لای مەلا ئەحمەدی ئۆمەر گۆنبەتی کە برازای فاتێ بوە و مەلای مزگەوتی مفتی بوە».

وەک پێشتر گوتم مەلا عەبدولڕەحمان قسە لە زاری باوکی خۆی دەگێڕێتەوە، ئەوەشمان تێبینی کرد کە ساڵی 1231 بۆ وەلادەتی حاجی لەگەڵ هەندێ مێژوو و ڕوداوی دیکە باش ناگونجێ.

بە پێی لێکدانەوەی من چونکە نامیلکەکە لە زۆر ڕووەوە ناتوانێ وەرامی پرسیاران بداتەوە و لە هەندێ شوێندا بە تەواوی لە ڕووداو دوور کەوتۆتەوە، وەک ئەوەی کە دەڵێ حاجی قادر و کەیفی بەیەکەوە چوون بۆ ئەستەمبوڵ، لە دیاری کردنی ئەو 9 ساڵەی عومری حاجی قادریشدا کە ساڵی هاتنی بێ بۆ کویێ پرسیاری نەسەلمێنانە هەڵدەگرێ. ئەم وردییەی دیار کردنی تەمەنی 9 ساڵی بۆ حاجی قادر لە کاتی مردنی باوکی لە کویێوە هات!. ناڵێم زانینی شتی وا لە لادێ »مستحیل»ە، بەڵام سەرەڕای زەحمەتییێکی کە تێیدایە جارێکی دیکەش دەبێتە جێی گومان لێ کردن بەوەدا کە خۆی لە نێوان خەبەری گوماناوی بێ. کە ساڵەکەی 1231 کەوتە شوبهە، بە جۆرێکی عەفەوی ساڵی مردنی باوکی و هاتنی خۆیشی بۆ کۆیێ دەکەوێتەوە شوبهەوە. لێرەدا ئەوەش دەخرێتە سەر لایەنی سەلبی باوەڕ پێ کردنی کە ڕیوایەت و ڕواڵەتی ئەوتۆش هەیە ساڵێکی زووتر و عومرێکی بچووکتر ناو بنێ بۆ هاتنی حاجی بۆ کۆیێ، با هەر لەوە گەڕێین کە ڕیوایەت هەیە دەڵێ لە کۆیێ بەوەلەد بوە. وەک دوای کەمێکی دیکە باس دەکەین بەڵگەیێکی زیهینیش هەیە بۆ دەستنیشان کردنی عومرێکی زووتر لە 9 ساڵی هەرچەند ئەو بەڵگەیەش بۆ خۆی بە تەنها نابێتە هۆی سەپاندنی ئەو ڕایەی کە پشتگیری لێ دەکا.

نامیلکەکە لە شتێکی گرنگی دیکەش بێدەنگە. کە حاجی لە عومری 9 ساڵی هاتبێتە کۆیێ بە پێی ڕاگەیاندنی نامیلکەکە دەبێ لە 1240 هاتبێ. ئێمە دەزانین کەوا لەو

ماوە درێژەدا چ مزگەوتێک نەبۆتە پەناهـ و هێلانەی تێدا ژیان و حەوانەوەی حاجی. داخوا خاڵۆزای حاجی، کە مەلا ئەحمەدی مزگەفتی مفتی بێ، هەر ژیا تا ڕۆیشتنی حاجی بەرەو ئەستەمبوڵ و جێگاکەی چۆڵ نەبوو پوورزای (کە حاجیە) پڕی بکاتەوە؟ یاخود ئەو جێگایە چۆڵ بوو و یەکێکی بێگانە دەستی بەسەردا گرت؟ چۆن بوو لەوەدا حاجی بە دەنگ نەهات مەعلوومیشە ئەو لیاقەتی لە خەڵقی دیکە کەمتر نەبوە بۆ مەلایەتی و لەوانیش کەمتر محتاج نەبوە؟ یاخود خاڵۆزا مرد بەر لەوە حاجی ببێ بە مەلا بۆیە جێگاکەی بۆ غەیری حاجی بوە؟ نامیلکەکە دەڵێ دوای دوو ساڵ لە هاتنی حاجی بۆ کۆیێ دایکی مرد، تۆ بڵێی خاڵۆزاکەی تا چەند ساڵان حەواندیەوە؟ ئەگەر ئەویش زوو مرد بێ حاجی بە چی گوزەرانی کردووە؟ ئەمانە و گەلێک پرسیاری دیکەی وەک ئەوان بێ وەرامن و نامیلکەکە لە هەموویان بێدەنگە.

من لەو پرسیار و تێبینیانە مەبەسم گلەیی کردن نیە لە ناتەواوی نامیلکەکە، ئەوەی ڕاستی بێ هێندەی مەمنوونم سنووری نەبێ، بەڵام کەوا بە وردی لەگەڵی دەدوێم مەبەستم ئەوەیە هەر بڕیارێکی پێی بگەین لەبارەی ئەو لایەنانەی ژیانی حاجی کە نامیلکەکە باسی کردوون و من خەریکی تۆژینەوەم لێیان بڕیاری سەرپێی و سەرزارەکی نەبێ، چونکە گومان نیە لەوەدا گەلێک لەو پرسیار و لێکۆڵینەوانە پەیوەندی بەهێزیان دەبێ لەگەڵ ساغ کردنەوەی پلە و قۆناغەکانی دواتری ژیانی حاجی.

من کە شکایەت دەکەم لە دەست کەم مەعلووماتی دەربارەی مێژووی ژیانی حاجی دیسانەوە ئەو کەموکورتەی کە دەیزانم لە زۆر جێگە دەموەستێنێ لە قبوڵ کردنی خەبەراتێ دەماودەم و بێبەڵگە کە باسی حاجیامان بۆ دەگێڕنەوە، دەوجا لە دوارۆژدا کە هەوڵ و تەقەڵڵای نووسەران مەعلووماتی پتری کۆ کردنەوە و هۆی نەسەلماندنییان زیاتر بوو لە عاست خەبەری بێبەڵگەدا دەبێ ئەوسا چەند بە درێژتر و وردیتر لەگەڵ هەڵسەنگاندن و پێوانەی تەواتور و گوتەی ئەفواهی خەریک بن و کەمتر لێی ڕازی بن.

لە ماوەی ڕابردوودا تەواوێک خەریک بووم بۆ وەدەستهێنانی مەعلووماتی ئەوتۆ کەلەبەری ئەو ڕۆژانەی سەرەتای ژیانی حاجی پڕکاتەوە و وەرامی پرسیاران بداتەوە، زۆریشم حەز بەوە دەکرد هیچ ئیشکالێک نەهێڵێ لە دەوروپشتی نامیلکەی مەلا عەبدوڕڕەحمان و لە هەموو ڕوێکەوە شایەدی بۆ بدا چونکە لەوە خۆشتر نیە بۆ

تۆژەرەوە تۆژینەوەکەی لەگەڵ سەرچاوەیێکی نووسراودا ڕێک کەوێ و لەو ناڕاحەتیی دوودڵی ڕزگار بێ.

لە بارەی مەلا ئەحمەدی گونبەتی کە خاڵۆزای حاجی و مەلای مزگەوتی مفتی بووبێ چەندین ڕاسپاردەم خستە کار، لە ئەنجامدا کەموزۆر شتێکم بۆ نەهاتەوە لەگەڵ قسەی نامیلکەکە ڕێک کەوێ. مەلا و خاوەنی ئێستاکەی مزگەوتی مفتی کە خۆی مەلایەتیەکەی بە میرات بۆ ماوەتەوە لە باب و باپیریەوە، ناسەلمێنێ مەلا ئەحمەد ناوێک مەلای مزگەوتی مفتی بووبێ لەو سەردەمانەی کە حاجی قادر لە کۆیێ بوە، هەر هێندە دەڵێ کە مەلا ئەحمەد ناوێک لەگەڵ حاجی قادر و حاجی مەلا عەولادا بەینێک لای باپیری ئەویان خوێندوە لە مزگەوتی مفتی.

هەمان مەعلوومات و شتی لەویش نزیک، لە سەرچاوەی دیکەی عەلاقەدار لەگەڵ مزگەوتی مفتی بە نامە پێم گەییوە و ئەویش لە لای خۆیەوە ڕووناکایی نامیلکەکەی مەلا عەبدوڕڕحمان لێڵ دەکا. نە کەسم دیوە بڵێ لە نەوەی مەلا ئەحمەدم نە لە کەسیشم بیستوە هیچ کوڕ و نەوە و کەسوکارێک نیسبەتی بۆ ئەو گێڕابێتەوە. وەنیە بتوانم بڵێم بەڕادەی پێویست تەحقیقاتم لەو پرسیارانە و نهێنییانە کردوە، بەڵام لەوەندەی بۆم کراوە نەگەیشتم بە یەقین و نیمچە یەقینێکیش، تەنانەی ئەو پرسیارانەی بە هۆی ناسیاوانەوە لە ئەهلی ئۆمەر گونبەدم کرد دەربارەی فاتێی دایکی حاجی قادر، کە بەپێی نامیلکەکە دەبێ ئۆمەر گونبەدی بووبێ، ئەوانیش چ وەرامێکیان وەرنەگرتەوە هەر دەڵێی ڕۆژەک لە ڕۆژان فاتێی ئۆمەر گونبەدی دونیای نەدیبێ. کەسێک لەوانەی سوئالیان لێ کرا نەیگوت فاتێیەکی ئۆمەر گونبەد شووی کردبێ بە مەلاییێکی گۆڕقەرەج . دەبێ ئەوەش بڵێم کە فاتێ لانی ئۆمەر گونبەدی بێ سەروشوونە چ لای دیکەشی بۆ ڕوون نەبۆتەوە، واتە کەسێکیش نەیگوتوە خەڵقی فلانە تیرە و هۆزە، کە خەڵقی ئۆمەر گونبەد نەبێ.

سەرپاکی ئەو قسە و باس و پرسیارانە پێویستی بە ساغ کردنەوە هەیە، وا دەزانم کە ساغیش کرانەوە ڕووپێوێکی (مساحە) فرەوان لە سەرەتای ژیانی حاجی ڕوون دەکاتەوە و تیشکی بەهێزیش دەخەنە سەر دواڕۆژانی. بەش بە حاڵی خۆم هەر ئەوەندە عورزەم بە دەستەوەیە لە پێشەوە بە شەرمەوە خستمە ڕوو لەوەدا کە وەزعی ئێستاکەم لە هیچ ڕووێکەوە یارمەتی تۆژینەوە و بەدوادا گەڕانم نادا تاکوو بێ دوودڵی، بە لاییێکدا، مەسەلەکان ساغ کەینەوە. بەڕاستی یەکڕوو کردنی پرسیاری پڕ

گرێوگاڵ پێویستی بە هاریکاریی گشتی هەیە، دەبێ هەریەک لەوانەی خولیای ساغ کردنەوەی ڕابردوویان لە دڵدا هەیە لە لای خۆیەوە، تاکە شەخس ناتوانێ کۆششی خۆی پان کاتەوە بەڕادەی پانایی مەوزووع، کە بشتوانێ کاتێکی یەکجار درێژی پێ دەوێ.

ئەمانەی خستمنە بەرچاوی خوێنەر سەرجوملەی گوتە و بیروڕای جیاجیایە دەربارەی ساڵ و جێگەی لەدایکبوون و کاتی هاتنی حاجی قادر بۆ کۆیێ. قسەیێکی تایبەتی خۆم ماوە، وەک تێبینی، لە بارەی ئەو ساڵەی هاتنی حاجی بۆ کۆیێ لە پێشتر ئیشارەم بۆ کرد و ناوم نا بەڵگەی زیهنی. قسەکەم لە بنەڕەتدا لەسەر تەواتور هەڵدەستێ بەڵام بەڵگەکەی زیهینی، وەک داروەکاز، باڵای لەرزۆکی ئەو قسەیەم ڕاست دەگرێ. دیمەنێکی کەمرەنگی سپیپات وەک زرەخەون یاخود ورێنەی تادار کە هەیە و نیە... نادیترێ لە بەراورد کردنی دیوانەکەی حاجی لەگەڵ هی نالیدا دێتە پێش چاوێکی تارماییبین وەیا هەستی زامی کول. دیمەنەکە ئەمەیە:

وەک بڵێی نالی لە سەرەتای عومریەوە تا ماوەیێکی ئەوتۆ فرچکی گرتبێ بە «لادێی» هەر لە شارەزوور و «خاکوخۆڵ» و دەشتودەر بوە و لە دەستووراتی فەلاحەتدا قاڵ بۆتەوە و کەینوبەینی شۆبڕین و وەردانەوە و تۆ کردن و دروێنە و خەرماندانان و هەڵگرتن و هەموو کاروبارێکی کشتوکاڵی لێ بوە بە «سروشتی مکتسب» و ناوی گژوگیا و گوڵ و گوڵاڵەی بۆ بوە بە فەرهەنگی سەرەتایی گرۆگاڵی منداڵەتی. وێنەی ژیان و ئەحواڵ و ڕوخساری دەرودەشت لە ڕووپەڕەی زیهن و هەستی بوە بە نەقشی هەڵکەندراو. دەبێ بۆیە بێ لە زۆر شوێنی دیوانەکەیدا چاندن و دانەوێڵە و وەرد و شۆ و ئاژۆڵ و گوڵ و گیا وا دەبریقێتەوە هەر دەڵێی تریفەی مرواری و گەوهەرە کە لە ڕشتەیێکدا وەستاییێکی شارەزا و پسپۆڕ هۆندبێتیەوە. وتوێژی نالی لەگەڵ دەشتودەر، گیا و گوڵ و ئاژەڵدا لە هی مرۆڤێکی لادێی ئازموودە دەکا نەک بوێژێکی خەیاڵباز. لەگەڵ مندا سرنج بدە دەوری «چەڵتوک» لەو دوو بەیتەدا:

بەحری غەزەلم پڕ لە دوڕ و گەوهەرە ئەمما
غەوواسی دەوێ یەعنی بە تەعمیقی بزانە

پڕ دانەیە ئەمما نەوەکوو دانەیی چەڵتوک
بەحرم گوتوە نەک وەکوو گۆلی مەرەزانە

سرنجیش بدە ئەم چەند فەردە کە هەر یەکە لە قەسیدە و غەزەلێکەوە هاتوون:

1) گلەی ناکەم ئەوەندەی دەنکە جۆیێ
ئەگەر کەللەی سەریشم پڕ لە کاکەی

2) قوش قوشی ڕاویی نەبێ مورغی کولانە و کەندوە
سەگ سەگی تاریی نەبێ گاوی بنەی ئەنباریە

3) لە دەورانی تەبیعەدا لەگەڵ ثوری فەلەک جووتە
لە ملیا چەنبەری دەوران و تەوقی چەرخی گەردوونە

4) تری وردە قوتا و سایقا
فیا قوتی من جوتە ثم فردە

5) چونکە باوکی میسریو[7] دایکی حەبەش بوو مەهـ..[8]
ڕۆژ و شەو کافوور و میسکی ڕووگەنم خاڵ دەنکە جۆی

بەنیسبەت ئەم بەیتەی دوایی ڕەنگە کەم وایە شاعیر بۆ ئەوە چووبێ خاڵ بە دەنکە جۆ بشوبهێنێ، چونکە زۆر درەنگ خەیاڵ بۆ «جۆرەشکە» دەڕوا تا هەمرەنگیی لەگەڵ خاڵدا ببێتە جێی تەشبیهـ.

نالی لەو شیعرانەدا چاندن و وەرد و جووت و دانەوێڵەی دێنەوە سەر پەردەی تصوری بە جۆرێکی عەفوی بێ ئەوە ماندووبوون و هەناسەسواری نابەڵەدی و بە دوادا گەڕان وەتەنگی هێنابێ.

[7] – وشەی «میسریو» بەم جۆرەم نووسی چونکە لە خوێندنەوەدا وا دەخوێندرێتەوە، دەنا وەزنی بەیتەکە تێکدەچێ.

[8] – بەتاڵایی ئێرە لەوەوە هاتوە کە بۆم ساغ نەبۆوە چ وشەییک وەیا ڕستەیێک پڕی دەکاتەوە.

که لە وەسفی بەهار و کاتی تەشبیهـ کردنیشدا ناوی گوڵ و گیا دەبا بەقەدەر شانێکی دەشت و باغەوانێکی شار لێیان بەڵەدە. ڕادەی ئاشنایی نالی لەگەڵیاندا وا ڕادەگەیێنێ کە ڕیشەیان لەگەڵ ڕیشەی سروشتی تێک ئالاَبێ، هەر بۆیەیشە بەو زۆرییە و ڕێکییە شکۆفە و غونچە و گەڵا و درەخت لە شیعرەکانی سەر وەدەر دەنێن. فەرموو سەیرێکی ئەم چەند بەیتە بکە:

1) هێند مونتەزیری تۆ بوو هەتا چاوی سپی بوو
نەرگس کە لە سەر یەک قەدەم و دیدە چەقی بوو

2) نالی زوبانەکەی تەڕ و پاراوی سووسنت
حەیرانی چاوی نەرگسە وەک لالە نادوێ

3) شەبنم کە «نظم و نثره» لە ئەوراقی غونچەدا
گۆیا بوە بە زار و زوبان و ددان و پووک

4) چاوی هەمرەنگی گوڵە مەستی شەو و ڕۆژی مودام
یەک لە نەشکوفتە وەنەوشە یەک لە نەیلووفەڕ دەکا

5) بولبول کە گەرمی نەغمەیە ئاوور دەکاتەوە
غونچە حەزینە جەرگ و دڵی بۆ دەکا توێ

6) لالە کە مەجمەرێکە بە با خۆش و گەس دەبێ
ناوی کە پڕ خەڵووزە بە شەبنم کوژایەوە

7) شەوبۆی سەری سونبولی زولفت لە سەری دام
ئێستەش سەرەکەم مەستە لەبەر نەشئەیی شەوبۆ

خۆ لە مەدحەکەی«تاقمی مومتازی شاهـ» بەشی زۆری درێژە شیعرەکان لە جەرگەی گوڵ و گیا و درەختەوە هەڵدەستن:

نەرگس نیگەهـ و ساق سەمەن کورتە وەنەوشن
موو سونبول و ڕوومەت گوڵ و هەم لالە کولاهن

گوڵزاری دەر و دەشتن و غیلمانی بەهەشتن
ئاهوو سیفەت ئاتەش بە کەف و تیز نیگاهن

سەحرا بە تەجەللی دەکەنە وادیی ئەیمەن
قامەت شەجەر و مەزهەری ئەنواری ئیلاهن

تەنهایی سەمەن بەرگی وەنەوشە کە دەپۆشن
وەک نووری دڵی غەرقەی زولماتی گوناهن

لالەن بە بەدەن ئەتلەسی ئەخزەر کە لەبەرکەن
نەورەستەوو گوڵ دەستە لەگەڵ بەستە گیاهن

چەند قەسیدەییێکی دیکەش هەن کە لەهەر یەکەیان، پێشتر، یەک یا دوو فەردمان نووسی ئەغڵەب بەیتەکانیان لەگەڵ گوڵ و گیا و دەشتودەر دەدوێن وەک قەسیدەکانی:

1) ئەی شۆخی بێنیاز و گرانناز و غەمزە سووک

2) تەشریفی نەوبەهارە کە عالەم دەکا نوێ

3) درونی لدار الشارزور و بردە

4) گەرمی و تەڕی بەهارە کە پشکۆ کوژایەوە

لەو شیعرانە و گەلێ شوێنی دیکەدا نالی کە ناوی گوڵ و دار و درەخت دێنێ ئەو شاعیرە نیە لە قامووس و کتێبان ناوی دیوون یا لە خەڵقی گوێ بیستیان بوە...
نەخێر کابراییێکی دەشتەکی ئەوتۆیە سەدان جار دەستەی لێ بەستوون و لەسەریان نووستوە و ئەم دیو ئەو دیوی کردوون. بە ئاسانی نایێنە مێشکی بوێژەوە تەشبیهی زمان بکا بە «سوسنی تەڕ و پاراو» یاخود دوو چاوی خێلێک، یەکیان بە «نەشکوفتە وەنەوشە» و ئەوی دییان بە «نەیلووفەر» دابنێ، یاخود بەو هەموو دەسەڵاتە و دیققەتکارییەوە «زار و زوبان و ددان و پووک» بکا بە وێنەی ناو

ئاوێنە کە لە غونچەیێکی شەونم لێنیشتووە دووبارە بێتەوە. دەمەوێ بڵێم سەرەڕای دەسەڵاتی شاعیری هەستی تیژ و فیکری ورد دەبێ «لەگەڵ ژیان - معاشرة» یش یارمەتی نالی دابێ بو ئەو هەموو ئیعجازکارییە لە عاست گوڵ و گیا و درەختدا و هەر بۆیەش ئەوەندە خۆیان دەشیعریدا هاوێشتبێ.

ئەم زاهیرەیەی «نباتی» یە بە هەردوو ڕووی «چەند و چۆن»یەوە لە دیوانی حاجی قادردا خۆ نانوێنێ. بەڵێ گوڵ و گیا و میوە و دەشتودەر لە شیعری هەموو شاعیرێکدا هەیە، بەڵام هەبوونی تێهەڵەنگوتن وەیا بە دوادا گەڕان و خۆ پێوە ماندوو کردن یەکجار جیاوازە لە هەبوونی«زگماک»ێکی ئاسایی کە دەڵێی پارچەیێکە لە سروشت و دەروونی شاعیر. بە ڕادەی ئەوە کە شاعیر لە نزیکەوە ڕەفاقەتی کردبن ناوهێنان و لە کارهێنانیان بۆ دەربڕینی واتا وەیا نەخشەکێشان وەستایانەتر دەبێ.

هەڵبەت ئەو ڕەفاقەتە لە سەرەتای ژیانی شاعیرەوە بێ پتر فرچکی پێوە دەگرێ و لە گیان و میزاجی جێگیرتر دەبێ. بۆیە من وا دەزانم نالی پلەی منداڵی و ساوایی لە دێی «خاکوخۆڵ» و دەشتودەر و نێو گیا و گوڵ و ئاژەڵدا ڕابواردبێ. بەو پێیە و لە ڕێی قیاسی »مفهوم المخالفة»وە دەبێ کزی و کەمی زاهیرەی «نباتی» لە دیوانی حاجی قادردا لەوەوە هاتبێ کە حاجی بە ساوایی وەیا لە سەرەتاکانی منداڵیدا لە لادێ ڕانەبواردبێ. کەواتە دەگەم بەو ئەنجامە کە ئەگەر حاجی قادر وەلادەتیشی لە کۆیێ نەبووبێ دەبێ لە زوییکەوە، واتە هەر لە ساواییەوە لادێی بەجێهێشتبێ و هاتبێتە کۆیێ.

ڕواڵەتی بە یەکدی گرتنی دیوانەکەی لەگەڵ هی نالیدا وا ڕادەگەیەنێ کە ئەم ڕەفاقەتەی سەرەتای ژیان لەگەڵ شیناورد و گوڵ و درەخت و دەشتودەردا بۆ حاجی ڕێک نەکەوتوە، بۆیە ئاشنایی ئەو لەگەڵیاندا هەر بەقەدەر ئاشنایی شاعیرێکی شارستانی بوە. بەڵام هەمان حاجی قادر، چونکە چەند ساڵێکی خوێندنی فەقێیەتی لە نێو عەشیرەت و ڕەوەند و لەگەڵ ڕەشماڵ و مەڕ و ماڵاتدا ڕابواردوە و لە چەند بەهارێکدا خۆی لە هەوارەکانی لاجان و باڵەکاتی و دەوروبەری سابڵاغ و بێتوش دیوە و لە تەفسیلاتی ژیانی کۆچەری و مەڕداری و گاڕان بەخێو کردن و خێمەنشینی شارەزا بوە بۆیە بەو هەموو دەسەڵاتەی «تعبیر و تصویر»ـە لە بەهاریەکەیدا وێنەیێکی لە سەدی سەد و ڕەسسامانەی ژیانی نێو ڕەشماڵ و گژەگژی دا کردنی ئاژەڵ و بێچوو تێپەردان و هەموو کەینوبەینی کۆچەری وەک

تابلۆی زەیتی ئارایش دەدا و بەهار و عێلەجات و سەگ و کەحێل و مەڕوماڵ و باران و هەورەتریشقە و پەڕەوڵی تاقی ئاسمان و هەموو بارێکی ئەو کارەمان بە چاو قوچێنێک بۆ دەخاتە سەر یەک.

تۆ بڵێی ئەگەر حاجی قادر بە چاوی خۆی ئەو جۆرە ژیانە و تێکهەڵقژانە و هەڵسوڕ و داسوورەی نەدیبا بیتوانیبایە لە نەخشەکێشانیدا هێندە خامە ڕەنگین و شیرنکار بووبا. جارێکی دیکەش سرنج بگرە لە وەسفی بیابان و ڕەمل و دڕک و داری ڕێی حیجاز کە نالی لە چەند قەسیدەییێکی «مناجاة»دا بەرەو حەج لە کانیاوی دڵی خۆی هەڵهێنجاون. نە نالی دەیتوانی لە غەیبە ئەو وەسفە ئەفسوناوییەی سەحرا بکا، نەهیچ وەسفێکی وا لە سەرانسەری دیوانی حاجی یا غەیری حاجی کە دیمەنەکەی نەدیبێ و جودی هەیە. ئەو وێنەگرییەی نالی کردوەتی لە دەسەڵاتی تاک تاکەی شاعیری هەڵکەوتوو نەبێ نیە باچووبێتە حەجیش، چ جایی ئەوەی شاعیری حەج نەکردوو و سەحرا نەدیتوو بتوانێ هەیبێ.

ئائەم تێبینیانە وا دەکەن من، ئەو تەواتورە پەسەند بکەم کە دەڵی حاجی لە منداڵییێکی زوەوە یاخود بە ساوایی، هاتۆتە کۆیێ و لەوێ چاوی پشکوتووە و خوێندنی سەرەتایی دەست بێ کردوە تا بوە بە فەقێیەکی فراژوو لە خوێندا نەبیستراوە لەگەشتەکەی باڵەکەتی وکوردستانی ئێرانی بەپێشەوە لە کۆیێ چووبێتە دەرێ بۆ خوێندن.

## لاباسێکی گرنگ

لەژێر ئەم عینوانەدا و بە موناسەبەی کار تێکردنی سروشت و دەوروبەر لە فکر و خەیاڵی شاعیر بە تەفسیلێکەوە بیروباوەڕی خۆم شەرح دا لە گوتە «مقولة»یێکی یەکجار گرنگی فەلسەفەی ماددی کە بەسەر زار و زمانانەوە باوە و دەتوانم بڵێم، بێ دەمەتەقە دەگوترێتەوە و لە نووسیندا دووبارە دەکرێتەوە و، وەک من بۆی دەچم، ئەوەندەی بڵێی زەرەر لە ئادەمزاد دەدا و مافی کەم دەکاتەوە لە هەردوو ڕووی ماددی و مەعنەویی بوون و ژینییەوە.

نووسینی لاباسەکە لەگەڵ ڕەچاو کردنی هەموو پێویستی دوور نەکەوتنەوە لە ئەسڵی باس دیسان نزیکی 80 لاپەڕەی گرتەوە، خۆ ئەوەی ڕاستی بێ هەڵدەگرێ چەندین کتێبی لەسەر بنووسرێ چونکە حیکایەتی «فکر و ماددە» بە بەریەوە هەیە پان بێتەوە تا هەرچی سەربە ئادەمزادەوەیە بگرێتە ناو باوەشیەوە، ئیتر سەبارەت بە درێژبوونەوەی نووسینەکە لە لاییکە و نەبوونی پەیوەندی ڕاستەوخۆی لەگەڵ ئەسڵی باسەکە لە لاییکی دیکەوە کەوتمە سەر بیری ئەوە کە لێرەی ڕاگوێزم بۆ ناو پەڕاوێزی نامیلکە وەیا کتێبێکی دیکە... بەینێکیش دوودڵ بووم لەو ڕاگوێستنەوە، چونکە هەردەڵێی منداڵێکی ساوایە و بێشکەگۆڕی پێ دەکەم، مەعلوومیشە ساوا حەز لە هەوەڵ بێشکەی خۆی دەکا.

بەهەمەحاڵ بڕیارم دا ئەو هێندە نووسینەی ژێر عینوانی لاباسەکە، بە دوودڵیەوە، لەم کتێبە دەراوێژم بۆ ناو نووسینێکی ئایندە. بەڵام دەبێ ئەوە بڵێم بە درێژایی خەریکبوونم لەگەڵ حاجی قادردا ناوناوە کەلێنی ئەو لاباسە دەردەکەوێ، چونکە هەروەک لەم شوێنەدا پێویست پەیدا بوو بۆ دەربڕینی بیروباوەڕم دەربارەی ڕۆڵی فکرو ماددە لە تطوردا نەکا خوێنەر بەسەهوو ببەم، لە زۆر شوێنی دیکەشدا ئەم پێویستییە دێتە پێش لەبەر هەمان سەبەب، واتە بەسەهوو نەبردنی خوێنەر. لە حاڵێکدا لاباسەکە لێرە نووسرابایەوە لزووم نەدەما بەوە لە هەموو شوێنێکی وەک ئێرەدا بیروڕای ناو لاباسەکە دووبارە بکرێتەوە، بەڵام ئێستاکە لاباسەکەم پێچایەوە هەموو ئەو شوێنانە، بەلای خۆمەوە، وەک هەتیوی ڕووتی لێ بەسەردێ.

لەبەر ئەمە هەرچەند بڕیاریشم دا تا دەرفەتێکی ئایندە بیروباوەڕەکانم بە نادیاری بمێننەوە، دان بەوەدا دەهێنم لە بری نووسینی ئێرەکانەم لەبەر تیشکی ئەو

بیروباوەڕانە نەبێ پڕ نابێتەوە، مەبەسیشم کەلەبەری فکرییە، هەر لەبەر ئەم هۆیەیشە بڵاو کردنەوەی ئەو بیروڕایانە بوو بە قەرزێکی ئەدەبی بەسەرشانمەوە، هەر نەبێ بەرانبەر بە نووسینەکەی خۆم و، زیمنەن لە عاست ڕۆحی حاجی قادردا.

بۆ ئەوەی خوێنەر تێم بگا وا لە ژێر ئەم دێڕەدا نموونەیێکی نووسینی ناو لاباسەکە دەخەمە بەرچاوان:

*«دەزانم هەندێ ئەدیب کە حەز لە «تحلیلی ماددی» دەکەن لەوانەن پەسەندی ئەو بەیەکدی گرتنەی دیوانی نالی و حاجی قادرە بکەن بەو جۆرەی کە کردم، چونکە لە ڕواڵەتدا بە یەکدی گرتنەکە ئەوە دەسەپێنی کە «مادده» زاڵە بەسەر «فکر» دا، ئەدی ئەوەنیە تێکەڵبوونێکی سەرەتای عومر لەگەڵ گژوگیادا شاعیرێکی وەک نالی کرد بە پسپۆڕی نەبات؟ مانەوەی حاجی لە نێو عەشرەت و کۆچەر و بەهارە هەواردا، کردی بە ساحیر لە کێشانی وێنەی ئەو ژیانە؟ لە زاهیردا ئەمانە بەڵگەی تازەن دەچنە ڕیزی زنجیرەی هەزار ئاڵقەی بەڵگەکانی دیکەی «نظري وتجريبي»یەوە کە بەڵگەخانەی فەلسەفەی ماددی دەوڵەمەند کردوە».*

ئا ئەمە نموونەیێکی نووسینەکەیە کە پەنجە درێژ دەکا بۆ ئەو ڕێبازەی فکری من تێیرا دەڕوا بەرەو تصوری عەمەلییەتی کار تێکردن و کارتێکران لە میانی فکر و مادده، ئادەمزاد و سروشت. وەک دەبینی لەو چەند ڕستە کورتیلەیەدا من لەو باوەڕەدا نیم، هەرگیزیش تێیدا نیم و ڕەنگە نەشبم، کە مرۆڤ لە گۆڕانی کۆمەڵایەتیدا هەر مرۆڤە دەوجا بەهێز بێ یا بێهێز، سروشتیش لەو گۆڕانەدا عەبد و نۆکەرە ئەویش سەرکەش بێ یا هەموار. تاکە عاملی ایجابی لە گۆڕانی کۆمەڵایەتیدا مرۆڤە، سروشت عاملی بێ تەرەفە، دەسەڵاتی نیە خۆ بکا بە عاملی ئیجابی، مردوە و جووکەی لەبەرەوە نایێ تا بگوترێ بە شێوەیێکی ئیجابی تەدخول دەکا لە گۆڕانی کۆمەڵایەتی. مرۆڤ «فاعل» و سروشت «منفعل»ـە، مرۆڤ کارتێکەرە و سروشت کارتێکراوە. مرۆڤ داهێنەر و پەیداکەر و خاوەنی گۆڕانە.

لە سروشتدا تەنها هەر گۆڕانی بایۆلۆجی بە جۆرێکی عەفوی و لەسەر یاساکانی گۆڕانی تێکڕای گیانلەبەر، پەیدا دەبێ و دەشێ پێی بگوترێ گۆڕانی سروشتی. مادده لە خۆوە یەک میلیمەتر ژیانی کۆمەڵایەتی بەرەو پێشەوە نابا، مرۆڤ نەبێ هەرچی

ماددەی سەر ئەرز و ئاسمانان هەیە نووکی خامەیێک دروست ناکەن، یەک گۆڕانی هەڵنابەستن، دوکانێک دانانێن بووکەشوشەی منداڵانی تێدا بفرۆشن. هیچ شتەک نابێ کڕین و فرۆشتن بکا تا خەیاڵ بڕوا بۆ بووکەشووشە و قەیتانی قۆندەرە.

لەو دیاردانەی زاهیرەی نەباتی لە شیعری نالیدا، ئەگەر ڕواڵەتەکە خەیاڵ بۆ هەندێ ببا کە گژوگیا و دەشت بەرهەمهێنی ئەو زاهیرەیەن، ڕواڵەتێکی درۆزنە، چونکە نالی گژوگیاکەی بەکارهێناوە وەک کەرەستەی تەشبیه و نەخشەکێشان و واتا دەربڕین. گژوگیا بۆ خۆی چەند بێدەسەڵاتە لەوەدا کە کراوە بە ئارایشی هەڵبەستن، وەیا کە دیمەنی بێگیانی لە دڵ و هەناوی گیانلەبەرێکی هۆشیاری پڕ هەستی خاوەن تێگەیشتن و ئیرادەدا دووبارە دەبێتەوە. نە لە قودرەتی شاعیر کەم دەبێتەوە کە نەتوانی وەسفی شتێک بکا نەدیترێ، چونکە شاعیرە و ساحیر نیە، نە لە قودرەتی ئەو شتەش زیاد دەبێ بەوەدا کە وەسف نەکرێ تا نەدیترێ، چونکە مردوو قودرەتی نیە تا زیاد و کەم کات. شاعیر هەر دەمێنێتەوە وەک تاکە عامیلی کاریگەر لە وەسف کردندا. گژوگیاش ئەو عامیلە بێتەرەفە و بێگیانە و بێئیرادەیە دەبێ کە مومکینە بزن و مەڕ بیخوا یا شاعیر وەسفی کا...

ئەمانە نموونەی ئەو تێفکرینانەن کە لەو لاباسەدا شەرح دراون و هەوڵم داوە مافی تەواوی مرۆڤی تێدا ڕوون کەمەوە کە لە گۆڕانی کۆمەڵایەتی و مێژوویی بەری دەکەوێ بۆ ئەوە دەوری کز نەکرێتەوە لە تەک دەوری زۆر موبالەغە تێدا کراوی سروشت و ماددە و دەوروبەر. شریتەی فکرەکان سەر دەکێشێتەوە بۆ باسێکی مەیلەو قووڵ کە درۆی ئەو ڕواڵەتە دەردەخا لە بوونی جۆرێک «ثنائية – Dualism ». لەوەدا دەوری یەکەمی کۆمەڵایەتی بدرێ بە مرۆڤ و یەکجارەکی لە ماددەی مردوو وەرگیرێتەوە.

باسەکە لە وردبوونەوەیدا دەری دەخا کە هیچ «ثنائية – Dualism» پەیدا نابێ، لەوەدا کە مرۆڤ یەکەم عامیلی گۆڕانی کۆمەڵایەتی و تاکە عامیلی ئیجابی بێ تێیدا، مفکری مادديش نابێ لە ترسی فکرەی «ثنائية» خۆ باوێتە باوەشی ستەمێکی یەکجار گەورە دژی مرۆڤ لەو ڕووەوە کە ستاندنەوەی دەوری هەرە گرنگی «تطور» لە مرۆڤ و بەخشینی ئەو دەورە بە ماددەی ڕاستەوخۆ مرۆڤ لە پایەی ڕاستەقینەی خۆی دادەبەزێنێ و هێندەی لێ کەم دەکاتەوە دەتوانم بەوپەڕی دڵنیاییەوە بڵێم کەوا بێلزووم و بێئینسافانە دەیکا بە عەبدی شتێک دەبا ئەو عەبدی

بێ، لە گوێرەی هێنانە خواری پایەشی، بە ناچاری و بەزەرورەت ماف و پاداشی کەم دەبێتەوە، بە ئاسانیش دەکرێ بە عەبدی مۆدێلی سەدەی بیستەم.

مناسب نابینم لێرەدا بە خشکەی خامە پێدزیلکە بە فکرم بکەم بۆ ناو جەرگەی ئەو لاباسە و دووچاری درێژەیێک ببم کە ترسی ئەو وای کرد لاباسەکە ڕاگوێزم. ئومێد دەکەم لە ئایندەیێکی نێزیکدا بیر و ڕایەکانم بە تەواوی بخەمە بەرچاوی ڕەخنەگری خوێنەر.

لێرەدا ئەوەندەش دەڵێم زوربەی ئەو ڕایانە لە ساڵی 1946 دا بوون بە نامیلکەیێکی 60-70 لاپەڕەیی و تەسلیم بە لایەنێکی سیاسی کرا کە ببێتە مەوزووعی لێبوردبوونەوە و ڕەخنەگرتن و چاوگێڕانەوە بە هەندێ باوەڕی سەر بەفەلسەفەی ماددیەوە کە پێویستی هەیە بە نوێ کردنەوە و لێ زیاد و کەم کردن. بەداخەوە نامیلکەکە بزر بوو هیچ نوسخەیێکیشم نەبوو کە فکرەکان وەک هەبوون بیانپارێزێ. وەنیە ونبوونی نامیلکە چ زیانێکی بەخشیبێ چونکە نە ئەو و نە ئەمەی ئێستا و ئاینده دەخرێتە بەرچاوانەوە دەتوانێ بیروڕای کەس بگۆڕێ: خوێنەران تێکڕایان بیروباوەڕی خۆیان هەیە، هەر بەرەیان سەر بە فەلسەفەیێکی پڕ کەرستەی هەڵمەت بردن و لەسەر خۆ کردنەوەن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەنیسبەت نووسینی خۆمەوە واباشتر بوو نامیلکەکە نەفۆتابا و بۆم بوویایە بنگەی گەشتێکی بەرەوپێش.

لەوەدا کە دەڵێم بەتەما نیم کەس بە نووسینی من واز لە باوەڕی خۆی بێنێ نابێ خەیاڵ بۆ ئەوە بڕوا کە من خۆم باوەڕم زەعیفە بەو شتەی دەینووسم، ئەگەر باوەڕم بە ڕایەکانی خۆم لە حەدبەدەر نەبا هەرگیز جورئەتم نەدەکرد دەریان برم لەگەڵ ئەوەدا کە دەزانم تەئسیر ناکەن و چ لایەنێکیش لە سەریان بە جوان نایێ. فکری فەلسەفی و کۆمەڵایەتی وەک پرسیاری حیساب و کیمیا نیە بە بورهان ئیسپات بکرێ، گۆڕانی باوەڕی سیاسی و فەلسەفی بە نووسینی یەک و دوان و پەنجایان ناکرێ: فەرموو بە نووسین باوەڕی بوتپەرستێک بگۆڕە، خۆ مەعلوومیشە لە بوت پەرستن بێئەساستر چ فکر و باوەڕ پەیدا نابێ، یاخود هەوڵ بدە یەکێک بێنە سەر باوەڕی خۆت کە مەدرەسەی فکری ئەو لە هی خۆت جیاواز بێ، دەیان تەجرەبەی ڕۆژانە ئیسپات دەکا کە فکرەکەت ڕاست نیە کەچی تا وازی لێ دەهێنی پیر دەبی... خۆ ئەگەر لێشم نەسەلمێنی بەنیسبەت فکری خۆتەوە، چ ئعتراضت نیە لەوەدا بڵێم

فکری مەدرەسە سیاسیەکەی ناحەزت هەموو ڕۆژان دە جاران ئیسپات دەبێ درۆیە کە چی پەیڕەویکەرانی ڕۆژ سوورتر دەبن... بەداخەوە.

قسە زۆرن و مەوداش کورت. با لێرەوە ڕابگەڕێینەوە بۆ باسی حاجی قادر. ئەم چەقەچەقەی فکر و ماددە ببێتە بەڵێن لە منەوە بۆ دوارۆژێکی نزیک، کە هیچ بەرهەڵستێکی لە خۆم بەهێزتر نەیێ و دەستم بگرێ.

## حاجی قادر لە پلەی دوای تەمەنی منداڵی

لە گۆڕقەرەج بێ یا لە کۆیێ، ساڵی 1231 بێ وەیا 1240، حاجی پێی نایە کۆڕی کوردەوارییەوە و بوو بە ڕۆڵەیێکی هەستیاری کوردستان.

ئەو دەمەتەقە و سەلماندن و نەسەلماندنە کە لە دەوری ساڵ و جێگەی وەلادەتییەوە هەڵدەستێ، لە عاست جێگەی قۆناغی دوای پلەی منداڵییەوە تارماییشی نامێنێ. هەموو ڕیوایەت و تەواتور و خەبەری نووسراو و کەلەپۆرێک لە سەردەمی حاجی و خودی حاجیەوە بە ئێمە گەیشتبێ لەوەدا یەکدی دەگرنەوە کە منداڵی و گەنجایەتی و خوێندنی فەقێیەتی لە کۆیێ بەسەربردوە. لە هەر تەمەنیک بووبێ کە گۆڕقەرەجی بەجێهێشتوە و هاتۆتە کۆیێ، لەوە بەولاوە بۆتە کۆیێ و پەیوەندی ژیان و نیشتەجێی لەگەڵ گۆڕقەرەجدا بەجارێ پچڕاوە. مەگەر ناوناوە سەردانی لە خزمان کردبی دەنا هەموو ژیانی ئەو دەورەی لە کۆیێ ڕابردووە.

هەڵبەت ئێمە کە وا دەڵێین، وا ڕادەنوێنین حاجی قادر لە گۆڕقەرەجەوە هاتبێتە کۆیێ نەک لە کۆیێ بەوەلەد بووبێ بەمەشدا ڕێی سەخت دەگرینەوە بەر نووسینەکەمان و لایەنی ئاسان بەلاوە دەنێین، چونکە وەک دوای لەحزەیێک لێی دەدوێین هەر هەنگاوێک منداڵیی و ساوایی و سەرەتای ژیانی حاجی بەرەو کۆیێ نزیکتر کاتەوە ڕووپەڕەی پلەکانی دواتری حاجی کە «کۆییاتی»یەکی خەست و تێرە گونجاوتر دەکا لەگەڵ ئەو سەرەتایانە، چونکە پێی ناوێ من بڵێم مەنتیق وا داخوازی دەکا هەستی حاجی بە کۆییاتی لەگەڵ ئەوەدا زیاتر دەگونجێ کەوا بە ساوایی هاتبێتە کۆیێ ئەگەر نەڵێین لە کۆیەش بەوەلەد بووبێ.

پچڕانەوەی حاجی لە ژیانی لادێ و بوونی بە دانیشتوویێکی شارستان تەنها گوێزانەوەییێکی خانەگۆڕی نیە لە لادێوە بۆ شار. هەر وەک نەمامێک بە ڕەگ و ڕیشەوە لە جێی خۆی دەرکێشی و بە پنجەوە لە جێگەییێکی دیکە بینێژی، حاجیش بەو جۆرە ڕەگی لە لادێ دەرکێشرا و لەکۆیێ چاندرا و ڕوا. نەک هەر پەیوەندی ماددی و ڕابواردن و گوزەران و تێداژیان بەڵکوو پەیوەندی ڕۆحیشی لە گۆڕقەرەج بڕا و بە کۆیەوە لکا.

ئەم پچڕانەوەی حاجی لە بێشکەی کۆنی و خزانی بۆ ناو بێشکەی تازە بەو جۆرە یەکجارەکی و لە هەموو ڕوێکەوە بەتەواوی، زاهرەییێکی ئەو تۆیە نیگای سرنج بۆ خۆی ڕادەکێشێ و پرسیاران هەڵدەستێنێ و داوای وەرام و تەفسیر دەکا. ئێمە وامان ڕانواند حاجی لە گۆڕقەرەجەوە هاتۆتە کۆیێ، خۆ ئەگەر نامیلکەکەی مەلا عەبدولڕەحمان بگرین بە شایەد هاتنی بۆ کۆیێ لە عومری نۆ ساڵی بە تایبەتی لە لادێ عومرێکە مرۆڤ دەکا بە فرچک گرتووی ژیانی لادێ لە هەموو ڕوەکانی ئەو ژیانەدا، کەواتە بۆ دەبێ حاجی ڕۆژەک لە ڕۆژان یادی ئەو ژیانە و ئەو لانە نەکاتەوە؟ هەر دەڵێی لە بیر خۆی دەباتەوە و لە موناسەبەشدا بەسەر زمانی خۆیدا ناهێنێتەوە.

تۆ سەیرکە بە فەندی وشە تێکهەڵکێشان ناوی چەندین جێگەی وەک تەکەڵتوو و ئۆمەر گونبەد و ئاگر و ئاوەگرد و شارەزووری خستۆتە ناو هەڵبەستەکانیەوە کەچی نە بە هێما نە بە وشە تێکهەڵکێشان نە بە سەراحەت ناوی گۆڕقەرەج نابا. ئەوەش ناسەلمێنرێ بگوترێ ڕەنگە ناوی بردبێ، بەڵام هەڵبەستێکی کە ناوی تێدا بردوە فۆتاوە چونکە جێگەی لەبارتر بۆ هێنانی ناوی گۆڕقەرەج لەو جێگایە چنگ ناکەوێ کە ناوی ئۆمەر گونبەد و تەکەڵتووی تێدا هێناوە بەو هۆیە کە هەر سێ ئاوایی دراوسێی یەکدین.

ئەوەندەی فکرم کردەوە لە دۆزینەوەی سەبەبێک بۆ ئەم ئەڵوەدای یەکجارەکی حاجی لە دێی باب و باپیرانی، نەگەیشتم بە هیچ ئەنجامێکی ئەوتۆ نیمچە قایلیشم بکا. تا ڕادەییێک کە بگوترێ حاجی لە کۆیە هاتۆتە دونیا سەرسوڕمان لەو بێدەنگییەی حاجی کەم دەبێتەوە بەڵام شتێکی هەر دەمێنێ، چونکە هەر نەبێ دەبێ وەک تەکەڵتووی حیساب کا. تۆ بڵێی چ «رد فعل»؟ یاخود تۆ بڵێی عیشقی حاجی

بۆ کۆیێ لە سەرەتای ژیانیەوە سۆزی خۆشەویستی لە دڵیدا پەیدا نەکردبێ تا ئەو ڕادەیە پەردەی فەرامۆشی یەکجارەکی خستبێتە سەر بێشکەی یەکەمی بوونی؟

فکرم لەو پرسیارانە تێ بڕ ناکا و هیچ تروسکەیێکم لێوە دیار نیە، نە لە دیوانی حاجی، نە لە خەبەراتی دەماودەم، ڕێگەیێکی بەراورد کردنم بۆ بباتەوە سەر سەبەبێک. خوێنەریش وەک من، هەرچی هەیە لە هۆی دۆزینەوەی سەبەب وا لە پێش چاوی، ئەگەر ئێستاش هەندی من لە ئەحواڵی حاجی نەزانێ دوای خوێندنەوەی هەموو نووسینەکەم چ نامێنێ لای من زانراو و لای ئەو نەزانراو بێ دەربارەی ئەو پرسیارانە.

ئەوەی ڕاستیش بێ دڵم بۆ ئەوە ناچێ بێدەنگبووبێ حاجی لە عاست گۆڕقەرجدا ڕێکەوت بێ. وا دەزانم لێی لا داوە بەڵام نازانم لەبەر چی! ناشمەوێ خۆ بکەم بە زانای «سایکۆلۆجی» و چراییکی خوازرایەوە هەڵکەم وەک فانۆسەکەی «دیوجین» پەنا و پەسێوی شرایەوە و نهێنی لە گوتە و هەڵبەست و کەلەپۆری سەر بە حاجیەوەی پێ بپشکنمەوە بۆ دۆزینەوەی سەبەبێکی چەشمبەندانە. لە قووڵایی دڵمدا کە بەینێکە خەیاڵی حاجی تێیدا دێ و دەچێ یەقینێک هەست پێ دەکەم کە حاجی بە خۆڕایی بێباک نەبووە لە عاست گۆڕقەرەج، تابڵێی نارەحەتیشم بە دەست نەدۆزینەوەی هۆی ئەو بێباکییە. خۆ باهەڵدانی بێهودەش نامان گەیەنێ بە هیچ، کەواتە ئەم زاهیرەیە با بەجێ بێڵم وەک ڕاستیێکی «احتمالی» بۆ هەڵکەوت و ڕێکەوتی دوارۆژ بەڵکوو لە لاییکەوە خەبەرێک و ئەسەرێک پەیدا بێ هۆیەکەمان بۆ ئاشکرا کا، یاخود شیعری ئەوتۆی حاجی بەدەستمان بگا کە ناوی گۆڕقەرەجی تێدا هێنابێ و ببێتە وەرامی پراسیارەکە و ڕواندنەوەی ئیشکالەکە. هەرچەند لەوەدا بێ ئومێدم.

بەهەمەحاڵ، سەبەب هەبێ و نەبێ بۆ ونبوونی ناوی گۆڕقەرەج لە شیعری حاجی قادردا، ئەو حەقیقەتە هەر دەمێنێتەوە کە حاجی بوو بە یەکێکی کۆیی ئەوتۆ بە هەموو عومری کۆیی بووبێ. ئەم ڕاستیەش لە زۆر ڕووەوە خۆ بەدەردەخا و تیشکێک دەداتەوە و لایەنێکی گرنگ لە شەخسیەت و سروشتی حاجی ڕوون دەکاتەوە و پشکنەریش شارەزاتر و ئاشناتر دەکا بە زنجیرەی هەنگاوەکانی حاجی کە لە سەرەتای ژیانییەوە هەنگاوی لە خۆڕازی و باوەڕ بەخۆ هاتوو بوە. حاجی کە بوە بە کۆیێ هەرچی هەستی غەریبی و میوانەتیی بێ لە دڵ و مێشک و خوێنیدا جووڵەی

نەکردووە، بە پێچەوانە لە کۆییەتیدا هێندە چەسپاوە و ڕەگ داکوتاو بوە بە مەیدان و قۆناغ پێش زوربەی خەڵقی شارەکە کەوتۆتەوە، ئەگەر نەڵێم هەموویان. حاجی لیێیان بوە بە مامۆستا و ڕابەر لە کۆییەتیدا تا وای لێهاتوە هەر دەڵێی ئەو خاوەن ماڵە و خەڵقەکە مێوان.

بە عادەت کە یەکێک لە شوێنێکەوە ڕادەگوێزێ بۆ شوێنێکی تر تا ماوەیێکی دوورودرێژ قەپێلکی غەریبی لە بۆتەی ڕەوشت و نەریت و دەستووراتی ئەو شوێنە تازەیەدا ناتوێتەوە و تۆزی غەریبی لێ ناتەکێتەوە. ساڵەها تێدەپەڕێ بەر لەوەی مرۆڤی غەریب جلوبەرگی مەفتەنی تازەی لەبەر بکا. ئەغلەب وا دەبێ ئەو مرۆڤە بە هەموو عومری خۆی نیسبەتی ناوی بۆ کۆنەمەفتەنی بەلەقەب، بە میراتیش بۆ مندالانی، بەجێ دەمێنێ. وا هەیە ئەو لەقەبە پشتاوپشت لەگەڵ منداڵ و نەوەی نەوەیشی سەرەوژێر دەبێتەوە و هەر دەڵێی، بە زاراوەی شوانان بۆتە «دەستبێن»و هەموویان بە شوێنەواری کۆنیانەوە دەبەستێتەوە.

بێگومان مرۆڤ تا هەستی غەریبی لە خۆیدا بکا کنارەگیر دەبێ لە کەینوبەینێکی کە لە مەفتەنە نوێیەکەیدا ڕوو دەدا. دوورمەبینە کە ویستی خۆی تیکەڵ بە چاکە و خراپەی ئەو شوێنە بکا کەسانی ڕووشکێن و جەربەزە لێی بەدەنگ بێن و بیشکێننەوە بەوەدا کە غەریبە و خۆ لە کاری لاوەکی هەڵدەقورتێنێ. ئەوەی لێرەدا دەیڵێم، حاڵێکە و هەمووومان دەیزانین، نەک هەر لە کوردەواریدا بەڵکوو ڕەنگە لە هەموو جیهان بوە و دەبێ. لەگەڵ ئەو ڕاستیەدا ڕاستیێکی دیکە هەیە وەک خزمەتکار تەقویەی دەکا: مرۆڤی غەریب تا هەژارتر و بێ دەسەڵاتتر بێ درەنگتر دەچێتە ڕیزی دانیشتوانی زگماکی مەفتەنی تازەی و تەمغەی غەریبیشی زەحمەتتر لێ دەسوێتەوە. دەسەڵات و دەوڵەمەندی، وەک دەزانین، چالاکانە ڕێوجێ خۆش دەکەن بۆ حەسانەوەی خاوەنەکەی و بەخێرهێنانی. ئەم ڕاستییانە و تێبینیانەت لە بیر بێ.

حاجی قادر کە هاتوە بۆ کۆیێ هەرچی سامان و دەسەڵات هەیە نە خۆی نە ئەو کەسەی هێناوەتی بۆ کۆیێ نەیبوە. ئێمە لەو وتووێژەی تا ئێرە کردوومانە لەسەر ئەو ئیحتیماڵە ڕۆیشتین کە دایکی بە منداڵی بۆ کۆیەی هێناوە، دوای مردنی باوکی بەو پێیە سەرەڕای بێسامان و بێدەسەڵاتی، حاجی قادر هەتیمیش بوە کە هاتۆتە کۆیێ.

دەوجا بۆ خۆت بیر بکەوە لە حاڵی هەتیمێکی هەژار کە بە غەریبی لە لادێیەکی بچووکەوە بێ بۆ شارستان.

وەک حیکایەت ڕایگەیاند لە کتێبولکەی مەلا عەبدولڕەحمان، گوتەی دەماودەمیش دەگێڕێتەوە حاجی هێشتا منداڵ بوە دایکیشی مردوە. نە باب، نە سامان، نە دەسەڵات، نە هێزی بازوو، نە هیچ شتێک لەو شتانەی دڵ ئارام دەکەن و ئازایی بە مرۆڤ دەبەخشن لە کاسەی حاجیدا بایی تۆسقاڵێک نەبوە. لەو تەمەنەدا کە منداڵ دێ فەرقی خۆشی و ناخۆشی و هەست بە شانازی وەیا شەرم هاتنەوە دەکا.

لەو تەمەنەدا پلەی هەرە بەرز لە بێپلکەی کۆمەڵایەتی کە حاجی پێی گەیشتوە شاگرد ئێمەنیدروویی بوە. شایەدی شێخ ڕەحیم ئەم لایەنی بۆ ساغ کردووینەوە. خۆ لە ڕاستیدا ئەگەر شێخ ڕەحیمیش چ شایەدی لە لا نەبا زاهیری حاڵی حاجی قادر پلەیێکی لەوە باڵاتری بۆ دیار نەدەکرد. بەجێ مانی لە خوێندنیش، وەک دیتمان، لە لای خۆیەوە ڕاگەیاند کە دەبێ حاجی لەبەر هەژاری و خەیکبوون بە گوزەرانەوە تەرکی خوێندنی کردبێ وەیا بە درەنگەوە ملی نابێتە خوێندن. ئەمانە ڕاستی و تێبینی بێفێڵن لە ژیانی حاجی قادر.

بەدوا ئەم تێبینی و ڕاستییانە ڕاستیێک دێتە بەرچاو هەمووان دەپێچێتەوە و دەبێتە تیشکێکی ناوەکی کە دەروون و شەخسیەتی حاجی ڕوون دەکاتەوە، با بڵێم سروشت و »جبلە«تی ئاشکرا دەکا، بەڵکوو دەتوانم بڵێم ئەو تیشکە وەک کلیلێکە کە دەرگەی پێ دەکردێتەوە بۆ ناو نەفس و ویژدانی حاجی و ڕادەی بەهێزی و بێهێزی ئەو نەفس و ویژدانەمان بۆ دیار دەخا… تاریکایی تێدا ناهێڵێ تا لزووم بمێنێ بۆ ناسینی، مرۆڤ بکەوێتە سەر لێکدانەوە: حاجی قادر، بەو ڕاستییانەدا مەعلووم دەکرێ دەبێ ئادەمزادێکی یەکجار نەفەس زل و لەخۆ ڕازی و ئازا و باوەڕ بە خۆ هاتو بووبێ، گەلێک لە عادەت بەدەر، تاکوو لەبنی چاڵی هەژاری و هەتیوی و غەریبیەوە بە خێرایی و لەزوێکەوە گەیشتبێتە ڕیزی هەرە پێشەوەی کۆمەڵایەتی کۆیێ.

هەموو خەبەراتی دەماودەم، کە زۆر جاران چاوگی نووسراویش پشگیریان دەکا، ئەوە ڕادەگەیەنن حاجی قادر هەر لە دەوری خوێندنی فەقێیەتییەوە مرۆڤێکی ناسراو و ڕێز لێگیراو بوە. وەک یەکێک لەو پیاوانەی خاوەن جێوڕێ و سامان و ناو و

شەخسییەت بەشداری کردوە لە جوموجۆڵی کۆمەڵایەتیی و هاتوباتی ژیانی ڕۆژانەی شارەکە و کەینوبەینی خۆشی و ناخۆشییەک کە ڕووی دابێ. لێرە بەپێشەوە موناسەبە داخوازی کرد باسی ئەوە بکەین کە شیعری سەر کێلەقەبری حاجی بەکر ئاغا بەکر هەڵبەستی حاجی بوون، ئەو ڕۆژەش ڕووداوی گرنگتر و دیارتر لە مەرگی ئەو مەزنە پیاوە لە کۆیەی ئەوسادا چاوەنوارِ نەدەکرا کە بە ئەدەب و زەکای یەکێکی لە حاجی ناودارتر و هێژاتری بسپێرن.

بێگومان سپاردنی ئەو کارە بە حاجی قادر بۆ خۆی یەکێکە لەو بەڵگانەی شورەت و بەرچاوی و پایەی حاجی ئیسپات دەکەن. لەو ڕووەوە کە بە جۆرێکی عەفەوی جاری وەها و لە هەڵکەوتی وەهادا خەیاڵی خاوەن بەرزەوەند بۆ کەسێک دەچێ لەو لایقتر بەدەست نەکەوێ. خۆ دەشزانین لە کاتی مەرگی حاجی بەکر ئاغادا 1270 حاجی قادر فەقێ بوە، ئەوسا نەشچووبوو بۆ گەشتەکەی خوێندن لە باڵەکەتی و کوردستانی ئێران، تەمەنیشی لەوەدا نەبوو کە بگوترێ ڕەنگە حورمەتی پیریی حاجی قادری پێش خستووە.

نەخێر لە شەخسییەتی خۆی بەولاوە هیچ هۆیەک نەبوە لەو هەڵوەستە و هەموو هەڵوەستەکانی پێش و دوای حاجی قادر بباتە ڕیزی پێشەوەی کۆمەڵایەتی کۆیێ... تەنانەت بویژی (شاعریەت) بە تەنها یارمەتی ئەو چوونە پێشەوەیە نادا، شاعیرێکی عادەتی دەتوانێ بە ئاسانی ببێتە سواڵکەرێکی «محترم» کە شاعیرەکە خۆی ئارەزۆی سواڵکەری بکا.

شاعیرییەتی حاجی قادر بە پیچەوانەی سواڵکەریی و قەلەندەر مەشرەبی ئەغڵەب بە شەڕی هێناوە لەگەڵ ئەم و ئەودا و بەربەرەکانی کاری نالەباری پێ کردوە. حاجی شاعیرێکی نەسەلمێن و لەخۆ ڕازی و هێرش بەر بوە، ئەم ڕەوشتانەش نەک هی سواڵکەر نینە و بەس، بەڵکوو پیاوی بەخشندەش کەم وایە هێندەی لە باراندا بێ. هەموو بەخشندە ناتوانێ، یاخود ناوێرێ، لە کاری نارەوا بەدەنگ بێ، زۆر بەخشندە هەن بە بەخشین بێدەنگی خەڵق دەکرِن چ جایی خۆیان تێکەڵ بە چاکە و خراپەی ئەم و ئەو بکەن.

چەسپاندنی حاجی قادر لە ژیانی کۆمەڵایەتی کۆیەدا بەقەدەر هەر ڕەوشت و سروشتێکی دیار لە ژیانی حاجیدا دیار بوە. گوزارشتی کە لێی دەگێڕدرێتەوە لەگەڵ

هەڵبەستەکانی، لەم ڕووەوە وەک دەنگ و دووبارەبوونەوەی یەکدی تصدیق دەکەن. بەڕادەی شایەدی ڕەوشت و کردەوە و ڕەفتاری حاجی لەو سەردەمی کۆیەدا کە بە تەواتور پێمان گەیوە دیوانەکەشی شادیەدی دەدا کەوا حاجی لە سەرەتای خۆناسینیەوە ڕۆڵەیێکی هەستیار و هۆشیار و ئازا و دڵسۆزی کۆیێ بوە، هەر دەڵێی دوای نیشتنەوەی کەشتیەکەی »نوح« بەسەر کێوی جودەوە، باپیرە گەورەی حاجی لە دانانی هەوەڵ بەردی بناغەی کۆیێ بەشدار بوە. ئەوەندەی سرنج بگریە شیعرەکانی تاکە وشەیێکت نایێتە بەرچاو وەک ڕەمزیش پەنجە درێژ کا بۆ ڕۆژگارێک کە حاجی کۆیی نەبووبێ.

چەندێکی بەراوردیم کردبێ لە میانی شیعری حاجی و شاعیرانی دیکەی کۆیی و غەیری کۆیی نەمدیوە هیچیان نە وادەی حاجی خۆ بە خاوەن ماف، بەڵکوو مەسئوول، بزانن لە کاروباری ئەو جێگەی لێی ژیاون. قسە لێرەدا لەگەڵ ئەو کەسانە و شاعیرانەیە کە وەک حاجی لە هێزی شەخسییەتی خۆی بەولاوە هۆی تدخل کردنی نەبووبێ لە کاروباری گشتی مەفتنەکەیدا، نەک شاعیرێک وەیا زانایێک سەرەڕای ئەدەب و زانستی خۆی پایە و دەسەڵاتی تدخل کردنی هەبووبێ، تەنانەت لێرەشدا بە دەگمەن نەبێ هاوتای حاجی دەست ناکەوێ. لەگەڵ درێژبوونەوەی زنجیرەی باسەکان ئەم لایەنە یەکجار گرنگەی سروشتی حاجی لە هەڵوەستی جۆراوجۆردا زیاتر خۆ ئاشکرا دەکا.

بەداخەوە ڕوون کردنەوەی هێزی نەفس و گیانی کەموزۆر ڕۆناکایی ناداتەوە بۆ جۆری ژیان و ڕابواردنی ئەوسای حاجی قادر. هەر هێندەمان مەعلووم کرد حاجی لە منداڵیدا شاگرد ئێمەنیدروو بوە و لەوەڕا دەزانرێ کە لە خوێندن دواکەوتووە یاخود بە درەنگەوە دەستی کردوە بە خوێندن. لەوە بەولاوە، نە من دەزانم نە کەسیشم پێ شک دێ بزانێ، تا چ تەمەنێک شاگردی کردوە و کەی بەتەواوی کەوتۆتە سەر خوێندن و هەوەڵجار لای کێی خوێندوە و چەند جاران مزگەوت و مامۆستاگۆڕی کردوە و چ تەرزە فەقییەک بوە و سەرەتاتکەی گەنجایەتی لە کێ کردوە، بۆ ژنی نەهێناوە و نەکەوتۆتە سەر فکری گوزەران پەیدا کردن و ماڵ پێکەوە نان؟ چ بوو هانی دا درێژە بە خوێندنە دواکەوتوەکەی بدا تا دەگەینێ بە باڵەکایەتی و کوردستانی ئێران؟

هیچ کامێک لە ڕیزەی ئەم پرسیارانە و چەندین پرسیاری وەک ئەوان وەڵامێک وەرناگرێتەوە. خەتی بەیانی جووڵانەوە و کردار و ڕەفتاری حاجی لەو سەردەمانەدا کە دەبن بە پەراوێزی ئەم پرسیارانە سەروبنی دیار نیە هەرچەندە ناوناوە لێرە و لەویّ تێی هەڵدەنگوین. بەڵام لە ناو شەوەزەنگی ئەو نادیارییەی چۆنەتی ژیانی حاجی، زۆر بە سەیری، بێدەنگی و کش و ماتی و نەبوونی تەقەوڕەقە تێیدا یارمەتی ئەوەمان دەدا بچینە سەر ئەو قەناعەتە کە جاجی قادر ژیانێکی ئاسایی و عادەتی ژیاوە. لەو ڕۆژانەی سەرەتای عومری خۆ ناسینی، چ ڕووداوێکی ئەوتۆ بەرەنگاری نەبوە تەقینەوەی زرنگابێتەوە لە دوارۆژدا وەک ئەو هەرا و ناکۆکییەی کە لەگەڵ شێخ نەبی ماویلیدا، گەشتی باڵەکەتی و کوردستانی ئێرانی بوو بە باس و خواسێک کە سەرەوژێر بۆوە تا ڕۆژانی ئێستامان و دەشڕوا بەرەو دوارۆژێکی نادیار. نەبوونی سەر و سۆراغێکی ژیانی ئەو قۆناغە لە عومریدا وا ڕادەگەیەنیّ چی ئەوتۆی تێدا ڕوونەداوە ببێتە دەنگ و باسی ئەوسا و دوارۆژ.

زۆر جاران ڕووداوی خۆش یا ناخۆش دەبێتە هۆی ناسین و زانینی ئەو زەرفە و ئەو کەسانە کە عەلاقەیان هەیە لەگەڵ ڕووداوەکە. ڕووداوی ناخۆش هەرچەند لە کاتی خۆیدا کەس لێی ڕازی نیە بەڵام بەنیسبەت دوارۆژەوە چرایێکە و مێژووی کۆن ڕوون دەکاتەوە. «خۆزگە» دارێکە و شین نەبوە. ئەگەر ڕێم هەبا دەمگوت خۆزگە حاجی لەو سەردەمانەدا دووچاری شتێک هاتبا، خۆش یا ناخۆش، دەنگی دابایەوە و ڕۆژگارەکەی لە تاریکیی نەناسی و بێسەروشوونی دەرخستبا و ئێمەشی لەو سەرسوڕمانە و حەپەسانە ڕەساندبا.

تێبینی ڕوودان و شتی خۆش و ناخۆش لە ژیانی ئەوسای حاجی قادردا ئەو بابەتە دەگرێتەوە کە لەگەڵ خودی خۆیدا بەتایبەتی پەیوەندی هەبوبیّ نەک ئەوەی کە بۆ هەموو خەڵق وەک یەک وایە. بەڕاستی شاعیرەکانی کوردی پێش دەوری تازە، واتە شاعیرانی سەدەی نۆزدەم و ئەغڵەبی سەرەتاکانی سەدەی بیستەم کەم بوە بە غەیری دڵ و دەروون و هەستی زاتی خۆیانەوە خەریک بووبن، زوربەی ناوەڕۆکی دیوانەکانیان گرۆگاڵی عیشق و شیکایەت و واتا و وشە تێکهەڵکێشان و کۆمەڵ کردنی جوانکاری و فەند و فێلی ئەدیبانەیە، ناوناوەییێکی کەم نەبیّ شاعیر تفاعلی لەگەڵ دونیای دەرەوەی نەفسی خۆی بوە.

ئەم زاهیرەیەی دابڕانی ئەدیب لە ژیانی ڕۆژانەی سەردەمی خۆی هۆی ماددی ئاشکرای هەیە ئومێد دەکەم لە جێی مناسبی خۆیدا نەختێکی لەسەر بدوێم، بایی ڕوون کردنەوەی مەبحەس. لێرەدا بە موناسەبەی دوان لە کشوماتی و بێهەرایی دەوری سەرەتای فەقێیەتیی حاجی قادر ئەو تێبینییە کورتیلەیەم کرد کە دەبوا بیکەم، من حیسابێکی کەم نەبێ نایکەم بۆ دەنگ نەدانەوەی ڕووداوی گشتی لەو سەردەمانەدا لە شیعری حاجی و غەیری حاجی، چونکە بەپێی دەستوور چاوەڕوان ناکرێ دەنگ بداتەوە، ئەگەر چاوەڕوان کرابا بۆم هەبوو دەلالەتێکی گەورە وەرگرم لە دەرنەکەوتنی ڕووداوێکی گەورە لە شیعری حاجی قادردا.

لە ساڵی 1246 تاعوونێکی قڕان هێن کوردستان و عێراق و جێی دیکەی گرتۆتەوە خەڵکی وەک گەڵای دار هەڵوەراند. یەک لەوانەی لە کۆیێ پێی مردوون »واثق بالله مەلا عەبدولڕەحمانی جەلیزادە« - باوکی حاجی مەلا ئەسعەد و باپیری حاجی مەلا عەبدوڵا بوە. هەر هەمان تاعوون بنەماڵەی حەویزییانی شڕ کردوە تاکە پیاوێکی لێ دەرچوو بێ جاجی بەکر ئاغا بوە. لەو ساڵەدا بەپێی نامیلکەکەی مەلا عەبدولڕەحمان تەمەنی حاجی قادر 14- 15 ساڵی بوە کە دەست دەدا بۆ وەرگرتنی وێنەی کارەساتی وا کوشندە و هەڵڕشتنەوەی لە هەڵبەستدا. خۆ سەروبنی دیوانی حاجی بکەی تارمایی ئەو تاعوونەشی تێدا نادۆزیەوە، بەو پێیە دەبێ نەبوونی ناوونیشانی تاعوونەکە لە شیعری حاجی قادردا ببێ بەهۆی تەرجیح، ئەگەر نەڵێم ئیسپات، بۆ ئەوە کە ئەوسا حاجی لە عومرێکدا نەبوە کارەساتی وا کاری تێ بکا. واتا گەلێک لە 14-15ساڵی گچکەتر بوە. کەچی من لە موناقەشەی ساڵی بەوەلەدبوونی حاجی ئەم تێبینییەم هەر باس نەکرد، لێرەشدا باسم نەدەکرد ئەگەر پێویست لێی داوام نەکردبا.

لزووم نیە لە لای خۆتەوە بارمەتیم بدەی و ئەم تێبینییەم بۆ حیساب کەی بە بەڵگەوە وەیا هۆی ترجیحی ڕایەکەی خۆم کە دەڵێم ڕەنگە حاجی 1240 دا هاتبێتە دونیا و نەهاتنی ناوی تاعوونەکە لە شیعریدا نەبێتە موجیبی سەیر پێ هاتن چونکە تەمەنی شەش ساڵانە بوە لە کاتی ڕوودانی. بەڵێ لزووم بە یارمەتی دان نیە لەو ڕوەوە کەوا شتی وەک تاعوونەکە گرنگ ڕووی داوە لە کاتێکدا کە تەمەنی حاجی لە 20 ساڵان تێپەڕیوە کەچی کەموزۆر لە شیعریدا ناو و هەستی نیە.

له 1262 كه هەر نەبێ حاجی عومری 22 ساڵی بوه به پێی لێكدانەوەی من، هەرای بەینی ئەحمەد پاشاو نەجیب پاشا ڕووی داوه له كۆیێ و ئەنجامی هاتوه به شكانی ئەحمەد پاشا و هاتنی نەجیب پاشا بۆ شاری كۆیێ و كشانەوەی لەشكری بابان بۆ سلێمانی. ئا ئەم ڕووداوه گرنگەش بزره له سەراپای شیعری حاجی، خۆ چ تەوجیهی تەمەن گچكەش جێی نابێتەوه تا بڵێین ئەو هۆی بزری ڕووداوەكەیه، چونكه وەك گوتم ئەوسا بەپێی لێكدانەوەی من 22 ساڵی بوه، بەگوێرەی نامیلكەكەی مەلا عەبدولڕەحمان 31 ساڵی بوه.

دەوجا كه دیار نەكەوتنی ئەم كارەساته له شیعری حاجیدا نەبێته ئیسپاتی چووكیی عومری، كەینوبەینی تاعوونەكەش نابێته ئیسپات له مەیدانی خۆیدا. وەدەستهێنانی متمانه لەو زاهیره و هی وەك ئەو له ڕێی لێكدانەوه و بەراورد كرن و بەیەكدی گرتن كارێكه تابڵێی سەخت. كه نەتەوێ پرسیاران بەلایەكدا ساغ كەیتەوه به پێی مەیل و ئارەزۆی شەخسی خۆت، دەبێ یەك بایەخ بدەی بەو دەلیلەی كه یارمەتیت دەدا وەیا یارمەتی دژت دەدا.

جگه لەو دوو ڕووداوه یەكێكی دیكەش هەیه تا ڕادەیێك خزمایەتی لەگەڵ ئەو سەرەتایانەی ژیانی حاجی هەبێ ئەویش قەتلوعامەكەی بنەماڵەی غەفووریيانه كه له 1237 له كۆیێ ڕووی داوه. ئەگەر نامیلكەكەی مەلا عەبدولڕەحمان بكەینه سەرپشك، لەو ساڵەدا حاجی 6 ساڵان بوه، به پێی باوەڕی منیش هێشتا سێ ساڵێكی دمێنێ بێته دونیا. بەهەمەحاڵ ئەمیشیان ئەسەری نیه له دیوانەكەیدا. وەك له شوێنی تایبەتیدا دەردەكەوێ ئەم كارەساتەی قڕان تێخستنی غەفووریيان هەرچەند له دیوانی حاجی قادردا دەنگیشی نەدابێتەوه بۆ خۆی دەبێته وەڵامدانەوەی پرسیارێكی گرنگ دەربارەی هەڵوەستێكی پڕ دەلالەتی حاجی. وەی كه نرخێكی زله قڕانی بنەماڵییێك ببێته وەڵامی پرسیارێك.

خولاسەی گوته و هەڵگێڕانەوەی ڕووپەڕەی مێژوو هەر بەو ئەنجامەمان دەگەیەنێ كه له قۆناغی گەنجایەتی و فەقێیەتیی حاجی قادر چ ڕووداوێكی تایبەتی ڕووی نەداوه پەیوەندی بووبێ لەگەڵ حاجیدا و لێی وەشابێتەوه ویژدانی ئەوسای ورژاندبێ. ئەم ئەنجامه له ڕاگەیاندنی حاڵ و دەلالەتی بێدەنگی سەر هەڵدەدا، وەنیه بەڵگەی ماددی هەبێ بیسەپێنێ، مەنعی ئەوەش ناكا بەڵگه پەیدا بێ له دژی ئەو ڕاگەیاندنه. خۆ پێی ناوێ من بڵێم، نەبوونی دەنگی دڵدارییەكی عادەتی لەو تەمەنه پڕ جۆش و

خرۆشەی لاوێتیی، خاسەتەن بەنیسبەت بوێژێکی هەستیار و جوانیپەرستەوە، دیمەنێکی عادەتی نیە، بەڵکوو لەوانەیە پێی بگوترێ کەلەبەر و نوقسانی لە نەخشەی ژیانی حاجی قادردا.

ڕەنگە هەبێ و بڵێ بە چ مەعلووم حاجی بە خامۆشی و بێ دەنگ و سەدا یەکێکی خۆش نەویستبێ لەو تەمەنەدا؟ ئەوەی ڕاستی بێ منیش ئەو ئیحتیماله دێنمەوە ناو حیسابەوە، هەر خۆشم لێرەدا کردمە پرسیار و بە زاری یەکێکی نادیارەوە خستمە بەر سرنج، چ «استحاله»ش نیە لەوەدا شتێکی وا ڕووی دابێ، بەڵام هەڵستاندنی «احتمال» لە ڕێی گوتەی وەک «بە چ مەعلووم»ـەوە جێوڕێی خۆی هەیە و دەبێ هۆیەکی بەهێز داخوازی لێ بکا. بۆ میسال دەڵێم کەس لێی ناسەلمێندێ بەسەر ڕووبارێکەوە ڕاوەستێ و بڵێ بە چ مەعلووم پێش سەدان ساڵ پردێکی گەورە و مەحکەم لێرەدا نەبوە بێ ئەوەی شوێنی پێچکەی پرد وەیا دار و پەردووی پرد لەوێدا هەبێ. یاخود یەکێک لە چۆڵی «غرفە» خەیاڵ بکا لە ئیحتمالی ئەوە قەسر و باغ و جۆگە ئاوی لێ بووبێ و چ دروشمێکی ئاوەدانیش لەو ناوە بەرچاو نەکەوێ.

ئیحتیمالی بێ بنج شتێک نیە کەس خۆی پێوە ماندوو کا یاخود حیسابێکی بۆ بکا. منیش کە دەڵێم دیار نیە دڵداری هەبووبێ لە ڕۆژانی سەرەتای گەنجایەتی و فەقێیەتی حاجی قادر لەوەوە ڕێی دەربڕینی گوتەکە بە خۆم دەدەم کە نە دەماودەم بیستراوە و نە هیچ دەلالەتێکی شیعرەکانی حاجی ئەوە ڕادەگەیەنێ لەو عومرەدا دووچاری دڵداری بووبێ. وەک لە شوێنی مناسبدا بۆتی ڕوون دەکەمەوە حاجی کە دڵداری هاتۆتە ڕێ، لە تەمەنێکی دواتردا، باس و خواسەکە بە گوتەی خەڵق و بە هەڵبەستی حاجیش دەنگی داوەتەوە، دەنگدانەوەکەشی هێندە بەهێزە ڕووپێوێکی (مساحە) مناسب لە نووسینەکەی من بۆ خۆی تەرخان دەکا، بۆت مەعلووم دەکەم حەقیشیەتی جێگەی بایی خۆی لە دیراسەی ئێرە و غەیری ئێرە بگرێتەوە.

بە زاهیر وا پێ دەچێ سەرەڕای عامیلێکی زاتی لە نەفسی حاجیدا کە سەرچاوەکەی لە منەوە دییار نیە و هەر بە ئاکار و ئاساری زیهنم بۆی دەڕوا ئەو ئاکار و ئاسارە کە نەبوونی دڵداریی قووڵ و سووتێنەرە لە هەموو ژیانی حاجیدا، بەڵێ سەرەڕای ئەمە دەبێ تەنگ و چەڵمەی کەم دەستیی و ناگزووری و خەریکبوون بە گوزەرانەوە زیاتر مەیدانی کوڕێنیی و دڵداری لە حاجی تەسک کردبێتەوە. ئەم

ئیستدلالەش لە جۆری »بەچ مەعلووم»ـەوە، تۆیش دەیزانی نەداری و کوێرەوەری ئەو زەمینە هەموارە نییە تۆوی تێدا بڕوێ. نەبوونی دڵداری لای پیاوی هەژار کەمتر جێی پرسین و سەیر پێهاتنە بە تایبەتی بۆ پیاوێکی وەک حاجی قادر کە گەنجێکی بەرەڵلای بێ پەردە و پاوان نەبوە شەرمی نەهاتبێتەوە لە زڕانی ناوی بە دەم دەنگ و باوی دڵدارییێکی هەرزەکارانە. بە قەناعەتی خۆم حاجی قادر لە کۆیێ، کە مەفتەن و نیشیمەنیەتی، نەدەشیا دڵداری بکا بە نیازی ژن هێنان نەبێ. وەزعی گوزەرانیشی ئەوە نەبوە یارمەتی ماڵ دانان و خێزان پێکەوە نانی دابێ. زاهیری حاڵ وا ڕادەگەیەنێ هێندە نەدار بوە نەیتوانیوە خێزانی شار بەڕێوە ببا، کە ژنی هێنابا دەبوا بگەڕێتەوە بۆ لادێ، هەرگیز بۆ ئەو خەیاڵەش نەچوە.

وا بوە، زۆریش وابوە، پیاوی بەقەدەر حاجی هەژار و لەوەزعی وەک ئەودا، ژنی هێناوە و گوێی نەداوەتە فەقیری و بوون و نەبوونی گوزەران. بەڵام واش بوە پیاوی کەمتر هەژار لە حاجی و لە وەزعی لەبارتر تا وەزعی ئەو ژنی نەهێناوە لە ترسی موحتاجبوون و سەغڵەتی دواڕۆژ بەدەست منداڵ و ماڵەوە. هیچ سەیر لەوەدا نیە حاجی قادر لەم تایپەی دوەمە بووبێ کە بە ڕاستیش هەر وا بوە.

ئێمە دەزانین حاجی خاوەنی نەفسێکی چەند لە خۆڕازی بوە ئەم زانینەشمان کاری گومان کردن و «ڕەنگە وا بووبێ» نیە چونکە هەموو ژیانی حاجی زنجیرەییێکی بێپچڕانەوە بوە لە نەفس زلی و بەخۆ نازینەوە. کەواتە چاوەڕوان ناکرێ لەو تەرزە پیاوە دڵی بڕوا بۆ ژن هێنان کە ترسی ناگزووری و سەغڵەتی دوایی تێدا بێ. پیاوی ڕەبەن هەر چۆنێک بێ گوزەرانی ئاسانترە لە پیاوی خاوەن خێزان، بەنیسبەت نەفسی سەرکەشی حاجیشەوە ترسی ناچاربوون بۆ خواستنی یارمەتی لە پێناو بەڕێوەبردنی خێزان پتر لە خەڵقی تر دوودڵی کردوە و دووری خستۆتەوە لە ژن هێنان.

پیاوی عادەتی لەوانەیە دابین کردنی ئارەزۆی نەفس بەلایەوە گەلێک پێش کەوێتەوە لە خۆپاراستن لە کەمایەتیی سواڵ کردن، یاخود یارمەتی خواستن، بۆیە مومکینە بە هەژاریش ژن بێنێ و خۆی باوێتە بەر ئیحتمالی سواڵ و سەدەقە، بەڵام یەکێکی وەک حاجی گومانی وای هەرگیز لێ ناکرێ. من و تۆش لە دەوروبەری خۆمان مرۆڤی وامان دیوە مردن هەڵبژێرێ و دەست پان نەکاتەوە.

له هاوینی 1963 کاتێک چەند ئەندامێکی وەفدی کوردستان لە بەندیخانە بووین، دوو قارەمانی وامان دیت دراوسێمان بوون چەندی بڵێی بەبەر مەردایەتییانەوە هەبوو، نەک بۆ خواردن، بۆ پاراستنی ڕۆحیش چاویان نەدەترووکاند. شەجاعەتی ئەفسانەیی ناو کتێبان بەڕاستی لە واندا کۆ ببۆوە. ئەمە دەڵێم بۆ نزیک کردنەوەی زێدە بەرزی نەفسی حاجی لە تصورمانەوە.

خوێنەر دەبینێ ئەم تێبینیانە و سرنجدان لە تەنها سەرچاوەی ڕاگەیاندنی حاڵەوە هەڵدەستن وەنیە چ خەبەرێک و نووسراوێک ئیشارەیان بۆ بکا. بەڵام لە دوو ڕووەوە هێز پەیدا دەکەن:

یەکەم ئەوەیە کە دەگونجێن لەگەڵ مەنتیقی ژیانی عادەتی بە تێکڕایی و ڕەوشت و نەفسی حاجی قادر تایبەتی. دوەم ئەوەیە لە هیچ لایێکەوە نە خەبەر و نە تەواتور نە نووسین نە لێکدانەوەی زیهینی بەرهەڵستیان ناکا.

من بۆ خۆم لە زۆر زانای مێژوو و کۆمەڵایەتی و فەلسەفە و لێکدانەوی ئەوتۆم خوێندۆتەوە و وەک ئەو لێی ڕازی بووم. بە نیسبەت باسەکەی ئێرەکانەش لەو سرنج و لێکدانەوانە ڕازیم یا خەبەرێک پێچەوانە وەردەگرم لە سەرچاوەیێکی بێگومانەوە.

بەم چەند لاپەڕەیە لە زیهینکاری هەر هێندەمان بۆ کرا پەڕاوێزێکی یەکجار کەم ڕەنگ و باریک بە دەوری ڕۆژانی سەرەتای گەنجایەتی حاجی ڕاکێشن. لە مقارەنە و دەلالەت وەرگرتن بەولاوە کەمێکی یەکجار کەم نەبێ لە ڕاستیی ماددی نەکەوتە نێوان ئەو پەڕاوێزە. هەر دەڵێی جلوبەرگی ڕۆستەمی زاڵە و لەبەر چوێلەکەیێکمان کردوە. لەگەڵ ئەمەشدا دەرخستنی هەر پرسیارێک بێ لە نەزانینی مطلقەوە بۆ ناو جۆرێک زانین با کەمیش بێ، تا ڕادەیێک لە سەرسوڕمان کەم دەکاتەوە. بەنموونە دەڵێم، کە زانیمان جیهان فەزایە نەک ئەو قەپێلکە شووشانە کە بطلیموس کردنی بە فەلەکەکانی دەوری زەوی، ماوەیێکی تەواو بەرەو ڕۆشنایی دەڕۆین با جارێ کەمێکی زۆر کەمیش نەبێ لە ناوەڕۆکی ئەو فەزایە نەزانین.

ڕەهابوون لە دەستی ئەفسوون و سیحری مەجهوول هەنگاوێکی فرەوانە بۆ ناوجەرگەی ڕۆناکی. ئێمە با بە جۆرێکی سەرەتایش بێ ئەوەندە بزانین کە هەوەڵ ڕۆژەکانی گەنجایەتی حاجی ڕۆژانی ئاسایی بێ بگرە بەردە و ڕووداوی زرینگەدار

بوون، لەتەک ئەوەشدا مەعلووم بکەین کە گیانی حاجی هەرگیز نەیویستوە خۆی باویتە ناو قەفەسی بێدەسەڵاتی بە دەست خێزانی ناگزوورەوە، هێندەش ئیزافە بکەینە سەر ئەو کەمە زانینەمان کە حاجی لەگەڵ بێ سامانی و جێورپێی و حاڵ و وەزعی ماددی لەباردا گەنجێکی بەرچاو و ڕێزلێگیراو بوە... با تێکڕای ئەو ڕاستیانە هەرچەندە کەمیش بن ببنە پەرژین لە دەوری سەرەتاکانی ژیانی حاجی و لەنێوان خۆیاندا تابلۆییێکی مەفهووم و ئاسایی و چاوەڕوان کراو بگرنە باوەش، دوای ئەمە هەوڵ بدرێ بۆ کردنەوەی بەتاڵانی ناو پەرژینەکە بە زانین و خەبەر و لێکدانەوەی نوێ.

تا ئێستاش ئەوەی نووسراوە لەبارەی حاجی قادرەوە هێندە کورتیلە و قوڵە و قرتاو بوە هەر بایی ئەوەی کردوە حاجی لە غەیبەوە بێنێتە ناو کۆڕی ژیانێکی پڕ لە ئازادی و ئازایی و خەباتی سیاسی وەک سوارەی قودرەت کە لە ئەفسانانی دەخوێنیەوە. وەک بڵێی دیراسەی حاجی و تێگەیشتنی هەنگاوەکانی پێبەپێی لە منداڵیەوە تا گەنجایەتی و کامڵی و پیری لزوومی بەوە نەبێ بزانرێ منداڵیەکەی چۆن بردۆتە سەر و گەنجایەتیەکی چ جۆرێک بوە و کام واقیع کاری کردۆتە سەر نەفسی، واقیعی زاتی بێ یا کۆمەڵایەتی و سیاسی، چەند زاتەکەی سروشتی بوە، چەندی »مکتسب». ئەو سروشتی و مکتسبە لەسەر جوملەی ژیان و هاتنی فەلسەفەی کوردایەتی چ تەئسیرێکیان بوە - ئەمانە و زنجیرەهای پرسیاری وەک ئەمانە بێ شوێنن لە ناو ئەو نووسینانە کە تا ئێستا دەوری حاجی قادریان داوە.

وەنیە بۆ منیش لوابێ وەرامی ئەو پرسیارانە بدەمەوە، بەڵام سرنجیان ڕاکێشاوم و ویستوومە بە وەرامی تەواویش نەبێ ئەوەندە ڕووناکیەیان بخەمە ناوەوە کە لە تاریکایی مطلقیان دەرباوێژێ. هەوڵم داوە لە حاجی بگەم و خەڵقی تێبگەیەنم، باوەڕیشم هەیە چەند هەنگاوێکی لێ نێزیک بومەوە. لەم قسانەش چ مەبەستم خۆهەڵدانەوە نیە، هەر هێندەم دەوێ خوێنەری عادەتی سەیری پێم نەیێی کە دەبینێ من خەریکی کاری وام کەس خۆی پێوە خەریک نەکردوە. حاجی بە جۆرێک ژیاوە و لەبەر هۆیەک یا چەند هۆیەک ژنی نەهێناوە، ناوی گۆڕقەرەجی نەبردوە، نەبوە بە مەلای ناو شار یا لادێ، خانووی نەبوە، دڵداری لێ نەبیستراوە... حاجی ئەوە بوە کە لە واقیعدا بوە، ئەو واقیعە من دۆزیبێتمەوە یا چەشنێکی دیکە بێ کە من بۆی نەچووبم، خۆ دەبێ هەبووبێ و دەبێ هەوڵ بدەین بزانین چ بووبێ...

لەوەش زیاتر، دەبێ واقعێک بووبێ لەگەڵ تێکڕای ئەو سەردەمە گونجاو بووبێ و لەگەڵ دواڕۆژ و چارەنووسی حاجیش «تعارض»ی نەبووبێ.

هەڵبەت وا خۆش بوو تەواوی سەروبەری ئەو واقیعە و ڕووداوەکانی بە تەواتور یا بە نووسین یا بە هەر هۆیەکی زانین بێ، پێمان گەیشتبا، بەداخەوە. کە پێمان نەگەییوە نابێ پشت گوێی بخەین بایەخی پێ نەدەین. تا ئەوەی کە ئیمکان هەیە لە ڕێی قیاسی نەزانراو لە زناراو و ڕاگرتنی ڕابردوو لەبەر تیشکی دواڕۆژ و دەلالەتی حاڵی ئەو گوزارشتانەی ژیانی حاجی کە لێمان مەعلوومە و هەموو ئەو زیهنکارییەی پەیوەست بە بنکەی ماددییەوە کە نهێنی ڕوون دەکاتەوە، کۆشش بکەین بۆ هەڵگرتنی پەردە لە ڕووی سەفحە تاریکەکانی تۆماری داستانی حاجی بە مەرجێک لەو کارەدا هەڵبەستن و دروست کردن لەمەنهەجماندا نەبێ و مەیل و ئارەزۆی شەخسی تێکەڵ بە مەوزووع نەکەین، دەنا هەر دەستی لێ نەدەین چاکترە. واقیع بە نەزانراوی بمێنێتەوە نەک یەکێکی ساختەی لە جێگە دابندرێ و بدۆزرێتەوە. ئەم تەرزە هەوڵدانە بۆ دۆزینەوەی نەزانراو لەبەر تیشکی زانراو لە نێو گەلانی پێشکەوتوو بۆ زۆر مەوزووع و لە گەلێک مەیداناندا کراوە، وا بوە هەندێ جار لە خوێندنەوەمدا ئیستنتاجی وام دیوە، بەڕاستی لە کاری ساحیری کردوە بێ ئەوە نووسەر فڕوفێلی بەکارهێنابێ وەیا مەیلی خۆی تێکەڵ بە مەبحەس کردبێ. گەلێک جاران حەقیقەت بە هەموو سەرچاوەکانی زانینیەوە لە ناو نووسراو و زانراودا لەبەر دەستاندایە کەچی چاو لێی هەڵدەزەلێ و نای بینێ هەر دەڵێی ئۆینی دامە و شەترەنجە لەسەر ڕووی تەختە و لە نێوان داشەکاندا پەیدایە بەڵام زیهن بۆی ناچێ و چاو نایبینێ. تا مرۆڤ بێ ئومێد دەبێ لە دۆزینەوەی ڕاستی دەبێ ئیفلاس بە هەموو سەرچاوەکانی زانین و لێکدانەوە بکا و بە نەزۆکیان دەربێنێ ئەوسا دەست بشوا لە مەوزووع. لەو حاڵەشدا بێئومێدی یەکێک نابێتە هۆی بێئومێدی هەموان.

لەوانەیە ئەوەی من بە ئیفلاسی دادەنێم لە ڕاستیدا تروسکەی ئەوەندە ڕۆناکییەی تێدابێ کە چاوی تیژی تۆ پەکی لەسەر کەوتوە. لێرەدا چەند هەنگاوێک بەرەو دوا دەکشێمەوە و میساڵێک لە واقیعی گوزارشتی حاجی دێنمەوە بەرچاوان، بۆ ئەوە بزانرێ ئیفلاس کردن بە سەرچاوەی لێکدانەوە و بە نەزۆک دەرێنانی، کارێکی نەفەس کورت نیە:

له بیرتە ڕیوایەتیی مەلا عەبدولڕەحمان کە لە باوکییەوە قسە دەگێڕێتەوە گوتی «فاتێ» دوای مردنی مێردی لە گۆڕقەرەجەوە حاجی هێنایە لای برازای خۆی لە کۆیێ، کە مەلا ئەحمەدی ئۆمەر گونبەدییە. لێرەدا چاو لەوە بپۆشین کە تحقیقاتمان لەگەڵ ئەم ڕیوایەتە جووت نەڕۆیی، با وا ڕابنوێنین کە ئەمە ڕاستیەکی بێگومانە. لە عاست ئەم ڕاستیەدا چەندین پرسیار هەیە تاکێکمان بە دەنگ نەهێنان کە دەبوا بە دەنگ بێن و وەرام وەرگرنەوە:

1) بە اصطلاح، میراتگرانی حاجی چۆن ڕازی بوون تاقانەی مەلا ئەحمەد لەو عومرە بچووکەدا (نۆ ساڵان) ڕاگوێزرێ بۆ شارێکی مەیلەو دوور (کۆیێ ئەو نێزیکە نیە لە گۆڕقەرەج کە هەندێ نووسین تا ئێستا ڕایانگەیاندوە). حاجی وەک لە درەختەکەی خانەوادە دەردەکەوێ تاقانەی کوڕە گەورەی مەلا ئەحمەدی گەورەیە، بەنیسبەت ئەو لکە پێیدا شۆڕ بۆتەوە چڵێک نیە لە ناو چڵان شرابێتەوە، بەنیسبەت هەموو خانەوادەش یەکەم لکی درختەکەیە.

2) تۆ بڵێی »گۆڕقەرەج» ئەوسا هیچ مەلای تێدا نەمابێ دوای مەرگی باوکی حاجی کە توانیبێتی دەرس بە سوختە و فەقێیان بڵێتەوە؟ سرنج بدە درەختەکە دەبینی لە ئامۆزاکانی مەلا ئەحمەد (باوکی حاجی) کەسیان مەلا نەبوون، لەوەڕا زیهن دەڕوا بۆ هێندێ کە مومکینە دوای مەرگی مەلا ئەحمەدی گۆڕقەرەج بێ مەلا مابێتەوە بەڵام ئەو ئیحتمالە دەمێنێ کەوا مامی مەلا ئەحمەد، مەلا ڕەسوڵ ناو هێشتا نەمردبێ، ڕەنگە بەنیسبەت باوکی حاجی قادرەوە لەو مامانە بووبێ کە لە تەمەندا لەگەڵ برازایان فەرقیکی ئەوتۆی نەبووبێ. ئەوساش ئەم پرسیارە دەمێنێ لە فەرزی مامی حاجی قادر لەو دەمەدا کە مەلا ئەحمەدی باوکی مردوە مەلاش بووبێ ئاخۆ لە گۆڕقەرەج مەلا بوە یا لە دێیەکی دیکە؟ کە مەلا ئەحمەدی باوکی حاجی مرد مەلا ڕەسولی مامی، کە مەلا بووبێ لە دێیەک، هاتەوە یا نەهاتەوە بۆ گۆڕقەرەج تا جێگا چۆڵ بوەکەی مەلا ئەحمەدی باوکی بگرێتەوە؟

3) «فاتێ» ی دایکی حاجی دەسەڵاتی ڕاگوێزتنی حاجی لە کوێ پەیدا کردوە؟ ئاخۆ تەمەنی ئەوە بوە خزمانی ئەمین بن لە ڕۆیشتن و دوور کەوتنەوەی و مەترسی ناو و ناتۆرەیان نەبووبێ...؟

4) فاتێ بۆ نەگەڕایەوە ماڵی باوکی لە ئومەرگونبەد و بە خۆی و کوڕیەوە چوە لای برازا؟ هەر بۆ مەبەسی پێ خوێندن؟ چما لە ئۆمەر گونبەد ئەوسا مەلا نەبوو حاجی لای بخوێنێ؟

ئەمانە و چەندین پرسیاری دی هەڵدەستن لەو تاکە خەبەرەی هاتنی فاتێ بۆ کۆیێ و نەمانەوەی لە گۆڕقەرەج و نەچوونی بۆ ئۆمەرگونبەد و ڕازی نەبوونی خزمانی گۆڕقەرەج و ئومەرگونبەد لەو ڕاگوێزتنەوە و قبوڵ کردنی خوارزا بە حەواندنەوەی پوور و پوورزاییک لەگەڵ دەستکورتیی خۆیدا.

زۆر مومکینە وەڵامدانەوەی یەکێک یا زیاتر لەو پرسیارانە لانی نەزانراوی ژیانی حاجی وەیا واقیعی ئەوسای ناوچەی خزمانی ڕوون کاتەوە. ئەوەی ڕاستی بێ جگە لەو پرسیارانە پرسیاری دیکەش هەیە دێتە بەر سرنجم لەلایەنێکی زۆر جیا و دوور لەو لایەنەی حیکایەتی فاتێ! ڕیوایەتی مەلا عەبدولڕەحمان کە دەڵێ مەولوود مرۆڤێکی نارەحەت بوو و ئەو ناڕاحەتییەی بوە هۆی کوشتنی، فکرم دەبا بۆ پرسیارێکی یەکجار ورد و دوورەدەست.  هەر بۆیەش بەسەر قەڵەمیدا دێنم کە زەرەرێک نیە لە نووسین و دەربڕینی.

تۆ بڵێی باپیری مەولوود و باپیری حاجی قادر کە کوڕی یەکەم و دوەمی مەلا ئەحمەدی گەورەن دایکیان جیاواز نەبووبێ لە دایکی براکانی تر و لە ڕێی ئەو ئافرەتەوە دەمارێکی سەرکەشی بەرەوژێر نەهاتبێتە خوارێ؟ بە جۆرێکی »کامن« بۆ کوڕ و نەوەکانی و لە شەخسی حاجی و مەولوود ئەو سەرکەشیە سەری هەڵدابێتەوە؟ بەڵام سەرکەشیی حاجی دروستکەر و هی مەولوود ڕووخێنەر بووبێ؟ زاهیرە و ڕووداوی وا زۆر دیتراوە و بیستراوە و چ بەرهەڵەستێکیش نابێتە بەر هەبوونی لە وەزع و حاڵی حاجی و مەولوودا بەڵام چ بەڵگەمان بەدەستەوە نیە بی سەپێنێ وەیا بیکا بە ئیحتمالێکی نزیک... وێنەیێکی زیهنییە و خێرا بە مێشکدا تێدەپەڕێ و خامۆش دەبێتەوە بەڵام کەموزۆر گۆمی وەستاوی فکر دەشڵەقێنێ.
لەبیرت بێ گوتم لەبەر کەمیی خەبەراتی حاجی دەبێ ئەو کارە بکەین زانای ئاسار و شوێنهەڵگر دەیکەن تاکوو کەمێک ئاشنایی پەیدا کەین لەگەڵ سەرجوملەی ژیانی حاجی، کەوا نەکەین دەستپاچە دەوەستین.

**حاجی قادر و خوێندن**

زانیمان، لە ڕاگەیاندنی نامیلکەکەی مەلا عەبدولڕەحمانەوە، حاجی قادر سەرەتای خوێندنی تا عومری نۆ ساڵی لای باوکی بوە. ئەم خەبەرە جێی باوەڕ پێ کردنە چ بگۆترێ لە گۆڕقەرەج ڕووی داوە یاخود لە کۆیێ. سەرەڕای باوەڕ پێ کردن ئەوەش بەدەستەوە دەدا کەوا خوێندنی حاجی لە سەردەمی بەر لە مەرگی باوکی مەبەستێکی بنجی بوە بەنیسبەت خێزانەوە، ڕەنگە بەنیسبەت سەرپاکی بنەماڵەوە، ئەگەر وانەبا دەبوا وەزعی نالەباری ئابووریی مەلای باوکی حاجی، ناچاری کردبا بەوە کە شوانی وەیا بەرخەوانی خستبا بەر حاجی. وەنیە لەوەدا شتێکی سەیر هەبێ چونکە مەلا ئەحمەدی باوکی حاجی کوڕی کوڕە گەورەی مەلا ئەحمەدی گەورە بوە، باوکی مەلا ئەحمەدیش کە کوڕەگەورەکەیە هەر مەلا بوە. لە جیلی مەلا ئەحمەد خۆی (کە باوکی حاجیە) تەنها هەر ئەو مەلا بوە.

لە مەڕا وا پێ دەچێ بڕیارێکی بێدەنگی و عەفەوی هەبوە کە زنجیرەی مەلایەتی بنەماڵەکە لە ڕێی کوڕە گەورەوە نەکوژێتەوە و نەپچڕێتەوە. دەبینین کوڕی چوارەم «مەلا ڕەسوڵ» کە خۆی مەلا بوە وەیا پێی گوتراوە مەلا، کوڕەکەی ئەو «عثمان» مەلا نەبوە. برای دوەم «عەبدولڕەحمان» و برای پێنجەم «أبو بکر» نە خۆیان نە تاکێک لە کوڕ و نەوەیان مەلا نەبوون. تەنانەت خاوەن نامیلکەکە، کە دەکەوێتە بەرانبەر حاجی لە زنجیرەی سەرەوژێربوونەوەی بنەماڵە نە باب نە باپیر هیچیان مەلا نەبوون. بۆیە وا پێ دەچێ، پێ داگرتنی مەلا ئەحمەد لەسەر ئەوە کە حاجی خەریکی خوێندن بێ بە جۆرێک لە نۆ ساڵیدا تەواوی قورئانی خەتم کردوە (بەپێی ڕاگەیاندنی نامیلکەکە) بۆ هەندێ بوە کە حاجی قادر ببێتە جێگر و میراتگری عیلمی بنەماڵە و لە شوێن باب و باپیرانی بە مەلایەتی بمێنێتەوە.

مردنی ناکاتیی مەلا ئەحمەد بوە بە کوژانەوەی ئەو ئومێدە و پچڕانەوەی ئەو هەوڵدانە. تۆ بڵێی ڕاگویزتنی حاجیش بۆ کۆیێ دوای مەرگی باوکی هەر بۆ مەبەستی دەوام کردن بە خوێندنی نەبووبی؟ کە بیسەلمێنین حاجی تا نۆ ساڵی لە گۆڕقەرەج بوە و فاتێی دایکی دوای مەرگی باوکی بۆ کۆیەی ڕاگویزتوە، دێتە عەقڵەوە ڕازیبوونی خزم و کەسی حاجی لەو ڕاگوێزتنەدا بۆ مەبەس و بە نیازی دەوام کردنی حاجی بووبێ لەسەر خوێندن. هەرچەند چ خەبەرێکمان پێ نیە تێمان بگەیەنێ داخوا لەو دوو ساڵەی بەینی هاتنی حاجی بۆ کۆیێ و مردنی دایکی، حاجی

به ڕێکوپێکی خوێندوەتی یاخود هەر لە سەرەتاوە خوێندنەکەی کەوت و ڕەوت بوە و پسانەوەی تێدا بوە! ئەگەر کەوت و ڕەوت بووبێ ئەو مەبەست و نیازەی کە گوتم هۆی هاتنی حاجی بوە بۆ کۆیێ کز دەبێتەوە و ناکرێ قبووڵی کەین بە هۆیێکی بێ دەمەتەقە، چونکە کە خوێندنی بەدەوام نەبووبێ دیارە هەر لە پێشەوە حیسابی ئەو بێدەوامییە کراوە لەگەڵ ئەوەشدا دایک بڕیاری هێنانی کوڕەکەی بۆ کۆیێ داوە، ئەوسا دەبێ بە دوا هۆیەکی دیکەدا بگەڕێین بۆ تەبریری ئەو ڕاگوێزتنە و ڕازیبوونی هەموو خزمەکان پێی.

ئەم لێکدانەوانە لەسەر «احتمال» هەڵدەستن، بەڵام «احتمال»ـەکە من دروستم نەکردوە چاوگەی نووسین بە ئێمەی ڕاگەیاندوە و گوتەی دەماودەمیش «تدخل»ی کردوە لە ڕاگەیاندنی نووسینەکە.

من لە ناو بەیەکدیدا تێپەڕین «تقاطع» و تێکئاڵقانی«تشابک» ئەو ئیحتیمالانە و ئیحتیمالی ئەوە کە مەلا ئەحمەد بۆ خۆی هاتبێتە کۆیێ و دوایی مردبێ، ئەوەندە قەناعەتم هەیە تا مردنی دایک و باوکی حاجی قادر چ لە گۆڕقەرەج بووبێ و چ لە کۆیێ بووبێ بەردەوام بوە لەسەر خوێندن. ئەم قەناعەتەشم هەم لە ڕاگەیاندنی حاڵ، هەم لە مەنتیقی ڕاگوێزتنەوە دێ. لە هەر بار و لە هەر جێگەیەک بووبێ زۆر لەگوینە تاقانەی بەرەی کوڕە گەورەی بنەماڵە تا ئیمکانی بووبێ خوێندبێتی، ئیمکانیش کاتێک بەسەر دەچێ کە دایک و باب نەمابن، بە خوێنی جگەریش بێ، ئەرکی خوێندنی تاقانە هەڵگرن.

لەو باوەڕەدام بوونی حاجی بە شاگرد ئێمەنیدروو دوای مەرگی دایکی بوە. واتە لە سوختەییەوە، بەر لە فەقێیەتی، ئەو سۆزەی کەوا دەکا دایکی حاجی بە هەموو فەقیرییەوە تەئمینی خوێندنی بێ کەلەبەر بکا، نەهەبووە و نە داوا دەکرێ هەبووبێ لای خاڵۆزای حاجی واتە مەلا ئەحمەدی مزگەوتی مفتی (دیسانەوە موناقەشەی چەند و چۆنیی بوون و نەبوونی مەلا ئەحمەد لە مزگەوتی مفتی لەبیر خۆمان دەبەینەوە، خۆمان بەوە دابین دەکەین کە دەبێ یەکێک هەبووبێ دوای مردنی دایک بووبێتە بناوان و دەرەتان بۆ حاجی کە هەتیویش بوە و غەریبیش، وا ڕادەنوێنین ئەو کەسە مەلا ئەحمەد بوە) دەچێتە عەقڵەوە ئەو مەلا ئەحمەدە - یا هەر کەسێک بووبێ - وەتەنگ هاتبێ لە بەخێو کردنی نەفەرێکی سەر لەبەری بێ کەسب و کار ئیتر خستبێتیە بەر پیشەیێکی وەک ئێمەنیدروەتی بۆ کەم کردنەوەی

ئەرکی گوزەرانی بە موچە و ڕۆژانەی شاگردی. دووریش نابینم لەگەڵ ئەو خەریک کردنەوەی بە شاگردییەوە، مەلا ئەحمەد ڕەچاوی هەندێ کردبێ کە حاجی جێی ئومێدی بنەماڵەیێکە بۆ مەلایەتی ئیتر ناوەناوە، یا ڕۆژانە، دەرس و دەورێکی لەگەڵدا کردبێ نەوەک یەکجارەکی خەت و سەودای کوێر کردبێتەوە و بۆ دوارۆژ کەڵکی مەلایەتی پێوە نەمێنێ. پێدەچێ ئەم نیوە لەگەڵدا خەریکبوونە بێ نەیهێشتبێ حاجی قادر پەیوەندی لەگەڵ خوێندندا بڕابێ و دوای گەیشتنی بە پلەی لاوێتی و ڕەهابوونی لە ئەمر و فەرمانی مەلا ئەحمەد نەفسە بەرزەکەی وازی پێ هێنابێ لە پەلەی گوزەران و خستبێتیە سەر ڕێبازی خوێندێکی بەردەوام. ناشزانم داخوا مەلا ئەحمەد لەم سەردەمەی گەیشتنی حاجی بە تەمەنی لاوێتی هەر ماوە یا نەماوە؟ لە مزگەوتەکەی مفتی ماوەتەوە یا ڕۆیوە بۆ مزگەوتێکی دیکە؟ کە مابێ لە مزگەوتی مفتیش بووبێ؟ عەجەبا لەگەڵ حاجی هەر بەیەکەوە ژیاون یاخود جۆرێکی دیکە بوە؟

ئەمانە هیچی مەعلووم نین و زۆریشم هەوڵدا، لە دورەوە، خەبەرێک و شوێنەوارێکی لێ وەرگرم بەداخەوە نەگەیشتم بە چ ئامانج و بەرهەمێک. هەر کەسێک شتێکم لێ پرسیبێ ئەغڵەب وەڵامەکەی «نازانم» بوە، لە یەک دوو قسەی خۆشکەڵەی گەپ و ڕۆحی نوکتەی حاجی لەو سەدەمانەدا بەولاوە هەرچی پێی بڵێی ڕووناکییە بۆم هەڵ نەکرا.

وەک دەبینی قسەکانی لە لێکدانەوە و زاهیرەی حاڵەوە هەڵدەستن نەک لە سەرچاوەی بێگومانەوە. بەڵام دیسانەوە دەبێ ئەوە بڵێم لێکدانەوەکە زۆر خزمە لەگەڵ واقیعی ئاسایی و ڕێکیش دێ لەگەڵ ئەوەندە خەبەرە کەموکورتەی کە بێگومان لە حاجیەوە پێمان گەیشتوە. خۆ ئەگەر لە هەموو ڕوویێکەوە واقیع ئەوە نەبووبێ کە لەو ڕووبەرانەدا نەخشەیێکمان کێشا ئیمکان نیە شتێکی زۆر دوور بووبێ لێی. حاجی لە کۆیێ بوە، شاگرد ئێمەنیدروە بوە، دایک و باوکی مردوون، لە جێگەیێک ژیاوە، فەقێیەتیشی کردوە و بۆی چۆتە باڵەکایەتی و کوردستانی ئێران. پێشتریش زانیمان قورئانی لای باوکی تەواوکردوە. دەشزانین تاقانەی باوکی و نەوەی کوڕەگەورەی بنەماڵە بوە. ئیتر کە ئەمانە وابن بەزاهیر دەبێ ڕەوتی ژیانی منداڵی و سەرەتاکانی خوێندن و گوزەرانی بەو جۆرەی گوتمان وا بووبێ یاخود جۆرێکی یەکجار لەو نێزیک. بەڵام کە لە لایێکەوە خەبەرێکی قەتعیمان بۆ هات

وێنەیێکی جودای نیشان دا بۆ ئەو ڕۆژگارەی حاجی، ئەوسا بێ سێ و دوو سەر دادەنوێنین بۆ حەقیقەت و لەگەڵ شاعیری عەرەبی دەڵێینەوە:

فقل لمن يدعي في العلم فلسفة
حفظت شيئا و غابت عنک اشياء

ئەی ئەو کەسەی لە زانستدا داوای فەلسەفە دەکەی
شتێکت ئەزبەر کردبوو شتەهات لێ ون بوو

ئەم پەندەش ئەوسا هەر بۆ من نابێ، ڕەنگە پێویستیش نەبێ بۆ من ئەوسا پەندی لێ وەرگرم چونکە لەپێشەوە ڕێی پەند لێ وەرگرتنیم ناوەتە بەر خۆم. هەر کەس لە لێکدانەوەدا دەگا بە قەناعەت ئیحتمالێکی بە سەهوو چوون هەر بیهێڵێتەوە، هەر نەبێ بۆ ڕەهابوون لە دڵشکستەیی بەسەهوو چوونێک کە حیسابی بۆ نەکرا بێ.

لێرەدا دەبێ ئەوەش بڵێم، ئەو ڕیوایەتەی کە دەڵێ حاجی لە کۆیێ هاتۆتە دونیا و کەمتر خۆ لە مەلا ئەحمەدی ئۆمەر گونبەدی دەگەیەنێ، بەلای خۆیەوە ئەویش تەوجیهی کوێر نەبوونەوەی خەت و سەودای حاجی دەکا لەو ڕووەوە کە دەڵێ هەمان سۆزی کە مەلا ئەحمەدی خستۆتە سەر خەریکبوون بە خوێندنی حاجیەوە، لە دەوروبەر و مزگەوتی نزیک ماڵی حاجی هەبوە کە «بێ مەلا ئەحمەدی» پێوە دیار نەبێ.

لزووم نابینم درێژە بدەم بەم تێبینییەی دوایی، ئەوەندەی ئیشارەی لێرەدا کردم بۆ بەیانی گۆشەنیگای (زاوية نظر) ڕیوایەتەکەی دوەم بەکافی دەزانم. ڕووداوی وەهاش بەسەیر نازاندرێ چونکە زۆر جاران هی وەک ئەو دیتراوە. لە ناو مەلا و فەقێ و پیاوانی مەیلەو تەمەنداری کۆیێ مەعلوومە سۆز و پەرۆشی مەلای گەورە بوە وای کرد مەلا مەعسومی هەورامی بکەوێتە سەر خوێندن و ببێتە یەکێک لە قوتابیە هەرە پێشکەوتوەکانی مەلای گەورە و دوای مردنی شێخ نووری برای ببێتە جێگری خۆی لە مزگەوتی گەورەی حاجی بەکر ئاغادا. هەر شەجاعەتەکەی مەلای گەورەش بوو لە مەلا مەعسوم دیار کەوتەوە ئەو ڕۆژەی کە لە ڕووی

«متصرف»ێکی سەردەمەکانی شۆڕشی کورد پڕ بە دەم ڕستەی »الفرسان القرصان»ی تەقاندەوە لەبەر گوێی دۆست و دوشمن. لە باوەڕی خۆیشی بەولاوە هیچ هێزێک نەبووە ئەو قسەی پێ بکا وەیا بە دوا قسەکەدا مەلا مەعسوم بپارێزێ وەیا وەزیفەی بۆ بەردەوام کا و نانی نەبڕێ. ئەو کە قسەکەی کرد نەیدەزانی خۆی و وەزیفەی سەلامەت دەردەچن یا دەبنە قوربانی باوەڕ.

ئەگەر تا ئێستا نەشم گوتبێ لە قسەکانم دیارە و خوێنەریش تێگەییوە خوێندنی حاجی خوێندنی مەلا و مزگەوت بوە. لەو سەردەمەدا هێشتا فێرگەی
میری (قوتابخانە) لە کۆیێ نەکرابۆوە، تا حاجیش لە کۆیێ بوو و دوای ڕۆیشتن و مەرگی ئەویش بە چەند ساڵان ئەوجا یەکەم فێرگەی میری لە کاتی والیەتی «سلیمان نظیف» و لە سەر داوا کردنی مەلای گەورە لە کۆیێ کرایەوە. کە فێرگەی میری نەبوە نەشبیستراوە لەو سەردەمانەدا کەس داوای کردنەوەی کردبێ.

لە ڕاستیدا ئەوسا بیر کردنەوە لە داوای ئەوتۆیی هێشتا بەوەلەد نەبووبوو. نە ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری لە نێوان خەڵقدا گۆڕانێکی وای بەسەردا هاتبوو فێرگەی میری بکا بە داخوازییێکی پێویستی کۆمەڵ و کەلەبەرێک پڕ بکاتەوە لە بەرژەوەندییێکی تازە پەیدا بوودا، نە پەیوەندی میانی میللەت و میری لەو جۆرە بوو کە هەر نەبێ بۆ نمایشێکی دۆستایەتی و خۆ نزیک کردنەوە بیر لە داخوازی وەها بکرێتەوە.

پیاوێکی وەک حاجی مەلا ئەسعەدی جەلیزادە تا خۆی مابو نەیهێشت حاجی مەلا عەبدوڵای کوڕی فێری زمانی تورکی بێ نەکا ئەو شارەزاییەی بە تورکی لە میری نزیک خاتەوە و لە ئەنجامدا ببێ بەهۆی وەرگرتنی وەزیفە. هەر بەهۆی ئەو مەنع کردنەی حاجی مەلا ئەسعەد بوو هێشتا لە ساڵی 1384 دا مەلا عەبدوڵا تورکی فێر نەبوە، کە «تقی الدین پاشا» دێتە کۆیێ و بە موناسەبە لەگەڵیدا دەکەوێتە وتووێژ زمانی قسە پێ کردنیان عەرەبی بوە. وتووێژەکە و موناسبەکە کەلەپۆرێکی خانەوادەیی جەلیزادانە، بەلای تەبعی خۆشمەوە پڕە لە نرخ و لەززەت، نامەوێ بە پاڵەپەستۆ جێی بۆ بکەمەوە لە ناو باسەکانی ئێرەدا و پەکیشی لەسەر نەکەوتوە، کە موناسەبە پەیدا بوو گێڕانەوەی ئاسانە.

بیر کردنەوە لە فێرگەی میری نەک ئەوسا بەڵکوو لەو کاتەدا کە مەلای گەورەش بەهۆی پێشبینی خۆیەوە کردی بە داخوازییەکی ناوچەیی و گرنگ هێشتا بەلای خەڵقەوە کارێکی پەسەند نەبووە. چەندین ساڵ دوای کردنەوەشی بەرەو تاقمی وا هەر هەبوون بە کفرخانەی دابنێین.

خولاسەی گوتە ئەوەیە لە سەردەمی دەست پێ کردنی حاجی بە خوێندن هەر مزگەوت هەبوو تێیدا بخوێندرێ. نامەوێ بکەومە سەر لێکدانەوەیێکی خەیاڵی بەوەدا ئەگەر خولیای داوا کردنی فێرگەی میری بە ڕێکەوت پەیدا بووبا لای کەسێکی ئەوسا کە بتوانن داوای ئەوتۆیی بکەن داخوا هەڵوەستی حاجی قادر چ دەبوو، پەسەندی دەکرد یاخود دەکەوتە دژی داوا کردنەکە، هەرچەندە بۆ خۆم لەو باوەڕەدام حاجی بە پێی ڕواڵەتی سروشتی دەکەوتە لایەنی پشتگیری کردن لە داخوازیەکە چونکە، هەروەک بۆمان دیار دەکەوێ، حاجی یەکجار دوور بوە لە وشکەتەبیعەتی و «تعصب». ڕابواردنەکانی خۆی کە لێرە بەدواوە هەنگاو بە هەنگاو ناوناو لە خەبەراتی مەعلوومەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە، بەڵگەن بۆ ئەوە حاجی دژی وشکیی تەبیعەت و تەسکیی مێشک و خشونەتی ژین بوە.

بەڵێ، بێگومان حاجی لە مزگەوتەکانی کۆیێ کەوتۆتە سەر خوێندنێکی بەردەوام. هەرچەند تەفسیلاتی ئەو خوێندنە و کەوت و ڕەوتی چۆن بوە لە کەسەوە مەعلووم نیە، بەڵام چ هۆیەکیش نیە فکر لەوە بکرێتەوە خوێندنی حاجی جۆرێک بووبێ جیاواز لە جۆری عادەتی خوێندنی ئەوسا. دەبێ ئەویش وەک فەقێکانی ئەو سەردەمە ناوناوە مزگەوتگۆڕی کردبێ بۆ مەبەسی خوێندن لای مەلای باش وەیا لەبەر قەڵەباڵغی ئەو مزگەوتە لێی گوێستۆتەوە.

نامیلکەی مەلا عەبدولڕەحمان و ڕیوایەتی دەماودەم لەوەدا یەک دەگرنەوە ماوەیێک لە مزگەوتی «مفتی» خوێندوەتی، هەرچەند لە عاست شەخسی مامۆستای مدرس کە حاجی دەرسی لا خوێندبێ لە یەکدی دەترازێن، چونکی وەک دیتمان نامیلکەکە یەکێک ناو دەنێ و گوتەی زاریش یەکێکی دیکە. ئەوەی ڕاستی بێ گوتەش هەیە لە سەرچاوەی غەیری خاوەنی مزگەوتی «مفتی» یەوە لەگەڵ نامیلکەکە ڕێک دەکەوێ لەوەدا کە خوێندنی حاجی لای مەلا ئەحمەدی ئۆمەر گونبەدی بوە. بەڵام دەشێ ئەویش لە نامیلکەکەوە مەعلووماتی وەرگرتبێ و قسەی ئەو دووبارە بکاتەوە، چونکی ئەغڵەب قسەکانی ناو نامیلکەکە بێگۆڕان لەو تەواتورانە دەبیسترێنەوە، وا

دیاره دەنگ و باسێکی کەوتۆتە بەر گوێیان و بۆتە خەبەری دەماودەم بێ ئەوە خەبەرگێڕەوە خۆی ماندوو کردبێ بە دیار کردنی سەرچاوە.

سەرەتاکانی خوێندنی حاجی لە هەر کوێیەک و لای هەر کەسێک بووبێ، دوایی کە گەیشتووە بە پایەی «مستعدی» بوە بە سوختەی حاجی مەلا ئەسعەدی جەلیزادە. پەیوەندی حاجی لەگەڵ بنەماڵەی جەلیزادە ڕاستییێکی مێژووییە، بۆ ئەوساش ڕووداوێکی زۆر ئاسایی بوە چونکە بەنیسبەت کەسێکی وەک حاجی پڕ قابیلەیەت و لەخۆ ڕازی دوو مەدرەسەکەی[9] حاجی مەلا ئەسعەد و کتێبخانە دەوڵەمەندەکەی و مستعدە زانا و ژیرەکانی گەورەترین جازیبە بوە لە کۆی دڵی حاجی ڕاکێشابێ، بەتایبەتی کە حاجی مەلا عەبدوڵا گەیشتە تەمەنی خوێندن و نەختێک تێهەڵکشا ئیتر لەگەڵ حاجی قادردا ئەو برادەرییەیان پەیدابوو کەوا تا مردن بەردەوام بوو. دوای مردنیشیان بۆ ڕۆژگاری ئێستا و پاشەڕۆژیش دەمێنێتەوە وەک نموونەی بێگەردیی برایەتی و دڵسۆزی.

با لێرەدا تێبینییەک بێنمە ناوەوە کە لە موناسەبەی «برادەری» حاجی قادر لەگەڵ حاجی مەلا عەبدوڵا دا ئیحتیمالی ئەوە هەیە فکر بۆ پەیوەندی حاجی لەگەڵ «کەیفیی جوانڕۆیی»ش بڕوا، کەچی شناسی کەیفی و حاجی قادر گەلێک درەنگتر پەیدا بوو، ماوەی بەردەوامبوونیشی چەند ساڵێک بوو بەر لە سەفەری حاجی بۆ ئەستەمبوڵ و لەوێ بە یەکدی گەیشتنەوە. حاجی و کەیفی دوای گەڕانەوەی حاجی بۆ کۆیێ لە گەشتە دوورودرێژەکەی فەقێیەتی باڵەکایەتی و کوردستانی ئێران بوون بە برادەر، ئەوسا حاجی قادر و حاجی مەلا عەبدوڵا لای مەلا ئەسعەد، کەیفیش لای حاجی مەلا عەبدوڵا، دەرسیان خوێندوە. لزووم نیە پێشبڕکێ بکەم لە نووسینەکەم بە گێڕانەوەی حیکایەتی دواڕۆژ، ئەوەندە تێبینییە بۆ هەندێ بوو کە وەرامی ئەو کەسە بداتەوە بڵێ «ئەدی کوا برادەریەکەی کەیفی و حاجی؟».

---

[9] – لە هەوەڵەوە تەنها مەدرەسەکەی مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەد کە لە مەلا عەبدولڕەحمانی کاکی جەلیەوە بۆی مابۆوە، لە پاش ساڵی 1260 مەدرەسەی مزگەوتی گەورەش کە حاجی بەکر ئاغا دروستی کرد.

حاجی قادر و حاجی مەلا عەبدولا نەک هەر لە مزگەوت و لەسەر خوێندنەوەی کتێب و کاتی دەرس و دەور بەیەکەوە بوون، لە ڕاستیدا هاوڕێیی یەکدی بوون تا ئەو ڕادەی کە مومکینە دووکەسی خەڵقی یەک شار هاوڕێ بن. هەر چەند تابلۆیێکی تەواو و ڕێکوپێک بۆ ئەو هاوڕێیەتییە بە من دروست ناکرێ، بەڵام گومان نیە لەوەدا تا بڵێی فکر دەڕوا برایەتی ئەو دوو مرۆڤە بەتین و بەردەوام و هەمیشەیی و بێ گروگاڵ بوە. وەک لە باوکی خۆم بیستوە حاجی قادر بەنیسبەت حاجی کاک ئەسعەدەوە وەک ئەولاد و بەنیسبەت حاجی مەلا عەبدولاوە وەک برا وا بوە. خۆ پێی ناوێ من بڵێم دیارە باوکیشم ئەم ڕاستیەی لە باوکی خۆیەوە وەرگرتوە. وەنیە لەو پەیوەندییە و خۆشەویستییەشدا چ سەرسوڕمانێک پێک بێ چونکە حاجی قادر دوای مەرگی دایکی بوو بە مرۆڤێکی بی هێلانە، بەو مانایە کە بەنیسبەت ئەوەوە جیهان وەک یەکی لێ هات، بەڵکوو دەشێ بگوترێ حوجرەی مزگەوتەکان زیاتر لێیان دەوەشاوە ببن بە ماڵ و مەئوای حاجی لە خانەیێک کەوا نە باوک نە ژن نە منداڵی ئەوی تێدا بێ ژیانیشی بەسەر ئەو خانەوە ببێ بە زێدە ئەرک لەبەر ناگوزووری و وەزعی نالەباری ئابووریی خانەوادەکەی. کە حاڵ وابێ، واش بوە، ڕەفاقەتی حاجی لەگەڵ حاجی مەلا عەبدولادا زۆر بە ئاسانی پەیوەندی حاجی لەگەڵ ماڵ و مەدرەسەکانی حاجی کاک ئەسعەددا ڕۆژ بە ڕۆژ بەهێزتر کردوە تا دەبینین سەفەری خوێندنی فەقێیەتیشیان بەیەکەوە کردوە لەگەڵ حاجی مەلا عەبدولا. پێشتریش وێنەیێکی ڕەفاقەتی ئەو دوو مرۆڤەمان دیت لە گێڕانەوەی فەردە شیعرەکەیدا بە «ئەسپی بەزین».

با ئەوەشت پێ بڵێم من کە لە گێڕانەوەی گوزارشتی ئەو سەردەمە ناوی باپیرم بە «حاجی مەلا عەبدوڵلا» دەبەم وەنیە ئەوسا چووبێ بۆ حەج، سەفەری بۆ مەکە چەند ساڵێک دوای ڕۆیشتنی حاجی قادر بوە بۆ ئەستەمبوڵ. واتە حاجی باپیرمی نەدیوە بە حاجی، هەڵبەت پێشی نەگوتوە حاجی مەلا عەبدولا، ئەوەی ڕاستی بێ حاجی قادر و تێکڕای خەڵق پێیان گوتوە کاک عەبدولا (کە بە لەهجەی کوردەواری کاکەولا گوتراوە). دوای حەجیش ئەغلەب ناوی بە «حاجی کاکەولا» هاتووە. تەنانەت شێخ ڕەزاش لە چوارینەیێکیدا دەڵێ «حاجی کاکەولا لە ئادەم فیلترە» بەڵام لە نووسینەوەدا کراوە بە «حاجی عەبدولا».

دەتوانم بڵێم بە بیرمدا نایێ بۆ حاجی قادر لە و سەردەمەدا چ جۆرە ژیان و ڕابواردن و ڕەفاقەتێکی خۆشتر و سوودبەخشتر و هەمئاهەنگتر پەیدا بووبا لەوەی کە لەگەڵ حاجی مەلا عەبدوڵادا بۆی پەیدا بوو. بێگومان بەنیسبەت حاجی مەلا عەبدوڵایشەوە هاوڕێیی لە حاجی خۆشتر و لایقتر و هاومەشرەبتر و ئەدیبتر دەست نەدەکەوت. جازیبە لە دوو لاوە ئەو دوو مرۆڤە بۆ یەکدی کێشاوە. ئەسەری حاجی قادر، لە پێش چاوی من، لە دارشتنی مەیلی ئەدەب و شیعر لە دڵی حاجی مەلا عەبدوڵادا زۆر ئاشکرایە.

بە یەقین دەزانم حاجی کاک ئەسعەد هانی باپیرمی نەداوە بەرەو هەڵبەست و ئەو مەیلانەی فەقێ و مەلا بۆ لای غەیری کتێبی مزگەوت دەبا، ڕەنگە گومان لەوەدا نەبێ هەموو تێکۆشانی حاجی کاک ئەسعەد لەگەڵ کوڕە گەورەکەیدا بۆ ئەوە بیکا بە مەلایەکی چاک، دوور نابینم ئامۆژگاریشی کردبێ دژی شیعر. مومکینە بگوترێ، ڕاستیشە مەیلی حاجی بەکر ئەغا بۆ شیعر تا ڕادەییک ڕێگەی شاعیری بۆ باپیرم هەموار کردبێ، بەڵام ئەو هێندە تەئسیرەی حاجی بەکر ئاغا بایی ئەو ناکا لەگەڵ بەرهەڵستی حاجی مەلا ئەسعەدیش، باپیرم هەر بەردەوام بووبێ لەسەر هەڵبەست. بێگومان ڕەفاقەتی لەگەڵ حاجیدا بە جۆرێکی دائیمی ئارەزۆی هەڵبەستی «دەمەزەن» کردۆتەوە. بابڵێین تا حاجی بەکر ئاغا لە دونیا بوو تەشجیعی ئەو کافی بووبێ، ئەی دوای مەرگی ئەو؟

وەک لە جێی خۆیدا ڕوونی دەکەینەوە دوای مەرگی حاجی بەکر ئاغا، حاجی قادر و باپیرم چوون بۆ گەشتی فەقێیەتی و لەو گەشتە چەند ساڵێک بەیەکەوە بوون، لەو چەند ساڵانەشدا نە حاجی بەکر ئاغا ماوە بېێتە هاوبەش لە مشتومالْدانی مەلەکەی باپیرم نە حاجی مەلا ئەسعەدیش لێیان نێزیک بوە پەردەیێکی بەرهەڵستی بخاتە بەر ئەو تەئسیرە کە یەکێکیان بۆ ئەوی دیکەی هەبێ.

حاجی و باپیرم لەو چەندساڵەی بەیەکەوەبوونیان لە خوێندنی فەقێیەتی ئەوەندەی ئیمکان هەبێ ڕەفاقەتی دووکەس کار بکاتە سەر مەیل و مەشرەبیان، ڕەفاقەتەکەیان کاری تێ کردوون. زێدە کار کردنی ئەو ڕەفاقەتە لەوەشەوە دێ کە لە ژیانێکی غەریبی بەیەکەوە بوون، واتە هەر یەکەیان بۆ هاوڕێیەکەی نێزیکترین و دۆستترین مرۆڤ بوە لە هەموو پانایی و درێژایی ناوچەی گەشتی خوێندنیان. کە لە پێشەوەش باسی کار کردنی حاجی دەکەم لە مەیل و مەشرەبی باپیرم چ مەبەستم موجامەلە و

هەڵدانەوەی حاجی نیە، ڕاستی وەزعەکە ئەوە بوە. چونکە بەهۆی زێدە تەمەنێکی کە حاجی هەیبوە لەچاو باپیرم دیارە ئەو زوتر بوە بە شاعیر. ئەگەر نامیلکەی باسکراو بکەین بە شاهید، دەبێ بڵێین بە لە وەلادەتی باپیرم حاجی شاعیر بووە چونکە لە و دەمەدا تەمەنی 19سالان بوە. خۆ ئەگەر فەرقی تەمەنیان 10 ساڵیش بووبێ بە پێی باوەڕی من دیسانەوە لە تەمەنی 20 ساڵەی حاجیدا باپیرم هێشتا منداڵێکی 10سالان بوە. بەڵێ من ناڵێم حاجی قادر باپیرمی کردوە بە شاعیر چونکە شاعیرییەت بە فێر کردن نابێ، هەر ئەوەندە دەڵێم بویژی حاجی دەورێکی باشی هەبوە لە ڕێک خستن و پێکهێنانی زەرفێکی لەبار و هەموار بۆ گەشە کردن و بەردەوامبوونی مەیلی باپیرم بۆ بویژی.

حاجی قادر و حاجی مەلا عەبدوڵا لە مەجلیس و دانیشتنە ئەدەبیەکانی ئەوسا ماڵی حاجی بەکر ئاغا و بە دوای ئەودا ئەمین ئاغا کە خاڵوانی حاجی مەلا عەبدوڵا بوون، بەیەکەوە بەشدار دەبوون و تێیاندا وەک دوو ئەستێرەی وەرشەدار ڕووناکاییان دەبەخشی.

حاجی بەکر ئاغا و ئەمین ئاغای کوڕی، یەک لە دوای یەک، دوو ئەدیب و شاعیری گەورەی سەردەمی خۆیان بوون. حاجی بەکر ئاغا ڕەفیقی کەم بوە لە عیشقی کتێب و مەیل بۆ ئەدەب و ڕۆشنبیری. ڕەنگە ئەوەندەی کە بۆ کتێبان ماڵ و دارایی خۆی بە خەرج داوە بۆ هیچ مەبەسێکی دیکەی سەرف نەکردبێ. کتێبێکی نادیاری بەلاوە مەتلەبترە لە ملک و ئەرز. ئەوەندە کاتەی کە لە دانیشتنەکانی ئەدەبیشی بەسەر دەبرد، ئەوەندە و نیو ئەوەندەی بۆ بەرژەوەندی دونیا بەسەر نەدەبرد. ئەغلەب کاتی شەو و ڕۆژی لەگەڵ زانا و ئەدەیب و مەلاکانی دەوری خۆی ڕادەبوارد.

سامانی حاجی بەکر ئەغا، ئەگەرچی زۆریش بوو، لە ئەنجامی خۆشویستنی پارەوە بۆی کۆمەڵ نەبوو بوو، لە دەستی صودفەوە کەوتە کۆشی. تاعوونەکی 1246 کە ئەغلەب وڵاتی ڕۆژهەڵاتی نزیکی گرتبۆوە و خەڵقێکی بێژماری کوشتبوو، حاجی بەکر ئاغا بوو بە میراتگری هەموو بنەماڵەی حەویزی کە دەگوترێ 80 ماڵێک بوە. ئەم ڕاستییە لێی دەوەشێتەوە نەهێلێ ناحەزێکی ئیمرۆی دەوڵەمەندان بێلزووم ڕقی لەو مرۆڤە نرخدارە ببێتەوە، چونکە لە ڕێی ستەم و ستاندن و داگیر کردنەوە حاجی بەکر ئاغا دەوڵەمەند نەبووە. کتێبخانەکەی کتێبی هێندە نادیاری تێدا بوو کەم کەمە

نەبێ لە هەموو ئەو وڵاتانەی دەوروپشتی خۆمان هاوتای نەبووە. بەداخەوە ئەم سامانە زلەی کتێبان دوای خۆی وردە وردە پەرت و بڵاو بوو تاکوو بەجارێک فۆتاو شتێکی لێ نەمایەوە پێی بگوترێ کتێبخانە.

مزگەوتی گەورەی کۆیێ، بە پێی ئەو سەردەمەی تێیدا دروست کراوە لەچاو ئەو خانوانەی لە شارە کوردەکاندا هەبوون، کە یەکێکە لە مزگەوتە نایابەکانی کوردەواری بە ماڵی حەڵاڵی خۆی بنیادی ناو یارمەتی میریشی قبووڵ نەکرد تێیدا. بە ڕاستی مینبەر و میحراب و گونبەدەکەی دڵی مرۆڤ دەکەنەوە. مەیل و ئارەزۆی حاجی بەکر ئاغا بۆ ئەدەب و شیعر و ڕۆشنبیری و خوێندەواری بە دەگمەن نەبێ لای سەردار و مەزنە پیاوەکانی کورد پەیدا نەبووە.

بەپێ داگرتنی ئەو، پیاوێکی وەک حاجی مەلا ئەسعەد جارێکیان چوە بۆ شام لای مەلا «عبدالرحمان الکزبری» اجازەی «حدیث و تفسیر»ی وەرگرتوە جاری دیکەشیان چۆتە بەغدا اجازەی زانستەکانی دیکەی لە مەلا «عەبدولڕەحمان ڕۆژبەیانی» وەرگرتوە.

حاجی مەلا عەبدوڵا گێرابوویەوە ئەگەر حاجی بەکر ئاغا بە تانووتانی نەگرتبا فێری فارسی نەدەبوو. دیوەخانەکەی حاجی بەکر ئاغا بە ڕاستی ناوچەییێکی ئەدەب و شیعر و زانست و هەموو جۆرەکانی ڕۆشنبیری بوە، لە گوێرەی ئەو ڕۆژگارە هەلێکی بەختەوەری بوە بۆ ئەو کەسانەی ویستوویانە سوودمەندتر بن لەو بەهرانە.

بەدوا حاجی بەکر ئاغادا ئەمین ئاغاش وەک باوکی ئەدیب و شاعیر و هونەرپەروەر بوە. هەمان کۆبوونەوەی ڕۆشنبیریی سەردەمی باوکی لە دیوەخانە دڵگوشایەکەیدا بەردەوام بوە بە ئیزافەی کەرستەییێکی تازەی زەق و ئارایشت کە گۆرانی و مۆسیقا و گەپ و گۆبەند بێ. ئەمین ئاغا لە باوکی زیاتر مەیلی بە دونیاوە بوە بەو پێیە مەجلیسی ئەو شۆخی و کەیف و پێکەنینی پتر تێدا بووە. لەسەردەمی ئەمین ئاغادا بازاڕی گۆرانی و مۆسیقا سەرلەنوێ کەوتەوە گەڕ، فێرگە (مدرسە) ی بەستەسازی و مەقامشناسی کە میراتێکی یەکجار کۆنی ڕابردووی کۆیەیە نوێ بوەوە و بوژایەوە. - لە جێگەی مناسبی خۆیدا ئەم باسەی مۆسیقا و گۆرانی و هەندێ باری کۆمەڵایەتی و ژیاری (حضاری)کۆیێ دێتە ناو نووسینەکەمانەوە.

جگە لە کۆیێ جێگەی دیکەش هەبووە لە کوردستان مەجلیس و ڕابواردنی وەهای تێدا بوە، بەڵام گومانم نیە لەوەدا لە ڕووی ئوستادی و هونەرکارییەوە هاوتای دانیشتنەکانی دیوەخانی ئەمین ئاغا یەکجار کەم هەبوە، ڕەنگە هەر نەشبووبێ، چونکە بە عادەت خاوەن مەجلیس تەنها خەریکی بیستن و دیتن و کەیف پێ هاتن دەبێ، بۆ خۆی تێکەڵ نابێ لەگەڵ گوزارشتی بەزم و ئاهەنگ. تەنانەت ئەگەر ئەو خاوەنە بەهرەیێکیشی هەبێ لەو هونەرانەدا کەوا لە مەجلیسەکەی پێشکەش بە تەماشاچیان دەکرێن، مەگەر جار و بارێک، دەنا تدخلێک ناکا لە چاکە و خراپە و چەند و چۆنی دەستووراتیان. هەرچی هەیە لە گەپ و گۆرانی فنونی شۆخی کە خۆرسک لەنێو کۆمەڵانی خەڵق هەڵدەقووڵن و چ دانەر و داهێنەریان مەعلووم نین و بە اصطلاح پێیان دەڵێین «فۆلکلۆر» دێنە کۆڕی بەزمەوە و دەبن بەهۆی تەڕەدەماغی و خۆشگوزەرانیی دەستەی بەزم گێران.

ئەمە واقیعێکی ئاساییە لە جیهانی بەزم و ئاهەنگ، بەڵام بەنیسبەت مەجلیسی کەیف و ئاهەنگی دیوانخانەی ئەمین ئاغاوە واقیع گەلێک جیاواز بووە. ڕێکەوت وا بوو ئەمین ئاغا بۆ خۆی شاعیرێکی هێژا بوە لە کوردی و فارسیدا، بەشێکی زۆر لە بەیتی گۆرانی و بەستەکان خۆی دەیهۆندنەوە، ئەوەی خەڵقی دیکەش هەڵیبەستبان لە پێش چاوی ڕەخنەگر و نیگاری هونەری ئەودا تێپەر دەبوون ئەوجا دەبوون بە گۆرانی و دەخرانە قاڵبی مۆسیقاوە. بۆیە هەڵبەستی گۆرانییەکانی ئەو سەردەمەی کۆیێ کە زارەوزار بە ئیمە گەیوە زەوقێکی هونەرکارانە و واتای تازە و داڕشتنی بێسابیقەی تێدایە لەچاو بەندی گۆرانی عادەتییەوە:

ئەرێ گوڵێ گوڵە جوانێ
سینگ سپێی مەمک فنجانێ
داک حدودێ بێ نیشانێ
ئەگەر جەلادان لە من دەگرنەوە چارگۆشەی مەیدانێ
چەرخەچیی شا میسرییان دەردێننەوە لە کالانێ
تو حەقی ئەو ڕۆژی جومعە کەوا شەمووی بەسەردا دێ
ئەوان گرتیانە ئەتوو بەردەوە لە بەندیخانێ

لەلای خۆتەوە قیاسێکی ئەم دارِشتنە بکە لە گەڵ بەستەی وەک

تازە داکەوتوە ئاوی بەللووعە
پێم گۆ بۆ ماچێ گۆتی مەمنووعە

ئەوەی ڕاستی بێ نەک هەر بەستەی تازە هەڵبەستراو، گەلێک لە بەستەی گۆرانیەکانی پێش ئەو دەورەش بەهۆی کەوتنە کاری فێرگە (مدرسە)ی مۆسیقاسازییەوە لەبەر و دیوانخانەی پیاو ماقووڵانی کۆیێ کە مەرکەزەکەی ماڵی ئەمین ئاغابوو، ئەو گۆرانیە کۆنانەش بەرگیان نوێ کرایەوە وەک کۆرپەی تازە لەدایکبووی کەوتە بێشکەی بەزم و ئاهەنگی دڵتەڕ و مۆسیقادۆست و کەیفخوازانەوە.

لەوەش زیاتر: ئەمین ئاغا سەرەڕای شاعیری، شارەزاییێکی دەست درێژیش بوە لە «مقام». بەقەدەر هەر ئوستادێکی بەناوبانگ لە زانستی مەقامدا چەسپاو بوە. شاعیریی لە لاییێکەوە و مقامشناسی لە لاییێکی ترەوە هەردووکیان کە بە تێروپڕی لە بەهرەی ئەمین ئاغادا کۆببوونەوە، ئاکاری شیرن و خنجیلەی ئەو بەزمانە بوون کە لای ئەو بەرپا دەبوون لەو ڕووەوە بە تەرازووی هونەر گەلێک سەنگینتر و نرخدارتر دەردەچوون لە بەزمی عادەتی کە لە جێگاکانی دیکەی کوردستاندا بەرپا دەکران.

ئەو دانیشتنە ئەدەبییانەی سەردەمی حاجی بەکر ئاغا و ئاهەنگسازی دەوری ئەمین ئاغا بوون، بەلای باوەری منەوە، کەوای کردوە مەلاییێکی زلی وەک حاجی مەلا عەبدوڵا ببێتە پێشەواییێک لە فنونی مەقامناسیدا، چونکە لە سەرەتای عومریەوە و بەر لەوە ببێتە جێنشینی حاجی مەلا ئەسعەد زۆر جاران لەو دانیشتنانەدا بەشدار بوە و دڵ و مێشکی بە گوزارشتیانەوە مەشغوڵ بوە.

بەڵێ مەجلیسی فەقێیان بێ گورانی و گەپ و دەنگی خۆش نیە، بەنیسبەت حاجی مەلا عەبدوڵاوە کتێبخانەکەشی کتێبی مۆسیقا و مەقامی تێدا بوە، بەڵام گۆرانی گوتن لە مەجلیسی پڕ تەقیە و زمان گرتنی فەقێیان شتێکە و لەرەی عوود و کەمان لە کۆشک و تەلاری شاعیرێکی مۆسیقاردا شتێکی دیکەیە. ئەوەندە شارەزاییەی مەلاییێک لە مەقامدا پەیدای دەکا بەهۆی خوێندنەوەی کتێب و بێستنی ئاوازی

فەقێیانە چەندین جار زیاد دەکا و بە گەشە دەکەوێ لە ڕێی بەشداربوون لە مەجلیسی تایبەتی بەزم و ئاهەنگدا. نەکا زەللەیێک بە خەیاڵی خوێنەر بکەم دەبێ لێرەدا ئەوە بڵێم بەزمی ئەو دەمەی کۆیێ لە مۆسیقا و گەپ و گۆرانی و شۆخی و خواردنی ڕێکوپێک بەولاوە شتێکی تێدا نەبووە پێی بگوترێ «بێشەرعی» هەر بۆیەیشە ئیمکان هەبوە یەکێکی وەک حاجی مەلا عەبدوڵا وەیا حاجی قادر تێیدا بەشدار بووبێ. وەک دەزانین ئەغڵەب نوێژی ئێوارە و خەوتنان لە دیوەخانەکاندا بە جەماعەت دەکرا وەک لە مزگەوت بێ.

حاجی قادر بە زۆری لەو مەجلیسانەدا لەگەڵ حاجی مەلا عەبدوڵا بەشدار بوە. لە شۆخی و جوانکاری و ئارایشتی ماددی و مەعنەوی دانیشتنەکان زەوقی وەرگرتوە. هەڵبەت وەزعی وا سازگار لەگەڵ شیعر و هونەردا یارمەتی ئەوەی داوە مەشرەبی ئەدەبی حاجی قادر مشتوماڵ بووبێ و شێوازی داڕشتنی شیعرەکانی ڕەونەقی پەیدا کردبێ. بەهرەوەربوونی حاجی لە جوانی و زەوقی ئەو بەزمانەدا شتێکی سەیر نیە و لێشی نایێ نیشتمانپەروەرێک و چینپەروەرێکی ئێمرۆ لێی ناڕازی بێ و بکەوێتە ڕەخنەگرتن لە حاجی، یا هەر نەبێ، کە ڕەخنەی نەگرت ئینکاری ڕاستییەکە بکا. نەک هەر ئەوەندە، بەڵکوو حاجی قادری کەمبەخت لەم مەیدانەدا بەختیاریش بوە، چونکە ئەویش وەک هەموو هونەرمەندێک و شاعیرێک موحتاجی فێرگە و مامۆستای ئارایشتی زەوق و بەهرە بوە، لە جێگەیێکی وەک کۆیەشدا ئەکادێمیی مۆسیقا و گۆرانی نەبوە، تا دەرسیان تێدا بخوێنێ و بەو دەرسە زەوقی ئەدەبی و بەهرەی بوێژی خۆی بە پێپلیکەی خوێندندا سەرەو ژوور ببا، بەزمەکانی دیوەخانەی ئەمین ئاغا، خۆ و تالع، بوە بە ئەکادێمیی هونەر و زەوق بۆ حاجی قادر، هێندی بشڵێی یارمەتیان داوە لە پەروەردە کردنی مەلەکەی هونەری و زیاد کردنی دەسەڵاتی بەسەر قاڵبی شانگ و ڕێکوپێک لە شیعر هەڵبەستندا.

ئارایشت لە کاری ئەدەبی، ئەوەی ڕاستی بێ لە هەموو کارێکدا، نرخی زل و تایبەتی خۆی هەیە. وا دەبێ بەرهەمێک هەمووی هەر ئارایشتە و تا بڵێی بەنرخیشە، وەک ئەوەی کتێبێک بە خەتی خۆش نووسرابێتەوە سەد جاران زیاتر پارەی پێ دەدرێ لە یەکێکی دیکەی خەتەکەی خۆش نەبێ. بێگومان ئەگەر حاجی قادر خڵوەی هەر لەگەڵ «قفا نبک من ذکری حبیب ومنزل» و کتێبە زەحمەتە ڕەقەکانی مزگەوتدا کردبا و ژیانیێکی سەر لەبەری فەقێیانەی ڕابواردبا دەم و دوو و ڕاوێژیشی لە

شیعردا کەموزۆر وشکایی ئەو سەختی و ڕەقییەی تێدا دەبوو، با بڵێین وشکی و زبری لە شێوازیدا دەبوون بە شەقڵ.

لەگەڵ حاجی قادر و باپیرم، کەیفییش لەو ئاهەنگانەدا بەشدار بوە. هەمان تام و شامی ئەو بەزمانە و ئارایشتی ژیانی نەرم و نولّی پڕ تەرەفی تالارە مەڕمەڕەکی ئەمین ئاغا لە هەڵبەستنەکانی کەیفییشدا خۆ بەدیار دەخەن. سەیرێکیش لەوەدا نیە چونکە لە ئەنجامی تێکەڵ بوون، بۆ ماوەیێکی بەردەوام، لەگەڵ بەزم و ئاهەنگدا، مرۆڤ شاعیر بێ یا گۆرانیبێژ یا هەر هونەرمەندێکی دیکە بی، جۆشی ئەو بەزمانە خوێنی دەکولێن... دڵی دەهەژێن... ئاورینگی جوانی و زەوقی گۆرانی و نەشئەی مۆسیقا و ئارایشی ژووری ڕازیەوە و ڕایەخی نایاب و خواردنی پاک و نازک لە تێکڕای ئاهەنگەکەوە هەڵدەستێ و لە ئاوێنەی دەروونی هونەرکار دووبارە دەبێتەوە و دەڕژێتە ناو گوفتار و کرداریەوە.

سەیرێکی ئەم نموونەیە بکە لە هەڵبەستی کەیفی:

زوڵفی سیاهی تا بە تا<br>
خوتەن خوتەن خەتا خەتا

لە پێچی کەمبەری هەتا<br>
نەزەر دەچێ «معطر»ـە

بەراوردێکیان بکە لەگەڵ ئەم فەردەی ئەمین ئاغا هەرچەند لە کێش و قافیەش لە یەکدی جودا بن:

دەخیلت بم لە عوششاقت مەڕەنجە<br>
دڵ و دینم فیدای ئەم لار و لەنجە

لە هەردوو نموونەدا نەزاکەتی پارچەی ئاوریشم و بێنی مۆمی کافوور و ڕەونەقی کاسەی بەلوور و نەقش و نیگار هەڵدەستنەوە بۆ ناو خەیاڵی گوێگرێک کە سرنجی خۆی بداتە پەیوەندی میانی مرۆڤ و ئەو جۆرە ڕابواردنە کە تێیدا دەژی. لێرەدا

مەبەستی من ڕاگەیاندنی ڕواڵەتی وشە و شێوازی شیعرەکانە، لەوە بەولاوە مەعلوومە دارشتنەکەی کەیفی بەهێزتر و زرینگەدارترە.

لە لای خۆتەوە سرنجێک بدە شەوق و ڕەونەقی هەڵبەستەکانی کوردی و سالم و تاهیر بەگ چەند ڕێکهاتوە لەگەڵ ژیانی دوور لە «تزمت»ی کە ڕایان بواردوە. خۆ تاهیر بەگ، وەختە بڵێم، نیوەی شیعرەکانی زادەی ڕاستەوخۆی ژیانە بەگزادانەکەیەتی:

هەروەکوو قەوس و قوزەح بادەست لە گەردن دانیشین
تۆ بە سوخمەی ئاڵ و سەوز و من بە ڕەنگی زەردەوە

«نالی» یش وەک حاجی قادر و زیاتریش لەو، بۆی ڕێککەوتوە لە سەرەتاکانی شاعیرییەتییەوە خۆ لە مەجلیسی ئەمیرەکانی باباندا ببینێ و لە ژیان و و ڕابواردنی ڕۆژانەی ئەوان، کە بەنیسبەت ژیانی تێکڕای کوردەواری پڕ بوە لە دەنگ و ڕەنگ و زەوق و نازکی، وێنەی گۆناگۆن و نەقش و نیگار و دیتراو و بیستراوی شەنگ و شلک ببنەوە بە خەیاڵی شیعر و بچنە ناو هەڵبەستەکانیەوە. قەسیدەی «ئەم تاقمە مومتازە» بەڵگەیێکی زلە بۆ ئەم ڕاستییە.

لە قسەی وا بە پەلە کە لێرەدا زۆر بە کورتی دەیانکەم ڕاستییێک دەڵێمەوە یەکجار بڵاوە بەسەر زارانەوە، تەنانەت کاتی خۆی لە فێرگەی ناوەندی و بەرە ژوورتر دەمانخوێند و نموونەشیان بۆ دەهێنایینەوە لە شیعری عەرەبی پێش ئیسلام و بەراورد کردنی لەگەڵ هی دەوری »عباسی».

هەڵبەستێکی «عنترة» و یەکێکی «إبن المعتز» ئەو فەرقەی بە تەواوی دیار دەخست کە لە میانی ژیانی بیابان و شارستاندا هەیە. خۆ ئەگەر لە فێرگەش ئەمە بە دەرس نەگوترێتەوە هیچ لە ڕاستیەکەی کەم نابێتەوە. بۆیەیەش دەرسی فێرگە دەکەم بە شاهیدی قسەم تا خوێنەرێکی کورد لێی ڕوون بێ چی لێرەدا دەیڵێم وەک قانوونێکی سەرەتایی و بەدیهی وایە کە مێردمنداڵێک دەیخوێنێ و سەیری لەوە نەیێتەوە پێشەواییێکی وەک حاجی قادر سوودی وەرگرتبێ لە بەشداربوون لە ژیانی کۆشک و تالاری ئاغاییێک.

خۆدیتنەوەی بەردەوام لەو تەرزە مەجلیس و ئاهەنگانەدا سەرەڕای مشتومالْدانی مەلەکەی هونەری، تاوی دیکەشی هێناوە بۆ ناو دەروونی حاجی و پالْی ناوە بە سروشتی سەرکەشی بەرەو هێرش و هەلْمەت بردن. با بزانین چۆن؟

ژیانێک هەر لە چوار دیواری حوجرەی مزگەوت و لە نێو کتێبی زانستە قالْب گرتووەکان بەسەر بچێ، ئەو فرەوانییە و ڕەنگاوڕەنگییەی نابێ کە ژیانی هەمەچەشنە و «زۆر مەیدان» و تەجرەبە و مەوزووعی جیاجیا پەیدای دەکا. مەجلیسی بەزمی ئەمیرێک یا دەستڕۆیوێکی خاوەن تەلار لەگەلْ لایەنی جوانی و نەزاکەت و شۆخیەوە، لایەنی کۆمەلاْیەتی و سیاسی و ڕۆشنبیریشی تێدا دەبێ. لەو کاتەدا کە زوربەی خەلْق دوای نوێژی خەفتنان چرا قۆدیلەکانیان خامۆش دەکەن و خۆ داوێنە باوەشی سەعاتەهای سارد و سڕ و کەمڕەنگیی خەوی ناچارییەوە، تەلاری خاوەن بەزمێک ئەوسا شەعشەعە پەیدا دەکا و مەجلیسی بەزمی ئاهەنگ و لەتیفە و وتووێژی ئەدەبی و سیاسی و زانستییەوە درێژ دەبێتەوە بۆ ناوجەرگەی شەو... هەندێ جاران بۆ شەبەقی بەیان. هەر باس و خواس و ڕووداوێک لە نێوان خەلْقی شار وەیا دەستەی میری وەیا دەولْەتانی دوور و نزیکدا سەری هەلْدابێ لەو تەرزە مەجلیسانەدا باس دەکرێن و دەخرێنە تەرازووی هەلْسەنگاندنەوە و دەدرێنە بەر زمانی ڕازیبوون یا ڕازینەبوون. بێگومان کوتانەوەی دەنگ و باسی سەر بە کۆمەلْ و سیاسەتی دەولْەتان و گوزارشتی ناوخۆیی و جیهانی، نهێنی مرۆڤ ڕوون دەکاتەوە و سرنجی دەبا بۆ بیر کردنەوەی ئەوتۆ کە لە خۆوە ناپژێ، یا هەر نەبێ ئەو کوتانەوەیە خێرای دەکا لە پژانی، لەوەش زیاتر، ترسی مرۆڤ دەشکێنێ لە باس کردنی مەوزووعی نازک و پڕ «حساسیة» و زاری ڕادێنێ لە ڕەخنەگرتن و پێوانە و کێشانەی کۆمەلاْیەتی و سیاسی و هەموو بارێکی ژیان.

لەم ڕووەوە بەزم و ئاهەنگەکانی تەلاری ئەمین ئاغا، لەویش بە پێشەوە دانیشتنە ئەدەبیە سیاسیە کۆمەلاْیەتییەکانی دەوری حاجی بەکر ئاغا، بە جۆرێکی واقیعی بوون بە فێرگە «مدرسە»ی ئەدەب و سیاسەت و هونەر و کۆمەلاْیەتی بۆ هەموو ئەو کەسانەی تێیاندا بەشدار دەبوون هەریەکەیان «بەپێی لیاقەتی خۆی» سوودی لێ وەردەگرتن. بەڕاستی حاجی قادرێک کە لە دواڕۆژدا ببێ بە ڕابەر و پێشەوای نیشتمانپەروەری کوردایەتی یەکجار پێویستی هەبووە لە سەرەتای ژیانیدا بە بنگە و فێرگەی ئەوتۆ تەنگەژەی ژیانی فەقیری و فەقێیەتیی بۆ فرەوان کا و گوێی ڕابێنێ

به باس و خواسی دوور له «ضرب یضرب» و زمانی تیژکا له قسەی سیاسی و کۆمەڵایەتی. ئەمن ناڵێم ئەگەر ئەوسا بەزم و ئاهەنگی نەدیبا و بەشداری نەکردبا له دانیشتن و وتوویژی هەمەچەشنەی فکری، داخوا حاجی چۆن دەبوو و ڕووی له چ لایێک دەکرد، هەروەهاش ئەوە ناڵێیم ئەگەر له گۆڕقەرەج نیشتەجێ با، به مەلایەتی یا به فەلاحەتی به چەندیێکی شۆرەتی ئێستاکەی دەگەیشت، لەوەش نادوێم ئەگەر بۆ ئەستەمبوڵ نەچووبا سەرەنجامی شاعیریی و گیانی سەربزێوی بەچی دەگەیاند...

نه له من و نه له غەیری من داوا دەکرێ به دوا »فرضیة»ی نەبوو بکەوێ و ئەنجامی مەوهوومی لێ وەرگرێ، بەڵام گومان نیه لەوەدا هاتنی حاجی بۆ ناو جەرگەی ڕابواردن و هەستان و دانیشتنی هەرە پێشەوەی ئەوسای کۆیێ ئاسۆیەکی بۆ کردەوە گەلێک بەرزتر و فرەوانتر له ئاسۆی عادەتی فەقێیەکی وەک خۆی. به مەدا دیمەن و ڕوانگەی ئەوتۆی هاتوونە بەرچاو و مێشکی که له جێگەی بەرزەوە نەبێ نادیترێن.

به موناسەبەی جێگە دەڵێم مەلای گەورە دەیفەرموو »موسا»ی پێغەمبەری جوولەکە به هۆی پەروەدەبوونی له ماڵی فیرعەون ئازایی و ئازادیێکی پەیدا کرد هەرگیز له نێوان جوولەکەکاندا بۆی پەیدا نەدەبوو. بەڵێ مووسای جوولەکە بێ یا حاجی قادری کورد بێ دەبێ له سروشتیدا هەڵکەوتوو بێ تا ئلهامی ئازادی له دەوروبەری خۆی وەرگرێ، چونکه که هەڵکەوتوویی نەبێ هەرچی فێرگە و بەزم و دەوروبەر هەیە نابێ به هاندەر بەرەو کارێک ترس و لەرزی تێدا بێ. هەزاران کەس له دەوروبەری یەک جۆردا دەژین و دەمرن بەیەکەوە، کەچی یەک دوو کەس له قەپێلکی ترس و لەرز دەردەچن واش دەبێ تاکێکیان لێی دەرناچێ.

له سەردەمێکی ڕابوردوودا هەموو فرەنسە یەک جان دارکی پەیدا کرد، کچیش بوو، بەشداربوونی حاجی له ژیانی هەرە پێشەوەی کۆمەڵایەتیی ئەوسای کۆیێ بەنیسبەت حاجی قادر و کوردەوە له سوودی «محض» بەولاوە تێیدا نەبوە. ئەم بوونی سوود و زیانە جگە لەوە له خودی خۆیدا ڕاستییێکی بێفێڵە، هێندەیش ئاشکرا و ڕووناکە دەبێ به کێش و تەرازووی ئیمرۆ و دوارۆژیش هەروا له قەڵەم بدرێ، چونکه سەرەڕای لانی «ایجابی» پڕ سوودی ئەو بەشداربوونە که مشتوماڵبوونی شاعیرییەتی حاجی و فرەوانبوونی نیگای و ڕاهێنانییەتی به وتوویژی سیاسی و کۆمەڵایەتی، هەرچی

بەرهەڵستێکی ئەدەبی وەیا ئینسانی وەیا گیانی میللی و نیشتماندۆستیی کەوا بە وەهمی ڕەخنەگردا بێ تێیدا نەبوە.

لە دەربڕینی ئەم باوەڕەمدا هێندە ڕام لە خۆمە و بە چەشنێک واقیعی مێژوویی بێشوبهە یارمەتیم دەدا خەریکم «تحدی»ی ڕەخنەگر بکەم و بڵێم ئەگەر پێت دەکرێ نموونەیێکی بەقەدر حاجی بێگەردم بۆ بێنەوە پاک و ڕاستە. ئەگەر لە نموونەی باوەڕ پێکراوی خۆت بۆت نەدۆزرایەوە ئیزنم دای لە هی خەڵقی دیکەم بۆ دەستنیشان کە.

بۆ پاڵپشتی ئەم «تحدی»یە دوو بەڵگەی ئەوەندە گەورە هەن لەبەر تاوی ئەواندا هەرچی ڕەخنە و ئیعترازێک بە بیری گوماناوی وەیا دڵی کرمێدا بێ وەک کەفوولکە و پووش و پەڵاشی گێژ خواردووی ناو لافاوی لێ دێ کە یەک لەحزە نەتوانێ هەڵچەقێ وەیا بوەستێ تاکوو پێ داگرێ لە سەر داوایێکی دژی ئەوەی تازە گوتم.

## بەڵگەی یەکەم

هێندە حاجی لە کۆیێ بوە و پەیوەندی لەگەڵ شێخ و مەلا و ئاغایاندا هەبوە ڕۆژەک لە ڕۆژان چاوی نەنوقاندوە لە کاری بەد و نارەوادا. بەپێی باوەڕی گشتی ئەوسا ڕووداوێک وەیا ڕەوشتێک خراپ بووبێ، حاجی لێی بەدەنگ هاتووە و دژی وەستاوە و جەنگاوە، لەم مەیدانەدا ئەوەندە جەنگاوەر بوە، وەک مەعلوومە و لە جێی مناسبی خۆیدا ڕوونی دەکەمەوە، پشوێکی حەسانەوەی نەدا لە سەرانسەری ساڵانی دوای فەقێیەتیی کە دەبوا قۆناغی حەسانەوە و گردوکۆیی بێ بۆ حاجی. خانوێک دروست کا، ماڵێک پێکەوەنێ، شوێنەوارێک بنیادنێ، دوو قرۆشان باوێتە سەر یەک.

هەموو ئەو چینانەی میللەت کە لەبەرخاتری ئەوان تارمایی ڕەخنەگرتن لە کردەوەی حاجی دێتە تصور و نووسینی هەندێک لە خاوەن ڕایانی ئیمرۆ، تێکڕایان دەیێکی حاجی خەریک نەبوون لە بەرهەڵستی خراپە و کاری نارەوا... صەدیێکی حاجی بێپەروا نەبوون لە فەوتی سەر و ماڵ. ئەوان چینانە و خەڵقانە بۆ ماف و سوودی تایبەتی خۆیان ورتەیان لەبەرەوە نەدەهات چ جایێ ئەوە بەرهەڵستی «مطلق»ی خراپە بکەن. دەشتوانم بڵێم هەژارێک نەبوە لەو سەردەمەدا خۆ بەسەر حاجیدا هەڵداتەوە و بە هەژارییەوە شانازی بکا چونکە حاجی لەو هەژارتر بوە.

پەیوەندی حاجی لەگەڵ ناودارانی چەرخی خۆی پوولێکی نەخستۆتە گیرفانیەوە و وشەیێکی ڕەخنەی لەسەر لێوان وشک نەکردوە. هەروەک لە ڕۆژانی فەقێیەتی حاجی ئەو حاجییە بوو کە دڵی «بە پێخاوسی نەکەوشم بوو نەکاڵەک» لە دوای فەقێیەتی و کاتی سەفەری بۆ ئەستەمبوڵیش هەر هەمان قارەمانی ڕووت و بێپارە بوە. هاتە کۆیێ بە هەژاری و لێی دەرچوو بە هەژارتری، نالی هەر دەڵێی ئەم بەیتەی:

بنوارە بوونی ئەووەلت و چوونی ئاخیرت

هاتی چ ڕووت و قووت و هەڵاتی چ لووس و پووس

بۆ حاڵی تایبەتی حاجی هەڵبەستوە نەک بۆ تێکڕای ئادەمزاد. چوونی بۆ ئەستەمبوڵ ئەوەندە بە فەقیری بوە، دوای تێپەڕبوونی صەد ساڵ بەسەریدا، دڵی هەستیار و پەرۆش پەلەفرەیەتی یارمەتی بۆ کۆ بکاتەوە.

وەنییە بەلای منەوە هەموو هەژارییەک ببێتە هۆی شانازی. هەژاریی عادەتی هەر ئەوەندەی لێ دەوەشێتەوە بەزەیی و پەرۆش و دڵسووتان لە ئادەمزاددا ببزێوێ و هانی بدا بۆ چارەسەر کردنی، بەڵام هەرگیز نابێتە هۆی ڕێزلێگرتن و پێدا هەڵگوتن. مرۆڤ کە بەناچاری و لەبەر بێدەسەڵاتی وەیا نالەباری زەرف هەژار بوو، نە خۆی هەست بە سەربەرزی دەکا نە کەسیش پایەی لێ دەنێ لەبەر هەژاری، خۆ شەهادەی بەرزی وەرنەگرتوە لە فێرگەی هەژاری تا پێوەی بنازێ. هەژارییەک مەردایەتی و شانازی تێدایە کە لە بەرزیی نەفس و فیداکاری و خۆنەویستی و دەستکراوەیی و ڕەوشتی ئەوتۆییەوە هاتبێ. «الفقر فخری» کە بە قسەی پێغەمبەر قبووڵ بکرێ بۆیەیە کە فەقیرییەکەی لە ناچارییەوە نەبوە. من کە لایەنی نەداری و ڕووتوقووتیی حاجی ڕوون دەکەمەوە پێی لەسەر دادەگرم وەک ڕاستییەکی واقیعی، لەودا سەرەڕای خزمەتی مێژوو دوو ئامانجی گرینگم هەیە:

یەکەم: تا کە حاجی بە خۆڕایی بەر ئەو تیرە ناڕەوایە بێئینسافە بێڕحمانە نەکەوێ کەوا کوێرانە دەگرێتە خاوەن سامان و دەسەڵاتی لێرە بەپێشەوە لەبەر مەحزی قین هەڵستان لە سامان و دەسەڵات.

دووەم: تا بزانرێ هەژاریی حاجی لە ناچاری و بێدەسەڵاتییەوە نەبوە، ئەگەر بیویستبا دەیتوانی خۆ تێر و تەسەل بکا، کاڵ و کووتاڵی ئەدەبی ئەوتۆی هەبوو کە بیفرۆشتبا کڕیاریان هەبێ... تیغی زمان هێندە تیژ بوو بە پارە بیخاتەوە ناو کاڵانی بێدەنگبوون. بەڵێ حاجی کاڵایەکەی فرۆشت بەڵام نرخەکەی هەرا و ناڕاحەتی و نەسرەوتن بوو. خەنجەری زمانیشی خستە کاڵانەوە... کاڵانی هەناوی خراپە و درۆزنی و تەڵەکەبازی.

لەم زەمینەدا من بۆ خۆم لە جیاتی خوێنەر پرسیارێک لە خۆم دەکەم و وەڵامەکەیشم گەرەکە. حاجی کە ئەو خەنجەرە بێ لە هەناوی خراپە و تەڵەکەبازی بچەقێ ئەی بۆ یەخەگیری ئاغاکان نەبوو؟ ئەوەندەی توانی لە دژی شێخ نەبی ماویلی کۆشا و جەنگا کەچی ورتەیێکی لێوە نەهات لە عاست ئاغاکاندا! ئەم ڕاستییە چۆن لەگەڵ حەقپەرستی و بەدنەویستیدا دەگونجێ؟

وەرامدانەوەی ئەم پرسیارە هەر وەک گەرد دەتەکێنێ لە پێ و دانەبی حاجی، پەردەش هەڵدەداتەوە لە ڕووی هەڵکەوتی سیاسی- کۆمەڵایەتیی ئەو سەردەمەی کۆیێ. جێگەی ڕاست و دروستیش دیار دەکا بۆ هەڵوەستی ئەو مرۆڤانە کە ئەوسا بە چاکەخواز و دەروونپاک دەژمێرران.

هەڵبەت نابێ لەبیر بکەین ئێمە لە کۆیەی سەد ساڵ زیاتر پێش ئیمڕۆ دەدوێین، چاکە و خراپەش بە مقیاسی سەد ساڵ لەمەوپێش دەپێوین، بیروڕای ئیمڕۆ ناکەین بە بەریوانی (حکم) ئەو سەردەمە، خۆ ئەگەر لە شەجاعەتی خۆمان ڕاببینم بوێری دان بە هەموو ڕاستییەکدا بێنێ ترسم لەوەش نامێنێ بە هەر مقیاسێک بێ چاکەخوازی ئەوسا و ئێستاکە هەڵکێشرێن تا بزانین ئاخۆ کامیان گۆی جوانمەردی دەبەوە؟ بەڵام با خۆمان ڕەها کەین لە گەشتی ناو دڕک و داری ئەو زەمینە چقڵاوییەی مقارنە کردن لە میانی ئێستاکە و ڕابردوودا و پەیڕەوی ئایەتێک بکەین کە دەفەرموێ »تلک أمة قد خلت لها ما كسبت ولكم ما كسبتم«.

با بزانین وەزعی ئەوسای کۆیێ و باری سیاسی - کۆمەڵایەتی پەیوەندیدار لەگەڵ پرسیارەکە چی بوە تا بتوانین بە ئینسافەوە وەڵام بدەینەوە. بە یەکدی گرتنی شەهامەتی ئەوسا و ئێستا واز لێ بێنین بۆ بیروباوەڕی شەخسی.

دووسەد ساڵێک دەبێ دوو بنەماڵەی دەسەڵاتدار، بەجووت، لەکۆیێ دەژین و بە هۆی هێز و تواناییێکی کە هەیانبوە لە هەموو کەینوبەینێکی ئەو ناوەدا، خۆشی بێ ترشی بێ، تێکەڵ و عەلاقەدارن. ئەو دوو بنەماڵەیە بوون بە جێگیری بنەماڵەی کۆنتری کۆیێ کە پێشتر خاوەن سامان و زەوی و دەسەڵات بوون، بەڵام بە جێگیربوون و چەسپاندنی ئەمانە وردە وردە کز بوون تاکوو کەوتنە ڕیزی دوەم و سێیەمی ڕیزەکانی پێشەوەی کۆمەڵایەتیی کۆیێ.

ئێرە جێی درێژە پێدانی مێژووی بنەماڵەکانی کۆیێ نیە تا لەسەری بڕۆین و ئەو مەعلووماتەی بەدەستەوەیە دەربارەیان تۆمارکەین. چەند دێڕی تازە نووسراوی سەرەوە بوون بە پەڕاوێزێکی تەنک و باریک لە دەوری واقیعی دەسەڵاتداریی لە کۆیێ لە ماوەی دوو چەرخ لەمەوبەر تابتوانین شوێن هەنگاوەکانی حاجی بکەوین و لە نێوان ئەو پەڕاوێزەدا ڕاستی و چەوتی هەنگاوەکان دەرخەین.

چ سوود نابینم باسی ئەوە بکەم بەر لە حەوێزی و غەفوورییان چ بنەماڵەیێک لە کۆیێ خاوەن پارە یان مڵک و ماڵ بوو و دەسەڵاتی عەشایەری و ڕوەتی میری هەبوە و چۆن ئەو دەسەڵاتەی دۆڕاندوە و بۆ لە دۆڕاندنەکەی بێدەنگ بوە. هەرچەند دەزانم پاراستنی ئەوەندە مەعلووماتەی لەو بارەوە ماوە کەموزۆر خزمەتێکی مێژووی پێ دەکرێ، هەرنەبێ مێژووی کۆیێ، بەڵام ئێرە جێی ئەو پاراستنە نیە بە باس و خواسی حاجی قادرەوە تا بەتایبەتی لێی بدوێین، لە هەر شوێنێک سەروکارێکی ئەو بنەماڵانە لەگەڵ خەتی بزووتنەوەی حاجی بەیەک گەیشتنەوە بە پێی داخوازی جێگە لێی دەدوێین. ئەوەندە دەڵێم بەداخەوە کەم وایە لە شوێنەواری ئەو بنەماڵانە مرۆڤی وا هەبێ دەنگ و باسیانی پاراستبێ، ئەگەر شتێک لە خەبەراتیان مابێ بەلای چەند پیاوێکی بێ عەلاقەوە ماوە، ئەوانیش بەناو ساڵان کەوتوون، ئەگەر نەڵێم، پیربوون و، مەترسی ونبوونی خۆیان و مەعلووماتیان لێ دەکرێ.

بەر لەوە من بلێم زوربەی خوێنەران دەزانن ئەو دوو بنەماڵەیە «حەوێزی» و «غەفووری»ن. ناوی حەوێزیم پێش خست چونکە لە کۆتایدا ئەوان کۆنترن. لەو ساڵانە کە حاجی لەکۆیەدا ژیاوە و کۆشاوە دەسەڵاتی عەشرەتی و ناوشاری کە هە بووبێ هی ئەو دوو بنەماڵەیە بوو. بەڵێ بنەماڵەی دیکەش هەبوون خاوەن ناو و جێگە و ڕێگە و ڕێزلێگیراو، کەسانی واش لە کۆیەدا هەڵکەوتوون لەو بنەماڵانە بەهۆی هێزی »شخصیە»تی تایبەتی خۆیانەوە بە هیچ جۆرێک ناو و نیشانیان کز

نەبۆتەوە لەتەک تیشکی دەسەڵاتی ئەم دوو بنەماڵەیە، بەڵام ئەوان کەسانە خۆیان و بریقەی ناویان و ڕێز و دەسەڵاتیان دەچێتە ناو جغزی »معنویات»ەوە وەک دین و زانست و ئەدەب و هونەر بێ، لایەنی دەسەڵاتی «دنیوی» قرغی[10] ئەو دوو بنەماڵەیە بوە.

بۆ ئەو کەسانەی حەز لە زانینی خەبەری سەربە سیاسەتی بێ تەئویلە دەکەن ئەوەندەش دەبێ بخرێتە پاڵ قسەکانەوە کە لەبارەی مەیل و ئارەزۆی سەربە کوردایەتیەوە حەوێزی مەیلی بابان و غەفووریش مەیلی سۆرانیان بوە، ئەم جیاوازییە لە مەیلی سیاسیدا دەستی بوە لە هەندێ ڕووداوی کاریگەر بەنیسبەت هەردوو بنەماڵەوە و لە ڕێی ئەوانیشەوە بەنیسبەت تێکڕای کۆیێ. پشکنینەوەی یەکجار ورد دەربارەی تفصیلاتی ئەو ڕووداوانە دەخلێکی چەندانی نیە بەسەر تایبەتی باسی حاجی قادرەوە، ڕووپەڕە ناخۆشەکانی گوزارشتی بەینی دوو بنەماڵەکەش کاتێک تۆمار کراون کەوا هێشتا حاجی بەوەلەد نەبوە یاخود ئەگەر بەوەلەدیش بووبێ لەتەمەنێکدا نەبوە بە هیچ لایەکدا مەیل بکا. ئەوەی مەعلوومیشە لە سەردەمی پێگەیشتنی حاجی چی ئەوتۆ لە میانیاندا ڕووی نەداوە مانیع بێ لەوەی کە حاجی پەیوەندی لەگەڵ هیچ لایەکیاندا ببڕێ.

بەدەم نووسینەوە ئەم لایەنانەی عەلاقەدار لەگەڵ حاجی ڕوون دەبنەوە، لەوەش زیاتر پێویست نیە درێژە بدەین بە چەند و چۆنی ڕووداوی یەکجار تایبەتی

---

[10] – «قرغ» وشەیێکە کە لە نێو عەشرەتی خاوەن مەڕ و زەویدا، بەکار دێت و ئەوە دەگەیەنێ کە پووش و پاوان وەیا دار و دەوەنی فلآنە شوێن عائید بە فلآنە کەسە. دەگوترێ ئێرە قەغی مام باپیرە، هۆ و هەڵپێتوانە (داری هەڵپەردراو) قرغی خۆمە. واتاکەی لە واتای «احتکار» نزیک دەبێتەوە، بۆیە من وا بە چاک دەزانم بۆ «احتکار» بەکار بێ و کار «فعل» یشی لێ داتاشرێ. بگوترێ: میری تووتنی قرغاندوە، کۆمپانیاکان نەوتەکە لە نێوان خۆیاندا دەقرغێنن، شەکر و چایەش قرغا. خولاسە لە هەردوو جۆری تێپەڕ و تێنەپەڕدا بەکار بێ وەک هەموو کارێکی ڕەسەن کە تێپەڕ و تێنەپەڕری هەبێ: هەروەک «ڕژا، دەڕژێ – ڕژاندی، برژێنە» هەروەها بگوترێ «قرغا، دەقرغێ، بقرغێ – قرغاندی، دەقرغێنێ، بقرغێنە» هەندەی پێ ناچێ دەست و زار لێی ڕا دێ.

عەلاقەدار بە هەردوو بنەماڵەکە. ئێمە لە کولانەی باسەکانی دەوروپشتی حاجییەوە سەیری مێژوو و ئەشخاس و ڕووداو دەکەین و هەر بایی داخوازی ئەوان باسانە لێیانەوە دەدوێین، ڕێگەمان نیە بۆ وردبوونەوە لە گوزارشتێک کە خزمەتی مەبەستمان ناکا.

بابگەڕێینەوە بۆ زنجیرەی نووسینەکەمان و خەریکی جەواب دانەوەی ئەو پرسیارە بین کە خۆم لە خۆمم کرد. بۆچی حاجی یەخەگیری ئاغاکان نەبوو. لەو چەند دێڕەی سەرەوودا ڕوون بۆوە کە ئەگەر حاجی لەگەڵ ئاغاکان بەدەنگ هاتبا دەبوا خۆ لە دوشمنایەتیی ئەم دوو بنەماڵەیە هەڵبکا. چی بوو حاجی وەستاند و بێدەنگی کرد لە عاست ناودارەکانی ئەم دوو بنەماڵەیە؟

حاجی کۆڵی دا؟ حاجی خۆی فرۆشت؟ حاجی ترسا؟ نەخێر نەخێر سەد جار نەخێر، هۆی بێدەنگی حاجی نە کۆڵ دان بۆ نە خۆفرۆشتن بوو نە ترسان. ئێمە لێرە بە پێشەوە گوتومانە حاجی لە ژوورووی ترس و کۆڵ دان و خۆفرۆشتنەوە بوە. گوتمان سروەتی نەبوو تا لە کۆیێ ژیا، دەشزانین ڕۆژ لە ڕۆژ ئاوری گیانی بڵێسەدارتر دەبوو تا مەرگ خستیە چاڵی گۆڕێکی ونی یەک لە قەبرستانەکانی ئەستەمبوڵ. کەواتە با خامە لە ڕووپەرەی مێژووودا ئەم ڕاستییە تۆمار کا. حاجی قادر کردەوەی ئەوتۆی لە پیاو ماقووڵانی ئەم دوو بنەماڵەیە نەدیت وەک بیانووش بیکا بەهۆی تێ هەڵگیرسانیان. نەکەی وا تێبگەی دەڵێم ئەوان پیاو ماقووڵانە فریشتەی پاک و بێگوناهـ بوون. نە ئەوان و نە تێکڕای خەڵقی ئەوسا فریشتە بوون و نەخەڵقی ئێمرۆش فریشتەن. بەڵام بۆ ئەوە حاجی قادر بیر نەکاتەوە لە هێرش بردن بۆ سەریان پێویست نیە فریشتە بووبن، هێندە بەسە بە پێی باوەڕی خەڵقی ئەو سەردەمە کردەوەکانیان لە دەستوور و عادەتی گشتی بەدەر نەبووبێ. دەوجا بابزانین چۆن ڕێکەوت وا بوو دەسەڵاتی حەوێزی و غەفووریيان لە سەردەمی حاجی قادردا سەری نەگەیاند بە ستەم و کاری نارەوا.

من کە دەڵێم »ڕێکەوت وابوو« لە خۆمەوە بە پیر باوەڕی ئەوان کەسانەوە دەچم کە لە ڕێی تحلیلی »بەرژەوەندی ماددی»یەوە چاوەنۆڕی خراپە دەکەن لە خاوەن دەسەڵات. بەشێکی زۆریشیان کۆمە ناکەن لەوە ئەگەر خراپەیان نەدۆزیەوە لە دەسەڵاتداران بۆیان هەڵبەستن نەوەک فەلسەفە لەعاست ڕووداودا پاشگەز بێتەوە. من کە بەرەوپیری ئەوانە دەچمە مەبحەسەوە ئەگەر بسەلمێنم بەڕێکەوت وابوو

خاوەن دەسەڵات ستەمی نەکردوە. لەوە بەولاوە هەرگیز لەگەڵ ئەوەدا نیم بۆ خاتری سەرکەوتنی فەلسەفە خراپە هەڵبەستریٚ بە شوێن دەسەڵاتداردا، دڵخۆشیش دەبم ستەم نەکرابیٚ چ لە لایەن دەسەڵاتدارەوە چ لە لایەن هەرکەسێکی دیکەوە بیٚ. بەلای منەوە مرۆڤ لە ئەزموون (امتحان)ی چاکە نومرەی دەرچوون وەرگریٚ خۆشترە نەک مرۆڤ تێبشکیٚ و فەلسەفە سەرکەویٚ. هەزار فەلسەفە دەکەم بە قوربانی یەک مرۆڤ.

بەڵیٚ منیش چاوەنۆڕی کاری بەد دەکەم لە دەسەڵاتدار، چونکە وەک دەبینین مرۆڤ لەسەر دەسەڵاتیش ڕانەوەستاوە، کە پێی کرا کاری ناڕەوا دەکا و ئەغڵەب نموونەی وا دەبینین لە کردەوەی مرۆڤی عادەتی کە گوتەی شاعیری عەرەب بە ڕاست دەگێڕیٚ:

والظلم من سيم النفوس فان تجد
ذا عفة فلعله لا يظلم

هەر بۆیەیشە بە دڵ پشتگیری لە هەموو هەنگاوێکی سیاسی و فکری دەکەم کە دەسەڵات بدا بە تێکڕای خەڵق، نەکا یەکێک یا کۆمەڵەیێک یا بەرەیێک دەسەڵاتەکەی بۆ سوودی خۆی و زیانی زوربەی میللەت بەکاربێنیٚ. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا کە ببینم یەکێک یا کۆمەڵەیێک یا بەرەیێک یا دەوڵەتێک دەسەڵاتی خۆی تەرخان کردوە بۆ سوودی گشتی تا بڵێی خۆشحاڵ دەبم، ئەگەر بۆم بکریٚ شایی دەگێڕم بۆ ئەو ڕووداوە خۆشە نەک تازیە دادەگرم لەبەر نەهاتنەدی چاوەنوارِ کردنەکەم.

با ئەوەش بڵێم، وەنیە هەموو جاران «دەسەڵات»کاری ناڕەوا بکا. من لە باسی حەوێزی و غەفووریدا بە «تبرع» دەڵێم «ڕێکەوت وابوو» بۆ دەفعی ڕەخنەگر و لەبەر ئەوە کە غاڵب وایە لە وەزعی ئاسایی دەسەڵات بەرەو ستەم دەخزیٚ. ئەگەر ئەم هۆیانە نەبیٚ دەتوانم بڵێم هێندەی کە مومکینە بە «ڕێکەوت» ستم نەکرابیٚ ئیمکان هەیە سەرۆکەکانیان لە ڕەوشتی چاکی خۆیان مەیلیان بۆ ستم نەچووبیٚ، واتە لەوانە بووبن ئەگەر دەسەڵاتی تەواویشیان هەبووبا بۆ ستەم کردن، هەر نەیان کردبا.

مێژوو نموونەی ئەوتۆی هەیە لە پیاوچاکان هێندە پاکسروشت بوون بایی ئەوە بکا پێمان بسەلمێنی جیلێکی سەرلەبەری دەسەڵاتداران لە خودی خۆیانەوە پاک و چاک بووبن سەیریشمان بەوە نەیێ. پیاوێکی وەک «عمر عبدالعزیز» نەک لە نێوان دەسەڵاتداران و پیاوانی دونیایی و سەر بە سیاسەتەوە بەڵکوو لە نێو هەژار و بێدەسەڵات و لات و گۆشەنشین و پیاوی سەر بەرماڵیش هەر دەبێتە پێشەوا و نموونەی پیاوچاکی. کە بوو بە خەلیفە یەکجارەکی ناز و فیز و ئاسوودەیی و خۆشگوزەرانی تەڵاق دا و نەفسی خۆی خستە ژێر پێیەوە. لە دڵ و دەروونی خۆیشی بەولاوە ئەوەی هۆی چاکی بێ لە دەوروبەری نەبوە. جەزیرەیێکی چاکە بوو لە ناو دەریای خراپەدا. شاعیری عەرەب لە دوای مردنی شینی بۆ دەکا و دەڵێ:

اقول لما اتانی ثم مهلكة
لاتبعدن قوام الحق والدين

قد غادروا في ضريح للحد منجدلا
بدير سمعان قسطاس الموازين

هەردەڵێی فریشتان و «قسطاس الموازین»ـەیان بەزاریدا هێناوە چونکە بە ڕادەیێک ڕاست و دادپەروەر بوە نەک لە سەردەمی خۆی تاکی نەبوە بەڵکوو تا ئیمرۆش یەک دوو کەسی وەک «غاندی« نەبێ لە مەیدانی حەقپەرستیدا کەس نیە هاوتای بووبێ. قسەمان لە پیاوی سیاسی و دونیاییە، دەخلمان بەسەر دەروێش و عابیدەوە نیە لێرەدا، چونکە سیاسەت لەگەڵ عیبادەت بە یەکدی ناگیرێن. «عمر عبدالعزیز» و «غاندی» لەوانەن لە ڕووپەڕەی 51 ی ئەم نووسینە ئیشارەم بۆ کردن.

دەگەڕێمەوە بۆ پرسیارەکەی کردم. چۆن ڕێکەوت وابوو دەسەڵاتی ئاغایی حەوێزیی و غەفووریان لە سەردەمی حاجی قادردا سەری نەگەیاند بە ستەم! با لە تۆماری پەڕی سەدەی بیستەم هەڵگێڕینەوە بەرەو ڕابردوو و چەند دێڕیک لە پەڕی سەدەی نۆزدەیەمی کۆیێ بخوێنینەوە کە باسی حەوێزی و غەفوورییمان بۆ دەگێڕێتەوە، لە حەوێزیشەوە دەس پێ دەکەین.

لێرە بە پێشەوە گوتمان حاجی بەکر ئاغا بوو بە میراتگری هەموو حەوێزییان، بۆیە خۆی بریتییە لە بنەماڵەی حەوێزی هەر لە ساڵی 1246ـەوە کە ساڵی تاعوونەکە و

قرانی حەویزییانە تا ساڵی 1254 کە بۆ یەکەم جار لە دوای ژن هێنانی کوڕی بوە. لەو ساڵەیشەوە تاکوو مەرگی لە 1270دا لە خۆی بەولاوە نە کوڕی گەورە و نەکوڕی گچکە و گچکەتر لیاقەتی ئەوەی پەیدا نەکردوە کردار و ڕەفتاری لەسەر حەویزییان حیساب بکرێ چونکە هەموو ماوەکە 16 ساڵ بوە، کە ئەمە بە حاڵ مرۆڤ تێیدا دەبێ بە جحێل و چەپ و ڕاستەی خۆی دەناسێ.

بەنیسبەت ئەمین ئاغایشەوە کە کوڕی گەورەی بوە، پەروەدەبوونی پڕ ناز و فیزی جۆرێک بوە نەیهێشتوە بیر لە تاڵی و شرینی دونیا بکاتەوە چ جایی دەست بۆ کرد و کۆشش درێژ کا تا بگوترێ چاکی کرد یا خراپ. جگە لە کەمتەمەنی و پەروەدەبوونی بە ناز، بەردەوامبوونی باوکێکی وەک حاجی بەکر ئاغای دەسەڵاتدار لە خۆوە جغزێکی دەکێشێ لە دەوری کوڕ و دەستوپاوەندی کە لێی دەرنەچن.

ئەمە لە لانی «نظری» یەوە کەوا تا ڕادەییێک لانی «عملی» تەواویشەوە. ڕووداو ئەوە بوە کە ئەمین ئاغا ساڵانی پێش مەرگی باوکی بە خوێندن و پەروەردەبوونێکی بەگزادانەی بەسەر بردوە کەموزۆر نزیکی کاروباری گوزەران نەبۆتەوە، دەخلێکی بەسەر هیچ کەینوبەینی سەرف و سوودەوە نەبوە. ئەوەی ڕاستی بێ پەروەردەبوونی سەرەتای ژیانی تاوی برد بۆ هەموو ڕۆژگاری، تاکوو دەتوانم بڵێم ڕۆژەک لە ڕۆژان ئەمین ئاغا نەبوە بە مرۆڤێکی عادەتی کە حیساب بکا بۆ فەقیری و دەوڵەمەندی. دەستبڵاوێک بوە لە هەموو سنووران بەدەر. لەبەر ئەمە تاکە نوێنەری «حەویزییەتی» شەخسی حاجی بەکر ئاغا بوە هەتا کۆتایی ژیانی.

وەک دەزانین، تا ڕادەییێکیش باسمان کردوە، ئەم مرۆڤە خوێندەوار و شاعیر و خاوەن مەدرەسە و کتێبخانە بوە و شۆرەتی بە مەلا بەکر و حاجی بەکر دەرکردوە. تەنانەت حەوێزی پێیان دەگوترێ مەلا بەکری و حاجی بەکری نەک بەکر ئاغایی، مەگەر ناوناوە. ئەگەر واز لە مەشرەب و مەیلی ڕۆشنبیری و پەروەرشتی شەخسی بێنین پەیوەندی کۆمەڵایەتی و چەشنی گوزەران و لایەنی ئابووری بکەین بە ڕەچاوکەری «لقب»ێک بۆ حاجی بەکر ئاغا، ئەوسا هەر بە جارێ لە ئاغایەتی دەشۆرێ، چونکە حاجی بەکر ئاغا خاوەنی دێ و دێهات و عەشرەت و ملک و ماڵی دەرەوە نەبوە. سامانێکی هەی بووبێ پارە و ملکی ناو شار و زەوی و باغی دەوری شاربوە.

بەراستی ئەگەر نژادەکەی ئاغا نەبوایە دەبوا بە مەلاییکی بازرگان ناوی بێ، خۆ مەعلوومە تیجارەتی حاجی بەکر ئاغا هەردوولای دەرنان و هاوردنێ (تصدیر و استراد) هەبوە. قافڵەی بۆ بەغدا و موصڵ و حەڵەب و تەوریز و تاران هاتوچۆی کردوە، هاوینان بەرەو کوێستان و زستانان ڕوەو گەرمێن، وەک ئەهلی مەککەی سەردەمی تازەی ئیسلام »رحلە الشتاء والصیف»ی بوە.

گوتەیەکی مەشهوورە ئیمزای ئەو بە برەوتر بوە لە هی حکومەتی عوسمانی لای بنگە تیجارییەکانی ئەوسا و ماڵ و کاڵا و بابەتێکی ئەو ماملەتی پێ کردوە لەبەر دەستخاوێنی و پوختەیی پێشبڕکێی لەسەر کراوە لەلایەن توجار و کۆمپانیاکانەوە. شەقڵی «علامة فارقة» حاجی بەکر ئاغا بەڵگەی بێ دەمەتەقەی پەسەندی و خاوێنی بوە. ناو و شەخسیەتی لە کۆیە و کوردستانی تێپەڕاندوە و لە زۆر وڵاتانی بێگانە بە چاکی ناسراوە. «سیدی آلوسي» کە یەکێکی بوە لە مەلا هەرە گەورەکانی بەغدا گوتوەتی گەورەکانی بەغدا چاوەنۆڕی هاتنی حاجی بەکر ئاغا دەبن بەڵکوو کار و مەسڵەحەتییان بۆ بڕوێنێ لای والی و کاربەدەستانی دیکەی میری.

ئەم دەسەڵات و ناوبانگە و پایەی شاعیرییەت و شەخسییەتی ڕێی پێ داوە کە کوڕێکی خۆی «حاجی طاهر ئاغا » بکا بە سەرۆکی شارەوانی بەغدا. «عبدالباقي العمري» کە ئەوسا یەکەم شاعیری عەرەب بوە لە بەغدا لە دیوانەکەیدا مەدحێکی گەورەی حاجی ئاغا دەکا و بە عەرەبی برِە شیعرێکی فارسی ئەو «تشطیر» دەکا.

حاجی بەکر ئاغا، بێ ئەوە من یا غەیری من لەسەری بکاتەوە، ڕەوشت و کردەوەی خۆی لەسەری دەکاتەوە. هەڵکەوتوێکی هێندە بەشەرەفی سەدە و نیوێکی بەر لە ئێستاکەی کۆیێ بوە، ئەگەر بێ گۆڕین وەک خۆی ئیمرۆکە ڕوحی بێتەوە بەر لە خێر و خۆشی و ڕۆشنبیری و ئاوەدانی کۆیە و کوردستان زیاد دەکا، یا هەر نەبێ خزمەتێکی گەورەی بێفێڵی ئەو لایەنانە دەکا.

ئەمە کورتەییێکە لە سەروکاری حاجی بەکر ئاغا کە دەبێتە نموونەی سەراپای داستانی ژیانی. پیاوی وەها ئێمڕۆش ڕەخنەی لێ ناگیرێ چ جایی ئەوەی داوا بکرێ لە یەکێکی وەک حاجی قادر یەخەگیری بووبا بەر لە سەد و سی ساڵێک. ئێستاکەی ئێستا لە کوردستان و هەموو «میللەتستان» ێکی نزیک و دوور و چەب و ڕاست دەوڵەمەند و دەستڕۆییو هەن بە پێی ئەم زەمانە نیو هەندی حاجی بەکر ئاغا

خزمەتی وڵات و میللەتەکەیان نەکەن بە قسە و ئیددیعا و پڕوپاگەندە نەبێ. کە پێویستیان بوو خەڵقیش بەکوشت دەدەن و بە قوربانی خۆیانی دەکەن. کەچی لەوانەن بە قارەمانی میللی لە قەڵەم بدرێن و بخووریان بۆ بسووتێنرێ و شیعریان پێدا هەڵبگوترێ، کێ دەڵێ پەیکەریشیان بۆ دروست ناکرێ.

کە ئێمە ناو و نیشان و خۆشیی و سامان و دەسەڵات بکەین بە نۆشی گیانی زیندوانی بێ ماف و لیاقەتی ڕۆژگاری خۆمان ئێوە و خواتان با بەرنەبینە گیانی مردوویێکی بێگوناهی بێتاوان، ئەو تاوانانە نەبێ کە لەگەڵ میزاجمان ڕێک نەکەوێ و کەیفمان پێی نایێ. سەد ڕەحمەتیش لە گۆڕی حاجی قادر کەوا نە لە ڕێی بێئینسافی و نە لە ڕێی حەسوودی پێبردنەوە دەستەویەخەی هاوچەرخێکی خۆی نەبوە کە لەبەر هونەری زۆر و سامانی زۆر و شۆرەتی زۆر و چاکەی زۆر جێی حەسوودی پێبردن بوە. ئەدیبەکانی ئێمرۆ بەهۆی هێرش بردن بۆ سەر کات و مرۆڤی مردوو خۆ دەدزنەوە لە کات و مرۆڤی زیندوو، چ گومانم نیە یەکێک وەک ئەو حاجی قادرە هەبا کە لەسەردەمی حاجی بەکر ئاغادا ژیاوە وەک ئەدیبانی ئیمڕۆ خۆی نەدەدزیەوە.

سەرگوزەشتی ئەمین ئاغا لە هی باوکیشی بێ کێشە و گرێوگاڵترە. کەمێکی سامانی حاجی بەکر ئاغا گەیشتە ئەمین ئاغا دوای ئەوەی دابەش کرا بەسەر خاوەن پشکاندا. میراتگری حاجی بەکر ئاغا بە کوڕ و کچەوە ئەوەندە بوون کە مەودا نەدا بە دەوڵەمەندبوونی هیچ کامێکیان لە ڕێی خودی میراتەکەوە، ئەوەی دەوڵەمەندبووبێ بەهۆی کۆششی تایبەتی خۆیەوە بوە. لە فەرزی پشکێکی زیادیش بۆ ئەمین ئاغا دانرا بێ، بایی ئەو زێدەمەسرەفەی نەکردوە کە بە هۆی گەورەیی کەوتۆتە ئەستۆیەوە.

ئەمین ئاغا سەبەب بە نازێکی زەمانی باوکییەوە کە تێکەڵ بە ناو و شەخسییەتی بووبوو و لە دڵاندا خۆشەویستی کردبوو و سەبارەت بەوە کە براگەورەیی و بەرە و دیوەخانە و قۆناغی بە میرات بۆ مایەوە، ئەمین ئاغا ڕێزی لێگیراوە نەک لەبەر پارە و سامانی زۆر. لەوەش زیاتر، تەمەنی 15-16 ساڵەیی لە کاتی مەرگی باوکیدا سۆز و پەرۆشی خەڵقی تێکەڵ بە ڕێز لێگرتنی کردوە، تەنانەت گەورەکانی ئەوسای کۆیێ بەوە ڕازی بوون چۆنێکی دڵی ویستبێتی وا ڕەفتار بکا و گوێ نەداتە دەستوورات و عادەتی دیوان و قۆناغان. لە لاییکەوە دابەشبوونی سامانی باوکی بەسەر میراتگراندا

و لە لایێکی دیکەوە بەردەوامبوونی ئەرک و تەکلیفی دیوەخانەکەی و لە لایێکی سێیەمەوە کەمتەرخەمی و گوێ نەدانە سوود و زیان، بوون بەهۆی ئەوەی ساڵەو ساڵ وەزعی گوزەرانی ئەمین ئاغا دالەنگێ و کەموکەسەری بێنێ تا وای لێ هات گەیشتە سەغڵەتی و ناگزووری. نەبیستراوە نە لە سەرەتای عومری و نە لە هیچ پلەیێکی دواتری ژیانی زوڵم و زۆری کردبێ. ئەوەی ڕاستی بێ ڕەوشت و ڕابواردن و ئەدەب و هونەردۆستیی ئەو مرۆڤە لەگەڵ زوڵم و زۆردا کەموزۆر خزمایەتی نەبووە. خراپە کردن لەگەڵ زەرفی ماددی پێویستدا دڵ و دەروونێکی خراپەخوازیشی دەوێ. کەسبێک نیە هەموو کەس لێی بزانێ و تێیدا پسپۆڕ بێ.

لە کارەساتی 1284 ی کۆچی کە «تقي الدين پاشا» بەسەر غەفوورییەکانی هێنا (دوای ماوەییێکی کورت باسی دەکەینەوە) ئەمین ئاغا لە جیاتی ئەوەی سوود لە هەل وەرگرێ و خۆ لە والی نزیک کاتەوە و شادی بکا لە دەرد و نسکۆ و نەگبەتی بنەماڵە هەمچەشمەکەی، یاخود هەر نەبێ لاتەریک بێ و بێتەرەف بوەستێ، کەوتە دژی «تقي الدين پاشا» و بە شیعر هەجوێکی ئەوتۆی کرد بوە هۆی دوورخستنەوەی لە کۆیێ و دووچاربوونی تەنگ و چەڵەمە و ناڕەحەتییێکی دوورودرێژ. هەر چەند ئەم ڕووداوە دوای چوونی حاجی بوە بۆ تورکیا، دیسانەوە تیشکێک دەگەڕێنێتەوە بۆ حاڵ و ڕەوشتی ئەمین ئاغا لە ڕۆژانی زووتردا کەوا جارێ حاجی کۆیەی جێ نەهێشتبوو.

ئینجا با بزانین بەرەی غەفوورییان لە چ وەزعێکدا بوون کە داخوازی لە پیاوێکی وەک حاجی قادر بکا دۆستیان بێ یا دوشمن.

لە باسی حەوێزییان و کردەوەی پیاوەتی حاجی بەکر ئاغا و ئەمین ئاغا گەلێ داستان هەن پێویستم نەدیت بیان هێنمەوە ناو دەفتەرەوە نەکا بگوترێ بۆ لە سەر کردنەوە و لایەنگیرین هاتوونە ناو. بەنیسبەت غەفوورییانیشەوە هەر هێندە لە باریانەوە دەدوێم کە خوێنەرێکی بە ئینساف بیکاتە مقیاس و هەڵوەستی حاجی قادری پێ هەڵسەنگێنێ لە عاستیاندا.

ئەم بنەماڵەیە لە ساڵی 1237ی کۆچی لە ئاژاوەیێکی سامناکدا قتلوعام کراون (جارێکی دیکەش دەگەڕێینەوە بۆ ئەم باسە). لێرەدا هەر هێندەی باس دەکەین وەزعی ستەمکاریی و بێستەمی غەفوورییان ڕوون کاتەوە. ئەوەی ڕاستیش بێ حەز

ناکەم لابەلا و بێ قوولْبوونەوەیێکی تەواو کە هەموو سەروبەرێکی ڕووداوەکە ساغ کاتەوە و تاوانباریی و بێتاوانیی ئەو لایەنانەی تێیدا بەشداربوون وەیا ناویان کەوتۆتە ناو گوزارشتەکەوە زۆر چاک دیار خا، نامەوێ بە کەلوکلۆمی لێی بدوێم. ئەگەر پێویستی گێڕانەوەی سەروکاری حاجی قادر نەبا ئیشارەشم بۆ کارەساتەکە نەدەکرد، بۆیەیە تەنها لە گۆشەی نیگای وسکتبوونی حاجی لە خراپەی غەفووریيانەوە، کە خراپەیان بووبێ، سەیری قەتلوعامەکە دەکەین و ناوی دێنین.

تۆ بلێی بنەماڵەیێک بە نیازی قڕتێخستن تیغیان لێ بەکار هاتبێ و لە یەک دوو تێرینە بەولاوە لێیان دەرنەچووبێ، دەبێ چەند ساڵان چاوەنۆڕ بکەن تا دێنەوە سەر بار و ئیمکانی ستەم کردن؟ ئەوەش بزانە لەو ساڵانەدا کە بە «افتراض» دەڵێن چاوەنۆری هەلیان کردوە بۆ ستەم کردن، بەلای عوسمانیانەوە خۆشەویست و قسەڕۆییو نەبوون تا بگوترێ مەرحەبای حکومەت کەلێنی قەتلوعامی بۆ پاشماوەکانی پڕ کردۆتەوە و کوتەکی دەستدرێژی داوەتە چەنگیان. تازە گوتمان لە 1284 یش جارێکی دیکە درانەوە بەر دەمی تیغی فەنا و گەورەکانیان کوژران و بریندار کران و خرانە بەندیخانەوە، ماڵیان بە تالانی ڕۆیی. حەماغا بە دوای برینداریدا 14 ساڵان لە حەپسخانەی کەرکووک و بەغدا ماوەتەوە.

حاجی قادر تاوانی لەوەدا نیە کە غەفووری زەرفی ستەم کردنیان نەبوە تا لە دژی زوڵم و زۆریان دوا با و بەمەدا ڕەخنەگرانی ساڵانێ دوای 1950 لە خۆی دوورخستبایەوە. ئەمە وەزعی غەفووریيان بوو تا حاجی لە کۆیێ بوو. دوای چوونیشی بۆ ئەستەمبوڵ و تێپەڕینی ساڵانی بەندیخانەی حەماغا و هاتنەوەی بۆ کۆیێ و پەرەسەندنی دەسەڵاتی، لە خەبەری ئازایی و چاکە و پیاوەتی و بەخشینی سەرۆکیان بەولاوە کە حەماغا بوە پێی نەگەیشتوە. خەڵقی وڵاتی کۆیێ و هەموو کوردستان جوانمەردیی حەماغای سەلماندوە. سەخاوەتی بوەتە پەند و قسەی نستەق و چووتە فۆلکلۆرەوە. دەوجا پیاوێک بەو جۆرە ڕێزلێگیراو و خۆشەویست بێ لە نێوان هاوڵاتیەکانی چۆن دێتە عەقڵەوە لە لایەن دوورکەوتەوەیێکی دڵ پڕ سۆزی وەک حاجی قادرەوە دوشمنایەتی لەگەڵدا بکرێ.

جوانمەردی و سەخاوەتی حەماغا کە حاجی قادر پێیدا هەڵ دەڵێ تا دواڕۆژی ژیانی هەر لە زیاد کردندا بوە. وەنیە نهێنیەک ئاشکرا بکەم بەوەدا کە بڵێم لە گرانیەکی 1917 خەڵقی زۆر لە کۆیێ بە نانی حەماغا لە مردن ڕزگار بوون. ئەوەندەی کە

دەرخواردی هەژار و برسیيانی دا ئەگەر بە پارە و ملْک و ماڵی دابا دوو بەشی ناو شاری کۆیێ لە خانوو و دوکان و ڕەز و باغ دەبوو بە هی ئەو.

ئەمە ڕاستییێکە کاملْەکانی کۆیێ چاکی دەزانن، لاوەکانی ئیمڕۆش لێی بێخەبەر نین، بەڵام لێم ڕوونە لە دوارۆژدا بەهۆی شاردنەوە و ئینکار کردنی نووسەران هێندەی تۆز لێ دەنیشێ مەگەر ئینسافکار لێی بتەکێنن دەنا وا سەرپۆشی دەکا لەگەڵ نەبوو جووتی دەکا. ئەوا لە گۆشەی بێتەرەفییەوە ڕاستی دەگێڕمەوە لە حەماغا بە موناسەبەی پەیوەندی دۆستی و سۆز لە میانی حاجی قادر و ئەودا دەنا خزم و کەسی بۆ خزمەتی مێژووش ڕێیان نیە بیر بکەنەوە لە ژیاندنەوەی یادی حەماغا وەیا داوای ئینساف بکەن لە خامە و زمانی ڕۆشنبیرییێکی سەردەمی ئاتۆم.

بە دوا حاجی قادردا حەقپەرستێکی وەک مەلای گەورەش شایەدی چاکە و جوانمەردی و نەترساویی حەماغا داوە. بۆ خۆم داستانەهام لێ بیستوە لە گەورەیی حەماغا. جگە لە بیستن شایەدی نووسراویش هەیە لە مەلای گەورەوە بۆی. ئەوەندەی بزانم تەنها بۆ مەرگی ئەو لە شیعردا بە حیسابی ئەبجەد مێژووی دەرهێناوە. لە بڕە شیعرێکیدا کە بە فارسیی هەڵبەستوە بەدوا چەند بەیتێکی مەدحدا ئەم دوو دێڕە شیعرە دەکا بە کۆتایی و مێژووی مەرگی تێدا دەردەخا. لێرەدا بەیتەکانی بە ڕێنووسی فارسی دەنووسم:

بهر تاریخ جستجو کردم
«باز الاشهب» بگریه لب بگوشد

بتاسف «محمد اغا مرد»
پیء تاریخ اینقدر فرمود

ئەم ڕستەی«محمد اغا مرد» مێژووی مردنی حەماغایە و 1338 دەگرێتەوە.

کاتێک کەوتمە سەر تۆژینەوە لە بارەی هۆی چۆڵبوونی گۆڕقەرەج گوتەیێک کەوتە بەر گوێم وای ڕادەگەیاند حەماغا دەخلێکی بووبێ لە چۆڵبوونیدا. من زۆروکەم گوتەکەم نەچوە دڵەوە، چونکە ئەگەر شتێکی وا هەبا، نەدەبوو حاجی قادر لە پاداشی ئەم کردارەدا هەڵبەستی مەدح پێشکەش بە حەماغا بکا. نامیلکەی مەلا

عەبدولڕەحمانیش کەموزۆر هۆی چۆڵبوونەکە ڕوون ناکاتەوە، هەر ئەوەندە دەڵێ کە مەولوود کوژرا گۆڕقەرەج مان چۆڵ کرد. من پرسیارێکم لەو ڕووەوە نارد بۆ مەلا ئەنوەری نەوەی مەلا عەبدولڕەحمان. ماڵی ئاوابێ بە نامە جوابی دامەوە و بۆی دەرخستم کەوا مەولوود پیاوێکی نارەحەت و بەد بوە و لە نیزاعی ناوخۆییدا کوژراوە. کەواتە چۆڵبوونی گۆڕقەرەج دەخلی کەسی بێگانەی بەسەرەوە نیە، نە ئاغا نە غەیری ئاغا، لە ئەنجامی ڕووداوێکی ئاسایی ناوخۆیی خانەوادەی مەلا ئەحمەدی گەورە چۆڵ کراوە.

لێرەدا لابەلا دیمەنێکی کۆمەڵایەتیی وڵاتی کۆیێ دێتە بەرچاوێکی سرنجدەر. جارێ بە شکڵێکی سەرپێیی ئەم دیمەنە دەخەمە ڕوو، لە جێگەی مناسبتردا بە پێی بیروباوەڕی خۆم تعلیلی دەکەم. دیمەنەکە ئەمەیە:

وەک دیار دەکەوێ بەپێی ئەوەی پێنجیەکی زەویەکانی گۆڕقەرەج ئەو سێ زەویەن کە بۆ حاجی مانەوە، ئەم گۆڕقەرەجە تا بڵێی دێیەکی بچووک بووە و چەند ماڵێکی بەخێو کردوە و بەس. وەک گۆڕقەرەج دێی دیکەش هەن لە وڵاتی کۆیێ هەر یەکەیان چەند ماڵێکی بەفەللاحی تێدایە بە حاڵ سەپان و شوان و جۆتیاری بایی پێویستی دێیەکەی لێ پەیدا دەبێ. ئەو دێیانە ئەغڵەب مڵکی فەللاحەکانن و پشتاوپشت بە میرات بۆیان هاتۆتە خوارێ بێ ئەوەی زۆردار لێیانی داگیر کردبێ. بەڕاستی سەر لەبەری قەزای کۆیێ ئەم زاهیرەیەی خوردەمالیک تێیدا دیارە و نیگا بۆ خۆی ڕادەکێشێ. زوربەی دێیەکانی ئەم ناوچەیە هی فەللاحانان نەک هی زەویداری زل. دەوجا هۆی ئەم سەربەخۆییەی فەللاحی وڵاتی کۆیێ و ڕزگاربوونی زەوییەکانیان لە دەستی زۆردار و ساماندار دەبێ چی بووبێ؟ لە شوێنی دیکەی کوردستانی گەورە بێ وەیا پارچەی کوردستانی عێراق بێ ناوناوە و لێرەولەوێ خوردەمالیک هەن، بەڵام زاهیرەکە کەم وایە هێندەی وڵاتی کۆیێ تێکڕا و فرەوان بێ.

ئەو گوتەی بەرگوێی من کەوت کە گۆیا حەماغا دەخلی بووبێ لە چۆڵ کردنی گۆڕقەرەج و نامەکەی مەلا ئەنوەر بە درۆی خستەوە، کە هیچ ئەسڵ و ئەوساسێکی نەبوو و هەڵبەسترا، لەو ڕواڵەتەوە هاتوە کەوا بە پێی دەستووری گشتی بوون و نەبوونی دەسەڵات و چاوەنوارِ کردنی دەرپەڕاندنی هەژاران لەلایەن دەسەڵاتدارانەوە دەبێ پەرتەوازەی بنەماڵەی حاجی قادر بەهۆی دەستدرێژی زۆردارێکەوە بووبێ.

کەچی ڕووداوی ڕاستەقینە نە لە گۆڕقەرەج و نە لە زۆر دێی وەک ئەو کەموزۆر لەگەڵ ئەم ڕواڵەتە و چاوەنوارِ کردنە ڕێک ناکەوێ. با ئەم پرسیارە لە بیر نەکەین و وەرامەکەی هەڵگرین بۆ کات و شوێنێکی لەبارتر.

پێویست نابینم، بۆ وەرامدانەوەی پرسیاری ئەو هۆیانەی بوونە مانیع لە دژکاریی حاجی قادر لەگەڵ ئاغاکانی کۆیێ، چیتر درێژە بدەم بە نووسینەکەم. ئەوەندەی تازە خستمە بەرچاوی خوێنەرانی ئینسافکار بەسە بۆ «تبریری»ی هەڵوەستی حاجی لە ڕۆژانی پێش سەفەری بۆ ئەستەمبوڵ. دەمێنێتەوە هەڵوەستی حاجی بەرانبەر تێکڕای چینی، بە اصطلاح »دەرەبەگ» لە کوردستاندا.

ئەم باسەش جێگە و کاتی لەبارتری هەیە، بێگومان کە گەیشتینە ئەو جێگە و کاتە تارادەی پێویست لێی دەدوێین. ئەمە لەبارەی بەڵگەی یەکەم بۆ ئەوە کە بەشداربوونی حاجی لە ژیانی کۆمەڵایەتیی ڕیزی پێشەوەی کۆیێ لە چاکە بەولاوە تێیدا نەبوە، چۆنەتی کردار و ڕەفتاری حاجیشمان کرد بە ناوەڕۆکی بەڵگەکە. ئێستاکە دێینە سەر:

**بەڵگەی دوەم**

دیتمان تا حاجی لە کۆیێ بوو لە ڕووداوی نارەوا بێدەنگ نەبوە. تۆ بڵێی لزووم هەبێ بەوە ئیسپاتی لایەنی بێعەیبی و نەترساوی و حەقپەرستی و خۆنەویستی و جوانمەردی لە ژیان و ڕابواردنی ئەستەمبوڵی بکەین؟ تا من دەنگ هەڵێنم لە خوێندنەوەی دەفتەری ژیانی حاجی لە غەریبی و نێو بێگانانداا دەنگم خۆ نانوێنێ لە تەک نەعرەتەی قارەمانانەی دلێرانەی پاڵەوانانەی خودی حاجی. لەوەی کردی و گوتی کەلەبەرێکی جوانمەردی نەهێشتەوە، ئێمە بە خێری خۆمان، بۆی پڕ کەینەوە.

بەڕاستی شەرم دەکەم خۆ بکەم بە سەرپشک لە هەڵبژاردنی گوتە و هەڵوەست و خەباتی حاجی لە ڕۆژانی غەریبیدا تا بیانکەمە بەڵگەی بێعەیبی ئەوان ڕۆژانە، نەکا ڕەخنەگری ئیمڕۆ تیری توانجی تێ بگرێ. پێی ناوێ لەسەری بڕۆم و درێژە بە قسە بدەم هەر هێندە دەڵێم ژیانی حاجی لە پلەیێکی ئەوتۆی شەرافەتدا بوە نەک تەنها ڕەخنەگر دەمکوت دەکا و بەس، بەڵکوو ڕەخنەگر و غەیری ڕەخنەگریش بەو شەرافەتە قەرزدار دەکاتەوە لە مەیدانی بێعەیبی و فیداکاری و نیشتمانپەروەریدا،

گلەیی ئەوەشیان دێنێتە سەر کەوا دەیان ساڵ تێپەڕی بە دوا خەباتی ئەودا بێ ئەوە یەکێکی دیکە وەک خۆی لەناو کوردا پەیدا بێ خۆ بکا بە مەشخەڵی دوەم بەدوا چراکەی حاجیدا.

دەوجا حاجی قادرێک تا لە کۆیێ بووبێ لە دژی کاری نارەوا ڕاوەستابێ و جەنگابێ، دوای چوونی بۆ ئەستەمبوڵیش بووبێتە ئەو پێشەوایەی نیشتمانپەروەریی و کوردایەتی کە 50 ساڵێک پێش هەنگاوی خۆی کەوتبێتەوە ئیتر لەوە پتر بەڵگەی چی بێنینەوە بۆ سەپاندنی ئەو ڕاستییە کە تێکەڵبوونی حاجی لەگەڵ ژیانی ڕیزی پێشەوەی کۆمەڵایەتیی کۆیێ و کەم و کەسرێکی بە خەبات و جمووجۆڵی هیچ قۆناغێک لە قۆناغەکانی عومری نەداوە و زیانێکی بە گیانی بلێسەدار و نەسەلمێن و سەر بە ڕەفزی نەگەیاندوە.

چارم ناچارە بۆ تەواو کردنی وێنەی تابلۆی ژیانی حاجی و وێنەیێکی بەرچاوی ڕۆژانی ئێستاکەمان بێنمەوە ناوەوە تا لە ڕێگەی بە یەکدی گرتنیشەوە ڕاستیی بێگەردی کردەوەی حاجی جارێکی دیکەش ساغ کەینەوە. بە چاوی خۆمان دیومانە گەلێک لە خەباتکەر و شۆڕشگێڕی ئەم چەرخ و دەورە لە ماڵی خزمێکی دەوڵەمەندی خۆی چایە و قاوەی گێڕاوە، واش بوە ئەو ماڵە هێندە دەوڵەمەند و دەسترۆیویێک بوە پەیوەندی خزمایەتی لەگەڵ شۆڕشگێرەکە نەبوە تاکوو سەرزارەکیش بۆی ببێ بە عوزری چایە و قاوە گێڕان. بە دوا خزمەت کردنیشدا وەک هەموو دەستوپاوەندێک لە نان و خوانی دەوڵەمەندەکەی نۆشی گیانی کردوە.

بەلای بیروڕای منەوە لەم کارەدا عەیبێک نایەتە دی چونکە کارێکی ئاسایی و ڕەوای کۆمەڵایەتی و دەستوورێکی بێگەردی بەیەکەوە ژیانە. بەڵام کە بەنیسبەت یەکێکی دیکەوە دۆستایەتی لەگەڵ دەوڵەمەند و دەسترۆییودا بە عەیب گیرا، لە چایە گێڕان و خزمەت کردن گەڕێ، ئەوسا شۆڕشگێڕ بەو خزمەت کردنە و دوو لوقمە نانە، خۆی نەفرۆشتوە و کە پێویستیی نیشتمانپەروەری وەیا چینپەروەری لێی داوا کرد، بێ دوودڵی کابرای خاوەن سفرە و شیلانت بۆ هەڵدەواسێ، بەڵام ئەم گوتەیە دوو کەلەبەری گەورەی تێدایە بە قسەسازی و فەند و فێڵی ڕەوانبێژی (بلاغە) پڕ نابێتەوە.

یەکەم، ئەو کەسەی دۆستایەتیی دەوڵەمەندانی لێ بەعەیب دەگیرێ ئەویش وەک شۆڕشگێڕەکە قسە و عوزری وای بەدەستەوەیە و دەتوانێ بڵێ منیش لە کاتی پێویست دەوڵەمەندەکە دەکەم بە قیمە بە دوا هەڵواسیندا، کەچی لێی ناسەلمێنرێ.

دووەم، هەرچەند نیشتمانپەروەری و چینپەروەری بکرێ بە بهانەی هەڵواسین وەیا ئازاردانی دەوڵەمەندەکە لەمەدا بێوەفایی و کەمفرسەتی و دڕندەییەک هەیە نە بەر هیچ «توجیە»ێک دەکەوێ و نە بە وشەسازیی و ڕەوانبێژیش دەسڕێتەوە. دەبێ لایێک لەو دوو لایەنە نەکرێ. یا نانی کابرا نەخورێ یا کابراکە هەڵنەواسرێ. کۆ کردنەوەی ئەم دوو کارە «متناقض»ـە هەرگیز دروست نییە، سەرەڕای دروست نەبوونی پێوستیش نیە. ئیمکان هەیە تەناقوزەکە نەهێڵرێ لە ڕێی کەم کردنەوەی تیژڕۆیی «تطرف»ـەوە.

گیانی شۆڕشگێڕی و سوودی گشتی و میللەتپەروەری پەکی لەسەر ئەوە نەکەوتوە خاوەن چاکە هەڵواسرێ. پیاوێک کە بە پێی دەستووری کۆمەڵایەتی لەوانە بوو خزمەت بکرێ با خزمەت بکرێ، هەر بە هەمان دەستووریش بیر لە هەڵواسینی نەکرێتەوە.

بەهەمەحاڵ، حاجی قادر خزمەتی هیچ دەسترۆیوییێکی نەکردوە، بە چووکایەتیش نانی هیچ کەسی نەخواردوە. خۆی لە خەڵق بەکەمتر نەگرتوە تا خزمەتیان بکا. لە شیعریشدا ئەگەر بە «تواضع» خۆی شکاندبێ پەیڕەوی دەستوورێکی ئەدەبی کۆنی شاعیرانەی کردوە. خولاسە لە هەر لایێکەوە سەیری ژیان و ڕابواردنی کۆیەی بکەیت و بە هەر ڕوێکدا ئەم دیو ئەو دیوی بکەیت لە مەردایەتیی بەولاوە تێیدا نادۆزیەوە.

ئەم تێکەڵبوونەی حاجی لەگەڵ ژیانی دەسەڵاتداران سەرەڕای ئەوەی کە لە سوود بەولاوە تێیدا نەبوە لە هەمان کاتیشدا بایی تۆسقاڵێک پەیوەندی حاجی لەگەڵ زوربە و زۆرینەی میللەتدا کەم نەکردۆتەوە. بەشی هەرە زۆری کاتی خۆی وەک فەقێیەکی مزگەوت و بێماڵێکی شارەکە ڕابووردوە شریتەی بوون و ژینی لەگەڵ هی خەڵق تێکئالاوە. نەک هەر هێندە و بەس بەڵکوو بۆ سوودی ئەو خەڵقە یەخەی پیاوی بەدی گرتوە و دژی کردەوەی چەوت وەستاوە، بۆ خودی خۆی ئەوەی بەرژەوەند بێ لەو هەڵوەستانەیدا نەبوە، بە پێچەوانە ئەو هەڵوەستانە هەموو

بەرژەوەندییێکی حاجی پامالٚ کردوە. باسی ئەوەمان کرد کەوا بە درێژایی ژیانی لە کۆیێ نەبوە بە خاوەنی کۆلٚیتە خانوویێک وەیا هۆیەکی گوزەرانی ئاسوودە.

بێگومان بەردەوامبوونی نەداری و دەستکورتیی حاجی بۆ خۆی بەلٚگەی هێندێیە کەوا لەبەر سروشتی حەقپەرست و خەباتی بێوچانی دژی کاری نارەوا دەرفەتی نەبووە بیر لە وەزعی خۆی بکاتەوە. دیاریشە ئەو هەولٚ و تەقەللایەی بۆ سوودی میللەت بوە چونکە کە سوودی شەخسی هاندەر نەبیٚ بۆ یەخەگرتنی پیاوی بەد هاندەرێک نامێنێتەوە چاکە و مەسلٚەحەتی خەلٚق نەبیٚ، خۆ وەک سانکۆپانزا و دۆنکیشۆت بە خەیالٚ و وڕێنەی پالٚەوانپفی یەخەگیری «ئاشی با» نەبوە.

ئائەمەیە پوختەی ژیانی خوێندن و فەقێیەتی و گوزەران و ڕابواردنی حاجی لە تەمەنی جحێلٚی و سەرەتاکانی خوێندنی لە کۆیێ کەوا دەماودەم پێمان گەیوە، شایەدی بەهێزیش هەم لە دیوانەکەی و هەم لە هاوچەرخانی بە قسە و نووسین پشتگیریی لیٚ دەکا.

حەزم بەوە دەکرد جۆگەلەییێکی «بیانی» پێکهاتبا ڕێبازی بزووتنەوە و مامۆستاگۆڕیی و دۆستایەتی بەستن و خۆشویستن و ڕق لێهەلٚستان و جۆری گوزەران و هەموو لایەنێکی ژیانی ڕۆژانەی حاجی قادری نیشان دابا وەک وێنەی فۆتۆغراف یا فیلمی سینەما ئەوەی نهێنی و نادیارە لەبەر چاوی ئێستامان بیخستبا بەر تیشکی نوێژی نیوەڕۆ و هەموو ئارەزۆمەندێکی دلٚنیا کردبا، بەلاٚم داخەکەم ئەوە و نیوە و سێیەکیشی لە ئیمکاندا نیە. هەر مەعلووماتێکی هەمانە پچڕ پچڕ و کەمتاکورت و ناتەواوە.

لە هەموو بوون و ژین و چەند و چۆنی حاجی دیوانەکەی کە بە ناتەواوی پڕ لە هەلٚە پێمان گەیشتوە دەولٚەمەندترین شوێنەوارێکە لێی بەجیٚ مابیٚ. بەڕاستی مەیل و ئارەزۆی من لە خەریکبوون بە باس و تۆژینەوەی سەربە مرۆڤەوە بۆ ئەوە دەچیٚ بزانم ئەو مرۆڤە لە واقیعی ژینیدا چۆن ڕواوە و گەشەی کردوە و بەری گرتوە... کام شەپۆل هێناوەتی و بردوەتی، کام سەرچاوە ڕژاوەتە ڕووباری گیان و بیرییەوە... لە چ هەوایێک نەفەسی وەرگرتوە... دلٚی بۆ کیٚ و کویٚ ڕۆیشتوە و بەچی کراوەتەوە.

خۆشی و لەززەت لە تۆژینەوە دەربارەی مرۆڤ ئەوەیە بەهۆی وەدەستهێنانی ڕاستییەکان و ڕووداوەکانی ژیانی، گیان بێنیەوە بەر وێنەی و گوێت لە خورپەی

دەروونی بێ و هەست بە تەوژمی دڵی بکەی... ببینی لە منداڵییەوە بەرەو گەنجی تێهەڵدەکشێ و مووی لێ دەڕوێ و سمێڵی قنج دەبێ - کە مرۆڤەکە پیاو بێ - و سەرەتاتکە لەم کۆڵانە و لەو کەلێنە دەکا، خولاسە بیکەیتەوە ئادەمزادێکی ئاسایی وەک ئەوانەی لە دەوروبەری خۆتن و لایەنی ئاشکرایان هێندە زۆرە نهێنیەکانیشیان پێوە ئاشکرا دەبن.

بەنیسبەت یەکێکی وەهاوە کە بیناسیت، چەند وەزعێکی دڵشکێن دەبێ لە تەمەنی 10 ساڵیەوە نەیبینی، تا دەگاتە 20 ساڵییە ڕەنگە کەسێکی دیکە بێ. ئەگەر هەمان مێردمنداڵەش بێ لە واقیعدا، لە ناخی دڵی تۆدا هەو نییە. دە ساڵی دوورودرێژ بە هەموو ڕووداو و گۆڕان و نشێو و سارد و گەرمییەوە کە لە میانی وێنەی ناو دڵی تۆ و ئەم گەنجە «خوێن و گۆشتە» دایە، بوە بە دیواری لە یەکدی جودایی و بێگانەیی[11]. تا ئاشنا نەبیت بە گوزارشتی ئەو دە ساڵەی عومری هاوڕێکەی منداڵیت و ئەو ئاشناییەتییەت پردێکی زیهینی دروست نەکا لە میانی هەردوو وێنەی منداڵی و گەنجایەتی کە بەرەو یەکدی بەسەریدا بپەڕنەوە و تێکەڵی یەکتر ببنەوە، وێنە و ئەسڵ، خەیاڵ و مادده وەک دوو کەسی جودا دێنە بەر هەستت. مرۆڤی مردووش وەک هی زیندوو وایە. تۆ کە خەریکی دیراسەی مرۆڤێکی سەد ساڵ پێش ئیمرۆ بوویت و قۆناغێکی عومریت بۆ ئاشکرا بوو، بەدوای ئەو قۆناغەدا پازدە ساڵێکی عومری بە نەزانراوی مایەوە ئیتر ئەویش لەبەر چاوی »تصور»ت وەک دوو تارمایی لەیەکدی جودا خۆ دەنوێنن.

بە نموونە دیوانی حاجی قادر بگرە و سەیری ناوەڕۆکی بکە، چ لە لانی واتا، چ لە لانی داڕشتن و چ لە لانی بیروباوەڕەوە بێ هەر دەڵێی دیوانی چەند شاعیرێک دەخوێنیتەوە نەک یەک شاعیر، چونکە شیعرەکانی لە هەموو ڕوێکەوە بایی ئەوەی هی چەند شاعیرێک بن لە یەکدی جودان. نە بە تەواوی و نیوە تەواویش، ئاگاداری گوزارشت و کەینوبەینی قۆناغەکانی عومری حاجیت تا لە ڕێی بەیەکدی گرتنی واتای شیعرەکان لەگەڵ داخوازیی گوزارشاتەکە بتوانیت قەسیدە و غەزەلەکانی

---

[11] - تا ئێستا نایابترین نووسینێکم خوێندبێتەوە دەربارەی نەگونجانی ژیان لە زەرفێکی غەیری ئەو زەرفەی تێیدا قاڵب گرتوە بوە چیرۆکە درێژەکەی «توفیق الحکیم«ـە لە ژێر ناونیشانی «اهل الکهف».

بکەی بە پلەی یەک لە دوا یەکی پێپلیکەییێک و پەیوەندی ناوخۆییان بدۆزیتەوە، نە هیچ لیستەییێکی زەمەنیت بە دەستەوەیە مێژووی هەڵبەستنی شیعرەکانت بۆ ڕوون کاتەوە تا بەهۆی زانینی ڕێچکە و هاتنی یەک لەدوا یەکیانەوە پێگەیشتن و تکاملی لەسەرەخۆی حاجی لە شیعرەکانیدا بناسیەوە.

بەڕاستی کاتێک شارەزا دەبی لە حاجی و ئەدەبی حاجی، کە مێژووی ژیانیشیت زانیبێ و لیستەی زەمەنی شیعرەکانیشت بە دەستەوەبێ چونکە ئەوسا بە تەواوی خزمایەتی میانی هەر شیعرێک و ڕووداوێک لە ژیانی دەدۆزیتەوە و لە «تخمین» و هەڵسەنگاندن و بەراوردی کردنی دوو بەختی ڕزگار دەبیت. هەرگیز «تخمین و یقین»وەک یەک نابن.

بەداخەوە ئەغڵەب شاعیرەکانی سەدەی نۆزدەمی کورد وەک حاجی قادر، نە لەدایکبوونی شیعرەکانیان و نە زەرفی ماددیشیان لە کاتی دانانیان بە سەروسۆراغە، بۆیەیە کە دیوانی یەکێکیان دەخوێنیەوە دەبینی بە شێوەییێکی مەتەڵاوی نامەفهوم لە ڕووپەڕەییێکی دیوانەکەی خەریکی تصوفە لە هی دوای ئەودا کفران دەکا ئەوجا دەبێ بە عاشق، نەختێکی تر شکایەتییەتی لە دەست کۆلنج... هۆی ڕیزبوون لەتەک یەکدی و دراوسێی هەڵبەستەکانیش هەر ئەوەیە دواپیتی قافیەیان، با بڵێین «ش» یە یا «واوە».

ئێمە لە لانی خۆمانەوە یارمەتی ئەو دیوانانە دەدەین و دەڵێین شاعیر لە هەموو باغێک گوڵ دەچنێ، دەبێ دیوانیشی وەک دەستەگوڵ وابێ، سوور و زەرد و مۆرد تێکەڵ بن. بەڵام دڵخۆش کردن بە گوتەی وەها بێنیازمان ناکا لە زانینی کات و زەرفی دانانی ئەو هەڵبەستانە کە وەک کەشکۆڵی دەروێش وان، لە هەموو چێشتێکی تێدایە...

چاک ڕێککەوت ئەم کەشکۆڵەی دەروێش هاتە بیرم چونکە دەست دەدا بۆ ڕوون کردنەوەی مەبەس لەو ڕووەوە کە نەک هەر هەڵبەست، بەڵکوو کەشکۆڵی دەروێش و کاسەی سواڵکەریش حیکایەتێکی خۆش دەگێڕنەوە ئەگەر بزانین فلانە چشت و فیسارکە خواردەمەنی لە کام ماڵ و کام جێگەوە تێیان کەوتوون... ڕەنگە بەمەدا بتوانین وەک لیستەی چێشتخانە لیستەیێک ڕێک خەین چێشتی خانەوادەکانی گەڕەکێکی سەرلەبەرمان بۆ بخوێنێتەوە بۆشمان دەردەکەوێ چەند خانەوادە

چێشتیان نەداوە بە دەروێش و سواڵکەر یا لەبەر دەستکورتی یا بەرچاو تەنگی یا هەر هۆیەکی دیکە بێ.

دەتوانم بڵێم لە دیراسەی ژیانی یەکێکی وەک حاجی یا نالی یا وەفایی وەیا هەر شاعیرێکی وەک ئەمانە کە پەردەی نەناسراوی کەوتۆتە سەر ژیان و ڕووداو و گوزارشتیانەوە، دەرخستنی نهێنیەکانی ژیانیان و جۆری پەروەردەبوونی خۆیان و چارەنووسیان و هۆی بزاوتنەوەی هەستیان بۆ دەربڕینی واتای جۆری شیعرەکانیان... ئا ئەم لایەنانە گەلێک گرنگترن لە شی کردنەوەی هەڵبەستەکانیان چونکە بەشی زۆری واتای شیعرەکانیان بە خوێندنەوەی سادە دەزانرێ. خۆ شیعرەکانی حاجی قادر دەربارەی کورد و کوردستان و گیانی کوردایەتی هێندە سادە و ئاشکران، مەگەر هەڵە لە نووسینەوەیان هەبێ دەنا لەوانەن پێویستیان نەبێ بەشەرح دان و شی کردنەوە، چونکە دەبێتە «تحصیل حاصل»، لەگەڵ ئەمشدا حاجی بۆ خۆی نەناسراو و بێ سەروشوێن دەمێنێتەوە ئەگەر بە تایبەتی و بە وردی خەریکی وەدەستهێنانی ئەو چەند و چۆنیەی نەبین کە حاجیمان پێ دەناسێنێ.

لێرەدا بێگومان مەبەستم ئەوە نیە نرخی هەڵبەستەکانی کەم کەمەوە، چونکە دیارە ئەگەر نرخی هەڵبەستەکانی نەبوایە بیریشمان لە ژیان و گوزارشتی نەدەکردەوە، ڕەنگ بوو هەر ناویشمان نەبیستبا چ جایی ئەوەی بچینە سەر باس لێ کردن و پێوە خەریکبوونی. مەبەستم ئەوەیە کەوا لە واقیعدا شیعرەکانی ئەوەندەی هەن وا لەبەر دەستمانن و ماناشیان بە زۆر ئاشکرایە، هەر ساتێکیش بمانەوێ دەتوانین بە حینجەیی لێیان بکۆڵینەوە تا ئەگەر هی واتا نەزانراویشیان تێدا بێ بە خەریکبوون و پرسین و تۆژینەوە و هاریکاری شیعردۆستان واتاکانیان دەربخرێن، بەڵام ئەمانە هەمووی و چەندین هەندەش لە شی کردنەوەی شیعرەکانی بێنیازمان ناکا لە ئاشنابوون بە سەرگوزەشتی ژیانی. کاتێک کە سەرگوزەشتەکەشمان زانی، ئەوساش شارەزا نابین لە حاجی قادر و ئەدەبەکەی ئەگەر بە شێوەیەکی متمانەبەخش مێژووی لەدایکبوونی پارچە هەڵبەستەکانی نەزانین بە تایبەتی ئەوان هەڵبەستانە کە زادەی ڕووداو وەیا زەرفی تایبەتین. لە ڕێچکەی ئەم نووسینەوە ناوەناوە ئەم ڕاستییەت بۆ دەردەکەوێ بەوەدا کە زانینی سەرچاوەی هەڵبەستێک چ ڕوحێک دەخاتە بەر هەڵبەستەکەوە و دەیکاتەوە بە هەناسە و فڕکەی دەماری حاجی.

چەند خۆشە ڕابردووی لە دەست چوو، لە ڕێی ژیاندنەوەی بیرەوەری یەکێکی وەک حاجی سەر لەنوێ بیهێنیەوە سەر شانۆی ژیان و دووبارە گیانی بخەیەوە بەر، مێژووناس کەم وایە بەوە ڕابگا مێژوو بکاتەوە بە چیرۆکێکی زیندووی سەر شانۆی ڕۆژگاری ئێستاکە. لەبەر فرەوانی مەوزووعی پێوەخەریکبوونی هەر هێندەی پێ دەکرێ گوزارشتەکانی گۆڕستانی مێژووت بۆ بگێڕێتەوە، ڕێکخستن و نیشاندانی ڕابردوو وەک فلیمی سینەما کاری هونەرمەند و نووسەر و چیرۆکنووس و شانۆگەرییە.

بەینێکە لە خوێندنەوەی کتێب و ناملکە و گوتار دەربارەی ئەدیب و شاعیر، وەیا دەربارەی هەر مەوزووعێک بێ، مەیلی ئەوەم داناوە نووسەر لێم ببێ بە مامۆستای فێرگەی ناوەندی و بەنیسبەت ئەدیب و شاعیرەوە هەر هێندەم شناسایی بۆ پەیدا بکا نموونەم بۆ بێنیتەوە لە جۆری بەرهەمیان و بە خێری خۆی پێم بڵێ ئا ئەمە دینداریەکەی و ئەمە حەقپەرستییکەی و ئەمەش بانگهێشتنەکەی بۆ ئازادی و ئەمەش نازانم چییەکەی. دیراسەی ئەدیب و شاعیر کە هێنانەوەی نموونە بێ لەو بەرهەمی هەیەتی ئەوا سەدی حەفتا و هەشتای ئەرکی دیراسەکە دەچێتە ئەستۆی ئەدیب و شاعیرەکە خۆی، سەدی بیست و سیش کە دەمێنێتەوە بۆ ئەرکی نووسەر، لەوانەیە بەشێکی زۆری بێ لزووم بێ و بەو مانایە کە شتی ئەوتۆن بەر لەوە نووسەر خۆی پێوە ماندوو بکا خەڵقیش زانیویانە.

بەڵێ وا دەبێ بەرهەمێک شیعر یا پەخشان بێ جوانییەکی لە واتا نهێنیەکانیدا دەبێ و زانینیان زاخاوی مێشک دەدەن و دڵ دەکەنەوە بایی ئەوەی کە زانینی جۆری تفاعلی هونەرکار لەگەڵ سروشت و دەوروبەری خۆی سوود دەگەیەنێ بە خاوەن دیراسە وەیا خوێنەر. هەڵبەت لە حاڵی وەهادا شی کردنەوەی نووسین و هەڵبەست و کاری هونەری لە خودی خۆیدا و بێ تێبینی زانینی مێژوو و زەرفی بەرهەم هێنانیان بایەخێکی گەورەی دەبێ، لەوانەیە دەرخستنی واتاکان هێندە جوانی دەربخەن پەکی لەسەر ئەوە نەکەوێ ناوی خاوەنەکەش بزانرێ، وەک ئەوەی لیرەیێکی زێڕ بدۆزیەوە و ناوی خاوەنی توڕڕەکەی نەزانی. لیرە هەر لیرەیە. بە میساڵ دەڵێم زۆر لە شیعرەکانی شاعیرێکی وەک نالی لەو بابەتەن. تۆ بزانە مانای ئەم دێڕە شیعرە چیە:

نەقشی دوو موویی بە دوو ڕوویی دەبێتە عەیبی شەیب
ئایینەکە ڕووپاکییە ڕووناکییە نوور و «شمط»

گەردنت ئازاد بێ زانینی کات و زەرفی هەڵبەستنی... من هەر ئەوەندە تێبگەم «ئەلبێر کامێ» لە کتێبەکەی «ئەفسانە سیزیف« چ دەڵێ ئەوەی لانی کۆمەڵایەتی و چاکە و خراپە و »هونەر بۆ هونەر بۆ گەل» و کات و زەرفی دانان و هەرچی دیکەی سەر بەم کتێبەوە هەیە لە بیر خۆمی دەبەمەوە... وەک ئەمیش زوربەی نووسینی وجودی و ڕەمزییەکان و وێنە و پەیکەری سوریالیستەکان. بەڵام بە جۆرێکی گشتی و لە غالِبی حاڵدا نرخی نووسین لە بارەی مرۆڤی هونەرکار و نووسەر و بویژ لەوەدایە زەرفی ئاوسبوونی مێشک و هەست و نەفسی بە واتایانە کە لە بەرهەمەکانیاندایە دیاری بخرێ و ڕایەڵی ئەو قوماشەی کە بەرگی بوتی مەعنای لێ هۆندراوەتەوە هەڵوەشێ و بگەڕێتەوە بۆ ماددەی ئەسڵی دەوجا ئەو ماددەیە کەتان بێ یا لۆکە یا ئاوریشم.

شاهکارێک کە ببێتە نموونەی نزیکە دەستی خوێنەرێکی کوردی عێراق بۆ ئەم مەبەستەی تازەی خستمە ڕوو کتێبەکەی «عباس العقاد»ە بە ناونیشانی «إبن الرومي: حياته من شعره» کەوا چل ساڵێک دەبێ نووسیوەتی و کاتی خۆی لە ناو ئەدیباندا دەنگێکی زلی دایەوە. بەڕاستی ئەگەر ئیمکان هەبێ و هێزی مێشک و قەڵەم یارمەتی بدا، ساغ کردنەوە و لێکۆڵینەوە و ڕوون کردنەوە وا دەبێ کە «عقاد» لەو کتێبەدا کردوەتی. نەبێتە ناشکری سەردەمێک نووسینی کوردی هەربۆیە دەشیا بێتە کۆڕی خوێندەوارانەوە چونکە مەتەڵ گوتەنی کە مەلا نەبێ کەڵەباب دەبێتە بلقاسم.

زۆر بە خۆشییەوە دەڵێم لەو 10-15 ساڵەی دواییدا نووسینی ڕێکوپێک و دەوڵەمەند بەڕادەیێکی دڵگوشاد بڵاو دەکرێتەوە و هێندەی تا ئێستا خراوەتە بازاڕی ڕۆشنبیرییەوە لێی دەوەشێتەوە ببێ بە سەرەتای هەنگاوی ڕاست و دروست بۆ گەشتێکی پیرۆزی بەرەو پێشەوەی کوردەواری لە جیهانی خوێندەواریدا. نەبوونی نووسینی قاڵ و دەوڵەمەند لێرە بە پێشەوە ئەنجامێکی ئاسایی وەزعی کورد بوو کە ئەم فەردەی مەلای گەورە بە چاکی وێنەی کێشاوە:

هەواڵی کورد و کوردستان دەپرسی؟
وڵاتی چۆل و قەومی ڕووت و برسی

ژمارەی هەموو دانیشتوانی کوردستانی عێراق نەدەگەیشتە سەر ژمارەی شارێکی مامناوەنجی و بەقەدەر ڕاستە شەقامێکی مەیلەو قەرەباڵغی یەکێک لە شارە چالاکەکانی ئەورووپا خوێنەری کتێبانی تێدا نەبوو. تێکڕای سەرمایە و سامانی کوردیش بەقەدەر سەرمایەی کۆمپانیاییێکی زلی ڕۆژئاوای پێک نەدەهێنا. ئیتر لە کوێوە نووسینی قووڵ هەڵقوڵی و لە کوێوە ژمارەییێکی ئەوتۆ لە خوێندەواران بێنین چاپەمەنی کوردی بەڕێوەببەن؟ قسەم لێرەدا بۆ تێکڕای وەزعەکەیە دەنا وا بوە ناوناوە نووسینی نرخدار لە هەڵبەست و پەخشان بڵاو دەکرایەوە. بێگومان ئەم تاقمە نووسینە نرخی خۆیان پێ دەدرێ ئەگەر ئیمرۆش نەبێ لە دوارۆژێکی نێزیکدا.

لەبەر تاوی گیانی تازەی پڕ «جدیەت»ی نووسینی کوردی و بەهۆی مەیلێکی شەخسی خۆم بۆ وردبوونەوە لە نووسیندا و سەبارەت بە گرنگی شەخسیەتیی حاجی قادر و پایەی بەرزی لە گیانی نیشتمانپەروەریی کوردایەتی، سەرەڕای ئەمانەش هەمووی لەبەر ڕێزگرتنم لە خوێنەری کورد کەوا لە پلەی سادەیی و عاتیفی سەرکەوتوە و بە شانازییەوە دەوری هەرزەکاری (مراهقە) ی سەقافی تێپەڕ کردوە، ئەم نووسینەم بۆ ڕواڵەت و چاولێکەریش بێ ڕیش و سمێڵێکی «وقار»ی بە دەم و شەویلەیەوە بەستوە و چاویلکەی ئوستادی خواستۆتەوە و وەکازێکی کامڵی بە دەستەوە گرتوە و بە تەکاندان و پشوو خواردنەوە سەرەو هەوراز کەوتۆتە ڕۆیشتن لە ڕێبازی سوارچاکاندا.

تا ئەم هەڵوەستەی نەفەس هەڵکێشانی حەسانەوە، بەپێی دەسەلاتی تەعبیر و یارمەتیی کەرەستەی نووسین و لێکۆڵینەوە، لە دەوری منداڵیی حاجی قادرەوە هەڵکشاین بۆ سەردەمی فەقێیەتی و ڕابواردنی ڕۆژانەی لە کۆیێ. لە چەند کولانە و ڕۆشنەییێکی ئەخباری حاجی قادر و وەزعی کۆمەڵایەتی و ئابووریی سەر بە سیاسەتی ئەوسای کۆیەوە، بایی پێویستی مەوزووع، شەوقێکی ناوەکی (داخلی) مان خستە زەرفی بوون و ژیان و پەلەفڕەی سەرەتای گەنجایەتی حاجی.

بێگومان چەندین جار زیاتر لەوەی تا ئێستا من بەیانم کرد پێویستمان بە ڕوون کردنەوە و لێکۆڵینەوە هەیە بۆ یەکدی گەیاندنەوەی دوو کەوانەی دەوری باسەکەمان تا بینە جغزێکی تەواو و باوەش بە هەموو ڕاستی و واقیعی ئەو سەردەمەدا بگرێ. بەڵام داخەکەم لە وەزعی ئێستاکەی خۆم و گشتیدا هەر ئەوەندە ئیمکان بوو. گەلێک بەرهەڵستی بێ عەلاج لە لانی شەخسی و ماددییەوە هاتوونە بەر هەنگاوم و ڕێبازی بزووتنەوەی بەستوە. بێ ئەوە شەرح بدەم دەڵێم جارەهای جار وابوە لە سفت و سۆی زەرفێکی تایبەتی کە تێیدا ژیاوم وشە لەسەر نووکی خامە وشک بوە وەک فرمێسکی قەتیس ماو... لە هەندێ باریشەوە هەڵکەوتی سیاسی و کۆمەڵایەتی ئیمڕۆی وڵاتەکەمان مەودای لێ کورت کردومەوە بە جۆرێک نەتوانم جڵەو بۆ خامە شل کەم تا لە گوێرەی توانایی خۆی هەنگاو هەڵێنێ. بەو ئومێدە کە لە وەزعێکی لەبارتری دوارۆژدا بتوانم هەندێ کەموکوڕی نووسینەکەم ببرم چاو لە عەیبی خۆم دەپۆشم و بە ناچاری دیخەمە پشتگوێ و بەرەو پلەیێکی نوێی ژیانی حاجی سەر دەکەوم لە دوای دەوری سەرەتای فەقێیەتی و ڕۆژانی گەنجایەتی لە کۆیێ.

کۆتایی ئەم قۆناغە لە عومری حاجی قادر بە سەفەرەکەی باڵەکایەتی و لەوێوە بۆ کوردستانی ئێران دێ.

ڕەنگە پێویست بەوە نەبێ بڵێم، سەفەرەکەی بۆ مەبەسی خوێندن بوە نەک تیجارەت وەیا سەیران وەیا گوزەران وەیا هەر مەبەستێکی دیکە کە بە بیری مرۆڤدا دێ.

گەشتی گەرمێن و کوێستان و خواروژووری فەقێی کورد بۆ نیازی خوێندن دیمەنێکی زێدە بەرچاو و پڕ جموجۆڵی دەورانی لەمەوپێش بوو. ئەم گەشتە تا 20 ساڵێکیش لەمەوبەر بە زۆری دەدیترا هەرچەند ئەوساش بەینێک بوو دەستی کردبوو بە کزبوون و کەمبوونەوە. لزووم نابینم بکەومە سەرباسی هۆی ئەم کزبوونەی خوێندنی فەقێیەتی و خوێندنی مزگەوت. بەنیسبەت حاجی قادرەوە وەک خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و کۆتایی فێرگەکانی ئیمڕۆیە بەنیسبەت قوتابی ئەم چەرخە.

لەگەڵ ئەمەشدا، واتە هەرچەند باسی فەقێیەتی و گەشەی جارانی و کزبوونەوەی ئێستاکەی پەیوەندی ڕاستەوخۆی لەگەڵ باسی حاجی قادر نەبێ، لایەنێکی «جغرافی» لە گەشت و گەڕانی کۆنینەی فەقێیانەی تێدا بوە. ئێمە کە خەریک بین باسی حاجی بکەین وەک یەکەم چرای نەتەوایەتی، ڕەوا نیە چاو بنوقێنین لە دیاردانی تارمایی هەستی نەتەوایەتی لە گەشتی فەقێیان بە هەموو لایێکی کوردستاندا، هەر نەبێ لەبەر ئەوە کە حاجی خۆی فەقێ بوە و گەشتی بە چەند هەرێمێکی کوردستاندا کردوە بۆ خوێندن.

دەبا بزانین ئەم لایەنەی «جغرافی» و ڕاگەیاندنی هەستی نەتەوایەتیی تێیدا چۆن بوە؟

هەر وەک گەشتەکەی حاجی قادر بۆ باڵەکەتی و کوردستانی ئێران بوە، نەک بۆ ناو تورک و عەرەب و فارس، زوربە و زۆرینەی گەشتی فەقێیەکانی دیکەی کوردیش هەر لە پەراوێز و سنووری کوردستاندا بوە، واتە «جغرافیە»ی گەشتەکانیان بە تێکڕایی نەخشەی کوردستانی کێشاوە هەرچەند سیاسەتی نێوان دەوڵەتانیش خۆی نەناس کردبێ لەو نەخشە و سنوورە.

بێگومان بوونی بزووتنەوەیێکی بێ خوتتە و پیلانی فەقێیان لە هەموو خاکی کوردستاندا و بە جۆرێکی دائیمی و بە قەڵەباڵغی و لەسەر ئەرکی خەڵقەکەی کوردەواری، بەڵگەی بوونی گیانێکی ئاشنایی و خۆیایەتی و یەک ماڵییە، ئیمکان نییە پەیدا بووبا ئەگەر خەڵقەکە و فەقێیەکان هەموویان کورد نەبان و هەستیان بەو «یەکبوون»ـە نەکردبا. هەست بە «کوردبوون» کردنیش لەم «مێوانەتی» فەقێ و «خانەخوێیەتی» خەڵقەکە ئەوەندە بەهێز بوە سنووری نێوان قەڵەمڕەوی ئێران و عوسمانلی نەیتوانیوە هەستەکە کەرت کا. تەنانەت کە هەردوو دەوڵەت شەڕیشیان لەگەڵ یەکتر کردوە فەقێی ژێر دەستی عوسمانلی هاتوچۆی خوێندنی هەر کردوە بۆ ناو کوردی بەردەستی ئێران و بە پێچەوانەوەش. هەردوو دەوڵەتیش لە لای خۆیانەوە بە جۆرێکی واقیعی بێدەنگ و بگرە بەردە دانیان بەو «کوردایەتی»یەدا هێناوە و لێی بێدەنگ بوون.

جێی خۆیەتی لێرەدا بەڵگەیێکی نووسراوی مێژوویی بخەمە بەرچاوی خوێنەر کەوا وەک ئاوێنە دیمەنی هەستی نەتەوایەتیی دەداتەوە لە خوێندنی کۆنینەی نێوان فەقێیانی کورد. فەرموو لەگەڵ مندا، خوێنەری کورد، وەقفنامەی حاکمی بابان «عەبدولڕەحمان پاشا» بخوێنەوە کەوا بەسەر کتێبە دەستنووسە نایابەکەی «صحیح البخاري»یەوە نووسراوە لە ساڵی 1211ی کۆچی واتە 177 ساڵ پێش ئیمڕۆ، کە ئەوسا هێشتا کوردی گوتەنی، لە کدولەی تەڕیشدا فەلسەفە و فێرگە و پارتی سیاسی نەهاتبوونە ناوەوە خەڵقی فێری کوردایەتی بکەن. کوردایەتییێک هەبووبێ و کرابێ بە شکڵێکی ئاسایی و عەفەوی لە دڵ و دەمار و دەروون و خوێن و مێشکانەوە تین و تاوی خۆی داوەتەوە. لە دوای پێشەکیەکەی وەقفنامەکە[12] ئەمە دەخوێنێتەوە:

«فها انا قد وقفت ذلك الكتاب وقفا صحيحا شرعيا على العالم الرباني و العارف الصمداني ملا عبدالرحمان الجلي ثم على اولاده الذكور الأفقة ما تناسلوا بطنا بعد بطن ثم على اولاد اخوته الاعلم ماتو الدوا ثم على عشيرته الاعلمين ثم على العلماء الذين كانوا في ناحية كردستان من الموصل الى بغداد و سنندج وجعلت ثوابه هدية وتخفة لضريح افضل الكائنات وخلاصة الموجودات عليه افضل الصلوة واكمل التحيات رجاء ان يشفع لي يوم العرصات وجعلت مثل ثوابه تحفة لروحي والدي و اخي المرحومين انا الراجي عفو ربه الكريم عبدالرحمان پاشا.»

**مۆری**

**عەبدولڕەحمان پاشا**

---

[12] - زەنگۆکرافی وەقفنامەکە لە یەکەم ژمارەی گۆڤاری «کۆڕی زانیاری کورد»دا بڵاو کرایەوە، لەم نووسینەڕا بۆ گۆڤارەکە گوێزرایەوە.

## وێنەی وەقفنامەکە

بسم الله الرحمن الرحيم الحمد لله الواقف على الجليات والخفيات العالم بالكليات والجزئيات والصلاة
والسلام على رسوله المؤيد بأوضح البينات وأبهر المعجزات وعلى آله وأصحابه الذين حازوا قصبات
السبق في مضمار المسابقة للخيرات أما بعد فلما أنعم الله علي بأن جعلني من أمة من كان علة
غائية لإيجاد النشأتين وسببا لانتظام الكونين صلعم ولما وقع في قلبي محبة أصح
الكتب بعد كتاب الله المجيد وهو كتاب صحيح البخاري الذي اشتمل
على كلام تلك العلة فقد ألزمت على نفسي استنساخ واشتراء ذلك الكتاب
ما أمكن رجاء لشفاعة صاحبه يوم الحساب فها أنا قد وقفت ذلك الكتاب
وقفا صحيحا شرعيا على العالم الرباني والعارف الصمداني ملا عبد الرحمن الجلي
ثم على أولاده الذكور المتقين فالأتقى منهم ما تناسلوا بطنا بعد بطن ثم
على أولاد إخوته الأعلم فالأعلم منهم ما تناسلوا ثم على عشيرته العالمين
ثم على العلماء الذين كانوا في ناحية كردستان مدة
الوصول إلى بغداد وسنبح وجعلت ثوابه
هبة وتحفة لضريح أفضل الكائنات
وخلاصة الموجودات
عليه أفضل الصلوات
وأكمل التحيات
راجيا
أن يشفع لي يوم العرصات وجعلت مهملا فليحفظه لروحي ووالدي وأخي المرحومين أنا الراجي عفو ربه الكريم

عبد الرحمن باشا



وێنــەی وقفنامەکە

## دوا لاپەڕەی کتێبەکە

عن أبي زرعة عن أبي هريرة رضي الله عنه قال قال النبي صلى الله عليه وسلم كلمتان حبيبتان
إلى الرحمن خفيفتان على اللسان ثقيلتان في الميزان سبحان الله وبحمده سبحان الله العظيم

الحمد لله الذي علم بالقلم علم الإنسان ما لم يعلم والصلوة والسلام على رسوله الهادي للعرب والعجم وعلى آله وأصحابه مصابيح
الظلم ومجاليح الكرم وبعد فقد اتممت بعون الله الملك الباري هذه النسخة من كتاب صحيح البخاري امتثالاً
لأمر من أوجب الله علينا اطاعة أمره واشتغالاً بخدمة من فرض الله علينا أداء شكره أعني به حضرة من أنام
الأنام في ظل الأمن وسد بسياسته طرق العدوان على يأجوج الزمان وأفاض على أهل الفضل
سجال الأفضال والإحسان حتى استقبلت من أياديه أيدي الفقراء إلى السماء واستوطنت
من لطف نواله الأفواه على الدعاء والرجاء لا زال ظلاً على رعيته ظليله [illegible] مستظلاً
بحمايته إياه وهو الأمير الأعلى والسلطان الأسنى زبدة نتيجة الخواقين العظام
خلاصة سلالة السلاطين الكرام [illegible] محمود پاشا
يسر الله له من الخير ما يشاء فاستراح القلم من نسخه سلخ شهر
رمضان المبارك في سنة ألف ومائة وإحدى عشر من
الهجرة النبوية المصطفوية على هاجرها ألف ألف
الآف صلوة وتحية وأنا الحقير الضعيف
محمد ابن الشيخ يوسف ابن المرحوم الشيخ
مولانا ابن الشيخ عمر اولاد
اويس القرني غفر الله
عنهم وغفر
ذنوبهم

الواقف خاصة لوجه
الله عبد الرحمن
پاشا

دوا لاپەڕەی کتێبەکە

وەک لێتەوە دیارە وەقفنامەکە ڕەچاوی قەڵەمڕەوی بابانی کردوە، لە کوردستانی گەورە هەر هێندەی گرتۆتە باوەش کە پەیوەندی نێزیکی هەیە لەگەڵ حوکمداری بنەماڵەی باباندا. باوەڕ دەکەم یەکێک لە هۆی تەسک کردنەوەی سنووری وەقفنامەکە ئەوەیە کە خاوەنی کتێب «عەبدولڕەحمان پاشا» پەرۆشی کتێبەکەی بوە و ویستووەتی بکەوێتە دەستی زانای وەها کە ئیمکان هەبێ بزانرێ گەورەترین زانایە لەو هەرێمەی کوردەوارییەی دێتە بەرچاوی دانیشتوانی بابان و کۆیێ، کە هەرێم زۆر فرەوان بوو دەست نیشان کردنی مەلایێک بۆ کتێبەکە وەزەحمەت دەکەوێ،

بەهەمەحاڵ من لەوەدا ڕەخنە لە عەبدولڕەحمان پاشا ناگرم و توهمەی ناوچەپەرستی بە پاڵ نادەم. بۆ ئەو بەسە لە ڕۆژگاری خۆیدا بیری لەو لایەنەی «کوردستان»ـە کردبێتەوە لە کارێکدا کە بەچکە و شیرمژی ئایینە. لە دەربڕینی تێبینی دەربارەی پەراوێزی وەقفنامەکە هەر ئەوەندەم مەبەس بوو کە بڵێم مەساحەی نەخشەی کوردستانێک کە خوێندنی فەقێیەتی دەیکێشا زۆر فرەوانترە لە نەخشەی وەقفنامەکە چونکە هەموو کوردستانی گەورەی دەگرتەوە. بەڵام دەبێ ئەوەش بڵێین نەخشەی وەقفنامەکە ئەگەر تەسکتریش بێ قەڵەمێک کێشاوەتی کە دڵخوازە و ئیرادەی خاوەنەکەی ویستوەتی بیکێشێ، وەک نەخشەی عەفەوی و تێکڕای خەڵقەکە نیە بە میللەت و فەقێیەوە کە هەر «ڕاگەیاندنی حاڵ»ی لێ دەخوێنرێتەوە.

پوختەی قسە لێرەدا ئەوەیە هەردوو نەخشە، هی وەقفنامەکە و هی تێکڕای کوردەواری، بۆ خۆیان و بۆ ئێمەش جێگەی شانازییە و لە گەلێک هەڵوەستدا وەرامی ئەو کەسانە دەداتەوە کە حەز بەوە دەکەن لێرە بەپێشەوە ببڕای ببڕای هەستی نەتەوایەتی و گیانی کوردایەتی وجودی نەبووبێ. وا هەیە ئەو کەسانە کورد نین، لە زەمینەی دوشمنایەتی کوردەوە حەز بەو ئیفلاسە ڕووحیەی کورد دەکەن، هەیشە بۆخۆی کوردە، ڕەنگە مەبەسیشی دوشمنایەتیی کورد نەبێ بەڵام بەهۆی داخوازیی تایبەتی باوەڕی خۆی نەبوونی گیانی نیشتمانپەروەری لە نێو کوردا زیاتر حەز لێ دەکا، چونکە نەبوونی ئەو گیانە باشتر دەگونجێ لەگەڵ باوەڕەکە و ئامانجی باوەڕەکەی.

تێبینیەکی زۆر گرنگ هەیە لە باوەری بوون و نەبوونی گیانی کوردایەتییەوە ئێرە هەموارترین جێگەیە بۆ باس کردنی و ناشێ لێی لادەم، گوتەیێکی یەکجار

پەرەسەرندوو هەیە دەڵێ بزووتنەوەی کوردایەتی کوتەکی حازر بە دەستی ئیمپریالیزم و خوێنمژیی و کۆنەپەرستییە لە ڕۆژهەڵاتی نێزیکدا. ئەم گوتەیە چەندین سەرچاوە دەیڵێتەوە، هێندەش لە یەکدی دوورن شتێک نیە کۆیان کاتەوە مەگەر دووشمنایەتییان بۆ کورد. شۆڤێنی لای ڕاست و شۆڕشگێڕی لای چەپ بە نۆرە بارەها ئەم گوتەیان کوتاوەتەوە.

کاوێژکەرانی ئەم بەند و باوە دەبێ خۆ ماندوو کەن تا بە چەشنێکی نیوە خوێندەوارانەش بێ، تەوجیهێک پەیدا کەن بۆ تاوانبار کردنی وەقفنامەکەی عەبدورڕحمان پاشا. چونکە ئاشکرایە 177 ساڵ پێش ئیمڕۆ ئیمپریالیزم وەک ئێستا لە کاردا نەبوو تا بکرێ بە هاندەری پاشایێکی بابان کە لە ڕێی گیانی کوردایەتییەوە خۆی بکا بە کوتەکی دەستی ئەو لە دژی بزووتنەوەی ئازادیخواز کە ئەوسا هێشتا بەوەلەد نەبووبوو.

ڕەنگە هەندێک لەو کاوێژکەرانە کە ناوناوە بۆ مەبەسی تایبەتی خۆیان بە ڕواڵەتی دەستەو دامانی ئایین دەبن، کوێرەڕێیەک پەیدا کەن بۆ هێرش بردن بۆ سەر عەبدولڕەحمان پاشا و وەقفنامەکەی بەو ناوە، کە ئەوسا بیری ئەوتۆیی لە دژی «یەکیەتیی ئیسلام» بوە، بەڵام تارمایی ئەم توهمەیە بۆ تروکەیێکیش لەبەر تیشکی ڕاستی ناوەستێ. ئەوان غیرەت کەسانەی ڕواڵەتیی ئایین، لە دوو سەرەوە ساختەیان دەردەکەوێ:

یەکەمیان ئەوەیە بە درۆش بێ، فرمێسکێک هەڵناڕێژن بۆ ماڵوێرانی کورد بە دەست «یەکیەتیی ئیسلام»ـەوە، کە خەلافەتی عوسمانی نوێنەری بوو.

دووەمیان ئەوەیە کە هێرش نابەنە سەر هیچ بزووتنەوەیێکی غەیری کورد لە دژی ئەو »یەکیەتی»یە، بەپێچەوانە، پێی دەڵێن بزووتنەوەی ئازادیخواز.

پەنا بردن بۆ ئایین لە دژی کوردایەتیی کە خزمەتی ئەم تاقمە ناکا دیارە بە هیچ جۆر خزمەتی ئەوان ناحەزانەی کورد ناکا کە خۆیان لە دژی ئایینەوە بە دوا ئەوەدا دەگەڕێن لە مێژووی کۆن و تازەدا بزووتنەوەی پشت لە دین بدۆزنەوە.

من کە ئەمانە دەڵێم هەر لە بیرمە وەقفنامەکەی پاشای بابان بە ورێنە و خەون و خەیاڵیش ناچێتە ڕیزی دژکاریی لە عاست ئاییندا. چەند سەیرە بەڵگە بێنمەوە بۆ ئەوە کە نووسینەوەی کتێبی «صحيح البخاري» کە لە دوا قورئانەوە دێ و بە

نیازی نزیکبوونەوەیە لە خوا کارێک نەبوە دژی دین بێ... دەک هەزار لەعنەت لە سیاسەتی دوور لە واتای ئینساف و مرۆڤایەتی.

وەی کە ناخۆش و جگەرسووتێنە ئەندامی میللەتێکی ژێر چەپۆڵک و بێدەسەلات بیت، لە بن دیواری »مسجد الاقصی« خۆت بە کوشت بدەیت پێت دەڵێن «شعوبی»، لە ناو ماڵی خۆت بەرگری داگیرکەر بکەیت پێت دەڵێن خزمەتکاری بێگانە، دۆستێ ڕۆژاوا بیت - ئەگەر بە دۆست قبوڵ کا - کلکی ئیمپریالیزمیت، سەر بە ڕۆژهەڵات بیت- ئەگەر لێت گەڕێ شوێنی کەویت- بێدین و «اباحي» و ڕووخێنەریت... شۆڕش بکەیت فیتنەچیت، بوەستیت و خامۆش بیت واوەیلا بۆ ڕۆژگارت.

خۆ هەر دەڵێی گاڵتە بە شەخسی خۆت دەکەن کەوا لە کتێب و دەستووری ئەساسی و ناو ورگ و ڕیخۆڵە و هەناوی فەلسەفە و نەزەرییەشدا دەنووسن برایەتیی و وەکیەکی و مافی چارەنووسی میللەتان و نازانم چی. بە تەجرەبە دەردەکەوێ میللەتێک چی دەبێ بابێ عەیبی نایەتە سەر، ئەگەر لایەنێکیش جنێوی پێ بدا لایەنێک پێیدا هەڵدەڵێ، لە هەموو حاڵانیشدا کە هێز و دەسەڵاتی هەبوو جیهان سەرانسەری دەبێتە خوازبێنی کاری، بەڵام تاوانی گەورەی بێ شەفاعەت و بەخشین... عەیب و ئابڕووچوونی دونیا و قیامەت بێدەسەڵاتییە. کە بێدەسەڵات بوویت ئەو دۆستەی بەدرۆ بۆت دەگری، چەک دەفرۆشێ بەو دوژمنەی دەتکوژێ. قسەی ڕاستی بێ پەردە و کینایەت ئەوەیە میللەتێک کە هەستی بەخۆ نازینی کرد و دەماری مەردایەتی جووڵا هەوڵ دەدا دەسەڵات پەیدا کا... بەدوا پەیدا کردنی دەسەڵاتدا ئیتر ڕێی نابێ مەرحەبای دۆست و دوژمنی ڕاست و درۆ بداتەوە... ئەمە دەڵێم بۆ دڵی ئەو خۆش باوەڕانەی عاشقە مەرحەبان.

گەشت و خوێندنی فەقێیان، جگە لە ئیسپات کردنی هەبوونی گیانێکی نهێنیی کوردایەتی خزمەتێکی یەکجار گەورەی «بوونی قەومی» کوردیشی کردوە. خۆت دەیزانی هەموو فەلسەفەیێکیش ئەوە ڕادەگەیەنێ تاکوو پەیوەندی ماددی و مەعنەویی لە ناو میللەتێکدا بەهێز و زیندوو بێ ئەو میللەتە هەست بە بوونی خۆی دەکا، خۆ ناسینەوەی بەتینتر دەبێ. ئەوەی ڕاستی بێ، بەلای باوەڕی منەوە، سوود و بەرژەوەندی »مشترک« و بیرەباوەڕی «مشترک» باوک و دایکی هەستی گشتی «مشترک»ن. بەمیساڵ دەڵێم، زمان بۆیە دەبێتە هۆی برادەری لە میان دووکەسی

«هەرگیز یەکدی نەدیتوو» لە وڵاتێکی بێگانەدا، چونکە هەردووبان لە شتێکی خۆشەویستدا دەکا بە «شریک». نامەوێ، ڕێشم نیە، لێرەدا ئەسڵە باسەکە بەجێ بێڵم بۆ لاباسی هۆیە زلەکانی کە مرۆڤ لە یەکدی نزیک دەکاتەوە وەیان دووریان دەخاتەوە وەک «ڕەنگ، دین، ڕەگەز، چین، بەرژەوەند، دوشمنایەتیی، مەترسی مشترک، فەلسەفە...» و چۆن ئەو هۆیانە بە نۆرە وەیا بە پێی داخوازیی هەڵکەوت دەبن بە یەکەم و دوەم، وەیا بە جارێ خۆ دەشێرنەوە، چونکە دەریای بێپایانی ئەم سەرەباسانە چەندین کەشتیمان لێ ژێر ئاو دەکا بەر لەوەی بگەینە ئەوبەری، بۆیەیە لێی بێدەنگ دەبم بەناچاری، وەک ئەمانەت دەیخەمەوە کەشکۆڵی زانستی مێژووی گشتی و دەگەڕێمەوە بۆ زنجیرەی باسەکە.

بەنیسبەت کوردەوە چونکە کیانێکی سیاسی نەبوە کۆی کاتەوە سەر یەکتر و لە ڕێی دەسەڵاتی «میری» یەوە پەیوەندی سەقافی و ئابووری و کۆمەڵایەتیی هەموو لایێکی گەل و وڵاتەکەی بەیەکەوە ببەستێتەوە و بەرەو باوەڕێکی گشتی یەکگرتوویان ببا، تا بڵێی پێویستی بوە بە بوونی پەیوەندی «خۆڕسک»ی ئەوتۆ نەیەڵێ خەڵقەکە یەکدی فەرامۆش بکەن. دەتوانم بڵێم هاتوچۆی کۆچەری کە لە خودی خۆیدا دیمەنی ژیانێکی سەرەتایی و دوورە ژیارە (حضارة) سوودی ئەوەی هەبووە بە درێژایی کات کوردەواری ئەمدیو و ئەودیوی سنووری نێوان دەوڵەتان بەیەکەوە بلکێنێ با بەشێوەیێکی ناکام و ناپوخت و لە پەراوێزی ڕووپێو (مساحە) یێکی تەسکیشدا بێ، چونکە کە پەیوەندی کەم بوو، کەمێک پەیوەندی دەکا زۆر.

ماوەی درێژە پێدانم نیە بەو باسەی چوندوچۆنی ئەو پەیوەندییانە کە کوردی بەیەکەوە بەستوون و هەستێکی«مشترک»ی بۆ دروست کردوون و کامیان لە گرنگیدا پێش کامیان دەکەوێتەوە وەک »زمان، مەفتەن، نژاد، مێژوو، ئایین، یەکیەتی چارەنووس و سوود و زیان، سەقافەت، ئابووری...» تەنها بە جۆرێکی سەرەتایی و وەک بدیهیە دەبێ ئەوە بڵێم زمان و مەفتەن لە ژوورووی هەموو پەیوەندییێکەوە دێن نەک هەر بەنیسبەت کوردەوە بەڵکوو بەنیسبەت هەموو میللەتێکی جیهانەوە لە ڕووی دروست کردنی هەستی نەتەوایەتیی... ڕەنگە لە هەموو مێژوودا یەک دوو میساڵ هەبێ، لەبەر هۆی یەکجار تایبەتی و بێ سابیقە (پێشینە) هەستی نەتەوایەتی و خەباتی قەومی لەسەر بنجی «یەکیەتی زمان و مەفتەن» هەڵنەستابێ. با لەوە واز بێنین و موناقەشەی ئیعتیرازی ئەو فەلسەفانە

نەکەین کە بەلایەنەوە هۆی پەیوەندی نەتەوایەتیی هەیە گرنگتر لە زمان و نیشتمان چونکە ئەو موناقەشەیە سەرەتای هەیە بەڵام کۆتایی دیار نیە. چاکتر ئەوەیە بلکێینەوە بەو باسەی لێی دەدواین.

وەک گوتم نەبوونی کیانێکی سیاسی بۆ کورد هۆی هەرە بەهێزی پەیدابوونی هەستێکی نەتەوایەتیی گشتی لە کوردان کەم کردۆتەوە. سرنجێکی سەرپێی دەری دەخا لەم حاڵی پڕ پێویستی بۆ بوونی پەیوەندی خۆڕسک کەوا کەلێنی نەبوونی کیانی سیاسی کەمێک پڕ کاتەوە لەناو کوردا، گەشت و هاتوچۆی خوێندنی مزگەوتان لە کوردستاندا پەیوەندیێکی وای پێک هێناوە تاکی نەبێ. نە بازرگانی، نە فەلاحەت، نە پیشەسازی، نەهیچ کەسب و کارێکی کە هاتۆچۆی خەڵق دەکا و بە یەکتریان دەناسێنێ نەیتوانیوە سەرانسەری وڵاتی کوردان بەیەکەوە ببەستێتەوە بەقەدەر گەشتی فەقێ و مەلایان کە بە هەموو کوردستاندا بڵاو دەبوونەوە و لە دێیەکەوە بۆ دێیەک و لە شارێکەوە بە نیازی خوێندن جێ گۆڕکێیان دەکرد و لەو جێگۆرکێیەدا خەڵقیان دەناسی و پێکیان دەناساندن. وەک بە هۆی خوێندنەوە مەلایێکی سنەیی گەیشتۆتە کۆیێ و دیاربەکر یاخود فەقێی موکری و بادینی و سۆرانی لە مزگەوتی ئاواییەکی کوردستان وەها کۆنەبوونەتەوە بە هیچ هۆیێکی دیکە و لە هیچ مەیدانێکی تردا کوردی ئەم سەرەوسەری کوردستان وەها کۆ نەبوونەتەوە.

سەرەڕای زۆریی ژمارەی ئەو فەقێ و مەلایانە کە هاتوچۆکەیان کردوە، کاتی دوورودرێژی خوێندنیشیان و مانەوەیان لە غەریبی، قووڵیی و فرەوانییەکی بەو پەیوەندییە بەخشیوە کە گەشتەکەیان بەرهەمی هێناوە لە نێوان خەڵقدا، زۆر زەحمەتە لە کارێکی تردا بەرهەم بێ، یاخود هەر نایێ. پیاوێکی وەک حاجی قادر بە هۆی خوێندن نەبا کەی بۆی دەکرا چەند ساڵان سەرلەبەر بە کوردستاندا بگەڕێ و کوردان بناسێ و شارەزای وڵاتیان و ئاشنای زار و عادەت و مشاکل و خۆشی و ناخۆشی ژیانیان ببێ. لە فەرزی سەفەرەکەی بۆ «چەرچیەتی» با هەر دوو مانگ و سێ مانگ بە چەند دێیەکدا دەگەڕا و دەچۆوە بۆ ماڵە کشوماتەکەی لەگەڵ کەمێک تەئسیری سەفەر و ئاڵوگۆڕ و شناسی. لە پەراوێزی لاپەڕەیێکی کتێبەکەی «سیوطي» ئەم چوارینەی فارسی نووسیبوو وەک کامێرا دیمەنێکی ژیانی خوێندن و فەقێیەتی خۆی پێ وەرگرتووە.

یا رب بکرم بجای طاعت از من
این کوشش و این سعی دمادم بپذیر

وین گرسنگی و غربت و بی خوابی
فرسودن پهلوان ببالای حسیر

واتاکەی بە کوردی

خوایە بەکەرەمی خۆت لە جیاتی تاعەت
ئەم کۆششت و خۆ ماندوو کردنەی هەمیشەییم لێ قبوڵ بکە

برسییەتی و غەریبی و بێ خەوی...
سوانی پەڵاسوانم بەسەر حەسیرەوە، ئەمانەیشم لێ بسەلمێنە.

دەوجا ئەمە لە کوێ و سەفەری نەفەس کورتی کەم سفتوسۆی مامڵەت لە کوێ؟ تفاعلی فەقێ لەگەڵ ژیانەکەی خوێندنی لە چاو تفاعلی خەڵقی دیکە لەگەڵ ژیانی دوور لە ماڵیان، دەڵێی جۆش خواردن و تێکچڕژانی کیمیاوی تێدایە.

جگە لە لایەنی نەفەسدرێژی گەشتی خوێندن و زێدە تێکەڵبوونی فەقێ مەلا لەگەڵ ژیانی ڕۆژانەی خەڵق و دیدەنی کردنی لە دەیان شار و لادێ، دەبێ ئەوە تێبینی بکەین کە وەک خوێندن مرۆڤ دەکا بەخوێندەوار و ئەدیب و شاعیر و ئامادەی دەکا ببێتە ئەندامێکی بە تاو و تین لە تێکرای ژینی ڕۆشنبیری و مەعنەوی میللەتدا، کۆچەری و چەرچییەتی و تیجارەت و جووڵانەوە بۆ گوزەران کەموزۆر لەم لایەنە تەئسیرێکیان نیە. هەرچی بازرگان و چەچی و کۆچەری کورد هەیە چوارینەیێکی وەک ئەمەی حاجی قادریان بۆ بەجێ نەهێشتووین لە جەرگەی کەسبەکەیانەوە هەڵستابێ. تاجیرێک و کۆچەرییێک بەهۆی کەسبەکەیانەوە نابنە شاعیر و ئەدیب دەبێ لە سەرچاوەیێکی دیکەوە فێری شیعر و ئەدەب ببن. کە ئەوسا، واتە لەسەردەمی حاجی قادر و بەر لەویش لە خوێندنی مەلایەتی بەولاوە چ سەچاوە نەبوون.

له لانی ئەژماریشەوە، ژمارەی فەقێ و مەلایان کە ئەم هاتۆچۆیەیان دەکرد لە ژمارەی تێکڕای ئەو کەسانە پتر بوە کە کوردستانیان پێواوە بۆ هەر نیازێکی دیکە بووبێ غەیری خوێندن. دەماودەم گوتراوە و بیستراوە، زۆریی ژمارەی مزگەوت و مەدرەسانیش دەیسەلمێنی، سەردەمێک لە شاری کۆیێ 500 مستعد و فەقێ خوێندوویانە، بێگومان بەشی هەرەزۆری ئەمانە کە لەمزگەوتەکان و تەکیە و خانەقاکان ژیاون لە شوێنانی دوورەوە هاتوونە کۆیێ بۆ خوێندن.

باوکم لە باوکی خۆی دەیگێرایەوە، کە ئەویش لە جیلی پێش خۆی بیستبوو، مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەد کەوا کەوتۆتە سەر خەتی شوورەی[13] دەوری شار، سەردەمێک لە دەرەوەی شوورەوە 70 ڕاتبەی بۆ هاتۆتەوە، هەڵبەت 70 ڕاتبە بۆ ژمارەیێکی کەم لە نانخۆران کۆ ناکرێتەوە، دەبێ فەقێیەکی زۆر لە مزگەوتەکەدا ژیابن تا پێویستیان بەم هەموو خۆراکە بووبێ. خۆ ئەگەر ڕاتبەی ناو شاریش بخەیتە سەر ئەو 70 ڕاتبەیە ئیتر بۆ خۆت بیر کەوە لەو هەموو قەڵەباڵغیەی لە مزگەوتێکدا کۆبۆتەوە کەهەموو غەریب بوون چونکە بە عادەت فەقێی شار لە ماڵی خۆی نان دەخوا و دەنوێ. حاجی مەلا عەبدوولڵا لە هەرەتی تاقەتی دەرس گوتنەوەی، ڕۆژانە 24 دەرسی گوتۆتەوە. باوکم دەیگوت هەندێ دەرسی پێش بەرچایی سبەینان و هەندێکیش دوای نوێژی خەفتنان دەگوتەوە زۆر لە شوێنی تری وەک کۆیێ لە کوردستاندا ناوچەی خوێندنی مەلایان بوە. من کە بە نموونە باسی کویێ دەکەم، لە ناو مزگەوتەکانی کۆیەش ناوی مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەد دێنم لەبەر دوو هۆیە:

---

[13] - ئەم شوورەیە بەرەبەرە وێران بوە، بەشێکی خوارووی تا 100 ساڵێکیش لەمەوپێش هەر ماوە بە قسەی حەماغای گەورە کە باوکم لێی دەگێڕایەوە بەشێکی بەرد و خرچانی شوورەکە بەکارهاتوە لە دروست کردنی دیوەخانەی «محمود ئاغای باوکی حەماغا». بە پێی کۆتایی چارینەیێک کە لەلایەن شاعیرێکی ناو نەزانرایەوە هەڵبەستراوە مێژووی بنای دیوەخانەکە دەبێتە 1271ی کۆچی.

کریم اکرام این تاریخ فرمود
«بیامد بانی ان محمود اغا»

- یەکەم: ئاگاداریم لە وەزعی کۆیێ زیاترە تا جێگەیێکی تر.
- دووەم: کۆیێ بێشکەی حاجی قادرە، مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەدیش یەکێکە لەو مزگەوتانەی حاجی لێی خوێندوە بە ڕەفاقەتی باپیرم.

وەک دەزانین و تازەش ئیشارەم بۆ کرد، خوێندنی فەقێیەتی مەلا و فەقێیەکی لە یەک دوو جێگە کۆ نەکردۆتەوە، بەڵکوو بەهەموو ئەو شوێنانەیدا بڵاو کردوونەتەوە کە مەلای «مدرس» چاکی لێ بوە. قوتابی دەورانی ئێستا، کە دەچنە دەرەوە بۆ خوێندن، لە چەند کۆلێجێک کە جێی «اختصاص» یانە بترازێ چاویان بە کەم شوێنی دیکە دەکەوێ، چاویشیان پێی بکەوێ بەشدار نابن لە تاڵی و سوێری و خۆشی و ناخۆشی ئەو شوێنە. لەفەرزی بەشداریش بن چ تەئسیرێک ناکا لە گیانی میللییەتیان چونکە وەک گوتم خوێندنیان ئەغڵەب لە دەرەوە دەبێ. خۆ ئەگەر لە وڵاتی خۆیان بشخوێنن وەزعی ئێستاکەی پڕ پەیوەندیی هەمەچەشنە کە هەموو جیهان بەیەکەوە دەلکێنێ پێویست نایەڵێ بەوە چەند قوتابیێک، با ژمارەیان زۆریش بێ، کەلەبەری گەورە پڕ کەنەوە لە هەستی نەتەوایەتی میللەتەکەیان.

لە کورد بەولاوە کە کیانی سیاسی پێک نەهێناوە، ڕەنگە میللەت نەمابێتەوە بێکیان لەسەر ڕووی زەوی. قوتابی سەردەمی نوێ لە ناو میللەتی خاوەن کیان بەهۆی بەسەرچوونی قۆناغی خەبات کردن لە پێناو ئەو کیانە، خەریکی خەباتێکی تازەداهاتووی ئەو تۆیە لە هیچ ڕوێکەوە ناکێشێتەوە سەر ئەو ڕۆڵە و دەورەی کە خوێندنی مزگەوت لە کوردەوارییدا بینیوەتی. خۆ ئەوەی ڕاستی بێ نەبوونی کیانی سیاسی کورد ئیمڕۆش ڕۆڵی قوتابیەکی کورد جودا دەکاتەوە لە هی قوتابیەکی ڕووس وەیا ئەڵمان وەیا تورک. ئەگەر جورئەت بکەین ڕاستی بڵێین و شەرمی حزووری گەلان نەمانگرێ، خۆهەڵسوونی قوتابیەکی کورد لە بزووتنەوەیێک کە بەرهەمی بۆ گەلی خاوەن کیان دەبێ، بێ تەئویل بە واتای ئەو چەند بەیتەی حاجی قادر دەکەوێ کە بۆ ئەو شاعیر و نووسەرانەی کوردی داناوە زمانی بێگانە بەکار دێنن:

وەک مریشکێ کە عەقڵی نەیهێنێ
بێت و هێلکەی مراوی هەڵبێنێ

وەک بگاتە کەناری جۆگەلەیێک
نایەتە شوێنی بمرێ جووجەڵەیێک

حاجی قادر بێنیتەوە بە نموونەی فەقێیەکی کورد، پێمان ڕادەگەیەنێ ئەوەندەی بە دوا خوندندا لە لادێی ڕابواردوە لە 7-8 ساڵانەی گەشتی فەقێیەتی پترە لەو کاتی کە لە شاری بەسەربردوە. لە جەرگەی جەرگی ژیانی عەشیرەت و هەوار و پاوان و ناو مێگەل و گاڕان و ڕەشماڵدا قاڵ نەبوویایەوە بەهارییە سیحراوییەکەی هێندە دەوڵەمەند نەدەبوو لە لایەنی کۆمەڵایەتی و مرۆڤایەتییەوە، بەوەدا لە ڕووی ڕوخساریشەوە کز دەبۆوە چونکە تەجرەبەی لەگەڵ بەهاردا نەدەبوە تەجرەبەیێکی زیندووی هەناسەگەرم، ئەوپەڕی جوانی کە بووبا هەر هێندە دەبوو کە دووبارە کردنەوەی بێ ڕەنگ و شەوقی بەهاری ناو کتێبان دەیبێ.

لێرەدا بۆ دیارخستنی ئەسەری تەجرەبەی زیندوو لە شیعری شاعیردا نموونەیێکی بچووکی شاعیرێکی مەشووری ئێستاکەی عەرب دێنمەوە کە لە شار ژیانی بەسەر بردوە و پەیوەندی لەگەڵ کشتوکاڵ و چاندن و ناشتنی درەختدا نەبووە. «احمد رامي» لە پارچە هەڵبەستێکی ئاهەنگدا ئەمە دەڵێ:

زرعت فی ظل ودادی
غضن الامل وانت رویته

واتە: لەبەر سێبەری خۆشویستنم لکی ئومێدم چاند و تۆش داشتت. هەڵبەستەکەی بە لەهجەی میسرە نەک عەرەبی ڕەسەن.

سەیرکە چەند ناشارەزایە لە ئسووڵی نەمام چاندن. نە سێبەر یاریدەدەری گەشە کردنی درەخت و شیناوردە، نە لکە داری بێ ڕەگ و ڕیشە دەچێنرێ. بە تەئویلێکی دوورەدەست نەبێ ئەم هەموو ناشارەزاییە بەرپەرچ نادرێتەوە. بەڵێ داوا ناکرێ شاعیر باغەوان بێ، بەڵام کەسیش داوای باغەوانی لێ ناکا کە ئاگاداری دار و درەخت و چاندن بووە لەخۆوە و ڕەچاوی دەستووراتی باغەوانی دەکا. بەمیساڵ دەڵێم ئەگەر شاعیر شارەزای زانستی فەلەک بێ هەرگیز لە شیعردا بێ سەبەب

ناڵی چواردەی ڕمەزان بوو ڕۆژی ڕووت گیرا، چونکە ڕۆژ گیران لە کۆتایی مانگی عەرەبیدا دەبێ.

پوختەی قسە ئەوەیە گەشتی پڕ جۆش و خرۆشی فەقێیان بەدوا خوێندندا شادەمارێکی پەیوەندی گشتی بوو لەم سەرەوسەری کوردستان بۆ ماوەی سەدان ساڵ کە ئەگەر ئەو نەبا هیچ جووڵانەوەیێکی دیکە نەبوە جێی بگرێتەوە وەیا لە تەئسیری نەبوونی کەم کاتەوە. بە جۆرێکی واقیعیش ئەم خوێندنە یەک شکڵە و تێکەڵبوونی مەلایان لەگەڵ ژیانی ڕۆژانەی خەڵق، تاڕادەیێکی زۆر گرینگ و بەرچاو هەستێکی کۆمەڵایەتی یەک ڕەنگی بۆ میللەتی کورد پەیدا کردوە، چونکە مەلاکان بەدوا گەڕانی سەرانسەری وەیا زۆر شوێنی کوردستان و شارەزابوون بە لەهجە و عادەت و ڕەوشت و گوزەرانی ئەو خەڵقە وەک »باڵوێزی گەڕۆک - سفیر متجول» بوون بە نوێنەری ناوچەکانی لێیان خوێندوە. کاتێک لە شار وەیا لادێش خەریکی مەلایەتی بوون هەر خوێندەواری ڕووت و ئاسایی نەبوون بەڵکوو بۆ زوربەی خەڵق جێی پەروەردکار و ماموستا و دادگا و قازی و بەریوان (حکم) یان پڕ کردۆتەوە.

سرنج لە هەندێ بگرە کوردی ئێران هەرچەند سەربە دەوڵەتێک بوون کە مەزهەبێ ڕەسمی «شیعی» بوە، زوربەیان سوننی و شافیعی ماونەوە وەک کوردی سەر بە عێراق و تورکیا لە ڕێی ئەوەوە کە مەلاکانیان سوننی و شافیعی بوون.

جگە لە دیاردانی گیانێکی کوردایەتیی و بەردەوامبوونی پەیوەندیێکی بەهێزی ماددی و مەعنەوی لە میانی دانیشتوانی سەرانسەری کوردستان، لە خوێندنی فەقێیان مانەوەیان لە چارچێوەی وڵاتی کوردزماندا لە هەردوو قۆناغی فەقێیەتی و مامۆستایەتی، واتە خوێندن و دەرس گوتنەوە، دەلالەتێکی گەورەی دیکە هەیە، وەک دوای کەمێک بۆت ڕوون دەبێتەوە، چەندین دەرگای باس و لاباسی زێدە فرەوان دەکاتەوە کە سەر دەکێشنەوە بۆ لایەنی هەرە گرینگ لە بوونی ماددی و مەعنەوی کورد و پرسیارەکانی سەر بە چارەنووس و نەگەیشتنی کورد بە دروست کردنی کیان و لە یەکدی نەچوونی باری ڕۆشنبیری و باری ئابووری کورد و دەیان لاڕێ و کولانەی لاوەکی (جانبی) کە ئەگەر نووسەر جڵەوی خامەی شل کا بۆ شەرحدانیان بە زەحمەت و ئەرکێکی زیهنی و دیراسەیێکی مێژوویی بێپایان نەبێ لێیان نابێتەوە. لە واقیعدا ئەو لاڕێ و سەرەباسانە ئەوەندە دوور و قووڵن بەحاڵ جێیان لە کتێبێکی

سەربەخۆی درێژی زۆر مەبحەسدا ببێتەوە چ جایی ئەوەی بخرێتە ناو قەبارەی کتێبێکی دیکەی ئەوتۆ خۆی هەڵخناو بێ بە چەندین باس و لاباس.

من بەپێی داخوازی جێگە هەر ئەوەندە مەودایەم هەیە کورتەیێکی مەوزووعەکان بخەمە سەر کاغەز، کە زوربەیان تا ئێسە قسەیان لێ نەکراوە، یاخود من نەمدیوە کەس قسەی لێ کردبن، بیروڕایەک لێرەدا دەری دەبڕم چشتێکە لە کەس نەبیستراوە و لە هیچ سەرچاوەیێک باسی لێ نەکراوە. وەک بۆشت دەردەکەوێ بیروڕایەکەم لە لای خۆیەوە گەلێک باوەڕی سیاسی و فەلسەفی ڕەد دەکاتەوە و واقیعی کوردەواری لەوە دەردەبا کە وێنەی دووبارە کراوەی ناو ئاوێنەی فەلسەفە و عەقیدەی حازر و بزر بێ و دەیکاتەوە بەو ڕاستییە کە خۆی لە خۆیدا ڕاستە نەک خزمەتکاری ڕاستی فەلسەفە و «فکرەی مجرد» بێ. نووسەری «ملتزم» کە یەخەگیری مێژوو دەبێ بە زۆرەملێ دیخاتە سەر زەوی و فەلسەفەکەی خۆی دەکا بە کفن لە بەری، پێشت دەڵێ فەرموو سەیرکە فەلسەفەکەم وەک شەوقی نیۆنی سەوز و سوور دەوروبەری خۆی بە ڕەنگی خۆی ڕەنگین کا. دەبێ فەلسەفە تیشکێکی بێتەرەفانە بخاتە سەر واقیع تا ڕاستی و نهێنیەکنی دەرخا. ئەگەر وا نەکا بە هەڵەمان دەبا.

دەلالەتی پەیوەستبوونی خوێندنی فەقێیان لە پەراوێزی سنووری کوردستانی گەورە ئەوەیە کە کورد لە ڕووی خوێندەواری و ڕۆشنبیری و زانستەوە بەپێی سەردەمەکانی ڕابردوو، هاوتای میللەتانی دراوسێی خۆی بوە، کە تورک و فارس و عەرەبە، پێویستی نەبوە بۆ خوێندن هانا بباتە بەر بێگانە. لەو تاکە مەیدانەی ڕۆشنبیرییەدا کورد هەنگاوێک دوانەکەوتوە لە دراوسێکانی و بە قەدەر ئەوان مەلا و زانای بەرزی لە ڕیزی هەرە پێشەوەی زانستدا هەبوە. شەخسی حاجی قادر بۆ مەبەسی خوێندن بە شار و دێی کوردستاندا دەگەڕا وەک هەزاران مەلا و فەقێی کورد، بەڵام بۆ مەبەسی دەرکەوتن و خۆ بە عالەم ناساندن چوە ئەستەمبوڵ. کە گەیشتە پایەتەختی خەلافەتیش سەقافەتێکی ئەوتۆی نەدیت لە ژووررووی هی خۆیەوە بێ، سەقافەتی کوردستانی لەبیر بباتەوە. بە خۆڕایی و بۆ هەڵدانەوە و شانازی کردنی بێئەساس نیە کە لە ئەستمبۆڵەوە مەدحی زاناکانی کورد دەکا. بێگومان ئەگەر شەپۆلێکی بێسامانی سەقافەتی تورک لە گێژاوی خۆیدا غەرقی کردبا بیری لەوە نەدەکردەوە بۆ حاجی مەلا عەبدوڵا بنووسێ:

به غەیری جەددی ئێوە کێهە دانا
لە کوردستان بناغەی عیلمی دانا

بەڵێ مجامەلەییێکی زل هەیە لەو بەیتەدا، بەڵام موجامەلەکە هەر هێندەیە کوردێک هەڵدەکێشێ لە تەک کوردی هاوڕێی خۆیدا، نەک لە نەبوونەوە پایەییێکی بۆ دروست دەکا. کاتێکیش کە دەڵێ:

علومت کافیە و شافی بە واجیب
لە کۆی تۆ دەبتە حاجب «إبن حاجب»

مەبەسی دەربڕینی خۆشەویستی و ڕێزی خۆیەتی دەربارەی باپیرم، دەنا «إبن حاجب» مەلاییێکی کوردە لە جیهانی خوێندەواریی ئیسلامدا ناوی هەیە. یاخود کە حاجی مەدحی مەولانا خالید و کاک ئەحمەدی شێخ و بێتوشی دەکا بایی تۆسقاڵێک وشکەمنەتیان بەسەردا ناکا، هەر یەک لەوانە سەرامەدی زەمانی خۆیان بوون.

لە سەرانسەری کوردستان چەندین بنەماڵەی زانست بۆ ماوەی سەدان ساڵ شەوچرای خوێندەواری و ئەدەب بوون... زەهاوی، حەیدەری، قەرەداغی، پێنجوێنی، سنەیی، خەتیی، جەلی، مزووری، شێخ وەتمانی، ماڵی «مصنف»، ڕۆژبەیانی، بەرزنجی، هەرتەلی، ماڵی «قازیی سابڵاغی»، دایە خەجێی پەیدەرپەی ئەدیب و زانای ناوداریان پێ گەیاندوە تیشکی زانستیان بە کوردستان و دەرەوەیدا پژاندوە.

مەلای وەک «إبن حاجب» و «إبن ادم» و «أبو بکر مصنف» و «عەبدولڕەحمانی جەلی» هاوتای «سەعدی تەفتازانی» و «ڕازی» بوون. وەک ئەوانیش بێئەژمار زانای کورد پشتاوپشت هاتوونەتە خوارێ بە لێژگەی مێژوودا ناوی کوردیان بەرز کردۆتەوە و تا ڕادەییێک دڵخۆش کاتەوە، باری بێکیانی و بێهێزی و هەژاریی میللەتەکەیان ڕاست کردۆتەوە. بێگانەیەک کە دەڵێ و دەنووسێ «قدوتنا ومولانا الشیخ خالد الکردي» بیەوێ و نەیەوێ تەواوێک لە گوتەی بێحورمەت دەلێسێتەوە کە بێشەرمانە لە کورد دەگیرێ. هەر یەکە لەو مەلا و پێشڕەوانەی ئاین و تەریقەت و ئەدەب بەقەدەر قارەمانێکی میللی پشتگیرییان لە کورد کردوە بە چەکی زانست و مەعنای سەردەمی خۆیان.

عینوانی خوێندن و خوێندەواری لە کوردستانی چەند چەرخێک لەمەوبەر بە سێ بەش دابەش دەکرێ:

1) مەلایەتی و زانستی ڕووت
2) شێخایەتی تەریقەت
3) ئەدەب.

تێکڕای هەر سێ بەش ئەو ژیانە «معنوی و عقلی» یە پێک دێنن کە لەتەک ژیانی «ماددی» دا ناوێ دێ و بە هەردووکیان کاکڵی بوونی تەواوی کورد بەرهەم[14] دێ. هەرچەند خوێندنەکە لە پێش هەموو ئامانجێکدا پێگەیاندنی مەلای

---

[14] – لێرەدا بەرهەمی فۆلکلۆری لە سەرگوزەشت و بەیت و گۆرانی و پەند و مەتەڵ داوام لێ دەکا جێگەی تایبەتی بۆ دیار کەم کە مافی حەڵاڵی خۆیەتی، بەڵام لەبەر گەلێک هۆی گرینگ دەنگی ئەو داوا کردنە و ئارەزۆی خۆشم خامۆش کرد و بە ناچاری لە مەوزووعەکەم لادا. لەم هۆیانە دوان دەخەمە بەرچاو:

1. کە کەوتمە سەر لێکۆڵینەوە لە ڕۆڵی فۆلکلۆر لە ژیانی معنوی و عقلی کورد، لەبەر فرەوانیی مەوزووع، وەک ئەوەیە لە نوێ باسێکی سەربەخۆم هێنابێتە ناو نووسینەوە، دەبوا بۆ ماوەیێکی یەکجار درێژ لە مەوزووعی ئەسڵی واز بێنم، بەمەشدا نووسینەکە هێند درێژ دەبێتەوە، بابڵێم لە تام دەردەچێ.
2. وەک لێرە بە دواوە بۆت دیار دەکەوێ، ژیانێکی «عقلی و معنوی» کە لە خوێندنی مزگەوتانەوە سەری هەڵداوە و بوە بە تایێکی تەرازووی وجودی کورد کە تایەکەی دی ژیانی «ماددی» بێ، هیچ خزمایەتییێکی نەبوە لەگەڵ ئەم ژیانە ماددییەدا. بە پێچەوانەی چاوەنۆڕ کردنی خوێنەر لە ڕواڵەتی فەلسەفەی ماددی و ڕاگەیانەکانی، ژیانی «عقلی ومعنوی» کورد نە لە واقیعی ماددی خۆی هەڵقوڵیوە نە وەک ئەویش هەژار بوە، چونکە چ فەرقێکی نەبوە لەگەڵ ژیانی «عقلی و معنوی» فارس و تورک کە هەردویان خاوەن دەوڵەت بوون و لە ناو دەوڵەتان پایە و شۆرەتییان هەبوو.

با پێشبڕکێ لە نووسینەکەم نەکەم و ڕوون کردنەوەی مەبەس لە شوێنی خوێدا بخوێنیتەوە. لێرە هەر هێندە دەڵێم فۆلکلۆری کوردی چونکە دەنگدانەوەیێکی عەفوی چەند و چۆنی واقیعە هەژارەکەی کوردە ئەمیش وەک ئەو لەچاو ئەدەب و زانستی مزگەوتان یەکجار سەرەتایی و هەژارە. فۆلکلۆری کوردی دەشێ پێی بگوترێ «بنای فوقی - ژوورخان»ی ژیانی ماددی کورد، لە حاڵەتێکدا خوێندنی مزگەوتان بنای فوقی واقیعێکی ماددی یەکجار پێشکەوتوترە لە هی کورد. ئەم ڕاستییەت کە بۆ ڕوون بۆوە لێرە بەدواوە حەقم دەگری لەوەدا کە باسی فۆلکلۆر ناهێنمە تەک باسی خوێندنی مەلایەتی کە بریتییە لە زانستەکانی ئیسلام و فەلسەفە و فەلەک و مەنتیق و زمان و... هتد.

بە جۆرێکی سەرپێیش ئەوەندەت بۆ ئیزافەی سەر قسەکانم دەکەم، فۆلکۆری کوردی لەگەڵ هەژاری و سەرەتایی خۆشیەوە چونکە ئەویش بەرهەمێکی هونەری و زیهنیە، لە چاو واقیعی ماددی یەکجار کزی بێ تین و تاو، ڕەنگێکی ئەریستۆکراتی لە خۆی هەڵسووە و تەواوێک نازوفیزی کردوە بەسەر چەکمەسەری و کوێرەوەری زوربەی میللەت و خۆی لێ دوور خستۆتەوە و بە زۆری دەوری «ڕەزم و ئایین و دڵداری» هەڵهاتوە. بە تەمای ئەوە مەبە فۆلکلۆری کوردی کە لە جەرگەی میللەتەوە هەڵستاوە لەگەڵ فەلاحەت و کرێکاری مازوو چنین و کاروانچیەتیی و مەرەزەچاندن و مەڕ لەوەڕاندن و مانگا دۆشین و ڕەزەوانی خەریک بووبێ. ئەو مەوزووعانە کە بە ڕێکەوت هاتبێتە ناو فۆلکلۆریشەوە لەبەر خاتری خۆیان و بۆ ڕێز لێنانیان نەبوە، بەڵکوو خزمەتکار و سێبەری مەوزوعی دیکە بوون. هێندەی فۆلکلۆر بە بسکی یار و خەنجەری گەنج و خەلیل و پەری و خەزنە و ڕەخش و جنۆکە و فریشتە و پاشا و مەلا و شێخ و ئەوان شتانەوە خەریک بوە سەدیێکی وان گوێی نەداوەتە مەوزووعی ئەوتۆ گیانی پڕ جۆش و خرۆشی شۆڕشگێڕێکی ئیمڕۆ تەسکین بکا.

لەتەک دەریا دەریای فۆلکلۆری سەر بە ئایین و ڕەزم و دڵداریدا جۆگەلەیێکی بچووک نادۆزیتەوە بە تەئویل نەبێ ئەو گیانە میللی و شۆڕشگێڕەی تێدا بێ کە تۆش و منیش حەز دەکەین بە هەبوونی. دیار نەدانی گیانی بزۆز و سەر بە ڕەفزیش لە فۆلکلۆرماندا ئەنجامێکی ئاسایی تێفکرین و خەریکبوون و یزدان و دڵ و

دەروونی میللەتەکەمان بوە، زۆردار و داگیرکەر بە هەڕەشە شایەر و حیکایەتخوانی کوردیان لە هەڵبەست و سەرگوزەشتی بڵێسەدار نەتۆقاندوە. نە «ضریبة» هەبوە لەسەر بەستە و گۆرانی، نە وەک ئێستاش «رقیبی عسکری» وەیا «وەزارەتی ڕاگەیاندن» چاوەدێری سرکە و کورکە و گڕوگاڵی خەڵقی کردوە.

هەر وەک شایەر و گۆرانیبێژ لە خۆوە حەزیان کردوە لە بەستە و هەڵبەست و ئاهەنگی زرینگەدار، تێکڕای خەڵقەکەش هەر چاوەنۆڕی بەند و باوی لە عادەتبەدر و دڵبزوێن بوون. ئەگەر فێڵ لە خۆمان نەکەین و بە ئانقەست واقیع نەگۆڕین ئیمڕۆش عالەم هەر وایە، چ لە ناو کورد بێ چ لە ناو غەیری کورد، دەسەڵات و پێویستی سیاسی لێ ناگەڕێ چی لە دڵاندا هەیە بێتە سەر زاران.
نووسینم دیوە ویستوەتی لە ڕێی فەلسەفەی «خەباتی چینایەتی» بگا بەو ئەنجامە کەوا هەر بەرهەمێکی فۆلکلۆری گیانێکی شۆڕشگێڕی تێدا بێ لە چینی چەوسایەوە سەری هەڵدابێ و بۆ بەتین کردنی خەباتی خۆی لە دژی خوێنمژ، گۆیا ئەو گوتە و پەندانەش کە هیممەتشکێن بن زۆردار هەڵی بەستوون بۆ چاوشکانی زۆربەی گەل.

ئەم گوتەیە تا بڵێی بێبەڵگەیە و لەبەر هیچ ڕەخنەیێکی بەهێز و بێهێز ناوەستێ. هەر پێی ڕازی نەبیت دەچێتەوە وەک بەفری هاوین. جارێ لە پێشەوە با بڵێم نووسەر دەیتوانی لە هەمان ڕێی خەباتی چینایەتی و چەوساندنەوە بگا بە ئەنجامێکی دژی ئەنجامی پێشوو و بیگوتایە چینی هەژار هێندە تۆقاندراوە و خراوەتە ژێر چەپۆکی خوێنمژ لەبیری چۆتەوە قسەی ئازایانە و پەند نەسەلمێنانە داهێنێ. بە دوا ئەم قسەیەدا دەیتوانی بۆ ئیسپات کردنی، بەڵگەش بێنێتەوە لەوەدا بە سەدان ساڵ جارێک نەبوە جووڵەیێک بکا لە دژی خوێنمژ، ئەگەر جارێکیان لە جێگەیێک بزووتنەوەیێک بووبێ هەر لە هەمان جێگە دوای کوژانەوەی بزووتنەوەکە پشتاوپشت خەڵقەکە خەوی لێ کەوتۆتەوە. لە هەندێ وڵاتیش بە درێژایی مێژوو بزووتنەوە نەبوە لەدژی هیچ کەس.

نەبوونی بزووتنەوە ڕێک دێ لەگەڵ ئەوە کە پەندی هیممەتشکێن هی زۆرینەی خەڵق بێ. ناچێتە عەقڵەوە بەشی زۆری میللەت هێندە ناڕازی و نەسەلمێن و شۆڕشگێڕ بێ کارگەی پەند و بەستەی شۆڕشگێڕانە دانێ کەچی جووڵەی لەبەرەوە نەیێ. کە میللەت بگاتە ئەو پلەیە لە هۆشیار و خۆناسین و دوشمن ناسینەوە پەندی

مناسبی حاڵ دانێ ئیتر بۆ دەبێ شەقێک لە دامودەسگای زۆردار هەڵنەدا و دەسەڵاتی لی نەسێنێ، خۆ ئەگەر پەککەوتن بە نیسبەت زۆرینەی خەڵقەوە هەر لەسەر هۆش و هەست کردن کەوتووە، دەسەڵاتی زۆردار لە ئاسمانەوە بۆی نابرێ چەک و جبەخانەشی لە غەیبەوە نایێ، مەلائیکەت و پەریش بۆی هەڵناگرن. من کە قسەی وا سادە دەکەم لەبەر زێدە سادەی ئەو قسەیەیە کە ڕەخنەی لێ دەگرم.

هەڵبەت دەسەڵات گرتنە دەست وا بە ئاسانی نابێ بەڵام کە بیروباوەڕێک بەلایەوە وابێ میللەت بەدرێژایی مێژوو هێندە شۆڕشگێڕ بوە فەلسەفە و ڕۆحی شۆڕشگێڕی بخاتە ناو گوتە و پەند و قسەی نەستەقیەوە، دەبێ لێی بپرسرێ ئەرێ برا ئەدی بۆ بە درێژایی مێژوو میللەت بزووتنەوەی نەکردوە لە دژی خوێنمژ، بۆ لە ماوەی دوو هەزار ساڵاندا فەلسەفە شۆڕشگێڕەکەی نەکرد بە «دەستوور العمل»؟ ئەم پرسیارانە و هی دیکەی وەک ئەوان دێتە پێش و لە ڕاستیدا چ وەرامیان نیە، بەڵام ئەوەی ئارەزۆ بکا دەتوانێ بە پێی کەیف و خواهشتی دڵ و بیر و باوەڕی خۆی وەرامان بداتەوە کە هیچیان لە ئەسڵی گوتەکە بەهێزتر نەبن...

یەکێک کە گوێی نەدایە بوون و نەبوونی بەڵگە و گوتی «نان ئەو نانە ئیمرۆ لە خوانە» مۆرفینی دەرەبەگە بۆگێژ کردنی، بڵێین فەللاح و «دەستێک نەتوانم بیبرم ماچی دەکەم» مەلا و شێخ و دایان ناوە بۆ سوودی ئاغا و زیانی ڕەشوڕووت و هەژار، دەشتوانێ بە ئاسانی خۆی ئیقناع کا بە هەر وەرامێک بێ بۆ ڕەد کردنەوەی ئیعترازان.

بەڕاستی مرۆڤ دەبێ خۆی زۆر ماندوو کا تا ئیقناع دەبێ بەوە ئەو فەللاحەی دەستە و نەزەر بۆ ئاغا ڕادەوەستێ و فەرمانەکانی جێبەجێ دەکا، واش دەبێ خەڵقی بۆ دەکرێ، هەر هەمان فەللاحە کە ئاغا پشتی کردەوە پەندی شۆشگێرانە دادەنێ لە دژی و مافخواروی پێ هۆشیار دەکاتەوە. خۆ باشتر ئەوە بوو پەندەکەش دانەنێ و دەستەو نەزەریش بۆی ڕانەوەستێ. ڕێز لێگرتنەکە بە چاو دەدیترێ و چ تەئویلان هەڵناگرێ، بەڵام پەند دانان، لە فەرزی بە خۆڕایی بسەلمێنین کە فەللاح دای ناوە لە دژی ئاغا، گوتەی پەنا و پەسیوانە تەمغەی لێندراوە بیکا بەماڵی فەللاح و دوشمنی ئاغا. تێناگەم ئەو فەللاحەی سەدان ساڵ پێش ئیمرۆ ژیاوە چ فەللاحێک بوە گوتە و کردەوەی هێندە لێک دوور بوون، لە هیچ ڕوێکەوە خزمایەتی نیە لەگەڵ

ئەو فەللاحەی خۆمان دەیناسین. بەپێی ڕاگەیاندنی ئەو تەحلیلانە کە تازە ڕەخنە لێ گرتن فەللاحی لێرە بە پێشەوە زادەی ئەفسۆن و تەڵەسم بوون، بە فەلسەفە نەبێ تێیان ناگەین.

خۆ ئەگەر چاویش لەوە بپۆشین کە تازە گوتمان، ڕەخنەی دیکە دێتە پێشەوە و چ وەرامیان نیە. کە میللەت پەندی شۆڕشگێڕانەی دانا بۆ تیژ کردنی ئیرادەی خۆی چۆن تەدبیری ئەو لایەنە دەکا کە دوشمنەکەی سوود وەرنەگرێ لە پەندەکان؟ کێ دەڵی کوڕی دەرەبەگ و خوێنمژ بەو پەندانە دڕتر و ئازاتر نابن! هەروەها کە درەبەگ پەندی سەرکزەڵەی ڕێک خست بۆ هەڵفریواندنی گەل چۆن ئەمینە لەوە کوڕ و نەوەی خۆی لە دوارۆژدا بەو پەندانە عەزمیان ناشکێ؟

ڕاستی ئەوەیە فۆلکلۆری کوردی هی هەموو کوردە و دڵ و دەروونی تێکڕای خەڵقەکە دووبارە دەکاتەوە. چ خەباتێکی چینایەتی بەرچاو لە نێو کوردا نەبوە ببێ بە فەلسەفە و بچێتە ناو فۆلکلۆرەوە. چۆنەتی حاڵیش بەوە ئیسپات نابێ کە من یا تۆ یا فەلسەفەیێک وا حەز دەکا. سەیر ئەوەیە تاکوو ئێستاکەش فۆلکلۆرمان نەبوە بە دوو کەرت و سێ کەرت، بەو مانایە کە پەندی خەباتی چینایەتی و خەباتی دینی و خەباتی دەرەبەگی خۆ لە یەکدی جوداکەنەوە، مەگەر من و تۆ خەریک بین لێرە بەولاوە بۆ ئیسپات کردنی گۆشەی نیگای تایبەتی خۆمان پەندان ڕێکخەین و بە زاری خەڵقیاندا بێنین. قسە لە فۆلکلۆرە نەک لە نووسین و شیعر چونکە پێی ناوێ من بڵێم نووسەر و شاعیرەکان هەر یەکە سەربە لاییکن و بیر و باوەڕی ئەو لایە دەڵێنەوە. عومری ئەم دیمەنەش لە 20-30 ساڵ تێپەڕ ناکا، بەر لەوە شیعر و نووسینیش گیانی «چینایەتی» تێدا دیاری نەکراوە، کە واتاییکی نارەزامەندی هاتبێتە ناویانەوە لە ڕێی گیانی دادخوازی و ستەم نەویستییەوە بوە.

گیانی نارەزامەندی و شۆڕشگێڕی لە فۆلکلۆر و غەیری فۆلکلۆردا کاتێک دەبێ بەماڵی چینێک کە بە سەراحەت ئەو مەبەسە ڕاگەیەنێ، کە مەیل و ئارەزۆی من و تۆ تێیدا بەشدار بوو ئەوسا بۆ چ لاییکمان مەبەس بێ دەتوانین، لەگەڵ نەختێک وشەسازی، بیدەین بەو لایە، سەیری ئەم گوتەیە بکە کە دەڵێ «زاڵم هەی زاڵم، گاش بدەم بەفریش باڵم» چەند ڕێک هاتوە لەگەڵ ئەو واقیعەی خۆمان دەیزانین بەر لە پەیدا بوونی فەلسەفەی تازە. مەزڵوومە و بە دەست زاڵمەوە زیرەی لێ

مزگەوتی مەبەس بووە، شاعیر و شێخی تەریقەتیش بەم خوێندنە پێگەیشتوون و تێگەیشتوون، یەکێک لەوان شۆرەت و ناوی پەیدا نەکردوە ئەگەر دەستێکی درێژی نەبووبێ لە خوێندەواری، کە بریتی بوە لە خوێندنی مزگەوت. بوێژێک کە خوێندەوار نەبووبێ و هەڵبەستی دانابێ پێی گوتراوە «شایەر». شێخێکیش

---

هەڵستاوە بێ ئەوە گوتەکە ڕابگەیەنێ زاڵم کێیە و زوڵم لێ کراو کێیە، یاخود لەسەر چینێکی دەستنیشانکراو بکاتەوە. لە لانی گیانی شۆڕشگێڕیشەوە هەر هێندەی تێدا دەدیترێ کە فکرەی دادخوازی بە گشتی لە دژی ستەمە. وشەی «گا» لە لای خۆیەوە یارمەتی ئەوە دەدا کە پەندەکە بۆ کۆمەڵێکی فەللاحی بباتەوە چونکە مەزڵوومێکی شارستان گاجووتان شک نابا تا زۆردار لێی بستێنێ لەبری بەفر نەماڵینەوە، بەوە نەبێ دیار نادا زاڵمەکە ئاغایە نەک زۆردارێکی دیکە. پەندەکە هەر هەندەشی دەربڕیوە کە زاڵم زۆڵمی خۆی دەکا تا بۆی بکرێ، لە زوڵمەکەش نارازییە، لەوە بەولاوە نە لە دژی مڵکایەتی ئاغایە نە چ ڕێگەیێکیش دەگرێتەبەر بۆ بەرهەڵستی زوڵمەکە. دەتوانم بڵێم پەندەکە ڕازییە بە نیوەی زوڵمەکە، واتا یا بەفر ماڵین یاخود گاجووت دان. ماوەیێکی فرەوان هەیە لە میانی ئەم پەندە و گیانی شۆڕشگێڕی، ئەگەر من و تۆ یارمەتی نەدەین لە خۆوە نای بڕێ.

دادخوازی و زوڵمنەویستی جاران نە ڕەنگێکی تایبەتی لە خۆی دابوو نە خۆیشی بە هیچ بەرە و تاقمێکەوە بەستبۆوە، خودئاسایی و بێ هاندەر و هەرەشەکەر لە دەروونی خەڵقەوە هەڵدەستا دەچووە پەند و بەند و بەستە و گۆرانی و حیکایەتەوە، ئیتر تا چ ڕادەیێک دادخوازییەکە و زوڵم نەویستیەکە تێهەڵدەکشا، پەیوەندیێکی نەبوە لەگەڵ چینایەتی و قەومایەتی و ئەو جۆرە «...ایەتی»یانەوە.

بەداخەوە ناتوانم چی دیکە لەسەر مەوزووع بڕۆم، تا شتێکی زیاتری لەسەر بنووسم پێویستم پتر دەبێ بە بەڵگە و ئیسپات و ڕەد کردنەوەی ئیعتیرازان و لە ئەسڵی بابەت دوور دەکەومەوە. ئەو هێندەی نووسیم بایی ئەوە دەکا، تا ڕادەیێک، بیر و باوەڕی من ڕوون کاتەوە دەربارەی پایەی فۆلکلۆر، ئەو هۆیەشی بە دەستەوە دا کە بوە مانیع لە ڕاگرتنی فۆلکلۆر لە ڕیزی خوێندنی مزگەوتان. لێرەدا چی دیکەم مەبەس نیە.

نەخوێندوو بووبێ پێی گوتراوە «کۆلکەشێخ» وەک مەلای نیوە خوێندوو کە بە «کۆڵکەمەلا» ناوی دەرکرد.

مەلایەتی لە شیعری تێکڕای شاعیرانی پێش قۆناغی نوێ دیمەنێکی تابلێی بەرچاوە. سەیری یەم بەیتەی«کوردی» بکە چەند مەلایەتی و شەرعناسی تێدایە:

تۆ دەست بە تیغ و پەنجە بە خوێن سوور و دڵ «قتیل»
«لوث» یش «ثبوت»ی دەعوییە یا ڕاستە یا درۆ

ئارایشت و زینەتی بەشێکی زۆر لە شیعری شاعیرەکان ڕاستەوخۆ لە کتێب و زانستەکانی مزگەوتەوە هەڵدەستان و بە پێی دامەزراوی شاعیر لەو زانستانەدا «تکلف» لە بەکار هێنانیان بزر دەبوو، وشە و زاراوەی زانستەکانی لەگەڵ شێوەی بوێژیدا پتر دەگونجان. ئەم بەیتەی »مەحوی» کەوا پڕە لە مەلایەتی وەها ڕەوان هاتووە و هێندە دەستەملانی مەبەس و زامی شاعیر بوە لەوەدا کە دەڵێ:

لەسەر تۆ دوشمنە عالەم «قضیە»م «مانع الجمع»ە
کە تەرکی تۆ نەکەم تەرکی هەموو دونیا نەکەم چ بکەم

فەرقێکی ناکەم لەگەڵ ئەم فەردە ئاگرینەی »کوردی»:

ئەمان سەرقافڵەچی کاروان دەخیل سا چەرخەچی لەشکر
جڵەوی هەڵکێشە ڕەحمێ کە، کە جارێکە و هەر ئیمجارە

لە دیوانی حاجی قادردا چەندین هەڵبەست هەن زادەی کوتومتی مزگەوتن، وەک ئەویش هەموو ئەو شاعیرانەی مەلا بوون و بە دوایی شۆرەتی شاعیری غەلەبەی لێ کردوون وەک نالی و مەولەوی و وەفایی و بێخود و صافی، ئەسەری خوێندنی مزگەوت لە سەرانسەری دیوانەکانیاندا دێتە بەر هەموو چاوێک، نەک هەر چاوی سرنجدەر. لەوەشدا چ سەیرێک نیە، دیاردانی مەلایەتی لە شیعری مەلادا وەک ئەوەیە گەرمی لە ئاگر و ساردی لە بەفرەوە هەڵستێ. ئەوەندەی شیعرم دیبێ لە

کوردیدا کەموزۆر ئەو مەلایەتییەم تێدا دیوە مەگەر شیعری مەلای گەورە نەبێ، هەرچەند خۆیشی مەلا بوو بابەتی خوێندنی مزگەوتی بۆ ئارایشت نەهێناوەتە ناو هەڵبەست، لەبەر غەلەبەی لانی کۆمەڵایەتی بۆ ڕەخنەلێگرتن نەبێ ناوی نەهێناوە وەک ئەوەی کە دەڵێ:

ئەتو خودا پێم بڵێ مامۆستای ڕووت و برسی
هیچ ئیشی تۆ پێک دێنێ شیعری «امرؤ القیسي»

یاخود:

عیلمی تەبیعەت عیلمی خودایە
«قال و قول» گشیتی هەبایە

زۆری دیکەی وەک ئەمانیش.
حاجی قادر یەکێکە لەو شاعیرانە کەوا مەلایەتی لە شیعریاندا جێگەی دیارە و بەکارهێنانی فنوونی خوێندنەکەیان ڕووکەشی و سەرەڕۆ نیە بەڵکوو لە بۆ ناخ و ناوەڕۆکی واتای هەڵبەستەکانیان قووڵ بۆتەوە. لێرەدا ئەم چەند نموونەیە لە شیعری حاجی قادر بەسە بۆ دیار خستنی مەبەس:

1)
بخونە «کافیە» و «شافی» «کمالی» نەشئەیی جاهی
صەدی وەک «إبن حاجب» «صرف»ی عومری کرد بە حەیرانی

2)
تەماشام کردوە نەقشی «دراهم» «صرف»ی «ممنوع»ـە
کەچی «قاضی» «اضافة»ی کرد بە «مفتی» هاتە بەر چەنگی

3)
ئەم«نحو»ەیە «صرف»ی عشقبازی
«مستقبل»ی کەمترە لە «ماضی»
«کشاف»ی ڕموزی »ایە» تی تۆ
«تفسیر کبیر» ی «فخری ڕازی»

وادەزانم درێژە کێشانی خوێندنی حاجی دەخلێکی بووبێ بەسەر تێکەوتنی واتای سەر بە دەرسی فەتێیانە لە شیعرەکانی. بە شایەدی دەستنووسی خۆی تا 1277ی کۆچی خەریکی «سیوطي» بوە کە ئەوسا بە پێی لێکدانەوەی من تەمەنی 36 ساڵی بوە و بە پێی نامیلکەکەی مەلا عەبدولڕەحمانیش 45 ساڵی بوە. بێگومان بەدوا «سیوطي»یشدا کتێبی دیکەی خوێندوون چوونکە ئەگەر هەر بایی «سیوطي» مەلا با ئەو هێزەی نەدەبوو لە شیعری مەلایانە، بەڵکوو لە تێکڕای شیعرەکانی چونکە وەک لە خوێندنەوەی دیوانەکەی دەرکەوێ حاجی تا بڵێی خوێندەوار و باخەبەر بوە لە هەموو ئەو مەیدانانەی ئەوسا خەڵق جوتە ئەسپی قەڵەم و زمانی تێدا غار داوە. بەڵام حاجیش وەک مەلای گەورە بە غەلەبە لێ کردنی لانی کۆمەڵایەتیی و سیاسی و نیشتمانپەروەریی مەیلی کەم بۆوە، یاخود هەر نەما، بۆ ئارایشت دانی شیعرەکانی بە واتای مەلایانە. کە هانای بردبێتە بەر مەلایەتی و ئایین بۆ سەپاندنی بیروباوەڕ و خواهشتە میللییەکانی بوە بۆ ئەوە خەڵق ئیقناع کا وەیا زمانی مێشکوشک ببەستێ وەک ئەوەی کە دەڵێ:

بۆچی فەرموویەتی ڕەسوولی ئەمین
«اطلبو العلم ولو بالصين»

ئەم بەیتە، بۆ خاتری وەزنی ڕاست بێ، یا دەبێ وشەی «العلم» «العيلم» بخوێندرێتەوە، یا دەبێ نیوە بەیتەکەی دوایی بکرێتە: «اطلبو علمكم ولو بالصين». حاجی بەهەر لایێکیدا گوتبێ ئاگای لە پێداویستی کێش هەبوە، لە فەرزی «العيلم»ی گوتبێ چاوی لە لانی شاعیری پۆشیوە بۆ لانی کۆمەڵایەتی. لە هەندێ شوێنی دیوانەکەی ئەم زاهیرەیەی قوربان کردنی شاعیری بە فیدای نیشتمانپەروەری خۆی دیار خستوە، بەڵام هەست بەوە دەکرێ شوێنەکان ئەوەندە پڕ بوون بە عاتیفەی سووتێنەر تۆ و منیش تێیدا بێباک دەبین لە عاست جل و بەرگ و ئارایشت.

لزووم نابینم نموونەی دیکە بێنمەوە بۆ ڕوون کردنەوەی لانی هانابردنە بەر مزگەوت و ئایین بۆ مەبەسی کۆمەڵایەتی لە شیعری حاجی قادردا، تەماشا

کردنێکی سەرپێی دیوانەکەی بێنیازت دەکا لەوە من یا غەیری من، نموونەت بۆ بێنێتەوە.

شێخەکانی تەریقەتیش، وەک شاعیرەکان، زانستەکانی مزگەوتیان خوێندوە و لێی بەڵەد بوون، بەڕادەی مەلایەتیشیان شێخەتییان بایەخدار بوە. لەمەدا وەنیە هەر کورد شێخی چاک و مەلای چاکی بووبێ، هەموو ئیسلامەتی بە تورک و عەرەب و فارس و ئەفغان و هیند و ڕەش و سپیەوە لەم کارەدا وەک کورد بوون. دەتوانم بڵێم، بێ هەڵبواردن، شێخێکی ناودار نیە لە قادریی و نەقشبەندی و شاذلی و رفاعی و هەموو تەریقەتەکانی «تصوف» دا زێدە مەلا نەبووبێ. لە کوردەواریدا هەرچەند وابوە مەلای باش لەبەر کەمدەستی و نەداری بوە بە مرید و خەلیفەی شێخێکی لە خۆی کەمتر مەلا، بەڵام ئەغلەب مەلای خاوەن تەدریس و پایەی بەرزی زانست لەبەر باوەڕی بێفێڵ و تەئویلی خۆی بە ڕاست و دروستی شێخێک لە «شرع و تصوف» دا، بوە بە مریدی و تەریقی لێ وەرگرتوە.

لە دیوانی وەفایی «مەلا ڕحیم» کە مەلاییێکی تەواو مەلا بوە سرنج بگرە دەبیبنی ئەو مەرسیانەی کە بۆ شێخی خۆی داناون لە ئەغڵەب شیعرەکانی بە تەئسیرترن، ئەگەر نەڵێم لە هەمووان:

لە باغان ئاهـ و نالین دێ دەڵێن شاهی گوڵان ڕۆیی
لە مەیخانان سەدای شین دێ دەڵین پیری موغان ڕۆیی

یەکێکە لە شیعرە هەرە بەناوبانگەکانی زمانی کوردی. وەک ئەمیش دوو دێڕە شیعری خوارەوە کە ئەوانیش مەرسیەن و «وەفایی» بۆ شێخی خۆی هەڵبەستوون:

بولبول وەرە تا ڕۆحی من و تۆیە بناڵین
تۆ باغی گوڵانت چوە من داغی دڵانم

قومری وەرە تا ڕۆحی من و تۆیە بگریەین
تۆ سەروی ڕەوانت چوە من ڕۆحی ڕەوانم

ڕابردووی دوور و نێزیک پڕە لە شایەدی وەها کە ئیسپاتی ئەوە بکا شێخە چاکەکانی مەلای چاک بوون. لێرەدا با کاک ئەحمەدی شێخ و مەولانا خالید بکەین بە میسالٚ کە بەلای زوربەی کوردەوارییەوە ناسراون. هەر دوویان تا لە مەلایەتی نەگەیشتوون بەوپەڕی دامەزراوی ملیان نەناوەتە بەر »تصوف و ارشاد». پیاوێکی وەکوو حاجی مەلا عەبدولا بەدوا ئیلحاحی چەند ساڵانەدا ئیجازەییکی[15] کورتیلەی لە کاک ئەحمەدەوە بۆ هاتوە.

لەم مەیدانەی زانستی سێ شەقامی مەلایەتی و شێخەتی و بویژیدا، کورد شان بە شانی میللەتانی دیکە ڕۆییوە و یەک هەنگاو لیان دانەماوە. لە مەیدانی مەلایەتی و شێخەتیدا لە کۆنەوە و لە مەیدانی بویژیدا لە سەدەی نۆزدەمەوە، هاوتایی کورد لەگەڵ میللەتانی ئیسلامدا دیمەنێکە بە پانایی ڕووپەڕەی ژیانی کورد. مەلای هاوتای گەورەترین مەلای گەلانی دیکە و شێخی هاوتای پێشەواکانی تەریقەت و شاعیری هاوتای هەرچی شاعیرێکی ڕۆژهەڵاتی گەورە هەیە، لە کوردان هەڵکەوتووە.

لەم مەیدانەی زانست و مەعنایەدا گەلی کورد مەودایێکی هێندە زۆر درێژ لە واقیعی ماددی خۆی پێشکەوتوە هەرچی نزیکی و خزمایەتی هەیە لە بەینیاندا بڕاوە. لە هیچ ڕوێکەوە هەڵکەوتی ماددیی کورد زەرف و سەرچاوەی ئەو «زانست و مەعنا»یە نەبوە، ئیمکانیش نەبوە ببێ بەوە زەرف و سەرچاوەیە. ئەم دیمەنەی لەیەکنەچوونی بوونی «ماددی» و بوونی «معنوی و زانستی» ی کورد هەرچی ڕاستە حیسابێکی لێکدانەوەی ماددی هەیە لە بەستنەوەی «فکر» بە ماددەوە دەکا بە کارێکی خەیاڵی ئەفسانەیی.

نیسبەتی ڕۆشنبیری و زانست و »معنی»ی کوردەواری لەگەڵ میللەتی کورد و خاکی کوردستان وەک نیسبەتی مێوان وایە لەگەڵ ئەو قۆناغەی لێی دابەزیوە. هەر بایی ئەوەی کە مێوان زادەی ئەو ژوورەیە بە کرێ تێیدا دەنوێ، زانست و «معنی»ی کوردستانیش لە خاک و دانیشتوەکانی کوردستان و کوردەوە هەڵقوڵیوە. هەروەک چێشتی ماڵی پاشایێک بێنێ بۆ ماڵی گەدایێک یاخود جلی سمۆکن لە دوکانی جلدوورێکی ملیۆنێرانەوە بێنێ و لەبەر سەپانێکی بکەی، زانستەکانی یۆنانی

---

[15] – بە زەنگۆغراف لە یەکەم ژمارەی کۆڕی زانیاری کورددا بڵاوکرایەوە.

کۆن و سەردەمی ئیسلام و فەلسەفەی هیند و ڕۆشنبیری فارس تێکڕایان بە حازر و بزری لە ڕێی کتێبانەوە هاتنە نیمچە ویرانگەکانی کوردستان... لە شارۆچکە و قەسەبچەکانەوە تێیان کرد بۆ هەموو کوردەواری، بگرە نێو زنج و ڕەشماڵیش.
دەبینی مەلاییێکی کوردی ڕووت و برسی بێ پارە و پوول لەسەر بەردێکی ڕەق بە دەوری کانیاوی گوندێکی هەژاری کوردەوە خەریکە فەلسەفەی ئەفلاتوون و مەنتیقی ئەرەستۆ و هەندەسەی ئیقلیدس و فەلەکی بطلیموس و شەریعەتی ئیسلام و زانستەکانی معتزلی و ئەشعەری و ئەدەبی متنبی و معرری و سعدی و حافظ بە ڕەوانی و بەوپەری ئوستادییەوە دەڵێتەوە بۆ فەقێیەکی کوردی لە خۆی ڕووت و برسیتر.

لە قاهیرە و ئەستەمبوڵ و شام و بەغدا و لاهور و تونس و مەراکیش و فارس و زانستگاکانی ئەورووپای پێش 500 ساڵ چ ماددەیێک دەخوێندرا هەمان ماددە لە هەرتەلی ڕانیە و عەبابەیلێی شارەزوور و ڕوستێی ڕەواندز و دێیەکانی وەک ئەمانی هەموو ناوچەکانی کوردستان لەبەر چراقۆدیلە و لەسەر حەسیری شڕ، واش دەبوو بێ چرا و حەسیر، بە دەرس دەگوترانەوە و کتێبیشیان لەسەر دادەنرا.

لەبارەی باوەڕ و «عقیدە»ی ئاینیشەوە زوربەی کوردەواری تاکە یەک تەلی پەیوەندی ساغی بە ڕابردووی کۆنی خۆیەوە نەماوە لەو کاتەوە کە ئاینی ئیسلام بڵاوبۆوە و بو بە جێگیری زەردەشتی.

زانست و باوەڕ و ئایین کەوا کاکڵی ژیانی«معنوی» کورد پێک دێنن یەک دێڕ و وشە و پیتی لە سەرچاوەی کورد و کوردستانەوە هەڵنەقوولیوە، هیچیان ئاوێنەی ژیانی ماددی و ئابووری کورد نین و هەموویان دەرەکی «خارجی»ن. ژینای ماددی و ئابووری کوردی کرد بە کۆیلەی خۆی، بە «حەقلی تجربە»، بەپێچەوانەی چاوەنۆڕ کردنی ڕواڵەتی تیۆریەکانی ماددی، ژیانی کورد بوو بە ئاوێنە بۆ زانست و باوەڕێکی مێوان.

لەو لەحزەی منداڵ بە زگی داکی دەکەوێ تا ئەو کاتەی دەچێتە قەبرەوە هەموو چرکە سەعاتێکی عومری مەحکوومە بە «قران و شرع» و زکر و فکری پیاوچاک و شێخ و مەلا و هێزی نهێنی سەر بە بەهەشت و جەهەننەم. مەڕەکەی، دەغڵەکەی، باغەکەی، زەوی و ئاوەکەی، پەرژین و نێوانەکەی، سەلەم و ڕیێدەکەی،

زەکات و سەرفترەکەی، نوێژ و حەجەکەی، ژن هێنان و تەڵاقدانەکەی، تیجارەتەکەی… مەڕ سەربڕینەکەی و «بسم الله» لێ هێنانەکەی، غەزا و خۆ بەکوشت دانەکەی، خەون و خەیاڵ و شەونخوونی و «تهجد» و ڕۆژیەکەی… ئەمانە و هەرچی هەیەتی لە لەش و ماڵ و ژن و خێزان لە نێو ئەو جغزانەدا دەخولێنەوە کە ئاینی ئیسلام لە مەککە و مەدینەڕا بە دیاری بۆی ناردوە. هیچ نیسبەتێکی نیە لەگەڵ کوردستانی پێش ئیسلام، تەنانەت چەند ناوێکی وەک بەسێ و گوڵێ و پیرۆت و سوارە نەبێ هەرچی ناوی کوردیش بوو گۆڕا بە ناوی پیاوە ئاینییەکانی عەرەب یاخود هەر عەرەبی عادەتی.

خولاسە ژیانی «عقلي و معنوی» کورد لە هەزار ساڵ زیاترە زادەی کوردستان نیە تێکەڵ بە ژیانێکی یەکجار فرەوانتر بوە لە کوردستان، بە ماددە و مەعنایەوە. تۆ بڵێ ئەگەر واقیعی کورد بوبا بە سەرچاوەی زانست دەبوا کەی ئەم واقیعە شەرحی ڕۆژگیران و مانگیرانی بۆ دابا یا مەساحەی جغز و چوارگۆشە و سێ سووچی بۆ لێکدابایەوە؟ یاخود ئەگەر باوەڕ «عقیدە» لە ئاسۆی کوردستان و تاڤگە و شاخ و دارستانەکانیەوە هەڵستابا و تێکەڵ بە کۆمەڵایەتی و ئابووری کورد بووبایەوە دەبوا چ نوێژێک پێک بێنێ خزم بێ لەگەڵ دوو ڕکعەتی سبەینان و بەرز کردنەوەی پەنجەی شەهادە بەرەو قیبلە؟ تۆ بڵێی تەڵاق و میرات ئەوەبان کە 1300 ساڵە لە ناو کوردان بوە بە یاسا؟ پێویست بە درێژەدان ناکا، ئەوەی تازە خستمە ڕوو «بدیهیە»یێکە لە هەر چوار دەوری ماددی و مەعنەویەتەوە ڕووت تێ دەکا و بەقەدەر خۆت و وجودت ڕاستییێکی زیندوە و نەفەس هەڵدێنێ.

نەختێک سرنج بگری، ئەم ڕاستییە تیشک بۆ ئێستاکەشت داوێ، کە قیاس لەو بکەی دەبینی زانست بیروباوەری فەلسەفی زوربەی خاوەن فکری کوردی ئیمڕۆش لە جەرگەی کوردەوارییەوە هەڵنەقوڵیوە، ئەویش وەک زانست و باوەری هەزار ساڵ لەمەوبەر بە دیاری بۆی هاتوە، بەڵام ئەمجارەیان لە ئەورووپاوە. نە ماددەکانی خوێندنی زانکۆی سلێمانی و نە فەلسەفەی سیاسی و ئابووریی جۆرجۆر کەوا لە بەربەرەکانی یەکدی دان لە کوردستان، زادەی کوردەوارین. واقیعی کوردستان ئێستاکەش ئەوە نیە لە هەناوی خۆیەوە ئەو تەرزە بەچکە مەعنەوییە «ئەریستۆکرات»انە بێنێتە سەر دونیا. مامۆستا لە دەرەوە خوێندن و دەرسی ئەو ماددە و فەلسەفانەمان نەدەن بە وڕێنەش نایێنە خەیاڵمانەوە.

وەنیە من لێرەدا بە تەنگ بێم لە هاتنە ناو فەلسەفە و زانست و باوەڕی دەرەکی[16]، بێگومان ئەگەر چاوەنۆڕی پەیدابوونی زانست و فەلسەفەی ئەوتۆ بکەین زگماک کورد بن ئەوا هەر دەبێ چاوەنۆڕی بکەین، مەبەسم لە قسەکانم ئەوەیە واقیعی ڕاستەقینە دەربڕم. ئەگەر گەنجێک لەو «بدیهیە»یە غافڵ بووبێ بێنمەوە یادی. قسەکانم تا ڕادەییێک لایەنی خەیاڵیبوونی ئەو قەناعەتەیش دیار دەخا کە پێی وایە هەمیشە فەلسەفە و باوەڕ زادەی واقیعێکن کە تێیدا دەژین. کەچی وا لە پێش چاوتە فەلسەفە و باوەڕ لەدەرەوە بە سواری فڕۆک و گەڕۆک و کەشتی دێتە وڵاتەکەت و خەڵقیش بە دوا خۆیدا ڕاماڵ دەدا.

لێرەدا قسەییێکی بێهێز هەیە دەڵێ کە فەلسەفەی «دەرەکی» لەگەڵ پلەی گۆڕانی «ناوەکی» ڕێککەوت وەک ئەوەیە بۆ خۆی زادەی ئەو گۆڕانە بێ. بەڵام ئەم گوتەیە هەر لە ڕواڵەت و لەسەر کاغەز و بەسەر دەم و زارانەوە ڕاستە، لە واقیعدا کە بەرەیێک فەلسەفە لە دەرەوە دێنێ گوێ ناداتە «ناوەکی و دەرەکی و گونجان و نەگونجان» بۆ خۆی بڕیاری پێشەکی داوە فەلسەفەکە بسەپێنێ، لەوەدا ئەرزەحاڵی خەڵقیش ناخوێنێتەوە با خەڵقەکە زوربەی میللەتیش بێ.

خوێنەر وا تێنەگا خوێندنی مزگەوتان شتێکە و زانست شتێکی دیکەیە. بەر لە ڕاپەرینی زانستی نوێی ئەورووپا، لە هەموو جیهاندا هەر ئەوە زانست بوە کەوا لە مزگەوتەکان بەدەرس دەگوترانەوە. تائێستا لە نێو زاناکانی ئەورووپادا کە ناوی «إبن سینا» دێ وەک ناوی «ئەنیشتاین» هاتبێ وایە. مەعلوومە «إبن سینا»ش مەلاییێکی زێدە گەورەی سەردەمی خۆی بوە. لە ڕووی نابەلەدییەوە گەلێک لە گەنجەکانمان بەلایانەوە خوێندنی «دین» خوێندنی «جهل»ە کەچی گومان لەوەدا نیە مامۆستای ئەوگەنجانەش نابن بە فەقێی باش لای مەلای «إبن ادم» ئەگەر ئیمڕۆ زیندوو بایە. گەنجی خوێنگەرم و کەمتەجرەبە و نیگاتەسک بە خوێندنی سەرەتایی هەندێ لە نووسینەکانی سیاسی و ئابووری و فەلسەفی، بە هەموو دڵیەوە، وا لە خۆ دەکا کە بوە بە «علامة الدهر» و کلیلی دەرگای ڕابردوو و پاشەڕۆژ وا لە نێو پەنجەکانی، ڕاستییەکان و نهێنییەکانی سروشت و مێژوو بوون بە خزمەتکاری

---

[16] - پێشنیازی کۆڕی زانیاری کورد ئەمەیە «دەرەکی، لاوەکی، ناوەکی» بۆ «خارجي، جانبي، داخلي» بێ.

مێشک و میزاجی ئەو. ئەمە خەیاڵیکی بێ ئەساسی «مراهقە-هەرزەکارەتی»یە نە دەخلی بەسەر ڕاستییەوە هەیە نە بەسەر واقیع.

بە تێکڕایی خوێندەواری ئیمڕۆی کورد بەراورد بکە لەگەڵ مەلاکانی لەمەو پێش هەر لایە بە پێی زەرف و کاتی خۆیان هەڵیانسەنگێنە، بێگومان، تەرازووی مەلاکان یەکجار سەنگینتردەبێ. بە پێچەوانەی دواکەوتنی خوێندەوارێکی کورد لە خوێندەواریی «نموونە» ی ئەم سەردەمە، مەلایەکی کوردی 400 ساڵ پێش ئیمڕۆ هاوتای خوێندەواری «نموونە - نموذجي»ی زەمانی خۆی بوە، واتە ئەو زیاتر کوڕی ڕۆژگاری خۆی بوە لە مامۆستاییێکی ئێستای کورد.

پیاوێکی وەک »ابراهیم الحيدري» کە بوو بە «شیخ الاسلام» لە دواڕۆژانی خەلافەتی عوسمانی، مەلاییێکی هەولێری بوو. بە پێی دەوری خۆی پایەیێکی نەهێشتەوە لە ڕەوتی زانیاری ئاینی و جیهانی کە بۆ مەلاییێک مومکین بێ لێی سەرکەوێ. لەو دەمەدا ئەم مەلایە لە ڕووی هێز و دەسەڵات و ناو و مەقامی ڕۆشنبیرییەوە چەندین مەیدان لەپێش خوێندەوارانی ئیمڕۆی کوردەوە دێ بە پێی کاتی خۆیان. پایەی »شێخ الاسلام» لەوە بەرزترە یەکێک بگا بە پایەی پاداشتی«نۆبل». خۆ دیارە تا ئێستا تاکە کوردێک نە ئەو پاداشتەی وەرگرتوە نە لە دواڕۆژێکی بەرچاویشدا بەتەمایە وەری گرێ. لەمەشدا سەرت سوڕنەمێنێ، چونکەکە پلەی خوێندن لە ناو کورداندا بە گەزوگرێی سەدەکانی ڕابردوو لە ڕیزی تورک و عەرەب و فارس بووبێ دیارە خوێندەوارێکی ئێستای کورد لەو پلەیە دوا دەکەوێتەوە بایی دواکەوتنی ڕۆشنبیریی ئێستاکەمان لەچاو ڕیزی هەرە پێشەوەی ڕۆشنبیریی نوێدا.

دیسانەوە دەبێ ئەوەت لەبیر بێ، خوێندەوارێکی دوو سەد ساڵ لەمەوبەری کورد کە دەبوو بە پێشەوا لە مەیدانی ڕۆشنبیریدا شەهادەکەی لە فێرگەیێکی کوردستان وەردەگرت و لزوومی نەبوو لە پێناویدا بچێ بۆ دەرەوە.

لەم لایەنەی پەرەسەندنی خوێندنی مەلایەتی لەکوردستان، تایبەتییێک سرنج ڕادەکێشێ، بەڵام هۆیەکەی وەک خۆی، ئاشکرا نیە، بەڵکوو تا ئێستا ڕوون نەبۆتەوە. ئەم خوێندنە وەک لە کورستاندا بە دەشت و شاریەوە باوەشی بۆ کرابۆوە، نە لە نێو تورکان، نە عەرەبان، نە فارسان، تا ئەوەی بزانم، نە هیچ میللەتێکی دیکەی

ئیسلامدا هێندە خۆشئامەدی لێ نەکراوە. وەک باسمان کرد ژمارەیێکی زۆر لە گوندەکانی کوردستان مزگەوتی ئاوەدان و مەلای باش و تدریسی تێدا بوە، تەنانەت ئەوەندەی مەلای چاک لە گوندی کوردستان ژیاون و دەرسیان گوتۆتەوە بەقەدەر وان لە شار و نیمچە شارەکاندا پەیدا نەبوون، فەقێیەکانیش زوربەیان لای مەلای دێ خوێندوویانە. خۆ مەعلوومە هاوینان شارەکان فەقێی تێدا نەدەما بە هۆی ئەوەوە کە دەچوون بۆ گوندەکانی ناو شاخ و تا دەمەو پایز و بەسەرچوونی گەرما ئەوسا دەگەڕانەوە بۆ شار. زاتەن بەشی زۆری میللەتی کوردیش لە گوند ژیاوە نەک لە شار. بۆ میسالْ دەڵێم لە ناو پەڕاوێزی هەموو ئەو ڕووپێوە (مساحه) کە دەکەوتە سنووری ئێساکەی پارێزگەی (محافظه)ی هەولێر دوو سێ شار و قەسەبچەی تێدا بووە کە بە زاراوەی خۆمان پێیان دەڵێین شار دەنا هەر گوندی نەختەک گەورەی کەمێک ڕێکوپێک بوون.

ئەم زاهیرەیە وا بوە سرنجی نووسەری غەیری کوردیشی لێرە بەپێشەوە ڕاکێشاوە. یەک لەمانە نووسەری تورک »رضا توفیق« لە کتێبی «مفصل قاموس فلسفة» قسە نەقل دەکا لە «میزان الحق» ی حاجی خەلیفە کە دەڵێ زانستەکانی فەلسەفی لە ڕێی فەقێیەکانی کوردی کوردستانەوە لە تورکیادا ژیانەوە.

بەش بە حاڵی خۆم تەواوێک فکرم کردەوە بۆ دۆزینەوەی تعلیلێکی دڵنیاکەر لەم زاهیرەیەدا بۆ دەبێ کورد پتر لە میللەتانی دیکەی ئیسلام بە مەلا و مزگەوت و خوێندنیانەوە خەریک بووبێ؟ ئەوەی ڕاستی بێ شتێکی کە پێی گەییوم، وەرامی هەموو پرسیار و ئیعترازێک ناداتەوە، واتە بایی تەعلیل ناکا، بۆیەیە لایق بەوەی نابینم باسی بکەم. پرسیارێکە و دەمێنێتەوە بۆ لێکۆڵینەوە.

بۆ کوردێک بیەوێ لە ڕابردووی میللەتەکەی هۆی شانازی ڕاست و دروست بدۆزێتەوە کە خۆی پێ هەڵداتەوە لەتەک میللەتانی ڕووی زەمین، مەیدانێکی بێفێڵتر و لەبارتر نیە لەم مەیدانەی مەعنەویات و زانست. من لە سرنجدان و تێفکرینم لەگەڵ خۆمدا، بەوپەڕی سادەیی و بێ تەمسیلیەوە، هەستی لەخۆ ڕازیبوونم دەجووڵێ کە دەبینم نالی و شێخ ڕەزام لە ڕیزی هەرە پێشەوەی شاعیرانی ئیسلامەوە دێن... مەولانا خالید و کاک ئەحمەدی شێخ شان بەشانی گەیلانی و شاهی بوخارا دونیای تصوفم بۆ دەگەڕێن... «إبن ادم» و «إبن حاجب» بەقەدەر «عضد و شریفی جرجانی» لە مەلایەتیدا پێشەوان. بەشێکی زۆر لە خەفەتم دەرەوێتەوە بەو چرایە

گەش و تریفەدارانە کە لە بنگەکانی ئایینی و زانیاری کوردستانی کۆنەوە بە تیشکی چاوخێرەکەریان عەیبی هەژاری و بێدەسەڵاتی و بێکیانیی کوردم بۆ دادەپۆشن، بەڵکوو تێی دێننەوە.

ڕۆشنبیرێکی ئیمڕۆی کوردیش ناتوانێ کارێک بکا ببێتە هۆی ئیفلاسی کورد و مێژووی کورد لە هەموو ڕوییکەوە وەک ئەوەی ئەوان چرایانە کز کاتەوە بە توهمە تێگرتن و بێبایەخ کردنیان. بەڕاستی کوژاندنەوەی ناو و ڕەوت و شۆرەتی چراکانی زانست و ئاین و ئەدەب لە مێژووی کورد ئەو کارە خۆخنکێنەیە کە ناحەزی کورد حەزی پێ دەکا و چاوەنۆریەتی. زاتەن زۆر لەوان ناحەزانە خەریکن ئیسپاتی کوردنەبوونی ئەغلەب ناودارەکانمان بکەن، بە هەڵبەستنی نەسەبێکی سەر بە غەیری کوردەوە بۆیان، ئیتر کە ئێمە لە خۆمانەوە گیانی خۆنەویستی یاخود بێگانەدۆستی پاڵمان پێوە بنێ بە بارانی لەعنەت و نەفرین ئیتر چاراکانی مێژوومان بکوژێنینەوە و ناحەزەکانمان بەو کارە بحەسێنینەوە هێندەیان قەرزار دەکەینەوە مەگەر، کوردی گوتەنی بە کوشتنمان لە ژێر ئەو قەرزە دەرچن. لێرەدا ئەو گوتەیەش لەو تەرزە گەنجەی کوردە ناسەلمێنین کە بڵێ من باوەڕم بە ڕابردووی کورد و غەیری کورد نیە، چرا درۆزنەکانی هەموویان دەکوژێنمەوە، چونکە ئەو هەر هێندەی پێ دەکرێ وەک «أبو موسى الاشعري» چرای «علي بن ابي طالب»ی خۆی بکوژێنێتەوە، کوژانەوەی چرای «معاوية» بە دەست «عمر بن العاص«ـەوەیە.

پەروەردەبوونی حاجی قادر لە سەرەتای عومریەوە تا پێگەیشتن و چەسپاندنی، لەم کێڵگەی زانست و سەقافەت و باوەڕ و ئەدەبی چەرخ و سێیەکە چەرخێکی لەمەو پێشیی کوردستان بوە. فتیلەی نیشتمانپەرەوەریی حاجی قادر کە هەڵکرا بە هۆی زەیتی ناو ئەم فانۆسەی ڕۆشنبیریی کوردەواریی ئەوسا بوە. حاجی ناوی نەدەبوو چ جایێ ئەوەی ببێتە پێشەوای کوردایەتی ئەگەر لە سەرەتای عومرییەوە «ئالێ دەڵێ بابە»ی فەقێیەتی نەکردبا. لەو سەردەمەدا هیچ جۆرە خوێندن و سەقافەتێک نەبوە لە کوردستاندا جێی خوێندنی مزگەوت بگرێتەوە و خەڵق بکا بە خوێندەوار، سوختەخانە نەبێ کە دەرسی ئەلفوبێی سەرەتا و «ناگەهان و ئەی شودە»ی بە منداڵان دەگوتەوە و ئامادەی دەکردن ببن بە فەقێ و بگەنە یەکەم پێپلیکەی خوێندنی مەلایەتی.

حاجی قادریش لەسەر ئەوە ڕانەوەستا، بە بیریشیدا نەدەهات ڕاوەستێ، داخوا من و تۆ ئەم ڕاستییە دەدۆزینەوە و دەیلێینەوە یاخود بنلێوی دەخەین و لێی بێدەنگ دەبین. ئەو لە لانی خۆیەوە خوێندن و پەروەردەبوونی هەوەڵی عومری پەسەند کرد بە سەرچاوەیێک کە جۆگەلەی کردەوە و گوتە و ڕەوشتی لەوێوە ڕەوان بێ تا ئەو ڕۆژەی مەرگ ژیانی پێچایەوە، هەرگیز لەو خوێندن و پەروەردەبوونەی پەشێمان نەبۆوە و داوی پەیوەندی خۆی لێ نەبڕی و بە هیچ سەقافەتێکی دیکەیشەوە نەلکا، هێندەی کە لە زانست و شارەزایی نوێی زیاد دەکرد دەیخستەوە سەر خەرمانی زانستی کۆنی و ڕابردووی پێ دەوڵەمەند دەکرد، بەو واتایە کە یەکێک ڕابردووی خۆی نەسڕێتەوە، ئەو ڕابردوە لەگەڵ دواڕۆژیدا دەبنە یەک پارچەی سەرانسەر ئیتر هەر سامانێک لە «زانست و مەعنا» بکەوێتە کۆشی ژیانیەوە بۆ هەموو ژیانەکەی حیساب دەکرێ.

ئەگەر لەبەر خاتری هیچ شتێک چاو نەنوقێنین لە واقیع، هێندەی نیوەڕۆییێکی هاوین ڕوونە کە حاجی قادر شانازی بە ڕۆژانی کۆیە و کوردستانی ژێرووی کردوە زیاتر لە خۆ هەڵدانەوەی بە ڕۆژانی نێو تورکانی. هەموو دیوانەکەی هاوار و فیغانیەتی بۆ ئەو ڕۆژگارە لەدەست چوەی. ئەگەر ڕابردوویێکی جاهیلانە و نۆکەرانەی هەبا لە کۆیێ دەبوا شەرمی بەخۆیدا بێتەوە و ئەم چوارینەیە نەڵێ:

ئەی ڕەفیقانی وەتەن زۆر غەزەلم ماوە لەوێ<br>
لە کەنارێکەوە تەقدیرە وەکوو هەڵبکەوێ

وەک سەفینە بگەڕێ بیخەیە بەر بەحری قسەم<br>
حەیفە وەک من لە غەریبی بمرێت و نەتەوێ

ئەم لایەنەی شانازی کردنی حاجی بە ژیانی سەرەتای عومر و خوێندن و فەقێیەتی، واتە بەر لە ڕۆیشتنی بۆ ئەستەمبۆل، لە زۆر موناسەبەدا بە دەم نووسینەوە دێتە پێش.

بە دوا ڕوون کردنەوەی ژیانی »عقلی و معنوی» کورد و بەر لەوە باسی لایەنی ماددیی ژیانی کورد بکەم هەندێک هەڵەی نووسراو و بڵاوکرایەوە هەیە لە دەم و ڕاوێژ و بەسەر خامەی گەلێک نووسەرانەوە خۆش هاتوە و جێگەی پایەی تایبەتی

بۆ تەرخان کراوە و دەکرێ لەوانەیشە ببێتە سەرەتای زنجیرە لە نووسینی وەک خۆی هەڵە و ناتەواو، چونکە لە ڕواڵەتدا پشت ئەستورە بە لێکدانەی عیلمی و دروست کردنی فکرە لەسەر بنچینەیێکی ماددی.

لە ماوەی ئایندەدا هەوڵ دەدەم بۆت ڕوون کەمەوە کەوا ئەم نووسینە و هی وەک خۆی، کە بە زاهیری داوای عیلمانیەت دەکەن، لەوە زیاتر کە «ژوورخان» ێکی فکریی نەبووی هەڵستاندبێ لەسەر ژێرخانێکی ماددیی موهووم، هیچی نەکردوە پەیوەندی هەبێ لەگەڵ زانست و بنچینەی ماددی و عیلمانیەت. ئەوی ڕاستیش بێ هەڵستاندنی ژوورخانی خەیاڵی لەسەر ژێرخانێکی ئاسان و نێزیکەدەست کە ڕواڵەتی بێ قووڵبوونەوەی تیۆری داوای بکا، هەندەی سەرابی بیابان مێشک و چاو دەخەڵەتێنێ و بەڕادەی ئەویش سووک هەڵدەستێ و خۆش دێتە باوەڕەوە. بۆیە هەڵەیەک کەوابێ، لە مەوزووعی حاجی، نابێ خۆمی لێ لادەم و چاوی لێ بپۆشم. هەروەک لە سەرەتای نووسینەکەشم گوتم هەڵەی نووسراو لێی دەوەشێتەوە ببێتە سەرچاوەی لێکۆڵینەوەی مێژوویی لە دوارۆژدا، بەڵکوو هەر لە ئێستاوە سەر لە خەڵق بشێوێنێ، جگە لەمەش ئەم هەڵانە وەک بۆت دەردەکەوێ، تێکەڵ بە مەوزووعی ئەوتۆ بوون بە درێژی لێی دواوم لەم نووسینەدا.

لە ژمارەییێکی تایبەتی »هاوکاری»ی ساڵی سێیەم گوتارێک دەربارەی حاجی قادر بڵاو کرایەوە لە ژێر عینوانی «حاجی قادری کۆیێ: شاعیری سەردەمی ڕاپەڕینی نەتەوەی کورد». وەنیە من دەخلێکم هەبێ بەسەر تێکڕای ناوەڕۆکی گوتارەکەوە، چونکە نووسینەکەی من بەبەر ئەوە ڕاناگا خەریکی ڕەخنە گرتن و نرخاندن بێ لەو نووسینانەی دەربارەی حاجی بڵاوکرانەوە، من بەحاڵ دەرفەتی ئەوەم هەیە «هەندێک» لە «هەموو» مەوزووعی حاجی بنووسم چ جایی ئەوەی بپرژێمە سەر هەڵسەنگاندنی نووسینی نووسەرانی دیکە. بەڵام لە گوتارەدا، کە بە شێوەییێکی گشتی پشتگیرییێکی باش دەکا لە حاجی قادر و لە مەعنادا بەدەم ئەو کەسانەدا هاتۆتەوە کە هێرشی نارەوایان بردۆتە سەر حاجی، هەڵەی هەمەچەشنە هەیە، هەندێک لەو هەڵانە ئەوەندە دژی ڕاستین کە هەڵەبوونیان دەمەتەقە هەڵناگرێ وەک ئەوەی لە ستوونی یەکەمی لاپەرە سێزدەدا دەنووسی:

*«له ساڵی 1839دا کاتێک که حاجی دەچێته ئەستەمبوڵ و دەگاته ئەوێ سەیر دەکا بەدرخانیەکان له کاردان بۆ ڕێکخستن و بەرپا کردنی شۆڕشی ساڵی 1842-1843 یان».*

ئەم ساڵەی 1839 دەکەوێته بەرانبەر 1255ی کۆچی. چەند جارێک باسکراوه و له گوتاراندا نووسراوه، وا ئێستاش دووبارەی دەکەینەوه، حاجی قادر تا کۆتایی 1276 له کوردستانی ئێران خەریکی خوێندن بوه و هێشتا له گەشتەکەی باڵەکایەتی و بەدوا ئەوێدا هی کوردستانی ئێرانیی نەبووبۆوه. ئەم ڕاستییەش بەشایەدی خودی حاجی ئیسپات دەبێ، چونکه به خەتی خۆی لەسەر کتێبەکەی «سیوطي» حاشیەی نووسیوه و کۆتاییەکەی به فەرده فارسییەکه هێناوه، لێرەدا بێدەسکاری له ڕێنووسەکەی حاجی فەردەکه دەنووسمەوه:

شب 3 شنبه بیست از ماه اخر
هزار دوصد و هفتاد و شش در

وشەی«اخر» و دوا وشەی فەردەکه «در» مەناقەشه هەڵدەگرن داخوا واتایان چیه بەڵام ساڵەکەی 1276 بەولای موناقەشەوەیه. بۆ کورت کردنەوەی قسه ئەگەر بڵێین حاجی یەک ڕۆژ دوای نووسینەوه ئەم حاشیەیه نەوەخرا و چۆته تورکیا، دیسانەوه چوونەکەی 20 ساڵێک دەکەوێته دوای 1839. ئەم شایەدییەی خودی حاجی زیاده بۆ ڕوون کردنەوەی مەبەس و دیارخستنی هەڵەکەیه، دەنا بەڵگەی دیکەش هەن بێشوبهه وەک حاشیەکه، ڕاستی نیشان دەدەن.

لەفەرزی حاجی 1255 چووبێته ئەستەمبوڵ ئەوسا حاجی مەلا عەبدوڵا تەمەنی پێنج ساڵی بوه، دەبێ لەو پێنج ساڵانەدا خوێندنی فەقێیەتی لەگەڵ حاجی قادردا کردبێ و بەیەکەوه بەشداربووبن له گەشتەکەی باڵەکەتی. خۆ بەنیسبەت ئەمین ئاغاوه دەرفەت نامێنێ یەک ڕۆژ لەگەڵ حاجیدا ڕەفاقەتی کردبێ مەگەر لەناو بێشکەدا بووبێ چونکه وا بزانم ئەمین ئاغا لەو ساڵەدا هاتۆته دونیا، لێره به پێشەوەش ئەمەمان باس کردوه.

جگە لەمانە، بەپێی ئەوە کە گوتارەکە دەڵێ حاجی لە 1215 بەوەلەد بوە، لێرەشدا قسەی غەیری خۆی دووبارە دەکاتەوە و گلەیی لەو ناکرێ ئەگەر هەڵە هەبێ لەم مێژووە، حاجی لە تەمەنی 24 ساڵیدا چوە بۆ ئەستەمبوڵ. دیتت ئەم تەمەنە بایی نیوەی ئەو گوزارشتە ناکا کە بێگومان لە حاجیەوە پێمان گەییوە بەر لە سەفەری بۆ ئەستەمبوڵ. ساڵانی منداڵی، ئینجا خوێندنی پچڕپچڕ و شاگردی، ئینجا کەوتنەوە سەر خوێندن، ئینجا حەوت ساڵێک گەشتی باڵەکەتی و کوردستانی ئێران، ئینجا گەڕانەوەی بۆ کۆیێ و چەقەچەقی شێخ نەبی... هتاد. حاجەت بە درێژەدان ناکا ئەم ساڵەی 1839یە هی کردن نیە.

ئەم هەڵەیە بەرهەمی پەلە کردنە لە دۆزینەوەی پەیوەندی میانی ڕووداو و «فکرە». بەوپەڕی ئاساییەوە و بێ دوودڵی، نووسەر بۆ ئەوە چوە حاجی قادرێک پەندی میللەتپەروەری لە بەدرخانیان وەرگرتبێ دەبێ لەو ساڵە پڕ خرۆشانەی جموجۆڵی «بەدرخانی»دا مێشکی پژابێ و خوێندنی کولابێ، خۆ ناشکرێ بگوترێ لە کۆیەوە ئەم تین و تاوەی وەرگرتوە، چونکە وەک ئێستا بۆت باس دەکەم نووسەر ئەم دەرگەیەی لە لانی خۆیەوە بۆ مەبەسێکی دیکە پێوە داوە، کەواتە با حاجی بگوێزینەوە بۆ ناوجەرگەی گوزارشت، کارگەی مێژوو، بێشکەی «فکر».

هەڵەیێکی گەورەی دیکەی گوتارەکە ئەوەیە کە پێ دادەگرێ لەسەر هێندێ ئەم حاجی قادرە پێش چوونی بۆ ئەستەمبوڵ:

> *«... کە هۆنراوەی دادەنا تەنیا خزمەت کردن و دڵخۆش کردنی کاربەدەست و دەسترۆیشتوان بوە. شیعری ئەو سەردەمەی ژیانی حاجی نموونەی ئەدەبی دەرەبەگی دواکەوتوو بوە..»*

جارێکی دیکەش پەلە کردن لە «مارە کردن»ی فکر لە گوزارشت، نووسەری خلیسکاندوە. ڕواڵەتی لێکدانەوەی زانستی ماددی نوێ وا ڕادەگەیەنێ کە حاجی بەر لە ئامادەبوونی زەرفی ماددی بۆ بیروباوەڕی نیشتمانپەروەری هەر دەبێ خزمەتی واقیعی دەرەبەگی کردبێ، لە نەزەر تێفکرینی سادەی ماددی ئەمە قەفەسێکە و بە دەوری حاجیەوە چاری ناچارە دەبێ وەک تووتی تێیدا بخوێنێ و بچرپێنێ. حوکمی ڕواڵەتی ئەم جۆرە لێکدانەوەیە هەند بەهێزە لای نووسەر، بێنیازی کردوە لە

هێنانەوەی بەڵگە و ئیسپات، وەک ڕووناکیی ڕۆژ و تاریکیی شەو بدیهییێکی ماددییە...!!

ئەم هەڵەیە لە سنووری مێژووی تێپەڕ کردوە تا خۆی لە دڵ و مەیل و سروشتی حاجیش ئاڵاندوە و کردوەتی بە خزمەتکارێکی زگماکی دەرەبەگ. بڕیاری ئەوتۆیی کە بەشی زۆری ژیان و ئەدەبی حاجی دەگرێتەوە نابێ بەم جۆرە بێ بنکە و بنج و بناغە بێ و زادەی کوتومتی لێکدانەوەیێکی سەراو بێ.

دەبا بزانین، خزمینە ئەو غەزەل و قەسیدەی حاجی دایناون بەر لە سەفەری بۆ ئەستەمبوڵ چەندن، کامەن، چۆنن، چ دەڵێن؟ چەندیان بە دەرەبەگی هەڵگوتوە؟ چەندیان بە داگیرکەری هەڵگوتوە؟ سەیرە حاجی مەدحی داگیرکەری نەکردوە! کە گوترا حاجی خزمەتکاری دەرەبەگە ئەم پرسیارە هەڵدەستێ: بۆ خۆی نەکردۆتە خزمەتکاری «ئاغا»ی دەرەبەگ کە داگیرکەری عوسمانییە؟ خۆ حاجی پیاوێکی نازیرەک نەبوە تا ئەم بەرژەوەندە زلەی نەدیبێ لە خزمەت کردنی داگیرکەر.

بۆ دەبێ حاجی لە دژی «شیخ نەبی» بکەوێتە تێکۆشان و هەڵبەست گوتن، خۆ هەر نەبێ شێخ نەبی ناوێکی دوعاگۆیی بەسەرەوەیە و خزمەتکاریی ئەو بۆ مەلامەشرەب کەمتر عەیبە؟ نەکەی خەیاڵی ئەوە بکەی «منافسە»ی ئاینی حاجی قادر بەگژ شێخ نەبیەوە نابێ چونکە حاجی خاوەن مزگەوتیش نەبوە تا هەست بە مەترسی بکا لە شێخ نەبی یەوە گۆیا جێگە و دەسەڵاتی لەق دەکا. ئەگەر مەسڵەحەت حاجی بەشەڕ هێنابا دەبوا شەڕی پێ بکا لەگەڵ مەلاییێکی مدرسی یەک لە مزگەوتەکان بەڵکوو جێگاکەی لێ دەسەنێ یاخود لێی دەبێ بە شەریکی زەکات و سەرفترە.

با من وەرامی ئەم پرسیارانە بدەمەوە بە جۆرێکی بێ گومان. هەرچەندە دەستنیشان کردنی هەڵبەستەکانی حاجی کە پێش سەفەری بۆ ئەستەمبوڵ دایناون کارێکی تا ئێستا نەکراوە، ئەگەر کەسیش کردبێتی بڵاوی نەکردۆتەوە، بەڵام ئەو هەڵبەستانەی کەوا پێش سەفەرەکەی مەدحی پێ کردوون و لێیان دەوەشێتەوە بکرێن بە بەڵگەی خزمەتکاری لە سێیان تێپەڕ ناکا:

- یەکەمیان مەدحی بەر بارەگای حەمەد ئاغای مامەش:
  ئەم خەیمە کە شەمسییەیی شاهەنشەهی ئەرزە

- دوەمیان مەدحی ئاغای حاجی بەکر ئاغایە:
  ئەی «محمد» وەی «امین الدولة» ئیمڕۆ کۆیی تۆ

- سێیەمیان مەدحی هاوڕێی خۆی حاجی مەلا عەبدولڵایە:
  ئەی »عطارد» لە دەرت خادمی سجادە بە شان

لە بدیهیە ئاشکرا ترە ئەم هۆنراوانە حاجی ناکەن بە خزمەتکار. شاعیر لە درێژایی 25 ساڵێک، یا زیاتری عومری شاعیرییەتی خۆی کە لە کوردستانی بەسەر بردوە لە سێ موناسەبەدا مەدحی سێ کەسی کردبێ وەک مەدحی نەکردبێ وایە، شاعیر نیە لە ماوەی 25 ساڵاندا چەندین شیعری نەبێ لە شەقام و مەیدانی جۆرجۆر کە هەندێکیان لە هەندێکیان ناکا، وەک ئەوەی «ملحد» ێک ناوناوە شیعری خواپەرستانە بڵێ بەپێی داخوازی جێگە، یاخود خواپەرستێک چەند هۆنراوەی سەر بە «گومان» هەڵبەستێ. بۆ نموونە دەڵێم بوێژێکی وەک «أبو نواس» شیعری وەهای داناوە لە هی «إبن الفارض» و «أبو العتاهیة» سۆفیانەتر.

لەوەش زیاتر دەتوانم پاکانە بۆ حاجی قادر بکەم. مەدحەکەی حاجی مەلا عەبدولڵا بۆ خزمەتکاری نەبوە ئەگەر بۆ مەبەسی دوشمناتیش بمانەوێ حاجی عەیبدار کەین، چونکە هاوڕێیەکی هەرە نیزیکی خۆیەتی. مەدحەکەی «حەمەد ئاغا» ش بە هیچ جۆر بێنی لێ نایێ چونکە هەڵبەستێکی مێوانانە بوە بە خەیاڵی ئارایشتی بەهار و لە هەڵکەوتێکی یەکجار تایبەتیدا گوتراوە و هیچی دیکەی بە دوادا نەهاتوە، چ سواڵ و پاڕانەوەشی تێدا نیە. وەک دەشیبینی لەو قەسیدەیەدا دڵداری پتر هەیە لە مەدح، لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، لە باکوور و باشوور، لە کۆن و نوێ کەس بە شیعرێکی وەها نەبوە و نابێتە خزمەتکار، خۆزی حاجی چەند هەڵبەستێکی دیکەی هێندە پاراو و بەهێز و دڵتەڕانەی بۆ دادەناین با لە مەدحی هەرکەسێک دەبوو بووبا، تا گەنجینەی ئەدەبی خۆی و میللەتەکەی پێ دەوڵەمەندتر کردبا، ئەوسا چ دەگوترا با بگوترابایە.

سەقفی وەکوو گەردوونە شکافی وەکوو ئەنجوم
پەردەی وەکوو ئەدواری سەما ئەتلەسی سەوزە

کوا بۆ دەست و قەڵەمێکی وا ڕەنگین وێنەی خێوەت لەسەر ڕووی کاغەز بکا بە وێنەی ئاسمانی عەکس بوویەوە لە ئاوێنەدا:

هەر لێرە هەتا دەشتی بەهەشت ئایینی لاجان
ئاهیستە برۆ نەک وەکوو دێوانەیی هەرزە

تا داخڵی خەڵوەت دەبی ئەمجا بە وەکالەت
خاکی قەدەمی ماچ بکە بەم تەرزە کە تەرزە

مەئزوونی ئەوەندە وەکوو ئاهم بە نەزاکەت
لادەی سەری زولفی نەوەکوو بیخەیە لەرزە

وتووێژی وا نازک لەگەڵ بای سەبادا بۆ مەبەسی هێندە شاعیرانە و مەجزووبانە سەد جار ئەوە دێنێ سەرەتاکەی وەک عینوانی نامەی «مسجل» بە تەمغەی «شاهەنشەهی ئەرز» مۆرکەی. نەک حاجی قادری پێش سەد و بیست ساڵ بەڵکوو گیڤارای ئیمڕۆش کاری وا هونەرمەندانە بکا لێی شیرن دێ.

دەمێنێتەوە مەدحەکەی ئەمین ئاغا. لە جێی مناسبی خۆیدا بای پێویست لێی دەدوێین. لێرەدا هەر ئەوەندە دەڵێم ئەمیش وەک مەدحەکەی حەمەد ئاغای مامەش تاقانەیە، چ برا و خوشکی نەبوون تا حاجی لە کۆیێ بوو.

ئەمانەن دروشم و نیشانە و بەڵگە و ئیسپاتی خزمەتکاری حاجی بۆ دەرەبەگ. خۆ لە لایەن خزمەتکاریی حاجی بۆ داگیرکەری عوسمانییەوە تاکە یەک پیت نیە چ جایێ وشە وەیا دێڕە شیعر. بەڵام سەیرێکی زۆر سەریر ئەوەیە دوای چوونی بۆ ئەستەمبوڵ و لە گەرمەی خەباتی نیشتمانپەروەرانەیدا چالاکانە دەکەوێتە سەر مەدحی دەرەبەگ و شێخ و مەلا و دەسەڵاتدارانی مردوو و زیندووی کورد، بە تایبەتی کوردی کوردستانی عێراق، کە ئەمانەن بە پێی بیر و باوەری گەنجێکی عیلمانی ئیمڕۆ هەموویان زۆردار و خوێنمژ و ئەفسانەپەرستن.

دیوانەکەی بخوێنەوە یەکجار قەڵەباڵغ بوە بە ناوی کەسانی وەک کاک ئەحمەدی شێخ و مەولانا خالید و حەماغا و ئەمین ئاغا و خالصی (شێخ ئاورەحمانی تاڵەبانی) و بێتووشی و شێخ ڕەزا و حاجی مەلا عەبدوڵا و نازانم کێ. خۆ ئەگەر ناوی ئەو

شاعیرانەش بخەینە سەر تێکرای ناوەکان، کە ئێستا پێیان دەڵێن »وشەساز» ئیتر دیوانەکەی هێندە قەڵەباڵغ دەبێ بە جارێ دەبێتە دیوەخانە. لێرە بەدواوە لە جێگەی تایبەتیدا دەخوێنییەوە کاتێک کە حاجی لە کۆیێ خەریکی ژیانی پڕ تەنگوچەڵەمەی خۆی بوە بەوپەڕی تیژییەوە بەدەم پیاوێکی بە دەسەڵاتی وەک »شێخ غەفور»دا دێتەوە کە سەرۆکی کەرتی بنەماڵەی «تاڵەبانی» بوە لە کۆیێ، کە چی دوای چوونی بۆ ئەستەمبوڵ و کولانی گیانی لە نیشتمانپەروەری و کوردایەتیدا ئەوجا بە شیعر مەدحی «خالصی» دەکا کە برای شێخ غەفوور خۆیەتی:

«غوثێ ثانی» و «حاتمی» مەزهەب
عەبدورەحمانی«خالصی» مەشرەب

بەو پێیە و گەز و گرێیە دەبێ حاجی قادر دوای چوونی بۆ ئەستەمبوڵ بووبێتە خزمەتکاری دەرەبەگ و ئەفسانە، دەوجا بۆ خۆت خەریک بە بە تەئویل و قسە تێک بردن و حیکایەتان جێگە و ڕێگە پەیدا کە بۆ گیانی پاکی کوردایەتی لە شیعری حاجی قادرێک کە ناوت نا پیاوی دەرەبەگ و ئەفسانە. کارێکی زەحمەت و سەختە. یا دەبێ گەز و گرێکەت بگۆڕی یا دەبێ بەرگی نیشتمانپەروەری لە شیعری حاجی دارِنی.

گەیشتن بەم ئەنجامە وەرگەڕاوە بەرهەمی ڕاستەوخۆی تەماشا کردنی جیهانە بە دووربینی نەزەرییە کە سەرەوبن کرابێ. پێوانی ڕابردوو بە مقیاسی دواڕۆژ وەک هەڵگێرانەوەی زێی «دیجلە»یە لە دەریاوە بەرەو شاخەکانی کوردستان. پێ داگرتنی «دیجلە» لەسەر ڕۆیشتنی بەرەو خوار فەرمانی سروشتە سووچی خۆی نیە، داوا کردنی من و تۆ لە دیجلە سەرەو هەوراز بێتەوە هەڵەی من تۆیە. لە ژیانی حاجی قادریشدا ئەو «حدیة»[17] نەزەرییە نیە کە بە پێی لێکدانەوەی هەندێ نووسەران دەبێ هەبێ. دەمەوێ بڵێم حاجی قادر پێش سەفەری ئەستەمبوڵ ئەو عەبد و نۆکەرەی دەرەبەگ نیە کە بە لای هەندێ کەسەوە داخوازییێکی »حتمی» نەزەرییە.

---

[17] – ڕەنگە لە کوردیدا «الحدیة»ی عەرەبی «گردەبڕی» بێ. وشەی «حد» یش لەو گوێرەیە دەبێتە «گردەبڕ».

حاجی قادری پاش سەفەری ئەستەمبوڵیش ئەو مۆدێلە شۆڕشگێڕە نیە کە گەنجێکی خوێنگەرمی دوای 1950 لێی ڕازییە. حاجی قادری ئەوەندە «ازدواجي»، کە سەروبنی ژیانی وەک دوو قوتبی «سالْب و موجب»ی کارەبا بێ، دەبێتە زاهیرەیێکی مەتەڵاوی نامەفهووم. بوونی ئەم «حدية»یە لە ژیانی حاجیدا »توازن» ناهێڵێ نەک هەر لە ڕەوتی ئاسایی حاجیدا، کە بە بازێک لە نۆکەرییەوە ببێتە پێشەوای کوردایەتی، بەڵکوو «توازن»ەکە تێک دەدا لە نەفس و دەروون و وێژدانیشی. تەقەلە لێدان و سەرەوبنبوونی مرۆڤ لە بیروباوەڕ و ڕەوشتدا کەم وایە پێی بگوترێ «گۆڕانی سازگار» (تطور صحي، سليم) بەتایبەتی کە هۆی ماددی زۆر بەهێز نەبێ داوای ئەو سەروبنبوونە و تەبریری بکا.

ئەغڵەب ئەو کەسانەی پەتی پەیوەندی خۆیان دەپچڕێنن لەگەڵ بیر و باوەڕ و دۆست و هاوڕێ و ڕەوشت و خووی دوێنێیان دەمارێکی ئەستوری نەخۆشی دەیانکا بە دوژمنی ڕابردووی خۆیان و ژیانی تێپەڕیویان. حاجی قادر ئەو نەخۆشە نەبووە. واش دەبێ مرۆڤ لەبەر عەیبێکی گەورە لە ڕابردوویدا لێی هەڵدەگەڕێتەوە. لە ژیانی حاجی قادردا ئەم عەیبە، نەگچکە نە گەورە، نەبوە شەرمی لێی بێتەوە. هەندێ جاران مەبەستی شەخسی دەبێتە هاندەر بۆ بادانەوەی 180 پلەیی واتە بەرەودوا. حاجی ئەم مەبەستە شەخسییەی لە سەرەتای ژیانییەوە کوشتوە. ئەوەی ڕاستی بێفێڵ بێ.

حاجی لەگەیشتنی بە پلەی بیر کردنەوەی کۆمەڵایەتی و سیاسی سەر بە نیشتمانپەوەرییەوە بەرەو »تکامل»ێکی زۆر ئاسایی سروشتی خۆی ڕۆیشت نەک بە دەوری »استحالە» و قەپێلک گۆڕیندا. سروشت و دەروونی خۆی بەقەدەر فێرگەی خەباتی بنەماڵەی بەدرخان یارمەتی حاجیان دا ئەو هەنگاوە هەڵێنێ لە خرۆشانی پیوریتانی حەقپەرستییەوە بیگەیێنێتە واتای ڕوون و «متبلور»ی نیشتمان پەرستی. بە دەم نووسینەوە و بەپێی داخوازی جێگە ئەم ڕاستییە پتر خۆ بەدەر دەخا، لێرەدا هەر ئەوەندە دەخەمە سەر قسەکانم کە ئەگەر جێگۆڕی تاکە عامیلی تطوری پەرۆشی حاجی بێ لە «مرۆڤایەتی»ی بێ سنوورەوە بۆ کوردایەتیی خەست و پتەو دەبوا هەموو ئەو کوردانەی وەک ئەو جێگۆڕییان کردوە بەرەو ئەستەمبوڵ وەک ئەو ببنە نیشتمانپەوەر.

گوتارەکەی «هاوکاری» یش ئیشارەییێکی بەهێزی تێدایە بۆ دەوری سروشتی حاجی لە پەیدابوونی گیانی کوردایەتی لە لای، بەڵام بە جۆرێک دەیخاتەوە بە گورِ و تاوی بەدرخانیەکان و دەیکا بە سێبەرێکی خەباتی ئەوان، لەگەڵ هەوەڵ نەفەس دانی ئیشارەکە نەفەسی دەبرِێ. تەنانەت خەریک نەبوونی نالی و کەیفی بە کوردایەتییەوە دەکا بە بەڵگە بۆ هەڵقولینی رِوحی کوردایەتیی حاجی لە کانیاوی بەدرخانی، بەو مانایە کە نالی و کەیفی چونکە بۆیان رِێک نەکەوت لەگەڵ بەدرخانیاندا بژین نەبوون بە نیشتمانپەروەر.

بەڵێ گومان نیە لە بوونی تەئسیرێکی زۆری بەدرخانیان لە تێکرِای گیانی نیشتمانپەوەریی ئەوسای کوردی سەروو، بەڵام نابێ دووری و نزیکی خەڵق لەو بنەماڵەیە بکرێ بە بەڵگەی بوون و نەبوونی گیانی کوردایەتی لەلایان. بەنیسبەت «کەیفی» یەوە دەبێ لێرەدا ئەو گوزارشتی کە لە جزمی دووەمی دەفتەری کوردەواریدا باس کراوە لە بارەی بزووتنەوەی هەستی نەتەوایەتی لە لای بخرێتەوە بە زیهنی خوێنەر و بەوەدا مەعلووم بکرێ دووربوونی لە بەدرخانیان دووری نەخستۆتەوە لە کوردایەتی و ئەرکی نیشتمانپەروەری لە بیر نەبردۆتەوە.

سروشتی حاجیی لەخۆ رِازی و باوەرِ بە خۆ هاتوو لە عاست بنەماڵەی بەدرخانیشدا ئاشکرا و نیگاکێشە. لە هەموو دیوانەکەیدا یەک دێرِە شیعر هەیە باسی چاکە و فەزلی بەدرخانیان بکا:

بەدرخانیو لەسەر لاچێ لەمەوپاش
لە هەر لاوە دەتانهارِن وەکوو ئاش

حاجی ئەگەر نەترسابا لەوەی ناوبردنی بەدرخانیان لێی بگیرێ بە عەیب، بەو مانایە کە حەمل بکرێتە سەر بوونی چاکە و نەوازشتی ئەوان لە گەردەنی، دەبوا جارەها ناویان بێنێ و مەدحی پیاوەتی و کوردایەتی و خەباتیان بکا. بۆ دەبێ هێندە ناوی پیاوێکی وەک نالی بێنێ لە هۆنراوەکانیدا و خۆی بۆ بشکێنێ؟

بە «تضمین» فەردەکی «نالی» دەهێنم تا رِەفیقانم
بزانن فەرقمان زۆرە خەزەف قەت وەک گوهەر نابێ

یاخود خۆ بەوە هەڵداتەوە کە لە نالی کەمتر نیە؟

زاهیرە بەیتم لە نالی و کوردی زۆر کەمتر نیە
تالعم بەرگەشتەیە و بەدبەختە بەختم نوستوە

یاخود لە نالی زیاترە؟

بەجێما نالی وەک ناڵی، دواکەوت کوردی وەک گەردی
کە حاجی غاریدا ئەسپی لە مەیدانی سوخەنرانی

هەڵبەت ئەمەی کردوە چونکە کەس لێی بە داوێوە ناکا و لەو مەدح و ناوبردنانەدا سەرشکێن ناکرێتەوە. بەڵام زێدە گوتنەوەی ناو و چاکەی بەدرخانیان هەرچەند مەحزی ڕاستیش بێ، مەردی بێ ئینساف تەئویلێکی مزەخۆری و گەورە و چووکی بۆ دێنێتەوە.

جگە لە تێکڕای ماڵی بەدرخانی، حاجی قادر ناوی تاکە کەسێکیش دەبا لە یەک دوو بەیتی دیوانەکەیدا. هەرچەند ناو بردنەکە نەختێکیش لەژێر پەردەی ڕستە ئاراییدا بێ، دیار دەدا کە مەبەس شەخسی »یەزدان شیر»ی بنەماڵەی بەدرخانییە:

ئەمیرێک ماوە پاشایە. گوتی کێیە؟ گوتم شێرە
گوتی لێڕە؟ گوتم لێرە هەتا تاران و هیندوستان

بە خۆی شێرە وەکوو ناوی لە شەڕدا دوژمن ئەندازە
تەمایان هەر بە ئەو ماوە تەواوی خاکی کوردستان

لەو چەند بەیتە بەولاوە کە جارێکیان بە سەراحەت باسی بنەماڵەکە و جارێکیان بە شکڵ ڕەمز ناوی یەکێکیان دێنێ خەبەر و ئەسەرێکی دیکەی بەدرخانیان لە دیوانەکەیدا نادۆزیتەوە.

پوختەی قسە ئەمەیە، حاجی ڕۆژەک لە ڕۆژان خزمەتکاریی کەسی نەکردوە، هەڵبەستی بۆ دڵی کەس دانەناوە، سروشتێکی خورت و کشت و هەستیار و سەرکەشی بوە، لە هەموو هەنگاوەکانی ژیانیدا شوێنی ئەم سروشتەی وەک مۆر و توورڕە دەخوێنرێتەوە. تا ئەوەندەی ئیمکان هەبێ مرۆڤێکی زادەی مرۆڤان بە خۆی بنازێ و خاوەنی بیروڕای سەربەخۆ بێ، لە هەمان کاتدا غەریبی و بێکەسی و هەژاریش نەیتوانی لە گەردەنفیرازی کەم کاتەوە، حاجی قادر ئەو بەخۆ نازیوە سەربەخۆیە گەردەنفیرازە بوە.

جگە لەو هەڵانەی تا ئێستا خەریکی ڕاست کردنەوەیان بووین، لە گوتارەکەدا دەربارەی کۆیێ و چەند و چۆنی ڕۆشنبیری و ئابووری و کۆمەڵایەتیی کۆیەی سەردەمی حاجی و بەر لە حاجی، بیروڕایەکی سەرپێیی بێبەڵگە هەیە تا بڵێی دوور کەوتۆتەوە لە واقیع.

لە ستوونی دوەمی گوتارەکە ئەم ڕستەیە دەخوێنیتەوە: «لە ڕووی خوێندەوارییەوە لەو سەردەمەدا هەموو کوردستان بەگشتی و ناوچەی کۆیێ بە تایبەتی زۆر دواکەوتوو بوە». بەدوای ئەمەدا لە هەمان ستوون ڕستەیێکی دیکە دێ کە دەڵێ «لە ڕووی ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە دیسانەوە ناوچەی کۆیە کە دەتوانین بیکەین بە نموونە بۆ هەموو ناوچەکانی کوردستان لەو پەڕی دواکەوتندا بوە». پاش ئەم گوتەیە بۆ شەرحدانی مەبەسی گوتارەکە دەچێتە سەر ژماردنی هەندێ لە بارەی ناخۆشەکانی ژیانی ئەوسای کۆیێ وەک دەرەبەگی ڕەگ داکوتاو و «احتکار»ی زەوی و زارو باغ و لە لایەن چەند کەسێکەوە و نەبوونی پرۆژەی پیشەسازی و پەرەسەندنی نەخۆشی و هەژاری و بەگژیەکدا چوونی غەفووری و حەوێزییان.

لەم چەند دێڕ و ڕستەیەدا باری ڕۆشنبیر و کۆمەڵایەتی و ئابووری ناوچەی کۆیێ خراوەتە پایەیێک ژێرتر لە تێکڕای کوردستان، بەتایبەتی لە باری ڕۆشنبیرییەوە کەوا گوتارەکە بۆ خۆی وشەی «بەتایبەتی» بۆ بەکار هێناوە.

ئەم قسانەی گوتارەکە ئەگەر ڕاستی مێژوویی بێدمەتەقە با وە یاخود بە بەڵگەی نوێ ئیسپات کرابا، دەربڕینی نەک ماف، بەڵکوو پێویستییێکی ئەدەبی بوو بە سەر شانی نووسەرەوە، بەڵام هەرچی ئیسپات کردن و پێ سەلماندنە لە نووسینەکەدا وجودی نیە، ئەوە نەبێ بیر و باوەڕێکی سادەی سەرپێیی عاتیفی کە خاوەنەکەی

حەز بە گوتنەوەی دەکا و لەگەڵ ڕواڵەتی ئەو «حکم»ـە تێکڕاییە ڕێک دەکەوێ کە بەسەر کوردستاندا دەدرێ لە هەموو بارێکیەوە، بۆتە «بدیهیە»ش بەلای نووسەرانەوە لزوومی بەبەڵگە و ئیسپات نەماوە.هەر چۆنێک بێ ئەوا گوتارەکە کۆیێ دادەنێ وەک ناوچەی جەهالەت، بەڵام بێگومان ئەگەر خاوەن گوتار خۆی کۆیی نەبا بەو جۆرە پێی دانەدەگرت لەسەر نەخوێندەواریی کۆیێ هەر نەبا لەبەر شەرمی ڕوان، کوردی گوتەنی. تۆ بڵێی کۆیێ لە ناوچەی قەرەتەپە و بازیان و مەندەمەرەش نەخوێندەوارتر بووبێ؟ ئەم ناوانە بە ڕێکەوت هاتنە بیرم نەک لەبەر مەبەسێکی تایبەتی.

واتێدەگەم تاکە یەک بەڵگەی «بێدەنگ» هەیە لەگوتارەکەدا بۆ زێدە نەخوێندەواریی ناوچەی کۆیێ کە نووسەر بە سەراحەت دەری نەبڕیوە، ئەویش زۆری ژمارەی مزگەوت و مەدرەسەی مەلایانە لە کۆیێ! کە مزگەوت حیساب بکەین بە بنکەی جەهالەت دەتوانین کۆیێ حیساب کەین بە بێشکەی دواکەوتوویی و نەخوێندەواری. ئەگەر ئەمە مەبەست نەبێ هیچ بەڵگەیێکی دیکە نامێنێتەوە لە نووسینەکەدا بۆ سەپاندنی گۆشەی نیگای خاوەنەکەی.

وەنیە دانانی خوێندنی مەلایانەش بە خوێندنی بێ بایەخ و دژی ڕاستی و پێشکەوتن کارێک بێ کەس نەیکردبێ و گوتەیێک بێ کەس نەیگوتبێ، ئەوەی ڕاستی[18] بێ بۆ ماوەیێکی دووردرێژ لە سەرەتای پەیدابوونی خوێندنی نوێوە ناکۆکی میانی مزگەوت و فێرگە (قوتابخانە) چەندین ناڕاحەت و دەمەتەقەی پەیدا کردوە، تا وا بوە هێرش و بەبەرەکانی دوولایی لە بینیاندا بۆتە بابەتی هەڵبەست. پێویست نابینم نموونە

---

[18] – نووسەر هەیە تەعبیری «لە ڕاستیدا – لە ڕاستی دا» بە هەڵە دەزانێ، گۆیا دەبێ بگوترێ «ئەوەی ڕاستی بێ» یاخود «بە ڕاستی». هەرچەند «لە ڕاستیدا» تازەش پەیدا کرابێ، بەکار هێنانی لە هیچ دەستورێکی واتا دەربڕینی لانەداوە و کوردییێکی دروست و ڕێکە. لەگەڵ هەڵێنانی هەنگاوی نوێ بەرەو قۆناغەکانی یەک لە دوا یەکی سەروژوور چوونی خوێندەواری کوردی پێویستمان بە گەلێک تەعبیر و قاڵبی تازەداهاتوو دەبێ لە وتوێژ و نووسیندا. تەسک کردنەوەی دڵخوازی نووسەران لە پەیدا کردنی ئەو قاڵبانە ڕێ دەگرێ لە تەقەللای دەوڵەمەندتر کردنی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی. «لە ڕاستیدا» واتاییێکی نەختێک جیاش دەردەبرێ تا ئەوانی دی.

بێنمەوە لە شیعری ئەم و ئەو و زامی کۆنینەی سارێژبووی بکولێنمەوە، چی لێرەدا گوتم زۆر خەڵق دەیزانێ و لەبیریشیانە.

خۆ خەریک کردنم لێرەدا بە دواوە، بۆ دیارخستنی ڕاستیی تەواو لە بارەکانی جۆرجۆری ژیان و ژیاری شاری کۆیێ، وەک کۆمەڵایەتی و ئابووری و خوێندەواری و هەر بارێکی دیکە کە سووڕانەوەی خامە لەسەرکاغەز توشی دێ تەنها بۆ مەبەسی ڕاست کردنەوەی بیر و ڕایەک نیە کە من بە هەڵەی دەزانم، بەڵکوو لە هەرە پێشەوە، بۆیەیە کە شاری کۆیێ بێشکەی حاجی قادرە... شوێنەواریەتی... سەرچاوەی بوونی ماددی و مەعنەویەتی... ئاسمانی پەروازی و فکر و هەست و سۆزیەتی... هۆی خۆ هەڵدانەوە و شانازی کردنیەتی... ئاخۆ ئەم بووکی خولیای حاجی کە کۆیی بێ تۆ بڵێی هەر بەچکە مەیموونە و لەبەر چاوی دایکی شیرین، یاخود بەڕاستی بووکە و بە جوانیی خۆی و ئارایشتی ئاڵ و واڵای ڕەگی هەست و هونەر و بوێژی و زەوق و شەوق لە مرۆڤدا دەجووڵێنێ؟

باسێک کە لە دەوری تاکە بولبولی نیشتمانپەروەری کوردایەتی چەرخێک لەمەوبەر هەڵ بێ دەبێ سەرێکیش بە هێلانەی ئەو بولبوولەدا داگرێ کە هەوەڵ پەلەفڕەی تێدا کردوە و زووترین چریکە و چەهچەهەی لەوێوە هەستاوە. هۆی دوەمی خەریکبوونم ئەوەیە کەوا، بێ خۆ هەڵکێشان، خۆیشم زادەی مەڵبەندی کۆیەم. بە پێی نێزیکیم لێیەوە قەرزداری خوێنەری کورد و کتێبخانەی مێژووی کوردم، وەک شارەزای خانە، لە کاروباری کۆیەی سەر بەم باسەوە بدوێم و بەقەدەر تواناییم تاریکی لێ بڕەوێنمەوە. قەرزداری کۆیەشم لەوەدا کە نەیێم و لایەنگیری لێ بکەم هەر نەبێ دەستێکی لەسەر کردنەوەی بۆ بەرز کەمەوە کە ستەمی لێ کراوە. ئەو شارە کە منی هێنایە کۆڕی ژیان هەر هێندە گەردەن ئازادی کردم و ئیزنی دام ڕەها بم لە پەیوەندی دایک و ڕۆڵیەتی کە غەدری بۆ نەکەم نەک غەدری لێ بکەم.

با بگەڕێینەوە سەر چەقی باسەکە.

لایەنی خوێندەواری و نەخوێندەواریی کوردستانم بە جۆرێکی گشتی بە پێی دەرفەت و دەسەڵات لێرە بە پێشەوە باس کرد، بێ ئەوە لە پێویست زیاد یاخود بەقەدەر

پانایی مەوزووع درێژەی پێ بدەم. لە چەند ڕووییێکی لێرە بە دواوەش بەتایبەتی لەسەر کۆیێ دەدوێم بایی ئەوە ئەسڵی باسەکە و ڕاست کردنەوەی هەڵە لێم داوا دەکا. ئەم ڕێبازە پانەی نووسین لەسەر سەقافەتی ڕابردووی کۆیێ خامە نابا بۆ تەنها مەیدانی خوێندەواری و زانست و ڕۆشنبیری ڕابردووی کۆیێ و بەس، بە ڕێچکۆڵەی جیاجیادا کە وەک لکەدار بە هەموو لایێکی درەختی ئەسڵە باسەکەدا بڵاو بوویێتەوە، نووسینەکەم بۆ سەر جوملەی ئەو مەیدانانە دەچێ کەوا بە یەکدی گەیشتنەوەیان دیمەنێکی گشتی بێ کەلەبەر و پچڕانەوەی کۆیەی لێرە بە پێشەوە ڕاستەوخۆ بە باری ئێستاکەی دەبەستێتەوە. دوێنێ و ئیمڕۆ دەکا بە یەک تابلۆ.

کۆیێ لە زۆر ڕووەوە پایەی تایبەتی خۆی هەبوە لە ژیانی کوردەواریدا. بەڵام ئەم پایەی بە سرنجدان و لێ وردبوونەوە نەبێ خۆ بە دیار ناخا هەرچەند لە واقیعیشدا بە قەدەر چیاکەی هەیبەسوڵتان و سەرچاوەکەی حەمامۆک و گردۆڵکەکەی باسکی عارەبیان تەواوکەری شەخسیەتی کۆیەیە. عادەتەن مێژوو خەریکی ڕووداوی بە بریق و باق و زریق و زاق دەبێ، گوێی بۆ گرمە و زرمە کردۆتەوە و چاوی لە بڵێسە و نەبەرد و بکوژە و ببەستە بڕیوە. ڕاستیی بێدەنگ و کشومات با کێڵگە و توخمزای ڕووداو و گۆڕان و قەومانیش بێ خۆ ناهاوێتە کۆڕی بەزم و ڕەزمی مێژووەوە، یاخود لە بەزم و ڕەزمی مێژوودا جێی ناکرێتەوە. پاڵەوانێک گورز و گۆپاڵ و شیر و ڕمی هەڵگرتبێ هەر ئەو قارەمانی گوزارشاتی مێژوو، نە وەستای گورز و گۆپاڵەکە و نە نانکەر و چێشتلێنەرەکە و نە مەیتەری ڕەخشکە و نە جلشۆر و جلدروە کە هیچیان نابن نە گرمتەش[19] کە مێژوو لێی هەڵنگوێ و هەست بە هەبوونی بکا. حەزدەکەم لێرەدا میساڵێکی عەلاقەدار لەگەڵ ڕۆژانی ئێستاکەمان بێنمەوە:

ساڵی 1963 کە ئێمەی «وەفدی کوردستان» خەریکی گفتۆگۆ بووین لە بەغدا و ئەژانسی خەبەرسازی دەوڵەتان خەریک دەبوون دوو وشەمان لێ ببیەن و سەدان کەس دەستە دەستە دەهاتنە لامان و داوەتیان دەکردین و تێکڕامان یەک قەوغامان

---

[19] – «گرمت»: زەقییەکە بایی ئەوە بێ پێی مرۆڤ لە هەنگاو هەڵێناندا لێی هەڵەنگوێ. لەمەتەڵدا هەیە دەڵێ: «قەلەباچکەی سەر گرمتی، خۆش خۆش کلکان دەکوتی».

نابۆوە سەروبنی نەبێ، بە برادەرانم دەگوت سەیری ئەم «مفارقە»یە بکەن، هەزاران چەک هەڵگری پێشمەرگەی کورد لەبن دار و بەردی شاخ و دۆڵەکانی کوردسانن بە هەموویان هێندەی یەکێک لەو کوردانەی بەر سێبەر و کۆندیشن و ناو ئیستیراحەتەی بەغدا کە خەریکی سیاسەتن دەنگیان ناگا بە گوێچکەی زەمان و مەکان، زوربەیان هەتا هەتایش هەر بێدەنگ و نەناسراو دەمێننەوە کەچی جەنگاوەری و فیداکاری ئەوانە زەیتی چرای کوردەواری بە شۆڕش و پارتی و وەفدیەوە.

بەڵێ مێژوونووس یەکجار ئەریستۆکرات و بەفیزن، خامە زێڕینەکەیان دەنگ و باسی زرینگەدار نەبێ نایخاتە سەر ئەتڵەسی تۆمارەوە. ئەو تایبەتییانەی کۆیەش کە لە حەقیقەتدا پایەیێکی گرنگی پێکهێناوە لە سەرجوملەی ژیانی کوردەواریدا، لەو بابەتە بێدەنگ و بێناوەن چاو نایانبینێ تا پەنجەیان نەخرێتە سەر و بگوترێ ئا ئەمانەش حیساب کەن لە زیمنی خەرمانی داهاتی ڕوحی و ماددی کورد و کوردستان. تایبەتییەکانی کۆیێ وەک زەوییێکە دەغڵی ڕواندوە و لە ژێری شراوەتەوە، دەغڵەکە دیارە و خۆی زەویەکە نادیار.

بەر لەوەی شاری سلێمانی بنیاد بنرێ، لە هەموو ئەو ناوچە پانەی کوردستانی ژێروو کە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی هەولێر و کەرکووک و ڕۆژئاوای سابڵاغ و سنە تاکە یەک ئاوایی کورد هەبووبێ لە شار بچێ کۆیێ بوە. شارەزوور لە زوێکەوە دەفتەری ڕەش بۆوە، لە هەندێ نووسین و کەلەپۆر و فۆلکلۆردا نەبێ شوێنەوارێکی ژیاری- سەقافی - ئابووری - کۆمەڵاتیی شارەزوور نەمایەوە تاوێک بێنێتە سەر هیچ بارێکی کوردەواری لەو دوو سەد سێ سەدساڵەی دواییدا. تا ئێستا بە جۆرێکی بێگومان جێگەی شارەکەی شارەزوور نەزانراوە کوێیە، ئیتر کە شارێک وەها لە ڕووپەڕەی جیهان سڕابێتەوە کە شوێن و جێگەی بزر بووبێ دەبێ چ تەئسیرێکی مابێ لە کاروباری ژیانی پڕ بزووتنەوە و جموجۆڵ و ڕووداو.

قەڵاچوالان کە بۆ ماوەیێ پایتەختی فەرمانڕەوایی بابان بوو، سەرەڕای کورتی ئەو ماوەیە، لەبەر زۆر هۆی بەتین کە ئەوان بوونە هاندەری ئیبراهیم پاشا لێی بگوێزێتەوە بۆ سلێمانی، ئەم قەڵاچوالانە نەیتوانی لە گوێرەی گرنگیی پایەی پایتەخت و مەرکەزی حوکمڕانی کە هەیبوو ببێتە ئەو بلێسە و شەوقە کە تین و تریفەی بە کوردستاندا بڵاوبێتەوە. نامەوێ لێرەدا باسی ئەسڵی جێبێڵم بۆ شی

کردنەوەی هۆیەکانی کەم تەئسیری قەڵاچوالان لە هەردوو لایەنی ماددی و مەعنەوی کورد، هەر هێندە دەڵێم ئەو تەئسیرە چەندێک دەبێ بووبێ ماوەکەی ئەوەنە کورت بوە بەبەر ئەوە ڕانەگەیشتووە ڕەگ داکوتێ و شەقڵی خۆی لە مەیدانی ژیاندا بەجێبێڵێ. هێشتا پێنجوین لە ڕووی بەرهەم هێنانی پێشکەوتنێکی ژیاری لە دەوروپشتی خۆیدا، کاریگەرتر بوە لە قەڵاچوالان، خۆ مەعلوومە لە ڕووی ڕۆشنبیرییەوە چ نیسبەتێک نەبوە لە میانیاندا.

ئاوایی بچووک و کەمدەرامەد هەرچەند لە خۆی زیادیش چالاک بێ جغزی هەڵمەت و تەقەللا و تین تاوی تەسک دەبێ، تەنانەت لەوانەیە بۆ خۆی لە ژێر تین و تاوی دەوروپشتی ژیان و عادەت و نەریتی خۆی بسەپێنێ بەسەر دەوروبەریدا، شەپۆلی جموجۆڵی دەوروبەرەکەی ڕامالّی دەدا و دەیکاتە پارچەیێک هەماهەنگ لەگەڵ دیمەن و ڕواڵەتی گشتی. بۆیەیە دەبینی قەسەبچەی بچووک لە نێوان عەشرەتان ناتوانێ جلی عەشرەتی بگۆڕێ بە شارستانی، لەوە گەڕێ کە ناتوانێ کار بکاتە سەر تایبەتییەکانی هیچ کامێک لە عەشیرەتەکان.

شاری کۆیێ بە گەز و گرێی چەرخەکانی لەمەوبەر و بەنیسبەت تێکڕای شارەکانی کوردستان شار بوە، قەسبچە نەبوە. بەڵگەیێکی بچووک بۆ ئەم ڕاستییە دێنمەوە لە کتێبی «قاموس الاعلام» کە لە ساڵی 1898 لە ئەستەمبوڵ دەرچوە. بۆ مەبەستی بەیەکدی گرتن (مقایسە- مقارنە) لەم کتێبە شایەدی وەردەگرم کە دەربارەی گەورەیی و بچووکی ئەوسای هەولێر و کۆیەی داوە. بۆ هەولێر شەش هەزار دانیشتوو، بۆ کۆیێ دەهەزار دانیشتووی داناوە. دەبێ ئەوەش لە بیر نەکەین لەوە بە پێشتر کۆیێ گەلێک گەورەتر و قەڵەباڵغ تر بوە. سەرژماری ناو کتێبەکەی «قاموس العلام» کاتێک کراوە کە تازە دەهات کۆیێ خۆ بگرێتەوە لە دوای ڕشانەوەکەی 1281ی کۆچی کە دەوەستێتە بەرانبەر 1765ی زانیی. پێشتریش لە 1246ی کۆچی تاعوون کارێکی کردوە لە کۆیێ نوێژی جومعەی تێدا نەکراوە، واتە چل کەسی خەڵقی شار لە مزگەوتی جومعەی ئەوسای کۆنەبۆتەوە کە «نصاب»ی نوێژی جومعە پێک بێنن.

بەر لەو فەلاکەتانە تەنها ئەو هێندەی شارەکە کە دەکەوێتە ناو شوورەوە لە دە هەزار کەسی زیاتر حەواندۆتەوە. وەک لێرە بەپێشەوە بە موناسەبە باسم کرد، لێرەشدا دەڵێمەوە، لە دەرەوەی شوورەی شار ئاوەدانییێکی زۆر هەبوە. ڕەنگە هیچ

موبالەغە نەبێ لەوەدا کە بگوترێ دانیشتوانی دەرەوەی شووورە پتر بوون لە هی ناو شووورە، کە ئەمە دەڵێم گوتەی خۆکرد نیە، مەعلووماتی ئەوتۆم لایە بەڵگەبێ بۆ گەورەیی شارەکە.

لەبیرتە گوتم مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەد وابوە لە دەرەوەی شوورەوە حەفتا ڕاتبەی بۆ هاتۆتەوە. لەو مزگەوتەوە بەرەو سەرووی شار بڕۆی دوای 400-500 مەترێک دەگەیتە حەمامێک کە مەشورە بە حەمامی پیسکان، ئەویش وەک مزگەوتەکە کەوتۆتە ڕێکی شوورەی شار، یاخود لە تەنیشت شوورەوە بوە بەلای دەرەوە. مێژووی دروست کردنی بەسەر دەرگەکەی دەرەوەی لە پارچە مەڕمەڕێک هەڵکەندراوە و ساڵی 1111 ی کۆچی لێ نووسراوە، واتە 1700ی زایینی کە دەچێتە پێش 270 ساڵێک و بەقەدەر تەمەنی سلێمانی و قەڵاچوالان دەگرێتەوە. ئەم حەمامە تا ئێستاش هاوتای کەمە لە لایەن ڕێکی و مەحکەمی و ئەندازە و مەڕمەڕەکارییەوە. لە چەند گونبەدێکی کە تێیدایە ئەوی هەرە پێشەوەیان مەهارەت و وەستاییەکی وای لێ سەرف کراوە، باوەڕ ناکەم ئیمڕۆ بە کەرەستەی عەمەلەی کۆیێ گونبەدی وەها دروست بکرێ. ئەگەر بۆ مەبەسی بەربەرەکانی و ئیسپاتی وەستایش ئیمکانی دروست کردنی پەیدا ببێ، کارێکی هێندە بە ئەرک و زەحمەتە کەس بیر ناکاتەوە لە خۆوە شتی وا بنیاد بنێ. کارێکی وا سەخت لەکۆیە 270 ساڵ پێش ئیمڕۆ بە ئاسایی و بۆ مەحزی سوود کراوە، کاسبکارێکیش کردوەتی نەک ئەمیر و بەگلەر بەگێک. جگە لە لانی هونەری و وەستایی، ئەم حەمامە بۆ لانی قەڵەباڵغی کۆیەی ئەوساش شایەدی دەدا، چونکە عادەتەن حەمام لە نێو شار دروست دەکرێ نەک لە دەرەوە. ئافرەت خۆ هەڵناکوتن بۆ جێی دوورەدەست و چۆڵ خۆیان تێدا «حەمام لەمیش»بکەن. دیارە لە دەرەوەی شوورەی شار ئەو قەڵەباڵغیە هەبوە کە حەمام لە نزیکیەوە دروست بکرێ. هەر ئەو قەڵەباڵغیەش بوە حەفتا ڕاتبەی لێ چۆتەوە بۆ مزگەوتێک.

جگە لە شایەدیی بێ قسە و دەنگی دار و دیواری حەمام و مزگەوت حیکایەتی کابرام دێتەوە بیر کە هەوەڵ جار دەچێتە شار بە ڕێکەوت پڵاو دەخوا کە هەرگیز نەیخواردبوو، کە گەڕایەوە بۆ دێی خۆی گوتی «شتێکی زۆر خۆشم خواردوە لە شار، بە پێی مەدحێک کە لە مەلای خۆمانم بیستوە ئەوەی خواردوومە یا مزگەوت بوە یا حەمام» لە پیاوانی جیلی پێش خۆم بیستوە سەردەمێک 200 ماڵی تیرەی «قوبادی

بەگ» لە دەرەوەی شوورەی شار بەلای ڕۆژئاواوە نیشتەجێ بوون و خانوویان دروست کردوە.

بەڵگەیێکی دیکەی گەورەیی کۆیێ ئەوەیە، لە سەروچاوی ئاوی حەمامۆکەوە تا لە شار دەچویتە دەرێ یەک لە دوا یەک ئاشی ئاو دروست کرابوون، بۆ خۆم کەلاوەی چار ئاشم دیوە لە ناو شاردا، کەلاوەی دیکەش هەبوە من نەمدیوە، یاخود پێش بیر هاتنی من بە تەواوی کوێر بۆتەوە. ئەو هەموو ئاشە بۆ شارێکی بچووک دەست نادەن، هەر ئاشەوانەکان بەخێو ناکەن.

بازاڕەکەی کۆیەش لە لانی خۆیەوە حیکایەتێکی ڕەسەنی و فرەوانی و دەوڵەمەندیی ئاڵوویێر و مامڵەت و چالاکی بزووتنەوەی ئابووریی ئەو شارەمان بۆ باس دەکا. وەک بازاڕی هەموو شارێکی »تەواو شار» کە هەر تاقمە کاسبکار و خاوەن سنعەت و پیشەیێک لە جێگەیێکی تایبەتی خۆیان لە بازاڕدا کۆمەڵ دەبن هەروەهاش بازاڕەکەی کۆیێ لەو ڕووەوە ڕێکوپێک دامەزراو بوە. گوزەری زێڕنگران، گوزەری ئاسنگران، گوزەری عەتاران، هی ئێمەنی و کاڵەکدروان، هی نەجاڕان، هی خەنجەرسازان، هی زین و کۆپاندروان، هی بەقالان، هی کەبابچیان... هتد. هەموو جێگە و ڕێگەی خۆیان دیار بوو توجار و بازرگانی گەورەش لە قەیسەریەکان دوکان و حوجرەیان هەبوو. کەس نەیدیوە ڕۆژەک لە ڕۆژان عەتاری لای بەقاڵ دانرابێ یاخود ماڵی بازرگانی لای عەتار هەڵدرابێتەوە.

دەباغچی و کاروانچی لە بازاڕ دانەدەنیشتن، هەر یەک لەمانە بە پێی داخوازی کارەکەیان جێگەی جیاجیایان هەبوو. دەباغچییەتی کەسبێکی بە برەو بوو، دەباخانە لە جێگەیێکی نزیک دەرەوەی شار بەسەر نۆینی (شیو) ئاوی لەکارهێنراوی شارەکەوە بوو. جێی حەیوان سەربڕینیش »سەلاخانە» لە کنارێکی شارەکە بوو، قەسابەکان بۆ گۆشت فرۆشتن گوزەری تایبەتی خۆیان هەبوو، ئێستاش هەیە لە بازاڕ. بەینێکە سەلاخانە دوورتر خراوەتەوە لە شار. جێگەی دوکانی خمخانەچییانیش لە بازاڕ نەبوو، شوێنی تایبەتی بۆ دیار کرابوو، نەوەک کاری خمگەری ڕەنگی خم بە دەوروپشتی خۆیدا بڵاو کاتەوە و مامڵەتچی سەغڵەت بکا.

شارێک لە دەمێکەوە شارنەبێ و ئوسووڵ و دەستووراتی مامڵەت و کڕین و فرۆشتنی بە گوێرەی داخوازی بەرژەوەندێکی کۆن و چەسپاو جێگیر نەبووبێ تا ئەو ڕادەیە گوێ ناداتە ڕێکخستنی بازاڕەکەی بۆ حەساندنەوەی کڕیار و سەر لێ نەشێوانی.

لە لایەن ئابووریشەوە کە لە نزیکەوە پەیوەندی هەیە بە گەورەیی شارەکە کۆیەی پێش دامەزراندنی حکومەتی عێراقی دوای شەڕی جیهانی یەکەم، وەزعێکی ئابووری یەکجار جیاوازی هەبوو لە وەزعی ئێستاکەی. نەک هەر لەبەر ئەوە هەولێر بوو بە لیوا و کۆیێ بە قەزایی مایەوە و لە ڕووەوە بار دالەنگا، بەڵکوو لەبەر هۆی یەکجار گرنگتر لە قەزایی و لیوایی کۆیێ هەژار بوو و خەڵقی لێ تەکیەوە و دەرامەدی وشک بوو تا وای لێ هات لەبەر بێ ئیشی، خەڵقی شارەکە پەرتەوازەیان کرد و بە چوار لای خۆیاندا بڵاوبوونەوە.

هۆیەکەش ئەمەیە. لە کۆنەوە دوو سەرچاوەی بنجی کۆیەیان کردبوو بە ناوچەیێکی گرنگی ئابووری. یەکەمیان ئەوەیە کە جێگەی شارەکە لە سەر ڕێی تیجارەتی ترانزێتی میانی سوریە و بەغدایە[20] لە لاییکەوە و باکوور و ڕۆژاوای باکووری ئێران لە لاییکی دیکەوە ئازربایجان و کوردستان دەگریتەوە، هەڵکەوتبوو... دوەمیان ئەوەیە، بە پێی سەردەمی خۆی کۆیێ ناوچەییکی گەورەی پیشەسازی و چنین و هۆندنەوە و چەک دروست کردن و زیندروەتیی و گازری و بەڕە و مافووری «کوردی» و لباد و پێڵاو و جەڕە و گۆزە و گەچ و مەڕمەڕکاری و کاروباری فەلاحەت و جووت و ئاشنانەوە و ئەغڵەب ئەو پیشە و وردەکارانە بوو کە ژیانی کوردی ئەوسا داخوازی دەکرد. بێجگە لە خودی خۆی دەوروپشتی، ناوچەکانی ڕانیە و قەڵادزە و مەنگوڕاتی تا دەگاتە سەردەشت... خۆشناوەتی و وڵاتی گەردیاتی و بەری شێخ بزێنی لە باشووری زێی کۆیێ... خولاسە وڵاتێکی فرەوانی کوردەواری بەم جۆرە بەرهەمە پێویستانە، کارسازی دەکرد و خۆیشی پێ دەحەواندەوە و دەگەشاندەوە.

جگە لەم دوو لایەنە گرنگەی ترانزێت و وردە سنعەتانە، کۆیەش وەک هەموو شارێکی چالاک و خاوەن پوول و دەرامەد، تیجارەتی ناوەکیشی تا بڵێی پێشکەوتوو

[20] - دەتوانی بڵێی «بابل« بۆ ئەو سەردەمە کۆنانەی کە هێشتا شاری بەغدا تێیدا نەهاتبوە و جود.

فرەوان بووە. هەرچی بەرهەمی کشتوکاڵ[21] و حەیوانی و سروشتی هەیە، زیندەماڵ و مردەماڵ، توجار و مامڵەتچی و قاچاغچی و تەڕاح و قەیاغچی دوور و نێزیکیش لە بازاڕ و خانەکانی کۆیەدا بە زۆری دیتراوان.

بەردەوامبوونی وەزعی وا بۆ سەدان ساڵ ئەنجامێکی کۆمەڵایەتی و ژیاری و ڕۆشنبیری بەرهەم دێنێ کە دوای کەمێکی تر لێی دەدوێم. ئێستا قسە لەو ئەنجامە ناکەم تا بۆت ڕوون دەکەمەوە کۆیەی دوای شەری یەکەم و دامەزراندنی حکومەتی عێراق وەزعی بەچی گەیشت.

ئەرکی سەفەربەر و گرانییەکەی 1917 ژیانێکی بە کۆیێ نەهێشتبوو، لاپەڕەی نوێی «احتلال و انتداب» و بە دوا ئەواندا «حكمی وطنی» کرایەوە. یەکەم ئەنجامی کوتومتی تەواوبوونی جەنگ بەنیسبەت ئابووری کۆیەوە ئەوەبوو ڕێگەی ترانزیت کە بە وڵاغ و قافڵە و کاروان ئاوەدان بوو، ئەم ڕێگەیە یەکجارەکی کوێر بۆوە، هەم لەبەر ئەوە دوو حوکمی لەیەک جیا کەوتە سوریە و عێراق، هەم لەبەر ئەوە پەیدابوونی ئۆتۆمۆبێل ترانزیتی لە وڵاغ و کاروان سەندەوە. بە کردنەوەی ڕێی گەلی عەلی بەگ و حاجی ئۆمەران تیجارەتی ترانزیت ڕێی خۆی گواستەوە بۆ ئەوێ. بە کردنەوەی ڕێی ئۆتۆمۆبێلیش لە سلێمانیەوە بە دەربەندی کونەکۆتردا بۆ ڕانیە و قەڵادزە هەرچی وڵاتی ڕۆژهەڵاتی کۆیێ هەبوو وردە وردە لەدەستی بۆوە. زووتر ڕانیە و قەڵادزە وەک دوو گەڕەکی کۆیێ حیساب دەکران. ئەوەی ڕاستی بێ دوای چۆڵبوونیان لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەم خەڵقی کۆیێ ئاوەدانیان کردنەوە. تا ئێستاش بنەماڵەکانی هەرە کۆنی ڕانیە و قەڵادزە کۆیین.

---

[21] - بەرهەمی تووتنی پژدەر و ڕانیە و بەشێکی زۆری ناوچەی ڕەواندز و خۆشناوەتی و هەموو وڵاتی کۆیێ تێکڕای سەر بە توجارەکانی کۆیەوە بوو و لە گومرگی کۆیێ عەمبار دەکرا و دوایی دەنێررا بۆ هەولێر و موسڵ و کەرکووک و بەغدا و ناو عەشرەتەکانی عەرەب. دوای دامەزراندنی دایەرەی «انحصار» ڕانیە و پژدەر خرانە سەر سولێمانی.

هەروەک پەیوەندی کۆیێ لەگەڵ سەرانسەری ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی خۆیدا پچڕا، بەرەو ڕۆژاوا و باشووریش شادەماری بەرژەوەند و سوود و مامڵەت و هاتوچۆی پسا لەبەر هەمان هۆی نەبوونی ڕێگەیێکی ئەوتۆ دەست بدا بۆ ڕەوتی ئۆتۆمۆبێل.

کورتەی قسە ئەوەیە دوای پەیدابوونی ڕێی قیرەتاو و بەیەکەوە بەسترانی ناوچەکان بەهۆی ئۆتۆ و هەندێ جار بەهۆی شەمەندەفەرەوە و مانەوەی کۆیێ بێ ڕێگە و پەیوەندی، وەزعێکی نوێ هاتە پێش هەموو حیسابێکی کۆنی سەروبن کرد. کۆیەی چالاک و پڕ جموجۆڵ چ بزووتنەوەیێکی نەما، زۆر جێگەی کەمدەرامەدیش ڕەوڕەوەی کەوتە گەڕ. کوردی گوتەنی، کۆیێ بوو بە پیادە و شوێنان بوونە سوار. جاری جاران هەموویان وەک یەک بوون هاتوچۆ و گوێستنەوەیان بە پشتی وڵاغ بوو.

نووسەری تازە پێگەیشتوو کە هێشتا عومری ماوەی نەداوە لە ڕێی و تووێژی ناوەکی (حوار داخلی) و سرنجدان و لێکۆڵینەوەی خۆی بگا بەو ڕاستیانە، لە هیچ کتێب و نامیلکە و گوتاریشدا باسێکی مێژوویی نیوەچڵی لە بارەی کۆیەوە نەدیوە کە بەو هۆیەوە شارەزایی لە ڕابردوو و ئێستای کۆیێ پەیدا بکا، بەڵێ نووسەری ئەوتۆیی بێ سێ و دوو و تێوەستان بڕیارێکی گشتیی فرەوان دەدا کۆن و نوێ داوێتە سەر یەک، وەک دەغڵی هەرەمە.

لێرەدا دەربارەی لاتریکبوون و نەمانی پەیوەندی کۆیێ بە دونیاوە ڕووداوێکی بچووک دەگێڕێمەوە لە تەجرەبەی خۆم، ئەویش دەبێتە ئاڵقەیێک لە زنجیرەی باری ئابووری کۆیێ، باری ئێستاکەیشی بە ڕابردوو دەبەستێتەوە. ساڵی 1953 کە نوێنەری کۆیێ بووم بە هاریکاری لەگەل خەڵقی شارەکە ئەوەی ئیمکان بوو ڕزگار کردنی کۆیێ لە دەست بێ ڕێی کردمان... مەزبەتە، بروسکە، نمایش، ئیزراب، چ نەما نەیکەین. لە ڕۆژنامەکانی وەک ڕۆژنامەی «الدفاع» ی صادق البصام، و «الاهالی»ی کامل الچادرچی، لە بەغداش هی وا هەبوون یارمەتیمان بدەن بۆ گەیاندنی دەنگی کۆیێ بە گوێچکەی حکومەت و هەموو گەلی عێراق. منیش لە لانی خۆمەوە بە نووسین و گوتار و «مراجعە» بە پێی توانینم خەریک دەبووم. بۆ ئەو مەبەسە و هەندێ مەبەسی گشتی تر، کە لێرەدا لزووم نیە باس بکرێن، دیدەنیێکی وەزیری بەرگریم کرد و لەو دەیدەنیەدا هەوڵم دا، تێیدا سەریش کەوتم،

بۆ نەهێشتنی کۆسپێکی یەکجار سەیر لەپێش کردنەوەی ڕێگەی کۆیە و ڕانیە کە هەموو هەوڵ و تەقەللاییێکی بێ بایەخ دەکرد.

لە دەمێکەوە، واتە لە 20 ساڵێکەوە بەڵکوو زیاتریش، ڕاپۆرتێک خرابوە دۆسیەکانی وەزارەتی بەرگرییەوە وای ڕادەگەیاند کە گۆیا لە گۆشەی نیگای عەسکەرییەوە، پاراستنی نەوتی کەرکووک داخوازی دەکا دەرفەت نەدرێ بە کردنەوەی ڕێگە لە میانی کۆیە و ڕانیە نەکا ئەو ڕێیە یارمەتی سپای هێرشبەر بدا کە لە ڕۆژهەڵاتەوە بیەوێ بگا بە کەرکووک. ڕاپۆرتەکە بۆ تێبردن و شاردنەوەی ئامانجی بەرهەڵستی کردن لە بەستنەوەی ڕانیە بە کۆیەوە، لە هەوەڵەوە بە جۆرێکی گشتی دەڵێ هەموو ڕێگایەکی ستوونی (عمودی) کە لە سنووری ئێرانەوە بەرەو ناوەوەی عێراق بێ، دەبێ مەنع بکرێ نەوەک لە کاتی شەڕێکی جیهانیی ئایندەدا یارمەتیی داگیرکەر بدا لە داگیر کردنی وڵاتەکە، ئیتر لەوەڕا ڕاپۆرتەکە بە تایبەتی پێ لەسەر ڕێی کۆیە و ڕانیە دادەگرێ.

من لە دوو کەلەبەری زلەوە ڕەخنەم لەو ڕاپۆرتە گرت. یەکەم لەو ڕووەوە کە ڕێگاکانی حاجی ئۆمەران- هەولێر، کۆیە - کەرکووک، قەڵادزە - کەرکووک، خانەقین - بەغدا، کە جگە لە ڕێی کۆیە - کەرکووک، هەموویان قیرتاون و هەمووشیان ستوونین بۆ جەرگەی وڵات، بەپێی ئەم ڕاپۆرتە دەبێ گشتییان کوێر بکرێنەوە نەک هەر ڕێی کۆیە و ڕانیە یاساغ بکرێ. دووەمیان، لە هەوەڵ ڕۆژی نووسینی ئەم ڕاپۆرتە و بەر لەویش بە ماوەیێکی دوورودرێژ لە جەنگەکانی پێش جەنگی یەکەمەوە زانراوە کە تاکتیکی شەڕی نوێ ستراتیجی هێندە زل دەگرێتە بەر، 30 — 40 کیلۆمەتری میانی ڕانیە و کۆیێ، کە سێ چوارێکی دەشتاییە و مەنعی چەرخان ناکا، هەر تێیدا ناخوێندەرێتەوە، لەوانەیە دوو باسکی «کماشە-گاز» ی هێرش ئەگەر لە ڕۆژهەڵاتەوە بێ یەکیان بڕوا بۆ دەریای سپی ناوەڕاست ئەوی تریان بڕوا بۆ خەلیجی بەسرە. ئەم ڕاستییە لە پاش شەڕی دووەمی جیهانیەوە بوە بە زانیاری سەرەتایی. ئەوەشم ئیزافە کرد کە بە لامەوە بۆ سومعەی پیاوە ستراجیستەکانی سپای عێراق کەموکەسرییە بەهۆی ڕاپۆرتی وا سەیرەوە نیگاتەسکی بەسەر خۆیاندا بسەپێنن.

بە دوا ئەم وتووێژەدا فەرمان دەرچوو لە وەزارەتی بەرگرییەوە بۆ وەزارەتی ئاوەدان کردنەوە (اعمار)ی ئەوسا کە دەس بدرێتە کردنەوەی ڕێگەی کۆیە و ڕانیە. باس

کردنی ئەم گوزارشتە و هەوڵ و تەقەللای خەڵقی کۆیێ بۆ وەدەستهێنانی گوزەران و خۆ ڕزگار کردن لە لاتەریکیی و بێدەرامەدی، سەرەڕای ئەوە کە تۆمار کردنی خەباتێکی مەردانە و هەمەچەشنەی مەفتەنی حاجی قادرە، کارێکە گیانی حاجی بحەسێنێتەوە، چونکە ئەو سەدساڵێک لەمەوپێش هانی خەڵق و خزمی کۆیەی دەدا بۆ جموجۆڵی گوزەران و لە غەریبیەوە بە هەڵبەست ڕێگەی جۆرجۆر و تازەبەتازەی نیشان دەدان سوودی لێ وەرگرن. فەرموو سەریری ئەم چەند دێڕە شیعرە بکە لە زیمنی قەسیدەکەی «وەرە سەیری بزانە لاوی کۆیێ» و بۆ خۆت دەلالەتی لێ وەرگرە. بە دوا تانووت لێ دانی کۆییان و سەرشکاندنیان لەوەدا کە بە شێخی درۆزن هەڵدەخەڵەتێن ئەمە دەخوێنیەوە:

ئەمیش تەنها نیە سووچ و خەتاتان
لە کەسبیش غافڵن میسلی مەلاتان

لە بەغدا بۆچی خورما بێت و لەیموون
لە بۆ دەرمان لە ماڵ بێ ڕۆنی زەیتوون[22]

لە دەوری کوللی باغی شاری کۆیێ
دوو سەد مەن داری زەیتوونی بە جۆیێ

لە ئێوە کامەتان بووی یەک دوو بارێک
بکاتە کیسەییێک یاخود خرارێک

دوو پێی لێدا لە کۆلا میسلی دۆشاو
وەکوو ڕۆن ڕۆنی زەیتوون بێتە سەر ئاو

وەیا کەی نێژراوە چەند نەمامێ
لە نارنج و ترنج و هەر مەقامێ

بزانن شین دەبێ نابێ بە بەر دێ
لە جێگای گەرم و ساردی چی بەسەر دێ

---

[22] – مەبەستی ئەوەیە ڕۆنی زەیتوون لەکۆیێ هێندە کەمە بە دەرمان دەشێ، کەچی دار زەیتوون تا بڵێی زۆرە لە باغەکانی کۆیێ.

بەراو خاکی ئێوە کیمیایە
دوڕ و گەوهەر گەزۆ و مازووی چیایە

مەعادین خاتری تۆ بێ لەگەڵ کان
گەنمتان زێڕە حەتتا زیوە زیوان

ڕەژووی پاپۆڕ و خوێ و نەوت و گۆگرد
لە کێوی ئێوەدا کۆیە وەکوو گرد

حاجی لە ناوهێنانی نەوتدا بەنیسبەت وڵاتی کۆیێ پێشبینییەکی سەیری کردوە دەشێ بۆی بە کەرامەت لەقەڵەم بدرێ و بخرێتە بەر تیشکی ئەم چەند دێڕە هەڵبەستەی:

ئەم قسەی ئێستە عەیبی لێ دەگرن
ئەو دەمەش دێ زەمانی بۆی دەمرن

ئەم بە ئەو ئەو بە ئەم دەڵێ کاکە
سەیری قانوونی حاجی چەند چاکە

هەر چلۆنێ ئیشارەتی فەرموو
وەک کەرامەت هەمووی وەها دەرچوو

سەیر و کەرامەت و پێشبینییەکە لەوەدایە کە لەو ساڵانەی دواییدا نەوتێکی زۆر دۆزرایەوە لە نزیک کۆیێ و بیری بۆ هەڵکەندرا و هەموو کاردروستی نەوت دەرهێنان جێبەجێ کرا بەڵام یاسای ژمارە 80 دەرچوو کارەکەی وەستاند و بیرەکە کوێر کرایەوە. بێگومان حاجی قادرێک هێندە بە پەرۆش بێ بۆ میللەتەکەی کە لە دوورەوە فێری ڕۆنی زەیتوون دەرهێنانیان بکا و هانیان بدا بۆ چاندنی لیمۆ و نارنج، خەمی بێرێی و لاتەریکیشی بۆ دەخواردن ئەگەر لەسەردەمی خۆیدا شارەکەی دووچاری ئەو تەگەرەیە بووبا.

پوختەی قسە لەو مەوزووعە ئەوەیە لاچوونی ڕێی ترانزیت لە کۆیەوە بۆ جێگەی تر و مانەوەی کۆیێ بێ ڕێ و بان یەکەم شادەماری گەشە کردن و فراژووبوونی

ئابووریی کۆیەی بڕی. دەمێنێتەوە شادەماری دووەم کە وردەسنعەت و پیشەسازی پێویستییەکانی ژیانی کوردەواری بوو، ئەم شادمارەش بە لێشاوەکەی سنعەتی ئەورووپا و غەلەبەی پیشەسازی شارەکانی تری تازەگەشایەوە و هێز پەیدا کردووی عێراق، ئەویش پسا و بازاڕی کۆیێ وردە وردە کز بوو، خەڵقی دوور و نێزیکی لێ تەکایەوە، لە چەند گوندێکی دەوروپشتی خۆی بەولاوە کەس نەما ڕووی تێ بکا.

لە حاڵێکدا ئۆتۆمۆبێل لە بەینی شارەکاندا بە درێژایی ڕۆژ و ماوەییێکیش لە شەودا وەک کێشەی هەنگ هاتووچۆیان دەکرد، ڕۆژی وا هەبووە لە یەک دوو ئۆتۆمۆبێل بەولاوە لە کۆیێ دەرنەدەچوو. زستانان بە زۆری هاتوچۆ یەکجاری دەبڕا، خەڵقی زۆر لە برسان و لەبەر بێئیشی بۆی دەرچوون. کەسادی ئابووری گەیشتە پلەیێک مانگانەی هەندێ دوکان لە قەیسەریەکان بوو بە درهەمێک، وا دەبوو بە خۆڕایش کەس نەی دەویستن. بازاڕ ئەوەندە چۆڵ بوو دوکاندارەکان خۆیان بە کەلا بەردێنە دەخافڵاند. بێگومان تووتن نەبا، کە نەمر و نەژی، گوزەرانێکی بۆ خەڵقەکە پەیدا دەکرد کۆیێ ئەوە نەمابوو خەڵق بژێنێ. نازانم دوارۆژ سەر بە چ دەگەیەنێ، بەڵام تا ئێستا (1972) لەبەرچاوە کۆیەی سەدان ساڵی پێش ئیمڕۆ بەنیسبەت ئەو ڕۆژگارانە قیاسێک هەڵناگرێ لەگەڵ کۆیەی ئێستادا.

ئینجا با سەرەوژوور بینەوە بۆ تەواو کردنی گەشتەکەمان لە ڕێچکەی ئەو باسەی گوتم دوای کەمێکی دیکە لێی دەدوێم. با بزانین کۆیەی بەر لە کزبوونەوەی گەشەی ئابووری و دەرامەدی، لە مێژووی کۆنەوە چ ڕۆڵێکی بوە لە مەیدانەکانی کۆمەڵایەتی و ژیاری و ڕۆشنبیریدا.

گوتمان لە ڕۆژهەڵاتی هەولێر و کەرکووکەوە تا ڕۆژئاوای سابڵاغ و سنە تاکە شارێکی کورد هەبووبێ کۆیێ بوە بەر لە دروست کردنی شاری سلێمانی بۆ ماوەییێکی چەند سەد ساڵی. لەو چەند چەرخەی فەرمانڕەوایی عوسمانی لە کوردستانی عێراقدا تورکەکان بۆ مەبەسی خۆ چەسپاندن، وەیا هەر مەبەسێک بێ لە دوو شاری هەولێر و کەرکووکدا سەقافەتی تورکیان بڵاوکردەوە و زمانی خۆیان خستە کوچە و بازاڕەکانەوە. ئەم کارەیان کە لەم دوو شارەدا خستە کایەوە لە هەر جێگەییێکی دیکەش با هەمان تەئسیری خۆی دەکرد، وەنیە ڕێکەوت کە یەخەگیری وان بوو چ عەیبێک بێنێتە سەر گیانی کوردایەتییان.

ئەوەی ڕاستی بێ دانیشتوەکانیان بۆ پاراستنی کوردایەتیی خۆیان زیاد لە شاری دیکە دووچاری نارەحەتی دەبوون وەک ئەوەی مەلە لە دژی خوڕی ئاو بکا. لێرەدا ڕووداوێکی مێژوو دەگێڕینەوە بۆ ڕوون کردنەوەی هەڵکەوتی شاری کۆیێ کە مەڵبەندی حاجی قادرە لە ڕووی ڕاگەیاندنی ڕووحی کوردایەتییەوە. لەو واقیعەدا کە عوسمانی چنگاڵی خۆی گیر کردبوو لە هەناوی کەرکووک و هەولێر، مایەوە کۆیێ کە پرشنگییێکی کوردایەتی بداتەوە بۆ ناو دانیشتوانی عەشیرەت و دێ و ئاواییەکانی کوردستان لەو مەساحە پانەی تازە باسمان کرد. ئەو تفاعل و تێکچڕژان و تێکەڵبوونی کۆیێ هەی بوو لەگەڵ لادێ و عەشرەت و کۆچەری کورد بەهۆی یەک زمانی و لەیەکدی نزیکبوونەوەی عادەت و نەریت و فەرقێکی ئەوتۆی نەهێشتبوو لەمیانی ڕووالەتی کۆیی و دەشتەکی.

کۆیێ شارێکی کرایەوە بوو بۆ دانیشتوی دەشت، خەڵقەکەشی ئاشناتر بوون بە ژیانی دەشتودەر، واتە هاتوچۆی دوو سەرە لە شارەوە بۆ دەشت و بە پێچەوانەش نزیکی و شناسی و تێکەڵییەکی بۆ سنووری بەرهەم دێنا لە میانی هەردوو لا بۆ ڕاهاتن بە ژیانی یەکتر وای کردبوو ژنە کۆیی وەک ژنی لادێ بە ڕووی کرایەوە لەماڵەوە بچێتە دەرێ. دەتدیت لە کەرکووک و هەولێر بەهۆی سەقا ئاو دەگەیشتە ماڵەکان، کەچی ژنە کۆیێ جەڕە و گۆزەی لە سەرشان دادەنا و هەڵدەکشا بۆ سەرووی شار و ئاوی خواردنەوەی بۆ ماڵی خۆی دێنا، یاخود جلی شۆراوی دەبرد بۆ حەوزی مزگەوتان و گوێی ڕووباران «بسمیل»ی دەکردن، چ پاسەوانیشی لەگەڵ خۆیدا نەدەبرد. لەوەش زیاتر، ئافرەتی کۆیی لە هەڵپەڕکێی «ڕەشبەڵەک» دا لە دەستی پیاو شایی دەکرد.

کە حاڵی ئافرەت وابێ پێویست نیە باسی حاڵی پیاو بکەم چونکە منیش باسی نەکەم لە خۆوە بۆ سرنجدەر دەردەکەوێ جیاوازییێکی کەم نەبێ نەبوە لە میانی پیاوی کۆیێ و دێیەکانی وڵاتی کۆیێ، ئەوەندە بەسە بڵێم توتنەوانی خەڵقی کۆیێ کەسبی تووتنیان فێری دانیشتوانی دێیەکانی وڵاتی کۆیە و ڕانیە کرد.

ئەم یەک زمانیی و یەک عادەتییە کارێکی زۆری کوردەواری کردۆتە سەر کۆیێ تاوی کۆیەشی گێڕاوەتەوە بۆ سەر کوردەواری. زۆربوونی مزگەوت و بنگەی خوێندن و دین لە کۆیێ، سەرەڕای گەورەیی شارەکە، بەرهەمی جازیبەی یەک زمانییە کە لە دوور و نزیکەوە فەقێی کوردی بۆ خۆی ڕاکێشاوە بێ ئەوەی حکومەتی عوسمانی

پوولێک خەرج بکا خەڵقەکە سەدان فەقێ و مەلایان بە خێو کردوون و ڕێزیان لێ گرتوون. فەقێیەکی سنەیی یا ئاکرەیی یا جەزیری کە بوە بە باڵیۆزی وڵاتەکەی خۆی لە مەڵبەندی کۆیێ، دوای خوێندن و ئیجازە وەرگرتنی سەر لە نوێ بۆتەوە باڵیۆزی کۆیێ کە گەڕاوەتەوە بۆ شارەکەی خۆی.

ئەم تێکەڵیەی ژیانی شارستانیی و عشرەتی وای کردوە خەڵقی کۆیێ دوو چەشنە جلک لەبەر بکا، وەک ئەهلی هەموو شارێک کە تێکەڵی ئەوتۆیی تێدا هەبێ، هەم عەشرەتی هەم شارستانی. لە لایێکەوە جبە و عەمامە و مێزەر و کەشیدە و کەوا و سەڵتە و چاکەت و هەمیان، لە لایێکەوە ڕانک و چۆغەڵ و پەستەک و شەلوار و مرادخانی و شەدە و پشتێن وەک گوڵ و گیای بەهاران تێکەڵ بەیەکدی دەبوون و تا ئێستاکەش. لەناو ئەو تێکەڵییەی جل و بەرگدا دوو ڕاستی پڕ لە واتای تایبەتی کۆمەڵاتی و قەومی دێننە بەرچاوێکی وردبین.

ڕاستی یەکەم ئەوەیە جل و بەرگی چینی ناوەنجی و بەرەژێرتر لەسەر دەستووری عەشرەتی بوە. بە پێی بوونی پەیوەندی لەگەڵ دەشتودەر و ڕەنج دان جل و بەرگیش خۆی ڕێک خستوە لەگەڵ پێداویستی ژیانی دەشت و ئەرکی ڕەنج. ئەمە لانی کۆمەڵاتی سەربە ئابوورییەوە کە تریشکی خۆی لە چاو دەچەقێنێ و سەری ڕێ بە هۆش و سرنجی مرۆڤ دەگرێ.

ڕاستی دوەم ئەوەیە خەڵقی کۆیێ نە دەوڵەمەندی نە فەقیر و هەژاری جلکی تورکانە حکومەتیان لەبەر نەکردوە. با بڵێین هەژارەکە وەزعی ئەوتۆی نەبوە جلکی ئەورووپی لەبەر بکا، خۆ دەوڵەمەندەکە ئەو وەزعەی هەبوە! سەرەڕای بوونی ئەو وەزع و ئیمکانەی بەرژەوەندیش لێی داوا دەکرد لاسایی داگیرکەر بکاتەوە کەچی نەیکرد. کەواتە لە میانی دوو جازیبەی ئەم پەڕ ئەو پەڕی بەرژەوەندی سەر بە داگیرکەر، لە لایێکەوە و، جووڵەی دڵ و هەناو بۆ قەوم و خۆیش، لە لایێکی دیکەوە، ئەو خەڵقەی سەردەمی عوسمانی، بێ مامۆستا و ڕابەر، لە خۆوە بە پاڵەپەستۆ و هاندانی هەستی فیتری خشکەیان بۆ کوردایەتی بوە. ئەمەش لانی ڕاگەیاندنی قوەمی لە جل و پۆشاکی کۆچکردوانمان. لەم مەیدانەدا گەنجی ئیمڕۆی کورد دەبێ کڕنوو ببا بۆ گیانی باپیرانی نەک شەرمی لێیان بێتەوە.

ئەنجامێکی یەکجار گرنگی بە یەک گەیشتنەوەی شارستانەتی و عەشەرەتی لە کۆیێ بۆ ماوەی سەدان ساڵ وەزعێکی زێدە تایبەتی وڵاتی کۆیەیە ئەگەر سێ عامیلی: یەک زمانی و گەورەیی و کۆنی شارەکە نەبا، هەرگیز نەدەشیا ئەو وەزعە پێک بێ. لە شاری کۆیەوە تاوێکی زۆر بەتین و کاریگەر چۆتە سەر باری «دەرەبەگی و زەویداری» لە هەرێمی نزیکە دەستی خۆی. بەردەوامبوونی پەیوەندی زۆر بەهێز و هەمیشەیی لە میانی کۆیە و وڵاتی کۆیەدا بە درێژایی ماوەیێک سەرەتاکەی دیارنەبێ کارێکی کردوە کەم شار توانیوەتی بیکا لە کوردستاندا.

ئەم تین و تاوەی ژیاری (حضاری) و ئابووری کە لە کۆیەڕا پژاوە بە ناو دەشتودەردا شیرازە و ڕایەڵی گیانی قەبیلەیی و هۆزپەرستی لەبەر یەک هەڵوەشاندوە و لەحیمی جۆش خواردنی بەیەکەوە ژیانی تەسک و تروسکی پلەی سەرەتایی کشتوکاڵی تواندۆتەوە، فەللاحی گوندەکانی وڵاتی کۆیێ لە ئەنجامی تەئسیری ژیاری شارەکە بەرەو «مستوی»ی بیر کردنەوەی شارستانانە سەرکەوتوون. ئەم کارە گەیشتۆتە ڕادەیێک کە دەبینی لە ئەغڵەب گوندەکانی وڵاتی کۆیێ دەمێکە گیانی قەبیلەیی لەناو چوە، تەنانەت فەللاحی ئەو گوندانە هێندە چاو کرایەوە بوون سەرەک عەشرەت و ئاغایان لەناو خۆیاندا بەخێو نەکردوە. لە وڵاتی کۆیێ پەیوەندی عەشیرەتی بە جارێ پچڕاوە، تا دەتوانم بڵێم کەم کەس هەیە ناوی کۆنی تیرە و هۆزەکانی بزانێ.

زاهیرەی نەبوونی «قەبیلە – عەشرەت» لە دەوری کۆیێ زاهیرەیێکی ڕێکەوت نیە، بەڵکوو گوێزانەوەیێکی گۆڕانی کۆمەڵایەتییە لە پلەیێکی سەرووتر کە بەهۆی پەیوەندی سەقافی و ئابووری میانی کۆیە و گوندەکان پێک هاتوە. بە پێی زاراوەی سیاسی تازە دەبێ بڵێین چالاکی بۆرجوازیی کۆیێ بە هەردوو لانی ماددی و عقلییەوە لە نێوان خەڵقی گوندەکانی نێزیک کۆیێ بۆ ماوەیێکی یەکجار دوورودرێژ چاوی فەللاحەکانی کردۆتەوە و هۆشێکی سەربەخۆیی پێ داون و بە تدریج لە ئاغا و سەرەک عەشرەتی بێنیاز کردوون. لەبەر چاوی فەللاحێکی مەیلەو شارستانی و خاوەن پەیوەندیی جۆرجۆری ئابووری وکۆمەڵایەتی و فکری لەگەڵ شاردا، سەرۆک و ئاغا و براگەورە لە عەرشی مەیلەو مقدسی پێشەوایی و پارێزگاری نیمچە غەیبی دێتە خوارەوە و دەبێتە خاوەن بەشێکی نابەجێ لە بەرهەمی کشتوکاڵەکە و مەڕ و ماڵەکەی.

بەڵێ بێگومان هاتنە خواری سەرەک عەشرەت لەو عەرشە پیرۆزەی دەستکەوتێکی ژیاری (حضاری) و پێشکەوتنی فکری و ئابووری فەللاحە کەوا لە ڕێی ڕەگ و دەماری پەیوەندی زۆر بەهێز لەگەڵ شارستانێکی زۆر گەورە و چالاکدا بۆی دێ وەک هێزی کارەبا لە مەکینەوە بە هۆی تەل بگا بە پەنا و پەسێوی تاریک و لاتەریک. چالاکی و ژیاری شار نەبێ فەللاح دڵ و مێشکی ڕوون نابێتەوە بۆ تێگەیشتنی سوودی قۆناغێکی لە خۆی هەورازتر، لە فەرزی ڕووناکیش بێتەوە، یەکجار بە ئەرک و درەنگ دەبێ. ڕاستی ئەو تیۆرییەی کە دەڵێ بۆرجوازیی شار دۆستی فەللاحە لە دژی زەویدار و ئاغا، لە وەزعی فەللاحی وڵاتی کۆیێ زۆر چاک دەفامرێتەوە.

دەبێ ئەوە بزانین و باوەڕی پێ بێنین کەوا لە ژیانی سەرەتایی و دوورەشارستانی عەشرەتیدا مرۆڤی عەشرەت لەبەر هۆی یەکجار بەهێز و هەمەچەشنە، وەک هەستی خزمایەتی و بەرژەوەندی تەسکی ناوخۆیی و پێویستی پارێزگاری مشترک و بەیەکەوە ڕابواردنی دائیمی لەگەڵ خەڵقی عەشرەتەکەی و کەمپەیوەندی لەگەڵ عەشرەتانی دیکە و تەسکی نیگا و نۆڕین و دەیان هۆی وەک ئەمانە کە دەتوانیت بۆ خۆت بیاندۆزیەوە، ئا ئەم مرۆڤەی عەشرەتییە وا دەلکێ بە عەشرەتەکەیەوە هەر دەڵێی بەردێکی ناو دیوارە بزووتنی بۆ نیە مەگەر دیوارەکە برمێ. تێکڕای عەشرەتەکەش سەرۆکیان بەلاوە دەبێتە ڕەمزی شانازی و خۆ پێهەڵدانەوە و هۆی سەلامەتی و پاراستنی.

لەو ژیانە سەرتاییەدا جارێ خەباتی چینایەتی تارمایشی لە ناو عەشیرەتدا نادیترێ. لە پلەی قەبیلەیی بەر لە نیشتەجێبوون، مرۆڤی قەبیلە نەک خەباتی چینایەتی ناکا و بەس، دەتوانم بڵێم جارێ لای ئەو «مفهوم»ی چین پەیدا نەبوە تاکوو خەباتی بۆ بکا. بەسە بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستییە کە مرۆڤی کۆچەری بیر ناکاتەوە لەوە ببێ بە خاوەن زەوی چونکە جارێ بیری نەکردۆتەوە لە کشتوکاڵ تا خولیای زەوی مێشکی پڕ بکا. تێکڕای کۆچەری قەبیلە وەک یەک خێزان لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر دەگوێزنەوە بە دوا دەم و کاوێژی ئاژەڵەکانیاندا. خانوەکەشی بریتیە لە ڕەشماڵێک کە ئەویش وەک خۆی بە زەویەوە نالکێ.

لەو پلەیەدا «پەلەی ژیان»یش کە یاسایێکی کۆمەڵاتیی فرەوانتر و ڕەگ داکوتاوتر و کۆنتر و بەهێزترە لە خەباتی چینایەتی وەیا قەومی، بگرە ئاینیش، ئا ئەو ژیانەش

بە جۆرێکی گشتی و تێکڕایی عەشرەتەکە دەیکا بۆ پەیدا کردنی پاوان و بەرگری دوشمن و زاڵبوون بەسەر تەنگوچەڵەمەی گوێزانەوە و هاتوچۆدا. ئەو ستەم و دەستدرێژییەی کە پەلەی ژیانی فەردی بە فەللاحییێکی دەکا لە دژی فەللاحێکی هاوڕێ و دراوسێی خۆی هەرگیز مرۆڤێکی کۆچەری لە دژی هاوڕێیەکەی نایکا، چونکە گەلێک بەرژەوەندی گشتی سەر بە هەموو عەشرەتەکە لە یەکدییان نێزیک دەکاتەوە و چەندین مەترسی دەرەکی «خارجی» دەیان کاتە برا و برادەر. لە فەرزی دەسەڵاتدارێک بشیەوێ غەدر لە یەکێکی بێدەسەڵاتی عەشرەتەکە بکا سەرەک عەشرەت دەرحاڵ لێی بەدەنگ دێ و «جەریمە»ی دەکا، چونکە، وەک گوتم، سەرپاکی عەشرەتەکە بۆ خۆیان و بۆ سەرۆکایەتی یەک خێزانی گەورە پێک دێنن.

هۆی ژیان لە نێو کۆچەر ئاژەڵە، دەسرۆییوێکی کۆچەر مەگەر دزی بکا لە بێدەسەڵاتەکە، کە کارێکی زۆر زەحمەتە و ئیمکانی شاردنەوەی نیە و دەبێتە هۆی ڕیسوابوونی دزەکە، دەنا مەڕ و ئاژەڵی هەردوویان لە یەک مێگەل و گاراندان و بێ جیاوازی دەلەوەڕێن، شوان ناتوانێ مەڕی پیاوی بێدەسەڵات هەڵاوێرێ و لە پاوانی دوور خاتەوە تا کە هی دەسەڵاتدار باشتر بلەوەڕێ. من بۆ مەبەسی ڕوون کردنەوە ئەو ئیحتماله باس دەکەم دەنا لە نێو کۆچەر نە فەقیر و نە دەوڵەمەند و نە شوان بیر لە شتی وەها ناکاتەوە. لە لانی مەڕدارییەوە فەللاحیش ڕێی نیە دەستدرێژی بکا بۆ یەکێکی دیکە مەگەر بە دزین (دزینیش کارێکی دەگمەن نیە لە نێو فەللاحاندا)، چونکە مەڕ و ئاژەڵی فەللاحیش وەک هی کۆچەران لە یەک مێگەل و ڕاندا بەخێو دەکرێن.

بەڵام فەللاح لەو مەیدانانەی گوزەران کە مەسڵەحەتی یەکێکیان تێیدا بە هی یەکێکی دیکەوە نەبەستراوەتەوە وەک کێڵگە و نۆرەئاو و سەپان و ڕێنجبەر گرتن و بە دزیەوە مەڕ لە دەغڵ بەردان... هتد کەمتر دەست دەپارێزێ لە زیان گەیاندن بە دراوسێیەکەی. ئەغڵەب فەللاحێک کە لە کەلێنێکەوە بۆی هەڵکەوت قەپێک دەگرێ لە هاوڕێیەکەی، لەوەدا چ گوێی خۆی ناداتە ئەو تیۆریانە کە لە جیاتی فەللاح «ادعا»ی ئەوە دەکەن بەرژەوەندی چینایەتی فەللاحان دەکا بە برادەر. ئەمەیە فەرمانی «پلەی ژیان» کە لەتەک ئەودا خەباتی «چینایەتی وەیا قەومی» سەدان سەدان ساڵ خەوی وەک مەرگی لێ دەکەوێ ئەگەر دەمە چەقۆیەکی

لاوەکی (جانبی) بە خەبەری نەهێنێ، تا بە تەوژم و تاقەتی میکانیکی خۆی هۆشیار دەبێتەوە و چاو هەڵدێنێ و دەجووڵێ، فەلسەفە و «نظریە» تاقەتیان دەچێ و خەویان لێ دەکەوێ.

بابێمەوە یادی فەرامۆش کردوان. لەو ناوچانە کەوا گیانی عەشرەتی تێدا بەهێز بوو کاتێک »تسویة» جاڕ درا فەللاح بیری لەوە نەکردەوە داوای زەوی بکا، هێشتا دمەچەقۆی لاوەکی نەی ئێشاندبوو تا بەخەبەر بێ، بۆیە هەرچی زەوی هەیە بە ناوی ئاغا و خاوەن ملّکی زلەوە نووسرا. دوای تەواوبوونی «تسویة» بەهۆی هاندانی گەنجی تازە پێگەیشتوو، کە هەندێکیان بەچکە ئاغاش بوون، فەللاح لە ئاغا هەڵگەڕایەوە. هۆی بێدەنگبوونی فەللاح لەکاتی «تسویة»دا لە ترسی میری نەبوو بەڵکوو لەبەر نەبوونی هەست و ڕاپەڕین بوو. چونکە وەک دیتمان دوای پەرەسەندنی ئەو هەستە لە ڕێی تەبلیغاتی گەنجەکانەوە نە ترسی میری و نە بڕیاری «تسویة» و نە تاپۆی ڕەش، فەللاحی نەوەستاند لە جووڵانەوەی چینایەتی و بەگژدا چوونی ئاغا و خاوەن زەوی. لەو کاتانەدا کە فەللاحی ناوچەی عەشرەتی ئەرزی بۆ ئاغاکەی «تسویة» دەکرد و شایەدی ملّکایەتی بۆ دەدا، دێیەکانی وڵاتی کۆیێ زوربەیان هی فەللاح بوون و لە زۆر کۆنەوە دەخلێکی ئاغایان بەسەرەوە نەمابوو.

زاهیرەی بوونی گوندی بچووکی وەک «گۆڕقەرەج» و مانەوەی بۆ خوردە مالیکی وەک حاجی قادر و باب و باپیری، ڕێکەوتێکی کوێرانە نیە، بەرهەمی ئەو گۆڕانە و پێشکەوتنە ژیاری (حضاری) یە دوورودرێژی کۆیەیە کە باری کۆمەڵایەتی و فکری وڵاتی کۆیەی پلەیێکی تەوا سەرخستبوو لەچاو زوربەی ناوچەکانی کوردستانی ژێرروودا.

خۆڕایی و ڕێکەوت نیە ئاغا و خاوەن زەوی وڵاتی کۆیێ لە شاری کۆیەدا ژیاون نەک لە دێیەکان. فەللاح کە هەستی سەربەخۆیی جووڵا هەڵ ناکا، ژیانی ئاغاش لە ناو کۆمەڵە فەللاحێکی ئاغانەویستوودا چ تامی تێدا نامێنێ. وردە وردە لەگەڵ پەیدابوونی نارێکی بەیەکەوە هەڵ نەکردنی فەللاح و ئاغا بە ناچاری ئاغاکە دەگوێزێتەوە بۆ شار و لەوێوە دەتوانێ ئاسانتر سەرپەرشتی ملّکەکانی بکا چونکە کەمتر شەڕەدندوکە لە بەینیان پەیدا دەبێ و هەرچی بێگاریشە لە کۆڵ فەللاح دەبێتەوە، کە لەکۆڵیش بۆوە نابێتە هۆیەکی تازە و تایبەتی بۆ زێدە ڕق لێبوونەوە.

ڕەنگە بگوترێ لە حاڵی وادا کە ئاغا و فەللاح کەوتنە بەربەرەکانی یەکدی، حکومەت بەپێی بەرژەوەندی مشترکی چینایەتی پشتگیری ئاغا دەکا و سەری فەللاحی بۆ نەرم دەکا. لە فەرزی ڕواڵەتی ئەو نەزەرییەیە بێ دەمەتەقەش قبوڵ بکەین و بڵێین هەمیشە حکومەت خزمەتکاری »چین» بوە، خۆ حکومەتی کۆیەی دەوری عوسمانی هی کوردان نەبوە تا ئاغا و مەلاکی کورد حیساب کەین بە خاوەن حکومەت و چاوەنۆڕی یارمەتی لەو حکومەتە بکەین بۆ ئاغا لە دژی فەللاح. داگیرکەری بێگانە، بەتایبەتی هی ڕۆژهەڵات کە دواکەوتووتر بوە لە هی ڕۆژئاوا، خەریکی چەوساندنەوە و ڕاو و ڕووت بوە، ڕەنگە پارووی چەورتری لە ئاغا قەپاندن بێ نەک فەللاح.

ئەم ڕاستییانە بۆت ڕوون دەکەنەوە کە حاجی قادر ڕەگی دەگەڕێتەوە بۆ بنجێکی فەللاحی ئازاد و خاوەن زەوی و گوزەرانی سەربەخۆ و ڕەسیو لە زوڵم و زۆری چینێکی سەرووی خۆی. بێشکەی منداڵی حاجی هەرچەند هەژاریش بوو بێ بێشکەییەکی سەربڵند بوە، داغی نۆکەری و ژێردەستی لەسەر گۆنەی نەبوە، ئەگەر دەرفەت هەبا ئەوەندە خەریک بین هەموو فڕکەییەکی ڕەگی سەرکەشی حاجی بگەڕێنینەوە بۆ بزوێنەرێکی ماددی کە پاڵپشتی بکا لە سروشتە نەسەلمێنەکەی و پێ داگرین لەسەر دۆزینەوەی شوێن قامکی (بصمة) هۆی گوزەران لە دەروون و «ذات»ی حاجی، مومکین بوو سێ زەویەکەی «زولفەقار و قەرەقاجێن و هاوینەهەوار» بکەین بەو مەمکەی هەوەڵ دڵۆپی بەخۆ نازینی تکاندۆتە ناو هەناوی حاجی قادرەوە.

بە پێی گەز و گرێی سەردەمی حاجی، پێش ئەو و ئێستاکە و تا دوارۆژێکی نادیاریش، وەدەستهێنانی گوزەران لە سەرچاوەی ئازاد و بێ زۆر و زەنگی ئەم و ئەو ترسی نانبڕان، فرچکی سەربەخۆیی و ڕێز لەخۆ گرتنی بە مرۆڤ دەگرت و هەستی بچووکایەتی و دەست بەسەری لە دەروونی دەڕواندەوە. فەللاحێک خۆی بە خاوەن زەوی بزانێ و بە ئارەزۆی خۆی بیکێڵێ و نەیکێڵێ و ئاژەڵەکانی بێ ترس لێرە و لەوێ بلەوەڕێنێ و چاوسوورکەرەوەی نەبێ، هەڵبەت فەللاحێکی لەخۆ ڕازی و سەرکەش دەبێ لەچاو یەکێکی دیکەی «کرێگرتە» کە ناچار بێ بۆ خاتری زەویەکەی لەبەر دەستیدا بمێنێتەوە خاوەنەکەی بلاوێنێتەوە و مێچکە مێچکەی لەبەر بکا و سوخرە و بێگاری لێ بسەلمێنێ.

باوەڕ دەکەم لە ڕۆژگاری ئێستاکەشماندا، لە وڵاتی وەک عێراق و کوردستان و زوربەی ئەو وڵاتانە کە شیرازەی کۆمەڵایەتی تێیدا فەلاحەت و زەراعەتە، هێوێنی شەخسیەتی فەللاح زەویەکەیەتی. کە زەوی لێ سەندرایەوە و ملّکایەتیەکەی نەما، بەهەر ناوێک بێ، ناوەڕۆکی مرۆڤایەتی و ئیرادەی لە دەست دەچێ و دەبێتە هی ئەو لایەنە کە زەویەکەی لێ ساندوە. فەللاح کە خۆی خاوەن زەوی نەبوو، دەبێتە عەبدی زەوی. کە بڵێین جاران خاوەن زەوی فەللاحی دەکرد بە عەبد لە ڕێی دەست ڕاگەیشتنی بەسەر چاوگی مەعیشەتی فەللاحەکە، ئێستاش کە نەقابە یاخود هەر ڕێکخراوێکی تر خۆ لە فەللاح بکا بە چاوسوورکەرەوە بتوانێ ئەرزی لێ مەنع کا یاخود لێی بسێنێتەوە و بیدا بە یەکێکی تر، دیسانەوە فەللاحەکە هەمان عەبدی لەمەوپێش دەمێنێتەوە کە هەبوو. «ئاغاگۆڕی» فەللاح ناگۆڕێ، فەللاحی بێ ئەرز مرۆڤێکی دیلی بێ ئیرادەیە.

من کەوا بەپەلە لەو مەوزووعە گرنگە بە بازدان دەڕۆم و پەنجە بۆ ئێرە و ئەوێ درێژ دەکەم و لێی تێدەپەڕم بۆیەیە چونکە مەبەسم نیە تۆژینەوەی نەزەری و مێژوویی سەربەخۆ و قووڵ لە کۆمەڵایەتی کوردستان بکەم. هەر هێندە دەتۆژمەوە بایی ئەوە بکا لەبەر تیشکی بەراورد کردنی جێگە لەگەڵ جێگە و بەیەکدی گرتنی پلە لەگەڵ پلە، پایەیە شاری کۆیە و«حجم»ی کار کردنی لە ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووری و ڕۆشنبیریی کوردەواری خۆ بەدەر بخا لەبەر چاوی خوێندەوارێکی تازە پێگەیشتووی کورد.

ڕوون کردنەوەی ئەم لایەنە ڕاستەوخۆ یارمەتی ئەوەشمان دەدا بزانین بۆچی ئیمکانی ئەوە هەبوو یەکێکی وەک حاجی قادر لەو خاکە هەڵکەوێ. حاڵیبوون لە واقیعی ژیاریی و ڕۆشنبیریی کۆیی... ناسینی کۆیێ و تێگەیشتنی دەوری لە گۆڕینی کۆمەڵایەتی و ئابووری کورد بە درێژایی مێژوویێکی سەرەتا نادیار... سەرکەوتنی تێکڕای دانیشتوانی ناوچەی کۆیێ بۆ پلەیێکی بەرەوژووتر لە پێپلیەکی تطوردا، لایەنی «لە عادەت بەدەربوون»ی دەرکەوتنی حاجی قادر و مەلای گەورە لە کۆیێ دەکاتە شتێکی مفهوم.

کە کۆیێ ناسرا مەعلووم دەکرێ ڕێکەوت نیە بە دوا حاجی قادردا، کە ئەم نووسینە دەیەوێ لەگوێرەی ئیمکانی تێی بگا، مەلای گەورە بێ و باوجوودی مەلایەتی لە پێش هەموو کوردێک کچی خۆی بنێرێ بۆ مەکتەبێ کوڕان... تاکە کوردێک بێ

شیوەن بکا بۆ بارزانی 1932... تاکە کوردێک بێ بۆ مافی کورد لە نەوت بەگژ میریدا بێ لە 1930... تاکە کوردێک بێ پرۆتستۆی خۆی دەربڕێ لە تۆمار کردنی ئەرزی کورد بە ناوی وەزارەتی دارایی عێراقەوە:

«قطع النظر»یش لە مەعدەن و کان
ئەو ئاو و بەراوی مڵکی کوردان

کردیانە ئەرازیی ئەمیری
وەی خاک بەسەرت ئەتۆش ئەسیری

ئەوسا چ بەیاننامەی 11 ئازار و پرۆژەی ئۆتۆنۆمی نەبوو مافی کورد بپارێزێ لە دەستدرێژی ڕێژێمی پاشایی بەرانبەر مافەکانی ماددی و مەعنەوی گەلی کورد، دەبوا دەنگێک بەرز بێتەوە لەو گوزارشتەی دەخلێکی بەسەر وجودی کوردەوە هەبوو، ئەم دەنگەش هی مەلای گەورە بوو.

ئەوەش بزانە دەرخستنی ڕۆڵی کۆیێ لە پێگەیاندنی ئەم بلیمەتانە بایی سەرە مویێک لە پایەیان دانالەنگێنێ، چونکە ئەم ڕاستییە هەر دەمێنێ کە هەستیاری و سۆز و هەڵکەوتوویی بێمانەند وای کردوە تەنها ئەمان بتوانن هێوێنی ئەم سەقافەتەی کۆیێ تێکەڵ بە دەروونی خۆیان بکەن و وەک بورکان لە ڕۆژگاری کوردەواریدا بیتەقێننەوە. حیسابێکیش بۆ ئەوە بکە هیچ کامێکیان بۆ ئومێدی شەخسی، چەندیش کەم بێ، خەباتیان نەکردوە، بە پێچەوانە، کوردایەتی ئیفلاسی بە هەردوویان کردوە. لە هەوەڵ هەنگاوی تەقەللایانەوە بێنیازی خۆیان دەربڕیوە و هەرچی تەمای خۆشی بێ لە دڵی خۆیانیان دەرهاویشتوە هەردوویان لە ناخی دڵ و دەروونی کۆیێ، کە میراتێکی هەزارساڵەی یا زیاتری ڕەوتی بەرەو پێشەوەی ژیاریی و ڕۆشنبیریی کورد بوە هەڵقوڵیون، لە غەیبەوە نەهاتوون، بۆ کۆڕی کۆششی بێ فڕوفێڵ و گرێوگاڵ کە لە ڕەسەنی و قووڵایی ئەو سەقافەتە بوەشێتەوە.

ئەگەر کۆیێ جێی نەخوێندەواری با زیاتر لە هەموو کوردستان، هیچ تەفسیرێکی ماددی ناتوانێ تێمان بگەیەنێ بۆ دەبێ حاجی قادری «کۆیی» دەیان ساڵ پێش هەموو کوردێک بکەوێتەوە لە مەیدانی بیری ڕوون و فەلسەفەی کوردایەتی؟ بۆ دەبێ ئەو تاک و تەنها لە ناو دە میلیۆن کوردی ئەوسا بیر بکاتەوە لە باری

کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی و ڕۆشنبیری ئەوتۆ بە زیهنی غەیری ئەودا نەهاتبێ؟ چۆن وا بوە زێدە لە هەموو کوردێک بەر لە 100ساڵ زیاتر پرۆگرامی خەباتی میللی بکا بە ئایینی خۆی و بیکاتەوە بە دەرس بۆ میللەتەکەی؟ ئەگەر کۆیێ مەفتەنی ئەو جەهالەتە بێ کە گوتارەکەی «هاوکاری» دەیکا بە بەرگ و لەبەر کۆیەی دەکا دەبا ڕۆشنبیرێکی ڕۆژانی ئێستاکە تێمانبگەیەنێ چۆن وا ڕێککەوت مەلای گەورە تاکە مرۆڤێک بێ لە ناو کورد و غەیری کورد بەو هەموو جورئەتەوە هێرش ببا تە سەر چاوگەکانی «جبر» و شتێک بڵێ هەر ئەو گوتبێتی، ئیمرۆش گەنجێکی «علمانی» نەوێرێ بیڵێ؟

خۆزی ئیمامی ڕازی لەم عەسرە زیندوو بایە
تا لە سونعی بەشەری تەیارەی بدیبایە

ئەوجا ئیمانی دێنا بە قودرەتی بەشەری
قەت ئینکاری نەدەکرد بە تەقلیدی ئەشعەری

چونکی سەلبی تەئسیریان لە قودرەتی عەبدی کرد
ئوممەتی وا بە قودرەت پاکی بە زیندوویی مرد

«رواه الدار قطني، حدثنا الترمذی»
هەموو لە کیس ئێمەدا لە پاپۆڕ تاکوو دەرزی

ئیمامی«ماتریدی»ش یەعنی «علم الهدی»
چەند لە قودرەتی هات ڕێگەی لە ئێمە تێک دا

دەتێمان بگەیەنن بە ناو کام دەربوونە و کوچە تاریکەکانی جەهلدا فکرێ بۆ ئەوە ڕۆیی بڵێ:

عیلمی تەبیعەت عیلمی خودایە
«قال» و «قول» گشتی هەبایە

عیلمی کیمیات گەر نەخوێندوە
بەخوا نازانی خوا چی کردوە

ئەمەی دەگوت لە کاتێکدا بە لای زوربەری خەڵقەوە دەم لێدان لە «طبیعە» بە کفر و «الحاد» حیساب دەکرا لەو ڕووەوە کە گۆیا شەریک پەیدا دەکا بۆ خوا. لە لایەن سوودی شەخسیشەوە قسەکان بەر لە هەموو عالەم دژی خۆی بوو چونکە خۆی مەلا بوو، شۆرەت و شەخسیەتی لەگەڵ مەلایەتی تێکەڵ بوو.

بۆ دەبێ یەکەم دلێر لە کوردستاندا پشتگیری بکا لە ئافرەت دەنگی مەلای گەورە بێ لە کۆیێ؟

ژن مامۆستای فیترییە
«تشکل»ت لەوییە

ماددی یە «معنوی»یە
«رشد»ە یا لە ڕێ لادان

تەربیە لە لای داکە
داک چاک بێ ئەولاد چاکە

باب لە ئەسلا بێ باکە
فەقێکی ناکا چەندان

کە دایکی چاکی نەبی
سێ سەد حەدیسی «نبی«

چلۆن تەئسیری دەبی
وەک پف لە پەتک و سەندان

ئەم بەستنەوەی پەروەردەبوونی منداڵ بە کۆش و باوەشی دایکیەوە و دۆزینەوەی پەیوەندی ماددی لە میانی «ڕەوشت»ی منداڵ و «بێشکە»ی منداڵ چۆن سەری دەرهێنا لە سەرچاوەی «جەهالەتی» کۆیێ؟ گوێت لێیە دەڵێ «سێ سەد حەدیسی نبی» بێ دایکی چاک تەئسیری نابێ؟ ئەم بیروباوەڕە ئازادە چۆن ئیمکانی بوو چل ساڵ زیاتر لەمەوبەر لە شەوەزەنگی کۆیێ بگەشێتەوە؟ سرنج بدە تێدەگەی لەم

هەڵبەستەدا داوا دەکا پەروەردە کردنی منداڵ لە دایکەوە ڕانەگوێزرێ بۆ باوک کە لە یەکدی جودا دەبنەوە. دەیەوێ لە نوێ بیر بکرێتەوە لە سوودی منداڵ ئاخۆ باوک یا دایک بۆی بە پەرۆشترە لە ساواییدا؟ دەڵێ تەربیە لە لای داکە- باب لە ئەسڵا بێ باکە.

ڕەوا نابینم باسی مەلای گەورە بە جۆرێکی «جانبی» بێنمە ناو نووسینمەوە چونکە ئەو بۆ خۆی لێی دەوەشێتەوە ببێتە سەرچاوەی دیراسەیێکی قووڵ کە لە فەلسەفە و خەبات و ڕەوشت و بیری ئازادی ئەو مرۆڤە بدوێ. حورمەتی حاجی قادر ئیزنی بۆ وەرگرتم لە گیانی مەلای گەورە کە لێرە بە موناسەبەی جێگە سوود لە یادی وەرگرم، هەرچەند یاد کردنەوەشی بە جۆرێکی سەربەخۆش نەبێ.

با لە حاجی و مەلای گەورە واوەتر بێین بۆ ساڵەکانی 40 — 50 و چاوێک هەڵبێنین لە خەباتی سیاسی کوردەواری، دەبینین بەشێکی زۆر لە ئەندامانی »قيادي» پارتە شورشگێرەکان گەنجی کۆیین. ئەگەر بە تەئسیری یاساکەی «قصور ذاتي Inertia» نەبا کە تین و تاوی ڕابردووی دەوڵەمەندی کۆیەی لە ڕووی سەقافەت و ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە گلێر کردەوە بە دوا حاجی قادر و مەلای گەورەدا بۆ ئەم گەنجە شۆڕشگێڕانە، ئەگەر ئەمە نەبا کۆیەی ساڵانی 1940 و 1950 تێکڕای وەزعی هێندە دالەنگا بوو نەتوانێ بچێتە ڕیزی سلێمانی و هەولێر و کەرکووک لە ڕووی ئیمکانی پێ هەڵستان بە ئەرکی قیادەتی بزووتنەوەی سیاسی. ڕابردووی پڕ شانازیی کۆیێ یەکەم هاندەری خەڵقەکەی بوو تا لە کۆڕی خەبات دوا نەکەوێ. بە ئەرک و زەحمەتێکی نەفەسبڕ کۆیەی دابڕاو لە کاروانی دەرامەد و گوزەران خەباتی سیاسی خۆی لە ڕیزی هەرە پێشەوەی خەباتی گشتیی عێراق و تایبەتیی کورد دەئاژوا. بەڕاستی شەرمی لە خۆی دەهاتەوە، وەک دەوڵەمەندێکی لێ قەوماو، دان بنێ بە ئیفلاسیی خۆی هەرچەند بەمەشدا لە ئەرکێکی پشت شکێن ڕەها بێ. من کە لە نزیکەوە ئاگادار و تێکەڵی ئەم بزووتنەوە و خەباتە سیاسییە بووم دەتوانم باش «تقدير» بکەم کەوا کۆیەی ڕووت و قووت و برسی بەرەو هەڵوەستی سامناک و ئەرکدار دەچوو و چەندین جار بەقەدەر توانایی خۆی قورسایی خەباتی دەگرتە بەر، نەک لەبەر بەسەهوو چوون لە خۆ هەڵسەنگاندن و «چەند دەخوا و چەند دەبەزێ» بەڵکوو لەبەر تاکە هۆی شەرم کردنەوە لە کۆڵدان.

بۆ ئەوە قسەکانم مافی خۆیان لە قەناعەتی خوێنەر وەربگرن لێرە بەرەژێر لیستەیێک دەگرمەوە لە سەرژماری کۆیە و شارە پێشەواکانی خەباتی سیاسی لە کوردستاندا تاکوو بەوەدا ئیمکانی نرخاندنی ڕۆڵی کۆیێ ئاسانتر بێ لە ڕێی بەراورد کردنی بارستی ئەو لەگەڵ هی ئەوان:

| | 1947 | 1957 | 1965 |
|---|---|---|---|
| کۆیێ | 7.800 | 8.300 | 10.500 |
| هەولێر | 27.000 | 40.000 | 92.000 |
| سلێمانی | 33.000 | 50.000 | 86.000 |
| کەرکووک | 68.000 | 126.000 | 157.000 |

تا ئەو سەرژمارانە بەهەڵەت نەبەن دەبێ ئەوەش بزانی دەرامەدی هەشت هەزار کەسی کۆیێ نیو بەقەدەر دەرامەدی هەشت هەزاری سێ شارەکەی دی ناکا چونکە پەژارەیی باری ئابووری کۆیێ گەییوە پلەیێک فرزەی بڕی بوو و بەتەواوی پەکی گەشە کردن و گەورەبوونی خستبوو: لە 1947 ەوە تا 1957 وەک لە لیستەکە دەخوێنیتەوە سەرژماری 500 کەسی زیاد کردوە. ئەم ژمارەیە کەمترە لە سەرجوملەی منداڵبوون لەو دە ساڵانەی کۆییدا، دەبوا لە ڕێی منداڵبوونەوە پتر زیاد کا بەڵام بێئیشی و هەژاری خەڵقێکی زۆری کۆیەی دەرپەڕاند بەرەو هەولێر و کەرکووک و ڕانیە و قەڵادزە و سلێمانی و بەغدا و هەموو لایەک... بەشێکی زۆری فەرقی دوو هەزاری میانی سەرژماری 1957 و 1965 دەگەڕێتەوە بۆ هەڵاتنی

فەللاحان لە دێیەکانەوە بۆ ناوچەی قەزا و لیواکان لەبەر مەترسیی جەنگی ناوخۆیی، دەنا ڕۆیشتنی کۆییان بۆ جێگەی تر هەر بەردەوام بوو تا ئەو ڕۆژەی 1965 کە سەرژماری تێدا کرا، بۆ خۆم یەکێکم لەو ڕۆیشتوانە، وا بزانم تا ئێستاش هەر بەردەوامە. خۆ ئەوەی ڕاستی بێ بەشێکی زۆر لەو کەسانەی کۆیەیان بەجێ نەهێشت بەهۆی ئەوەوە بوو هیچیان نەبوو بیکەنە خەرجی ڕاگوێستن.

لەمەڕا بۆت مەعلووم دەبێ کۆیەی 7-8 هەزار کەسی بێ دەرامەد بەقەدەر شاری 4-5 هەندی خۆی گەورە و چەند جار لە خۆی دەوڵەمەند تر خەباتی دەکرد و ڕەنجی دەدا. یەکەم بەهۆی ئەم زێدە فیداکارییە تەوژم و پاڵەپەستۆی بەهێزی ڕابردووی بوە نەک هێزی ئێستاکەی. لەبیرمە لەساڵی 1957 کە تیپی «مەولەوی» لە گەشتی پیتاک کۆ کردنەوە بۆ خنکاوەکانی سلێمانی هاتنە کۆیێ، یەکێک لە ئەندامەکانی بە خۆمی گوت »هەرگیز نەمدەزانی کۆیێ شارێکی هێندە بچووکە، لە گوێرەی دەنگ و ناوی خەبات و چالاکیی سیاسی کە کۆیە هەیەتی دەبوا هەر نەبێ 25 هەزار نفووسێکی هەبێ». ئەوسا نفووسی هەشت هەزار بوو، هی سلێمانیش پەنجا هەزار. دیارە ئەو ئەندامە لە دڵی خۆیدا، بەلای کەمەوە کۆیەی داناوە بە نیو هەندەی سلێمانی، کەچی دەوری شەشیەکێکی دەرچوو...

لە یەکەم کۆبوونەوەی ئاشتیخوازانی عێراق لە ساڵی 1954 تەنها نائیبێکی ئەوسای کورد کە بەشدار بووبێ نائیبی کۆیێ بوو. گەورەترین دەسەڵاتدار و خاوەن و زەوی و هێزی عەشرەتی کۆیەش کاکە زیادی حەماغابوو ئەویش یەکێک بوو لەو بەشدارانە و، ئەوسا، ناوی لە ڕیزی هەرە پێشەوەی ناوەکان نووسرا بوو. بۆیە دەڵێم ئەوسا چونکە کاتێک لە دوای سەرکەوتنی شۆڕشی تەمووز کە ئاشتیخوازی بوو بەهۆی خۆڕەپێش کردن و حەسانەوە، کەسانی ئەوتۆ لە کورد و عەرەب هاتنە ڕیزی پێشەوەی ئاشتیخوازی و ناویان تێیدا بریقایەوە لەوە بەپێش خۆیان دەپاراست لە مەترسی «تاوانی ئاشتیخوازی». پیاوی وەک کاکە زیاد هەر بۆیە دەستی دەدا ببێ بە سوپێر و قەڵغانی کاتی خەوف و خەتەر. ئەمە ڕاستییێکە دەبێ بنووسرێ و پەندی لێ وەربگیرێ. ئێمڕۆش نەبێ لە دواڕۆژدا. پەندیشی لێ وەرنەگیرێ، بەڵکوو دوشمنایەتیشی بکرێ، هەر دەبێ بنووسرێ. چ قەیدی هەیە ڕاستیی بە بەرگوێی مێژوو کەوێ.

بەر لەوە بگەینە باسی «ئاشتیخوازیی» و کۆبوونەوەکەی یەکەمی، دەبوا ئەوە بڵێین کۆیێ تەنها شارێک و ناوچەیێک و ئاواییەکی کوردستان بوو کە لە هەموو خەباتی ئاشکرای کوردی عێراق توانیبێتی لە ڕێی هەڵبژاردنی ڕاستەقیینە و بە اصطلاح «جماهيري»یەوە دژی خواهشتی میری نوێنەری سەر بە پارتێکی شۆڕشگێڕ بگەیێنێتە ئەنجومەنی نوێنەران (مجلس النواب). لە هەڵبژاردنەکانی دوای جەنگی دووەمەوە تا ئەو هەڵبژاردنەی لە ئاخەلێوی ساڵی 1954دا کرا بۆ ئامادە کردنی زەرفی لەبار بۆ «پەیمانی بەغدا»، نوێنەری »پارتی دیموکراتی کورد» لە کۆیێ دەرچوە و دەنگی کوردی بە گوێچکەی جیهان ڕاگەیاندوە و داوا کردنی مافەکانی دروشمی چالاکیە سیاسیەکەی بوە لە ئەنجومەنی نوێنەراندا. نەگەیشتنی نوێنەرانی ناوچەکانی دیکەی کوردستانی عێراق بە ئەنجومەن شایەدی دەدا لە دژی ڕێژیمی پێش 1958 و ئەوە ئیسپات دەکا کە ئازادی نەبوە لە هەڵبژاردندا. بەڵام گەیشتنی نوێنەری کۆیێ لە ئەنجامی زەحمەت و تەقەللاییێکی زل و زەبەندەدا سەرەڕای ئەو شایەدییەی دژی ڕێژیمی پێش 1958، شایەدییەکی تایبەتیش دەدا بۆ کۆیێ کە شارێک بوە، ڕەنگە تاکە شارێک بووبێ، لە هەژاریەوە تاکوو گەورەترین دەسەڵاتداری، خەباتی کردوە بۆ وەدەستهێنانی پیرۆزی لە جەنگی سیاسی میللی دژی ڕێژیمێکی حەقنەسەلمێن.

ئەم تایبەتییەی کۆیێ کە نادیترێ لە شوێنێکی دیکەی وەک خۆی، میراتی بێ دەمەتەقەی ڕابواردووی بەنرخ و پێشکەوتوویەتی، ئاڵقەیێکە لە زیجیرەی بێپچڕانەوەی بەرەوپێش ڕۆیشتنی ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و ژیاریی مێژووی چەندین سەد ساڵی کۆیێ، بەر لە جەنگی یەکەمی جیهانی. هاندان و پاڵەپەستۆی ئەو ڕابوردووە دەولەمەندەی نەبا هەرچی هۆیەکی وەک «سوودی شەخسی و چینایەتی... هەڵاوێشتنی دەماری قەومییەت زیاد لە خەڵق... پێداویستی موناوەرەی سیاسی... کۆڕێنێ» بەتایبەتی لە کۆیێ پەیدا نەبووبوو تاکوو لەو هەڵوەستە تایبەتییەی هەڵبژاردندا ببێتە نموونەی خەباتی چالاک و خۆ قوت کاتەوە. دەبوا هەژاری و بێدەرامەدی تازە یەخەگرتوو کە زۆر بە دڕی بینەقاقەی خەڵقەکەی گرتبوو وەهایان دوور خاتەوە لە تێکڕای خەباتی عێراق و کوردستان ناوێکیان بۆ نەهێڵێ لە کۆڕی شانازیی سیاسیدا.

نووسەر ناتوانێ ڕاستی تەواو لە واقیعێکی ئێستاکەدا بدۆزێتەوە ئەگەر ڕەگەزە پێکهێنەرەکانی لەمەوپێشی نەزانێ. کۆیە و حاجی قادریش کە لە یەکدی جودا ناکرێنەوە، نابن بە دایک و ڕۆڵەی تەواو ئەگەر پەیوەندی لە میانیاندا هەر هێندە بێ حاجی لە کۆیێ یان لە نزیک کۆیێ هاتبێتە دونیا. نەبوونی ڕەگی موشتەرەکی بەهێز لە میانی منداڵ و بێشکەی تێدا پەروەردەبوونی، لێکیان دەکا بە خوازرایەوە و مێوان.

حاجی مێوانی بێشکەی خۆی نەبوو، بێشکەکەشی نەخوازرابۆوە. گەشەی ژیاری (حضاري) سەدان بەڵکوو هەزاران،ساڵی تێپەڕیو لە مێژووی دەوڵەمەندی کۆیێ کارێکی پیرۆزی کردبوو لە سازدانی زەمینەی پەسەند بۆ ڕوانی تۆی بیری ئازاد. خستنە بەرچاوی ئەو ڕاستیانە ئەگەر هەڵدانەوەیەکی کۆیەشی تێدا بێ، یارمەتی دەدا لە حاجی قادر بگەین، ڕەنگە بێ ئەو ڕاستییانە هەر تێی نەگەین. لە باس کردنی ئەو تایبەتییانەش کە مێژوو بۆ کۆیەی پێک هێناوە بێ ئەوەی من و تۆ بمانەوێ یا نەمانەوێ، هەرگیز نابێ ئەوە بە دڵاندا بێ، خەباتی جێگەیێکی تر یا شەخسێکی سەربەخۆ کە لە کۆڕی کوردایەتیدا جەنگاون کز دەبێتەوە لە موقارەنەدا. هەر کەسە و هەر جێگەیە جوانەمەردییێکی کرد بێ لە گوێرەی دەسەڵات و بۆ لوان، چ دەرفەتێکی بە لۆمە لێ کردن نەداوە، کەسیش ڕێی ناکەوێ لۆمەی بکاو بڵێ بۆ لەوە زیاتری نەکرد. داوا کردنی لە تاقەت بەدەر شەڕفرۆشتنە بە واقیع. من لە حیسابی تایبەت بە خۆمدا پیاوەتی ئەو کەسانە و ئەو کوردانەش دەڵێمەوە کە لە ژێر پەردەی تەئیدی حکومەتەوە چاکەیان کردوە. لە هەموو کەس داوا ناکرێ پاڵەوان بێ بەڵام لێی داوا دەکرێ چاکە بکا، هەر نەبێ خراپە نەکا. دیسانەوە دەڵێم لە ژێر پەردەی خەبات و کوردایەتی و چینایەتیش خراپە کردن هەر خراپەیە. بەرگی درۆزن حەقیقەتی شتان ناگۆڕێ.

بەدوا باس کردنی پلەی ڕۆشنبیری و گۆڕانی کۆمەڵایەتی و فراژوویی ئابووری و ژیاریی کۆیێ و دەوروبەری، با نەختێکیش لە ڕووپەرەی ژیانی هونەریی کۆیێ بەڵگە و شایەد بە قسە بێنین تا کورتە حیکایەتێکی ڕابردووی گەشەداری ئەم شارەمان بۆ بگێڕنەوە، ئەوانیش لە لای خۆیانەوە تیشکێک باوێژن بۆ ڕووناک کردنەوەی پەناوپەسێوی مەفتەنی حاجی.

لە کتێبخانەی جەلیزادان دەسنووس هەیە بە ناوی «الاذکار للامام النواوي» بە خامەیێکی ڕەنگین و هونەرکار نووسراوەتەوە، لە کۆتایی کتێبەکە مێژووی

نووسینەوەی هەیە و ساڵی 776ی کۆچی تۆمار دەکا کە دەوەستێتەوە بەرانبەر ساڵی 1274ی زاینی، واتە نزیکی 600 ساڵێکە نووسراوەتەوە. خاوەنی دەسنووسەکە، خۆش بەختانە، ناوی خۆی و نشیمەنی بەتەواوی و ڕەوانی بەیان کردوە و دەنووسێ »خضر بن عمر الکویسنجقلي موطنا»[23]. تا ئێرە هەندەمان لە ڕاگەیاندنی کتێبەکە پێ دەگا کەوا، بەر لە 600 ساڵ خۆشنووسی وا هونەرمەند لە کۆیێ هەبوە، کە ئەمە بۆ خۆی بەڵگەیە بۆ ڕەواندنەوەی توهمەی »جهالة» لە ڕابردووی کۆیێ. لە لانی زانیاری مێژوویی ڕوتیشەوە ئەوەمان تێ دەگەینێ کە ناوی «کۆیسنجق» کۆنترە لە حوکمی عوسمانی، ڕەنگە بگەڕێتەوە بۆ سەردەمی «ئیلخانی» وایا لەویش کۆنتر بۆ دەوری فەرمانڕەوایی نەوەکانی هۆلاکۆ... لەو سەردەمە کۆنانەدا »سنجق» هەر واتاییکی ڕاگەیاندبێ، کۆیێ ئەوسا هەو بوە.

لەبارەی نرخی ئەو کتێبە و خاوەنەکەی، بەنیسبەت دەرخستنی ڕابردووی هونەری کۆیەوە، هەر ئەوەندەم بۆ ڕوون دەبۆوە کە تاکە لایەنی خەتخۆشی ڕوونی دەکاتەوە، زۆریش بەوەندە ڕاگەیاندنە دڵخۆش دەبووم، بە تایبەتی لە ڕووی ئەوەوە ڕابردوومان، چ هی تێکڕای کورد بێ چ هی تەنهای کۆیێ بێ، یەکجار پێویستی هەیە بە سەرچاوەی نووسراو، نووسراوەکە هەرچی دەبێ با ببێ، کە یەک تریفەی ڕووناکی بخاتە ناو نادیاری و نائاشکرایی گۆشەیێکی مێژوومانەوە، بێئینسافیم لەگەڵ کتێبەکە نەدەکرد و بەوەندە پەیامەی «هونەری و مێژوویی» دەربارەی ڕابردووی کۆیێ لێی ڕازی بووم، نەخێر مەمنوونی بووم، تا لەو ساڵانەی دوایی، لە پاشکۆیەکی ڕۆژنامەی «الثورة»ی بەغدادا گوتارێکی خوالێخۆشبووی «دکتۆر مصطفی جواد»م خوێندەوە بەر لە مەرگی بە چەند مانگێک، لەسەر مەقامی عێراقی دەدوا. لە ئاخەلێوەی گوتارەکەی چەند دێرێکی نووسیوە، بێ ئەوەی ئەو ئاگادار بێ وەیا مەتلەبی بێ، نرخێکی زلی دا بەو کتێبە و خاوەنەکەی لە ڕووی دەلالەتی بۆ پایەی ژیاری کۆیێ لەو سەردەمەدا. لەو ئاخەلێوە باسی دوو مۆسیقاری گەورە دەکا کە لە ڕێی وانەوە زاراوە (اصطلاح)ی فارسی ناو مەقامەکان بەرەو ڕۆژئاوای وڵاتی عەرەب بڵاو بۆوە. دەخلێکم بەسەر یەکەمیانەوە نیە، بەڵام بەنیسبەت دوەمەوە دەڵێ

---

[23] – ئەگەر لە کۆیێ نیشتەجێ نەبا نەی دەگوت «موطنا» دەبوا بڵێ «مولدا» یاخود «منشا» کە ویستبای کۆنە هێلانەکەی یاد بکاتەوە.

«الجمال المشرقي خضر بن عمر الكردي». بێگومان ئەم مۆسیقارە هەمان خەتخۆشەکەی نووسەرەوەی کتێبی »نواوی»یە، کەوا نەک هەر کوردە، کۆییشە. پێی ناوێ من بڵێم »خضر بن عمر الكردي» کەسێک نیە غەیری ئەو «خضر بن عمر الكويسنجقلي»یە. هەڵبەت ئەو لە نووسینی خۆیدا ناڵێ «الجمال المشرقي» چونکە عادەت نیە، جوانیش نییە نووسەرەوەی کتێب وەیا دانەرەکەی خۆ هەڵداتەوە بەلەقەبان، بەڵکوو بە پێچەوانەی خۆ هەڵدانەوە، جاران خۆشکاندنەوە باو بوو. زاتەن ئەمیش لە پێش ناوەکەی دەنووسێ »الراجي لطف ربه الاكبر».

لەگەڵ مندا سەیری دەلالەتی ئەوەکە یەک لە دوو مۆسیقاری هەرە زلی ئیسلام بەر لە 600 ساڵ هونەرمەند و ڕۆشنبیرێکی کۆیێ بوە. خوێندنی مەلایەتی، وەک گوتمان و باسمان کرد، لە هەموو کوردستان باو بوە، کۆیەش وەک شوێنە پێشکەوتوەکانی کوردستان لەو خوێندنە بەهرەوەر بوە. بەڵام پێگەیاندنی مۆسیقاری ئەو تۆ کتێبدانێ لەسەر مۆسیقا و، نووسینەکەی لە جیهاندا بڵاو بێتەوە و سەقافەتی مۆسیقی بگوێزێتەوە لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێک و هێندە هونەرکارێکی شەنگ و هێژای بێ پێی بگوترێ «الجمال المشرقي»، ئەوەندەش بە نەژادی خۆیەوە بنازێ »الكردي» بە دوادا بێ، لە لانی خۆشیەوە سووربێ لەسەر دەربڕینی مەفتەنەکەی کە «کۆیسنجق» بێ ئا ئەمە کارێکە و ڕووداوێکە حیسابان نوێ کاتەوە ئەگەر سەرەوبنیان نەکا، هەڵان ڕاست کاتەوە و نیگا بگۆڕێ بەرەو ڕابردوو، بە چاو و زیهنێکی تازە کرایەوە مێژووی کۆیێ بنرخێنێ.

لەم ڕۆژگارەی ئیمڕۆمان کە پلەی جیهانگەردییە و مۆسیقا و گۆرانی گوێچکەی گوێگر کەڕ دەکەن و ڕادیۆ و تەلەفیزیۆن و سینەما و هۆڵی مۆسیقا و شانۆ، بگرە سەرشەقامی شارە گەورەکان تێکڕایان وەک خانەی مۆسیقا وان. ئا لەم سەردەمەی گۆرانی و مۆسیقا و سەما و هەڵپەڕکێیەدا لە هەموو کوردستان، بە نائازادییەوە، هاوتای ئەو مام خدرە کۆییەی پێش 600 ساڵ نیە، شاگردێکی ئەویشمان نیە.

تۆ بڵێی بوونی ئەو لەو کاتەدا و نەبوونی هاوتای ئەو لەم کاتەدا دوو هەڵکەوتی ڕێکەوت و بێدەلالەت بن؟ هەروا لەخۆڕا بێ بوونی ئەو لەو کاتەدا و نەبوونی هاوتای ئەو و ئیمڕۆش لە خۆڕا و بێسەبەب شاگردی ئەو لە هەموو کوردستانە پێ ناگا؟ دیسانەوە لەخۆڕا و بێسەبەب ئەم «الجمال المشرقي» یە مۆسیقارێکی زل بوو، خەت خۆشێکی زل بوو، زانایێکی زل بوو؟ دیسانەوە لەخۆڕا و بێسەبەب هونەر

و زانستەکەی لە کۆیێ نیشتەجێ بوو و نەیگوێستەوە بۆ وڵاتێکی دیکە، واتە مانەوەی لە کۆیێ کەرەستەی «الكويسنجقلي موطنا» ڕای دەگەینێ شایەدی نادا بۆ گەورەیی و پێشکەوتوویی کۆیێ تا ئەو ڕادەیە زانست و هونەری هەمەچەشنەی ئەم مەزنە پیاوە بە خێو بکا و بیحەوێنێتەوە!

بەڕاستی و بێ پێچ و پەنا و لێ زیاد و کەم کردنەوە پەیدابوونی مۆسیقاری وا زل لە جەرگەی جەرگی زێدە خوێندەواری و گەشەداری و گەورەتی و داراییەوە هەڵدەستێ. جێگەی بچووک و هەژار و نەخوێندەوار هەرگیز نابێ بە بێشکەی هونەر و مۆسیقا... نایانژێنێ... هەر پێیان ئاوس نابێ تا بیانژێنێ یاخود نا. گۆرانی گوتنی دەنگخۆشێک شتێکە و دانانی کتێب لەسەر مۆسیقا و شۆرەت و پێ وەرگرتنی شتێکی یەکجار جیاوازە.

بەر لەوە گوتارەکەی دکتۆر مصطفى ببینم مەعلووماتی ئەوەم هەبوو لەو دوو سەد ساڵەی چەرخی نۆزدەم و هەژدەمدا کۆیێ شارێکی ئاهەنگدۆست و مۆسیقاساز بوە. باوکم گەلێک جاران، لە زیمنی دانیشتنەکانی چەند سەعاتی مەجلیسی تایبەتی خۆی و، لە ناو مەزوعە جیاجیا کان کە لەو دانیشتنانەدا دەبوونە هۆی چاو و مێشک کرانەوەی گوێگران، باسی ڕۆڵی کۆیەی دەکرد لە داهێنانی ئاوازی تازە و پێشکەوتوودا.

هەر لەبیرمە دەیفەرموو لە کوردستانی ئێران گۆرانی پەیدا دەبوو، لە سلێمانی ئەوەش و تراش دەکرا و کۆیێ لە چەرخی دەدرا. بەداخەوە تەفسیلاتی ئەو وتووێژانەی باوکم لەبیر نەماوە تاکوو بۆ خوێندنەری کوردی دەور و تەسلیم بکەمەوە، بەڵام بایی ئەوە یارمەتی بە یەک گەناندنەوەی ڕابردوو و ئێستاکەی کۆیەمان بدا، قسەکانی لە گوێم دەزرینگێنەوە و سرنجم بۆ ئەوە دەکێشن کە ئوستادیی خۆی و باوکی «حاجی مەلا عەبدوڵا» و ئەمین ئاغا و حاجی بەکر ئاغا لە مەقامشناسیدا میراتێکی یەکجار کۆنی کۆیەیە. پیشەییێکی ڕەگداکوتاو بوە لە کۆیێ.

ئەو مەعلووماتی کە لە باوکمەوە پێم گەییوە دەربارەی ئاهەنگسازی کۆیێ، دوای زانینی مەوزووعی «الجمال المشرقي» ڕاستەوخۆ و بێ ئەرک و نەفەسسواری جێگەی مناسبی خۆی وەرگرت لە تابلۆی ڕۆشنبیری و ژیاری کۆیێ. هەرچەند ئەڵقەکانی میانی سەدەی چاردەم، کە ڕۆژگاری جەمالی مەشریقییە، لەگەڵ سەدەی

هەژدەم کە مەعلووماتی من دەیخوێنێتەوە لە ڕێی باوکمەوە، ئەو ئاڵقانە لە زنجیرەی پێشەوەی مۆسیقاسازی کۆیێ بە نادیاریش ماوەتەوە زەکاییکی زۆری ناوێ بزانرێ زاهیرەی مەقامشناسی ڕۆژگاری سەردەمی حاجی لە کۆیێ نەوەی بێگومانی سەردەمی جەمالی مەشریقییە.

با ئەوەش لێرەدا بخەمە سەر تێکڕای مەوزووعی گۆرانی و مەقام لە کۆیێ، کەوا بەڵگەیێکی بەهێز و ڕەسەنی ئەم پیشەیە لە مەفتەنی حاجی قادر لەوەدا دێتە دەست کە مسڵمان و گاوری کۆیێ لە مەقامشناسیدا هاوڕێ و هاومەشرەب و هاومەجلیس بوون، جیاوازیی ئایین لەم مەیدانەدا بایی تۆسقاڵێک خۆی بەدەر نەخستوە. بۆ خۆم دیومە گورانیبێژی کۆیێ بۆ ماوەی دوورودرێژ گۆرانی گوتوە. لە نێوان گاورەکان چەندین مەقامزان و گۆرانیبێژ لە کۆیێ هەڵکەوتوون لە مسڵمانەکانیان تێپەڕاندوە.

بەڵگەیێکی بەهێزی دیکەش بۆ ڕەسەنی و کۆنینەیی پیشەی مەقامشناسی لە کۆیێ ئەوەیە کەوا نەک هەر ئاغا و خاوەن کۆشک و تەلار وەیا مەلا و خوێندەواری هێژا شارەزای مەقام بوون و تێیدا خەریک بوون، بەڵکوو لە جەرگەی میللەت و لە نێوان ڕیزی کەسەبەی کۆیێ مەقامزانی ئەوتۆ پەیدا بوە و هەڵکەوتوە ڕەنگە هاوتای کەم بووبێ لە کوردستاندا. نموونەی هەرە پێشکەوتوو لەم مەیدانەدا، تا ئەمن بزانم، خوالێخۆشبووی «حاجییە گەورە» بوو کە لێرە بە پێشەوە بەڵێنم دا جارێکی دیکەش یارمەتی لێ بخوازم بۆ ڕوون کردنەوەی لایەنێکی گرنگی ژیاری و هونەری کۆیێ.

حاجییە گەورە مەقامزانێکی زل بوو، تێیدا ئوستاد بوو، لە ئوستادیش زیاتر عاشقە مەقام بوو. یەکێک بوە لەوانەی لە مەجلیسی حاجی مەلا عەبدوڵادا ئاغڵەب ئاگری سۆزی گۆرانی و مەقامی هەڵایساندوە. خولیای مەقام ئۆقرەی لێ هەڵگرتوە، بێرە و بەوێیدا گێڕاوە. لە تەمەنی گەنجایەتی خۆیدا چۆتە مووسڵ، مەقامزانی بەناوبانگی ئەوسای مووسڵ »مەلا عوسمان»ی دیوە. بە دوا ئەوەدا لە تەمەنێکی کامڵتر چۆتە حەڵەب و شام لەگەڵ «سید درویش» گۆرانیبێژ و مەقامشناس و گۆرانیسازی مەشووری میسی دیدەنی کردوە. بەم گەشتانەی لە وڵاتی عەرەب و گەشتەکانی کوردستانی عێراق و ئێرانی هەموو جۆرە مەقامی کلاسیکی و مەقامی ناوچەیی هەرێمەکانی عێراق و غەیری خۆی فرەوانتر کردوە.

حاجییە گەورە جگە لە مەقام، پیشەییێکی هونەری دیکەشی بوە کە ئەویش دەبێتە بەڵگەییێکی سەربەخۆ بۆ بوونی ڕابردوویێکی گەشی کۆیێ. حاجی گەورە «میلبازی» و کاری «زۆرخانە»ی کردوە، واتە لە مەیدانی وەرزشیش ئوستاد بوە. مەبەس لە وەرزش یاری بەرەڵڵای گەنج و منداڵی دەشتودەر و گۆڕەپانان نیە، بەڵکوو مەبەس وەرزشی هونەری لەسەر دەستوور و زانستە.

«حاجییە گەورە» نموونەییێکی پێشکەوتووی خەڵقی بوە لەم هونەرانەدا. واتە تەنها کەسێک نەبوە خەریکی ئەو تەرزە کارانە بێ. میلبازی و مەقامشناسی بۆ خۆیان بەرهەمی گۆڕانێکی »حضاري« ئەوتۆن بە هۆی بەرز کردنەوەی ڕێکار (مستوی) ی ماددی و زیهنی ژیانەوە کاری «ترف» بکا بە جۆریک لە جۆرەکان پێویستەکانی کۆمەڵاتی و کۆمەڵەی خەڵقیان پێوە خەریک بکا. ئەوەی بزانم کاری «زۆرخانە» بەلای زۆر کەسەوە لە کۆیێ باو بوە، تەنانەت بە منداڵی لە ماڵی خۆمان میلی وەرزشی بچووک و ناوەنجیم دیوە. هەندێ جار باوکم دەیگرتنە دەست و، لە ژووری تایبەتی خۆی، چەند بزووتنەوەیێکی وەرزشی پێ دەکردن. لە ساڵەکانی کۆتایی ژیانی ئەم میلانە نەدەهاتنە بەرچاوم، نازانم چیان لێ هات. ئەوەش دەزانم باپیرم لە گەنجایەتییدا میلبازی کردوە و تێیدا شارەزا بوە، زاتەن ڕاستییێکی دەماودەم گوتراوە کە حاجی مەلا عەبدوڵا لە پیاوە بەهێزەکانی سەردەمی خۆی دەژمێررا.

مێژووی هونەر و وەرزش لە شاری کۆیێ باسێکی خۆش و بایەخدارە هەم دڵ تەڕ دەکاتەوە و هەم زاخاوی مێشکیش دەدا، ڕووپەڕەییێکیش لە دەفتەری ژیانی پێشکەوتووی شارەکە بۆ خوێنەر و تۆژەرەوە و پشکنەر لە تاریکی ڕادێنێتە بە ڕووناکی. خەیکە ئەم ڕووپەڕەیە وا لە بیران چووبێتەوە دێڕەکانی نەخوێندرێنەوە. بەلای قەناعەتی خۆمەوە هەرچی دروشمی شارستانەتی و پێشکەوتنی ژیاری و پێداویستی ژیانێکی دەوڵەمەند بوە لە ڕابردووی کۆییدا هەبوە. کاری زۆرخانە کەوا من چەند لنگە فرتەیێکی ئاخەلێوە و گیانەلاوەییم دیوە هەر لەبەر کەیف پێ هاتنی یەک دوو کەس نەهاتۆتە شارەکە و بە ناو خەڵقدا پەرەی سەندبێ، دەبێ پێویستێکی بەرگری و بەربەرەکانی کردنی دوشمن و هێرشبەر بووبێ کەوا لە کۆنەوە داخوازی کردبێ لە خەڵق هێزی هەڵگرتنی چەک و بەکار هێنانیان هەبێ لە ڕۆژی جەنگدا.

بەنیسبەت کۆیەشەوە زۆرخانە و میلبازی و چەک هەڵگرتن و دروست کردن و وەرزشی جۆرجۆر کاری «ترف» نەبوە، بەڵکوو داخوازییێکی بنجی لەسەرخۆ

کردنەوەیان بوە. ئامادەبوون بۆ جەنگ لە لانی هێز و وەرزش و چەکسازییەوە «تکملە» و تەواوکەری شوورە و بورج و باروو بوە بە دەوری شارەکەوە. دروست کردنی شوورەی مەحکەم بە درێژایی چەند کیلۆمەترە لە گەچ و بەرد کارێک بوە خەڵقی شارەکە کردویانە، چ حکومەتێک لەوەدا یارمەتی نەداون. فەرمانڕەواییێک کە بوە بە میری کۆیێ هاتۆتە سەر حازری. دەردەسەری قایمکاری، پێشتر کۆیێ چێشتوویانە.

ئەم شوورەیە بۆ خۆی بە تەنها داستانێکی دارایی و بەهێزی و گەورەیی و ژیاری شارەکەمان بۆ دەگێڕێتەوە، بە تایبەتی لە ڕووی ئەوەوە کەوا کۆیێ ناوچەی حوکمڕانی نەبوە تا بڵێین دەسەڵاتی فەرمانڕەوای شارەکە لە خەڵقی دوور و نێزیک مەسرەف و ئەرکی شووره دروست کردنی داوا کردوە. تا ئێستاش لەبیر نەچۆتەوە سێ دەروازەی گەورەی بوە یەکێکیان لە ڕۆژهەڵاتی باشوور بەرەو ڕێبازەکانی ڕەوەو بابان و ڕانیە و قەڵادزە و کوردستانی ئێران. ناوی ئەم دەروازەیە «دەرکی قۆنگری سەرشاخان» بوو. وشەی «قۆنگر» لە «کنگرە» وە هاتوە، کەوا بەسەر بەردە شاخە زلەکانی ئەو جێگەیەوە دروست کراوە و لە ژێریەوەش دەروازە هەبوە. دوەمیان لە باکووری شار بە ناوی «دەرکی خۆشناوان» بەرەو خۆشناوەتی و شەقڵاوە و ڕەواندز بوە. سێیەمیان «دەرکی گەروو سۆرک» بەرەو هەولێر و پردێ و کەرکووک بوە. ئەم ناوانەی ئێستاکە لە بیران نەچوونەوە بەڵام ڕۆژەک دێ بە بیری کەسدا نەیێن و شوێنەکانیشیان یەکجارەکی کوێر بێتەوە و نەناسرێتەوە. پێویستە نیشانەیێک لەو شوێنانە هەبێ ئەم بەشە بچووکەی مێژووی کۆیێ بپاریزێ. وا بزانم ئەمە ئەرکێکە بەسەر شانی شارەوانییەوە.

خۆت دەزانی بوونی دەرگە پاسەوان و چاودێری کردن و داخستن و کردنەوەی دەوێ. سەرەڕای نوێ کردنەوە و گۆڕین و چەندین ئەرکی قورسی دیکە کە تێکڕایان بە حوکمەت نەبێ ناکرێ، کەچی کۆیێ حکومەتی وەک بابان و سۆران و ئەردەڵان و ئامێدی نەبوە قورسایی کارەکە دابەش کا بەسەر خەڵقی هەموو قەڵەمەڕەوی خۆی، خەرج و مەسرەف و ئەرکی شوورە و هەموو کاروبارێکی بەرگری لە کیس دانیشتوانی کۆیێ دەرچوە. وەنیە لێرەدا هەر بە لێکدانەوە «استدلال» بگەم بەم ئەنجامە بەڵکوو ڕووداوی مێژوویی مەیلەو نێزیک ئەم

لایەنەی خۆ بەڕێوە بردن و لەسەرخۆ کردنەوەی کۆیەمان بۆ دەگێڕێتەوە و هەستی شانازیشمان تێدا دەبزوێنێ.

لە سەردەمی «محمد ئاغا» ی باوکی حاجی بەکر ئاغادا شازادەیێکی ئێران بە عەودالّیی دوشمنایەتی «عەبدولرەحمان پاشا» ی بابان ڕەو دێنێ بۆ سەر کۆیێ و لە ئەنجامی نەتوانینی گرتنی شارەکە، لەبەر مەحکەمی شوورەی دەوری و چالاکی خەڵقەکەی لە دیفاع کردندا، ئابڵوقەی شارەکە دەدا و بەینێک بە دەوریەوە دەمێنێتەوە. ئەو «محمد ئاغا» یە زۆر دەوڵەمەند بوە، لەگەڵ خەڵقی شارەکە دەدوێ و ڕێی لەسەرخۆ کردنەوەیان دێنێتە بەر و پێیان دەڵێ پارەم زۆرە، بە ئەمان و زەمان تا هێندە مانگە سەرەتیر لە پارەی قورقوشم دەشکێنمەوە، دوای ئەو هێندە مانگە زیو دەشکێنمەوە کە ئەو برا ئینجا زێڕ و شەری پێ دەکەین. هەڵبەت شازادەی عەجەمیش تا ئەو دەمە چەکمان نامێنێ وەڕز دەبێ و وازمان لێ دێنێ. بەشی زۆری مەسرەفی شەڕەکە محمد ئاغا دەیکێشێ و کۆیێ تەسلیم نابێ. لە ئەنجامدا شازادە بۆ ئێران دەگەڕێتەوە، بەڵام بۆ پاراستنی ئابڕووی ئەو و لادانی فەلاکەت لەسەر شارەکە ڕێکەوتنێک دەبێ لە میانیاندا کە ناوێکی «صلح» بخاتە سەرکشانەوەی شازادە. وەک بیستوومە لە جیلی پێش خۆم خەڵقی کۆیێ سەنەدێکیان دابوە محەمەد ئاغا کە لە دوا ڕۆژدا بە پێی ئیمکان مەسرەفەکەی بۆ ڕەد کەنەوە. بەڵام لە کاغەزی سەنەدەکە بەولاوە پولێکیان لێ وەرناگرێتەوە. دەڵێن ئەم سەنەدە لای حەوێزییان ماوە، ئەگەر مابێ ڕێکەوتنێکی خۆشە، بیرەوەری جوانمەردی شاری کۆیەی تێدایە بە تاک و گەلییەوە.

هەر لەو شەڕەدا کارێکی تایبەتی قارەمانانە ڕوویداوە حەیفە لەبیر بچێتەوە. لەشکری عەجەم لە باکووری شار بەسەر گردی »کونە گێچەر«ەوە چەند تۆپێک دادەبەستن شارەکەی پێ تۆپباران دەکەن و خەڵقەکە زۆر پێی سەغڵەت دەبێ. دەستەیێک لە فەقێیان دەبەن جانفیدا، بە زاراوەی ئێستاکە پێشمەرگە، و لە کاتێکی مناسبدا لە شار دەچنە دەرێ دەستە و خەنجەر هێرش دەبەن بۆ سەر تۆپەکان. ناگەڕێنەوە تاکوو هەموان دەشکێنن و سەربازی دەوری تۆپەکانیش پامالّ دەکەن. لە فەقێیەکانیش چەند کەسێک شەهید دەبن بەڵام بە هۆی هەڵمەتی چاپووکانە و ناکاوی هێرشەکە و غافڵی عەجەمەکان کوشتارێکی کە لە عەجەمان کراوە گەلێک لە هی فەقێیەکان پتر بوە.

به داخەوە ناوی هیچ تاکێک لەو فەقێیانە بەبیری کەس نەماوە، نە شەهید نە ئەوانەی سەلامەت دەرچوون. حەق وایە وەک سەربازی نەناسراو پەیکەریان بۆ بکرێ و یادی خۆکوژییان لە پێناو سوود و شەرەفی ولاتەکەیان و ئەهلی ولاتەکە بیپارێزێ. بە دوا ئەو کارەساتەدا گردەکە ناوی بوە بە گردی شەهیدان، لەگەڵ تێپەڕینی کات ناوەکەشی کوێر بوەتەوە، ئێستا نەگوترێ «کونە گێچەر» کەس نایناسێتەوە. وشەی «گێچەر» لەوەوە هاتوە گردەکە «گێچ-گەچ»ی زۆرە، کوورەی گەچ دروست کردنیش زوربەیان بە بن گردەکەوەن.

ئەوەی لەو چەند ڕووپەڕەی دوایی نووسینەکەت خوێندەوە کورتەیێکی تەسک و تروسکە لە ڕابردوێکی کۆن و فرەوانی کۆیێ. کەمدەرفەتی و بێماوەیی و ترسی دوور کەوتنەوە لە ئەسڵی مەوزووع بە جۆرێک قسەکانمی خڕ کردۆتەوە سەر یەک، هەر هێندە یارمەتی ڕاستیی و مێژوو دەدەن کە وەک سەرەباس ڕێگەی تۆژینەوە و لێکۆڵینەوە و وردبوونەوە ڕوون کەنەوە بۆ ڕۆشنبیر و شارەزا و پسپۆڕی مێژووناس و خۆ تەرخانکردوو بۆ «کوردۆلۆژی».

لێرە دەبێ ڕاستییێکی دیکەش ئیزافە بکەین، وەک سەرباسێکی تازە، بۆ سەر ئەو ڕاستییانەی لێرە بە پێشەوە نەختێکیان لێ دواین، ئەویش تیشکێکی تایبەتی خۆی داوێژێ بۆ بەر هەنگاوی مێژووناسێک کە بۆ سەرەو هەورازی ڕابردوو پێ هەڵبێنێ. سێ هۆی بنجی وای کردوە لە کۆنێکی زۆر کۆنەوە کۆیێ ببێ بە شار:

یەکەمیان ئەوەیە، لە هەولێرەوە بەرەو ڕۆژهەلات بێی تا دەگەیتە کۆیێ تووشی ئاوێک نایەیت شارێک تێر ئاو کا. سەرچاوەی حەماموک بۆ خۆی بەتەنها بەسە بۆ ئەوە هێندە قەڵەباڵغی لە دەوری خۆی کۆ دەکاتەوە شارێکی گەورە پێک بێنێ. ئەو ئاوە بە پێی لە کارهێنانی ئاو لە ڕابردووی کۆندا بایی شارێکی سەد هەزار کەسی دەکرد، چونکە پێویستی خەڵق بە ئاو بۆ خواردنەوە و شووشتن و ڕێژە و پێژە، لە کۆندا، دەیێکی پێویستی ئێستاکەی ژیانی مۆدێرن نەدەبوو. بۆیەیە ئاوەکەی حەماموک، جاران گەلێک لە پێویستی خودی شارەکە زیاد بوو بۆ باغ و شیناوردێکی زۆریشی پێ ئاو دەدرا.

هەرچەند لە دەشتی بیتوێن و ڕانیەدا ئاوی وەک حەماموک و چەندین جار لەو زۆرتر هەن، بەڵام نەخۆشی لەرزوتا (ملاریا) لە کۆنەوە بوە بە بەرهەڵست لە

پەیدابوونی ئاوایی گەورە لەو ناوچە گرنگەدا. وڵاتی بیتوێن، کە چەند جاران حاجی لە دیوانەکەیدا ناوی دێنێ و، دەشتی ڕانیە بۆ کشتوکاڵ مانەندیان نیە، بەڵام بەر لەوە دەرمانی مێشوولەکوژ پەیدا ببێ ئەغڵەب دێیەکانیان، بەتایبەتی هی بیتوێن، دوای ماوەیێک لە ئاوەدانبوون بە هۆی زۆری مردن کوێر دەبوونەوە. نیسبەتی منداڵ مردن لە بیتوێن وا هەبوە گەیشتۆتە 100%.

ئەم حاڵەی بەرهەڵستی کردنی مەلاریا لە پەیدابوونی ئاوەدانی، بێگومان لە مێژوویەکی یەکجار کۆنەوە هەر هەبوە، چونکە وەزعی ئێستاکەی سروشتێکی تازەداهاتوو نیە. لە سەردەمە زۆر کۆنەکانی جیۆلۆجییەوە، با بڵێین لەو ساوە کە گۆماوی بیتوێن بەهۆی داخورانی ماڵی[24] زێی کگچە[25] لە تەنگژەی کونەکۆتردا، بەتاڵ بوو و خاکی دەشتی بیتوێن و دامەنەکانی پژدەر و دەشتایی وڵاتی مەندەمەرە وشک بوونەوە، ناسازی مانیعی ئاوەدان بوو، لە هەزار و دوو هەزار ساڵیش پێش ئیمڕۆوە ئەو مەنعە هەر هەبووە و دەرفەتی نەداوە شارێک لە بیتوێن پەیدا بێ بەربەرەکانی کۆیێ بکا وەیا قەڵەباڵغیەکەی بۆ خۆی ڕاکێشێ[26].

---

[24] – زاراوەی کوردەواری بۆ «قطر»ی ئاو «ماڵ»ی ئاو وەیا زێ بەکاردێنێ.

[25] – ئەم زێیە ناوی زۆرن. بێگانە ئەغڵەب پێی دەڵێن «زێی گچکە» یاخود «خواروو». ئەمین زەکی بەگ پێی دەڵێ «زێی کۆیێ» لە دیوی کوردستانی ئێران «چۆمی کەڵوێ» ناویەتی. لە هەر جێگەیێکیشەوە تێپەڕ کا ناوی ئەو جێگەیەی پێ دەگوترێ وەک زێی سندۆڵان، زێی دوکان، تەقتەق، زێی پردێ. وا من لێرە زێی گچکە، واش دەبێ دەڵێم زێی کۆیێ.

[26] – باسی بیتوێن دوای ڕوونبوونەوەی باری مێژوویی بەر لە 3600 ساڵی ئەو ناوچەیە بەهۆی هەڵکەندنەکانی ئارکایۆلۆجی گردە ئەسەرییەکانی، بە تایبەتی گردی «شمشارە»و دۆزینەوەی دوو سەد سێ سەد خشتی لێ نووسراوی ساغ و شکست، ئەم باسە بۆ تۆژەرەوەی مێژوو گەلێک فرەوان بوە. دەلالەتێکی یەکجار گەورەی ئەو دۆزینەوانە ئەوەیە ناوی گردۆڵکە ئەسەرییەکان و ئاواییەکانی ئێستای ناوچەی بیتوێن و ڕانیە، لە ماوەی 3600 ساڵدا گۆڕانێک کەم نەبێ بەسەریدا نەهاتوە. شمشارە بۆ خۆی «شووشەرا»ی پێ گوتراوە. لە نووسینەکاندا ناوی جێگەیێک دێ

هۆی دووەم ئەوەیە ئاوەکەی حەمامۆک لە جێگەیێکی هەموار و لەبار بۆ ئاوەدانی و ژیانی شارستانی سەر ئەرز بوە. لە نێو جێگەی سەخت و هەڵدێر و تەلان نیە دەست نەدا بۆ ئاوایی گەورە. ناو شاخ و داخ بۆ قەڵات و بنکەی عەسکەری و بەرگری دەست دەدا نەک بۆ شار، بەتایبەتی شارێک ناوچەی فەرمانڕەوایی نەبێ وەک کۆیێ، چونکە فەرمانڕەوا ناوچەی فەرمانی سەختیش بێ دەتوانێ بەهۆی زەحمەت دانی خەڵقەوە خۆی و سپا و دەستوپاوەند و خاوەن پیشەی پێویست بەخێو بکا. کوردی دەڵێ «کە زۆر هات قەباڵە بەتاڵە».

لەگەڵ هەمواری جێگاکەشدا بە جۆرێکی سرنجڕاکێش هەڵکەوتی کۆیێ لانی بەرگریشی تێدا دەدیترێ. شیو و ڕووباری لای ڕۆژهەڵاتی و گردۆڵکەکانی لای سەروو و ڕۆژئاوا و باشووری ئیمکانی ئەوەیان پەیدا کردوە، تا ڕادەیێک، بە ئاسانی پێشی هێرشبەر بگیرێ یاخود بنگە و قەڵای بەهێزی بەرگری تێدا دروست بکرێ، قشڵەی کۆیێ تا ئێستاش بەسەر گردی ڕۆژئاوای باشووری شارەکەوە بۆ ئەم لایەنە شایەدی دەدا.

---

لە نزیک «شووشەرا» پێی دەڵێ «شیمەڕینی» کەوا بێگومان دێی «کامەریان»ی ئێستایە. دوو عەشیرەت ناویان دێ بەسەر خشتەکانەوە یەکیان «کوڕە شانوم» ئەوی تریان «کاک موم»، هەر دوو ناو ئیمڕۆ لە بتوێن مەوجوودن بە ناوی دوو دێی ئاوەدان «قورڕقوشینە» و «کامەم». کۆمەڵێک ناوی تریش هەن وەک ئامانە بە درێژایی زیاتر لە 3600 ساڵ وەک خۆیان ماونەوە.

من بۆ ئەوە دەچم ئەو میللەتەی لەو سەردەمە کۆنانەدا نیشتەجێی ئاواییەکانی بیتوێن بوە هەر خۆیەتی بێ بڕانەوە و گۆڕان ماوەتەوە ڕۆژانی ئیستا، واتە ئەوساش دانیشتوەکانی کورد بوە. نووسینەکان وا ڕادەگەیەنن قەومی «خوری» لەو شوێنانەدا ساکن بوون. دەمێکە من مەیلەو قەناعەتم پەیدا کردوە کە کورد و «خور» یەک میللەتن یاخود هەر نەبێ قەومی خوری بەشێکی زلن لەو ڕەگەزانەی کوردیان پێکهێناوە، دۆزینەوەکانی «شمشارە» ئەم باوەڕەمی تەواوێک بەهێزتر کرد. لێرەدا ناتوانم لەسەر ئەم باسە بڕۆم چونکە پەیوەندیێکی بە مەوزووعەوە نیە، ئەوەندەی نووسینم لەوەوە هات ئاوەکانی بیتوێن لەبەر هۆیەکی مەعلوم شاریان بە دەوری خۆیانەوە پێک نەهێناوە، وەک «ئاوی حەمامۆک» کۆیەی پێکهێناوە.

هۆی سێیەم ئەوەیە جێگەی شارەکە بە زاراوەی خۆمان، ناو ئاقارە بەرەو هەر لایێک بڕۆی ئاوەدانە. بۆ میسالّ دەڵێم جێگەییێکی وەک دوزخورماتوو لای باشووری حەمرین و چۆڵی «غرفە» پێی ناگوترێ ئاوەدان، نە ئاوی دائیمی هەیە، نە بارانی ساڵانەی هەموو ساڵێک بایی کشتوکاڵ و مەڕوماڵ دەبارێ. کۆیێ بە پێچەوانەی دوز دەوروپشتی هەند ئاوەدانە هەستیش بەوە ناکا لەولای دوز وەیا مووسڵەوە بیابان دەست پێ دەکا. بارانیش ئەوەندە هەیە بەرهەمی کشتوکاڵی ساڵانەی هەبێ نەک ساڵ نا ساڵ.

جگە لەم لایەنە، لە نزیکشەوە هیچ بەرهەڵستێکی سروشتی وەک زێی خوڕ و شاخی بەرز و سەخت مەودای نەفەس هەڵێنانی ئابووری لێ کورت نەکردۆتەوە تەنگی پێ هەڵچنی و تەگەرە بنێتە بەر جموجۆڵی. پێ دەچێ پەیدا نەبوونی شارێکی گەورە لە پژدەر، لە مێژووی کۆنەوە، لە هەندێ ڕووەوە بگەرێتەوە بۆ ئەو هۆیە کە ناوچەی نزیک و سەر بە شارەکە (کە قەڵادز بێ) هەمیشە مەودای تەسک بوە. هەموو لاییێکی بە شاخی سەخت گیراوە، کە هەندێکیان بە درێژایی زستان هاتوچۆی پێدا ناکرێ وەیا بە زەحمەت نەبێ کەس تێی بڕ ناکا. خۆ وڵاغ و باروتا هەر هیچ. شاخی قەندیل، لە باکووری ناوچەکە، بۆ خۆی بوە بە شوورەییێکی ئەوتۆ هاوینانیش لێ سەرکەوتنی زەحمەتە چ جایێ زستان و بەهاران. لە باشووریشدا جووت بەرهەڵستی شاخی ئاسۆس و زێی کۆیێ لە لای خۆیانەوە بۆ هاتوچۆ کردنی ئابووریی گەورە و هەمیشەیی نەهێشتۆتەوە. ئاوی گەورەی[27] وەک زێی کۆیێ بە درێژایی مانگەکانی

---

[27] – ئێرە جێی لێ دوان نیە لە زاهیرەییێکی مێژوویی زۆر گرنگ کە بریتییە لەوە سەرەتای ژیار (حضارة) دەستی پێ کردوە لە دەوروپشتی ئاوی بچووکی ئەوتۆ مرۆڤی کەمدەسەڵات پێی بوێرێ بۆ کشتوکاڵ و ئاوەدان و لێ پەڕینەوە و بناوان لەبەر هەڵبەستن. دوای پێشکەوتنێکی ژیاری زل و پێکهێنانی دەسەڵاتی وەها بەربەرەکانی پێ بکرێ لەگەڵ سروشتدا ئینجا مرۆڤ بە خۆی و دەسەڵات و قەڵەباڵغی و پیشەسازی و فەند و فێڵی ڕام کردنی سروشت توانیوەتی لە دەوری زێی «دیجلە» و «فرات» نیشتەجێ بێ، ئەگەر وا نەبێ هەموو ساڵێک مرۆڤی بێدەسەڵات و کەم هونەر و پیشە و فەند و فێڵ، لە دەوری زێی گەورە تێ دەچێ و دەفۆتێ. جارێکیان کە لافاوی کژی زۆر ئاوی ڕامالّی دەدا، جارێکیشیان لە کژی

زۆر باران هاتوچۆ دەبڕی یاخود هەر نەبێ گەلێکی لێ کەم دەکاتەوە. تاکە ڕێگایەکی هاتوچۆی هەمیشەیی هەبێ لە پژدەرەوە بۆ دەرەوەی خۆی ڕێگاکەی تەنگژەی دەربەندی «سەنگەسەر«ە کە پژدەر دەبەستێتەوە بە ڕانیە و بیتوێن و کۆیەوە. ئەم ڕێگایەش ناوناوە، هەموو ساڵێک دەگیرێ بەهۆی زیاد کردنی ئاوی ڕووبارەکانی «ژاراوە» و «کەڵەگاڕفێن» و تاڕادەیێکی کەمتر ئاوی چۆمی «سوڵتانەدێ» ش.

بەم جۆرە وردبوونەوە و سرنجدانە لە باری کۆیە و دراوسێکانی مەعلووم دەبێ کۆیێ تا بلێی شارێکی کۆنە. لەو چەند پەڕەی دەسنووس کە لەسەر کتێبەکەی «مەلا سەمەدی مەرگەیی» گێڕاوەتەوە دەردەکەوێ لە کاتی هاتنی سپای ئیسلام بۆ کوردستانی عێراق کۆیێ شار بووە. ئەوسا بەپێی دەسنووسەکە گوندی «هەرمۆتە»ش شاری گاوران بوە و ناوی دەنێ «ارموطا»، وا دیارە لەو سەردەمەدا کۆیێ «زەردەشتی» بوە چونکە دوای شەڕی «ارموطا» و گرتنی ئاواییەکە و کوشتنی حاکمەکەی کە ناوی «میطا» بوە شاری کۆیێ بێجەنگ تەسلیم بوە.

من لە خۆمەوە دەگەم بەو ئەنجامە کە کۆیێ زەردەشتی بووبێ، وەنیە لە هیچ سەرچاوەیێک شتی وام خوێندبێتەوە. لێرە بەڵگەیێکی فکری هەیە زیهن بۆ هەندێ دەبا کە لەو سەردەمەدا کۆیێ زەردەشتی بوە. بەڵگەکە ئەوەیە ئەگەر کۆیێ وەک «هەرمۆتە» گاور با ئەویش لە جەنگەکەدا بەشدار دەبوو. زاهیر وا ڕادەگەیەنێ هەر وەک ئێستا کۆیێ و هەرمۆتە لە ئاییندا جیاوازن ئەوساش هەر جیاواز بووبن.

وەک لە مێژوو دیار دەدا ئەغڵەب ئەو شوێنانە کە ئاینییان عیسایی بوو هەر بە عیسایی مانەوە، بەڵام ئاواییە زەردەشتییەکان هەموو بوون بە مسلمان. ئەرک و زەحمەتێکی کە پیاوە ئایینییەکانی دینی زەردەشتی بە ناوی دینەوە خستبوویانە سەر شانی خەڵقەکە یەکەم هۆی بەرەوپیر چوونی کوردەکان بوو بۆ ئایینی ئیسلام. زەردەشتی بە دینێکی ئاسمانی لە قەڵەم درابوو، وەک عیسایی سەیر دەکرا لە لایەن

---

کەمبوونەوەی ئاو کە ڕێکار (مستوی) ی ئاوەکە نزم دەبێتەوە و بێسەبەب نیە

یەکێک لە کۆنترین شوێنەوارانی مەڕ بەخێو کردن دۆزرابێتەوە، بە پێی گوتارێک لە گۆڤاری «سۆمەر» دا خوێندوومەتەوە ئەوەیە لە «شانەدەر» دۆزراوەتەوە. باوەڕ دەکەم کە لەوەش کۆنتر بدۆزرێتەوە هەر لە جێگەیێکی وەک «شانەدەر» دەبێ.

سپای ئیسلامەوە. بۆ کوردەکان دەیانتوانی وەک دیانەکان لەسەر دینی خۆیان بمێننەوە. بەڵام وا دیارە هاتنی حاکمێکی نوێ بە دینێکی نوێوە هەلێک بوە و هەڵکەوتوە بۆ زوربەری خەڵقەکە کە خۆیان لە دەست پیاوە بێڕەحمەکانی زەردەشتی قوتار کەن. تاڕادەیێکیش دێتە بەر نەزەر کە ئایدۆلۆجی دیانی قووڵتر و ڕەگ داکوتاوتر بوە لە زەردەشتی، بەو پێیە قابیلیەتی بەردەوامبوونی پتر بوە لەو. ئەم بیروباوەڕانەم وەک «بدیهیە» دێنە بەرچاو. ئیمکان هەیە دیراسەیێکی بە پێز چەشنێکی دیکەمان تێبگەیەنێ، هەرکاتێکی گەیشتم بە بەڵگەیێکی ئەوتۆ بۆ باوەرێکی ترم ببا دەرحاڵ قبوڵی دەکەم.

ئە هۆیانە کە وایان کردوە لە سەردەمی هاتنی سپای ئیسلام بۆ خاکی کوردستان کۆیێ شار بووبێ، لە کۆنتریشەوە هەر هەبوون. بەڕاستی سەرەتای پەیدابوونی هۆیەکانی کاتێکی دەستیشان کراوی نیە، هەرچی هەیە لەو وەزعی تایبەتییانەی کۆیێ هەندێ مێژوو کۆنن، هیچ کامێکیان دەسکردی کەس نیە. کەواتە بە پێی حوکمی «منطق» دەبێ کۆیێ یەکجار کۆنتر بێ لەو 1300 ساڵەی هاتنی ئیسلام بۆ کوردستان. تائێستا هیچ تۆژینەوەیێکی مێژوویی لە بارەی کۆیەوە نەکراوە نوقتەیێک لە ڕابردووی ڕوون کاتەوە. ڕەنگە ئەو کەمە مەعلومات و سرنجدانی شەخسی کە لای منە ببێتە هەوەڵ قۆناغی دیراسەیێکی فرەوانتر لەوانەی تا ئێستا کراون، بەڵام ساغ کردنەوەی چەند و چۆنی مێژووی کۆیێ کاری ئارکایۆلۆجی ساڵە و ساڵە نەک بە پەلە.

خەبەری پچڕپچڕی لێرە و لەوێ و لێکدانەوە و «استنتاج»ی بێ سەرچاوەی ماددی مێژوویی هەرچەند ڕێچکۆلەش دەرکەن بۆ هەندێ ڕووناکی و شارەزایی، دیسان تێهەڵکشان بۆ مێژووی هەزاران ساڵی لەمەوبەر بە پێپلیکەی سرنج و لێکدانەوەی بی بنگەی ماددیی سەخت، دەبێتە وشکەمەلە و پەروازی خەیاڵی. هەرچۆنێک بێ ئەو هەندەی من لێرەدا لەسەر چەند لایەنێکی ژیان و ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری کۆیەم نووسی بۆ تەنها پەیوەست کردنی سەردەمی پێش حاجی قادر بوو بە کاتی تێدا ژیان و گوزەران لێ کردنی حاجییەوە. لەو ڕێگایەشەوە چەند هەڵەیێکی فکری و مێژوویی دەربارەی حاجی و مەفتەنەکەیەوە ڕاست کرانەوە کە دەبوا ڕاست بکرێنەوە چونکە هەڵەی چاپکراو و بڵاوکرایەوە، وەک زوتریش گوتم، دەبنە سەرچاوەی مێژوو. ئەوەی ڕاستیش بێ، ئەگەر هیچ هۆیەکی لاوەکی و دەرەکی وەک

ئەو هەڵانە و پێویستی ساغ کردنەوەشیان لە بەیندا نەبا دەبوا هەرچی حەقیقەتێکی ماددی هەیە کە تاویان هێنابێ بۆ ناو دەروونی حاجی و یارمەتی گەشە کردنی شاعیرییەت و حەقپەرستییان دەبێ بخرێنە ناو باس و دیراسەیێکی شایان بە پایەی حاجی تا لە سنووری ئیمکاندا حاجی قادری «بویژ و مرۆڤ» بە جیلی ئێستاکە و دوارۆژ بناسێنن و پردیش دروست کەن لە میانی بلیمەتی ئەو و کێڵگەیێک کە لێی ڕواوە و بەرهەم داوە. ئەرکی سەرشانی نووسەر ئەوەیە تا دەتوانێ پرسەک «علامە استفهام» بسرێتەوە لە بابەتی نووسینەکەی و پەردەی مەتەڵی لەسەر باسەکانی هەڵگرێ و لە قەناعەتی خوێنەریان نزیک کاتەوە، نەک بە زۆرە ملێ بەڵکوو بە بەڵگەی ماددی و فکری.

من لە هەوەڵی کارەوە عوزرم هێناوەتەوە بۆ تەسکیی پەراوێزی نووسینەکەم، لێرەشدا دەبێ هەمان عوزر دووبارە بکەمەوە بۆ تێکڕای خوێنەری کورد، بەڵام بە تایبەتی بۆ دانیشتوانی کۆیە و ڕۆحی حاجی قادر کە لە دەستمدا نەبوو بەقەدەر گرنگی مەوزووعی و پێویستی قەرزی ئەدەبی خۆم لە عاست هەردووکیاندا نە مێژووی کۆیێ و نە ژیانی حاجی، تا ئەو پلەیەی باسەکەمان پێی گەیشت، هێندە بدرەوشێنمەوە، خۆم بڵێم دەست خۆش گەردێکی تەواوت لە بەلووری چراکانیان تەکاندەوە. بەداخەوە چەندین لانی مێژووی کۆنی کۆیێ و ژیان و ڕابواردنی حاجی قادر لەبەر نەبوونی سەرچاوەی نووسراو بەهۆی مردنی زوربەی خەبەردارانی سەدەی نۆزدەمەوە لە ژێر تەمی ونی و نادیاری مانەوە، تەمەکەش ئەوەندە تێرە چاو و زیهن تییێان برِ ناکەن. ترسم لەوە هەیە کەمتاکورتێک لەو خەبەرات و گوزەرشاتی ڕابردوومان کە بەسەر زمان و لە زیهنی هەندێ دانیشتوانی ئێستاکەی کۆیێ زیندوە و نەمردوە ئەویش بەهۆی نەنووسینەوە فەرامۆش بکرێ یاخود بەهۆی مردنی خاوەنەکەی بمرێ.

دەمەوێ لێرەدا تکاییێکی تایبەتی بکەم لە هەرە جوانمەردێکی کورد کە ئاگاداری ڕووداوێکی کۆنینەمان بێ، ئاگاداریەکەی بپارێزێ. لە کۆبوونەوەی وردەدەنگوباس داستان پەیدا دەبێ. بەنیسبەت مەوزووعی حاجی قادریشەوە پێویستی نەفۆتاندنی ئەخباری ئەو لە گوێرەی گرنگی پایەی خۆی لە خەباتی قەومی کوردا فەرزێکی گەورەتر و کارێکی پیرۆزترە. بێگومان دەرخستنی وردەباسی شرایەوە وەیا هەڵبەستی بڵاونەکرایەوە یا ئەگەر هەبێ نووسینی پەخشان با چەند دێڕێکی نامەی ئاسایش بێ

و له حاجی بەجێ مابێ، دیراسەی لێرە بە دواوە دەوڵەمەندتر دەکەن، نووسەریرش زیاتر دەحەسێننەوە لە ماندووبوونی بە دوا گەڕاندا… زۆر جاران وا دەبێ نووسەر وەک مەلی باڵشکاو لەبەر هۆی هەمەچەشنە ناتوانێ بۆ وەدەستهێنانی زانیاری تازە لێرە و لەوێ بگەڕێ، جا ئەگەر ئەو شتەی ناتوانێ بۆ وەدەستهێنانی سەفەر بکا، لە ڕێی نووسینەوە دەستی بکەوێ وەک گەنجی دیبێتەوە وایە.

دوای ئەم چاو پێدا خشاندنی خێرا و کورتیلە بە تێکڕای ژیانی «علمی و ڕوحی»ی کورد و بە دوا ئەودا وەزعی تایبەتی کۆیێ لە هەردوو ڕووی »ماددی و معنوی»ی کۆن و تازەیەوە، دەگەین بە باس کردن لە بارەی ژیانی «ماددی»ی کورد لە کۆنەوە و دەرخستنی نەبوونی هیچ جۆرە «تناسب»ێک و لەیەک چوونێک لە میانی دوو ڕووپەڕەی «زانیار»ی پێشکەوتوو و «ماددی»ی یەکجار دواکەوتووی کورد. بە دەم ئەم داستانەوەش لە گوێرەی مەودای تەسک و پێویستی دوور نەکەوتنەوەی بێسنوور لە ئەسڵی مەوزووع هەوڵ دەدەم هۆی ڕاستەقینەی دوا کەوتنی باری «ماددی»ی ژیانی کورد دەربخەم بەپێی ئەو قەناعەتە کە خۆم لە ئەنجامی وتوێژی ناوەکی (حوار داخلی) و سرنجدانی شەخسی پێی گەییوم زیاتر لەوە کە لە ڕێی خوێندنەوەی چاوگی مێژوویی و فەلسەفەی نووسراوەوە پەیدام کردبێ، چونکە ئەوەی ڕاستی بێ، بۆشت دەردەکوێ، لێکدانەوەیێک کە لەم ڕەوەوە دەیهێنمەوە بەرچاوت نە لە کەسم بیستوە و نە لە هیچ نووسراوێک خوێندوومەتەوە، ئەمیش وەک هەندێک لەو لێکدانەوانەی تازە لە تۆمار کردنیان بوومەوە، بەشێکی لە تریسکانەوە و بریقانەوەی واقیع بۆم ڕوون بۆتەوە، بەشێکیشی لە کورت هێنانی تعلیلاتی ئەو نەزەرییانە هاتوە کە لە مەیدانی مێژوو و پێشکەوتن و گۆڕان و تێکڕای کاروباری مرۆڤاتیدا هاتوچۆ دەکەن.

با بە میساڵ بۆت ڕوون کەمەوە چۆن کورت هێنانی تعلیل، مرۆڤ هان دەدا بۆ دۆزینەوەی تعلیلی تەواو. میساڵەکەت بۆ دێنمەوە لە سروشت چونکە کەس نیە شەڕی لەسەر بکا و بۆ هەموومان وەک ماڵی حەڵاڵ وایە، بە دوا ئەم میساڵەدا بۆ خۆت دەتوانی قیاسی کەم و کورتی فەلسەفەی سەر بە سیاسەت و ئابووری و باوەڕ لەو بکەی. میساڵەکە ئەمەیە. دەڵێن باران لە هەور پەیدا دەبێ، ئەم گوتەیەش وەک «بدیهیە» دەگوترێتەوە تا وای لێ هاتوە کەم کەس بیر دەکاتەوە لەوە ئاخۆ گوتەکە کەم و زیادییێکی تێدایە یا نیە.

مرۆڤێکی سرنجدەر و باوەرهێناو و دڵسۆز بۆ ئەم «بدیهیە»یە چاوەنوارێ دەکا کە هەور بە پڕی پەیدا بوو باران بباریٚ چونکە «بدیهیە» کە چ احتمالی نەهێشتۆتەوە بۆ بەشداربوونی هیچ عاملێکی تر، غەیری هەور، لە پێکهێنانی باران. کەچی جارەهای جار وا دەبیٚ بە درێژایی ڕۆژ و دوو ڕۆژ هەور دیٚ و دەڕوا و ناباریٚ یاخود لە هەندیٚ جێگەش دڵۆپی لیٚ نایێتەوە خوارەوە!!

کابرای دڵسۆز و سرنجدەر بە سەیرێکەوە دەپرسیٚ ئەدی کوا باران خۆ ئەمەتە هەور؟ کورت هێنانی نەزەرییەکە مرۆڤەکەی خستە سەر باری پرسیار و بەراورد کردنی تایبەتی و گوماناوی خۆی. ئەوسا شەرحدەری نەزەرییەکە بیٚ ئەوە بڵیٚ نەزەرییەکە ناتەواوە، لەگەڵ هەندێک سەرشکاندنەوەی خاوەن پرسیاریش، دەڵیٚ بۆیە باران ناباریٚ چونکە سەرما لە پێویست کەمتر بوو هەی نەزان!! قەیدی نیە، با نەزان بووبیٚ خۆ بەهۆی پرسیارەکە گەیشتە زانینی هەموو نەزەرییە! ئیتر خۆ هەڵدەگریٚ بۆ ڕۆژێک هەوریش هەبیٚ و ساردیش بیٚ، باران کوێوە دەڕوا لە چەنگ نەزەرییەی بیٚ کەلەبەر!!

کابرای دڵسۆزی نەزەرییە، زۆر جاران لە زستاندا دەگا بەو ڕۆژە سارد و هەوراوییە و، دڵنیا و بێگومان چەترەکەی لەگەڵ خۆیدا دەباتە دەرەوە تا تەڕ نەبیٚ، کەچی ناباریٚ!! ئەوسا دەکەوێتە پرسیار کردن لەگەڵ خۆیدا. تۆ بڵێی ئاسمان بەسەهوو چوو بیٚ یا نەزەرییە! دیسانەوە شەرحدەری نەزەرییە سەری دەشکێنێتەوە و دەڵیٚ پاڵەپەستۆی هەوا ئەوە نەبوو یارمەتی بارین بدا... لە هەلی سێیەمیدا هەور و سەرما و پاڵەپەستۆی هەوا سێقۆڵی کۆ دەبنەوە و ناشباریٚ. شەرحدەری نەزەرییە ئەم جارەیان خۆی و نەزەرییە بەوەدا دەپەڕێنێتەوە کە بڵیٚ هێندە وردیلە «ذرە»ی تۆز بە ئاسمانەوە نەبوو وردیلەی هەڵمی ئاو پێوەی بنیشیٚ و دڵۆپی باران پێک بێنیٚ.

دیتت هەوری تەنها، بیٚ مەرجە پێویستەکانی دیکەی باران، نابێتە هۆی باران بارین. لە مەیدانی مێژوو و کەینوبەینی سەر بە مێژوویشەوە دەتوانم بڵێم نەزەرییەیێکم نەدیت هەندیٚ نەزەرییە سادەکەی باران پێویستی نەبووبیٚ بە تەواو کردن یاخود بە ڕاست کردنەوە. ناتەواوی نەزەرییەش لە خۆوە بۆ وردبوونەوەیێکی بێتەرفانە و چاوکرایەوە بەقەدەر خودی نەزەرییەکە ئاشکرایە. هەر هێندە خۆت نەکەی بە پاسەوانی فکرە و بیروباوەڕی تایبەتی زۆر بە ئاسانی دەتوانیت کەموکورتی و چەوتیشی ئەگەر هەبیٚ بدۆزیتەوە. کە «تعصب»یش بۆ لایەنگیریت ببا هەرچی

کەموکەسر و ناتەواوی هەیە کۆ ببنەوە، دەریش کەون، ناتوانن گوتەیێکی ئیعترازت لێ وەرگرن. کە بتەوێ بڵێی هەور هۆی بارانە، هەموو ڕۆژیش هەوری بێباران تێپەڕی خۆتی لێ بەدەنگ ناهێنێ و ڕەنگە سووریش بی لەسەر قسەکەت و بچیە چاوی خەڵقیشە بڵێی کەس دیویەتی بێ هەور باران بباریێ! کەس نەیگوتوە بێ هەور باران دەبارێ، بەڵام موشکیلە ئەوەیە بە پێچەوانەی ڕاگەیاندنی نەزەرییەکە هەوریش هەیە و باران نیە…

بێگومان ئەو نەزەرییانە کە دانراون بۆ تەعلیلی مێژوو و ڕووداوەکانی لە ئەنجامی وردبوونەوە و پشکنینەوە و دیراسەی یەکجار دوور و قوڵ و ئوستادانە بەرهەم هاتوون و خاوەنەکانیان مەبەسی یەکەمیان لەو ماندووبوون و ئەرکی بێ پایانەیان گەیشتن بوە بە ڕاستی، تاکێکیش لەوانە داوای ئەوەیان نەکردوە چی دەیڵێن ڕاستی تەواوە. خۆ ئەگەر ئەوە بڵێین دەر لە حزە سەرەوخوار دەبنەوە بۆ سەر خاکی بێحورمەتی. بەڵام بەداخەوە پەیڕەویکەرانیان ڕازی نابن کەس بڵێ کەموکووڕییان هەیە… نەزەرییە دەکرێتە ئاینێکی تازەداهاتوو، سەرلەنوێ نرخی فیداکاریی کوێرانە بۆ خۆی لە خەڵق دەستێنێ.

هەرچۆنێک بێ دەرنەچوونی بڕیارە گشتییەکانی ئەو نەزەرییانەی لەباو دان لە مەیدانی هێنانەوەی تەعلیل بۆ ڕەوتی مێژووی کورد یەکێک بوو، یەکێکی گەورەش بوو، لەو سەرچاوانەی بیروباوەڕی تایبەتی خۆم لێ هەڵێنجا. بەلای خۆمەوە لە ڕازی نەبوونم بە نەزەرییەی ناتەواو ئەگەر نەشگەیشتبم بە نەزەرییەی تەواو هەنگاوێکم هاویشتوە بەرەو دۆزینەوەی ڕاستی، یاخود با بڵێم تەقەللای من ئەگەر لە شکڵی نارەزایش بێ، کە ڕواڵەتێکی «سلبی»یە، دیسانەوە ئیمکان هەیە پێی بگوترێ هەوڵدان بۆ تەواو کردنی باوەڕی ناتەواو، چونکە من لە دژی هیچ بیروڕا و فەلسەفەیێک نیم ویستبێتی مێژوو و ڕووداوەکانی بگێڕێتەوە بۆ سەرچاوەکانی ڕاستەقینەی… هێندە هەیە هەرگیز بەوە ڕازی نیم، یاخود بابڵێم خۆم پێ ڕازی ناکرێ، چاو بپۆشرێ لە بەشێکی ڕاستی و بخرێتەوە ژێر لێوەوە لەبەر خاتری خاترداران. کە زانیمان هەوری تەنها باران نابارێنێ ئیتر لزووم نابینم پێ داگرین لەسەر ئەو تەعلیلە ناتەواوە. پێ داگرتنمان لەسەری لەوانەیە ببێ بە هۆی زەحمەتی بێهودە لە تەقەللای پێکهێنانی بارانی دەسکرد (صناعي) چونکە کە باوەڕمان ئەوە بوو هەوری تەنها باران پێکدێنێ هەر خەریکی ئەوە دەبین هەور پەیدا کەین ئەوساش

کارەکەمان دەچێتە خانەی دووبەختەکی، یا دەبارێ یا ناباری، ڕەنگە ئەغڵەبیش ئەوە بێ کە نەبارێ.

لام وایە کەم کەس هەبێ بەرهەڵستیم بکا لەوەدا کە بڵێم کورد بە درێژایی کاتێکی چەند هەزار ساڵەیی لێی دەوەشێتەوە میللەتی نموونەیی بووبێ لە هەژاری و کەم گوزەرانیدا. ئەوەی ڕاستی بێ لە کۆنێکی کۆنەوە، لەوەتەی مادەکان لێیان تێک چوە، کورد بۆی ڕێک نەکەوتوە وەک پوورەهەنگ وەیا شارەمێروو لە دەوری خۆی بئاڵێ و هەنگوین لە شانەی خۆی پەیدا کا یاخود دانەوێڵەی دەرەوەی تێدا کۆ کاتەوە. مادەکانیش کە دەسەڵاتدار بوون ڕووپێوێکی کەمیان لە کوردستانی گەورە گرتبۆوە، بەڵام دەشیا ببن بە بنکە بۆ پێکهێنانی کیانێکی گەورەتری کورد… ئەمە ڕێک نەکەوت و لەوساوە بە جۆرێکی پچڕپچڕ و ناوناوە نەبێ کورد حوکمڕانی نەدیوە، وەک مەڕی بێ شوان و پەرژین بوە هەر لێی خوراوە.

سرنج بۆم دەردەخا، لەتۆشەوە دیارە، بە درێژایی چەند هەزار ساڵێک کوردستان کەوتۆتە نێوان سێ هێزی زلەوە. فەرمانڕەوایی ئێران و دەسەڵاتی بابل و ئاشوور و، بۆ ماوەیێک لەگەڵ ئەواندا ئینجا بە دوا ئەواندا دەسەڵاتی ڕۆمەکان. ئەم سێ ناوچە زلەی دەسەڵات کە کوردستانیان گرتۆتە نێوان خۆیانەوە، هەر یەکەیان بەرووبووم و داهاتی کەرتێک لە کوردستانی گەورەیان بۆ خۆیان ڕاکێشاوە و مەودایان نەداوە ئەو داهاتە لەکوردستان بمێنێتەوە و ببێ بە ماکی بنیادنانی دەسەڵات و حوکمڕانی. هەروەک ئاورێژی شاخەکانی کوردستان هەندێکی دەڕێژێتەوە ڕۆژهەڵات و بەرەو ئێران هەندێک ڕۆژئاوا بەرەو ئەنەدۆڵ، هەندێکیشی دەڕوا بەرەو دەشتی بابل و ئاشوور، هەروەها زوربەی بەرهەمی ئابووریی کوردستان بە درێژایی مێژوو ڕژاوەتە ئێران و ئەنادۆڵ و بابل و هیچی ئەوتۆی لە خاکی کوردستاندا بەجێ نەماوە. سێ مقناتیسی گەورە پیت و داهاتی کوردستانی بۆ خۆی کێشاوە، تا ئێستاش هەر دەیکێشێ. لە کوردستان سەرمایە پێک نەهات.

لێرەدا باسی ئەوە ناکەم هێرشی هەر یەک لە دەوڵەتەکانی ئەو سێ ناوچەیە بۆ سەر یەکتری و ڕەویان بۆ کوردستان چەند جاران لە چەرخێکدا کورد و کوردستانی شێلاوە و ئاواییەکانی کاول کردوە خەڵقەکەی هەڵفڕاندوە، نەک لەبەر کەم ئەهمیەتیی ئەو کارەساتانە، بەڵکوو لەبەر ئەمە کە بە لای منەوە تەئسیری ئەو ڕەوە و هێرشانە چەندێک بووبێ لەچاو تەئسیری ئەو زاهیرەیەی «لەبەر ڕۆشتنی

ئابووری» (نزیف اقتصادی) لە کوردستانەوە بەرەو دراوسێکانی، تەئسیرەکە کز دەبێتەوە و دەچێتە پلەی دووەم و سێیەمەوە.

ڕەوی بێگانە هەرچەند یەکجار بە سفت و سۆش بووبێ، کاتی بوە و بەسەر چوە و پشوێکی ئەوتۆی بەسەردا تێپەریوە لە ئاسودەیی تا ڕەوێکی دیکە خەڵقەکە پەڕوباڵ بێننەوە و بکەونەوە سەر باری کاری جارانیان. دەمەوێ بڵێم شێلرانی کوردستان لە ژێر سمی سپای هێرشبەر لە ڕۆمەوە بۆ سەر ئێران یا لە باشوورەوە بۆ سەر بابل یا لە ئێرانەوە بۆ سەر ئاشوور هۆی یەکەم و بنجی نەبوە لە پێک نەهاتنی کیانی سیاسی (حکومەت) بۆ کورد. بۆ خۆت دەبینی ئەو هێرشانە نەبوونە هۆی لەناوچوونی ئەو دەوڵەتانەی کەوتوونە ژێریانەوە. چەندین جار یەکێک لەوانە داگیرکراوە، بۆ ماوەیێک کیانیشی دۆڕاندوە، کەچی لە ئەنجامدا هەر بۆتەوە دەوڵەت. لە فەرزی یەکیک لەوانە فۆتاویش بێ لە ژێر تاوی میللەتێکی داگیرکەردا، میللەتە داگیرکەرەکە بۆ خۆی بۆتە دەوڵەت لە شوێنی ئەو. کورد هەرچەند بەو ڕەوانە نەشفەوتاوە، هەر نەبوە بە دەوڵەت.

هەر سێ ناوچەی دەوری کوردستان لە حاڵێکدا حاکمگۆڕیشیان کردبێ بەروبوومی کوردستانیان بۆ خۆیان کێشاوە. عامیلی ئابووری کە بەنیسبەت کوردستانەوە «لەبەر ڕۆیشتن - نزیف» بوە لەو سێ ناوچەیەدا «نەقلی خوێن» بوە بۆ ناو شادەمارەکانیان. واتە خوێنی «ئابووری» کورد ڕژاوەتە دەماری دراوسێکانی. کوردستان وەک کانیاوێک بوە لە سێ جۆگەلەوە ئاوی لەبەر ڕۆیشتوە و ئیمکان نەبوە پڕ بێ.

بەلای بیروباوەڕی منەوە کارەسات و گوزارشات و چەندوچۆنی ناوخۆیی کورد چ بیانخەیتە ژێژ ناونیشانی «خەباتی چینایەتی» چ ناوێکی دیکە بدۆزیەوە، وەک من کە دەڵێم «پەلەی ژیان» و ئەو ناوە بکەی بە عینوانی کارەسات و گوزارشاتەکە، تەفسیری پێک نەهاتنی کیانی کورد ناکەن. چارەنووسی کورد بە دەست گوزارشاتی ناوخۆیی کورد و کوردستانەوە نەبوە، بە دەست هەڵکەوتێکی یەکجار نالەبار بوە کە مەودای نەداوە کورد ببێ بە خاوەن هێز و کەرستەیێکی ئەوتۆ، ڕێگە تەخت کا و زەرف دروست کا بۆ پێکهێنانی فەرمانڕەوایی و حوکمڕانی.

ئەو «نزیف»ـە ئابوورییەی کە داهاتی کوردستانی، بە بەرهەم و سەرمایەوە، ڕاگوێستەوە بۆ ناو دراوسێکانی و دەگونجێ پێی بڵێین «نقل دم اقتصادي» هەرگیز ڕێی ئەوەی نەداوە هێندە سەرمایە لە کوردستاندا عەمبار بێ بایی خەرجی دەسەڵاتێکی حکومەتی بکا. لەوە گەڕێ کە نەیتوانیوە چالاکییێکی ئاڵوگۆڕ و بازرگانی لە نێوان کوردەواری پەیدا کا و هەستێکی بەرژەوەندی ماددیی «مشترک»یان بخاتە دڵ و مێشکەوە. کە ئەمە سەرەتای مەفهومی دەوڵەتی قەومییە بەلای میللەتێکەوە و لە هەموو ڕوێکەوە جیا دەبێتەوە لە هەوڵ و تەقەللا و پاڵەوانبازیی تاکە ئەمیرێک بۆ دامەزراندنی دەسەڵاتێکی تایبەتی بۆ خۆی و خزم و دەستوپاوەندی نزیکی خۆی.

زۆر جاران دامەزراندنی دەسەڵاتی وا تەسک و تروسکی شەخسی، یاخود خانەوادەیی، لە مەفهومی حکومەت دەردەچێ و دەبێتە چەتەگەری بەسەر خەڵقەوە. تەنانەت زوڵم دەگاتە ڕادەییک کەس پەرۆشی فۆتانی دەسەڵاتەکەی نامێنێ. هەر ڕێکخستن و دام و دەسگاییێک لەسەر بنجی بەرژەوەندییێکی فرەوان هەڵنەستێ کەڵکی ئەوەی نابێ لە سوود و چاکەی خەڵق زیاد کا.

ئەو نەزەرییەی دەڵێ لەگەڵ پەیدابوونی «چین» حکومەتیش پەیدا بوو تاکوو چینی سەرەوە بتوانێ چەوساندنەوەی چینی ژێرەوە بۆ سوودی خۆی بەردەوام کا، ئا ئەم نەزەرییە لە مێژووی کورد یەکجارەکی پەکی کەوتوە و هیچ تەفسیرێکت بۆ ناهێنێتەوە پێی ڕازی بیت لە پەیدا نەبوونی کیانێکی کوردی، چونکە هەزاران ساڵە ئەو چینانە لە کوردستاندا هەن نەشبوون بە هۆی دروستبوونی حکومەت. من خۆم لەو باوەڕەدام ئەگەر مەبەسی چەوسانەوەش لە بەینیدا نەبێ، مرۆڤ کە گەیشتە پلەییێکی هەڵکشاوی ژیار (حضارة) حکومەت دادەنێ و دەسەڵات ڕێک دەخا با هەموو خەڵقیش وەک برا وا بن. پێک هێنانی هۆی ژیان و پێشکەوتن لە پلە یەک لە دوا یەکەکانی گۆڕان داخوازی بوونی حکومەت دەکا، چەوساندنەوە لە بەیندا هەبێ یا نەبێ.

بەوەندە باوەڕەش «اکتفا» ناکەم. بەلای ڕای منەوە ئەگەر باری ئابووری یارمەتی مرۆڤ نەدا بۆ جێبەجێ کردنی داوا و ئەرکە تایبەتیەکانی «دەسەڵات – حکومەت» نە بەرژەوەندی تێکڕای کۆمەڵ، چ جایێ تاکە چینێک، نە پێویستیەکانی پلەی گۆڕان و پێشکەوتن، نە زەبری کوتەک ناتوانن حکومەت دانێن و سپا و پۆلیس و

کاربەدەست بە خێو کەن. نەبوونی ئابووریی گەشەدار وادەبێ حکومەتی دروست و حازر دەڕمێنێ، هەڵبەت ناهێڵێ لە نەبوویەوە حکومەت دروست بێ.

ڕەنگە لێم بەدەنگ بێی و بڵێی پەیدابوونی چین لە کوردستاندا حکومەتی پێک دێنا ئەگەر بێگانە لێی گەڕابا، بەڵام بە هێنانەوەی ئەو تەئویلە بۆ پەیدا نەبوونی حکومەت لە «حجازی» پێش ئیسلام و سەرەتای پەیدابوونی ئیسلام، خۆ دەمێکیش بوو چینەکان هەر لە عەبدەوە تا بازرگان و خاوەن زەوی و سەرەک عەشرەت لە کاردا بوون. هیچ داگیرکەر و هێرشبەریش بەسەر حیجازدا هاتۆچۆیان نەدەکرد و میللەتەکەیان پامالْ نەدەکرد تا بڵێی وەک کوردستان ئەویش بێگانە لێی نەگەڕا حکومەت دروست کا.

وەک من تێی دەگەم حیجازی ئەو سەردەمە دەهات لە ئەنجامی پێشکەوتنی ئابووری و ژیارییەوە، نەک بەهۆی پەیدابوونی چینەوە، بگا بە پلەی دامەزراندنی حکومەت. خەڵقەکەی خەریک بوون لە دەوروپشتی «كعبة» و بنەماڵە دەسەڵاتدارەکانی «مکە» بە تایبەتی ماڵی »أبو سفيان» جۆرێک ڕێکخستنی قسەڕۆییو پێک بێنن. «دار الندوه»ش بەرەو ئەوە دەچوو وەک سەرای حکومەتی لێ بێ. بەڵام هێشتا مەودایێکی تەواویان مابوو بنگە و دەسگای «رسمی» دانێن.

نەزەرییەی پەیدابوونی حکومەت لە ڕێی پەیدابوونی چینەوە چونکە پێشەکییەی لە واقیعی مێژووییەوە هەڵنەستاوە ئەنجامەکەشی ئەوە دەرناچێ کە نەزەرییەکە چاوەڕوانی دەکا. بەپێی موژدە و بەڵێنی نەزەرییەکە، ڕەوتی بەرەو کۆمیونیزم لەو وڵاتانەدا کەوا شۆڕشی سۆشیالیزم تێیاندا سەرکەوتوە، دەبوا دەسەڵاتی حکومەت کز کاتەوە تا بە تەواوی دەتوێتەوە و نامێنێ، کە چی هەتا دێ ئەو دەسەڵاتەی حکومەت زیاد دەکا و ڕێکخراوەکانی پەرەدەسێنن و وردە وردە میللەت کە هەمووی دەبێ بە حکومەت، واتە پێچەوانەی بەڵێنی نەزەرییە دێتە دی. ئەو تەوجیهەش کە بڵێ فەرق لەوەدا حکومەت ببێ بە میللەت یا میللەت ببێ بە حکومەت کەموزۆر خزمایەتی نیە لەگەڵ ڕاگەیاندنی نەزەرییەکە، چونکە نەزەرییە دەڵێ «سلطه» نامێنێ و میللەت بێ «سلطه» خۆ بەڕێوە دەبا. نەمانی «سلطه»ش وەک بدیهیە یە لە ناو نەزەریەکەدا چونکە کە گوتی لە هەوەڵەوە «سلطة - حکومەت» بۆ تاکە مەبەسی چەوساندنەوەی چینی خوارەوە پەیدا بوە دیارە نابێ «سلطه» بمێنێ کە «چین» نەما یاخود چەوساندنەوە نەما.

من لێرەدا عەیب ناگرم لە داهێنەری نەزەرییە چونکە ئەو بە پێی تێگەیشتنی خۆی و چاوەنۆڕ کردنی لە ڕەوتی مێژوو بەسەر ڕێبازی خەباتی چینایەتییدا چی بە ڕاست زانیوە ئەوەی بە ئێمە گوتوە، ڕەنگ بوو ئەگەر بۆ خۆی ژیابا بە چاوی خۆی دەیدیت واقیع شتێکی جودایە لە ڕواڵەتی فەرمانی نەزەرییە، وازی لە نەزەرییەکە بهێنابا بۆ واقیع. گلەیی بکرێ لەو کەسانە دەکرێ کەوا بیروباوەڕێکی لە سەرەتاوە ناوی «علماني» و «مادي» لەخۆ ناوە دەیکەنەوە دینێکی نوێ کە نابێ هەڵەی تێدا بێ.

نەزەرییەکانی ماددی بەر لە هەموو شتێک جلی «تقدیس»یان لەبەر عەقیدەکانی لێرە بە پێشەوە دارنی و بە خەڵقیان گوت ئەو بیروباوەڕانەی بە زادەی ئاسمان و فریشتە و بێ پەڵە و گەرد دادەنران لە چڵکنترین سەرچاوەی ماددیەوە هەڵستاون، بە دوا ئەو گوتەیەدا چەکوچیشیان دا دەست خەڵق کە ورد و خاشیان بکەن. دەوجا کە حاڵ وابێ بۆ دەبێ مرۆڤێکی «علمانی - ماددی» لە عاست بیروباوەڕی «علمانی- ماددی» دا سەرلەنوێ ببێتەوە سۆفی و دەروێش و لە نووکەوە ئەفسانەییەکی دەسکردی «ماددی» بکا بە خەرمانەی تقدیس لە دەوری باوەڕ و نیگا و تصورێک کە خۆی لە دژی غەیب و تقدیسە؟

ئەم «تناقض»ـە فکریەی «داخلی- ناوەکی» بۆ بکرێ بە کۆڵەگەی فەلسەفە؟ تاوانبار کردنی ڕەخنە گرتن لە فەلسەفەیێک کە خۆی لە بنەڕەتا ڕەخنە گرتنە لە هەرچی باوەڕێکی غەیری خۆیەتی، ڕاست وەک ئەوەیە کابراییێک بڵێ من مرۆڤێکی زۆر بەڕەحمم هەرچی پێم باوەڕ نەکا لە گەردەنی دەدەم! فەلسەفەی ماددی کە بەوە بنازی خەڵقی ڕەساندوە لە ئەفسانەی «تقدیس و پاکسروشتی» نابێ پەیرەوەکانی بێن پێمان بڵێ «فەرموون کڕنوو ببەن بۆ ئەم فەلسەفە مقدس و پاکسروشتە»! بەلای منەوە ڕاستی لە هەموو نەزەرییە و بیر و باوەڕێک مقدسترە.

مافی نەتەوایەتیی هەرە گرنگی میللەتی کورد کە دامەزراندنی حکومەتە لە سەرانسەری کوردستاندا، ئەم مافە کە نەکەوتە دەستی میللەتی کوردەوە سوچێکی ئاغا و مەلا و شێخ و زەید و عەمری کوردی تێدا نەبوە، فەللاح وکرێکار و کەسەبەی کوردیش لەوەدا گوناهبار نین. بەلای باوەڕی منەوە دامەزراندنی کیانێکی کورد لەو زەرفە مێژووییە کە کوردی تێدا ژیاوە کارێک بوە هێندە زەحمەت وەک «مستحیل»وا بوە. هێزی میللەتی کورد بە هەموو مرۆڤ و سروشت و ئابووری و

کۆمەڵایەتی و سەقافەتی و گیانی نیشتمانپەروەرییەوە بخە لایێکەوە و هێزی بەرهەڵستی کردنیش لە پێک هاتنی ئامانجی نەتەواییەتی کورد بە هەموو بارێکەوە بخە لایێکی ترەوە بێگومان هێزی بەرهەڵست گەلێک زیاتر بوە لە هی کورد. بەرهەڵستییەکەش هەر تاکێک نیە. هەڵبەت ئەو دەولەتانەی کوردیان ژێردەست کردوە بەر لە هەموو بەرهەڵستەکان دێنە بەرچاوی بینەر، بەلام بەپێی باوەڕی من لە ماوەی دووڕودرێژی چەند هەزار ساڵەی مێژوو، یەکەم بەرهەڵست زێدە شڕیی باری ئابووریی کورد بوە بەو جۆرە بۆم باس کردی.

دوژمنانی کورد و داگیرکەرانی کوردستان دەهاتن و دەچوون، یەکیان دەفۆتان یەکێکی دیکە دەهاتە جێ. لەو سێ ناوچەی دەوری کوردستاندا چەندین جار دەولەت گۆڕاون، هەر جارە بەهۆی بوونی ئابووری ئەوتۆوە حکومەت بەڕێوە ببا، یا داگیرکەرەکە حوکمڕانی کردوە یاخود میللەتە ژێر دەستەکە سەرلەنوێ دەسەلاتی گرتۆتەوە دەست خۆی.

پوختەی قسە ئەوەیە وەزعی لەباری ئەو سێ دراوسێیەی کوردستان بە درێژایی مێژوو بوە هۆی ئەوە بەدائیم حکومەتی تێدا ببێ. ئەگەر هێزی لاوەکی (جانبی) حکومەتی یەک لەو پارچانە بڕووخێنی بە پێی داخوازی ئەو وەزعە لەبارە سەرلەنوێ دەسەلاتی حکومەت دروست کردنەوەی تێدا کۆ دەبێتەوە. سرنج لەوە بگرە ئەو داگیرکەرانەی کە دەهاتن و لە بابل و ئەنادۆڵ و ئێران حکومەتیان دروست دەکرد جارێک لە جاران کوردستانیان نە کرد بە ناوچەی حوکمڕانی خۆیان، بێگومان هەمان سەبەبی ئابووری کە ناوم نا «لەبەر ڕۆیشتن – تزیف – ی ئابووری» داگیرکەرەکەی کوردستانیشی هێندە بێهێز دەکرد نەتوانێ حکومەتێکی بەردەوام بەڕێوە ببا.

سەیرێکی یەمەن بکە. کوردستان چەند کەوتۆتە سەر خەتی جموجۆڵ و هاتوچۆی ژیاری میانی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا یەمەن ئەوەندە لاتەریک و دوور لە تاوی ژیاری بوە، بەو پێیە دەبوا بە درەنگەوە توانایی و شیاوی دامەزراندنی حکومەتی هەبێ، کەچی بەهۆی ئەوەوە بەروبووم و داهاتی بە شکڵی «نزف اقتصادی» لەبەری نەڕۆیشتوە و نەڕژاوەتە وڵاتی ترەوە، لە ناو خۆیدا بوە بە هۆی چالاکیی ئابووری بەرەو زیادبوون. لە ئەنجامی کاردا خەرمانبوونی داهاتەکەی ئابووری لەناوخۆی، پێزی دانانی حکومەتی پێ داوە، بوە بە خاوەن حکومەت. بەلای منەوە ئەمەیە هۆی

بنجی لە چارەنووسی یەمەن، عامیلی دیکە کە هەبێ، هەیشە، بە دوا ئەودا دێن. یەمەن دوو لای دەریایە و لاییکیشی بیابانە، خاکەکەیشی وەک خاکی کورد بە پیت و بەرەکەتە، ناوناوە بێگانە داگیری کردوە بەڵام زەرفی ئابووری یارمەتی داوە لە هەموو داگیرکەرێک ڕزگار بێ.

وەک یەمەن حەبەشە و یۆنان و گەلێ وڵاتی تریش عەمباربوونی داهاتی ئابووری تیاندا بوە بە هۆی یەکەم لە پێکهێنانی حکومەتەکانیان.

قەناعەتی من ئەوەیە ئەگەر یەک لەو سێ وڵاتە دراوسێ بەهێزەی کورد چۆڵ با، با بڵێم یا دەریا یا بیابان یا شاخاوییەکی ئەوتۆ با دەستی نەدابا بۆ تێدا حەوانەوەی حکومەتێکی گەورە، کورد لە دەمێکەوە دەگەیشت بە مافی نەتەوایەتی خۆی. من لەو باوەڕەدام، دەمێکە لە نێوان کوردا ئەوەندە هۆش و گۆش و خوێندەواری و هەستی نەتەوایەتی هەیە ئەگەر لانی ئابووری یارمەتی حکومەتی دابا حکومەتی چەسپاو و دائیمی لە سەرانسەری کوردستاندا پێک بێنێ. لانی ئابووری لێ دەرکە، لە هەموو ڕوویێکی دیکەی لیاقەتی حکومەت دانانەوە بەراوردی کورد بکەی لەگەڵ یەمەن و حەبەشە کورد پێشکەوتووتر بوە. ئەو بەگلەر و حوکمدارییەی لێرەو لەوێ بۆ ماوەی کورت کورت لە کوردستاندا پەیدا بوون، بێگومان، لە یەمەن ڕێکوپێکتر بوون.

من کە یەمەن و حەبەشە بە نموونە دێنمەوە دەمەوێ لە واقیعی جیهانی کۆن دوور نەکەومەوە دەنا دەتوانم «ئەزتێک و ئینکا»ی ئەمریکای سەروو و خواروو بکەم بە نموونە، کە لە هەر دواندا حکومەت پێک هاتبوو سەدان ساڵ بەر لە دۆزینەوەی ئەمەریکا و پەڕینەوەی ئەورووپییان بۆ ئەوێ. هیچ کامێک لە ئەزتێک و ئینکا و Mayans کە سێ گەلی هەرە پێشکەوتووی جیهانی نوێ بوون، هێشتا نەیان دەزانی خوێندن و نووسین چیە. لە لانی بیر کردنەوەی فەلسەفیشەوە، کە مەلاکانی کورد هەزار ساڵە بە دەرسی دەڵێنەوە تێکڕای دانیشتوەکانی ئەمەریکا لە گرِوگاڵێکی منداڵانە بەولاوە تێپەڕیان نەکرد بوو.

جارێکی دیکەش نزیک کەوینەوە لە کوردستان و، ئەرمەنەکان بە میساڵ بێنینەوە کەوا لە زوییێکەوە حکومەتیان بووە لە ئەرمینیا. ئەوسا واتە لە مێژوویێکی کۆندا، دەورە نەدرابوون بە هێزی گەورە، شاخەکانی قەفقاس شورەیێکی مەیلەو بێ

مەنفەزی لە پشتیانەوە دروست کردبوو، تا ڕادەیێکیش دوو دەریای خەزەر و ڕەش چەپ و ڕاستیانی ئاسوودە کردبوو. خولاسە ئەو مەرجانەی کە بە بیری مندا دێن بۆ پێکهێنانی حکومەت و لە کوردستان نەبوون، بەنیسبەت ئەرمەنەکانەوە هەبوون. بە پێی باوەڕی من ئەوان لە شوێنی کوردان بان وەک کورد بێ حکومەت دەبوون، کوردیش لە جێی ئەرمەنەکان با وەک ئەوان حکومەتی دەبوو. لە فەرزی جیاوازیش هەبا لە بەینی کورد و ئەرمەن لە ڕووی تایبەتییەکانی سەقافییەوە و لیاقەتی ئەوان زیاتر بووبا لە کورد بەهۆی ئەو تایبەتیانەوە، دیسانەوە حوکمی واقیعی کوردستان خۆی فەرز دەکرد بەسەریاندا و فەرقەکەی سەقافی بێبایەخ دەکرد، یاخود پەکی دەخست.

من لە لانی ئابووری مەبەسم گوزەرانی نەمر و نەژی «کولەمەرگ» نیە بەڵکوو ئەو داراییی و سامانەیە کە حکومەت و دەسەڵات بەخێو دەکا و لەگوێرەی پێداویستی وەزعی کوردستان کە لە هەموو لاییێکەوە دەورە دراوە بە هێزی گەورە سپای بەرگری پێک دێنێ، دەنا ئەگەر ئەو زاهیرەیەی «لەبەر ڕۆیشتن» (نزیف)ی ئابووری نەبا کە نەیهێشتوە سامانی گەورە لە کوردستاندا کۆبێتەوە، خاکی کوردستان بە زەوی و ئاوی زۆریەوە و هەمەچەشنەیی داهاتەکانی سروشتی و ئاژەڵییەوە دانیشتووی خۆی باش بەخێو دەکا و ئەوەندەش ئامادەیە کەوا لەگەڵ ڕەوتی بەرەو پێشەوەی کورد سەرچاوەی تازەی گوزەران بە دەستەوە بدا. بەڵام بێگومان گوزەرانی ساڵانەی سەروبەر نابێتە چاوگی هێزێک حکومەتی پێ دامەزرێ کە ئامانجێکە گەلێک بەولای گوزەرانی عادەتییەوە.

ڕەنگە مبالەغە نەبێ لەوەدا کە دەڵێم لە سەرانسەری کوردستان بانکێک بە پارەی کورد دانەمەزراوە و پردێک لەسەر ئەرکی کورد بەسەر زێ و ڕوبارێکەوە نەکراوە، پرۆژەییێکی گەورەی کشتوکاڵ و جۆگە لێدان لە کوردستاندا ڕێکنەخراوە، لە چەند جێگەییێکی مەیلەو شار نەبێ کارگە و پیشەسازی بچووکیش نەبوە بەرهەمی «محلی» بەکار بێنێ.

خولاسە سەرمایە لە کوردەواریدا پەیدا نەبوە تاکوو تاوی ژیاری خۆی بێنێ بۆ ناو شیرازەی کۆمەڵایەتی گەلی کورد و بەپێی داخوازیی سروشتی خۆی، کوردان بە یەکدی ببەستێتەوە لە ڕێی پەیوەندی ئابووریی گشتی یفرەوانەوە کە زوربەی گەلی کورد تێیدا بەشدار بن و لە دەوری بئاڵێن و بەرهەم زیاد کەن. ڕاستییێکی مەعلوومە

بوونی بەرژەوەندی گشتی بە تێپەرینی کات هەستێکی تێکڕایی دروست دەکا، هەستێکی چاوکرایەوە و خاوەن خواهشت و ئامانج، نەک هەستێکی عاتیفی ڕووت کە ئەگەر بشکەوێتە بزووتنەوە نازانێ هەنگاو هەڵێنێ و تەقەلای خەڵق ئاراستە کا و بەرەو هەدەفێک تەقەللاکە لێ خوڕێ.

گیروگرفتی گەورە لە پێش مافی نەتەوایەتی کورد پەیدا نەبوونی بەرژەوەندی ئابووریی گەورە و گشتیی زوربەی کورد بەر لە هەموو شتێکی دیکە کە ببێتە بەرهەڵست، بەدوا ئەودا بوونی هێزی زلە لە دەوری کوردا کە بەرهەڵستی کردوە لە پێکهێنانی دەسەڵاتێکی کوردی.

ئەم بیر و باوەڕەی من دەفتەری چەند هەزار ساڵەی کورد دەخوێنێتەوە نەک هی ڕێکەوت و ڕووداوێکی تاک. حوکمدارێکی کورد پەیدا بوە و ڕاستەوخۆ لە لایەن شاهەنشاهـ و سوڵتانێکەوە تەفروتونا کراوە. دیارە هۆی کوتومتی لەناوچونی حوکمدارەکە ئەو شاهنشاهـ و سوڵتانە بوە، بەڵام ئیمکانی لەناوبردنی حوکمدارەکە دەگەڕێتەوە بۆ چارەنووسێکی کۆنتر و فرەوانتر لەو چەند مانگ و ساڵەی حوکمدارەکەی تێد ڕاست بۆوە و ڕووخێنرا.

وەزعی مێژوویی «لەبەر ڕۆیشتن- نزیف»ی ئابووریی چەند هەزار ساڵەی کورد لە کۆنەوە بریاری لەناوچوونی ئەو حکومدارەی داوە. لەناو نەچوونی حکومدارەکە شتێکە دژی بڕیاری واقیع یاخود مێژوو. لەم مەیدانە زۆر کۆن و فرەوان و قووڵەی هەڵرژانی خوێنی کورد (کە داهاتەکەی بێ) بۆ ناو ڕشتەی خوێنی دراوسێکانی، گوزارشاتی بچووک و تەسک و مەحدودی ڕۆژانەی ژیانی کورد دەخلێکی یەکجار کەم و بێ تەئسیری هەبوە، یار هەر نەیبوە. نە خەباتی چینایەتی و نەپەلەی ژیان و نە ناکۆکی ناو چینەکان هیچیان چارەنووسی کوردیان مۆر نەکردوە. جگە لەو باری ئابووری یەکجار تایبەتی کە لەناو کوردا هەبوە هەرچی بارێکی دیکەی تێدا هەبووبێ لەناو میللەتانی دراوسێی کوردیشدا هەبوە کەچی نەبۆتە بەرهەڵست لە گەیشتنیان بە پلەی دروست کردنی حوکمی قەومی. هەڵبەت ئەگەر کوردیش هەر بە قەدەر ئەوان دووچاری گیروگرفت و بەرهەڵست بووبا لە ڕەوتی سیاسی بەرەو دروست کردنی «کیان» دەبوا ئەویش بگەیشتایە ئەو ئەنجامە کە ئەوان پێی گەیشتن. خۆ کورد سیحری لێ نەکراوە زێدە لە میللەتان.

ئەوەندەی دیبێتم نووسەرێکی ماددی لە بارەی مەوزووعی سەر بە کوردەوە نووسیبێتی هەر لە ڕێبازە کلاسیکیە نەزەرییەکانی ماددییەوە بۆ مەوزووع چوە و هانای بردۆتە بەر پلەی گۆڕان و هۆی بەرهەم (وسیلة انتاج) و فیۆداڵ و بۆرجوازی. خەریک بوە لە پەنا و پەسێوان بەڵگە بدۆزێتەوە، واش بوە بەڵگەی دروست کردوە، بۆ ئەوە مێژووی کورد و کۆمەڵایەتی کوردیش وەک هی هەموو جیهان ڕاستی نەزەرییەی ماددی ئیسپات بکەن. لەوەدا هەر دەڵێی مەبەستی ئەسڵی ئەوەیە کورد و مێژووی بکرێن بە خزمەتکاری نەزەرییە نەک نەزەرییە ببێتە خزمەتکاری کورد.

لەو تەرزە نووسینانەدا زۆر جار دیومە، کە نەزەرییە پێویستی بوو، قوربانی بێ سووچ و تاوان لە ئەرز دراوە بۆ سەپاندنی ڕاستی و دروستیی فەلسەفەی نووسەرەکە ئیتر بەپێی داخوازی ئەو سەپاندنە تاقمێک لە چینی تاوانبار بەلای نووسەرەوە ڕیسوا کراون و ئابڕوویان بوە بە ڕەنگی ئەو نەقشە جوانە کە ڕواڵەتی فەلسەفەی پێ ئارایشت داوە. وا بوە نووسەری ئەوتۆیی، لە ترسی بریندار کردنی هەستی قەومی خەڵق، قەڵەمەکەی هەڵەنگاوتوە لە قارەمانێکی قەومی کە دەرەبەگێک یاخود پیاوێکی ئایینی بوە، بەڵام دە جاران تۆڵەی ئەوەندە هەڵنگاوتنەی ساندۆتەوە لە فیوداڵی و پارەدار و خاوەن ناو و شۆرەت کە بە پێی باوەڕی خۆی دەبێ «خائین» بن لەبەر «انتمای طبقی»یان با لە واقیعدا خائینیش نەبن. هەر بەو ڕێبازە کلاسیکیانەدا تحلیلی مێژووی کوردیشی کردوە ویستوەتی ژیانی «عقلی»ی کورد بکاتەوە بە ئاوێنە بۆ ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی کورد، ئیتر لە بەیتێک تیشکی دەرەبەگی و لە گۆڕانێک خەباتی چینایەتی و لە مەتەڵێک زرینگەی دراوت بۆ بخاتە سەر کاغەز و پێت بڵێ ئەمەتە بەڵگەی ڕاستی و دروستیی فەلسەفەکەم کەوا دڵۆپ دڵۆپ لە واقیعەوە دەڕژێتە ناویەوە.

باوەڕم نیە هیچ فەلسەفەیێکی ناودار و ناسراو بۆ خۆی هێندە تەسک بێ کە بەم جۆرە ئحتیاج بێ بە تەسک کردنەوە و وێکهێنانەوەی مێژوو. بەشی زۆری وەتەنگ هاتنی فەلسەفە لە تەعلیلی واقیع و ڕووداو گوناهی تەنگیی نیگای پێڕەوەکانیەتی. هەندێ جار کورتبینیی نووسەر لە گێڕانەوەی ڕووداو بۆ سەرچاوەی «چینایەتیی» وا ڕادەگەیەنێ سەرانسەری ئادەمزاد یەک هۆزە، هەندێکی خوێنمژ - کە تێکڕایان دۆست و شەریکی یەکدین لەو خوێن مشتنەدا - هەندێکیشیان خوێن مژراو - کە ئەوانیش هەموویان دۆست و هاوشعوری یەکدین. ئیتر خەریک دەبێ لەو کولانەی

وەک کونیدەرزییەوە قافڵە و قەتاری مێژوو تێپەڕ بکا لە حامورابییەوە بۆ سەردەمی لۆمۆمبا. حەز ناکەم ناوی کەس بێنم ئەوەی دەیڵێم لە زۆر نووسیندا دەیخوێنیتەوە.

هەر ئەم نیگایە تەسکە کە دەکرێ بە دووربین بۆ سەیر کردنی مێژوو، سەیری ڕۆژانی ئێستاکەشی پێ دەکرێ و مۆری پەسەندی و ناپەسەندی پێ لێ دەدرێ لە ڕووداو و ئەشخاس و بزووتنەوە و ڕێکخراوی سیاسی و هەڵوەست و گوتار و کردار... من دەخلێکم نیە بەسەر کاری ئەم تەرزە نیگایە تەسک و تروسکەدا لە ڕۆژگاری ئێستاکەمان، بۆیە ناچمە سەر چینە کردن لەو قسە و نووسین و هەڵوەستانە کە لە نیگای وەها تەسکەوە هەڵدەقوڵن. من لەگەڵ ڕابردوو خەریکم بایی ئەوەی کە پەیوەندی هەبێ بە شریتەی ئەو لاباسانەوە کە بە مەوزووعی حاجی قادرەوە هەڵدەستن. هەر ئەوەندە دەڵێم وەک بدیهیە کە نیگا و نۆڕینێک لە مێژووی ڕابردووی بێگیان نەگا دیارە لە ئێستاکەی زیندوو و بزۆز پتر بەسەهوو دەچێ. قەسابێک نەتوانێ کەلەشی مەڕی سەربڕاو پەلپەل بکا بۆ چێشت لێنانێکی ڕێکوپێک، هەڵبەت ناتوانێ مامزێک پەلپەل کا کەوا لە هەڕا کردندایە.

بیروڕاییێک کە لێرەدا خوێندتەوە لە بارەی وێکچوونی دوولانی «عقلی و ماددی» ژیانی کورد، لە زیمنی ئەویشدا مەوزووعەکانی سەربە باری کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیریی کۆیێ، هەموویان و تێکڕایان ئەوەندە پان و قووڵن چەندین دیراسەی درێژ و سەربەخۆیان دەوێ. هەندێک لە و دیراسانە نووسەرێک پێیان ناویرێ ئەگەر خۆی بۆ تۆژینەوەیان تەرخان نەکا. هەندێکیشیان جێیان نابێتەوە لە ژێر ناونیشانی لاباس، لەو ڕووەوە دەبێ ئەوانیش بکرێن بە دیراسەی سەربەخۆ.

ڕەنگە ئەوەندەی منیش نووسیم، کە کەمیش بوو، پێی بگوترێ لادان لە باسی بنجی، بەڵام بە پێی باوەڕی خۆم لەوەندە کەمتر بایی پەیدا کردنی چ قەناعەتێکی نەدەکرد، زۆر بێ یا کەم. خۆ ئەوەی ڕاستی بێ قەناعەت هێنان بە بیروباوەڕی ئەوەندە دوور لە بیروباوەڕی پەرەسەندوو، تەماییێکی هێند گەورەیە بە نووسین هەر نایێتە دەست. گۆڕانی بیروباوەڕی پەرەسەندوو لەسەر واقیعی ڕەق و بە ئازار نەبێ نابێ. کەواتە نووسینەکەم کەمیش بێ، زەرەری نەبەخشیوە لەو ڕووەوە کە ئەگەر زۆریش با سوودی کەم دەبوو، یا هەر نەدەبوو لە عاست قەناعەتی پەرەسەندوودا.

**پوختەی قسە ئەمەیە**

1) زانستی کورد لە ڕابردوودا یەکجار دەوڵەمەندتر بوە لە ئابووری کورد.

2) شاری کۆیێ لە جێگایە هەرە پێشکەوتوەکانی کوردستان بوە، چ لە ڕووی زانستەوە بێ چ لە ڕووی ئابوورییەوە. ئەم پێشکەوتنەشی شوێنی دیاری خۆی هەیە لە پلەی گۆڕانی ناوچەی سەربە کۆیێ و لە پەیدابوونی بیری ئازاد تێیدا.

3) باری ماددی یارمەتی کوردی نەداوە دەنا لە هەموو ڕوییێکەوە کورد لێی دەوەشایەوە بگا بە مافی نەتەوایەتی خۆی وەک ئەو میللەتانەی دراوسێی کە بە مافیان گەییون.

بەڵام دەبێ ئەوە لە بیر نەکەین چی لێرە بە پێشەوە گوتم خوێندنەوەی مێژوو و ڕابردووی کوردە. ئێستاکە و دواڕۆژی کورد لە زەرفێکی یەکجار جیاواز دەژی لەچاو زەرفی کۆنی. لاتەریکی و بێ پەیوەندی و نەبوونی تیکەڵێکی ئابووریی بەهێز لە میانی ئەمسەرەوسەری کوردستان کە لە مێژووی کۆندا ئەو دەورە زلەی بوە هەمووی کز دەبێتەوە لەبەر تاوی ڕادیۆی ترانزیستۆر و ڕۆژنامە و چاپەمەنی و فڕۆک و دەمەتەقەی میللەتە یەکگرتوەکانی (لە ڕاستیدا یەکنەگرتەوەکان) و سەدان هۆی بەیەکەوە بەستنەوەی سەرانسەری جیهان نەک هەر کوردستان. بۆمبایێکی ئاتۆم لە دەریای «هێمن» Pacific دەتەقێ، لە هەموو شاخ و دۆڵ و سەحرای دوورەدەستی ئەرزدا دەنگ دەداتەوە. وا دەبێ ئافرەتی حەفتا ساڵی لێت دەپرسێ ئەرێ بەینی ئەمریکا و چینی میللی چی لێهاتەوە! گەز و گرێی تازەداهاتوو کە زەرفی ماددیی سەردەمی نوێی پێ دەپێورێ، هەر بە جارێ حیسابی کلاسیکی تێک داوە و کردوەتی بە کۆنینەییێکی مۆزەخانە.

مومکینە ئیمرۆ یەک دوو چاڵەنەوت لە جێگەی مناسبدا حکومەتێک دروست کەن. خۆ ڕووناک کردنەوە بە چرای دوێنێ کۆنەپەرستی بێ فڕوفێڵە. چەرخی تازە بە تەواوی نوێیە.

**لێرەدا کۆتایی بەشی یەکەم هات.**

ئەمە دووەم جارە لەم نووسینەدا دژی خواهشتی خۆم دەبزوومەوە. جاری یەکەم ئەوەبوو نووسینەکە لە گوتارەوە بوو بە کتێب و کەلێنێ بێماوەیی و بێدەرفەتی و بێسەرچاوەیی خۆی بە دیار خست بەو جۆرە کە لە شوێنی تایبەتی خۆیدا باسم کرد.

جاری دوەم ئەوەیە کە کتێبەکە بە ناچاری کرایە چەند بەشێک. هەر چەند سەرپاکی بەشی دوەمیش ئێستا ئامادەیە بۆ چاپ کردن، بە هۆی ئەوەوە ئیمکان نیە هەموو نووسینەکە لەگەڵ بەرپا کردنی پەیکەرەکەی حاجی بە چاپ ڕابگا، لە کۆڕەوە بڕیار درا، خۆیشم بڕیارەکەم پەسەند کرد، کەوا ئەو هێندە بەسەرهاتەی حاجی کە دەکەوێتە پێش گەشتی خوێندنی لە باڵەکایەتی و کوردستانی ئێران ببێتە بەشی یەکەم.

لە دڵدا حەزم بەوە دەکرد هەموو ژیانی حاجی بەر لە ڕاگوێستنی بۆ ئەستەمبوڵ ببێتە یەک کتێبی سەرانسەری بێ پچڕانەوە، چونکە وەک دیارە تێکڕای ئەو ژیانەی دەبێتە قۆناغێکی سەربەخۆ کە ڕابگیرێ لە بەرانبەر قۆناغێکی سەربەخۆی وەک ژیانی ئەستەمبوڵی. بەڵام کە چار نەما و نووسینەکە لە یەکدی پچڕایەوە جێی خۆیەتی ژیانی بەر لە سەفەری بۆ ئەستەمبوڵی، ئەویش بکرێ بە دوو قۆناغی گردەبڕ. یەکێکیان پێش گەشتەکەی خوێندنی، ئەوی تریشیان لەو گەشتەوە تا ڕۆیشتنی لە کۆیێ بەرەو تورکیا.

نووسینی بەشی یەکەم و دوەم لە نیسانی 1972 ەوە گەڵاڵە کراوە کەمێکی کۆتاییەکەی بەشی دوەم نەبێ هەمووی پاکنووسیش کراوە. لە بەشی دوەمدا کۆمەڵێک باسی نوێ دەخوێنێتەوە کە تا ئێستا کەس لە سەری نەنووسیون. بۆ خۆم جارەها بەقسە لێیان دواوم، واش بوە هەندێکم لەو قسانە بۆ هاتۆتەوە لەم و لەو بێ ئەوە بگوترێ کە بە ئەسڵ لە خۆم بیسترابن. لەمەدا وەتەنگ نایێم و پەرۆشیشم نیە قسەی من خاوەنی تری بۆ پەیدا ببێ، لەم ڕوون کردنەوەیەدا هەر هێندەم بەسە بە خوێنەری کورد ڕابگەیەنم کە ئەگەر لەو ماوەیە تا بەشی دوەمی نووسینەکەم دەردەچێ چی ئەوتۆی لە نووسینی خەڵقی بکەوێتە بەرچاو کە لەو بەشەی دوەمەدا سەرلەنوێ بیخوێنیتەوە وەنیە من لە خەڵقم وەرگرتبێ، بەپێچەوانە ڕەنگە قسەی من

بە گوێی خەڵق کەوتبێ یا خود بە لانی کەمەوە ئەو کەسەش وەک من لە لای خۆیەوە گەیشتبێتە هەمان باوەڕ.

بە نموونە دەڵێم لە بەشی دووەمدا ڕایەکی نوێ دەردەبڕم لە بارەی پەیدابوونی نالی و سالم و کوردی لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەم و لەو ڕایەدا دەوری شۆڕشی فرەنسە و عەبدولڕەحمان پاشای بابان، بە بەڵگەی مێژوویی و نووسرایەوەوە، ڕوون دەکەمەوە. جا ئەگەر لە ئێستاوە تا ئەوسا کەسی تر لە نووسەرانی کورد ڕایەکی ئەوتۆیی دەربڕێ نووسینەکەی من لەوی وەرنەگرتوە. لەنێوان برادەران شایەدم زۆرە کەوا من دەمێکە گەییوم بەو باوەڕەی وا ئێستا ئیشارەتم بۆی کرد، لای دەیان کەسیش بە دووروودرێژی لێی دواوم، جا ئەگەر یەکێک لەوان بۆ خۆی ساغ کاتەوە بە پێش دەستی کردن لە نووسینی، هەر هێندە بۆ من دەمێنێتەوە پاکانەی ئەوە بکەم من لەوم نەدزیوە. وەک ئەم ڕایەش گەلێکی تری نوێ لەو بەشەدا دێتە ناوەوە. خۆ ئەوەی ڕاستی بێ من لە سەرپاکی نووسینەکەم باسی شتێکم نەکردوە کەس باسی کردبێ، لە ڕێباز و دەربوونەی ئەوتۆوە بۆ پەرستگەی حاجی قادر ڕۆییوم شوێن پێی لێرە بە پێشەوەی تێدا نەبێ. زاتەن کالای وەها نوێ نەبێ لایق بە خوێنەری کورد نابینم. چی نووسیومە نوێیە، جا ئەگەر ڕاست ئەگەر هەڵە.

بەشی سێیەم جارێ هەر تارمایی پەیکەرەکەی لە مێشکمدا دەجمێ. کەمێکی یەکجار کەم نەبێ، کە ڕەنگە ڕاست بێ پێی بگوترێ چش، لە سەرگوزەشتی ڕۆژانی حاجی لە تورکیادا لێم مەعلوم نیە. کە بمەوێ لەگەڵ ئەو هەموو بێ مەعلووماتیەمدا لە بارەی حاجیی ئەوسا بنووسم، دەبێ بکەومە سەر لێک کردنەوەی «معمی»ی خزمایەتیی شیعرەکانی لەگەڵ ڕووداوی ئەوتۆ لێی بوەشێتەوە شیعری وەها بەرهەم بێنێ. واتە دەبێ شیعرێکی حاجی بگرمە دەست و بگەڕێم بە دوا ڕووداوی ئەوتۆ کە لە سەردەمی حاجی قادردا قەومابێ و بشێ ببێتە دایکی شیعری وەها.

تۆ سەیری چەند بێ مەعلووماتین دەربارەی ئەو ڕووپەڕەی ژیانی حاجی لە تورکیادا، تەنانەت نازانین پەیوەندییەکەی لەگەڵ بەدرخانیاندا چۆن بوە، لەگەڵ کامیان بوە، هەوراز و نشێوی ئەوان چ تەئسیرێکی دەکرد لە گوزەران و ژیانی حاجی... لێرەدا دەبێ ئەوە بڵێم چی نوویسومە دەربارەی «یەزدان- عزالدین شێر» کە گۆیا مەبەسی حاجی ئەو بووبێ لەو یەک دوو بەیتەی بە تعبیرێکی توێکڵەدار وشەی «شێر»یان تێدایە، دەمەتەقییەکی باش هەڵدەگرێ لە زۆر ڕووەوە کە ئێرە جێی لێ

دوانیان نیە، هەڵبەت لە بەشی سێیەمدا هەوڵ دەدەم پرسیاری ئەم یەک دوو بەیتە یەکلا بکەم.

کەواتە لێبوونەوە لە نووسینی بەشی سێیەم کاتێکی یەکجار دوورودرێژی دەوێ لەوەی بەشەکەی پێشوتر خایاندی.

بێگومان تەواو کردنی باسی حاجی قادر هەر بە گێرانەوەی سەرگوزەشت و ڕوون کردنەوەی گۆشە تاریکەکانی ژیانی نابێ، بە دوا ئەو ئەرکەدا ئەرکی شەرحدانی دیوانەکەی دێ کە کاکڵی فەلسەفە و بیروباوەڕی لەوێدایە. من کە شەرحی دیوانەکە و واتا و ڕاگەیاندنی شیعرەکانیم خستە دوای هەموو کارێکەوە لەو ڕووەوە بوو کە دیوانەکەی لەبەر دەستاندایە و هەڵ نایێ، خەڵقیش لە زۆر واتاکانی شارەزا بوون، چی ئێستا پێویستە بگوترێ ئەوەیە کە کەس نایزانێ یاخود بۆی نەچوە. مەتەڵ دەڵێ «بەپێیان بگرن بێ پێ هی خۆنە».

چ مەعلوماتێک و بیر و باوەڕێکی تایبەتی لە کەس نەبیستراو یاخود گۆشەنیگایێکی تازەداهاتوو بۆ نرخاندن و سەنگاندنی دەلالەتی ڕووداو هەبێ ئەوەیە «بە پێ» و ڕەنگە کە زوو نەخرێتە بەر چاوانەوە لە دەست بچێ. هەر نەبێ لەبەر ئەوە کە مومکینە خاوەنەکەی بمرێ بەر لە تۆمار کردنی... مردنیش شەرمی لە کەس نەکردوە. جگە لە مردن هۆی بەرهەڵست و تەگەر لە پێش نووسین زۆرن وەک ئەوەی بیروباوەر لەوانەن کە تۆمار نەکرێن لەبیر بچنەوە. یاخود کە کاتی لە باری تۆمار کردنیان بەسەرچوو جارێکی تر هەل دەست ناکەوێتەوە. وا دەبێ لە بیریش نەچونەتەوە و هەلیشیان لە دەست نەچوە کە چی خاوەنیان هێزی نووسینی کەم بۆتەوە... هتاد.

بە دوا شەرحدانی دیوانەکەی، پەراوێزەکانی حاجیش بە دەوری ڕووپەرەکانی کتێبی «سیوطي» داخوازی خەریکبوونێکی گەورە دەکا. بە ڕاستی ئەم پەراوێزانە (حاشیە) گەنجێکن لە حاجیەوە بە جێماون ژووررووی هەموو نرخێک.

بڕوا دەکەم وا دەبێ لەو حاشیانە تووشی هی وا بێیت زیاتر لە شیعرەکانی بە حاجیت بناسێنێ و لەو ڕووەوە کە شاعیر لە کاتی شیعر داناندا ئارایشتدانی خۆی لە بیر ناچێ، واتە شەخسیەتی و دڵ و دەروونی دەکەوێتە ئەودیو پەردەی ئارایشتەوە، بەڵام فەقێیەک کە حاشیە دەنووسێ یاخود حاشیە دادەنێ ئاگای لەو لایەنەی خۆ

ڕازاندنەوە نامێنێ بەو پێیە حاشیەکەی گەلێک سادەتر و لە خۆی نزیکتر دەبێ تا شیعرەکەی... خۆ هەر نەبێ حاشیەکان بە خەتی حاجی نووسراونەوە، خەتیش ڕابەرێکە بۆ ناو دەروون.

پوختەی گوتار ئەمەیە تێکڕای نووسین لە بارەی حاجیەوە، کە بە تێر و پڕی بکرێ، کارێکی ئینسایکلۆپیدییە. ئەو هێندەی من تا ئێستا نووسیومە شتێکی سەرەتاییە، جارێ با بکرێ بە دیارییێکی هەژارانە بۆ یادگارێکی دەوڵەمەند.

«...»

**سپاس**

کارێکی کەمم کردوە و زۆری تێدا قەرزدار بووم بەو چاکەی دۆست و دڵسۆزان بۆیان کردووم:

جارێ لە پێشەوە دەبێ ئەوە بڵێم ئەگەر ئەرکی دەیان ساڵی بێوچانی خوشکم «یا نەجیبە» نەبا بەشی هەرە گرنگی کەلەپۆری کۆچکردوان کە لای ئێمە ماوە هەمووی دەفۆتا. ساغ کردنەوەی گەلێک حاشیە و نووسینی وردیش کە خەبەری مێژوویی وەیا دەلالەتی بێ گرفتی لێ وەرگیراوە کردەوەی بێهاوبەشی خۆیەتی. بەداخەوە بەرهەمی هەرە زۆری کردوکۆشی بیست ساڵەی دوای مەرگی باوکم لە کەینوبەینی هاوینی 1963 دا بوو بە خۆراکی ئاگر، وەک کوردستانی ئەوسا، ئەوەی سووتا بەنیسبەت ئەوەی ماوە وەک ڕووبار و جۆگەلە وایە، لە ژووروووی نرخاندنەوەیە، کەلێنیشی بە هیچ شتێک پڕ نابێتەوە.

جگە لە یا نەجیبە، لە خزمانی خۆم، کاک مەجید و حەمە عەلی ئامۆزام چی لە دەستیان هاتوە بۆیان کردووم لە وەدەست هێنانی وەرامی ئەو پرسیارانەی هاتوونە بە نووسینەکەم. لەوەدا تەواوێکیش ئەرک و زەحمەتی هەمەچەشنەیان کێشاوە.

مەلا قادری کانی دەربەندی، کە دۆستی خۆم و فەقێی باوکمە، گەلێک لە پێویستی دۆستایەتی زیاتری بۆ کردووم. پەرۆشێکی برایانەی بێگەرد وای کردوە هەندەم بۆ ماندوو بێ… هەر ئەو بوو نامیلکەی مەلا عەبدولڕەحمانی بۆ وەرگرتم لە مەلا ئەنوەر و درەختی خانەوادەی حاجی قادری خستە جغزی ئیمکانەوە. جارێکی دیکەش چاکەی خۆی گەیاندە ئەو دیو سنووری برایەتییەوە بەوەدا کە دوای چەند جارێک سەفەر و هاتوچۆ بۆ باڵەکاتی کتێب و دەستنووسی نایابی مەلا «ئیبنو ئادەم»ی بۆم وەرگرت لە «مەلا وەیسی»، کە نەوەی «ئیبنو ئادەم»ە. بەو کتێبەش ئەسڵی نووسینەکەمی دەوڵەمەند کرد دەربارەی ڕووپەڕێکی گرنگ لە ژیانی حاجی قادر کە پەیوەندی هەیە بە مەلای ئیبنو ئادەمەوە. ئەم ماجەرایە لە بەشی دووەمدا دێتە بەرچاوان.

مەلا عەلی حاجی تۆفیق و مامۆستا جەلال حەمەد و شێخ جەمالی سەید ئەحمەد و مامۆستا حەمەدەمین مەعروف و یەکێک لە بنەماڵەی شێخ ڕەحیم، کە نامەکەی ون

بوە و ناوەکەیشی لەگەڵ نامەکەی لێم پەنهانە، بە پێی توانایان وردە خەبەرێکی کە لایان هەبوە بە نامە بۆیان ناردم.

خوالێخۆشبووی مامۆستا «صابر اسماعیل» چراییێکی بۆ ئەم نووسیینە هەڵکردووە بەوەدا کە خۆی یەک لە شایەدەکانی قسەی مەلا شێخ کەریم بوو لە هەبوونی دوو شاعیر بە ناوی حاجی قادر، هەر خۆیشی ڕاگەیەنی چوارینەییێکی «کەیفیی جوانڕۆیی» بوو، بە موناسەبەی جێگەی لە بەشی دووەمدا دەیخوێنیتەوە... ڕەوانی شاد بێ.

خێرەومەندانی تریش کە هەبن و یارمەتییان دابم دەبێ ببورن کەوا لێرەدا ناویان نەهاتۆتە ناوەوە بەهۆی بیرچوونەوە، نەک هۆیەکی تر.

لە براگەلی سەربە «کۆری زانیاری کورد»یشەوە سیاسی مامۆستا هەژار و دکتۆر کەمال مەزهەرم بەسەر شانەوەیە کە هەر یەکەیان لە لای خۆی و مەیدانی تایبەتی دەسەڵاتیەوە بۆ وەرامی هەموو پرسیارێکم و هەڵگرتنی ئەرکی هەر خواهشتێکی کردبێتم لە خۆم ئامادەتر بوون.

«...»

**پێشەکی و ڕوون کردنەوە**

هەروەک لە پێشەکییەکەی بەشی یەکەمی ئەم نووسینەدا ڕوون کرایەوە، لە سەرەتاوە تەمای دانانی کتێب نەبوو، لە هیچ ڕوێکەوە لە خۆم ڕانەدەدیت ئەرکی کتێبدانان بخەمە ئەستۆی خۆمەوە بە تایبەتی لە بارەی یەکێکی وەک حاجی قادر کە پایەی حورمەتی بێهاوتای لە مەیدانی کوردایەتیدا داوای تەواوی و بێ کەموکەسری دەکا لەو کەسە بیەوێ ئەوەندە بەرز بێتەوە چەشمەندازی بە سەر ئاسۆی هەرەبەرزی ژیانی ئەو مرۆڤەدا بشکێ. تەواوی و بێ کەموکەسریش مەرجی یەک دوو بابەت نیە لە کاری هەمەچەشنە و پێداویستی نووسیندا:

- کاتی بەرفرەوان،
- زەرفی لەبار،
- کەرەستەی تێر و پڕ،
- دەرفەتی تۆژینەوە لەو جێگا و سەرچاوانەی پەیوەندییان بە نووسینەکەوە هەیە،
- ئیمکانی گەیشتن بەو کەسانەی شتێک دەزانن لە بارەی مەوزووعەوە،
- ئاو و هەوا (مناخ)ی سازگار بۆ دەربڕینی بیری سەربە ڕامیاری و ڕۆشنبیری و ئابووری و باوەڕ... هوە ئەمجا
- دەسەڵاتی ئەدەبی و زانستی و هێزی خامەی نووسەر.

کە بتەوێ، دەتوانی مەرجی تریش بخەیتە سەر ئەم مەرجانە کە وا تێکڕایان نووسین دەوڵەمەند دەکەن و نووسەر دەگەیەنن بە پلەی دڵنیایی و ئەو مافەی پێ دەدەن لە خۆی و لە نووسینەکەی ڕازی بێت.

هەروەک درێژە کێشانەوەی نووسینەکەم لە گوتارەوە بۆ بارستی کتێب عەیبی نەبوونی ئەو مەرجانەی دەرخست، دابەشبوونیشی بۆ چەند جزمێک، لە لاوە عەیبێکی تازەی چاوەڕوان نەکراوی خستە ناو بەشی یەکەمەوە: لە بەشی یەکەمدا چەند جاران بەڵێنم داوە کە ئەم گوتەیە و فلانە ڕایەم دواتر ڕوون بکەمەوە بەو تەمایە کە هەموو نووسینەکە بە جارێک لە چاپ دەردەچێت. کەچی بەشی یەکەم بەسەر چوو بەر لەوە بگەمە ئەو شوێنانە کە بەڵێنەکانی تێدا بەجێ دەهێنران، بۆیە بە ناچاری شی کردنەوەی چەند باسێکی بەشی یەکەم کەوتە بەشەکانی ترەوە.

پێویستم نەدیت لیستەیێک ئامادە بکەم دەست نیشانی ئەم باسانە بکا و جێگای ڕوون کردنەوەیان لە بەشەکانی تردا دیار بخا: نەختێک چاوپۆشی لە خوێنەرەوە ئەو کەلێنەم بۆ پڕ دەکاتەوە.. لێرەدا بۆ مەبەسی ڕوون کردنەوە تەنها ئیشارە بۆ یەک دوانێک لەو بەڵێنانە دەکەم:

لە لاپەڕەی 175 ی بەشی یەکەمدا بەڵێنی تۆیژینەوەی هۆی دابڕانی ئەدەبی ئەدیبی کورد لە ژیانی ڕۆژانەی گەل دێتە بەر چاو.

لە لاپەڕە 309 ی هەمان بەشی یەکەم گوتوومە لە جێگەی مناسبدا لە سەر مەدحەکەی حاجی قادر بۆ ئەمین ئاغا دەدوێم.

کەچی ئەم دوو بەڵێنە و گەلێکی تریش لە بەشی یەکەمدا بێ سەر و سۆراغ مانەوە لێرە بەدواوە پێ بە پێ و جێ بە جێ وەک قەرزی نەخوراو دەیان دەمەوە، داوای عوزرپەزیریش لە خوێنەری خۆشەویست دووبارە دەکەمەوە.

لەوانەیە خوێنەر لێم بپرسێ، هەقیشیەتی، و بڵێ تۆ کە هێندە بە شکایەتی لە دەست بێماوەیی و بێدەرفەتی و بێکەرەستەیی و بێ هەموو شتێک چۆن ملت نایە بەر ئەم نووسینە پڕ گرێوگاڵە و بەم جۆرە نەفەس درێژانە بە چوار لایدا دێیت و دەچیت و هەر جارەش هەنگاوتی تێدا فرەوانتر دەکەیت؟

دەمەوێ خوێنەر لێم بسەلمێنێ چی دەیڵێم لە بارەی بێدەرفەتی و بێ هەموو شتێک... ڕاستیی بێفێڵە. لەوە گەڕێ کە نەمتوانیوە، ڕەنگە هەر نەشتوانم، لە کوردستانی ئێران و لە تورکیا و ئەستەمبۆڵدا چ تۆژینەوەیێک بکەم، یا بە گەشت و گەڕان تێیاندا چی ماوە لە خەبەر و ئەسەری حاجی، بهێنمە بەر دەست: بۆم نەلوا لە باڵەکەتی هیچی نوێ لە ئەحواڵی حاجی بخەمە سەر ئەو کەمتاکورتەی خەبەراتی ژیان و خوێندنی لەو مەڵبەندەدا. لەوە زیاتر کە لەو تحقیقاتەدا هەندێ خەبەر و چەندوچۆنی زانایی و شەخسیەتی مەلای «ئیبنو ئادەم»ـم بۆ ڕوون بۆوە و بەوەدا یەکێک لە سەرچاوەکانی پێ گەیشتنی حاجی قادر لە جاران زیاتر کەوتە بەر تیشکی ناسراوی، هەرچی زانینێک هەیە کە ڕاستەوخۆ لەگەڵ حاجی قادردا پەیوەندی هەبێ نەکەوتە کەشکۆڵی سواڵ و سەدەقەمەوە: بەر لەو تۆژینەوەم چەندم دەزانی لە ژیان و خوێندنی حاجی قادر لە باڵەکاتیدا هەر ئەوە مایەوە بۆ خەرمان و داهاتم و یەک دانەی نوێی لێ زیاد نەکرا... زۆر بەداخەوە.

کۆشام بۆ وەدەست هێنانی وێنەیێکی خراپگەی «گۆڕقەرەج»، بەڵێنیشم وەرگرت لە دۆستێکی خۆم، کە خزمی حاجی قادریشە، بەڵام وا هاوینی دووەم ڕادەبرێ بەسەر ئەو بەڵێنەدا و «همان حیرت روزن باقیست» بە دیار چاوەنۆڕییەوە.

ویستم خەریتەیێکی ئەو شوێنانەی کوردستان «بە ڕادان بدەم» کە حاجی ژیان و خوێندن و گەشتی لێ کردوون، دەستم بە هیچ پنجێکەوە بەند نەبوو.

لەوەش کەمترم داخوازی کرد: گەڕام بە دوای خەریتەیەکدا کە ئاواییەکانی باڵەکاتی و هاوینەهەوارەکانی وەک «سینگوڕە، ئاوی پرژ و گۆلەشین، گەرووی شێخی، هەواری گورگ و شێران...» بگرێتەوە کە هەموویان ناویان هاتووە لە شیعری حاجیدا، کەچی لە بەختی کەچم لە نێوان 60- 50 خەریتەی سەرلەبەری کوردستانی عێراق کە وا ورد و درشتی هەموو شار و ئاوایی و شاخ و دۆڵ و چاک و پیری ئەو ناوەیان تێدا تۆمار کرابوو، تەنها ئەو پارچە خەریتەیە بزر بووبوو کە بەر باڵەکاتی دەکەوت. بەڕاستی لەمەدا هەر دەتگوت قەزاوقەدەر بەرهەڵستیم دەکا. پارچە بە پارچەی ئەو خەریتانە، بگرە لە حەمرینەوە تا هەموو لایێکی کوردستانی عێراق، وڵاتیان دەدا بەر خۆیان و پێ بە پێ و جێ بە جێ دەیان خوێندەوە و هەر لە شاری گەورە و شاخی بەرز و ئاوی زۆرەوە تا هۆرەمەڕ و گردۆلکە و کوێراوی بەهارانیان دەگرتەوە و چییان نەدەهێشتەوە بۆ پرسین لەم و لەو، بەڵام وەک ئەوەی دەستێکی غەیبی هاتبێ و بە مەقەسێکی ئەفسووناوی بۆ مەبەستێکی تایبەتی خۆی مەقەسکاری کردبێ بەم جۆرە ئەم پارچە و خەریتەیەی هەرێمی باڵەکاتی لەوانی تر بڕابۆوە و لێیان دەرکێشرابوو و لەناو چوو بوو. وای کە لەم ڕووداوە نالەبارە وەتەنگ هاتم، بەڵام بێسوود...

با پێت بڵێم چۆن لەگەڵ ئەم هەموو بێماوەیی و بێکەرەستەییەوە توانیم دەست بە نووسین بکەم و لە سەریشی بەردەوام بم! چەند هۆیێکی بنجی هەیە یارمەتی منی داوە لەم مەیدانەدا:

یەکەم: نزیکی لە حاجی قادرەوە بە بۆنەی «کۆیی»بوونمان و هاوڕێیی ئەو لەگەڵ باپیرمدا.

دووەم: عادەت گرتنم بە سەرنجدان لە واتای ئاشکرا و نهێنی ئەو شتانەی دەیان بینم وەیا دەیان خوێنمەوە کە وا بە زۆری و گەلێک جاران پەردە لە سەر واقیعی شرایەوە هەڵدەدەنەوە و ئازادیشم دەکا لە ملکەچ کردن بۆ غەڵەتی پەرەسەندوو.

سێیەم: ڕەهابوونم لەو بڕیارە پێشەکییانە کە وا خۆ لکاندنی دەروێشانە بە باوەڕی حازر بەدەستەوە دەیانکا بە ئایەتی قورئان و ئینجیل و جغزی تەقدیسیان بە دەورەدا دەکێشێت و لە ڕەخنە و هەڵسەنگاندنیان دەر داوێت. بەلای منەوە ئادەمزاد لە هەموو فەلسەفە و باوەڕێک بەنرختر و بەشەرەفترە و ناشێ و نابێ بکرێ بە بەندەی باوەڕ. لەو تاریکستانە ڕەشتر و ئەنگوستەچاوتر نییە کە مرۆڤ، وەک بەرخ، ڕام بکرێ بۆ کاوێژ کردنەوەی تاکە یەک باوەڕ و تفاندنەوە و هێنانەوەی هەرچی باوەڕێکی هەیە غەیری ئەو.

چوارەم: بەیەکەوە ژیانێکی گیانی و فکری دوور و قووڵم لەگەڵ تێکڕای شیعر و کەلەپۆر و دەنگ و باس و خەبەراتی حاجی قادردا کە ڕێگام پێ دەدا، زیاتر لە یەکێکی نائاشنا، بۆ زانینی ئەو هۆیە بزوێنەرەی فڕکەی بە دەمارەکانی خستووە و هەناسەی گەرم داهێناوە و دڵی هەژاندوە و خوێنی کوڵاندوە و ڕازی کردوە وە یا ڕقی هەڵستاندوە.. تۆ کە ماوەیێکی درێژ لەگەڵ مەوزووعێکدا ژیایت و لێی ورد و قووڵ بوویتەوە هەست دەکەیت، لەگەڵ درێژبوونەوەی کات، ڕووناکاییەکی وەک هی بەیانی کە وردە وردە تاریکی شەو دەڕەوێنێتەوە، پێبەپێ دەکشێت بە سەر گۆشە تاریک و نهێنی و نەزانراوەکانی مەوزووعەکە و لە بەر چاوی دەروونت ڕۆشنیان دەکات.

لەگەڵ ئەم بەیەکەوە ژیانەدا مەلابوونی حاجی قادر سەرلەنوێ تێگەیشتنی کردار و گوتاری ئەوی بۆ من ئاسانتر کردەوە لەو ڕووەوە کە خۆم لە دەوروبەری مەلایاندا ژیاوم و شارەزای ژیانی فەقێ و مەلا و دەرس و دەور و ڕاتبە و گەشت و گەڕان و گەرمێن و کوێستانیان هەم و هەرچەند بۆخۆم خوێندنی فەقێیانەم نەبوە و لە سێ مانگێک بەولاوە سەری خوێندنم بە کتێبی مزگەوتدا نەگرتوە، ئەویش لە هەڵکەوتێکی تایبەتیدا لای باوکم... ئەو حوجرەی مزگەوتی گەورە و مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەد لە کۆیێ کە حاجی قادر دەرسی تێدا خوێندووە، بۆخۆم دیومە چەندین مەلا و مستعد و فەقێ ئالێ دەلێ بابەیان تێدا کردوە، کوچکە و کەڵەکێکی لە هاوینەهەواری چنارۆک کە کاتی خۆی حاجی قادر دارکەپر و ساباتی بە سەردا

ڕایەڵ کردوون منیش بە هاریکاری فەقێ و مستعدەکانی باوکم دارکەپر و ساباتم بە سەردا تەنیونەوە لەگەڵ چروو و گەرا و دەراوی چیا و دەشت و چەمەڵانی ئەو ناوە. تۆ کە لە نامەکەی حاجی قادر بۆ باپیرم ئەم بەیتە دەخوێنیتەوە:

لە خۆم ئاگر هەڵێنم وەک «چنارۆک»
لە چاوم گریە دەر بێ وەک «حەمامۆک»

لە موناسەبەی «ئاگر هەڵێنان» و ناوی «چنارۆک» هەر هێندەت بۆ مەعلووم دەکرێ کە وا وشەی«چنارۆک» ئاگری هەڵێناوە چونکە «نار»ی تێدایە، بەڵام ڕەنگە هەرگیز گوێ بیست نەبووبیت ئەفسانەیەک هەیە دەڵێ چنار کە زۆر پیر بوو لە خۆوە ئاگر دەگرێ. ئەمانەشت زانیبێ ئیمکانت نیە وەک من بە چاوی ئەوسای حاجی قادر سەیری چەشمەندازی چنارۆک بکەیت و سۆزی ئەوسای ئەوت ببزوێ بۆ چنارۆک وەک ئێستاکەی من.

بەنیسبەت منەوە ئەو کات و ئەو جێگایانەی حاجی قادریان تێدا ژیاوە هەر خۆیان بوون و نەگۆڕابوون کە من چاوی ژیانم لەم جیهانە هەڵێنا. جۆری ژیان و ڕابواردن و کۆڕی دەرس و بانگ و نوێژ و جومعە و هەموو سەروبەرێکی ئەو ژیان و ڕابواردنەی باوکم بە دوو چاوی خۆم دیون درێژەیێکی ئاسایی و سەد لە سەدی ڕۆژگاری حاجی قادر و باپیرم بوو، تەنانەت پیاوی وەها مابوون دەهاتنە مەجلیسی باوکم کە هاوچەرخی حاجی قادر بوون.

من بێ زیاد و کەم شیرمژی ئەو ئاو و هەوا و دەوروبەرە بووم کە حاجی قادر فەرچکی پێ گرتبوو، لەمەشدا چ هونەرێکی خۆم باس ناکەم، ڕێکەوتت بۆ دەگێڕمەوە کە بۆ من هەڵکەوتوە و بۆ تۆ نا! دەمەوێ بۆت مەعلووم بێ بەشێکی ڕووناکایی نووسینی من کە حاجی قادر ڕوون دەکاتەوە دووبارەبوونەوەی تیشکی خۆیەتی لە ئاوێنەی چەشنی ژیان و دەوروبەری مندا، واتە حاجی قادر لە ڕێی منەوە خۆی خۆی ڕوون دەکاتەوە.

نەشارەزابوون لەو کەسە کە دیراسە دەکرێت، بە زۆری، خاوەنی دیراسەکە بە سەهوو دەبات. نووسەری ئەورووپاییم دیوە باسی مرۆڤێکی ڕۆژهەڵاتی کردوە و قسەکانی ئەو مرۆڤەی بە ڕواڵەت وەرگرتوە و لەو ڕواڵەتەوە بڕیاری چەندوچۆنی و

چاکە و خراپەی مرۆڤەکەی داوە، لەمەشدا هێندە لە ڕاستی دوور کەوتۆتەوە وەک ئەوە بوە کە بە ڕەش بڵێ سپی یاخود کورت بە درێژ لە قەڵەم بدات. ئەم نەشارەزاییە یەکێکە لەو هۆیانەی وا دەکا هەندێ نووسەری کورد جارجارە حاجی قادر بکەن بە خزمەتکاری دەرەبەگ و ناوەناوەیەکیش بیخەنە پێش موزاهەرەی ڕەشوڕووتانەوە.

پێنجەم: نیگا و بینینی تایبەتی خۆم کە بریتییە لەوە جیهان بە شتێکی یەکگرتوو و سەرانسەر دەبینم و کەرت و بەش و پارچەکانی لەبەر چاوم لە یەکتر ناپچڕێنەوە، ئەمەش وا دەکا درەنگتر لە یەکێکی تری وەک خۆم بگەم بە کۆتایی شی کردنەوە و پێچانەوەی مەوزووع، لەو ڕووەوە کە ماوەییێکی تەواو لە پەراوێزی هەموو مەوزووعێک لەگەڵ مەوزووعەکانی دەوری خۆی تێکەڵ و بەیەکەوە بەستراوە و داوەمووییێک نابێ گردەبڕ لە یەکتریان جودا بکاتەوە.

شەشەم: سەرەڕای تێکەڵبوون و بە یەکەوە بەسترانەوەی مەوزووعانەوە کە ناچارم دەکات بەردەوام بم لە کوتانەوەی ئەو میقدارانەیان کە وا لەگەڵ ئەسڵی مەوزووع تێکەڵن، ڕوون کردنەوەی مەبەس بە تەواوی بەرهەم نابێ ئەگەر دەوروپشتی ڕوون نەکرێتەوە. بە نموونە دەڵێم کە گوترا ڕووسیا و ئەمریکا تەنها دوو دەوڵەتن ئاسمانگەردییان کردبێت و گەیشتبنە ناو مانگ، ئەم گوتەیە وەک مەتەڵ خۆ دەنوێنێ و هیچ شارەزامان ناکا بەو هۆیانە کە وایان کردوە هەر ئەم دوو دەوڵەتە کاری وا گرنگ بکەن ئەگەر زێدە هێز و سامان و تەکنیک و زانستی ئەمان و ئەرکی یەکجار سەختی ئاسمانگەردی بەباشی ڕوون نەکەینەوە. نموونە لەمەش ئاشکراتر هەیە بۆ ڕوون کردنەوەی مەبەس: زوربەی خەڵق دەڵێن لە سووڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆیدا شەو و ڕۆژ پەیدا دەبێ، ئەمەش گوتەییێکی ڕاستە و هێندەی بدیهیە ڕوون بۆتەوە بۆ ئەوانەی شارەزای زانستی فەلەکن، بەڵام گومانت نەبێ بەشی هەرە زۆری خەڵق لە ڕاستە قسەکە بەولاوە کە وەک تووتی دەیڵێنەوە هیچ چەندوچۆنێکی مەسەلەکە نازانن و هێندە لێی نەشارەزان ئەگەر پێیان گوترابا نەسووڕانەوەی زەوی هۆی شەو و ڕۆژە ئەویشیان دەسەلماند و دەیانگوتەوە. خۆ مەعلوومە هەزاران ساڵ بوو هەر ئەوە دەگوترایەوە چ لە لایەن زاناوە چ لە لایەن نەزانەوە...

ئێستاکەش زوربەی دەرچوانی زانکۆکان نازانن هۆی نهێنی چیە لەوەدا کە وا سوورانەوەی زەوی بە دەوری خۆیدا نزیکەی 23 سەعات و 56 دەقیقە دەخایێنێ بەڵام شەو و ڕۆژ 24 سەعاتی تەواوە؟ ئەم تفاوتی نزیکی چوار دەقیقەیە لە میانی کاتی پێویست بۆ سوورانەوەی زەوی بە دەوری خۆیدا لەگەڵ کاتی پێویست بۆ ئاوابوون و هەڵاتنەوەی ڕۆژ تا دەگاتە سەر کەلی ڕۆژئاوا، ئا ئەم تفاوتە لە کوێوە هاتوە؟ چۆن دەشێ درێژایی شەو و ڕۆژ 4 دەقیقە زیاتر بێ لەو کاتەی پێویست بۆ سووڕی زەوی بە دەوری خۆیدا لە حاڵێکدا دەزانین شەو و ڕۆژ لەو سوورەی زەوی پەیدا دەبێ؟ لە زاهیردا ئەم گوتەیە وەک ئەوەیە بڵێی شەو و ڕۆژ 4 دەقیقە لە خۆی درێژترە، کەچی گوتەکەش ڕاستە و هۆیێکی زۆر ئاشکرا و بەرچاویشی هەیە بەڵام چاومان وەک شەوکوێرە نای بینێ...

نووسەری عادەتیی وەک من و تۆ شتی وەها دەنووسێ هەڵە و ڕاستی هەڵ بگرێ و سەلماندن و نەسەلماندنی بە بەرەوە بێ، خۆ من و تۆ نە شێخی تەریقەتین، نە سەرۆک نیقابەین، نە پێشەوای سیاسەتین چی بیڵێین بێ بەڵگە و هۆی ئیقناع کردنیش بێ پەیرەوەکانمان بڵێن سەددەق. بەڕاستی ئەگەر شتی بێگومانیش بڵێین هەر بە زەحمەت لیمان قبووڵ دەکرێ چ جایی ئەوەی شتی ئەوتۆ بڵێین پێویستی بە بەڵگە هەبێ و لەگەڵ بیر و باوەڕی تردا پێک کەوتنەوە و تێک هەڵقژانی ببێت.

لەمەوە بۆت دەردەکەوێ گوتەیێکی من بیڵێم و بینووسم ئەگەر خۆی لە خۆیدا سادەش بێ، دەبێ لەگەڵ بەڵگە و هۆ و شەرح و شی کردنەوەی تەواو پێشکەش بە خوێنەران بکرێ، ئەوساش کۆسپی گەورە و سەختی نەسەلماندن و بە هەڵە دەرچواندن و درۆ خستنەوەی هەر لە پێش دەمێنێ. لە ژیانی ئاساییمدا دووچاری هەڵکەوتی وەها بووم هێندە نالەبار بوە لە جیاتی دڵگیری پێکەنینی بزافتوە، وەک ئەوەی بڵێم ئاوی شاخەکانی کوردستانی عێراق دەڕژێنە دەشتاییەکانی ناوەڕاست و بەرەو خوارتر، ئیتر یەکێک لێم بە دەنگ بێ و ئیعتیرازم لێ بگرێ بەوەدا کە بڵێ: چۆن دەڕژایە ئەو دەشتانەوە ئەگەر شاخەکان بەرزتر نەبوونایە لە دەشتەکان.. چۆن دەگەیشتنە بەسرە ئەگەر «شط العرب – یەکاوی عەرەب» ڕووی لە شوێنێکی تر کردبایە... چۆن ئەو ئاوانە پەیدا دەبوون ئەگەر باران زۆر نەباریبایە.. چۆن.. چۆن و چەندین«چۆن»ی تر کە هیچ یەکێکی نرخی فلسێکی نیە و بە قەدەر ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا لە گوتەکەی من دوورن و لەوە بەولاوە کە خاوەن «چۆن»ەکان بیر و ڕای

سیاسی لەگەڵ هی من جودایە و ئەمە بۆ ئەو بەسە خۆ دژ بنوێنێ لەگەڵ هەر شتێکی من بیڵێم با ئەو شتە بەڵگەنەویست (بدیهیە)یش بێت هەرچی هۆی بەرهەڵستی هەیە پەیدا نابێ... خۆ ئەگەر من شێخی تەریقەتی سیاسی ئەو بام و بمگوتبایە ئاوی«شط العرب - یەکاوی عەرەب» سەرەژوور دەبێتەوە بۆ بانی ئەنەدۆڵ ئەوسا بێگومان پەنجەی شادەی بەرز دەکردەوە و دەیگوت ئەشەدەم بیللا ڕاستت فەرموو بەڵام خەڵقەکە نەزانە و تێی ناگا.

نووسەر تا نەبێتە جێی متمانی و باوەڕ پێ کردنی خوێنەران ناتوانێ بەئاسانی ئیقناعیان کات، یاخود هەر بەجارێ و هەتا هەتایێ ناتوانێ. متمانی و باوەڕ پەیدا کردنیش، بەزۆری، لەوەوە دێت شتێک بنووسێ و بڵێ کە لە پێشەوە بزانێ خوێنەران حەزی لێ دەکەن و ئینتیزاریی بۆ دەکێشن. دەوجا کە نووسەر لە ڕێبازێکەوە ڕۆیشت، بەرەو باوەڕی خۆیەوە، پشتی لە ڕێبازی خوێنەرانەوە بێت و لە ئاوێک مەلەی کرد خوڕگەی نەڕژێتە ئەو گۆمەوە خوێنەران مەلەی تێدا دەکەن دەبێ لە هەر هەنگاوێک و باسک لێدانێکدا ئاڵاییێکی بەڵگە بەرز کاتەوە و مۆمێکی ڕاستی هەڵ کات و زەنگێکی سۆز لێ بدات هەر نەبێ بۆ پاکانەی خۆی و نووسینەکەی..

ئەمانەی لێرەدا دەیڵێم دیمەنی بەرچاوی ڕۆژانەمانن و وەک هەناسە هەڵی دێنین و خۆراکی مەعنەویمانن. هەڵبەت من کە هەست بەو ڕاستیانە بکەم و بایەخی خۆیان بدەمێ دەبێ ئەرکی نەفەسبڕی درێژە پێدان و شی کردنەوەی بە زیادەوە و بەڵگەهێنانەوەی پێویست و نەویستی بۆ بکێشم، لەگەڵ ئەمەشدا ڕەهابوون لە توهمەی ناڕەوا و بێ بنج و بەڵگە بەولای ئومێدەوەیە. گوتەیێک و ڕاییێک ڕاستی بێ پەردە و پەناش بێ دەبێتە ئامانجی تانە و توانج کە هات و لەگەڵ میزاج وەیا بەرژەوەندی ئەم و ئەودا نەگونجا: کە من بڵێم حاجی قادر دژی خاوەن زەوی (ناوی دەرەبەگ ناهێنم چونکە ناوهێنانی هەڵەییێکی سافیلکەی مێژوویی و خوێندەوارییە بۆ سەردەمی حاجی قادر) نەبوە و خزمەتکاری دەرەبەگیش نەبوە، سەرلەبەری ئەو دوو تاقمە دەڕەنجێن کە یەکێکیان سوورە لەسەر ناوهێنانی دەرەبەگ با لەو کاتانەدا جارێ لە سکی دایکیشی نەڕسکابێ، ئەوەی تریشیان پێ دادەگرێ لەسەر هێندێ کە حاجی قادر کۆنەپەرست و نۆکەری دەرەبەگ بوە لەو بڕیارەشیدا «پێی خۆی کردوە بە هۆقە» و گوێ ناداتە شتێک ئەو دەنگە نەبێ کە

لە هەناوی خۆیدا دەجریوێنێ. کە بێم و بڵێم حاجی لە کوردستانی عێراقەوە خەباتی سیاسی نەکردوە و هەڵبەستی نیشتمانپەروەرانەی دانەناوە، بەمەشدا هەموو ئەو جوامێرانە دەتۆرێنم کە پێیان خۆشە هەوڵ بدرێ بۆ ئەوە حاجی قادر بکرێتە بولبولێکی کوردایەتیی شیرمژی کۆیێ.

من کە ئەو ڕێگایانە بگرمە بەر لە نووسینمدا خەلقم لێ بتۆرێنێ، دەبێ نووسینەکەم پشت ئەستوور کەم بە بەڵگەی ئەوتۆ خۆ لەبەر هێرشی بێئینسافانە بگرێ، ئەم بەڵگانەش بە دوو قسەی قوت و قرتاو ساز نادرێن، بە ئاسانیش نایێنە بەردەست بەتایبەتی بۆ من کە خۆت دەبینی بە ڕێبازێکدا نارۆم شوێن پێی لە خۆم بەپێشەوەی تێدا بێ نەک لەبەر دەعیە و دەماغ بەڵکوو لەبەر نەبوونی هیچ شوێن پێیەک لەو مەیدانەدا کە لە پێش چاوی زیهن و دڵ و فکری مندا ڕوونن.
ئەوەندەی نووسینم هاتبێتە بەرچاو لە باسی حاجی قادر و هەموو ئەو لاباسانە کە لەوەوە سەر هەڵدەدەن نەم دیت یەکێک لەو نووسینانە شتێکیان لێوە بڵێ کە من پێی ڕازی بم تا بیکەم بە بەڵگە بۆ نووسینی خۆم. ئەو نووسینانە یان هەر بە جارێ لەو شتانە بێدەنگن کە من دەیان بینم، یاخود بە شێوەیێک دەدوێن کە بە لای منەوە پێچەوانەی ڕاستی و واقعین...

لەبەر ئەم هۆیانە و گەلێکی تر کە پێویست نیە بە دوایان کەوین، نووسینەکەم بە ناچاری و بە جۆرێک خۆ لێ دزینەوەی لە ئیمکاندا نەبێ، درێژەی کێشا و دەکێشێت، خوێنەریش دەبێ لەگەڵم نەفەسدرێژ و بەسەبر بێ. سەرەڕای نەفەسدرێژی و سەبریش دەبێ سەیری تێکڕای نووسینەکەم بکا نەک جزمێک و دوو جزمی. ئەو درێژەدانەی کە بەنیسبەت یەک جزمەوە وەک لە مەوزووع لادان دێتە بەرچاوان، کە بخرێتە ناو پەراوێزی هەموو نووسینەکەوە دەبێتە ئەو کورتەباسە کە شی کردنەوەی بابەت داخوازی دەکات. عومر وەفای هەبێ و لە هەموو باسەکە ببمەوە، ڕاستی ئەم تێبینییە وەک بەدیهیەی لێ بەسەر دێت.

لە بەشی یەکەمدا هەندێ سەهوو دێنە بەرچاو بەڵام زیانێکی بە بیر و باوەڕەکانم نەگەیاندوە.. بەیتێکی «سالم» لە لاپەڕەی 37 هەڵەی تێدایە، ڕاستییەکەی ئەمەیە:

زستانی ئەووەڵین بوو دڕا بەرگی شێخ هەواس
ڕۆمی ئەوەندە شوومە لە شەخسیش دەدا زەرەر

لە میانی باسی حاجی بەکرائاغا گوتوومە کوڕێکی خۆی کردە سەرۆکی شارەوانی بەغدا. من بەمەدا گوتەیێکی مەشوورم باس کردوە بێ ئەوە لێی ورد بووبمەوە. هەر دوا بە دوای چاپ کردنی بەشی یەکەم لەگەڵ خۆمدا کەوتمە ڕەخنەکاری: حاجی بەکرئاغا کە لە ساڵی 1270 دا مرد کوڕە گەورەی 15- 16 ساڵی بوو، چۆن دەچێتە عەقڵەوە کوڕی سێیەم وە یا چوارەمی بەر لەو ساڵەدا، واتە پێش مەرگی حاجی بەکرئاغا بووبێتە سەرۆکی شارەوانی؟ ڕاستییەکەی ئەوەیە ئەو کوڕەی دوای مەرگی خۆی بوە بە سەرۆکی شارەوانی بەغدا بەڵام ناو و شۆرەت و حورمەتی حاجی بەکرئاغا یارمەتی کوڕەکەیان داوە لە گەیشتنی بەو پایەیە. ڕەنگە لەم بابەتە سەهوانە ئیتریش هەبێ بەڵام دەخلی بەسەر هیچ حیسابێکی ترەوە نیە و هیچ لێکدانەوە و بەراوردێکی ناو نووسینەکە هەڵناوەشێنێ.

هەروەک گەلێ جار گوتوومە لێرەدا جارێکی تریش دەڵێم خۆم لە وشەی بێگانە لانەداوە کە زانیبێتم بەو وشەیە واتا و مەبەس پتر ڕوون دەبنەوە تا وشەیێکی کوردی پەتی.

ناو ناوێک ڕستەی سەخت هاتوە بۆ ناو نووسینەکەم کە ئەمە دژی خواهیشتم بوە، بەڵام گەلێ جار وادەبێ سەختیی فکر و لێکدانەوە لەگەڵ ڕستەی ئاسان و ساکاردا ناگونجێ و نووسەر ناچار دەبێ هانا بباتە بەر ڕستەی ڕەق و گرێیاوی، ئەگەر وا نەکا دەبێ واز لە فکرەکەی بێنێ. ئەوەی ڕاست بێ بەرهەمی فکر سەر لە بەریان ڕەق و سەختن نەک هەر نووسین، ئەمەشم لە نووسینی ترمدا باس کردوە لە من بە پێشەوەش نووسەرانی تر لێی دواون، تەنانەت «توفيق الحكيم» خاوەن فکرەی «اسلوب تعادلي» لەو باوەڕە دایە کە وا بەپێی زەحمەتی و سەختی لێکدانەوە و بیرکردنەوە نووسین و «تعبير»یش زەحمەتە و سەخت دەبێ، لەمەشدا چ سەهوێکی نەکردوە.

لە لایەن ڕێنووسیشەوە پێویستە بڵێم یەک شێوەی سەرانسەر لە نووسینەکەمدا خۆی نەکردۆتە دروشمێکی بەرچاو، زۆر جاران شێوەگۆڕیم کردوە. وا بوە نووسیومە «دەت کرد» واش بوە «دەتکرد» و لەم بابەتەش گەلێکی تر. هۆی ئەم شێوەگۆڕییە لە دوو و سێیان پترە بەڵام ئەوەندە بەسە ببێتە شەفاعەتکارم کە وا تا ئێستا هێچ شێوە ڕێنووسێک یەکجارەکی نەبۆرە قەراردادە، ڕێنووسی «کۆڕی زانیاری کورد»یش کە خۆم تێیدا خاوەن بڕیارم، پیتی وەها لەباری بۆ دانەڕژاوە

هەمووی دەست بدا بۆ بەکارهێنان سەرەڕای ئەوە کە وا بڕیارەکانی کۆڕیش هەموو ڕووپێویکی نووسینی کوردی نەگرتۆتەوە، بۆیە وا بوە لە دەستووری کۆڕم لاداوە بە ناچاری.

لەم شێوە گۆڕینەی ڕێنووسدا هەرچەند هەستی نارەحەتی دەکەم بەڵام ئەوەندەش دەزانم کە وا تا ئەو ڕۆژەی ڕێنووسێک دەبێتە یاسای یەکجارەکی شێوەگۆڕی نابێتە خەوش وە یا جێی گلەیی.

بەهەمەحاڵ مەبەستی یەکەم لە نووسیندا خۆش خوێنییە، هەوڵی کۆڕ وە یا لایەنێکی تریش هەر ئەمەیە ڕێبازێک بۆ نووسین تەخت کا زیهن و چاوی خەلقی تێیدا ماندوو نەبێت، چاوەدێری دەستوورەکانی زمانیشی کردبێت. ئومێد دەکەم ئەو ڕۆژە بەچاوی خۆمان ببینین سەیرمان بێتەوە لە سەرسوڕکێ و سەرلێشێوانی ئیمڕۆ بە دەوری ڕێنووسەوە.

قسەیێکی تایبەتیم هەیە لەگەڵ ئەو «گوڵێ»یەی کە حاجی لە «دەشتی بەهەشتی لاجان» چاوی پێی کەوتوە و دڵی بۆی چوە. من لە بەشی یەکەمی نووسینەکەمدا وام ڕانواندوە کە وا کچی حەمەد ئاغای قەرەنی ئاغای مامەش بوە. ئەم بڕیارەم لەوەوە هاتوە کە «گوڵێ» کچی ئاغای مامەشان بێ، چونکە مامەش چ ئاغاییکیان نەبوە ناوی «قەرەنی» و لە سەردەمی حاجی قادردا لە عومرێکدا بووبێ هەڵی گرتبێ کچێکی وەک گوڵێی بووبێ. قەرەنی ئاغای مامەش 30 ساڵێک دەبێ مردوە و لە عومری 75 ساڵیشدا مرد. بەو پێیە ئەو هێشتا لە دایکی نەبوە کە حاجی چاوی بە گوڵێ کەوتوە. کەواتە کە گوڵێ مامەش بێ نابێ کچی قەرەنی ناوێک بووبێ لە مامەشان. بەڵام لەم یەک دوو ساڵەی دواییەدا ڕیوایەتی ترم کەوتە بەر گوێ کە دەڵێ «گوڵێ» کچی «قەرەنی ئاغای پیران» بوە، ئەم ڕیوایەتەش پتر بە سەر زارانەوەیە و لە خەلقی واشم بیستوە پەیوەندی عەشیرەتی و هاتوچۆی ساڵانەی مەڕداری لەگەڵ باڵەکاتی و هاوینە هەوارەکانی کوردستانی ئێران هەیە. کەواتە ئەو ئیحتیمالی کە «گوڵێ» لە عەشیرەتی پیران و کچی قەرەنی ئاغای پیران بووبێ بەهێزتر لە هی ترە.

پیران و مامەش، هەردوو عەشیرەت لە دەوروبەری لاجاندا دەژین، وەک دەشبینی ناو «قەرەنی ئاغا» لە هەر دوواندا پەیدا دەبێ، لەوەوە تێکەڵ پێکەڵی لەو

حیکایەتانەی سەربە هەر دوو لایاندا دەگەیەنێ شتێکی ڕەچاو کراوە، بەتایبەتی بەسەرهاتەکان دەماودەم دەگێڕنەوە و کەس تۆماری نەکردوون تاکوو شێواوییان تێدا پەیدا نەبێ. ئەم ڕوون کردنەوەیەم بە پێویست زانی لە ڕووداوێکدا کە پەیوەندی بە حاجی قادرەوە هەیە و پرێشە لە هەست و تاسە.

یەک شت ماوە لەم پێشەکییەدا پێتی بڵێم، دەبێ وەک مزەی دەست خاوێنی (أمانة) لێمی تەحەمول بکەی: سەرلەبەری بەشی یەکەم و بەشی دووەمی ئەم نووسینە لە ئازار و نیسانی 1972 دا گەڵاڵە کرا، لە هاوینی هەمان ساڵدا بەشێکی نووسینەکەم پاکنووس کرد. لەوە بەو لاوە ناو ناوێێک نەبێ چ دەسکاریم تێدا نەکردوە. ئەوەندە دەسکارییەی کە کراویشە شتێکی زۆر کەمە و گۆڕینێکی نەکردوە لە بیر و باوەڕی هەوەڵ جارم. چی ماوە لەو هێندەی پاکنووس کراوە لە جزمێکدا جێی نابێتەوە، بەناچاری و لە ترسی درێژەکێشان و زلبوونی لەحەدبەدەر، بڕیارم دا بایی جزمێک لەو پاکنووس کراوە بکەم بە بەشی دوەم، چەندی دەشمێنێتەوە لەبەر جزمی دوەم لەگەڵ ئەوەندە گەڵاڵەی کە وا تا ئێستا نەپرژاوم پاک نووسی بکەم بکەوێتە بەشی سێیەمەوە، بە مەرجێک پاکنووس کردنی گەڵاڵەکە ئەوەندە درێژ نەبێتەوە لە قەواڵەی جزمێکدا جێی نەکرێتەوە. بەهەمەحاڵ پاکنووس کراو و گەڵاڵە، تێکڕایان خەریکی ئەو قۆناغەی ژیانی حاجین کە وا لە کوردستانی عێراق و ئێرانی ڕابواردوە، جارێ یەک وشەم نەنووسیوە لە ژیانی ئەستەمبۆڵی. با بزانین چرای خەباتی حاجی بۆ کوێمان دەبا!

«...»

## حاجی قادر و گەشتی خوێندن

بەشی دووەمی ئەم نووسینە لەو کاتەوە دەست پێ دەکا کە حاجی قادر بە هاوڕێیی باپیرم، حاجی مەلا عەبدوڵا، لە کۆیەوە بەرەو باڵەکەتی ڕۆییوە بۆ تەواوکردنی خوێندنەکەی، بەڵام لە میانەی گەیاندنەوە یەکتری جەمسەری ئەم دوو قۆناغە جوداوازە بەرچاوەی ژیانی حاجی، وەک تەقەڵی دەزووی مشترک لە میانی دوو پارچە کوتاڵ، وردە باس و خواسێک ماوەتەوە لە بەشی یەکەمەوە بۆ بەشی دووەم، وردە وردە لەگەڵ بەسەرچوونی سەرەتاکانی بەشی دووەم، لێیان دەبمەوە. ئەم وردەباسانە کە لێرەدا دەبنە جەمسەری میانی دوو قۆناغی جوداواز، بە ئەسڵ درێژەی یەک باس و ڕەوتی یەک گەشت بوون، دابەش کردنی نووسینەکە بۆ چەند جزمێک شێوەی جەمسەری پێدان. هەر ئەم دابەش کردنەشە وا دەکا خوێنەر سەیری بێتەوە لەوەدا کە وا یەکەندەر دوو بە دوا عینوانی «حاجی قادر و گەشتی خوێندن»دا ناچمە ناو باسی گەشتەکەوە. کە بێیت و ئەم بەشەی دووەمە بکەیتەوە درێژەی ئاسایی بەشی یەکەم سەیر پێ هاتنەکە کەم دەبێتەوە، یاخود هەر بە جارێ دەڕەوێتەوە.

لە بەشی یەکەمدا ئەوەندەمان بۆ کرا بە جۆرێکی ناتەواو، لە ڕێی گوتەی دەماودەم و لێکدانەوەی هەندێ ڕووداو و مێژووی نووسراوەوە بگەین بە پلەی دوای فەقێیەتی لە خوێندنی حاجی قادر کە وا پایەی «مستعدی»یە.

ئەوەندەی هەوڵمدا بزانم جگە لە مزگەوتی «مفتی» و دوو مزگەوتەکەی جەلیزادان «مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەد و مزگەوتی گەورە» لە چەند مزگەوتی دیکەی خوێندوە و مامۆستاکانی کێ بوون و دەرسی بە کێ گوتۆتەوە و لەگەڵ باری خوێندنی ئایا باری گوزەرانی چۆن بوە بەتێکڕا، نەگەیشتم بە هیچ ئەنجامێک. کە دەڵێم هیچ ئەنجامێک مەبەسم مانای تەواوی وشەکەیە: تاکە یەک وەرامم وەرنەگرتەوە لەو هەموو پرسیارە و تۆژینەوەی کردم. لە هەندێ برادەرانەوە چەند دێڕی پڕسۆز، بەڵام بێ سەرەنجام، هاتوە بۆم بە هەموویان یەک موشکیلە ساغ ناکەنەوە و وەرامی یەک پرسیار نادەنەوە. نامەیێک، یان دوان، لەو نامانە خەبەرێک لە حاجی دەگێڕنەوە نرخێکی تایبەتی خۆی هەیە هەرچەند خەبەرەکەش تا بڵێی

کورتیله‌یه: له کاتی فه‌قێیه‌تیدا له «گۆڕقه‌ره‌ج» ـه‌وه کاڵه‌کی بۆ هاتوه. ئه‌ویش دانه‌ی گه‌وره و په‌سندی گل داوه‌ته‌وه له مزگه‌وت بۆ مه‌لا و فه‌قێیان، شه‌ق و شلوقه‌کانیشی بۆ ماڵی مامۆستای ناردوه. که لێیان پرسیوه بۆ وا ده‌که‌ی؟ گوتوه‌تی ماڵی مامۆستا قه‌ڵه‌باڵغه منداڵی زۆرن هه‌موو شتێک ده‌خۆن.. قسه‌که‌ش له زاری «حاجییه گه‌وره»وه وه‌رگیراوه.

له‌م خه‌به‌ره‌دا گیانێکی نوکته‌بازی و گاڵته‌چییه‌تی ئێسکسووک به‌دی ده‌کرێ له حاجی، به‌ڵام له هه‌مان کاتدا ئیشکالێکمان بۆ ده‌نێته‌وه ناتوانین بی ڕه‌وێنینه‌وه: ئه‌و مامۆستایه‌ی حاجی کێ بوه وه‌ها خاوه‌ن ماڵ و مناڵی زۆر؟ هیچ یه‌ک له نامه‌کانی بۆ من هاتوون دان به‌وه دانانێن که مامۆستاکه‌ی حاجی «مه‌لا ئه‌حمه‌دی ئۆمه‌ر گونبه‌دی» بووبێ، له‌وه‌ش بێده‌نگن ناوی مامۆستاکه چی بوه. لێم ڕوونه خاوه‌ن نامه‌کانیش بۆیان مه‌علووم نیه مامۆستاکه‌ی کێ بوه، ده‌نا وا ده‌زانم ناویان دێنا.. خه‌به‌رێکه و به ته‌واتور هاتوه نوکته‌یێک له حاجی قادر ده‌گێڕێته‌وه نه بنجی هه‌یه نه بناوان، به‌ڵام نوکته و خه‌به‌ره‌که خۆشن، له‌گه‌ڵ نامێلکه‌ی مه‌لا عه‌بدولڕه‌حمانیش ڕێک ده‌که‌وێ له‌وه‌دا که ئه‌ویش پێی گوتین به‌روبوومی زه‌ویه‌کانی حاجی له گۆڕقه‌ره‌جه‌وه بۆی چۆته‌وه کۆیێ تا سه‌فه‌ری کرد به‌ره‌و ئه‌سته‌مبۆڵ و کۆیه‌ی جێ هێشت.. هه‌ڵبه‌ت داهاتی سێ پارچه زه‌وی هه‌ر هه‌تا کویێ بۆ خاوه‌نی ده‌چێته‌وه، ئه‌وه نیه بگاته ئه‌سته‌مبۆڵ.

حاجی به پێی ئه‌و حاشیانه له ده‌وری کتێبه‌که‌ی «سیوطي» نووسیوه‌تیه‌وه خه‌تی زۆر خۆش بوه. ئاخۆ له‌گه‌ڵ خه‌تخۆشیدا، وه‌ک که‌یفی، ئه‌ویش مۆرهه‌ڵکه‌ن بوه؟ نازانم و نه‌م بیستوه. به‌ڵام به دووری نابینم بۆ پێک هێنانی گوزه‌ران به‌هره‌ی خه‌تخۆشی خۆی له‌و کارانه‌دا به خه‌رج بردبێ که نانێک په‌یدا ده‌که‌ن، وه‌ک کتێب نووسینه‌وه و مۆر هه‌ڵقه‌ندن و کۆڵینی کێله قه‌بر.

کتێبێکی ده‌سنووس لای ئێمه هه‌یه له دوای 1260ی کۆچی بۆ حاجی مه‌لا ئه‌سعه‌د نووسراوه‌ته‌وه، به دوو که‌سان نووسینه‌که‌یان ته‌واو کردوه، یه‌کیان «عه‌بدولڕه‌حمانی ساوجبلاغی» ئه‌وی دیکه‌یان «عه‌بدولقادری کۆیی». ئه‌م عه‌بدولقادره له کۆتایی کتێبه‌که وه‌ک حاشیه هه‌ندێ هه‌ڵبه‌ستی بێهێزی فارسیشی داناون له مه‌دحی حاجی مه‌لا ئه‌سعه‌د. تێکڕای نووسینه‌که‌ی پێ ده‌چێ هی حاجی قادر بێ به‌ڵام هێشتان له لانی شاعیرییه‌ت و خه‌تخۆشییه‌وه گه‌لێک کزتره له‌و حاجی قادره‌ی ده‌یناسین. جا

ئەگەر ساغ بکرێتەوە ئەم نووسینە هی حاجییە یەک دوو ڕاستی و تایبەتی ئاشکرا دەکا:

یەکەمیان ئەوەیە، لە گوێرەی ناخۆشیی خەتەکە دەبێ حاجی درەنگ دەستی کردبێ بە خوێندن چونکە لە کاتی نووسینەوەی کتێبەکە بە پێی ڕاگەیاندی نامێلکەی مەلا عەبدولڕەحمان تەمەنی حاجی لە 30 ساڵ تێپەڕیوە، کە ساڵی لەدایکبوونی 1231 بووبێ، بەپێی لێکدانەوەی منیش لە 20 ساڵی تێپەڕاندوە، کە لە ساڵی 1240 بووبێ. فەقێیەک لە تەمەنی عادەتیدا دەستی کردبێ بە خوێندن لە 20 - 25 ساڵیدا بەهرەی خەتخۆشی کە هەبێ لەوپەڕی گەشانەوەدا دەبێ، کە بەهرەی نەگەشابێتەوە دەبێ لە بەر درەنگ دەست بەخوێندن کردن بێ. جگە لە زەعیفی خەتەکەی، هەڵبەستەکەشی زەعیفە. جا ئەگەر ئەم عەبدولقادرە حاجی قادر بێ وا پێ دەچێ بەڕادەی هەڵکشانی لە خوێندن بوێژیشی بەرز بووبێتەوە.

دووەمیان لەقەبی (نازناوی) حاجی لەو سەردەمەدا بە خۆوە نەناوە. گریمان ساغ بێتەوە کە خەتەکە هی ئەوە، دیارە نەبوونی لەقەبی «حاجی» لە هەموو ئەو شوێنانەدا کە خاوەنی خەتەکە ناوی تێدا بردوە سرنج ڕادەکێشێ بۆ پرسیارێکی تازە کە ئەویش بێ وەرامە: تۆ بڵێی بە درەنگەوە حاجی قادر نازناوی «حاجی» بەکار هێنابێ؟ ئەگەر ئەمە وابێ هۆیەکەی چیە؟ ئاخۆ لەوانەیە حاجی قادر بە دوا حەج کردندا ئەم نازناوەی بۆ خۆی پەسند کردبێ! ئەگەر شتێکی وا ڕووی دابێ چۆن وا ڕێک کەوت لە کەس نەبیسترێ؟ ئەمانەش پرسیاری بێ وەرامن[28].

---

[28] - لە «مەلا ڕەئوفی سەلیم ئاغای حەوێزی» ـیەوە بەیازێکی دیوانی حاجی قادر و هەندێ سەرگوزەشتی حاجیم بۆ هات، لە میانەدا دوو بەیتی ناتەواو و لەنگی نووسیوە کە گۆیا حاجی قادر دایناون بۆ دیاری کردنی ساڵ و ڕۆژی لەدایکبوونی. بەیتەکان ئەگەرچی لەنگیش بن خەبەرێکی تازەمان بۆ دەگێڕنەوە لە حاجی، لەنگبوونیان خەتای کەس نیە، دەستاودەست کە هاتوون شێواون و گۆڕاون. تاکە یەک (مصرع)ی بەیتەکان کە (مصرع)ی دووەمە لە بەیتی یەکەم، لەنگ و لۆری تێدا نیە و ئەگەر لە حاجی قادرەوە بۆمان مابێتەوە پرسیارێکی گەورە بە دەوری نازناوی «حاجی»یەوە هەڵدەستێنێ چونکە ئەو گوتە مەشهوورەی کە دەڵێ نازناوی «حاجی» لەوەوە هاتوە حاجی قادر لە مانگی حاجییان لە دایک بوە ئا ئەم گوتەیە

من لێرەدا، کە تا ئێستا ساغ نەبۆتەوە دەستنووسەکە هی حاجی بێ، بە ڕێبازێکی خەیاڵیدا شوێن قسە و ئیحتیمالێک کە لەوەوە هەڵدەستێ کتێبەکە دەستنووسی حاجی بێ، بەڵام با ئەوەندەش بڵێم بایی وردبوونەوەیێکی خێرا و سەرپێیی کە لە نووسینەکەم کردوە و لەگەڵ ئەو شارەزاییە کە هەمە لە ناسینەوەی دەستنووسان دێتە باوەڕمەوە کە هی حاجی قادرێکی سەرەتاکانی فەقێیەتی، نەک سوختەیی بێ، واتە هی پێش «مستعدی».

---

هەڵدەوەشێ و بەدرۆ دەخرێتەوە. ئەمە بەیتەکەیە بە خۆی و «مصرع»ی یەکەمی شکستیەوە:

به امری رب العالمین در خرمان
ولادتمه لە 17 ی شهری شعبان

شکستی و لەنگی نیوەدێڕی یەکەمی بەیتەکە هیچ دەخلێکی نیە بەسەر نیوەی دوەمیەوە چونکە لەوانەیە ئەویش بە ئەسڵ ڕێک و پێک بووبێت وەک هی دوەم.. من لێرەدا درێژە نادەم بە باس کردنی ئەو هەموو سرنج گرتن و لێکدانەوە و هەڵگێڕانەوە و ڕاست کردنەوەی کە خۆم و ئەندامێکی تری کۆڕیش بە خەرجمان برد لەگەڵ هەر دووبەیتەکەدا، ئەوەش باس ناکەم چەند هەوڵ و تەقەللا و سەفەر و هاتوچۆش کرا بە دوا ساغ کردنەوەی بەیتەکان و دۆزینەوەی ئەو سەرچاوەی کە گۆیا لێی وەرگیراون.. هەر ئەوەندە دەڵێم ئەگەر ڕاست بێ ئەم هەڵبەستە هی حاجی قادرە دیار دەکەوێ حاجی لە مانگی «شعبان» بە وەلەد بوە نەک بە مانگی حاجییان کە «ذوالحجة»یە، ئەوەساش پرسیاری لە کوێوە و کەی و چۆن پەیدا بوونی نازناوی «حاجی» دەبێتە مووی لووت بۆ ئەو کەسە کە بیەوێ شتێکی بایەخدار لە بارەی حاجی قادرەوە بنووسێ. بەڵام لە لاییێکی ترەوە هەڵکەوتی درەنگ دەست پێکردنی حاجی قادر بە خوێندن و هەڵبەست لە گومان دەر دەبا و ئیسپاتی دەکا، بەنیسەت منیشەوە حەسانەوەیێکی تازەم بۆ پێک دێ لەو ڕووەوە کە وا چەندێکی حاجی لە خوێندنی وەخرابێ ئەو وەخرانە لەگەڵ ڕەوتی ژیانی ڕێکتر دێت...

ئیمکان هەیە، بەپێی باوەڕێکی بەپەلەی خۆم، ئەو تەرزە خەتە پێش کەوێ و ببێ بەو خەتە خۆشەی کە لە کتێبەکەی «سیوطي» دا دەدیترێ هەرچەند بۆخۆم هیچ حیسابێکی قەراردادە لە بارەی حاجی قادرەوە ناخەمە گومان بەهۆی ڕێک نەکەوتنی دەلالەتی ئەو کتێبە لەگەڵیدا، دەبوو ئەوندەی گوتم هەر بڵێم لە بارەی بوونی کتێبێکی ئەوتۆ کە لێی دەوەشێتەوە تیشکی تازە و نەدیتراو بخاتە سەر چەندوچۆنی سەرگوزەشتی حاجی قادر، بەتایبەتی لە ساڵانی هەوەڵی ژیانیدا. لێرە بەپێشەوە گوتم خوێندنی سیوطي لە تەمەنی 45 ساڵی و 36 ساڵی لەگەڵ هەموو وەخرانێک و دابڕانێک کە فەقێ دووچاری ببێ هەر بە تەمەنێکی یەکجار درەنگ لە قەڵەم دەدرێ (بەتایبەتی 45 ساڵی) چونکە سیوطي لە کتێبە مەیلەو سەرەتای ناوەندی خوێندنی فەقێیەتی دێ، بەڵام ئەگەر مەعلووم بکرێ، بە شایەدی ئەم کتێبەی تازەم باس کرد، حاجی لە تەمەنی بیست ساڵیدا هێشتا هێندەی نەخوێندووە خەتی خۆش بێ وەیا ببێ بە شاعیرێکی چەسپاو ئەوسا ئیشکالی کتێبەکەی سیوطي لە خۆوە دەچێتەوە. گوتەی شێخ ڕەحیمیش دەربارەی شاگردبوونی حاجی لای وەستای ئێمەنیدروو باشتر جێی خۆی دەکاتەوە لە قەناعەتی خوێنەر.

من تا ئێستا بۆم ڕێک نەکەوتوە نووسینەکانی حاجی بەسەر سیوطییەوە لەگەڵ ئەم کتێبە بدەم بە پسپۆڕێکی خەتناس تا بڕیارێکی قەتعی لێ وەرگرم و پرسیارەکە یەکلا کەم، بەڵام ئەمە قەرزێکە بەسەر شانمەوە هەر دەبێ بیدەمەوە بە خوێنەری کورد و تەسلیم بە مێژووی کەمەوە. ئومێد دەکەم لەم کارەدا زۆر دوانەکەوم، هەر کاتێکیش گەیشتم بە ئەنجامێک ئیزافەی تۆمارخانەی مێژووی حاجی قادری دەکەم. تا ساغکردنەوەیێکی یەکجارەکی وا دادەنێم ئەم کتێبە وجوودی نیە و چ حیسابێکی بۆ ناکەم. ئەمیش وەک پرسیارەکەی حاجی قادری شێخ وەسانی و هەبوون و نەبوونی شیعری ئەو لە دیوانەکەی حاجی قادری کۆییدا. ئەوەی ڕاستیش بێ ساغبوونەوەی خەتی ئەم کتێبە بەلای حاجی قادردا زیاتر لەگەڵ نامێلکەکەی مەلا عەبدولڕەحمان دژ دێ، بە نیسبەت بیر و باوەڕی منەوە تعدیلاتی زۆر گەورە پەیدا ناکات.

ئەمەی لێرەدا گوتم و بە تەمام بیکەم شتێکی ناچارییە، جێگر (بدل)ی نیە بەڵام ئەگەر ساغ بێتەوە کتێبەکە دەسنووسی «حاجی» یە، زۆر بە ئاسایی ڕێک و گونجاو

دێت لەگەڵ دیمەنێکی زێدە بەرچاوی ئەدەبی «حاجی» لە دوا ڕۆژانی ژیانیدا. با بزانین چۆن؟

بە عادەت شاعیر کە لە زوێکەوە دەستی کرد بە شیعردانان هێز و توانای بوێژی لە ناوەڕاستەکانی عومریدا دەگەن بەو پەڕی گەشەکردن، نەخێک دوای ناوەڕاستی عومری دەست دەکا بە سەرەولێژبوونەوە. لە تەمەنی پیری و بێتاقەتی و کەمهێزیدا ئەو شاعیرەی لە گەنجایەتیەوە شاعیر بووبێ بەدەگمەن نەبێ شیعری بەهێزی بۆ داناندرێن، وەک ئەوەی کە بڵێی بورکانی نەفس و گیانی لە تەقە و تەقینەوە دەکەوێ بەهۆی درێژخایاندنی بەکارهێنانی ئەو بورکانە هەر لە گەنجایەتییەوە تا دوای ناوەڕاستەکانی تەمەنی. بێگومان ئەم دەستوورە بیژۆک (شاذ)ی تێدا دەبێ بەڵام دەشێ بایەخی پێ بدرێ، واش دەزانم ئەگەر لەبەر تیشکی ئەودا دیراسەی شاعیرییەتی چەند شاعیرێکی ژیان زانراو بکرێ، ڕاستی دەستوورەکە خۆ بسەپێنێ.

لەم تێبینییەوە کە سەیری شیعرەکانی حاجی قادر بکەین زۆر بەئاشکرایی دێتە بەرچاوی هەموو ئەدیبێک و شیعردۆستێک کە وا هەڵبەستەکانی حاجی لە دوا ڕۆژانی ژیانیدا لە جۆری هەڵبەستی هەرە بەهێزی حاجی حیساب دەکرێن. من لێرەدا بەهارییەکەی ناکەم بە بەڵگەی ڕایەکەم چونکە نازانین لە چ تەمەنێکدا هۆنیوەتیەوە هەرچەند مەعلوومە لە ئەستەمبۆڵەوە کردوەتی بە دیارییێکی نەمری سۆز و گڕی نیشتمانپەوەری، شیوەنەکەی بۆ «کەیفی»، ئەویش ناکەمە بەڵگە چونکە تەمەنی 60 ساڵی (لەو ڕووەوە کە لە ساڵی 1300ی کۆچی هونیوەتیەوە، بەپێی لێکدانەوەی من کە حاجی لە 1240 دا هاتبێتە دونیا دەبێ تەمەنی 60 ساڵ بووبێ) بۆ شاعیرێکی وەک حاجی بە تەمەنی بێ هێزی و کەم تاقەتی دانانێم، بەڵام چ دەمەتەقە لەوەدا پەیدا نابێ کە بڵێم نامەکەی بۆ باپیرم لە عومرێکدا نووسیوە بەهەموو حیسابان هی پیری و بێهێزی بێ، بەڵگەش لەمەدا شیعرەکانی حاجی خۆیانن:

سەر و ڕیشم سەراپا بۆتە لۆکە<br>
بە شەو هەمڕازمە پشمین و کۆکە

لەبەر پیری ئەوەندە بێ حەواسم
دەڵێی ئەرکانی ئیسلامی ئیناسم[29]

بە چاوێکی ورد و ئەدیبانە سەیری ئەم نامەیە بکەیت لێت ڕوون دەبێ دەسەڵاتی حاجی قادر لەو کاتەدا لە تۆقەڵەی سەری بوێژیدا بوە. ڕەنگە ڕاست بێ بڵێن هەرگیز حاجی قادر لەوە ژێهاتیتر نەبوە، ئەگەر ئەمەش نەڵێین خۆ ڕێمان هەیە بێ دوودڵی بڵێین هەرچی ئاکار و نیشانەی بێهێزی هەیە لەو هەڵبەستەدا تارماییشیان نایێتە بەرچاو. جا ئەگەر ساغ کرایەوە کە وا ئەم کتێبە خەت ناخۆشەی باسی دەکەم دەسنووسی «حاجی»یە و شیعرە فارسیە بێهێزەکانیش هەڵبەستی ئەون و بەمەدا سەپاندمان حاجی بە درەنگەوە بۆتە شاعیر و خەتخۆش، ئا ئەم دۆزینەوەمان دەگونجێ لەگەڵ بەردەوامبوونی هێز و توانای بوێژیی حاجی تا دوا ڕۆژەکانی ژیانی یاخود هەر نەبێ تا تەمەنی پیرییێکی ڕاستەقینە. وا دەزانم ئەم دۆزینەوەش شتێکی بێنرخ نەبێ...

ئەوجا با بلکێینەوە بە ئەسڵی باسەکە و هەنگاو هەڵێنین لەگەڵ حاجی بەرەو قۆناغی دوای پلەی فەقێیەتی، پێکەوە دۆعاخوازییێک بکەین لە کۆیێ بۆ سەفەرەکەی باڵەکاتی و لاجان و سابلاغ و دەوروبەری بێتووش و شوێنەکانی تری کوردستانی ئێران، بەم سەفەرەش لاپەڕییێکی نوێ و پان و بە تەفسیل لە ژیانی حاجی بکەینەوە بۆ چاوی سرنج و بیخەینە بەر خامەی مێژوو تاکوو لەو هەندە دەنگ و ڕەنگە کەمەی کە لێی ماوەتەوە تابلۆییێک ڕێک خات و نەخشەییێکی تێدا بکێشێ دروشمی حەقیقەتی ئەو ڕووداوە بپارێزێ.

حاجی قادر کەی بۆ ئەم گەشتە لە کۆیێ بەدەر کەوتووە؟ لەم گەشتەدا چەند ماوەتەوە؟ کوێ و کوێ گەڕاوە؟ چی خوێندوە؟ کەی بۆ کوێ گەڕاوەتەوە؟ سەرجوملەی بەسەرهاتی لەو گەشتەدا چی و چۆن بوە؟

---

[29] – بۆ تێگەیشتنی واتای وشەی «ئیناسم» بگەڕێوە بۆ لاپەڕەی 106 و دواتر لە بەشی یەکەم.

نێزیکە بڵێم شەرم دەمگرێتەوە کە ناچارم دان بەوەدا بێنم ئەم پرسیارانەش سەر و سۆراغیان نیە وەک زۆرینەی پرسیاران دەربارەی حاجی. بە لێکدانەوە و بەراوردی کردن نەبێ ڕێگەیێک دەر ناکرێ بۆ تاریکستانی پرسیارەکان. لە هیچ ڕووپەڕەی یەک لەو کتێب و نامیلکانەی لەبەر دەستاندان کەموزۆر ئیشارەت نیە ساڵێک دەست نیشان کا بۆ سەرەتای گەشتەکە و یەکێکیش دانێ بۆ کۆتاییەکەی، یاخود شتێک بگێڕێتەوە لە سەرگوزەشتی حاجی بە درێژایی ساڵەکانی خوێندنی. هەروەک کتێب و نامیلکەی کۆن و پەراوێزەکانیان خامۆشن لە عاست ئەم پرسیارانەدا، تێکڕای چاوگی نووسراوی نوێش کە ناوی حاجی دێنن و لە بارەیەوە دەدوێن و پێوەی خەریکن ئەوانیش لەو پرسیارانە بێدەنگن و ورتەیان لەبەرەوە نایێ. هەر هێندە زانراوە و گوتراوە و دەگوترێتەوە حاجی چوە بۆ باڵەکاتی و هەندێ شوێنێ کوردستانی ئێران و خوێندنی لێ کردوون و گەڕاوەتەوە کۆیێ بەڵام هەرچی وشەی وەک «کەی، کوا، چۆن، چەند، کوێ؟» هەیە و پێیان دەڵێن «ناوی پرسیار - اسم الاستفهام» هیچ وەرامێکی ڕێک و پێک وەرناگرنەوە. سەیر ئەوەیە وەک سەرگوزەشتە هەڵبەستراوەکەی چوونی «امرؤ القیس» بۆ ناو ڕۆمەکان و زەهر خواردوو کردن و مردنی لە گەڕانەوەیدا، کە هەمووی زادەی خەیاڵی حیکایەت خوانانن، بۆ حاجی و گەشتەکەی، کە ڕووداوێکی ڕاستە، بە درۆش شتێک ڕێک نەخراوە هەر نەبێ خێرەومەندێکی حیکایەتخوان لە وەکالەتی «امرؤ القیس» بەرەو ڕۆم هەڵبەستێکی ڕێک خست و گوتی:

بکی صاحبي لما رأى الدرب دونه
وايقن انا لاحقان بقيصرا

فقلت له لاتبک عينک إنما
نحاول ملکا أو نموت فنعذرا

دیسانەوە بە خێری خۆی لە گەڕانەوەیدا، پێش مەرگی، ئەم دوو بەیتەشی بۆ ڕێک خست:

أجارتنا ان المزار قريب
واني مقيم ما اقام عسيب

أجارتنا ... هتاد

و كردی بە بەندی لاواندنەوەی، بە داخوازی قافیە «عسیب»یشی کردە گۆڕستانی تەرمەکەی، بەمەدا ڕێ و شوێن و ناونیشانێکی ساختەی قوت کردەوە، وەک ئاڵای درۆزن بەسەر هەندێ قەبری مەوهوومەوە، لە لانی خۆیەوە پاراستنێکی شوێنەواری«امرؤ القیس» بکا. کاشکی بۆ حاجی قادریش درۆزنێک ڕووی خۆی سپی کردبایەوە بە گێڕانەوەی چەند خەبەرێکی ئەو گەشتەی. سەد خۆزیا بۆ «نالی» و «کەیفی» یش خەبەرسازان چەند سەرگوزەشتێکیان ڕێک خستبا و تارماییەکی ئەستەمبۆڵیانی خستبا بەرچاوی پشکنەرەوە. وا دەبێ خەبەری دروستکراو ڕاستی بە دەستەوە دەدا بێ ئەوە خەبەرەکە مەبەسیشی بووبێ چ ڕاستییان بە دەستەوە بدا. خۆ ئەوەندەی مێژوونووس لە ئەفسانە سوود وەردەگرێ بۆ گەیشتن بە ڕاستی، ڕەنگە هەر هەندە سوودمەند بێ لە خەبەری ڕاستی پاتەوپات. بە نموونە دەڵێم کتێبەکەی Gods,Graves and Scholars باسی زانایێکی ئارکایۆلۆجی دەکا کە لە ڕێی ڕەمزە ئەفسانەییەکانی «ئیلیازە» وە گەیشتە دۆزینەوەی شوێنی شاری «تەروادە».

لەو ڕووداوانەی بێ سەروشوێنن و مەعلوومات دەربارەیان زۆر کەمە، بۆ لانی تۆژینەوەی مێژوویی، بوونی خەبەری تێکەڵ بە درۆ سوودبەخشترە لە نەبوونی هیچ خەبەرێک. ئەو خەبەرەی لە نەبوویەوە ڕووداو هەڵدەبەستێ بە ناچاری ناوی شەخس و جێگەی حەقیقی دێنێتە ناو حیکایەتەکەیەوە، چونکە خەبەرساز درۆیەکانی لە دەوری جێگە و شەخسی هەبوودا دەتەنێ، بەزەحمەت بیری بۆ ئەوە دەچێ شەخس و جێگەش بخولقێنێ، لەبەر زۆر هۆی سەربە دەسەڵاتی هونەری و هێزی تصورەوە کە ئێرە جێی لێدوانیان نیە بەنموونە دەڵێم کتێبە ناودارەکەی «مەلا سەمەدی مەرگەیی» درۆی مێژوویی یەکجار گەورەی تێدایە وەک ئەوەی کە «خالد بن الولید» سەرلەشکری ئەو سپایەی ئیسلام بوە کە کوردستانی عێراق و ئێرانی گرتوە. لەگەڵ ئەمەشدا تۆپۆگرافیایێکی ناوچەی کۆیێ و مەرگە و بیتوێن و دیوی پژدەر نیشان دەدا ئەوەندە لەگەڵ ڕاستی ڕێک و دۆستە لایەنی درۆی مێژوویيت لە هەندێ خەبەراتی حیکایەتەکە لە بیر دەباتەوە. دروستیی تۆپۆگرافیاکە وا لە مرۆڤ دەکا بێتە سەر ئەو باوەڕە کە وا هەرچەند دیاردانی «خالد» بە سەرکردەی سپای مسڵمانان درۆیێکی بێ دەمەتەقەش بێ، ڕەنگە جەنگەکان و

ڕووداوەکانی باسیان دەکات ڕاست بن، یا لە ڕاستی نێزیک بن با سەرەکی سپای ئیسلامیش «خالد» نەبووبێ یەکێکی تر بووبێ.

بەو پێیە ئەگەر سەروشوێنێک هەبا لە گەشتەکەی حاجی قادر بە سەر زمانانەوە یا لە ناو حیکایەت و سەرگوزەشتاندا، با درۆشی تێدا با، ڕەنگ بوو ئەوەندە ڕاستییەی لێ وەربگیرێ کە ماندووبوونی بەدوا داگەڕانی پشکنەر و تۆژەرەوە بێنێ. با ئەوەش بڵێم حیکایەت خوانێکی سەد ساڵ پێش ئیمڕۆکە درۆیێکی هەڵبەستبا ترسی ئەوەی لێ نەدەکرا درۆکانی ببن بە سەرچاوەی فەلسەفە و باوەڕی درۆ و ئەفسانەیی وەک ئەوەی کەسێکی خوێندەوار بە نیازی فێڵ لە خەلق کردن زەللەی فکری بە دڵ و مێشکان بکا.

بەداخەوە ئەو تەرزە سەرگوزەشت و حیکایەتانە لە کەم کەمترن. ئەوەی ڕاستی بێ یەکێک لەو نووسەرانەی دەربارەی حاجییان نووسی بێ و من نووسینەکانم خوێندبێتەوە خۆی لەو لایەنەی زەرفی ژیان و فراژیبوون و بزووتنەوەی هەست و شاعیرییەتی حاجی نەگەیاندوە، وەک بڵێی بە لایانەوە جۆرێ ژیان و ڕابواردن و خوێندن و هەڵستان و دانیشتنی چ پەیوەندیێکی نەبووبێ لەگەڵ هەڵقوڵین و تەقینەوەی ویژدانی. یا لەبەر ئەمەیە کە کەس خۆی ماندوو نەکردوە بە هەڵدانەوە و تێوەڕامانی لاپەڕەکانی دەفتەری سەرگوزەشتی حاجی، یاخود کارەکەی زۆر سەخت هاتۆتە بەر چاوان، یاخود لانی نیشتمانپەروەری حاجی، لە نەزەر نووسەران، هەموو لایەنێکی دیکەی شاردۆتەوە و بایەخی پێ نەهێشتوە: حاجی قادرە و بوە بە یەکەم بوێژی کوردایەتی ئیتر چ لزوم هەیە بە زەحمەتی بێ لزوم لەو ئەرکە نەفەس بڕەی دۆزینەوەی سەرگوزەشتێکی بێ سەروشوێن..

هەرچۆنێک بێ نەمدیت نووسەرێک خۆی بەو لایەنانەوە خەریک کردبێ لە کەینوبەینی حیکایەتی حاجی قادر کە من بۆیان بە پەرۆشم، نەخێر شەیدام. نەختێک، بەڵام زۆر کەم و بە شکڵێکی سەرەتایی و بێ بەڵگەی ماددی و زیهنی و قووڵبوونەوە، لە سەرەتاکەی «دیوانی حاجی قادر، چاپی هەولێر، ساڵی 1969» سەرگوزەشت و بەسەرهاتی حاجی دەخوێنێتەوە، لابەلایی و بەپەلە، باسێکی گەشتەکەی باڵەکاتی و کوردستانی ئێران دەکا کە ئەگەر هەمووی باوێیە سەر یەک لە دوو سێ دێڕ تێپەڕ ناکا. نەوەک کەمم گوتبێ با بڵێم «دوو سێ لاپەڕە» لە جیاتی دوو سێ دێڕ.

پشتگوێ خستنی بەسەرهاتی شاعیر یا هونەرکار یا زانا با هەر کەسێک کە ببێتە بابەتی باس کردن و لەسەر نووسین، تاریکاییێک دادێنێ بەسەر کاکڵی مەوزووع هیچ شتێک نیە وەک چرا بیرەوێنێتەوە. بەسەرهاتی ژیانی مرۆڤ ئەو چرایەیە مرۆڤەکە و بەرهەم و خەبات و چاکە و خراپەی ڕوون دەکاتەوە و نرخی ڕاستەقینە بە هەموو سەروبەرێکی دەدا، کە ئەو بەسەرهاتە نەبێ وەیا پشت گوێ بخرێ لە کوێ چرا دەخوازرێتەوە ڕاستی ڕوون کاتەوە. بەسەرهاتی هەر کەس زمانی واقیعی ئەو کەسەیە شایەدی بێدرۆی لێ دەدا، کە ئەو زمانە بێدەنگ کرا کوا زمانێکی وەک ئەو بەدەنگی بێنین و ڕاستی لێ وەرگرین؟ زمانی ڕاستگۆ کە سکوتی کرد یاخود سکوتی پێ کرا هی درۆزن بەدەنگ دێ بە خۆی و هەموو چەکی لەسەر خۆ کردنەوە و خەلق بە درۆ خستنەوەی.

من کە ئەمە دەڵێم بۆیەی ناڵێم گلەیی و گازاندە بکەم لەو نووسەرانەی خۆیان لە سەرگوزەشتی حاجی نەگەیاندوە، ڕاستییێکە و بەیانی دەکەم. بەهیچ جۆرێکیش بێدەنگیی وان بۆ خۆیان و نووسینیان نابێتە بەدەنگ هێنانی زمانی ناڕاست: ناڕاستی لەو کاتەوە دەست پێ دەکا کە بە ئانقەست ڕاستی ون بکرێ یاخود بکوژرێ. ئەم کارەش لە دوای بێدەنگیی نووسەرەکانەوە دێ نەک لە عەینی سکووتەکەوە، خەلقی دیکەش دەیکەن نەک ئەو نووسەرانە کە بێدەنگ بوون.

وا دەزانم نووسەرە دڵسۆزەکان کە خۆیان لە بەسەرهات و شی کردنەوەی زەرف و تاوی ڕووداو و خوێندن و تەگەرەکانی ژیانی حاجی نەگەیاندوە لەبەر زۆر هۆی گرنگ بوە کە ئەمانە هەندێکیانن:

یەکەم ئەوەیە سەرچاوی زانینی ڕووداوەکانی ژیانی حاجی، یاخود زەرفی ژیانی بە جۆرێکی گشتی، یەکجار کەمە، هەندێ جارانیش هەر نیە. کە سەرچاوەی زانراویش نەبوو دۆزینەوەی هی نهێنی زەحمەتێکی وای تێدایە بە کەم کەس هەڵدەگیرێ.

دووەم: نووسەرێکی کورد پەیدا نابێ دەسەڵاتی دارایی بایی ئەوە بکا چەند ساڵان عەوداڵی دۆزینەوەی ڕاستی بێ لەو سەروبەری ژیانی حاجی قادر. گوریسی نووسەری کورد بە یەکلایی ناگاتەوە...

سێیەم: دامان نا دەسەڵاتی ماددی و داراییش هەبوو، کە نیە، کوا ئەو ئازادییە بۆ کوردێکی عێراقی کە تۆژینەوەی پێویست بکا لە بارەی ژیانی حاجییەوە لە

کوردستانی ئێران و لە ئەستەمبۆڵدا. سەد جاران «حسنی نیە»ی خۆی ئیسپات بکا لەو کارەیدا هەر دەبێتەوە بە قارەمانی ئەو چیرۆکە کە گوتی تا من ئیسپاتی ئەمە دەکەم کەوڵم دەچێتە دەباخانان، بۆ نووسەری کورد دوو سێ دەباخانە نەک هەر یەک.

چوارەم: پەلە کردن، پەلە کردنێکی دروست و پیرۆز، بۆ سوود وەرگرتن لە هەڵبەست و بیر و فەلسەفەی حاجی: دیارە کە نووسەر خۆی گل دایەوە بۆ دەست هێنانی مەعلووماتی تەواو لە بارەی ڕووداو و بەسەرهاتەکانی حاجی دەبێ ساڵەها خەریکی بەدوادا گەڕان و بەراورد کردن و بە یەکدی گرتن بێ تا دەتوانێ دیراسەییێکی قووڵ و فرەوان بەرهەم بێنێ. ڕەنگە بیر لەوەش بکاتەوە کە تێپەڕینی کاتی وا دوورودرێژ سەر بکێشێتەوە بۆ بەسەرچوونی کژی سوود وەرگرتن لە پەندەکانی حاجی قادر و زەرفی وەها دروست ببێ پێویستی بە فەلسەفەیێکی تازەتر بێ. لێرەدا قسەییێکی خۆم دەترینجێنمەوە ناو ئەم چاوپێداخشاندنە و دەڵێم «کەس ترسی بەسەرچوونی کژی فەلسەفەی حاجی نەبێ، جارێ گەلێک زوە بۆ ئەو بەسەر چوونە: هەویری کورد زۆر ئاوخوازە».

پێنجەم: کەموکووڕی و ناتەواوی، کە ڕێگە لە خەلق بەگۆڕێ و فریویان نەدا، نابێتە هۆی زیان بەخشین لە نووسیندا، ئەوەندەی دەنووسرێ کەمیش بێ، سوودێک هەر دەبەخشێ.

بەدوا ئەمانەدا وردە هۆی یارمەتیدەریش کاری خۆیان دەکەن لە خێرایی کردن، وەک ئەوەی مرۆڤ حەز دەکا بەرهەمی بکەوێتە بازاڕەوە، یاخود پێشدەستی بکا لە خزمەتی گەل، کە ئەمانە ئارەزۆی بێ عەیبن و لە خاوەنییان بە داوێوە ناکرێن.

خۆ ئەوەی ڕاستی بێ منیش تا ڕادەیێکی گرنگ گوێم نەداوەتە تەواوی: گەلێک کەلەبەری زل هەیە لە نووسینەکەمدا بۆم پڕ نابێتەوە. هیچ ترووسکەییێکیش دیار نیە، بەو نزیکانە، ڕێگەییێک دەرکەم بۆ وەدەست هێنانی مەعلووماتی ئەوتۆ کەلەبەرەکانم بۆ پڕ کاتەوە. ناچاری خستمیە سەر خۆ فریودان بەوە کە هەندێک خزمەت چاکترە لە هیچ.

سەرەڕای خزمەت، ئەو هاندەرانەش پاڵیان پێوە نام کە لە پێشدان باسم کردن وەک ئەوەی کەمتاکورتێکی مەعلووماتم دەربارەی حاجی، ئەگەر نەینووسم، وردە

ورده هەمووی دەفەوتێ. 20 ساڵ پێش ئێستا زۆر شت هەبوون، لە هەڵبەست و ڕووداوی سەربە حاجی قادرەوە پترم لێ دەزانین، تێپەڕینی کات لە یادمی سڕیەوە. لەو هێندە مەعلووماتەی کەوا لام هەبوو و بۆ خۆی لە چاو سەرجوملەی بەسەرهاتی ڕۆژگاری حاجی یەکجار کەم بوو، بەشێکی زۆریم لە دەستدا. کەواتە بەر لەوەی لە دەست بچێ تۆمارکردنی بوو بە واجیب. وەک لێرەش بەپێشەوە گوتوومە، لەبەر هەمان سەبەبی زێدە کەمی مەعلوومات دەربارەی حاجی دەبێ وەک زانای ئاسار لە نیگا و نیم نیگا و هێمای هەموو بەسەرهات و ڕووداو و مێژووی کەسان و هەڵوێستەکانی پەیوەندیدار لەگەڵ حاجی سوود وەرگرین ئەگەر ئەمە نەکەین دەبێ واز لە تەقەللا بێنین.

وادەبێ مرۆڤی بێتالع لە مەیدانێکی تەسکی ژیانیدا بەخت فریای دەکەوێ. سەرگوزەشتی حاجیش کە زۆری ونە و لەبیران چۆتەوە، وەک بەختی ئەو مرۆڤە بێتالعە، لە کەلێنێکی تەسکەوە پرشنگە تالع ڕۆشنایی بۆ داوێژێ. سەبارەت[30] بەوە ڕووداو و مێژووی تۆمارکراو هەن ناوناوە لەگەڵ ژیانی حاجیدا پەیوەندییان هەیە، لە گوێرەی زانراویی خۆیان ئەو نەختە ژیانەی حاجیش ئاشکرا دەکەن.

گەشتەکەی حاجی لە باڵەکاتی و کوردستانی ئێران یەکێکە لەو ڕووپەڕانەی دەفتەری سەرگوزەشتی حاجی کە بە هۆی زانیاری لاوەکیی بێشوبهەوە بتوانین چەند دێڕێکی لێ بخوێنینەوە. دیوانەکەی حاجی و هەندێک لەو پەراوێزانەی بە دەوری «متن»ی کتێبەکەی «سیوطي» دا حاجی خۆی نووسیوێتی، ئەوانیش لە لای خۆیانەوە یارمەتیمان دەدەن بۆ پێک هێنانی نەخشەیێکی گشتی ئەم گەشتە کە وا هەرچەند ڕووپێو (مساحە)ی پانی تێدا دەمێنێ بە تاریکی و نەزانراوی، دیسانەوە دەکەوێتە ناو جغزێکی واوە هەر دوو سەری گەیشتبێتەوە یەکتر. مێژوو و ڕووداوی زانراو لەگەڵ دیوانی حاجی و کتێبەکەی سیوطي سنووری بێپچڕانەوە بە دەوری نەخشەی ئەم گەشتەدا دەکێشن و سەرەتا و کۆتایی بۆ دیاری دەکەن.

---

[30] - وشەی «سەبارەت بە...» واتاکەی ئەوەیە کە بڵێی «سەبەب بە فلان شت» نەک «نیسبەت بە فلانە شت» وەک زۆربەی نووسەران بەکاری دێنن. لە فۆلکلۆر بەند هەیە دەڵێ: « سەبارەت بە تۆ من لێرە بەندم» واتە سەبەب بە تۆ نەک نیسبەت بە تۆ.

ڕەنگە زوربەی خوێنەران وەک من بزانن گەشتەکەی حاجی لە کۆیەوە تا باڵەکاتی و سینگوڕە و گەرووی شێخی لەگەڵ باپیرم، حاجی مەلا عەبدوڵادا بوە. ئەم ڕووداوە گومانی تێدا نیە. بۆ زانینی ئەم ڕاستییە پێویست نیە بە مەعلووماتی تایبەتی، نامەکەی حاجی بۆ باپیرم لەم ڕووەوە شایەدێکی قەتعییە:

به بیرت دێ زەمانی چووینە باڵەک
بە پێ خاوسی نە کەوشم بوو نە کاڵەک

وەها بوو دڕک و دار و شاخ و باری
وەکوو مەخمەل بوو نەرمی یانە خاری

کە چووینە سینگوڕە سینەم گڕی بەست
وەکوو «قەندیل»ی سەرگەردان وەکوو مەست

دەڵێن ئێستا هەواری گورگ و شێران
وەکوو قەلبی حەسوودی تۆیە وێران

چکاوە ئاوی پڕژ و گۆلەشینی
نەماوە هەر لە کۆتر تا شەهێنی

«گەرووی شێخی» لە لوقمەی کۆچ باران
موعەڕڕایە میسالی ڕۆزەداران

حاجی قادر و حاجی مەلا عەبدولا سەرانسەری ئەو شوێنەیان پێواوە و خوێندن و ڕابواردن و هاتوچۆیان تێدا کردوە. باوکم و مامم باسیان دەکرد جارێکیان لە هاوینەهەواری چنارۆک، کە بەشێکی زۆری وڵاتە شاخاویەکەی باڵەکاتی و قەندیل و ئەو دەوروبەرەی لە دوورەوە لێ دیارە، حاجی مەلا عەبدولا لە ساڵانی دوایی عومریدا لە ڕێچکۆڵەیێکی بەرەو «سوولی پاشا» ڕۆییوە، کۆسپێکی لە پێش هەنگاویدا بوە، وابزانم کۆسپەکە هەر ماوە، بە جۆرێکی مەیلەو نارەحەت و بە یارمەتی خەلقەکەی لەگەڵی بوون لێی سەرکەوتوە. هەڵوەستێک دەکا و ئاوڕێک لە شاخەکانی قەندیل و باڵەکاتی دەداتەوە، دەستێکیان بۆ درێژ دەکا و بە چاوی تەڕەوە دەڵێ «ئەو هەموو شاخ و داخ و هەڵەت و پەڵەتەم بە پێیان کوتاوەتەوە وا ئێستا

لەو کۆسپە سەر ناکەوم». شوبهە نیە لەوەدا مەبەسی گەشت و هاتوچۆ لێ کردنی ئەو ڕۆژگارە بوە کە لەگەڵ حاجی قادر بە یەکەوە بۆ خوێندن کردوویانە.

بەڵام ئایا کە ئەم ڕاستییەمان زانی چ یارمەتیمان دەدا بۆ زانینی ڕۆژگاری ڕوودانی؟ دەزانین کەی بوە؟ تۆ بڵێی لە هیچ لایێکەوە تیشکێک بێت و نەختێک لە تیری و خەستی تاریکایی دەور و پشتیمان بۆ کەم کاتەوە؟ خۆشبەختانە من هەندێک لەو تیشکە شک دەبەم وەک «لایت»ی ئۆتۆمۆبیل شەقامی شەوڕۆییمان ڕۆشن کا.

مێژووی بێگومانی ڕووداوی دیکە هەیە نیسبەتی لەگەڵ ئەم گەشتەدا وەک نیسبەتی شەموە لەگەڵ یەک شەمموودا. بەپێی ئاگاداری و شارەزایی خۆم کە بە هۆی نزیکیم لە سەرچاوەی هەندێ مەعلووماتەوە بۆم پەیدا بوە، سرنجی شەخسیم یارمەتی داوم بۆ دەلالەت لێ وەرگرتنی، چەند بەڵگەییێکم بۆ ڕوون بۆتەوە ئەوە دەسەپێنن کە ئەم گەشتە و خوێندنە لە دوای مەرگی حاجی بەکرئاغا بوە نەک پێشتر.

بەڵگەییێک لە جەرگەی کردەوەی خودی حاجییەوە هەڵدەستێ و بۆخۆی بەس بێ بۆ سەلماندن و سەپاندنی ئەم لایەنە ئەوەیە کە چوار بەیتەکەی مێژووی مردنی حاجی بەکرئاغا بە سەر کێلە قەبرەکەیەوە، وەک لێرە بەپێشەوە گوتمان هەڵبەستی حاجی قادرن. پێی ناوێ من بڵێم لە خۆوە دیارە ئەم چوار بەیتەی سەر کێلەقەبرەکە لە دوورەوە بە دیاری نەهاتوون بۆ کۆیێ، چونکە ئەگەر حاجی بۆ خۆی لە کۆیێ نەبا ئەوەندە شاعیرەی تێدا هەبوون پێویست بەوە نەهێڵن شیعر لە دوورەوە بێنن وەک دەرمان بۆ نەخۆش.

لێرە بەپێشەوە[31] گوتوومە مێژووی مەرگی حاجی بەکرئاغا لە ڕستەی کۆتایی بەیتی چوارەمدا دەردەکەوێ کە «واثانی ثنین محمد»ە و 1270 پێک دێنێ. ئەم ساڵە دەوەستێتە بەرانبەر 1853ی زایینی. کەواتە لەو ساڵەی 1270 یەدا حاجی قادر لە کۆیێ بوە. دەمێنێتەوە ئەوە ساغ کەینەوە مردنی حاجی بەکرئاغا پێش گەشتەکەی حاجی قادر بوە و لە ڕێکەوتی سەفەرێکی بەرەو ماڵ نەبوە کە حاجی قادر لە دەمی

---

[31] - بگەڕێوە بۆ بەشی یەکەم.

مەرگی حاجی بەکرئاغادا لە کۆیێ بوە. هەر ئێستاکە بەدەم خوێندنەوەی چەند دێڕێکی لێرە بە دواوە ئەم ڕاستییەت بۆ ڕوون دەبێتەوە.

حاجی بەکرئاغا خاڵی باپیرم بوە، نەک خاڵێکی عادەتی کەوا ڕەنگە لەگەڵ خوارزایدا بێباک و کەمتەرخەم بێ وەیا خوارزا لە عاست ئەودا بێ پەروا و سۆز بێ: ڕاستی بێگەرد ئەوەیە حاجی بەکرئاغا خۆشویستنێکی بێئەندازەی بوە بۆ باپیرم، لە موقابەلەدا باپیریشم ئەوپەڕی سۆز و ڕێزی هەبوە بۆ خاڵی. بە جۆرێ دائیمی و ڕۆژانە ئەو خاڵ و خوارزایە یەکدییان دیوە و لە مەوزووعاتی زانست و ئەدەب وتوویێژیان بوە. یا لە دیوەخانەی حاجی بەکرئاغا یا لە یەکێک لە دوو مزگەوتەکەی جەلیزادان مەجلیسی زانست و ئەدەب ئەم دوو مرۆڤەی کۆ کردۆتەوە. لەمەشدا سەیر پێ هاتن پەیدا نابێ، وا نەبا سەیر بوو[32].

---

[32] – مناسبی ئەم جێگەیە سەرگوزەشتێک دەگێڕمەوە هەم پەیوەندی میانی خاڵ و خوارزا بەیان دەکا هەم نموونەیەک لە جۆری وتوویێژیان نیشان دەدا.

باپیرم بۆ کوڕ و کەسی خۆی باس کردبوو، بەر لەوە فێری فارسی ببێ حاجی بەکرئاغا زۆرجاران پێی دەڵێ خوارزا تا فێری فارسی نەبی دڵم داناکەوێ. وا ڕێک دەکەوێ، بەپێی گێڕانەوەی باپیرم خۆی، جارێکیان لە یاریی سێ بازدا قاچێکی وەردەگەڕێ و چل ڕۆژان لەناو جێ دەکەوێ و گەڕان و دەرس خوێندنی بۆ ناکرێ. لەو چل ڕۆژەدا هەل وەردەگرێ کە دەرس و دەوری نیە، خەریکی خوێندنەوەی ئەو کتێبە فارسییانە دەبێ کە لەو سەردەمەدا باو بوون تا بناغەیێکی مەحکەم لە فارسی دادەمەزرێنێ. باپیرم گوتبووی ئەو قاچ وەرگەڕانەم بۆ خێر وەرگەڕا و لە شەرمەزاری دەری چواندم. لەدوای فێربوونی فارسی دەکەوێتە سەر هەوەسی شیعر لەبەر کردن و شەڕە شیعرینە بە فارسی لەگەڵ خاڵیدا.

جارێکیان بەیتێکی فارسی لە خاڵی دەپرسێتەو، وابزانم هی«سعدی»ی شیرازییە کە دەڵێ:

اینک عسلی دوخته دارد مگس نحل
شهد لب شیرین تۆ زنبور میانرا

بێگومان لە کاتی مەرگی حاجی بەکرئاغادا دەبێ باپیریشم وەک حاجی قادر لە کۆیێ بووبێ، چونکە ناچێتە عەقڵەوە خوارزاییێکی وەک ئەو لە سەرەمەرگی خاڵێکی وەها مەزن و دڵسۆزدا لە هەندەران بووبێ و بۆ ساڵەهای خوێندن لەو تەمەنەی دوارِۆژانی ژیانی خاڵی لێی دوور کەوتبێتەوە. جگە لەم لایەنە باپیریشم لەو کاتەدا تەمەنێکی وای نەبوە پێشتر چووبێ بۆ خوێندن چونکە لە مەرگی خاڵیدا تازە دەبوو

---

حاجی بەکرئاغا دەستێکی باڵای هەبوە لە فارسیدا لە نێوان شاعیرەکانی کوردی عێراق دوو سێ شاعیری وەک ئەو هەبوون هێندە فارسی بزانن. تا قسەکەم نەبێتە داوای بێبەڵگە لێرەدا نموونەیەک لە شیعری دەخەمە بەرچاو، غەزەلێکی «حافظ»ی تەخمیس کردوە ئەمە سەرەتاکەیەتی:

آوخ زهجر تو مرا خم شده قامت
پیداشده در روی من از مرگ علامت
شاید نبرم حسرت رویت بقیامت
یارب سببی ساز که یارم بسلامت
بازآید و برهاندم از چنگ ملامت

ئەمە لە تەخمیس ناکا، دەڵێی هەموو شیعرەکە هی«حافظ»ـە. خولاسە حاجی بەکرئاغا دادەمێنێ و مەعناییێکی بۆ نایێ بسەلمێندرێ. باپیرم دەڵێ خاڵە مۆڵەتم دای تا هەفتەییێک. دوای ئەوەش هەر بۆی ناکرێ واتاییێکی مناسب ببینێتەوە، پاش چەند جارێک مۆڵەت پێی دەڵێ خاڵە تۆ نەزانی «عسلی دوختە»چیە ئیمکان نیە مەعنای بەیتەکە بزانی. ئەوجا بۆی باس دەکا کە وا لە سەردەمی عەباسییەکان فەرمانێک دەردەچێ هەرچی جوولەکە هەیە، بۆ ناسینەوەیان دەبێ پارچە قوماشێکی «عسلی» ئەوساکە هەبوە بە سەر شانیانەوە بدروون، بەو پێیە ئەو پارچە عەسەلییە دیارخستنێکی بێحورمەتانەی تێدا هەیە بۆ ئەو کەسەی بە خۆیدا بدوورێ. کە ئەمە زانرا واتای بەیتەکە لە خۆوە ئاشکرا دەبێ.

باوەرِ دەکەم حاجی بەکرئاغا ئەوەندەی بڵێی کەیفی بەوە هاتوە خوارزای دەستی باڵای پەیدا کردوە لە فارسیدا.

به بیست ساڵی. بەڵێ چ شوبهە نایێتە دڵمەوە لەوەدا کە لە کاتی مەرگی حاجی بەکرئاغادا باپیرم لە کۆیێ بوە و هێشتا نەچوە بۆ گەشتی خوێندن لەگەڵ حاجی قادر بە یەکەوە. نەک هەر لەوێ بوە و بەس: دەبێ ماوەیێکی ئەوتۆش لە دوا مەرگی هەر لە کویێ مابێتەوە بایی ئەوە بکا «ئەمین ئاغا» لە شوێنی باوکی دانیشێ و کەلێنی ئەو پڕ بکاتەوە.

بە عادەت لە ڕووداوی وادا خزمی نێزیک تێکڕایان حازر دەبن لە چەندوچۆنی دانیشتنی کوڕ لە جێی باوکی، ئەوساش بۆ حاجی بەکرئاغا لە حاجی مەلا ئەسعەد، دوای ئەویش حاجی مەلا عەبدولا، خزمی نێزیکتری نەبوە بۆ کەینوبەینی وەها حازربوونیان پێویست بێ، کوڕی هەرە گەورەی، ئەمین ئاغا 15-16ساڵی بوە، لێرە بەپێشەوە گوتمان تاعوون خزمی بۆ حاجی بەکرئاغا نەهێشتبوو لە حەوێزییان. کە گوتیشم بەر لە مەرگی حاجی بەکرئاغا باپیرم تەمەنێکی وای نەبوە خوێندنی تێدا کرابێ لە دەرەوەی کۆیێ بۆیە بۆ خوێندنی باپیرم لەگەڵ حاجی لە باڵەکاتی بە «مستعدی» بوە نەک بە فەقێیەتی، خوێندنی درێژە پێ دراویشی کە کردبێ لە غەیری کۆیێ هەر ئەوە بوە کە لەگەڵ حاجی قادردا کردوویەتی.

کە ئەمە وابێ و بخرێتە سەر بەڵگەی یەکەمەوە کە شیعرەکانی حاجی قادر خۆیەتی، گومان نامێنێ لەوەدا سەفەرەکەی حاجی و باپیرم دوای مەرگی حاجی بەکرئاغا بوە، واتە دوای 1270، با بڵێین دەوروبەری 1271، ئاخۆ لەبەرچی نابێ لە 1271 بەم لاوەتر بێ؟ کێ دەڵێ لە 1272 دا نەبوە؟ هەر خۆم دەڵێم نابێ دوای 1271 بووبێ چونکە لە ژیانی مەعلوماتی باپیرمدا گەلێک ڕووداوی تووڵانی و دوورودرێژ هەیە لە سەرەتای گەشتەکەوە تا 1275 ڕوویان داوە هەر نەبێ چوار ساڵێکیان خایاندوە. کەمتر لە چوار ساڵ جێی ئەو ڕووداوانەیان تێدا نابێتەوە. ئەم ساڵەی 1275ـە مێژووی ژن هێنانی باپیرمە. لەم چوار ساڵەی پێشتردا داستانی پڕسۆزی دڵدارییەکەی باپیرم و «حەلیمەی مەلای شێخ وەتمان» ڕووی داوە و لە سێ ساڵان پتر هەر دوویانی بەدەم ئومێد و نەومێدییەوە تلاندۆتەوە تا سەری گەیاندوە بە نەومێدی یەکجاری. دوای سەرکەشیەکی بێهوودەی پڕ لە دڵگەرمی و تۆران و تەقەللای ئێرە و ئەوێ، باپیرم ناچار بوە دەست هەڵگرێ لەو ئاواتە زلەی و سەر دانوێنێ بۆ فەرمانی حاجی مەلا ئەسعەدی باوکی و کچی حاجی بەکرئاغای لێ مارە بکرێ.

داستانی حاجی مەلا عەبدوڵا و «حەلیمەی مەلا محەمەدی شێخ وەتمان» کە مامۆستای باپیرم بوە لە نهێنی و ژێرپەردەیی دەرچوە و بەسەر هەموو زار و زمانانەوە[33] بوە، عاتیفەیەیێکی ئەوەندەش پاک لە نێوانیاندا هەبوە نە باوکی حەلیمە شەرمی لێ هاتۆتەوە نە باپیریشم لە کەسی شاردۆتەوە. باوکم دەیگێڕایەوە کە وا باپیرم تا دوارۆژانی ژیانی ناوبەناوە بە چاوی تەڕەوە دەستی لە سەر دڵی داناوە و گوتویەتی «ئێستەش برینی حەلیمەی تێدایە».

ئەم چەند دێڕەم لە بەسەرهاتی حەلیمەی مەلا بەزیادەوە نووسی بۆ خاتری ئەوە نووسینەکەم نەبێتە «برۆ بۆ خۆت بی پێوە». مەبەستم ئەوەیە هۆی دەست نیشان کردنی 1271 کە سەرەتای گەشتەکەی حاجی و باپیرم بێ، بە دەستەوە بدەم. ئەوەی ڕاستی بێ ئەگەر بۆم ساغ کرابایەوە کە حاجی بەکرئاغا لە سەرەتاکانی 1270 مردوە حەزم بەوە دەکرد بڵێم گەشتەکەش هەر لەو ساڵەدا دەستی پێ کردوە چونکە لە گەلێک ڕووەوە پێنج ساڵەی میانی 1270 و 1275 لەبارتر و گونجاوترە بۆ جێ کردنەوەی بەسەرهاتی ژیانی باپیرم لەو سەروبەردەدا.

لەگەڵ مندا سرنج بدە ئەوە کە وا دوای چەند ساڵێک لە خۆشویستن لە کاتی فەقێیەتی باپیرم لە دێی «شێخ وەتمان» ئەوسا بە ئومێدی خوازبێنی حەلیمە گەڕاوەتەوە بۆ کۆیێ لای باوکی، کە باوک ڕازی نەبوە ئەوجا دەستی کردوە بە تەقەللای ڕازی کردنی لە ڕێی ڕجاکارانەوە.. لە ئەنجامدا باپیرم کۆیەی جێ هێشتوە و ئاوارە بوە بەو نیازە کە وا باوکی ناچار بکا بەمەترسی لەدەست چوونی کوڕی گەورەی واز لە بەرهەڵستی بێنێ و حەلیمەی بۆ بخوازێ. لەو میانەشدا بەوە خەریک بوە کە ئەگەر باوک هەر ڕازی نەبوو بە هۆی یارمەتی خزمانی بێگەلاس و پژدەر بگا بە ئاواتی.. کە دەزانێ باوکی بە دوایدا دێ، پژدەر بەجێ دێڵێ بەرەو

---

[33] – بە دەست خۆم نیە چەندی حیکایەتی حەلیمەم بە دڵدا تێ دەپەڕێ ئەو بەیتەی فارسیم دێتەوە یاد

طپل پنهان چزنم طشت من از بام فتاد
کوس بدنامیء ما بر سر بازار زدند

کوردستانی ئێران بە نیازی«مەلا عەلی تورجانی»، لە دەوروبەری سەردەشت باوکی دەیگاتێ و دەیگێڕێتەوە بۆ کۆیێ.

بە قەناعەتی خۆم لەو چوونەی بەرەو کوردستانی ئێران جازیبەیێکی حاجی قادر کاری تێ کردبێ و بۆ ئەوێی ڕاکێشابێ چونکە حاجی ئەوسا لە کوردستانی ئێران دەیخوێند. هەرچۆنێک بێ سەرکەشی و ئاوارەبوونی بێ سوود بوو و هاتەوە کۆیێ و دوای بەینێک، هەرچەندێکی بووبێ، لە ساڵی 1275 کچی حاجی بەکر ئاغای لێ مارە دەکرێ. وا دەزانم ئەو هەموو کەینوبەینە باشتر لە 5 ساڵاندا جێی دەبێتەوە تا 4 ساڵان. خۆ لە ڕاستیدا گوتەی دەماودەم لە پێنج ساڵانیش پتر باس دەکا بەڵام ئیمکان نیە پتر لە پێنج ساڵان زەمانە کەوتبێتە میانی سەرەتای گەشتەکە و ژن هێنانەکە چونکە نە ئیمکان هەیە گەشتەکە پێش 1270 دەستی پێ کردبێ نە ژن هێنانەکەش لە 1275 دواتر کەوتبێ: نووسراو هەیە ئەوە دەسەپێنێ کە دوەم منداڵی باپیرم لە 1278 بوە، دیارە دەبێ بەلای کەمەوە لە 1275 ژنی هێنابێ دەنا ناشێ لە 78 دا بووبێتە باوکی دوەم منداڵی.

لەم بڕیارانەدا کە وا هێندە بە دڵنیاییەوە دەریان دەبڕم ڕاگەیاندنی حاڵێکی ئاسایی دەکەم بە حەکەم، قسەم لەوە نیە ڕووداوێکی لە عادەت بەدەر کە ئێمە نایزانین وای کردبێ بەسەرهاتەکان پتر یا کەمتر لە پێنج ساڵیان خایاندبێ، ئەمەش ئیحتیماڵێکە کەس چ حیسابێکی بۆ ناکات تا لە کەلێنێکەوە بەڵگەی سەپاندنی گوێ قوت دەکاتەوە.

ئەوەی تا ئێرە لێی دوام بەسە بۆ ڕوون کردنەوەی مەبەس و قەناعەت هێنان بەوە کە سەرەتای گەشتی فەقێیەتی حاجی قادر لەگەڵ باپیرم لە دوای مەرگی حاجی بەکرئاغا بوە، ئیتر یا لە کۆتایی 1270 یا لە سەرەتای 1271 دەستی پێ کردوە.

ماوەی بە یەکەوە بوون و بە یەکەوە خوێندنی حاجی قادر و حاجی مەلا عەبدوڵا لە باڵەکاتی و شێخ وەتمان و ئەو ناوە لە کەسەوە مەعلووم نیە، چۆنەتی ڕابواردن و جێگە جیا جیاکانی تێدا خوێندنیشیان هەروەها بێ سەر و سۆراغە. منیش لە بارەی ئەم لایەنەوە شتێکی ئەوتۆم نەبیستوە بۆ خۆی تەنها شارەزامان کا بە مەوزووعی تۆژینەوەمان. بەداخەوە سەرچاوەکانی خەبەراتی سەر بەو کات و وەزعە، کە جیلی پێش خۆمانە، یەکێکیان بەر حەیات نیە هانای ببەینە بەر و دوو قسەی لێ

وەرگرین، کەسێکیشیان کەموزۆر نووسینی لە پاش بەجێ نەماوە باسی هیچ بارێکی لێرە بەپێشەوە بکا تاکوو لە نێوان تێکڕای نووسینەکە تایبەتییێکی ئەو گەشتەمان چنگ کەوێ.

تاکە هۆیەک مابێ بۆ ڕوون کردنەوەی نەزانراوی و نادیاری ئەو باسە بەراورد کردن و سرنجدان و زیهنکاری شەخسییە. لەگەڵ ئەم خەریکبوونەی شەخسیشدا هاویشتنەوە سەر یەکی سەرجوملەی ئەو کورتیلە گوتەی دەماودەم و نووسینی یەکجار نادیری سەر بەو کات و وەزعەیە. لای من بایی ئەوەی دەنکە کفریتێک لە ژوورێکی تاریکدا هەڵکەی و دوای یەک دوو چرکەی سەعات لێت بکوژێتەوە، خەبەرێک و ئەسەرێک پەیدا دەبێ لێی دەوەشێتەوە ببێتە ناوئاخنی ئەو گەشتە و بەتالاییێکی کەم پڕ کاتەوە لە پانایی هێمای ئەو چەند بەیتەی سەروو کە لە نامەکەی حاجیمان هێنایەوە بە نموونە بۆ ڕاگەیاندنی ماوەی بە یەکەوە بوونی ئەو و حاجی مەلا عەبدوڵا لە گەشتی باڵەکاتیدا.

لە دیوانەکەی حاجی قادر(چاپی هەولێر1969) بەیتێکی بە هەڵە نووسرایەوە هەیە، من ڕاستییەکەی دەزانم، دەشێ ببێتە چاوگ بۆ وەرگرتنی فکرەیێکی تەماوی و ناتەواو، لە هەمان کاتیشدا تێکڕایی و گشتی، لە بارەی ماوەی بە یەکەوە بوونی حاجی و باپیرم و جۆری ڕابواردنیان لە باڵەکاتی. وەک لێرە بە دواوە بۆ خوێنەری ڕوون دەکەمەوە، وەنیە لەبەر زیهنکاری و وردبوونەوەی مووقڵێش، کە لای یەکێکی دیکە غەیری من نەبێ، من لەو بەیتە سوودێکی ئەوتۆ وەردەگرم بە کەس وەرنەگیرێ، نەخێر ئەوەی لێرەدا یارمەتی من دەدا ڕووداو و بەسەرهاتی ئەوتۆن پەیوەندییان لەگەڵ ئەو بەیتە هەیە من دەیانزانم و کەم کەس بیستوونی. هەر ئەو زانینەیە واش دەکا بتوانم بەیتەکە ڕاست کەمەوە.

لە ڕووپەڕە 106 ی دیوانی حاجی «چاپی هەولێر» ئەمە دەخوێنینەوە:

«مەلکەقور» و «حجاری» وەکیل
قس من اسمائهم و لا تسئل

ئەم بەیتە بەو جۆرەی لە دیوانەکەدا نووسراوە نە کێشی تەواوە نە قافیە و نە هیچ واتاییێکیش ڕادەگەیەنێ. دوو وشەی«ملکەقور» و «حجاری» بخرێتە ناو کەوانە و

وشەی «وەکیل»یان بەدوادا بێ لێیان چاوەڕوان دەکرێ سەر و سۆراغێک لەو وەکالەتە بە دەستەوە بدەن و خەبەرێکی تایبەتی ڕابگەیەنن، کەچی لە خامۆشیی بێ کێش و قافیە بەولاوە گوێت لە چ سەدایێک نابێ. ڕاستی بەیتەکە ئەوەیە من ئێستاکە پێتی دەڵێم:

«ملکه قۆڕ» و «حیماری» «کیسه شکەل»
قس من اسمائهم ولا تسئل

وشەی«اسمائهم» دەبێ هەمزەی یەکەمی بکرێ بە هەمزەی «وصل» تاکوو کێشی بەیتەکە ڕاست و بێگرێ بێ. بە ئیملای کوردی کە وای بنووسین وەک دەی خوێنینەوە بەم جۆرە دەنووسرێ «قیس مینەسمائیهیم».

حاجی قادر لە لیستەی ناوی شاعیرانی کورد کە خستوونیە نێوان دێڕە شیعرەکان هەڵبەستەکەیەوە، ئەم سێ ناوە عەنتیکەیە دەنووسێ وەک نازناوی سێ شاعیر. نازناوی وەها لەوان بەپێشەوە نەبیستراوە، بە دوا ئەوانیشدا پەیدا نەبۆتەوە.

نەک هەر ئەم سێ شاعیرە نازناوی وایان بە خۆوە ناوە، ئەوان سێیانە و گرووپێکی قەڵەباڵغ لە برادەرانیان، کە هەموویان فەقێ و مەلا بوون و لەگەڵ حاجی قادر و باپیرم لە باڵەکاتی خوێندوویانە، ناوی وەها سەیر و نەبیستراویان کردوە بە لەقەبی بویژی و یەکتریان پێ هەڵداوەتەوە و کردوویانەتە مەداری شەڕە شیعرێنە و گەپ و پێکەنین و نوکتە لە یەکدی گرتن. جگە لەو سێ ناوە چەند ناوێکی دیکەم بە بیر ماون کە لە باوک و مامم بیستوون، ئەوانیش بە درێژەی سەرکوزەشتەکەوە لە باپیرمیان بیستوە.

بەدوا «ملکە قۆڕ و حیماری و کیسە شکەل» دا کە حاجی لە هەڵبەستەکەی ناویان دێنێ ئەم ناوانەشم دێنەوەبیر: داڵ واو دوو، فس گوریس، قەبرخوار، پەڕبەجیق. لێردا سەرجوملەیان کردی حەفت شاعیر، کە ئەمانە هەندێکن لە هەموو، کەمێکن لە زۆر. ئەمانە و چەندێکی دیکە کە ناویان بزرە و لەبیر چوونەوتەوە، کۆمەڵە فەقێ و «مستعد»ێک بوون لە مزگەوتەکەی «ملا محمد»ی شێخ وەتمان و چەند مزگەوتێکی دیکەی باڵەکاتی هەموویان شاعیر و قەشمەرباز و گاڵتەچی، ڕۆژانی بێ

دەرسی بۆ لای یەکدی چوون و تێکڕایان کۆڕی گەپ و گۆبەندیان ڕێک خستوە و ساڵیان پێ بردۆتە سەر، ئەگەر نەڵێم عومر.

لە ڕووپەڕەی 108ی دیوانەکەی حاجی(چاپی هەولێر) ئەم بەیتە دێتە بەرچاو:

«مەلکە» مان مەلکە مووتی مەعنایە
یەعنی هەر چۆنێ حەز بکا وایە

بۆم ساغ ناکرێتەوە ئاخۆ ئەم «مەلکە»یە هەمان«مەلکەقۆڕ» ە کە زووتر ناوی هێنا یاخود شاعیرێکی تازەیە غەیری ئەو. سرنجێکی بە پەلە لە وەسفی «مەلکە» بە ڕستەی «مەلکەمووتی مەعنا» و بەراورد کردنی لەگەڵ ئەو وێنەیەی بۆ مەلکەقۆڕ پەیدا دەبێ لە سێ بەیتی پێشوتردا کە دەڵێ:

مەلکەقۆڕ و حیماری کیسەشکەل
قس من اسمائهم ولا تسئل

شیعریان جوانە، بەس نیە کوردن
گەرچی بەدناون و گەلێ وردن

بەفیدایان دەکەم سەد «إبن یمین»
چونکە دەربەستی غیرەتی کوردین

وا ڕادەگەیەنێ «مەلکە» و « مەلکەقۆڕ» یەک کەس بێ بەڵام لەوانی دیکە بە دەسەڵاتتر بووبێ لە شیعردا بۆیێ دوو جار خۆ داوێتەوە بەر زیهنی حاجی قادر. لە فەرزی یەکێکی تریش بووبێ، شاعیرێک بوە لە دەستە و مەشرەبی مەلکەقۆڕ و هاوڕێکانی، هەر لەو گرووپەش بوە کە ئەوسا لە باڵەکەتی کۆمەڵ بوون. دیاریشە لە واتای ڕستەی «هەر چۆنی حەز بکا وایە... مەلکەمووتی مەعنایە» کە لە کاتی گوتنی شیعرەکەدا «مەلکە» زیندوو بوە. هەمان شکڵ، داڕشتنی بەیتەکانی پێشووتریش کە کاتی «حاڵ» ڕادەگەیەنێ دیار دەدا «مەلکەقۆڕ» و دوو هاوڕێکەی نەمردوون. لەمەدا هەرچەند ئیسپات پەیدا نابێ کە مەلکە و مەلکەقۆڕ یەک

کەسن، نەبوونی «تعارض» دەردەکەوێ لە یەکبوونیان بەوەدا کە هەر دوویان زیندوون: ئەگەر هەڵبەست ڕای گەیاندبایە کە یەکێکیان زیندوە و یەکیان مردوە، ڕاستەوخۆ دیار دەکرا کە دوو کەسی جیاوازن. دەشزانرێ حاجی ئاگاداری ئەحواڵی مردن و ژینیان بوە.

لە شیعرەکانی حاجی و بەسەرهاتێکی منیش دەی گێڕمەوە، وا دەردەکەوێ، ئەو دەستە شاعیرە بە کوردی شیعریان گوتوەو خۆیان لە فارسی و عەرەبی نەگەیاندوە. بەڕاستی کارێکی ئەوان کردوویانە لە لانی جەربەزەیی و قۆشمەییەوە بە بەر ئەوە ڕانەگەییوە نوکتەی یەک لە دوایەک و تریقەی پێکەنینی قسەی نستەق و پەلار و توانجی توێکڵدار لە دەرووندا گیر بخۆنەوە تا وەریان دەگێڕنە سەر زمانێکی تر. هەر وەک کابرای عەرەب گوتی:

ولست بنحوی یلوک لسانه
ولکن سلیقی أقول فأعرب

ئەوانیش دەرفەتی خۆهێنان و بردنیان نەبوە بەدوا ڕستەی ڕێکوپێکدا بگەڕێن لە زمانی بێگانەدا، بێ سێ و دوو کوردانە لە سەر و گوێلاکی یەکدییان ڕاکێشاوە.

حاجی قادر لە شیعرەکانیدا زیمنەن ناڕەزایی خۆشی دەربڕیوە بەرانبەر دانانی شیعری فارسی و عەرەبی لە لایی شاعیرانی کوردەوە. دیارە بۆ خۆی ئەوسا لە کوردی بەولاوە شیعری نەگوتوە، وەتەنگیش هاتوە لە دانانی شیعری غەیری کوردی لەلایەن شوعەرای کوردەوە کەچی پێ دەچێ ئەوسا هێشتا هەر باوی مابێ بایی ئەوەی هەستی حاجی بریندار بکا. ئەوەش دەفامرێتەوە لە قسەکانی حاجی کە ئەو سێ (یاخود چوار) شاعیرە هەر بەردەوام بوون لەسەر شیعری کوردی و دەنگ و خەبەری خۆیان و شیعریان گەیشتۆتەوە حاجی، واتە قسەکان و تەنها ئیشارە نین بۆ سەردەمی فەقێیەتی کە لە «باڵەکەتی» دا ئەو گرووپە شەڕە شیعریان تێدا کردوە بە کوردی.

بەپێی گێڕانەوەی باپیرم ئەو شاعیرانە لە هەموو ناوچەکانی کوردستانەوە هاتوون، وە نییە تەنها هی دەوروبەری ڕەواندز و کۆیە و بابان بووبن. ڕێکەوتی خوێندن کۆی کردوونەوە و هەر یەکەی لە جێگەیێکەوە هێناوە. ئەو هێندە قسەی کە لە زاری

«مەلکە قۆڕ»ی گێڕاوەتەوە بە لەهجەی کرمانجی سەروو بوە، ناوچەی شاعیرەکانی دیکە ڕوون نابێتەوە چونکە وتوویژێک کە لێیان نەقڵ کراوە نەخراوەتە پاڵ تاک تاکیانەوە. بەڵام «حیماری» لەوە بەدەرە و ناوچەی مەعلووم دەکرێ لە ڕێی ڕووداوێکی دیکە جگە لەوەی باپیرم دەی گێڕێتەوە. بە دوا سەرگوزەشتی تاقمی«باڵەکەتی»دا هی تایبەتی«حیماری»ش دەخرێتە بەرچاوی خوێنەر. بەپێی پێویستی جێگە و لێکدانەوەی هەندێ ڕووداو و تاکە بەیتێک کە بە زمانی حاجییەوە نەقڵ دەکرێ نەختێک پتر لەگەڵ ئەودا خەریک دەبین.

پوختەی گوتە لە مەوزووعی ئەم جەماعەتە ئەوەیە کە باپیرم و حاجی قادر دەچنە باڵەکەتی زۆرینەی ئەوان پێشتر لەوێ خوێندوویانە و، ئاغڵەبیشیان لای«مەلا محمد»ی شێخ وەتمان موستەعید بوون. حاجی و باپیرم دەبن بە هاوڕێی خوێندنیان و برادەری ڕاگواستنیان لێرە و لەوێ و سەفەری فەقێیانەی ناو خێڵ و عەشرەتان.

بەو نیازە کە شوێنەواریان کوێر نەبێتەوە و سەبارەت بەوە کە وا پەیوەندییان لەگەڵ سەردەمێکی ژیان و جۆری ڕابواردن و خوێندنی حاجی قادردا هەیە و ناوی سێ یاخود چوار کەسیان کەتۆتە نێو دیوانەکەیەوە و بۆ مەبەسی ئەو سەرگوزەشتیان بکەین بە هۆی دیار کردنی مەودای مانەوەی حاجی قادر لە باڵەکەتی، من لێرەدا چی لە بیرم ماوە دەربارەی بەسەرهاتییان تۆمار دەکەم. باوکم و مامم دەیان گێڕایەوە لە زمانی باوکیانەوە، ڕووداو و شیعر و نوکتە و گەپ و ڕابواردن و هەموو کەینوبەینێکی سەربە مانەوە باپیرم کردبووی بە نامێلکەیێکی شکڵ کەشکۆڵی هۆندنەوە و پەخشان بە زمانی کوردی و لەژێر ناوی «ئاتەشکەدە»دا. زۆر بەداخەوە ئەم «ئاتەشکەدە»یە لەگەڵ چەند کتێبێکی دیکە لە کتێبخانەی مەلایێکی کۆیی، هەر لە ژیانی باپیرم دا، سووتاوە و لەناو چوە. تاکە یەک نوسخە بوە بۆ خوێندنەوە دەستاودەست مەلاکان لە یەکدییان وەرگرتوە تاکوو قەدەر کردی بە خۆراکی ئاگر، هەر دەڵێی ناوەکەی خۆی کە «ئاتەشکەدە»یە سووتاندی و بە گوتەی کوردی خۆی خواردەوە.

چەندێکی من لێرەدا دەی نووسم بەشێکی یەکجار کەم و کورتیلەیە لەو زۆرەی باوکم دەیگێڕایەوە، هی باوکیشم کەمێک بوە لە چاو ئەوەی لە باپیرمی بیستوە. بێگومان ئەو هێندەی باپیریشم بە زار باسی کردوە کەمتر بوە لەوەی ناو کەشکۆڵەکە، چونکە لەو کاتەی کەشکۆڵەکەی تێدا نووسراوە تا ئەو ڕۆژەی باوکم

گەیشتۆتە تەمەنێکی ئەوتۆ گوێ بداتە سەرگوزەشتی وەها 30 ساڵێکی بەسەردا تێپەڕیوە، ماوەی سی ساڵانیش چەندین ناو و ڕووداو و شریتەی باس و خواس لە مێشک دەسڕێتەوە، بە تایبەتی چونکە سەرگوزەشتی ئەو کۆمەڵە شاعیرە ڕووداوی چەند ساڵێکی گرتۆتەوە و قسەی لە چەندین کەس گێڕاوەتەوە و شیعر و شەڕە دەندووکێی چەند جاران تێک هەڵقژان و یەکدی قۆستنەوەی باس کردوە. هەڵبەت حیکایەتی وا توولانی و زۆر قارەمان و پڕ گرۆگاڵ و دەمەتەقە و شەڕە شیعرێنە بە نووسینەوە نەبێ ناپارێزرێ.

مرۆڤ چەندێک بیری تیژ بێ شتی تێکەڵ و پێکەڵی لەبیر دەچێتەوە. لەگەڵ ئەمەشدا کەمتاکورتێک کە من لەبیرم ماوە بە نووسینەوە لە فۆتانی ڕزگار بکەم چاکتر لەوە بە تەواوی لە ناو بچێ. ئەوەی ڕاستی بێ سەرەڕای لایەنی پەیوەندی ئەو سەرگوزەشتە لەگەڵ پلەیێک لە ژیانی حاجی قادر و جگە لە ڕوون کردنەوەی زەرفێک کە چەند بەیتێکی دیوانی حاجی خەریک کردوە، چەسپاندن و نەمرانی ڕووپەڕەیەک لە مێژووی فەرامۆشکراو و داب و دەستووری کوێر بوویەوە و ژیاندنەوەی ناو و یادی چەند شاعیر و ئەدیب و قسە خۆشی کورد ئەوە دێنێ، زیاتریش دێنێ، من هەندێک خەریک بم بە نووسینەوەی و خوێنەری کوردیش چاوێکی پێدا بخشێنێ.

بەگوێرەی باسێک کە باپیرم نەقڵی کردوە، ئەو تاقمە شاعیر و قسە خۆشانە مەیلیان بۆ گەپ بە نیسبەت خەلقی ئەوسا و ئێستاکەوە لە حەد بەدەر بوە. ئەو مەیلەش بەلای باوەڕی خۆمەوە، هەر لەوەوە نەهاتوە ئەوسا ژیان لە هی ئێستا سادەتر بوە و بەس، دەبێ باری ژیان و گوزەران و ڕابواردنیش یارمەتی خەلقەکەی دابێ بۆ ئەوە پڕ بەدڵ پێبکەنن و بە زۆری خەریکی خۆش گوزەرانی بن. ئەم شێوەی خۆش گوزەرانی کە دێتە بەر چاوی «تصور»ی من نەک تەنها لە دەلالەتی گەپ و پێکەنین و شەڕە شیعرێنە دەتریسکێتەوە، بەڵکوو جارێکی دیکەش لە ڕێبازی «مفهومی عکسی»یەوە خۆ بەدیار دەخا لە شیعرەکانی حاجی قادردا:

دەڵێن ئێستا هەواری گورگ و شێران
وەکو قەلبی حەسوودی تۆیە وێران

چکاوە ئاوی پرژ و گۆلە شینی
نەماوە هەر لە کۆتر تا شەهینی

گەرووی شێخی لە لوقمەی کۆچ باران
موعەررایە میسالی ڕۆزەداران

ئەم چەند دێڕە شیعرەش بەڕادەی ڕاگەیاندنی پێکەنین و گەپ، لە قالبی «سلب»ی خۆیدا «ایجاب»ی خۆشی و ئاوەدانی و بەروبووم و داهات و تێریمان بۆ دەگێڕێتەوە. حاجی لەو بەیتانەیدا یادی ولاتێکی ئاوەدان دەکاتەوە. تۆ بڵێی لە میانی سالانی سەرەتاکانی 1270 کۆچی، کە کاتی خوێندنی حاجی قادرە لە باڵەکاتیدا، تا ساڵی 1306 وەیا 1307ی کۆچی کە نامەی بۆ باپیرم ناردوە و ئەو چەند بەیتەی تێدان، چ کارەساتێک، خۆشی و ئاوەدانیی ئەو ناوچەیەی گێڕابێ بە پێچەوانە[34].

مەوداکە دەوری 30 ساڵێک دەگرێتەوە، مێژووی هێندە کۆن نیە پەردەی تاریکی کۆنینەیی بتەنێ لەسەر دروشم و کەینوبەینی، کەچی ئەوەندەی تێ دەفکرم بۆ دۆزینەوەی هۆیەکی ئەوتۆ لەو سالانەدا کاری وێرانکەری کردبێ لەو ناوچەیەدا، لە تاکە هۆییێک بەولاوە نایێتە زیهنمەوە، کە خۆشم پێی ڕازی نیم، ئەویش ڕشانەوەکەی ساڵی 1281 ی کۆچی بێ. کە دەڵێم «پێی ڕازی نیم» بۆیەیە چونکی وەک ئێستا دەڵێم و جارێکی دیکە بە درێژتری دووبارەی دەکەمەوە بە تەواوی ساغ نەبۆتەوە، ئاخۆ حاجی قادر لەو ساڵەی1281 ـەدا لە کۆیێ بوە یا بەرەو ئەستەمبۆڵ

---

[34] – لە کاتی گێڕانەوەی ئەم تێبینییەدا مامۆستا عەلائەدین سەجادی گوتی لە 1288ی کۆچیدا گرانییێکی زۆر سەخت بە سەر ئەو ناوچەیەدا هاتوە کە باڵەکەتیش دەگرێتەوە، لێی دەوەشێتەوە وێرانییێکی وەهای پەیدا کردبێ بووبێتە هۆی بزاڤتنەوەی پەرۆشی حاجی قادر لەم بەیتانەدا.

لە میانی 1288 و کاتی هەڵبەستنی شیعرەکانی بەلای کەمەوە 18ساڵ مەودا هەیە. وا دەزانم، بەعادەت، هەژدە ساڵ بەشی ئەوە دەکا ئەگەرچی چ کۆسپێکی تر نەهاتبێتە بەر ژیانی خەلقەکەوە، تێری و خۆشیی پێشووتر پەیدا بکەنەوە. لەگەڵ ئەمەشدا تێبینیەکەی مامۆستا عەلائەدین بایەخی خۆی هەر هەیە.

ڕۆییوە، هەرچەند لای غالب ئەوەیە کە هێشتا هەر لە کۆیێ بوە. کە لە کۆیێ بووبێ کارەساتی ڕشانەوەکە بۆ ئەو دەبێتە شتێکی زانراو کەڵکی ئەوەی لێ دەبڕێ دوای بیست و ئەوەندە ساڵە ببێتە هۆیەکی نهێنیی وێرانبوونی ئەو ناوچەیە و حاجی سەری لێی سوڕ بمێنێ.

هەرچۆنێک بێ دەبێ هۆی گۆڕانی باری ئەو ناوچەیە بەرەو ناگوزووری شتی ئەوتۆ بێ دەنگی نەدابێتەوە و لە دوورەوە خەبەری وەرنەگیرابێ. ئەم تێبینییانەم لەوەوە هەڵ دەستێ کە بەلای منەوە حاجی قادر لە بەر کزە و سۆزی غوربەتی سادە نیە وا بە پەرۆشەوە باسی ئەو شوێنانە دەکا بە چۆلی و وێرانی، پێداگرتنی لە سەر دیمەنی ئەو جێگایانە بە وێرانی لە سێ دێڕە شیعری یەک بە دوایەکدا، وێنەی واقیع دەگرێ زیاتر لە کزەی سادەی دەروون. تێکڕای شیعر و دیمەن و ڕووداو و مێژوو لەگەڵ تێبینیەکانی من وان لەبەر چاوی خوێنەر،کە نەتوانم قەناعەتی پێ بێنم بە بیر و باوەڕی خۆم دەمێنێتەوە خۆی و قەناعەتێک کە بۆی پەیدا دەبێ.

لێرەدا پێویستە ئەوەش بێنمەوە بەرچاوان کە پێشتر گوتم، زانینی زەرف و ڕووداوی پەیوەند بە هەڵبەستەوە گیانێکی بە بەر دێنێتەوە مومکین نیە بێتەوە بەری ئەگەر زانینەکەی لەگەڵدا نەبێ. دۆزینەوەی دەماری بەستنەوەی سۆزی دەروون بە ڕووداو و واقیعەوە ئەو تین و تاوە دەردەخا لە هەڵبەستدا کە «تفاعل»ی کیمیایی میانی مادده و مادده وەیا مادده و هێز پێکی دێنێ.

خەریکبوونی ئەو کۆمەڵە شاعیرە بە گەپ و قسەی خۆش و پێکەنین کژی تایبەتی نەبوە: لە حوجرە بووبن یا لە سەفەر یا لە هەواران، باوەڕم هەیە لە کاتی دەرس خوێندنیشدا، هەر بۆیان ڕێک کەوتبێ نوکتەبازییان کردوە. دێتەوە بیرم لە گێڕانەوەی ئەو بەسەرهاتە لە زاری باپیرمەوە، باوکم دەی گوت عەرزی باوکم دەکرد کە حاڵی خوێندنتان وا بووبێ چۆن بوون بە مەلا، لە وەرامدا باوکی پێی گوتوە ڕۆڵەم بەخوا نازانم چۆن بوومە مەلا. بەڵام بە نیسبەت حاجی مەلا عەبدولاوە بیری تیژی زۆر یارمەتی داوە کە لە خوێندن دانەمێنێ. باوکم باسی دەکرد، باپیرم لە ڕۆژانی دوایی ژیانیدا چەندین مەبحەسی کتێبە زەحمەتەکانی پلەی ژووورووی خوێندنی مزگەوتی پیت بە پیت لەبەر بون.

یەکێک لەو شاعیرانە کە نازناوی بە من نەگەییوە ناوی مادەرزادی «بو منصور صوفی...»بوە. ئەم خاڵانەم دانا لە جێگەی دوا وشەی ناوەکەی کە لەبیرم نەماوە. بەپێی دەستووری «تخفیف» کە لە زۆر ماددەکانی خوێندنی مزگەوت ناوی دێ و کاری پێ دەکرێ تەخفیفاتی لە ناوەکەی خۆیدا کردبوو: گوتبووی ناوەکەم لەفزەکانی قورسن دەیانگۆڕم بە لەفزی سووکتر و ئاسانتر. لە «بو منصور» هەوەڵ جار وشەی «بوم» دێتە پێشەوە ماناکەی «کوندەبۆیە» و تەیرێکی ناقۆلایە، دەیگۆڕم بە «کۆتر» جوانتر و ئێسک سووکترە. بە دوا «بوم» دا ئینجا لەفزی «من» دێ ئەویش لە «کێشان» قورسە ئەگەر بە لەفزیش نەبێ، دەیکەم بە «رطل» لە «من» سووکترە و چەند«رطل»ێک دەکا یەک «من». لەفزی «صور» ناوی ئەو شەیپوورەیە لە ڕۆژی قیامەتدا بە دەنگە زلەکەی مردوو لە قەبری دێتە دەر، «بوق» کە بۆڕیەیە لەو سووک و چووکترە، «صور»یش بوو بە «بوق». لە لەفزی«صوفی» وشەی «صوف» هەیە بە کوردی «خوری»یە و دڕ و زبرە، «پەشم» لەو نەرمتر و جوانترە. لەو وشەی خاڵم لەجێ دانا تخفیفاتی کردبوو بوو بوە «پازدە». خولاسە لەدوا تەوش و تراش و ئاسان کردن ناوەکەی خۆی کردبوە «کوتر الرطل البوق بن الپشم والپازدە» بڕیاریشی دابوو تا بەو ناوە سووک و خۆش و کورتیلەیەی بانگ نەکەن وەرام نەداتەوە. دەوجا هەموو جاران دەبوا بانگی کەن «کوتر الرطل البوق بن الپشم والپازدە» ئەوسا لە سەری زمانیەوە بڵێ «هۆو» چونکە وشەی «هۆو» لە بەڵێ کورتترە.

بەو تەرزە وتوویژ و گەپ و گاڵتەیە چەندین ڕۆژ و شەو و هەفتە و مانگیان ڕابواردوە و لێی تێر نەبوون. یەکێکیش لەوان دەمەتەقە و نوکتە لە یەکدی گرتنە، دڵگیری و تووڕەبوونی لێ پەیدا نەبوە. زۆرجاران وابوە لە بانگدان یا لە عەینی نوێژ کردندا نوکتەیان بۆ هاتوە نوێژ و بانگیان بۆ بڕیوە تا نوکتەکەیان ئەدا کردوە بە دوا ئەودا نوێژەکەیان بە قەزا گێڕاوەتەوە. بەڕاستی تاقمێک بوون هەرگیز لە خۆیان بەپێشەوە مانەندیان نەبوە بەدوا خۆشیاندا تا دونیا دەبڕێتەوە ئیمکانی هاتنی مانەندیان نابێ، زاتەن بە پێی زاهیری حاڵ تازە ئەو ڕۆژگارە بەسەرچوو وەزعی وای تێدا هەڵکەوێتەوە.

مێژووی سەردەمی عەباسیەکان لە ئەخباری بوێژەکانی کەیفچی و ئایین سووک هەندێ ڕووداوی ئەوتۆ دەگێڕێتەوە لە هی ئەو گرووپە بکا، بەڵام نە لە سەردەمی

عەباسی و نە غەیری عەباسی ڕووی نەداوە مەلای سەرسپی و قورعان خوێن هێندە زارشڕ و کەمشەرم و گاڵتەچی بووبێ، تەنها مەلاییێکیش نەبێ ڕێکەوت فێری نوکتەی کردبێ، یەک تاقمی تەواو لە مەلایان بن هەر یەکەیان گرەوی قۆشمەیی لە ئەبوو نواس بباتەوە. فەرموو سەیری ئەم نموونەیە بکە لە نوکتە - جنێوی هەڵبەست: یەکێک لەو کۆمەڵە شاعیرەی ئاخرزەمانە لە کاتی گاڵتە و پێکەنین و شەڕە شیعرێنەی عادەتی خۆیاندا ئەمەی بە مەلکەقۆڕ گوتوە:

دەتبەمە سەر ئاوە گردی
دات دەهێڵمێ «....»ی کوردی

ئیقباڵی خۆت ئەی مەلکەقۆڕ
ئەگەر ژیای ئەگەر مردی

مەلکەش بەو پەڕی زەوق و شەوق و سمێڵەخنکێوە بە لەهجەی بادینی گوتوەتی هەڵبەستەکە «تقطیع» دەکەم ئەگەر «تفاعیل»ی ڕاست بێ قبووڵمە دەنا قبووڵی ناکەم: دەتبەمە سەر مستفعیل، ئاوەگردی مستفعیل، دات دەهێڵمێ مستفعیل... هتد، بابە خوا بەزیادی کا قبووڵمە.

ئەو سەرگوزەشتانەی باپیرم لێی گێڕابوونەوە و ئێستاکە من لەبیرم نەماون ئەوەندە قوت و سەیر بوون فەرقێکیان نەبوە لەگەڵ حیکایەتی «سێ کۆسە». هەموو بزووتنەوەییێکیان تێکەڵ بە نوکتە و پێکەنین بوە، وەک ئەوەی دونیا لە لەحزەی حازری بەولاوە تێدا نەبێ.

بەو جۆرە بێغەمی و بێباکی و پڕئاسوودەیی ڕۆژگاریان بەسەر بردوە، تا دمەو بەهارێکیان خەلق لە هەواران دەبن و لە ڕەشماڵاندا دەژین، ئەوەی لە گوندانیش دەمێنێتەوە بە ڕۆژ هەر دەچنە دەرەوە خەریکی کاری هەمەچەشنەی بەهاران دەبن، فەقێیان دەکەونە سەر خەیاڵی بەرپا کردنی گۆبەندێکی کوردانەی زۆر کلاسیکی و تێکەڵ بە گەپ و گاڵتە کە دەشوبهێتە شانۆگەری کۆمیدی بەڵام شانۆکەی دەشتودەر و عێل و عەشرەت بێ نەک چەند پەردە و تەختە و تابلۆی نەقشاو. بە عادەتی کۆنینەی کوردەواری، فەقێیان دەستە و تاقمی خۆیان ڕێک دەخەن و کاردروستایی فەرمانڕەوایی و حاکمەتی گەپی «میرمیرانێ» دەکەن کە جارەها بە

جۆرێکی نیوە ڕاست و نیوە گەمە لە گەلێک شوێنی کوردستاندا بەرپا کراوە. (وەک بیستوومە دواجار لە سلێمانی کرابێ لە کاتی«احتلال»دا بوە، لە سەرەتاکانی 1920).

فەقێیەکان «پەڕبەجیق» دەکەن بە «میرکوڕان» واتە فەرمانڕەوای پیاوان، یاخود ئیمپراتۆر. کچانیش وەک پیاوان ڕێکخراوێکی ژنانەی سەربەخۆ پێک دێنن بۆ مەبەسی گەپی بەهار و بەربەرەکانی وەیا چاولێکەری پیاوان. کچان لەو جارەدا «کەڵەشێر»ێک دەکەن بە میر. عادەتەن کچێک دەکرایە سەرۆک و پێی دەگوترا «میرکچان» ئەم «میرکچان»ە تا ڕادەیێک لە «کچی نموونە - ملكة الجمال»ی ئێستاکەی کردوە، لە هەڵبژاردنیدا جوانی و چابووکی و بەرچاوی و ئارایی و زۆر ڕەوشتی پەسندی تێدا ڕەچاو کراوە.

وەک بڵێی لەم جارەدا کە باسەکەی دەگێڕمەوە نەوەک لە کەینوبەینی گەپ و بەربەرەکانی و بە یەکدی کەوتنەوەی کچ و کوڕان تیری وشە و پلاری نوکتە بەر کچەکە بکەوێ ئەم کەڵەشێرەیان کردوە بە میر: هەروەک ئێستاکە بۆت باس دەکەم، لە هەڵبژاردنی کەڵەشێرەکەدا، کچان عەقڵێکی تەواویان بە خەرج بردوە.

گەمەی«میرمیرانێ» سەردەمێک لە نێوان خەلقدا بە تێکڕایی و لە نێوان فەقێیاندا بە تایبەتی لە کوردستان باو بوە. بە درێژایی بەردەوامبوونی گەپەکە حوکمی «میر» هێندەی حوکمی والییێک کاری کردوە، چی کە فەرمووبێتی کەس بێ ئەمری نەکردوە، بەڵام ئەوەی کچانیش میرێک بۆ خۆیان دانێن هێندەی هی پیاوان لە برەو نەبوە، تا بەرەو گەرمیانیش هاتبای بەرەو کزبوونەوە و نەمان دەهات. «میرکچان» زیاتر لە نێو عەشرەتەکانی دوورە شار دەستوور بوە.

کورتەی قسە ئەمەیە، ئەم جارەیان کوڕان و کچان ئەوەی بۆیان کراوە لە «حوکمڕانی»ی سەربەخۆ کردوویانە. بەدەم یاری و گاڵتەی بەهارانەوە خەرج و باج کۆ دەکەنەوە و ئەمر و نەهیان دەکەن و تاوان و جەریمەش دادەنێن بۆ ئەو کەسەی لێی بوەشێتەوە. هەر لە بچووک و بێدەسەڵاتەوە تا گەورە و سەرۆک عەشرەتەکان بەپێی دەستووری ئەوسای «میرمیرانێ» هەموویان فەرمانبەری بێ ڕەخنە بوون بۆ فەرمایشی میر کوڕان و میر کچان.

لە لایەنی خەرج و باج و پیتاکەوە سەرۆک عەشرەت و دەوڵەمەندەکان، بەتایبەتی، چی لێیان داوا کرابێ، بێ گیروگرفت داویانە، لە سۆخرە و بێگاری و وڵاغ خواستنەوە

و هەر کارێکی تریش «میر» بە پێویستی زانیبێ بۆ سوودی «حکومەت»ـەکەی سەرپێچی تێدا نەکراوە لەلایەن کەسەوە.

گەپ و گەمەیێک کە درێژەی کێشا بە زۆری ڕوو لە ناکۆکی دەکا، هەندێ جارانیش کارەساتی لە عادەت بەدەری لێ پەیدا دەبێ. ئەم جارەیان بەهۆی بوونی دوو حکوومەتەوە و سەبارەت بە هاڤرکێ و بەربەرەکانی میانی کوڕان و کچان، ماجەرایەکە زیاتر لە ماوەی عادەتی درێژە دەکێشێ و هیچ لایێکیان نایەوێ پێش لایەکەی دیکە حکوومەتی خۆی تێک بدا و ببێتە ڕەعییەی حکوومەتەکەی تر کە جارێ هەر بەردەوامە. حوکمڕانیی دوو حاکمان لە یەک جێگەدا وردەوردە و کەمکەمە تێک هەڵقژان و بەیەک کەوتنەوەی لێ ڕوو دەدا. وا بوە لە کۆ کردنەوەی خەرج و باج و پیتاکدا باجگری کوڕ و کچ لە یەکتریان ڕاخوڕیوە، شەڕە جنێو و شەڕە چەپەڵۆکیشیان کردوە.

وا دیارە پیاوەکان، لە ئەنجامی بەربەرەکانی بێوچانی کچان و خۆ بەکەم نەگرتنیان لە عاست پیاواندا، وەتەنگ دێن و دەماری سەرۆکایەتیی مێژووییان بەخەبەر دێ و بە شکڵێکی بەهانەکارانە میر کوڕانیان کە «پەڕبەجیق»ـە قاسید دەنێرێ بۆ لای کچان و پێیان ڕادەگەیەنێ کە وا دەبێ «میرکچان» بێتە سەردانی«میرکوڕان» چونکە بەپێی فەرمانی قورئان کە ئایەتێکی دەفەرموێ «الرجال قوامون علی النساء» کچان دەبێ سەر فروو بێنن بۆ پیاوان و گەورییان بسەلمێنن.

کچانیش دوای وتووێژی ناوخۆیی قاسید دەنێرنەوە بۆ لای «میرکوڕان» و داوای لێ دەکەن بێتە «خزمەت میرکچان» چونکە بە دەستووری «الجزء یتبع الکل» میری کچان زاڵترە و مافی پێشەوایی هەیە: میری کوڕان کە «پەڕبەجیق» بێ تاکە یەک پەڕە ئەویش جیقناوی، میرکچانیش کە وا «کەڵەشێرە» هەزاران پەڕی خاوێنی پێوەیە.

ئەو«منطق» بەکارهێنانەی کچان شتێکی سەیر نەبوە لەو جێگە و کاتەدا، چونکە خوێندەواریان تێدا بوە، یەک لەوان «حلیمە»ی کچی مەلای شێخ وەتمان بە هۆی ئەوەوە کە لە بنەماڵەیێکی خاوەن مزگەوت و فەقێ و دەرس و کتێبخانە بوە نەک هەر خوێندەوار، بوێژیش بوە. بوێژیی حەلیمە جێی شوبهە نیە چونکە باپیرم ئەو

ڕاستییەی باس کردوە و گەلێک لە شیعرەکانی حەلیمەشی لەبەر بوە، زۆر بەداخەوە لەو نیو فەردە بەولاوە کە بۆ باپیرمی داناوە هیچی ترم لەبەر نیە:

ئەگەر زەهراوە دەینۆشم شەرابی دەستی عەبدولڵا

باپیرم و حەلیمە گەلێک شیعریان بۆ یەکدی داناوە، هەموویان فۆتان: ئەگەر مابان دیوانێکی شیعری دڵداری زیندووی کوڕانە و کچانەیان پێک دێنا ببا بە نموونەی ئەدەبی دڵداری ڕاستەقینەی ئەوسای کوردی. ئەم دوو دێڕەی خوارەوە کڵپەیێکی سۆزی باپیرمە بەرانبەر بە حەلیمە:

کە بێری هاتە ناو مێگەل سەراپا قرمزی پۆشی
مەلا ئیدراکی چوو شێخیش تەریق زاهید نەما هۆشی

حەبیب دیتی ڕەقیب وەستاوە سەرپۆشی بە ڕوودا دا
گوتم هەوری سیا هات شەعشەعەی خورشیدی داپۆشی[35]

با بێینەوە سەروکاری میرکوڕان و میرکچان.

لەم جەوابکارییەی کچان کە لە نەزەر پیاواندا پێ لێ هەڵبڕینی تێدایە، پیاوان دڵگەرم دەبن و بەهانەی قسەیان دەبێ بە کردەوەی دەست، هەموو لە هەموو هێرش دەبەن بۆ سەر بنە و بارەگای کچان و «پەڕبەجیق» کە خۆی سەرکردەی هێرش بوە بە خەنجەر کەڵەشێرەکەیان دەکوژێ. کچانیش بەردەبنە گیانی پیاوان، بە دەست و پێ و تێلا و بەرد بەرگرییان دەکەن و هێرشیان دەبەنەوە سەرێ. هەرا زل دەبێ و سەر دەگەیێنێتە لێ دان و کوتانێکی ئەوتۆ واوەی کوشتن هەموو شتێکی

---

[35] – لە پاش بەسەرچوونی ماجەرای «حەلیمە» جارێکیان باپیرم بە هاوڕێیەتی شێخ عەلی تاڵەبانی کە ئەوسا جحێڵ و هاوتەمەنی باپیرم بوە دێتە کەرکووک. شێخ عەبدولڕەحمانی تاڵەبانی«خالسی»، باوکی شێخ عەلی و شێخ ڕەزا، دەڵێ کاکەولڵا بیستم حەزت لە چەتیوێک کردبوو! لە وەرامدا دەڵێ بەڵێ قوربان ئەگەر لە کەرکووک بام دەبوو حەز لە هەتیوێک بکەم.

تێدا دەکرێ. جگە لە لێدان کارەساتی دیکەش ڕوو دەدا لە نێوانیاندا هی گێڕانەوە نیە، دەبێتە هۆی ئەوە جەمبوورەی کوڕان لەبەر یەک هەڵوەشێ و فەقێیەکان بڵاوەی لێ بکەن و هەر یەکەیان، یاخود ڕاستییەکەی ئەغڵەبیان، بەم لا و بەولادا بۆی دەرچن. دەستەی ئەو شاعیرە جەربەزانەش کە ماکی گەمە و کارەساتەکە بوون باڵەکەتی بەجێ دێڵن و بێرە و بەوێدا پەخش و بڵاو دەبنەوە.

دوای ئەم ئەنجامە مانەوەی حاجی قادر لە باڵەکەتی بە جۆرێکی ئاشکرا و بێ گومان لە منەوە ڕوون نیە، وابزانم کەسی دیکەش هەر نایزانێ، بەڵام وا پێ دەچێ حاجی قادر مابێتەوە، چونکە حیکایەتی «ئاتەشکەدە» ئیشارەتی تێدا نیە بۆ ئەوە کە حاجی لەبەر ئەم سەیر و سەمەرەیە شێخ وەتمان وەیا باڵەکەتی جێ هێشتبێ. جگە لە نەبوونی ئیشارەت، حاجی قادر خۆشی چ کەتنێکی نەکردبوو ناچاری کا لە باڵەکەتی دەرچێ. مەعلوومە ئەگەر هیچ ڕووداوێکی نالەباری لێ دەرچووبا شۆرەتی ڕووداوەکە لەگەڵی دەڕۆیشت بۆ دیوی کوردستانی ئێران و لەوێش جێی پێ لەق دەکرد.

وەک گوتم ماکی کەتنەکە «پەڕبەجیق» و هاوڕێکانی بوون کە لە ناوە عەنتیکەکانیان بزۆزی و ناڕاحەتی دەبارێ. حاجی قادر لەقەبی ئەوتۆی نەبوە سێبەری سووچ و تاوانی بخاتە سەر تا بۆ ئەوە بچین خۆی بە خەتابار زانیبێ و لە شەرمان ڕۆیی بێ. بە نیسبەت باپیرمەوە پرسیارەکە گرێی تێدا نیە چونکە دوای کارەساتەکە بەینێکی زۆر لە شێخ وەتمان ماوەتەوە و دەوامی داوە بە خوێندن و سەرگەرمی عیشق بوە. هەر ئەو عیشقەش بوە لە حاجی قادری دابڕیوە و نەی هێشتوە لەگەڵیدا بچێ بۆ کوردستانی ئێران. لێرەدا زیهن هەڵوەستی باپیرم لە بەند و باوی میرکوڕان و میرکچان بە ڕوونی دەبینێ چونکە جگە لەوە کە خۆی لێی چاوەڕوان دەکرێ لە گەڵێک کاری وادا خودداری بکا کە یەکێکی وەک «قەبرخوار و داڵ واو دوو» لێی لانادەن، عیشقی حەلیمەش ڕێی هەموو بزووتنەوەیێکی لێ دەبەستێ کە بێحورمەتی تێدابێ بۆ تاقمی کچان کە حەلیمەی تێدایە.

حاجی قادریش وەک ئەو خۆی لە ژووروووی هەرزەکاری «پەڕبەجیق و کێسەشکەل» داناوە. لەوەش لادەین، هەر نەبێ سەبارەت بە برادەری و دۆستایەتی لەگەڵ باپیرمدا کارێکی وای نەکردوە لە عاست کچاندا بیکاتە جێی گلەمەندی. ئەوی مەعلوومە لە پەیوەندی حاجی قادر و حاجی مەلاعەبدوڵا برایەتییێکی ئەوتۆیە

هەرگیز شتێکی وای تێدا ڕوو نەداوە لە یەکدییان بڕەنجێنێ. لە هەموو دیوانی حاجی قادردا هاوتای ئەو نامە هۆنراوەیە نیە کە بۆ حاجی مەلا عەبدوڵای ناردوە لە ڕووی دەلالەتی برادەری و خۆشویستنەوە.

زاهیری حاڵ وا دەگەیەنێ هیچ هۆیەک نەبوە حاجی ناچار کا دەرحاڵ دوای هەرای میرمیرانێ باڵەکەتی لە خۆی وەتەنگ بێنێ و لێی دەرچێ، بەڵام ماوەی مانەوەی لەوێ دوای هەراکە، ئەگەر مابێتەوە، نازانرێ و بە لێکدانەوەش سەرەدەری لە تحدیدی ناکرێ، مەگەر بە «تقریب».

دەتوانین تەخمینێک بکەین بۆ درێژەی خوێندنی لە باڵەکەتی بەر لەو هەرایە لە ڕێی سرنجدانێکی زۆر قووڵ لە ڕاگەیاندنی حاڵەوە. بە قەدەر توانین بۆ خەملاندنی ئەو ماوەیە، وەک عملیتی «چوونە ناو پێست» بە خەیاڵ بۆ ئەو ڕۆژگارە گەڕاومەتەوە و خۆم خستۆتە پێستی مرۆڤێکی خەیاڵی کە وا لە کونجێکەوە ئاگاداری ئەحواڵی دەنگ و باسێکی گەشتەکەی حاجی بێ. لەم ڕێگەیەوە چەند ترووسکەیێکی ڕووناکیم هاتنە بەر چاوی سەرنج و تصورەوە بەڵام ئەوەندە کزن چاوی سەرنجدەر و وردبین و کرایەوە نەبێ فەرقی پێ ناکا. ترووسکەکان هەرچەند ئەوەندە کزن چ ناوەڕۆکێکی ئەو سەردەمە ناگەشێننەوە بۆ دیتن، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا لێیان دەوەشێتەوە ببن بە نیشانە بۆ دیارخستنی پەراوێزی زەمەنی لە دەورەی ناوەڕۆک و تا ڕادەیێک ڕابەریمان بکەن بۆ تەخمین کردنی مەودای مانەوەی حاجی قادر لە باڵەکەتی، بەدوا ئەویشدا لە کوردستانی ئێراندا.

یەکەم ترووسکە ئەوەیە، بە عادەت فەقێ لە وڵاتی گەرمێنەوە بەرەو کوێستان ناڕۆن تا بەهار پیر نەبێ و گەرمای هاوین دەست پێ نەکا. وەک لە کۆنەوە ئەمە عادەت بوە تا ئەو ساڵانەی دواییش کە گەشتی گەرمێن و کوێستانی فەقێیان مابوو هەر وا بوو، عادەتەکەش لە خۆوە بە ڕێکەوت پەیدا نەبوە، لەبەر پێویستی وەزع و داخوازیی حاڵ جێی بۆ خۆی کردۆتەوە: مانەوە لە گەرمێن تا ئەو کاتەی گەرما دەست پێ دەکا خۆشترە لە ڕابواردنی کوێستان، مەگەر فەقێ نیشتەجێ بێ لە کوێستان دەنا بە دەگمەن نەبێ بۆ خوێندن لە گەرمێنەوە ڕووەو کوێستان نابێ بەر لە سەرەتای هاوین. لەگەڵ بەسەرچوونی سەرما و هاتنی گەرما میوەش لە کوێستانان دەست پێ دەکەن بگەن، ئاوی ساردیش بۆ خواردنەوە لە هی گەرمێن خۆشتر دەبێ. کەواتە دەبێ سەرەتای گەشتەکەی حاجی قادر و حاجی مەلا عەبدوڵا بەرەو باڵەکەتی لە

سەرەتای هاوین دەستی پێ کردبێ. لە شیعرەکانی حاجیش ئەو ڕاستییە بە هێما خۆ بەدیار دەخا، کە دەڵێ:

وەها بوو دڕک و دار و شاخ و باری
وەکوو مەخمەل بوو نەرمی یانە خاری

وەسفی دیمەنێکی هاوینانەی تێدا بەدی دەکرێ چونکە وا دیار دەکەوێ کاتێک گەیشتوونە باڵەکەتی «خار»، «دڕوو» پەیدا بوە. دیسان کە دەڵێ «کە چووینە سینگوڕە سینەم گڕی بەست» هەمان واتا دووبارە دەبێتەوە چونکە خەلق ناچنە جێی وەک «سینگورە» ئەگەر هاوین دانەهاتبێ.

بە پێی دەلالەتی تێکڕای ڕووداو و شیعر و مێژووی تۆمارکراو و پێویستیی وەزع دەبێ حاجی و باپیرم لە یەکەم هاوینی دوای مەرگی حاجی بەکر ئاغا بۆ باڵەکەتی چووبن. ئەمە ئەنجامێکە بە لێکدانەوەی ورد پێی دەگەین وەنیە چاوگی نووسراو ڕۆژ و کاتی ئەو سەفەرە بەدەستەوە بدا. بەڵام وەک دەبینین لێکدانەوەکە لەسەر بنجێکی ماددی مەیلەو پتەو کە قورسایی هەڵوەست ڕاگری، هەڵچەقیوە. پێش چەند دێڕێکیش کە گوتم «مێژووی تۆمارکراو» مەبەسم لەوەدا ساڵ و ڕۆژی مەرگی حاجی بەکر ئاغا و بەسەرهاتەکانی باپیرم و شتی ئەوتۆ بوو کە ڕاستەوخۆ پەیوەندییان لەگەڵ سەفەرەکەی باڵەکاتی هەیە و هەمووشیان تۆمارکراون و شتی زانراون، دەنا سەفەرەکە بۆ خۆی لە هیچ مێژوێکی دیار کراودا باسی نەهاتوە.

ترووسکەی دوەم ئەوەیە هەوای میرمیرانێ لە بەهاردا بەرپا دەبێ کەواتە دەبێ حاجی قادر و باپیرم هاوین و پایز و زستانێکی سەرلەبەریان ڕابواردبێ لە باڵەکەتی بەر لەوە کژی بەرپابوونی میرمیرانێ داهاتبێ. لێرەدا بەو قسەیە لای هەرە کەم دەگرین لە ماوەی مانەوەیان چونکە چ مەعلووم نیە ئەو میرمیرانێیە کە بۆتە هۆی لەبەریەک هەڵوەشانی ڕشتەی مەلاکان لە یەکەم بەهاری دوای گەیشتنیان بێ لە باڵەکەتی، مومکینە لە دوەم بەهاردا بووبێ. بۆ ناونانی یەکەم یا دوەم بەهار هیچ بەڵگە و بنگەی فیکری وەیا مێژوویی چنگ ناکەوێ، بەڵگەیێک هەبێ لەو چەند بەیتەی حاجی قادردا پەیدا دەبێ کە لێرە بەپێشەوە جارێکی دیکەش کردمانن بە

شایەد، ئەوەی ڕاسیش بێ دەلالەتی بەیتەکان ئیشارە بۆ لای بەهاری دووەم وەیا سێیەم دەکەن زیاتر لە هی یەکەم.

دەلالەت و پەیامی بەیتەکان تروسکەی سێیەمە. حاجی قادر لەو چەند بەیتەی یاد کردنەوەی باڵەکەتیدا ناوی گەلێک جێگە و ناوچە و هەواران دەبا و مەساحەیێکی پانی باڵەکەتی پێ دەگرێتەوە. ناوبردنی ئەو هەموو جێگایانە هی ئەوە نیە ڕێڕەو پێیاندا تێپەڕیبێ. گوزەری سەفەر بە جێگەیەکدا ناوی ئەو جێگەیەش ناچەسپێنێ لە مێشک و دڵی ڕێبوارەکەدا چ جایی ئەوە دوای سێ ساڵێک بە تاسە و پەرۆشەوە لە ئەستەمبۆڵەوە ناویان بێنێ و حەسرەتیان بۆ بخوا. حاجی قادر کە ناوی «باڵەک و سینگوڕە و هەواری گورگ و شێران و پرژ و گۆلەشین و گەرووی شێخی» دێنێ وەک نموونەی سەرپاکی هەموو هەوار و دێ و شوێنی لێ ڕابواردن و تێدا خوێندن باسیان دەکا. بێگومان لە گەلێ جێگەی دیکەشدا ژیان و ڕابواردن و خوێندنی کردوە. پەراوێزی هەڵبەست لەو تەرزە باس و خواسەدا بۆ هەموو ڕووداوێک و ناوێک و شوێنێک خۆ فرەوان ناکا. ئەگەر نەفەس درێژیی حاجی نەبا ڕەنگ بوو ئەوەندە جێگەیەش ناویان نەهاتبا.

ترووسکەی چوارەم ئەوەیە کاتێک کە حاجی ناوی سێ شاعیران دەبا لە دیوانەکەیدا پڕبەدڵ لەسەریان دەکاتەوە و یەکجار بە شارەزایی لە بارەیانەوە دەدوێ. وەک بڵێی بەیەکەوە ژیانێکی دوورودرێژ هەبووبێ لە میانیاندا و بە زاراوەی کوردی «نان و نمەک» هانی حاجی دابێ لەگەڵ ئەوەدا کە «بەدناو»یشن هەر بۆیان بپارێتەوە. بەڵێ، حاجی قادر کوردایەتی دەکا بەهۆی هەڵدانەوەیان، گومانێکیش نیە لە ڕاستی شعووری حاجی لەم لایەنە. بەڵام پێدەچێ بوونی پەیوەندییێکی شەخسی و ناسیاوی خۆی لەگەڵیاندا پاڵپشتی کوردایەتیەکەی کردبێ، کە ئەمە شتێکە لە وەفاداری حاجی دەوەشێتەوە.

تێبینییەک هەیە لێرەدا پێویستە دەری برم بۆ ڕەواندنەوەی تارمایی گومانێک کە لە بەیتێکی حاجییەوە پەیدا دەبێ لە بارەی ناسین و نەناسینی لەگەڵ ئەمانەدا: بە دوا ناوهێنانی ئەوان و گەلێک لە شاعیری دیکەی کورد ئەوجا حاجی دەڵێ:

ئەوی خۆم دیومە وەیا ئەسەری[36]
ئەمەیە بۆت دەکەم بە «مختصری»

ئیتر دێتە سەر ناوی «مولانا و خالصی و بێتوشی». ڕەنگە زیهن بۆ ئەوە بڕوا حاجی ئەو شاعیرانەی نەدیتبن کە ناویان پێش ئەم بەیتە هاتوە و بە بیستن ناسیبنی، کەچی بەڵگەیێکی قەتعی هەیە پێچەوانەی ئەمە ئیسپات دەکا واتە بەیتەکە نابێتە بەڵگە بۆ نەبوونی ناسیاویی میانی حاجی و شاعیرەکانی پێش ئەم بەیتە: بەڵگەکەش ئەمەیە کە ناوی «کەیفی»یش کەوتۆتە پێش بەیتەکەوە.

کەیفی حاجەت نیە بکەم باسی
ئەم کتێبە بخوونی دەیناسی

خۆ پێی ناویٚ من بڵێم کەیفی نزیکترین برادەرێکی حاجی قادر بوە لە ئەستەمبۆڵ تاکوو لە 1300 دا مەرگ کەیفیی پێچایەوە.

تroووسکەی پێنجەم ئەوەیە کە حاجی دەرحاڵ دوای کارەساتی میرمیرانیٚ مەجبوور نەبووبیٚ باڵەکەتی جیٚ بێڵیٚ: هەر نەبیٚ هاوینەکەی دوا بەهاری کارەساتەکەی لە هاوینەهەوارەکانی باڵەکەتی بەسەر بردوە، دەمەو پایز بەرەو وڵاتی کوردستانی ئێران بزووتوە. ئەمە دەڵێم لە فەڕزی کە بگوتریٚ چ ساڵان دوای کارەساتەکە نەماوەتەوە لە باڵەکەتی، واتە ئەگەر ساڵیشی تەواو نەکردبیٚ نیو ساڵێکی هەر بەسەر بردوە.

خولاسە ئەو چوار پێنج ترووسکە و هەندیٚ گوتەی دەماودەمی دیکەش هەن ئەوە ڕادەگەیەنیٚ کە حاجی قادر لە ساڵێک زیاتر، تەواوێکیش زیاتر، دەوامی بە خوێندنی

[36] – هەندیٚ دەسنووس ئەم بەیتە وا دەنووسن: «ئەوی خۆم دیومە یانەخۆ ئەسەری».

جا ئەگەر وەک نووسینی سەرەوە بنووسریٚ دەبیٚ پیتی «و» لە ڕستەی «دیومە» قورس بکریٚ تا کێشی بەیتەکە ڕاست بیٚ. ئەگەر وەک ئەمەی خوارەوە بنووسریٚ، قورس کردنەکە نامێنیٚ و واوەکە بە وەستاوی تەواوەوە دەدرکێنریٚ.

دابێ لە ناوچەی باڵەکەتی. نامێلکەکەی باسلێکراوی مەلا عەبدولڕەحمانیش بۆ ڕاستی ئەم لایەنە شایەدییێکی تێدایە لەوەدا کە دەڵێ جگە لە گوندی شێخ وەتمان ماوەییێکی زۆریش لە گوندی «گرتک» کە ئەویش لە باڵەکەتییە لای مەلا ئەحمەدی مەلا ئادەم لەگەڵ حاجی مەلا عەبدوڵادا بەیەکەوە خوێندوویانە. هێندە هەیە نامێلکەکە بۆ ئەوە چووە کە خوێندنەکەی حاجی و باپیرم هەوڵ جار لە شێخ وەتمان و دواجار لە گرتک بوە، بە لای منیشەوە وەک بدیهیە وایە کە باپیرم گەیشتۆتە شێخ وەتمان و دڵی بۆ حەلیمە ڕۆییوە نەیتوانیوە لە جێگەیێکی تر ئۆقرە بگرێ و خەریکی دەرس و دەور کردنەوە بێ. کەواتە وەک من بۆی دەچم دەبێ زووتر لە گرتک و دواتر لە شێخ وەتمان خوێندبێتیان، ئەمەش لەگەڵ واقیعی بێتەگەرەی وەزعی باپیرم گونجاوترە چونکە مانەوەی لە شێخ وەتمان سەرانسەر و بێ گوێزە گوێز بوە.

لەو باسەی خوێندنی حاجی لە باڵەکەتی، دەلالەتی کۆتایی یەکێک لە بەیتەکانی دەمان گێڕێتەوە بۆ باسێکی تێپەڕیو کە لە پێشەوە بە دوورودرێژی لێی دواین. ئەوسا[37] گوتم لەم بەیتەدا ڕاگەیاندنێک هەیە هێشتا شوێنی مناسبی نەهاتوە، وا ئێرە شوێنی مناسبیەتی. حاجی کە دەڵێ:

وەرە با بۆت بکەم باسی نیهانی
بە یادی عەیش و ئەییامی جەوانی

واتای عەیش و ئەییامی جەوانی لەگەڵ عومری 31 – 32 ساڵی ڕێکتر دێ نەک لەگەڵ عومری 40 – 41 ساڵی! وەک من بۆی چووم کە حاجی لە 1240 هاتبێتە دونیا لە کاتی سەفەرەکەی بۆ باڵەکەتی و خوێندنی لەوێ کە ساڵانی 1271 و 1272 و 1273 بووبێ تەمەنی حاجی 31، 32، 33 ساڵی بوە. بەپێی نامیلکەی مەلا عەبدولڕەحمان کە وەلادەتی حاجی لە 1231 بووبێ لەو ساڵانەدا تەمەنی 40، 41، 42 ساڵی بوە. هەرچەند لە تەمەنی 65 ساڵی وەیا 75 ساڵیدا، کە حاجی نامەی بۆ باپیرم نووسیوە تەمەنی 41 ساڵیش

[37] – بنوارە بەرەو کۆتایی لاپەڕە 130 لە بەشی یەکەمی ئەم نووسینە.

ڕەنگە خۆی بە «عەیش و ئەییامی جەوانی» بنوێنێ بەڵام بێگومان 32 ساڵی ڕێکتر دێ لەگەڵ تەڕایی و شلکی گوتەی «عەیش و ئەییامی جەوانی» دا. کە هیچ بەڵگەیێک نەمێنێ بۆ ترجیحی 41 ساڵی، خودی بەیتەکەی حاجی ئیشارەی بۆ 32 ساڵی بەهێزترە.

ئەم تێبینییەم هەڵگرت بۆ ئێرە چونکە کاتێک لە باسی وەلادەتی حاجی قادر دەدواین هێشتا چ باسێکی گەشتەکەی باڵەکەتیمان نەکردبوو، لە دیارخستنی ساڵی گەشتەکەش نەدوابووین تا دەلالەتی «عەیش و ئەییامی جەوانی» ساڵێک بەسەر ساڵێکی دیکەدا هەلاوێرێ بۆ لەدایکبوونی حاجی.

مرۆڤ چەند وەتەنگ دێ لەوەدا هەرچی بڵێ هەر لەسەر لێکدانەوە و بەراورد کردنەوە هەڵستێ. بەردەوامبوونی وەزعی ناچاری بۆ لێکدانەوە و بە یەکدی گرتن هەر دەڵێی وەزعی سەربازی نۆبەچییە کە هەموو دەم و کات سونگی تاق وەستایی و سرنج لە دەوروپشتی خۆی بگرێ نەوەک هەڕەشەیێکی نهێنی لە پەناییێکدا خۆی شاردبێتەوە. حەزم بەوە نەدەکرد لەو وەزعی سونگی تاق و زینهارەدا بوەستم و دەمارم تێیدا کشت بێ و هەر لە ئێستاوە غەمی سبەی ڕۆژیشی لێ بخۆم کە خوێنەر بە بەرهەمەکە ڕازی نەبێ، بەڵام چ بکەین لەگەڵ ناچاری. عەرەب گوتەنی:

اذا لم تكن غير الأسنة مركبا
فما حيلة المضطر الا ركوبها

واتە کە غەیری سەرەڕم چنگ نەکەوێ بۆ سواربوون، مرۆڤی ناچار سواری نەبێ چ بکا.

لە سەرەتای باس کردنی دەستە شاعیری «باڵەکەتی»یەوە گوتم بەدوای سەرگوزەشتی ئەواندا باسێکی تایبەتی «حیماری» دەگێڕمەوە. تا ئێرە جێگەی مناسبی ئەو باسەیە.

فەردێکی زۆر مەشوور هەیە، بەسەر زمانانەوە دەگوترێتەوە، دەخرێتە ڕیزی ئەو هەجوانەوە کە ئاڕاستەی شێخ نەبی ماویلی کراون. فەردەکە ئەمەیە:

«ست عشر» ژنیەتی بە مەزهەبی «حماری»
«إبن ادم» نەماوە سەری پان کا وەک ماری

بەهۆی ئەوەوە ناکۆکی میانی حاجی قادر و شێخ نەبی دەنگی داوەتەوە و لە گەڵێ موناسبەدا حاجی هێرشی بردۆتە سەرێ، غالبی کەسان ئەو فەردەش دەکەن بە هی حاجی، بەڵام مەنتیق ئەوە ناسەلمێنێ حاجی قادرێک لە هەڵبەستی تایبەتیدا، وەک تازە خستمانە بەرچاوان، هێندە پشتگیری بکا لە «حیماری» و هاوڕێکانی و بڵێ:

بە فیدایان دەکەم سەد «إبن یمین»
چونکە دەربەستی غیرەتی کوردین

خۆ باوێتە ئەو «تناقض»ە ئاشکرایە و «حیماری» جووت کا لەگەڵ شێخ نەبی. لەسەر کردنەوەی «بەدناو» هەر ئەوەندە دەسەلمێنرێ کە شەخسی مودافەعەچی بۆ خۆی بەشداری نەکردبێ لە زڕاندنی ناو و سومعەی بەدناوەکە. بە نیسبەت حاجیشەوە لەسەر کردنەوەکە هەموو سنوورێکی زار گرتنی تێپەڕاندوە و لە بەیتەکاندا دەنگی لەسەر کردنەوەی هەندە دلێرە هێرش بەر قەرزدار دەکاتەوە. لەوەش زیاتر: حاجی ئەم دەستە شاعیرە دادەنێ بە «دەربەستی غیرەتی کوردی»، ئەی چۆن دەگونجێ غیرەتەکەش لەسەر کوردایەتی، کە حیماری بێ، بکاتە فەتوادەر بۆ «شێخ نەبی» کە 16 ژنان بە جارێ کۆ دەکاتەوە لە ژێر نیکاحی خۆی، شێخ نەبی بەلای حاجی قادرەوە ئەوە بێ کە بیکا بە نموونەی هەموو عەیب و عارێک، گلەیی هەرە گەورەشی لە هەندێ کەس ئەوە بێ کە دوای دەکەوێ و خزمەتی دەکا؟

بەلای منەوە هیچ تەئویلێک بایی ئەوە ناکا فەردەکە بکا بە هی حاجی قادر. گوفتار و ڕەفتار و بیر و باوەڕ و خەباتی حاجی، هەموویان تێکڕا مانیعن لەوەدا ئەم فەردە

له زاری حاجییەوە هاتبێتە دەرێ. فارس دەڵێ: «چو کفر از کعبه برخیزد کوجا ماند مسلمانی» - کە کافری لە کەعبەوە هەڵستاوە مسڵمانەتی لە کوێ دەمێنێ؟[38]

[38] - لەو ڕۆژانەی دواییدا، کە دەمێک بوو لە پاکنووس کردنی مەبحەسی ئێرەکانە بووبوومەوە، گوتارێکم خوێندەوە لە ڕۆژنامەیێکی کوردی نووسەرەکەی بۆ ئەوە چوە فەردەکە هی حاجی مەلا عەبدوڵڵا بێ، گۆیا لە ڕاوێژی ئەو دەوەشێتەوە، بەپێی زەوقی نووسەر.

لێوەشانەوە و هەست پێکردن شتێکی مەعنەوی و زێهنییە و دەشێ خەلق تێیدا ڕێک کەون یاخود جودا بنەوە، لەو ڕەوەوە نووسەر مافی تەواوی هەیە چی بە ڕاست دەزانێ ئەوە بکا بە باوەڕی خۆی. وەنیە من بەڵگەیێکی مادی پێچەوانەی بیر و باوەڕی نووسەرم هەبێ ئیسپاتی ئەوە بکە فەردەکە هی باپیرم نیە، بەڵام منیش وەک ئەو ڕێم هەیە، لەگەڵ نەختێک ڕوون کردنەوەدا، بیر و باوەڕی خۆم لە بارەی ئەو فەردەوە دەربڕم.

من بۆ ئەوە ناچم فەردەکە هی باپیرم بێ، هەر چەند ئیمکانیش هەیە هی ئەو بێ وەک ئەوەی هی شاعیرێکی تر بێ، گەیشتنیشم بەو باوەڕە سەرەڕای زەوقی شەخسیم و شارەزاییم بە ئەدەبی باپیرم کە لە ڕووی هێزەوە ڕێکار (مستوی) ی فەردەکە لە هی ئەو بەرەژێرتر دادەنێم، لە هیچ کەسێکی خانەوادەی خۆمانیشم نەبیستوە کە فەردەکە هی ئەو بێ. چەندین جار لە مامم بیستوە فەردەکەی خوێندۆتەوە هەرگیز جارێکیان نەیگوت ئەم فەردە هی باوکی بێ، لەو باوەڕەشدام ئەگەر هی باوکی با دەیگوت هی ئەوە، چونکە ئەوەندەی گوتارێک یا هەڵبەستێکی باس کردبێ هی باوکی بووبێ ئەو لایەنەی گوتوە و لێی بێدەنگ نەبوە. ئەوەی ڕاستی بێ مامیشم فەردەکەی بە هی حاجی قادر لە قەڵەم دەدا وەک هەموو خەلق. لە باوکیشم بیستوە ناو ناوێک ئەو فەردەی دەخوێندەوە، ئەویش هەرگیز نەی گوت هی باوکێتی. لام وایە سەراحەتی مامم لەوەدا کە گوتی فەردەکە هی حاجییە و بێدەنگی باوکیشم کە فەردەکە نەگێڕێتەوە بۆ باوکی دەلالەتێکی ئاشکرای تێدایە بە نیسبەت ئەو خاڵەی ئێستا وا موناقەشەی دەکەین.

بەڵگەی زیاتریش بە دەستەوە هەیە لەوەندەی تازە گوتم: بەسەرهاتی وا ڕووی داوە لە میانی باپیرم و شێخ نەبی ئیسپاتی ئەوە دەکا باپیرم لە وەزعێکیا نەبوە بەرانبەر بە شێخ نەبی حەسرەت هەڵێنێ بۆ ئیبنوئادەم. ئێرە جێی گێڕانەوەی ڕووداوەکە و بەدوا ئەودا گێڕانەوەی ئەو وتوویژە نیە لە میانی باپیرم و شێخ نەبیدا ڕووی داوە کە ئەگەر نووسەر خۆی ئاگاداریان با، قەناعەتی دێنا شێخ نەبی لە نەزەر حاجی مەلا عەبدوڵڵادا ئەو کۆسپە گەورەیە نەبوە کە فەردەکە ڕادەگەیەنێ.

من کە ئەو ڕووداوە و وتوویژە ناگێڕمەوە لە بەر هەندێ هۆی تایبەتی تەبعی خۆمە؛ ڕووداوی لەو بەهێزتر دەگێڕمەوە لە ڕووی دەلالەت و ئیشارە کردن بۆ پایەی شێخ نەبی لە تەک پیاوێکی وەک حاجی مەلا عەبدوڵڵادا: هەڵوەستی باپیرم لە عاست «شێخ عبیداڵله»ی نەهری بە بیر خوێنەر دێنمەوە کە سەدی وەک شێخ نەبی نەدەبوون بە مریدی ئەویش. ئەمەیە هەڵوەستەکە و بۆ خۆت بیکە هۆی بەراوردی کردن لەگەڵ دەلالەتی فەردەکە ئاخۆ تۆش وەک من قەناعەت ناهێنی کە حاجی مەلا عەبدوڵڵای بەرانبەر «شێخ عبیدالله» سەرەکی هەموو پێشەوای ئایین و سەرۆک عەشیرەت و دەسەڵاتدارەکانی کورد بوە لە غەزای ساڵی 1294 دا، لە سەر هەندێ ڕستە و وشەی ناو « مظبطە»یێک کە شێخ عوبەیدوڵلا داوا دەکا سەرۆکەکان بۆی مۆر بکەن و باپیرم پێی ڕازی نابێ، دەمەتەقێیێکی گەورە لە بەینیاندا پەیدا دەبێ. لە وەرامی قسەیێکی شێخ عوبەیدوڵلادا باپیرم دەڵێ، «یا شێخ ئەتۆ اسما و جسما مصغری ئەمن اسما و جسما مکبرم: تۆ عبیداللەی من عبداللەم تۆ هەندی چەنگیکی من دەڵێی شێرم، خوا لێت هەڵناگرێ خۆت لە من گەورەتر دابنێی». حیکایەتەکە دوورودرێژە هەر هێندەی لێ دەگێڕمەوە.

سرنجێ بدە نامەکەی حاجی قادر بۆ باپیرم لە وێشدا ئیشارەیێک هەیە بۆ ئەم هەڵوەستەی باپیرم و لە دێڕە شیعرێکدا شێخ عوبەیدوڵلای بۆ نزم دەکاتەوە لە قالبی هێمادا کە دەڵێ:

چ «عبدالله»، « عبیدالله احرار»<br>«مصغر» بەندەیێکە زەڕ خریدار

عوبیدوڵڵاهی ئەحرار هەرچەند پیاوێکی ئایینی کۆنینەیە و هەر لە ناوی «عبیدالله» دا لەگەڵ شێخی نەهری دەگەنەوە یەکتر، بەڵام حاجی قادر لە ڕێی هێنانەوەی وشەی « مصغر»ەوە بە دوا ناوەکەدا بیری خوێنەر بە ئاسایی دەباتەوە بۆ ئەو «مصغر و مکبر»ە کە لە وتووێژەکەی باپیرم لەگەڵ شێخی نەهری ناوەکانی «عبدالله و عبیدالله»ی خستە دوو تای تەرازووی هەڵسەنگاندنەوە.

ئەوەی ڕاستی بێ جگە لەم بەیتە مەیلەو هێماییە، حاجی قادر لە بەیتێکی تریشدا بێ پەردە و هێما شێخی نەهری داشکاندبوو بۆ حاجی مەلا عەبدوڵڵا بەڵام ئەم بەیتەیان لەبەر هۆییێکی یەکجار تایبەتی لە کاتی یەکەم چاپ کردنی دیوانەکەی حاجی پشت گوێ خرا و تێ چوو.

من کە ئەمە دەگێڕمەوە نامەوێ خوێنەر بە سەهوو ببەم لە عاست «شێخ عبیداللەی نەهری». دەمەتەقەیێک هەڵستابێ و پیاوێکی وەک حاجی مەلا عەبدوڵڵای بەدەنگ هێنابێ هەڵبەت دەبێ بە پێی داخوازی ئەو جێگەیە و پایەی حاجی مەلا عەبدوڵڵا قسەی ئەوتۆی تێدا کوتابێ، حاجی قادریش کە بیەوێ مەدحی حاجی مەلا عەبدوڵڵا بکا دەبێ بگەڕێ بە دوا پیاوی گەورەی وەک عوبەیدوڵڵاهی ئەحرار و شێخی نەهری تاکوو لەسەر ناو و شۆرەتی ئەوانەوە پەیکەرێکی حورمەت بۆ مەدح کراوەکەی داتاشێ. ئەو موناسبانە نەبن «شێخی نەهری» بخەنە بەر تیشکی کزەوە، پرشەنگی ناو و پایەی دەسەڵات و شەخسییەتی ئەو چاو خیرە دەکا. بەسە بۆ ئەو لەم غەزایە گەورەیەدا سەرۆکی تێکڕای غەزاچییانی کورد بوە، لە ناویاندا پیاوێکی وەک سەرۆکی تایفەی کاک ئەحمەدی شێخ لە سلێمانی،کە خۆی سەرۆکی هەموو ناودارەکانی کوردی عێراق بوە. بە موناسەبە دەڵێم باپیرم لە فەردێکدا مێژووی غەزاکەی بە حیسابی جومەل دەرهێناوە کە دەڵێ:

ئەنگوشتی قەدەر لە لەوحی نووسی
تەئریخی غەزا «غزای روسی»

دوو وشەی کۆتایی فەردەکە، «غزای ڕوسی» 1294 دەگرێتەوە.

بەپێی باوەڕی هەندێ کەس وشەی «حیماری» بۆ هەمزە حیماری ناگەڕێتەوە. گۆیا مەبەس هەر واتای سادەی وشەکەیە کە بە کوردی «کەر»ە، پیتی «ی»ش کە بە دوایدا هاتوە بۆ نیسبەت نیە بەڵکوو پێکهێنەری دارِشتنی «اظافی»یە کە لە هەندێ لەهجەدا، وەک هی کۆیێ، دێتە ناوەوە. بەڵام ئەم باوەڕە لە عاست «ست عشر» بە تەواوی کورت دێنێ چونکە کۆکردنەوەی 16 ژن لە ژێر نیکاح کاری «کەر» نیە، فەند و فێڵ و تێک بەستنێکی حیلەکاری «خلع و تعلیق» و گەلێک کوێرە ڕێی «قیلەشەرع»ی پێ دەوێ و بەبێ وەستا ناکرێ. هەمزە حماریش نەبێ دەبێ یەکێکی تر ئەوە سازدا. مەزهەبی «کەر - حمار» بەتایبەتی نارِەوا بۆ «ست عشر»، هەموو ژمارە بۆ ئەو وەک یەکن.[39]

---

خوێنەر دەبینێ من کە بۆ ئەوە ناچم ئەم فەردە سەرکزەڵەیە هی باپیرم بێ، یەک لە سەبەبان ئەوەیە ڕووداوی وا بوە لە ژیانی باپیرمدا ڕێ نەدا خەیاڵ برِوا بۆ ئەوە کە کۆمەی شێخ نەبی کردبێ. لەگەڵ ئەمەشدا چونکە خاوەنی فەردەکە نەناسراوە ڕێگە نابەسترێ بگوترێ هی حاجی مەلا عەبدوڵڵایە و چ «استحالە»ش نیە هی ئەو بێ. بەڵام بەپێی زاهیری حاڵ و ئەو ڕاستییانە کە لە حاجی مەلا عەبدوڵڵاوە ماونەتەوە من قەناعەتم هەیە کەسێکی دیکە فەردەکەی هەڵبەستبێ. بەهەمەحاڵ باسی«عبدالله» و «عبیدالله»ش هەرچەند تایبەتییێکی حاڵی باپیرم بێ مەوزووعێکیشە لەو مەوزووعانەی حاجی قادر هەڵبەستی پێوە گوتوون، کە بویسترابا واتاکەی ڕوون بێتەوە دەبوو ئەم داستانە بێتە ناوەوە. جارێکی دیکەش دەڵێم زانینی سەرچاوەی هەڵبەست گیانێکی پێ دەبەخشێ ئەوەندەی بڵێی لە نرخ و لەززەتی زیاد دەکا.

[39] - ڕایەک هەیە دەڵێ بەیتەکە وا نیە وەک دەگوترێتەوە، گۆیا گۆڕانێکی بەسەر دا هاتوە ئەسڵەکەی ئەمە بوە:

«ست عشر» ژنیەتی بە مەزهەبی «قفال»ی
ئیبنو ئادەم نەماوە...

«قفال» زانایێکی سەردەمی عەباسیەکان بوە، بەپێی ئەم ڕایە دەبێ ئەو لە ڕێی فەند و فێڵی کوێرەڕێیەکانی شەرعەوە کۆ کردنەوەی شازدە ژنانی لە ژێر نیکاحی پیاوێکدا

بەپێی گێڕانەوەی دەماودەم کە گەیشتۆتە ڕادەی «تواتر» ناوی تەواوی «حیماری» بە نازناوەوە «هەمزە حیماری» بوە. دیارە کورد دەڵێ «هەمزە» دەنا ئەسڵی ناوەکەی «حمزە» عەرەبییە.

سەرگوزەشتێکی کورتیلە هەیە زۆر دەگوترێتەوە بۆ مەبەسی گەپ و پێکەنین، کەمێکیش لە ئەخباری «حیماری» و جۆری لەهجەی قسانی بەیان دەکا. هەر لەو سەرگوزەشتەشدا دووبارە مەعلووم دەکرێ ناوی «هەمزە» بوە.

جارێ لە جارانی بە یەکدی گەیشتنی شێخ ڕەزای تاڵەبانی و هەمزە حیماری لە کۆیێ، بەعادەتی هەمیشەیی، شەڕە شیعرێنە دەست پێ دەکا. وام بیستوە لە مزگەوتی گەورەی کۆیێ یەکدی دەگرنەوە، مەلا و فەقێ و خەڵکێکی زۆریش لێیان کۆ دەبنەوە. هەڵبەت شەڕە دندووکەیان زۆر بوە و شێخ ڕەزا گەلێک شیعری «ارتجالی» گوتوە بەڵام لە تاکە فەردێک بەولاوە لە بیران نەماوە، فەردەکەش ئەمەیە:

لە سەر شاهـ و گەدا ئەم ئیشە فەرزە
ئەوەی ئەلفێکی بێ بیکا بە «هەمزە»

توریەکاریەکەی شێخ ڕەزا ئاشکرایە پێویست نیە شەرح درێ. خەلقەکە گوێ دەگرن و شیعری شێخ ڕەزا دەبیێن و خامۆش دەبن و پێ ناکەنن. هۆی پێنەکەنینیان ئاخۆ پلانگێڕی بوە بۆ سەغڵەت کردنی شێخ ڕەزا یاخود ئەو شیعری گوتونی لەگەڵ لایەنی جنێوفرۆشی کە تێیاندا بوە هێندە سەنگین و بەویقار بوون پێکەنینی خەلقی نەهێناوەتەوە، هەر لاییکیان بێ واقیع ئەوە بوە خەلقەکە بە هەڵبەستەکانی شێخ ڕەزا نەکەوتوونەتە سەر پێکەنین.

---

جایەز کردبێ. من لە نووسیناندا ناوی «قفال»م دیوە بەڵام شارەزای مەزهەب و مەشرەب و ئایینی نیم تا بتوانم لێرەدا لە بارەیەوە شتێک بڵێم، بەڵام بایی ئەوەی ئەم فەردە بگرێتەوە دەتوانم سرنج ڕاکێشم بۆ لای قافیەی دوو نیوە دێڕی فەردەکە: دیارە «حیماری» وەک ماری، هاوقافیەن نەک حیماری، قفالی.

هەمزە حیماریش لەسەری زمانیەوە و بە بزاوتنی سەر و دەست کە مناسبی واتای قسەکانی بێ گوتوەتی:

ڕەزا نیە و قەزایە
لەسەر ...م دانایە
لۆ کەرکووکێم هەڵدایە

دەستێکیشی هەڵتەکاندوە بەرەو کەرکووک. خەلقەکە لەبەر شیددەتی پێکەنین دەکەونە سەرپشت. شێخ ڕەزا زیاتر بە وەزعی خەلقەکە سەغڵەت دەبێ نەک گوتەکانی حیماری کە زۆر سادە و خوێڕیلە بوون. هەرجارە شێخ ڕەزا شیعرێک دەڵێ، حیماری گوتەی پێشووی دووبارە دەکاتەوە تەنها ناوی جێگاکە دەگۆڕێ کە شێخ ڕەزای بۆ هەڵدەدا. وەک بڵێ «لۆ بەغداییم هەڵدایە... لۆ بەسراییم هەڵدایە».

دەگێڕنەوە شێخ ڕەزا وای لێ بەسەر دێ بە اصطلاح لە دین دەردەچێ و دەڵێ «ئەوە کوشتوومی من دوڕ دەقەڵێشمەوە کەس پێ ناکەنێ ئەم وا وا لێ کراوە گوو دەخوا خەلقەکە بۆی دەکەونە سەرپشت».

ئەم شەڕە دەندووکێیەی شێخ ڕەزا و حیماری لە لایەن کاتی ڕوودانیەوە پاڵپشتی ئەو ڕایە دەکا کە بڵێ مەبەس لە «حیماری»یەکەی بەیتی «ست عشر» هەر ئەو هەمزە حیمارییەیە کە لەگەڵ شێخ ڕەزا شەڕە جنێوی کردوە، چونکە شەڕە جنێوەکە لە کاتی گەرمەی دەسەڵاتی شێخ نەبیدا بوە. واتە «هەمزی حیماری»ی شێخ ڕەزا و «حیماری»ی «ست عشر» لە یەک کاتدا بوون. کە نەختێکیش ورد بینەوە لە دمودووی هەمزە حیماری ئەو خەیاڵەمان بە دڵدا دێ کابراییێکی وەها جەربەزە لێی دەوەشێتەوە بۆ مەبەسی خۆش گوزەرانی، شوێن پارووی خۆی خۆش کردبێ لای شێخ نەبی بە فەتوای حەلاڵ کردنی شازدە ژن بۆ پیاوێک. پوختەی قسە ئەمەیە کەوا هیچ بەرهەڵستی ماددی و مەعنەوی نایێتە بەر یەکبوونی «حماری» ی ناو دیوانی حاجی قادر و «همزە حماری» ی شێخ ڕەزا و «حماری» ی بەیتەکەی «ست عشر».

لەوەندە زیاتر لە خەبەراتی «حیماری» و هاوڕێکانی لە بیری من نەماوە. بەو چەند وشەیەی حیماری کە لەگەڵ شێخ ڕەزادا شەڕە شیعری پێ کردوە دەردەکەوێ

لەهجەی ئاخاوتنی نە بادینی و نە هی سلێمانییە، بەڵکوو هی ناوچەی کۆیێ و ئەو شوێنانەیە وەک کۆیێ قسە دەکەن. بەڵام لەوە زیاتر سەروشوێنێکی لە منەوە مەعلووم نیە، هەروەها هی هاوڕێکانیشی: ئەوەندەی تازە لە گێڕانەوەی بوومەوە سەرپاکی مەعلووماتی منە لە بارەی گرووپی حیماری و قەبرخوار...هتد. بێگومان شیعریان زۆر گوتوە، دەشبێ نوکتە و نادیرەیان دەماودەم گەڕابێ، چونکە پتر لەوە خەریکی خوێندن بووبن خۆیان داوەتە شیعر و لەتیفە و گەپ. بە خۆڕاییش نیە حاجی قادر سێ کەسیان لە جوملەی شاعیرە ناودارەکانی کورد دەژمێرێ دیارە دەبێ ئەوەندە شیعرەیان دانابێ پێیان بگوترێ شاعیر.

لەگەڵ ناوی ئەو کۆمەڵە جەربەزەیەدا ناوی پیاوێکی دیکەشم دەبیست کە ئەویش هاوڕێی خوێندنیان بوە، بەڵام نەک بە جەربەزەیی، لەگەڵ حاجی قادر و باپیرم برادەر و ناویشی کاک ئیسماعیلی چۆمانی بوە. بەو پێیە دەبێ خەلقی گوندی چۆمان بووبێ. لە ناو کاغەز و نووسراوەی کۆنینە کە لە لای ئێمە پارێزراون پارچە کاغەزێک 7 بەیتی تێدا نووسراوە بە شکڵ نووسی فارسی. لە سەرەوەی بەیتەکان «کاک اسماعیل» نووسراوە کە دانەری هەڵبەستەکەیە، لە بەیتێکیشدا شکایەتی دووری «کاکە عەبد» هەیە. وا پێ دەچێ ئەو کاک ئیسماعیلی چۆمانی بێ کە تازە باسم کرد، کاکە عەبدیش حاجی مەلا عەبدوڵا بێ کە لە سەردەمی دانانی هەڵبەستەکەدا هێشتا نەبووبوە حاجی و لە تافی گەنجایەتیدا بوە. دەگونجێ برادەرێکی خۆی بۆی نووسیبێ «کاکە عەبد». شیعرەکان بێهێزن، شاعیر خۆیشی دان بەوە دادەنێ لەگەڵ هێنانەوەی عوزرێکی کلاسیکی بێتالعیدا، وا لێرەدا بەیتەکە شکڵ نووس دەکەمەوە:

مقرم شعرەکانم قلپن اما کر نبی طالع[40]

لفرظی کر بچینم کل دریم بو دی لهر جای

---

[40] - بە شکڵ نووسی ئێستاکە وای لێ بەسەر دێ:

موقررم شیعرەکانم قەڵبن ئەمما گەر نەبێ تاڵع

لە فەرزی گەر بچێنم گوڵ دڕیم بۆ دێ لە هەر جایی

لە کەرتی دووەمی بەیتی پێش ئەم بەیتەیان ناوی کاکە عەبد دێنێ:

«فراق کاک عبد جرکی بریم و نور بینای»[41]

نووسینەکە و شکڵی ئەو کاغەزەی بەسەریەوە نووسراوە لێیان دەوەشێتەوە هی 100 ساڵ زیاتر پێش ئێستا بن. بەڵام چ بەڵگەم بە دەستەوە نیە ئیسپاتی ئەوە بکا ئەم کاک ئیسماعیلە و هی چۆمانی یەک کەس بن، چی گوتم کاری تەخمینە. هێندە هەیە دەبێ ئەوەش بڵێم مانەوەی ئەم نامەیە لە حاجی مەلا عەبدوڵاوە بۆ ئێمە پاڵ پشتی ئەوە دەکا کاکە عەبد حاجی مەلا عەبدوڵا بێ، لەوەیشەوە پتر دڵ بۆ هێندێ دەڕوا کاک ئیسماعیل نامەکەش هەر خۆی کاک ئیسماعیل چۆمانی بێ، چونکە مەعلوومە ئەویش شاعیر بوە و وەک هاوڕێکانی تری.

هەروەک نازانین ئەم کۆمەڵە شاعیرە لە کوێوە هاتوون ناشزانین، لە هەمزە بەولاوە، ناوی ئەسڵییان چی بوە، دوای بڵاوبوونەوەیان چییان لێ بەسەر هاتوە، بۆ کوێ چوون، شوێنەواریان کوێر بۆتەوە یاخود مندالْ و نەوەیان لە دوا بەجێ ماوە، شیعرەکانیان کۆ کراونەوە یاخود وەک خۆیان تێدا چوون: خولاسە هەرچی مەعلووماتە دەربارەیان بە دەستەوە نیە و خۆشیان بە هەموو چاکی و خراپەیانەوە بێ سەر و سۆراغن. خێرەومەندێک شتێک بزانێ دەربارەی هەرکامیان بێ پێویستە بە خەلقی ڕابگەیەنێ و نەیفۆتێنێ.

کۆمەڵبوونی ئەو شاعیرانە لەو ناوچەیەدا بۆ خوێندن لەگەڵ چەندین فەقێ و مەلای غەیری وان وا ڕادەگەیەنێ ئەوسا باڵەکەتی مەڵبەندێکی پێشکەوتووی کوردستانی خواروو بوە لە ڕووی ژیاری و خوێندەواری و گوزەرانیشەوە. دیارە زانستپەروەریی پاشای کۆرە لە کاتی حوکمڕانی خۆیدا ئەسەری هەرماوە تا ئەو کاتەی حاجی و هاوڕێکانی خوێندنیان تێدا کردوە.

[41] - ئێستا وەهای دەنووسن: «فیراقی کاکە عەبد جەرگی بڕیم و نووری بینایی»

حاجی قادر بە چاوی خۆی پاشماوەی کردەوەی پاشای کۆرەی دیوە هەروەک پاشماوەی غیرەتکەشی حاکمێکی دیکەی کوردیشی دیوە بۆیە لەم بەیتەدا ئەمە دەڵێ:

تا تەعیناتی کۆر و لاڵ مابوو
لە گەلێ دێیەکان مەلای چا بوو[42]

مەعلوومە «کۆر» لەم بەیتەدا پاشای کۆرەیە بەڵام تۆ بڵێی «لاڵ» کێ بێ. بیستوومە «عەبدالرحمان پاشای بابان» لاڵ بوە یاخود نەختێک زمانی گرتوە، دەگونجێ مەبەسی حاجی لێرەدا ئەو بێ. بەو پێیە قسەکەی سۆران و بابان دەگرێتەوە. لە لایێکی تریشەوە ئیمکان هەیە مەبەسی میر ئەحمەدی برای پاشای کۆرە بێ کە مەعلوومە لاڵ بوە، ئەوسا واتای شیعرەکە حەسر دەبێ لە سۆران. بەلای قەناعەتی منەوە بەر لە کۆر و لاڵەش مەلای چاک لە دێیەکان هەر هەبوون

[42] - ئەم بەیتە لە دیوانەکەی حاجی بەم شێوەی خوارەوە نووسراوە:

تا تەعیناتی کۆر و لاڵە هەبوو
لە گەلی دێیەکان مەلای چا بوو

وەنیە شیعری وەها قافیە مەیلەو بێهێز نەبێ وەیا کەم بێ، بەڵام بێگومان ئەو جۆرەی تر کە «التزام»ی تێدایە و لە لایەن زۆربەی شاعیرەکانی سەدەی نۆزدەمەوە چاوەدێری دەکرا ڕێکتر و خۆشتر و شاعیرانەترە. لە لایێکی دیکەشەوە «مابوو» تا «هەبوو» پتر دەگونجێ لەگەڵ واقیعی حاڵی حاجی تا «هەبوو» چونکە حاجی بۆ خۆی لە هەڵبەستدا مەبەسی شتێکی کە پاشماوەکەی دیوە لەو گەشتی باڵەکەتیدا یا لە شوێنێکی تر کە ئاگاداری حاڵ و وەزعی بوە، نەک شتێک کە لە حزووری خۆیدا بنیاد نرابێ. حاجی کە لەو هەموو مزگەوت و مەدرەسانەی باڵەکەتی دەرسی خوێندوە بیست ساڵێک بەسەر نەمانی پاشای کۆرەدا تێپەڕی بوو، دیارە ئەوسا تەعیناتی کۆرە «مابوو» دوای بەسەرچوونی «کۆرە» خۆی بۆیە حاجی دەبێ بڵێ «مابوو - نەک هەبوو». هەرچۆنێک بێ من دەڵێم بۆ ڕستەی «مابوو» پتر دەچێ.

بەڵام لە سەردەمی ئەم دوو خونکارەدا، مەبەس پاشای بابان و ڕەواندزە، ڕەونەقی خوێندن لە عادەت بەدەر بوە. ئەوەی ڕاستی بێ بەربەرەکانی بەینی بابان و سۆران کە بەتێکڕایی کارێکی وێرانکەر بوە، لەو مەیدانەی خوێندنەدا سوودێکی زۆری بوە. هەبوونی مەلای چاک لە قەلەمڕەوی هەردوو لا هۆی شانازی و خۆ پێ هەڵدانەوە بوە. هەر ئەو شانازییە بە مەلای چاک بوە وای کردوە «عەبدولڕەحمان پاشا» جێگە و ڕێگە و مڵک و ماڵ و مزگەوت و مەدرەسە ئامادە کا لە کۆیێ بۆ مەلا عەبدولڕەحمانی کاکی جەلی و لە دێی «جەلی»یەوە ڕای گوێزێ بۆ کۆیێ: بێگومان نزیکیی دێی جەلی لە قەلەمڕەوی ڕەواندز و مەترسی ڕاگوێستنی کاکی جەلی بۆ ئەولا خێرایی کردوە بە عەبدولڕەحمان پاشا لە هێنانی کاکی جەلی بۆ کۆیێ و کۆتا کردنی دەستی ڕەواندز لێی. من ناڵێم ئەگەر هاڤرکێ نەبا «کۆر و لاڵە» یاخود میرەکانی تر مەلاکانیان بەلاوە دەنا، بەڵام ڕێی ئەوە دەدەم بە خۆم، ئینسافیش لێم دەسەلمێنێ، کە بڵێم بوونی مونافەسە تیژتری کردوون لە یارمەتیدانی مەلایان. وەنیە لەوەشدا کارێکی ئەوتۆیان کردبێ چ عەیبێکی تێدا بێ. لە مێژووی سەرەتای ئیسلامدا نموونەی لەو ئاشکراتە هەیە: «المؤلفة قلوبهم» بە فەرمانی قورئان پشکێکی دیار کراویان هەبوو لە «بیت المال»، تا دوای خەلیفەی یەکەم ئەم پشکەیان پێ درا، بەڵام کە «عمر بن الخطاب» بوو بە خەلیفە تەعیناتەکەی بڕی و گوتی ئیسلامەتی حەوجە بەوان نەماوە بێ لزوم بۆ نازیان بکێشێ.

هەروەک کۆمەڵبوونی ئەو گرووپە بەڵگەی بوونی وەزعێکی لەبارە بۆ خوێندن لە باڵەکاتیدا، ئەگەر مەعلووم بکرێ دوای ڕۆیشتنیان لە باڵەکەتی سەرلەنوێ لە جێگەیێکی دیکەی کوردستان جەمبوورەیان بەستوە، ئەویش دەبێتەوە نیشانەیێکی وەزعی تایبەتی ئەو جێگەیە، ئەوسا ڕەنگە شیعری شاعیرێک وەیا نووسینی نووسەرێک وەیا بەیتی شایەر و گۆرانیبێژێک لەگەڵ ئەو وەزعەدا دەنگ و ڕەنگی یەکدی بدەنەوە هەر وەک حاجی قادر باڵەکەتی و «کۆر و لاڵە و مەلکە و کیسەشکەل و... هتد»ی دووبارە کردەوە. با لەوەش گەڕێین، هەر خودی شاعیرەکان پارچەیێکن لە مێژووی سەد ساڵی پێش ئیمڕۆمان، دیمەنێکی بێ مانەندیش نیشان دەدەن لە جۆری بوێژی و گوتە و کردەوەی لە کەس نەچووی و نەبیستراو. پێوە خەریکبوون و بەدوادا گەڕان و لێ تۆژینەوەیان لە لایەن ئەدیب و مێژووناسی کوردەوە پێویستێکی ڕۆشنبیرییە.

من کیسەی خۆم بەتاڵ کرد لە هەرچی کالاییێک لەوانەوە بۆ من بەجێ مابێ، ڕەنگە بەوەدا قەرزێکی ئەدەبیشم بە میللەتەکەم دابێتەوە وەک بڵێی سەرگوزەشتیان مۆمێکیشی هەڵکرد لە ڕێبازی خوێندنی حاجی قادر و گەشتە درێژەکەی لە هەندێ شوێنی دوو پارچەی کوردستانی گەورەدا. دوور نابینم لێرە و لەوێ، دوور و نزیک خەبەر و ئەسەری دیکە پەیدا بێ، ناتەواوی نووسینەکەی من پڕ کاتەوە یاخود کەم کاتەوە.

## پشوویەکی لێکۆڵینەوە

بەر لەوە ڕووپەڕەی باڵەک وەرگێڕین و یەکێکی تازە بکەینەوە، شتێکی گرنگ هەیە لە تۆماری گەشتەکەی حاجی قادر کە پەیوەندیدارە لەگەڵ هەموو ژیان و بیر و باوەڕی لێرە بەدواوەی حاجی، دەبێ بەقەدەر توانایی لێی بدوێین و بوون ونەبوون و چەندوچۆنی شتەکە ساغ کەینەوە و نرخی ڕاستەقینەی خۆی پێ بدەین.

هەروەک بۆشت ڕوون دەبێتەوە لە درێژەکێشانی باسەکە، کەنە کردن تێیدا دەست و قەڵەمی نووسەر و تۆژەرەوە دەبا بۆ دەروون و هەستی کۆمەڵایەتی و نەتەوایەتی ئەوسای کورد. چ مەبەس دیراسەی حاجی بی و چ دیراسەی تێکڕای باری کوردەواری بێ، لەگەڵ وەشاندنی هەر کولێنگێکی لێدانەوەی زەویە کۆدە و نەکێڵراوەکانی ژیانی کوردی ئەو سەردەمانە، دار و پەردووی بەسەر یەکدا تەپیوی مێژوو تۆژاڵ تۆژاڵ سەرزەوی دەبنەوە بۆ بەر چاوی کەسێک بیەوێت ڕابوردوو بە ئێستاکەوە ببەستێتەوە و سەرەدەری لە دواڕۆژ بکات. لە لای خۆمەوە هەر ساتە سپاسگوزاریم بۆ گیانی حاجی قادر زیاد دەکات لەو ڕووەوە کە خەباتە دەوڵەمەندەکەی بە هەموو گۆشە و قوژبنێکی کورد و کوردستانماندا دەبات، کە ئەگەر وا نەبا نە لەو و نە لە کورد و کوردستانیش دەگەیشتین، لە ڕێی ئەم تەرزە تۆژینەوەیە.

لەو چەند ساڵەی دوایی، دەماودەم لە پەراوێزێکی تەسکی گوتواندا دەگوترا حاجی قادر و حاجی مەلا عەبدوڵا بیری میللەتپەروەرییان لە باوەڕەکانی ئیبنوئادەم وەرگرتوە. گۆیا ئەو چەند ساڵەی خوێندن و ژیانیان لە باڵەکەتی و هەرێمێک کە مەلای ئیبنوئادەم تێیدا ژیاوە سوودمەندی کردوون لە باوەڕە پێشکەوتوەکانی ئەو

مەلایە زلەی کورد، بە تایبەتی حاجی قادر کە لە دواییدا بۆی ڕێککەوت جغزی تەسکی کۆمەڵایەتیی کۆیێ و کوردستانی خواروو جی بهێڵێ و مێشکی زاخاودراوی بەو بیرە ڕۆشنانە لە ئەستەمبۆڵ گەشە بکا: واتە حاجی قادر بەر لەوەی بچێ بۆ ئەستەمبۆڵ بیری نیشتمانپەروەرانەی هەبوە و لە پاشماوەی بیری مەلای ئیبنوئادەمیشی وەرگرتوە.

من لە لانی خۆمەوە «تعصب»ێکی تایبەتیم نیە بۆ هیچ ڕایەک، بە لاشمەوە ڕاستی هەر چییێک بێ ئەوا هەیە، نە بە خۆشبوونی من دەگۆڕێ و نە لزومیش هەیە بە نەفەس سواری ئێستاکەی من و غەیری من لە فەرزی حەزمان بەو ڕاستییە کرد یا نەکرد. تازە پەنجەیێکی قودرەت لێرانەدا بەرەو دوا ناگەڕێتەوە بۆ چەرخ و چارێگە چەرخێک لەمەوبەر تا ڕووداو بگۆڕێ و چارەنووس لە نوێوە بکێشێ.. بە قسەی سادەش سەد جاران ڕووداو بگۆڕین وەیا هەڵبەستین وەیا بشارینەوە یەک میلیمەتر هەڵوەستی ئێستاکەمان بەرەو پێشەوە نابەین.

دەست خاوێنی لە هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی ئەو ڕاستییە و هەموو ڕاستییێک قەرزێکی ئەخلاقی – میللی – مێژوویی – مرۆڤایەتییە لە ئەستۆی نووسەر و ئەدیب و قسەکەر و هەموو ئەو کەسانەی شت بە خەلقی ڕادەگەیەنن و هەرگیز لەگەڵ خزمەتی میللەت و مێژوو ڕێک ناکەوێ شتی دەستکرد هەڵبەسترێ و بەرگی ڕاستی لەبەر کرێ.

دەزانم هەندێ جار بەڵکوو زۆرجاران لە ڕووی دڵسۆزییەوە یەکێک شتێک هەڵ دەبەستێ بۆ خزمەتی مەبەستێک، ئیتر ڕەنگە ئەو مەبەسە سوود لەو هەڵبەستنە وەرگری یاخود وەرنەگرێ، بەڵام ئەنجامی هەڵبەستن و دەستکاری هەرچی دەبێ با ببێ و چەندێک سوودی لێ وەربگیرێ و وەرنەگیرێ «تبریر – دروستاندن[43]»ی

[43] – «دروست» لە وشەی «بر»ی عەرەبی نێزیکە کە «تبریر»ی لێ وەرگیراوە کەواتە بۆ ئێمەش ڕێ هەیە وشەی«دروست» بکەین بە «فعل» وەک عەرەب «بر»ی کردوە بە سەرچاوەی «برر، یبرر، تبریر» ئێمەش بڵێین «دروستاندن». پێشینیان زۆر وشەی وایان داهێناوە تەنانەت وابوە وشەی عەرەبییان لە ڕێی «دارِشتن – اشتقاق»ەوە کردوە بە کوردی وەک ئەوەی گوتوویانە «جەڕباندن، عامڵاندن، کەرهاندن» بە واتای تەجرەبە کردن و بەکارهێنان و ڕق لێ بوونەوە کە

کارەکە ناکا: نابێ شت لە نەبوو هەڵبەسترێ.. نابێ ڕاستی بگۆڕێ وەیا ئینکار بکرێ وەیا بشرێتەوە. نابێ هەڵە بەرگی ڕاستی لەبەر بکرێ. لزوم نابینم بە دوا بەڵگەهێنانەوە و میسال گوتنەوە بکەوم بۆ جۆری دەستکاری کە لە مێژووی کۆنەوە کراوە چونکە ڕووپەڕەکانی مێژووی کۆن و نوێ پڕن لە درۆ و شتی هەڵبەستراو و ڕاستی شاردنەوە و هەزاران کاری وەها نارەوا، ئەوەی چاوی لێیان نەنووقێنێ دەچنە چاوەیەوە.

دەزانین لێرە بە پێشەوە ساختە و دەستکاری چی بە ئینسان کردوە و چەندین فەلاکەتی بەسەر هێناوە. لەگەڵ زانینی ئەوەدا دەبێ ئەوەش بزانین، دەستکاری کردنی لێرە بە دواوەش هەمان نسکۆکانی کوشندە دێنێتەوە بەر مرۆڤ. دەبێ باوەڕ بێنین بەوە کە دەستکاری ڕەفتارێکی خراپە ئەگەر بۆ چاکە بێ و چاکەشی لێ پەیدا بێ، چونکە گومان لەوەدا نیە کە وا هەر کاتێک ڕێگەی دەستکاری کرایەوە با جارێکیان بۆ چاکەش بێ دەیان جار بۆ خراپە دەبێ.. لە فەرزی لایەنێکیش سوودی لێ وەرگرێ لایەنێکی دیکە یا پتر لە لایەنێک لێی زەرەرمەند دەبێ. هەر ئەو کەسەی دەستکاری دەکا چەند سەغڵەت دەبێ بۆ خۆی لە دەستکاری کردنی خەلق. دەبوا پەند لەو نارەحەتییەی خۆی وەرگرێ و بەزەیی بە ڕاستیدا بێتەوە و ڕەحمیش بە عالەم بکا، خۆ بگێڕێتەوە لەو کارە چەوتە. ڕەنگە هەندە کەسێک لە ڕێی ناچارییەوە وەیا لەبەر پەرەسەندنی دەستکاری کردن لە نێوان نووسەراندا، بەتایبەت نووسەری سیاسی، ئەویش شت هەڵبەستێ و خۆی بەوە ئیقناع کا کە بەڵێ سوود چیە لەوەدا یەکێک یا چەند کەسێک مل دەنە ڕاستی و «قل الحق ولو علی نفسک» بکەن بە پێڕەو لە حاڵێکدا زۆر کەسی دیکە گوێ نەدەنە ئەم پەندە، هەڵبەت گوێشی نادەنێ؟

خۆ ئیقناع کردنی ئەوتۆیی هەرچەند باری ئەو تەرزە کەسانە لە نەزەر خۆیاندا ڕاستیش کاتەوە، چی لێرەدا گوتم دەربارەی ڕاست گۆیی و دەست خاوێنی هەر

---

لە «جرب و عمل و کره»ی عەرەبییەوە هاتوون. بادینیەکان لەو کارەدا یەکجار چالاکن، بایی نیمچە فەرهەنگێک وشەی عەرەبییان کردوە بە کوردی. وشەی «دروستاندن» بە واتای «تبریر» دێ، وشەی «دروست کردن» بە واتای «بناء و صنعه و عمل» دێ.

دەمێنێتەوە وەک بەردی بناغەی فەلسەفە و باوەڕ و پرۆژە و شەقامی بەرەو کامرانی و خێر و خۆشی بۆ زوربەی ئادەمزاد لە ماوەی بێ بڕانەوەی هەر لە ئێستاوە هەتا هەتایێ. لەبەر ئەمە فەرمانی نووسەر هەر لەوەندە ناوەستێ کە بڵێ نابێ ڕاستی بگۆڕێ، بەڵکوو دەبێ تا دەتوانێ لە دژی ئەو خوەی دەستکاری کردن و گۆڕینی ڕاستی بێ و ئەوەندەی پێی دەکری هەڵە و چەوتی ڕاست کاتەوە و ڕاستی شرایەوە بەدەرخا.

لەبەر ئەوە خۆم خەلقی کۆییم و لە دڵ و دەروونی دانیشتوەکانی شارەزام و هەست بە مەیل و ئارەزۆیان دەکەم زیاتر لە یەکێکی کۆیی نەبێ، نەک هەر بە خەیاڵ بەڵکوو دەتوانم بڵێم بە سەری پەنجان گەرمایی مەیلی بەتینی کۆییان هەست پێ دەکەم بۆ دۆزینەوەی ئیسپاتی پتەو کە بوونی بیری نەتەوایەتی لە حاجی قادردا بسەپێنی بەر لە سەفەرەکەی بۆ ئەستەمبوڵ. جگە لەو هەستە خەیاڵییە، لە وتوویژدا، وابوە بە نامەی تایبەتیش، گەنج و خاوەن بیر و باوەڕی کۆیی بیر و ڕای ئاشکرایان لای من دەربڕیوە لە بارەی بوونی ئەو هەستە نیشتمانپەروەریی لای حاجی قادر لە زوێکەوە.

وەک ئەوان منیش حەزم دەکرد بگەیشتمایە قەناعەت هێنان بە بوونی بیر و باوەڕی میللەتپەروەری لە حاجی قادری پیش سەفەری بەرەو ئەستەمبۆڵ. وە نیە خەلقی کۆیێ حەز بکەن بە بوونی هۆی شانازی بۆ خۆیان و شارەکەیان، خەلقی هەموو جێگایەک، مەگەر نەخۆشی نەفسییان هەبێ، دەنا حەز بەو تەرزە شانازییە دەکەن... حاجی قادر خۆی کە دێتە شانازی کردن بە کۆیێ بۆ ئاسمانی بەرز دەکاتەوە. بەڵێ ئەو مەیلەی خۆ هەڵدانەوە شتێکی سروشتییە لە مرۆڤدا. بەڵام کە مەیلەکە ڕووی کردە لادان لە شەقامی ڕاست دەبێتە ناڕەوا و لە جایەزی دەردەچێ. دەبێ مرۆڤ ورتە لە مەیل و ئارەزۆی خۆی ببڕێ کاتێک کە خەریکی لێکۆڵینەوەی مێژوو دەبێ. ئەوەی ڕاستیش بێ چ میللەتێک و چ شارێک و چ عەشرەتێک پێویستی بە شانازی بێ بنج نیە. ڕابردوو وەک ئێستاکە نیە بتوانی سوود وەرگری لە ڕازاندنەوە: هەرچی جوانی هەیە بۆی بخوازیەوە ناتوانی لێرەوە ببێتە ئارایشت بۆی. ئێمە با مێژوو قبوڵ کەین وەک هەبوە بەڵام بە وەزعی نالەباری ئێستامان ڕازی نەبین و خەریکی چارەسەرکردنی بین. لەبەر تیشکی ئەو تێبینیانە با هەوڵ بدەین بە تەرازووی فکر و لێکدانەوە و بەڵگەی مێژوویی، ئازادانە و ئازایانە، ئەو گوتە و بیر و

باوەڕە هەڵسەنگێنین کە دەڵێ حاجی قادر لە ڕاگەیاندنەکانی مەلای ئیبنوئادەمەوە فکری نیشتمانپەروەری وەرگرتوە، بەو پێیەش گۆیا بەر لە چوونی بۆ ئەستەمبۆڵ شیعری کوردپەروەرانەی گوتوە و خەباتی کوردایەتی کردوە.

مەلای ئیبنوئادەم زانایێکی ئەوتۆیە لە هەر میللەتێکدا هەڵکەوێ شانازی پێوە بکا. لە سەردەمی خۆیدا گەیشتوە بەو پەڕی شارەزایی و پسپۆڕی لەو زانستانەدا کە لە باو و ناودا بوون. لە باری فیکری ئازادیشەوە بە کێش و تەرازووی هەڵسەنگاندنی واتای «ئازادی» لەو سەردەمەدا ماوەیێکی فرەوان لە تێکڕای ڕۆژگاری خۆرهەڵات پێش کەوتوە. ئەگەر لیستەیێکی ناوی زانا گەورەکانی کورد بگیرێ ناوی ئەو لە دیرِی هەرە پێشەوە دێ لەگەڵ چەند ناوێکی دیکەی بایی دێڕێک بکەن، لەوانەی هەر یەکێکان لە دەوری خۆیدا پێشەوای زانست بوە.

بەگوێرەی گێڕانەوەی دەماودەم لە میراتی فۆلکلۆری وەک ئەو بەیتەی «ست عشر» ئەویش پشتگیری لێ دەکا، مەلای ئیبنوئادەم تایبەتێکی خۆی هەبوە نەبیستراوە لای کەسی دیکە هەبووبێ لەو مەلا و شێخ و پیاوە دینییانەی کورد کە ناو و خەبەراتییان پێمان گەییوە. ڕستەی «ئیبنوئادەم نەماوە سەری پان کا وەک ماری» وا ڕادەگەیەنێ کە وا هەر ساتێک بیستبێتی «بێشەرعی» دەکرێ لە جێگەیێکی ئەو دەستی بیگاتێ، بۆ خۆی بەرهەڵستی ئەو بێ شەرعییەی کردوە و سزای تاوانبارەکەی داوە. ئەو بەیتە و گوتەی دەماودەمیش پێ لەسەر هەندێ دادەگرن کە مەلای ئیبنوئادەم وابوە لەسەر بێشەرعی تاوانبارەکەی کوشتوە. «سەرپان کا وەک ماری» لە کوشتن کەمتر بە دەستەوە نادا.

هەر چەند لزووم نیە لەوە بدوێین ئاخۆ مەلای ئیبوئادەم چۆن ڕێی بە خۆی داوە خۆ بکاتە «قاضی» و بڕیاری کوشتن بدا و کوشتنەکەش جێ بە جێ بکا، بەڵام کە باسی ئەو لایەنەمان کرد دەبێ کەمێکیش یارمەتی خوێنەری ئاسایی بدەین تاکوو سەری لە کارەکە سوڕ نەمێنێ: بێگومان مەلای ئیبنوئادەم کاتێک ڕێی فەتوای وەهای بە خۆی داوە کە دیویەتی دەسەڵاتێکی حکوومەتی و شەرعی یا هەر نەبوە سزای تاوانبار بدا، یا سزاکەی پشت گوێ خستوە و فەرمانی شەرعی ئەنجام نەداوە، کە حاڵیش وا بوو واتای حەدیسی پیغەمبەر کە دەفەرموێ «من رأى منكم منكرا فليغيره بيده فأن لم يستطع فبلسانه فإن لم يستطع فبقلبه وذلک أضعف الأيمان» دەبێتە واجیب. هەر ئەم پێ هەڵستانەی ئیبنوئادەم بەو تەرزە کارە زەحمەت و

گرنگانە بێ ئەوە کەس بتوانێ مەنعی بکا، بۆخۆی بەڵگەیە بۆ بەرزی و چەسپاویی پایەی لە مەیدانی زانست و ئاییندا.

وەک دەبینی ئیشکالێک نیە لە بلیمەتی و ئازایی و زانایی ئیبنوئادەم، لەوەشدا ئیشکال نامێنێ کە مرۆڤێکی یەکجار بێهاوتا بوە. کاشکی خێرەومەندێک چ مەلا چ ڕۆشنبیرێکی دیکە لە وانەی خولیای زیندوو کردنەوەی کەلەپۆر و ڕابردووی مردوومان لە مێشکیاندایە ژیان و بیر و باوەڕ و بەرهەم و کرد و کۆش و چالاکی ئەم زانایە زلەی زیندوو کردبایەوە بۆمان و بی خستبا ناو کتێبێکەوە تاکوو وەک «فرض الکفاية» کە تەرک کردنی هەمووان گوناهبار دەکا و پێ هەڵستانی لەلایەن یەکێکەوە هەموان لە گوناھـ ڕەها دەکا ئەویش خۆی و میللەتەکەی ڕەها کردبا لە کەمتەرخەمی و بێباکی بەرانبەر چرای هێندە پڕشنگدارمان. ئەوسا ئەو کەلەبەرانەی لە نووسینەکەی مندا پڕ نەبوونەتەوە و هەندێ پرسیاری گرنگیان بێوەرام بەجی هێشتوە ئەو خێرەومەندە پڕی کردبانەوە و دڵ و مێشکمانی لە ناڕەحەتی بێوەرامی پرسیارەکان حەساندباوە، قەرزی مەلای ئیبنوئادەمیشی دەداوە لە جیاتی خۆی و گەلی کورد.

بەڵێ پایەی ئیبنوئادەم، هەرچەند لە تێکڕای بەسەرهاتی ژیان و زانینەکانی کەمێک نەبێ بە ناوماندا بڵاو نەبۆتەوە، دیسانەوە لێمان مەعلوومە چ پایەیێکی بەرز ونرخدارە. بەڵام ئاخۆ لەوەی پێی دەگوترێ «بیری نیشتمانپەروەری» بە زاراوەی ئیمڕۆکەمان، یاخود لەبەر تیشکی نیشتمانپەروەرییەکەی حاجی قادردا، ئا لەو مەیدانەدا ئیبنوئادەم گەیوەتە کوێ؟ جگە لە مەلایەتیەکەی کە شۆڕەتی لە باس کردن و هەڵدانەوەی بێنیازە و بەولای بەرهەڵست کردنی خورافات و دوشمنداری پیاوی ئایینی تەڵەکەباز و نەسەلماندی بێشەرعی ئاشکرا و چەوساندنەوەی خەلق بۆ سوودی شەخسی بە ناوی دینەوە، کە ئەمانە لە سەردەمێ ئەودا و بە نیسبەت مەلاییێکی سەر بەرماڵەوە بە نرخترن لەوە من و تۆ ئیمڕۆ خۆ بکەینە سۆشیالیست، ئایا لەمانە بەولاوە بەرەو بیری کوردایەتی چ قۆناغێکی تێپەڕاند بوو؟

ئەوەندەی بیستبێتم و زانیبێتم و لە کتێبی بایەخداردا خوێندبێتمەوە بۆم ساغ نەبۆوە مەلای ئیبنوئادەم کوردایەتی کردبێ بە واتای بزووتنەوە وەیا فەلسەفەیێکی قەومی. بەڵێ بە پێی ئەوە کە مسڵمانێکی ڕاست بوە و لە خوا ترساوە و بڕوای بە قیامەت ترسی دونیای لە دڵدا بردۆتە دەرێ و تەمای ناڕەوای لە پەڕەی مێشک و گیانی

سرِیوەتەوە مومکینە لە رِێبازی ئەنجامدانی فەرمانی شەریعەتەوە بەرەنگاری کاری نارِەوای حکوومەتی ئەوسا بووبێ، جا ئەگەر عوسمانی فەرمانرِەوا بووبن یەخەگیریان بووبێ و کەوتبێتە هەڵوەستی وەها لە رِێی مەفهوومی بەرهەڵستی کردنی بێگانەوە لە رِواڵەتدا شێوەیێکی کوردپەروەری وەرگرتبێ. بەڵام ئایا ئەو کارانە هەموویان کە لە پەراوێزی واتای ئایین دەرناچن، تا بشلێی بە نرخ و پیرۆز و شەرافەتکارن، مومکینە پێیان بگوترێ کوردایەتی؟

بێ ئەوە جورئەت بکەم لەو قسانەمدا عەیبێک لە ئیبنوئادەم بگرم، بەو پەرِی تەقدیسەوە بۆ گیانی پاکی و رِەوشتی قارەمانانەی دەڵێم کوردایەتی دروشم و رِوخسار و ناوەرِۆکی تایبەتی هەیە جیاوازی دەکاتەوە لە «پیوریتانیزم»ی ئایینی بێ فێڵ. وا دەبێ نیشتمانپەروەری و ئایین بە یەکەوە جووت برِۆن وەک ئەوەی بە جووت لە دژی ستەم بن وەیا خەلق هان دەن بۆ بەرگرتنی هێرشی بێگانە. رِەنگە ئایین خۆی ببێ بە دەستووری میللەتێک و لە سەری برِوا. بەڵام هەموو دەزانین تۆ و کێڵگە و دروێنەی نیشتمانپەروەری شتێکە و هی ئایین شتێکی سەربەخۆی خۆیەتی.

وا هەیە نیشتمانپەروەر، تاکی یا کۆمەڵی، «ملحد»ن، یاخود لە عاست دیندا بێپەروان. لزووم نیە بلێم، وا دەشلێم بۆ مەبەسی زێدە رِوون کردنەوە، نیشتمانپەروەرێکی برازیلی چ بیر لەوە ناکاتەوە ئاخۆ قورئانی ئیسلام چ دەفەرموێ و مەرقەدی گەیلانی چەند منارەی بەسەرەوەیە. میللەتان ئایینی جوداوازیان هەیە هەمووشیان بیری تایبەتی نیشتمانپەروەریی خۆیان هەیە. هەر میللەتێکیش هۆش و گیانی میللەتپەروەری هەژاندی، پێش ئەوە بیر لە فەلسەفە و ئایین بکاتەوە هەر پێداویستەکانی فەرمانی میللی دێنەوە بەر چاوی. با لێرەدا نموونەیێکی سەر بەو مەوزووعەوە بێنمەوە بۆ رِوون کردنەوەی لایەنی ئەوە کە وا رِەنگە نیشتمانپەروەری رِێک نەکەوێ لەگەڵ فەلسەفەیێکی تری کۆمەڵایەتی و سیاسی وەیا باوەرِی دینی. با لە پێشەوە نموونە لە ئایین بێنمەوە بە دوا ئەوەدا لە فەلسەفە.

زوربەی مێژوونووسان لەسەر ئەو قەناعەتەن کە وا وەزیر «إبن العقلمي» لەبەر جیاوازیی مەزهەب، خەلیفەی عەباسی «مستعیم بالله»ی هەڵفریواند و بەغدای تەسلیم بە هۆلاکۆ کرد.. با 600 ساڵێک واوەتر ببین و نموونە لە مێژووی کورد بێنینەوە لە رِۆژگارێک کە حاجی قادر ژیاوە و خۆی ئاگادار بوە، هەرچەند

نەختێکیش لە دووەرە بێ: گوتەیێکی مەشوور هەیە دەڵێ «مەلای خەتێ» لەبەر باوەڕی ئایینی خۆی کە ناسەلمێنێ مسڵمان لە دژی خەلیفەی ئیسلام چەک هەڵگرێ، فەتوای دا بە کافربوونی هەر کوردێک شەڕ بکا لەگەڵ لەشکری عوسمانی کە ئەوسا بە دەوڵەتی ئیسلام دەزانرا و پاشان لەقەبی خەلیفەی پێوە بوو، گۆیا ئەو فەتوایە بوو لەشکری میری ڕەواندزیی لە شەڕ کردن وەستاندەوە و چەکی پێ فڕێ داوە و بەوەدا میری ڕەواندز ناچار بوە بە تەسلیمبوون و حکوومەتی لێ تێک چوە. من لێرەدا بە نموونەی بەرهەڵستێکی دینی لە تەک داخوازی و پێویستی قەومی و هەم بۆ مەبەستی«جدل» وا ڕادەنوێنم کە وا مەلای خەتێ ئەو فەتوایەی دابێ، دووریش نابینم لە حاڵی وەهادا مەلاییێک کورد بێ یا غەیری کورد بێ فەتوا بدا بە کافربوونی پیاوی یاخی لە دژی خەلیفەی ئیسلام، دەنا ئەگەر بۆ ئەم مەبەسە و لەبەر ئەوە نەبێ کە فەتواکەی مەلای خەتێ زۆر بەسەر زمانانەوەیە، نموونەم لە ڕووداوی تر دەهێنایەوە چونکە گوتەیێکی دیکەی یەکجار دژی ئەو گوتەیە بە بەڵگەی عەقڵییەوە پاشەکشە دەکا بەو شۆرەتەی کراوەتە عەیبێکی گەورە لە مەلای خەتێ.

من بێ ئەوە چ مەبەستێکم هەبێ غەیری دەست خاوێنی مێژوویی، گوتەی دوەمیش بە خوێنەری کورد ڕادەگەیەنم، ئەوەندەش دەڵێم قسەیێکی لەو ڕووەوە پێم گەییوە لە پیاوی ئەوتۆم بیستوە هیچ پەیوەندیێکی خزمایەتی وەیا دۆستایەتی بە بنەماڵەی مەلای خەتێوە نیە، بەپێچەوانە لەلایەن مەشرەبی «تصوف»ەوە دەبێ بە ناحەزی مەلای خەتێش بژمێردرێ. سەرەڕای بێ پەیوەندی، چ سوودێکی پێ ناگەیەنێ نە لە ئێستاکە و نە لە دوا ڕۆژدا لەو سوودە بەولاوە کە ناوناوە دووچاری دەمەتەقەی بکا لەگەڵ ئەو کەسانەی مەلای خەتێ تاوانبار دەکەن. قسەکە کە هی لایەنگیری و خزمایەتی و سوودی شەخسی نیە، لە ناوچەیێکیشەوە هەڵستاوە شارەزایە لە ڕووداوەکانی سەردەمی پاشای کۆرە لە ڕەواندزدا.

ئەم گوتەیە ئینکاری فەتواکە ناکا بەڵام دەڵێ لەسەر خواهشتی پاشای کۆرە دەرچوە نەک لە دژی: واتە مەلای خەتێ بەپێی بەرژەوەندێک کە پاشا خۆی ڕەچاوی کردوە بۆ ئەوە هەم وڵاتەکە وێران نەبێ و هەم ئابڕوو نەتکێ بە پەلە و دوا کات فەتوای ڕەوابوونی ئەو شەڕەی دەرچواندوە تا ببێتە هۆی ئیمکانی گێڕانەوەی لەشکری کورد بۆ ڕەواندز و کردنەوەی درەگەیێکی ئاشتی و ڕێک کەوتن.

بەپێی بیستن و لێکدانەوەی خۆم دوو بەڵگەی گەورە پشتگیری ئەم ڕیوایەتە دەکەن:

یەکەمیان ئەوەیە لە سەرەتای دانانی مەلای خەتێ بە «باش مەلا» و مەرجەعی دینی لە قەلەمڕەوی پاشای کۆرەدا، ڕێک کەوتنێک و پەیمانێکی بنجی و سەرەتایی هەبوە لە میانی پاشا و مەلادا لە سەر ئەوە کە نە پاشا تێکەڵ بێ لە کاری سەربە شەرع و ئایینەوە، نە مەلاش دەخلێکی ببێ بە سەر کاروباری حوکمڕانی و هەڵسووڕاندنی ئیشی دونیاییەوە، هەر یەکەیان لە مەیدانی خۆیدا ئازاد بی و سنوور و پەرژینی لێ نەشکێ. هەر لەبەر ئەم ڕێککەوتنە بوە مەلای خەتێ بێدەنگ بوە لە زۆر کردەوەی پاشا و دەستوپاوەندەکانی لە هەڵسووڕاندنی کاری حوکمڕانی کە وا گەلێک جاران خزمایەتی نەبوە لەگەڵ فەرمانی قورئان و حەدیس و شەریعەت. پیاوێکی وەک پاشای کۆرە هەرچەند خزمەتی مەلایانیشی کردوە و گەشەی داوە بە خوێندن لە مزگەوتەکان جارەها کاری وای کردوە نەک هەر ئایین بەڵکوو کوێرەڕێی ئینسافیش لێی نەسەلماندوە، بەڵام بەلای خۆیەوە پێویست بوە بۆ سوودی حکوومەتەکەی. وەک پاشای کۆرە هەموو حاکمێکی تریش بێئینسافی و دڕندەیی کردوە هەر کاتێک بە پێویستی زانیبێ، چەند حاکمێک نەبێ لە درێژایی مێژوودا کە ژمارەیان لە پەنجەی دەستان تێ ناپەڕێ.

بەڵگەی دوەم ئەوەیە، کە وا تا ڕادەیێک لە هی یەکەمەوە هەڵدەستێ، پاشای کۆرە لە حوکمڕانیی خۆیدا دەستی نەپاراستوە لە کوشتن: یەکێک بووبێتە هۆی بێهێزیی حکوومەتەکەی وەیا ئەو گومانەی لێ کردبێ کوشتوەتی. بەر لە هەموو خەلق مامەکانی خۆی کوشتوون. دەوجا پیاوێکی وا ڕژد لەسەر پاراستنی دەسەڵاتەکەی چۆن بێدەنگ و دەست پاچە ڕادەوەستێ لە عاست مەلای خەتێ کە خەریک بێ کارێکی وا بکا تەخت و تاجی لێ تێک دا؟ مەلای خەتێش کە شارەزای خوێنڕێژیی پاشای کۆرەیە چۆن ئەو فەتوایەی دا و هەڵ نەهات بۆ جێگاییێک خۆی تێدا بپارێزێ تا ئەو کاتەی ئیشی پاشا یەکلا دەبێ؟ یاخود با بڵێین دەبوا لە پێشەوە مەلا پەنا ببا بۆ جێگەیێک کە لە دەسەڵاتی پاشا بەدەر بێ ئەوسا فەتواکە بڵاو کاتەوە. وەک دەزانین نە پاشا مەلای کوشت و نە مەلاش ترسا لە کوشتن چونکە فەتواکە لە سەر ئارەزۆ و پەسندکردنی پاشا بوە.

بەیتێکی حاجی قادر، کە لەمەپێش بە شایدەمان هێنایەوە و دەڵێ:

تا تەعیناتی کوێر و لاڵ مابوو
لە گەلێ دێیەکان مەلای چا بوو

لێرەدا زیمنەن پاکانەیێک دەکا بۆ مەلای خەتێ، ئەوساش حاجی قادر نەی دەزانی لە دوا ڕۆژدا ئەو تۆهمەیەی دەخرێتە پاڵ تا پاکانەی زیمنی بۆ بکا. پاکانەکە لەوەوە دێ کە وا مەعلوومە بە دوای مەلای «ئیبنوئادەم» دا یەکەم مەلا لە تەعیناتی پاشای کوێرە سوودی وەرگرتبێ مەلای خەتێ بوە، بەو پێیە ئەو بەر لە هەموو مەلاییێک دەکەوێتە ناو پەراوێزی قسەی حاجی «لە گەلێ دێیەکان مەلای چا بوو». زاهیری حاڵ ئەوەیە حاجی قادر بە وەهم و خەیاڵیشیدا نەهاتوە مەلای خەتێ چ عەیبێکی هەبووبێ دەنا بێگومان لێی بێدەنگ نەدەبوو و لە پەراوێزی شیعرەکەی دەر دەهاویشت.

جگە لەمە، حاجی و باپیرم لە مزگەوتی مەلای خەتێ خوێندوویانە: گریمان لەو کاتەدا بیریان نەپرژا بوو فەتواکە لە مەلای خەتێ بە عەیب بگرن، خۆ دوای چوونی حاجی بۆ ئەستەمبۆڵ و کرانەوەی هۆشی میللەتپەروەرانەی دەبوو فکرێک لەو فەتوایە و خوێندنەکەی خۆی لە مزگەوتی مەلای خەتێ بکاتەوە و شتێک لە بارەیەوە بڵێ. زۆر ئاشکرایە فەتواکە لە کاتی دەرچوونیدا چ عەیبێکی لێ نەگیراوە، لە دواییشدا هەمان بێعەیبی بوە وای کردوە پیاوێکی کوردپەرستی وەک حاجی قادر ڕەخنەی لێ نەگرێ.

ئەم دوو گوتەیە هەن دەربارەی هەڵوەستی مەلای خەتێ، گوتەیەکیان پەرەسەندوو و ئەوی دیکەیان لەبەر سێبەری یەکەمیان کز و بێدەنگ. من هەرچەند لە وەزعێکدا نیم بتوانم نووسینەکەم تەرخان کەم بۆ تۆژینەوەیێکی ئەوتۆ پرسیارەکە یەکلا کات، لەگەڵ ئەمەشدا قەناعەتم ئەوەیە فەتواکە لەسەر خواهشتی پاشا دەرچوە، هەر ئەمەش زیاتر دەگونجێ لەگەڵ دەلالەتی حاڵ و چۆنەتی ڕووداوەکانی ئەو کاتە و وەزعە کە فەتواکەی تێدا دەرچوە. مەیلەو یەقینم پێک هاتوە لەوەدا ئەگەر مەلا لە خۆوە ئەو کارەی کردبا لە سەرەتای بەرپابوونی شەڕەکەوە دەیکرد چونکە کە جایەز نەبووبێ هەر لە ڕۆژی یەکەمەوە جایەز نەبوە. ئەوەی ڕاستی بێ یەکێک بە وردی کتێبەکەی خوالێخۆش بووی حوزنی موکریانی بخوێنێتەوە

ترووسکەی حەقیقەتی لێ بەدیار دەکەوێ هەرچەند حوزنی بۆ خۆی باوەڕی تایبەتی خۆشی هەیە دژی مەلای خەتێ.

ڕەنگە بێسوود نەبێ لێرەدا لە هەڵوەستەکانی مەلای کورد دوو هەڵوەستی نوێ بە بیران بێنمەوە یەکێکیان تایبەتی کۆیێ، یەکێکیشیان هی تێکڕای کوردستانی عێراق، کە هەر دوویان لەلای خۆیانەوە پاکانەیێکی نهێنی دەکەن بۆ مەلای خەتێ لەو ڕووەوە کە میللەتی زۆرلێکراو داخوازی دوێنێ و ئیمرۆی لە ڕۆڵەکانی یەک چەشنە، ڕۆڵەکانیشی وایان چاوەڕوان لێ دەکرێ یەک هەڵوەست ڕاوەستن لە دوێنێ و ئیمرۆدا چونکە زەرفی هەڵوەستیان یەکێکە، خۆفرۆشێک و خەڵەتاوێک نەبێ لە هەڵوەستەکە لانادات.

هەڵوەستی تایبەتی مەلاکانی کۆیێ ئەوە بوو لە ساڵی 1961 دوای بەرپابوونی شۆڕش لە 11ی ئەیلوول، حکوومەتی «عبدالکریم قاسم» داوای لێ کردن برووسکەی پیرۆزبایی بۆ بنێرن و شۆڕشگێرەکانی کوردی تێدا تاوانبار بکەن. 10 مەلا، لەوانەی فەلسەفە و تەئویلات فێری نەکردبوون تبریران بێننەوە بۆ خراپە، بەوپەڕی سەر بەرزییەوە ڕەفزی خواهشتی میرییان کرد و چوونە بەندیخانە و دووچاری عەزاب و زەحمەتێکی گەورە بوون. نە خۆیان نە کەسیش دەیزانی سەرئەنجامیان بە چی دەگا چونکە دەعواییکی عورفی قورس ڕێک خرا لە دژیان کە سزای خنکاندن بوو. هەندێک بێدین شایەدیشیان لێ دان، بەتایبەتی لە مەرحووم مەلا مەعسووم... چەند مانگێک لە بەندیخانەکانی بەغدا و دەوروبەری بەغدا مانەوە، بەڵام بەختیان یار بوو لەوەدا شۆڕشی کورد بەردەوام بوو و چارەنووسی زۆر کەس و زۆر لایەنی سیاسی بەو دەوام کردنەی شۆڕشی کورد گۆڕا و مەلاکانی کۆیەش وەک چەند خەلقی دیکە بەردران. ئەمە بە نیسبەت مەلاکانەوە کەچی هەموو دەزانین بە سەدان برووسکە لە ڕادیۆ دەخوێندرایەوە و لە ڕۆژنامان بڵاو دەکرایەوە، یا لە ترس یا لە تەماع کورد و غەیری کورد، بە شەهادە و بێشەهادە، خاوەن شۆرەت و بۆرەپیاو، دەیاننارد بۆ پشتگیریی عەبدولکەریم و لە دژی شۆڕش.

مەلاکان ئەمانە بوون:

1) خوالێخۆشبووی مەلا معصومی هەورامی،
2) خوالێخۆشبووی مەلا محمدی مەلا عەلی،

3) خوالێخۆشبووی مەلا محمدامین مەلا مصطفی عاصی،
4) حاجی مەلا ظاهری مەلا صادق،
5) مەلا أنوری شیواشانی،
6) مەلا عەلی حاجی توفیق،
7) مەلا صدری مەلا صالحی خطیب،
8) مەلا محمدامین کریم کانی ڕەشی،
9) مەلا فتح الله عبدالکریم،
10) شێخ حسامالدین تاڵەبانی.

ئەو ساڵە دوای گرتنی مەلاکان وا ڕێک کەوت چووم بۆ سلێمانی، برادەران وەزعی کۆیەیان لێ پرسیم، پێم گوتن ئێستا لە کۆیێ خەلق بە بانگی کەڵەشێر نوێژ دەکەن چونکە مەلای تێدا نەماوە بانگ دات.

هەڵوێستی تێکڕای مەلایانی کوردستانیش ئەوە بوو لە ساڵی 1966 بە بۆنەی ئاهەنگێکی دینییەوە «عبدالسلام عارف» ئەغڵەب مەلاکانی لە بەغدا کۆ کردنەوە و گوتاری پێ خوێندنەوە. ژمارەیێکی زۆریش لە مەلاکانی کورد هێنرابوون بەو نیازە قسەکانیان بە ڕادیۆ بڵاو کرێتەوە، ئیتر یا بە ترس یا بە تەماع لە قسەکاندا شۆڕشی کورد تاوانبار بکەن. ئەوەی ڕووی دا شتێک بوو دژی هەموو حیسابێکی «عبدالسلام»: یەکێک لەو مەلایانەی کورد کەرتی وشەیێکی لە زاری دەرنەچوو «عبدالسلام» پێی خۆش بێ، تێکڕایان داواشیان لە حکوومەت کرد ئاشتی بنێتەوە لەگەڵ شۆڕشگێرانی کورد.

هەرچەند مەرج نیە مەلاییکی 140 ساڵێک پێش ئیمڕۆ خۆی کردبێتە «قدوة» بۆ مەلاکانی 140 ساڵ دواتر، بەڵام کە بەڵگەیێکی «قطعی» نەبوو ئیسپاتی لە یەکدی دوورکەوتنەوەی ڕەفتاری باپیر و نەوە بکا لە گوتەی دەماودەم بەو لاوە، لە هەمان کاتیشدا گوتەی بە «منطق و ئیقناع»یش هەبێ وا ڕاگەیەنێ نەوەکان ڕەفتاری باپیریان دووبارە کردبێتەوە، پتر بە دڵەوە دەنووسێ لە ڕابوردوودا ئەوە ڕووی دابێ کە نیسبەتی باپیر و نەوە داخوازی دەکا.

بەهەمەحاڵ مەلای خەتێ یا بە ڕەزامەندی پاشای کۆرە فەتواکەی داوە یا لە دژی ئەو. ئەگەر بە ڕەزامەندیی پاشا بووبێ چ گلەیی نایێتەوە سەر مەلا. خۆ، لە فەرزی «مستحیل» ئەگەر لە خۆوە فەتواکەی دابێ دیارە لە نەزەر گیانی نیشتمانپەروەریی کورددا دەبێتە جێی گلەییەکی زۆر گەورە، بەڵام ئەوساش گومان لەوەدا نابێ کە لەبەر مەحزی باوەڕی دینی کارەکەی کردوە، پوولێکی لە کەس وەرنەگرتوە. بەپێی باوەڕی خۆی شمشیر هەڵکێشان لە ڕووی خەلیفەی ئیسلام کارێکی ناجایەز بوە. ئا لێرەدا نیشتمانپەروەری و دینپەروەری لە یەکدی دەترازێن جا هەر لایەکیان چ دەلیلێک دێنێتەوە با بێنێتەوە بۆ ڕاستی و دروستی باوەڕەکەی. مەبەس ئەوەیە بۆ خوێنەری ڕوون کەمەوە ئایا دەشێ دینداریی مەلای ئیبنوئادەم بێ سێ و دوو ڕوو لە نیشتمانپەروەری بکا وەیا بیری کوردایەتی بخاتە مێشکانەوە!

نەک هەر ئایین بەڵکوو هەموو باوەڕێک کە لە سەرچاوەیێکی غەیری نیشتمانپەروەرییەوە هەڵ بقوڵێ مومکینە لەگەڵ نیشتمانپەروەری سادە و بێتەئویلدا نەگونجێ. لەوەش زیاتر دەتوانم بڵێم: ئایین هەڵدەگرێ ڕێگا بدۆزێتەوە لە ئایەت و حەدیس و فەتوای موجتەهیدەکان بۆ ئەوە لە کاری دونیاییدا کەنارەگیر بێ و لێی بەدەنگ نەیێ، وەک ئەوەی پەیڕەوی «لکم دینکم ولی دین» بکا، بەڵام باوەڕەکانی سیاسی کە لە سەرچاوەی تایبەتی خۆیانەوە هەڵدەستن ڕێبازی ئەوتۆ نادۆزنەوە لە فەلسەفەکەیان فەتوای بۆ بدا لە تەک هەڵوەستەکانی نیشتمانپەروەریدا کنارەگیری بکەن و مەیدانی بۆ بەجێ بێڵن. فەلسەفەی سیاسی بە درێژایی کات و لە هەموو هەڵوەست و مەیدانێکدا خۆ زاڵ دەنوێنێ بەسەر بیر و باوەڕی غەیری خۆیدا، بەڕادەی بوونی گیانی شۆڕشگێریش لە فەلسەفەدا لایەنی تاوانبارکردنی غەیر بەهێز دەبێ تێیدا.

هەموو لەبیرمانە ئەو ساڵە کە کۆماری مەهاباد لەناو چوو و سەرۆکەکانی خنکێنران چەندین ڕۆشنبیری کورد دەیانگوت و دەیانگوتەوە لەناوچوونی کۆماری مەهاباد ڕووداوێکی باش بوو چونکە خزمەتی ئاشتی جیهانی کرد: ئەمەیان دەگوت نەوەک گلەیی بکرێ لە بەرەی سۆشیالیزم کە مەهابادی نەپاراست. بە زاری کەسیشدا نەهات بڵێ کە پاراستنی ئاشتی ئەو پێویستە بوو، دەبوا لە پێشەوە بەرەی جەنگخواز نەورووژێنن بە دروست کردنی کۆماری مەهاباد، هەر نەبا ئەو قوربانیانە لە کیسەی کورد دەمانەوە. بێگومان باوەڕێکی سیاسی ئەو تەئویلەی دێنایەوە بۆ شیرن کردنی

تامی کارەساتەکە لە زار و گەرووی کورد. لەمەشدا هەموو لایەنە سیاسیە شۆڕشگێرەکانی کوردستان یەک دەنگ بوون.

بۆ ئەوە تەمێکی تاریک و بێلزوم بە دەوری نووسینەکەمەوە نەمێنێتەوە دەربارەی ڕووداوی مەهاباد لێرەدا ئەوەندەش دەخەمە سەر قسەکانم و دەڵێم بەلای باوەڕی خۆمەوە چ گلەیی ناکرێ لە بەرەی سۆشیالزم لەوەدا نەیتوانی یاخود نەیویست بە ئەرکێکی زل کۆماری مەهاباد بپارێزێ، بەڵام ئەگەر کورد پێی کرابا کۆمارەکەی بپارێزێ دەبوا بیپارێزێ وەلەو دەجارانیش شەڕی گەورە یا گچکە لەو پاراستنەدا پەیدا بووبا. هیچ میللەتێک ئامادە نیە خۆ بکاتە «مسیح»ی سەردەمی چەرخی بیستەم لە پێناو جیهاندا، بۆ دەبێ کورد خۆ بکاتە «مسیح». خۆ کردنە «مسیح» کاری ناچارییە.

هەر لەو هەڵوەستانەدا کە بیری نیشتمانپەروەری لەگەڵ فەلسەفەی تردا یەکدییان نەگرتۆتەوە ئەوە بوو لە دەوروبەری ڕاپەڕینەکەی 1948 کە پێی گوترا «وثبە» نامێلکەیێک دەرچوو، وا بزانم کوردیش دەری کردبوو، بەلای خۆیەوە ئیسپاتی ئەوەی کردبوو کورد «ئوممەت» نیە. دیارە کە کورد ئوممەت نەبێ مافی ئەوەی نامێنێ خەباتی قەومی بکا. بێگومان فەتوای وەها گەلێک کوشندەترە بە نیسبەت چارەنووسی کوردەوە لە فەتواکەی مەلای خەتێ ئەگەر بووبێ و ئەگەر نەبووبێ. دیارە خاوەنی نامێلکە ڕەچاوی ئەوەی کردوە بوونی خەباتێکی قەومی کورد بزووتنەوەی چینایەتی عێراق کەرت دەکا. لێرەدا ئەم فەلسەفەیە نەک هەر ڕێک ناکەوێ لەگەڵ بیری نیشتمانپەروەی، بەڵکوو هەندەی خۆ دوور خستۆتەوە لێی چۆتە ڕێزی دوشمنە هەرە گەورەکانیەوە.

وەک ئەم نامێلکەیە، تێکدانی قەبری عەلی کوردی و خێزانەکەشی کە بە وەسیەتی خۆیان لە حەمرین هەڵنرابوون ئەویش لەو فەلسەفەوە هەڵستاوە کە پاراستنی یەکیەتیی خەباتی چینایەتیی عێراق بەر لە هەموو ئەنجامێکیەوە دێ... نازانم بە دوا تێکدانی قەبرەکان تەرمی مێرد و ژن چی لێ هات.

دەوجا لێت مەعلووم بێ دینداریی مەلای ئیبنوئادەم لە خۆوە نابێتە سەرچاوە بۆ بزافتنەوەی هەستی نەتەوایەتی لە دەروونی خەلقدا. فکری نیشتمانپەروەری دروشم و ڕێباز و فەلسەفە و باوەڕی تایبەتی خۆی هەیە لە نەزەر فەلسەفەی دیکەدا کز

نابێتەوە، ڕەنگە لەگەڵیان ڕێک کەوێ و ڕەنگە ڕێک نەکەوێ. لەبەر ئەوە تا ئیمکان دەبێ بگوترێ مەلای ئیبنوئادەم کوردایەتی کردوە و گیانی نیشتمانپەروەری هەبوە بە واتای کوردستانپەروەری دەبێ بەڵگەی قەتعی و ڕابەر پەیدا بێ کە ئەم لایەنە بسەپێنێ. پیووریتانیزم و عەلەیهی درای ئەفسانە و خراپە کە بۆ خۆیان جێی پێوەنازینن، نابن بە کوردایەتی هەر وەک لە وڵاتێکی دیکەدا نابن بە تورکچیەتی وەیا ڕووسپەروەری.

ئاخۆ لە نووسینەکانی ئیبنوئادەم چی ئەوتۆمان بەدەستەوەیە کە کوردایەتییەکی ئاشکرای تێدابێ؟ یا ئەگەر کوردایەتی سەریحیش نەبێ، لە جغزی ئایین دەرچووبێ و گەیشتبێتە سنووری بەرژەوەند وەیا فەلسەفەیێکی دونیایی؟ وە نیە من هەموو وەیا زۆرینەی نووسینەکانی ئیبنو ئادەمم دیبێ بەڵام لە دەستنووسێک کە ئەسڵەکەی مەلای ئیبنوئادەم خۆی لە 1234دا نووسیوێتی و ناوی هەموو تەئلیفەکانی خۆی تێدا هێناوە و کورتەیێکیش لە سەرگوزەشتی خۆی دەگێڕێتەوە، دەردەکەوێ لەو نووسینانەیدا بەولای دین و مەوزووعەکانی خوێندنی مزگەوتەوە نەڕۆییوە، با لەو مەیدانەشدا لە مەلای دیکە و غەیری مەلایانیش ئازاتر و خواناستر و زاناتر بێ. لە عاست حەقیقەت شەرم و ترس جێی نابێتەوە: حەقیقەتیش ئەوەیە لەوەندەی بیستوومە و بە خوێندنەوە دیتوومە، تا ئێستا، لە پاشماوەی ئیبنوئادەم شتەکم پێ گەیشتبێ مەلایەتیی بێهەمتا و ئایینی پاک و سروشتی چاک و دڵی ئازا بوە.

بەڵام چاکتر بۆ من و نووسینەکەم ئەوەیە بڕیاری پێشەکی نەدەم، ساغ کردنەوەی مەبەس بدەمە دەست تۆژینەوە و چی لە بن بێژنگی تۆژینەوەدا مایەوە ئەوە ببێتە کاکڵ و ناوەڕۆکی هەوڵ و تەقەللام. لەگەڵ ئەمەشدا ڕەنگە ناوناوە خامە پەلەم پێ بکا و وردە بڕیاری یەکجارەکیم پێ بدا، تۆ ئەم بڕیارە سەرپێییەم لەسەر حیساب مەکە و لێم بە پشوو بە تا کۆتایی شی کردنەوەی باسەکە.

دەنگ و سەدای کردەوەکانی ئیبنوئادەم لە چاو پیاوانی تری وەک خۆی گەلێک پتر دێتە بەر گوێیانەوە. دەنگێکی یەکجار ئاشکرای یەکێک لە گوتەکانی کە وا بەولای دینداری ڕووتەوە چووبێ ئەو دەنگەیە لە سێ بەیتی مەشووریەوە هەڵدەستێ کە کەوتوونەتە ڕیزی کەلەپۆری زۆر بەنرخی کوردییەوە و گیانێکی بەرچاوی ئازایی و ناڕەزایی لێیانەوە دەدرەوشێتەوە. کە سرنجێکی ورد لە بەیتەکان بگرین دەبینین یەکەم و دوەمیان ڕەخنەکارییێکی نەبەردانەیە لەگەڵ ئاسماندا، بەڵام بەیتی سێیەم

لەگەڵ نرخی تایبەتی خۆیدا پارسەنگ کردنێکی ڕەخنەکەیە لەو ڕووەوە هۆییێکی بەهێزی ڕازی نەبوون و ڕەخنەگرتن بە دەستەوە دەدەن. واتە ئیبنوئادەم دوای ئەنگوست لە چاوانی ئاسمان دەرحاڵ کارەساتێکی وەها دەکاتە عوزری ڕەخنەکاری کە هیچ قسە و گلەییان بۆ ئاسمان ناهێڵێتەوە. سێ بەیتەکان ئەمانەن:

هەوران کردە گۆڵە گۆڵ
میکائیلا ئەتۆش دەی

تووتن و ماشان بڕشێنە
دەبا نۆش بێتە سەر دەی

ڕۆمی ئەوا پەیا بوون
کوتوبخانان دەکەن «طی»

بەیتەکان لە ڕووی باوەڕی ئایینەوە جورئەتێکی ئاشکرایان تێدایە ئەگەر لەبەر تیشکی دینداریی کلاسیکی کۆنی ڕازیبوون بە قەزاو قەدەر تەماشا بکرێن، چونکە هەر لە هەورەوە کە جاران بە زاهیرەییێکی ئاسمانی دادەنرا تا فریشتەی میکائیل کە فەرمانبەری یەزدانە، تا ڕشاندنی تووتن و ماشان، تا هێنانی نۆ بۆ سەر دە هەموویان گلەیی و نارەزامەندییە. کەم وایە پیاوی ئایین خۆی لێ دابێ هەر نەبێ لەبەر خۆپاراستن لە تانە و توانجی ئەم و ئەو؛ زۆر بە سادەیی گوتویانە لە فەرزی مافی گلەیی کردنیشمان هەبێ لە کارەساتی زەمانە خۆ گلەیی کردن چ سوودێکی نیە، بێدەنگبوونیش چ تاوانێکی تێدا نیە، کەواتە سەلامەتی لە بێدەنگی دایە. زۆریان، یاخود زۆرینەیان، لەسەر ئەو ڕێگەیە ڕۆیشتوون کە ئەم بەیتەی شێخی سەعدی نەخشەی دەکێشێ:

بهمه حال شکر باید کرد
که مبادا ازین بتر گردد

واتە «لە هەموو حاڵێکدا دەبێ سپاس گوزاری بکەین نەوەک لەوە خراپتر بێ».

جورئەتی سێ بەیتەکە لە مەلای ئیبنوئادەم دەوەشێتەوە و ڕێک دێ لەگەڵ ئەو کردەوانەی کردوونی لە دژی کەسانێک بێشەرعییان کردبێ. نامەوێ بچمە ناو موناقەشەی باوەڕی ئیبنوئادەم دەربارەی«جبر و اختیار» چونکە زۆر دوورمان دەخاتەوە لە مەوزووع و کاتێکی دوورودرێژیشی دەوێ تا لێی دەبینەوە.

بەهەمەحاڵ ئەم سێ بەیتە بە هەموو ئازایی و ئازادیی باوەڕەوە کە تێیاندایە چی ئەوتۆ بەرەو بیری نیشتمانپەروەریی سادی نابەن، چونکە داد و فیغانی ئەو بەیتانە لە دەست ڕۆمیان بۆ کتێبخانانە نەک بۆ فۆتانی مافی نەتەوایەتی کوردە. ڕەنگ بوو ئەگەر چەند بەیتێکی دیکە بەدوا ئەمانەدا هاتبا و باسی زوڵمی جۆرجۆری تورکانی کردبا، لەو ناوەدا تووشی شەکواییکی کوردانە هاتباین، بەڵام لەو سێ بەیتانە بەولاوە هیچمان لا نیە و لە کەسم نەبیستوە چی دیکەی لابێ[44].

لێرەدا هەڵوەستێک پێویستە. لە ژمارەیێکی گۆڤاری «هەولێر» گوتارێک بڵاو کرایەوە دوو بەیتی ئیزافەی سەر ئەم سێیانە کردوە و سەرجوملەی گەیاندوە بە پێنج. دوو بەیتەکە ئەمەن:

میری سۆران و بۆتان
لەناو چوون بە دەسیسە

---

[44] - لە هاوینی 1973دا دوای «کۆڕی شەقڵاوە» کە بۆ لێکۆڵینەوە لە گیروگرفتی کتێبەکانی قوتابخانەی کوردی بەسترا، سەردانێکی باڵەکەتیم کرد، لە گەڵاڵە چوومە دیدەنی جەنابی «مەلا وەیسی» کە لە نەوەی ئیبنوئادەمە و پێشتریش بە نامە و ڕاسپاردە لە یەکتر خەبەردار بووین، لەم سەردانەدا تەواوێک لە بارەی ئیبنوئادەمەوە دواین. سەیر لەوەدا بوو نە مەلاوەیسی و نە هاوڕێکانی کە خەڵقی باڵەکەتین و هەندێکیان خزمی مەلاوەیسی بوون یەکێکان ئەم سێ بەیتەیان نەبیستبوو. من لێرەدا هیچ گومانێکم بۆ پەیدا نابێ لە نیسبەتی بەیتەکان بۆ مەلای ئیبنوئادەم چونکی لەو جۆرە هەڵکەوت و ڕێکەوتانە شتی زۆرم بیستوە، تەنانەت وا بوە گوتەیێکی باوکم لە زاری خەڵقەوە بە خۆم گەیشتۆتەوە.

کوردستانمان چی لێ هات
کوردان بۆ ماتن تاکەی

ڕاستییەکەی، کە ناچارم دەبێ بیڵێم بێ ئەوە ناوی کەس بێنم، ئەم دوو بەیتە پەیوەندی نە بە مەلا ئیبنوئادەم نە بە کەسێکی دیکەی سەردەمی ئەوەوە هەیە، ئەگەر ئیبنوئادەم دانەری سێیەکەی تر نەبێ. هەر دوو بەیت هەڵبەستراون و خراونەتە سەر سێیەکەی ڕەسەن. نەختەک سرنج لە شێوەی ئەم دوو بەیتە و هەندێک بەراورد کردنیان لەگەڵ سێیەکەی تردا، دەستکاری و هەڵبەستنەکە بۆ هەموو چاوێکی شاعیرانە دەردەخا. نووسەری گوتارەکە چ گلەیی لێ ناکرێ لە نووسینیان چونکە هەمووی بیستوون و چ هۆیەکیشی لا نەبوە گومان بکا لە ڕەسەنیی هەندێکیان، تەنها ئەوەندە گلەیی لێ دەکرێ کە چاوی هەڵەنگووتوە لە جەمسەری پێکدا دروانی سێیەکەی سەرەتا لەگەڵ دوەکەی کۆتایی چونکە دەمودوویان هەند لە یەکدی دووڕە هەر دەڵێی جۆگەلە ئاوێکی ڕوون و یەکێکی لێڵن دەگەنەوە یەکدی و تا ماوەیێک تێکەڵی یەکتر نابن و لەوانەن ببرێنەوە بۆ سەرچاوەکەیان.

بەڵام لەتەک ئەو بۆرە گلەیەدا نووسەری گوتارەکە کە خۆی کۆییە، عوزرێکی دیکەی بەدەستەوەیە، لێشی دەسەلمێنرێ: ئەویش وەک زوربەی ڕۆشنبیر و خوێندەواری کۆیێ حەزی بەوە کردوە نیشتمانپەروەریی حاجی قادر لە تێکڕای ڕێبازی عومریدا درێژاییەکی زیادەی گرتبێتەوە لەو ماوەی ژیانی لای بەدرخانیەکان، ڕەگی کوردایەتیشی قووڵتر بووبێتەوە بۆ ناو دەروون و سروشتی لەوەندە قووڵاییەی کە خەباتی ساڵەکانی عومری لە ئەستەمبۆڵ ڕای دەگەیەنن، چونکە گومان نیە تا لە زووترەوە کوردایەتی کردبێ خەباتەکەی پتر دەبێتە شیرمژی کۆیێ. باوەڕ دەکەم گەلێک کۆیی پێی خۆش بێ حاجی قادر هەر لە منداڵیەوە کوردایەتی کردبێ و پەک لەسەر هێندێ نەکەوێ داخوا مەلای ئیبنوئادەم چی گوتوە و چۆن پیاوێک بوە و گوتەکانی چ تاوێکی هێناوە بۆ سەر گیان و بیر و باوەڕی حاجی قادر. مەیلی وەها دڵسۆزانەی مرۆڤ بۆ هەبوونی هۆی شانازی لە مەفتەنەکەیدا تا بڵێی پەسند و پیرۆزە، بەڵام لە عاست حەقیقەتدا نابێ ورتەی لێوە بێ.

کەواتە ئەو دوو بەیتەی کۆتایی پێنج بەیتەکان ڕەسەن نین و هەڵبەستراون و بە دوا سێیەکەی ڕەسەندا قەتار کراون. پێویست نابینم بەدوا چۆنەتی هەڵبەستنیان بکەوم، هەر ئەوەندە دەڵێم باخوێنەر دڵنیابێ لەوەدا کە مەبەس لە هەڵبەستنەکە خزمەتێک بوە بۆ پایە و شۆرەتی حاجی قادر و بۆ پتەوکردنی بنجی کوردایەتیەکەی، کە ئیسپات بێ لە ئیبنوئادەمەوەیە.

جگە لەوەی تا ئێستە گوتم، بەڵگەی زیهنی و مەنتیقیش هەن بۆ سوور کردنەوەی ئەوە کە مەلای ئیبنوئادەم لە ڕێی دیندارییەوە دەستی بۆ کار و باری دونیا درێژ کردوە: ئەگەر کوردایەتییێکی ڕاستەوخۆ و سەربە فەلسەفە و بیر و باوەڕێکی نیشتمانپەروەرانەی بێتەئویلی کردبا دەبوا کۆمەڵێک لە شیعری سیاسی هەبێ نەک تەنها ئەو دوو بەیتە (کە زانیمان ڕێک خراون و هی ئەو نین). هەڵبەستیشی لە دوا بەجێ نەمابا دەبوا، وەک چالاکیەکانی ئایینی، چالاکی کوردایەتی و سیاسیشی لێ نەقڵ کرابا و دەماودەم بە ئێمە گەیشتبا هەر وەک گوتە و کردەوەی دیندارانەی پێمان گەیشتوە، یاخود هەر نەبا لە نووسینی پەخشانی چەند ڕووپەڕەییێکمان بە دەستەوە با.

کوردی دەڵێ بە گوڵێک نیسان نایێ. گریمان ئەو دووبەیتە دەسکردە بە گوڵێکیش حیساب کەین بۆ لەحزەییێک، هەر دەبنەوە بە گوڵی نایلۆن و بە دەستمانەوە وشک دەبێ چونکە نیسانی ڕاستەقینەی بەهار بە ئەنواعی گوڵ و لالە و نەرگز خۆ دەنەخشێنێ، کە ئەو نەخش و ئارایشتە نەبوو دەبێ ئەو تاکە گوڵەش دەسکرد بێ نەک زادەی بەهار و سروشت.

لەمەش زیاتر دەتوانین لە مەوزووع هەڵکرێنین بە سرنجدان و لێکدانەوە: عەجەب نەدیتراوە و نەبیسراوە پێش حاجی قادر یا لەگەڵ ئەودا چ کەسێک لە دەوروبەری مەڵبەندی ئیبنوئادەم لەو فیکرە میللییە سوودی وەرگرتبێ و دوو پیتی بە سەر زماندا هاتبێ لە کوردایەتیدا چ بە هەڵبەست بێ چ گوتە چ پەخشان؟ بۆ دەبێ کوردایەتیی ئیبنوئادەم ساڵەهای ساڵ بن بووبێ و کەس ئاوازێکی نەگوتبێتەوە و تەلێکی نەلەراندبێتەوە تاکوو حاجی قادر بە ڕێکەوت دەچێتە باڵەکەتی و لە دەمی ئەم و ئەوەوە دوو سێ بەیتی مسڵمانانە و دڵپاکانە، با بڵێین کوردپەروەرانە، دەبیێ و دەبنە هەوێنی ڕۆحی نیشتمانپەروەری؟ بۆ یەکەم جار، لە وێژە و شیعری تازەی کوردیدا و بناغەی بیری سیاسی و هەستی بەخۆ نازینی میللی لەو ڕێیەوە لە ناو

کوردان دەچەسپێ؟ لەبەر چاوی من ڕێکەوتی وەها لە کاری سیحر دەچێ وەک لە حیکایەتان دەڵێن فلانە تەڵەسم بە ناوی فلانە پاڵەوانەوە بەسترابوو تا بە خۆی و ئیسمی ئەعزەم و ڕەخش و شیریەوە نەهات دەرگای نەکرایەوە و نهێنییەکانی ئاشکرا نەبوون. زەحمەتە ڕووداوی وەها لە جەرگەی واقیعەوە هەڵقوڵێ.

کە ئەمە دەڵێم دەزانم پێشتر تاقە سوارەی وەک ئەحمەدی خانی هات و چەند سەد ساڵێک بەدوا ئەودا کەس نەهات. هەر حاجی قادر خۆی ژیا و مرد و دەیان ساڵ بەسەر مردنیدا تێپەڕی بەر لەوە شاگردێکی ئەو پەیدا بێ. کەواتە لە زاهیردا ڕێی تێدەچێ مەلای ئیبنوئادەمیش تاقە سوارێک بووبێ وەک ئەحمەدی خانی، لە دەوروبەری خۆیدا کەس نەبوە هێندە ژیر و هەڵکەوتوو بووبێ توانێبیتی خۆی بە تیشکی بیر و باوەڕی ئەو ڕووناک کاتەوە. بەو پێیە هاتنی حاجی قادریش بۆ مەڵبەندەکەی ئیبنوئادەم دەبێتە ڕێکەوتێکی خۆش کە نەیهێشت دەنگی ئیبنوئادەم بێ سەدا بڕوا و ون بێ. بەڵێ دەشێ شتی وەها بگوترێ، وا من شتەکەم گوت ئەگەر کەسی دیکەش نەیلێ و نەیگوتبێ. بەڵام لە چەند سەرێکەوە قیاسی حاڵەتی ئیبنوئادەم لە هی ئەحمەدی خانی و حاجی قادر دوور دەکەوێتەوە نەک نزیک دەبێتەوە.

ئەحمەدی خانی و حاجی قادر هەر دووکیان بەڵگەی کوردایەتی و بیری میللییان لەگەڵ خۆیانەوە و پێویستیان نیە بە «استدلال» و سرنج گرتن و بەدوادا گەڕان. نەهاتنی کەسی وەک خۆیان بە دوایاندا، تا ماوەیێکی زۆر درێژ یا کەم درێژ، نابێتە بەڵگەی خەریک نەبوونی ئەوان بە کوردایەتییەوە، چونکە خەریکبوونیان لە ژووروویی بەڵگانەوەیە و ڕاستێکی بێگومانە. نەهاتنی کەسی ئەوتۆیی بە دوایاندا دەبێتە بەڵگەی زێدە گەورەیی و پێشکەوتوویی ئەوان لە چاو کات و خەلقی سەردەمی خۆیان و دوای خۆیانیشەوە. با واز لە دەلالەتی حاڵی خانی بێنین و بە حاجی قادرەوە بلکێین[45].

---

[45] - لێرەدا جێی بەراوردی کردن لە میانی خانی و حاجیدا نابێتەوە لە ڕووی پایەی تێهەڵکشانیانەوە لە خەباتی سیاسی کوردایەتی. زۆر بە کورتی و سادەیی ئەوەندە ڕاستییە لێرەدا دەردەبڕم کە دەڵێم خانی وەک «مفکر» بۆ بیری کوردایەتی چوە، زەرفی مێژووییش یارمەتی نەداوە بیر و باوەڕەکانی بکاتە بانگهێشتنێک بۆ

حاجی بۆ خۆی دەبێتە مانیع لەوەدا بکرێتە جێگەی «قیاس» بۆ بەهێزکردنی احتمالی ئەوە کە مەلای ئیبنوئادەم وەک تاقەسوار لە سەردەمی خۆیدا کوردایەتی کردبێ، چونکە حاجی قادر لە باڵەکەتیەوە نەکەوتە سەر خەیاڵی کوردایەتی تا ببێتە بەڵگەی کوردایەتی بۆ ئیبنوئادەم، وەک لێرە بەدواوە لێی دەدوێم حاجی لە دەرەوەی کوردستان کەوتە سەر فکر و بیر و باوەڕی سیاسی خەست.

بەڵێ بێگومان، لەو باوەڕە دام، ئەوەی پێی بگوترێ باوەڕی خاوێن و ڕەوشتی پاک و کردەوەی چاک و بەرهەڵستی کردنی بێدینی و ستەم، ڕاستەوخۆ لە خەبەراتی ئیبنوئادەمەوە هەڵدەستن وەک تیشک لە چرا هەڵدەستێ، ئەمانەش سامانێکی ئەدەبی و ڕوحی کەم نین، نەخێر یەکجار زلن و لەوانەن ببنە پاڵپشتی مەیل و لایەنگیری بۆ چاکە لە دڵ و دەروونی مرۆڤێکی وەک حاجی قادردا و تیژتر و ئازاتری کەن لە عاست تەڵەکەبازی و شەعبەدەدا. دەتوانین بڵێین ئیبنوئادەم بە ڕەوشت و کردەوەی خۆی زەویی هەموار کردوە بۆ لێ ڕوانی تۆی ڕاستی و چاکە لە سەردەمی خۆی و دواڕۆژدا، بەڵام ناتوانین لەوەندەڕا بڵێین پەیامی کوردایەتی بە خەلق ڕاگەیاندوە. هەر نەبێ نەبیستراوە ڕای گەیاندبێ.

وام تێمەگە بڵێم مەلای ئیبنوئادەم لەسەر خەتێکی باریکی سنووری میانی حەقپەرستی و کوردایەتی ڕاوەستاوە و ئەم ڕاوەستانەی بە بەریەوە نەبوە شوێن پێیەکی یا سێبەرێکی خستبێتە ناو جغزی کوردایەتییەوە، ئەوەی ڕاستی بێ تۆژینەوەم گەیاندوومی بە دۆزینەوەی شوێن پێی ئیبنوئادەم لەسەر چەقی ڕێبازی کوردایەتیدا بەڵام شوێن پێیەکە بەرهەم و ئەنجامی پەیرەوی کردنی فەلسەفەیێکی سیاسی سەربە کوردایەتیەوە نەبوە بەڵکوو لە شەقامێکی ترەوە هەنگاوی هەڵێناوە و بە ئاسایی لە سنووری حەقپەرستی ڕووتەوە و بێ مەبەستێکی ماددی دونیایی و فەلسەفی، چۆتە ناو کوردایەتییەوە: مەلای ئیبنوئادەم بەهۆی دڵی هوشیار و فکری حەقپەرستیەوە گەیشتۆتە ئەم ڕاستیە کە وا لە دەربڕینی کوردبوون و نووسینی

---

دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی. حاجی کە خۆی بە قوتابییێکی خانی ژماردوە لەبەر زۆر هۆی تایبەتی کە لە سەردەمی خانیدا پەیدا نەبووبوو لە پلەی پەند و ئامۆژگارییەوە تێپەڕی بۆ قۆناغی هاندان و داواکردنی خەباتی چەکدار لە میللەتی کورد بۆ وەدەست هێنانی مافەکانی خوراوی.

کوردی و هێنانی ناوی کوردستان هیچی ناجایەز پەیدا نابێ و چ «بدعة» ڕوو نادا. لەم مەیدانەدا گاڵتەشی بەو کەسانە کردوە، نەخێر تاوانباری کردوون، کە بەلایانەوە نووسینی کوردی کارێکی ناڕەوایە. دوای کەمێکی تر ئەمەت بۆ ڕوون دەکەمەوە.

ئەم هەنگاوە زلەی مەلای ئیبنوئادەم بەرەو ڕاگرتنی کورد لە ڕیزی میللەتانی تردا تاکە هۆی بلیمەتی و حەقپەرستی خۆی پێی هەڵێناوە، لە هیچ فێرگەیێکی سیاسی سەردەمی خۆی و پێش خۆیەوە فێری هەڵێنانی نەبوە. وەنیە منیش بە لێکدانەوە و سرنج گرتن لە هێمای کردار و گوفتاری ئیبنوئادەم گەیشتمە قەناعەت بە بوونی ئەو هەنگاوە لە ڕەوتی ئەودا. خۆی بە نووسین و سەراحەتی پاتەوپات ڕاستییەکەمان دەخاتە بەردەست و چاوان. لەم مەیدانەدا بە دوادا گەڕان گەیاندمی بە دەسکەوتێکی زل لە کەلەپۆری ئیبنوئادەم کە تا ئێستا وەک گەوهەری شرایەوە وابوە دەنگ و ناوێکی نەداوەتەوە. ئێرەکانە هەموارترین و لەبارترین جێگەیە بۆ کردنەوەی ئەم ڕووپەڕە پیرۆزە لە دەفتەری ژیان و بلیمەتیی ئیبنوئادەم.

بۆ یەکلا کردنی پلەی تاو و تەئسیری ئیبنوئادەم لە ویژدانی حاجی قادردا، لە زیمنی پەلەفڕە و تەقەللای وەدەستهێنانی مەعلووماتی پێویست، خواهشتی فریا کەوتنم لە مامۆستا مەلا وەیسی کوڕی مەلا عەبدوڵا کرد کە خۆی لە نەوەی ئیبنوئادەمە. لە سەرەتاوە بە نامە، دوایی بە ناردنی کتێبێک لە دانان و نووسینەوەی ئیبنوئادەم فریام کەوت و بەمەدا یەکجار منەتباری کردم و خزمەتێکی زلیشی پێشکەش بە مێژووی گشتی و هی تایبەتی کورد کرد.

کتێبەکە لە ژێر ناوی «مشكاة المنقول»دا چەند مەبحەسێکی لە زانستەکانی ئیسلام تێدایە کە ئیبنوئادەم خۆی دایناون، لە کۆتایی کتێبەکەدا، وەک دوا ئاڵقەی زنجیرەی باسەکان، نامیلکەیێکی عەرەبی بە سەرەتاییێکی فارسییەوە شەرح و سەرگوزەشتی ئیشکالێک دەگێڕێتەوە کە بە «عويصة» ناوی دەبا و لە بنەڕەتدا «إبن كمال» دایناوە و بە جۆرێکی یەکجار زەحمەت و سەخت ئایەتی «لاتشحون»ی پێ شی کردۆتەوە. لە کەنارێکی نووسینەکە ئیبنوئادەم دەفەرموێ هەوەڵ جار لە شەوی هەشتی شەوالی 1205ی کۆچی لە بەر شەوقی مانگ گرێی ئیشکالەکەی ڕەواندۆتەوە و لە ڕۆژی «عرفه» کە دەکا 9ی شەوالی 1205 پاکنووسی کردوە بەڵام دوای دوو ساڵ سەرلەنوێ نووسیوەتیەوە و خستۆیتە سەر زنجیرەی نووسینەکانی «مشكاة المنقول». لە پێشەکیەکەی فارسیدا دەڵێ لە «قریە

اولز – واته وەڵزێ – از قرای کردستان» بوە کە «عویصة» کەی بۆ هاتوە. بەدوا ئەوەدا ناوی «عەبدولڕەحمان پاشای بابان» دێنێ و شاری سلێمانیش بە «مقر سلطنه کردستان» دادەنێت. دەبینی لە پێشەکیە فارسیەکەدا دوو جاران ناوی کوردستان دەبا.

ئیبنوئادەم لە پەراوێزی شەرحەکەی عەرەبی ڕستەیێک دەنووسێ من لێرەدا وەک خۆی بێ زیاد و کەم دەیهێنمە بەرچاوی خوێنەر تاکوو بێ تەرجومان و بە جۆرێکی ڕاستەوخۆ گەرمایی و سۆزی نووسینەکە بێنە بەر هەست و زانینەوە:

*«ومن العجب انی سمعت انه شنع علي بان الديباجة كردية فصدق عليهم المثل الكردي السائر هم كبيضة خرجوا من قشرها...».*

لە پەراوێزەکە هەر هێندەمان مەبەستە لێرەدا کە پەیوەندی بە گیانی کوردایەتی ئیبنوئادەمەوە هەیە، واتاکەشی بە کوردی ئەمەیە:

*«سەیر لەوەدایە کە لێیان بە عەیب گرتووم پێشەکیەکەم کوردییە، بەوەدا ئەو گوتەیەی کوردییان لێ بەڕاست گەڕا کە دەڵێ وەک هێلکە لە قەپێلکی خۆیان دەرچوون...».*

سەیری چەند زیرەکانە و زانایانە و دڵسۆزانە لە زەمینەی دیفاع کردن لە نووسین بە زمانی کوردی، هەر پەندی کوردی، ئەو کەسانە ڕیسوا دەکا کە کوردن و شەرمیان دێتەوە لە زمانەکەیان.

ئەم نووسینەی ئیبنوئادەم کە لە 1205 دا نووسراوە شەش ساڵان دەچێتە پێش وەقفنامەکەی «عەبدولڕەحمان پاشای بابان» کە وا بەسەر کتێبەکەی «صحيح البخاري»[46]یەوە نووسراوە و ناو و سنووری کوردستانی قەلەمڕەوی بابانی تێدا تۆمار کراوە.

لزوم نابینم من خۆ هەڵقوتێنم لە هێما و ڕاگەیاندنی ئەم نووسینانە چ لە پێشەکیەکە و چ لە پەراوێزەکەدا، هەر ئەوەندە دەڵێم بە دەست خۆم نیە تا تێوەیان ڕادەمێنم

[46] – بە زەنگۆغارف لە بەشی یەکەمی ئەم نووسینەدا بڵاو کرایەوە.

ئیبنوئادەمم بەلاوە زلتر دەبێ و خۆمانم بچووکتر دێتە بەرچاو کە هێندە نانکوێرین لەگەڵ مرۆڤی وا بێ هاوتاماندا. گیانی کوردایەتی و شۆڕشی کورد قەرزە بەسەر شانیانەوە پەیکەرێکی سامناک بۆ ئیبنوئادەم بەرپا بکەن لە شوێنێکی ئەوتۆ کوردستان یاخود هی باڵەکەتی کە وا پڕ بێ لە دەلالەت... با بڵێین لەسەر چەقی ئەو شەقامەی کە دەنۆڕێتە خانوەکەی «قصرالسلام».

بگەڕێینەوە بۆ پێشەکی و پەراوێزەکە.

زانیمان پێشەکیەکە بە فارسی نووسراوە، کەچی لە پەراوێزەکە وا دەردەکەوێ عەیبگرەکان کوردیبوونی پێشەکیەکەیان بە عەیب داناوە. تۆ بڵێی هۆی نەمانی ئەم پێشەکیە کوردییە چی بووبێ؟ بەلای هەندێک لەو کەسانەی کتێب و پێشەکی و پەراوێزەکەیان دیوە هەر پێشەکی فارسیەکەیە وەک کوردی هاتوە بەر گوێی خەلق یاخود بە کوردی ناوی ڕۆییوە. من ئەم ئیحتیماله زۆر بێهێز دادەنێم چونکی سەرەڕای ئەوە کوردی بە فارسی لە قەڵەم نادرێ، هەر فارسیەکە خۆی لەوانە نیە لە سەرەتاوە پێشەکی نووسینەکە بووبێ چونکە باسی دەنگدانەوەی نووسینەکە و دەمەتەقەی کە لەسەری هەڵستاوە دەکا. هەڵبەت دیارە فارسیەکە بە درەنگەوە نووسراوە، دەنا نەدەشیا شتی دواکات بە نیسبەت نووسینەکەوە باس بکا. وا دەزانم لەبەر هەر هۆیەک بێ، ئیبنوئادەم کە دوای دوو ساڵ پاکنووسی کردوە پێشەکیە کوردییەکەی هەڵبواردوە و سەرلەنوێ بە فارسی پێشەکیێکی تازەی نووسیوە کە سەرگوزەشتی «عویصە» کە و ئەو ماجەرایەش دەگێڕێتەوە کە دوای شی کردنەوەی لە لایەن خۆیەوە لە نێوان مەلایان ڕووی داوە و هەندێکیان بە ناوی خۆیانەوە بڵاویان کردۆتەوە و خەڵات و بەراتیشیان پێ وەرگرتوە.

دەزانم ئەم قسەیەم بە نیسبەت پرسیارەکەوە زۆر سافیلکەیە و یەکلا کردن و ساغ کردنەوەی گرێی ئیشکالی نەمانی پێشەکی کوردی و گۆڕانی بۆ فارسی پتر لێکۆڵینەوە و زیهنیکاری دەوێ، بەڵام ئەوەی ڕاستی بێ بۆ زەرفی ئێستاکەی من و باری نووسینەکەم نە دەست دەدا و نە ئیمکانیش هەیە بایی پێویست خۆمی پێوە خەریک بکەم و لێی بتۆژمەوە، هەر نەبێ لەبەر ئەوە کە بارستێکی زۆر لە نووسینەکەم دادەگرێ، گریمان بۆم لوا پێوەی خەریک بم و یەکلاشی بکەم. لەبەر ئەمە ئیشکالەکە دەهێڵمەوە بۆ دواڕۆژ و هەلێکی لەبارتر. جارێ بەوەندە لێ دوانە و خستنە بەرچاوە وازی لێ دێنم.

دەبینی شوێن پێی ئیبنوئادەم لەسەر شەقام و ناو جغزی کوردایەتیدا هەموو چاوێک دەیخوێنێتەوە بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا دەبێ بسەلمێنین ئیبنوئادەم لە مەڵبەندی حەقپەرستی و مسڵمانەتی و دڵ هوشیاری خۆیەوە گوزەری کەوتۆتە هەرێمی کوردایەتی و لەم گوزەرەدا چ هاندەرێکی سیاسی پاڵی پێوە نەناوە و بە دەروونیشیدا خەیاڵی هەڵگێڕانەوەی کوردان لە دژی «خەلیفە» تێ نەپەڕیوە، بەڵگەش ئەمە هەر لە نووسینەکەی خۆی دێتە بەردەست چونکە ناوی «سلطانی عثمانی» - کە ئەوسا «سلطان سلیم» بوە - بە حورمەتەوە دەبا.

بۆ پشووێکی کورت با واز لە ڕاگەیاندنی سیاسی و مێژوویی ئەو نووسینانەی ئیبنوئادەم بێنم و دوو پەیامی سۆزناکی مرۆڤایەتییان لێ بگێڕمەوە: سۆزی پەیامێکیان بە نیسبەت خۆمەوە ئەوەی تریان بە نیسبەت هەموو کەسێکەوە کە پایەی بەرزی ئیبنوئادەم بناسێ.

لە دوا پەڕی نامێلکەی کۆتایی زنجیرەی «مشکاة المنقول» ڕێکەوت و هەڵکەوتێکی هەست بزێوم کەوتە بەرچاو. ئەم پەڕە کاغەزەی کۆتایی کتێبەکە بە ئەسڵ نامەیێک بوە لە مەلا عەبدولڕەحمانی کاکی جەلیەوە، کە کوڕی مەلا عەبدوڵای کاکی جەلی باپیرە گەورەی جەلیزادانە، بۆ مەلای ئیبنوئادەم هاتوە. خەت و ئیمزای نامەکە دەستنووسی مەلا عەبدولڕەحمانن و بەلای ئێمەوە زۆر ئاشنان، هەڵبەت ناوەڕۆکی نامەکەش کە بە فارسی نووسراوە هەر زادەی دەروونی ئەوە.

لەم نامەیەدا کاکی جەلی لە عادەت بەدەر پایە لە ئیبنوئادەم دەنێ و هەڵی دەداتەوە. دیارە ئەم هەموو پایە لێ نانە و هەڵدانەوەیە هی «مجامله»ی سادە نین و چەندێکی لێیان کەم کەیەوە بۆ تێبردنی لانی مجامله دیسانەوە بایی ئەوەیان لێ دەمێنێتەوە کە نامەکە بۆ مەلاییێکی زێدە زل و باوەڕ پێ هاتوو و لێسەلمێنراو نووسرابێ، بەتایبەتی ئەگەر ئەوەی تێ بخوێنینەوە کە مەلا عەبدولڕەحمانی کاکی جەلی خۆی یەکێک بوە لە مەلا هەرە گەورەکانی ئەو سەردەمە و لە تەمەنیشدا هەڵکشێوتر بوە لە ئیبنوئادەم.

بۆ من ئەم پەیوەندییەی میانی جەلیزادە و ئیبنوئادەم یەکێک بوو لە مژدە هەرە خۆشەکانی ئەو سەردەمە لەبیرکراوە کە لە ڕێی زۆر پیرۆزی کتێبێکی مەلای ئیبنو ئادەم پێم گەیشت.

پەیامی دووەمی کاغەزەکە کە سۆزێک دەداتەوە بۆ هەموان، نەک هەر بۆ خۆم، ئەوەیە کە ئیبنوئادەم پشتی کاغەزەکە و بەتاڵایی میانی دێڕەکانی نامەی جەلیزادەی بە نووسینی ئاخەلێوەی کتێبەکەی خۆی پڕ کردۆتەوە، واتە هێندە کاغەزی نەبوە بۆ تێدا نووسین کە ئەو تاکە پەڕە نامەی دۆستێکی خۆی لە بیر بباتەوە، دەر لەحزە وەک هەلێکی هەڵکەوتوو کاردروستیی خۆی پێ کردوە، لە هەمان کاتدا نووسینەکەی مەلا عەبدولڕەحمانیشی پاراستوە. لەمەڕا، جارێکی دیکەش کەم دەستیی ئیبنوئادەم خۆ دەنوێنێ، پێشتر بەوەدا خۆی نواند کە شەرحی «عویصە» کەی لەبەر شەوقی مانگ نووسیوەتەوە، دیارە چرا و مۆمی نەبوە، یاخود بە گران بەهای زانیوە، کە شتی لەبەر بنووسێتەوە. تۆ بزانە زاڵبوونی خۆشەویستی زانست بەسەر مرۆڤدا چەندی خەریک دەکا و بە کوێیدا دێنێ و دەبا.

من لە سرنج گرتنی خومدا لە عاست ئەم گیانە پاتەوپاتەی کوردایەتیی مەلای ئیبنوئادەم، سەرلەنوێ و بە جۆرێکی ڕوونتر لە جاران بۆم ئاشکرا دەبێ کە وا کوردایەتیی ئیبنوئادەم لە حەقپەرستنێکی ڕووت و بێفێڵەوە دێت و چ باکی لەسەر ڕابەری سیاسی نەکەوتوە فێری بکات، بۆ هیچ مەبەسێکی سیاسیش ئەم قسانەی نەکردوون: پیاوێکی خواپەرستی حەقناسی نەترساوە و چی بەڕاست دەزانێ ئەمە دەڵێ و دەکا بەبێ نیازێکی نهێنی سەربە بەرژەوەندی دنیاوە. کە ئەمە دەڵێم بەلای خۆمەوە لە نرخی ڕاستەقینەی بیر و باوەڕەکانی ئیبنوئادەم زیاد دەکەم، بەڵام نەک زیادکردنی بە واتای خستنە سەر و بۆ خواستنەوە بەڵکوو ئەو زیادکردنە کە بە دەرخستنی نرخەکە نەبێ نایێتە بەر چاوانەوە. ئەگەر مەلای ئیبنوئادەم وەک خەلقی تر لە ڕابەر و مامۆستایان فێری گوتنەوەی ڕاستی و مافی میللەتەکەی بووبا دەبوو قوتابییێکی باش نەک پێشەوایێکی هەڵکەوتوو لەو مەیدانەدا.

لەم تێبینیەی دوایی ڕا بۆ تێبینیێکی گرنگی تر دەڕۆم، ئەویش لەلای خۆیەوە نەختێک ڕۆشنایی داوێژێ بۆ سەر بابەتی لێکۆڵینەوەمان لەبەر چاوی خوێنەر بەتایبەتی ئەو خوێنەرانەی دەیانەوێ مامۆستایێک بدۆزنەوە لە کوردستانی عێراقدا بیری حاجی قادری بۆ کوردایەتی بردبێ:

ئێمە کە بمانەوێ وا ڕابنوێنین، وەیاخود بسەپێنین، حاجی قادر لە کوردستانەوە دەستی بە کوردایەتی کردبێ بۆ ئەو ئیسپاتەش پێویستنمان هەبێ بە مامۆستایێک مێشکی زاخاو دابێ بە بیری کوردایەتی، ئەوسا گرفتێکی گەورەمان دێتە بەر کە بە

گەزوگرێی ئەم بۆچوونە چ ڕەواندنەوەییێکی بۆ پەیدا نابێ، چونکە کە دڵنیا نەبین بەوە سەردەمی حاجی قادر کە سەردەمێکی نوێتر و پێشکەوتووتر بوە لە سەردەمی مامۆستاکەی و ئەم سەردەمە پێشکەوتووترە ببێتە مامۆستای حاجی، ئیتر لە کوێ و چۆن مامۆستاییێکی تر پەیدا کەین بۆ مامۆستاکەی حاجی؟ خۆ ناشکرێ و ناسەلمێنرێ بڵێین مامۆستاکەی حاجی حەوجێ بە مامۆستایان نەبوە چونکە ئەم تەرزە گوتەیە بێ بەڵگە لە کەس وەرناگیرێ، کە وەریشگیرا دەبێ لە هەموو کەسێک و بۆ هەموو کەس و لە عاست هەموو داواییێکی وەک ئەم داوایە پەسند بکرێ. ئەوساش شیرازەی سەر لە بەری لێکۆڵینەوە و تۆژینەوان هەڵدەوەشێ و ئارەزۆی تێکرِای گوتوان و نووسەران و خاوەن داوایان دەبێتە بەڵگە. کە حاجی قادر پێویستی بە مامۆستا هەبووبێ دەبێ مامۆستاکەشی ئەو پێویستەی هەبووبێ. کە یەکێک بێ و بڵێ نەخێر مامۆستای حاجی ئەو بلیمەتە بوە لە خۆوە شتی زانیوە ئەوسا ئەو کەسە دەبێ چەند پرسیاران یەکلا بکات و ئەم خاڵانەی خوارەوە بە بەڵگەی پتەو بسەپێنێ:

خاڵی یەکەم: حاجی لە کوردستانی عێراقەوە دەستی کردوە بە کوردایەتی، چونکە ئەگەر ئەمە نەسەپێنێ پێویست نامێنێ بە دۆزینەوەی مامۆستا بۆ حاجی لەو ڕووەوە کە حاجی لە دواییدا، ژیانی ئەستەمبۆڵی بۆ دەبێتە مامۆستا.

خاڵی دوەم: ئەم کوردایەتییەی لەو مامۆستایە وەرگرتوە کە نیازە بکرێ بە مامۆستای حاجی، نەک لە یەکێکی تر.

خاڵی سێیەم: مامۆستاکەی حاجی هێندە زانا و بلیمەت بوە بە بیری تیژی خۆی ڕاستی سیاسی و مافی میللەتی دۆزیوەتەوە لە سەردەمێکدا کە هێشتا ئەو تەرزە بیرکردنەوەیە لەو مەڵبەندەدا لە سگی مێژووی کورددا نەڕسکابوو. سەپاندنی ئەو جۆرە بلیمەتییەش بە کەیفە نابێ، دەبێ هەبوونی شتی وەها لە لێدانەوەی زوربەی زانراو و نەزانراوی گوتە و کردەی ئەو کەسە بەدەرخرێ.

بەنیسبەت منەوە کە دەڵێم مەلای ئیبنوئادەم لە ڕێی گیانی حەقپەرستی و ئازایی و زانایی خۆیەوە کوردبوون و بە کوردی نووسینی ڕەوا دیوە، هیچ ناچار نابم ئەو بەڵگانە بێنمەوە کە هەبوونی بیری سیاسی داخوازییان دەکات چونکە سەلماندنی ڕاستی و ملدانە حەق شتی ئەوتۆیین لە مەلایەتی ڕاستەقینە چاوەنوارِ دەکرێن. من

نەمگوت ئیبنوئادەم کوردایەتی سەربەخۆی کردوە کە لە ڕێی ناسینەوە مافی نەتەوایەتی کورد و هەست کردن بە نەبوونی کیانی کوردییەوە بۆی پێک هاتبێ تاکوو ناچاربم ئەم هۆی ناسین و هەست پێ کردنە لەودا بدۆزمەوە لە کاتێکدا ناسین و هەستی وەها لای کەسی تر نەبوە.

ئەو هێندە ئاکار و ئاساری زانایی و ئازایی و حەقپەرستییەی کە من لە ئیبنوئادەمدا ڕەچاوم کرد و بە بەڵگەش سەپاندم بایی ئەوەندە گوتە و کردە و بیر و باوەڕانە دەکەن کە ڕاستەوخۆ لە گیانی حەقپەرستی و زانایی و ئازایی ڕووتەوە هەنگاوی پێ هەڵێنابێ بۆ ناو ڕاستە شەقامی گرۆگاڵی کوردایەتی و بەڕەوا زانینی کوردبوون و بە کوردی نووسین، کە ئەمانە جارێ قۆناغێکی مێژوویی بەرفرەوان لە پێش بزووتنەوەی سیاسی و قەومییەوە دێن و ڕەنگە لە هەموو قۆناغێکی مێژوودا لای تاکە مرۆڤی ئازا و هوشیار و زانا بدیترێن.

یەکێک بیەوێ پەیدابوونی ئەو تەرزە حەقپەرستییە و مێشک ڕوونییە بکا بە شتێکی ئاسان و ئاسایی دەتوانێ چەندین ئایەت و حەدیس و مەبدەئی ئایینی بکا بە ئێستگە و لەسەری هەڵچەقێ وەک «کلکم لآدم و آدم من تراب - لافضل لعربي على عجمي الا بالتقوى - ان اکرمکم عندالله أتقاکم... هتد» بەڵام نووسراوی ناو قورئان و کتێب شتێکە و هەڵوەستی ڕاستەقینە شتێکی تەواو جودایە. ئەم ئایەت و حەدیسانە هەر هەبوون کە مەزهەبێکی گەورەی ئیسلام ژنی عەرەبی هەڵاوێرد لەودا کە پیاوی غەیری عەرەب ببێ بە هاوکوفی «کفوء». «ان اکرمکم عندالله أتقاکم» دەچوە چاوانەوە لە حاڵێکدا خەلافەت کرا بە مافی تایبەتی قورەیش، هەندێکیش ویستیان بیکەن بە مافی بێهاوبەشی نەوەی عەلی و فاتیمە. خۆت دەزانی توهمەی «الشعوبية» چەند کەسی هونەروەر و زانای ڕیسوا کرد و چەند ڕێگەی بیر کردنەوەی پیرۆزی کوێر کردەوە.

دەبینی من نامەوێ هەڵوەستی ڕۆشنبیرانە و حەقپەرستانەی ئیبنوئادەم لەبەر تیشکی ئەم مەبدەئە نەزەرییانەی ناو کتێبان کز کەمەوە و پێی بڵێم ئەمە هەڵوێستێکە بە ئاسایی و ڕاستەوخۆ لە نووسین و باوەڕەکانی ئیسلامەوە دێنە دی و بەوەشدا دەمەتەقە داشکێنم بەلای بەرژەوەندی خۆمەوە کە بمەوێ لە بایەخی ڕاگەیاندنەکانی ئیبنوئادەم کەم کەمەوە بە نیسبەت کرانەوەی هۆشی حاجی قادر بۆ بیری نیشتمانپەروەری، چونکە من لە بەیەکدی گرتنی هەڵوەستی ئیبنوئادەم لەگەڵ

تێکڕای هەڵوەستی پیاوانی ئایینی و تایبەتی پیاوانی ڕۆژگاری خۆی لایەنی واقیع دەکەم بە حەکەم، نە خۆم و نە خوێنەر و نە ڕاستیش نا هاوێمە هەڵەی حوکمی نەزەرییەوە و مەبدەئی ڕووتەوە و واقیعیش ئەوە بوو کە لە پێشەوە بەرەنگاری بووم و مافی تەواوی ئازایی و زانایی و حەقپەرستی مەلای ئیبنوئادەمی لێ وەرگرتم، بە شانازییەوە بۆ خۆم.

وا دەزانم لەم دیارخستنانەشدا هەموو سوودمەندبوونێکی مومکین لە زەمینەی کرانەوەی هۆش و ئازابوون بە نیسبەت حاجی قادر و غەیری ئەوەوە خرایە تای تەرازووی ڕاستی بێ فێڵەوە، واتە یەک تۆسقاڵم لە بایەخ و نرخی پەیامەکانی ئیبنوئادەم دانەشکاندوە، هەر ئەوەندەشم لێ داوادەکرێ و چی تریش نە بەبەر مەوزوعەوەیە و نە بەبەر منەوە. هەروەک لێرە بەدواوەش بۆت ڕوون دەبێتەوە بە دەم ڕەوتی بەرەو ئاسۆی دیار و نادیاری ئەم لێکۆڵینەوە لە ڕادەی کار تێکردنی پەیامەکانی ئیبنوئادەم لە ویژدانی حاجی قادر، چی بەدەستمەوە بێ بە دەستەوەی دەدەم و هێندەی تۆسقاڵێکی لێ گل نادەمەوە، ئەوساش ئەگەر من بەسەر شتاندا تێپەڕیبم و فەرقم پێی نەکردبێ لە من بەدواوە کۆڕە کوردی زیرەک و چالاک بە سەهوو چوونەکانم بۆ ڕاست کاتەوە، خۆ پێی ناوێ من بیڵێم کاری وا نەفەس درێژی کۆتایی نادیار بە کەسێک و دوو کەس ئەنجام نادرێ، بە بەریەوە هەیە چین چین نووسەران بێن و لێی زیاد کەن و کەلەبەرەکانی پڕ کەنەوە.

ئاشنایی خودی خۆم لەگەڵ ئەم باسەدا شتێکی تازە نیە: بەر لەوە کەس لە سەری نووسیبێ وەیا من ئەم «مشكاة المنقول»ـەی ئیبنوئادەمم دیبێ لە جیلی جەلیزادانی پێش خۆمم بیستوە، بەتایبەتی لە مامم شێخ نورالدین، کەوا یەکێک لە
سەرچاوەکانی ئیلهام بۆ حاجی قادر و حاجی مەلا عەبدولا لە مەیدانی پژانی مێشک و ڕەوشەنی بینین و ئارابوون لە کۆمەڵدا بیر و باوەڕ و هەڵوەستەکانی ئیبنوئادەم بوە.

ڕەنگە ئەمە لەو ڕاستییانە بێ چ دەمەتەقە هەڵنەگرێ، بەڵام ئایا لەم ڕێبازەدا تا کوێ چوون و ئیبنوئادەم بە کام پایەی ئازایی و حەقپەرستی و ڕووناکی بینینی گەیاندوون؟ تۆ بڵێی فێری کوردایەتی بە واتای خەباتی سیاسی قەومی کردبن؟ تێکۆشان و تەقەڵلای من لەم پێچەبەدەورەی هەڵسووڕ و داسووڕم، وەک ڕاوچی ناشارەزا، بۆ وەدەست هێنانی«یقین»ـە لە ناو ئەو هەموو تاریکستانەی دەروی مەبەستدا: دەڵێم بەڵکوو، کوردی گوتەنی، خوا و ڕاستان بگەمە ئەنجامێک بایی ئەوە

ڕووناک بێ کە لە گرنگی باسەکە و نرخی خەباتی حاجی قادر بوەشێتەوە. یەکلا کردنی پرسیاری سەرەتای دەست پێ کردنی حاجی قادر بە خەباتی سیاسی کوردایەتی یەکێکە لە پرسیارە هەرە بنچییەکان لە سەرپاکی مێژووی خەباتی سیاسی کوردی نوێ.

ئەوەی من بۆم ساغ بۆتەوە بە جۆرێکی بێتەئویل و پاتەوپات، تاو و تەئسیری مەلای ئیبنوئادەم لە گیانی حاجی قادردا هەر تا ئەو ڕادەیە بوە کە لە شیعر و نووسینەکانی حاجی مەلا عەبدوڵادا بەدی دەکرێ، لەو ڕووەوەش گەشترین میراتێکی حاجی مەلا عەبدوڵا کە لە بەر دەستماندا بێ ئەو دوو بەیتەیە کە وا بە دوا قەسیدەیێکی «متصوف»انەی مەیلەو درێژی فارسیدا دێن:

با بکەم تبدیلی وزن و قافیە و ڕویە و عروض
بەم زەمانە هیچی تر شیعرم لەبۆ هەڵناستێ

بیکەمە کوردی زمانی خۆمە چاکی تێدەگەم
خوایە تۆفیقم بدەی من بەندە توو مولاستی

جگە لەمە، لە بڕە شیعرێکی دیکەی فارسیشدا کە درەختی سەرۆکەکانی تەریقەتی نەقشبەندی دەڵێتەوە، کاتێک نۆرەی سەرۆکایەتی دەگاتە «مەولانا خالد» ئەم دوو بەیتە دەڵێ:

زشاه دهلی عبدالله انور
محمد خالد ما یافت زیور

سراسر نسبتش دریای نوردست
ضیابخش لوای شهرزورست

گوتەی «خالد ما» واتە خالیدی خۆمان، هی کوردان، و پێ داگرتنی لەسەر ئەوە کە «خالد» هی خۆمانە، بەدوا ئەویشدا هەڵدانەوەی ناوی شارەزوور هەستێکی کوردایەتی ئاشکرای تێدایە بەتایبەتی کە ئەسڵی کارەکە چ پەیوەندییێکی بە دونیاوە

نیە و بە ئانقەست نەبێ جێگەی هەست و سۆزی کوردایەتی تێدا نابێتەوە. بەڕاستی لەم دوو بەیتەدا حاجی مەلا عەبدوڵا دڕی بە درەختی نەقشبەندی داوە و کوردایەتی تێ ترنجاندوە.

دەشێ مەولوودنامەکەشی کە وەریگێڕاوەتە سەر کوردی بخرێتە ڕیزی ئەم هەڵبەستانەوە ئەگەر لە پێش ئەوانەوە نەبێ، چونکە نووسینی پەخشان بە کوردی لەو سەردەمانەدا کەمتر باو بوە تا هەڵبەست.

ئەم نووسینانەی حاجی مەلا عەبدوڵا بۆ کاتی خۆیان هەنگاوی بەرەو پێشەوەبوون لە سەر ڕێبازی کرانەوەی کوردایەتی. بەڵام هیچ کامێکیان لەو دەمەدا نەنووسراوە کە هێشتا حاجی هەر لە کۆیێ بوە و هەموویان پاش ڕۆیشتنی ئەو بوە بۆ تورکیا. بەڵگە بۆ نووسانی ئەمانە لە دوای ڕۆیشتنی حاجی لەوەوە دێ کە وا حاجی مەلا عەبدوڵا لە تەمەنی کامڵی، دەمەوپیری، هەڵبەستی متصوفانەی داناون. بێگومان بەر لەوە ببێتە جێنشینی باوکی، حاجی مەلا ئەسعەد، هەڵبەستی گۆشەگیرانە و دونیا نەویستانەی دانەناون، هەر بیریشی لە دانانیان نەکردۆتەوە. ساڵی مەرگی باوکی 1289ی کۆچییە، ئەوسا دەمێک بوو، هەر نەبێ 6-7 ساڵێک بوە حاجی قادر لە کۆیێ ڕۆیشتوە. پێی ناوێ درێژەی بدەم بەم لاباسە و جێی بۆ بستێنم لە باسی حاجی قادر؛ بەڵگە زۆرن ئەوە ئیسپات بکا کە دوای ڕۆیشتنی حاجی قادر بە ماوەیێک حاجی مەلا عەبدوڵا ئەو هەڵبەستانەی هۆندوونەوە، من لێرەدا تەنها یەک بەڵگە دێنمەوە بۆ ئەوەی قسەکەم بچێتە دڵی خوێنەرەوە:

دیتت لە هەڵبەستەکەی یەکەمدا حاجی مەلا عەبدوڵا دەیەوێ «قافیە و ڕویە و عروض» و زمانی هەڵبەست بگوڕێ و بیکاتە کوردی. دوای ئەمە لە قافیە و کێشێکی نوێدا بە کوردی دەست دەکا بە هۆندنەوە:

یا خاتم الرسل چ عەجیبە حیکایەتم
یا هادی السبل چ غەریبە شیکایەتم

ئیتر لەسەر ڕەوشتی کۆنینەی شاعیرانی ڕۆژهەڵات خۆ دەشکێنێتەوە و خۆ نزم دەکاتەوە تا دەگاتە ئەم بەیتە و دەڵێ:

مەنوارە قامەتی زلم و مێزەری سپیم
دڵم ڕەشە ... ... هتاد

لەم بەیتەدا دەردەکەوێ حاجی مەلا عەبدوڵا لە کاتی هەڵبەستنی بەیتەکەدا مێزەری سپی لەسەر ناوە. ئەوەی مەعلوومێکی بێگومانە حاجی مەلا عەبدوڵا دوای مەرگی باوکی لە 1289 مێزەری بەستوە، تەنانەت لە1288 دا کە لە خزمەت باوکیدا دەچێ بۆ حەج ڕانک و چۆغەڵ و جل و بەرگی قەتارچییانەی لەبەر کردوە. پێی ناوێ هێندەش گوماناوی بین و بڵێین بە چ مەعلووم مەبەسی لە وشەی «عمامە» ماناکەی حقیقی بێ و بە «مجاز» مەبەسی «مەلایەتی» نەبێ و بەوەدا «عمامە» لە بەیندا هەڵ بەستێ؟ چونکە ڕاگەیاندنی «حقیقی» عەمامەکە ڕێکتر دێ لەگەڵ ئەو «حەقیقەتە» زانراوەی کە لە جل و بەرگی حاجی مەلا عەبدوڵاوە بە ئێمە گەیشتوە،

لێرەدا «بەچ مەعلووم» هەموو ڕاستییان کوێر دەکاتەوە. ناشێ بێبەڵگە و بۆ خاتری گومان لێکردنی بێ بنج واز لە واتای «حقیقی» وشە بێنین و «مجازی»یەکەی بە دەستەوە بگرین. ئەگەر وا بکەین دەگەینە حاڵێک کەس لە کەس نەسەلمێنێ و کەس بە کەس باوەڕ نەکا. خۆ ئەگەر بە بیری خۆماندا بێنینەوە کە لەکاتی سەفەری حاجی قادر و جێ هێشتنی کۆیەیدا تەمەنی حاجی مەلا عەبدوڵا لە 22 ساڵی تێ نەپەڕاندوە ئیتر هەر بە جارێ دەسەلمێنین ئەم مێزەرە و شیعری متیوفانەی دوای ڕۆیشتنی حاجی قادر بوە. خولاسەی گوتە ئەمەیە نووسینەکانی حاجی مەلا عەبدوڵا لە دەمەو پیریدا بەرهەم هاتوون و تەواوێک دوای دوور کەوتنەوەی حاجی قادر بوە لە کۆیێ.

من لێرەدا کە بەرهەمەکانی باپیرم، حاجی مەلا عەبدوڵا، بە نموونە دێنمەوە بۆ دیار خستنی تین و تاوی فیکریی ئیبنوئادەم لە دەروون و وێژدانی حاجی قادردا بۆیەیە چونکە لە سەرپاکی بەرهەمی حاجی قادر و حاجی مەلا عەبدوڵا کە کوردایەتییان تێرا دیارە بێ و مەعلوومیش بێ زادەی کۆیەن هەر ئەمانەی حاجی مەلا عەبدوڵا هەن، کاتی بەرهەم هاتنیشیان بێگومان دەکەوێتە دوای سەفەری حاجی قادر.

کەواتە من بە هێنانەوەی نموونەکان لە خۆمەوە یارمەتی ئەو باوەڕە دەدەم کە وا بێ بەڵگە دەڵێ حاجی لە زوێکەوە کوردایەتی کردوە، چونکە ئەگەر ئەو نموونانە نەبن، نەک هەر ڕوحی کوردایەتی بەڵکوو هەرچی تاو و تەئسیرێکی کوردایەتیی ئیبنوئادەم هەیە لە ژیانی حاجی قادردا وەک نەخشی سەر ئاوی لێ دێ لەو ڕووەوە کە هیچ بەڵگەی ماددی بەدەست کەسەوە نامێنێ تریسکەییێکی ئەو تاو و تەئسیرە بداتەوە. هەر نەبێ بەهۆی لەگەڵ یەکدیدا ژیان و لە ڕێی ڕەفاقەت و هاومەشرەبیەوە دەشێ بەرهەمی حاجی مەلا عەبدوڵا بکرێ بە بنگەی «استئناس» بۆ جۆر و چۆنەتی دڵ و دەروون و ویژدانی حاجی قادر، ئەگەر ئەو «استئناس»ە نەبێ تاکە یەک بەیت و دێڕ و پیتی حاجی قادرمان بە دەستەوە نیە کە لە کۆیەی گوتبن وەیا نووسیبن بە تەئویلیش بچێتەوە بۆ لای بیری کوردایەتی.

لە فەرزی ئەگەر شتێکی واش هەبێ و بەو فەرز دانانەمان ئەو پەڕی «احتمال» بگرین، شتەکە لە پەراوێزی واتا و گیانی هەڵبەست و نووسینەکانی باپیرم دەرناچێ. خۆت دەزانی، خوێنەری بەڕێز، لێرەدا سەر لەنوێ بەو گوتەی «لە فەرزی هەشبێ» یارمەتی «احتمال»ی بوونی تاو و تەئسیری «ئیبنوئادەم» ـمان دا لە ویژدانی حاجی قادردا و یارمەتیەکەشمان لێی دێ ببێتە دڵدانەوەیێک بۆ ئەوانەی حەز دەکەن حاجی قادر لە بێشکەی منداڵی و گەنجایەتی خۆیەوە دەستی کردبێ بە کوردایەتی. سرنجت بۆ ئەوەش ڕادەکێشم کە فەرزدانانەکە بەلانی کەمەوە ماوەی بیست ساڵێک، حاجی قادر پێش باپیرم دەخاتەوە لەو مەیدانەی هەست بە کوردایەتی کردنەدا چونکە هەر نەبێ باپیرم بیست ساڵێک دوای ڕۆیشتنی حاجی گوتە و هەڵبەستەکانی سەربە کوردایەتی داناون، کە حاجی لە کۆیەڕا شتی وای گوتبێ وەیا هەستی پێ کردبن، ئۆتۆماتیکی، ئەو بیست ساڵە پێش باپیرم دەکەوێتەوە. وا دەزانم فەرز دانان و تێ خوێندنەوەی «احتمال» هەرگیز داوامان لێ ناکا لە بیست ساڵ زیاتر مەیدانی بۆ چۆل بکەین و گەردەنی ئازاد کەین لە بەڵگە و ئیسپات.

لەبیرت نەچێ من لەم چەند گوتە و دێڕەی نووسینی دواییمدا مەبەسم بیر و هەستی سەربە کوردایەتییە نەک گیانی ئازایی و حەقپەرستی و دژایەتی ئەفسانە، چونکە گوتوومە و لێرە بە دواوە زیاتریشت بۆ ئاشکرا دەبێ حاجی لە ماوەی مانەوەی کۆیەی و بەدوا ژیان و گەشتی لە باڵەکەتیدا کە مەفتەنی ئیبنوئادەمە چ

قسووریّکی نەبوە لەو مەیدانەدا، چەندیّکی بشلّیّی لە بوونی تین و تاوی ئیبنوئادەم بۆ بردنی حاجی قادر بەرەو ئازاتر و تیژتر بوون لە دژی تەڵەکەبازی و ئەفسانە و کاری نارەوا جیّی بە زیادەوە بۆ دەبیّتەوە لە کردەوە نەترسەکانی حاجی قادر.

ئەوجا، سەرلەنویّ، با بگەڕیّینەوە بۆ دەلالەتی ئەو چەند بەیتە کە بە هی ئیبنوئادەم ناسراون.

لە برِە شیعرەکەدا دەردەکەویّ ئیبنوئادەم هەر لە رِۆمیانی دیوە کتیّبخانان ویّران کەن «رِۆمی ئەوا پەیا بوون، کتیبخانان دەکەن طی»، لەوە پیّشتر چاوی بە دەسترِۆییویّکی کورد نەکەوتوە بیّ حورمەتی بکا لەگەڵ کتیّبان.

ئاخۆ ئەگەر دەسەڵاتداریّکی کورد، وەک داگیرکەریّکی عوسمانی، وڵاتی غەیری خۆی داگیر کردبا، کتیّبخانەی ویّران دەکردن و قورئانی دەسووتاندن! یاخود سەبارەت بە باوەرِی سادە و بەهیّزی سەربە غەیبەوە ترسیّکی ئاسایی لە کتیّب و نووسراوەی پەیوەست بە ئایینەوە لە سووتاندنی کتیّبانی مەنع دەکرد! رِەنگە کوردیش کە رِەوی بردبیّتە سەر غەیری خۆی وەک تورک و غەیری تورکی کردبیّ لە لانی کوشتن و تاڵان کردنەوە، بەڵام قەناعەتم هەیە رِیّزی کتیّب و نووسراوی گرتوە.. لیّیان ترساوە، بەیتەکان وا رِادەگەیەنن کە لەوە بەپیّشەوە ئیبنوئادەم کارەساتی ویّران کردنی کتیّبخانانی نەدیوە، ئاغا و بەگ و میری کورد لە کوردستاندا کتیّبیان نە سووتاندوون.

ئەوەی رِاستی بیّ تا ئیّستاش کورد لە عاست کتیّباندا هیّندە ئازا نین بویّرن بییان سووتیّنن. جارەهای جار دیومە، تۆش دیوتە، گەورە و گچکە، دەوڵەمەند و هەژار، دەسەڵاتدار و لات، پەرِە کاغەزیان لەسەر زەویەوە هەڵگرتوە و ماچیان کردوە و لە کونە دیواریّکیان ئاخنیوە. بەڵی بەم دواییە کە کاغەزی رِۆژنامە و گۆڤار و دەفتەر و کتیّبی قوتابخانان و کاغەزی میری کەوتنە کووچە و کۆڵانان و ویّنەی رِووت و بیّحورمەت لە رِووپەرِەی نووسراواندا زۆر بوون، کاغەز حورمەت و پیرۆزی جارانی دۆرِاند. بەڵام لیّرە بەپیّشەوە لە نەزەر کورددا کاغەز خزمی «قرآن» بوە و لە سەردەمی ئیبنوئادەم و کاتی هەڵبەستنی ئەم چەند دیّرِە شیعرەدا لە کتیّبەکانی مزگەوت بەولاوە بە دەگمەن نەبیّ کاغەز بەرچاوان نەدەکەوت. بۆیەیە دیتنی سووتاندن وەیا ویّران کردنی کتیّبخانە ئەو کارە زلەی کردوە لە دڵ و هەست و

خوێنی پیاوێکی وادا. سووتاندنی کتێبخانە ڕاستەوخۆ سووتاندنی ئایینە و بێحورمەتی کردنە لە بەرانبەر ئەو ناوانەی دڵی دینداریک دەجۆشێنن. لە دەوروبەری کۆیە و عەشرەتەکانی ڕانیە قورئانێک ناوی دەرکردبوو بە «قەیسەر کوژ»، سەد جاران لە تەڵاق و پاکانە زیاتر دزی دەگێڕایەوە لە سوێندی درۆ.

شەکوای بەیتەکان لە وێرانبوونی کتێبخانان بە دەستی تورکانەوە (ڕۆمی)، بە شێوەیێکی نهێنی ئەوە ڕادەگەیەنێ کە مەلای ئیبنوئادەم ژیابێ تا دوای کۆتایی هاتنی میراتی پاشای کۆرە و داگیرکردنی ڕەواندز لەلای سپای تورکەوە. لە دڵی خۆمدا بڕیاری نیهایی گەڕانەوەی ئەو سێ بەیتەم بۆ ئیبنوئادەم هەڵگرتبوو تا کاتێک بۆم ڕوون دەبێتەوە ئیبنوئادەم کەی وەفاتی کردوە: کە مەعلووم بکرێ بەر لە هاتنی سپای تورک بۆ ڕەواندز ئەو مردبێ دیارە بەیتەکان یەکێکی تر دایناون و بە هەڵە بۆ ئەو ساغ بۆتەوە. چەندین پرسیارم لەم و لەو کرد بۆ وەدەست هێنانی مێژووی مەرگی ئیبنوئادەم هەمووی بێ سوود بوو تاکوو نامەکەی مەلا «وەیسی»م بۆ هات و لە ئەنجامی پرسینەوەی دووبارە لە منەوە وەرامی ڕاستەقینەم لێیەوە بۆ هات کە ئەوەی پشتاوپشت بەوان گەیشتوە دەربارەی مەرگی ئیبنوئادەم ئەوەیە کە لە ساڵی 1260ی کۆچی، گیانی سپاردوە.

لەم مێژوە ڕا دەردەکەوێ لە ڕووی کاتەوە چ بەرهەڵستێک نایەتە بەر ڕاستی ئەو تەواتورە کە دەڵێ سێ بەیتەکە هی ئیبنوئادەمن، چونکە چەند ساڵێک بەر لەو ساڵەی 1260ـە میرایەتیی ڕەواندز تێک چوو و وڵاتەکە داگیر کرا... کە ڕۆمی کتێبخانەیان سووتاندبێ ئەوەندە ماوەیان بە دەستەوە بوە دوای تێچوونی میری ڕەواندز و هەر لە ژیانی مەلای «ئیبنوئادەم» دا کاری وا بکەن لەگەڵ سروشتی داگیرکەر ڕێک بکەوێ و زیرە لە گیانی ڕۆڵەیێکی هوشیار و دڵسۆزی کوردستانی داگیرکراو هەڵستێنێ. تۆش لەگەڵ مندا بڵێ هەزار لەعنەت و نەفرین لە گیانی داگیرکەر، ئەو داگیرکەرە هەر کەسێک و لایەنێک دەبێ با ببێ..

ئەوەندەی من بزانم و فکرم تێی بڕ بکا لەو باسەی بوون و نەبوونی کوردایەتی لای ئیبنوئادەم هەر ئەوەیە کە لەم چەند لاپەڕەی دوایی نووسینەکەمدا باسم کرد و بۆی چووم. سەرجوملە و پوختەی وەرگرتنی واتا و دەلالەت لە هەڵوەست و نووسینەکانی ئیبنوئادەم قەناعەت دەبەخشێ بەوە کە وا کوردایەتیی ئیبنوئادەم لە ڕێگەیەکی تایبەتی بلیمەتی و حەقپەرستی و زانایی و دڵهوشیاری خۆیەوە بوە و

دەتوانین قسەی تێدا کورت کەینەوە و بڵێین ئەم مرۆڤە لە کولانەی ئایینەوە سەیری جیهانی کردوە، بەڵام بە چاوێکی تیژ و نەترساو. کە زانیبێتی شتێک لەگەڵ ئایین دژایەتی نیە با ئەو شتە باویشی نەبووبێ یاخود ناحەزی زۆر بووبێ، ئەو پەسندی کردوە و لەبەر لۆمە خۆی لێ لا نەداوە. بەنیسبەت حاجی قادریشەوە زۆر جێی باوەڕە لە هەڵوەست و بیروباوەڕ و قسەکانی ئیبنوئادەم سوودی وەرگرتبێ و بۆ دوارۆژ بووبن بە زادێکی گیانی و پەندی ئازایەتی و حەقپەرستی بۆی.

بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا کە بگەین بەو ئەنجامە کە وا حاجی سوودمەند بوە یا نەبوە لە قسە و خەبەراتی ئیبنوئادەم بۆ پەیدا کردنی هەستی نەتەوایەتی و خەباتی سیاسی، ئەو پرسیارە هەر دەمێنێتەوە ئایا حاجی قادر بەر لە سەفەری بۆ ئەستەمبۆڵ شیعری کوردپەروەرانەی گوتوون و خەباتی سیاسی کردوە؟ خۆ ناکرێ بوون و نەبوونی بیری سیاسیی حاجی قادر ببەستینەوە بە سوود وەرگرتن لە تاکە کەسێک با ئەو تاکە کەسە مەلای ئیبنوئادەمیش بێ. ئیمکان هەبوو حاجی قادر ناوی ئیبنوئادەمیشی نەبیستبا و فکری کوردایەتی لە ڕێبازێکی دیکەوە بۆ پەیدا بووبا.

وەرامدانەوەی ئەم پرسیارەی تازە لە خۆمانم کرد شتێک نیە بە وشەی «ئا» یاخود «نا» لێی ببینەوە. تا مافی ئەوەمان دەبێ پرسیارەکە یەکلا بکەین پێویستە لێکدانەوەیێکی قووڵ بکەین لەبەر ئاوێنەیێکی ڕوون و بێ گەرددا. نەفەسی ئەو تەرزە زیهنکارییە تا بڵێی درێژە. کورد گوتەنی هەویرەکە زۆر ئاو دەخوازێ. ماوەی هاتوچۆ کردن و خۆ هێنان و بردن بۆ ترجیحی لایەکیان بەسەر ئەوی تردا گەلێک فرەوانە. یەکێک ئارەزۆ بکا بڵێ حاجی قادر لە کوێوە دەستی کردوە بە کوردایەتی کۆسپێک نایێتە پێشی وەک دیواری چەمەنتۆ ڕێگەی لێ ببەستێ و بی وەستێنێ، ئەگەر هەوەسبازی بکا دەتوانێ بڵێ فلانە بەیت و فلانە قەسیدەی لە کۆیێ گوتوون. لەم ڕۆژگارەدا نووسین پەیدا بوون ئەوەندە بێباکن لە عاست ڕاستیدا و بە جۆرێک تەنگ بە ئینساف و مێژوو و حەقیقەت هەڵدەچنن، لە تەک ئەواندا داوای بوونی گیانی نیشتمانپەروەری لای حاجی بەر لە چوونی بۆ تورکیا هەر ئیعتیرازی لێ ناگیرێ.

لەوە تێ فکرە کە نووسراوە و بڵاویش کراوەتەوە «مەم»ی قارەمانی چیرۆکە ناودارەکەی «مەم و زین» ئاژێری تراکتۆر بوە لای باوکی «زین» و سەبارەت بە جوداوازی چینایەتی «زین» نەدراوەتە «مەم». لەو تەرزە نووسینانە لە مەیدانی

جودا جودادا بە زۆری چنگ دەکەون. کەواتە با حاجی قادر لە کۆیەڕا کوردایەتی کردبێ گەرچی نەشی کردبێ، «چ قەوما، کەعبە کەچ بوو، مەسجیدولئەقسایە ڕووخاوە؟». بەڵام من کە قسەی وا دەڵێم بە موناسەبەی جێگەیە و گوتەیێکە لە تەک گوتەی شۆفێربوونی کاکە «مەم» ـە لای باوکی «زین»، دەنا گوتەی ڕاست و مرۆڤانە ئەوەیە کە بڵێین قەیدی چ دەکا و زەرەر لە کێ دەکەوێ دان بە حەقیقەتدا بێنین؟

ئەگەر بۆمان ساغ نەبۆوە حاجی لە کۆیەڕا کوردایەتی کردبێ، بۆ شەڕ لەگەڵ ڕووداو بکەین؟ لە گوتنەوەی ئەوەی ڕاستەوخۆ یاخود بە بەڵگە و نیشانە خۆ بە ڕاست دەنوێنێ چ نالەبارییێک پێک دێ و کام بەرژەوەند تێک دەچێ؟ هەڵبەت هیچ!! خۆ ئەگەر لە گوتنەوەی ڕاستی بەرژەوەندیش تێک بچێ، کە مەعلوومە تێک ناچێ، دەبێ گوێ نەدرێتە ئەو بەرژەوەندە. سوودێک لەگەڵ ڕاستی نەگونجێ با هەر نەبێ دەوجا با هەوڵ دەین و بزانین بە لێکدانەوە و هەڵسەنگاندن و کێشانی بەڵگە و ڕووداوی ڕابەر بۆ کام لادا دەلەنگێین: ئایا حاجی قادر لە کۆیەوە دەستی کردوە بە خەباتی کوردپەروەرانە و دانانی هەڵبەستی سیاسی یاخود دوای گەیشتنی بە ئەستەمبۆڵ!

لێرە بەپێشەوە[47] گوتم کەم وایە شاعیرێکی کوردی چەرخی نۆزدەم زەرف و کاتی هەڵبەستەکانی دیار بن. بەداخەوە حاجی قادریش یەکێکە لەو شاعیرانە. ئەگەر لیستەیێکی زەمەنی هەبا بۆ هەڵبەستەکانی، لزوم نەدەما دەمەتەقە لەسەر ئەوە بکرێ ئاخۆ لە کەنگیەوە دەستی کردوە بە دانانی شیعری سیاسیی سەربە کوردایەتی: ئایا لە کۆیەوە یا لە ئەستەمبۆڵەوە. بەڵام پێویستە لێرەدا ئەوەندەش بڵێم، بوونی لیستەی زەمەنی هەر شیعرەکانی ناو دیوانەکەی و ئەو کەمتاکورتەی بەسەر زمانەوەیە ساغ دەکاتەوە و دەمەتەقەیان لەسەر هەڵدەگرێ، گریمان ئەو لیستەیە بۆشمان دەرخا کە شیعرە سیاسیەکانی ناو دیوانەکەی دوای دەرچوونی لە کۆیێ هۆنراونەوە دیسانەوە ڕێگە نابەسترێ لە کەسێک کە بیەوێ بڵێ شیعرە سیاسیەکانی کۆیەی لەناو چوون... شیعریش خاتری تۆ بێ، ئەو کەسە دەتوانێ بڵێ بە قسە و ئاخاوتن کوردایەتی کردوە، لە ترسی تورکی داگیرکەر شیعری کوردپەروەرانەی دانەناون نەکا خەلق

---

[47] – دەبێ بگەڕێینەوە بۆ بەشی یەکەم.

دووچاری گیروگرفت بکا. کە لێرەدا ناوی «ترس» دێنم قسە و تێبینی غەیری خۆشمی پێ دووبارە دەکەمەوە، چونکە نووسەر هەیە بە نامە پێی ڕاگەیاندووم کە وا ئەم ترسە دەبێ حاجی مەنع کردبێ لە هەڵبەستی سیاسی دەنا ناچێتە عەقڵەوە لە ڕۆژگاری پێش سەفەری بۆ ئەستەمبۆڵی هیچ خەباتی کوردایەتی نەکردبێ.

لێرەدا هەڵوەستێکی کورت دەکەم بایی ئەوە بکا بیر و ڕای خۆم دەربارەی «ترس» و ترسانی حاجی قادر دەربڕم و بە دوا ئەودا بکەومەوە سەر شریتەی لێکۆڵینەوە.

ئەگەر «ترس» هۆی مەنع کردنی حاجی قادر با لە دانانی شیعری سیاسی، فەرقی کۆیە و ئەستەمبۆڵ نەبوو لە ڕووی ترسەوە ئەو فەرقە نەبێ ئەستەمبۆڵ پتر جێی ترس بوە، دەبوا حاجیش لە غەریبیدا ترساوتر بێ. ئەو هێرشە زلانەی کە حاجی بردوونی بۆ سەر تورکی عوسمانی و سنوورێکی نەهێشتۆتەوە لێی تێپەڕ نەکردبێ بۆ ڕیسوا کردنیان هەر لە نەفەر و ئونباشییانەوە تا دەگاتە خەلیفەیان، بۆ خۆیان شاهیدی ئەوەن کە «نەترسان» گەورەترین عامیلی پێک هاتنیان بوە چونکە تەنها نیشتمانپەروەریی ڕووت داوا لە کەس ناکا تا ئەو ڕادەیە تیژ و خورت بێ. جگە لە حاجی قادر شاعیرێک نەبوە لە ناو عەرەبانیش «مووی معاویە»ی لەگەڵ تورکان پساندبێ و هەموو پردێکی پەیوەندی لە نێوان خۆی و ئەواندا ڕووخاندبێ. ترس چ تەفسیرێک بە دەستەوە نادا بۆ ڕوون کردنەوەی هەڵوەست و گوتە و کردەوەی حاجی ئەو تەفسیرە نەبێ کە پێچەوانەی «ترس» واتە نەترسان و ئازایی بە دەستەوەی دەدەن.

تەفسیری نەبوونی شیعری سیاسیی حاجی لە ڕۆژگاری زوویدا لە ڕێی هێنانە ناوی ترسەوە، هەر لەوەندەی تازە گوتم کورت ناهێنێ، لە هەموو مەیدانێکی باسی حاجی قادردا کورت دێنێ، هێند کورت دێنێ هەموو حیسابان تێک دەدا و ڕاستییان سەروبن دەکا.

حاجی کە بترسێ لەوە گوتنی شیعری کوردپەروەرانە خەلق دووچاری تەنگوچەڵەمە دەکا و ئەم ترسە لەم تەرزە شیعرەی بگێڕێتەوە، ئەدی چۆن داوایان لێ دەکا ڕاستەوخۆ و بێ دوو دڵی چەنگەوبازی داگیرکەر بن و مافی نەتەوایەتی خۆیانی لێ بستێنن. هەر نەختێک ورد ببیەوە «تناقض»ی هەڵوەستەکەت وا بۆ ئاشکرا دەبێ پێی نەوێ من یا غەیری من بۆت ئاشکرا کا. حاجی بە هەڵوەستی وا سەیر وەک

کەسێکی لێ بەسەر دێ کە بە دەمانچە و خەنجەر هێرش ببا بۆ سەر دوژمنی، کە لێشی بپرسن ئەدی بۆ لێرە بە پەشێوە جارێکیان گلەیی لێ کردن وەیا خراپە گوتنەوەی ئەو کابرایەمان لێ نەبیستیت؟ لە وەرامدا بڵێ دەترسام گلەیی و گازاندە دڵگیری بکا وەیا بی تۆرێنێ.

سەرەڕای ئەمانە هەمووی، بە نیسبەت خۆمەوە دەبێ بڵێم وەک من لە حاجی قادر گەیشتووم و بایی ڕوون کردنەوەش لە سەری ڕۆیشتووم، ئازایی و نەترساوی و باوەڕ بە خۆ هێنان و سەرکەشی بەشێکی هەرە گەورەی نەفس و دەروونی حاجی قادر پێک دەهێنن. هەر ئەم ئازاییە وەک چراییکە سەرانسەری ڕێبازی ژیانی حاجی ڕوون دەکاتەوە و تەفسیری هەڵوەست و گوتە و کردەوەی دەکا. کە ترسمان تێکەڵ بەو تەفسیرە کرد تێکڕای ژیانی، هەر لە منداڵیەوە تا مردنی، وا لێڵ دەبێ سەرەدەری لێ نەکرێ و ئیمکانی تێگەیشتنی نەمێنێ. کۆبوونەوەی «ترس» لەگەڵ «حاجی قادر» دا وەک ئەم دیمەنانەی خوارەوەیە:

- دەوڵەمەندی و لە برسا مردن
- ڕاو کردنی پڵینگ و نەوێرانی تەقە کردن
- تەمووزی بەغدا و سەرمابردن
- پاداشی خێرا ڕۆیشتن و شەلبوون
- ئاو و وشکایی
- هیزەی ڕۆن و بێچەورایی ... هتاد.

تا بتەوێ حاجی قادر کۆ کەیتەوە لەگەڵ شتێکی دژی سروشتی خۆی وەک ئەوە نابێ کە بە ترساو ناوی ببەی. بەڕاستی «ترس» ئیفلاس بە هەموو تۆژینەوەیێک دەکا کە لە بارەی حاجی قادرەوە بکرێ. با واز لە ترس بێنین بۆ ناو چەقی باسی حاجی و بگەڕێینەوە بۆ پێوە خەریکبوون بەوەی پێوەی خەریک بووین.

ناو ناوە ڕووداوێکی مێژوویی وەیا ناسراو لە بەیتێکدا کاتی هەڵبەستنی بەیتەکە دەردەخا، بەڵام بەداخەوە هەڵبەستی وەها لە زوربەی دیوانی شاعیرانی کوردی سەدەی نۆزدەم زۆر کەمن، بەشی هەرە زۆری شیعرەکانیان وەک گۆڕستانی بێ کێلەقەبری لێ نووسراو سەرڕشتەیان بزرە.

دیوانی هەر یەک لەو شاعیرانە سەرەوبن دەکەی و چەند جاران دەی خوێنیەوە و سرنجی دوور و قووڵ لە زۆر شوێنی دەگری و خۆت دێنی و دەبەی بۆ ئەوەی بزانی هەڵبەستەکانی ئەو شوێنانەی دیوانەکەی لە کام تەمەنی عومریدا گوتوون و لەگەڵ کام پلەی پێگەیشتن و فراژیبوونی شاعیریەتیی شاعیرەکەدا ڕێک دەکەوێ ناگەی بە ئەنجامێکی وەها، کە خۆشتی لێ ڕازی بێ، بتوانی خەلقی دیکەی پێ ئیقناع بکەی. بەڵێ ڕەنگە دوای خەریکبوونێکی وەک «شامپلیۆن» کە نووسینی سەر «بەردی ڕەشید»ی خوێندەوە بە ماندووبوونێکی بیستساڵی، تۆش بە هۆی بەیەکدی گرتنی زانراو لەگەڵ نەزانراو و هەڵکێشانی هێمای شیعرێک بە تەرازووی داخوازیەکانی ڕووداوی مێژوویی وەیا باری کۆمەڵایەتی... بگەیتە ئەنجامێک ماندووبوونەکەت بێنێ و دەست بدا بۆ ئیقناع کردن و تەگەرە ڕەواندنەوە. بەڵێ مومکینە بەڵام حاجەت ناکا بڵێم لە خۆوە دیارە زەرف و ماوەی هێندە لەبار و درێژ نە بۆ من نە بۆ یەکێک لەوانەی دەیناسم پەیدا نابێ، لە فەرزی بۆ من بە زۆرەملی پەیداش ببێ لەگەڵ پێویستی بڵاو کردنەوەی باسەکەم چ گونجانێکی نیە.

کاری وا نەفەس درێژ ئەوە نیە چاوەنۆڕی کۆتاییەکەی بکەی و دیواری بەرهەمێکی ئەدەبی بە پەلەی لەسەر هەڵستێنی. لەگەڵ ئەمەشدا ئارەزۆی دۆزینەوەی زەرف و کاتی هەڵبەست لەبەر تیشکی ناوکی هەڵبەستەکە خۆی و ڕووناکی تێکڕای ناوەڕۆکی دیوانی شاعیر چشتێکە لە جەرگەی مەیلی ئەدەبیمدا. بۆ مەبەسی نووسین و بڵاوکردنەوەش نەبێ لە خۆمەوە، وەک گەلێ کەسی تر، سرنج دەگرم لە شێواز و داڕشتن و وشەکانی هەڵبەستێک کە کاتی دانانی مەعلووم نیە بەڵکوو لە دەلالەتی وشەیێکی وەیا هێمای ڕستەیێکی وەیا وێچوونی نەبزی لەگەڵ هەڵبەستێکی تردا سەرەدەرییێک بکەم لە کات و زەرفی هۆندنەوەی. بە نموونە لێرەدا یەک دوو تەجرەبەی خۆم دەنووسمەوە یەکێکیان لەگەڵ ئەو بەیتەی نالی کە دەڵێ:

هودهودی دڵ حەبسی بەلقیسی سەبای دیوە یەقین
خۆی کە دامەن گیری شاهی ئاصەفی «ثانی» دەکا

جارەهای جار بەسەر ئەم بەیتەدا تێپەڕیوم بە پەلە بێ ئەوە چ واتای نهێنی و ڕاگەیاندنێکی تایبەتی لێ وەرگرم. بەڵام کە کەوتمە سەر وردبوونەوە لە وردەکاریەکی تێیدایە و سەرنجم گرتە وشەکانی و ئەو حیکایەتەی دەی گێڕنەوە واتای «شاهی ئاصەفی ثانی» لەبەر چاوی زیهنم تریسکایەوە و یەکسەر سلێمان

پاشای بابانی باوکی ئەحمەدپاشای دەست نیشان کرد چونکە «ئاصەفی بەرەخیا» وەزیری «سلێمان پێغەمبەر» بوە، دیارە ئەوان (واتە سلێمان پێغەمبەر و ئاصەفی کوڕی بەرەخیا) هەردووکیان یەکەمن، ئاصەفێکی «ثانی» کە ئەم بەیتە باسی دەکا دەبێ عائید بە «سلێمان» ێکی تر بێ. کێ بێ لەسەردەمی «نالی»دا سلێمان بێ و شاهیش بێ غەیری سلێمان پاشای بابان؟ جوانی و قووڵی و لەتافەتی «هودهودی دڵ» و «بەلقیس» و «سەبا» و تێکڕای نیسبەتی ئەم حیکایەتە «قرآنی»یە لەگەڵ «سلێمان پێغەمبەر» و لە ڕێی ئەوەوە لەگەڵ «سلێمان پاشای بابان»دا لە بیر خۆت ببەرەوە هەر سرنج بگرە لایەنی ڕاگەیاندنی بەیتەکە لە ڕووی بەدەستەوەدانی کات و زەرفی دانانی. هەڵبەت کە زانرا لە بەیتەکەدا «سلێمان پاشا» مەبەستە، لەخۆوە ئاشکرا دەبێ کە لە حاڵی ژیان و حوکمڕانی ئەودا گوتراوە و لە لانی کاتەوە دەکەوێتە پێش قەسیدەی شیوەن و پیرۆزباییەکەی «تا فەلەک دەورەی نەدا» کە بۆ مەرگی سلێمان پاشا و هاتنە سەر حوکمی ئەحمەدپاشا دانراوە لە ساڵی 1254 دا. فەرموو سرنجێک بدە ئەم چەند بەیتەش کە لە هەمان قەسیدە داهاتوون:

ضابطەی طبعم سوارە ادعای شاهی هەیە
محتشم دیوانە داوای تەختی خاقانی دەکا

نوکی خامەی من کە بێتە معنی آرایی کمال
خەت بە خەت اظهاری نەقشی صورتی مانی دەکا

استطاعە و قوەتی طبعم بە کوردی و فارسی و
عارەبی اظهاری چالاکی و چەسپانی دەکا

وشەکانی عەرەبیم هەر بە ڕێنووسی عەرەبی نووسیەوە چونکە زۆریان گەلێک پیتی وایان تێدایە لە کوردیدا هەر بەکار نایەن و نووسینیان بە پیتە جێ گرەکانیان لە کوردیدا زۆر دوورمان دەخاتەوە لە ڕۆحی نالی و شیعرەکانیش.

هەست دەکرێ لەم بەیتانەدا تەوژم و تینێک هەیە هی نیوەی یەکەمی عومری «نالی»یە. شوێن پێی «نالی» لە ناو گوڵ و گوڵزار و گیای گەنجایەتی خۆی و بەهاری هەڵبەستەکەدا وەک نەقشی بەستبێ وایە. بەڵام باوجوودی ئەم هێز و تەوژم و تینەش ئەگەر دەلالەتی «شاهی ئاصەفی ثانی» نەبا نەمان دەتوانی کات و زەرفی دانانیان ببەینەوە بۆ سەرچاوەی ڕاستەقینەیان.

نموونەی دوەم چوارینەیێکی حاجی قادرە بە پیاوێکی «تەقتەقی»دا هەڵ دەڵێ:

شەوکەتی جووتەی سمێڵت تاکە مانەندی کەمە
تەرکەشی تیری تەژاو و شیری دەستی ڕۆستەمە

ڕووی لە تەختی ڕوومەتت هێناوە بۆ شانت دەڵێی
ماری سەرشانی «ضحاک» و دوژمنی تەختی جەمە

لەم چوارینەیەدا چ وشە و ناوێک نیە بەنهێنی وەیا ئاشکرایی پەنجە بۆ ساڵ و زەرفێکی تایبەتی درێژ کا بەو پێیە لە ناوەڕۆکی خۆیدا شەوقێک نادیترێ لێرەڕا بەرەو دواوە مێژوومان بۆ ڕوون کاتەوە، بەڵام لە دارڕشتن و شێواز و زرینگە و نەفەسدا دەڵێی جمرانە «توأم»ن لەگەڵ قەسیدە مەدحەکەی کە بۆ ئەمین ئاغای داناوە و بەم جۆرە دەست پێ دەکا:

ئەی «محمد» وەی «امین الدولە» ئیمرۆ کۆیی تۆ
جەنەتێکە کەوتە دۆزەخ هەرچی لێی دوور کەوتەوە

چاوێکی وردبین هەمان دەسەڵاتی لە حەد بەدەر لە مەدحەکەی ئەمین ئاغا و چوارینەکەی پێشووتردا دەبینێ، هەر ئەوەندە فەرقیان پێ دەکرێ چوارینەکە بۆ پیاوێکی عادەتی لادێیی دانراوە قەسیدەکەش بۆ ئەمین ئاغا. کە سمێڵی ئەمیان بکا بە شیری دەستی ڕۆستەم و ماری سەرشانی «ضحاک» دەبێ ئەمەش بۆ بەزمی مەجلیسی ئەمین ئاغا بڵێ:

قاوەچی بەزمی ئەتۆ دونیایە سینی ئاسمان
ئافتابی زەرفە فنجانی مەهە قاوەی شەوە

یەک زەوق و یەک نەفەس و یەک هێز لە هەر دوویان خۆ دەنوێنن، بۆیە من بۆ ئەوە دەچم هەردوویان بەرهەمی یەک قۆناغی عومری حاجی بن. ئەمما ئەم قۆناغە کەمەیە، لە جێی مناسبی خۆیدا دیاری دەخەین. جارێکیان لە پێک گرتنی ئەم دوو

پارچە هەڵبەستەدا من گوتم ڕەنگە هەر دوویان لە یەک دوو مانگدا گوترا بن، برادەرێکی شاعیرم گوتی من لە تەجروبەی شیعردانانی خۆمەوە دەتوانم بڵێم هەر دوویان لە یەک دوو ڕۆژدا گوتراون.

ئەم دوو تەجروبەیەم باس کرد تاکوو پاکانەیێک بکەم بۆ لێکدانەوەیێکی لێرەدا دەی خوێنیتەوە لە بارەی بوون و نەبوونی کوردایەتی لە هەڵبەستەکانی حاجی بەر لە سەفەری بۆ تورکیا. ئەوەندەی ئیمکانم هەبێ لە نیگا و هێما و ئیشارەی وشە و ڕستەکانی دیوانی حاجی واتای نهێنی و ڕابەر هەڵ دەگوشم، خۆم لە بیر و ڕای سەرپێیی و عاتیفی دەدزمەوە، بەشێوەییێکی هەستی و نەستی بەدەم تێپەڕینی کاتەوە واتا و ڕووداو بە یەکدی دەگرم بەڵکوو بگەم بە ئەنجامێکی نزیک لە قەناعەت و هەڵچەقیو لە سەر زەوییێکی سەخت. ئەوەی ڕاستی بێ لێرە بەپێشەوە، دەمێکە، ئەم وردەکارییە دەکەم لەگەڵ شیعر و دەنگوباسی حاجی قادردا، بێگومان لە هەمان ڕێبازیشەوە بەرەو دوارۆژ گوزەر دەکەم لەم گەشتە فکری و زیهنییەی ناو جیهانی بەرفرەوانی ئەم شاعیرەدا.

ئەگەر زەوقی شاعیری یارێکی وەفاکاری نووسەر بێ، لەوانەیە بتوانێ لە تامی شیعر چەژی تەمەنێکی لێ بکا کە لەو تەمەنە بوەشێتەوە و شیعرەکەش بداتەوە بە خاوەنی خۆی با نازناویشی تێدا نەگوترابێ، چونکە ناسینەوەی شیعری شاعیر بۆ زەوقی شیعردۆست، تا ڕادەیێک، وەک ناسینەوەی دەنگی گۆرانیبێژە. ئەگەر هەڵە لە گوتنەوە و نووسینەوەیاندا نەکرابێ دەشێ بزانرێ فڵانە بەیت هی «کوردی»یە یا هی «محوی»، هی شێخ ڕەزایە نەک فایق بێکەس. کە زەرفیش دیاری خست شیعرەکە هی کێیە سەرلەنوێ، مرۆڤ دەتوانێ بکەوێتە گەڕ بۆ دەست نیشان کردنی تەمەنێک کە لە دەمودووی وشەکان بوەشێتەوە. بەڵام وەک لە خۆڕا دیارە کارەکە کارێکی ئاسان نیە، تا بڵێی زەحمەتە. سەرەڕای زەحمەت، لێکدانەوەی ئەوتۆیی هەرچەند ئوستادانە بێ و ئەوپەڕی مووقڵاشیشی تێدا بەکار هاتبێ دیسانەوە دەمەتەقە هەڵ دەگرێ و کەسێک بیەوێ ئەنجامەکەی نەسەلمێنێ دەتوانێ نەی سەلمێنێ. بۆیە من چەندێکی خۆم خەریک کەم بۆ دۆزینەوەی کاتی هەڵبەستنی شیعرەکانی حاجی قادر هەر ناتوانم خوێنەری نەسەلمێنی پێ ئیقناع کەم و ڕێی ڕەخنەی گومانکارانە و لاسارانەی لێ ببڕمەوە. بەڵێ وا دەبێ لە هەڵبەستدا وشەیێک ئیشارە دەکا بۆ کات و زەرفی دانانی، وەک ئەم بەیتەی حاجی کە دەڵێ:

لەسەر تەناف کە لەرزی هەتیوی سندووسی
شکا مەتاعی زەریفی و قیمەتی لووسی

زاهیر وا پێ دەچێ وشەی «سندووس» جێگەی تەناف بازییەکە دیار خا، بەو هۆیەوە دەگەینە ئەو باوەڕە، یاخود مەیلمان بۆ ئەوە دەچێ، حاجی کاتێک هەڵبەستەکەی داناوە کە خەریکی خوێندن بوە لە دەوروبەری «سندووس»[48].
هەڵبەت لە بەیتەکەڕا دەشزانین حاجی لە سەردەمی فەقێیەتیدا سەیری تەنافبازی و سەما و سووڕانی کردوە، بەوەدا جارێکی دیکەش حاجی ئیسپاتی دڵتەڕی و دوورە «تزمتی» خۆی دەکا. بەڵام ئەم تەرزە شیعرە لە دیوانەکەیدا زۆر نین، هەشبن گەلێکی بێ سەروشوێنی هەن. هەرچۆنێک بێ ئەوەی ئێمە لێرەدا ئیشمان پێی هەبێ تێکڕا و سەرلەبەری شیعرەکانی نین، هەرئەو هەڵبەستانەمان مەبەستن کە خەریکی کوردایەتین، چونکە مەبەستمان ساغ کردنەوەی کاتی دانانی ئەو شیعرانەن کە سەرەتای خەریکبوونی حاجی بە کوردایەتییەوە دیار دەخەن ئایا لە کۆیێ بوە یا لە ئەستەمبۆڵ.

بۆ نموونە خۆ تاقی کردنەوە با سرنج بگرینە قەسیدەی:

وەرە سەیری بزانە لاوی کۆیی[49]
مەهە دانیشتوە یا سەروە ڕۆیی

---

[48] - ڕیوایەت هەیە دەڵێ تەنافبازەکە خەلقی سندووس بوە بەڵام لەگەڵ هەموو تاقمی گەمەکەرەکان بەیەکەوە هاتوونە کۆیێ، ئەمین ئاغا لەگەڵ حاجی قادر بەیەکەوە لە بانی مزگەوتی گەورە سەیری بەزمەکەیان کردوە، تەنانەت گۆیا هەتیوەکەی تەنافەکەی پساوە و کەوتۆتە خواردەوە کە ئەمە ڕاست بێ وشەی (سندووس) دەلالەتی نامێنێ. هەڵبەت هێمای وشە کاتێک بایەخی دەبێ کە لە هیچ لایێکەوە خەبەرێکی بێگومان بێبایەخی نەکا.

[49] - لە دەستنووسێک کە مەلا ڕەئوفی سەلیم ئاغا بۆ کۆڕی زانیاری کوردی ناردوە سەر جوملەی قەسیدەکە 35 بەیتە، واتە بەیتێکی لە دیوانە چاپ کراوەکەی حاجی

تا بزانین بۆمان ساغ دەبێتەوە هی دەوری ژیانی کۆییەتی یا هی ئەستەمبۆڵ. لە هەموو بەیتەکانی قەسیدەکەدا، نە تاکە بەیتێکی نە تاکە وشەیێکی نە تێکڕایان ڕاستەوخۆ جێگەی نووسینیان بە دەستەوە نادەن، لەوانەیە خوێنەری عادەتی کە نیازێکی لێکدانەوە و بەراورد کردنی نەبێ لە خوێندنەوەیاندا بیریش لەوە نەکاتەوە ئاخۆ زادەی کۆیەن یا هی ئەستەمبۆڵ. کەسێکیش کە مەیلی بڕوا بۆ ئەوە کە لە کۆیێ گوتراون چ بەڵگەیێکی بێ ڕەخنە پاشگەزی ناکاتەوە. بەڵام بایی ئەوەی خۆم ئیقناع بکەم، ئەگەر خەڵقیشم بۆ ئیقناع نەکرێ، لە تێکڕای بەیتەکان و لە تایبەتی هەندێکیان دەگەم بەو باوەڕە کە لە دەرەوەی کۆیێ، واتە لە ئەستەمبۆڵ، دانرابن.

لەباری دەلالەتی تێکڕای بەیتەکانەوە وەک گەرد و وەردی دوای بەیانی بۆم مەیلەو ڕوون دەبێتەوە دەم و ڕاوێژی گەلەییەکانی حاجی لەم قەسیدەیەدا لەوە دەچێ لە دوورەوەی ناردبن بۆ کۆیێ نەک ڕوەوڕوو بە خەلقی کۆیەی گوتبێ. لە لایەن شێواز و دارِشتن و سۆز و تاسەیشەوە بەیتەکان برای قەسیدەی «لە مەیدانی بەهارا شارەکەی کۆ»یەن، خۆ مەعلوومیشە ئەمەیان لە ئەستەمبۆڵەوە بۆ کۆیێ هاتوە چونکە ئەوەندە شکایەتی تێدایە لە دەست غەریبی کە کزە لە دڵی زیندوانی ئیمرۆکەش هەڵ دەستێنێ.

بە قەددی ئاوەگردە دەردی دووری
نەزیری «ئیچ قەڵا»یە بێ حضوری

بەلای زەوق و تەبعی منەوە ئەوەندە لەیەکدی چوونە و هەمئاهەنگییە بەسە بۆ ئیسپات کردنی هەڵبەستنیان لە ئەستەمبۆڵ نەک لە کۆیێ.

---

زیاترە. بەپێی دەستنووسەکە دوای بەیتی بیست و نۆیەمی ناو دیوانە چاپ کراوەکە ئەم بەیتە دەبێ بکرێتە بەیتی سییەم:

خەریکی کاسبی و کاری حەڵاڵە
بە غەیری ئەم ئەوانی تر بەتاڵە

دیوانەکەی ئەم بەیتەی تێدا نیە و سەر جوملەی 34 بەیتە.

سەرەڕای ئاوازی تێکڕای بەیتەکان کە لە دوورەوە دێتە بەر گوێچکەی دڵمەوە، تاکە بەیتێکی تێدایە بە تیشکێکی تایبەتی خۆی زیاتر لە نزیکەوە جێگا بۆ خۆی دیار دەخا:

لە عەهدی کەر نەبێ تا عەهدی گای کوێر
لە گوێی گا نوستوون زۆر حەیفە بۆ شێر

لەم بەیتەدا دیار دەکەوێ کاتێک حاجی قەسیدەکەی داناوە کە ڕۆژگاری «کەرنەبی - شێخ نەبی ماویلی» بەسەر چوە و دەوری شێخێکی تر[50] داهاتوە و هێشتا بەسەر نەچوە. کە حاڵ وابێ مەعلوومان کرد حاجی لە ئەستەمبۆڵەوە شیعرەکانی بۆ کۆیێ ناردوون چونکە کاتێک ئەو کۆیەی جێ هێشت شێخ نەبی لە گەرمەی جەزبە و های و هووی و دەسەڵاتدا بوە لە کۆیێ. ئیمکان هەیە نەختێک لەوەش زیاتر پەراوێزی زەمەنی لە دەوری هەڵبەستەکە تەسک کەینەوە و لە ساڵی تێدا هەڵبەستنی نزیکتر کەینەوە بەهۆی ئەوەوە کە شێخ غەفوور لە 1307ی کۆچی مردوە: باپیرم لە چەند بەیتێکی مەرسیەدا کە بۆ مەرگی شێخ غەفووری داناوە «یا غفوری» کردوە بە مێژووی مردنی کە 1307 دەگرێتەوە. کەواتە شیعرەکانی حاجی قادر لە دوای ڕاگوێستنی شێخ نەبی لە کۆیە و پێش مەرگی شێخ غەفور لە 1307 دا هۆنراونەوە. هەرچەند بە تەواوی نازانم شێخ نەبی چ ساڵێک کۆیەی جێ هێشتوە بەڵام بە پێی دەلالەتی هەندێ قسە و باس کە من پێیان ئاشنام، دەبێ ئەو ساڵە

---

[50] - مەشوور ئەوەیە کە مەبەستی حاجی قادر لێرەدا «شێخ غەفووری تاڵەبانی»یە. دەبێ عوزر بێنمەوە بۆ بنەماڵەی تاڵەبانی کە بە ناچاری ناوی مەزنەپیاوێکی وەک شێخ غەفوور لە جێگەی وەها نالەباردا دێتە ناو نووسینەوە. ئەوەی لە خۆمی ئازاتر کردم کە دەست نەپارێزم لە گێڕانەوەی ئەم حیکایەتە، باڵ قووڵی و دڵ فرەوانی تاڵەبانیانە لەوەدا کە بۆ خۆیان زۆر مەردانە دیوانەکەی شێخ ڕەزایان لە چاپدا و یەک وشەی ناقۆڵاشیان لێ نەسڕیەوە لەوانەی شێخ ڕەزا کردوونی بە تیری کوشندە و لە خزمانی خۆی گرتوە کە یەکێکیش لەوان سەرۆکی بنەماڵە کە شێخ غەفوور بوە.

بەینێک پێش 1300ی کۆچی بووبێ، ڕەنگە بەلای کەمەوە شەش حەوت ساڵێک. چونکە لێرەدا پەکمان نەکەوتوە لەسەر دەستنیشان کردن وەیا نزیکبوونەوە لەو ساڵە، لزوم نابینم خوێنەر خەریک کەم بە خوێندنەوەی ئەو قسە و باسانە بۆیێ لێیان بێدەنگ دەبم.

ئەم خۆهێنان و بردنە دووروردرێژە بۆ دیاری کردنی ساڵی نووسینی یەکێک لەو قەسیدانەی کوردایەتییان تێدایە، هەرچەند بایەخیشی هەبێ لە ڕووی لێکدانەوە و ڕووناک کردنەوەی مەوزووع و هەموار کردنی ڕێگەی تۆژینەوە، دیسانەوە ئەوە نیە ئیشکالەکە یەکجارەکی بڕەوێنێتەوە. من لە لای خۆمەوە و لە جیاتی خوێنەر دەڵێم دەشێ گەلێک کەس پێی دڵنیا نەبێ و لەسەر ئەو باوەڕەی بمێنێتەوە کە شیعرەکە لە کۆیێ هۆنراوەتەوە یاخود هەر نەبێ بڵێ بەلامەوە ساغ نەبۆتەوە لێرە دانراوە یا لەوێ.

مەبەستم لەم درێژەدانە بە لێکۆڵینەوە لە یەک دوو بڕە شیعری حاجی قادر ئەوەیە بە قەناعەتەوە پێت بڵێم هانابردنە بەر دیوانی حاجی بۆ دیارخستنی ساڵی دانانی شیعرەکانی کارێکی بێسوودە، چونکە ئیمکان نیە لەو هەوڵەدا شاهیدی هێندە ڕاست و دروست پەیدا ببێ کەوا «تەزکەرەی نفوس» بۆ هەموو قەسیدەیێک ڕێک خات و ئیسپاتی ساڵی لەدایکبوونی بکا، کە دایکەکە مێشک و دڵی حاجی بێ. جگە لە کەمسوودیی هەوڵدانەکەش، نەفەسی کاری وەها هێندە درێژە مەودا و کات و دەرفەتی یەکجار فرەوانتری دەوێ لەوەی بۆ ئەم نووسینەم لواوە. سەرەڕای کەمسوودی و بێمەودایی، کێشان و پێوانەی هەموو قەسیدەیێکی گوماناوی کە بخرێتە سەر کاغەز، بارستێکی ئەوتۆ پەیدا دەکا ببێتە هۆی ئێسک قورسی نووسینەکە و وەڕەزبوونی خوێنەریش، جگە لە ئەرکی ماددی لە عادەتبەدەر.

لەبەر ئەم هۆیانەیە خۆم ناوێمە باوەشی زێدە فرەوانی شی کردنەوە و لەبەریەک هەڵوەشاندنی واتا و ڕەمز و نیگا و نیمنیگای شیعرەکانی حاجی و لە جیاتی ئەو کارە زەحمەتە هەوڵ دەدەم لە سەرچاوی دیکەی وەک تەواتور و ڕووداوی بێگومان و مێژووی ڕابەر و فەرمانی مەنتیق و ڕاگەیاندنی حاڵ بەڵگە پەیدا بکەم کە مەبەست بسەپێنێ. هەڵبەت لەو کارەدا هەمیشە ئەوەم لەبیرە کە پەیدابوونی بەڵگە لە شیعری حاجی لە ڕێگەیێکی نێزیکەدەستەوە ڕاسترین و باشترین هۆی سەپاندنی

مەبەستە، وەک ئەوەی شیعرێک بە ئاشکرا خۆی مەعلووم بکا کە لە فڵانە شوێندا گوتراوە یاخود شەکوای غەریبی جێگەی بۆ دەست نیشان بکا.. هتاد.

دەشمەوێ خوێنەر لێم بسەلمێنێ کە لێی داوا دەکەم نابێ گومانی بۆ ئەوە بڕوا من لە پێشەوە بیر و باوەڕێکی حازر و بزرم بۆ خۆم قەرار دادە کردوە و بەڵگەی بۆ ڕەچاو دەکەم وەیا بۆی دادەتاشم، بەپێچەوانە بیر و باوەڕێکی بۆی بچم بەرهەمی ئەو بەڵگە و لێکدانەوە و قسەی دەماودەم و سەرگوزەشت و خەبەر و مێژووی بێ شوبهەیە کە تێکڕایان لێیان دێ ببنە بنج بۆ قەناعەت و متمانی.

پێش هەموو هۆیێکی ئەوتۆ وەک ڕێگەی ڕاست هەنگاومان بگەیەنێ بە ئەنجامی قەناعەت بەخش، قسەی جیلی ڕابردوو و گێڕانەوەی بەسەرهات و خەبەراتە کە هیچ بەڵگەی ماددی وەیا هیچ ڕاستییێکی بێ شوبهە و سەپێنراو بەدرۆیان ناخاتەوە. گوتە کە دەگا بە ڕادەی «تواتر» ئەگەر گونجا لەگەڵ بڕیاری هۆش و ڕووداوی زانراو و داخوازی زەرف، دەبێتە بەڵگەیێک کە مرۆڤ بحەسێنێتەوە لە سەرێشەی زیهنیکاری و لێکۆڵینەوە و ئەرکی نەفەس بڕی پەردە هەڵگرتن لە سەر ڕووی نەزانراو.

جگە لەو پاداشە گەورەی حەسانەوە کە لە «تواتر»ی قەناعەت بەخشەوە بەمرۆڤ دەگا، چ مەترسی بەهەڵەچوون و سەرلێشێوانیشی تێدا نیە کە لە زێهنیکاریدا پەیدا دەبێ. تەواتور هەر دەڵێی گۆشتی بێ ئێسکە کە قسەی پێشینان لە میسالاندا پەسندی کردوە. بەڵام تا تەواتور دەگا بە پلەی سەلماندن و لە سنووری گومان لێکردن تێدەپەڕێ گەلێک مەرجی قورس و زەحمەتی پێ دەوێ کە پوختەیان ئەوە بوو تازە گوتم، واتە نابێ هیچ بەڵگەیێکی پتەو هەڵیوەشێنێ و بەدرۆی خاتەوە. هەر بۆیەیە کە وا من بەڕادەی مەرحەبا کردنم لە تەواتوری بێگومان ئامادەم گوێ بگرم لە بەڵگەی ماددی وەیا زیهنی کە گومان بخاتە سەر تەواتور. گریمان ئیمڕۆ لە تەواتورێک ڕازی بم دەشێ سبەینێ لێی بگوێزمەوە بۆ ڕایەکی نوێ کە لە سەرچاوەیێکی ڕوونتر هەڵقوڵێ و خۆی ئیسپات بکا.

لەبەر تیشکی ئەم تێبینیانەوە، تەواتورێک بە ئێمە گەیشتبێ و باسی خەباتی سیاسی و شیعری کوردپەروەرانەی حاجیمان بۆ بکا ئەوەیە کە وا حاجی دوای چوونی بۆ تورکیا کەوتۆتە سەر هەوای کوردایەتی، با بڵێم ئەوسا لە ناو پەراوێزی

«هەقپەرستی» خۆیدا ناوەڕۆکێکی تازەی پەیدا کرد کە خەبات کردنە بۆ وەدەست هێنانی مافی نەتەوایەتی کورد. لە کەس نەبیستراوە، چ ئەوانەی هاوچەرخی حاجی بوون وەک حاجی مەلا عەبدولا و ئیبراهیم حەیدەری و «حاجییە گەورە» و شێخ ڕەحیم چ ئەوانەی دەخرێنە سەر جیلی دوای حاجی و قسە لەوان دەگێڕنەوە وەک باوکم و مامم «شێخ نورالدین»، کە وا حاجی قادر تا ئەو کاتەی کۆیەی جێ هێشتوە خەباتی سیاسی کردبێ وەیا شیعری نیشتمانپەروەری هەڵبەستبێ.

نەبوونی تاکە یەک خەبەر و سەرگوزەشت و قسەی دەماودەم ئەوە ڕابگەینێ کە حاجی قادر جارێک لە جاران بە قسە یا هەڵبەست یا نووسینی پەخشان لە کۆیێ خەریکی کوردایەتی بووبێ خۆی لە خۆیدا ئیسپاتێکی سەرەتاییە بۆ ئەوە کە دواتر کەوتۆتە سەر خولیای کوردایەتی. جا ئەگەر من بمەوێ وەیا کەسێکی تر بیەوێ پێچەوانەی ئەمە داوا بکا دەبێ ئەرکی بەڵگە و سەپاندنی پێچەوانەکە بخاتە سەر ئەستۆی خۆی. بەڵگە و سەپاندنیش ئەوە نیە بگوترێ ناشێ وەیا ناچێتە عەقڵەوە خەباتی کوردایەتی نەکردبێ و هەر دەبێ مێشکی بۆ بیری نیشتمانپەروەری چووبێ و هۆی وەک ترس لە تورکان نەی هێشتوە فکر و هەڵبەستەکانی بڵاو بووبنەوە.. هتاد چونکە ئەو تەرزە قسانە چ بایەخێکیان نیە و ئەوە نین بکرێنە دووخی[51] موناقەشە.

وا من لەلای خۆمەوە دەڵێم دەشێ و دەچێتە عەقڵەوە ئەو خەباتەی نەکردبێ، لەوەش زیاتر پێ دادەگرم و دەڵێم ناشێ و ناچێتە عەقڵەوە ئەو خەباتەی کردبێ دوەجا لەو گوتەیەمدا چی کەمترم گوتوە لە گوتەکەی تر، کام بەڵگەم هەڵبواردوە کە ئەوی تر خۆی پێ ڕازاندۆتەوە، بە چ گەز و گرێیەک گوتەی من کورتتر دێنێ!!

ئەو گوتەیە بێبەڵگەی «ناشێ و ناچێتە عەقڵەوە» هەر ئەوەندەی بەدەستەوەیە بۆ سەپاندنی خۆی کە بڵێ وا دادەنێم خەباتی حاجی لە ئەستەمبۆڵ درێژەپێدانی خەباتەکەی کۆییەتی، ئەوی ناسەلمێنێ با بۆخۆی ئیسپاتی نەبوونی ئەو خەباتە بکا لە کۆیێ. وەرامی ئەم داوایە یەک و دوو و سێ نین تا بڵێی زۆرن. لەگەڵ ڕچەی نووسین پێبەپێ تێیان هەڵ دەنگوین.

[51] - دووخ واتە محور

هەبوونی شتێک لە سەردەمێکدا ڕاستەوخۆ ئیسپاتی هەبوونی ئەو شتە ناکا لە سەردەمێکی جودای کۆنتردا، وەک ئەوەی هەبوونی خۆت لە کاتی خوێندنەوەی ئەم دێڕانەدا نابێتە بەڵگە بۆ هەبوونت لە پێش سەد ساڵدا، توانای خوێندنەوەت لە کاتی ئێستادا هەر ئەوەندە دەسەپێنێ کە تۆ لە تەمەنێکدای خوێندنەوەی لێ بوەشێتەوە، ئەم توانایەت بە تەنها بۆ خۆی لەو تەمەنەت زیاتر ئیسپات ناکا.

ساغبوونەوەی هەبوونی هەڵبەستی کوردپەروەرانەی حاجی قادریش لە ئەستەمبۆڵدا ڕاستەوخۆ نابێتە بەڵگە بۆ هەبوونی ئەو هەڵبەستانە لە قۆناغێکی زووتری زۆر جودا لە عومری حاجی قادردا کە وا گردەبڕ لە قۆناغی ژیانی ئەستەمبۆڵی جوداوازە. قۆناغی ژیانی کۆیەی گردەبڕ لە هی ئەستەمبۆڵ دەترازێ و چوونی بۆ ئەستەمبۆڵ واقیعێکی تازە داهاتوو بۆ حاجی قادر دیاری دەکا بە خۆ و هەموو داخوازی و دەلالەتێکیەوە. شیعرەکان لەو واقیعە تازەیەدا دەبنە بنگە و بەڵگەی موناقەشە بۆ دۆزینەوەی سەرەتای پەیدابوونیان لە واقیعە تازەکە خۆیدا، نەک پلە و قۆناغێکی کۆنتر، کە لە کۆیەیە.

ئەم قسەیەم لێم داوا دەکا بڵێم هەر وەک کوردایەتیی حاجی لە ئەستەمبۆڵ لە خۆوە نابێتە بەڵگە بۆ بوونی کوردایەتیی حاجی لە کۆیێ، نەبوونی بەڵگە و ئیسپاتیش بۆ کوردایەتیی حاجی لە کۆیێ ئەویش خۆی لە خۆیدا و بە تەنها ئیسپاتی ئەو بوونە ناکا چونکە ئیمکان هەیە شتێک هەبێ بەڵام بوونەکەی ئیسپات نەکرێ. هەربۆیە بوو، کەمێک پێشتر، گوتم نەبوونی خەبەرێک و ئەسەرێکی خەباتی سیاسیی حاجی لە کۆیێ دەبێتە «ئیسپاتی سەرەتایی» بۆ نەبوونی ئەو خەباتە نەک ئیسپاتی «دوایەکی و یەکجارەکی» واتە «نهایی و قطعی».

با لەوەش زیاتر باوێمە سەر ئەم قسانە بۆ زەحمەتتر کردنی گەیشتنم بەو ئەنجامە کە پێی گەیشتووم لە ڕێی لێکدانەوە و بەڵگە و داخوازی مەنتیقیەوە: نەبوونی خەبەر و ئەسەری خەباتی سیاسی حاجی لە کۆیێ نەدەبوو بە ئیسپاتی سەرەتاییش ئەگەر زەرف و حاڵ و مێژووی زانراوی حاجی قادر داوای هەبوونی خەبەرێک و ئەسەرێکی نەکردبا. با بزانین چۆن؟ پێمان گەییوە حاجی لە گۆڕقەرەج خاوەن زەوی بوە.. حاجی لە کۆیێ ژیاوە و فەقێ بوە... حاجی لەگەڵ باپیرمدا چۆتە باڵەکەتی بۆ خوێندن... حاجی چۆتە کوردستانی ئێران... حاجی بەگژ شێخ نەبیدا چوە... حاجی یەخەگیری شێخ غەفوور بوە... حاجی.. حاجی... گەلێک لە ڕووپەڕەکانی ژیان و

چالاکیی حاجی تەواو و ناتەواو بە ئێمە گەییوە، بۆ دەبێ تاکە یەک وشەی قسە وەیا هەڵبەست وەیا هەڵکەوت و هەڵوەست کە سەر بگەیەنێ بە مەفهومی کوردایەتی لە حاجی قادرەوە نەگا بە ئێمە نە بە نووسین نە ئیسپاتی مەنتیق و هۆش لە سەرانسەری ئەو عومرەی کە لە کۆیە و کوردستانی ڕابواردوە؟

با جارێکی دیکەش لە خۆمەوە یارمەتی ڕەخنەگر و نەسەلمێن بدەم بۆ زەحمەتتر کردنی قەناعەت هێنان بە لێکدانەوەکەم. لە بەشی یەکەمی نووسینەکەم کاتێ کە دوام لە بارەی مێژووی کۆیێ گوتم چەند ڕاستییک هەن ئەوە دەسەپێنن کە وا کۆیێ شارەکی یەکجار کۆنە (وەک بوونی ئاوی حەمامۆک و جێگەی هەموار و نەبوونی بەرهەڵستی گەورەی هاموشۆ... هتاد) هەرچەند ناو و شۆرەتی لە مێژووشدا زۆر بەرچاو نەبێ. گوتم ئەو ڕاستییانە کە لە کۆنەوە هەن داوا دەکەن کۆیێ لە کۆنەوە هەبووبێ با بەڵگەی دیکەی وەک نووسین و شوێنەواری بەرچاویش دەست نەکەوێ. دەوجا کە من بۆ ئیسپاتی هەبوونی کۆیێ لە کۆنەوە ئیکتیفا بکەم بە بوونی ئەو ڕاستییانە کە ئیمڕۆ هەن بۆچی ئیکتیفا نەکەم بە بوونی خەباتی سیاسی حاجی لە ئەستەمبۆڵ بۆ ئیسپاتیبوونی ئەو خەباتە لە زووترەوە؟ لەو ڕووەوە جوداوازیی کۆیێ لە حاجی قادر چیە؟

ئەوەی ڕاستی بێ زۆر جوداوازیی بنجی هەن ناهێڵن قیاسی حاڵەتی حاجی بکرێ لە هی کۆیێ، لێرانەدا یەک دوەکان بە نموونە دێنینەوە:

یەکەم: چەندین شاهید هەیە لە مێژووی بێگومان ئیسپاتی ئەوە دەکەن ڕێککەوتنی وەزعی سروشتی و ستراتیجی وەک هی کۆیێ، لە کۆنەوە شاری دروست کردوە. پەیدابوونی چەندین شار بەهۆی بوونی عەوامیلی وەک ئەوانەی لە کۆیێ هەن پشتگری دەکەن لەو نەزەریەی کی بڵێ دەبێ لە کۆنەوە کۆیێ شار بووبێ. هەبوونی کۆیێ لە کۆنەوە بەر ئەو دەستوورە دەکەوێ کە لە «فقه»دا پێی دەڵێن «الاستصحاب المقلوب». هەر لەبیرمە کە لە کۆلێجی حقوق بووین بەم جۆرە تەعریفیان بۆ کردین: «الاستصحاب المقلوب هو الحكم بوجود شئ في الماضي لتحقق وجوده في الحاضر مع عدم وجود دليل لنفيه في الماضي».

واتاکەشی بە کوردی ئەمەیە « الاستصحابی مقلوب بڕیاردانە بە بوونی شتێک لە ڕابردوودا لەبەر هەبوونی ئەو شتە لە حازردا چ بەڵگەیەکیش نەبێ بۆ نەبوونی لە

ڕابردوودا» وەک ئەوەی مەعلووم بێ فڵانە خانوو لەم ڕۆژەدا هی تۆیە، ئیتر بەمەدا بڕیار دەدەین پار و پێراریش ئەو خانوە هەر هی تۆ بوە مەگەر بەڵگەیێکی سەربەخۆ ئیسپاتی ئەوە بکا ئەوسا خانوەکە هی تۆ نەبووبێ.

بەڕاستی وەزعی کۆیێ لە حوکمی ئەو « الاستصحاب»ەش بە هێزتر ڕادەگەیەنێ چونکەر هەر وەک دەلیلێک نیە بۆ نەبوونی کۆیێ لە کۆنەوە، پێویست و داخوازیش زۆرە بۆ بوونی لە کۆنەوە.

وەزعی خەباتی حاجی قادر وانیە: زەرفی ئەستەمبۆڵ کە لێی دەوەشێتەوە ببێ بە کێڵگەیێک بیری سیاسی قەومی لێی بڕوێ شتێکی تازە بوو بە نیسبەت حاجی قادەرەوە، ئەو زەرفە لە کۆیێ وجوودی نەبوو تا بڵێین دەبێ بیری سیاسی قەومی حاجی قادر لە ئەستەمبۆڵ بەردەوامبوونی هی کۆیەی بێ، هەرچەند بەڵگەشمان نەبێ بۆ سەپاندنی ئەم بەردەوامبوونە.

سەرەڕای ئەمە کە ئەستەمبۆڵ زەرفێکی تازە بوو بۆ حاجی و ئەو زەرفە تازەیە مەودا نادا قیاسی ڕابوردووی ئەو لە ڕابردووی کۆیێ بکرێ، چ کەسێکیش لە کۆیێ و غەیری کۆیێ لەو کاتەدا پەیدا نەبوو خەباتی سیاسی کردبێ لە کوردستان تا بڵێین حاجیش وەک ئەو کەسە پێویستی بە زەرفی تازە نەبوە، لەمەشدا سەرلەنوێ قیاسی ئەو لە کۆیێ دوورتر دەکەوێتەوە چونکە، وەک گوتم، مێژووی کۆن زۆر نموونەی تێدایە بۆ پەیدابوونی شار لە وەزع و هەڵکەوتی وەک هی کۆیێ.

دوەم: بە نیسبەت کۆیێ هیچ بەڵگەیێک نیە نە تەواتور (وەک ئەفسانە) نە نووسراو کە ڕابگەینێ پێش ئەوەندە سەد ساڵە یا ئەوەندە هەزار ساڵە لە شوێنی ئێستاکەی کۆیێ چ شارێک نەبوە، کەچی بە نیسبەت حاجی قادرەوە چاوگی نووسراو هەیە کە دەسنووسی خۆیەتی ڕادەگەیەنێ تا ساڵی1277ی کۆچی حاجی قادر کوردایەتی نەکردوە. چاوگەکە کتێبی «سیوطي»یە کە نووسین و پەراوێزی حاجی بەسەرەوەیە و لە زۆر شوێنی ئەو نووسین و پەراوێزانەدا بۆ بابەتی ئەوتۆ چوە پەیوەندیی نیە لەگەڵ بابەتی کتێبەکە کە «صرف و نحو»ە، بەڵکوو تاسە و هەستی حاجی دەدەنەوە: چەند جاران لە دژی چاپی عەجەم هەڵبەستی داناوە بە کوردی و فارسی و عەرەبی وەک:

1. یارب بقدر حرف سیوطي یک یک.

2. زینهار نخر کتاب چاپ عجمی
3. ایاک ان تشتري المطبوعا.

وابوه کوتومت یەخەگیری شای عەجەم بوە:

قد سمعنا من مناد مات شا
لعنه الله علیه ماتشا[52]

جارێکی دیکەش باسی هەڵاتنی سپای عەجەم دەکا لە پێش لەشکری میری سنە. لەو شوێنانەدا مرۆڤ نەفەسی خۆی دەگرێ بە چاوەنۆڕی دەرکەوتنی هەستێکی تایبەتی کوردایەتی کەچی کتێبەکە لەو ڕووەوە خامۆش دەبێ و لە جغزی «ڕق هەستان و خۆش نەویستن»دا دەمێنێتەوە کە هەستێکی نەیارە بەرانبەر مەوزووعی هەڵبەستەکان و ئاودیو نابێ بۆ ناو سنووری هەستی «ایجابی»ی کوردایەتی. بەڵام ڕق هەستانەکە بێدەلالەت نیە چونکە نیشانمان دەدا پەنجەیێک ئەو خامەیە نارەزایەی گرتوە و پێی دەنووسێ کە وا پۆڕگی نەفسی خاوەنەکەی وەک بورکانێکی بچووک خەریکە دەجۆشێ و دەخرۆشێ و هەر درزێک بدۆزێتەوە تێیدا دەتەقێتەوە.

[52]- ئەم تێهەڵپێچانەی حاجی لە شای عەجەمان، جگە لەوە کە بێحورمەتی شای عەجەم ڕادەگەیەنێ لای حاجی، سرنجیش ڕادەکێشێ بۆ بیر کردنەوە لە هۆی ڕاستەقینەی بێحورمەتیەکە ئایا شیعەیەتیی شای عەجەم بوە یاخود عەجەمایەتی؟ ساغ کردنەوەی پرسیارەکە و داشکاندنی بە لایەکدا کارێکی ئاسان نیە کە وەرامێکی سەرپێیی یەکلای بکات، بەڵام لە دیمەنی تێکڕای باری دەروون و هەستی حاجییەوە کە لە ئێمەوە دیار بێ، دوور نیە هۆییێکی ئاوێتە (مزیج)ی شیعەیەتی و عەجەمایەتی و کارە ناپەسندەکانی دەوڵەتی ئەوسای ئێران لە حاجی خۆش هێنابێ شای عەجەم بداتە بەر تیری هەڵبەست. چ سەیرم نابێتەوە لەوەدا حاجی قادر بە دیتنی زوڵم و زۆری فەرمانبەرەکانی عەجەم لە خاکی کوردستانی ئێراندا قینی نژادی و مەزهەبیی کۆ بووبێتەوە و بووبێتە ئەم لەعنەتەی سەرەتای دێڕی دوەمی هەڵبەستەکە. قسەش لەوەندە نابڕێتەوە بەڵام من بە ناچاری دەیبڕمەوە.

لە چەند جێگایەکدا شیعری عەرەبی وەردەگێڕێتە سەر فارسی و کوردی. جارێکیان لە هێنانەوەی میسال بۆ بەکارهێنانی «لولا» بەیتێکی «أبو العلاء المعري» کە لە کتێبەکەدایە وەردەگێڕێتە سەر فارسی و بە دوا ئەودا درێژە دەدا بە نووسینەکەی و دەڵێ نووسەری ئەم پەراوێزە، کە حاجی خۆیەتی، بۆ بەکار هێنانی «لولا» بەیتێکی دانا نیوە کوردی نیوە عەرەبی. ئەمانەن نموونەکان، ئەسڵ و وەرگێڕدراو. بەیتەکەی «أبو العلاء» ئەمەیە:

يذيب الرعب منه كل عضب
ولولا الغمد يمسكه لسالا

وەرگێڕانەکەی حاجیش بە فارسی ئەمەیە:

گدازانیدی بیم از او همه تیغ
نیامش گر نبستی می چکیدی

ئەمەش بەیتە فەردەکەی حاجی خۆیەتی، وەک خۆی دەینووسمەوە:

ليلى كتى بنياتى عماراتى هوى[53]
لولا له قيس عامر ينهدم

بەدوا ئەمەدا عوزر دێنێتەوە بە ڕستەیێکی عەرەبی کە وا کاتی دانانی ئەم بەیتە حاجی هێشتا عەرەبی نەزانیوە، بۆیێ فڵانە هەڵە و فیسارە غەڵەتی تێدایە.

پوختەی قسەم لەم ڕووەوە ئەوەیە حاجی وەک فەقێیەکی بزۆز لە گەڵێ شوێنی کتێبەکەدا خۆ لە باسەکانی هەڵ دەقورتێنێ و بەدەنگ دێ، بەڵام بە هیچ جۆر بێنی سیاسەت بە کوردایەتییەوە لەم نووسینانەی نایێ، تەنانەت بەشی فارسی ئەم

[53] - بە ڕێنووسی نوێی کوردی وەها دەنووسرێت «لەیلا گوتی بونیاتی عیماراتی هەوا».

نووسینانەی پترە لە کوردی. تێکڕای «تدخل»کردنی چ بە پێچەکە و خوارەکە بێ چ پاتەوپات بێ لە سەرچاوەی ئایینەوە هەڵ دەقوڵن، بەڵام سەرچاوەکە بۆ خۆی لە ناخی دڵ و دەروونێکی بڵێسەداری وەک بورکانەوە سەر هەڵدەدا.

نووسراوێکی حاجی کە وا بەسەر کتێبەکەی «سیوطي»یەوە هەیە دەبێتە شایەد بۆ گێڕانەوەی واقیع: ئایین، نارەزایی، پەرۆش، هەست، سۆز، هەژاری، غوربەت، زیرەکی، بزۆزی، بوێری.. ئەمانەی هەموو تێدان، دەبوا ئەگەر کوردایەتیش هەبێ لەگەڵ ئەمانەدا خۆ بنوێنێ، چونکە هەستی نەتەوایەتی وەک هەموو هەستەکانی خوێن کوڵین و دەروون جۆشێن و پتریش لەوان، کە پەیدا بوو موناسبەش نەبێ موناسەبە دروست دەکا بۆ خۆ نیشاندان. حاجی قادر کە لەبەر هەستیاری خۆی وەک زیل دەزرینگێتەوە لەچاو شاعیرانی تردا، تعصبیشی بۆ کوردایەتی گەیاندییە ئەو پایە بڵێ مەدحی خوا دەکەم بە کوردی تا نەڵێن بە کوردی مەدحی نەکراوە و «ئەگەر کوردێ قسەی بابی نەزانێ..» دەبوا لەناو دەیان جار کە لەگەڵ مەوزووعەکانی سیوطیدا بەدەنگ دێ جارێکیشیان کوردایەتیەکەی لێ بەدیار کەوتبا.

بەڵێ دەزانم و گوتیشم دیارنەکەوتنی شت نابێتە دەلیلی یەکجارەکی نەبوونی ئەوشتە، بەڵام کە پێویست هەبوو بۆ دیارکەوتنی و هەر دیاریش نەکەوت، ئەوسا مرۆڤ خۆشی بگرێ لە بڕیاردانی نەبوونی ئەو شتە، بەهیچ جۆرێک مافی ئەوەی نامێنێ بڵێ هەر هەیە و دەبێ هەبێ. سرنجێکیش بدە ئەو ساڵەی 1276-1277 ھ کە پەراوێزەکانی حاجی تێدا نووسراوەتەوە لەو ڕووەوە کە دەکەونە دوای ساڵەکانی فەقێیەتی حاجی قادر لە باڵەک، واتە باوەڕ و فکرەکانی ئیبنوئادەم کاری خۆیان کردبوو، ئەگەر چ کارێکیان کردبێ و چ مەوداش نەماوەتەوە گومان بۆ ئەوە بڕوا کە وا دوای 1277 حاجی قادر بەسەر فەلسەفە و بیر و باوەڕی ئیبنوئادەمدا کەوتبێ.

بەو پێیە کتێبەکەی سیوطي بەڵگەیێکی یەکجار «سلبی» بە دەستەوە دەدا لە ڕووی بوون و نەبوونی هەستی نەتەوایەتی ڕوون و ئاشکرا لای حاجی قادر تا کۆتایی 1276ی کۆچی. لەگەڵ بوونی ئەم بەڵگە گەورەیەشدا ئەگەر یەکێک هەر سوور بێ لەسەر بوونی ئەو هەستە لای حاجی دەبێ لە پەراوێزی «عەقڵ ناسەلمێنێ و دەبێ هەبووبێ و ناکرێ نەبووبێ» دەرچێ و شایەد و بەڵگەی ماددی بێنێتەوە بۆ بوونی. بەڵگەی ماددیش لەم مەیدانەدا ئاسن و چەمەنتۆ نیە، یا نووسراوە یا گوتەی

بێشوبهەیە. خۆ ئەگەر ئەو کەسە بەڵگەیێکیشی پێ پەیدا نەکرا و هەر مانیشی گرت لە داواکەی خۆی ئەوا کار لە زیهنیکاری و ئیقناع و لێکدانەوە دەردەچێ و دەبێتە حەز لێ کردن و کەیف پێ هاتن و هەوەسبازی، ئەوساش هەڵوەستی وەها لەگەڵ «موضوعیە» چ پەیوەندییێکی نامێنێ و ڕوو لە «گرێی نەرگزی» یا نەخۆشییێکی تری وەک ئەو دەکا.

خوێنەری بەڕێز دەبینێ لەو بە یەکدی گرتنی بوون و نەبوونی کۆیێ لە کۆنەوە لەگەڵ بوون و نەبوونی گیانی کوردایەتی لای حاجی لە زوێکەوە، جیاوازییێکی گەورەمان دۆزیەوە لە میانی هەردووکیاندا کە ناهێڵێ قیاسیان لەیەکدی بکرێ، لەگەڵ زانینی ئەم جیاوازییەش بۆمان ڕوون بۆوە، با بڵێم بۆ من ڕوون بۆوە، تا کۆتایی ساڵی 1276ی کۆچی چ بەڵگەییێک پەیدا نابێ ئیسپاتی بوونی خەباتی کوردایەتی بکا لای حاجی، لەگەڵ نەبوونی بەڵگەی ئیسپات بەڵگەی سەلبیشمان قسە لێ کرد کە چ گومانی لێ ناکرێ، چونکە دەسنووسی حاجی خۆیەتی. ئەگەر نووسینەکە بە خۆی و دەلالەتی سەلبییەوە هی مرۆڤێکی دیکە با نەک هی حاجی لەوانە بوو بڵێین ڕەنگە کابرا لە بیری بردبێ یاخود مەبەسێکی بوە لە نەدانی شایەدی بۆ حاجی. من ئەوەندەی لە دەسەڵاتی ماددی و زیهنی و فکریم دابێ بە خەرجی دەدەم و داومە بۆ گەیشتن بە متمانەیی لەو مەوزووعە گرنگەدا. لێرە بەپێشەوە تا ئێستا کە ئەم دێڕەی تێدا دەنووسم تاکە یەک بەڵگەم بەدەست نەکەوتوە پڕشنگێک بداتەوە و واتای «کوردایەتی» ڕاگەیەنێ لە گوتە و نووسین و هەڵوستەکانی ڕۆژانەی حاجی قادر تا کۆتایی ساڵی 1276.

قسەمان لە سەرەتاوە لەگەڵ «تواتر» بوو داخوا چیمان بۆ دەگێڕێتەوە، پێویستی ڕچەی وتووێژ کتێبەکەی سیوطي هێنا ناو پەراوێزی تەواتورەوە کە دەبوو بە جۆرێکی سەربەخۆ بکرێ بە بنگەی لێکدانەوە.

ڕاگەیاندنی «تواتر» وەک کتێبەکەی سیوطي نیە لە سنووری 1276 و1277 دا بوەستێ بەڵکوو هەموو ئەو کاتە و ڕۆژگارە دەگرێتەوە کە دەکەوێتە پێش سەفەری حاجی بۆ تورکیا، واتە ئەو چەند ساڵەش دەگرێتە ناو باوەشی خۆی کە دەکەوێتە میانی1277 و ساڵی چوونەدەری حاجی لە کۆیێ.

ئەمەی تا ئێستا لێی دواین لەبەر تیشکی جووتە بەڵگەی «قسەی دەماودەم لەگەڵ کتێبەکەی سیوطي» شەقامی ڕەوتی حاجیمان بۆ ڕووناک دەکا لە لایەن پلەی گۆڕانی نەفس و دەروونی بەرەو ئامادەبوون بۆ وەرگرتنی هەموو فکرێکی نوێ وەیا تین و تاوێکی بەرەو پێشەوە کە لە ڕۆژانی ئایندەدا شەوق و هێزیان باوێن بۆ ناو مێشک و گیانی حاجی.

سەرت سوڕ نەمێنێ لەوەدا کە گوتم چی کردمان ڕوون کردنەوەی ئامادەبوونی حاجی بوو بۆ وەرگرتنی تین و تاو و فکری بەرەوپێش لە حاڵێکدا ئێمە خەریکی ئیسپاتی ئەوە بووین کە وا حاجی بەر لە چوونی بۆ تورکیا کوردایەتی نەکردوە، واتە خەریکی کۆکردنەوەی بەڵگەی «سلبی» بووین لەو ڕەوتەدا زیاتر لە هۆیەکانی هاندەر و تەکاندەری بەرەو پێشەوە. ڕەنگە تا ڕادەیێک بە ئانقەست قسەکانی خۆم خستبێتە قالبێکی ئەوتۆ لە ڕواڵەتدا نەگونجێ لەگەڵ ناوەڕۆکەکەی تاکوو وەک ئیشکال خۆ بنوێنێ و وەرامیشی بدەمەوە. ئێمە دەمانەوێ بزانین حاجی کەی دەستی کردوە بە کوردایەتی، واتە هەوڵ دەدەین سەرەتای شتێکی سەرەتا نادیار بدۆزینەوە.

ئێمە کە لە تاریکیدا سەرەپەتێکمان بەدەستەوە بێ و نەزانین سەرەکەی تری لە کوێ دەگاتە ڕووناکی، دەبێ باڵەوباڵ پەتەکە هەڵکەینەوە و هەنگاو بە هەنگاو لەگەڵی بڕۆین تا دەگەینە سەرەکەی تری. هەرچەند هەنگاوەکانمان لە سەرەتاوە دووریش بن لە ڕووناکی هەر ئەوانن بە ڕووناکیەکەمان دەگەیەنن. بۆ دۆزینەوەی سەرەتای دەست پێکردنی حاجیش بە خەباتی سیاسی هەر دەبێ کارێکی وا بکەین کە لەگەڵ پەتەکەدا کردمان واتە هەموو ئەو ڕۆژگارانەی حاجی هەڵکەینەوە کە کوردایەتییان تێدا نیە تاکوو سەربە ڕۆژگارێکەوە دەبێین کە کوردایەتی تێدا دەدۆزینەوە. هەڵکردنەوەی ڕۆژگارەکە و هەڵێنانی هەنگاوەکان لە سەرەتاوە وەک ڕواڵەتێکی «سلبی» خۆ دەنوێنن چونکە بەرهەمەکەیان، جارێ، کوتومت «نیە.. نیە» یە، بەڵام بەڕاستی خۆیان تاکە ڕێگەن بەرەو ئەنجامێکی «ایجابی».

سەرەتای دەست پێ کردنی حاجی بە کوردایەتی وەک سەرەتای جەنگی جیهانی وەیا ڕۆژی 11ی ئەیلوول نیە مێژووی زانراوی هەبێ، بۆیەیە دۆزینەوە و ساغ کردنەوەی ناچارمان دەکا کە هەموو قۆناغێکی ژیانی حاجی بپشکنینەوە و تێوەی ڕامێنین بەڵکوو بزانین بەپێی ڕادەی گەیشتن و پوختەبوون کام قۆناغیان دەشێ دایکی ئەم بەچکە تازەبووەی فەلسەفەی کوردایەتییە بێ. ڕواڵەتی «سلبی»

نەگەیشتن و پوختە نەبوونی چەندین قۆناغی ژیانی دەمانگەیێنێی بە «ایجاب»ی ڕوودانی هاتنە دونیای بەچکەکە لە قۆناغێکی خاوەن ژان و ژوارێکی تایبەتیدا.

لە گوێرەی بۆ لوانی محدودی لێکۆڵینەوە و بەراوردی کردن بەهۆی کەمبوونی سەرچاوەی زانینی بێ شوبهەوە، پێ بەپێی هەنگاونانی حاجی هەر جارە هەوڵمان داوە پسوولەی «دور و تسلیم» لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێک لە چنگی ڕووداو و دەلالەتی خەبەرات و گوتە و کردەوەی حاجی دەربێنین. شوێن پێی ئەو هەنگاوانە جڵەوی خامەی ڕاکێشا لە گۆڕقەرەجەوە بۆ کۆیێ و گوزەری پێ کرد لە دەوری فەقێیەتی و کژی «مستعدی»، ئیمجار گەشتە دوورودرێژەکەی باڵەکەتی و کوردستانی پێ کرد تاکوو بەسەر پردی کتێبەکەی «سیوطي»دا پەڕاندیەوە، بە موقتی، بۆ کۆتایی ساڵی 1276.

لە پاش ئەم ساڵەی زۆرجار گوترایەوەی 1276ەوە تا ئەو ساڵەی کە تێیدا ئەلۆەدای دواجاری لە کۆیە و کوردستان کرد، ماوەیێکی چەند ساڵی هەیە دەمێنێتەوە بۆ ئیحتیمالی ئەوە کە حاجی شیعری سیاسی کوردپەروەرانەی تێدا گوتبن. وەک گوتم «تواتر» لەویش بۆتەوە کە هیچ گوتە و کردەیێکی سەریحی کوردایەتی تێدا نیە، بەڵام ئاخۆ ڕاگەیاندنی حاڵ و داخوازی زەرفی ژیانی حاجیش پشگیری گوتەی دەماودەم دەکا بۆ ئەو ماوەیە هەر وەکوو پشتگیری کرد لە ماوەی پێشووتر؟

بەر لەوە بکەوینە سەر ساغ کردنەوەی ئەم لایەنەی بوون و نەبوونی کوردایەتی، جارێ با بزانین ماوەکە خۆی چەندە! بۆ ئەم پرسیارەش وەک زۆرینەی پرسیارەکان دەربارەی چەندوچۆنی ژیانی حاجی لەو وەرامە بەولاوە دەست ناکەوێ کە کاری گەز و تەرازووی زیهنی دەیداتەوە. هەر دوو سنووری ئەم لا و ئەو لای ماوەکە، واتە کۆتاییەکەی 1276 و سەرەتای سەفەری بۆ تورکیا لە تاریکی دان.

هۆی تاریکبوونی کۆتایی ساڵی 1276 ئەمەیە:

حاجی لە ڕووپەڕەی 121ی کتێبەکەی «سیوطي»دا ئەم بەیتەی کردوە بە کۆتایی پەراوێزێک لە دەسنووسەکانی خۆی:

شبی سه شنبه بیست از ماه اخر
هزار و دوصد و هفتاد و شش در

هاتنی ئەمرازی «در» لە کۆتایی بەیتەکە، ئەویش بۆ خۆی دەمەتەقە هەڵدەگرێ و پرسیار دێنێتە پێشمان کە وا بۆچی حاجی بەپێی دەستووری زمانی فارسی ئەمرازەکەی نەخستبێتە پێش «هزار و سیصد و هفتاد و شش» ـەوە و کردی بە قافیە؟ ئایا ئەمە بەڕاستی ئەمرازە، واتە ئەو «حرف جر»ی عەرەبی یە کە «من، فی» و لە کوردیدا «لە»یە یاخود ئەمراز نیە و «اسم - ناو»ە بە واتای «دەرگە - باب» ئەوساش واتای نیوە دێڕەکە دەبێتە «هزار و سی صد و هفتاد و شش در - دەرگە» کە هەر ساڵەی تێدا بە دەرگەیێک دانرابێ؟ من لەو کەشمەکەشە لادەدەم و خۆم و خوێنەری پێوە خەریک ناکەم چونکە حاجی هەرکامێک لەمانە یا غەیری ئەمانەی مەبەست بووبێ ساڵەکە وەک خۆی دەمێنێتەوە و مانگی کۆتاییش ئەو مانگە دەبێ کە هەیە. ئیشکال لە شتێکی ترەوە هەڵدەستێ کە تا ئێستا ڕەوانەوەی بۆ نیە، ڕەنگە هەر نەشێ یاخود زۆر زەحمەت بێ.

ئیشکال لەوە دایە، حاجی تا ڕووپەڕەی 144ی کتێبەکە لە پەراوێزاندا نووسینی هەیە، دەوجا دەبێ ئەم 23 ڕووپەڕەیەی لە کۆتایی ساڵی 1276ـەوە بە چەند هەفتە و مانگ بڕی بێ و بۆ ناو جەرگەی 1277 چەندی هەڵچنیبێ؟ لێرەدا بۆ خۆت لێتەوە دیارە لە تەخمین بەولاوە چمان بە دەستەوە نیە. ئەوپەڕی ئیمکانمان ئەوەیە لە فەقێیان بپرسین ئاخۆ، بەعادەت، خوێندنی 23 لاپەڕەی کتێبی سیوطي چەند کاتی دەوێ!

ویستم لە کوێرەڕێیەکی ناو حاشیەکانی «حاجی»یەوە ماوەی بڕینی ئەم 23 لاپەڕەیە لێک دەمەوە بەڵام داخەکەم لێی بە مراد نەگەیشتم. کوێرەڕێیەکەش ئەمەیە:

حاجی لە ڕووپەڕە 79 ئەم فەردەی نووسیوە کە لێرە بەپێشەوەش باسم کرد:

قد سمعنا من مناد مات شا
لعنة الله علیه ماتشا

زاهیری وا پێ دەچێ مەرگی شاهێکی عەجەمی مەبەست بێ نەک شاهی شەترەنج یاخود شاهێکی خەیاڵی شاعیر بە نیازی «جناس» و وشەسازی. ئەگەر ئەمە وابا

دەمان توانی بزانین لە چ وەخت و ساڵێک حاجی ئەم فەردەی لە ڕووپەڕە 79 دا نووسیوەتەوە و کەنگین خەریکی خوێندنی ئەم ڕووپەڕیە بوە چونکە مەرگی شاهەکانی قاجاری هەمووی زانراوە و تۆمار کراوە. دەجا کە بۆمان لێک درابایەوە حاجی بە چەند کات ماوەی میانی ڕووپەڕە 79 و ڕووپەڕە 121ی بڕیوە کە دەکاتە 42 ڕووپەڕە، دەمان توانی لە ڕێی قیاسەوە بزانین لە 121 تا 144 بە چەند کات تێی پەڕاندوە. بەڵام دەرکەوت نێزیکترین مەرگی شاهێکی عەجەم 10 ساڵان دەکەوێتە پێش ئەم ساڵەی 1276ـەوە. خۆ بە وڕێنەشدا تێناپەڕێ حاجی 42 ڕووپەڕەی بەینی 79 و 121 ی بە دە ساڵان تەواو کردبێ.

گریمان بۆ ئەوەش بچین کە وا ناگزووری و هەژاری دە ساڵان «حاجی»یان بەو 42 ڕووپەڕەوە خەریک کردوە، ئەوسا فەردەکە چ دەلالەتێکی نامێنێ چونکە قیاس هەڵناگرێ. جگە لەمە واقیعی زانراو لە ژیانی حاجیدا ئەو فەرز دانانە بە درۆ دەخاتەوە لەو ڕووەوە کە وا حاجی دە ساڵ پێش 1276 هێشتا نەچوە بۆ جێگایەک لە قەلەمڕەوی حکوومەتی ئێران بووبێ تا ئەگەر «شاهـ»مرد جاڕچی جاڕی بۆ ڕاهێڵێ و حاجی لێی ببێ و بەو بەیتە دڵی خۆی بحەسێنێتەوە.

کەواتە تا ئێستا گەزوگرێیەکمان بە دەستەوە نیە ئەو ماوەی پێ بپێوین و بزانین تا چەندی ساڵی 1277، حاجی خەریکی ئەم 23 لاپەڕەیەی سیوطي بوە. بەڵام دەتوانین بڵێین بەپێی ئەوە کە حاجی زۆر خەریک بوە بە نووسینەوەی حاشیە لەسەر ئەغڵەب لاپەڕەکان وا دیارە خێرایی لە خوێندنەکەی نەکردبێ و زیاتر مەبەستی ئەنجنینی ماددەکە بووبێ کەواتە دەشێ بڵێین ئەو 23 لاپەڕەیەی بە 3 مانگێک وەیا زیاتریش تەواو کردبێ.

با لەو 3 مانگەش دەست هەڵگرین و وادانێین لەگەڵ تەواوبوونی ساڵەکەی 1276 حاجی ئەو 23 ڕووپەڕەی تەواو کردوە، لەمەشدا یارمەتی ئەوکەسانە دەدەین کە دەڵێن دەبێ حاجی لە کۆیەوە دەستی بە خەباتی سیاسی کردبێ چونکە هەتاکوو لە مەودای شایەدی کتێبەکەی سیوطي کەم کەینەوە مەودای ئیحتیمالی کوردایەتییەکە درێژتر دەبێتەوە.

لە پاش ئەم چاوپۆشینەمان، لە نوێ، گرێیەکی تری بێ ڕەواندنەوەمان دێتە بەر: ئاخۆ حاجی قادر کە وەستا لە نووسینەوەی حەشییان بەسەر «سیوطي»یەوە وازی

له فەقێیەتی هێنا و گەڕایەوە بۆ کۆیێ؟ یاخود وازی له «سیوطي» هێنا بۆ کتێبێکی تر و بەردەوام بوو لەسەر خوێندن؟ که خوێندنی بەردەوام کرد ئایا هەر مایەوە له کوردستانی ئێران؟ چەند مایەوە؟ کەی هاتەوە کۆیێ؟

وەرامی ئەم پرسیارانه ئەگەر ئەوە بێ که وا حاجی دوای کتێبەکەی «سیوطي» بەینێکی تریش له کوردستانی ئێران مایەوە بۆ خوێندن، بایی ئەو مانەوەیە له ئیحتیمالی کوردایەتییەکەی کەم دەبێتەوە چونکە چ ئیمکانێک نیە و له هیچ زارێک نەبیستراوە و تاکە دەلیلێکیش پەیدا نابێ که وا حاجی قادر لەو غوربەتە و بێکەسییەدا له ناکاو کەوتبێتە سەر باری فکر و خەباتی سیاسییەوە. که دەڵێم «له ناکاو» بۆیەیە چونکە کتێبەکەی سیوطي چ پێشەکییێکی کوردایەتی بەدەستەوە نادا چاوەنۆڕی فکر و خەباتێکی سیاسی لێ بکرێ، که خەباتێک له «حاجی»یەوە ڕووی دابێ دەبێ له ناکاو بووبێ.

هەرچەند ساغ کردنەوەی ئەو پرسیارانه له گۆشەنیگای زانینی سەرگوزەشتی حاجی قادرەوە تا بڵێی کارێکی بەنرخ و بایەخدارە، بەڵام لەبەر ئەوە که وا لێرەدا دەرفەتی ساغ کردنەوە و لێکۆڵینەوەمان چەنگ ناکەوێ، بە ناچاری وازیان لێ دێنین بۆ دەرفەتێک که دواڕۆژ پێکی بێنێ وەیا ئەدیبەکانی کوردستانی ئێران پرسیارەکان ساغ کەنەوە. ئێمەش ئێستا هەر ئەوەمان بۆ دەمێنێتەوە بکەوینەوە سەر ڕێبازی ئەسڵیمان.

لەم ڕێبازەدا سەرلەنوێ یارمەتی ئەو کەسە دەدەم که حەز دەکا حاجی قادر له زووەوە کوردایەتی کردبێ، وا دادەنێم حاجی له سەرەتایساڵی 1277ەوە گەڕابێتەوە بۆ کۆیێ و لەوێ مابێتەوە تا سەفەری کردوە بۆ ئەستەمبوڵ، بەمەشدا ماوەی ئیحتیمال درێژتر دەکەینەوە بۆ ئەو خەباتە سیاسییە چونکە وەک گوتم له کوردستانی ئێران چ ئیمکانێکی خەباتی سیاسی نەبوە بۆ حاجی. لێرە بەدواوە بۆ خوێنەری ڕوون دەکەمەوە بەمەدا ماوەییێکی له دوو ساڵ زیاتر دەبەخشم بەو ئیحتیماله چونکە گوتەیێک هەیە بۆ ئەوە حاجی تا 1279 له کوردستانی ئێران مابێتەوە: من که دەڵێم با وا دانێین حاجی له سەرەتای 1277ەوە گەڕاوەتەوە کۆیێ لەم گوتەیە و دوو ساڵەکەش واز دێنم. پاش چەند لاپەڕەیێکی تر دەگەینە باسی ئەم گوتەیە.

ئەمە لە بارەی تاریکەیی سنووری کۆتایی 1276 و سەرەتای 1277. ئیمجار تاریکایی سنووری کۆتایی مانەوەی حاجی لە کۆیێ دێتە پێش: حاجی قادرکەی کۆیەی جێ هێشت بەرەو تورکیا؟

بۆ وەرامی ئەم پرسیارەش مێژووی بەستەزمان و گوتەی دەماودەمی کەڕ و لاڵ «دەمی بەسراو وەکوو فندق و بادام» و هیچکامیان ورتەیان لێوە نایێ.

هەر هێندەمان پێ دەکرێ بۆ زانینی سەرەتای ئەم ڕووداوە کە گردەبڕ ژیانی حاجی دەکا بە دوو کەرتی لەیەکتر کشایەوە وەک دوولای دەمی مەقەسی کرایەوە، بێین و بە زیهنیکاری خەریکی دەرهێنانی واتای مەتەڵی زەحمەت و هەڵێنانی مەعەمما و لوغزی تەماوی بین. چمان بە دەستەوەیە ساڵی سەفەری حاجیمان بۆ ڕوون کاتەوە؟ تا ئەمن زانیبێتم چش!! کە دەڵێم چش مەبەستم شتی وایە نوقتەیێک لەسەر پیتێک دانێ... برۆ بۆ ساڵێک هەڵتەکێنێ.. وەک کێلەڕێی سەر شەقامان (علامە مرور) پەنجە بۆ لایێک درێژ کا.

لەوە زیاتر کە لە گوتارەکەی «کەیفی جوانڕۆیی»دا باسم کردوە و لە دەفتەری کوردەواریدا بڵاوبۆتەوە، تا ئێستا چ مەعلووماتێکی تر پەیدا نەبوە، با بڵێم لای من پەیدا نەبوە، ساڵی سەفەرەکەی حاجیمان بۆ دیار خات. لە گوتارەکەدا ئەم ڕاستییانە ساغ کراونەوە:

1) حاجی و کەیفی لە کۆیێ ڕەفیقی یەکتر بوون.
2) کەیفی لە 1289 لە کۆیێ بوە بە بەڵگەی ئەوە کە لەو ساڵەدا مەرسیەی داناوە بۆ مردنی خێزانی مەلاعەبدوڵا، بەڵام نازاندرێ بەر لە 1280 کەی هاتوە بۆ کۆیێ.
3) کەیفی لە ساڵی 1286ەوە کۆیەی جێ هێشتوە. بەڵگەی ئەمەشیان لەوەڕا دەرکەوت کە حاجی مەلا عەبدوڵا گوتوەتی «لە 1288 کە کەیفیم دیتەوە لە حەڵەب دوو ساڵی تەواو بوو نەمدیبوو».
4) حاجی قادر بەر لە کەیفی سەفەری کردوە. لە گوتارەکەدا بە جۆری «تقریب» ماوەی بەینی سەفەری کەیفی و حاجی باس کراوە لێرەدا شتێکی تریشی دەخەمە سەر.

تەواتور هەیە کە حاجی زووتر ڕۆییوە و لەمەشدا گومان نیە، بەڵام لەو دواییەدا قسەیێکی مامم بیر کەوتەوە کە دەیگوت حاجی قادر بەینێک بوو چووبوە ئەستەمبۆڵ کە کەیفی ڕۆیی، مەبەسیشی لە وشەی «بەینێک» چەند ساڵێک بوو. بەو پێیە و لە ڕێی «مەسڵەتی - هدنە» کردن لەگەڵ نەزانینی ڕاستیدا دەبێ ساڵێک دەست نیشان کەین لە میانی1277 و 1286 دا.

دیسان بۆ ئەوەی یارمەتی ئەو ڕایە باس کراوە بدەین لەو ساڵانە 5-6 ساڵێکی بدەینە «احتمال»ەکە و 3-4 ساڵانیش بدەینە تەواتور و قسەی مامم و لێکدانەوەی ناو گوتارەکەی «کەیفی جوانڕۆیی». کەواتە با بڵێین حاجی لە 1282، 1283 کۆیەی جێ هێشت. بزانین ئاخۆ ئیمکان هەیە لەو 5-6 ساڵانەدا زەرفی خەباتی سیاسی بۆ حاجی پەیدا بووبێ؟

خەریکبوون بەو تۆژینەوەیە هەر وەک لایەنێکی زێدە گرنگی ژیانی «معنوی»ی حاجیمان بۆ ڕووناک دەکاتەوە. ڕووپەڕییێکی ژیانی ماددی حاجیشمان بۆ دەخوێنێتەوە لە هەوڵ و تەقەللای گوزەران و سەغڵەتی بە یەک کەوتنەوەی لەگەڵ ناحەزانی. ڕەنگە سوودی وردە مەعلووماتی سەربە کۆمەڵایەتی و جۆری ڕابواردنی ئەو ڕۆژگارەشمان پێ ڕابگەیەنێ.

حاجی کە گەڕاوەتەوە بۆ کۆیێ چەند ساڵێک بوە لێی دوور کەوتۆتەوە. وەک لێرە بەپێشەوە باسم کردوە، کە سەفەرەکەی بۆ باڵەکایەتی لە 1270 وەیا 1271 ەوە دەستی پی کردبێ و لە 1277 کۆتایی هاتبێ شەش حەوت ساڵێکی بەلای کەمەوە خایاندوە. چ مەعلوومیش نیە لەو ماوەیەدا هیچ جارێکیان سەردانی کۆیەی کردبێ. بەلای منەوە هیچ هۆیێک نیە حاجی ناچار کا زەحمەت و ئەرکی سەفەرێکی دوورودرێژ لە کوردستانی ئێرانەوە بۆ کۆیێ بچێژێ و سەرلەنوێ زەحمەت و ئەرکەکە دووبارە کاتەوە تا دەچێتەوە ئێران. ئەوسا نە بابی هەبوە نە دایکی ماوە و منداڵی لەدوا بەجێ ماوە، خزمانی گۆڕقەرەجیشی کە خۆشیویستوون لە کۆیەوە خۆشیویستوون، لە نێویاندا نەژیاوە تا بڵێین خۆشویستنێکی بێ ئەندازە هەبوە لە بەینیاندا پێویست بکا لە ئێرانەوە بگەڕێتەوە وڵاتی کۆیێ بۆ چەند ڕۆژێکی دیدەنی کردنیان تا ئاگرەکەی هەناوی دادەمرکێنێ و دەگەڕێتەوە کوردستانی ئێران.

جگە لەم لێکدانەوەیە، ئەو سۆزی غەریبی کە چوارینەی حاشیەیێکی سەر کتێبەکەی سیوطي ڕایگەیاند «یارب بکرم بجای طاعت از من..»[54] لێرە بە دواوەش هەمان سۆز لە قەسیدەکەی مەدحی ئەمین ئاغادا هەستی پێ دەکەین وامان تێ دەگەیەنێ کە سۆزی سەفەرێکی دوورودرێژی بێپشوو بێ و دیدەنی خزم و دۆستانی تێدا نەکرابێ.

من وام دێتە بەر هەست و زانین کەوا حاجی قادر هەروەک لە ئەستەمبۆڵەوە هیچ جاران سەردانێکی کۆیەی نەکردوە لە گەشتەکەی فەقێیەتیشی ئەو سەردانەی نەکردبێ. لە هەر دوو حاڵدا بێ ماڵ و منداڵی و بێ پەیوەندی ماددی بەهێز نەفەسی سەفەرەکەی درێژ کردۆتەوە بێ بڕانەوە و پچڕانەوەی ناوناوە کە سەردانی ناچاری بە مرۆڤی دەکا.

چەند جارێک ناوی ئەم قەسیدەیەی مەدحی ئەمین ئاغامان هێنا، هەر جارە لە مناسبەیێکی جودادا، ئێستا بۆ دواجار لێی دەدوێین و ئەوەندەی بۆمان بکرێ سوود لە ڕاگەیاندنەکانی وەردەگرین. پێشتر بەڵێنماندا کات و زەرفی ئەم قەسیدەیە ساغ کەینەوە و دەسەڵاتی شیعری حاجیش لەو قۆناغەدا ڕوون کەینەوە. جارێ با لە پێشەوە شیعرەکە بنووسین ئەوجا لێی بدوێین:

ئەی «محمد» وەی «امین الدولە» ئیمڕۆ کۆیی تۆ
جەنەتێکە کەوتە دۆزەخ هەرچی لێی دوور کەوتەوە

مودەتێکە[55] دەربەدەر کردەی وڵاتی غوربەتم
بەندە یادی ئاستان بۆسی ئەتۆی کرد هاتەوە

چونکە «تحفە» لازمە هەرکەس لە غوربەت بێتەوە
بەم دوو فەردە من قەزای سەد گۆنە «تحفە»م کردەوە

قاوەچی بەزمی ئەتۆ دونیایە سینی ئاسمان
ئافتابی زەرفە فنجانی مەهە قاوەی شەوە

---

[54] - لە بەشی یەکەمدا بڵاوکراویەوە.

[55] - لە هەندێ نوسخەدا «مودەیێکە» نووسراوە.

ئەو شەوە بۆ هەر کەسێ دونیا بکاتە ڕۆژی ڕوون
شەو لە «خطە»ی عومری ئەو عەنقایە دەربانی خەوە

بەیتەکان بۆ خۆیان هاواریانە لە دەست غەریبی بێڕەحم و دەربەدەریی دوورودرێژ و سۆزی یاد کردنەوە و ئارەزۆی گەڕانەوە و دیداری وڵات. تۆ بڵێی ئەم سەفەرە دوورودرێژە و پڕسۆز و غوربەتیەی کەی کردبێ؟

لە هەموو عومری حاجیدا تەنها یەک گەشتی وا دوورودرێژ هەیە بەر ڕۆژگاری ئەمین ئاغا بکەوێ، ئەویش گەشتەکەی خوێندنیەتی لە باڵەکەتی و کوردستانی ئێران. بۆ ئیسپاتی ئەم لایەنە بەڵگەی بێ دەمەتەقەی ئەوتۆ هەیە کە هیچ تێبینیەک و ڕەخنەیێک بەرانبەری ناوەستێ. پێش ئەم سەفەرەی بۆ باڵەک و کوردستانی ئێران هیچ ماوەیێک نیە لە ژیانی حاجی قادر و خوێندنیدا سەفەرێکی دیکەی دوورودرێژی تێدا کردبێ و گەڕابێتەوە کۆیێ بۆ مەدحی ئەمین ئاغا. گریمان لە تەمەنی حاجیدا ماوەی وەها بدۆزینەوە، کە نادۆزرێتەوە، ئەمین ئاغا بۆ خۆی ئەوە نەبوە زووتر مەدحی بکرێ و کۆیێ بە هی ئەو دانرێ و «ئیمرۆ کۆیی تۆ»ی بۆ بگوترێ چونکە ئەوسا منداڵ بوە و هێشتا زۆری ماوە جێی باوکی بگرێتەوە و بە گەورە و خاوەنی کۆیێ حیساب بکرێ. لە منداڵیش واز بێنە، تا حاجی بەکرئاغا مابێ بەو هەموو گەورەیی و شۆرەت و شەخسیەتی خۆیەوە چۆن کوڕێکی مێردمنداڵەی ئەو بە گەورەی هەموو کۆیێ ناو دەبرێ؟

گومان لەوەدا نیە ئەم بڕە شیعرە پێش مەرگی حاجی بەکرئاغا لە 1270 دا نەگوتراوە. ئەو ئیحتیمالەش نیە بگوترێ ڕەنگە لە دەمی مەرگی حاجی بەکرئاغادا، حاجی قادر بەینێک بووبێ لە کۆیێ دوور کەوتبێتەوە و دوای مەرگی هاتبێتەوە کۆیێ و مەدحی ئەمین ئاغای کردبێ چونکە پێشتر (لە بەشی یەکەمی ئەم نووسینەدا) زانیمان حاجی قادر خۆی شیعری سەر کێلەقەبری حاجی بەکرئاغای داناوە، واتە لە دەمی مەرگیدا لە کۆیێ بوە. کەواتە حاجی قادر پێشساڵی 1270 کە ساڵی مردنی حاجی بەکرئاغایە ئەم شیعرەی نەگوتوە.

لە سەرەتای نووسینی ئەم بەشەی دوەمەدا مەعلوومان کرد کە حاجی لە پاش مەرگی حاجی بەکرئاغا گەشتەکەی دەست پێ کردوە و بەلای کەمەوە تا کۆتایی

1277ی خایاند دوای گەڕانەوەی حاجیش بۆ کۆیێ لە ساڵی 1277دا تا ئەو ساڵەی کۆیەی جێ هێشت ئەو ماوەیە نیە سەرلەنوێ گەشتێکی دوورودرێژی تێدا کردبێ. کە بێی و ماوەی گەشتێکی دوورودرێژ لەو چەند ساڵەیە داشکێنی هێندەی لێ نامێنێتەوە بایی ئەو کەینوبەینەی دوشمنایەتی میانی حاجی و شێخ نەبی ماویلی بکا کە دەزانین دوشمنایەتییێکی تووڵانی بوە. ئەوەی ڕاستی بێ ماوەش هەبێ، کە نیە، ناچێتە عەقڵەوە بەدوا سەفەرێکی حەفت ساڵیدا حاجی سەفەرێکی تازەی چەند ساڵی بکا، هەمووی لە غەریبی و بە فەقیری.

کەواتە بە نیسبەت هەموو ڕۆژگاری حاجی لە کوردستاندا تەنها ئەو زەرفەی دوای گەڕانەوەی لە باڵەکەتی و کوردستانی ئێران هەیە کە بگونجێ بۆ هەڵبەستنی ئەم مەدحە. بە زاراوەی عەرەبی «دلالة الحصر» هەیە بۆ ئیسپات کردنی ئەوەی تازە لە گوتنی بوومەوە.

دەمێنێتەوە بگوترێ حاجی لە ئەستەمبۆڵەوە ئەم هەڵبەستەی ناردوە بۆ کۆیێ وەک لە لاپەڕە 57ی دیوانەکەی حاجی، چاپی هەولێر، نووسراوە و لەوەدا بیر و باوەڕی خەلقی تریش دەڵێتەوە. بە شەرمەوە دەڵێم ئەم گوتەیە وەک ئەو گوتە مەشهوورەیە کە دەڵێ «دال دوو ژێر د، اذا قوقب» لە حینجەیی کردنی وشەدا بەپێی دەستووری خوێندنی کۆن کە پیتی کۆتایی وشە «دال دو ژێر د» بێ واتە دالێکی «تنوین - دار» ی مەکسوور بێ چۆن ئیمکان هەیە ئەم پیتە ببێتە دوا پیتی وشەی «قوقب» کە پیتی «ب»ی مەفتووحە؟ حاجیش لە شیعرەکەدا بانگ ڕادێڵێ، نەک جارێک بەڵکوو دوو جار و سێ جاریش، کە وا لە غەریبی گەڕاوەتەوە بۆ کۆیێ و دەبوو بە دەستووری سەفەرکردان «تحفە» و دیاری پێ با، دەزانین هێندەش دەستکورت بوە تاقەتی دیاریانی نەبوە، بۆیە بە دوو بەیتی کۆتایی قەسیدەکە قەزای سەد جۆرە دیاریانی کردۆتەوە..

وا من دەڵێم ئەو دوو بەیتە سەد ئەوەندەی کۆشک و تەلارەکەی ئەمین ئاغا کە داریشی لەسەر بەردی نەماوە پارێزگاری ناو و شەخسییەتی ئەمین ئاغای کرد نەک هەر جێی دوو کیلۆ تووتنی بێشەما وەیا دوو تەسبێحی قەزوانی ئەبلەقی بۆ حاجی و ئەمین ئاغا گرتەوە، خۆ دەشزانین حاجی بە بەریەوە نەبوە لەو جۆرە «تحفە»یە زیاتر بکا بە دیاری گەڕانەوە لە سەفەر بۆ ئەمینئاغا یا یەکێکی تر. وەی باوانم حاجی چ بەخشندەیێکی! لە گەنجینەی غەیبەوە شەوچراغی نەمری دێنی و

دەیکەیە نیشانەی جاویدان بەسەر سینەی دۆستی وەفادارتەوە، چاوی مێژووش فرمێسکی تێدا قەتیس دەمێنێ بۆ ڕووتی و هەژاری و ئاوارەییت.

نازانم چۆن لەگەڵ ئاشکرایی واتای شیعرەکان گومان بۆ ئەوە چوە کە وا حاجی لە ئەستەمبۆڵەوەی هەناردبن. هێشتان لەبارتر بوو بگوترابا حاجی بۆ خۆی جارێکیان لە ئەستەمبۆڵەوە گەڕاوەتەوە کۆیێ و ئەو «تحفه»ی پێشکەش بە ئەمین ئاغا کردوە هەرچەند دەشزانین حاجی هەرگیز نەگەڕاوەتەوە نە بۆ کۆیێ و نە جێگەیێکی تری کوردستانی ژێرروو.

پوختەی قسە ئەمەیە، تاکە یەک زەرفی گونجاو هەبێ لە هەموو ژیانی حاجی قادردا بۆ ئەم قەسیدەیە دەست بدا ئەم زەرف و کاتەی دوای گەشتە دوورودرێژەکەی باڵەکەتی و کوردستانی ئێرانە. نە لەپێش ئەودا و نە لە دواتردا چ مەودا و دەرفەتێک پەیدا نابێ و جێی بۆ ناکرێتەوە. نەسەلماندنی ئەم ڕاستییە وەک ئەوەیە نەسەلمێنی کە شیعرەکان هی حاجی قادر بن.

ئەم برە شیعرە، کە لێرە بەپێشەوە گوتمان وەک غەزەلەکەی «هودهودی دڵ»ی نالی دەبێتە کێلەڕێی سەرشەقام (علامة طريق)، بە ئاشکرا قۆناغی شاعیریەتی حاجی دوای خوێندنی فەقێیەتی لە باڵەک و کوردستانی ئێران دیار دەخەن، بۆ کەسێکیش بیەوێ لیستەی زەمەنی دانێ بۆ شیعرەکانی حاجی ئەم برە شیعرە هەم جێی خۆی کردۆتەوە لەناو لیستەکەدا هەم لەوانەیە جێی هەندێ شیعری تریش بکاتەوە وەک مەدحەکەی کابرای تەقتەقی. هێندە هەیە ناسینەوەی کاتی دانانی شیعرێکی تر لە ڕێی بەراورد کردنی لەگەڵ ئەم شیعرەدا کارێکی ئاسان نیە، تا بڵێی ورد و زەحمەتە، ئەنجامەکەشی لە دەمەتەقە و سەلماندن ڕزگار نابێ.

جگە لە شەکوای غەریبی و دەست نیشان کردنی کاتی هەڵبەستنیان، ئەم چەند بەیتە مەبەستێکی نهێنێ دەروونی حاجیش بەدەستەوە دەدەن، بەڵام بە شێوەیێکی هێندە خامۆش و بێ تەقە و هەرا، تاکوو گوێ ڕانەگری بەسەر هەناسەی شیعرەکاندا و هەموو هەست و زانینت نەکەی بە هێزی بیستن، خورپەی ئەو مەبەسە نابیەیت: حاجی بە هۆی ئەم شیعرانەوە، سەرەڕای قەزا کردنەوەی «سەد کۆنە تحفە»، لە ڕێی بەکارهێنانی هونەر و دەسەڵاتێکی ئەدیبانەی بێهەمتا لە هۆندنەوەییاندا پایەیێکی «معنوی»ی کۆمەڵایەتی بێگومان و چەسپاوی بۆ خۆی

دروست کردوە لە ڕیزی پیاوانی هەرە پێشەوەی ئەو سەردەمەی کۆیەدا. با بزانین چۆن؟

گوتمان حاجی قادر بەلای کەمەوە حەفت ساڵێک بوو کۆیەی جێ هێشتبوو. بێگومان پایە و ڕێزی حەفت ساڵ لەمەوپێشی کە لە سەر تاکە بنجی شەخسییەت و هونەر هەڵستابوو و چ پاڵپشتێکی نەبوو لە دەسەڵات و ڕەوتی دنیایی وەک سامان و جێگە و ڕێگە و دیوەخان و مڵک و ماڵ، کەموزۆر شلۆقاوە و کز بۆتەوە، ئەگەر نەڵێم لە دڵاندا تارمایی فەرامۆش کردنی بەسەردا هاتوە. بەو بۆنەوە پێویستی زۆری بوە بە چەسپاندنەوە، بەتایبەتی چونکی دوای دوور کەوتنەوە و بزربوونی حەفت ساڵەیی هەر هەمان هەژار و دەستکورتەکەی جاران گەڕاوەتەوە بۆ کۆیێ: نە دارایی و سامانێکی کۆنی هەبوو ڕێی بەرەو پێشەوە چوونی بۆ تەخت کا، نە چ سامانێکی تازەی لەگەڵ خۆی هێناوەتەوە بیکا بە خەرقە و تەیلەسان، وەک جلە خوازرایەوەکانی مەلای مەشوور، پێی بچتە باری سەرەوە لە سفرە و شیلانی داوەتاندا.

هەرچەند حاجی قادر لە پاشماوەی حورمەتی کۆن و ناوبانگی شاعیریەتیی کۆن و نوێی سەرمایەیێکی هەبوە لە حورمەت، بەڵام دەبوو بازێک هەڵاوێ و خۆی بڵند کاتەوە تا شانی بگاتە ڕێکاری شانی پیاوە کەڵەگەتەکانی ئەو سەردەمە. هیمەتی بەرز و سروشتی لە خۆ ڕازی و سەرکەشی ئارامی لێ هەڵ دەگرت ئەگەر لە نێو خەلقدا کەوتبا نزمایی پێپلکەی دوەم و سێیەمی پەیژەی کۆمەڵایەتیی ئەوسای کۆیێ.

حاجی قادر بەم هەڵبەستە ئەوەی کرد کە سەدان ساڵ زووتر «متنبی» کردی لە دەربارەی «سیف الدولەی حمدانی». یەکەم خۆناساندنی «متنبی» بە «سیف الدولە» لە ڕێی قەسیدەیێکی ئەوەندە بەهێز و زرینگەدار بوو درێ دا بە پاسەوان و پەردەدار و حاجیبان و ڕێی بۆ «متنبی» هەموار کرد تا گەیاندییە لای «سیف الدولە» و ژووروی هەموو شاعیران و ئەدیب و خاوەن جێگە و ڕێگەیێک:

وفاؤکما کالربع اشجاه طاسمه<br>بأن تسعدا والدمع أشفاه ساجمه

ئەم بەسەرهاتەی «متنبی» و قەسیدەکەی، بە درێژی و شێوەییێکی دڵنیاکار، لە کتێبەکەی دکتۆر «طه حسین»دا دەخوێندرێتەوە کە لەژێر ناونیشانی «مع المتنبی» نووسیوەتی.

هەڵبەت حاجی قادر ئاگای لە «متنبی» نیە ئاخۆ چۆن جێگەی بۆ خۆی خۆش کردوە لە دەرباری «سیف الدولە»دا تا بگوترێ پەیڕەوی ئەوی کردوە لە هۆندنەوەی ڕشتە گەوهەرەکەی خۆی. ئەوسا «طه حسین»یش پەیدا نەبووبوو بە نووسینی زیرەکانەی خۆی پەندە نهێنیەکانی مێژوو لە خەلق بگەیەنێ: دوو هەڵوەستی هەمئاهەنگ و یەک جۆر، دوو دەسەڵاتی ئەدەبی خاریقی هان داوە بۆ یەک ڕەفتار لە دوو کات و دوو جێگەی جودادا.

ئەم چۆنیەتیەی کە باسم کرد و خۆم بە ڕاستی دەزانم هیچ لێکدانەوەییێک و هۆییێکی ماددی و زیهنیش بەرهەڵستی لێ ناکا، بە پێچەوانە پێویستی واقیع داخوازی دەکا، تەقەللا و پەلەی ژیانی حاجی قادریشمان بۆ ڕوون دەکاتەوە لەو ڕۆژگارەدا بەو شێوەیە و بەو چەکەی کە لە دەسەڵاتی حاجیدا بوە و لێی وەشاوەتەوە.

حاجیش وەکوو هەموو خەلقی تر دەبوو خەریکی گوزەران و ژیانێک بێ و لەو ژیانە و گوزەرانەشیدا لە ڕیزێکی کۆمەڵایەتی حورمەت و ناو و پایە هەڵچەقێ، ئیتر لە ڕیزی پێشەوە یا ناوەڕاست یا بەرەو پاشتر. بێگومان سەبارەت بە سروشتی بەخۆ نازیو و هەستی مووقەلاشی شاعیریەتی ئەو ناڕاحەتیەی کە هەژاری و دەستکورتی بۆ ئەوی پێکهێناوە لە هی مرۆڤێکی عادەتی گەلێک زیاتر بوە.

هەزاران مەردی هەژار لەو سەردەمەدا کونجی قەناعەتی گرتوە و دەستی لە ئەژنۆی خۆی وەرهێناوە و تەسلیم بە قەزا و قەدەر بوە، چ نانێکی هاتبێتە کاسەوە سەڵەواتی بۆ لێ داوە، چ مەرحەباییێکی لێ کرابێ دەست لەسەر چاو قۆستوویەتەوە. بەڵام حاجی قادرێک کە ئێمە دەیناسین ئەگەر بە لەش و سگ تەحەمولی ڕووتی و برسیەتیشی کردبێ، گیانی لە نێو قەفەسی هەژاری و سەرکزەڵەییدا نەوەستاوە و یاخی بوە لەو هەڵکەوتە نالەبارە. شاعیری عەرەب «متنبی» ڕاستی کردوە کە دەڵێ:

واذا كانت النفوس كبارا<br>تعبت في مرادها الأجسام

«کە نەفس گەورە بوو، لەش لە ڕێی مەبەستیدا ماندوو دەبێ».

شارەزابوون لە دەماری «ڕەفز و یاخیگەری» لە سروشتی خورتی حاجیدا ڕاستەوخۆ دەمان گەیەنێ بەو باوەڕە کەوا حاجی قادر لەو چەند ساڵەی دوای فەقێیەتی و بەر لە سەفەری بۆ تورکیا کە لە کۆیەدا ڕایبواردوە بە هۆی «تناقض»ی میانی باری ماددی زۆر کز و دەسەڵاتی هونەری زۆر هێژای کە وەک ئاگر و ئاو لە زەرفی گیانیدا کۆبۆتەوە، ئۆقرەی لێ هەڵستاوە و وەک مەلی سەربڕاو پەلەقاژەی کردوە.

دوای چەسپاندنەوە حورمەتی کۆنی و، لێ زیادکردنیشی، بەهۆی سەپاندنی هەڵکشانی لە شاعیریدا لە ڕێی ئەو قەسیدەیەوە و دیارخستنی زەکا و شیاوی خۆی بە وتوویژ و دەمەتەقەی ئەدیبانە، حاجی قادر تەکانی ڕۆژانە و سات بە ساتی داوە و هەنگاوی حورمەتکارانەی هەڵێناوە تاکوو تەرازووی سامانی مەعنەوی سووک هەڵنەستێ. نەفس زلی و سەرەوژوور نۆڕینی فیتری کە لە دەماری حاجیدا هەڵی هاویشتوە وەک تەلی کەمانی کێشرایەوە گرژی کردوە و لە هەر لاییکەوە نووکی ڕەخنەی بۆ هاتبێ زیرەی لێ هەستاوە: بنیادی حورمەتی لەسەر تاکە کۆڵەکەی «هونەر» وەستاوە بایی ئەوەی بە بەرەوە نەبوە ڕێ بە کەس بدا کەنەی لێ بکا. تاکە کۆڵەکەی «هونەر» چەندێک بەهێز و دامەزراویش بێ ناتوانێ قورسایی دەروون و هیمەتی گەورە ڕاگرێ ئەگەر پلار و ڕەخنەی ئەم و ئەو لێی داخورێنێ و داشۆرێنێ وەک «تعرية و تاکل - ڕووتاندنەوە و داخوراندن» کەمی کاتەوە.

لە هەڵوەست و هەڵکەوتی وادا پلاری بێدەسەڵاتان چاوی لێ دەپۆشرێ چونکە تەئسیری کەمە یا هەر نیە، بەڵام پلاری گەورەپیاو و دەسەڵاتداران دەبێ بکرێ بە تیر و تێیان بگیرێتەوە لەگەڵ تیرێکی تەڕ و تازەی دەسکردی حاجی خۆیدا. لێرەدا سەرگوزەشتێکی کورتیلە دەگێڕمەوە هەم مەبەس ڕوون دەکاتەوە و هەم بابەتێکی شراوەیە لە کاڵای ئەدەبی ئەوسای حاجی و غەیری حاجیش باس دەکا.

یەک لە بنەماڵە دەسەڵاتدارەکانی کەرکووک و کۆیێ بنەماڵەی «تاڵەبانی»یە. ئەوسا شێخ غەفووری برای شێخ ئەوڕەحمان و مامی شێخ عەلی و شێخ ڕەزای تاڵەبانی سەرۆکی کەرتی ئەم بنەماڵەیە بوە لە کۆیێ. دیارە شێخ غەفوور پیاوێکی شارەزای ئەدەب و زاراوەکانی شیعر و تەوریەکاری و فەند و فێڵی شاعیران بوە. بەپێی دەستووری زۆر باوی ئەوسای «قلب و تصحيف» لەگەڵ ناوی «حاجی»دا

ئەم فەندەی گاڵتە بەوشە کردنی لەکار هێناوە: لە ڕێی «تصحیف»ەوە وشەی «حاجی» کردوە بە «چاچی» کە بە فارسی بە «کەمان» دەڵێن. وشەی کەمان بە ڕێنووسی جاران «کمان» دەنووسرا کەوا مومکینە بکرێتە «گمان - گومان»، لە عەرەبیدا گومان «وهم»ە ئەویش دەبێتە «شک» وشەی «شک»یش کە خاڵەکانی لێ سڕایەوە دەبێتە «سک». جاران وشەی «صەگ»یش هەر «سک» دەنووسرا. دەوجا بەو شریتەی «قلب و تصحیف»ە کە شێخ غەفوور لە ناوی «حاجی»دا کردوەتی ئەم ڕیزە وشەیە پێک دێ: «حاجی - چاچی - کمان - گمان - وهم - شک - سک» بەو پێیە «حاجی - سک: سەگ» یەک دەگرنەوە. ئەم باسە دەگاتەوە حاجی قادر، ئەویش بایی چرکەیێکی سەعات ناوەستێ و بەم فەردە وەرامی شێخ غەفوور دەداتەوە:

شێخ غەفوور بیستوومە چاچیم پێ دەڵێی
چاکە من نابم بە نوقتەی لا بە لا

مەبەس لەو «نوقتەی لا بە لا» دا ئەمەیە کە وا نوقتەی پیتی «غ» لە ناوی «غەفوور» لابەلا بێتەوە بەرەو پیتی «ف» ئەوسا غەینەکە دەبێتە «ع» فیەکەش دوو نوقتەی دەبێ و پیتی «ق»ی لێ پێک دێ. بەم جۆرە وشەی «غفور»[56] دەبێتە «عقور» کە بە سەگی نهێنگیر دەگوترێ.

هەر ئەو جۆش و خرۆشەی دەروون بوە حاجی قادری دەستەویەخەی شێخ نەبی ماویلی کردوە. سوودێک نیە بۆ شێخ نەبی لە خۆڕا زمانی قسە و پەنجەی شیعری حاجی قادر، وەک تیر و شیر، لە گیانی خۆی بەردا و خۆی پێ کوناش کوناش بکا و تا ڕۆژی حەشر وەک بلوێر ئاوازی بەدناوی لێ هەڵستێنی. دەتوانم لێرەوە شایەدی بۆ شێخ نەبی بدەم، بەسەزمانە، بە هەر نرخێک کڕیار و فرۆشیاری پێ ڕازی بێ، دەیەویست حاجی قادر ڕازی کا یاخود هەر نەبێ لێی بێدەنگ بێ. سیاسەتی خەلق چەوساندنەوە و بە هەڵەبردن هەمیشە مەسڵەتی دەکا و ڕێک دەکەوێ لەگەڵ بەهرەی هونەر و وێژەدا تاکوو بتوانێ بیکا بە دۆستی خۆی و بازاڕی مامڵەتی پێ

[56] - لە «المنجد» وشەی «عقور» بە دڕ و بریندارکەر دانراوە.

برِازێنێتەوە و خەلقی پتر پێ گێل کا. خۆ ئەگەر دۆستایەتیش نەلوا، بەسپاسەوە، بێدەنگبوونی لێ دەکرێ.

گەلێک جاران پیاوی بە اصطلاحی کوردستانی ئێران «عەوام خەڵەتێن» چ لە ئایین چ لە سیاسەت، مووچە و بەرات و دیاری مانگانە و ساڵانە وەیا بێ کات و سات دەنێرێ بۆ ئەو کەسانە کە لە دەسەڵاتیان دەترسێ و کۆمە لە نارِەزامەندی و گلەمەندییان دەکا جا ئەو دەسەڵاتە هی هێز و سامان بێ وەیا پایەی میری بێ وەیا جەوهەری مەعنەوی بێ. با بڵێین زۆر جاران وادەبێ دۆستایەتی دەسەڵاتدارێک لەگەڵ یەکێکی وەک خۆی ناچێتە سەر بەهۆی نەگونجانی بەرژەوەندیان، خۆ لەگەڵ بەهرەوەر چ رِێک نەکەوتنێکی بەرژەوەندی ماددی لە میاندا نیە تا هەرا و ناکۆکی میانی بەهرە و دەسەڵات ببێتە کارێکی ناچاری. پیاوێکی وەکوو شێخ رِەزا سەرانەی لە چەندین خاوەن دەسەڵات و سامانی کورد و غەیری کورد ستاندوە لە بری مزەی وسکتبوون، زۆر رِاستیشی کردوە کە لە موناسەبەدا گوتوەتی:

تۆ هەتە تیغی دەبان و من هەمە تیغی زمان

فەرقی ئەم دوو تیغە هەر وەک ئاسمان و رِیسمان

بە نیسبەت پیاوێکی وەک شێخ نەبیشەوە تیغی زمانی حاجی قادر ئەو برِندە درِندەیە بوە کە بەدڵ لێی ترساوە و ئامادە بوە بۆ هێور کردنەوەی کالانی گەوهەرنیگاری بۆ بکا بە پێشکەش. بەڵام سروشتی حاجی لەلای خۆیەوە نەیتوانیوە مەسڵەتی لەگەڵدا بکا، بەپێچەوانە لە جیاتی رِێک کەوتن، یاخود هەر نەبێ وسکتبوون، ویستوویەتی دەستێک کە شێخ نەبی بۆ دۆستایەتی درێژی کردوە بۆی، ئەو بە تیغی زەهراویی هەڵبەست بی برِێتەوە.

شێخ نەبی، دوای بێئومێدبوونی لە دۆستایەتی، یاخود هەر نەبێ بێتەرەفی، حاجی قادر و پەیدابوونی مەترسی کردن لە کاری رِووخێنەری هەڵبەستەکانی، بە ناچاری و لەوپەرِی سەغڵەتیدا کەوتۆتە سەر بیرکردنەوە لە کوشتنی. کوردی پەندێکی هەیە دەڵێ: «دەستێک کە نەتوانم بیبرِم، ماچی دەکەم». ئەم پەندە بە نیسبەت شێخ نەبییەوە لە عاست حاجی قادردا سەرەوبن بوە و بۆتە: «دەستێک کە نەتوانم ماچی کەم، دەیبرِم». بێگومان سەغڵەتبوونی شێخ نەبی بەدەست حاجی قادرەوە گەیشتۆتە

سنووری به خۆ نەوەستان ئەوجا ڕێی داوە مریدەکانی خەریکی کوشتنی بن. بە حیسابێکی زۆر سادە و بێ گرێ و گاڵ کوشتنی حاجی لەگەڵ هەموو ناوبەدی و کاری پێچەوانە (ردفعل) کە لە نێو خەلقدا پەیدا دەکا دژی شێخ نەبی، زەرەری کەمتر بوە لە زەهری هەڵبەستەکانی.

وەک لە نامێلکەی مەلا عەبدولڕەحمان دەردەکەوێ و گوتەی دەماودەمیش دەیگێڕێتەوە، شێخ نەبیش ویستوویەتی وەک حاجی لە سەرەتاوە بە چەکی «ژمارە یەک» کە قسە و پڕوپاگاندەیە هێرشی حاجی پاشگەزکاتەوە. کە ئەم چەکەی کاریگەر نەبوە و بەرانبەر تیغی بلێسەداری زمانی حاجی کول وەستاوە ئەوسا شێخ نەبی دەستی بردوە بۆ چەکی «ژمارە دوو» کە چەکی ڕاستەقینەیە. مەلا عەبدولڕەحمان لە مەیدانی قسە و پڕوپاگاندەدا ناوی مریدێکی شێخ نەبی دێنێ کە «سۆفی ڕەشک» بێ. هەرچەند بەڵگەی قەتعیم بەدەستەوە نیە بەڵام ڕواڵەتی ناوەکە و ڕاگەیاندنی حاڵ وا دەردەخا ئەم سۆفی ڕەشکە هەمان «حاجی ڕەشک» بێ کە کەیفی جوانڕۆیی لە هەڵبەستە ناودارەکەیدا ناوی دێنێ:

جان و دڵ و دینم بە دەسی دولبەرێ دابوو
نەی دابوو وەها «حاجی ڕەشک» دینی بە دینار

ناوەکە و چەند تێبینییەک پشتگیری لەو ئیحتیماله دەکەن کە «سۆفی ڕەشک و حاجی ڕەشک» یەک کەس بووبێ: تێبینی یەکەم ئەوەیە ناوی «ڕەشک» وەک ئەحمەد و حەمە و باپیر نیە زۆر بەکار بێ. ئەوەندەی دەماودەم بیسترابێ لە کۆن و نوێدا لەو تاکە «حاجی ڕەشک»ـە بەولاوە کەسی تر لە کۆیێ ناوی ئەوتۆی نەبوە. نەوەی حاجی ڕەشک ئێستاش ماون لە کۆیێ و بنەماڵەکەشیان ناسراوە و پیاوی کاسب و خێرەومەندی چاکیشیان لێ هەڵکەوتووە. بەپێی تۆژینەوەی تایبەتی خۆم، حاجی ڕەشک لەو سەردەمەدا پیاوێکی دەوڵەمەند بوە. چ دوور نابینم ئەویش وەک هەندێ لە دەوڵەمەندەکانی ئەوسای کۆیێ بە شێخ نەبێ هەڵ خەڵەتابێ و بووبێتە مریدی.

وەک ئەویش «حاجی ئەفەندی» بۆ ماوەیێکی درێژ مریدی شێخ نەبی بوە. کۆیی دەزانن «حاجی ئەفەندی» سەرەکی بنەماڵەیێکی ئەوسا و ئێستای کۆیێ بوە.

بنگەیێکی تیجارەتی لە «بصرە» و یەکێکی لە کۆیێ هەبوە. بوونە مریدی ئەو تەرزە پیاوانە لای شێخ نەبی باری شێخایەتی ئەو شێخەمان بۆ دیارتر دەخات لە ڕووی ئەوەوە کە پیاوی خاوەن جێگە و ڕێگە و سەروەت و دارایی شوێنی کەوتوون و فەرمانبەری بوون.

تێبینی دوەم ئەوەیە، هەمان ناحەزی سۆفی ڕەشک لەگەڵ حاجی قادر لە شیعرەکەی «کەیفی»دا دەنگ دەداتەوە: خۆشەویستیی میانی کەیفی و حاجی قادر لێی دەوەشێتەوە یەکێکیان دوشمنی ئەوەکەی تر بە دوشمنی خۆی دانێ و لە هەڵکەوتدا بە خواری ناوی بێنێ، وەک کەیفی ناوی حاجی ڕەشکی هێنا. بەڕاستی شیعرەکەی کەیفی بایی بەڵگەیێکی ماددی هێزی سەپاندنی هەیە.

تێبینی سێیەم ئەوەیە دەشێ مرۆڤ کە بوو بە مریدی شێخ پێی بگوترێ «سۆفی» با حەجیشی کردبێ و لەقەبی حاجیەتی هەبێ. بۆیە ڕێی تێ دەچێ «حاجی ڕەشک» لە هەمان کاتدا «سۆفی ڕەشک» بووبێ و بە هەر دوو لەقەب ناوی برابێ.

لێتەوە دیارە، حاجی قادر کە بەگژ شێخ نەبیدا چوە لەگەڵ بەرەیێکی فرەواندا کەوتۆتە جەنگ، شێخ نەبیش دەبێ پیاوێکی خاوەن قابلیەتی تایبەتی لە خشتەبردن بووبێ. تاو و تەئسیری هەر ئەوەندە نەبوە بەندوباوی وای نابێتەوە جحێڵ و دەم ڕووت کەیفیان پێی هاتبێ، بەڵکوو لە ڕێی پسپۆڕی لە فنوونی «تشیخ»دا مسڵمانی بەڕێزی سەرمایەداری خواناس و حاجیشی خستۆتە داوی خۆیەوە. ئەوەی ڕاستی بێ، وەک لە بەرگی یەکەمدا باس کرا، مەیلەو بەدرەنگەوە کەوتە سەر کاری نارەوای ئاشکرا، چ بە دوور نابینم پێ لێهەڵماڵینی دوای ڕۆیشتنی حاجی بۆ ئەستەمبۆڵ بووبێ، ڕەنگە ئەوپەڕی لە ڕێگە دەرچوونیشی دوای دەرچوونی خۆی لە کۆیێ بووبێ.

بەهەمەحاڵ، شێخ نەبی لە ڕووی کار تێکردن لە دڵی مریدەکانی براچووکەیێکی «حسن الصباح» بوە، بەڵام نەبیستراوە بەنگ و حەشیشەی بەکار هێنابێ، یاخود با بڵێین هێشتا نەگەیشتبوە بەکار هێنانی هەموو ئامرازەکانی «حسن الصباح».

بەداخەوە بۆم ساغ نەکرایەوە لە چ ساڵێکەوە شێخ نەبی لێسی خۆی هاویشتە کۆیێ تا بزانین ناکۆکی میانی ئەو و حاجی قادر چەندی کێشاوە. بەڵام بەپێی زۆری باس کردن و گێڕانەوەی کەینوبەینی ناکۆکیەکە دەبێ چەند ساڵێکی خایاندبێ. هێندە

مەعلووم دەکرێ لەو ساتەوە دەستی پێ کرد هەر بەردەوام بوو، بێپشوو و بێوچان، تا حاجی کۆیەی جێ هێشت لەوەش بەولاوە لە شیعری حاجیدا دەنگ دەداتەوە ئەوەندەی حاجی لە ژیاندا بوە. دوور نابینم کاتێک حاجی قادر لە خوێندنەکەی گەڕاوەتەوە بۆ کۆیێ شێخ نەبی لە کاردا بووبێ یاخود دوای ماوەیێکی کورت کەوتبێتە کار، چونکە ئەگەر وا نەبێ ئەوەندە کاتەی کە حاجی دوای فەقێیەتی لە کۆیێ ماوەتەوە بایی ئەو هەموو تێکهەڵگیرسانە و شەڕ و نیوەشەڕە ناکا. بێگومان لە گوێرەی زیاد کردنی دەسەڵاتی شێخ نەبی ئاگری دوشمنایەتیەکە گەرمتر بوە تا گەیشتۆتە ڕادەیێک، دەسەڵات و دوشمنایەتی، سەر بگەیەنن بە تەقەللای کوشتن.

تێکڕای وەزعی لێر بەپێشەوە وەزعێک بوە حاجی خۆی تێدا دیوەتەوە دوای گەڕانەوەی بۆ کۆیێ لە گەشتی خوێندن و چ کەلەبەرێکی تێدا نەبوە لەو چەند ساڵەی پێش ڕۆیشتنی بۆ تورکیا کە هەناسەیێکی حەسانەوەی تێدا هەڵ بێنێ.

دەوجا لەگەڵ مندا سرنجێکی بێ تەرەفانە بگرە.

حاجی قادر کە بەو جۆرە خەریکی چەکمەسەری گوزەران و دروست کردنی شەخسیەت و ئالوودەی ناکۆکی و دوشمنایەتی ئەم و ئەو بێ تا دەگاتە حاڵێک ناچاری خوپاراستن بێ لە کوشتن، لە کوێوە ئەو دەرفەت و مەودایەی بۆ پەیدا بوە بێ هیچ پێشەکییەک لە کوردایەتیدا، بیری نیشتمانپەروەری بێتە تاکە مێشکی ئەوەوە و بە تەنها دەستکا بە خەباتی قەومی و شیعری بۆ بهۆنێتەوە؟ چۆن وا کوتومت لەناو ئەو گەرداوەی پڕ فرتەنەی ژیانێکی نالەبار و ناگزوور حاجی قادر ملی نایە خەباتی سیاسی و پەیامی کوردایەتی؟ کوا زەرف کوا ئیمکان؟

من ئەوەندەی تێ دەفکرم و یارمەتی بوونی کوردایەتی حاجی دەدەم لەو سەردەمەدا بە دوورخستنەوەی هەموو ئیحتیمالێکی تر کە کاری پێچەوانەی کردبێ لە پێش هەنگاوی حاجیدا و تەنها تیشکی زەرفی ڕاستەقینە و ڕووداوی بێگومان دەکەمە ئەو ڕووناکییە کە ئیمکانی پەیدابوونی گیانی کوردایەتی لای حاجی، یا غەیری حاجی، دیارخا و نیشانمان بدا، هەرگیز نایێتە دڵمەوە نە وەزعی حاجی تەحەمولی خەباتی سیاسی کردبێ نە ئەو ماوە کورتەی 5 – 6 ساڵەی پڕ تەگەرە بایی ئەوەی کردبێ تۆی فکری سیاسی تێدا پەیدا بووبێ و نێژرابێ و ڕوابێ و گەشەی کردبێ، لەوە هەر

گەڕێ کە باری کۆمەڵایەتی و پلەی گۆڕانی ژیاری هێشتا چەندین ساڵەهای ساڵی تر لە خەودا بوو بەر لەوە چاوێک بتروووکێنێ و سەیرێکی سیاسەت و کوردایەتی و خەباتی قەومی بکا. گوتەی دەماودەم و ڕاگەیاندنی زەرفی کۆمەڵایەتی و باری وەزع و ژیانی حاجی لەو ساڵانەدا هەموویان یەکتر دەگرنەوە و شایەدی بۆ یەکتر دەدەن کە وا حاجی دوای چوونی بۆ ئەستەمبۆڵ کەوتۆتە سەر خەباتی کوردایەتی.

لەگەڵ ئەمەشدا ئەگەر یەکێک بتوانێ لە ڕێی بەڵگەی چەسپاو و لێکدانەوەی بێتەرەفانە بۆمان ئیسپات کات وەیا لە باوەڕمان نێزیک خاتەوە کە حاجی قادر بەر لە تەرکی مەفتەن کوردایەتی کردوە و هەڵبەستی نیشتمانپەروەرانەی هۆندۆتەوە هیچ بەرهەڵستێک نیە بۆ ئەوە بێ دوودڵی لێی بسەلمێنن و کۆڵێکیش سپاسگوزاری بکەین. وەنیە «استحالە» هەبێ لە پێش ڕووداوێکی وەهادا، هەر ئەوەندەیە کارێکە خۆی لە خۆیدا زەحمەت و لە کەسیش نەبیستراوە و دەسنووسی حاجیش ئیشارەتی بۆ ناکا. بۆیەیە منێکی دەستگرتوو بە دامەنی ڕاستییەوە تا بەڵگەی پتەوم چەنگ نەکەوێ لە خوێندنەوەی مێژوو ناچارم بە دڵێکی تەنگەوە سەر دانوێنم بۆ بڕیاری ئەو لێکۆڵینەوەی خستمە بەرچاوی خوێنەر و لەسەر بنجێکی ماددی و زیهنی بەهێزیشەوە هەڵستاوە.

کەواتە تا جوانمێرێکی لەخۆم مەلەوانتر بەرەو قووڵایی زیاتر خۆی لە بنی گۆم نزیک دەکاتەوە و خەبەرێکی تازەترمان بۆ دێنێ کە قەناعەتێکی نوێ دروست کات من لەو باوەڕەدا دەمێنمەوە کە وا حاجی دوای چوونی بۆ ئەستەمبۆڵ و لای بەدرخانیەکان دەستی کردوە بە کوردایەتی.

بێگومان ساغ کردنەوە لایەنی بوون و نەبوونی خەباتێکی سیاسی لای حاجی قادری پێش چوونی بۆ ئەستەمبۆڵ خۆی لە خۆیدا تا بڵێی کارێکی گرنگە و ڕاستییێکی گەورە دەسەپێنێ لە ژیانی حاجی قادردا، بەڵام شوێن و ئەسەری ئەو ساغ کردنەوەیە هەر لە پەراوێزی بوێژی حاجی قادر ناوەستێ، چونکە دەبێتە ڕۆشنەیێک بۆ تێوە ڕامان لە سەرپاکی هەست و بیری سیاسیی خەست و گووراو لە سەرانسەری کوردستانی ژێرووی ئەو ڕۆژگارانەدا: ئاخۆ بوون و نەبوونی فکری سیاسی لای حاجی تا چەند ڕێک دێ لەگەڵ بوون و نەبوونی ئەو فکرە لای کۆمەڵانی ئەوسای کوردەواری!

چوونە ناو باس و حیکایەتی پەیدابوونی فکرەی سیاسی کە بوویێتە فەلسەفە و باوەڕ (نەک هەستی فطری) لە کوردستان و غەیری کوردستان گەشتێکی بێ بڕانەوەی لەدوایە و بۆ گەلێک مەیدانی لە یەکتر جودای مێژوو و کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسیمان دەبا، خۆ ئەگەر لە هەموانیش بکشێینەوە دەبێ ئەو ڕاستییە مێژووییە شیکەینەوە کە دروستبوونی «کیان - حکوومەت» گەلێک پێش پەیدابوونی باوەڕی قەومی وەیا چینایەتی دەکەوێتە لای کۆمەڵانی خەلق و هۆی ئەم زاهیرەش دەرخەین... دەبێ جیاوازی میانی هەوڵ و تەقەللای ئەمیرێک بۆ گەیشتن بە دەسەڵات ڕوون کەینەوە لەگەڵ باوەڕ هێنانی خاوەن بیرێک وەیا زوربەی گەل بە فەلسەفەیێکی تایبەتی سیاسی، بەڵام باس لێ کردنی ئەو مەوزووعانە بە ڕادەی لێ وەشانەوەیان و پاک کردنەوەیان لە عاتیفەکاری چەندین فرسەخ بەولای حاجی قادرەوە دەبا.

لە ڕووی ناچارییەوە بە چەند دێڕێکی کورتیلە لێی دەدوێین کە هەر بایی ئەوە بێ کەلەبەری گەورە لە نووسینەکە ببڕێ و حاجی و شیعری سیاسی و خەباتی کوردایەتی پێش سەفەر و پاش سەفەری بۆ ئەستەمبۆڵ بخاتە پەراوێزێکی مێژوویی ڕاستەقینە کە بڕیاری سروشت (حکم الطبیعة) بۆی سازداوە - هەر نەبێ بەپێی بیر و باوەڕی من.

حاجی قادر، پێش سەفەری تورکیا، کە هەڵبەستەکانی لە سنووری بەکارهێنانی زمانی کوردی دەرنەچووبێ، چەندێکی بزۆزی و یاخیگەری و ئازاییشی لەو هەڵبەستانەدا بەکارهێنابێ، زۆر گونجاو دەبێ لەناو جغزی واتای «کوردایەتی»ی ئەو ڕۆژگارەی کوردستانی خوارەودا: تازە بە تازە هەڵبەستی کوردی بە سەر زمانی نالی و کوردی و سالمدا هاتبوو، هەر سێیشیان لە ناوچەی حوکمڕانی باباندا دەژیان و هێشتا لە ناوچەی قەلەمڕەوی سۆران ئەو هەنگاوە هەڵ نەهێنرابوو. حاجی قادر و حاجی عەبدوڵا لە هەڵبەستی کوردیدا هەنگاوێکی باش پێش ناوچەی نێوانی زێی بادینان و زێی کۆیێ کەوتبوونەوە. هۆی ئەم پێشکەوتنەوەشیان بەپێی لێکدانەوەی خۆم، سەرەڕای لێهاتوویی خۆیان، بەرەوپێش چوونی شاری کۆیێ بوە لە مەیدانی گۆڕانی ژیاری و کۆمەڵایەتیدا لەچاو هەموو ئەو ناوچە فرەوانانەی نێوانی هەر دوو زێ. بە دوا ئەواندا ئەمین ئاغاش ئەم هەنگاوەی هەڵێناوە. کۆیێ ناوچەی حوکمڕانی نەبوە وەک سلێمانی و ڕەواندز تا بگوترێ هەڵکەوتنی حاجی قادر و حاجی مەلا

عەبدولا و ئەمین ئاغا، زادەی هەستی نیمچە سەربەخۆیی و دەسەلاتی نەتەوایەتی و بزووتنەوەی هەستی بەخۆ نازینێکی نەژادی بەرچاوە.

دەتوانم بڵێم تەجرەبەی شاری کۆیێ لە بەربەرەکانی سلێمانی و ڕەواندز بۆ پچڕینەوەی کۆیێ و دەست بەسەرڕاگەیشتنی، خەلقی کۆیەی ڕەنجاندوە و تەتجرەبەیێکی بە سفت و سۆ بوە. فرت و فێڵی عوسمانیش بۆ یاری کردن لە دوو لای پەتی «گوریسکێشەکێی» بەینی بابان و سۆران لە ئەرکی خەلقی کۆیێ گەلێک زیاد کردوە. بەو پێیە، شاعیرێکی کۆیێ کە لە ڕێی هەڵبەستی کوردییەوە هەستێکی نەتەوایەتی دابێتەوە، لە تامی خۆش و شیرینی حوکمڕانی حوکمدارەکانی ئەوسای کورد پەندی ڕاستەوخۆ و هاندەری وەرنەگرتوە، بەڵکوو لە هەڵکەوتنێکی خۆڕسکی مێژوویی کۆیێ بوە.

بەڵێ بێگومان باری حوکمڕانی لە سلێمانی و ڕەواندزدا، وەک ڕووداوی مێژوویی، کاری کردۆتە سەر هەستی کۆیە و هەموو شوێنانی کوردستان، بەلام دەبێ ئەوەش لەبیر نەکەین کە وا جۆری بزووتنەوەی دوشمنانەی میری بابان و سۆران لە دژی یەکتر «مد و جزر»ی ناخۆشی بە خەلقی ولاتی کۆیێ کردوە، زیاتر لە شوێنانی تر. کۆیێ ئامانجێکی گەورەی هەر دوو حوکمڕان بوە، بە درێژایی کات «گۆڵ»ێکی ستراتیژی سیاسەتی هەردوویان بوە و حیسابی تایبەتی بۆ کراوە و لەم کەشمەکەشەدا کۆیێ گەلێک نارەحەتی چێشتوە.

چاوەڕوان دەکرا لە حاڵەتی وادا «ردالفعل» پەیدا بێ لە کۆیێ بەرانبەر ماکی ئەو نارەحەتییە کە وجوودی دوو حکومڕانی کوردە لە چەپ و ڕاستی ناوچەی کۆیێ. کەچی بە پێچەوانەی چاوەڕوان کردن لە ڕواڵەتی ڕووداو، کۆیێ لە ئەزموونی نەژادپەروەریدا دەرچووە و عەیبی نەهاتۆتە سەرێ. وا دەزانم چەسپاوی شاری کۆیێ لە ژیار (حضارە) و تێگەیشتن و ڕۆشنبیریدا ئیمکانی ئەوەی پێ دراوە لەو تەگەرە و گرفت و کۆسپە هیممەت شکێنانە سەرکەوێ و لە مەیدانی کرانەوەی نیگای نەتەوایەتیدا خۆ لە ڕێکاری[57] سلێمانی بخشێنێ و تەواوێک لە ڕێکاری ناوچەی بەینی هەر دوو زێ تێ پەڕێنێ.

---

[57] - ڕێکار: مستوى

لێرەدا با هەڵوەستێک بکەین و پشوویێک بدەین بۆ وردبوونەوە لە ڕوخساری سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەم لە لایەن پژانی باوەڕی قەومییەوە تاکوو دیمەنی گشتی فەلسەفەی کوردایەتی لە کوردستانی باشووردا بهێنینە بەرچاوی زیهنیمانەوە و زاهیرەی پەیدابوونی هەڵبەستی کوردی لەو سەردەمەدا بکەین بە زاهیرەیێکی مێژوویی چاوەڕوانکراو و لە زەرفی خۆیدا جێی بکەینەوە. دەشمەوێ خوێنەر لێم ببوورێ کە وا ناوناوە هەڵوەستی ناچاری پێ دەکەم و زنجیرەی باسەکەم دەبڕمەوە بۆ شی کردنەوەی ئەو گرفتانە کە دێنە بەر هەنگاوی خامە لەم ڕەوتە درێژەیدا بە ناو مەیدانەکانی مێژوو و ئەدەب و فکر کە هەمووشیان لە سەرچاوەی باسی حاجی قادرەوە دەبن بە لاباس یاخود باسی سەربەخۆ.

وەقفنامەکەی عەبدولڕەحمان پاشا، کە لە بەشی یەکەمدا بە زەنگۆغراف وێنەی بڵاو کرایەوە و بەئاشکرا سنووری قەلەمڕەوی کوردستانی سەربە بابان دەکێشێ و ناوی کوردستان دێنێ تیشکێکی بەهێز داوێتە بەر هەنگاومان لەم ڕێبازەدا و بێ نیازمان دەکا لە تۆژینەوەیێکی مێژوویی دوورودرێژ کە ئێمە هەر بایی بەشی کورد و کوردستانمان لێی دەوێ. ئەم وەقفنامەیە لە ساڵی 1211ی کۆچیدا نووسراوەتەوە کە دەکەوێتە بەرانبەر ساڵانی 1796 و 1797ی زایینی. هەر چاوێک بۆ ئەم ساڵانە بکەینەوە دەزانین و دەبینین بە هەمووی شەش حەوت ساڵێکە شۆڕشی فەرەنسە بەرپا بوە و فەرەنسەش بۆتە ناوەندێک لەوێوە شەپۆلی شۆڕش و فکرەی شۆڕشگێری و نەتەوایەتی بە جیهاندا بڵاو دەبێتەوە. بێگومان بەڕادەی نێزیکی وڵات لە فەرەنسەوە و لە گوێرەی پلەی گۆڕانی مێژوویی ئەو وڵاتە گرمەی شۆڕشەکە دەنگی داوەتەوە و خەلقی بەخەبەر هێناوە و بەو پێیە تا هاتبای بەرەو خاوەر تین و تاوی فەلسەفەی شۆڕشەکە کەم دەبۆوە، هەم لەبەر دووری مەودا و هەم لەبەر سەرەتایی باری کۆمەڵایەتی لە هەموو ڕوێکەوە.

ئەم لێکدانەوەیە کە هەندەی «بدیهیە - بەڵگەنەویست» ڕوونە، باری کوردمان بۆ ڕوون دەکاتەوە لە ڕووی توانای سوود وەرگرتن لە ڕاگەیاندن و بەڵێنەکانی شۆڕشی فەرەنسە کەوا دیارە سوودێکی بێ هێز و پێز بوە، چونکە کوردستان سەرەڕای دووری لە فەرەنسە هەم لاتەریک و هەم وڵاتێکی سەرەتایی بوە لە گۆڕانی کۆمەڵایەتیدا. لەمەدا چ گومانێک نیە و شتێکە هەمووومان دەیزانین، هەر هێندەی پێ دەوێ بۆ زانینی بیری لێ بکەینەوە. بەڵام پیاوێکی وەک عەبدولڕەحمان پاشا کە

حوکمڕانێک بوە لەگەڵ وڵاتانی دراوسێ و بەولای دراوسێوە پەیوەندی هەمەچەشنەی هەبوە و پەیتا پەیتا دەنگوباسی جیهانی وەرگرتوە و لە ڕاگەیاندەکانی حاڵی بوە، زۆر بە ئاسایی و شێوەیێکی چاوەڕوان کراو ئیمکانی ئەوەی بوە گەلێک زووتر ئاشنایی پەیدا بکا لەگەڵ دروشم و بەڵێن و پەیامەکانی شۆڕشی فەرەنسە. سەرانسەری مێژوو، ئەم دیمەنەی پێشکەوتنەوەی تاکی میللەتێک لە زوربەی خەلقەکەی، دەخاتە بەرچاوی خوێنەر و بینەریەوە.

هەر لەم نووسینەدا تووشی مەلای ئیبنوئادەم هاتین کە لە تاکە هۆی زانینی خۆیەوە و بێ تین و تاوی شۆڕشی فەرەنسە، پێش زوربەی مەلا و خوێندەوارانی سەردەمی خۆی کەوتبۆوە نەک تەنها تێکڕای میللەتەکەی. ئیبنو ئادەم کە لە ساڵی 1205دا ناوی کورد و کوردستان دێنێ و باسی نووسینی کوردی دەکا هێشتا چ خەبەرێکی شۆڕشی فەرەنسەی وەرنەگرتوە چونکە تازە بە تازە تەقیوەتەوە و جارێ کەس لە گڕوگاڵ و مانا و پەیامی دروشمەکانی نەگەیشتوە.

پیاوێکی وەک «مارکس» لە زوربەی کرێکارانی ئیمڕۆش پێشکەوتۆتەوە، نەک تەنها لە زانستی گشتیدا بەڵکوو لە مەفهوومی چینایەتیدا بەر لە هەموو شتێکی تر کە بە زاهیری دەبوا کرێکار زگماگ تێیدا پسپۆڕ بێ.

هیچ سەیر نیە عەبدولڕەحمان پاشاش بە هۆی لوانی ماددی کە بۆی لواوە و ئاگاداری کردەوە لە بەسەرهاتی دوور و نێزیکی دەوڵەتان و ڕای هێناوە لە تێگەیشتنی ڕووداو و خوار و ژوور بوونەوەی لەنگەری کاروباری گێتی، مێشکی زووتر کرابێتەوە بۆ وەرگرتنی باوەڕی قەومی و مافی نەتەوایەتی لە دروشمەکانی شۆڕشی فەرەنسەوە. لەمەدا سەیرێک نیە، ئەگەر وا نەبا سەیر بوو. بۆ عەبدولڕەحمان پاشا هەڵکەوتی حوکمڕانی و کاری دەوڵەتی بۆتە «ژێرخان»ێک کەوا گەلێک لە ژوورووی هی تێکڕای میللەتی کورد بوە، بۆیەیە «ژوورخان»ی فکری ئەو لەو گوێرەیە بەرزتر بوە لە هی خەلقەکە.

سەرەڕای ئەمە، هەر پێهەڵستانی بە فەرمانی حوکمڕانی قۆناغێکی بەرفرەوان پێشی خستۆتەوە لە ڕەوتی بەرەو پێکهاتنی مەفهوومی سیاسییەوە. لەمانەش بترازێ، عەبدولڕەحمان پاشا بۆ خۆی خوێندەوارێکی پێشکەوتووی سەردەمی خۆی بوە، واتە هێندی هەر ڕۆشنبیرێکی ئەوسای کورد ئاسۆی فکری فرەوان بوە. لە کاتێکی دواتر

تا ئەو کاتەی وەقفنامەکەی تێدا نووسراوەتەوە «مستر ڕیچ»یش لە کتێبەکەی خۆیدا شایەدییێکی بێ فێڵ بۆ کوردایەتیی عەبدولڕەحمان پاشا دەدا. سەیرێکی ئەم کتێبە و شایەدی دانەکەی بۆ پاشای بابان لەبەر تیشکی ئەم تێبینیانەدا قسە و بیر و ڕایەکانی ئەم ئەمیرەی بابانمان پتر بۆ دەکاتە زادەی ئەو زەرف و کاتە لەو ڕۆژگارەدا، نووسینەکەی منیش لەبەر تیشکی ئەو شایەدییەی مستر ڕیچ و قسەکانی عەبدولڕەحمان پاشادا پتر بە دڵانەوە دەنووسێ.

دەوجا عەبدولڕەحمان پاشایێک لە ساڵی 1796 دا سنوور بۆ کوردستانی قەلەمڕەوی بابان دانێ لە کتێبی وەک «صحیح البخاری» دا کە وا لە دوای قورئانەوە دێ، دەبێ وەک سروشێکی مێژووی حیساب کەین کە هەوەڵ بانگهێشتنەکانی نیشتمانپەروەری ئەورووپای لەرزاندۆتەوە لە بەر گوێچکەی کوردەواریدا. لە مەڕا بۆ لێکدانەوەیێکی ئاسایی تریش دەڕۆین و دەڵێین کە حوکمداری بابان بگاتە پلەیێک لە فکری سیاسی و هەستی کۆمەڵایەتی و نیشتمانی، شوێنی خۆی و بەرژەوەندی بنەماڵە و حکوومەتەکەی لە جغزی کوردایەتیدا بناسێتەوە و کێڵگەی ڕوانی ڕەگی خۆی بدۆزێتەوە کە کوردستانە، چاوەڕوان دەکرێ لە قۆناغ و زەرفی وەهادا بوێژی مەڵبەندی بابانیش بگاتە پلەی بەکارهێنانی زمانی مادەرزادی خۆی لە هەڵبەستدا. نالی و کوردی و سالم بەشێکی شاعیریەتییان دەگاتە بەشێکی حوکمڕانی عەبدولڕەحمان پاشا.

دیمەنەکە زۆر ئاشکرایە هەر دەیەوێ پەنجەی بۆ ڕاکێشی: پەیدابوونی فکری سیاسی و هەستی نەتەوایەتی لای میری بابان بوو بە فەجری هەڵبەستی کوردی لای بوێژەکانی بابان. هەڵکەوت بە نیسبەت بوێژەوە هەر هێندە هاندەر بوو کە هەڵبەستی کوردی دانێ، جارێ مابووی بۆ ئەوتۆی فکری سیاسی خەست لەو هەڵکەوتەدا بڕوێ. لەو دەمەدا «ژێرخان» بۆ بوێژ هەر بایی ئەوەی بە بەرەوە بوو کە بەکارهێنانی زمانی کوردی بۆ بکا بە «ژوورخان». چ شوبهە نیە لەوەدا کە پاشای بابان لە ئاسۆیێکی بڵندترەوە سەیری جیهانی دەکرد تا بوێژەکانی دەوری خۆی، پتریش لەوان، لە تێکڕایان، خەریکی کاری وەها بوو لە ژیانی ڕۆژانەیدا کەوا بە مەیدان و بە قۆناغ لەوانی پێشتر خاتەوە.

بێگومان ئەو بوێژانەش ماوەیێکی پان لە پێش تێکڕای میللەتەوە دەهاتن. دەتوانم بڵێم بوێژەکان وەک ئاوێنە بوون کە ڕووناکایی بداتەوە: لەو ڕووناکاییەی لێیانەوە

دیار بوو تیشکە هەرە درەخشانەکەیان دەدایەوە کە زمانی کوردی بوو. بە نیسبەت «سالم»ەوە ئێش و ئازاری زەرفی تایبەتی خۆی کە وا کوتومت زامی دەخستە گۆشتی لەشیەوە لە ئەنجامی تێکچوونی حوکمداریی بابان خەریک بوو لەو زەرفەدا لێلایی دمەو بەیانی کوردایەتی جێبهێڵێ و بگاتە بریق و باقی دمەو ڕۆژهەڵات. وەرامەکەی بۆ نامەی نالی و هەندێ لە هەڵبەستەکانی تری کە داد و برۆ دەکا لە دەست زوڵمی تورکان و دەربەدەربوونی ئەمیرەکانی بابان لەرزوتای کوردایەتییان تێدایە.

حاجی قادر بەر لە سەفەری بۆ تورکیا تەنها لە لایەن کاتەوە هاوچەرخی بویژەکانی بابان بوو، کەمێکی کەم لەوان درەنگتر. لە لایەن باری مادییەوە وەک ئەوان بۆی ڕێک نەکەوت دراوسێی دەرک بە دەرکی ئەمیرێکی کورد بێ تاکوو لە تازیەدا «تا فەلەک دەوری نەدا» دانێ و لە نمایشی سپادا «ئەم تاقمە مومتازە» هەڵبەستێ. وەک ئەوان دەرباری ئەمیرێکی کورد لێی نەبوو بە ئاوێنە دیمەنی پێشکەوتنی فکری سیاسی لە جیهاندا دووبارە بکاتەوە بۆی. یارمەتیدەری تاک و تەنها و کوتومتی حاجی قادر بۆ گەیشتن بە پلە سەرەتاییەکانی فکرەی نیشتمانپەروەری، شاری کۆیێ و فراژیبوونی کۆیێ بوە لە ڕۆشنبیری و ژیاردا، جگە لە زەکا و بلیمەتی خۆی کە شتێک نیە بخرێتە ڕیزی دەوروبەر و زەرفی مادییەوە و حیسابی ئەوانی بۆ بکەین. من بۆ خۆم لەم باوەڕە دام، ئەگەر حاجی لە تەک ئەمیرێکی کورددا ژیابا هەر لە کوردستانەوە دەگەیشت بە قۆناغی خەباتی سیاسی لە ڕێبازی بەرەو پێشەوە چوونی فکردا. ئەم باوەڕەشم لە سەرچاوەی ژیانی «حاجی»یەوە هەڵدەقوڵێ نەک لە بیر کردنەوەیێکی سەراوی وەیا لە خۆشویستنێکی سادەوە: دیتمان بە دوایی لە زەرفی ئەستەمبۆڵدا، حاجی پێش هەموو هاوچەرخانی خۆی کەوتەوە هەروەها پێش جیلی دوای خۆشیەوە. بێگومان ئەگەر زووتریش زەرفێکی وەک زەرفی هاومەسلەکەکانی خۆی چەنگ کەوتبا، کە بویژەکانی بابانن، پێشیان دەکەوتەوە. نالی، کە ئەویش وەک حاجی کوردستانی عیراقی جێهێشت و جوە ئەستەمبۆڵ بەڵگەی ڕاستیی ئەم داوایەمە بەوەدا کە نەیتوانی لە مەیدانی فکری سیاسیدا ئەو ماوەیە ببڕێ کە حاجی لێی تێپەڕی.

حاجی کە زەرفی لەباری وەک بویژەکانی بابانی چەنگ نەکەوت و ڕێکەوتی کۆبوونەوەی هەژاری و خوێندنەکەی تا کۆتایی 1276 کە دەکەوێتە بەرانبەر

1860ی زایینی ئاوارەی کرد و لە سەرچاوەکانی ئیلهامی فکری سیاسیی خەست و ڕووناک دای بڕی، هەر ئەو مەیدانەی لە پێش بوو کە بە کوردی هەڵبەست دانێ و بەپێی سروشتی سەرکەشی خۆی نارەزایی دەربڕێ لەو واقیعە کە هەبوە. بێگومان لە هەڵبەستی کوردیشدا بیستنەوەی شیعری نالی و کوردی هاندەرێک بوە بۆی:
زۆر باس کردنی نالی و کوردی لە دیوانەکەی حاجی قادردا بەڵگەی ئەم ڕاستییەیە. وە نیە لەمەشدا هیچ کەمایەتی پەیدا بێ بۆ حاجی: سەرەڕای ئەوە کە ئیلهام وەرگرتن لە بوێژێکی کورد بۆ بوێژێکی تری کورد جێی سەربڵیندییە لە ڕۆژگارێکدا کە «حافظ و سعدی و متنبی و مجنونی لیلی» نموونەی لاسایی کردنەوە بوون، سەرەڕای ئەم لایەنە بەسە بۆ حاجی لەو وەزعی نالەباری خۆی و گیروکێشەی خەریکبوون بە باسە وشکەکانی کتێبی «سیوطي» بتوانێ لە قەپێلکی کلاسیکی جێوانەوەی ڕستەی عەرەبی و فارسی دەرچێ بۆ سەر چەقی ڕێگەی بەرەو کوردایەتی.

بەپێی ئەوە کە بارستی هەڵبەستە کوردییەکانی یەکجار پترن لە هی فارسی و هەموو زمانێکی تری دیارە حاجی لە سەرەتاکانی بوێژیشیەوە دەست کردوە بە هەڵبەستی کوردی نەک لە دوارۆژەکانی ژیانی لە کوردستاندا. باسی ئەستەمبۆڵ هەر ناکەم چونکە، بێگومان، لەوێ هەرچی گوتوەتی بە کوردی گوتوە. بەڵام «منطق» وا داخوازی دەکا بڵێین ئەو هەڵبەستەی نارەزایی و یاخیگەری بەهێزی تێدا بێ پتر لە ڕۆژانی دوایی مانەوەی لە کوردستان دەوەشێتەوە، هەڵبەستێکی کە بە سادەییش خەریکی دڵداری و فەند و فێڵی ئارایشت بێ، لەگەڵ نارەزایی کەمدا، لە سەرەتاکانی بوێژی حاجی پتر چاوەڕوان دەکرێ.

لەم سرنجانە و لێکدانەوانە و چاو پێدا خشاندنانەوە بە مێژوودا، من دەگەم بەو قەناعەتە کە وا بڕیاری مێژوو و تێکڕای قۆناغی فکری و فەلسەفی کوردایەتی لەوسای کوردستاندا بە جووتە ڕێک دێن هەم لەگەڵ گوتەی دەماودەم و هەم لەگەڵ هەڵکەوتی زانراو و نووسراوی ژیانی حاجی لەودا کە وا دوای چوونی بۆ ئەستەمبۆڵ حاجی قادر سەرکەوتبێ بۆ بەرزایی کوردایەتیی ڕاستەقینە کە هێشتا کوردستانی عێراق لێی سەرنەکەوتبوو.

تابلۆی واقیعی مێژوویی بە هەر دوو باری ماددی و فکرییەوە وێنەی جووڵانەوەی هەستی کوردایەتی کوردستانی عێراق لە سەرەتاکانیەوە بەم شێوەیە دێنێتە بەرچاو:

1) بزووتنەوەی هۆشی حوکمداری بابان بەرەو ڕووناکایی بیری قەومی لە دوای شۆڕشی فەرەنسە بە هۆی واقیعێکی دەوڵەمەندتر لە هی تێکڕای کورد، کە بۆ حوکمدارەکە پەیدا بوە: لەم تێبینیەشدا نابێ هیچ کەم کەینەوە لە هەڵکەوتوویی حاکمی بابان کە عەبدولڕەحمان پاشایە.
2) گەیشتنی بویژانی بابان بەدوا ئەم هەستەی نەتەوایەتی حوکمداری باباندا، بە پلەی ڕەهابوون لە کۆتی کلاسیکی هۆندنەوەی هەڵبەست بە زمانی بێگانە و ئاشنابوون بە دەربڕینی هەستی سادی دەروون بە زمانی مادەرزاد.
3) ئیمکانبوونی گەیشتن بە هەمان پلەی بویژانی بابان لە شاری کۆیەشدا بە هۆی هەبوونی میراتێکی ژیاری و ڕۆشنبیری یەکجار کۆن لەو شارەدا لەچاو دراوسێکانی.
4) هەڵچوونی کەف و کوڵی نارەزایی و یاخیگەری لە هەڵبەستەکانی حاجی قادرەوە لە ئەنجامی «تفاعل»ی سروشتی سەرکەش و خورتی حاجی لەگەڵ واقیعی مەیلەو تازەدا.
5) سەرکەوتنی حاجی لە دوا پێپلکەی نارەزایی فرەوان و بێ ئامانج بۆ سەر بانێکی سنووردار و ئاشکرای هەست بەخۆ کردن و خۆناسینەوە و هۆش شکان بە واتای «مافی نەتەوایەتی» لە ئەنجامی خۆدیتنەوەی لە دەوروبەرێکی خاوەن مێژوویێکی پێشکەوتووتر و گووراوتر[58] لەچاو کوردستان، کە ئەستەمبۆڵ بێ.

وەک دەبینی یارمەتیدانی هەڵکەوت - واقیع - لە لاییکەوە و لێ هاتوویی تاکە مرۆڤ لە لاییکی ترەوە کاتێک کە دەگەنە یەکتر بە بەریانەوە هەیە «فکرە» لە زەمانێک دەربخەن و لە زەمانێکی دواتردا دەرنەکەوێ، لە جێگەییێک پەیداکەن و لە جێگەییێکی تردا سەروشوێنی نەبێ، لای یەکێک بیکەن بە مەشخەڵ و لای یەکێکی تر نەترووکابێ.

---

[58] - وشەی «گووران» کە هەندێ کەس بە «گووران» دەینووسن نابێ تێکەڵ بێ لەگەڵ وشەی «گۆڕان» کە هەندێ نووسەر بە «گۆرران»ی دەنووسن. وشەی «گووران»، «گووران» لە عەرەبی دا بە واتای «نضوج، اختمار» دێ. وشەی «گۆڕان، گۆرران»یش لە کوردی ئێستاکەماندا بە واتای «تطور، تبدل» بەکار دێ. گووران دەبێ لە «گروون، گروین»یش جودا بکرێتەوە کە بە واتای «سلخ جلد»ە.

نووسەر هەن حەز بەوە ناکەن «تاک» چ دەورێکی هەبێ لە هێنانە دی باوەڕ وەیا گۆڕان وەیا بەسەرهاتی مێژوویی. ئەو نووسەرانە هێندە لە دژی دەوری «تاک»ن لە مێژوودا هەر دەڵێی بە لایانەوە «تاک» لە «مریخ»ـەوە بە میوانی دێ و حیسابی «تحلیل»ی ماددی سەر ئەرز تێک دەدا. بەڵام گریمان تاک حیساباتیش تێک بدا، خۆشی بێ و ترشی بێ، خۆ دێنێتە ناو حیسابەوە. لەو زەرفانەدا کە جارێ زوربەی میللەت نەگەیشتوە بە پلەی خەبات کردن و جووڵانەوە بۆ وەدەستهێنانی مافی خۆی و بەرهەڵستی کردنی ستەم، هەر «تاک» پەیدا دەبێ شتێک بڵێ و بکا ڕووی گۆمی مەند و داوەستاوی کۆمەڵ بشڵەقێنێ. دەبینی سەدان ساڵ تێدەپەڕێ بێ ئەوەی یەک بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی گشتی ڕووبدا، بەڵام لەو ماوەیەدا چەندین «تاک» شۆڕشی هەست و بیر وەیا کردەوە بەرپا دەکەن و گیانی کۆمەڵ دەهەژێنن، ڕەنگە دوای ئەو هەژاندنەش، سەرلەنوێ، کۆمەڵ بکەوێتە باوەشی خەوێکی دوورودرێژی وەک حەپەسانەوە و جووڵەییێکی ئاشکرا نەکا لە جووڵەی ئاسایی ڕۆژانەی گوزەران بەولاوە کە وا بە لای منەوە مێژوو دروست ناکا.

بە «مجاملە - دڵخۆشکەری» نەبێ تێکڕای چالاکی گەل کە لە ڕۆژێکەوە بۆ ڕۆژێک دەیکا لە پێناوی گوزەران و «پلەی ژیان - تنازع البقاء» ئەوە نیە پێی بگوترێ مێژوو. کاری ئاسایی کە بە درێژایی سەدان ساڵ سەد هەزار جار خۆی دووبارە دەکاتەوە و هیچ دەنگێک ناداتەوە نە مێژوو و نە هیچ. بەڵێ نرخی ئەو کارانە مەیدانی خۆی هەیە کە مێژوو نیە و شتێکی ترە. کاری ڕۆژانەی هەزاران ساڵی خەلق وەک زەوییێکە تۆدەرێک دێ و تۆی دەدا و دەبێتە خاوەنی دەغڵەکە و گوڵەگەنمەکان کە لە زەویەکە دەڕوێ بەڵام زەویەکە بۆ خۆی خاوەنی شتێک نیە. کاتێک زەویەکە دەبێتە شریک و پێکهێنەری گوڵەگەنم کە بە خواهشتی خۆی خواردن بدا بە ڕەگی پنجە گەنمەکە، کە خواهشتی نەبوو دەبێتە «امر واقع»ی ئاسایی. گەلی «مصر» کە هەرەمی دروست دەکرد بۆ فیرعەونەکان چ پشک و بەشی تێیاندا نەبوو، بەش و پشکی ئەو لەوەدا دەبوو کە هەرەم دروست نەکا. لە زۆرینەی ئەو جەنگە وێرانکەرانەی کە لە میانی گەلاندا قەوماوە، گوناهەکە و ئۆباڵەکە دەچێتە ملی پاشا و قوماندان و پاڵەوانەکانەوە نەک گەلەکان چونکە بە خواهشتی ئەو گەلانە جەنگەکان بەرپا نەبوون تا لەسەر وانی حیساب کەین، خوا و ئینسافیش لێمان قبوڵ ناکا لەبەر خاتری باوەڕێکی چەوتی خۆمان گوناهی ئەو

جەنگانە بخەینە ئەستۆی گەلانەوە و بڵێین هەر دەبێ خالقی هەموو شتێک گەل بێ با ئەو شتە مەلعوونیش بێ.

من دەڵێم تاکەکانی گەل هەر یەکەیان لە ژیانی ڕۆژانەیاندا ئەوەندە ناشیرنی و ناڕەوایی و دزێویە هەیە کە پێی نەوێ دزێوی ئەو مێژوانەشیان بخەینە سەر تاکی بەسەزمانی بێ دەسەڵات چ گوناهێکی نەبوە لە پەیدابوونیان، تەنانەت ئیمڕۆش خوا لێمان هەڵناگرێ زوربەی گەل تاوانبار بکەین بەو کارە دڕندانە و ناڕەوایانەی ئەوان هیچ دەستێکیان تێیدا نیە. چ مانعێک نیە لەودا گەل پێی بگوترێ داهێنەر و خالقی مێژووی مەلعوون ئەگەر بەڕاستی خۆی خاوەن و داهێنەری بووبێ.

لەم ڕۆژگارەی خۆماندا بە چاوی خۆمان دیومانە گەلێک لە گەلان زۆر بە ئارەزۆ و پڕ بە دڵی خۆی بەشداری کردوە لە تاوانێکی دڕندانەی گەورە دژی گەلێکی تر، لە کۆنیشەوە وا بوە گەلێک بە هۆی باوەڕەوە وەیا لەبەر تەماع تێ کردن، هێرشی بردوە بۆ سەر گەلێکی تر و لێی کوشتوە و ماڵی وێران کردوە و شتی لێ بەتاڵان بردوە. هەر لە نێوان هەمان گەلدا عەشیرتێک ئەوی تری شڕ کردوە خۆیشی بەو کارە هەڵداوەتەوە. کە ئەمە وا بێ من و تۆ بڵێین چی! بەڵام کە وا نەبوو من و تۆ بۆچی لە هیچەوە خەلقی کەین هەر هەتا بگوترێ گەلان مێژوویان دروست کردوە. خۆ ئەوەی ڕاستی بێ سەیرێکی زۆر سەیرە کە وا هەر هەمان کەسانی بە پەرۆشن بۆ ئیسپاتی دەوری گەل لە پێکهاتنی مێژوو، لە هەموو کەسانی تر خەریکتر و دڵگەرمترن بۆ ڕماندنی ئەو مێژووە. من لەو تەرزە دڵگەرمییە و خۆ خەریک کردنە خۆڕاییە ڕەها بووم و گەیشتووم بە ڕازیبوون بەم ڕاستە حیسابە: چی تاک کردوەتی با بە هۆی تۆقاندن و چەوساندنەوەی خەلقیش بێ ئەوا هی تاکە بە چاک و خراپیەوە، ئەوەی گەلیش تێیدا بەشدارە لە ڕێی خواهشتی ئاشکرایەوە ئەوا هی گەلە یاخود بە بەشداری گەلە، ئەویش بە چاک و خراپیەوە.

لەم خستنە بەر چاوی پەیدابوونی گیانی کوردایەتی، ڕۆڵێکی گەلی کورد هەبێ و تەقەللا و خواهشتی ئازادی تێدا بێ زۆر دواکەوتوە لە پژانی هۆشی تاکەکانی کە حوکمدار و بوێژ و مەلا بوون. چ لزووم نابینم ڕازی نەبوونمان لە ڕووداو و هەڵکەوت بمان خاتە سەر خەریکبوون بە هەڵبەستی ڕۆڵێکی ساختە بۆ گەلی کورد. گەلانی تریش هەر وا بوون: جووڵانەوەی تێکڕایان چەندین ساڵ و زەمان لە هی فەیلەسووف و خاوەن بیرەکانیان دوا کەوتوە. هەر وەک زوربەی میللەت ناتوانێ ببێ

به زانای کیمیا و فەلەک و بایۆلۆجی، هەروەهاش ناتوانیٚ شان بەشانی فەیلەسووفێک وەیا بویٚژێک وەیا حوکمدارێک بیری برِوا بۆ «واتا، فکر، تجرید» کە مافی نەتەوایەتیش لەو پەراوێزە دایە.

بەلاتەوە سەیر نەبیٚ کە من مافی نەتەوایەتی بە «واتا و تجرید» دادەنێم لەبەر زیهنی گەلی کورددا لەو کاتە باسلێکراوەی سەدەی نۆزدەمدا: پیاوێکی عادەتی دەرودەشت و کوچە و بازارِی کوردستان، بەرژەوەند و گوزەرانی خۆی و خێزانەکەی هێندە نەبەسترابۆوە بە هەریٚمە دوورەکانی کوردستانی دوور لە هەریٚمی خۆی تاکوو لە ریٚی ئەو پەیوەندییە مادییەی بەرژەوەندی موشتەرەکەوە هەستی نەتەوایەتی بۆی ببیٚ بەو هەستە کە لە شتی ماددی بەرچاوەوە پیٚی دەگا وەک گەرم و ساردی ئاو و هەوا وەیا ترش و شیرنی تریٚ و پەسیرە وەیا خۆشی و ناخۆشی بێنی گولّ و زبلّ...

بابایێکی سنەیی، باری چاک و خراپی ئابووریی دیاربەکر بەر هیچ راستە حیسابێکی ناکەویٚ و کار لە وەزعی ناکا تا لە خۆوە بیری بۆ ئەوە برِوا کە وا کوردبوونی سنە و دیاربەکر ئەرکێکی ئەدەبی وەیا ماددی موشتەرەک دەخاتە سەرشانی هەر دوو مەلّبەند و ئامانجێکی یەکچوویان بۆ دروست دەکا. پالّەیێکی ئەوسای هەلّەبجە ئەوەندەی بۆ گیسکێکی خۆی دەکۆشا و لەگەلّ دز شەرِی دەکرد و بە گژ گورگدا دەچوو، بۆ کوردبوونی هەولێر و ئامێدی دەییٚکی ئەمەش ئامادەی خۆ ماندوو کردن نەدەبوو، رِەنگ بوو هەر بیریش نەکاتەوە لە خەبات کردن بۆ کوردبوونی هەولێر، مەگەر بە دەرسدان و فێرکردنی.

خۆ ئەوەی راستی بیٚ پالّەی ئەوسای هەلّەبجە نەک بە نیسبەت هەولێرەوە بیری لە خەبات نەکردۆتەوە، لە عاست پالّە دراوسێکەی خۆیشی کەمتەرخەم بوە چونکە گوزەرانیان بەیەکترەوە نەبەسترابۆوە. پەندی «لە برام دەن لە من مەدەن، وا دەزانم لە جەوالّی کا دەدەن» بەرهەمی کوتومتی بێپێوەندی میانی سوود و بەرژەوەندی تاکەکانە. ئێستاش کار و باری فەلاحێکی کورد کە زەوی خۆی بکێلّیٚ چ پەیوەندییێکی نیە لەگەلّ هی دراوسێکەی. لە ژیانی سەرەتاییدا ئەم بێپەیوەندییەی میانی بەرژەوەندی خەلق دیمەنێکی گشتی و جیهانییە و باس لێکردنی زۆری بە بەرەوەیە. لێرەدا ئەم ئیشارەتە بۆی شتێکی ناچاری بوو، پێویستی مەبحەس داخوازی کرد.

ئەمە حاڵی زوربەی خەلقە بە نیسبەت بیرکردنەوە لە «واتا و تجرید». بەڵام وەزعی زیهنی حوکمدارێک وەیا بویژێک وەیا فەیلەسووفێک شتێکی زۆر جودایە و لە هەموو ڕوویێکیشەوە جودایە. هەست و پەرۆشی ئەمانە بۆ «فکر و واتا» شتێکی دوورەدەست نیە بە نیسبەت سەرچاوەکانی بیر کردنەوە و، تا ڕادەیێک، خەریکبوونیشیان. دوور مەبینە هەر یەک لەمانە بەرژەوەندی تایبەتی خۆی بکا بە قوربانی کوردبوونی هەرێمێکی هەرە دووری کوردستان. میللەتیش کاتێک کە گەیشتە پلەی بزووتنەوە و ڕاپەڕینی نیشتمانی لە ئەنجامی پێشکەوتن لە مەیدانەکانی فکر و ماددەدا، ئەویش وەک ئەدیب و فەیلەسووف خۆ بەخت دەکا لە پێناو کوردبوونی هەموو بستێک لە خاکی وڵاتەکەی.

وەنیە هەر سەرەتای بیر کردنەوەی نیشتمانی لە تاکانەوە دەست پێ بکا، فەلسەفەی چینایەتیش کە بە زاهیر دەبوو لە جەرگەی چینی هەژار و ڕەشوڕووتەوە هەڵستێ، ئەویش لە خاوەن بیر و فەیلەسووفی چینەکانی هەورازترەوە هەڵدەقوڵێ، دواتر سەرەوژێر دەبێتەوە بۆ ناو ڕیزەکانی چینی هەژار و پرۆلیتاریا. خواش دەزانێ بە چ شێوەیێک دەچێتە مێشکیانەوە. کرێکارێک وەیا پاڵەیێک وەیا کاسبێکی بچووک ئەو ئیمکانە زیهنییەی نیە بگا بە پلەی پاڵاوتنی «تیۆری» لە ڕاگەیاندن و پەیامەکانی واقیعەوە؛ ئەو ناتوانێ واقیع بڵێتەوە لە گوتە و نووسینی خۆیدا، ڕەنگە هەر نەشزانێ بنووسێ.. واقیع تێ ناگا تا بتوانێ لە نووسینی خۆیدا بیڵێتەوە. ئەگەر فەیلەسووفی چینی بورجوازی وەیا هەورازتر لە جیاتی پرۆلیتاریا فەلسەفەی پرۆلیتاری دانەنێن ڕەنگە ئەو فەلسەفەیە هەر دانەنرێ وەیا سەدان ساڵ دوا بکەوێ. دوای دانانی فەلسەفەکەش دەیان و سەدان ساڵ تێدەپەڕێ بەر لەوە زوربەی پرۆلیتاریا تێبگا وەیا خەباتی بۆ بکا. کە خەباتیشی بۆ کرد دەیان ساڵ تێ دەپەڕێ تا تێدەگا لە کوێوە هەڵە و چەوتی کەوتۆتە تطبیقیەوە.

بە ڕاستی کاری «تنظیر» واتە وەرگرتنی دەستوور و «نظریە» لە هەڵکەوت.. هەبوون.. سروشت.. موجود.. پلەی گۆڕان.. بەرژەوەند.. یا هەر تەعبیرێکی تر کە خۆت ڕات لێیە، پۆپی دەسەڵاتی زیهنی مرۆڤە و لە هەموو کردەوەکانی زەحمەت ترە. ئێستاش سەرم لەوە سووڕ دەمێنێ چۆن زانایانی فەلەک بەر لە 2500 ساڵ توانیویانە نەخشەی بزووتنەوەی ئەستێرەی زوحەل وەیا مەریخ بکێشن. فەرموو خۆت سەیرێکی ئاسمان بکە و پێم بڵێ کوا زوحەل و کوا مەریخ. هەر زەحمەتی و

سەختی تێگەیشتنی ئاسمانە کە ناهێڵێ تاک تاک نەبێ پسپۆڕی تێدا پەیدا بێ، خۆ لە نێوان نەخوێندەواندا فەلەکناس هەر پەیدا نابێ.

لە فەلەک واز بێنە و وەرە سەرباسی زمان کە هەموو دەم لە بەر گوێی خەلق دەزرینگێتەوە: لەوێشدا دۆزینەوەی دەستوورێکی مەیلەو نهێنی چەندین زانای تێدا بە هەڵە دەچێ.

خولاسە «فەلسەفە، نظریە، تجرید» لە هەر مەیدانێکدا بێ، بەپێی تایبەتیەکانی ئەو مەیدانە زەحمەت و نەفەس برە، هەڵبەت یەکێک لەو فەلسەفانەش بیری نیشتمانی و قەومی و چینایەتییە.

بەڕاستی تێکڕای باسی پژانی هۆش و هەستی نەتەوایەتی کورد و سەرە باسی ڕۆڵی «تاک» لە مێژوودا تا بلێی پان و قووڵن، دەشزانم ئەم چەند دێڕە وەیا لاپەڕەی تازە لە نووسینیان بوومەوە هەر بایی ئەوە بوون کەلێنی ڕەخنەگر بدەن تا بە ئارەزۆی خۆی ڕەخنەم لێ بگرێ، هەر خۆم چەندین ڕەخنەم هەیە لە نەفەس کورتی و سەرڕەوی نووسینەکەم لەو باسانەدا. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ناچار بووم بەوە کە ئیشارەییێکیان بۆ بکەم و هەوڵ بدەم کولانەییێک بکەمەوە تا هەر نەبێ پڕشنگێکی ئەو باسانە بکەوێتە ناو نووسینەکەوە چونکە بێگومان ئەو باسانە پەیوەندییێکی بەهێز و نزیکیان هەیە لەگەڵ بابەتی نووسین: بە قەدەر ئەوە باران کاریگەرە لە ڕوانی گیا و گوڵ، پەیدابوونی سەرەتای هەستی نەتەوایەتیش لە کوردستانی ژێرەوودا عەلاقەدارە لەگەڵ هەڵکەوتنی حاجی قادر، هەرنەبێ ئەمە باوەڕی منە و دەبوو ڕوونی کەمەوە یا هەر بە جارێ لە هەموو باسەکە وسکت بم.

پوختەی قسە ئەوەیە، چی زانراوە، لە ڕێی قسەی دەماودەم و واتای هەڵبەستەکانی حاجی و دەستنووسی خۆی بەسەر کتێبەکەی سیوطییەوە هەموویان لەوەدا یەکتر دەگرنەوە کەوا حاجی قادر دوای چوونی بۆ ئەستەمبۆڵ کوردایەتی کردوە. سەرەڕای ئەمانە، کە هەموویان بەڵگەی مادین، پژانی هەستی کوردایەتیش لە کوردستانی سەردەمی حاجی قادردا وا داخوازی دەکا کە وا حاجی قادر دوای گەیشتنی بە واقیعێکی پێشکەوتووتر لە کوردستان ئیمکانی ماددی لەباری بۆ پەیدا بووبێ کە خەباتی سیاسی و کوردایەتی تێدا بکا: ئا ئەم لێکدانەوەیەش بەڵگەی زیهنییە.

**سەرەوژوور چوونەوەیێک**

خوێنەر بمبوورێ لەوەدا کە بە ناچاری زنجیرەی باسی بەسەرهاتی حاجی قادرم بڕیەوە بۆ مەبەسی ڕوون کردنەوەی لایەنی زۆر گرنگی سەرەتای دەست پێکردنی خەباتی سیاسی حاجی، بۆ ئەم مەبەسە هەنگاوێکی زەمەنی فرەوانم هاویشت لە ڕۆژانی خوێندنی باڵەکەتیەوەی تا دوا ڕۆژی مانەوەی لە کۆیێ بەر لە سەفەری بۆ تورکیا. ئێستا کە وا ئەو ئەمانەتە زلەم لە ئەستۆی خۆم داڕنی و خستمە سەر خوانی مێژوو بۆ بەرچاو و زیهنی بینەر و نووسەر و خوێنەری کورد و غەیری کورد، بەرەو دوا هەڵدەکشێینەوە بۆ ئەو جێگە و کاتە کە لە گەشتەکەی خوێندنی حاجی لە باڵەکدا پێی گەیشتبووین.

پێشتر گوتم نازانین دوای کەینوبەینی «میرکوڕان و میرکچان» و پەخشبوونی ماکی هەرا و بەزمەکە کە تاقمی «پەڕبەجیق» بوو، حاجی قادر چەند ماوەتەوە لە باڵەکەتی. نە شتێکمان بۆ ماوەتەوە لە گوتەی دەماودەم نە چ نووسینێک بە ئێمە گەییوە حاڵیمان بکا کام ساڵ و کام کژ حاجی لە باڵەکەتیەوە چوە بۆ کوردستانی ئێران. تەنها ڕێچکۆڵەیێک نزیکمان خاتەوە لە گەڵاڵەکردنی فکرەیێک لە بارەی ماوەی مانەوەی حاجی لە باڵەکەتی دوای ئەو هەرایە، ڕێچکۆڵەی پڕ کۆسپ و بەردەڵانی تەخمینە. لێرەشدا بۆ بەراورد کردن و لێکدانەوە و تێ بڕ کردن چەند بنگەیێکی پتەو هەیە هەڵوەستیان لەسەر بکەین و بە دەور و پشتی خۆمان و مەورزووعدا بنواڕین: لەم چەند تێبینییەی خوارەوەدا شێوەیێکی ڕاستی وەک تارمایی پشت پەردەی تەنک دێتە بەر چاوی سرنج دەر:

1) حاجی قادر تاوانێکی نەبوە وەک تاقمەی «پەڕبەجیق» ناچاری بکا باڵەکەتی جێ بهێڵێ و لێی دەرچێ.
2) حاجی کە هاندەرێکی نەبوە بۆ دەرچوون لە باڵەکەتی، خولیاییکشی نەبوە وەک هی حاجی عەبدوڵا بەو وڵاتەی ببەستێتەوە.
3) ڕووداوی ناقۆڵای وەک ئەو هەرایەی «میرمیرانێ» هەستی ڕاحەتی کەم دەکاتەوە لای کەسێک هەراکەی دیبێ با بۆخۆیشی تێیدا گوناهبار نەبووبێ. ئەگەر هۆیەکانی مانەوە و نەمانەوەی حاجی لە باڵەکەتی بژمێرین ئەو هەرایە دەخرێتە ڕیزی هۆیەکانی نەمانەوەی.

4) به دوا ئەم چەند لێکدانەوەیەدا لێکدانەوەیێکی جغرافیمان دێتە بەر لە لای خۆیەوە یارمەتیمان بدا لەو تەخمینەدا. کە بێین و ڕووپێو (مساحه)ی باڵەکەتی بە ڕووپێوی ئەو شوێنانە بگرین کە حاجی گەشتی تێدا کردوە لە دیوی کوردستانی ئێراندا دەبینین ڕووپێوی ئەودیو گەلێک فرەوانترە. لە دیوانەکەی و کتێبەکەی سیوطي ناوی لاجان و سندووس و بانە و بێتووش هەن. نووسینی تریش هەیە لەگەڵ «تواتر» کە ئیسپاتی ئەوە بکەن حاجی لە سابلاغیش بۆ خوێندن ماوەتەوە ناوی سەردەشتیش لە شیعری حاجیدا دەدیترێ. ناوی سەردەشتی بە تەوریە لەم چوارینەدا ساز داوە لە حاڵێکدا دووچاری نەخۆشی زەردوو (زەرتک) بوە:

لە سەردەشتی میحنەت پەڕەی کردەوە
کەوانی بەلا لۆکەکەی پەیکەرم

بەلاڵووکە دەرمانی دەردم دەڵێن
بە پارە وەگیر ناکەوێ بی کرم

به یەکدی گرتنی ڕووپێوی باڵەکەتی لەگەڵ کوردستانی ئێران یارمەتی ئەوەمان دەدا بەپێی پانایيان پشکیان بۆ دانێین لەو حەوت ساڵەی گەشتی فەقێیەتی حاجی قادر چونکە بەلای کەمەوە حەوت ساڵی تەواوی لەم دوو هەرێمە بەسەر بردووە.

ئەمانە ڕاستی زیهنی و واقیعین. باوەڕ دەکەم ئەگەر لێرەشدا لە ڕێی «مەسلەتی»یەوە بەشە زۆرترەکەی ئەو حەوت ساڵە بدەین بە کوردستانی ئێران بە ڕێبازێکی هەڵە و ناعادلانەدا نەڕۆیشتووین. کە بڵێین حاجی لە 1270 وە تا 1277 بە خوێندنەوە خەریک بووبێ لەم دوو وڵاتەدا، سێ ساڵی سەرەتا بۆ باڵەکەتی و چوار ساڵی دواییش بدەینە کوردستانی ئێران مەسلەتێکی بێتەرەفانەمان کردوە. مانەوەی حەوت ساڵ بێ، وەک بۆی چووین، یاخود بە پشکنینەوەی زیاتر هەڵکشێ و داکشێ بنگەی مەسلەتیەکە و دابەش کردنەکە ناگۆڕێ، چونکە ڕووپێوەکان و ناوی شوێنەکانی لێ خوێندنی حاجی هەر ئەوەن کە هەن.

دیسان دەبێ لێرەدا بڵێمەوە، بڕیاری یەکجارەکی لە دەسەڵاتی مندا نیە. دەشێ بەڵگەی گوتەی دەماودەم وەیا نووسین وەیا ڕاگەیاندنی ڕووداو وەیا لێکدانەوەیێکی ورد و قووڵتر ئەم حیسابەی من هەڵوەشێنێ وەیا بیگۆڕێ چونکە مومکینە چۆنەتی ڕاستەقینە شتێکی جودا بێ لەو ڕواڵەتەی بە تەخمین دۆزیمانەوە وەیا نەخشەمان کێشا.

بە ڕاستی کێشانی نەخشەیێک کە سەرلەبەری گەشتەکەی حاجی دیار خات پێویستی هەیە بە هاریکاری گشتی، واتە هەر کەسێک شتێکی لێ بزانێ زانینەکەی خۆی بخاتە سەر بارستی زانراو لەم گەشتە. وە نیە ئەمەش کارێکی گران وەیا کەس نەکردە بێ، بە پێچەوانە هەم ئاسانە و هەم هی وەک ئەو لە کۆن و نوێ و لە هەموو لایەکدا کراوە و بەرهەمیشی زۆر بە نرخ بوە: هەر کەسەی شتێکی لێ دەزانێ بە دوو سێ دێڕ بیخاتە سەر کاغەزێک و بینێرێ بۆ کۆڕی زانیاری کورد وەیا زانکۆی سلێمانی وەیا کارگێڕیەکانی «تربیە» لە پارێزگاکانی کوردستان وەیا کارگێڕی گشتی خوێندنی کوردی لە بەغدا وەیا یەکیەتیی ئەدیبانی کورد وەیا لیژنەی بیرەوەری حاجی قادر لە کۆیێ وەیا دەستەیێک لە وانەی بە ڕۆشنبیری کوردییەوە خەریکن وەیا هەر نووسەرێک کە لە سەر حاجییان نووسیوە وەیا هەر جۆرێکی تر کە خۆی بەلاوەی پەسندە، بە مەدا مەعلووماتەکەی لە تێچوون دەپارێزێ و خەرمانی شارەزاییمان بە ژیانی حاجی دەوڵەمەندتر دەکا.

چەند جاران گوترا و ئێستاکەش دەبێ بڵێمەوە مەعلووماتی چەندوچۆنی ئەو ساڵانەی خوێندنی حاجی لە کوردستانی ئێراندا، وەک هی تێکڕای ژیانی، پچڕپچڕ و ناوەناوە و لێرە و لەوێن. بێتەگەرە نازانرێ کە لە باڵەکەوە تێی کردوە بۆ دیوی ئێران هەوەڵ جار لەکوێ بەند بوە و لێی خوێندوە. بەڵام ڕەنگە بتوانین لە ڕێی سەرەداوێکەوە کە بە دەستمانەوەیە لە باڵەکەتی، بگەین بەو سەری داوەکە لە کوردستانی ئێران بە هۆی هەڵکردنەوەی داوەکە، باڵەوباڵ، لەم سەرەوە بگەین بەو سەر.

سەرەداوەکە لەوەڕا دێتە دەستمانەوە کە وا حاجی دوای پیربوونی هاوین بە دەمەو پایزەوە لە کوێستانەکانی باڵەکەوە سەروژێر بووبێتەوە بەرەو کوردستانی ئێران. زانیمان، پێشتر لەم نووسینەدا، فەقێ کە گەشتی بەرەو کوێستان دەکەن لە گەرمیانەوە، دوای بەسەر چوونی بەهار و لە دەمەو هاویندا دەست بەو گەشتە

دەکەن. کاتێک بە پێچەوانە، لە کوێستانەوە بەرەو گەرمێن ببنەوە لە کۆتایی هاوین و دەمەو پایز سەرەوژێر دەبنەوە بۆ گەرمێن. ئەمە بڕیاری واقیعە و بە دەست کەس نیە، دەستوورەکەش ناگۆڕێ مەگەر کاریگەرێکی لاوەکی بێ و بە زۆر بیگۆڕێ. بە نیسبەت حاجی قادریشەوە چ ڕووداوێکی ئەوتۆ نەبیستراوە ناچاری کردبێ لە کاتێکی بێژۆک (شاذ) دا بەرەو گەرمێنی کوردستانی ئێران لە کوێستانی باڵەکەتی کوردستانی عێراقەوە سەفەر بکا.

بەپێی ئەم لێکدانەوەیەم بیرم بۆ ئەوە چوو کە وا حاجی هەوەڵ زستانی دوای جێ هێشتنی باڵەکەتیی لە جێگەیێک ڕابواردبێ هەم خوێندنی تێدا بکرێ و هەم فەقێی تێدا بحەوێتەوە و بحەسێتەوە. بێ ئەوە هیچ بەڵگەیێکی نووسراو وەیا گوتەی دەماودەمم بە دەستەوە بێ و تەنها لە ڕێی ئەو لێکدانەوەیەی تازە خستمە بەرچاوی خوێنەرەوە من بۆ ئەو ئیحتیماڵە چووم کە وا حاجی دوای جێ هێشتنی باڵەک لە دەمەو پایزدا بۆ سابڵاغ ڕۆیشتبێ. ویستم بزانم ئاخۆ لایەنی نێزیکی و دووری لەگەڵ ئەم لێکدانەوەیە ڕێک دێ؛ چاوێکم بە نەخشە (خریطە)دا خشاند دیتم سابڵاغ دەکەوێتە کێشی باڵەکەتی، واتە خەتێکی ئاسۆیی بکێشی لە باڵەکەوە بەرەو خاوەر بە سەر سابڵاغدا دەکشێ. لەم ڕووەش سابڵاغ دەبێتە نزیکترین ئیحتیمال.

هەموو مەرجەکانی خوێندنی سوودبەخش و حەوانەوە و حەسانەوە، سەرەڕای نێزیکی، لە سابڵاغدا کۆبۆتەوە. مەلا و «مدرس»ی چاک و مزگەوتی ئاوەدان و کەرەستەی حەوانەوە بە تێر و پڕی لە سابڵاغدا هەبوون، حاجیش لەوە زیاتری ناوێ، بە دەستیشی ناکەوێ تا دوودڵی بکا و جێگەیێکی تر هەڵبژێرێ بۆ خوێندن. کەواتە ئەگەر داخوازی حاڵ بکەین بە بەریوان دەبێ بەوە ڕازی بین کە بڕیاری بەریوان غەیری سابڵاغ دەسنیشان ناکا بۆ هەوەڵ جێگەی تێدا خوێندن بە نیسبەت یەکێکی وەک حاجی قادرەوە کە لە پایزدا بە نیازی خوێندن بچێتە کوردستانی ئێران لە باڵەکەوە.

کە دڵی خۆمان بەو لێکدانەوەیە تەسکین کرد و گوتمان حاجی بەر لە هەموو جێگەیێک ڕووی کردە سابڵاغ، لەوە بەولاوە نازانین چەند کات لەوێ ماوەتەوە و بە دوا ئەوێدا بۆ کوێ چوە و گەشتی خوێندن چەند جێگەی یەک لە دوای یەکی پێ گۆڕیوە و چەند جاران هاتۆتەوە سابڵاغ. خەتی هامووشۆی حاجی بە هەرێمەکانی کوردستانی ئێراندا چ سەردەری لێ ناکرێ.

ڕەنگە بەلای هەندێ کەسەوە دۆزینەوەی ئەم خەتە بایەخێکی نەبێ و نەدۆزینەوەشی زیانی نەبێ، بەڵام من لەو باوەڕەدا نیم و ئەگەر بۆم کرابا خەریک دەبووم بە پێکهێنانی خەتێکی زیهنی لە ڕێی وردبوونەوە لە هەموو ئەو سەرچاوانە کە لێ وردبوونەوە هەڵ دەگرن. وەنیەئەم کارەش لە ژوورووی دەسەڵاتی تۆژینەوەی پسپۆڕانەی نەفەس درێژ بێ، بەڵام نەفەسی وا درێژ بە بەر سینەی منەوە نیە با خۆشم بە پسپۆڕ دانێم لە هەڵگرتنەوەی شوێن پێی گەشتەوەران.

وەک لێرە بەپێشەوە لە موناسباندا گوتومە، تەواتوری بێگومان هەیە لەودا کە حاجی دڵی بۆ کچێکی سابڵاغی چوە، بەڵام نە ناوی کچە و کەسوکاری دەزانرێ و نە مەعلوومە دڵدارییەکە چەندی دەوام کردوە و نە هیچ باسی ئەو لایەنەش هەیە کەوا بۆچی دڵدارییەکە سەری نەگەیاندوە بە مارە کردن. بەهەمەحاڵ ئەو دڵدارییەی حاجی ڕێکەوتێکی بایەخدارە لە ڕووی ئەوەوە کە وا کەلەبەرێک دەکاتەوە بۆ ناو دەروونی حاجی و پەردەیێک لە عاتیفەی هەڵدەداتەوە لەوەڕا تیشکێک بخەینە ناو ئەو دەروون و عاتیفەیەوە و هەندێک بە ناوەڕۆکی ئاشنا بین. دوای نەختێکی تر ئەم گەشتە پڕ جورئەتەمان بۆ ناو باغی دڵداری حاجی دەست پێ دەکەین و وەرامی هەندێ پرسیار دەدەینەوە و سەیرەک (علامە تعجب) لەسەر ئەو مەوزووعە دەسڕینەوە: ئەمە دەکەین لە سنووری ئەو ئیمکانە کە هەبوونی سەرچاوەی لێکدانەوە بە دەستمانەوە دەدا.

بەپێی باس و خواسێک کە سابڵاغ بە ئێمەی ڕاگەیاندوە حاجی سەردەمێک لەوێ ماوەتەوە. لەو ماوەیەدا بەینێک لە مزگەوتی ڕۆستەم بەگ لای «مەلا حسێن»ی خوێندوە، مەلا حوسێنیش هەر بە مزگەوتەکەوە هەڵدراوەتەوە و گوتراوە مەلا حوسێنی مزگەوتی ڕۆستەم بەگ. چەند دێڕە شیعرێکی لە دیوارێکی مزگەوتەکە نووسی بۆوە، هەر مابۆوە تا لەو ساڵانەی دواییدا ژێر سواغی سپیکاری کەوتوە. بێگومان کەمتەرخەمی و بێ پەرۆشی نەبا دەبوا نووسینەکە وەک خۆی بهێڵرێتەوە لە ناو سپی کاریەکەدا و ببێتە میراتێکی مێژوویی و ئەدەبی و نەتەوایەتی زۆر نرخدار. ناشزانم برە شیعرەکە هەڵبەستی خۆی بوە یا شیعری شاعیرێکی تر بوە و کەوتۆتە بەر دڵی و کردوەتی بە مەشقی سەردیوار.

کارێکی وەک ئەمە لە مزگەوتێکی کۆیەشدا کرا بەڵام بەنیسبەت براییێکی حاجی قادرەوە کە «کەیفی جوانڕۆیی»یە. بۆ خۆم دیتبووم لە دیوارێکی هەیوانی مزگەوتی

حاجی مەلا عومەر لە کۆیێ بە خەتێکی زۆر خۆش ڕستە «عز من قنع و ذل من طمع» نووسرابوو. دەماودەم لە پێشینانەوە دەگوترا خەتەکە هی«کەیفی»یە. ئەم گوتەیەش جێی گومان لێ کردن نیە، چونکە هەر وەک هۆیەکی تایبەتی نیە بۆ گومان لێکردنی بەڵگەش هەیە پاڵپشتی بکا و ڕاستبوونی بسەلمێنێ: لەناو کەوانەی یەک لە دوو پیتە «ع»ەکان کە بە خەتی گەورە نووسرابوو چوارینەیەکی فارسی خەتخۆش هەبوو بە نووسینێکی ورد لێرەدا تۆماری دەکەم:

نوشتم این براین ایوان خانه
بماند از من مسکین نشانه
اگر گویند این مسکین کجا رفت
بگو بگریخت از جور زمانه

واتای چوارینەکە کەوا لێرەدا دەینووسم:

ئەمەم نووسی لە هەیوانی ئەم خانەیە
تا لە منی مسکینەوە بە نیشانە بمێنێ
ئەگەر بڵێن ئەم مسکینە بۆ کوێ چوو
بڵێ لەبەر ستەمی ڕۆژگار هەڵات

بە تەواوی لەگەڵ ئەو بەسەرهاتە بێگومان دەگونجێ کە هۆی دەرچوونی کەیفی بوە لە کۆیێ. کە وا بێ لەم چوارینەیەدا سێ شایەد کۆ دەبنەوە بۆ ساغ کردنەوەی هەڵبەستیان لەلایەن «کەیفی»یەوە:

- یەکەمیان خەت خۆشی: کەیفی ناوبانگی هەیە لە خەتخۆشیدا.
- دوەمیان بوێژی: کەیفی لە ڕیزی هەر پێشەوەی بوێژانی کوردەوە دێ.
- سێیەمیان، هەڵاتن لە دەست جەوری زەمانە: کەیفی لەوانەیە ببێتە نموونەی غەدرلێکراوی.

کە ئەم سێ شایەدە وەک کۆڵەکە خۆ بدەنە بەر گوتەی دەماودەم چ درزێک نامێنێتەوە تروسکەی گومانی لێوە بدیترێ.

ئەم خەت و نووسینە و چوارینەیەی کەیفیش وەک نووسینەکەی حاجی کەوتە ژێر سواغی سپی کاریەوە. بەڵام خۆ و تالع چوارینەکە ئەزبەر کرابوو بەر لە ونبوونی. من لە ڕێی مەلائەمین یومنی خەتخۆشەوە چوارینەکەم پێ گەیشت، کە خۆی کۆییە و ئاوارە بوە و ئێستا لە بەغدا نیشتەجێیە. خوالێخۆش بووی مامۆستا صابر اسماعیل کردی بە دیاری بۆم.

لە دیوانەکەی حاجی، قەسیدە مەدحی خێوەتی قەرەنی ئاغا یەکێکی لە چەند سەرچاوەیێکی کەم و تاریک کە بە هێما شتێک ڕاگەیەنن لە خەتی بزووتنەوەی حاجی لە کوردستانی ئێراندا. با بزانین چۆن!

لە خوێنەر داوا دەکەم وەک من سرنجی وردی خۆی بداتە ئەم بەیتە:

هەر وەک ئەلفی جانە ستوونی لە سکوندا
نەک تابیعی غەیرە و «متحرک» وەکوو «هەمزە»

دەزانین لە عەرەبیدا کە پیتی ئەلف بزووت دەبێتە هەمزە. لێرەدا کارمان هەر لەگەڵ ئەلف و هەمزەدا هەیە، وردەکاریی تری شیعرەکە جێگەی تایبەتی و کاتی لەبارتری هەیە. کەواتە بەوەندە اکتفا دەکەین کە بڵێین ستوونەکانی خێوەتەکە وەک ئەلفە کە لە وشەی «جان»دا وەستاوە، سکونی بەستوە و نابزوێ، خۆ «متحرک - بزۆز» نیە وەکوو «همزە» کە سکوونی بۆ نیە و هەر دەمە لەسەر بارێکە. لەم ڕواڵەتەدا «توریە»یێک هەیە بێدەلالەت نیە لە ڕووی دروست کردنی شێوە خەتێکی گەشت و هاموشۆی حاجی.

دەزانین ئەوسا لە کوردستانی ئێران سەرەک عەشیرەتی «مەنگوڕ» هەمزاغا بوە. بێگومان لە لایەن ناوبانگ و دەسەڵاتی عەشیرەتییەوە هاوتای سەرۆکانی پیران و مامەش و عەشیرەتەکانی ئەو هەرێمەی کوردستانی ئێران بوە. لەم بەیتەدا حاجی قادر کە سکونی ئەلف دێنێ بە مەدح و بزۆزی «همزە» دێنێ بە بەزم، لە ژێر پەردەی «توریە»دا هەمزاغا دەشکێنێ بۆ مەدح کراوەکەی خۆی. من لەمەوە بیرم بۆ هەندێ دەڕوا کە وا حاجی لە گەشتی گەڕانەوەیدا ئەم قەسیدەی هەڵبەستبێ، واتە دڵنیا بوە لەوە جارێکی تر ڕێی بەو هەرێمانە ناکەوێ کە دەسەڵاتێکی هەمزاغای مەنگوڕی تێدابێ، دەنا حاجی لەوە زیرەکترە یەکەم سەلاموعەلێکی لە

کوردستانی ئێران بە نانەوەی بنیادی ناکۆکی بێ لەگەڵ کەڵەمیریکی وەکوو هەمزاغادا. خۆ ناشچێتە عەقڵەوە بگوترێ ڕەنگە حاجی لە سەرەتای چونیەوە بۆ کوردستانی ئێران بڕیاری دابێ هەرگیز بە مەنگوڕایەتیدا گوزەر نەکا یا لێی نەمێنێتەوە.

جگە لەو تێبینییەی نارەزایی هەمزاغا، قەسیدەکە بۆ خۆی خەریکی مەبەسێکی وابوە باوکی گوڵێ ناکۆکی لە حاجی نارەزا بکا هەرچەند لەسەر بناغەی مەدحیشەوە هەڵستابێ چونکە لێتەوە دیارە، حاجی زیاتر لە مەدحی بنە و بارگەی «شاهەنشەهی ئەرز» بە خەیاڵ و شێوە شیرینەکانی «گوڵێ»وە خەریکە و نامە و ڕاسپاردەی خولیایی بۆ ئەو دەنێرێ. وا پێ دەچێ نازداریی کیژەکە وەها هەستی حاجی جووڵاندبێ گەلێک بەولای مەدحی سادەوەی بردبێ تا گەیاندوەتی بەوە تەما و حەزی خۆی بە پێدزیلکە گەیاندۆتە پەرژینی دەوری گوڵ و گوڵزار و ئاڵووالای قەد و بالای گوڵێ.

لەم تێبینیەشەوە هەر ئەوە دێتە دلانەوە کە قەسیدەکەی دوای جێ هێشتنی کوردستانی ئێران دانابێ نەک لە سەرەتای چوونی بۆ ئەودیو یا لەو کاتانەدا کە لەوێی خوێندوە. کە ئەم تێبینییانە بە هەند هەڵگرین و بڕیار بدەین لە دەمی هاتنەوەی بۆ کوردستانی عێراق مەدحەکەی هەڵ بەستوە دەرحاڵ خزمەیەتی ئەویش لەگەڵ مەدحەکەی ئەمین ئاغا دێتە بەرچاو، لە ڕووی لە یەکتر نێزیکی کاتی هەڵبەستنی هەر دوویانەوە، چونکە وەک گوتمان مەدحەکەی ئەمین ئاغای لە دەمی هاتنەوەی بۆ کۆیێ داناوە، باوەڕ دەکەم هەر لە ڕێی گەڕانەوەی بەرەو کۆیێ لە هەڵبەستنی بووبێتەوە تا بەڕاستی ببێتە دیاری سەفەر. کە قەسیدەکان بە یەکدی بگری هێزو نەفەسی هەر دوویان وەک هێز و نەفەسی یەک تەمەن دێنە بەر هەستی سەرنجدەرەوە.

بەیتێکی تریش لە بەیتەکانی قەسیدەکە ئەوە ڕادەگەیەنێ کە وا حاجی دوای دوور کەوتنەوەی لە لاجان برە شیعرەکەی هەڵبەستوە، واتە سەرەڕای گەڕانەوەی بۆ کۆیێ کە قەڵغانێکی پارێزگارییە بۆ حاجی، قەڵغانێکی تریشی لەوەدا دیوە کە لە دووریی لاجانێوە دەردی دڵی خۆی گوتوە.

هەر لێرە هەتا دەشتی بەهەشتی لاجان
ئاهیستە برۆ نەک وەکوو دێوانەیی هەرزە

دیارە «ئێرە» شوێنێکی دەرەوەی لاجان ڕادەگەیەنێ. هەرچەند نەشزانین ئەو شوێنە کوێیە لە خۆوە دیار دەکەوێ دەبێ شوێنێک بێ لە بەینی لاجان و کۆیێ، چونکە گوتمان لە گەڕانەوەی بەرەو کۆیێ شیعرەکەی هەڵبەستوە. وەک بڵێی، حاجی قادر، دوای دیتنی گوڵێ و ورووژانی پەپوولەکانی خولیای بە ڕەنگ و بێنی ئەم گوڵە گەشە، هەر هەمان وەزعی پڕ جۆش و فڕکە خوێنی، جەزبە و تاسە و پەرۆشی خۆی بە گەرموگوڕی لە بورکانی دەروونییەوە هەڵێنجاوەتە ناو تاوەی ئەو هەڵبەستەوە.

لەوە بەولاوە، واتە دوای دانانی هەڵبەستەکە چ، ڕاستییکی زانراو نیە تێمان بگەیەنێ ئاخۆ حاجی شیعرەکەی ناردوە بۆ لاجان بە هومێدی هاتنەوە گوتە و وەرامێک لەوێوە یاخود وەک هەموو هەڵبەستێکی بێئامانج خستۆتیە سەر زار و زمانانەوە..!

بۆرە حیکایەتێک هەیە دەڵێ کە شیعرەکان گەیشتوونەتە قەرەنی ئاغا گوتوەتی ئەگەر «گوڵێ» ی لێ داخوازی کردبام پێم دەدا، گۆیا قسەکەش گەیشتۆتەوە حاجی ئەویش گوتوەتی بە کام ماڵ و حاڵ و وەزعی لەبارمەوە داخوازی گوڵێ بکەم! هەرچۆنێک بێ کاتێک حاجی شیعرەکانی داناون چ مەعلووم نەبوە خاوەنی گوڵێ چۆنیان پێشوازی لێ دەکا تاکوو حاجی بە ئومێدی ڕەزامەندی ئەوەوە لە لاجان وەستابێ. نەخێر بێگومان لە دەروەی لاجانێ ئەو شیعرانە هەڵبەستراون ئیتر هەناردرابێ بۆ لاجان بە دەم ئومێدێکی شلۆقەوە یاخود لای حاجی لەسەر پەڕە کاغەزێک هەناسەی حەسرەتی بە خامۆشی هەڵێنابێ.

لە نێوان هەموو ئیحتیمالاندا دڵی من بۆ ئەوە دەچێ حاجی چ ئومێدێکی بە گوڵێ نەبوە لەو هەڵبەستەدا؛ چ ئومێدێکی هەبا دەبوا ڕێگەییکی تر بگرێتە بەر نەک هەڵبەستەکە بکاتە لەمپەرێکی گەورە لە پێش خۆیدا چونکە لە شیعری وەها بێ پەردەی پڕ لە وەسفی جوانی دەوەشێتەوە کە نیمچە ئومێدێکیش هەبێ لە ناوی ببا. ئەم هەڵبەستە هەرگیز نابێتە خوازبێنیکەر و بەربووک...

داستانی «گوڵێ» هەرچەند ئەویش سەرەتا و ئەنجام و کەینوبەینی بێ سەروشوێن بمێنێتەوە وەک داستانی دڵداریەکەی حاجی لە سابڵاغ، تیشکێک دەداتەوە بۆ ناو

دەروونی (عاطفی) حاجی قادر و لە گەشتی ناو ئەو دەروونەدا شوێن هەنگاوان ڕوون دەکاتەوە. جگە لەمەش چەند پەیامێک لە سەروکاری حاجییەوە ڕادەگەیەنێ وەک ئیشارەکانی «بێتەل»، دەبێ وەربگرین و تەرجەمە بکرێتەوە بۆ سەر وتوویژی زمانی خۆمان.

یەکێک لەو ڕاگەیاندنانە دیار کردنی ساڵی دانانی شیعرەکانە: بەپێی ئەوە کە حاجی لە سەفەری بەرەو گەرمێن و هاتنەوەی بۆ کۆیێ و ئەڵودای دواجار لە کوردستانی ئێران شیعرەکانی دانابن دەبێ لە 1277 ئەو دانانە کرابێ چونکە پێشتر بە وردبوونەوەییێکی درێژدار ئەو لایەنەمان مەیلەو ساغ کردەوە کە وا حاجی، بەپێی نووسینەکانی سەر سیوطي، بەر لەو ساڵەدا ڕووەو گەرمێن نەبۆتەوە. کە ئەم لێکدانەوەیە ڕاست بێ خەیمەی دەشتی لاجان بە خاوەنیەوە و بە گوڵ و گوڵاڵەی گیا و ئادەمیەوە دەبنە یەکێک لە کێلەڕێ[59] هەرە دیارەکانی ڕێبازی فراژیبوون و «تکامل»ی بەهرە و هونەری شاعیریەتی حاجی کە وا، لەبەر زێدە دیاربوونی، گڵۆپی ڕەنگاوڕەنگیشی بە سەرەوەیە بۆ ڕێنومایی گەشتەوەر و جەلای چاوی سرنج دەران.

ڕاگەیاندنی تری ئەمەیە کە دەبێ لە بەهاردا وەیا دەمەو هاوین ئەو قەسیدەیە دانرابێ چونکە دەشتی لاجان لە بەهاردا خێوەت و ڕەشماڵی تێدا هەڵدەدرێ. پێ دەچێ حاجی لە دوا بەهاری مانەوەی لە کوردستانی ئێراندا بەنیازی گەڕانەوە بۆ کوردستانی عێراق هاتبێتە لاجان و ئەوەندەی تێدا مابێتەوە سرنج لە «خێمەی شاهەنشەهی ئەرز» بگرێ و لە ڕێکەوتێکدا «گوڵێ» ببینێ. ئەگەر ڕاست بێ خاوەنی گوڵێ گوتبێتی «لێم داخوازی بکا پێی دەدەم» دەبێ حاجی ئەوەندە لای مابێتەوە بایی ناسینی حاجی کردبێ تا ئەوەی بە زاوای خۆی قبووڵ بکا.

ڕاگەیاندنی سێیەم ئەوەیە کە گەڕانەوەی حاجی بە لاجان و باڵەکەتیدا بەرەو کۆیێ مەیلێکی حاجی بۆ گەڕان بە دەستەوە دەدا، چونکە مەعلوممان کرد لە هەوەڵەوە حاجی لە باڵەکەتیەوە ڕۆیی بۆ دیوی ئێران، کەواتە لە سەرەتاوە ڕابواردن و خوێندن

[59] – کێلەڕێ: علامه الطريق Limestone لە کوردیدا دەگوترێ کێلەقەبر بە قیاس لەو دەشی بڵێین کێلەڕێ.

و گوزەرانی لە شوێنی وەک لاجان و وڵاتی سابڵاغدا کردوە ئەوجار چوە بۆ لای بانە و دەوروبەری بێتووش و بەینێکی خوێندن تێدا کردوون، دیسانەوە سەرلەنوێ تێ هەڵکشیوەتەوە بۆ لای سابڵاغ و لەوێوە دواجار بە لاجانێدا بەرەو باڵەکەتی و کۆیێ بۆتەوە. کە ئەمە خەتی گوزەری حاجی بێ لە گەشتی خوێندنی دیارە لەو چەند ساڵانەدا تا ئەو هەموو دەشتودەرەی کوتاوەتەوە و بە زاراوەی فەلاحان دووگاسنی کردوون وردە سەفەری خوێندنی کورتیلەی لە دێ و قەسەبچەکاندا کردووە و جێگۆڕکێی تێدا کردوون. تێکڕای ئەم گەشت و گەڕانە نەخشەی ڕووپێویکی ئەوەندە پان دەگرێتەوە بە بزووتنەوەی زۆر و جێگۆڕکێ نەبێ دووجار پێو ناکرێ.

ڕاگەیاندنی چوارەم بەڕاست دەرهێنانی ئەو گوتەیە کە دەڵێ حاجی دوای گەڕانەوەی لە کوردستانی ئێرانەوە ماوەیێک لە باڵەک ماوەتەوە ئەوجار هاتۆتەوە کۆیێ.
هاتنەوەی بۆ باڵەک، وشەی لاجان ڕایدەگەیەنێ چونکی ڕێگا لە لاجانێوە بەرەو کوردستانی عێراق دێتەوە باڵەک، بەڵام ماوەیێک مانەوەی لە باڵەکەتی لەوەڕا دەفامرێتەوە کە وا دەبێ دمەو هاوین هاتبێتە ئەو ناوە و کژی گەرمای لێ ڕابواردبێ و دمەو پایز سەرەو ژێر بووبێتەوە بۆ کۆیێ. ئەگەر مانەوەی هاوینێک بایی بەڕاست گێڕانی گوتەکە بکا کە دەڵێ «بەینێک ماوەتەوە» ئەوە هاوینەکی تەواومان بە دەستەوەیە، خۆ ئەگەر گوتەکە لە هاوینێک پتر بگرێتەوە دەبێ بە دوا بەڵگەی تردا بگەڕێین یاخود بێبەڵگە بڵێین گوتەکە لەوەشدا ڕاست دەکا، ئەوساش نازانین چەندی تر بخەینە سەر کژی هاوین... دەبێ ئاگاداری ئەوەش بین کە درێژەماندا بە ئیحتیمالی زۆر مانەوەی حاجی لە باڵەکەتی تووشی گرفتێک دێین لەوەدا کەچی ئەوتۆ نامێنێتەوە لە کاتی مانەوەی حاجی لە کۆیێ بەشی ئەو ڕووداو و کەینوبەینانە بکا کە وا بەر لە سەفەری بۆ تورکیا بەرەنگاری بوون. وا دەزانم تاکە هاوینێک لە هەموو ماوەیێک بێ ڕەخنەترە کە دەلالەتی حاڵ و گوتەی دەماودەمیشی لێ ڕازی بێ و گرفتی تازەش دروست نەکا.

ڕاگەیاندنەکان هەموویان کاری لێکدانەوەن وەنیە شایەد و بەڵگەی ماددی بێ دەمەتەقە بیان سەپێنێ، بەڵام لەگەڵ بەسەرهاتی زانراوی حاجی و هێمای شیعر و نووسینەکانی زۆر ڕێک دێن و دەگونجێن، واتە ئەگەر ئەو ڕاگەیاندنانەی تازە خستمانە پێش چاو، ڕووداوی ڕاستەقینە بن چ بەرهەڵستێک نایێ نە لە سەرچاوەی نووسراو و نە لە گوتەی دەماودەمەوە لەقیان بکا.

بەهەمەحاڵ حاجی چوە بۆ کوردستانی ئێران، تێیدا گەڕاوە، خوێندنی لێ کردوە، چەند ساڵێک لێی ماوەتەوە، «گوڵێ»ی دیوە و گەڕاوەتەوە بەرەو کۆیێ.. ئەمانە بوون و دەبێ بە شێوەیێک و یەک لە دوا یەک ڕوویان دابێ، هەڵبەت ئەو شێوەیە و هاتنی یەک بە دوا یەکدا تا لەگەڵ گوتەی دەماودەم و هێمای نووسین و ڕاگەیاندنی حاڵ گونجاوتر بێ پتر دەچێتە دڵەوە. تا ئەوەی منیش بتوانم ڕووداوی نامەعلووم لەگەڵ نووسینی بەرچاو و گوتەی مەعلووم بگونجێنم هەر هێندەم بۆ دەکرێ کە وا لەو ڕووپەڕانەدا دەیخوێنیتەوە. لەوانە بوو ئەگەر ماوەی زیاترم هەبا بۆ لێکدانەوە و بە یەکدی گرتن و بەراورد کردن و وەدەست هێنانی خەبەراتی تازە، بتوانم ڕووپێوێکی بەرفرەوانتر ڕوون کەمەوە لە تێکڕای ڕووپەڕەکانی تاریکیی ژیانی حاجی لە دیوی کوردستانی ئێراندا. لەو باوەڕەدام وردبوونەوەی نەفەس درێژ لە پەراوێزەکانی سیوطي و ڕاگرتنیان لەبەر ئاوێنەی ئەو شیعرانەی کە لە تەمەنی گەنجایەتی و دەوری فەقێیەتی دەوەشێنەوە ڕۆشنەی ناوەناوە دەکەنەوە بەسەر ڕێبازی حاجی داو شوێن پێی لێرە و لەوێ هەڵ دەگرن. بەڵام جارێ ئەم کارە ئاواتێکە و نەڕواوە.

ئەم قەسیدەیەی «خەیمەی شاهەنشەهی ئەرز» کە هێندە پڕ دەلالەت بێ، مافی ئەوەی هەیە بەیتەکانی بخەینەوە جێی خۆیان و دەست بژارێک بکەین لەو تێکەڵپێکەڵیەی کەوتۆتە نێویانەوە لە ئەنجامی نووسینەوەیان و بەوەدا ڕیز و ڕچەی دارشتنی قەسیدەکە لەگەڵ زنجیرەی واتای بەیتەکانی بکەینەوە خزمی یەکتر.

لە یەکەم نیگاوە دەردەکەوێ جێگەی بەشی زۆری بەیتەکانی گۆڕاوە و خوار و ژووریان پێ کراوە.. لەوەش زیاتری بەسەر هاتوە: هەندێکی لێ قرتاوە و کەل بوە. لێرەدا قسەم لەگەڵ ئەو قەسیدەیەیە کە لە دیوانەکەی چاپی هەولێر ساڵی 1969 دا دەیخوێنینەوە، چ گلەییش ناهێنمە سەر چاپەکە و خاوەنەکەی چونکە ئەو وەک وەری گرتوە وای چاپ کردوە.

بۆ ڕاست کردنەوەی ڕیزی بەیتەکان لە پێشەوە پێشنیاری شاعیرێکی مەشوور و لێسەلمێنراوی کوردی ئیمڕۆ پێشکەش دەکەم کە مامۆستا «هێمن»ـە. بەپێی باوەڕی ئەو ڕاستیی ڕیزی بەیتەکان دەبێ بەم جۆرە بێ:

ئەم خەیمە کە شەمسیەی شاهەنشەهی ئەرزە
تا چادری نیلووفەری سەر تەپڵەکی بەرزە

ئەتنابی وەکوو توولی ئەمەل لا موتەناهی
ئەوتادی وەکوو کێوی ئوحود مەرکەزی فەیزە

سەقفی وەکوو گەردوونە شکافی وەکوو ئەنجوم
پەردەی وەکوو ئەدواری سەما ئەتڵەسی سەوزە

هەروەک ئەلیفی جانە ستوونی لە سکووندا
نەک تابیعی غەیرە و موتەحەریک وەکوو هەمزە

ئەوسافی وەکوو خەتی دوو زولفە لە چەپ و ڕاست
وەک ماری موتەلسەم کە تەلسمی سەری کەنزە

وەسفی چ بکەم نێوەنی گوڵ یا بنی سونبوڵ
شایستە سەنا خوانی بکەم هەر وەکوو فەرزە

لای ژووری سەمەن نێوەنی گوڵ دامەنی سونبوڵ
لەو سوورەت و مەعنایە کە سەد جەننەتی لەغزە

فیلجوملە وەکوو خاڵی ڕوخی دلبەرە حاجی
دڵ پەستە دەسا بادی سەبا هەستە مەلەرزە

هەر لێرە هەتا دەشتی بەهەشت ئاینی لاجان
ئاهیستە بڕۆ نەک وەکوو دێوانەیی هەرزە

تا داخیلی خەڵوەت دەبی ئەمجا بە وەکالەت
خاکی قەدەمی ماچ بکە بەم تەرزە کە تەرزە

مەئزوونی ئەوەندە وەکوو ئاهم بە نەزاکەت
لادەی سەری زولفی نە وەکوو بیخەیە لەرزە

لەو چەشنە گوڵە هەڵدەکەوێ ساڵێ لە قەڕنێ
نەک وەک گوڵی بازاڕییە هەر ساڵی کە سەوزە

لەو دەسنووسەی مەلا ڕەئووفی سەلیم ئاغا کە بۆ کۆڕی زانیاری کوردی ناردوە هەندێک زیادی تێدایە لە چاو دیوانە چاپ کراوەکان و ئەو دەست خەتانەی خۆم دیتوومن: لە جێی مصرعی دوەمی بەیتێکیان دوو جۆری نووسیوە هەر دووکیشیان لە ڕووی کێش و قافیە و واتاوە هاوتای یەکترن. لە دیوانەکەی حاجی، چاپی هەولێر، نیوە بەیتەکە بەم جۆرە نووسراوە:

«نەک وەک گوڵی بازاڕییە هەر ساڵی کە سەوزە»

مەلا ڕەئووف بەسەر ئەوەوە ئەمەشی نووسیوە:

«نەک وەک گوڵی بازاڕییە موجود همو لحظە»

لە جێگەیێکی تریش نیوە بەیتێکی بێکێش، بەڵام قافیە ڕێکی نووسیوە کۆتایی بە وشەی «غەمزە» دێت. ئەگەر ئەم زیادیانە بکرێن بە بەیتی تەواو و بخرێنە سەر غەزەلەکەوە سەرجوملەیان دەبێتە 14 بەیت. لە خۆمەوە دەڵێم بێین و ڕەچاوی ئەم لایەنەش بکەین کە شاعیر بە زۆری حەز لە هەڵبەستی تاک ئەژمار دەکەن ڕێی تێدەچێ بە ئەسڵ غەزەلەکە 15 بەیت بووبێ و هەندێکی لەو بەیتانە لەناو چووبێ.

من لە لای خۆمەوە بەیتەکانم ڕیز کردبوون بەو شکڵە کە پێی ڕازی بووم. ڕیز کردنەکەی من نەختێک جوداوازی هەیە لەگەڵ هی مامۆستا هێمن، بەڵام چ پێویست نابینم دوای نووسینی پێشنیارەکەی ئەو هی خۆم بکەم بە سەرباریکی ناقۆڵا و زەق بۆ بنباری هورِ و هۆپی ئەم نووسینە درێژە. نوسخەی تریش لەم غەزەلە، چاپ کراو و چاپ نەکراو، لەبەر دەستاندان کەسێک بیەوێ دەتوانێ بەراوردی هەموویان بکات و دڵخوازی خۆی لە نێویاندا هەڵبژێرێ.

سەرگوزەشتی دڵداریەکەی حاجی لە سابڵاغ و پەیامی ئەم قەسیدەیە لە ڕووی کەمپەروایی لە دەربڕینی هەستی دەروونی خۆی جارێکی تریش سروشتی ئازا و باوەڕ بەخۆ هاتووی حاجیمان بۆ ڕوون دەکاتەوە. هەر چەند ژیانی حاجی پڕە لە

نموونەی ئازایی و سەرکەشی بەڵام مەیدانەکان وەک هی دڵداری نیە کە زوربەی پیاوانی ڕۆژهەڵات خۆی تێدا دەشارنەوە و چەندی لە دەستیان بێ ناهێڵن باس و خواسی دڵدارییان ئاشکرابێ و بگوترێتەوە یاخود سەرگوزەشتی نهێنییان تێیدا دەنگ بداتەوە. خۆ بەنیسبەت مەلا و پیاوی سەربە ئایینەوە زیاتر لە خەلقی تر دەنگ و سەدای دڵداری هۆی شەرم کردنەوە و بەخۆدا شکانەوە بوە. ناوناوەیێکی بەدەگمەن نەبێ مەلا ڕێگەیان نەداوە دڵدارییان لێ ئاشکرا بێ.

حاجی قادر بەوەدا کە جارێکیان لە سابڵاغ دڵداریەکەی زانرابێ و خێرا بە دوا ئەودا و لە خۆوە دەروازەی دڵی بۆ گوڵێ بخاتە سەر پشت و بانگ هێشتنی مەردوم بکا بۆ گوتنەوەی چیرۆکی حەز لێکردنی لە گوڵێ، ئەم حاجی قادرە هەرگیز لە مەلاییێکی شەرمنی سەرکزەڵەی چەرخی نۆزدەم ناکا. هەر دەڵێی مرۆڤێکی بەندی کراوی حوکم تەواوکردوە لە ناو دەروازەی بەندیخانەڕا دوا هەنگاوی هەڵدێنێ بەرەو ڕەهایی. حاجی بەم دڵداریانەی لە قەپێلکی کلاسیکی دەستووراتی کۆمەڵایەتی و نەریتی کۆنینە دەردەچێ و دەبێتە نۆبەرەی خێرا پێگەیشتووی پیاوی کورد لە ناوەڕاستی چەرخی نۆزدەمدا.

من نامەوێ دەلالەت قەرز کەم و بیخەمە سەر واتا و ڕاگەیاندنی دڵداریەکانی حاجییەوە، بەڵام پێویست دەبینم ئەوەندە دەلالەتی کە هەیە لەم دڵداریانەدا بخرێتە ڕوو و نرخ و جێگەی ڕاستەقینەی خۆیان پێ بدرێ لە سروشتی «(حاجی»دا: دەبێ بە هۆی ئەو دڵداریانەوە باشتر حاجی بناسین، پتر لێی شارەزابین، نزیکتر ببینەوە لە تەوژمی ئەو دەروونە کە حاجی کردە یەکەم دوژمنی نەترساوی شەعبەدە لە کوردستانی ژێرروودا و یەکەم فەیلەسووفی بیری کوردایەتی لە سەراپای کوردستاندا.

سەرەڕای مەلایەتی کە خۆی بەسە ببێتە کۆسپ لە پێش دەربڕینی ئارەزۆی نەفس بۆ لای ئافرەت، دوو کۆسپی تریش هەبوون حیسابی دووورودرێژتر بە حاجی بکەن لە دەربڕینی ئەم ئارەزووەدا: کۆسپی غەریبی و کۆسپی هەژاری. مەلاییێکی غەریبی هەژار ئەگەر لە دەروونیدا بڵێسەی ئارەزۆییێکی سووتێنەر نەبێ بۆ ئازادی لە کردەوە و ئاخاوتن ناوێرێ لە کاری نازکی وەک دڵداریدا زمانی ببزێوێ، ئەگەر مەیلێکیشی بوو بۆ ئافرەت لە هەناوی خۆیدا زندەبەگۆڕی دەکا. پاڵەپەستۆی هەستی زگماک لە دەروونی حاجیدا بۆ ئازادی لە کردەوە و ئاخاوتن، قەناعەتەکانی تەقاندۆتەوە، ئەو

قەناعەتە لە دڵداری بێ یا لە عاست شەعبەدەدا یا لە مەیدانی سیاسەت یا لە هەموو مەیدانەکانی باوەڕ بێ بە شێوەییێکی گشتی.

لە بیرت بێ جواداوازییێکی یەکجار گەورە هەیە لە میانی هەڵبەستی دڵداری عادەتی کە هەموو بوێژێک لە خۆی دەکا بە پیشە و چ باجی لە سەر نیە و ناو و ناتۆرە بۆ کەس نانێتەوە لەگەڵ دڵداری بە بنج و بناوان و سەروسەدا کە تا ئێستا پیاوی کورد خۆ دەپارێزێ لە زڕانی ناوی تێدا. تێوەڕامانی دوور بە دوور دوای سەد ساڵ زیاتر لە تێپەڕینی ئەو دڵداریانە، شێوە و ڕاگەیاندن و هێماکانیان دەخاتە پشت پەردەییێکی ئەستووری تاریکییەوە. بۆ چاوێکی وردبین نەبێ تارمایی گرنگی ئەم دڵداریانەش خۆ بەدەر ناخا.

لەوانەیە خوێنەرێکی ڕێبواری بە پەلە لەسەر ئەوە هەر نەوەستێ ئاخۆ حاجی قادر ڕۆژەک لە ڕۆژان بیری لە «جنس» کردبێتەوە یا نا! ئەوا دڵی بۆ «جنس» و ئافرەت چوو ئینجا چ بووا من لە جیاتی ئەو خوێنەرە قسان تەواو دەکەم و دەڵێم حاجی قادر کەوتە دژی کارە نارەواکانی شێخ نەبی سەد ساڵ لەمەوپێش - ئینجا چ بووا حاجی دەیان ساڵ بەر لە هەموو کوردێک بیری کوردایەتی کرد بە فەلسەفە... ئینجا چ بووا حاجی بە هەموو عومر نەترسا و هەرگیز کۆڵی نەدا... ئینجا چ بووا

بەڵام هەمان خوێنەری بەپەلە کە من لە جیاتی ئەو شتان بێ بایەخ دەکەم و پێیان دەڵێم ئینجا چ بوو، کە بیستی فلامورزی هاوڕێی خۆی حەزی لە فلانە کچ کردوە گوێی قوت دەبێتەوە بۆ خەبەرەکە و دەکەوێتە پرسین و تۆژینەوە لە باریەوە و هەر بە بیریشی دانایێ بلێ ئینجا چ بووا خۆ ئەگەر کچەکە چ جۆرە پەیوەندییێکی خزمایەتی وەیا ئاشنایی لەگەڵ خۆیدا هەبێ ئەوسا دڵداریەکە مانایێکی تازە و تایبەتی وەردەگرێ و دەکەوێتە بارێکی ترەوە و دە جاران زیاتر بایەخ پەیدا دەکا. ئەمە دەڵێم تاکوو دڵداریەکانی حاجی نیگای خوێنەر بۆ خۆی بکێشێ و داوای لێ بکا جێگەی لەباری بۆ بدۆزێتەوە لەو سروشتەی حاجی قادردا کە شارەزاییمان پێی هەیە.

ئەم دڵداریانە کە لە سابلاغ و لاجانێدا هەستی حاجی قادریان جوولاندەوە و بولبوولی طبعیان خستە چەهچەهە، دوای هاتنەوەی بۆ کۆیێ خامۆش دەبن و چی تریان بەدوادا نایێ. لە کەس نەبیستراوە لە ماوەی ئەو چەند ساڵانەی بەر لە

سەفەری بۆ تورکیا کەموزۆر خەریکی حەز لێکردن بووبێ. کە ئەمە نەبیستراب‌ێ دەبێ ڕووی نەدابێ بۆیە نەبیستراوە، چونکە تازە باسمان لەوە دەکرد حاجی قادر دڵداری بە تاوان نەزانیوە تا نادیاری کا و دای پۆشێ. خۆ ئەگەر دڵداری لە کات و وەزعی غەریبیدا گومانی ئەوەی لێ بکرێ نیازی مارە کردنی تێدا نەبوە و تەنها هەوەسێکی جحێڵانە بوە و تەقیە و شەرمێکی بۆ دڵدارەکە پێک هێناوە، ئەو گومانە لەو دڵداریەی حاجی ناکرێ کە لە کۆیێ دووچاری هاتبا تا بڵێین لەبەر زێدە تەقیە و شەرم کردن بە جارێ سەرپۆشی کردوە. هەڵبەت هەمان ڕەفتاری شەرافەتکارانەی حاجی کە لەو دوو دڵداریەکەی پێشووی بەدی دەکرێ، کە لە کۆیێ دووچاری هاتبا: غەیری ئەوە کە بە نیازی مارە کردن حاجی خۆ نامزەدی پەیوەندی عیشق و سەودای ئافرەت بکا چ نیازێکی تر بە دڵ و مێشکاندا نەیێ لە عیشقێک کە وا لە کۆیێ ناوی حاجی پێوە بێ. وەزعی حاجی لە کۆیێ گەلێک ناسکترە تا جێگەیێکی تر؛ بەپێی ئەو ناسکی وەزعەی، خۆ دوورتر دەگرێ لە هەر شتێک لۆمەیێکی کۆمەڵایەتی بێنێتە سەر، بەتایبەتی کە ئەو خەریکی خۆ چەسپاندن و خۆ بەرەو پێش بردن بێ.

لە خوێندنی فەقێیەتی و گەشتی مامۆستاگۆڕیدا کەمخەمی و بێپەرواییەک هەیە لە چاو ژیانی دابینبوون و دامەزران، کە دەبێ ئەویش حیسابی بۆ بکرێ لە مەوزووعی دڵ بەدەستەوەدان و حەز لێکردن. ئەم جواداوازیانەی میانی وەزعی حاجی لە کاتی فەقێیەتیدا تا وەزعی کۆیەی، بۆ خۆیان تا ڕادەیێک حیسابێکی تازە دێننە بەر حاجی، بەڵام هەر ئەوان نەبوونە هۆی پەیدابوونی دڵداریێکی گەرم و گوڕ بە سەروسەدا لەو چەند ساڵەی مانەوەی حاجی لە کۆییدا: هۆی گرنگتر بە دەستەوەیە، گەلێکیش گرنگتر.

وەک من بۆی دەچم و پێی قانع دەبم ئەو گیروگرفت و کەینوبەینە گەورانەی کە پەیدا بوون و یەخەی حاجییان گرت لە کۆیێ دوای گەشتی خوێندنی، وایان تەنگ پێ هەڵچنی و ئۆقرەیان لێ هەڵگرت دەرفەتێکی بۆ نەمایەوە بیر بکاتەوە لە دڵداری و ماڵ پێکەوەنان. گیروگرفتەکانمان لە جێی مناسبدا باس کرد و ناشێ لێرەیان باس بکەینەوە، چەند لاپەڕەیێک بەرەو هەوراز بینەوە دێنەوە بەرچاومان. نەفسی حاجیی لەخۆ ڕازی و بەخۆ نازیو هەرگیز لە زەرفی وا نالەباردا خۆ ناهاوێتە ژێر بارێکی قورسی تازەی ژن هێنانەوە کە ببێتە سەرباری هەژارییە نەدارییە میراتییەکەی.

ئەمە شتێکی مەفهووم و چاوەڕوان کراوە لە حاجی قادرەوە، بەڵام لێرەدا تێبینییەکی نوێ هەیە لەو مەوزووعی دڵداری نەکردن و ژن نەهێنانەی حاجی، سەری ڕێ بە زیهن و سرنج دەگرێ و خۆ بە ملدا دەدا و جڵەوی خامە ڕادەکێشێ بۆ باس کردنی.

ئەم تێبینییە لەوانە نیە خەریکبوونی سەراوی بە مەوزووعی حاجییەوە بیخاتە بەر چاوان، تا دڵت لەگەڵ دڵی ئەو حاجییە ئاوارەی بێ دەرەتانەی پڕ گیروگرفت و کۆسپ و تەگەرانەی دوای گەڕانەوەی بۆ کۆیێ جووت نەکەی و نەبزی ئەو تێکەڵ بە نەبزی خۆت نەکەی تارمایی تێبینییەکەش نابینی. با بڵێم لەوەش زیاترت پێدەوێ بۆ هەست کردن بە مەوزووعی تێبینییەکە: دەبێ بە خەیاڵ بگەڕێیتەوە ئەو ڕۆژگارە و خۆ بخەیتە قەپێلکی زەرف و باری ژیانی حاجییەوە، ئەگەر نەڵێم قەپێلکی نەفس و دەروونیەوە، و بە چاوی ئەو سەیری دونیا بکەیت و بە دڵی ئەو هەست بە خۆشی و ناخۆشی بکەیت.

ئەوەی من دێتە دڵمەوە، لە ئەنجامی تێوەڕامانێکی دوورودرێژ لەو زەرفە و ئەو دڵ و دەروونە و تەنگ و چەڵەمە و گرفتانە، قەناعەتێکە وەک «بدیهیە» کە وا وەتەنگ هاتنی حاجی لە وەزعی کۆیێ و تێکڕای کوردستانی ژێروو دوای کەمێکی کەم لە گەڕانەوەی بۆ کۆیێ دەستی پێ کردوە و ماوەیێکی ئەوتۆ نەکەوتۆتە نێوانی هاتنەوەی و سەرەتای دەست پێ کردنی تەنگ و چەڵەمەکانەوە بایی ئەوە بکا مرۆڤێکی وەک حاجی بکەوێتە سەر بیرکردنەوە لە ژن هێنان و ماڵ پێکەوەنان. هەر دەڵێی یەکەم سڵاوی دوای گەڕانەوەی بۆ کۆیێ، دەردی سەر عەلەیکی داوەتەوە.

خێرا دووچاربوونی حاجی بە ناکۆکی، سەرەڕای دەستکورتی و بێگوزەرانی، هەر وەک نەیهێشت دڵی بڕوا بۆ دڵداری و ماڵداری نەشی هێشت دڵی بڕوا بۆ نیشتەجێبوون. دەمەوێ بڵێم لە زوێکەوە حاجی بڕیاریدا کۆیێ و کوردستان جێ بهێڵێ بۆیەیە ببڕای ببڕای لێی نەبیسترا ناوی ژن بێنێ وەیا باسی ژنهێنان بکا. وا دەزانم ئەم بڕیارەی دوورکەوتنەوەی لە وڵات ماوەیێکی درێژ بەر لە ڕۆیشتنی لەگەڵی ژیاوە و ڕوودوای یەک لە دوو یەکی ڕۆژانە بڕیارەکەی بەهێزتر کردوە تاکوو لە کۆتایی شەڕێکی بەردەوامی نهێنی لە دەروونی حاجیدا لە میانی هێزی ڕاکێشانی گەل و مەفتەن و هێزی پاڵ پێوەنانی نارەحەتی و چەرمەسەری، بە تەکانێکی ڕیشە هەڵکەن حاجی هێزی خستە گەل هێزی پاڵ پێوەنان و ڕەگی خۆی دەرکێشا لە ناخی ئەو

«مەفتەنە جلوە ئارایە» کەوا نە تێیدا هەڵی دەکرد و نە لە دووری ئەویشدا توانی بحەسێتەوە.

ئەم هەڵقەنانەی دڵی حاجی، لە زویکەوە، سەبەب بوو کە چ هەوڵێکی نەدا ماڵ پێوە نێ: حاجی حەماسی پەیدا نەکرد بۆ ماڵ پێکەوەنان. ئەگەر ئەم لێکدانەوەم نیشانەی پێکابێ لە زەینمدا داخوازی دەکا کاتێک حاجی هاتۆتەوە کۆیێ ئاشی شێخ نەبی ماویلی لە گەڕ بووبێ، چونکی ناکۆکی بەینیان لێی دەوەشێتەوە یارمەتیدەرێکی تێکڕای وەزعی نالەباری حاجی بێ کە خستیە سەر بیر کردنەوە لە ئاوارەبوون.

بۆ سەپاندنی ئەم ڕایە و بیر و باوەڕە لە زیهنکاری و لێکدانەوە بەولاوە بەڵگەی ئیسپات بەدەستەوە نیە، بەڵام بیروڕایەکە بێ بنج نیە چونکە کە لێی وردبییەوە دەبینی ئیحتیمالێکی بەهێزە لە تەک دوو ئیحتیمالی تری بێهێزدا:

یەکەم ئیحتیمال ئەوەیە: ڕێکەوت وا بوو حاجی دوای گەڕانەوەی بۆ کۆیێ و تا لێی دەرچوو نە دڵداری کرد و نە خەریکی دامەزران بوو.

دووەم ئیحتیمال ئەوەیە: ڕەنگە حاجی تووشی دڵداری بووبێ و بیریشی لە دامەزران کردبێتەوە بەڵام بە ڕێکەوت ئەو باس و خواسانە لە پشت پەردەی پەنهانی مانەوە، یاخود بە ڕێکەوت خەلقەکە نەیانکردنە مەوزووعی وتوویژ و گوتنەوە.

سێیەم ئیحتیمال ئەوەیە کە من بۆی چووم: لەبەر گیروگرفت و هۆی تری گرنگ لە ژیانی حاجی ئیمکان نەبوە دڵی بۆ ئافرەت و ماڵ پێکەوەنان بڕوا.

ئیحتیمالی یەکەم و دوەم لە سەر «ڕێکەوت» هەڵچەقیون بۆیێ من بە بێهێزیان دادەنێم. هی سێیەم ئەوەیە کە من دەمەوێ بڵێم جێی قەناعەتی خۆمە. بەڵێ، دەشێ ڕووداو زادەی ڕێکەوت بێ بەڵام لە سەرچاوەی مادیەوە پەیدا بووبێ زیاتر بە دڵەوە دەنووسێ بەتایبەتی کە ڕووداوەکە لەگەڵ پێداویستی زەرف بگونجێ. بەهەمەحاڵ تا ئێستا بڕیاری یەکجارەکی لە بارەی ئەم ڕووپەڕەیەی ژیانی حاجییەوە لە دەست کەسدا نیە. ئەوەندەی گوێم ڕاگرتبێ و چاوم گێڕابێ لە کەسم نەبیستوە و چ نووسینم نەدیتوە خۆ لەو لایەنە بگەیەنێ و دوو قسەی تێدا بکا. کە حاڵ وابێ دیارە چ سەر و سۆراغ لای کەس پەیدا نابێ. خوێنەریش وەک من ئاگاداری زەرفی ژیانی «حاجی»یە لەو قۆناغەدا، هەرکامێک لەوان ئیحتیمالانەی بە دڵ بوو یاخود ئیحتیمالێکی چوارەمی پەسند کرد کە بە بیری مندا نەهاتبێ دەتوانێ ئەویان بکا بە

دڵخوازی خۆی. کە بەڵگەی تازەشی چەنگ کەوت بۆ تەرجیحی ڕایەکی تر دیسانەوە مەودای ڕەئی گۆڕکێی لە پێشە.

مەبەس لێرەدا ڕەواندنەوەی تاریکییە لە دەوری حاجی قادر، کە تاریکییەکە ڕەوپەوە ڕاستی هەرچی دەبێ با ببێ. من بۆ خۆم لایەنگری چ بیر و ڕایەک ناکەم ئەگەر بەڵگەی ماددی وەیا زیهنی لەسەریان نەکاتەوە. هەوڵ و تەقەللام لەوەوە دێ حەز دەکەم حاجی بناسم وەک مرۆڤێک کە لە واقیعدا ژیاوە نەک فکرەیێکی ڕووت کە نووسین خەلقی بکا. حاجی مرۆڤ بوە، وەک من و تۆ حەزی بە خۆشی دەکرد ئەگەر بۆی لوا با. هەڵبەت نەیدەویست بێبەهرە بێ لە کامرانی و حەسانەوە: کە ئەمەی بۆ نەلوابێ دەبێ لەبەر هۆی ئەوتۆ بووبێ لە حەز کردن و خواهشتی خۆی بەهێزتر.

قسە لە مەوزووعی دڵداری بە وەندە نابڕێتەوە، جارێ تەواوێکی بە بەرەوە ماوە. وەک دوای نەختێکی تر ڕوون دەبێتەوە باسی دڵداری دەکێشێتەوە سەر لێ دوان لە هەندێ لایەنی گرنگ هەم لە سروشتی حاجی و هەم لە ڕەوتی بەرەو گەیشتنی بەو پەڕی کوردایەتی. دڵداری وەک ئاوێنەییێکی هەمیشەیی لەسەر ڕێبازی ئادەمی، دەروونی حاجیمان بۆ عەکس دەکاتەوە، بەڵام با جارێ پاکانەیێک بکەین بۆ عیشق و دڵداری لە عاست ئەو توهمە و توانجانەی کە هەندێ مرۆڤی دڵوشک، بێڕەحمانە، دەیکەن بە تیری تەعنە و تێی دەگرن. با ئەوە ساغ کەینەوە کە عیشقی میانی نێر و مێ نەک هەر نەنگ نیە و بەس بەڵکوو شیرازەهۆنی کالای کۆمەڵایەتییە. دەبێ هەڵوەستێک بکەین تا تۆزێ بەدناوی لە دامانی دڵداری بتەکێنینەوە ئەوسا بکەوینە سەر ڕێبازی عەوداڵبوونمان بەدوا دەنگ و باسی حاجی لە جیهانی دڵداریدا.

خۆشویستن گەلێ جۆری هەیە، هەند زۆرە ڕەنگە نەژمێردرێ. بەڵام ئەو جۆرانەی دەکەونە سەر زمان و دێنە ناو نووسینەوە و خەلق پێیانەوە خەریکە و دەمەتەقەیان لەسەر هەڵدەستێنن چەند جۆرێکی ناسراو و گرنگن وەک: خۆشویستنی ئایین و مەزهەب و فەلسەفە و نیشتمان و هونەر و سروشت و باوک و دایک و برا و کەس و برادەر و بەدوا هەمواندا و لەپێش هەمواندا خۆشویستنی میانی دوو جنسەکەی نێر و مێ. بێگومان ئەم خۆشویستنانە هەموویان کاریگەر و بایەخدارن و زۆر جاران دەبنە هۆی خۆبەخت کردن و خۆ بەکوشت دانیش.

ئەمە ڕاستییێکە سەرپێچی تێدا ناکرێ و بەچاوی خۆمان دیتوومانە و دەیبینین، ڕەنگە وابووبێ بە جۆرێکی سەرشێوێن و نامەفهووم جان فیدایی کرابێ بۆ ئەو
خۆشەویستنانە. زۆرجاران لە گێڕانەوەی بەسەرهاتی کۆن و نوێ دەبیەن فڵانەکەس لە کەللەیان دا و وازی لە باوەڕی خۆی نەهێنا وەیا وشەیێکی نهێنی نەدرکاند دوشمنی باوەڕەکە سوودی لێ وەرگرێ، وەیا خۆی بە قوربانی پێشەواکەی کرد وەیا لە تۆڵەی قسەیێکی بێحورمەت یەکێکی کوشت و خۆشی تێدا چوو. کە دەڵێم «نامەفهووم» لەبەر ئەوەم نیە لە بنەڕەتا مەوزووعەکە خۆبەخت کردن ناهێنێ بەڵکوو بۆیەیە کە ئەغڵەب یەکێک خۆ بە قوربانی ئامانجێک دەکا ئامانجەکەی لە نەزەر غەیری خۆیدا، خۆ بەقوربان کردن ناهێنێ و هەر هەمان کەس لە ئامانجی گەورەتر بێخەبەرە و بێپەروایە و گوێشی ناداتێ. بە میسال دەڵێم لەوانەیە مریدێک خۆی بە قوربانی شێخەکەی بکا بەڵام گیسکێک بە قوربانی وڵاتەکەی نەکا.

پوختەی قسە ئەوەیە خۆشویستن گەلێ جۆری هەیە و هەریەکەیان بەرە و تاقمی ئەوتۆی هەیە کە پەیڕەوی دەکەن. بەڵام بە وردبوونەوە دەردەکەوێ تێکڕایان لە سەرەتاوە دەبنە دوو بەشی لەیەکدی جودا: بەشێکیان ئەوەیە لە خۆوە پەیدا دەبێ لە ویژدان و دەروونی مرۆڤدا، چ پێویستی نیە بە مامۆستا و ڕابەر وەک خۆشویستنی منداڵ و باوک و دایک و نێر و مێ. بەشی دوەمیشیان ئەوەیە ئەگەر بە فێر کردن و دەرسدان نەبێ زگماگ لە دڵی مرۆڤدا هەڵناقوڵن وەک خۆشویستنی سروشت و مەزهەب و هونەر و فەلسەفە و یاری... هتاد.

زۆرجاران مرۆڤ خۆ بە قوربانی شتی وەها دەکا ئەگەر بە هاندان و مێشک پڕ کردنی ساڵەهای ساڵ نەبێ مریشکێکی لە پێناو نادات، نەخێر لەوانەیە ڕقیشی لێی بوویایە ئەگەر مامۆستا دەرسی نەدابا. بەڵام خۆشویستنی کوڕ و نەوە چ مامۆستای ناوێ.

قسەیێکی یەکجار سافیلکە و ناپوختە و ناپەسند هەیە دەڵێ خۆشویستنی دایک و باوک بۆ منداڵیان بەرهەمێکی کۆمەڵایەتی سەربە چینایەتیەوەیە نەک هی سروشت. وابوە بیستوومە و خوێندوومەتەوە گۆیا بە نیازی سوود وەرگرتن لە دوارۆژدا، دایک و باوک منداڵیان بەخێو دەکەن. تەنانەت هەندێ لەو نووسینانە دەڵێن
پەروەردەبوون لە سێبەری ڕژیمی بورجوازی و لە نێو کۆمەڵی خاوەنی چینی

جوداجودا وا دەکا باوک و دایک بەتایبەتی منداڵەکانی خۆیان خۆش بوێت و فەرق و جوداوازی بکەن لە میانی منداڵی خۆیان و خەلقی تر.

ئەم تەرزە گوتانە تاکە پیتێکی ڕاستیان تێدا نیە و خەڵەت و پەڵەتی ڕووت و ڕەجاڵن. بەسە بۆ دیارخستنی هەڵەبوونیان کە بڵێین ئەگەر پەروەردەبوونی «بورجوازی» مرۆڤ فێر بکا بە خۆشویستنی منداڵی خۆی ئاخۆ چ بورجوازییێک و ئیمپریالیستێک مریشکی فێر کردوە خۆ بە قوربانی جووجەڵەی بکا، وەیا چوێلەکە لە تاوی بەچکەکانی خۆ باوێتە زاری مارەوە. گوتەی ئەوتۆیی نەک هەر بەرهەمی سادەیی و سەراوبوونی فکرییە و بەس، کە لێی وردبیتەوە دەبینی لە خۆوە بێ تدخلی من و تۆ سەرەوبن دەبێ و بایی تروکەی چاو خۆ بەسەر پێیانەوە ڕاناگرێ.

کە گوترا دایک و باوک لەگەڵ منداڵەکانیان بە فێڵوفرن و بە تەمای چەوساندنەوەی دوارۆژ بەخێویان دەکەن ئیتر هەرچی باوەڕ هەیە لای مرۆڤ بە هیچ شتێک نامێنێ، لە بنەڕەتا بەسەر خۆیدا دەتەپێ و وێران دەبێ، چونکە سەلماندمان دایک بە فێڵ بێ لەگەڵ منداڵەکەی بۆ دەبێ ڕابەری سیاسی و سەرۆکی حیزب وەیا دەوڵەت ڕاست کەن لەگەڵ خەلق... باوک درۆزن بێ و نەقابە ڕاست کا، ئەفسانەییکە گاڵتە دەکا بە هەرچی مرۆڤایەتی و هۆش و مەنتیق هەیە...

باوک و دایک کە سۆزیان بۆ منداڵەکانیان جێی گومان لێ کردن و تاوانبار کردن بێ، ئەو کەسە قسەی وامان فێر دەکا دەبێ چەند جاران فێڵی لێ کردبین و چ مۆرفینێکی خستبێتە مێشکمانەوە بەوان قسانەی!!! ناشێ و ناکرێ وڕێنەی وها بچێتە عەقڵی کەسەوە ئەگەر مۆرفینی لەگەڵدا نەبێ. مرۆڤ کە باوەڕی بە سۆز و تاسەی دایکی خۆی نەما کام زرە هەقی دەمێنێ باوڕ بە قسەی خەلقی تر بکا و گوێ شل کا بۆ مامۆستا و ڕابەر و فەیلەسووف! وابزانم ئەمە «بدیهیە»یە و لەسەر ڕۆیشتنی ناوێ.

قسەی من لێرەدا لەگەڵ چۆنیەتی و جۆری پەیدابوونی ئەو خۆشویستنانەیە کە هەندێکیان لە خۆوە دەڕسکێن و هەندێکیشیان بە فێر کردن دەڕوێن. کە کەوتینە سەر باری دەرسدان و بەئومێد کردن و ترساندن ئەوسا هەرچی بە خەیاڵدا دێت و نایەت لە پێچەوانەی یاسای سروشتی و خۆڕسک دەشێ پەیدا ببێ و سروشت و یاساکانی بپێچێتەوە. تۆ خەریکی یەکێک بیت بۆ ماوەی ساڵەهای ساڵ لە ڕێی

ڕاهێنان و ترساندن و ئومێد پێدانەوە فرچکی هۆش و هەستی پێ بگریت، دەتوانی بیخەیتە سەر ڕق لێبوونەوە لە هەرچی چاکە و پاکە و خۆشەویستە، یاخود بیکەیتە بوتپەرست بۆ هەرچی بەد و وێرانکەر و دزێوە. ڕەنگە بە دەرسدان دایک منداڵی خۆی بکوژێ وەیا دیندار کافر بێ وەیا قارەمانێکی باوەڕ و فەلسەفە بگۆڕێ بە خائین.

لێرە ئێمە قسە لە سەرچاوەی ئەسڵی خۆشویستن دەکەین، لەو قوڵپ و بڵقەیە دەدوێین کە لە بنی کانیەوە هەڵدەقوڵێ نەک لەو ئاوەی بە جۆگەلە داهاتوە و خڵتەی بێگانەی تێکەڵ بوە. دەوجا کە حاڵ وابێ هەندی بەدیهیە ئاشکرایە خۆشویستن هەیە فیتری و خۆشویستن هەیە بەرهەمی فێر کردن و دەرسدان و ڕاهێنان.

خۆشویستنی زگماگ و فیتریش هەموویان لە یەک هێزدا نین: هێندەی دایک و باوک منداڵی خۆیان خۆش دەوێ منداڵ دایک و باوکیان خۆش ناوێ. بەر لە 1300 ساڵ لە پێغەمبەر (ص) پرسرا هۆی ئەم جوداوازییە چیە لە میانی خۆشویستنی دایک و باوک بۆ منداڵ و هی منداڵ بۆ دایک و باوک؟ لە وەرامدا گوتی «لأنهم منا ولسنا منهم» واتە «چونکە ئەوان لە ئێمەن و ئێمە لەوان نین». هەڵبەت مرۆڤ پارچەیێکی جەرگ و دڵی خۆی خۆش دەوێ، کە منداڵەکەیتی، پتر لە دایک و باوکێک کە ئەو پارچە جەرگ و دڵە نین.

حیکایەت بەوەندەش تەواو نابێ: تایبەتیێک هەیە لە خۆشویستنی میانی «نێر و مێ»دا دەیکا بە زاهیرەیێکی تاقانە کە لە هەموو جۆرەکانی تری خۆشویستن جودای دەکاتەوە: وەک بڵێسەی کارەبا کە وا لە بەیەکتر گەیشتنی دوو هێزی «سەلب و موجب» پەیدا دەبێ، وەیا ئاو لە تفاعلی ئۆکسجین و هایدرۆجین پێکدێ، مەیلی نێوانی دوو جنسی «نێر و مێ»ش دوو گیانلەبەران ئەوەندە لە یەکتر نێزیک دەکاتەوە هەر دەڵێی بە «تفاعلی کیمیایی» گەیشتوونەتە یەکتر و تێکەڵ بوون. نێر و مێ کە دەگەن بە یەکتر دەبن بە دوو «مصرعی» یەک بەیت.. دوو ڕووی سککە، یەکیان ئەوی تر تەواو دەکات و نوقسانی دەبڕێ و بە هەر دوویان «وحدە»یێکی تەواو پێک دێت. ئەم یەکیەتیە بەهێزەی کە خۆشویستنی نێوانی نێر و مێ پێکی دێنێت، لە جیهانی گیانلەبەراندا وێنەی نیە. کە لەوێدا وێنەی نەبوو دیارە لە هەموو جیهاندا بێ وێنەیە.

زۆرینەی جۆرە خۆشویستنەکان «یەکلایی»ن: تۆ نیشتمانت خۆش دەوێ نیشتمان بێخەبەرە… مەزهەب و فەلسەفە و سروشت و گوڵ و پەپوولە دەپەرستیت، ئەمان کەڕ و لاڵن هەستیشت پێ ناکەن.. ئەدەب و فۆلکلۆر و یاری و نازانم چی لێت دەبن بە ماخولیا، ئەوا بۆ خۆت لە سەر تاکە تەلی ئارەزۆی دڵ و دەروونی خۆت ئاهەنگسازی دەکەیت… تاڕادەیێک خۆشویستنی میانی کوڕ و باوک و دایک و خزم و برادەر، واتە ئادەمیزاد بەگشتی، بەرانبەری و دوولایێکی تێدایە بەڵام هیچ کامیان ناگاتە پلەی «تفاعل» و یەکتر تەواو کردن.

ئەم ڕاستییەی «بێمانەندی»ی مەیلی میانی نێر و مێ کە یەکێکە لە ڕاستییە زلەکانی جیهان شتێکی تا بڵێی سروشتی و ئاساییە چونکە پەیوەندیێک ژیان دروست بکات و نەسل پێک بێنێت و بەردەوامی کات لێی دەوەشێتەوە تا ئەو ڕادەیە بێوێنە بێت. لەمە کەمتر دەست نادا بۆ بەردەوامبوونی «نوع». بۆیەیە دەبینی ئەوەندەی مرۆڤ بێ ڕابەر و مامۆستا و ترس و تەماع لە خۆوە خەریکی خۆشویستن و گۆرانی دڵدارانە و سەرگوزەشتی عیشق بوە و دەوری باس و خواسی عاتیفی هەڵاتوە، لەگەڵ هیچ مەوزووعێکی تردا هێندە خەریک نەبوە. تۆ سەیر کە سەپان دروێنە دەکا وەیا شوان مەڕ دەلەوەڕێنێ وەیا کاروانچی بە دوا وڵاغەکانیەوە ڕێگەوبان دەبڕێ هەموو هەر خەریکن گۆرانی بۆ لەش و لاری خونچە و بەسێ و ئەستی هەڵدەڕێژن، بە دەگمەن و تێ هەڵەنگوتن نەبێ ناوی ئەو کەسبە نابەن لە گۆرانیەکاندا کە گوزەرانی پێ دەکەن.

سەپانێکم نەبیستوە بڵێ وەی لەبەر ئەو گوڵەگەنمە جوانە دەڵێی گوڵەباغە و نانی وەک قەنەوزە. کرێکارێکت نەدیوە لە کاتی قوڕەکاریدا بەستە بچڕێ و بڵێ بێڵەکەم ڕێکوپێکە و هەر جارە دە کیلۆ قوڕی پێ هەڵدەدەمەوە. تا نەقابە وەیا حیزب وەیا لایەنێکی سیاسی وەیا ئایینی وەیا هونەری بە دەرس و ڕاهێنان فێری گۆرانی و هەڵبەستی نیشتمانپەروەری و چینپەروەری و دینپەروەری نەکا، نە عەمەلە نە سەپان نە شوان نە کاسب نە قوتابی نە سەرباز نە قومارباز نە کۆترباز، هیچیان لەخۆوە گۆرانی بۆ هۆی ژیان و پێوە خەریکبوونیان ناڵێن و تێکڕایان هەر دەگەڕێنەوە بۆ بەژن و باڵای بسک سوور و چاو کاڵ.

وەنیە ئەم وەزعەی خەریکبوونی مرۆڤ بە عاتیفەوە سیحر و ئەفسوونی فێڵباز و دوشمنی گەل پەیدای کردبێ وەیا ئەفیوون بێ لە لایەن زۆردار و دەرەبەگ و

بورجوازی و داگیرکەرەوە خرابێتە مێشکی خەلقەوە بۆ کز کردنەوەی خەبات و گیانی شۆڕشگێرانەیان. قسەی وەها کە دەکرێ و دەگوترێ بۆ تەعلیلی پەرەسەندنی گۆرانی و هەڵبەست و حیکایەتی عاتیفی فرِی بەسەر ڕاستییەوە نیە.

ئەو کەسانەی زۆردار و فێڵبازان لە غەیبەوە دێنن و دەیانکەن بە مامۆستای دەرسدەری گۆرانی عەتیفی، لە حەقیقەتدا بەهۆی تەسکیی نیگای خۆیان و کورت هێنانی ئەو «نظریە»ی کە باوەڕیان پێی هەیە لە عاست سازاندن و دروستاندنی (تأویل و تبریر) واقیع و ڕوداو، ناچار دەبن بکەونە سەر ڕێبازی ئەو تەعلیلە هەڵبەستراوانە بۆ ئەوە، بەپێی تێگەیشتنی خۆیان، «نظریە» کەیان بە سەر پردی هەڵبەستراودا بپەڕێننەوە لە خنکان و بە درۆ خرانەوە.

ئەو تەرزە نیگا تەسکانە کە دەبینن ستەملێکراوێکی وەک عەمەلە و جووتیار لەکاتی ئیش کردن و ڕەنج بردندا غەمی خۆی بە یادی لەش و لارێکی شلک و ناسک دەڕەوێنێتەوە نەک بە ڕق هەڵگرتن لە ستەمکارەکە وەیا پێدا هەڵگوتن بە هۆی ژیانی، ئا ئەم نیگاتەسکە هەندەی تر نیگای لێڵ دەبێ و دونیای لێ وەتەنگ دێت و هیچ چاران شک نابا بۆ ڕزگار کردنی بیر و باوەڕی خۆی لەوە بەولاوە کە شەیتان و دەجاڵ و فێڵبازان پێکەوە نێ و بیانکاتە مامۆستای دەرسدەری عەمەلە و جوتیار کە خەم و خەباتی خۆیان لەبیر دەبەنەوە و بە مۆرفینی لەش و لار و گوێی بەگوار لە ڕاستە شەقامی خەباتی چینایەتی وەیا قەومایەتی وەیا هەر «...یەتی»یێکی تر بێ، لایان دەدەن[60].

لەم میسالانەمدا مەبەسم ئەوە نیە لەسەر زۆردار و ستەمکار بکەمەوە (لەعنەتی خوا و مێژوو لە ستەمکار بێ هەتا هەتایێ)، بۆ خۆشت لەم ڕاستییە دەگەیت، هەر ئەوەندەم مەبەسە لەم سەردەمەی ڕۆشنبیری و زانست و ئاسمانگەردی و ئاتۆم و هونەر و تەکنیکەدا نەیەین و بەخۆڕایی ستەم لە «عاطفە» بکەین و بێ ئینسافانە ناوی بزڕێنین.. ستەمکار هێند تاونبارە لەو مەیدانانەی ستەمیان تێدا دەکا چ

---

[60] – من بە چاوی خۆم دیومە نووسەرێکی ئەوتۆیی شیعرێکی نوێی سی ساڵەی هێناوە بە بەڵگەی بوونی گیانی چینپەروەری لای وەرزێری کورد لەوەتەی کورد هەیە.

پێویست بەوە نیە ئێمە بۆ تاوانبار کردنی ئەو، عاتیفە و هەست و سۆزی زۆر پیرۆزی مرۆڤ تاوانبار بکەین، واتە خۆمان و شریتەی باوک و باپیرانمان بدەینە بەر سەرە شیر و تیری توهمە تێ گرتنی عاتیفە و سۆزیان: کاکە ئەگەر لە فەرزی موستەحیل ستەمکار لە پێکهێنانی ئەم عاتیفەیە دەستێکیشی هەبێ، کە نیەتی، سوود لەوە دایە لەم فەقەرەیە لێی بێدەنگ بین نەوەک شیرینترین و پاکترین و پیرۆزترینی ڕووپەڕەکانی مێژووی ئادەمیزاد دزێو کەین.

سەیرکردنێکی بێ تەرەفانە و ئازایانە نیشانمان دەدا سروشت هێندە کەرەستەی بەرهەم هێناوە بۆ دڵداری و هێندەش لەزەتی تێ خستوە، بە هیچ کەسێک و لایەنێک و حکوومەتێک و شەیتانێک و جادوویەک ناکرێ بۆ مەبەسی ڕێ لێگۆڕین و دامرکاندنەوەی گیانی خەبات سەدیەکی ئەو لەزەتە ڕێک خات و خەلقی پێ بفریوێنێ و خەریکی دڵدارییان بکات. هەروەک تێنوەتی و برسیەتی لە خۆوە و بێ مامۆستا خەلق دەبا بەرەو خواردن و خواردنەوە، هەروەهاش جۆشی دڵداری پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێت و بەرەو کەرتە هاوبەشەکەی ژیانیەوە دەیبا. جازیبەی دڵداری هێندە بەهێزە نەک هەر پێی ناوێ مامۆستا خەلقی بۆ ڕاکێشێ، بەڵکوو بە درێژایی مێژوو ئایین و فەلسەفە و دەسەڵاتی جیهانی هەموویان یاسا و سزا و پەند و مەتەڵیان داناوە تا لغاوێک بخەنە زاری ئارەزۆی فیتری زۆر بەهێزی «جینس ویستی»یەوە و لە ناو پەراوێزی بەرژەوەندی کۆمەڵایەتیدا دابینی کەن.

بەڕاستی هەرچی فۆلکلۆر هەیە نەک هەر گۆرانی و هەڵبەست و سەرگوزەشتە، کە بە شێوەیێکی خۆڕسک لە دەروونی میللەتدا زاوەتەوە و بێ مامۆستا و ڕابەر کەوتۆتە سەر زار و زمانان و باوی سەندوە. لەگەڵ ساکاری و «عفویە»ی ڕووداو و تەجرەبەی ڕۆژانەی خەلق دەگونجێ و ڕێک دێ سەد جاران زیاتر لەوەی لەگەڵ گرێ و گاڵی فەلسەفە و «نظریە»ی زادەی لێکدانەوە و بەراورد کردن و هەڵسەنگاندن «دوو بەختی - یا ڕاستە یا درۆ» ڕێک بێ و بگونجێ. هیچ سەیر نیە سەپانێک دوو هەزار ساڵ لەمەوبەر گۆرانی دڵداری گوتبێ هەر وەک سەپانی ئیمڕۆ دەیلێ، بەڵام زۆر سەیرە و ناشچێتە عەقڵەوە ئەو سەپانە گۆرانی نیشتمانپەروەری وەیا چینپەروەری گوتبێ. بە فەند و فێڵێکی وشەسازانەی سەرشێوێن نەبێ نالوێ گیانی نیشتمانپەروەری وەیا چینپەروەری بخرێتە ناو گۆرانی سەپانێکی میدیایی وەیا ئاشووری وەیا فیرعەونییەوە. ئەگەر پێویستی بەرژەوەندی خەبات و ئامانجی

کۆمەڵایەتی ناچارمان نەکا فێڵ لە خۆمان بکەین، هێندەی جریوەی چوێلەکە و حیلەی ئەسپ و قاسپەی کەو ئاشکرایە کە وا لەوەتەی ئادەمیزاد توانیوەتی گۆرانی بڵێ، لە پێش هەموو مەبەسێکدا، بە زۆری بۆ مەبەسی دڵ و عاتیفەی دڵداری گۆرانی گوتوە.

تەنانەت دەتوانین لێرەدا شتێکیش بخەینەوە سەر قسەکانمان کە یارمەیمان دەدا بۆ زێدە ڕوون کردنەوەی بابەت: ئەو گۆرانی و هەڵبەستی بۆ غەیب و ئامانجی ئایینی دانراوە لە بنەڕەتدا یا لەبەر ترس یا تەماییکی دوارۆژی پاش مردن بوە نەک لە خۆشویستنێکی سادە و بێ تەئویلەوە. تاک تاکە مرۆڤی خواناس گەیشتوون بە پایەی «فنا فی الله» و تەقوا و پەرستنیان بۆ خودی باوەڕ «ایمان» بوە، لەو تاکانە بەولاوە زۆربەی خواناسان لە ترسی عەزاب و بە ئومێدی بەهەشت خوایان پەرستوە و ستایشیان کردوە. خۆ منیش ئەمە نەڵێم ئایینە ئاسمانیەکان لە خۆیانەوە ترس و ئومێدیان کردوە بە مزەی تەقوا و لە کەسیان داوا نەکردوە بێ پاداش پەیرەوی یاساکانیان بکەن. پێی ناوێ من نموونە بێنمەوە لە کتێبە ئاسمانیەکان، بۆخۆت بیانخوێنەوە و پەندیان لێ وەرگرە.

ئەمانەی لێرەدا بۆت باس دەکەم، بەلای خۆمەوە، ڕاستی بێ فێڵ و بێ سازاندن (تأویل)ـە دەشزانم هەر بەرەیە و تاقمەی کە بە باوەڕێکی تایبەتی خۆیەوە خەریکە و ناتوانێ ڕەها بێ لە «تعصب» حەز دەکا و دەکۆشێ ئیسپاتی ئەوە بکا کە وا بابەتەکەی خۆی بزوێنەری جیهانە و هەموو هێزێکی بەرچاو و نادیار خزمەتکاری ئەو بابەتەیە و شتێک نیە لە سروشت دا، بە جۆرێکی سەربەخۆ و دوور لە پەراوێزی تین و تاوی باوەڕەکەی ئەو کارێکی تایبەتی بکا. من دەزانم و تۆش دەزانی هەر کەسێک تەعەسوبێکی هەبێ بۆ باوەڕێکی تایبەتی، بەدرێژایی بەردەوامبوونی ئەو تەعەسوبەی، خەریک دەبێ بەڵگەی ڕاست و ساختە کەڵەکە بکاتە سەر یەکتر بۆ سەپاندنی باوەڕەکەی خۆی، کە تووشی بەڵگەیێکی ئەوتۆش هات ڕیسەکەی لێ بکاتەوە خووری یا چاوی لێ دەنووقێنێ و پشت گوێی دەخا یا هەر بە جارێ ئینکاری دەکا. خۆ ئەگەر دەسەڵاتی دونیایی لە دەستدا بێ ئەوسا بەوەندە دابین نابێ بەڵکوو باوەڕهێنان بەو بەڵگەیە دەکا بە کفر وەیا خەیانەت وەیا گومراهی و دەبەنگی، بەو پێیەش سزای قورسی بۆ دادەنێ.

ئەمانە واقیعی بەچاو دیتراون، تا کاتێکی درێژیش لێرە بەدواوە هەر وا دەبێ. لە هەموو ئاسۆی سیاسەت و فەلسەفە و باوەڕەوە تروسکەیێک دیار نیە موژدەی نەمانی «تعصب» ڕاگەیەنێ. لەگەڵ ئەمەشدا ڕاستی هەر ڕاستییە ئەگەر هەموو ڕۆژێک بە کوتەک دەجاران ورد و خاشیش بکرێ. حیکایەتەکەی گالیلۆم بە بیر دێتەوە کە دادگای کەنیشتە ناچاری کرد خۆ بە درۆ بخاتەوە لەوەدا گوتبووی زەوی بە دەوری ڕۆژدا دەخولێتەوە، کە گالیلۆ لە دادگا دەرچوو لەبەر خۆیەوە گوتی «لەگەڵ ئەمەشدا هەر دەخولێتەوە..». هەویری ئەم باسە زۆر ئاو دەخوازێ با لێرەوە لێی ببڕمەوە.

کەواتە دووچاربوونی حاجی قادر یا هەر مرۆڤێکی تر بە گری و گاڵی دڵداری جێی سەرسوڕمان نیەو نابێ لێی بەکەم بگیرێ. بەلای ڕای منەوە نەبزووتنی هەستی سروشتی «خۆشویستن» لە مرۆڤدا کەلەبەرێک دەخاتە نەفسی ئەو مرۆڤەوە ڕەنگە هەرگیز پڕ نەبێتەوە، واش دەبێ نەخۆشی نەفسی، دڕندەی ئەوتۆ لە دەروونی ئەم و ئەودا پەیدا دەکا کە دەیانکاتە ناحەزی خێر و خۆشی. دەشێ نەڕوانی تۆی «خۆشویستن» لە دڵێکدا سەر بکێشێتەوە بۆ پەیدابوونی نەخۆشی «سادیزم» لەو دڵەدا لە ڕێی «گرێی ناکامی – عقدة الحرمان»ـەوە.

با من لێرەدا خۆم نەکەم بە پزیشکی سایکۆلۆژی و ناوی نەخۆشییان هەڵدەم و هەڵەیان تێدا بکەم، هەر لەو پەراوێزە فرەوانەی زانیاری گشتی (معلومات عامە)دا بخولێمەوە کە خوێنەریش وەک من تێیدا بەڵەدە. لەم پەراوێزەدا بێ ترس و گومان دەڵێم بە کەمگرتنی خۆشویستن و جینس کردارێکی ناسازە چونکە سەر دەکێشێتەوە بۆ دزێو کردنی سەرچاوەی بوون و مانەوەی «نوع». خواهی و نەخواهی ئەو کەسانەی جینس بە کەم دەگرن پشتگیری دەکەن لە بەرهەمهێنانی منداڵ بە هۆی مەکینە، لەو ڕووەوە کە مەکینە هەستی خۆشویستن و جینس ناکات.

بەڵێ بێگومان دڵداری سەرچاوەکەی پاک و پیرۆزە ئەگەر بە کردەوەی بەد لێڵ نەکرێ. بەڵام لەگەڵ ئەم ڕاستییانەدا دەبێ ئەوە بزانین کە وا هەرچەند ئەم عاتیفەیەی خۆشویستن ڕواڵەتێکی سروشتی و ئاساییش بێ لە تێکڕای ئادەمیزاددا، دیسانەوە ڕادەی هێز و تەئسیری لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر تا بڵێی جوداواز دەبێ. خۆشویستنیش وکوو هەموو عاتیفەیێکی تر، لە ڕووی قووڵی و تەوژمەوە، چەندین پلەی خوار و ژووری هەیە. با نەشزانین هۆی ئەم جوداوازییە چییە، بەچاوی خۆمان

دەبینی هەندێ جار مرۆڤ تووشی سەودای دڵدارییێکی وەها دێت بەرەو شێتبوونی دەبا و ئۆقرەی لێ هەڵدەگرێ و جڵەوی ئیختیاری لە دەست دەردێنێ و ناوی دەزڕێنێ و ئەوەی پێ دەکا «با بە دەواری شڕی نەکردبێ». کەچی لای هەندێ کەسی تر ئەم عاتیفەیە ناگا بەم پلەیە و لە ڕادەی عادەتی تێ ناپەڕێنێ. هەر دوو جۆری دڵداری، بەهێز و بێهێز و جۆری مام ناونجیشی دیتراون و بیستراون. ئەمە ڕاستییێکە پێویستی بە گوتنەوە و دووبارە کردنەوە نیە. وەک ئەم ڕاستییە، دڵداری حاجی ئەویش ڕاستییێکە دەمەتەقە هەڵ ناگرێ. بەڵام! دەمێنێتەوە ڕاستییێکی سێیەم ساغ کەینەوە:

ئاخۆ عیشقی حاجی قادر چۆن عیشقێک بوە؟ تۆ بڵێی لەوانە بووبێ مێشکۆڵەی نێو ئێسکی سووتاندبێ و شەونخوونی پێ کردبێ و شەکیبایی پێ نەهێشتبێ؟

بۆ گەیشتن بە قەناعەت و دڵنیایی لەم لایەنە گرنگەی دەروون و نەفس و عاتیفەی حاجی قادر ئەوەندەی لە توانامدا بووبێ زیهنیکاری و لێکدانەوەم کردوە، گوێم گرتۆتە تەواتور، وردە هەواڵ و گوتەی ئێرە و ئەوێم قۆستۆتەوە، سەرنجم داوەتە شیعرەکانی و بە شیعری بوێژی ترم گرتوون کە عیشقی ئاگرین لە ژیانیدا هەبوە. لەوەش زیاترم کردوە: هەر وەک دوای کەمێکی تر بۆت باس دەکەم زنجیرە و سەرەنجامی ژیانی حاجی قادرم کردوە بە حەکەم بۆ بڕیاردان لە بارەی بوون و نەبوونی عیشقی قووڵ و بڵێسەدار لە دڵی حاجیدا.

لە کۆتایدا هەموو لێکدانەوەیێکی زیهنی و ڕاگەیاندنی دەنگ و باس و ئەتواری حاجی و واتای غەزەلەکانی گەیشتمە ئەم باوەڕە کە حاجی قادر لە دڵداریدا زۆر قووڵ نەڕۆییوە.

تا من ئاگاداری ئەحواڵی حاجی بم لە ڕێی بیستن و تەواتورەوە، جگە لەو کچە سابڵاغییە کە دەگێڕنەوە حاجی خۆشی ویستووە و جگە لە گوڵێی لاجان کە وا حاجی بە پەلە مەیل و ئیعجابی خۆی دەربڕیوە نەبیستراوە دڵی حاجی بۆ کچێکی تر چووبێ، لە هەموو کوردستاندا.

بەنیسبەت کچە سابڵاغییەکەوە لەوە دڵنیاین ئەگەر گوتەی دەماودەم نەبا چ سەرچاوەیێکی ترمان چنگ نەدەکەوت لە شیعری حاجی وەیا نووسینی خەڵقی تر ئیشارەیێکی تێدا بێ بۆی. غەزەلەکانی حاجی نە بە سەراحەت نە بە هێما و

وشەتێکهەڵکێشان ناوێک بە دەستەوە نادەن و ئیشارە بۆ ڕووداوێکی تایبەتی ناکەن بیرمان بۆ لای کچێکی سابڵاغی بگێڕێتەوە. کە سەراحەت هەبێ هەر ئەوەیە بۆ «گوڵێ»ی بەکار هێناوە.

ئەم دوو خۆشویستنە ئەگەر کاریگەر و خولیایی بان وەک دڵداریی شاعیرانی تر کە بوە بە داستان بە سەر زمانی خەلقەوە و لە ناو دیوانەکانیشدا نموودیان هەیە، دەبوا لە ڕووپەڕەی ژیانی «حاجی»دا پانایێکی پتر بگرنەوە و شەقڵی خۆشیان لە شیعر و ناوەڕۆکی ئەدەبی «حاجی»دا ئاشکرا بکەن.

کەواتە، بەولای ئەو دوو دڵدارییەوە، گوتەی دەماودەم و بەڵگەی نووسراو لە خامۆشی نەبێ چ شایەدییان بە دەستەوە نیە، ئەو شایەدییە نەبێ کە خامۆشی بۆ خۆی دەلالەتی «نەبوون» ڕادەگەیەنێ نەک «هەبوون».

کە بەڵگەی ئاشکرا و قسەکەر چنگ نەکەوێ با بزانین بەڵگەی نهێنی و هێمایی لە گیانی غەزەلەکانی حاجی پەنجە بۆ چ جۆرە خۆشویستنێک درێژ دەکەن!

وەرگرتنی دەلالەت لە واتای غەزەل بۆ ساغ کردنەوەی بوون و نەبوونی عیشقی سووتێنەر کارێکی زیهن و زەوق دەیکا. لە واتای شیعردا بارستی ماددی نیە تاکوو بتوانین بیکەین بە بەڵگەی ماددی و کۆتایی بە دەمەتەقە بێنین. زیهن و زەوقیش بۆخۆیان «اعتباری»ن، بەر لەوە بتوانن دەمەتەقە هەڵگرن لەسەر بابەت لەوانەن ببنە هۆی دەمەتەقە. زیهن و زەوق چین تا ببنە «قازی» و بڕیار بدەن لە موناقەشەدا! کێ دەڵێ زیهن و زەوقی بارام مووقەڵاشترە لە هی ئازاد تا ئەو ببێ بە حەکەم؟

ئەوەی ڕاستی بێ نەک هەر لە عاست شیعر و هونەر و ئەدەبدا، بەڵکوو لە عاست هەموو کارێکی «اعتباری» کە حەکەم و پسپۆڕ بڕیاری تێدا دەدەن هەمان ڕەخنە دێتە پێش. بە نموونە دەڵێم کە کچێک دەبێ بە «شاژن»ی جوانی وەیا کوڕێک دەکرێ بە شای لەش جوانان وەیا دانسەرێک یەکەم پاداشی پێ دەدرێ لە دانسدا هیچ گەزوگرێیەکی ماددی نیە جوانی و ڕێکی و تەواوی ئەو کارانەی پێ بپێورێ لە گەزوگرێی زیهن و زەوق بەولاوە. ئیتر یا دەبێ ئەو کارانە نەکرێن تا ڕۆژێک دێ و کۆمپیوتەر دەبێتە حەکەم یاخود چ چار نیە لەوەدا زیهن و زەوقی پسپۆڕان ئەو حەکەمە بن.

خۆ و تالع زیهن کاریێکی من لێرەدا دەیکەم لەگەڵ غەزەلەکانی حاجی تاکە کۆڵەکە نیە قەوارەی باوەڕەکەمی ڕاگرتبێ، چونکە نەبوونی شایەدی تەواتور و خامۆشی سەرچاوەی نووسراویش، کە تازەم خستە ڕوو، لە لای خۆیانەوە دەبنە کۆڵەکەی دووەم. بە دوا ئەمانەدا هەندێ لە هەڵبەستەکانی حاجی قادر خۆی، ئەویش، شان دەداتە بەر لاییێکی باوەڕەکەمەوە و وادەزانم، بە تەواوی دەیسەپێنێ و دەیچەسپێنێ. کەواتە بیر و ڕای من کە لە زیهن و زەوقەوە هەڵستێ وەک هی پسپۆڕانی سەما و جوانی و هونەر تاقانە نیە.

لە لای تەبعی من غەزەلەکانی حاجی زادەی مێشکن، بەرهەمی ئوستادین، هۆنراوەی سنعەتکارن. دڵداری و خۆشویستنێک کە لە شیعری حاجی بەدی دەکرێن لە پەنجە و خامەی هونەرکارەوە دەتکێنەوە، لە گڕ و بڵێسەی دەروونێکی سووتاوەوە ناتەقنەوە. ئارایشتی ڕێکخستن و تێگەیشتن و پێگەیشتن لەو شیعرانە دەدرەوشێنەوە نەک هەنیسکی گریان و بۆنسۆی دڵی هەڵکزاو.

لەم ڕووەوە شیعری حاجی دەچێتە ڕیزی شیعرە دڵدارییەکەی شێخ ڕەزا نەک نالی و کوردی. شێخ ڕەزاش دووچاری عیشقی سووتێنەر نەبوە بۆیە شیعری غەرامی کەم گوتوون، ئەوەی گوتوشیەتی ئوستادی تێدایە نەک سووتان. لەوەندە شیعرە کەمەی دڵداری کە شێخ ڕەزا هەڵی بەستوون پێنج خشتەکیەکەی بە سەر ئاتەشپارەکەی «کوردی»یەوە بە سۆزترین پارچەیێکی عاتیفییە کە شێخ ڕەزا بە دڵ و زمانی داهاتبێ، بێگومان لەمەشدا گڕ و گڵپەی دەروونی «کوردی» بڵێسەی داوەتەوە بۆ ناو دەروونی شێخ ڕەزا:

دڵی بردم بە ناز و عیشوە دیسان شۆخی عەییارێ
فریبی دام بە چاوی مەستی خۆی مەحبووبی سەححارێ
لە هیجرانی تەقم کرد ئەی ڕەفیقان کوا مەدەد کارێ
ئەمان مردم عەلاجێ سا لە ڕێی پێغەمبەرا چارێ
ویسال یا قەتل یا تەسکین لە هەر سێ بۆم بکەن کارێ

کەسێک شارەزای هەڵبەست بێ و گوێی لە مۆسیقای وشە و لەرانەوەی ڕستە تێبگا دەزانێ کام شیعر لە بورکانی عیشقەوە دەجۆشێ و کامی لە گۆمی فکر و فەلسەفە هەڵدێنجێ. بویژێکی وەک نالی ئەگەر لە ڕێی عیشقی «حبیبە»وە ئاگری تێ

هەڵنەگەڕابا، هەرچەند دەسەڵاتی «نظم»ی گەیشتبا بە پلەی «اعجاز» نەی دەتوانی خامە لە خوێنی دڵی هەڵێنێ و شیعری پێ بنووسێ. نالی و کوردی هەردوویان دووچاری عیشقی بێڕەحمی دڕندە بوون بۆیە هەرگیز گڵپە و بڵێسەیان دانەمرکایەوە. ئەو دڵەیان کە لە سەردەمی گەنجایەتیدا بوو بەماڵی عیشق یەکجارەکی لە قەبەڵی کرا و نەبۆوە بە ماڵی خۆیان. بە نموونە، بێ دەسبژار کردن، بەیتێکی دێنمەوە تین و تاوی عیشق لە شیعردا دیار بخا. نالی لە کۆتایی غەزەلێکیدا ئەمە دەڵێ:

دوور لە تۆ نالی سەگێکە بێوەفا وو هەرزە گۆ
بۆچی بانگی ناکەی ئەم کەلبە کە نانی نانییە

لێرەدا مەبەسم نیە دەسەڵاتی نالی لە شیعردا دەرخەم بۆیە خۆم لە وردەکاری و لایەنی هونەری بەیتەکە ناگەیەنم، تەنها دەمەوێ کاری سیحراوی عیشق لە بەیتەکەدا بێنمە بەر چاو.

سرنج بدە وشەکانی هەڵبەستەکە تاکە یەک وشە نادۆزیتەوە حورمەتکارانە بێ و ببێتە بەرگی ئارایشت و عەیبی وشەی «سەگ» بپۆشێ کە نالی خۆی بەو تەشبیە کردوە. وشەکانی «بێوەفا، هەرزەگۆ، کەلب، نانی نانی، بۆ بانگی ناکەی» هەموویان کەمایەتی و پایە نزمییان تێدایە. بە زاهیر دەبوا کۆمەڵبوونی ئەو هەموو وشەی نزم لە بەیتێکدا قێزی مرۆڤ هەڵستێنێ، کەچی نەفەسی گەرمی عیشق و بڵێسەی دەروونی شاعیر ئەو هەموو خۆشکاندنەوە و خۆ کەم کردنەوەی هەڵگێڕاوەتەوە بەرەو بەرزی و شەرافەت و حورمەت. دەتوانم بڵێم لە کەم جێگەدا دەدیترێ وشەی «سەگ» ئەوەندە بایەخی وەرگرتبێ وەک لێرەدا بۆی پێک هاتوە بە تایبەتی کە هیچ وشەیێکی تریسکەدار و ئاورینگاوی لێی نەبوونەتە جل و قەرێتەی ڕازاندنەوە.

تۆ سەیرکە نالی چەند ڕاست دەکا بە پێی مەزهەبی عاشقان کە دەڵێ «دوور[61] لە تۆ نالی سەگێکە بێوەفا و هەرزەگۆ» چونکە عاشق کە لە یاری دوور کەوێتەوە جێی

[61] – لێرەدا «دوور لە تۆ» هەر وەک واتای دووربوونی عاشق لە مەعشووق ڕادەگەیەنێ، هەر وەهاش خۆی کردۆتە پەرژین بە دەوری ناو و شەخسی

خۆیەتی پێی بگوترێ سەگی بێوەفا، گرۆگاڵیشی بە هەرزەگۆیی دابنرێ. عیشق وا دەکا دوورکەوتنەوەی عاشق لە مەعشووق هێندە دزێو و ناشیرن بکرێ ئەگەر وشەی بێ حورمەتتر هەبێ لە «سەگی بێوەفا و هەرزەگۆ - کەلبی نانی نانی» - کە بێحورمەتترین سەگە - ئەوی بۆ بەکار بێت. کۆمەڵبوونی وشە و ڕستەی نزم لێردا چونکە نەخشەی «بێوەفایی» دەکێشێ لە ڕێی «مەفهومی پێچەوانە»وە حورمەت کۆ دەکاتەوە لەناو بەیتەکەدا و نالی خۆشەویست دەکا و دڵی من و تۆی بۆ دەبزوێنێ، لێی دەوەشێتەوە دڵی مەعشووقەکەش ببزوێنێ ئەگەر ئەم دڵە وەک بەرد نەبێ. خۆ ئەوەی ڕاستی بێ لە عاست مەعشووقدا بە تەواوی خۆی داناوە لە جێگەی ئەو سەگە، ئەدی ئەوە نیە پێی دەڵێ بۆ بانگی ناکەی وەک سەگی نانی نانی؟

لە شیعری شاعیراندا زۆرجاران وشەی سەگ هاتوە تا بشڵێی لە دڵاندا کاریگەر بوە. وا لێردا دوو نموونەی تر دێنمەوە بۆ مەبەسی بەراورد کردن و دەرخستنی کاری عیشق بە هۆی ئەو بەراورد کردنەوە.

شێخ ڕەزا دەڵێ:

مربوطه حیاتم به سلیمانی و خاکی
خۆزگەم بە «سەگ»ی قاپییەکەی ئەحمەدی کاکی

شاعیری فارس دەڵێ:

استخوان ریزهء مجنون مفگن پیش هما
که تعلق به جناب «سگ» لیلی دارد

لە هەردوو بەیتدا وشەی سەگ نرخێکی داوە بە واتای هەڵبەست ڕەنگە هەر بە سەگی ئەو شوێنە نرخی وەها دروست بکرێ، بەڵام هەر دوو سەگ لە سەر تەخت و بالینی حورمەت دانراون و دەوریان تەنراوە بە ڕێز و خۆشەویستی.

---

مەعشووق تا بی پارێزێ لە نزمایەتی وشەی «سەگ». وەک ئەوەیە شاعیر گوتبێتی «دوور لە ڕووی جەنابت نالی سەگێکە....».

له بەیتی شێخ ڕەزادا کاک ئەحمەدی شێخ سایەیێکی وای خستۆتە سەر سەگەکە و هێندەی بەرز کردۆتەوە لە «حاجب»ی سوڵتانێک زیاتر ڕوتبەی بۆ پەیدا کردوە. لە بەیتەکەی فارسیشدا وشەی «جناب» و پایەی «لیلی» و ناوی «مجنون» و نرخی مەعنەوی مەلی «هما» زیاتر لە بەرگی ئەتڵەس و تەوقی زێڕ و خەنەی دەست و پێیان ئارایشتیان بۆ سەگەکە کۆمەڵ کردوە. هەر دوو بەیتیش نموونەی ئەدەبی بەرز و نەمرن.

بە دوا دیڕی سەگی ناو ئەم دوو بەیتەدا کە دەڵێی ئاهەنگی حورمەتیان بۆ بەرپا کراوە پتر بۆت ڕوون دەبێتەوە عیشقی نالی چ کارێکی کردوە بۆ سەگەکەی خۆی.

پێویست نابینم خوێنەر خەریک کەم بە هێنانەوەی نموونەی تر بۆ دەرخستنی تینی عیشق لە هەڵبەستدا، چونکە دەبێتە قسەی دووبارە و کوتانەوەی بەدیهیە. ئەوەی من لێرەدا مەبەسمە لایەنی بوون و نەبوونی عیشقی سووتێنەرە لە شیعری حاجی قادردا. بەپێی زەرفی من دیوانی حاجی شایەدی نادا بۆ بوونی عیشقێکی وا سووتێنەر. یەکێک لە غەزەلە هەرە پێشکەوتوو و بەناوەکانی حاجی غەزەلەکەی «نەققاشی دەمی..»یە. کە بیخەیتە بەر تەرازووی هەڵسەنگاندنی هەڵبەست بۆ کێشانی دوو لایەنی ئوستادی و سۆز، دەبینی زۆر بە ئاشکرایی خۆی بە لایەنی ئوستادیدا دەکێشێتەوە و دەچێتە ڕیزی ئەو غەزەلەی شێخ ڕەزا کە مەشوورترین بەیتی ئەمەیە:

کارێ کە غەم و دەردی فیراقی بە منی کرد<br>سەرما بە هەتیو با بە دەواری شڕی ناکا

گریمان خوێنەر زەوقی من بە حەکەم قبووڵ نەکا لەوەدا کە دەڵێم شیعری دڵداری حاجی زادەی ئوستادین، لەو ڕووەوە کە گوتم دەشێ بڕیاری زەوق لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر بگۆڕێ، خۆ ناتوانێ دەلالەتی یەکجار پاتەوپاتی هەندێ لە هەڵبەستەکانی حاجی قادر خۆی ڕەت کاتەوە لە مەیدانی بوون و نەبوونی عیشقی قووڵ لای حاجی. تۆ بڵێی ئەگەر حاجی ڕۆژێک لە ڕۆژان دڵداری ئاگرینی هەست پێ کردبا ڕێی دابا بەخۆی ئەمەی خوارەوە بڵێ دەربارەی عیشق؟

باسی زولفی دریژ و چاوی بە خەو
نەبڕاوە بوە ... ... خوسرەو

حاجی لەمەش بە سەراحەتتر دژی شیعری عاشقانە دڵی خۆی کردۆتەوە کە دەڵێ:

حەیفە بۆ پیاوی ... تەمیز
هێندە باسی مەکانی... و ...

مرۆڤێک لە کاتی گەنجایەتیدا یا هەر قۆناغێکی هەڵکشاوی تەمەنیدا لە هەناوی خۆیدا دەستەچیلەی عیشقی هەڵایساندبێ و خوێنی دڵی خۆی پێ کوڵاندبێ ناشێ و ناکرێ تا ئەو ڕادەیە بە سووکی تەماشای عیشق بکا و توانجی کوشندەی تێ بگرێ.

وا دەزانم ڕاگەیاندنی ئەم هەڵبەستانە ڕێی دەمەتەقە دەبەستن.

من نەبوونی عیشقی ئاگرین لە دڵی حاجی قادردا بە زاهیرەیێکی دابڕاو و لاتەریک نازانم لە تێکڕای ویژدانی حاجی. بەلای تصوری منەوە ئەگەر نەبوونی ئەو عیشقە هەر لە پەراوێزی «نەبوونی عیشق»دا وەستابا و چ پەیوەندی نەبا لەگەڵ سەرلەبەری تابلۆی هەست و نەستی حاجیدا ئەوسا دەمگوت بزریی بڵێسەی عیشق نەختێک ڕەنگی تابڵۆکەی سپیپات کردۆتەوە و بەس، کەچی بەلای باوەڕی منەوە نەبوونی ئەم بڵێسەیە، هەرچەند خۆی ڕواڵەتێکی سەلبیە، بە جۆرێکی یەکجار کاریگەر و «ایجابی» خۆی نواندوە لە تابلۆکەدا و سەرەنجامی گەیاندوە بە عەلاقەداری لەگەڵ بنیادی گیانی کورپەروەریی حاجی قادر.

داوا دەکەم خوێنەر لێرەدا لەگەڵم بەپشوو بێ و لە قسەکانم ورد بێتەوە و سووک بە سەریاندا تێپەڕ نەبێ، ئەگەر ڕێم بدا تکای لێ دەکەم ئەویش وەک من ڕایەکە لە دڵ و مێشکی خۆیدا بکوڵێنێ و لەگەڵیدا نەختێک خەریک بێ، ئەگەر نەڵێم لەگەڵیدا بژی.

من بۆ ئەوە دەچم ئەگەر حاجی قادر لە سەرەتای گەنجایەتییەوە وەک نالی و کوردی هەست و هۆشی دیار و نەدیاری بە سۆزی عیشق پڕ بووبایەوە نەدەشیا لە

دوارۆژدا دەروون و نەفس و گیانی یەکجارەکی لەو عاتیفەیە بەتاڵ بێت و سەرلەنوێ بە عاتیفەیەکی تازەی تاقانەی نیشتمانپەروەری پڕ ببێتەوە. نەدەکرا لەو بورکانەی سەرەتای عومر و گوڕی گەنجایەتی نە پشکۆیەک نە بزووتێک نە خۆڵەمێشێکی گەرم نەمێنێتەوە وەک هەرگیزاو هەرگیز وجوودی نەبووبێ.

وا پێ دەچێ لە بیرەوەری دڵداریی کاتی جحێڵی هەر لایەنی ماددی حەیوانی خۆی هێنابێتەوە بەر هۆشی حاجی، کە ئەویش پاشماوەیێکی ئاسایی عیشقی بێڕەگە و وێنەیێکی خورتی و سەرگەرمیی دەوری گەنجایەتییە. بۆیە وەها بێپەروا دەکەوێتە دژی و بە چاوی سووک سەیری دەکا. گەر لە تارمایی عیشقی کۆن شێوەیێکی بلێساوی و خولیایی و مەجنوونانە لە ئاسۆی بەیانی گەنجایەتییەوە پڕشنگی داباوە بۆ ئێوارەی ژیانی حاجی، بێگومان، بە جۆرێکی تر پێشوازی لێ دەکرد.. بە چاوێکی تر تێوەی ڕادەما... دەنگێکی تری بۆ بەرز دەکردوە.

ئێمە دەزانین حاجی قادر دۆست و هاوڕێ و ناسیاوی خۆی لەبیر نەدەکرد، بۆ دار و بەردی کۆیەی دەناڵاند. دەوجا ئەگەر لە تابلۆی ڕابوردوویدا وێنەی فرشتەیێکی عیشق و سۆزی دڵداری هەبا، تۆ بڵێی بەم چەشنە یەکجارەکی و بێ ئاشتبوونەوە لە ناخی دڵدا کەوتبا دژی ئەم وێنەیە؟ هەرگیز ئەمە ناچێتە ناو هیچ حیسابێکی بەسەرەوبەرەوە.

نەبوونی ئەم وێنەیە لە تابلۆی ڕابوردووی حاجیدا ئەوەی بەرهەم هێنا هێندە بە سادەیی و بێباکی و قێز و بێزەوە ناوی عیشق بێنێ. بەڵام هەر لەوەندە نەوەستا، شتێکی یەکجار گرنگتری بەرهەم هێنا. تۆ بڵێی ئەم شتە چی بێ؟ فەرموو لەگەڵمدا سرنج بدە ئەم دیمەنە کە دێتە بەرچاوی زیهنی منەوە.

وا دەزانم نەبوونی عیشقی سووتێنەر لە ڕابوردووی حاجیدا بەشدار بوە لەوەدا کە دوا ڕۆژ نامومکینێک ببێتە مومکین: ڕێی داوە بەوە کە هەموو بوونی ماددی و مەعنەوی و ڕواڵەتی و دەروونی و خەو و بەخەبەری حاجی سەرانسەر لە قەبەڵی کوردایەتی بکرێ بێ ئەوە یادی دڵداری ببێتە شەریکی هەزارییێکی ئەو بوونە. هەر دەڵێی حاجی کە داخڵی عیبادەتخانەی کوردپەرستی بوو، گیانی و دڵێکی بێپەڵەی بێنوختەی وەک کاغەزی سپی تەسلیم بە خامەی چارەنووس کرد ئیتر ئەو خامەیە بێ ئەوە ڕەشایی

پیتێک وەیا خاڵێکی نووسراوی بێتە پێش بە هەموو لایێکی کاغەزەکەدا مەشقی خۆی لێ کرد تا ڕووپەڕەی پڕ کردەوە و دوو جار و سێ جاریشی بەسەردا هاتەوە.

لەم ڕوانگەیەوە دەتوانین چاوێکی حەقیقەت بین هەڵێنین و سەیری کوردایەتی حاجی بکەین و تێ بگەین چۆن مومکین بوو تا ئەو ڕادەیە شەیدای کورد و کوردستان بێت. حاجی بە جۆرێکی عاشقانە و دێوانانە باسی کورد دەکا، لەم مەیدانەدا هەر کوردپەوەر نیە و بەس: وەک مەجنوونی لەیلا وایە ئەگەر ڕاست بێ و مەجنوونێک هەبووبێ.. خۆ ئەگەر نەبووبێ حاجی بۆتە ئەو مەجنوونە. سۆزێکی کە هەستی پێ ناکرێ لە شیعری دڵدارانەی حاجیدا و لە شیعری نالی و کوردی تاو و تین دێنێ بۆ دڵی هەستیار، لەمە زیاتر و دڕندەتر وەک بڵێسە لە شیعرە نیشتمانیەکانیەوە هەڵدەستێ و دەماری هەستی خوێنەر هەڵ دەپڕووکێنێ.

حاجی شەیدایانە دەگەڕێ بە دوا تەعبیردا بەڵکوو وەک ئاو نەختێک لە کڵپەی هەناوی کز کاتەوە بەڵام ناگا بەو تەعبیرە کە برین سارێژ دەکا وەیا خوتخوتەی دەروون خامۆش دەکا.. هەرچی دەیڵێ کەمتر لە پێویست هەرچی دەیکا بێ سوودە لە عاست بێ ئۆقرەیی. بورکانی نەفسی دەجۆشێ و دەخرۆشێ، دەیسووتێنێ و سەبری لێ دەبڕێ و زیرەی لێ هەڵدەستێنێ و شیعری پێ دەڵێ و یەخەی دار و بەردی پێ دەگرێ گڕوگاڵی خولیای بۆ تەرجەمە دەکا.. نەخێر تەسکین نابێ و ئۆخەی ناکا.. خەیاڵی ئاگرین دەیبا بۆ هەموو بابەتێک بیکا بە هۆی تەقین و هەڵڕژان..

تێهەڵدەچێ بەرەو هەڵدانەوەی بوتی کوردی تا دەگاتە سنووری موبالەغەی ئەوتۆ لە جیهانی دێوانە و شەیدایان نەبێ جێی نابێتەوە. «لە گاوان و شوانی کوردەکان یەک بەسە بۆ لەشکری سەد کەڕەە دوو لەک» کوردێک بەس بێ بۆ لەشکری بیست ملیۆنی.. بەڵام قسەیێکە و کورت دێنێ لەگەڵ مەبەس، ژیلەمۆی دەروون تەڕ ناکاتەوە، گڕ و گڵپە داوای پتر دەکا... کەشتیەکەی نووح بەسەر کێوی کوردستانەوە وەستا کەواتە ئادەمیزاد لە جاری دووەمی پەرەسەندنیدا «کوردزاد»ە... پەروەردگارا! بە کوردیت مەدح دەکەم تا نەڵێن بە کوردی مەدح نەکراوی. مەدحەکەت بۆ ئارایشتی کوردییە بەهەشتی پێ ناکڕم...

من هەرچەند بمەوێ بە نووسین و شی کردنەوەی خۆم وێنەی ئەو خولیایە سووتێنەرەی کوردایەتیی حاجی قادر بکێشم ناگەم بە کەمەری ئەو پەیکەرە ئاگرینەی کە خامەی حاجی لە کەرەستەی هەست و ویژدان هەڵی ناوە، بۆیە لزوم ناکا خۆ خەریک کەم بە «تحصیل حاصل»ێکی کەم و کورت. با هەر ئەوە بڵێم لەلای خۆمەوە عیشقی حاجی بۆ کوردایەتی عیشقێکی تەواو و بێهاوبەشە لە دەروونی حاجیدا. دەمەوێ بڵێم حاجی هەموو دڵ و گیان و هەستی خۆی بە کوردایەتی بەخشیوە تۆسقاڵێکی بۆ هیچی تر نەهێشتۆتەوە. هەروەک دڵداری بێ بەش کردوە لە کلپەی دەروونی، ژن و ماڵ و منداڵیشی نەبوە بایی زەڕڕەیێک دڵی خۆی پێیانەوە خەریک کا.

ئەم تەنهاییەی حاجی لەگەڵ تاکە خولیای کوردایەتی لە ساڵانی دوایی ژیانیدا دیمەنێکی تراژیدی ماتەمینی ئەوتۆ دێنێتە بەر چاوی سرنجدەر چەند جاران لە سۆز و پەرۆش و تەقدیسی بۆ حاجی زیاد دەکا. من کە دەبوو لە دوای لەگەڵدا ژیانی دوورودرێژم ئاشنای ئەرک و عەزابی حاجی ببم و لێی ڕابێم، کاتێ کە بیرم دەڕوا بۆ ساڵانی ئاخەلێوەی ژیانی ئەگەر تانووت نەدەمە بەر خۆم جورئەتی سرنجدان و لێ وردبوونەوەم نابێ: پیری، تەنهایی، غەریبی، هەژاری، خولیای سووتێنەری بێئومێد و بێبەرهەمی نزیک و بەرچاو، نەبیستنەوەی دەنگی خەبات و تەقەللا لە هیچ لاییەکەوە...

دەک لەبەر ئەم عەزابە بێ سەر و بنە!!

ئەو سەغڵەتییەی «أبو فراس الحمداني»ی هەراسان کردو وەتەنگی هێنا لەو چەند ساڵەی ئەسیربوونی لای ڕۆمەکان تا وای لێکرد بەدەم هەنیسک دانەوە بڵێ:

أسجنا وبعدا واشتياقا وغربة
ونأى حبيب ان ذا لعظيم

وان امرء يبقى وفيا لعهده
على مثل هذا انه لكريم

ئا ئەم سەغڵەتیەی «أبو فراس» لە تەک ڕەنج و ئازاری بێبڕانەوەی حاجیدا وەک دڵتەنگی کاتی دەمەو ئێوارانە لەچاو تلانەوەی شەوی مارانگاز. حاجی کە لەگەڵ خۆیدا دەڵێ و وەرام دەداتەوە:

بەسە حاجی دوو سەد هەزار دەفعە
پێم گوتی ئەم قسانە بێ نەفعە

باوکە هەر چۆنی تۆ دەڵێی وایە
تێ دەگەم ئەو قسانە خۆڕایە

قوڕی کام جێ بکەم بەسەر خۆما
ئەمە لێم بۆتە عیللەتی سەودا

لێرەدا حاجی وەک سەحرانەوەردێکی یەکە و تەنها ژیلەمۆی لمی نیوەڕۆ بە هەنگاوی شەکەت دەپێوێ لە ڕێگەیێکی بێبڕانەوە بەرەو ئاسۆیێکی خوێیاوی سەرابی، دەشزانێ وا ڕۆژی عومری بەسەر دەچێ و شەوێکی هەتا هەتایەی بەدوادا دێت کە هیچ ڕووناکایی و فەجرێکی لێ ناپشکوێ، کەسیشی نیە لە پاش خۆی بە وەکالەتیش چاوێکی بۆ هەڵێنێ وەیا هەناسەیێکی بۆ هەڵمژێ... دەریای بێئەمانی مەرگ لە ژێر شەپۆلە بێڕەحمەکانی خۆی دەیپێچێتەوە و پەیوەندی لەگەڵ جیهاندا یەکجارەکی دەبڕێ و کۆتایی بە بوونی دێنێ و لە بنجەوە هەڵی دەکەنێ... بەڵێ «مەحبووبە»ی ئەو کە کوردستانە هەر دەمێنێ و بێ بڕانەوەیە، بەڵام بە قەدەر گەورەیی کوردستان لە دڵی حاجیدا کەسەر و ئازاری لێ دەرچوون و دەست لێ بڕانی گەورە دەبێ و تاڵاوی سەرەمەرگی لێ تاڵتر دەکا.

بێگومان ڕۆژانی کۆتایی ژیانی حاجی ماتەمێکی یەکجار زل بوە: هەرچی ئومێدێک کە ڕۆژگار ڕووناک دەکا بۆ مرۆڤ لە ئاسۆی دیار و نادیاری حاجیدا وجودی نەبوە، ئومێدیش نەبوە بە پەیدابوونی هیچ ئومێد. کۆش و باوەشی خێزان و منداڵیش نەبوە ساردایی شەوانی سەرەمەرگی گەرم کاتەوە. هەروەک «حمزە» کە لە جەنگی «أحد»دا شەهیدکرا و کەسی نەبوو بۆی بگریێ، پێغەمبەر کە گوێی لە گریانی خەلق بوو بۆ کوژراوەکانیان، بەدەم گریانەوە فەرمووی «ولکن حمزة لا بواكي له» -

هەمزە کەسی نیە بۆی بگری، هەروەهاش حاجی کە گەیشتە کاتی سەرەمەرگ و گیانەڵاوە...

با بەس بێ لە منەوە دووبارە کردنەوەی مەرگی حاجی، خۆ ئیمڕۆش کەسی نیە لە پشت و کەمەری خۆی بۆی بگری. خامەی من کە شینی بۆ دەکا دوای حەفتا و پێنج ساڵ[62] لە پەلەفڕی مەلی ڕوحی بە چەنگاڵی نەزعەوە شەرافەت بۆ خۆی کۆ دەکاتەوە لە میراتی مەعنەوی حاجی... مەشقی خۆنیشاندان دەکا لە بەر شەوقی شەخسیەت و شۆرەتی حاجی.. خودپەسندی خۆی دەشارێتەوە لە ناو تەپ و تۆزی شیوەن کردن بۆ حاجی.

لەبەر چاوی «تصور»م عەزابی دوارۆژانی حاجی خەیاڵی مرۆڤی ئیمڕۆ دەتۆقێنێ، دەوجا دەبێ چ عەزابێک بووبێت.

بەڵام لەنێوان تەبەق ئەندەر تەبەقی ئەم هەموو عەزابەدا ڕاستییێکی گەورە دێتە بەر هەستی سرنجدەر، تا ڕادەیێک بۆی ئاشکرا دەکا چۆن حاجی توانیوەتی خۆی ڕاگرێ لەبەر سفتوسۆی سووتان و قیمەبوون بە دەست و دەمی بڵێسە و تیغی چەندین جۆر تلانەوەی کوشندەوە: کڵپەی سۆز و پەرۆش و خولیای دڵ و دەروونی حاجی بۆ کورد و کوردستان دەردەکانی تری کز کردۆتەوە لە نەزەر خۆیدا. وەک بڵێی حاجی مۆمێک بووە و سووتاوە بە ئاگری سەودای کوردایەتییەوە، لەو سووتانەیدا فەلاکەتی غەریبی و پیری و بێکەسی دەسەڵاتی کار تێ کردنیان نەماوە. خواجە «کلیم»ی هەمەدانی دەڵێ:

زآتش هیچ پروا نیست دور از آب ماهی را

واتە ماسی کە لە ئاو دوور کەوتەوە پەروای نامێنێ لە ئاگر، حاجیش وەک ئەو ماسیە و لەویش زیاتر ئازاری هەرە گەورەی سووتانی بۆ کورد پەکی ئازارەکانی

---

[62] - ئەم نووسینە لە 1972 دا نووسراوە، ئەوسا 75 ساڵ بەسەر مەرگی حاجی دا تێپەڕی بوو.

تری خستوه.. حاجی وەک ماسیێک بوە کە لەناو بۆتەدا ببرژێ و پەروای نەبێنێ لە بێ ئاوی.

با سەرەوژوور بمەوە بەرەو ئەسڵی باسەکە و بڵێم بەدوا ئەم شی کردنەوەی تازە خستمە بەرچاوی خوێنەوەوە جورئەتی ئەوە دەکەم لەگەڵ خۆمدا بڕیار بدەم کە وا حاجی قادر لە سەرەتاکانی ژیانی گەنجایەتی و کەمپەروابیدا دووچاری دڵدارییێکی ئەوتۆ نەبوە جنجرۆک گیر کا لە پەردەی دڵی، ئاگر بەرداتە هەناوی و مێشکۆڵەی ناو ئێسکی بسووتێنێ. نەبوونی پەیوەندی و گیرۆدەیی زۆر بە دڵداریەوە ڕەهایی و ئازادی بۆ حاجی پێک هێناوە لە کۆتێکی قورس. ئەم کۆتە قورسەی عیشق ئەگەر بوویایە ئاڵقە بە دەوری دوو مەچەکی دەستی حاجییەوە هەندێکی لەو مەساحەیە دادەگرت کە کۆتە قورسترەکەی نیشتمانپەروەری پێی دەویست.

خوێنەر لێم بە سەهوو نەچێ: من ناڵێم دوو سۆزی عیشق و کوردایەتی لە دڵێکدا کۆ نابنەوە، دەڵێم سۆزی دڵداری کە لە دڵدا هەبوو بەشی خۆی لەو دڵە وەردەگرێ و تێیدا دەبێتە شەریک: ئا ئەم شەراکەت و هاوبەشییە، نەک تەنها هی دڵداری بەڵکوو هی هیچ جۆرە سۆزێکی تری ئەوتۆیی لە دڵی حاجیدا ڕەگی نەبوە، هەموو دڵی هی کوردستان بوە و لە کولانەی کوردایەتییەوە دڵی بۆ شت چووە. نموونەی وەک حاجی قادر لە نایاب نایابترە لە ڕووی خۆ لە قەبەڵ کردنی تاکە ئامانجەوە، بەتایبەتی کە ئامانجەکە دنیایی و سیاسی بێ. هەر بۆیەیشە پەیدا کردنی هاوتای حاجی وەیا دۆزینەوەی لە نێوان کەسانی مێژووی کۆن و نوێدا یا هەر بە جارێ مومکین نیە یاخود لە ئەستەم ئەستەمترە: وەک حاجی تا ڕادەی جەزبەگرتن شەیدای کورد و کوردستانە کەسی تر پەیدا نابێ ئەو شەیدایە و جەزبەگرتوە بێ لە مەیدانی تێدا خەریکبوونی.

دەشێ مرۆڤی پاک و دڵسۆز و خۆبەخت کردوو بدۆزرێتەوە، بەڵام شەیدا و خۆ لە قەبەڵ کردوو و دەست لە هەموو شتێک بڕاوی وەک حاجی، ئەگەر خۆ بە سەهوو نەبەین، یەکجار یەکجار بە دەگمەن دەدیترێ. لەم سێ بارە کردنەوەی وشەی «یەکجار»دا سەرت لێم سوڕ نەمێنێ، فارس گوتەنی:

سالها میگزرد شنبه به نوروز رسد

دوو دڵداریە مەعلوومەکەی حاجی لە سابڵاغ و لاجانێدا، خۆشبەختانە، یاریدەرییێکی باشیش دەدەن بۆ وەرامدانەوەی پرسیارێک کە لەوەوە هەڵدەستێ شیعری «غەزەل بۆ کوڕ» دێتە پێش چاو چ لە دیوانی شاعیرەکانی کورد بێ، کە یەکێکیان حاجی قادرە، چ لە دیوانی گەلێک شاعیرەکانی تورک و عەرەب و فارس بێ.

شاعیرەکان لە بزاوتنەوەی خەیاڵیان لە مەیدانی مەدحی کوڕدا گەلێک جۆر هونەر و شێوازیان بەکارهێناوە. وا هەیە شاعیرێک لە یەک غەزەلدا کوڕ و کچی بە یەکدی گرتوون و یەکیانی بەسەر ئەوی تردا ترجیح کردوە، یاخود جووتە شاعیرێک لە یەک قەسیدەدا کۆبوونەتەوە و هەر یەکەیان لایەنێکی پەسند کردوە و پێیدا هەڵگوتوە. شاعیری واش هەیە غەزەلی سەرلەبەری بۆ کوڕ داناوە وەیاخود بەشێکی زۆری لە هەڵبەستەکانی بۆ کوڕ تەرخان کردوە.

لە عاست ئەم مەوزوعەدا نووسەران لە یەک باوەڕدا نین: نووسەرم دیوە خۆی خەریک نەکردوە بە ڕاستبوون و ڕاست نەبوونی مەیلی شاعیرەکە لەو هەڵبەستەی بۆ کوڕانی داناوە. لە تەک ئەمەدا نووسەریشم دیوە ڕواڵەتی وشە و تەعبیری کردوە بە بەڵگەی هەبوون و نەبوونی ئارەزۆی بیژۆک (شاز) لای بوێژ. تەنانەت هەموو هەڵبەستێکی دڵدارانەشی داناوە بە بەڵگەی بوونی ئافرەتێکی ڕاستەقینە لە ژیانی بوێژدا و خۆی لەوە نەگەیاندوە ئایا هەڵبەستە دڵدارانەکە زادەی گڕ و تینێکی حەقیقی عیشقە یاخود بەرهەمی لێکدانەوە و ڕێک خستنە: بەچکەی دڵە یا هی مێشک.

لێرە بەپێشەوە نەختێک بیر و باوەڕی خۆم لە بارەی عیشق و دڵداریەوە ڕوون کردەوە بایی ئەوە بکا جێگەی حاجی قادر و هەڵبەستە دڵداریەکانی دیار خا لە جیهانی عیشق و سەودادا. لێرە بەوەلاوە گڕوگاڵێک دێنمە سەر کاغەز بەپێی دەرفەت هەندێک لە ڕۆشنایی فکری خۆم باوێتە ناو ناوەڕۆکی ئەم بابەتە پڕ هەست و تەقیە و ناسکییەوە، دەرفەتیش ئەوەندەی بە بەرەوە نیە چی لە دڵدایە بۆ خوێنەری هەڵڕێژم.

کورتەی بیر و ڕای من دەربارەی زاهیرەی هاتنی ناو وەیا تارمایی کوڕ بۆ نێو شیعر ئەوەیە کە زاهیرەکە خۆی لە خۆیدا نابێتە بەڵگە بۆ هەبوونی عاتیفەی شاز لای شاعیر، هەروەک شیعری شەرابدۆست ئەویش بە تەنها خۆی نابێتە ئیسپات کە

شاعیرەکە بادەگوسار بوە. من بۆخۆم شاعیر دەناسم باسی عیشق و شەرابی لە شیعردا کردوە کەچی هێندەی کە ملحد لە نوێژ دوورە ئەویش لە هەر دوو کار دوور بوە. «تناقض»ی وەها لای شاعیرانی ڕۆژهەڵات یەکجار زۆرە تۆ بڵێی دەبێ هۆیەکەی چی بێ. لێرەدا بەو پەڕی کورتبێژییەوە لە مەوزووع دەدوێم.

ئەو عالەمەی کە شاعیری ڕۆژهەڵاتی ئیسلام چەند سەدە ساڵێکە تێیدا دەژی، بە هەر دوو باری فکری و مادییەوە، لەبەر هۆی زۆر جۆر کە لێرەدا مەودای شەرحدانیان نیە، وەک زەویجاڕی لێ هاتوە کە هەموو تۆیێکی لێ ڕواوە. لە هەموو لاییێکەوە دیواری «نەکەی عەیبە، کوڕە بێ شەرعییە» مەودای بزووتنەوەی لێ تەسک کردۆتەوە و لە ئەنجامی کاردا بە هۆی وەتەنگ هاتنی دەروون لەو تەنگژەی بێمەودایی‌ەدا عاتیفەی جوداجودای تێکەڵ و پێکەڵ بوون، سنووریان بەزیوە.

گەلێک شاعیر بەهۆی ئەو تەنگەتاوەبوونەی بە دەست کەم دەرفەتییەوە هەموو کێڵگە تەسکەکانی عاتیفە و هەستی جۆرجۆری ناو دڵی گوشراوی خۆی بە شیعر کوتاوەتەوە تا دەبینی هەم کافرە هەم ئیماندار، هەم زاهیدە هەم بادەگوسار، هەم کوڕدۆستە هەم عاشقەکچ. بە شەرمە و بێ حەیایە... هەموو شتێکە و هیچیش نیە. ڕەنگە لەهەر بابەتەش پشکێکی هەبێ کە دەیکا بە کۆمەڵگەی «متناقضات» وەیا شەبەندەبەڕۆژەی عاتیفە و باوەڕ.

ڕەنگە لە ڕاستی دوور نەکەوتبێتمەوە کە بڵێم هۆیەکی دیکەی زۆر گرنگ کە لە جەرگەی بڕیار و داخوازی و پێویستەکانی کۆمەڵایەتییەوە هەڵدەستێ ئەویش بووبێتە خلیسکێک کە شاعیر لێوەی خزیوە بەرەو قەپێلکی تەسک و تروسکی زاتی خۆی و تێیدا حەبس بوە: شاعیران بەتێکڕایی لە وەزع و دەسەڵاتێکدا نەبوون خۆ تێکەڵ کەن لە چەندوچۆنی و چاکە و خراپەی ئەو ڕووداو و کەینوبەینە کە لەناو کۆمەڵدا سەر هەڵدەدەن و کار دەکەنە سەر باری ژیان و گوزەران و ئاسایشی خەلق. ئەم لایەنانە لە نەزەر شاعیردا خاوەنی خۆیان هەبوە چ لە داهێنانیان بێ چ لە بەرهەڵستی کردنیان. بڕیاری چاکبوون و خراپبوونی ڕووداو بەدەست دەسەڵاتدارانەوە بوە، ئەوانیش ژمارەیێکی یەکجار کەم بوون لە پیاوی میری و ساماندار و خاوەن هێز، هەندێ جاریش پیاوی ئایینی. کەم وابوە شاعیر خاوەن دەسەڵات بووبێ بەتایبەتی لەناو کوردان. لە فەرزی هەشبووبێ بە تێپەڕینی سەدان ساڵ لە لاتەریکی و گۆشەگیری شاعیر و خۆ تێنەگەیاندنی لە کەینوبەینی

کۆمەڵایەتی وڵاتەکەی ئەم حاڵەی لێ بوە بە قاڵب وەیا قەپێلک وەیا جل و بەرگ و تێی خزاوە.

نەبوونی دیمۆکراسی شاعیر و ئەدیبی ناچار کردوە بە خەریکبوون لەگەڵ نەفس و خولیاکانی خۆی تا وای لێهاتوە بیر نەکاتەوە لەوە کە خۆهەڵقوتاندن لە کار و باری ژیان مافی ئەو بێ. وەنیە لەوەشدا شاعیر و ئەدیب گوناهبار بن لەچاو زوربەی میللەت، چونکە هەروەک شاعیر و ئەدیب بە نووسین و هەڵبەست لە کاروباری کۆمەڵایەتی بێدەنگ بوون تێکڕای میللەتیش چ دەنگێکی ئیعتیرازی بەرز نەکردۆتەوە هەرچەند ڕووداوەکان و کارەساتەکان و خۆشی و ناخۆشیەکان لەگەڵ جەرگەی بەرژەوەندی ئەو خاوەن عەلاقەبوون یاخود بە گوتەیێکی ڕاستتر، دەسەڵاتدار گەمەی بە بوون و چارەنووسی ئەو کردوە لەو کارەساتانەدا. دەوجا میللەت کە لە عاست ژیانی خۆیدا بەدەنگ نەیێ شاعیر و ئەدیب بۆ دەبێ دەست کەن بە چەنەهەراشی.

بەڵێ ڕاستە میللەت نە دەسەڵاتی ماددی و نە دەسەڵاتی هۆشی لەوەدا نەبوە بەدەنگی بێنێ، بەڵام ئەم گوتەیە پرسیارەکە ناگۆڕێ: تێکڕای میللەت بێدەنگە و ئیعتیرازی نیە لە ڕووداو، دەتوانم بڵێم خۆی بە خاوەن ماف نازانێ لە بەدەنگ هاتن، شاعیر و ئەدیبیش وەک هەموو میللەت فرچک گرتوو بوە لە بێدەنگبوون، کە تاوانێک و درێغێک هەبێ هی هەموانە کە نەبێ ئەوا بۆ کەس نیە. بە نموونەی تەشبیهـ دەڵێم کە ڕێگر هات و کاروانی ڕووت کرد و کەس دەستی نەکردەوە لەسەرماڵی خۆی، گریمان شاعیرێکیشیان لە ناودا بووبێ و بە شیعر وەسفی ڕووت کردنەکەی نەکردبێ چ گلەیی تایبەتی لەو ناکرێ مەگەر بۆ شەڕ پێ فرۆشتن. کە خاوەن ماڵ لە قافڵەدا ماڵی ببەن بە تاڵان و چ دەنگ نەکا عەیبیشی لێ نەگیرێ، شاعیرێکی ڕێبوار لە قافڵەکەدا بە دەست یا بە زمان دژی جەردەکە نەوەستابێ هەر بەجارێ بێ عەیبە. خۆ ئەوەی ڕاستی بێ بە درێژایی ڕۆژگار هێشتا شاعیر زیاتر بەدەنگ هاتوە و نارەزایی دەربڕیوە لە کاری ناڕەوا.

تۆ سەیرکە ئەحمەدی خانی چەند مەودای زەمەنی پێش میللەتەکەی کەوتۆتەوە لە هەست کردن بە کوردایەتی و مافی نەتەوایەتیدا. فیردەوسیش بێنەوە بیرت...
نووسەر هەیە دەیەوێ مێژوو وەها بێنێتە بەرچاو کە ڕۆڵی میللەتی تێدا دەیان جار لە حەقیقەت زیاتر گەورە بکرێ، لەو کارەشدا بەڵگەی بە قەدەر دەنکە جۆیەک

دەکا بە هێلکەی قاز، بەڵام کاری وەها چ سوودی نیە لە زەرەر بەولاوە. پێی ناوێ مێژوو بگۆڕین، ئەگەر هیچمان لە دەست دێ با ئێستا و دوارۆژ بەرەو چاکتر بگۆڕین.

خولاسە و پوختەی گوتە ئەوەیە تا ڕێگە هەبێ بۆ تێکەڵبوون لەگەڵ باری کۆمەڵایەتی و سیاسی، ئەدیب و شاعیر و هونەرکار زیاتر لە قەپێلکی خۆیان دێنە دەر و کەمتر «تناقض» لە بەرهەمیان دەردەکەوێ. بەڵێ مومکینە قەناعەتی کەسێک بگۆڕێ لە قوناغێکی تەمەنی بۆ قۆناغێکی دیکە، بەڵام ئەمە پێی ناگوترێ تناقض بەڵکوو «فراژووبوون - تطور»ە. تناقض لەوەدایە هەموو ڕۆژێ، یاخود لە ماوەی کورتدا، واتای لەیەکدی نەچووی بێتە ناو بەرهەمیەوە، ئەو بەرهەمە ئەدەب بێ یا هونەر.

لە سەردەمی ئێستاکەدا ئەغلەب وا دەبێ لایەنی دەسەڵاتدار ئەدیب و هونەرکار تێکەڵ دەکا لەگەڵ ڕووداوی ڕۆژانە و سیاسەتی کاری نێزیک و دوورەدەستی دەرەکی و ناوەکی بەڵام ڕێی ڕەخنەگرتنی لێ دەبڕێ، هەر لەوە ئازادی دەکا کە پێیدا هەڵ بڵێ و چاوی خەلقی بۆ بنووسێنێ و جنێو بە ناحەزانی بدا. خۆ من بڵێم و نەڵێم ناوەڕۆکی هەرە نرخدار و بەشەرەفی دیمۆکراسی ئەوەیە خەلق بتوانێ بێ ترس و لەرز ڕەخنە بگرێ لە کاری خاوەن دەسەڵات. بە میسال دەڵێم لە گۆڤارێکی میسری کاریکاتۆرێکی هەفتانە هەیە بە ناونیشانی «محمود بک الماضي» کە هەر جارە بە جۆرێک گاڵتە دەکا بە خاوەن زەویەکانی سەردەمی فاروق، حەز دەکەم دەنگم بگەیەنم بە نیگارکێشەکەی ئەو کاریکاتۆرە و پێی بڵێم: محمود بەگ بیستساڵی تەواوە دەسەڵاتی سیاسی نەماوە، ئیمڕۆ میسر پێویستی هەیە بە کاریکاتۆرێک کە لە ژێر ناونیشانی «الأستاذ محمود عبدالحاضر»دا ڕەخنە بگرێ.

بەڵام هەرچۆنێک بێ خەریک کردنی ئەدیب و هونەرکار بە خزمەتی فەلسەفە و مەسڵەحەتی دەسەڵاتدارەوە قەپێلکە کۆنەکەی «نفس»ی لێ دەگۆڕێ بە یەکێکی تازەی وەزیفە و فەرمان کە جێی خەریکبوونی بە نەفسی خۆی تێدا نابێتەوە، چونکە ئەویش هەند تەسکە بە حاڵ بایی ئەوە دەکا بۆ ئەنجامدانی فەرمانە پەیتا پەیتاکانی دەسەڵاتدار تێیدا هەڵسووڕێ. چاکە و خراپەی ئەو قەپێلک و ناوەڕۆکەش لە دەست ئەدیب و هونەرکارەکە دەردەچێ و بەند دەبێ بە چاکە و خراپەی خاوەن دەسەڵات و فەرمانەکانی، ئیتر کوردی گوتەنی خۆ و تالع.

ئەمانەی گوتمان لە جێی خۆیان بن، بە دوا ئەواندا تێبینییەک هەیە ناکرێ چاوی لێ بپۆشین: ئەدیبەکانی ئیسلام لە کولانەی شیعرەوە هەناسەیێکی نیوە ڕەهایی یان هەڵێناوە و گوزەرگەیێکیان بۆ خۆیان کردۆتەوە گەپ و سەیرانێکی تێدا بکەن.
سەرنجێک بدە دەبینی هەموو ئەو قسە ناجایەزە کە لە ئاخاوتن وەیا لە نووسینی پەخشاندا یاساغ بوە لە هەڵبەستدا ڕێ دراوە بە گوتنی. ئەو بیر و ڕایانەی کە لە پەخشاندا پیاوێکی وەک «إبن الراوندي» پێ زەندیق دەبوو لە شیعرێک وەیا چوارینەی «خیام»ێک بە ناوی ڕەمز و تصوف و لە ڕێی تەئویلەوە دەخرایە پشت گوێ. زۆر قسەی ئەوتۆ کە لە نووسینی پەخشاندا دەبوە هۆی بێحورمەتی نووسەرەکە، لە هەڵبەستدا شۆرەتی بۆ شاعیر پەیدا دەکرد. من نامەوێ بڵێم هەرچی مەنفەز هەیە لە ڕووی نووسەری پەخشان بەسترابوو. وابوە نووسەری یەکجار بەهێز لە پەخشاندا قسەی بە جورئەتی کردوە و لێی نەگیراوە، بەڵام کە قیاسی شیعر دەکەی لەگەڵ پەخشاندا لە ڕووی ئازادیی تەعبیرەوە چ نیسبەتێک لە نێوانیاندا نامێنێ. شیعر شاڵاوی بۆ مقدساتی ئەوتۆ بردوە کەس جورئەتی نەکروە بە قسە وەیا نووسین سێیەک و چوارییێکی ئەو ڕێیەش ببڕێ:

«خاکم بدهن مگر تو مستی ربی»

لە شیعر نەبا، مەگەر لە وڕێنە، دەنا لە سەرانسەری وڵاتی ئیسلامدا جێی نەدەبۆوە.

وەک دێتە بەرچاوم ئەم زاهیرەیەی مەودادان بە تەعبیر لە شیعردا هەر دەڵێی هودنەی نێوانی لەشکرانە کە چەک دادەنێن و جەنگ دەوەستێنن و پشووی حەسانەوە دەدەن، یاخود «هایدپارک»ی لەندەنە بۆ هەموو کەس کراوەتەوە. مەیلەو بڕیارێکی گشتی دراوە ئەو قسەی کە بە عادەت لە خەلقی بەداوێوە دەکرێ بۆ شاعیر خاڵەبەخش بێ.

هەڵبەت ئەوە دەبێ بزانین لە سروشتی شاعیردا بێحیسابییێک هەیە شەفاعەتی بۆ دەکا. کەس بە تەما نیە شاعیرێک وەک خەلقی دیکە لە قسەکانی «جدی» بێ. بەقاڵ کە بڵێ کیلۆی سێو بە دوو درهەمە بایەخی گەلێک زیاترە لە خەیاڵبازیی شاعیرێک کە ئەستێرە دەکا بە پۆلووی سەر سەبیلەکەی. هەزار و سێ سەد ساڵ زیاترە قورئان لە بارەی شاعیرەکانی ئەوسای گوتوە «یقولون ما لایفعلون». بەدوا ئەو ئایەتەشدا شاعیر هەر وای بۆ لە قەڵەم دراوە کە قسەکانی ئارایشت و شەکر و

نوقڵن. بەڵێ کە شیعری شاعیرێک لە سنووری خەیاڵبازی و شۆخێنی و کەمشەرمی تێپەڕاندبێ بۆ ناو جەرگەی سیاسەت وەیا ئایین و بەرژەوەند و باوەڕی تێک دابێ ئەوسا ئەویش حیسابی «جدية»تی بۆ کراوە و، لەو گوێرەیە، دەسەڵاتی سیاسی و ئایینی بەرهەڵستی نیشان داوە و سزای بۆ داناوە، بەڵام بەر لەو خەتەی نێوانی تێکدان و تێک نەدانی بەرژەوەندی دەسەڵاتدار، شیعر گەلێک مەیدانی جووڵانەوەی هەبوو کە نووسین و ئاخاوتنی عادەتی نەیانبوو، ئێستاش نیانە.

وەک شیعر گۆرانی و بەستەش، کە شیعری ئاوازدارن، زۆر ئازادتر بوون لە ئاخاوتن. ئەوەی پێی دەگوترێ «ئەدەبی مەکشووف» کە لە بەستەی گۆرانیاندا بەدی دەکرێ، لە ئاخاوتندا دەبێتە هۆی شەڕە چەپەڵۆک. ئیمکان نیە ئەو قسە بەرەڵڵایانەی ناو بەستەی کوردی کە لە مەجلیسی پیاو و ژناندا بە گۆرانی دەگوترێن بە ئاخاوتنی عادەتی لە کەس بسەلمێنرێ. گۆرانی بێژێک بچێتە ناو ژنان و بەستەکانی بگۆڕێ بە قسەو لە وێدا بیانکا سەد تێڵای بە پشت و شانان دەکەوێ. کوردەواری زۆر زمان دەگرێ لە درکاندنی لەفزی ئەوتۆ ناوی لەشی ئافرەتی تێدا بێ، تەنانەت ناڵێ ژنەکەم، دەڵێ منداڵەکان... ناڵێ خوشکم، دەڵێ هەمشیرەم. کەچی لە گۆرانی و بەستەدا گرێی زمان دەکاتەوە بە جۆرێک ڕووی ئافرەت سوور هەڵدەگەڕێنێ.

ڕوخسەتی ڕەهایی کە لە شیعر و بەستە و گۆرانی دەردەکەوێ لە کاری بە جورئەت تریشدا هەر مەوجوودە لە ناو کوردەواری. شایی ڕەشبەڵەک یەکێکە لەو ڕوخسەتانەی کۆمەڵایەتی کە لە تەنگژەی عورف و عادەت و یاسا کەم دەکاتەوە. لە ڕەشبەڵەکدا نەبێ هەرگیز ڕێگە نەدراوە بە کوڕ و کچی کورد هێندە لە یەکدی نزیک بنەوە. ئەو کوڕ و کچەی لە دەستی یەکدی هەڵدەپەڕن ئەگەر لە پەنایەک وەها دەست لەناو دەست بدیترێن هەرا بەرپا دەکەن. لەناو عەشیرەت، بەتایبەتی کۆچەر، جۆری دیکەی ڕوخسەتی کۆمەڵایەتی هەیە کە لە شارەکاندا پەیدا نابێ لەوەوە هاتوە گوزەران ڕێگەی بۆ تەخت کردوە.

ئەم وێنانەی ڕەهایی و بەرەڵڵایی لە ئەدەب و هونەر و کۆمەڵایەتیی کوردەواری دەهێنمەوە بۆ ئەوە هاتنی ناوی کوڕ بۆ ناو هەڵبەست نەچێتە ناو چوارچێوەییێکی غەڵەتەوە. وەک دەشبینی پەراوێزی وێنەکان گەلێک فرەوانن، سەرەوژوور دەبنەوە بۆ مێژوویێکی یەکجار کۆن، پانیش دەبنەوە تاکوو ڕووپێوێکی یەکجار بەرین لە

تێکڕای ژیانی کۆمەڵایەتی دەگرنەوە، یەخەگیری هەموو بابەتێکیش دەبن هەر لە شتی کەم و بێ بایەخەوە تا دەگا بە دەستووراتی ڕەوشت و عادەت و یاسا و ئایین. تاکە میسالی «ژن هەڵگرتن»[63] لە نێوان عەشرەتاندا بەسە بۆ گرنگیی ئەو مەیدانانە کە بەرەڵڵایی جێی خۆی تێدا کردۆتەوە. تۆژینەوەی پێویست لەو

[63] - بەو دواییە گوتارێکم کەوتە بەر چاو لەسەر «ژن هەڵگرتن و ڕەدوو کەوتن» لە گۆڤاری «بەیان» دا بڵاو کرابۆوە کە ئەویش بەسەرداچوونەوەی گوتارێکی لەمەو پێشتر بوو لە بارەی هەمان بابەتەوە.

من گوتاری یەکەمم نەدیتوە، بەڵام هی دوەمم خوێندەوە و بە دڵیشم بوو. چەند تێبینیەکم هەبوو لەبارەی هەندێ لایەنی ڕێزمانی گوتارەکەوە خستمە سەر کاغەز و لە بەیاندا بڵاو کرایەوە. ئەوەی ڕاستی بێ ئەگەر گوتارەکەم بەدڵ نەبووبا لە چ لایەنێکەوە بەسەریدا نەدەچوومەوە.

لەگەڵ ئەمەشدا دەبێ ڕەدوو کەوتن و ژن هەڵگرتنیش وەک زاهیرەیێکی کۆمەڵایەتی بخرێتە شوێنی ڕاستەقینەی خۆی لە تابلۆی تێکڕای کۆمەڵدا. ئەم زاهیرەیە، بەتایبەتی لە نێوان ڕەوەند و عەشیرەتەکانی خەریک بە ژیانی کۆچەری و نێو شاخ و لێرەواردا، دەچێتە ڕیزی زنجیرەی «چاوپۆشین و لێ بوردن» کە کۆمەڵگەی تەنگ پێهەڵچنراوی ڕۆژهەڵاتی مسڵمان هەناسەیێکی بێپەروایی تێدا هەڵ دێنێ و بەپێی داخوازی دەوروبەری ژیان و بەرژەوەندی گوزەران، هەریەک لە هەرێمە جوداکانی ئەو کۆمەڵانە لە مەیدانێکی گرنگی کۆمەڵایەتیدا ڕێی پشووی حەسانەوەی بە خۆی داوە. هەروەک شار و قەسەبچەکان لەبەر تێکخزانی خانوەکانیان، ناوناو، گۆڕەپانێکیان تەرخان کردوە بۆ مەبەسی جۆر جۆری داخوازیەکانی کۆمەڵایەتی وەک یاری منداڵان وەیا بەرپا کردنی شایی و زەماوەند وەیا جڵەو گرتنی وڵاغی میوانی زۆر، هەوەهاش گەل بە تێکڕایی گۆڕەپانی مەعنەوی خستۆتە نێوان کۆمەڵە خانووی بەندیخانەکانی یاسا و نەریت و داب و دەستوور و حەرام و یاساغەوە، بەمەشدا لە ڕێی هەست کردنی سەلیقەوە کارێکی پزیشکانەی کردوە کە هەندێک لە پاڵەپەستۆی یاساغ و حەرام نزم کاتەوە.

سەرەباسانە ئەویش وەک گەلێ سەرباسی دیکەی هەڵمانبواردن کارێکی دوورودرێژ و سەربەخۆیە، لێرەدا هەر هێندە بایی ئیشارە بۆ کردن بکا مەودای باس کردنیان هەیە، وەنیە ئیشارە بۆ کردنیش بێسوود بێ چونکە سەرەڕای خزمەتی ئەسڵی مەوزووع زیهنی خوێنەریش بەرەو لایەنی ئەوتۆ دەبا لە سەروبەری کۆمەڵایەتیدا کە وا ڕەنگە لەبەر زێدە مەشغەڵەت بیری لێ نەکاتەوە.

لەناو عەرەب، لە کۆنەوە، شاعیر گەلێک ڕوخسەتی پێ دراوە کە ئەگەر شیعری نەگوتبا بۆی نەدەبوو بە ڕوخسەت: جگە لە تێپەڕاندنی سنووری عادەتی شەرم و شکۆ، لە جەرگەی زمانیشدا ڕێی دراوە لە چەندین جێگەدا گوێ نەداتە دەستووری زمان، تا دەبینی گوتەی «یجوز للشاعر ما لا یجوز لغیره» بوە بەقسەی نستەق و پەندی پێشینیان.

ئەم تەنگەتاوبوونەی بوێژی شەرق لە نێوان تەسکایی پەراوێزی ئازادی لە کردار و گوفتاردا کە وای لێ کردوە مەیدانە تەسکەکان بکوتێتەوە و «راوح»یان تێدا بکا، بۆتە سەبەبی ئەوەش هێندە ماهیر بێ لە ئارایشتی وشە و یاری کردن بە واتا. ناتوانم درێژە بە شی کردنەوەی فکرەکەم بدەم بەوەندە واز دێنم کە بڵێم لەگەڵ پەرسەندنی یاساغ کردنی دەربڕینی جووڵەی دەروون بە هۆی تدخلی سیاسەت و کۆمەڵایەتی و ئایینەوە، شاعیر و نووسەر دەسەڵاتی هونەری خۆیان لە ئارایشت بەکار دێنن چونکە لەو مەیدانەدا یاساغ کردن کەمە، یا هەر نیە. ئارایشتیش هەر

---

لە بەشێکی تێپەڕیوی ئەم نووسینە باسی «میرمیرانێ» کرا، لەوێشدا گەلی کوردی بێدەسەڵات تەقڵەیێکی سیاسی لێداوە و خۆی ئارەزۆی دیوی دەسەڵات و حوکمڕانی کردوە کە هەر نەبێ بە گەمە هەندێکی لێ بچێژێ و ئارەزۆی پێ بشکێنێ. گریمان میرمیرانێ لە نێوان گەلێکی خاوەن حکوومەتدا بەرپا کرا، لەوێشدا چینی بێدەسەڵات و هەژار لاسایی چینی خاوەن دەسەڵات دەکاتەوە و کرمی دڵی خۆی بەو کارە دەمرێنێ.

بەداخەوە مەودای درێژەپێدانم نیە، هەر ئەوەندەم ڕێی قسان هەیە لێرەدا کە بڵێم ئەم ڕواڵەتانەی «لە عادەت دەرچوون» دەبێ بخرێنە شوێنی ڕاستەقینەی خۆیانەوە و لەبەر تیشکی داخوازیەکانی کۆمەڵایەتی و بەرژەوەندا لێیان بکۆڵرێتەوە.

لە وشەدا نابێ لە واتاشدا دەبێ لە ڕێی «توریە و کنایە و جناس و زۆر واتایی و مفارقە و چەندین فەندی ترەوە». کوتانەوەی هەموو مەیدانێکیش جۆرێکە لە ئارایشت: شاعیر بۆ ئەوەی بگوترێ خاوەن دەسەڵاتە لە هەموو مەوزووعێک شیعر هەڵدەبەستێ، بەڵکوو هەموو پیتەکانی ئەبجەدیش دەکا بە قافیەی شیعر. زۆر بە جۆرێکی عەفوی شاعیرێکی کورد وەیا فارس بۆ مەبەسی دیارخستنی توانایی خۆی لە شیعردا پیتی «ڤ، ڕ، ط، ظ..» دەکا بە قافیە یاخود شیعری کافرانە دەڵێ یاخود دەکا بە «متصوف» یا مەدحی شەراب دەکا یا بە کوڕدا هەڵدەڵێ: ڕەنگە لە هیچ مەیدانێکیش لەو مەیدانانەدا چ جاران ئەسپی لینگ نەدابێ.

شوعەرای ئیسلام لە سەردەمە دەوڵەمەندەکانی دەوڵەتی ئیسلامدا، چ لە بەغدا چ لە پایتەختەکانی دیکەی دوور و نزیک، بەهۆی ژیانی هەمەچەشنەی ئابووری و ڕۆشنبیری و بازرگانی و هونەری و زانستییەوە، لەو قەڵەباڵغیەی وەک پۆرەهەنگی ڕۆژگارەکانی دەسەڵات و ساماندا دەیان توانی تا ڕادەیێک ئەوە بڵێن کە حەزی لێ دەکەن، بەتایبەتی لەو کاتانەدا کە باوەڕی ئایین خەریک بوو موناقەشەی زیهنی و عەقڵی بکا لەگەڵ فەلسەفەی یۆناندا، مەیدانی ئازادیی بیر و باوەڕ بە «ضرورة» زۆر فرەوان بوو چونکە ئایین بۆ خۆی خەریک بوو لە ڕێی عەقڵەوە فەلسەفە ببەزێنێ.

ئەم ئازادییە بەردەوام بوو تا ئایین لە دروست کردنی فەلسەفەی تایبەتی خۆی بۆوە و کردی بە جێگیری فەلسەفەی یۆنان، لەوە بەولاوە بە تەبیعەتی حاڵ قسەی بەرەڵڵا زۆرتر لە جاران بە دیواری یاساغبوون دەکەوتەوە.

دوای بەسەرچوونی دەوری گەشەدار بە وێرانبوونی عالەمی ئیسلام، بەتایبەتی بەغدا، لەژێر سمی لەشکری مەغۆل مەیدانی دەمەتەقە و ڕەخنە و ئازادیی بیر وەتەنگ هات تاکوو پیاوی ئایینیش ئەو مەودایەی جاران هەیبوو لە دەستی چوو، دەمەوێ بڵێم دەوری «قیاس و مقارنە و اجتهاد و استدلال» یەکجارەکی بەسەرچوو وای لێهات مەلایێک ڕەخنەی لە «إبن الحجر» گرتبا کافر دەکرا. تەنانەت فەلەکیاتی «بطلیموس» کە لە سەدەمی «وەرگێڕان - ترجمە»ی دەوری عەباسیەکان کرا بە قالبی ڕەسمی بۆ واتای قورئان و لە مزگەوتەکاندا بە بەشێکی عەقیدە دەژمێردرا ئەویش بە نیسبەت دواکەوتوویی فکری گشتی لە پاش وێران کردنی بەغدا بووە بە کفر لە تەک وڕێنە ئەفسانەییەکانی وەک ئەرز لەسەر پشتی گایە و کێوی قاف دەوری لێداوە و هتاد...

خولاسە حەساری دەوری فکر تەسک بووە بە پێی تەسکبوونەوەی ژیانی ئادەمزاد لە هەموو ڕویێکەوە. شیعری عەرەبی کە سروشتی لەگەڵ فرەوانی سەحرا و ژیانی کۆچەری بێسنووری پێش ئیسلامدا گونجابوو بەوەدا کە نەفەس درێژی و ڕەوانبێژی هەوێنی داڕشتنی بوو، ئەویش خزایە ناو قەپێلکی تەنگی وشەسازی و گەمە کردن بە واتا و خەریکبوون بە «بدیع». بەستەڵەکی دەوری شیعری عەرەبی نەتوایەوە تا دوای داگیرکردنی میسر لە لایەن ناپلیۆنەوە، واتە تا ساڵەکانی ناوەندی دەسەی نۆزدەم.

هەروەک تەسکیی مەودا لە دەور و پشتی شاعیر بوو بەهۆی «تفاعل»ی لەگەڵ سروشت و کۆمەڵ کەم بۆوە و لەو ڕێیەوە وێنەی پڕ نەقش و نیگاری تێک هەڵکێشانی واتا و وشەی بەرهەم دێنا، دەبینین یاساغ کردنی وێنەکێشان و پەیکەرتراشی لە ئیسلامدا ڕووی هونەرکاری وەرگێڕا بۆ لای «خەت» و لە مەیدانی خەتخۆشیدا ئەوەندە ماوەی بووی هێندێکیشی تێ هەڵێنایەوە لە حیسابی وێنەکێشان و پەیکەرتراشیدا، واتە قەرزی ئەوانیشی دایەوە بە خەتخۆشی. سەیرت نەیێ کە ئەو وردە سەنعەتەی بەندییەکان تێیدا ماهیر دەبن لە چەند ساڵی گیرانیان و مانەوەیان لە بەندیخانەدا، خەلقی دەروەی بەندیخانە نەگەن بە پایەی ئەو مەهارەتە چونکە بەندی هەموو هێزی زیهنی خۆی لەو کارەدا سەرف دەکا، خەریکی گوزەران و مەشغەڵەتی ژیانی ئازاد نیە کە نەهێڵێ بپەرژێتە سەر خۆ تەرخان کردنی تەواو بۆ سنعەتەکە. شاعیریش وەک هەموو ئادەمزادێک کە بکەوێتە ناو چوارچێوەیێکی تەسکی ژیانەوە، ڕەفتار و گوفتاری لە گوێرەی پێداویستی حوکمی ئەو تەنگژەیە دەبێ.

لە کولانەوەی ئەو ڕاستییەوەڕا دەتوانین بە نیگایێکی ڕوون سەیری زاهیرەی «غەزەل بۆ کوڕ» بکەین کە لە دیوانی شاعیرەکاندا دەدیترێ: بە زۆری و بە جۆرێکی گشتی غەزەل بۆ کوڕ لە سەرچاوەی «هونەر بۆ زات»[64]ەوە هەڵدەستێ کە

---

[64] - لێم بە سەهوو مەچوو لەودا کە دەڵێم «هونەر بۆ زات» چونکە من لە دژی ئەوە نیم شاعیر و ئەدیب و هونەرکار تەرجومانی زاتی خۆیان بن، بەپێچەوانە، کە تەرجومەی زاتی خۆیان نەکەن دەبنە تووتی وەیا ڕیکۆردەر و قەوان، شتی غەیری خۆیان دەڵێنەوە. بەڵام ئەمەش حەقیقەتێکە کە ئەدیب هەر عاتیفەی خۆی کاوێژ

ئەویش بۆ خۆی بەرهەمێکی کوتومتی کەمبوونەوەی «تعامل»ی شاعیرە لەگەڵ دەرەوەی نەفسی خۆیدا. لایەنی هونەری دوور لە عاتیفەی شاز بەوەدا یەکجار ئاشکرا دەبێ کە شاعیرێکی خۆی شاز نەبێ، لە وەسفێکی دەیکا بەرەو «تجرید» دەڕوا و خەریکی دۆزینەوەی «مفارقە» دەبێ بۆ نیشاندانی دەسەڵاتی خۆی لە مەیدانە بێفێڵە تەقلیدییەکەی وشە و مەعنا تێک هەڵکێشاندا. وا هەیە شاعیر ئەوەندە بە نەزاکەت لەگەڵ خەیاڵی مەعنای «مجرد»ی پەیکەری کوڕ دەدوێ لایەنی «جنس» لەبیر خۆی و خەلقیش دەباتەوە، هەر دەڵێی لە پەراوێزی ڕوحیدا وا بڵند دەبێتەوە دەگا بە ئاسۆی «تقدیس» و پاکسروشتی. نموونە لەو بابەتە یەکجار زۆرە، لێرەدا شاکارێکی «نالی» دێنمەوە بەر سەرنج و هەستی خوێنەر تا لەگەڵ مندا سەیری ئەو دیمەنە پڕ پەرستنە بکا کە خەیاڵی نالی وەک ئاوێنە چیهرەی کوڕێکی پێ دووبارە دەکاتەوە:

زۆر حەیفە لە بۆ کەعبەیی حوسنت کە بە سەیا
«نجاشی» خەتت هاتوە نێزیکە خروجی

هەرچەندی دەکەن قطعی سەرت دێیەوە ئەی خەت
وەک هیندووی سەححاری مەجووسی چ لەجووجی

ئەوا ڕووی کوڕەکەی کرد بە «کعبة» کە قیبلەگای هەموو مسڵمانانە و ڕۆژی پێنج فەسلان سەجدەی لە بەرانبەردا دەبەن.. کار گەیشتە نوێژ و سەجدە و قیبلە، لە عاتیفەی گۆشت و خوێن پەرست پچڕایەوە وەک ڕەش لە سپی بپچڕێتەوە. لەوە بەولاوە پێویست نیە من واتای شیعرەکەت بۆ شی کەمەوە، خۆت دەیبینی و تێیدەگەی.

هەرچی شیعری غەزەل بۆ کوڕ لە دیوانی حاجی قادردا هەیە لە تەرزی ئەو بەیتە و دوو بەیتەی نالین غەیری خەیاڵبازی و وشە و واتا تێکبەستن و لەیەکدی ئاڵاندن تێیاندا نیە. یەکێک لەو وێنانەی کە لەبەر پەیکەری کوڕێکی حەقیقی گیان لەبەر

---

کردەوە و «تفاعل»ی لەگەڵ دەرەوەی نەفسی خۆی نەما بەڕادەی پچڕانەوەی لە دونیا نرخی بەرهەمی کەم دەبێتەوە و وا باشە مەوزووع بە زاتی ئەدەبیدا تێپەڕێ و ببێتە بەرهەمێکی ئازاد.

کێشرابێ غەزەلەکەی «لەسەر تەناف کە لەرزی هەتیوی سندووسی»یە. لەو بڕە شیعرەدا حاجی قادر هێندەی سنعەتکاری و خەیاڵ بازی و ئەفسوون سازی کردوە هەتیوەکە و سەماکە و سەماگەی بە هەموو تەماشاچییانەوە کردوە بە شانۆیەکی خەیاڵی کە خامەی خۆی تێیدا بە جۆرێک هەڵ دەسووڕێنی فنوونی هەڵپەڕینمان لەبیر بباتەوە لەبەر فنوونی نەخش و ئارایشتی ئەدەبی.

لە دیوانە چاپ کراوەکانی حاجیدا تێکڕای ئەم بڕە شیعرە 7 بەیتە، بەڵام لە دەستنووسێک کە لەبەر دەستم دایە و مەلا ڕەئووفی سەلیم ئاغا بۆ کۆڕی زانیاری ناردوە سەرپاکی غەزەلەکە هەڤدە بەیتە، دوو بەیتی عەرەبییان تێدایە لە داڕشتنی زمانی و ڕێزمانییەوە کزن نەختێکیش کەموکەسرن، ئەوانی دیکە چەندی بڵێی هونەر و فەند و فێڵی شاعیرانەیان تێدایە. وا پێ دەچێ سەمای هەتیوەکە لەبەر ڕێکیوپێکی و بزووتنەوەی هونەرکارانەی کە نیشانی خەلقەکەی داوە، لە لانی خۆیەوە، یارمەتی دەسەڵاتی ئەدەبی حاجی قادری دابێ بۆ گەیشتن بەو پایە بەرزە لە داڕشتنی واتادا. ئەم غەزەلە لەمەیدانی خۆیدا وەک هینەکەی «إبن الرومي» دێتە بەر چاو کە لە وەسفی ئافرەتێکی گۆرانیبێژی داناوە، فەرقێک هەبێ لە میاندا ئەوەیە کە زەوقی حاجی کوردی و زەوقی «إبن الرومي» عەرەبییە. ڕێکەوتێکی زۆر نادیر جارێکیان منی قەرزداری ئەم بڕە شیعرە کردوە، ئەمەیە گوزارشتەکەی:

لە هاوێنی 1964 بۆ پیرۆزبایی شۆڕشی 23 ی یۆلیە، وەفدێکی ڕەسمی لە عێراقەوە چوو بۆ «قاهیرە» من یەکێک بووم لە ئەندامانی. شەوێک لە شەوە پڕ ئاهەنگەکان لە «نادي القوات المسلحة» دانیشتبووین بەرانبەر «ام کلثوم» کە گۆرانیە بەناوبانگەکەی «انت عمري» دەگوت. لە تەنیشتمەوە وەزیری «التعلیم العالي» - «عبدالعزیز السید» دانیشتبوو، پیاوێکی یەکجار باخەبەر بوو لە هونەر و ئەدەب بە هەموو کەرت و جۆرەکانیانەوە.

بە یەکەوە کەوتینە وتووێژێکی قووڵ لە بارەی مۆسیقا و گۆرانی، لەوەوە قووڵتر بووینەوە بۆ شیعر و ئەدەب. حەزی بەوە دەکرد لەو وتووێژەدا بایی ئیمکان شارەزاییەک پەیداکا لە ئەدەبی کوردی، ئیتر منیش هەندێ تایبەتیەکانی ئەدەبی کوردیم بۆ باس کرد و زنجیرەی قسە هێنامیە سەر «مقارنە» لە هەندێ ڕووەوە لە میانی ئەدەبی کوردی و عەرەبی و تا چ ڕادەیێکی شاعیرێکی کورد ئاگاداری

خۆیەتی لە ڕەچاو کردنی قافیەی ڕێکوپێک و، زۆر جاران، خۆ بەستنەوە بە «لزوم ما لا یلزم» ەوە هەرچەند ئەو کارە زەحمەتیش بێ...

بۆ ڕوون کردنەوە میسالێکم هێنایەوە و گوتم ئەو هەڵبەستە مەشوورەی کە وا « ام کلثوم» خەریکە لە گۆرانیدا دەیڵێتەوە لە واتادا «تناقض»ێکی تێدایە، وادیارە لە نەزەر عەرەب بەعەیب نەژمێرراوە چونکە کەس لێی بەدەنگ نەهاتوە، هەروەک بە سەر شاعیردا تێپەڕیوە بەسەر گۆرانیبێژ و ئاهەنگساز و هەموو گوێگرانیشدا تێپەڕیوە بە ئەدیب و شاعیر و زانا و هونەرکارەوە. شاعیر لەو گۆرانیەدا دەڵێ، قسەش لەگەڵ خۆشەویستەکەیەتی:

یا أغلی من ایامي
یا أحلی من احلامي

شتێکی نەدۆزیەوە لە نرخدا گەیشتبێتە پایەیێک «مقارنە»ی بکا لەگەڵ نرخی دۆستەکەی ڕۆژگاری خۆی نەبێ، دۆستەکەی بەوە هەڵداوەتەوە کە لە ڕۆژگاری بە نرخترە و «أغلی من ایامي» پێ دەڵێ کەچی دوای یەک دوو دێڕ ئەو هەموو عەزیزییە و نرخەی ڕۆژگاری لەبیر دەچێ و دەیکا بە نموونەی نحووسەت کە دەڵێ:

صالحت بیک أیامێ
و سامحت بیک[65] الزمن

واتە بەهۆی تۆوە یاخود لەبەر تۆ سولحم کردوە لەگەڵ ڕۆژگارم و لە بەر تۆ چاوپۆشیم کردوە لە زەمانە. دەوجا سەیرکە دەبێ ئەو ڕۆژگار و زەمانەیە چەند نەحس بن کە بەهۆی خۆشەویسترین کەس نەبێ سوڵحیان لەگەڵدا ناکرێ. جارێکیان هێندە عەزیز بن بگەن بە پایەی «مقارنە» لەگەڵ خۆشەویستەکەی

---

[65] - گۆرانیەکە بە شێوەی میسری هەڵبەستراوە نەک عەرەبی نحوی.

ئەمجار هێندە ڕووڕەش بن بە شەفاعەتی دۆست نەبێ سڵاویان لێ نەکرێ، لەمەدا «تناقض» دەگاتە ئەوپەڕ.

گوتم شاعیری کورد نەک هەر « تناقض»ی وەها ڕەوا نابینێ بەڵکوو کە چاری نەما بۆ مەبەسی ڕێکخستنی قافیە پیتێک بگۆڕێ بە پیتێکی هاودەنگی ئەو، لە لایەن ئاوازەوە عوزر دێنێتەوە و داوای لێ بوردن دەکا. لێرەدا بەیتێکی حاجی قادرم بە میسال هێنایەوە کە لەناو ئەو غەزەلەی «لەسەر تەناف»دا هاتوە و دەڵێ:

لە قافیەیی شیعر عەیبە لابدەین ئەمما[66]

بە یادی چاوی ئەمن لادەدەم بەمخصوصی

حاجی لە هێنانەوەی وشەی «مخصوصی» پیتی «ص»ی کردوە بە قافیە لە بریتی پیتی «س»، لە ڕاستیدا کورد «ص» بە «س» دەخوێنێتەوە بەڵام لەبەر زێدە دەسەڵات و زاڵی خۆی بەسەر واتا و داڕشتندا، ئەم لادانە ڕواڵەتییەی بەعەیب داناوە و عوزری بۆ دێنێتەوە و بە دوا عوزر هێنانەوەدا دەیکا بە موناسەبەی وردەکاری واتایی: پاش ئەوەی لادان لە قافیە دادەنێ بەعەیب و دان پێداهێنانەکە دەکا بە عوزر، شیعر و قافیە قەرزدار دەکاتەوە بەوەدا کە لادانەکەی بە «ئانقەست» بوە. هەر لە لەفزی بەواتای «ئانقەست»یش کە وشەی «مخصوصی»یە لادانەکەی کردوە، بە یادی چاوی مەدح کراوەکەش لە قافیە لادەدا چونکە دەبێ هەتیوەکە ئەوەندە بەناز بووبێ کە چاوی نەبڕیبێتە خەلق و لێی لادابن، ئەوجا لەسەر پێپلکەی ئەم بەیتەوە باز داوێ بەرەژوورتر بۆ واتاسازی لە کۆتایی بڕە شیعرەکەدا:

جەبینی مەهـ روخی میهرە زولفی شەو دهەنی[67]

سەبەب بە قافیە تەنگی بوو حاجی نەینووسی

[66] - «مصرعی» یەکەم بەم جۆرەش نووسراوە لە هەندێ دەستنووسدا. «لە قافیە شوعەرا عەیبە لابدەن ئەمما»

[67] - ئەمەیە ڕاستی بەیتەکە، چی لە دیوانەکاندا نووسراوە هەڵەیە.

پێویست نابینم لێرەدا خۆ ماندووکەم بە ڕاگەیاندنی وشەی «تەنگ» و چەند لایان دەگرێتەوە و چ عوزرێکی تازەش دێنێتەوە بۆ هێنانەوەی وشەی «مخصوصی».

بەڕاستی ئەو شەوە، شاعیرییەتی حاجی، زۆر یارمەتی دام چ لە لانی ئەوەوە ڕاستییێکی بەنرخ لە ئەدەبی کوردیدا بۆ ئەدیبێکی عەرەب دیارخەم، چ بۆ خۆهەڵدانەوە بێ ئەگەر حەزم بەوە کردبا لەگەڵ بەڵگەی مەحکەمدا شانازی بە بەرزی زمان و ئەدەبی نژادەکەم بکەم.

دیوانەکەی حاجی جگە لەمەش غەزەلی تری ئەوتۆی تێدایە خەریکی مەدحی کوڕ بێ، نووسەر کە بیەوێ شایەدی لێ وەرگرێ پێی ناوێ بۆ دۆزینەوەی نموونە خۆی ماندوو کا. بەڵام سەیر ئەوەیە یەک دوو نووسەری ناسراوی کورد بۆ ئەم مەبەسە یەخەی شیعری وایان گرتوە پڕ بە دەم هاواریەتی بۆ کچە عەلاقەیێکی نیە لەگەڵ کوڕدا: ڕواڵەتی شیعرەکە بە سەهوی بردوون چونکە لە سەرەتاوە ناوی «فێس» دەبا کە پۆشاکێکی کوڕانەیە:

لە سەر شەو ڕۆژی داناوە مەڵێن فێسی لەسەر ناوە
لەبەر با جامی یاقووتی بە مشکی وشکی داداوە

ئەم فێسەی لێرەدا ناوی هاتوە سەرپۆشێکی ژنانەیە لە کۆیە و لە سابڵاغیش باوە، هی ژنە کۆییان تاسی زێڕی بە دەوردا چەسپ دەکرێ. دەشێ «جامی یاقووت» بۆ ئەو تاسە زێڕە بگەڕێتەوە. هەر ئەمەش تەشبیهێکی دروستە چونکە ئەگەر زێڕەکە لە بەیندا نەبێ دەمێنێتەوە قوماشی فێس و ڕەنگە سوورەکەی کە پێی بگوترێ «جامی یاقووت» دیاریشە یاقووت کە ماددەیێکی ڕەقە لەگەڵ قوماشدا چ نزیکییەک لە بەینیاندا نیە تەشبیهـ هەڵگرێ ئەوە نەبێ کە هەر دوویان ڕەنگیان سوورە. جگە لەمەش، بریق و باقی تاسی زێڕ لێی دێ بەسەر پرچی ڕەشەوە پێی بگوترێ ڕۆژی سەر شەو، فێس ڕەنگیشی سوور بێ ماددەیێکی تاریکە نابریقێتەوە.

لەو گونجان و نەگونجانەش گەڕێ: بەیتی وا هەیە لە برِە شیعرەکەدا چ تەئویل هەڵناگرێ وەک:

له بەرقی ڕەنگی شەرواڵی حەیا دامێنی هەڵماڵی
له تەققەی دەنگی خڵخاڵی له گەردوون زوهرە داماوە

یاخود وەک:

له تەققەی ناڵ و شەققەی پانی بەرزی ئاسمان لەرزی
تەق و تۆق کەوتە سەر ئەرزی دەڵێن مەحشەر هەڵستاوە

خڵخاڵی و پانی بەرزی هەردوویان ماڵی بێفێڵی ئافرەتن. کە شیعرەکە بۆ کوڕ نەبێ هەر دەلالەتێکی لێی وەرگیرابێ له ڕووی مەیلی شازەوە له خۆوە دەچێتەوە.

گەلێک جاران لانی ڕەمز لەو شیعرە کوڕدۆست یا شەرابدۆستانە هێندە غاڵب دەبێ دەیگەینێتە پایەی سەرنجی«تصوف» و هیچ پەیوەندی لەگەڵ ڕواڵەتی وشەکانی نامێنێ. هەندێک له خاوەن زەوقی ئەدەبی بۆ ئەوە دەچن ئەو تەرزە شیعرانە کە له هەقیقەتدا مەتڵەبیان عیشق و شەراب نیە هەموویان هەر تصوفن، بەڵام ڕاستییەکەی مەیدانێکی فرەوان هەیە له نێوانی «تجرید»ی ڕووت و تصوفی بێکینایەدا. هەڵبەت له تصوفدا تجرید هەیە و واتایێکی سەرەتاییشە تێیدا، بەڵام هەموو جاران تجرید ناگاتە تصوف. له ڕەمزدا «تجرید» هەیە به شێوەیێکی گشتی، تصوف کە خۆی له جەرگەی ڕەمزەوە هەڵدەستێ بەهۆی ئەوەوە کە هەر واتای ڕووت نیە بەڵکوو سلوکیشی لەگەڵ دایە، دروشمی تایبەتی خۆی هەیە. ئا ئەم چوارینە فارسییە یەکێکە له هەڵبەستی هەرە بەرزی تصوف و ڕەمز:

یک جرعه می از حریف مستت برسد
صد چاشنئ دم الستت برسد

این جام نهاده‌اند در تاق بلند
پا بر سر خویش نه که دستت برسد

واتە: یەک قوم شەراب لە هاوبادەی مستەوە پێت بگا، سەد تامی دەمی «الست»ت پێ دەگا. ئەم جامەیان لە تاقی بڵندردا داناوە، دەبێ پێ لە سەر سەری خۆت دانێی تا دەستت بیگاتێ.

**با بگەڕێینەوە بۆ سەروکاری حاجی.**

لە دیوانەکەیدا وێنەیێکی دیکەش هەیە وەک «هەتیوی سەر تەناف» کە ئەویش لە کوڕێکی حەقیقییەوە تیشکی داوەتەوە:

کە هەستا قامەتی بەرزی لە فەرقی تا وەکوو ئەرزی
پەرێشان زولفی سەد تەرزی بە یەکدا داڕژا و لەرزی

گوتەی دەماودەم وا ڕادەگەیەنێ، کۆتایی غەزەلەکەش لێی دەفامرێتەوە، کە ئەم برە شیعرە وەسفی کوڕێکی لاوچاک بێ کە لە حەلقەی زکری دەروێشەکانی شێخ ئاوڕەحمانی تاڵەبانی لە کەرکووک بەشدار بووبێ و حاجی قادریش بە ڕێکەوت لە کەرکووک و میوانی شێخ ئاوڕەحمان بوە و کوڕەکەی دیوە و بەم نۆ بەیتە وێنەی کێشاوە. دەڵێن کوڕەکە شاگرد خەیاتیش بوە، بۆیە حاجی کە لە دوا بەیتدا دەڵێ:

مرادی من مریدی « خالصه»ە خەییاتییە کاری
مەلائیک صورەتە ئاهوو نیگاهە «حاجی»یە تەرزی

لانی مریدبوونی کوڕەکە و خەییاتبوونی دەربڕیوە. ئەم وشەیەی «خالص»یش ئاشکرایە بە تەوریە شێخ ئاوڕەحمان دەگرێتەوە چونکە نازناوی « خالصی» بوە.

نموونەی پێشووتر «لەسەر تەناف کە لەرزی» لە هاتنی ناوی سندووس تێیدا، زاهیر وا ڕادەگەیەنێ کە وا حاجی قادر دیمەنەکەی لە کوردستانی ئێران دیتبێ، کەچی بیستوومە دەڵێن کۆمەڵەی سەماکەر و تەنافباز هاتوونەتە کۆیێ و لە جێگەیێکی نزیک مزگەوتی گەورە نمایشی خۆیان کردوە. ئەمین ئاغاش لەگەڵ

حاجی قادر بە یەکەوە لە سەربانی مزگەوتی گەورەوە تەماشای دیمەنەکەیان کردوە. گۆیا ئەمین ئاغاش هانی حاجی قادری داوە بە هەڵبەست وەسفێکی تەناف بازەکە بکا.

بەپێی ڕیوایەتەکە هەتیوی سندووسی تەنافەکەی دەپسێ و دەکەوێ. بەڵام لە شیعرەکەدا لە وشەی «لەرزی» بەولاوە شتێک نیە وا ڕاگەیەنێ تەناف پسابێ و هەتیو کەوتبێ. «شکا مەتاعی زەریفی و قیمەتی لووسی»ش ڕەنگە واتاکەی ئەوە بێ کە بە لەرزینی هەتیوەکە لە سەما کردندا بەسەر تەنافەوە مەتاعی زەریفی و لووسی غەیری ئەو قیمەتیان شکا بێ نەک هی خۆی چونکە بەیتەکانی دوایی سەرپاکیان هەر وەسفی تەئسیری سەما و فنوونی هەتیوەکەیە.

سەرەڕای ئەمە بەڵگەیێکی تری لێکدانەوەشم بە دەستەوەیە بۆ تەرجیحی ئەو لایەنە کە هەڵبەستەکە لە سندووس وەیا جێگەیێکی وەک ئەو لە کوردستانی ئێراندا دانرابێ. گوتم برە شیعرەکە دوو بەیتی بێهێزی عەرەبی تێدایە، پێشتریش لە موناسەبەدا بۆم باس کردی حاجی قادر لە پەراوێزێکی کتێبەکەی سیوطي کە لە کوردستانی ئێران خوێندنی تەواو کردوە عوزر دێنێتەوە بۆ یەک دوو هەڵە کە لە هەڵبەستنی مصرعێکی عەرەبی، کاتی خۆی، دووچاریان بوە لەو ڕووەوە کە ئەوکاتەی مصرعەکەی هەڵبەستوە عەرەبی باش نەزانیوە. لەمەڕا دەردەکەوێ حاجی قادر هێشتا لە کوردستانی ئێران بوە بۆ خوێندن گەیشتوە بە پلەی توانایی لە عەرەبیدا.

هەر بەمەشدا دەردەکەوێ، بەڵکو ئیسپات دەبێ، کە وا حاجی هەڵبەستەکەی «هەتیوی سندووسی» لەو ڕۆژگارانەدا هەڵبەستوە کە تازە چوە بۆ ئێران و جارێ لە عەرەبیدا پیادە بوە، واتە حاشیەکە و هەڵبەستەکە هەردوویان هی یەک قۆناغی تەمەنی حاجی قادرن کە سەرەتاکانی خوێندندنیەتی لە کوردستانی ئێران. حاجی کە ئەم هەڵبەستەی لەسەر خواهیشتی ئەمین ئاغا دانابێ دەبێ دوای کۆتایی سەرلەبەری گەشتی خوێندنی بووبێ کە ئەوسا لە زمانی عەرەبیدا هەڵکشیوە و تووشی هەڵەی وەها نابێ بە ناقۆڵای لە قەڵەم بدەین وەک لە برە شیعرەکەدا تووشی هاتوە.

دەتوانم بە چەند ڕووپەڕەیێکی لێرە بە دواوە کۆتایی بە بیر و باوەڕی خۆم بێنم دەربارەی غەزەل بۆ کوڕ: شاعیرێک کە عاتیفەی شازی هەبێ و غەزەلەکەی لە

مەیلێکی ڕاستەقینەوە هەڵستێ دەم و دووی تا بڵێی جیاوازە لە هی شاعیرێکی خەیاڵبازی واتاپەرست. بەڕادەی نێزیکبوونەوەی شاعیر لە مەیلی شاز قسە و تەعبیری بەرەو واقیعەت دەڕوا و لە ڕەمز دوور دەکەوێتەوە، تەنانەت لەم واقیعیەتەشدا هەموو شاعیرەکان لە یەک پلەدا نین، وا دەبێ شاعیر لە دیمەنی کوڕ شێوەی جوانیەکەی خۆشدەوێ بێ ئەوە مەیلێکی حەیوانی بەهێز تێکەڵ بکا لەو خۆشویستنەدا. لەم درێژەپێدانەش مەبەسم هەر ئەوەیە خوێنەر بە سەهوو نەچێ لە ڕواڵەتی واتای شیعری شاعیری ڕۆژهەڵاتی کۆن چ لە مەیدانی غەزەل بۆ کوڕ بێ، کە لێرەدا مەبحەسی بنجییە، چ لە مەیدانەکانی دیکەی غەزەل و قەسیدە بێ.

کۆمەڵێک هۆی تایبەتی ڕۆژهەڵات وای کردوە شاعیر و ئەدیبەکانی ئەوە بڵێن کە نایکەن و باوەڕیشیان پێی نیە. ئەم مەوزووعەش سنوورێک نیە کۆتایی پێ بێنێ و تا بە دوای کەوین لێی نابینەوە، بۆیە هەر هێندەی لێ دوام کە ڕووناکییێک بخاتە سەر تاقمێک لە هەڵبەستەکانی حاجی قادر و وەرامی هەندێ گوتە و نووسینی ئەم و ئەو بداتەوە. لە نووسینەکەمدا، بەداخەوە، چەندین سەرەباسی وەک هی ئێرانە کەموکەسر و نیوەچڵ ماوەتەوە لە ترسی درێژەکێشانی بێ سەروبن، بەلای باوەڕی خۆمەوە هەندێ جار ئەوەی نووسیومە لەبەر زێدە کورتی وەک مەتەڵ و ڕەمزی کیمیا بوە، ڕەنگە بەولای کردنەوەی مەبحەس بۆ دەمەتەقە و ساغ کردنەوە، هەر ئەوەندە سوودی بووبێ کە خۆمی کردبێتە ئامانجی توانج. لەگەڵ ئەمەشدا ڕازیم لە کەموکەسرێک نووسەران بانگ هێشتن بکا بۆ تەواو کردن و ڕێکوپێک خستنی با مزەکەی خۆ خستنە بەر ڕەخنەش بێ لە منەوە.

حاجی قادر وەک ئەدیب و شاعیرەکانی دیکەی کورد و غەیری کورد ئاگاداری سەرجوملەی شیعر و ئەدەبی ئیسلام بوە و لە هەموو کانیاوێکی ئەو ئەدەبە واتای نۆش کردوە و ڕەنگ و وێنەی دیوە، لە گوێرەی دیاردانەوەی ناو و بەرهەمی شاعیر و شایەرانی کورد لە دیوانەکەیدا بەدیارە یەکجار باخەبەر بوە لە دەنگ و باس و شیعر و هەموو سەروبەرێکیان، وەک بڵێی بەتایبەتی خەریک بووبێ بۆ وەدەست هێنانی خەبەر و ئەسەریان زیاتر لەوەی کوردێکی دیکە خەریک بووبێ و زیاتریش لەوەی خۆی خەریک بووبێ بە شوعەرای غەیری کوردەوە. ئەوەی ڕاستیش بێ لە حاجی قادر چاوەڕوان دەکرێ چی سەربە کوردەویە پێوەی ماندوو بووبێ بۆ کۆ کردنەوە و نەفۆتانی.

لێرەدا باسی غەزەل بۆ کوڕ فکرم دەبا بۆ چەند بەیتێک لە دیوانەکەی حاجی قادر کەوا حیکایەتی لە زاری برادەرێکەوە دەگێڕێتەوە و لە جێگەی لەباردا ئیشارە بۆ بەیتێکی شێخ ڕەزا دەکا و حاجەت ناهێڵێ بە وشەی «صریح»:

ئەم قسە با لێرە بێ ماندوو بو ووم[68]
بۆت بکەم باسێکی بۆیان کردو ووم

پێی گوتم ئەحبابەکی صاحب حەشەم
سەرگوزەشتێکم هەیە با بۆت بکەم

دوای چەند بەیتێک ئەمە دەڵێ لە زاری برادەرەکەیەوە:

ماهی بێ میهرم لە دەرگا هاتە ژوور
ماتەم و شین و غەمی کردم بە سوور

کورت و کرمانجی کە گرتم بێ ڕەزا
خستم و باقی وەکو بەیتی «رضا»[69]

ئەم نیوە بەیتەی دوایی ئیشارەیە بۆ فەردە مەشوورەکەی شێخ ڕەزا کە وا چەند جووڵانەوە و هەڵسووڕ داسووڕی نێرپەرستانەی کۆ کردۆتەوە و لە نێویاندا «گرتم و خستم» هەیە. لێرەدا حاجی بێ ئەوە مەتڵەبی بێ، شایەدێکی بە دەستەوە داوە کە

[68] – ئەم دوو وشەی کۆتایی دوو مصرعەکەم وا نووسی تاکوو کێشی شیعرەکە تێک نەچێ، لە ڕاستیشدا خوێندنەوەی ئاساییشی هەر وایە هەرچەند بەدوا یەکتردا هاتنی سێ پیتی واو، چاو لێی دەرەوێتەوە. لە ڕێنووسی کوردیدا «بۆر - ظمە» شکڵی سەربەخۆی نیە واوی بۆ دانراوە، لە سێ واوەکەش دوویان بۆرن هی ناوەڕاستیان واوە.

[69] – ئەم وشەیەم «رضا» نووسی کە دیار بدا بۆ «شێخ رضا» دەگەڕێتەوە دەنا مەعلوومە دەبێ کوردانە «ڕەزا» بخوێنرێتەوە و وەهاش بنووسرێ.

ئەو ئاشناییەکی ڕۆژ بە ڕۆژی هەبوە لەگەڵ شوعەرای کورد و بەرهەمەکانیان، چونکە دووربوونی لە ناوچەی کوردەوارییەوە دەبوە مانیعی زانینەنەوەی خێرا بە خێرای ئەو تەرزە شیعرانە ئەگەر بە دوایاندا نەگەڕابا و مەراقی کۆ کردنەوەیانی نەبووبا.

لە فەرزی هاتنی یادی ئەو بەیتە بۆ ناو هەڵبەستەکە، خۆی لە خۆیدا بە تەنها نەبێتە بەڵگە، بێگومان لەگەڵ تێکڕای شارەزایی حاجی بە شیعر و شوعەرای کورد دەبێتە کەرتێکی دەلالەت بەخش لە بەڵگەیێکی فرەوانی زۆر کەرت. زاتەن لە گەلێک حاڵدا ڕاگەیاندنی بەشێکی کەم لە شتێکی زۆر هەر وایە، بۆ میسال دەڵێم زانینی «ئەنشتاین» لە تاک تاکی پرسیارەکانی ڕیازی نابێتە بەڵگەی زێدە زانینی؛ تێکڕای زانینی دەیکا بە فەیلەسووف لە ڕیازیات.

ئەمە کورتەیێکە لە حیکایەتە درێژەکەی «غەزەل بۆ کوڕ»، بۆ خۆت لەسەر باسەکانی بکۆڵەوە و بەتاڵاییەکانی پڕ کەوە. بۆ من چی تر ئیمکانی نییە لەسەری بڕۆم، دەزانم زار کردنەوە بۆ دوانێکی کورت لە هەر یەک لەسەر باسەکان وەک گلۆر کردنەوەی تۆپە بەفرە سەرەو لێژ بەسەر بەفردا هەر دەڕوا و زیاد دەکا.

ئەوەی ڕاستی بێ بەستنەوەی شیعری کوردی سەدەی نۆزدەم بە زنجیرەی مێژوویی شیعری عەرەب و ئیسلام تا باسەکە خۆ هەڵدەپێچێ لە شیعری پێش ئیسلام و لەوێوە سەرەوژێر دەبێتەوە بەشکڵێکی مەفهووم، کارێکی یەکجار گرنگە و زۆریش پێویستە، بەڵام لەوانە نیە بەدەم باسێکی ترەوە کەنەی لێ بکرێ. شی کردنەوەی شیعری کۆمەڵدۆست لەگەڵ تێکەڵبوونی شاعیر بە کار و باری کۆمەڵایەتیەوە گەلێک مەتەڵی نامەفهوومی ئەدەبی ئیسلام هەڵدێنێ.

من لەم ئاخەلێوەی بەشی دوەمی نووسینەکەم تەنها بایی ئەو زاهیرەی غەزەل بۆ کوڕ لە دیوانی حاجی قادردا بخاتە نێو چوارچێوەی مێژوویی و کۆمەڵایەتیەوە خەریک بووم بە باسەکەوە. چەندی لێرەدا گوتوومە و نووسیومە، لەبەر زێدە کورتی، هەر دەڵێی پێرستە بۆ سەرباسەکانی ژێر عینوانێکی گشتی. چ زیانیش نیە لەوەدا نووسەران تاک تاکەی ئەو سەرباسانە لێ بکۆڵنەوە بە مەرجێک لە تێکڕای تابلۆکە دانەبڕن. دابڕینی ڕواڵەتی کۆمەڵایەتی لە زنجیرەی ڕووداو و هەڵکەوت و

بەسەرهاتی مێژوویی دەیکاتە موعەمما و دەیخاتە تاریکایی بێ پەیوەندی و بێ سەرچاوەییەوە.

لە سەرگوزەشتەکانی کۆنینە کە دەگوترا «هەبوو نەبوو پاشایەک هەبوو ناوی مەحموود بوو...» وا دەهاتە بەر زیهنی گوێگرەوە پاشاکە و شارەکە و خەلقەکە وەک بڵقی سەر ئاو لەنکاورا پەیدا بوون. دەبێ نووسینی نەوباو بڵقەکە لە بنی گۆمەوە بەسەر خات.

«...»

## چەند وشی دوای درویتە[70]

-- ئا--

ڕێکەوت وا بوو کاتێک چاپکردنی ئەم نووسینە گەیشتە باسی کوردایەتیی عەبدولڕەحمان پاشای بابان و تەئسیری ئەو لە بەکارهێنانی زمانی کوردی لەلایەن شاعیرانی بابابەوە، مامۆستا هێمن خەریک بوو کتێبەکەی «ئۆسکارمان»ی لە ڕێنووسی ئەڵمانییەوە دەهێنایە سەر ڕێنووسی کوردی لەسەر خواهیشتی کۆڕی زانیاری کورد. لەوێدا هەندێ بەیتی «عەلی بەردەشانی» هاتبوونە بەرچاو کە لە سەردەمی عەبدولڕەحمان پاشادا هەڵی بەستبوون و گیانێکی کوردایەتی ئاشکرایان تێدایە. بەردەشانی خۆیشی لەو کاتەدا یەکێک بوە لە بەرە و تاقمی عەبدولڕەحمان پاشا.

لە وتووێژدا کە باوەڕی خۆم ڕوون دەکردەوە مامۆستا هێمن لە لای خۆیەوە، بۆ پشت گیری کردن لە ڕایەکەی من کە ئەویش لێی ڕازی بوو، باسی ئەو بەیتانەی بەردەشانی کرد و بە بەڵگەی بوونی ئەو تەئسیرەی عەبدولڕەحمان پاشای لە قەڵەم دان و بەمەدا هێزێکی نوێی خستە ناوەڕۆکی باسەکەوە. نەختێک دواتر بەیتەکانیشی بە نووسراوەیی پێ دام کە دەبوو لە کات و جێی مەتڵەبدا باس کرابان و لە چاپیش درابان. بەڵام داخم ناچێ کاتێک کە باسی بەیتەکان هاتە ناوەوە لە چاپ کردنی باسەکە بووبوومەوە بۆیەیە لێرەدا بە درەنگەوە کەوتە بەر چاپ. لەگەڵ تۆمارکردنی ئەم بەڵگەیە نرخدارەی بوونی گیانی کوردایەتی لای عەبدولڕەحمان پاشای بابان دەستێکی حورمەتیش بەسەر سینەوە دەگرم بۆ گیانی بەردەشانی.

ئەم چەند بەیتە لەو بەندەی ناوبراو، کە لە ژێر عینوانی «بەیتی عەبدولڕەحمان پاشای بەبە» لە کتێبەکەی ئۆسکارمانەوە وەرگیراوە، مامۆستا هێمن بێ دەست لێدان هێناوەتیە سەر ڕێنووسی کوردی منیش وەک ئەوم لێرەدا بە چاپ گەیاند.

---

[70] – «وشی» بەو گوڵە برنجە دەڵێن بەر دەستی تێلەگەکێش ناکەوێ کە لە دوا سەپانەوە دێ و مەڵۆیان دەکاتە کۆڵ و دەیان با بۆ سەر خەرمان.

ئەزم عەلی بەردەشانی
دە بەندێم نەکەی زبانی

بەیتێ دەڵێم بە دیوانی
مەدحی پاشای کوردستانی

مەدحی پاشای کامیان باشە
شایەد ڕۆم و قزڵباشە

هەر جارێ شیری دەکێشا
هەمووی دەهاتنە تەماشا

عالەم ئالایە چاوەشە
مەردە عەبدولڕەحمان پاشا

پاشای بەبان جهانگیری
وەک ڕۆستەمی زاڵی پیری

تەحا بە ڕا و تەگبیری
ڕانابوێرێ بە ڕەزیلی

ناکەم خزمەتی وەزیری
نانی دەستێنم بە شیری

بە شیری نەبێ قەت پێک نایە
دەوڵەت نایەتە ڕەدایە

ناچمە سەفەری لەحسایە
یاغی دەبم لە بەغدایە

یاغی دەبم ئینشائەڵڵا
خزمەتی ناکەم وەڵڵا

ئافەریم بارەکەڵڵا
تەوەککول تەعالەڵڵا
هەی کوڕە بەبەینە هەڵڵا

«...»

-- ب --

بەر لە باسەکەی عەبدولڕەحمان پاشا، جارێکی تریش مامۆستا هێمن تێبینیەکی بایەخداری ڕەچاو کرد لە بارەی زاهیرەی زۆربوونی مزگەوت و خوێندن و مەلا و فەقێ لە باڵەکەتیدا، بەداخەوە ئەویش دوای بەسەرچوونی کاتی چاپ کردنی سەرگوزەشتی خوێندنی حاجی لە باڵەکەتی و لێکۆڵینەوە لە بیروڕاکانی مەلای ئیبنوئادەم هاتە ناوەوە.

بەلای مامۆستا هێمنەوە ئەو قەتڵوعامی شا عەباسی سەفەوی بەسەر ناوچەی موکریانیدا هێنا لە ساڵی 1018ی کۆچی تا ئەو ڕادەیەی ناوچەکەی چۆل و هۆل کرد و کەسی تێدا نەهێشت، بوو بە هۆی ئەوە دانیشتوانی موکریان، چی ڕزگاری بوو لە کوشتن، بڵاوبوونەوە بە ناوچەکانی تری کوردستانی دەرەوەی ئێران و ژمارەییێکی زۆریان لە باڵەکەتیدا نیشتەجێ بوونەوە بەهۆی دراوسێیەتی هەر دوو ناوچەوە. موکریان کە وڵاتێکی پڕ مەلا و مەدرەسە بوو تاکە مزگەوتێکی تێدا نەمایەوە، تەنانەت یەکەم مزگەوتێکی دوای ئەم کارەساتە لە موکریاندا دروست کرابێتەوە مزگەوتی «سوور» بوە لە سابڵاغ ئەویش لە ساڵی 1089ی کۆچیدا وا پێ دەچێ زوربەی مەلا و مودەریسەکانی ئەوسای موکریان ڕوویان کردبێتە باڵەکەتی و بە ناچاری تێیدا مابنەوە و بووبنە سەرەتای زۆربوونی مەلا و مزگەوت لەوێدا. لە مقارنەی ساڵی قڕان تێخستنەکە کە 1018یە دەردەکەوێ بۆ ماوەی حەفتا ساڵ موکریان بێ مزگەوت بوە. لەمەڕا مەعلووم دەکرێ لەو ماوەیەدا هەر بێ مەلاش ماوەتەوە. بەمەدا ئاشکرا دەبێ ئەو مەلایانەی هاتنە باڵەکەتی لە هەموو عومری دوای ئاوارەبوونیان ڕێیان نەبوە بچنەوە موکریان و هەر لە باڵەکەتیدا ماونەوە و مردوون.

تێبینیەکە لەگەڵ ڕووداوی مێژوویی و زاهیرەی بەرچاو تا بڵێی گونجاوە و چ کۆسپێکیشی نایێتە بەر وەزەحمەتی بگێڕێ، بەپێچەوانە، خۆی کۆسپ ناهێڵێ لەبەر

زیهنێک بیەوێ بەسەرهاتی مێژوو بخاتەوە سەر یەک و کۆن و نوێی بە یەکترەوە ببەستێتەوە.

من لێرەدا، بۆ لایەنی پتەوکردنی قەناغەتی ڕواڵەتی بە بەڵگەی مادی، هەڵوەستێکم هەیە: کە خەلقی موکریان بە قەڵەباڵغی ڕایان گوێستبێ بۆ باڵەکەتی بێگومان بە خۆیان و هەموو دەستووراتی کۆمەڵایەتی و پۆشاک و خۆراک و تەرزی خانوو دروست کردن و... هتاد ـەوە هاتوون. بەو پێیە دەبێ شەقڵی خۆیان لە سەرلەبەری ژیانی ماددی و مەعنەوی باڵەکەتی دابێ. لەمەوە دەڵێم کە بێین و هەردوو هەرێم بەیەکدی بگرین دەبێ زۆر باری لە یەکچوون لە هەر دووواندا بدۆزینەوە. هەرچەند زەحمەتیش بێ تۆژینەوە لە پۆشاک و خۆراک بکرێ بۆ دەلالەت لێ وەرگرتن، لەو ڕووەوە کە ئەم شتانە زوو دەگۆڕێن و تایبەتیەکانیان دەدۆڕێنن، بەڵام ڕاوێژ و لەهجەی قسەکردن بەردەوام بەیەکدی گرتنی دوو لەهجەش کارێکی تا بڵێی ئاسانە ئیتر ئەگەر بێت و لێکۆڵینەوەی زمانزانانە بکرێ لە لایەن دووری و نێزیکی ئاخاوتنی موکریان لەگەڵ هی باڵەک و ئەم لێکۆڵینەوەیە خزمایەتییێکی وەهای سەپاند لەو کارەساتە مێژووییە بوەشێتەوە، چ گومان نامێنێ لە پێکانی باوەڕەکەی مامۆستا هێمن، ڕووپەڕییێکی گرنگی مێژووش بۆ بەرچاوی بینەر ڕووناک دەبێتەوە.

«...»

- ج --

هەرچەند لە کاتی خۆی وەخراویش بێ، چاپ کردنی نامێلکە زۆر باس کراوەکەی مەلا عەبدولڕەحمان بێسوود نیە. بە درەنگەوە هاتە دڵمەوە بڵاوکردنەوەی ئەم نامێلکەیەش یەکێکە لە ئەرکە ئەدەبییەکانی پەیوەندیدار لەگەڵ نووسینەکەم، بەتایبەتی چونکە مەترسی فۆتانی لێ دەکرێ و لەوانەیە مەلائەنوەر کە نووسەرەوەی نامێلکەکەیە نوسخەی تری لێ نەنووسیبێتەوە، هەر خۆیشی پێی گوتم دەست خەتە ئەسڵیەکەی باپیری خۆی، مەلا عەبدولڕەحمان، وای لێ بەسەر هاتوە ناخوێندرێتەوە. من هیچ دەسکارییێک ناکەم لە خەت و نووسینەکەی مەلائەنوەر، چۆنی بۆ ناردووم وەهای لە چاپ دەدەم، بەڵام ئەم تێبینییە دووبارە دەکەمەوە کە لە بەشی یەکەمدا دەرم بڕی بوو: وا دەزانم مەلائەنوەر شکڵنووسی نامێلکەکەی نەکردوە و ناوەناوە ڕێنووسی تازەی خۆی خستۆتە جێی خەتی باپیرەیەوە بەڵام بێ ئەوە دەسکاری بکا

له وشەکان، واتە قسەکان سەرلەبەریان هی مەلاعەبدولڕەحمانن هەرچەند شکڵی نووسینەکە هەمووی هی ئەویش نەبێ. وادەزانم خوێنەریش وەک من دەگاتە ئەو قەناعەتە، دوای خوێندنەوەی نامێلکەکە.

**نامێلکەی مەلا عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەحمەدی کوڕی محەمەدی کوڕی مەلا ئەحمەدی گەورە**

*عبدالله ایمە ئەصلی خومان خرکی گوندی گورقەرەجین*

*لە مملەکەتی کوی لعشرتی دەربندین لە طائفەی مەلا ئەحمەدی*

*گەورەین ئەو ملا احمد پێنج کوری هەبوە ملا صالح عبدالرحمن*

*محمد ملارسول ابو بکر ملا صالح کورەکی هەبوە ناوی ملا احمد*

*بوە ملا احمد کورەکی هەبوە ناوی عبدالقادر مەشهورە بە*

*حاجی قادری کویی ئەو حاجی قادرە بە قصەی بابم لە ساڵی*

*1231 هجری لە گورقەرەج لەدایک بوە ملا احمدی باوکی*

*لە گورقەرەج وەفاتی کردوە لەو وەختی حاجی قادر عمری نۆ*[71]

*ساڵ بوە قرأنی لەلای باوکی تەواو کردوە پاش مردنی باوکی*

*فاتی داکی لە گورقەرج ڕۆیشتوە چویتە مزگەفتی*

*مفتی لە کویی چویتە لای ملا احمدی عمر گمتی ئەو ملا احمدە*

*برازای فاتی دایکی حاجی قادر بوە لە کوی ملای مزگفتی مفتی*

*بوە لەوی لە مدرسەی ملا احمد حاجی قادر دەستی بە خوێندن*

*کردوە لە پاش دو ساڵان دایکی مردوە ئەوجا ملا احمدی عمرگمتی*

*چونکە حاجی قادر کوری پوری بوە هەموو مسرفی کیشاوە*

*ملا احمدی باوکی حاجی قادر سی قطعە ارضی لە گورقەرەج هەبوە*

*ناوی قطعە ارضەکانی ملا احمد ئەوانەن قەرەقاجین هاوینەهەوار*

*ذالفقار هەموو ساڵ حاجی قادر هەتا لە کوی بو والداتی*

---

[71] – لە نووسینەکەدا ئەم نیشانەیە بەسەر «و»ەکەوە هەیە. (مەسعوود).

ارضەکانی باوکی لە گورقەرەجەوە بوی چویتە کوی حاجی قادر

لە کوی مقدماتی تەواو کردوە لە پاشان لەگەڵ ملا عبدالله جلی

بۆ خوێندن لە کوی ڕویشتوە چویتە خوشناوەتی لە گوندی

هەرتەل مدتەک مایتەوە لە پاشان لەوی ڕویشتونە چویتە بالک

لەگوندی شیخ وسمان لەلای مامۆستا ملا محمدی شیخ عبدالله

مدتیکی زور ماینەوە لە پاشان هەر لە بالک دچنە لای ملا احمدی

ملا ادم لە گرتک مدتەکی زور لەوی ماینەوە ئەو ملا احمدە

ملایکی زور بەناو بوە حکم بەدەست بوە حاجی قادری زور خوش

ویستوە لەبەر ئەوەی حاجی قادر شاعر بوە لەو منطقانەی

فەقیاتی لی کردوە زور خوشیان ویستوە لە پاشان لەوی

ڕویشتونە چوینە سابلاغ لاجان مدتیکی زور ماینەوە حاجی

ملا عبدالله زوتر گرایتەوە کوی حاجی قادر نەگریتەوە هەتاکو

خویندنی تەواوکردوە هەر لە سابلاغ مایتەوە حاجی قادر شیعری

زورە بە ئەکثری لەلای ملا و فقیکانی کوی خوشناوەتی بالک

نوسراینەوە لەپاش تەواو کردنی علم دیتەوە شاری کوی لەوی

لەگەل حاجی ملا عبدالله دوستی لە مزگفتی حاجی بابکر اغای

ڕای بواردوە لەگەل پیاوە ناودارەکانی کوی وەک امین اغا حما اغا

اسعداغا و هەموو دوستکانی تری هەمو کات بەخوشی ڕای بواردوە

بە اکثری پاش تەواو کردنی علم لە کوی هەر خریکی کتاب

خوینەوە و شعر دانان بوە هەر شعرەکی دابنابا تسلیم بە فقیکانی

کوی ئەکرد بەلاویان ئەکردەوە حاجی قادر زور ضدی شیخ نبی

ماویلانی بوه حتی دلین او شعرەی بە شیخ نبی هەلبستاوە

ستە عشرە ژنیتی بمذهب حماری
ابن ادم نەماوە سەری پانکات وەک ماری

تەسلیم بە فقیکانی کۆی کردوە بەراویان کردیتەوە لە کوی

لە هەمو مزگفتەکان شیخ نبی صوفی و مریدی زور بوە لە کوی

عالم زور مطیعی بوینە صوفیکانی شیخ نبی لەو وەختی چوینە لای

شیخ نبی پیان گوتوە حاجی قادردائما هەجوت دەکات شعر بە

تکیە و خانەقای جەنابت هەلددات بەراوی دەکاتەوە لە شاری کوی

خصوص صوفی ڕەشک هەبوە صوفی شیخ نبی بوە زور ضدی

حاجی قادر بوە هەمو وەقت دەچوە بۆ لای شیخ نبی شکاتی لە

حاجی قادر کردوە لە نەتیجە شیخ نبی کەوت عەداوە لەگەل

حاجی قادر بە کاغەز نوسین بو یەکتری حتی وای لی هاتوە دفعەک

حاجی قادر لەگەل بەعضەک ملا و فەقی کانی کوی دەچیت بو گندی

هەرتەل بو سەر ایجازەی ملایەک لە وەختی گرانەوەی حاجی قادر بو

کوی بعضک لە صوفیکانی شیخ نبی بە تەدبیری شیخ نبی دەچنە سەر

ڕیگای حاجی قادر بیکوژن اما ملا و فقیکانی رفیقی حاجی ناهیلن

بیکوژن کە دەگەنەوە کوی فقیکان واقعەکەی بۆ ملا عبدالله جلی

دگیرنەوە ملا عبدالله لەگەل امین اغا و دوستەکانی حاجی قادر

بە گژ صوفیکانی شیخ نبیدا دەچن لە پاشان ملا عبدالله بە حاجی قادر

دەلی وای بە چاک دەزانم توزک اگاداری خوتبی چی تر هەجوم

نەکەیە سەر تکیە و خانەقای شیخەکان حاجی قادر دلیت ملا عبدالله

والله هەتاکو روحم لە بەدەن نمینی واز ناینم لە پاشان بە

*ملا عبدالله دەلیت لیرە نامینم هەرچەندی ملاعبدالله و امین اغا*

*جەهد دکەن دەکەن[72] نەروات ناسەلمێنی نەتیجە اوجا*

*حاجی قادر هەجویکی عام دەکاتە سەر شیخەکان و صوفیکان و*

*درویشەکانی کوی بە شعر دیداتە دەست فقیکانی کوی لە هەمو*

*مزگفتەکان بەراوی دەکەنەوە اوجا دلین لەگەل فقیکی شهرەزوری*

*ناوی کیفی بوە لە کوی دەرون دەچنە هەولیر مدتیک لە هولیر*

*دمینن لە پاشان لەوی دەرون دەچنە گوندی ماوەران مدتیک لەوی*

*دمینن اوجا لەوی دەرون دچنە استنبول لەوی دمینن هەر لەوی*

*دەمرن هەتاکوو مابو زور جار کاغەزی بو دوستەکانی خوی*

*رەوان کردوە بو کوی وەک امین اغا حما اغا ملا عبدالله جلی دلین*

*ملاکیفی پیش حاجی قادر مردوە چەند سال لەوە پیش فتاح افندی*

*لە استنبول هەتاوە کوی خەبەری وەفاتی حاجی قادری هیناوە بە ملا*

*عبدالله جلی و دوستەکانی حاجی قادری گوت حاجی قادر وەفاتی کرد*

*لە استنبول*

*و هیچ مندالی نەبوە ژنی نیناوە ئەمن تنها سی شعری حاجی قادرم*

*لە لایە*

*ملاحظە شعرەکانم نەنوسی چونکە لە دیوانەکەی هەیە[73]*

*یەکەم لە جملەی ماجرای دوری ولایت ئەو کاغەزەیە بۆ مامۆستا*

*ملا عبدالله گەورەی نوسیوە هەتاکو اخر.*

---

[72] – بەڵێنم داوە چی هەیە ئەوە بنووسم. (مەسعوود).

[73] – ئەو دێڕانەی لەناو جووت کەواندا نین قسەی ملا ئەنوەرە ئەویشم چ دەست لێ نەداوە. (مەسعوود).

دووەم ئەو شعرەیە

هەر لیرە هەتا دشتی بەهشت اینی لاجان
اهەستە برو نەک وەکو دیوانی هەرزە

تا داخلی خلوت ببی امجا بە وکالت
خاکی قەدەمی ماچ بکا بەم تازە کە تەرزە

فی الجملە وەکو خالی روخی دولبەری حاجی
دل بەندە دەسا بادی سەبا هەستە مەلەرزە

کوری دووەمی ملا احمدی گەورە ناوی عبدالرحمن بوە عبدالرحمن
کورەکی هەبوە ناوی شیخە بوە شیخە دو کوری هەبوە مولود و
احمد مولود لە گورقەرەج کوژرا لە پاش کوشتنی وی
گورقەرجمان چول کرد هەمووومان لەوی ڕویشتین هەتاکو آلان
نەچوینەوە گورقەرەج هر چولە احمدی برای کورەکی هەیە ناوی
علی لە گوندی گەرمک
کوری سیەمی ملا احمدی گەورە ناوی محمد بوە محمد کورەکی
هەبوە ناوی احمد بوە احمد دوو کوری هەیە محمد و عبدالرحمن
محمد مامەتە عبدالرحمن ئەمنم هەوم
کوری چارەمی ملا احمدی گەورە ناوی ملا رسول بوە ملا ڕسول
کورەکی هەبوە ناوی عثمان بوە عثمان کورەکی هەیە ناوی
ملا رسولە الان ماوە لە گوندی دولەزملایە
کوری پینجەمی ملا احمدی گەورە ناوی ابوبکر بوە ابوبکر
کورەکی هەبوە ناوی حاجی مصطفی بوە حاجی مصطفی سی

کوری هەبوە عزیز محمد احمد عزیز لە گورقەرەج پیش چول بون

مرد محمد یەک کچی هەیە بلقیس دایکت هەوە احمد یەک کوری

هەیە ناوی علی یە لە گوندی گردەشینەیە کە ئەکات خالت علی

اموزای دایکت.

عبدالله ئەوا ناوی هەموو خزموکەسی خومانم بو نوسی لە پشتی

ئەو کتابە لە سالی 1326 هجری لە گوندی قولتپە

«...»

لێرە نامێلکەکە کۆتایی دێت. لە بەشی یەکەمی ئەم نووسینەدا بەپێی داخوازی جێگە هەر جارە موناقەشەی شوێنێکی نامێلکەکە کراوە. بێگومان وتوویژم لەگەڵ نامێلکەکەدا زۆرە بەڵام لێرەدا تەنها دوو تێبینی دەردەبڕم، یەکێکیان تازەیە و ئەوی تریان دووبارە کردنەوەیە:

تێبینی تازە ئەوەیە باپیرم لەگەڵ حاجی قادردا نەچوە بۆ کوردستانی ئێران، نە بەنیازی خوێندن نە بە هیچ نیازێکی تر، بە هەموو عومرییشی جارێک چوە بۆ سابڵاغ ئەویش لە هەڵکەوتێکی تایبەتیدا کە ئێرە جێی باس کردنی نیە، کاتێکیش کە چوە بۆ سابڵاغ بیست ساڵێک بەسەر چوونی حاجیدا بۆ ئەستەمبۆڵ تێپەڕیوە.

تێبینی دووبارەکرایەوە ئەوەیە حاجی و کەیفی بەیەکەوە نەچوونە تورکیا، وەک باسم کردوە حاجی قادر چەند ساڵێک بەر لە کەیفی سەفەری کردوە. لەگەڵ هەموو تێبینییەکیشدا هەزار ڕەحمەت لە یاد و لە گۆڕی خاوەن نامێلکە بێت.

یەک کاری خودبەسەرم لەگەڵ نووسینەکەی مەلا ئەنوەردا کردوە ئەویش لە یەکتر جوداکردنەوەی وشەکانە چونکە ئەو بە زۆری لە نووسیندا وشەکانی نزیک یەکتر خستۆتەوە.

با ئەمەش بڵێم: مەلا عەبدوڵای کوڕی مەلاعەبدولڕەحمان دەکاتە باوکی مەلا ئەنوەر، لە سەرەتای نامێلکەدا بە عبدالله ناوی هاتوە.

«...»

## پێشەکی

نووسەران هەموویان یەک شێواز و یەک ڕێبازی شی کردنەوەی بابەت ناگرنە بەر. نووسەر هەیە مەوزوع بڕبڕ و کەرتکەرت دەکات وەک کە قەساب دێت و کەلەشی کوشتەکەی پەلپەل دەکات، ئیتر هەر کەرتە و هەر پەلەیە خۆی لە ژێر ناونیشانێکی سەربەخۆدا دەبینێتەوە وەیا بەر «فصل و باب» ێکی جودا دەکەوێت نووسەریش هەیە، بە پێچەوانە، سەرلەبەری نووسینەکەی دەخاتە بەر یەک نیگای بێپچڕانەوە کەوا هەمیشە زاڵە بەسەر تێکڕای دیمەندا، دەمدەمیش بەپێی بەسترانەوەی ڕووداوێکی سەرەتا بە ڕووداوێکی ناوەڕاست وەیا کۆتایی باسەکەیەوە باز بە خامەی خۆی دەهاوێت بەملا و بەولادا وەیا سەرەوژێر دەبێتەوە لەگەڵ ئەو پێوەندییەی کە کۆن و نوێی باسەکە بەیەکترەوە دەبەستێتەوە.

زۆربەی نووسینەکانی «عباس العقاد» و «طه حسین» لەم جۆرەی دووەمن. زۆربەی نووسینی قوتابخانەکانیش حەز لە پەلپەل کردنی بابەت دەکات.

ئەوەی من باوەڕی پێدەکەم لە جۆری ڕێباز و شێوازی نووسین ئەوەیە سەرلەبەری مەبەست بەدەستەوە بدات. لەبەر ئەوە فەرقێک نابینم لە نێوان ئەو شێوازەی کە دێت کەرتکەرتی بابەت لێ دەکۆڵێتەوە و پاشان بە یەکتریانەوە دەدووریتەوە، لەگەڵ ئەو شێوازەی هەموو بابەت دەداتە بەر چاو و دەمی خامەوە بێ ئەوە جەمسەر و بڕگەی لێکهەڵوەشاندنەوە بخاتە لەشی باسەکەیەوە چونکە هەردوو شێواز تام و شامی خۆی هەیە و هەر یەکەشیان تەڕدەماغییێکی تایبەتی خۆی بە خوێنەر دەبەخشێت کەوا ڕەنگە لەوی تردا پەیدا نەبێت.

ئەم ڕاستییە سەرەتاییە، بەلای منەوە، نەسەلماندن هەڵ ناگرێ بەڵام لە پەنا ئەم ڕاستییەدا یەکێکی تر هەیە، قووڵتر و گشتی تر و هەمیشەیی تر، هەرگیز لە بیر ناچێتەوە. جیهان لەم پەڕی بۆ ئەو پەڕی، بە خۆی و هەرچی تێیدا هەیە، یەک پارچەی شیرازە هۆنکراوی بەیەکەوە بەستراوەی تێکهەڵکێشراوی ئاڵقەبەندکراوی تێکەڵ بەیەکتربووی ئاوێتەیە.

هەرچەند ناوەڕۆکی جیهان ملیارەها ملیارەهای شتی سەربەخۆی تێدایە کە هەر یەکێکی خاوەن تایبەتی و تەرکیب و تین و تاو و خاسیەتی خۆیەتی، لەگەڵ

ئەمەشدا هیچ کامێک لە تاکەکانی ئەو ناوەڕۆکە لە تێکڕای ئەوانی تر نەپچڕاوەتەوە بەڵکوو لە دەوران دەورییەوە چەندین دەماری پێوەندی بە دراوسێکانی بەستۆتەوە، ئەوانیش وەک ئەو بەولاترەوە بەستراونەوە، شێوە زنجیرەی ئاڵقەبەند تا کۆتایی جیهانی بێ کۆتایی. پێی ناوێ لێرەدا نموونەی ڕوون کردنەوە بهێنمەوە لەحاڵێکدا هەموو «بوون» نموونەیە، هەر ئەوەندە دەڵێم بەکورتی و بە کوردی هەموو شتێکی ئەم دنیایە ماددی و نامادی لەم گەپەی «تێکئاڵقان و تێکبەستران و پێکدا تێپەڕین» ـەدا بەشداران. کەواتە هەڵاواردنی باسێک لە ناو باسان و پەلپەل کردنی، کارێکە لە سەرەتاوە وەک لەبەر یەک هەڵوەشاندنی پارچەی هۆندراوەیە وەیاخود هەڵگێڕانەوەی بزووتنی بەرەو پێشەوەی سروشتە. تاکە هۆیەکی پەسەند کردنی ئەم کارە پێچەوانەیە تێگەیاندن و ئاسان کردن و نزیک خستنەوەی مەبەستە، دەنا سەربڕین و پێست لەبەر داڕنین و پەلپەل کردنی کوشتە «کەبابەتی باس لێ کردن و نووسین بێ» لە چیەتی «ماهیە» خۆی دەردەبا هەروەک شکاندنەوەی ڕووناکایی بۆ حەوت ڕەنگە ئاورینگیەکان لە «تیشکایەتی» دەشۆرینێ.

بەڕاستی زۆرجاران کە باسێک دەکرێ بە چەند بەش و هەر بەشەی خورد دەکرێتەوە بۆ چەند بەند و هەر بەندەی بۆ چەند خاڵ... و هتاد من سەرەدەری لە خوێندنەوەکەم ناکەم، چونکە هەر دەبێ خەریکی بیر کردنەوە بم لە پەیوەندی خاڵەکە بە بەندەکەوە و هی بەندەکە بە بەشەکەوە و هی بەشەکە بە سەرلەبەری باسەکەوە... تائێستاش نەچوە دڵمەوە چۆن شۆڕشی فڕەنسە لەبەر ئەو هۆیە لەیەک پچڕاوانە ڕوویدا کە لە کتێباندا ژمارە یەک و دوو و چوار و پازدەی بۆ دادەنێن کەچی دەزانم شۆڕشەکە بە «پازدە کەرتی» ڕووی نەدا، هۆیەکانیشی چ ژمارەیان بۆ خۆیان دانەنا بوو لە یەکتریان جودا کاتەوە وەک لە کتێباندا جودای دەکەنەوە.

منداڵێک کە بەوەلەد دەبێ ناڵێین: یەکەم ملی بوو دوەم دەستی بوو سێیەم چاوی بوو... منداڵ بە گردی دەبێت، شۆڕشیش هەروەها. ئەو هۆیانەی منداڵیشیان پێک هێنا، وەک هۆیەکانی شۆڕش، بێ ژماردن و جودا کردنەوە کاری خۆیان کردوە. ئەو کاتانەی کە منداڵەکەشیان تێدا ڕسکاوە بێ پچڕانەوەی ڕۆژ و هەفتە و سەعات و مانگەکانی بەدوای یەکتردا هاتوون... شۆڕش و غەیری شۆڕشیش لەو ڕووداوانەی کە کاتی پێکهاتنیان درێژ دەکێشێت، وەک ڕسکانی منداڵ، جەمسەر و بڕگەیان نەبوە.

هەڵبەت لەم قسەیەمدا مەبەستم ئەوە نیە بڵێم منداڵبوون و شۆڕش هەڵگیرسان لە تاکە یەک هۆ پەیدا بوون: من دەڵێم هۆیەکانیان وەها لەیەکتر پچڕاونین وەک بە ژماردن دابەش کردن و جۆردانان لە یەکتر دەپچڕێنەوە، هەروەها ئەو ڕیزەشیان نەبەستوە کە ژماردن و دابەش کردن لە سەر کاغەز دەیبەستن. سروشت وەک ئاوی جۆگەلە وایە هەموو ناوەڕۆکەکانی بەیەکەوە لە پەیدابوون و بزووتنەوە و تێپەڕین و بەسەرچوون دان. هۆی یەکەم و پازدەمی سەر کاغەز لە سروشتدا بە یەک شەقام و لە یەک کاتدا جووڵەیان کردوە. ئەگەر کاغەز ڕسکا بێت. سروشت بەشبەش و بڕبڕ و تەکان بە تەکان نیە. یەک تاڤگەی بە خوڕی بێ جەمسەرە، فەرقێکیش لەوەدا نابینم ئایا ئەم تاڤگەیەی «وجود» بە هەموو پانایی و درێژایی و قووڵایی و بوعدی چوارەمیەوە لە ڕابردووەوە هەڵدەڕژێتە دوارۆژ وەیا لە جەرگەی ئایندەوە هەڵدەقوڵێ و دەبێتە ڕابردوو. ئایا ئێمە هەڵدەڕژێین یاخود هەڵدەقوڵێین! ئایا جیهان وەک ئەو تۆپە بەنەیە کە گلێر دەبێتەوە وەیا ئەو قایش مەترەیە کە هەڵدەکرێتەوە؟ مەتەڵی ئەم قسەیە چیە و لە کوێوە هاتە ناو پێشەکی باسی حاجی قادرەوە چونکە قسەی وەها و لەویش بەزاهیر خەیاڵیتر جێی لێکۆڵینەوەی خاوەن فەلسەفانە، ڕاستەوخۆش لە ڕچەی پێشەکیەکەوە هاتە ناوەوە، چ زەرەرێکیش ناکەین لەوەدا کە بەدەم سەرەتای کردنەوەی دەرگە بۆ ناو نووسین لاپەنجەرەیەکیش بکەینەوە بەڵکوو تیشکێکی تازە و نامەئلوفی پێدا بێتە سەر تەختەی نووسینەکە و نەختێک لە یەکئاهەنگی فکر و لێکدانەوەکەمان بگۆڕێت و لەرزە و لەرەیێکی «تنویع» بخاتە ئاوازەکانیەوە و مێشکیان بەرەو گۆشەیەکی نائاشنای بیر کردنەوە ببات. ئەوەندەی مرۆڤ یەک جۆرە بیروباوەڕ دەکوتێتەوە خەریکە ببێتە بوتپەرستی باوەڕ، کەوا حاجی قادر گوتەنی، «وەکو ئاوی شەوی تامی نەماوە».

کە ئەم قسانەمان بەسەر شێوازی نووسیندا بگرین دەبینین شێوەی دابەش کردن و هەڵبڕینەوە پتر لەگەڵ بابەتی زانستیدا ڕێک دەکەوێت، بابەتی ئەدەبی چونکە لەگەڵ جموجوڵی ژیان خەریکە ژیانیش وەک دەزانین کۆن و نوێ و ڕابردوو داهاتوو و هەرچی هەیە تێکدەبەستێت، نەک ئەوەندە و بەس بەڵکوو لەم ڕۆژەوە بەتەمای دوارۆژ دەبێ... سبەینێی سەر لە پێرێی خوار دەکاتەوە، ئا ئەم ژیانە و پێوە خەریکبوون و لەسەر نووسینی حەز لە ڕەهایی و بەربەڕەڵایی دەکات، زۆریش بەدەست هەڵبڕینەوە و دابەشینەوەوە سەغڵەت دەبێ. لێرە بە پێشەوە گەلێک لە

نووسەرانی ماددی «یەکێک لەوان پلێخانۆڤ» ئەو ڕاستییانەی کە بزووتنەوەیان تێدایە جودایان کردۆتەوە لەو ڕاستیانەی بزووتنەوە و گۆڕانیان تێدا نیە و لە هەموو کات و جێگەیەکدا هۆ وەک خۆیانن. من ئەو ڕاستییانەی ژیانیشیان تێدایە جودایان دەکەمەوە لەوانەی بێ ژیان دەبزوون. جارێکی تریش ئەو ژیانەی هۆشی لەگەڵە (کە هی ئادەمیزادە) جودای دەکەمەوە لە ژیان و بزووتنەوەی گیانلەبەری بێهۆش. بەو پێیە لە بەر چاوی مندا هەر وەک هێزی ژیان ئەم جیهانە گردەبڕ دەکاتە دوو کەرتی لە یەکتر جودا لەو ڕووەوە کە گیانلەبەر لە بزووتنەوەی ئالییەوە هەڵدەکشێ بۆ بزووتنەوەی بە هەست و خواییشت، هێزی «هۆش» یش سەر لە نوێ جیهانی گیانلەبەران گردەبڕ دەکاتەوە بە دوو کەرتی لە یەکتر جودا لەو ڕووەوە کە لێکدانەوە و تێگەیشتن و بە سەهوو چوون و لایەنگیری... و هتاد، لەگەڵ هۆشدا دەور دەبینن و سەرلەبەری دیاردەی «کۆمەڵایەتی» و بزووتنەوەی «مێژوو» یان لێ پەیدا دەبێت. لەو دەمەوە ماکی «هۆش» تێکەڵ بە ژیان و مادده بوو، مێژوو و کۆمەڵایەتی لە منداڵدانی وجوددا ڕسکا، پێشتر هەرچی «پێویستی ماددی» ی ژیان هەیە وەک خواردن و نوا و خۆپاراستن و زایەند «جنس» تێکڕایان لە نوختەی دروست کردنی ««کۆمەڵایەتی»» یەوە نەزۆک و ناکاریگەرن. ئەم جوداوازییەی مرۆڤ لە گیانلەبەرانی تر هێندە بنجی و جوداکەرەوەیە ڕێ نادات هەردووکیان بچنە ژێر حوکمی یاسا زۆر مەشوورەکەی «گۆڕانی چەند بۆ چۆن تحول الکم الی الکیف». گیانلەبەرانی غەیری مرۆڤ لەگەڵ ماددەی مردودا بەر ئەم یاسایە دەکەون، مرۆڤ بە تەنها دەمێنێتەوە بۆ ئاکامی هەمەچەشنەی ئەو یاسایە لە مەیدانی کۆمەڵایەتیدا. نووسەرێکی ماددی بێت و بەرپابوونی «شۆڕش» بگێڕێتەوە بۆ هەمان یاسای «گۆڕانی چەند بۆ چۆن» کە ئاو دەکوڵێنێت، هەڵەیێک دەکات کە گەورەترە لە یاساکە... جارێ ئێرە جێگەی ساغ کردنەوەی پرسیارەکە نیە.

شێوازێکی من لەم نووسینەمدا گرتومەتە بەر، لە سەرەتاوە ئەم شێوازەی سەرانسەری و بێجەمسەری و تێکبەستران و یەکهەناسە بوە کە هەموو سروشت و بوون و ڕابردوو و ئێستاکە و دواڕۆژ و کۆمەڵایەتی و مێژووش هەر وەهایە.

حاجی قادریش وەک من و تۆ و جۆرج و عوبێد ژیانێکی بێ پچڕانەوە و یەکبین و بەسەریەکەوە ژیاوە، نەک بە ئەنباز و تەکان بەتەکان و مەیدان بەمەیدان کە هەرجارە لە ئەنباز و تەکان و مەیدانێکەوە بۆ یەکێکی تر ژیانی حاجی پچڕ پچڕ و

کەرت کەرت ببێ وەک کوشتەی قەساب کە بەدەمی تەوەرزین پارچە پارچە دەبێت و پارچەکان «وحدە»یان دەدۆڕێنن.

خوێنەر لەم قسەیەمدا ڕەخنەی ئەوەم لێنەگرێ کە من لە هەندێ جێگەی بەشەکانی پێشووتری ئەم نووسینەدا گوتومە فلانە شت ژیانی حاجیی گردەبڕ کردوە بە دوو بەشەوە (وەک سەفەرەکەی باڵەکاتی و خوێندن، چوونی بۆ ئەستەمبوڵ..) چونکە ئەوەی مەبەستم بوە گردەبڕبوونی دەوروبەری ژیانی بوە نەک ژیانەکە خۆی وەیا ڕەوشت و ئاکاری حاجی. لێرەشدا مەبەست لە وشەی «ژیان» هەناسە هەڵێنان و خواردن و نوستن نیە، مەبەست ئەو مرۆڤایاتییەیە کە لەودیو خواردن و نوستن و هەناسە هەڵهێنانەوە سەر دەکات.

حاجی قادر لە هەر قۆناغێکی ژیاندا بووبێت بەردەوامبوونی حاجییەکەی قۆناغی پێشووترە هەرچەند خۆشی لە زەرفێکی جوداشدا دۆزیبێتەوە کەوا بێگومان تاو و تینێکی تایبەتی خۆی بۆ دەروون و بیروباوەڕی حاجی هێناوە بەڵام نەیتوانیوە بیگۆڕێت وەیا ڕێبازی ڕەوتی ئاسایی بەرەو ئامانجێک ببات کە بەنیسبەت نەفس و دڵ و مێشکی حاجی قادرەوە بێگانە و نائاشنا بووبێت.

کەسێک بتوانێ نیگای بینینی خۆی فرەوان بکات بایی دیتنی سەرلەبەری چەشمەنداز، بەو نیگایە فرەوانەش سرنج لە حاجی قادر ڕاگرێ بۆی ڕوون دەبێتەوە ئەو حاجی قادرە یەکێکە لەو تاک تاکە مرۆڤانەی کە گۆڕانی دەوروبەر و ئاووهەوا و باری گوزەران و بەرژەوەند کاریان نەکردۆتە سەر نەفس و گیانیانەوە، قەناعەت بنجییەکانیانی نەگۆڕیون، تێکەڵ بەڕەوشت و ئاکاریان نەبوون. چاوی وردبین و نیگافرەوان دەبینێ گۆڕانی دەوروبەر و باری ژیان و بەدوا یەکتردا هاتنی تەجرەبەی نوێ لە سامانی نەفسە زلەکە و ڕەوشتە خورتەکە و بەخۆ نازینەکەی حاجییان زیاد کردوە. دەبێ بڵێم ساڵەوساڵ و قۆناغەوقۆناغ حاجی قادر پتر دەبوو بە حاجی قادر وەک منداڵی نێرینە کە لەگەڵ تێپەڕینی کاتدا لە نێرایەتی زیاد دەکات و نیشانەکانی پیاوەتی پتر لێ دیار دەدەن.

ئێمە ئەگەر بێین ڕۆژانی ئاخەلێوەی ژیانی حاجی بکەین بە کێشی بەیەکتر گرتنی هەموو قۆناغەکانی تری دەبینین هەمان هەتیمە هەژارەکەی تەمەنی منداڵی و هەمان فەقێیە تازە دەست بەخوێندنە پچرپچڕ کردوەکە و هەمان موستەعیدەکەی

باڵەکەتی و کوردستانی ئێران و هەمان مەلایە بێ ماڵ و حاڵەکەی دوای گەشتی خوێندنە، تەکامولی کردوە و خۆی لە ژیان دابڕیوە بۆ ڕاگەیاندنی بیروباوەڕی کوردایەتی. ئەم گۆڕانەی باری نەفس و دڵ و دەروونی حاجی لە دەوروبەر و ئاووهەوا و سەقافەتی گۆڕاودا خاسیەت و تایبەتییێکە لە تاک تاکی مرۆڤی هەڵکەوتوودا نەبێ نایەتە بەرچاو، کە پەیداش دەبێ گەلێک لەو نووسەرانەی حەز بە بێدەسەڵاتیی مرۆڤ دەکەن لە ئاست دەوروبەر و واقیعدا لێی بە سەهوو دەچن: قۆناغ بە قۆناغ بەپێی گۆڕانی واقیعەکەی ئەویش دەگۆڕن و دەیکەنە بەندە و نۆکەری قۆناغ و واقیعە نوێیەکە، کەچی ڕاستی حاڵ ئەوەیە هەمیشە ئەو تاکە مرۆڤە هەڵکەوتوە ئاغای واقیع بوە بەڵام نەک ئاغایەتی دەسەڵات و دەست بەسەردا ڕاکشان، بەڵکوو ئاغایەتی خۆ لە واقیع بە پشتەوە گرتن و خۆ بە مامۆستای واقیع زانین و بەسەر واقیعدا نەڕاندن و هەڵوەستی ئەوتۆیی.

نووسەر زۆرن لەوانەی موناقەشەی تاکی هەڵکەوتوو دەکەن لە ئاست واقیعدا بە جۆرێک هەر دەڵێی تاکەکە تاوانبارە لە ناو قەفەسی ئیتیهامدا، واقیعەکەش داواکارە ئەوانیش محامی واقیعن دژی تاکە مرۆڤەکە. ئیتر باری قورس دەکەن و تەکلیفی لە ڕادە و توانا بەدەری لێ دەکەن بۆ ئیسپاتی دەوری خۆی لەو واقیعەدا تا دەیگەیەنن بەو هەڵدێرەی لێ ڕزگاربوونی نیە ئەویش ئەوەیە کە دەبێ تاکەکە ئیسپات بکا خۆی خالقی واقیعە، دەنا بڕیار دەردەچێ بە خالقبوونی واقیع و مەخلوقبوونی تاک، کەسیش نازانێ ئەم پووچاندنەوەی دەوری ڕۆڵە هەرە قارەمانەکانی واقیع و مێژوو بە سوودی کێ و زەرەری کێ تەواو دەبێ! گۆیا ئەگەر دادگای مێژوو مۆری سەرفرازی و خالقیەت و ئاغاکانی لە دەفتەری ئەو تاکە دابایە و ماچێکی ئافەرینی لە ناوچەوانی کردبایە کام ڕووپەڕە پڕشانازییەکانی مرۆڤایەتی و گەلایەتی و نیشتمانپەروەرایەتی و چینپەروەرایەتی و نازانم چیایەتی دەسڕایەوە؟ خۆ ئەو تاکە هەڵکەوتوە خالقیەتی خۆی لە خالقیەتی گەل نەدزیوەتەوە تاکوو نووسەر و خاوەن فکری مرۆڤدۆست و دادخواز ئەو ماڵە دزیارییەی لێ بەسەر بگرنەوە و بیدەنەوە بە خاوەنە ڕاستەقینەکەی کە گەلە. تاکی هەڵکەوتووی وەک حاجیی قادر هەوێنی خالقیەتەکەی لە خوێنی دڵی خۆی دەگرێتەوە بۆ تاکە ئامانجی خزمەتی گەل و ئازادیی گەل، ئەگەر ئەمەی نەکردبایە لە سەرەتاوە و لە بنەڕەتەوە حیکایەت و بێنە و بەرەی خالقیەتەکە پەیدا نەدەبوو تاکوو نووسەران و دادخوازانی دوارۆژ، وەک

پاڵەوانپێف، قۆڵ و باسکی هیممەتی لێ هەڵماڵن و خامەی ڕەنگین بەکار بێنن بۆ هەڵنانەوەی موعادەلەیێک کە هەموو خالقیەتەکە تێدا بکەوێتە بەرەو لای گەل.

ئەوەی من بۆی دەچم لە هەڵنانی موعادەلەی ئەوتۆییدا، شتێکە پێچەوانەی ئەو ئاکامەیە کە دروستکەرانی موعادەلەکە بە نیازی دەگرن: من وا دەزانم دزینەوەی دەوری خالقیەت لە تاکی هەڵکەوتووەوە بۆ گەل نابود کردنی ڕۆڵەیێکی دڵسۆز و چالاکی گەلە و بەس، چونکە گەلی چارەڕەش لە بەکارهێنانی فەندی درۆزنانەی ماڵ بەسەر گرتنەوەکەدا یەک پەناباتی ناچێتە کیسەوە.. یەک نانی نایەتە خوان.. هەر هیچ ئاگای لە مامڵەتە درۆزنەکە نیە تاکوو هەر نەبێ هەستی حەسانەوەیێکی درۆزنانە بکات. لە فەرزی موستەحیل ئاگاشی لە مامڵەتەکە بوو ئەگەر فیلێکی گەورەی لێ نەکرێ هەستی حەسانەوەی درۆزنیش ناکات چونکە هیچ باوک و دایکێکی هەناو پاک نیە حەز بەوە بکا ماڵی ئەولادی بۆ بدزنەوە لە حالێکدا ئەو ماڵی خۆیشی لە ئەولادی لەچاو نیە.

با ئەمانە هەموو بەلاوە بنێین و چاو بپۆشین لە ڕەوایی و نارەوایی دزینەوەی خالقیەتی تاکی دڵسۆز بۆ حیسابی گەل، ئەدی چ بکەین لەگەڵ ئەو دەورە ڕووخێنەرانەی کە تاکی ناپەسەند دەیان کات؟ خالقیەتە بەرەواژەکەی جەنگیزخان و هیتلەر بۆ کێ بدزینەوە؟ یەزیدی موعاویە دژی حوسێنی عەلی چ لێ بکەین؟ تۆ بڵێی ڕەوا بێ لایەکی ڕیشی مێژوو بتاشین و لایەکەی تری دەست لێ هەڵگرین؟ من نامزەدێکم بە خەیاڵدا دێت کارە بەدەکان و ڕووداوە ناپەسەندەکانی لێ مارە بکەین ئەویش دەرەبەگ و کۆنەپەرست و بۆرجوازییە، بەڵام مارەبڕینەکە خەتەری تێدایە چونکە کە سەلماندمان تاک وەیا کەمینەی گەل دەوری خالقیەتی هەیە لە خراپەدا، بە ئاسانی هەمان خالقیەت بۆ تاکی چاک لە کاری پەسنددا دەسەلمێندرێ.

ئەم تەرزە گرفت و پرسیارە و صەدانی وەک ئەوان لە هەموو مەیدانێکی فەلسەفە و فکری و زانستیدا بێ وەرام دەمێننەوە ئەگەر بە واقیعی سادە و بێ تەئویل ڕازی نەبین واقیعی سادەش ئەوەیە کە ڕووداو مێژوو و کۆمەڵایەتی سەردەمی کۆن لە خۆوە بێ مامۆستا و دوور لە خواییشتی ئەم و ئەو فکر و فەلسەفە پەیدا بوون، چ دەستێکی قودرەتیش لە غەیبەوە بۆ خاتری غەیبناس و غەیبنەناسان ڕێچکۆڵەی سەرەوژێربوونەوەی بۆ دنیا نەکێشاوە تاکوو لە دوارۆژدا

بیروباوەڕی لە قاڵبدراوی من و تۆ و یەکێکی تر هەموو جاران بەڕاست بگێڕێ.
ڕەهایی و بەڕەڵایی مێژووی لێرە بەپێشەوە لەوانە نیە بچێتە ناو تاڵە و فاقی تەسکی فکری نیاز لەخۆگرتووەوە کە لە پێشەوە بڕیاری داوە کام بابەت بەکەڵکی ئامانجەکانی دێن هەر لە پێشەوەش قاڵبی مناسبی ئامادە کردوە بۆ لە چەرخدانی ڕووداو و مێژوو و کۆمەڵایەتی و هەموو جیهان تاکوو لە گەڵ پێشبینییەکانی خۆیدا بگونجێن و ببنە بەڵگەی ڕاستی و دروستییان. ئەوەی ڕاستی بێ، فێڵی ئەوتۆیی لە کۆنەوەش بەکارهاتووە بۆ مەبەستی سەپاندنی بەرژەوەند تەنانەت ناوناوە شێخی سەر بەڕماڵیش وردە مەهارەتی بەکارهێناوە بۆ ئیسپاتی کەرامەتەکانی، وەک کە دێت و خەبەری دوورەدەست و بە هۆی قاصدی تایبەتیەوە وەردەگرێ بەر لەوەی خەڵقی دەوروبەری خۆی بیزانن، ئیتر بە کەرامەت پێیان دەفرۆشێتەوە.
ئەمانە دەبن بەڵام لە هەر مەیدانێکدا بێت زۆر ناخایێنێ و بۆشیی دیار دەکەوێت.
لەگەڵ ئەمەشدا کە بۆشیی کەرامەتێکی ساختە دەرکەوت دەشێ ساختەیێکی نوێکرد خەڵق بفریوێنێ... زۆر بەداخەوە.

بەڕاستی زۆر زەحمەتە بازاڕی تەڵەکەبازی لە خودی خۆیەوە ئیفلاس بکات، هەتا ئەو ڕۆژەی زۆربەی ڕۆشنبیران دەکەونە سەر بەرهەڵستی کردنی هەموو جۆرە تەڵەکەبازی و فێڵ و ساختە لە هەموو مەیدانێکی چالاکی مرۆڤدا خەرەکی ساختەکاری هەر لە گەڕدا دەبێت و پەند و ئامۆژگاری تاک و تەرای دڵسۆزیش وەک بانگەوازی بیابان دەبێ ج دەنگێک ناداتەوە... وا دەزانم ئەو ڕۆژەش، جارێ، دوورە.

من کە بە چاوێکی واقیعبین سەیری ئەم جیهانە دەکەم، لە ناو جیهانیشدا سەرنج لە حاجی قادر دەگرم بە ئاشکرایی و بێ هیچ گومان کردنێک دەبینم حاجی قادر بە خۆی و صەدی نەوەدی ئەو هاندەرانەی کە لە درێژایی عومریدا پاڵیان بە هەنگاوەکانیەوە دەنا هاتە ئەم جیهانە. هەرچی لایەنییێکی زانراو هەیە لە کردەوە و گوتەی حاجی ئەم ڕاستییە دەسەلمێنێ. نووسەر و خاوەن فکری ئەم ڕۆژگارەش حەز لە ڕاستییەکە بکەن یان نەکەن هەر ڕاستە و بە درۆ ناخرێتەوە.
گریمان ئەو ڕاستییە لەگەڵ پێوانە و کێشانەی ئەوان نووسەراندا ڕێک نەکەوت و بە هیچ کلۆجێک گونجانێک لە بەینیاندا پەیدا نەبوو، باشتر بۆ خۆیان و بۆ حاجی و بۆ کورد و غەیری کوردیش ئەوەیە کێشانە و پێوانەکەیان بگۆڕن وەیا وەهای

بسازێنن کە لەگەڵ ڕاستییەکەدا بگونجێت نەک ڕاستییەکە بنلێو بخەن وەیا بەرگی بۆ بخوازنەوە تاکوو لەگەڵ پێوانە و کێشانەکەیاندا بسازێت و وەقاری
بیروباوەڕەکانیانی پێ بپارێزن چونکە ئەم پاراستنە هەموو جاران و بەدرێژایی کات لە ئیمکاندا نیە. ڕاستییە بەدرۆخراوەکان لەگەڵ درێژەکێشانی زەمانە وەها کەڵەکە دەکەن و ئەوەندە قورس دەبن، هەرچەند زەمانەشی زۆر بوێ، ئەوساش هەموو ئەو ڕاستییانەی زووتر پێشێل کرابوون، وەک تۆپی پڕ هەوای ژێر ئاوخراو، بڵق دەکەنەوە بۆ ڕووناکایی سەر ئاوەکە، حاجی قادریش دەبێتەوە ئەو قارەمانە نەگۆڕاوەی کە گوێ ناداتە گۆڕانی واقیع و دەوروبەر و ئاووهەوا و بەرژەوەندی ماددی، نووسەرێکیش پەیدا دەبێ ڕاستییە بێفێلەکان لە بارەی حاجی قادرەوە دەنووسێ و دەڵێ:

بەردەوامبوونی حاجی لەسەر ڕەوشتە زگماکەکانی خۆی لە هەموو حاڵ و بارێکدا یەکێکە لەو دیاردانەی ناوناوە سەر هەڵ دەدەن و نەرمە گاڵتە دەکەن بەو بڕیارە فەلسەفییانەی ئادەمیزاد دەکەن بە برای تەرمۆمەتر کە بەپێی ساردبوون و گەرم داهاتنی دەوروبەر جیوەکەی دادەکشێت و هەڵدەکشێت.

حاجی قادر وەک تاک تاکە مرۆڤی هەڵکەوتوو، داکشان و هەڵکشانی تەرمۆمەتری نەفسی بە هەڵایسان و دامرکانەوەی دەروونی خۆی هات و چۆی سەرەوژوور و سەرەوژێری دەکرد، هەر بۆیەش بوو، بە پێچەوانەی چاوەڕوان کردنی دەستووراتی تەرمۆمەتر لە کاتی بەسەر بردنی ژیانی نێو سەرەک عەشیرەت و ئاغا و براگەوراندا نەبوو بە نەیژەن.. لە هەژاری و نەداری و ئاوارەیی و بێگوزەرانیدا سەختترین تاکێک بوو بەرانبەر هەرچی ترس و تەماعە. دیسانەوە بە پێچەوانەی چاوەڕوان کردنی پێوانە و کێشانەی حازروبزر، حاجی کە بیری کرایەوە بۆ فکری ڕوون و کەوتە سەر باری نیشتیمانپەروەری دەستی دایە پێدا هەڵگوتن بە گەورە و مەلا و شێخ و دەسەڵاتدارەکانی کورد. تەرمۆمەتری نەفسی حاجی لە چاو هی دەسکرددا سەرەوبن بوو، هەڵکشانی بە ساردی و داکشانی بە گەرمی دەبوو.

چەند خۆشە باری نەفسی و فکری مرۆڤ لەوەدا بێ کە فەلسەفە و بیروباوەڕەکانی تەنگەتاو نەبن بەدەست واقیعی ڕاستەقینەوە. حاجی قادرە و لە سێبەری ڕژێمی پێش سەرمایەداریدا، لەوپەڕی هەژارییەوە، خۆ بە گەورەتر دەزانێ لە گەوران... ئەحمەدی حەنبەلە و گیانی خۆی لەبەر دەستی دادەنێ لە پێناو فیکرەی قەدیمبوونی قورئان... موحەمەدی کوڕی عەبدوڵایە و هەر چی ماڵی دنیا هەیە وازی پێناهێنێ لە

چەند قسەیێکی دژی بیروباوەڕی گشتی نێوان عەرەبی 1300 ساڵی پێش ئەمڕۆکە. یەکێک لەو دەقانەی خۆی بۆ بەخت دەکرد ژیانەوەی ڕۆژی قیامەت بوو کە بوتپەرستەکان باوەڕیان پێی نەبوو لەوەشدا ئەوان گونجاوتر بوون لەگەڵ فەلسەفەی ماددیدا کە لە کۆنەوە چ باوەڕێکی بە غەیب و ژیانەوە نەبوە...

سەیر لەوەدایە عەرەبە بوتپەرستەکان لە هیچ سەرچاوەیێکی فەلسەفەی یۆنان و ڕۆمەوە فێری نەسەلماندنی ژیانەوە نەبوون، ئیمانیشیان بە خوا هەبوو، کەعبەشیان بە ماڵی ئەو دەزانی، حەجیشیان دەکرد... کەسیش ناتوانێت تەعلیلێکی سافیلکەی کۆبوونەوەی ئەم شتە لە یەکتر نەچوانە بکات، تەنانەت مولحیدێکی ئەمڕۆ خۆی ناچار دەبینێت لە هەندێ ڕووەوە لایەنی پێغەمبەر دەگرێ بەڵام لە نوقتەی قیامەت و ژیانەوەدا دەبێتەوە دۆستی «أبو جهل». ئەمانە و سەدان نموونەی وەک ئەمان لە هیچ پێوانە و کێشانەیێکی قەرارداده و قاڵب بەستوودا ناگونجێن مەگەر هەر جارە قاڵبەکە لە قاڵب بدرێتەوە و نەختێک لەبەریەک بکێشرێتەوە بۆ ئەوەی جێگەی «متناقضات» ی تێدا ببێتەوە کە کارێکی زەحمەت و بێبڕانەوەشە چونکە هەموو ڕۆژێک لەوانەیە نموونەیەکی نوێ پەیدا بێت و جێگەی دیارکراوی لە چارچێوەی قاڵبەکەدا بەر نەکەوێ ئیتر هانا ببرێتە بەر وەستای پسپۆڕ بۆ لە قاڵب دانەوە و جێگە پەیداکردن. بەلای منەوە چاکتر ئەوەیە پێوانە و کێشانەی قاڵب بەستوو هەرگیز بەکار نەیەت و لەجیاتی ئەو نیگایێکی بەرفرەوانی نەترساوی ئازاد سەیری جیهان بکات بە کۆن و نوێ و سروشت و ئادەمیزادیەوە، هەر چیەکیش دێتە بەر ئەو نیگایەوە با بێت و لە شوێنی دروستی خۆیدا ئارام بگرێت، کە دەستووریش هەڵێنجرا و لە مەیدانی ڕاستەقینەی خۆیدا تاقی بکرێتەوە، هەرساتێکیش پووچایەوە با بپووچێتەوە و چ هەناسەسواریشی پێ ناوێ لە من و تۆ وەیا لەو کەسەوە کە دەستوورەکەی دۆزیوەتەوە.

باوەڕ دەکەم ئادەمیزاد ئەوەندە مەخلوقێکی سەیرە لەوانەیە ئەو کەسەی خاوەن دەستوورەکەیە کەمتر وەتەنگ بێت لە پووچانەوەی دەستوورەکەی لەچاو مرید و دەروێش و پیڕەویکەرەکانی. وابوە شەخسێک بە پیرۆز و موقەدەس زانراوە، دوایی هەرچی هۆی تەقدیس و پیرۆزی هەیە لێی تەکاوەتەوە، تەنانەت خۆشی وازی لە داوا کردنی پیرۆزی هێناوە، بەڵام مریدەکانی دڕتر و شێرگیرەتر (شێتگیرەتر) بوون لەسەر تەقدیس کردنی، تاکە یەک کێشانە و پێوانەی قاڵب گرتووش نیە بتوانێ

بەڕاستی تەفسیری ئەم دیاردەیە بکات لەبەر تیشکی بیروڕای کێشانە و پێوانەکە خۆیدا. هەندێ جار بیروڕای قاڵب بەستوو کولانە دەخاتە دیواری قەپێلکەکەی خۆیەوە و تیشکێک لە دەرەوە دەهێنێتە ناو تاریکایی دەروونیەوە و ئەمەش بە بەڵگەی نیگافرەوانی و واقیعشناسیی خۆی دادەنێت، کەچی ڕاستی مەسەلەکە پێچەوانەی ئەم نیگافرەوانی و واقیع شناسییە ئیسپات دەکات چونکە فکرە قاڵب بەستووەکە لە پێشەوە هەرگیز نەیدەسەلماند هیچ ڕووناکییەک لە دەرەوەی زیندانە فکریەکەی خۆی هەیە، هەر کەسێکیش شتی وەهای گوتبا ڕیسوای دەکرد و لە ناوی دەبرد: کەواتە دانهێنانی فکری قاڵب بەستوو بە بوونی ڕووناکییەک لە سەرچاوەیێکی غەیری خۆیدا جۆرێکی بەحورمەتە لە ئیعلانی ئیفلاس، بەڵام پسپۆڕ و وەستای شارەزا ئیفلاسەکە دەخەنە شێوەیێکی ئەوتۆ ئابڕوو بپارێزێت. هەندێ جارانیش سەرەڕای ئابڕوپاراستن بە هۆی چاوبەستەکێی زیرەکانەوە دەعیە و دەماغێکی نوێش بۆ فکرە ئیفلاس کردوەکە پەیدا دەکەن و پتریش سەجدە بە مریدەکانی دەبەن. بە نموونە دەڵێم لەوانەیە بیروباوەڕێک لە مەیدانی فیزیادا ئیعلان بکا هەر کەسێک بڵێ فڕین بۆ غەیری مەل مومکینە ئەو کەسە گومڕا و شێتوویێتە، دواتر کە فڕین بۆ بە باو هەڵستێت و بڵێت: من ئەوەندە نیگافرەوانم و بەڕادەیێک فکری پێشڕۆم، هاتم بە هۆی هێزە پێشکەوتوەکانمەوە هەموو چەرخ و مەنگەنەی زانستم خستە گەڕ و موستەحیلبوونی فڕینم بەدرۆ خستەوە. ڕەنگە جاری واش هەبێ فکرە قاڵب بەستوەکە هەر ئەوەندە ڕازی نەبێ ئیفلاسی خۆی بە ئابڕوو بگۆڕێتەوە، بەڵکوو بەر ببێتە گیانی هەموو ئەو بیروباوەڕە ڕووناکانەی کە ئیمانیان هەبوو بە «فڕین» و لە پێناویدا گیانبازییان دەکرد، پێیان بڵێ ئەم ساختەچییانە بە درۆ و دەلەسە ڕایاندەنواند خەریکی پێشخستنی پرۆژەی فڕینن چونکە ئەوان بەپێی سروشتی دواکەوتوو و بەرەوپاش چوویانەوە ناتوانن هەنگاو بۆ کەعبەی «فڕین» هەڵێنن کە ئامانجی هەرەبەرزی سروشتناسە پێشڕۆیەکانە. هەر لەگەڵ ئەم قسەیەشیدا، بێگومان، هەموو شاگردەکانی بەیەک دەنگ دەڵێن: سەدەق، دەقاودەق....

ئەوەی لێرەدا دەیڵێم ڕاستییێکی بێفێڵە، نموونەی ڕاستبوونیشی هەموو ڕۆژێک بەدیار دەکەوێت وەک ئەوەی کە باوەڕێک هەیە لە کۆندا هەرکەسێکی بیگوتبا ئەرز بە دەوری ڕۆژەوە دەخولێتەوە دەیسووتاند، دواتریش خۆی کرد بە پیرۆزباییکەری

ئاسمانگەردی و ناونیشانی خۆی بە دیاری نارد بۆ مانگ، وەیاخود ئەو باوەڕەی کە زانستی سایکۆلۆجی بە درۆ و دەلەسە و بیری ڕەجعی دادەنا و ئێستاش وا خەریکە باوەشی پێدا دەگرێت و بۆخۆی دەدزێتەوە. نووسینی نوێم زۆر دیوە لە و بابەتە کەوا بەهەڵمەت بردن بۆ سەر غەیری خۆی پاشەکشە دەکا لە هەڵوێستی دوێنێ و پێرێی... دەمێکە گەیشتوومەتە قەناعەتی تەواو بە ڕەوانەبوونی ئەم ڕەوشتەی ئینکار کردنی ڕاستی و چاونووقاندن لە واقیع لەبەر خاتری بیروباوەڕ. فکر ئەگەر خۆی تەسک نەکاتەوە دەتوانێ لە یەکەم ترووکەی دۆزینەوەی ڕاستییەوە باوەشی پێدا بگرێت و خۆی بەو بگۆڕێتەوە بێ ئەوە شەرم و نەوێران دایبگرێت و بیخاتە سەر باری فێڵ لەخۆ و لە عالەم کردن.

چەند ئاسانە بەلای نیگای فرەوانەوە، ڕاستی تازە دۆزراوە بکاتە باوەڕی خۆی.

ئەم ڕێبازەی سەلماندنی ڕاستی باشترین و سەلامەتتریین و جوانمەردترین ڕێبازێکە ڕۆشنبیر لێیەوە بڕوا بەرەو ئامانج، لە هەموو مەیدانەکانی ڕۆشنبیرییدا.

کە بێێن باسی حاجی قادر بکەینە نموونەی تەطبیقی ئەم دەستوورەی سەلماندنی ڕاستی، دەبێ مل کەچ کەین بۆ هەر واقیع و ڕووداوێک کە لە ژیان و ڕەوشت و خەبات و ئەدەب و هەمووشتێکی حاجی دەردەکەون بێ ئەوە مەیلی خۆمان تێکەڵ بە تۆژینەوە بکەین. بەلای خۆمەوە لە یەکەم پیتی سەرەتای ئەم نووسینەوە ڕاستی و واقیعم کردوە بە کەعبەی ئامانج و شوێن پێم هەڵگرتۆتەوە بۆ هەر کوێیەک و بەرەو هەر شتێک بچێ، لەم کارەشدا چی بنگەی لێکدانەوەی کە لەبەر دەست و لە دەسەڵاتمدا بووبێت ئەوەم کردوە بە ئیستگە و سەرشاری سەرەتاتکەکانم کە دیارە لەوە پترم لێ داوا ناکرێ، لێشم داوا بکرێ لە ئیمکاندا نیە چونکە دەبێتە «تکليف بما لا يطاق». لەگەڵ ئەمەشدا کە بێین و کەم بوون وەیا نەبوونی سەرچاوەی مەعلوومات لەبارەی حاجییەوە بێنینە حیسابەوە، ئەو بنگانەی لە بەشی یەکەم و دوەم و ئەم بەشەی سێیەمدا کە بە هۆی لێکدانەوە و شت بەیەکتر گرتن و هەڵێنجانی فکری و ژیربێژییەوە دروست کراون، بنگەی کەم نین، دروست کردنیشیان ئاسان نیە. خوێنەری کورد لێم بسەلمێنێ کە دەڵێم لەو کاتە بە وەخت و بێ وەختەی شەو و ڕۆژاندا کە دەستەچیلەم لە گەرمایی خوێن و فرکەی دەمار و تروسکەی هۆش و بڵێسەی سۆزم دەسازاند بۆ ڕووناک کردنەوەی ئەو هەموو گۆشە تاریک و نووتەکانەی سەر بە باسی حاجی قادر کە لە هیچ لایێکەوە بایی

کونی دەرزی ڕووناکاییان بۆ نایەت[74]، حیسابی هیچ کۆمە کردن و بەرژەوەندێک لە کاسەی ئیعتیبارمدا نەبوە جگە لە تاکە حیسابی دۆزینەوە و دەربڕینی ڕاستیی.

من کە بۆ ماوەی دورودرێژ لەگەڵ حاجی و زەرفە بزرەکانی ژیانیدا بژیم و گوێ بەسەر نەبز و هەناسەیدا بگرم و بەناو تیشک و گەرمایی قسەکانیدا بەرەو دەروونی بڕۆم و لەو دەروونەدا نەفسێکی زل و لەخۆ ڕازی و بەخۆ نازی و خورت و سەرکەش بدۆزمەوە کە خۆی لە دەوروبەر بە گەورەتر بزانێ و بەسەر حوکمی داخوازیی ڕۆژگاردا زاڵ بێ و بڕیاری ئەو نەزەرییانە بپووچێنێتەوە کە حەز بە بێدەسەڵاتی مرۆڤ لە ئاست واقیعدا دەکەن... من کە ئەم ڕاستییە بدۆزمەوە خۆشم لە نەوازشی موجامەلە ڕزگار کردبێت، چۆن لەگەڵ بەرزبوونەوەی ئەودا خامەی خۆم ژووررووی چاڵ و چۆڵی خاترانەی کورتبینی نەزەرییان ناخەمەوە بەرەو «شەرەفستان»ی واقیعی ڕاستەقینەی بەر تیشکی نیوەڕۆ؟ کێ بێ لە قووڵایی دڵە زیندوە هەستیارەکەیدا حەز نەکا سەربازێکی گەردن کێلی قافڵەی بەرەو پێشچوون بێ و سڵ نەکاتەوە لەو سێبەرانەی تیشکی دەسکرد و بەهەڵەبەری ڕێگران تێکیان داوێن لە نێوان قاچوقول و هەنگاوەکانی قافڵەکە و بە دەوروبەری شەقامی ڕەوتیدا؟ چەند خۆشە ئەو کاتەی مرۆڤ هەست دەکا لە کردەوە و گوتەیدا بەسەر کوردەغیرەتی ئاست باوەڕی چەوتی ڕێزلێگیراودا زاڵ بوە؟ چ شیرینە چەژی هەڵوەستێک کە تەڵەکەبازی و گێل کردن و سەرلێشیواندن و هەڵمەتەکاسەیی لێی وەتەنگ دێن؟ بەڕاست تۆ بڵێی لە مەیدانی ڕۆشنبیری و مەڵبەندی دۆزینەوەی فکریدا هیچ مەوقیفێک هەبێ شاگەشکەدارتر لە پەلەفڕە و ڕوحپەرەیی ئەو دەمە پیرۆزەی ڕاستییێکی شرایەوەی تێدا هەڵدێنێت لە ناو شەوەزەنگی باوەڕی درۆزنی بەبرەودا؟ کۆپەرنیکۆس بێنەوە بەر یادی خۆت کە «زەوی» لە بەندیخانەی فکری کۆن دەردێنێت و بەدەوری ڕۆژدا دەیخولێنێتەوە! کۆلومبۆس لە ڕۆژاواوە بەرەو ڕۆژهەڵات تێ دەنیشێت! مادام ڕۆڵان بەدەنگ بێنەوە لە گوتە یەکجار مەشوورەکەی ڕووبەڕووی فکرەی «ئازادیی»دا! پێم بڵێ نووسەرێکی کوردی

---

[74] وەک دۆزینەوەی ساڵی لەدایک بوونی، دەرخستنی دەوری شاری کۆیێ لەپێگەیاندنی پیاوی وەک حاجی، دۆزینەوەی ساڵی چوونی بۆ باڵەک، ماوەی مانەوەی لە فەقێیەتی، مانەوەی دواتری لە کۆیێ...

بێسامانی کەمدەسەڵات کە ناتوانێ چەنگەوبازی باسەکانی جیهانی ببێت و لە چارچێوەی خانە وێرانە تەسک و تاریکەکەی خۆی دەرچێت، چی لە بەردەستەدا هەیە شانازی پێوە بکات لە دروستبینی و ڕاستبێژی بەولاوە؟ کە هات و ئەو هێندە هۆیەی کەیف بەخۆ هاتنیشی کردە قوربانی بڕیارە فەلسەفیەکانی حازربەدەست و خۆسەپێن، دەبێ دڵی خۆی تەسکین کات بەو جۆرە شانازییەی کە جاران عەبدە وەفادارەکان سەری خۆیان پێ بەرز دەکردەوە لە کاتی پابۆسی خاوەنە شەرعییەکانیاندا! من بێم حاجیی قادر لە تۆقەڵەی شەرافەتی گەردەن فیرازی خۆیەوە بێنمە بەر پێڵاوی ئەو براگەورانەی کە خۆی لەوان بە پشتەوە دەگرت، لەبەر خاتری ڕەشایی چاوی ئەو تصورانەی کە شەیدای کڕنوو بردنی «تاک» ن بۆ شکۆی «واقیع» دەبمە جەلادێکی بەکرێگیراو بۆ پەڕاندنی سەری قارەمانێک، کە ئەمەشم کرد لەگەڵ حاجی قادردا دەبێ ئابڕووی هەموو ئەو ئابڕوودارانەش ببەم کە بە پێوانە و کێشانەی دڵگەرمێکی ئەمڕۆ، لەبەر تیشکی نیگالێڵەکەیدا، نابێ ئابڕوویان هەبووبێ! لەوەندەش نەوەستم: هەرچی مێژوو هەیە سەرەوبنی بکەم بۆ بەر حوکمی ئەو تصورانەی کە گەردەنی حاجی قادریان پێ پەڕاندم و ئابڕووی ئابڕوودارانیان پێ تکاندم! نەخێر ئەمە ناکەم!!!

ئابڕووی حاجی قادرێک نابەم کە ئابڕووی هاوچەرخی خۆی کڕیوەتەوە بەوەدا یەکە و تەنها لە جیاتی ئەوانیش پێکۆڵی لە واقیع کردوە، سەری بۆ دانەنواندوە!

من لەگەڵ حاجی قادرێکی ڕاست و دروستدا خەریکم، تارماییەکەی بەناو واقیعێکی بێفێڵدا دەگێڕم. گوتە و کردەی لێ هەڵدەگرمەوە بێ دەسکاری: هەر شەوقێکێش لە باسی ئەوەوە بەملاو بەولادا پژا تێیرا دەڕۆم تا ئەو مەودایەی پێی ڕووناک بۆتەوە. ئەگەر هێزی هەست و پێزانینم یارمەتیم بدات دەلالەتی گوتە و کردەوەکانی دەکەم بەو تیشکەی کە مرۆڤ و واقیع و ڕووداوی ڕۆژگاری ئەوی پێبناسرێتەوە، لەو ڕەوەوە کە حاجی لێی دەوەشێتەوە بە نموونەی ڕاستگۆیی و ڕاستڕۆیی ئەو سەردەمە حیساب بکرێ و هەڵوەستەکانی بەرانبەر کەسان و ڕووداوانی ڕۆژگاری خۆی بە شایەدی ڕەوا و باوەڕپێکراو وەربگیرێن و دەجاران پتر تەرجیح بدرێن بەسەر لێکدانەوەی لایەنگیرانەی وەیا نەشارەزایانەی نووسەرێکی ئەم ڕۆژگارەدا کە دەزانین نەشارەزایی و لایەنگیریی بە بەریانەوە هەیە نەک تەنها لە ئاست دوێنێ هەڵەی سەرشێوێن بکەن، بەڵکوو ڕووداوەکانی سەردەمی خۆیان بە جۆرێک بگرنە ژێر تیر و

شیری لایەنگیری و نەشارەزاییەوە کە ئیتر بە کەس نەناسرێنەوە، ئەو ڕووناکییەی کە لێشیانەوە هەڵدەستێتەوە یا هەر بەجارێ لە شەوەزەنگی دووکەڵی هەڵەکان تێبڕ نەکات یا ئەگەر تروسکەیێکیشی لێ بینرا بیروڕای سافیلکان بەرەو هەڵدێر و تەلانی ئەوتۆدا ببات کە هەزار سەرمەقولاتەی تێدا لێ بدات وەک ئەو نووسینە ڕێزلێگیراوەی کە دەڵێ بۆرجوازیەتی بەغدا نەی دەهێشت «دەروێش عەبدوڵا» کەی ناو هەڵبەستی «گۆران» لە ساڵی 1930 بگاتە ئیستگەی ڕادیۆی بەغدا و هونەری نەیژەنیی خۆی بە مەردم ڕابگەیەنێ، لە حاڵێکدا زۆرینەمان دەزانین چەندین ساڵ پاش 1930 ئیستگەی بەغدا دامەزرا، بەمەشدا ڕوون دەبێتەوە بە زۆرەملێ و لە ڕێی لایەنگیری و نەشارەزاییەوە نەبێ ناشێ گوناهی نەگەیشتنی دەروێش عەبدوڵاش بخرێتەوە سەر گوناهەکانی تری بۆرجوزایەتی بەغدای ساڵی 1930.

ئەم تەرزە نووسینە، ناچارە دەبێ جارێکی تریش چاو لەو ڕاستییە بنووقێنێ کە هەمان بۆرجوازیەتە بە زۆر تاوانبارکراوی مەسەلەی دەروێش عەبدووڵڵا هەر خۆی بوو ڕێی بە گۆرانیبێژی نەمری کورد «کاوێس ئاغا» دا کە لاوکی شۆڕشی شێخ مەحموودی دژی ئینگلیز لە کۆمپانیاکانی بەغدادا بکاتە قەوان و بە هەموو وڵاتدا بڵاوبێتەوە. تۆ بڵێی نووسەرەکە لە هیچ پەنا و پەسێوی فکر و فەلسەفەیدا کەلێن و دەرفەتێکی ئەوتۆی چەنگ نەکەی کە لێیەوە بەرەو حەسانەوەیێکی فکری بڕوات بەوەدا لایەنی لە ناوبردنی شۆرشی شێخ مەحموود جودا کاتەوە لەو لایەنەی ڕێی دا بە پڕ کردنەوەی قەوانی کاویس ئاغا کە هەر خۆی بوو گوناهی مەسەلەکەی دەروێش عەبدووڵڵای نەکردبوو؟ ئەگەر ئەم دەرفەت و کەلێنە لە بیروباوەڕەکەیدا پەیدا نەبێ، بێگومان بە درێژایی عومری نووسینی خۆی ئەم خانەبگیرییە بە مێژوو دەکات.

من چەندێکی نارەوایی و ناشیرینی گۆڕینی ڕووداو و مێژوو دەبینم، جار لە جار پتر بێزم لەو کارە دەبێتەوە و دەم بە دەم زیاتر خۆم دەلکێنم بەو شتەی بە ڕاستی دەزانم، هەتا لەو مەیدانەشدا تەجربەم دەوڵەمەنتر دەبێ بێباکتر دەبم لە ئاست توانجی نەشارەزا و کەم ئینسافان. هەرچەند فێڵ لە خۆم ناکەم بەوەدا کە ئومێدی ساختە و مەوهوم بەرەو ئەو قەناعەتە وشک و برینگەمەوە ببات کە گۆیا نووسینی ڕاست و بێلایەنگیریی بتوانێ پێشی لافاوی دەسکاری و سەرڕۆیی و درشتبینی و

هەڵبەستنی وەک حیکایەتەکەی دەروێش عەبدوڵلا بگرێت، کە دەزانم صەدان دەست و قەڵەم ئامادەن پشتگیریی لێ بکەن ڕەنگە یەک خامەش نەبێ وەیا نەوێرێ ئافەرین بکا لە بەدرۆخستنەوەی، لەگەڵ ئەمەشدا نەک تەنها هەر بەردەوامبوون لەسەر ڕێبازی ڕاستی و ئینساف بە فەرمانی ئەخلاق دەزانم، بەولای بەردەوامبوونەکە، بەدەست خۆم نیە، جار لە جار پتر هەستی شەرم کردن و بەخۆدا شکانەوە دەمگرێ لە جیاتی ئەو کەسانەی شەرم نایانگرێ لە هەڵبەستندا، وەیا ڕێی بەخۆدا شکانەوەیان نیە لەو شتانەدا کە بەناچاری هەڵیان دەبەستن. ئەم هەستی بەخۆدا شکانەوەی لە جیاتی غەیر تووشی هەمووومان بوە و خەجاڵەتیمان تێدا کێشاوە. وەک بڵێی لاشعوورمان خۆمانی لە جێگەی ئەو غەیرەدا داناوە و ختوکەی هەستی کەمایەتی و پەستی بە لەشماندا هێناوە. وابوە ئەوانەی لە مەحکەمەدا دەبینن شایەدی درۆزن قورئان دەخوات بۆ سوودێک وەیا شتێکی کەم، ئارەقی شەرمەزارییان لێ دەتکێت هەرچەندە شایەدەکە بە هۆی ڕاهاتن لەو کارەدا هەستی عەیبەشی سوا بێت.

من وەیا یەکێکی تری وەک من کە لە دادگەی مێژوودا نووسەری شت هەڵبەستوو بە شایەد دەبینین، پتر لە دانیشتوانی دادگەی ڕەسمی مافی بەخۆداشکانەوەمان هەیە، پتریش لەوان پەرۆشی لەدەست چوونی ڕاستی بێ ئۆقرەمان دەکات چونکە شایەدی هەڵبەستراو لە دادگەی مێژوودا قودسیەتێکی گەورەتر و گرنگتر دەشکێنێ لە قودسیەتی پارەی دەعواکەی دادگەی ڕەسمی، زیانیش بە ملوێنەهای ئادەمیزاد دەگەیەنێ نەک بە چەند کەسێکی خەسارەکردووی دەعوای «صلح».

ئەم سۆز و پەرۆشەی من لە خەڵەت و پەڵەتەکەی ناو باسی دەروێش عەبدولڵادا بۆ خۆم و بۆ خۆت و هەموو ئادەمیزادە لە هەموو جێگە و کاتێکدا نەک بۆ بۆرجوازیەتی بەغدای 1930 کە ئەوەندە خوێڕوو بوو لەسەر خۆیشی نەدەکردەوە، ئەوەندەش ترسنۆک بوو ڕۆژنامەیێکی نەبوو قسەی باشی بۆ بکات... لەسەرخۆ کردنەوەی چی و ڕۆژنامەی چی لە حاڵێکدا ئەو جارێ هەستی بە چینایەتی خۆی نەکردبوو و چ دەستێکی نەبوو لە سیاسەتی دەوڵەت: گەورەترین سەرمایەداری عیراق بایی نیوەی یەک نائیبی «معارض» سەنگی نەبوو. سەرمایەداری عیراق ئەو بێناوک و ناوەڕۆکە بوو کە لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا بەقەدەر دەیێکی جێگایەکی وەک ئیسپانیای سەدەی پازدەم چالاک و ئازا نەبوو تا ئەگەر ئەو لەو

سەردەمانەدا کریستۆف کۆلۆمبی بەرەو ڕۆژئاوای ئەتلانتیکی ترسێنەر هەنارد سەرمایەی عیراقیش لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا پشکنەریکی ئابووریی هەناردبا بناری پیرەمەگروون و قەندیل نالێم تۆقەسەریان!

سەرمایەداری عیراق بەداخەوە، شەپرەلێداویک بوو کە نەیتوانی چ دەوریکی ئەوتۆی هەبێ لە بەرەوپێش بردنی شارستانیەتیدا، بە هەموو عومری عیراقی پێش شۆرشی 1958 سەرمایەدار بە بەرتیلدان دەگەیشتە خزمەت کاربەدەستێکی میری... زەندەقی لە پۆلیس دەچوو..

بێگومان بۆرجوازیەتی عیراقی پێش 1958 بە قەدەر شۆڕشگێڕ لە حکومەت دەترسا بەقەدەر حکومەتیش لە شۆڕشگێڕ دەترسا: چەند غەڵەتە بگوترێ ئەم بۆرجوازیەتە ترسنۆکە بێناوکە وێراوەتی بەرهەڵستی لە دەروێش عەبدوڵا بکات لە گەیشتن بە ئیستگەی ڕادیۆ، کە دەزانین جارێ ئیستگەی ڕادیۆش نەبوو، چونکە لە چاوسوور کردنەوەییکی کارگێڕی گشتیی ڕادیۆ زراوی هەرچی سەرمایەداری گەورە هەبوو دەڕژا... لە پۆلیسی بەر دەرگاکەی دەترسا. مێچکە مێچکەی لەبەر فەڕاشەکەی دەکرد... بەڕاستی شەرەفێکی زۆر گەورەی بێ بنج و بناوان بە بۆرجوازیەتی عیراقی 1930 دەبەخشرێ بەوەدا کە بگوترێ ئەو دەیتوانی دەروێش عەبدوڵا لە ئیزاعە بگێڕیتەوە..

بەڵێ بێگومان من مەبەستم لەسەر کردنەوەی بۆرجوازیەتی بێجورئەتی عیراق نیە لە ڕاست کردنەوەی هەڵەی دەروێش عەبدوڵادا، بە پێچەوانەوە من دەمەوێ لەسەر خۆم و خۆت و دەروێش عەبدوڵاش بکەمەوە چونکە دەزانم ڕەوا دیتنی خێرا کردنی هەشت نۆ ساڵە لە دروست کردنی ئیستگەی بێتەلی بەغدا بە نیازی تاوانبار کردنی سەرمایەداری لە ئاست دەروێش عەبدوڵا و کورددا، دەرگەی ڕەوای دیتنی هەموو نیازێکی پێچەوانەش دەکاتەوە لە هەموو جێگە و کاتێکدا، هەر جارەش لەژێر ناونیشانێک و بەهۆی جۆرێک لە جۆرە بێ ئەژمارەکانی تەڵەکەبازییەوە.

هیچ دوور نابینم هەندێک لە خوێنەرەوەی ئەم گوتانە خۆیان بەر قەمچی و دەمەتیغی تاوانی درۆزن و هەڵبەستراو کەوتبن لەلایەن ئەوانەی ناوچەوانیان دڵۆپە ئارەقی خەجاڵەتی پێدا نایەتە خوارەوە.

هەمان ڕقبوونەوەم لەشت هەڵبەستن و بێباکیم لە ئاست توانجی بێئینسافدا وای کرد خۆش ئامەدی بکەم لە نووسینێک کە بیرو ڕایەکانی ناو بەرگی یەکەمی «حاجی قادری کۆیی» بە میتافیزیکی دانابوو.

جارێ با لە پێشەوە ئەوە بڵێم وەصفی میتافیزیکیەتی ئەو پیاوتۆقێنە نیە کە وەها بە ڕاشکاوی لە مرۆڤ ببێتە عەیب، خۆدانەپاڵ ماددییەتیش ئەو شەهادە سەلمێنراوە نیە کە هەموو نیوە خوێندوانیش بە «علامة الدهر» لە قەڵەم بدات. زۆر پیاوی باوەڕ هێناو بە میتافیزیک ئەوەندەی شەرەف لێ دەتکێ بەشی عەشیرەتێک دەکات، هێندەش زانایە پەنجا شاگردی ماددەپەرستی هەیە. میتافیزیکیەت لە هەموو مێژووی ئادەمیزاددا ئەوەندە بە فڕکە بوە بە زۆری فڕکەی شادەماری ماددییەتی لە نەزەر خۆیدا کز کردۆتەوە. «جان دارک» هێندە میتافیزیکی بوە هەر دەڵێی «رابعة العدوية»یە، هەموو کردە و گوتەیشی دەنگدانەوەی ئەو سروشانە بوە کە دەیبیستن و تێیان دەگەییشت لە تەطبیقیشدا ڕاست دەردەچوون پتر لەوەی پێشبینی ماددییەکان ڕاست دەردەچێ. چیرۆکی شانۆگەریی Saint Joan ی برناردشۆ بخوێنەوە و لەو میتافیزیکیەتە بگە. «جان دارکی» قوتابخانەی میتافزیک پێشڕۆی گەلی فڕەنسە بوو نەک زانایێکی ماددی وەیا زەعیمێکی جووڵانەوەی سیاسی دنیادۆست.. حاجی قادر ئەوەندە میتافیزیکی و سەر بە خوا و غەیب و کەرامەتە ئەگەر لە میتافیزیکیەتەدا پارسەنگی نیگای زانستپەروەری لەنگەری بۆ ڕانەگرتبا خێرا بە خێرا دەبوە یەک لەو دەروێشانەی زەرگوەشێنی دەکەن بۆ غەیب. با لە نموونەی گیانلەبەر وازبێنین و یەخەی زانستی ڕووتی بێ پەردە و پەنا بگرین. لەم سەردەمەدا زانست ئەوەندە مەیدانی بێئەژماری هەمە چەشنەی بێسنووری لە جیهاندا دۆزیوەتەوە ناچار بوە چاویلکەی فەلسەفە و فکری ڕووتی خواستۆتەوە بۆ تێوەڕامانیان چونکە چاو و چاویلکەی موختەبەر و تەطبیق پێیان ڕاناگات و ڕەنگە تێشیان نەگات کەچی پێش حەفتا ساڵێک ئەویش وەک فکری ماددی سادە دانی بە فەلسەفەدا نەدەهێنا. هەرچی بەر تاقی کردنەوەی موختەبەریش نەکەوتبا حیسابێکی بۆ نەدەکرد. گەلێک لەو دۆزراوانەوەی چەند ساڵی دوایی، لە ساڵانی سەرەتای 1900 دا بە وڕێنە و خەونی میتافیزیکی دادەنران... لە مەیدانی سیاسەتیشدا زۆر لە هەڵوەستەکانی بەرەی شۆڕشگێڕی ئەم سەردەمە بە کێشانە و پێوانەی شۆڕشگێڕی پەنجا ساڵ پێش ئەمڕۆ بە خیانەتی ڕووت لە قەڵەم دەدران.

هەزاران نموونەی ژیانی ڕۆژانەمان لە هەموو مەیدانێکی مرۆڤدا ئەوەمان بۆ ئیسپات دەکات کە جیهان «یا ڕەش یا سپی» نیە، لە نێوان ڕەش و سپیدا هەزاران ڕەنگی تر هەیە کە ئەگەر چاو نەیدیت دەبێ بە مفهومی ماددی تەسک پێی بگوترێ «میتافیزیکی» هەرچەند خاوەنەکەشی لە یەک دەقیقەدا دە کوفران بکا بۆ ئیسپاتی ماددیبوونی خۆی. چ دەمەتەقە لە وەدا نابێ هەبێ کە مرۆڤی «ماددی» سادە وەک مرۆڤی «میتافیزیکی» سادەیە، هیچ کامێکیان لە بیروڕا و فەلسەفەکەیان ناگەن هەر وەک سەعات لە گەڕان و کات ژماردنی خۆی ناگات. لە لایێکی تریشەوە ئەو فەرق نەبوونەی نێوان مرۆڤی ماددیی سادە و میتافیزیکی سادە دەیان گەیەنێتەوە یەکتر کە هەردووکیان باوەڕەکەیان دەپەرستن، تەنانەت دەشێ بیروڕایان بەیەکتر بگۆڕنەوە و هیچ نوختەیێکیش لە ئاکار و ڕەفتاریان نەگۆڕێت. بەشێکی زۆری گەنجی هەرزەکار لە ماوەی ساڵێکدا، وەیا کەمتریش لە ساڵێک، لەمپەڕی ئیلحادەوە باز داوێن بۆ ئەوپەڕی دینداری، بە پێچەوانەش... هەڵبەت من ناڵێم ڕێبازی ماددی و میتافیزیکی لە بنەڕەتدا یەک دەگرنەوە کە دەزانم لە بنەڕەتدا و لە سەرەتای پەیدابوونیانەوە دژی یەکترن، ئەوەی دەمەوێ لێرەدا بیڵێم شتێکە هەر بایی ئەوە دەبێ کە ببێتە وەرامێکی کورتیلەی ئەو قسەیەی زۆر سافیلکانە بەڕایەکانی من دەڵێ میتافیزیکی، لەوەشدا چەند وشەیێک لە فەرهەنگی بێپایانی «مادە و میتافیزیک» دەردێنم و بەس:

1) گەلێک لەو دیاردانەی وەیا بۆچوونانەی جاران لە بەرچاوی زانستی ماددی تازە گەشەسەندوودا میتافیزیکی دادەندران، دەرکەوت لە بنەڕەتدا و لە ڕاستییدا ماددین بەڵام ماددیبوونەکەیان ئەو جۆرە نیە کە لە موختەبەردا هەستی پێ بکرێ.
2) ئینکار کردنی زۆر شتی بە ڕواڵەت میتافیزیکیی لەلایەن زانای ماددییەوە دەگەڕێتەوە بۆ کەم مەعلووماتی زاناکە، هەروەک گێڕانەوەی گەلێک دیاردەی سروشت بۆ سەرچاوەیێکی ماددی ئاشکرا ئەویش لە نەزانینەوە بوە چونکە سەرچاوەکەی شتێکی ماددی یەکجار بزرتر و دوورەدەسترە لەو سەرچاوە دەست هەڵێنجەی کە زانستی ناکامڵ پێی دەگات.
3) دەردەکەوێ، لە ئاکامی پێشکەوتنی زانست، ڕاستییە یەکجار قووڵەکانی ماددی لەچاو بیروباوەڕە سەراوەکانی زانستی سەدەی نۆزدەهەم و

سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا، وەها لە تاریکی و نەزانراوییدا ڕۆچوون هەر دەڵێی سەر بە غەیبەوە دەنێن. لەو شتانەی پێیان دەڵێن Black Holes – کونەڕەشەکان مەودا و کات نامێنن و خێرایی بزووتنەوە لە خێرایی ڕووناکی تێدەپەڕێت کە ئەمە قسەیێکە لە هی محی الدین العربی و شەمی تەبریزی دەچێت... چەند سەیرە ئەو قسەیەی دەڵێ لەو شوێنانەدا هەموو زەوی بەقەدەر یەک تۆپی بلیاردی لێ دێتەوە...!

قسەی «محي الدين العربي» شتێکی وەهای باس کردوە لەوەدا کە گوتوەتی «ارض السمسمة» چەند جاران ئەوەندەی هەموو ئەرز گەورەیە... دەبینی ئەو تۆقینەی جاران پیاوی ماددی دەتۆقی لەو شتانەی خزمی غەیبن، وردەوردە دەبێتە تۆقینێکی وەک ترسی ئەو دەروێشەی پێی گوترابا شێخەکەی ئاگای لە غەیب نیە.

4) ساڵەو ساڵ و جیلاو جیل ئاشکراتر و ڕوونتر دەبێتەوە، هیچ یەکێک لەو نەزەریانەی خەریکی تەعلیلی سروشت وەیا کۆمەڵایەتی وەیا زاتی مرۆڤ بوون بایی جوزئێکی کەمی کارەکەی خۆیان ناکەن چونکە کارەکە یەکجار یەکجار یەکجار پان و قووڵ و مەتەڵاوتێرە لەوەندەی هاتبوە بەر نیگای خاوەن نەزەریەکەوە. هەر ئەم کورت هێنانەی نەزەریەکانیشە وا لە مریدەکانیان دەکات بەگژ دار و بەردا بچن کە دەبیەن یەکێک دەوێرێ بڵێ نەزەریە کورتی هێنا وەیا غەڵەتی کرد. صۆفی چەند دادەچڵەکێ کە بیستی یەکێک بڵێ شێخەکەی هەموو شتان نازانێ، مریدی نەزەریەی ماددیش وەک ئەو زەرگ وەشێنی دەکات لە حاڵی وەک ئەودا، هەر هێندە فەرقە لە بەینیاندایە کە صوفیەکە توهمەی کافربوون لە خەڵق دەگرێ مریدە ماددیەکەش توهمەی خیانەت و ڕەجعیەت!

ئەگەر بمانەوێ دەتوانین تەواوێک بەدوا پووچانەوەی توهمەی «میتافیزیکیەتی» بکەوین، تەواوێکیش لە بە خۆنازینی «ماددیەتی» سافیلکە داشکێنین و یەک بستیش لە ڕاستی و ئینساف و سوودی ئادەمیزادە و چینی هەژارانیش لامان نەدابێ لەگەڵ ئەم تێبینیانەشدا کە بگەڕێیتەوە بۆ بەشی یەکەمی نووسینەکەی من لە

کتێبی «حاجی قادری کۆیی» گەلێک لێکدانەوەی ماددی تێدا دەخوێنێتەوە کە ئەگەر چیتر بەرەو ماددیەت ڕۆییشتبان دەبوونە ئەفسانە. یەکێک لەو بیروڕایە ماددی و بنجییانەی کە لە پێش من چ نووسەرێکی تر بۆی نەچووبوو ئەو ڕایەم بوو کە دەڵێ هۆی پەیدا نەبوونی دەوڵەتێکی کوردی لە مێژوودا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو دیاردەیەی کە ناوم نابوو «نزیف اقتصادی». پێم بڵێ کام بیروباوەڕی ژێر و بێ هەڵپە لەم بۆچوونەی من ماددیترە؟ نووسەرێک نەختێک پەرۆشی ڕاستی و سوودی ئادەمیزادی هەبێ، ئەم ڕایە دەهاوێتە بەر حوکمی زانست و ڕووداو و حاڵ وەزع و جوغرافیە و مێژوو و هەموو ئەو شتانەی کە ڕاستبوون و هەڵەبوونی بیر و باوەڕانیان پێ تاقی دەکرێتەوە، نەک لەو پەڕی لایەنگری و تەسکپێوی خۆیەوە بێ وردبوونەوە بڵێ ئەمە میتافیزیکییە.

سەرلەبەری نووسینەکەی ناو بەرگی یەکەمی «حاجی قادر...» بخوێنیتەوە دەبینی هەمان نۆڕینی ماددی و واقیعی کردۆتە ڕابەر، چونکە بەپێی بینینی خۆم هۆی ماددیم هاتوونە بەر هەست لە لێکۆڵینەوەی ئەو شتانەدا کە لەوێ لێیان کۆڵراوەتەوە، خۆ ئەگەر دیتبام نوشتە و کشتەک وەیا جنۆکە و مێردەزمە هۆی ئەو شتانە بوون ئەوساش شەرم دای نەدەگرتم و باسم دەکردن، لە واقیعیشدا گەلێک جاران بیروڕای ئەفسانەیی بوونەتە هۆی ڕووداوی مێژوویی هەرچەند ناوەڕۆکی ئەفسانەکە لە خۆوە کاریان نەکردوە، بەڵام خەڵق باوەڕیان پێی کردوە و بە ناوی ئەوەوە و بۆ ئەویش جەنگاون. لەوانەیشە بەپێچەوانە، نەک ئەفسانەی درۆزن بەڵکوو مەبەستیکی ماددی درۆزن و خەیاڵی، خەلقی جووڵاندبێتەوە و ماڵ وێرانی کردبن. من کە بزووێنەری درۆزنم هاتە بەرچاو ئینکاری ناکەم چونکە درۆزنیەکە نابێتە مانیعی هەبوونی، لە بزووێنیەتیشی ناخات. بە من چی مفکری ماددی وەیا غەیبی کەیفی بەو بزووێنە درۆزنە نایەت. دەزانین دنیا زۆر مرۆڤی درۆزنی تێدایە نەک هەر بزووێنەر، خۆ نایەین ناوی درۆزنەکان لە دایەرەی نفوس بسڕینەوە. بەهەمەحاڵ نووسینەکەی بەرگی یەکەمی «حاجی قادر» چی لە واقیعدا هەبووبێ و کاریگەر بووبێ ئەوەی باس کردووە، قۆنتەراتی نەگرتبوو ئەو ڕاستییانەی نیوەخوێندەوار حەزیان لێ ناکەن چاویان لێ بپۆشێت وەیا لە ناویان ببات. ئا ئەمەش چەند نموونەیەیێکی شی کردنەوەی ماددی ناو نووسینەکەن کە بڕوا دەکەم هەموو نووسینەکە هەر لەو بابەتەیە:

1) دۆزینەوەی دیاردەی دەوڵەمەندی گیا و گوڵ و گوڵزار لە دیوانی «نالی»دا، کە بەڵگەیە بۆ پەروەردەبوونی نالی، بە منداڵی، لە لادێ و دەشتودەردا، نەبوونی ئەو دیاردەیەش لە دیوانی «حاجی قادر» دا کە ئەویش بەڵگەیە بۆ پەروەردەبوونی قۆناغی منداڵیەتی ئەو لە شاری «کۆیێ» نەک لە «گۆڕقەرەج».
2) دەرخستنی توانەوەی پێوەندی عەشیرەتایەتی لە وڵاتی کۆیێ لە ئەنجامی تەئسیرێکی کۆن و بەردەوامی بۆرجوازیەتی کۆیێ لە ژیانی دەشتودەری نێزیکی خۆی.
3) دابەشبوونی پتر لە % 75 ی زەوی و زاری وڵاتی کۆیێ بەسەر خوردە مالیک و فەلاحاندا، ئەویش بە هۆی پشتگیری کردنی هێزی بۆرجوازیەتی کۆیێ لە فەلاحی ئەو هەرێمە بەدرێژایی مێژوویەکی زۆر کۆن.
4) دەستنیشان کردنی ئەو هۆیە ماددییانەی کە لە کۆنەوە بڕیاری هەبوونی شارێکیان داوە لەو جێگەیەی کە شاری «کۆیە» ی لێ هەڵکەوتوە.
5) پەیوەستبوونی خوێندنی مەلا و فەقێی کورد لە چارچێوەی کوردستانی گەورەدا بە هۆی هەبوونی هەستێکی فیتری خۆ بە کوردزانینەوە.
6) تێخوێندنەوەی دەوری زەویوزارە میراتیەکانی بنەماڵەی «حاجی قادر» لە پتەو کردنی هەستی بە خۆناسینی «حاجی» لەو ڕووەوە کە قەمچی ئاغای بەسەر پشتی خۆیەوە نەدیتوە.

ئەمانە مشتێکن لە خەروارێک کە هەموویان لە جەرگەی واقیع و شی کردنەوەی ماددییەوە هەڵدەکوڵن، جا کە یەکێک بێت و بە سافیلکەیی ئەمانە بە لێکدانەوەی میتافیزیکی دابنێت، ئەو کەسە دوو جاران مێشکی خۆی لە بێنەوبەرە و گیروگرفت و گرێوگاڵی ئەم جیهانە مەتەڵاوییە حەساندۆتەوە: جارێکیان لەوەدا کە نازانێ «میتافیزیک» چیە، جارێکی تریش بەوەدا کە ماددییەتی بە میتافیزیک لە قەڵەم دا دیارە نازانێ ماددییەتیش چیە، ئەوساش دەکەوێتە ژێر سێبەری پڕ حەسانەوەی ئەو پەندە کوردییە زۆر مەشوورەی کە دەڵێ «نازانم ڕەحەتی گیانم».

لەو بەشە یەکەمەی کتێبی «حاجی قادر» کە پێی گوترا نووسینی میتافیزیکی، دەوری یەکجار گرنگی خوێندنی فەقێیانە لە پێکهێنانی پەیوەندی گشتی نێوان

ئەمسەرەوسەری کوردستانی گەورەدا دۆزراوەتەوە کە لە هیچ مەیدانێکی پێوەندی ماددی و ئابووری و نیشتیمانپەروەرایەتی و چینپەروەرایەتیدا بە درێژایی صەدان و هەزاران ساڵی مێژووی میللەتی کورد سێبەرێکی ئەو پێوەندییەش نەبوە: بەڵێ دەزانین خەڵق لەگەڵ یەکتردا مامڵەتیان دەکرد بەڵام نەک مامڵەتی نێوان سنە و دیاربەکر، فەلاح و کرێکاریش هەبوون بەڵام هی کۆیە ئاگای لە هی وان نەبوو، قسەشیان کوردی بوو بەڵام کابرایەکی هەولێری لەوانە بوو تا مردن یەکێکی سابڵاغی نەبینێت. ئالەم حاڵەتە بێ پەیوەندی ماددی گشتیدا فەقێیەکی سنەیی و دیاربەکری و یەکێکی کۆیی و هی وان و هەولێری و سابڵاغی لە سلێمانیدا یەکتریان دەگرتەوە و لە پێنجوین بەیەکەوەیان دەخوێند و بەرەو خانەقین دەڕۆشتن… ڕۆشنبیر ئەگەر چاوی خۆی نەبەستێتەوە ئەم دیمەنە هی نەدیتن و ئینکار کردن نیە، دوای دیتنیشی ئەگەر نەزەریە و بیروباوەڕی خۆی تەسک نەکاتەوە لەوانە نیە هیچ نەزەریەیێکی مامناوەنجیش خۆی لێ وەتەنگ بێنێت.

وا دەزانم تێخوێندنەوەی دەوری گرنگی ئەم پێوەندییە گشتییەی نێوان کوردان لە بەشی یەکەمی «حاجی قادری کۆیێ» لەسەری بە «میتافیزیک» حیساب کرابێت بە نامەی ئەمەوە کە دەرسودەوری مزگەوتان پێوەندی بە خوا و ئاین و مردن و ژینەوە هەیە کە ئەمانە جەرگەی میتافیزیکن.

**خوێنەری کورد !**

چ سوچێکی من و مەلا و فەقێ و حاجی قادر و زاناکانی ئیسلامی لێرە بە پێشەوە لەوەدا نیە کە بە درێژایی مێژووی هەزارانساڵەی کورد نە تیجارەتێکی سەرانسەر، نە بزووتنەوەیێکی گشتیی کوردایەتی، نە جووڵەیێکی چینایەتی بەرچاو، بگرە مردەڵانەش، نە هیچ پەیوەندیێکی تری ماددی لە منداڵدانی کوردستانی گەورەدا ڕسکاوە تاکوو بنلێوخستنی، منی تێدا گوناهبار ببم وەیا خوێندنی فەقێیانە تێیدا بەرپرسیار بێت. هاتوچۆی هەزاران مەلا و فەقێش بە پانایی و درێژایی کوردستاندا بۆ ماوەی هەزار ساڵ، ئەویش چ بەرهەڵستی جووڵەی کوردایەتی و چینایەتی و ماددییایەتی نەکردوە، ئەو پەیوەندییەی کە پێکیشی هێناوە لە نێوان کوردەواریدا تاکە پێوەندی گشتی بوە، ڕێی نەبوە هەست بەوە بکات کە لە دوارۆژدا لێکدانەوەی

ماددی نیوەچڵ لێی وەتەنگ دێت تاکوو لە بەر خاتری ئەو بڕیاری ئیعدام کردن و نەهێڵانی خۆی دەرچواندبا، کە دەریشی نەچواند ببێتە جێی گلەیی نووسەرێکی ماددی شلکی دوارۆژ. ئایا من لە ئاست ئەم هەڵوەستە نارەحەتەی رۆشنبیری وەها «تەسکبین» دا چیم کردبایە باش بوو؟ دیارە بۆ وەدەست هێنانی رەزامەندی لێکدانەوەی تەسکبین و درشتبین کەوا نەک هەر بەرانبەر تێکرای جیهانی ماددی بەسەهوو دەچێت، بەڵکوو بە پێوانەی هەموو لێکدانەوە و بیر کردنەوەیێکی ماددی بەرفرەوان و راست و دروستیش هەر بە هەڵە و ناراست لە قەڵەم دەدرێت، بەڵێ بۆ خاتری ئەم رەزامەندییە دەبوو من دوو جاران مێژوو بکەمە «کۆسەبەبی بلیاچۆ» کە دێت ریش و سمێڵی خۆی دەتاشێت و مووی دەسکردیان بە جێگەیەوە دەنووسێنێت، منیش بێم ریش و سمێڵی مامە مێژوو بتاشم بە سرینەوەی دەوری یەکجار بەرچاو و بەتەئسیری خوێندنی مەلایانە، ریش و سمێڵێکی دەسکردیشی پێوە بنێم بە هەڵبەستنی پێوەندیی ماددی گشتی لە نەبوونەوە، تاکوو ناوەناوە دەست و قەڵەمی لەرزۆکی نووسەری ترسنۆک و تەقلیدی بە پەنجە بێجورئەتەکانی شانەی ئەو ریش و سمێلە درۆزنە بکات و خوتخوتەی گومانەکانی ناو دڵی خۆی پێ برەوێنێتەوە بەدەم وەنەوزی سەرەتای خەوە پڕ خەون و خەیاڵە خۆشکەڵانەکانی نیمچە خوێندەواریەوە.

بەهـ بەهـ لەو دەسکارییە نارەوایەی مێژوو!
بەهـ بەهـ لەو حەسانەوە درۆزنەی لێکدانەوەی نیوەچڵ!

تێکرای ئەو بیروباوەرانەی وا دەزانن شی کردنەوەی مێژوو بە شێوازی ماددی بریتییە لە دۆزینەوەی پەیوەندی ماددی رەق و زەق و بە وەزن و سەنگ خۆ دەدزنەوە لە واقیعێکی کۆمەڵایەتی گەلێک گەورەتر و بەرینتر و قووڵتر و ئاڵۆزکاوتر و بەگیروگرفتتر لەو واقیعە سادەیەی کە بە موعادەلەی ریازی و پێوانەی بەرژەوەندی بازاری و راستە حیسابی کرین و فرۆشتن و سوود و زیانی مامڵەتی رۆژانە شی دەکرێتەوە: هەروەک مرۆڤ بریتی نیە لە 60 کیلۆ ئاو و 10 کیلۆ خوێ و چەند کیلۆیەک ئاسن و خەڵووز و گەچ کە نرخی هەموویان لە دوو دینار تێپەڕ ناکات هەروەها کۆمەڵایەتیش بریتی نیە لە چەند دەستوورێکی سادەی بێقوولایی و لەسەر زەقایی ماددە هەڵچەقیو. مرۆڤ و کۆمەڵایەتی بەهۆی ئەو تایبەتیە یەکجار بێمانەندانەی کە لە هەموو جیهانیان جوداواز دەکاتەوە بە سروشت و گیانلەبەریەوە،

له شێوەیێکی زۆر ئاڵۆزکاو و سەیر و گرێیاوییدا، پتر له دەروونی خۆیاندا ڕووچوون نەک له ماددە. تەجرەبەی ڕۆژانەی دەیان و صەدان و هەزاران ساڵە ئیسپاتی ئەوە دەکات کە مرۆڤ و کۆمەڵایەتی ڕەگی پەیوەندییان بە وجودەوە لە تۆژاڵی سەرەوەی ماددەوە ڕۆ دەچێت بەرەو ناخی ناوەڕۆکی خۆیاندا، هەر وەک گیا لە زەوی و ئاو و هەوا و تیشکی ڕۆژەوە ماددەی مردوو وەردەگرێت و دەیکات بە ماددەی
زیندوو (عضوي) هەروەهاش مرۆڤ لە دەوروبەری ماددی و بەرژەوەندی گوزەران و هۆیەکانی مانەوەی نەوع و دیاردەکانی سروشت و هەزاران ماکی بزووێنەری چەرخ و مەنگەنەی ژیان و بوون و بەسەر بردنەوە کەرستەیێکی خامی سەرەتایی دەداتە بەر هێزە زگماکەکانی بێئەژماری هەست و زانین و هۆش و سۆز و بەزەیی و ڕقبوونەوە و بە خۆداشکانەوە و ترس و ئازایی و نەزانین و بەسەهوو چوون و بیری چەوت و ئێشان و بێهێزی و خۆشی و نەخۆشی و جینس و تەماع و حەپەسان و چەند هەزاران خاسیەتی تری ئاشکرا و بزری مرۆڤایەتییەوە، لەوەوە کیانێکی ماددی مەعنەوی عەقڵی عاتیفی مەنتیقی غەیبی تەماعکارانە خۆ
بەختکەرانەی ڕەنگاوڕەنگ و هەزار ئاواز و دەهەزار دەرگە و دەربوونەی لێ دروست دەکات کە هەر یەکێک لەو باریکە ڕێگایانەی لێی دەبێتەوە و تێی دەکەنەوە جیلاو جیلی زانا و پسپۆڕ و پشکنەر و لێکۆڵەرەوە خەریک دەکات و بەشەڕیان دێنێت و لێکتریان نزیک دەکاتەوە و دووریان دەخاتەوە و پێکیان دێنێتەوە تاکوو لە ئاکامی ئەو شەڕ و ئاشتبوونەوەیەیاندا لە سەر شتێکیان هەڵدەوەستێنێت کە لەوانەیە بەتەواوی پێچەوانەی ڕاستی بێت و لەوانەیشە جەرگەی حەقیقەتی گرتبێتەوە.

تۆ سەیرکە چەندین هەزار ساڵە زانا و فەیلەسوف و ژیر و پسپۆڕ لەسەر تاکە دیاردەی زۆر سەرابی و بەزاهیر کەمبایەخی «خەون» دەمەتەقەیانە و ئەوەی دەیلێن نایلێنەوە سات لە ساتیش هەنگامەی دەمەتەقەیان گەرمتر دەبێت. دوور نابینم یەکێک لەوانەی ئەم دێڕانە دەخوێنێتەوە دیاردەی «خەون» بباتەوە سەر بنیچەی خواردنی خواردەمەنی فوودەری وەک پیاز و نسکێنە. لە حاڵێکدا زانای وەهاش هەیە خەون دەگێڕێتەوە بۆ بەرایی 50 ملیۆن ساڵێک کە ئەوسا هێشتان باپیری باپیرە گەورەی مرۆڤ لە پلیکانەی تطوری بایۆلۆجیدا تەشریفی نەهێنابوە ناو لیستەی «داروین و لاماک». ڕێشی تێدەچێ ئەو کەسەی نووسینی وەک ئەمە و بەشی یەکەمی «حاجی قادر...» بە بابەتی میتافیزیکی دادەنێت بڵێ خەون ڕەمزێکە

لە خەباتی چینایەتی، دینداریکێش بە دەنگ بێت و بڵێت خەون پەروازەی گیانە بەرەو هێلانەی غەیب، لەولاوەش زانایەکی سایکۆلۆجی بیتاقەی «جینس و گرێی ناکامی و بەندوباوەکانی نەفس» بخاتە سەر مێزی دەمەتەقەوە، سبەی دوایش زانستێک سەر هەڵێنێت و وەک عومەر خەیام بڵێت: «ای بیخبران راه نه انست و نو این».

لە خەون گەڕێ و یەخەی ئەم گوتەیە ڕاست و مەشوورە بگرە کە شتێک لە واقیع دەگێڕێتەوە و باسی دزت بۆ دەکات، چۆن بەر لەوەی بچیتە پارێزیماڵی نێچیرەکەی پڕبەدڵ دەپاڕێتەوە و دەڵێ «خوایە بەتەمای تۆ!!». لەم پاڕانەوەیەدا چەند دەستووری کۆمەڵایەتی و مرۆڤایەتی و چینایەتی و دینایەتی و نیشتیمانپەروەرایەتی و پیاوەتی و ناپیاوەتی دژی یەکتری تێکەڵ کردوون؟ لە کوێوەی هێنان؟ چۆنی سەلماندن؟ دەگێڕنەوە وابوە دزێک لەو کاتەدا کە دەستی بە ماڵەکەی کابرای دزراودا گێڕاوە لە تاریکیی شەودا تامی شتێکی وردی کردوە بزانێ شەکرە یاشتێکی ترە کە چێ خوێ بوە، دەرحاڵ وازی لە ماڵەکە هێناوە و بەجێی هێشتوە بێ ئەوەی بایی فلسێکی لێ بدزێت بەو بۆنەوە کە دوای چێشتنی خوێیەکە نمەکی کابرای خاوەن ماڵی کردوە و بەمەدا دزی لێ کردنی دەبێتە نمەک بە حەرامی کە لە مەردان ناوەشێتەوە، بەڵام ئەگەر خوێیەکە شەکربا ماڵەکەی تالان دەکرد.

پێم بڵێ کام یەکێک لە هۆیەکانی ماددی وەیا بەرژەوەندی وەیا ئاینی وەیا نیشتیمانپەروەری وەیا چینپەروەری وەیا جنسی و مانەوەی نەوع وەیا مەردی وەیا نامەردی وەیا هەر تاکە هۆیەکی تر بێت ئەم سەرمەقولاتەیە بە مرۆڤ لێ دەدات و لەم هەڵوەستە موتەناقیزەیدا ڕادەگرێت؟ هەڵوەستێکە لە هەناوی دزەکە دەدات و کۆمەڵایەتی بەرفرەوانی ژیانی دزەکەوە هەڵدەقوڵێت لە ئاکامی بەیەکتر گەیشتنەوەی صەدان عامیلی لە یەکتر ئاشنا و بەیەکتر دژ و لەگەڵ یەکتر بێتەرەف کە بە کەس ناکرێ بیانباتەوە بۆ سەرچاوەی ئاشکرا و بێگومانی وەک کە پەیدابوونی ئاو دەبرێتەوە بۆ سەر تەفاعولی ئۆکسجێن و هایدرۆجین لە زەرفی پێویستدا: لە فەرزی توانیشی هەموو هۆیەکان بباتەوە بۆ سەرچاوەی خۆیان و بە فندوفێڵ تەناقوزی نێوانیانیشی سەرپۆش کرد، دیسانەوە ناتوانێ موعادەلەیێکی ڕاست هەڵستێنێ لە تێکەڵبوونی ئەم عامیلانە کە تەفسیری هەڵوەستی دزەکە بکات ئەگەر تێکرای

عامیلەکان نەخاتە ناو بۆتەی نەفس و دەروونی دزەکەوە و لەویوە قەوارەی موعادەلەکە دەرنەچێت چونکە مومکینە هەرچی عامیلی دەرەوەی «نەفس و دەروون» ی دزەکە هەیە پەکیان بکەویت لە ئاست بڕیاری ئەو نەفسەدا: بە نموونە دەڵێم لەوانەیە دزێکی تر دوای چێشتنی خوێیەکە لەسەرینایی سەبەبێکەوە کە نایزانین چیە، پتر شێتگیرە ببێ لەسەر تاڵان کردنەکە وەیاخود تەئسیری پێچەوانەی نمەک کردنەکە هانی دزەکە بدات بۆ ئاگر تێبەردانی خانوەکە سەرەڕای دزینی ماڵەکە، کە ئەمەشی کرد ڕەنگە ئەوەندە پەشیمان ببێتەوە خۆی بکاتە تۆبەکاری نەقشبەندی وەیا بەڕادەییێک دڕبێت واز لە دزیەتی بێنێ بۆ جەردەیی. با دوور نەڕۆین و نموونەی بەینی خۆم و خۆت بێنینەوە: دەشێ یەکێک بیری لەم لایەنانە نەکردبێتەوە، دوای خوێندنەوەی ئەم دێڕانە بە هەندێک لە قەناعەتەکانی خۆیدا بێتەوە و بڕیارێکی نوێ بدات بەرانبەر بەشێک لەو پرسیارە کۆمەڵایەتیانەی کە لەمەوپێش لێیان بووبۆوە وەیا نەیدەتوانی بڕیاریان بۆ بدات، کەچی یەکێکی تری وەک ئەو دەستی غەزەب درێژ دەکات و پەڕەکانی کتێبەکە بدڕێت، یەکێکی تریش گوێ نەداتە هیچ نە بە چاکە نە بە خراپە وەیا نازانم چی بکات، کە من نازانم کۆمپیوتەریش هەر نازانێ.

هەموو جیهانی ماددی و مەعنەوی مرۆڤ بدە بەر نیگای سرنجتەوە دەبینیت سەرلەبەریان تایبەتی وەهایان تێدایە کە لە هەموو جیهانی دەرەوەی نەفسی مرۆڤ و دەستوورەکانی کۆمەڵایەتیدا سێبەریشی نادیترێت.

سەیری دەستووره مەشوورەکەی «گۆڕانی چەند بۆ چۆن» بکە و بەسەر مرۆڤ و سروشتیدا تەطبیق بکە: لە ماددەی مردودا گۆڕانی «چەند» گۆڕانێکی ئالی حەتمەیی سادەی «چۆن» پێک دێنێت و بەسەر دەچێت وەک ئەوەی ئاوت سارد کرد و گەیاندتە پلەی سفر ئاوەکە دەبێتە شەختە و هیچی تر، لە حاڵی ئاسایشدا کە لە چ لایێکەوە بەرهەڵست نەبێ، ئەم گۆڕانەی ئاو بۆ شەختە گۆڕانێکی ناچاری و حەتمییە کە هەر دەبێ ببێت. هەرچی دیاردەییێکی تری گۆڕانی«چەند بۆ چۆن» ی ماددی مردوو هەیە سەرلەبەریان وەک دیاردەکەی ئاو و شەختەیە.

لە جیهانی مرۆڤدا کارەکە ئەو وێنەیە ئالییەی تێدا نیە، بابڵێم لە چەند ڕوویێکەوە لە جیهانی ماددەی مردوو جودا دەبێتەوە، تا ئەو ڕادەیەی یەکتر ناگرێتەوە:

1- له گۆڕانی «چەند بۆ چۆن» ی مرۆڤایەتیدا هێندە عامیلی کاریگەر و بێئەژمار و جودا هەیە نە بەکەس دەکرێ بزانێ چەندیان لە گۆڕانەکە بەشدار دەبن و چەندیشیان بێتەرەف دەمێننەوە چەندیشیان دەوری پێچەوانە دەبینن، نە ئیمکانیش هەیە پێشبینی لە ئاست گۆڕانەکەدا بکرێ وەک کە لە حاڵەتی ئاو و شەختەدا دەکرێ، لەبەر زۆربوونی عامیلە نەزانراوەکان و مەعلووم نەبوونی چۆنیەتی ڕەفتاری مرۆڤ بەرانبەر ئەو عامیلانە چونکە گۆڕانی کۆمەڵایەتی ئاکامی موعادەلەیێکە هەزاران «مجهولات» ی تێدایە، یەک لەوان و لە هەموانیش کاریگەرتر بڕیاری مرۆڤە، بە پێچەوانەی ئەو موعادەلەیەیە کە گۆڕانی ماددەی مردوو نیشان دەدات کە مەعلوومە چەند عامیل تێیدا بەشدار دەبێت و چ بڕیارێکیش لە هیچ تاکێک لەو عامیلانەوە دەرناچێت. بە نموونەی ڕوون کردنەوە دەڵێم لە سەرەتای داهێنانی ئۆتۆمۆبیلەوە کەس نەیدەتوانی تێبڕ بکات لەوەی ئەم عامیلە تازەیە چ گۆڕانێک لە سەرانسەری جیهان پێک دێنێت، کاوچووک و قیر چ دەورێک دەبینن لە هەموار کردنی عەمەلیەتی گۆڕانەکەدا، کام دەوڵەت بەم داهێنانە لەوانی تر سوودمەند تر دەبێت وەیا کاروباری گەراجان چۆن دەگەڕێت وەیا بەنزینخانە لە هەڵەبجە دەکرێتەوە... وەیا... وەیا هەتا کۆتایی زنجیرەیێکی دوور و درێژی «وەیا» کە نەدەشیا بە بیری هیچ بلیمەتێکدا بێت. ئەم تاکە عامیلەی ئۆتۆمۆبیل کە خۆی یەکێکە لە هەزاران عامیلی تری وەک خۆی کە دەور دەبینن لە بەرەوپێش بردنی ڕەوڕەوەی گۆڕانی کۆمەڵایەتی، ئا ئەم تاکە عامیلە صەدان عامیلی تری لە پشتەوەیە کە ئەوانیش دەور دەبینن لە بەرهەمهێنانی ئۆتۆمۆبیل ساڵ بە ساڵیش ژمارەیان پتر دەبێت و تێکەڵتر دەبن لەگەڵ سوود و زیانی مرۆڤ، جۆری تازەتریش دادەهێنن لە پێوەندی کۆمەڵایەتی وەیا بەرهەڵستی دەکەن لە پەیدابوونی پێوەندی تر لە مەیدانێکی تردا وەیا... وەیا... دیسانەوە تاکوو کۆتایی زنجیرەی «وەیا» یان.

هەموو دنیا ڕاست بێتەوە ناتوانێ بزانێ «ئاسمانگەردی» سەر بە چییەوە دەنێت وەیاخود ئەوەی پێی دەڵێن «هۆشی ئەلەکترۆنی» چەند گۆڕان پێک دێنێت لە ڕواڵەت و ناوەڕۆک و ماف و ئەرک و پاداشی کۆمەڵایەتی.

2 - گۆڕانی «چەند بۆ چۆن» لە مرۆڤایەتیدا، سەرەڕای زۆر بوونی عامیلی نەزانراو تێیدا، دیسانەوە بەبەر حوکمی «نەزانراویی» دەکەوێتەوە لەوەدا کە گۆڕانەکە ئالی نیە و ڕووی ناچاریی لە یەک لا ناکات وەک کە هایدرۆجین هەر بەرز دەبێتەوە

ئاویش هەر سەرەژێر دەڕوات. گۆڕانی مرۆڤ (کۆمەڵایەتی) لەوانەیە بەپێچەوانەی هەموو تێفکرینێک و چاوەڕوانی کردنێک بەرەو ڕاست وەیا چەپ وەیا دواوە وەیا قیراج وەیا سەرەوژوور بڕوات. بێگومان زانایێکی مەیدانی فیزیا وەیا بایۆلۆجی وەیا هەر زانستێکی تری بڕوا بە مادده هێناو بەر لە 50 ساڵ وای چاوەڕوان دەکرد لە ئەنجامی پەرەسەندنی زانستی نوێ و بڵاوبوونەوەی بەرهەمە زانستییە ماددیەکانی بەناو گەلاندا، وێڕای زاڵبوونی نیگای عیلمانیە پشت لە غەیبەکان بەسەر نیگای غەیبپەرستەکاندا، کۆمەڵایەتیی مرۆڤ بە خێرایی لە قۆناغی پەرستنی غەیب تێبپەڕێت و مل بنێتە ڕێگای زانست و تەکنیک کە هەرگیز لێی چاوەڕوان نەدەکرا بۆ غەیری ئیمان هێنان بە مادده تیشک باوێژێت، کەچی بە پێچەوانەی هەموو چاوەڕوان کردنەکە، مرۆڤێکی غەیبپەرست سواری فڕۆکە دەبێت، کە دەزانین فڕۆکە بەرهەمێکی یەکجار سەرسوڕێنی زانستە، بە مەسرەف و ئەرکێکی گران دەچێ بۆ ماچ کردنی دار و بەردی وڵاتێکی دوور... لەبەر تیشکی کارەبا ئەو کتێبە دەخوێنێتەوە کە بەلای داهێنەری کارەباوە هەمووی ئەفسانەن... مزگەوت و کەنیشتە لەو وڵاتانەدا قوت دەبنەوە کە 50 ساڵ زیاترە بەلای خۆیانەوە ئیفلاسی مزگەوت و کەنیشتەیان ئیسپات کردوە، خەڵقیش دەچنە ناویانەوە و عیبادەتیان تێدا دەکەن هەرچەندە لەوانەیە ناخۆشەویستیش ببن. ئەمە ڕوو دەدات لە حاڵەتێکدا وا دەزانرا مزگەوت و کەنیشتە ئەوەندە ئەفسانەیی و بێبنجن بە پاڵێک دەڕمێن، ئەوەندەش دوژمنی چاکە و پێشکەوتن و ئازادی گەلان بوون ئەگەر حکومەتی کۆنەپەرست نەیانپارێزێت گەلان بۆ خۆیان داریان لەسەر بەردیان ناهێڵن. چ دوور مەبینە پەرستگە لەو وڵاتە بەرەو بێهێزی بڕوات کە حوکمەتەکەی پشتگیری لێدەکات. کەس پێی ناکرێ لەم مەیدانەی کۆمەڵایەتیەدا بەڕاستی نیشان بپێکیت چونکە کۆمەڵایەتی دار و بەرد و شەختە و ئاو نیە موعادەلەی ڕێکوپێک و بێ کەلەبەری بۆ دابنرێت.

3- گۆڕانی «چەند بۆ چۆن» ی مرۆڤ وەک هی ماددەی مردوو نیە لە شوێنی خۆیدا جینگڵ بخوات و هەموو ڕۆژێ و بە درێژایی زەمانە تا قافی قیامەت دووبارە ببێتەوە. هەروەک دەزانین عامیلەکانی گۆڕانی کۆمەڵایەتی بێئەژمارن، تێش گەییشتین پێشبینی ناکرێ گۆڕانەکە بەرەو کوێ دەڕوات، دەبێ بشزانین گۆڕانی کۆمەڵایەتی وەک گۆڕانی ئاو نیە کە لە سارددیا دەبێتە شەختە، چونکە وەک

شەختە لە گەرمیدا نابێتەوە ئاو. واتە گۆڕانەکە بە هەمان ڕێگەی بەرەوپێش چوونیدا بەرەو دوا ناگەڕێتەوە بۆ هەمان نوختەی کە یەکەم جووڵەی تێدا کرد. کشانەوەی گۆڕانی کۆمەڵایەتی هەرگیز نای باتەوە بۆ ناو قەپێلکەکەی جارانی، وەک کە شەختە دەچێتەوە ناو قەپێلکی ئاو، چونکە کۆمەڵایەتی مرۆڤ کە پاشەکشە دەکات بەشێکی خاسیەتەکانی بەرەوپێش چوونی لەگەڵ خۆیدا بەرەو دوا دەکێشێتەوە.

4 - گۆڕانی کۆمەڵایەتی ئەو حەتمیەتەی تێدا نیە کە لە گۆڕانی ماددەی مردوودا هەیە. دەشێ هەموو هۆیەکی ماددی گۆڕان پەیدا بێت بەڵام گۆڕانەکە ڕوو نەدات چونکە عامیلی هەرە بنجی و کاریگەری کۆمەڵایەتی کە مرۆڤە نایەوێ وەیا ناتوانێ وەیا نازانێ وەیا بۆی نالوێ وەیا لێی ناگەڕێن وەیا ناوێرێ، بگۆڕێ. واش دەبێ لە نێوان کۆمەڵێکدا نیو هێندەی کۆمەڵێکی تر عامیلی گۆڕان پەیدا نەبوە بەڵام ئەو کۆمەڵە زۆر ئامادەی گۆڕانە وەک ئەو ئاوەی کە خاسیەتی وابێ لە 50 پلەی گەرمیدا بکوڵێت، ئەویش لە بەرەوپێش چونێکی نیوەچڵدا گۆڕان دادەهێنێت.

ئەگەر ئارەزوو بکەین دەتوانین زنجیرەی ئەم ئاڵقانە درێژ کەینەوە تا لێی وەڕەز دەبین، بەڵام لزوم نابینم چی تری بەدوا بکەوین بەڵکوو زووتر دەگەینە تێبینیەکی یەکجار گرنگ و پڕ بایەخ لەم بەیەکدی گرتنەی گۆڕانی مرۆڤ و ماددەی مردوودا لەبەر تیشکی دەستوورەکەی «چەند بۆ چۆن»: ئەم تێبینیەیان تا ئێستا نەم دیت لە هیچ نووسەرێکی ماددییەوە سەرهەڵدات وەیا کەم و زۆر لە بابەتی وەک ئەو نێزیک ببنەوە. تێبینییەکە ئەمەیە:

گۆڕانی «چەند بۆ چۆن» کە شی کردنەوەی ماددی دایدەنێت بە دەستوورێکی بنجی، تەنها لە دوو جیهانی یەکجار لە یەکتر دووری ماددەی مردوو و مرۆڤدا دەدیترێت لەگەڵ ئەو هەموو جوداوازییە بێئەژمار و زێدە گەورانەی کە لە نێوان هەر دوو جۆرە گۆڕاندا هەیە، جیهانی ڕوەک و گیانلەبەران هەرگیز بەر ئەم دەستووره ناکەوێت. وەک کە ئاو و ئاسن و بەرد و دار لە «کریتیکاڵ پۆینت» دا چۆنیەتییان دەگۆڕێت وەیا باری کۆمەڵایەتی لەو نوقتەیەدا ئەویش دەگۆڕێت بە بارێکی تر، ڕوەک و گیانلەبەر چ نوقتەی واییان نیە بە وەصفی «گیانلەبەریی» تێیدا بگۆڕێن مەگەر ئەو گۆڕانە بایۆلۆجییە یەکجار تەنبەڵەی کە مرۆڤیش تێیدا بەشدارە. گۆڕانی «چەند» ی ڕوەک و گیانلەبەر هەر لە سنووری گۆڕانی «چەندایەتیی» دا دەمێنێتەوە و سەر بە شتێکی تر ناگەیێنێت: بێنە هەرچی مەیموون و ڕێوی و فیلی

دنیا هەیە لە جزیرەیێکی ناو دەریای ئەتلاتنیکدا کۆیان بکەوە، هەر ئەوەندە ڕوو دەدات کە یەکێکیان ئەوی تر لەناو ببات وەیا بیخوات وەیا هەموویان لە برسان بمرن. حەز دەکەی خۆراکیان زیاد بکە یاخود کەمی بکە وەیا بە جارێ لێیان ببڕە... باران ببارێنە، مەبارێنە... بەفر بێنە، مەهێنە... هەرچی بەخەیاڵتدا دێت بیکە یەک تۆسقاڵ تەئسیری نابێ لە پەیدابوونی گۆڕانێکی «چۆنایەتیی» ئەو ڕوەک و حەیوانانە: پێت ناکرێ «کریتکاڵ پۆینت»ی گۆڕانی ئاو بۆ شەختە وەیا بەرپابوونی شۆڕشی فرەنسە لە جیهانی ڕوەک و حەیواناتدا پەیدا بکەیت. تەنانەت ئەو گۆڕانە یەکجار بە ئەرک و مەسرەفەی کە زاناکان لە نێوان ڕەسەنە مەڕی ئوسترالیاییدا پێکی دێنن، ئەویش سەرلەنوێ قاڵب بەستوو دەبێ و جووڵەی لێدەبڕێ و هیچی تری لێ ناکەوێتەوە. هەرچی گۆڕانێکی وەها دەسکردی ئادەمیزادە هەیە لە نێوان ڕوەک و جانەوەراندا نەزۆکە و سەر بە شتێکی تر ناگەیەنێت. خۆ ئەوەی ڕاستی بێ، ئەو تەرزە گۆڕانەی کە مرۆڤ دایدەهێنێ دەبێ بخرێتەوە سەر ئەو Critical Point ەی کە گۆڕانی کۆمەڵایەتی پێک دێنێت چ لە مەیدانی فڕۆک دروست کردندا بێ چ لە مەیدانی داهێنانی نەوعی تازەی ڕوەک و ئاژەڵ و دڕندە و شتی ئەوتۆییدا بێ.

خولاسە، سەرلەبەری ڕوەک و ئاژەڵ بەر ئەم دەستوورەی «گۆڕانی چەند بۆ چۆن» ناکەون. لەمەش بترازێ، بەلای منەوە، ناشێ هەرگیز گۆڕانی کۆمەڵایەتی لەتەک ئەم گۆڕانەی ماددەی مردودا ناوی بێت، چونکە لە هیچ ڕوویێکەوە خزمایەتی لە نێوانیاندا نیە و نابێ. مرۆڤ مەوجودێکە بەتەواوی لە هەموو مەوجودی تر جودایە و دنیای ئەو دنیایێکی تازەی بێسابیقەیە.

جا کە من یا یەکێکی تر لە ناو هەزاران عامیلی تێکەڵ و پێکەڵی کۆمەڵایەتیدا دەوری عامیلی خوێندنی مەلایانە بدۆزینەوە لە ژیانی کوردەواری و مێژووی کورددا نە لە شی کردنەوەی ماددی دوور کەوتووینەوە نە جارێ هیچ هۆیەکی میتافیزیکیمان هێناوەتە ناو حیسابەکەوە. ئەگەر شی کردنەوەی ماددیش وەتەنگ بێ لە بوونی دەوری خوێندنی مەلایانە وەیا شتێکی وەک ئەو وەیا ئەو کە بەڕاستی دەوری هەبووە، دیارە ئەو شی کردنەوەیە لە واقیع وەتەنگ دێ.

هەروەها کە دەوری ڕاستەوخۆی مادده و سوود و بەرژەوەند وجودی نەبوە لە بەیەکەوە بەستنەوەی ئەم سەرەوسەری کوردستانی گەورەدا، کەس نەهاتوە ئینکاری

دەوری ئەم عامیلانە بکات لەو کاتانە و لەو حاڵانە و لەو جێگایانەدا کە دەوریان بوە و دەبێ.

ئەوەی پێویستە لەسەر مرۆڤی هەستیار و زانا و دڵسۆز ئەوەیە چاو و مێشک و دڵی خۆی بکاتەوە بۆ هەر هۆ و عامیلێک کە لە مێژوودا کاریگەر بووبن. دژی هەموو ڕەوشتی مرۆڤایەتی و یاساکانی کۆمەڵایەتیشە بێین لە هیچە هۆیەک بسڕینەوە کە هەیە وەیا یەکێک هەڵبەستین کە نیە. نە من نە تۆش قۆنتەراتمان نەگرتوە ڕێ و شوێن دانێین بۆ تێخوێندنەوەی بیروباوەڕی ئایینی وەیا فەلسەفی وەیا ئابووری وەیا هونەری وەیا نازانم چی لە ڕووداوەکانی مێژوودا وەیا یاساکانی کۆمەڵایەتیدا ئەگەر لە واقیعدا تێنەخوێندرابنەوە.

من کە دێمە سەر دیراسەی ژیان و فکر و خەبات و بەسەرهات و ڕەوشت و ئەدەبی یەکێکی کەممانەندی وەکو «حاجی قادر» تاکە یەک سەرەداوی جڵەوی قەڵەمی خۆم تەسلیم بە بڕیاری فکری و فەلسەفیی لێرە بە پێشەوە ناکەم. ئەو تەلە بەردانەی کە لەم ڕێگایەدا هەڵیان دەدەمەوە حەز دەکا شەیتانیان لێدەرپەڕێ وەیا فریشتەیان لێوە هەڵفڕێ وەیا عەزیایان تێدا خزابێ، من لێیان وەتەنگ نایەم: چی دەبینم ئەوە دەڵێمەوە صەد جاران ئەم و ئەو ڕازی دەبن یا قەڵس، لەوەشدا ئازادیی بیروباوەڕ بەکاردێنم کە بەردی بناغەی دیمۆکراسی و مافی مرۆڤایەتییە. بەلای منەوە گرنگ ئەوەیە گیانی حاجی نەتۆرێ و ڕیزی ئینساف نەشێوێ و گەرد لە ڕووی ڕاستی و ڕووداوی مێژوو نەنیشێ.

بێگومان گەلی کورد، بەڵکوو هەموو گەلێک، سوود لە گوتنەوەی ڕاستی وەردەگرێ چ لە مەوزوعی گشتی و جیهانی بێت و چ لە بابەتی سەر بە میللەتەوە بێ، بە نیسبەت بەرژەوەندی کوردیشەوە ئەو بابەتەی پێوەندی بە کوردەوە هەیە پتر لە هەموان ڕاستیخوازە چونکە دیارە کورد ناتوانێ شوێن پێی خۆی مەحکەم کات ئەگەر ڕێگاکەی بە چرای حەقیقەت ڕووناک نەکرابێتەوە.

ئەم خۆدانە پاڵ گوتنەوەی ڕاستیی لە سەروکاری حاجی قادردا سوود و حەسانەوەییێکی گەورەش بە نووسەر دەگەیەنێ لەو ڕووەوە کە ناچار نابێ بۆ شاردنەوەی ڕاستیی سەرپۆشی درۆزن بچنێ وەیا هەر جارە بە نوکی قەڵەم قەبر لە گۆرستانی مێژوو هەڵکەنێ بۆ زیندەبەگۆڕ کردنی ڕووداوی حەق و ڕەق. ئەگەر

نووسەر شەرمی بێتەوە لەوەدا کە درۆی لێ سپی ببنەوە هەرگیز ئەو جورئەتە ناکا شتی وەها بڵێ کە لەگەڵ واتا ئاشکراکانی ناو دیوانی حاجی قادردا نەگونجێت. گریمان لەو هەڵبەستن و دەسکاریەدا بارێکی سیاسیش پشتگیری لە نووسەرەکە کرد و ناڕاستەکانی بۆ پاراست، ئەدی دوای بەسەرچوونی هەلکەوتەکە چ دەکات و کێ دێنێ هەڵەکانی بۆ پینە بکات. بێگومان هەڵبەستن و سەرپۆش کردنی درۆ کارێک نیە هەتاهەتایی بەردەوام بێت وەیاخود لە هەموو جێگەیێکدا بە سەلامەتی تێپەرێت: درۆییێکی لە توران ڕێزی لێ بگیرێت لە ئێران ڕیسوا دەکرێت، ئەمە دەڵێم بەلایەنگیریی ئەو درۆیەی لە خۆی ئەمینە سپی نابێتەوە لە حاڵێکدا بەپێی باوەڕی من هەڵبەستن کارێکی ناپەسند و تاوانبارە تەنانەت گەورەترین هێزی جیهانیش بە درێژایی ئەزەل و ئەبەد لەسەری بکاتەوە.

نووسینەکەی من کە ئەم مەرجانەی بە خۆوە گرتوە تا ڕادەی دڵشکستە کردنی زیندوان بۆ خاتری مردووی بەشەرەف، ویستوەتی لەگەڵ حەقیقەتی بەسەرهات و ژیان و فکر و فەلسەفە و خەباتی حاجی قادردا جووت بڕوات. لە بەرچاوی خۆم، سەیر لەوەدایە کە سەرەڕای ڕێک کەوتنی نووسینەکەم لەگەڵ حەقیقەتی مەوزوعەکانی باسی حاجی قادردا، دوو جارانیش لەلایان شکڵەوە بەیەکەوەڕێک کەوتون.

لایەنی یەکەم ئەوەیە، هەروەک حاجی لە پلەیێکی دواکاتی ژیانیدا یادی ڕابردوو دەکاتەوە، وەیا پلەیێکی سەرەتاکانی ژیانی ڕێ خۆش دەکات بۆ پلەیێکی دواتری، ئەم نووسینەش لەبەر تیشکی زۆر بەهێزی ئەو ژیانەدا هاتوچۆی بە خامە کردوە، وەک جۆلانە، لە گۆڕقەرەجەوە بۆ سابڵاغ و لە سابڵاغەوە سەرەو هەوراز بۆ پێشووتر و لەوێوە بۆ کۆتایی سەرگوزەشت لە ئەستەمبۆڵ و هەر بەم شکڵە لە زۆر جێگەی نووسینەکەدا. کە بگەڕێیتەوە بۆ بەشی یەکەم و دوەمی ئەم باسە، هاتوچۆییێکی پەندۆلی دەبینێت لە خامەوە کە هەر جارە شتێکی ئەم سەرەی باسەکە بە یەکێکی ئەو سەری ساغ دەکاتەوە.

بێگومان ئەم دەنگدانەوەی نێوان قۆناغەکانی سەرتاسەری ژیانی حاجی بەڵگەیێکی گەورەی خێرا قاڵبوونەوەی ئەو ژیانەیە کەوا لە زوییێکەوە بەرەو ڕووکاری حەقپەرستی و ڕێز لەخۆ گرتن و بەخۆ نازینەوە لەنگەری بەستوە، ئیتر ئیمکانی لەیەک نەچوونی سەرەتا و کۆتایی ژیانەکە بۆتە نامومکین، بۆیەیە کە ویستت

بەڵگەی نەترسانی حاجی لە پلەی ناوەندی ژیانیدا پەیدا کەیت دەتوانی هانا ببەیتە بەر سەرەتا و کۆتایی ژیانی چونکە هەموو قوناغەکان یەک ئاهەنگی نەترسان دەچرن، هەروەهاش بۆ هێنانەوەی بەڵگەی ڕاستی و حەقپەرستی و ئاکارەکانی تریشی. بەڕاستی ئەم تێخوێندنەوەی دوارۆژ لە سەرەتاوە، وەک کە لە ژیانی حاجی و ئەم نووسینەدا دەدیترێت، دەستوورێکی ئابووری و ڕامیاری و کۆمەڵایەتیی ئەم سەردەمەشە کە دەبینین دەوڵەتی خاوەن ژیار و هێز و زانست و تەکنیک حیسابی50 ساڵ وەیا زیاتری دوارۆژ هەر لە ئێستاوە دەکەن، واتە کۆمەڵە ڕاستییەکانی ئەمرۆ خۆ لە دوارۆژدا دەبینێتەوە بەتەواوی وەک ڕاستیەکانی سەرەتای ژیانی حاجی قادر.

لایەنی دوەم ئەوەیە، هەر وەک ژیان و ڕەوتی بەرەوپێش چوونی حاجی بزووتنەوەییێکی درێژەداری بەسەریەکەوە بوە نەک تەکان بەتەکان و باز لە دوا باز، ئەم نووسینەش لە یەکەم ڕووپەڕەی بەرگی یەکەمەوە تا ئەم جێگایە، لێرەش بەدوا تا کۆتایی، یەک نەفس و بێ پچڕانەوە و بێ بڕگە بوە و دەبێت.

سەرلەبەری بەرگی یەکەم و دوەم و ئەم پێشەکیە، بەدوا پێشەکیەشدا تا کۆتایی بەرگی سێیەم، بریتین لە چەند سەرەباسێک کە ئەگەر بشیان سڕینەوە زیانێک بە نووسینەکە ناگات. چوارسەد لاپەڕەیێکی بەرگی یەکەم ئەم سەرەباسانەیان تێدایە:

دوای چوار لاپەڕەیەکی «ڕوون کردنەوە» ئەم سەرەباسانە بەدوا یەکتردادێن:

1) پێشەکی
2) حاجی قادر
3) حایی قادر کێیە
4) حاجی قادر کەی و لە کوێ هاتە دونیا
5) لاباسێکی گرنگ
6) حاجی قادر لە پلەی تەمەنی دوای منداڵی
7) حاجی قادر و خوێندن.

هەموو بەرگی دوەمیش، کە 330 لاپەڕەیێک دەبێت، بریتییە لەم چەند سەرەباسە:

1) پێشەکی و ڕوون کردنەوە
2) حاجی قادر و گەشتی خوێندن

3) پشوویێکی لێکۆڵینەوە
4) سەرەژوورچوونەوەیێک
5) چەند وشەی دوای درویێنە.

دیارە بەرگی سێیەمیش هەر وەکو دوەم دەبێت.

لەم بەرگەدا ناوناوە بەڵێنی ڕوون کردنەوەی ئەو باسانەی کە لێرە بە پێشەوە ڕوون کردنەوەیان خراوەتەوە بەر فەرمانی دوارۆژ، بەجێ دەهێنرێن.

هەندێک لەو بەڵێنانە کە لە بەرگی یەکەمدا بۆ بەرگی دوەم هەڵگیرابوون، لەم بەرگەدا بەجێ دێن چونکە بە پێچەوانەی چاوەڕوان کردنی خۆم، درێژ خایاندنی شی کردنەوەکانی ناو بەرگی دوەم جێگەی نەهێشتنەوە قەرزی هەموو بەڵێنەکان بدەمەوە. زۆر ئاشکرایە، هۆی ئەم درێژخایاندنە دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی وەیا کەم بوونی سەرچاوەی باسی حاجی قادر چ بە نووسین چ بە قسەی دەماودەم بێت، چونکە کە سەرچاوە نەبوو بەسەرهاتەکانی ساغ کردبێتەوە دەبێ هەموو ساغ کردنەوەکە بدرێتە بەر ئەرکی لێکۆڵینەوە و پشکنینەوە و زهینکاری و بەراورد کردنەوە.

نووسەر هەیە کە سەرچاوەی دەست نەکەوت خێرا لە باسەکەی دەبێتەوە عوزری بێ سەرچاوەییش هەمیشە بەسەری نوکە قەڵەمەکەیەوە، وەک فرمێسکی درۆزن قەتیس دەمێنێ، قەڵەمی کۆڵنەدەر لە نەبوونی سەرچاوەی ئاشکرادا ناگاتە ئەو وشکانی و بیرۆییەی کە بە لێکدانەوە و بیر هەڵکەندنیش تەڕایی لێ پەیدا نابێت. ئەوانەی بەدوا ئاودا دەگەڕێن ئەگەر لە دیمەنی وشک و برینگی دەشت و مەزرایان پەیامی بێئومیدی وەرگرن دەبێ لە سەرەتاوە خۆ بدەنە حەسانەوەی دەست پاچەبوون و دۆش دامانەوە، چونکە زۆرینەی دەشتودەری خوا ڕووکارێکی وشک و برینگی هەیە نووسینیش لە بارەی باسی بێسەرچاوەوە وەک ئەو گەڕانەیە بە دوو ئاودا کە لە هەرێمی بە ڕواڵەت وشکدا دەکرێ. دۆزینەوەی ئاساریش وەک دۆزینەوەی ئاوی وشکانی و نووسینی بێسەرچاوەیە چونکە ئەویش بە زاهیر چ ئومێدێکی بەرچاوی لێوە دیار نیە موژدەی هەبوونی ئاساری لە هەناوی زەوییەوە پێ ڕابگەیەنێ، کەچی چاوە پڕ مەهارەتەکانی زانای ئاسار، وەک «تیشکی ڕۆنتکین»،

تاریکستانی ئەو هەناو و دەروونە دەخوێننەوە و مێژووی سورگومی هەزاران ساڵ لەمەوپێش بەسەر دنیا دەخەنەوە.

بەڕاستی توێژینەوە لە ڕابردووی میللەتی کوردیش، چ مێژووی گشتی میللەتەکە بێ چ ژیانی تاکە پەنجەنیشانەکانی بێ، پێویستە بە چاوی زەڕڕەبین و زیهنی مووقڵاش و نەفسی بلوێرژەنانە بکرێت، دەنا لە هیچ یەکێکیانی بە مراد ناگەین.

**چاو پێدا گێڕانەوەیەک**

بەشی یەکەم و دووەمی ئەم لێکۆڵینەوەیە لەبەر شەوقە یەکجار کزەکەی کەمتاکورتی بەسەرهاتی حاجی قادر کە لە چەند ڕێگاییکەوە پێمان گەییشتوە، ڕێی لە پێش خامەدا دەرکرد، لە سەرەتای ژیانییەوە تا دوای گەشتەکەی خوێندنی لە باڵەکەتی و کوردستانی ئێراندا. لەو ڕێ دەر کردنەدا چەند ڕووپەڕەییکی شرایەوەی ژیانی حاجی و زەرفی بەشێک لە هەڵبەستەکانی و هێمای نەفسی و گیانیی کردە و گوتەکانی لە سنووری دەسەڵاتدا خرایە بەر ڕووناکییەوە کەوا ڕەنگە ئەمە یەکەم جار بێ ئەو تەرزە نهێنیانە لێیان دەکۆڵرێتەوە و ڕاگەیاندنەکانیان دەدرێنەوە بەر حوکمی واقیع و داخوازی خاسیەتەکانی شەخسیەتی حاجی قادرەوە، گەلێکیش بەتاڵایی لە نەخشەی ژیان و بەسەرهات و نمای ئەدەب و شاعیریەتی حاجی قادر بە ناچاری درایە توێژینەوەی دواڕۆژ کە من یاخود یەکێکی تر بیپەرژێتە سەر خۆ تەرخان کردنێکی هەناسە درێژتر، وەیا تالعی لەبارتر سەرچاوەی تازەتری مەعلووماتی نەزانراوی بخاتە بەر دەست.

لە کۆتایی بەرگی دووەمدا یەک لافاوی سەغڵەتی و بێدەستی و بێوەزعی و هەژاری و بێماڵیمان بەسەر حاجی قادردا بەجێهێشت، لەناو ئەو لافاوەشدا ئاگری نەفسی بەرز و سەرکەش کە خۆی پێ ڕاناگیرێ لە چارچێوەی قەفەسی کەساسی و بێدەسەڵاتیدا ئیتر یا قەفەسەکە دەسووتێنێ یاخود ئاگر لە عومری خۆی بەر دەدا کە هەر ئاگری ڕووتیشە. من لە بەجێهێشتنی حاجی لەو سەغڵەتیەدا بە هەندێ دڵی خۆم دەدەمەوە و گلەییان لە خۆم دەتەکێنمەوە کە ئەگەر هاتبام درێژەم بە نووسینەکەم دابا و حاجیم لە سەغڵەتی ئەوساکەی دەرهاویشتبا، سەرلەنوێ تەسلیم بە سەغڵەتییێکی

نوێترم دەکردەوە لەوی پێشوتریان بێ سامان و ئامانتر، چونکە ئەم جارەیان سەغڵەتیەکەی لە غەریبیدا دەبوو بە دەست ئاگرێکی یەکجار سوتێنەرتر لە هی پێشوەوە کە ئاگری کوردایەتی و نیشتمانپەرستیی بێسەروبنە، بێوچان و بێئومێد.

لە بەشی دووەمدا گەیێشتم بەو قەناعەتە کەوا حاجی دوا بە دوای گەڕانەوەی لە گەشتی خوێندنی بەناو باڵەکاتی و کوردستانی ئێراندا، هەر لەگەڵ هاتنەوەی بۆ ناو ناسیاوانی کۆیێ، خێرا دڵی هەڵقەنا و کەوتە سەر خولیای ئاوارەبوون، هۆیەکانی ئەم قەناعەتەشم لەو بەشەدا باس کردوە ناشێ سەرلەنوێ لێرەدا باس بکرێنەوە، خوێنەریش دەتوانێ بۆیان بگەڕێتەوە بەشی دوەم، بەلاَم سەرەڕای ئەو هۆیانەی لەو بەشەدا باس کراون تێبینی تر هەن لەبارەی خێرا کردنی حاجی لە جێهێشتنی کۆیێ، ئەوانیش بایی خۆیان پشتگیری دەکەن لە شیمانەی (احتمال) ڕاستبوونی بۆچوونەکەم کە زادەی ئەو دیاردەیە و تێبینییە و لێکۆڵینەوە و سەرچاوەی نووسراو و گوتەی دەماودەمەیە کە لەو دوو بەشە تێپەڕیوەی نووسینەکەمدا خراونەتە بەر چاو و هەست و زیهنی خوێنەری کوردەوە.

لێرەدا بەر لەوەی بچمە سەر ڕێچکۆلەی تەواو کردنی لێکۆڵینەوەکانی لێرە بە پێشەوەم دەبێ سرنجی خوێنەر بۆ ڕاستییێکی زۆر گرنگ بە نیسبەت ئەم نووسینەوە ڕابکێشم. تا ئێستا من نەکەوتوومەتە سەر لێکۆڵینەوە لە خەبات و کوردایەتی و شیعر و ئەدەب و تێکڕای هەڵوەستی، حاجی لەم ژیانەدا، شتێکی گرنگتریش لەمانە ماوە جارێ نەم کردوە ئەویش هەڵێنجانی حەقیقەتی هەرە گەورەی مەزنایەتیی لە ڕادەبەدەری حاجی قادرە کە لە قووڵایی هەندێک لە هەڵبەستەکانی یەکجار دەلالەت بەخشییەوە سەر وەدەردێنێ و لێکدانەوەی ورد تێی دەگات. ئەوەی ڕاستی بێ، ئەم کارە دەکەوێتە کۆتایی بەسەرچوونی دیراسەی ژیان و سەرلەبەری ئەو کاریگەڕانەی تاو و تینییان هێناوە بۆ ناو ویژدان و دەروونی حاجی و لەوێوە فەرمانی چۆنەتی کردەوە و گوتەی دەرچوە، بەو پێیە کاتێک نۆرەی دەگاتێ کە لە تۆژینەوە دەربارەی ژیانی ئەستەمبۆڵیشەوە دەرباز بووبین، واتە بەپێی چاوەڕوان کردن، ئەو لێکۆڵینەوە قووڵ و وردە دەبێتە بەشی پێنجەمی ئەم نووسینە. لە ئێستاوە تەنها ئەوەندەت پێ دەڵێم کە ئەگەر ئەو کارە ئەنجام نەدرێت بەشی هەرە گرنگی لێکۆڵینەوە لەبارەی حاجی قادرەوە لە تاریکایی نووسینەکەدا ناخرێتە بەر پەیکەری وجودیەوە.

با بکەوینە سەر ڕچەی نووسینی لێرە بە پێشەوە. لە بەشی دووەمدا لاپەڕە 187-188 بە دوا لێکۆڵینەوەیێکی ورد و درێژە پێدراودا، بۆ دەمکوت کردنی هەموو جۆرە ئیعترازێکی لێم بگیرێت، مەودای مانەوەی حاجی قادر لە کۆیێ دوای گەشتی خوێندن و بەر لە سەفەری بۆ ئەستەمبوڵ، ئەو مەودایەم گەیاندە 5- 6 ساڵ.

کە بگەڕێیتەوە بۆ خوێندنەوەی ئەو لێکۆڵینەوەیە دەبینی لە دوو لاوە یارمەتی زۆر خایاندنی مانەوەی حاجیم لە کۆیێ داوە. لە لاییێکەوە وام دانا لە کۆتایی 1276ی کۆچییدا حاجی گەڕابێتەوە بۆ کۆیێ، لەم دانانەشدا دوو ساڵم ستاندەوە لە گوتەی شاهیدێک (ئەم شاهیدە مامۆستا زەبیحییە) کە دەیگوت دەستنووسی حاجی قادرم بەسەر دیواری مزگەوتێکی سابڵاغەوە دیتوە و مێژووی 1279ی لێ نووسرابوو. بەڕاستی نێوانی کۆتایی ساڵی 1276 و ساڵی 1279 لە دوو ساڵانیش پتر دەگرێتەوە، بەڵام من کەرتی ساڵم لە حیسابەکە فڕێ داوە و هەرچی هەبوو لەو شایەدیەم ستاندەوە و دامەوە بەو کەسانەی دەیانەوێ مەودا و دەرفەت بدۆزنەوە بۆ پەیدا کردنی خەباتی کوردایەتیی حاجی قادر بەر لە چوونی بۆ ئەستەمبوڵ، چونکە دیارە دەرفەتەکە لە مەودای 5– 6 ساڵدا پتر پەیدا دەبێ نەک لە 3– 4 ساڵدا.

سەرەڕای ستاندنەوەی ئەم دوو ساڵە لە بەردەوامبوونی حاجی لە خوێندنەکەی کوردستانی ئێرانی، هاتم لە لاییێکی تریشەوە حاجی قادرم لە کۆیێ وەستاند تا ساڵانی 1282 و 1283ی کۆچی، بەوەشدا دەلالەت و ڕاگەیاندنی گوتەیێکی مامە شێخ نوورەدینم وێک هێناوە و 3– 4 ساڵم پێ گرتەوە، لە حاڵێکدا ئەگەر لە ڕاستە دەلالەتەکەی گەڕابام و مەودام لێ تەنگ نەکردباوە پتری ڕادەگەیاند، ئەوساش سەفەری حاجی دەکەوتە پێش 1282، هەر بەو پێیەش دەبوو لەو 5– 6 ساڵە بایی ئەو پێشکەوتنە داشکێندرێ.

بۆ ئەوەی خوێنەر لەم قسەیەم بگات بی ئەوەی ناچار بێ بگەڕێتەوە بۆ بەرگی دووەم، دەڵێم لەو بەرگەدا قسەی مامم ئەوە بوو کە حاجی قادر بەینێک بوو، وەیاخود چەند ساڵێک بوو، لە کۆیێ ڕۆیشتبوو بەر لەوەی کەیفی جوانڕۆیی لە 1286ی کۆچی کۆیێ جێ بهێڵێ. قسەکەی مامم لە 3– 4 ساڵی پتر دەگرتەوە هەرچەند بە جۆرێکی ئاشکراش ژمارەی ساڵەکانی دەرنەبڕیبێت، ڕەنگ بوو ئەگەر بەوردی لێی پرسرابایە، بیگوتبایە ژمارەیان چەندە، بەڵام داخەکەم ئەوسا کەس مەبەسی نەبوو لەو وردییە بکۆڵێتەوە و ئێمە لە دەردی سەری لێکۆڵینەوەی دوارۆژ ڕزگار بکات.

خوێنەری کورد دەبینێ، ئەو 5– 6 ساڵەی کە لە بەرگی دووەمی «حاجی قادری کۆیی»دا کردم بە ماوەی مانەوەی حاجی لە کۆیێ دوای گەشتی خوێندن و بەر لە ڕۆیشتنی بۆ تورکیا، لەسەر حیسابێکی شلۆقی موجامەلەی ڕەخنەگر و نەسەلمێن هەڵستاوە و بەس، موجامەلەکەش بۆ مەبەسێکی ئەوەندە گرنگ بوو، کە بریتیە لە ساغ کردنەوەی بوون و نەبوونی شیعر و خەباتی کوردپەروەرانەی حاجی قادر پێش چوونی بۆ ئەستەمبوڵ، مەبەسەکە ئەوەی دەهێنا بە چاوپۆشین لە 2– 3 ساڵ پتر خایاندنی مانەوەی حاجی لە کۆیێ دەمی ڕەخنەگر شیرن بکەم و لە خۆمی بەدەنگ نەهێنم تا لە تۆژینەوەکەم دەبمەوە و بیروباوەڕی خۆمی تێدا ڕوون دەکەمەوە. ئەگەر خوێنەر لەگەڵمدا بە ئینساف بێ لەم دەمشیرن کردنەدا لە سەر حەقم دەبینێ، نەک جۆرێکی تر.

ئێستا کەوا هەنگامەکەی ساغ کردنەوەی ئەو پرسیارە لە نووسینەکەی مندا بەسەر چوو تا ئەو ڕادەیەی کە لە توانامدا بووبێت مێژووی دەست پێ کردنی حاجی بە شیعری کوردپەروەرانە لە بەرگی دووەمدا یەکلا کرا و ترسی بێئۆقرەیی و پەلەپەلی ڕەخنەگری مەسەلەکەم لێ ڕەویەوە، زۆر بە شێنەیی و لەسەرەخۆ و بەوپەڕی خوێن ساردییەوە باسی یەکێک لە دیاردەکانی شیعری حاجی قادر دەکەم کە ئەویش بە شێوەیەکی خامۆش، بەڵام یەکجار ڕاگەیێن، باسێکی ماوەی حاجی قادرمان لە کۆیی بۆ دەگێڕێتەوە لەگەڵ باس گێرانەوەکەشدا دیسانەوە بە خامۆشی ڕاگەیێنانە شایەدییێکمان لە پرسیارەکە بۆ دەدات. کە دەڵێم «بە خامۆشی» قسەکەم لەوەوە دێت کە وا دیاردەکە لە خۆوە بە دەنگ نایێ، ڕاگەیاندنەکەشی بە هەرا و دەنگ نیە: دەبێ زیهنتی پێوە خەریک کەیت و لێکدانەوەی تێدا بەکاربێنێت تەواوێکیش لێی ورد بیتەوە ئەوجار لە ڕاگەیاندنەکەی دەگەیت دەنا دیاردەکە وەک نەبێ هەروەها دەبێ و دەشمێنێتەوە. وا دەزانم لە یەکەم نیگاشەوە بۆت مەعلووم دەبێ لێرە بە پێشەوە کەس بۆی نەچوە چونکە دیارە کەس ئەوەندە لەو باسانە ورد نەبۆتەوە تا ئەم حیسابە وردەی تێدا کردبێت، واش دەزانم، ئەگەر من لێی نەدوابام تا ماوەیێکی یەکجار دوور پشکنەری کورد بۆی نەدەچوو چونکە وەک هەر ئێستا دەردەکەوێت دیاردەکە بە وردبوونەوەییێکی زۆر لایەن و بەراوردکەرانە نەبێ خۆی بەدەست بینەرەوە نادات. با ئەوەشت پێ بڵێم، دەستنیشان کردن و دۆزینەوەی دیاردەی هێندە «ئاشکرا و بزر» خوێنەر و ڕۆشنبیران ناچار دەکات بسەلمێنین

کەوا جیهان هەر ئەوەندە نیە چاوی عادەتی سرنجی عادەتی تێی دەگات و دەیبینێت، وەیاخود ڕاگەیاندنی شوێنەوار و کەلەپور لەوە تێپەڕ ناکات کە تێوەڕامانی سەرپێیی بەدەستەوەی دەدات.

دەوێرم مەرجێک بکەم بایی ئەوەی ئەگەر بیدۆڕێنم ئیفلاس بکەم، مەرجەکەش لەسەر ئەوە بێ کەوا هەرچی تا ئێستا لە بارەی کورد و کوردستان و کوردی و ئەدەب و کەلەپۆر و کۆمەڵایەتی و ئابووری و مێژوو و هەموو سەروبەرێکی کوردەوە نووسراوە، کە لە ناویاندا نووسینەکانی خۆمە، لە سەرەتاییکی کورت و تەنک بەولاوە نیە، لە ژێریەوە ڕاستییە هەرە گەورەکان و ڕاگەیاندنە هەرە دروستەکان مانەوە بۆ لێکۆڵینەوەی دوور و درێژ و قووڵ. ئەو نووسینە سەرەتایی و تەنگانە، لەگەڵ نرخی زۆری کە هەشیانە لەچاو نەبوونیانەوە، لێیان دەوەشێتەوە ببن بە هۆی سەر لێشێوان و بەهەڵەدا چوون ئەگەر ڕوونبوونەوەیان وەک شووشە و ئاو نەبێ، تا ئەو ڕادەیە کە ژێری خۆیان لە بەرچاواندا ئاشکرا دەکەن.

نووسین و تۆژینەوە هەیە هەرچەند ڕاستیش بێ، بەڵام لە بەر ناتەواوی و بێ سەروبەری وەک گوتە مەشوورەکەی لێهاتوە کە دەڵێ کابرایێک لە گوتنەوەی شەهادەی باوەڕی ئیسلامەتیدا هەر ئەوەندەی گوت «اشهد الا اله» و خامۆش بوو، بەمەشدا هەرچەند کەرتێکی ڕاست و دروستی خواناسینی گوت بەڵام بە هۆی ناتەواوییەوە بوو بەکافرێکی بێ دەمەتەقەی پشت لە ئیمان. بە میسال دەڵێم تۆ کە گوتت «بارام لە ئازادی دا» و لە قسەکەی خۆت بڕیەوە، ڕاستەوخۆ دەبم بە ناحەزی بارام و دۆستی ئازاد، بەڵام کە هاتی و بەردەوام بوویت لە سەر قسەکەت و گوتت «لێی دا لەسەر بێعاری وەیا دزی کردن وەیا جنێودان» دەرحاڵ دەمخەیتە بارێکی پێچەوانەوە لە ئاست بارام و ئازاددا و پڕ بەدڵ دەڵێم دەست خۆش بارام. ناوناوە لەم بەشەی نووسینمدا دەگەینە باس و لێکدانەوەی ئەوتۆ کە ویستویەتی کەرتە شەهادەکەی قرتاوی «... الا الله» بباتەوە جێگەی ڕاستەقینەی خۆی.

ئەو دیاردەیەی ناو دیوانە شیعری حاجی قادر کە خەریکم لێرەدا، تازە بە تازە، ڕوونی دەکەمەوە لەوانەیە ئەگەر لێی بێدەنگ بم سەری خوێنەری کورد بشێوێنم لە ئاست چەند و چۆنی یەکێک لە قۆناغە گرنگەکانی ژیانی حاجی قادر کە ئەویش قۆناغە ناوەندیەکەی نێوان گەشتی خوێندن و چوونی بۆ ئەستەمبوڵە: سەر شێواندنەکە لەوەوە دێت کە ئەگەر خوێنەر قەناعەتی هاتبێت بە لێکۆڵینەوەکەی

بەرگی دووەم لە بارەی ماوەی ئەو قۆناغە کە 5 6 ساڵ بێت، ئا ئەو قەناعەتە شیمانەییێکی گرنگی تری لێ کوێر دەکاتەوە کە وا گەلێک ڕێکتر دێت و پتر دەگونجێت لەگەڵ تێکڕای وەزعی حاجی قادر لەو قۆناغەدا. شیمانە ڕێکتر و گونجاوترەکە ئەوەیە کە مەودای قۆناغەکە تەواوێک کورتتر بێ لەو 5-6 ساڵەی کە لێکۆڵینەوەکەی بەرگی دووەم بەڕواڵەت کردبویە تەمەنی ئەو قۆناغە.

سرنج و وردبوونەوە دەری دەخات، ئەو بارە نالەبارە و پڕ نارەحەتی و تەگەرە و بێ دەسەڵاتی و کەم دەستییەی کە حاجی قادری تێدا بوو لێی دەوەشێتەوە ئەوەندە خۆی لە نەزەر حاجیدا دزێو کردبێت کە ئیتر دڵی نەیهێنێ وەک پێنج شەش قاچی دەوال پێ لە خۆیانی بئاڵێنێ و دەرد و ئازاری ئەو پێنج شەش ساڵانە لە لەش و نەفسیدا هەڵگرێ، لە حاڵێکدا ڕێی هەبێ ساڵەکان کورتتر کاتەوە و زووتر ئاڵقە و گەوەکانی لە خۆی شل کاتەوە و لێی ڕەهابێت، وەک کە دەزانم کردی و واخەریکم بۆتی بە ئیسپات بگەیەنم.

زوو کردنی حاجی قادر لە خۆ ئازاد کردن ئەنجامی وەزعێکە بەدەوری حاجییەوە وەک جغزی تەواو کە هەردوو سەری گەیشتبێتەوە یەکتر، ئیتر لە هەرلاوە سەیری بکەیت ڕێ بەزیهنت دەگرێ و هۆی زوو کردنی حاجیت بەدەستەوە دەدات، وردە وردە لەگەڵ درێژەکێشانی شریتەی نووسین ئەو هۆیانە و هاندەرانەی خێرایی کردنە لە دەربازبوون، وەک دانەی تەزبیح، بەداوێوەیان دەکەین تا لێیان دەبینەوە و دووسەری تەزبیحەکەش وەک جغزەکەی دەوری حاجی دەگەیەنینەوە یەکتر، بەڵام لێرەدا پێشدەستیەیەک دەکەم بۆ تێخوێندنەوەی دوو دانەیان بە نیازی ئەوە کە نووسینەکە بە بۆشاییەوە ڕانەوەستابێت و هەر نەبێ یەک دوو کۆڵەگەی بەڵگانی بەبەر درابێت تا دەگەینە ئەو کاتە کە هەموو کۆڵەگەکان لە شوێنی مناسبی خۆیاندا دەچەقن:

یەکێکیان لە نیگاییێکی بەرەو دواوە خۆ دەنوێنێت: حاجی قادر بە خۆڕایی درێژەی بە گەشتی خوێندن نەدا بۆ ماوەی 7 ساڵ وەیا 9 ساڵان، بێگومان بەرهەڵستیەکی زۆر بەهێز دەیوەستاند لە گەڕانەوەی بۆ کۆیێ. بەعادەت فەقێ خێرایی دەکات لە خوێندن بە نیازی خێرا دامەزران و نیشتەجێ بوون، کە ئەمە ئاکامێکی چاوەڕوانکراوە لە هەموو چالاکی و کەسب و کارێکدا چونکە مرۆڤ بە ئومێدی دروێنە زەوی دەکێڵێت و دەچێنێت، بە ئومێدی مەلایەتی و تەدریس لە مزگەوت و

مەدرەسەیێکی ولاتیشدا لە مزگەوتان دەخوێنێ و گونداوگوند و شارەوشار دەگەڕێ. دیسانەوە بە عادەتیش لە کاتی چەند ساڵەی خوێندندا چەند جاران بەرەو ماڵ دەبێتەوە و دیدەنی خزم و کەسی خۆی دەکات، تا بۆشی بلوێ دەیەوێ لە نزیکی مەفتەنی خۆی نیشتەجێ ببێت و بگوزەرێنێ. حاجی قادر بە پێچەوانەی عادەت، ئەوەندەی پێی کرا خۆی وەخراند لە گەڕانەوە بۆ کۆیێ، وەک منیش بۆی دەچم هۆی خۆ وەخراندنەکەی لە چاوان دەچەقێت: حاجی قادر کە دەگەڕایەوە بۆ کۆیێ، کوردی گوتەنی، بەسەر سفرەی بەتاڵدا دەهاتەوە چونکە خاوەنی هیچ شتێک نەبوو تێیدا. کە دەبێت وێنەی حاڵ و باری حاجی لەو هیچ نەدارییەدا تەواو بکەین دەبێ بە خۆنازین و لە خۆڕازیبوون و خۆ بەگەورە گرتن و ڕێز لەخۆنانی حاجیش بێنینەوە بەر چاومان کە هەر بەجارێ گەڕانەوەی قەلەندەرانە و هەژارانە و بێدەسەلاتانە زەحمەتتر و ناخۆشتر دەکات و ڕێی نەهاتنەوە هەموارتر دەکات. من کە بە وردی سرنج لە تێکڕای باری ماددی و نەفسی حاجی ڕادەگرم سەیرم لەوە دێتەوە چۆن حاجی بیری لە گەڕانەوە کردەوە و هاتیشەوە، گەلێکیش لێکدانەوەم کردوە، دەشی کەم، بۆ دۆزینەوەی هۆی دڵکێشی ئەوتۆ بایی ئەوە بکات دوودڵی و مەترس و شەرم بەخۆدا هاتنەوەی حاجی لە گەڕانەوەی فەقیرانە بەلاوە بنێت و بەرەو کۆیێ پاڵی پێوە بنێت وەیا ڕایکێشێت: لە ئاکامی لێکدانەوەی دوور و درێژم هەر بەو دوو سەبەبە زۆر ئاشکرایە گەیشتووم کەوا لێرەدا دەینووسم، یەکەمیان کزە و سۆزی بیر کردنەوەی ولات و دۆست و برادەرە، کە ئەمەش هەستێکی زۆر ئاسایی و خۆڕسکیشە لە مرۆڤدا، دوەمیان وەکیەکبوونی کۆیە و سابلاغە بەنیسبەت حاجی قادرەوە لەو ڕووەوە کە لە سابلاغیش خاوەنی هیچ شتێک نەبوو لەوانەی گوزەرانی پیاوی ڕەبەنیش پێک دێنن.

کەواتە مانەوەی حاجی قادری بێ ئامانج و بێ سەبەب لە سابلاغ یاخود هەر جێگەیەکی تری کوردستانی پانوبەریندا دەبوە «ترجیح بلا مرجح». پێشی ناوێ سەرلەنوێ بکەومەوە موناقەشەی ئەوە کە نەفسە زلەکەی حاجی هەر وەک نەیدەهێشت لە کۆیێ ببێتە خاوەنی قڕووشێک، نەشی دەهێشت لە سابلاغ و غەیری ئەوێشدا ببێتە خاوەنی هیچ شتێک. کەواتە وا دیارە لە نێو دوو عامیلی دژی یەکتر کە یەکێکیان بەرهەڵستیکەری شەرم و دوودڵییە ئەوی تریان پاڵپێوەنەری سۆز و ئارەزوە، لە ئەنجامی شەڕێکی ناوەکی نەفس و دەروون و دڵدا سۆزی غەریبی

کردنەوە زاڵ بوە بەسەر عاملی وەخرێنەری دوودڵی و شەرم کردنەوەدا، بەڵام دیارە تا ڕادەیێک شیرنبوونی گەڕانەوە بۆ وڵات دوای بەسەر چوونی دەوری خوێندن یاریدەی ئەو پاڵپێوەنەرەی سۆزی غەریبی داوە لە زاڵبوونیدا بە سەر هێزی وەخرێنەر. لەم زاڵبوونەی لایەنی پاڵپێوەنەر کە هێزێکی «ایجابی ئەرێتی» یە بەسەر لایەنی بەرهەڵستیکەردا کە هێزێکی «سلبی - نەرێتی»یە. یاسای کۆمەڵایەتی و مرۆڤایەتی خۆڕسک و زگماک بە ڕاڕەوێکدا ڕۆیشتوە دژی ڕاڕەوی یاسایەکی «فقهی» و قانونییە کە لە ڕووبەڕووبوونی «مانع و مقتضی» دا مانیعەکەیش دەیەخێت و دەیکاتە بنگەی بڕیار.

هەڵبەت من لێرەدا مەبەستم ئەوەنیە بڵێم هەمیشە لە کۆمەڵایەتی و مرۆڤایەتیی خۆڕسکدا هێزی پاڵپێوەنەر سەر دەکەوێ، چونکە زۆر جاران هۆی کاریگەری سەلبی لەم مەیدانەشدا زاڵ دەبێ بەسەر «ایجابی - ئەرێتی» دا بە درێژایی ساڵەهای بێبڕانەوە بەری پێشەوەچوون دەگرێ، ویستم ئەم لەیەک نەچوونەی بڕیاری وەزعی حاجی و وەزعی «فقهی قانونی» بێنمە بەر چاو و زیهنی خوێنەرەوە کە ڕاستییێکە سەر بە کۆمەڵایەتی، شێوەییێکیشە لە بێئەژماربوونی چۆنایەتیی حاڵ و باری سەر بە مرۆڤەوە. بگەڕێینەوە بۆ زەرفی حاجی و لەو کاتەی تێیدا گەڕایەوە بۆ کۆیێ:

حاجی قادر کە ئەمەی گوتمان و ڕوونمان کردەوە وەزعی نەفسی و ماددی بێدەمەتەقەی بووبێت بە ئاشکرایی دیارە کە وا زوو کردنی لە جێهێشتنی کۆیێ بەقەدەر خۆ وەخراندنی لە هاتنەوە بۆ کۆیێ دەبێتە بڕیارێکی چاوەڕوانکراوی ئەو بارە نەفسییە و ماددییەی حاجی کە پێشتر لە سابلاغی هەڵقەناند. خۆ ئەگەر تەنگوچەڵەمەی دوشمنایەتیە خەستەکەی حاجی لەگەڵ شێخ نەبی و مریدەکانی بێنێنە ناو حیسابی ئەم لێکدانەوەیە هەر بەجارێک ئاشکرا دەبێ جێ پێی حاجی لە خاکی کۆیەدا چەند لەق بوە.

دوەمیان ئەو هۆیە زلەی نەبوونی هیچ پەیوەندییێکی بەرژەوەندی ماددی و گوزەرانە، کە حاجی بە کۆیەوە ببەستێتەوە. ئەمجارەیان موعادەلەییێکی کۆمەڵایەتی و نەفسی ئەوتۆ پەیدا دەبێت هەر دەڵێی چ جۆرە ڕووبەڕووبوونێکی «مانع و مقتضی» تێدا نادیترێت چونکە وەک دەبینین «مانع» ی ڕۆیشتن پەیدا نیە تا بەرانبەر «مقتضی» ڕۆیشتنەکەی دانێین. بەدوا ئەمەدا چەند ڕوون و ئاشکرایە کە ئەو هۆیانەی حاجیان لە کۆیێ ترازاند هەر خۆیان خێراییشیان پێ کردبێ لەو ترازانەدا.

ئێمە لە جێگەی پێویستدا جارێکی تریش ئەم بێ پەیوەندییە ماددییەی نێوان حاجی قادر و کۆیێ و دێنینەوە ناو باسەکەمانەوە.

دوابەدوای ئەم تێبینیانە و وردبوونەوانە بە خوێنێکی ساردتر لە هی سەرەتای دەستپێ کردنەوەی نووسینم، دەگەڕێمەوە بەرەو پیری ئەو دیاردەیەی شیعری حاجی کە گوتم بە خامۆشی باسی ماوەی درێژەکێشانی قۆناغە گرنگەکەی ناوەندی بەینی قۆناغی فەقێیەتی و قۆناغی ژیانی ئەستەمبوڵی دەکات کە ماوەی مانەوەی لە کۆیێ دەگرێتەوە.

دیاردەی وەک ئەمەی لێرە بەدواوە باسی دەکەم لە شیعری هەموو شاعیرێکدا بۆ چاوی وردبین خۆی دەنوێنێت، هەر جارەش بەپێی جۆری ژیان و چۆنیەتی ئەدەب و داڕژانی هەست و نەستی شاعیرەکە، بەڵام کەم جاران لێکۆڵینەوەی عادەتی لە ئاست دیاردەی وەهادا هەڵوەست دەکات و سرنجی لێدەگرێت. من لە بارەی شیعری حاجی قادرەوە، هی شاعیری تریش، ئەم هەڵوەستەم کردوە و سرنجم گرتوە، وا لەم ڕووپەڕانەی ئایندەدا ئاوێنەی زیهنی خۆمت بۆ دەکەمەوە تاکوو دیاردەکەی تێدا بخوێنیتەوە. ڕەنگە دوایی خوێندنەوەی ڕووپەڕەکان خوێنەر لە خۆی بپرسێت و بڵێت بۆچی دیاردەی وەها ئاشکرام بە بەرچاوی خۆمدا نەهێنا، ئومێد دەکەم لەکاری وەک ئەمەدا ئەو دیمەن بە بەرچاودا هێنانە بکات.

ئا ئەمەش ئەو دیاردەیەیە کە دەڵێم لە ناو دیوانی حاجیدا پەیدا دەبێت و یاریدەی سنوورکێشان بە دەوری ماوەی قۆناغی ناوەندی عومریدا دەدات. شیعری حاجی کە بەپێی نەخشەی زەمەنی هەڵبەستیانەوە قۆناغیان بۆ دانرابێت دەخرێنە جغزی سێ قۆناغەوە، هەر بەو پێیەش دەکرێن بە سێ بەشی جودا کە هەر بەشەیان سەرەڕای هەبوونی سنووری کات بەدەوریانەوە، جارێکی تریش لەیەکتر جودا دەبنەوە لە ڕووی هۆی بزاوتن و وروژاندن و خەریک کردنی دڵ و دەروونی حاجی قادرەوە کەوا بەئاشکرایی لە زۆربەی شیعرەکانی هەر یەکێک لەو قۆناغانەدا دەردەکەوێت:

- بەشی یەکەمی نەخشە زەمەنیەکە بریتیە لە قۆناغی فەقێیەتی و گەشتی دەرس و دەوری زانستەکانی ئیسلام.
- بەشی دوەمی، ئەو چەند ساڵەیە کەوا ئێستا خەریکین پەراوێزێکی بە پێوانە و کێشانەی بۆ دانێین و ماوەکەی بە شێوەیێکی ڕاست وەیا لە ڕاست نێزێک دیار

خەین. ئەو بەشە هەمان بەشە ناوەندییەکەیە کە دەکەویتە پاش بەسەرچوونی گەشتی خوێندن و پێش سەرەتای دەرچوونی حاجی لە کۆیێ بەرەو تورکیا و ناوچەی خەلافەتی ئەوسا کە ئەستەمبۆڵ بوو.

- بەشی سێیەم هەموو عومری حاجی دەگرێتەوە دوای دەرچوونی لە کۆیێ.

کە بێین هەڵبەستەکانی دیوانی حاجی قادر بەدەنگ بێنین بۆ دیارخستنی ئەو سەردەمەی کە تێیاندا هۆندراونەوە، یاخود بۆ زانینی پێوەندییان بە یەکێک لەو سێ قۆناغەوە، بە مەرجێک سەلیقەیێکی ڕاست و سازگار ڕابەرمان بێت لەو کارە زیهینیەدا، دەتوانین میقدارێکی بە پۆز لەو شیعرانە بە ئاسانی بدەینەوە بە قۆناغی تایبەتی خۆیان.

بەنیسبەت قۆناغی یەکەمەوە: خەریکبوونی بەردەوام و دوور و درێژی حاجی قادر بەدەرس و دەوری مزگەوتەوە لە قۆناغی یەکەمی لیستە زەمەنیەکەدا، لێی دەوەشێتەوە وای کردبێ بەشی زۆری شێعرەکانی ئەو قۆناغەی، باسەکانی «صرف و نحو» و ماددەکانی تری خوێندنی مزگەوتی کردبێت بە ماددەی هەڵبەست و وەیاخود هەرنەبێ زۆرینەی شیعرەکانی سەر بە قەواعیدی عەرەبی و باسی ئاینی ئیسلامەوە لەو قۆناغەدا هۆنرابنەوە. بەپێی لێکدانەوەی خۆم و سرنجێکی ڕامگرتوە لە شیعرەکانی حاجی دەتوانم بڵێم ئەگەر دەرفەت هەبێ بۆ بەراورد کردن و بە یەکدی گرتن و زیهنکاریی تێروپڕ دەشێ هەندێک لەو هەڵبەستانەی کە زۆر لە نێزیکەوە پێوەندیان بە «صرف و نحو» و ئایینەوە هەیە بدرێنەوە بەو ڕۆژانە کە باسەکەی صەرفی وەیا نحوی وەیا ئایینیی ناو هەڵبەستەکەی تێدا خوێندراوە. ئەم دیاردەیە لە ڕووپەڕەکانی کتێبە زۆر باسکراوەکەی «سیوطي» دا بە ئاشکرایی خۆ دەنوێنێ، چونکە حاجی قادر ئەرکێکی زۆری پێوە بردوە و گەلێک لەگەڵی خەریک بوە. سەیرت بەقسەم نەیێ ئەگەر بڵێم ڕەنگە ناوناوە خەونیشی بە باسەکانی سیوطییەوە دیبێت کە ڕۆژ لە دوا ڕۆژ خەریکی ئەنجنین و ساغ کردنەوەو پەراوێزکاریی دەوری پەڕەکانی بوە، چونکە هەموو دەزانین مرۆڤ زۆر خەونان بەو شتانەوە دەبینێت کە بە ڕۆژ پێیانەوە ماندووە، چ جایی ئەوەی وەک حاجی قادر بە ڕۆژ و بەشەو

دەستەویەخەی دەرس و دەور و حاشیە نووسینەوە و ئەزبەر کردنی باسەکانی ناو ئەو کتێبە بووبێت.

ئەو کەسەی شارەزای جۆری دەرسی ناو مەلا و فەقێیان بێ دەزانێ چ شێوە وردپێوی و کوتان و ئەنجنین و ساغ کردنەوەیێک لەگەڵ ئەو دەرسانەدا دەکرێت و فەقێی تایین فکر و خەیاڵ و وڕینە و خەو و خۆراکی دەبێتە گوتنەوە و کوتانەوە و دەجاران هاڕینەوەی ئەو دەرسەی لای مامۆستاکەی دەیخوێنێت. سەیرێکی حاشیەکانی حاجی قادر بکەیت بە دەوری ناوەڕۆکی سیوطییەوە، ئەم تێ ئاڵان و تێکەڵبوونە لەگەڵ ماددەی کتێبەکەدا بۆ یەکەم نیگات دەردەکەوێت. بێگومان دەبێ نیسبەت و تەناسوبێک هەبێ لە نێوانی ماوەی خەریکبوونی حاجی قادر بە خوێنی مزگەوتەوە لەگەڵ بارستی ئەو شیعرە سەر بە ئایینانەی کە لەو ماوەیەدا هەڵبەستراون. واتە بەپێی درێژبوونەوەی ئەو ماوەیە شیعری ئاینی و هەڵبەستی تێکەڵ لەگەڵ ڕێزمانی عەرەبی ئەویش زیادی کردوە. دواتر باسی قۆناغەکانی دوەم دەکەم.

بەنیسبەت قۆناغی سێیەمەوە: تایبەتی جوداکەرەوەی ئەو قۆناغەیان هەڵبەستی سەر بە کوردایەتی و سیاسەتە. تێکڕای هەڵبەستە نیشتیمانپەروەریەکان و سیاسیەکانی حاجی قادر زادەی ئەو قۆناغەن (لە بەرگی دوەمی ئەم نووسینەدا لایەنی سەرەتای دەست پێ کردنی حاجی بە شیعری کوردپەروەرانە ساغ کراوەتەوە و بە ئیسپات گەیشتوە کە لە دوای چوونی لە کۆیێ بۆ لای بەدرخانیەکان لە ئەستەمبوڵ، قۆناغی کوردایەتی حاجی دەستی پێکراوە). هەمان نیسبەت و تەناسوبیش لە نێوان ماوەی قۆناغەکان و بارستی هەڵبەستەکان لەم قۆناغەشدا وەک مۆمی ناو تاریکی دیار دەکەوێ.

بەنیسبەت قۆناغی دوەمەوە کە بابەتی لێکۆڵینەوەی ئێستاکەمانە: لەم قۆناغەدا تایبەتیەکی وەک «علامة فارقة» هەیە نە بەهیچ کلۆجێک لەوانی تردا پەیدایە نە لە ژیانی هیچ شاعیرێکی دیکەی ئەوسا هەبوە، شتێکە بۆ حاجی قادر ڕێکەوتوە لەو دەمەدا، ڕاستریش ئەوەیە بڵێم یەخەگیری خۆی کردوە نە بۆ غەیری ئەو ڕێککەوتوە نە ئیمکان هەبوە جارێکی تر بۆ حاجی ڕێککەوێتەوە. تایبەتیەکە ناکۆکی و دوشمنایەتیە کوشندە بێپشوە بێوچانە بێمەسڵەتیەکەی نێوان حاجی قادر و شێخ نەبی ماویلییە. دەزانین لەو دوشمنایەتیەدا تاکە چەکی هێرش بردن و لەسەرخۆ

کردنەوەی حاجی هەڵبەست بوە، لەمەوە دەزانرێ شیعرەکانی حاجی دژی شێخ نەبی
هی ئەم قۆناغەن، بێ لەو چەند بەیتەی دواتر لە ئەستەمبوڵەوە بەپێی داخوازی
مەبەستی هەڵبەست ناوی شێخ نەبییان تێ کەوتوە هەمووشیان دەناسرێنەوە کەوا
هی قۆناغی سێیەمی عومری حاجین وەک ئەو بەیتەی کە جارێکیان لە بەشی
دوەمی ئەم نووسینەدا بۆ نیازێک کردبوومە شایەد و بەڵگە:

لە عەهدی کەرنەبیی تا عەهدی گای کوێر
لە گوێی گا نوستوون زۆر حەیفە بۆ شێر

کە بگەڕێیتەوە بۆ دەوروبەری لاپەڕە 163ی بەشی دوەمی کتێبی «حاجی قادری
کۆیی» بۆت دەردەکەوێ ئەم بەیتەی لە ئەستەمبوڵەوە کردوە بە دیاریی گلەمەندی
بۆ خەڵقی کۆیێ.

چ گومان نیە لەوەدا کەوا زۆری و کەمی ئەو هەڵبەستانەی حاجی قادر لە
سەروپۆتەراکی شێخ نەبی ڕاکێشاون، زۆری و کەمی ماوەی ئەو کاتە بەدەستەوە
دەدات کە شەڕ و ناکۆکیەکەی تێدا بەردەوام بوە چونکە دیارە هەتا ئەو ماوەیە
درێژتری خایاندبێت ئەو تەرزە هەڵبەستانە پتر پەیدا دەبێ. لە مەدا چ گومان نیە و
هەمان نیسبەت و تەناسوبی دوو قۆناغەکەی تری ژیانی حاجی لێرەشدا کاری خۆی
دەکات، بەڵام دەبێ پرسیارێک لە خۆمان بکەین و بڵێین ئایا کە حاجی گەڕاوە بۆ
کۆیێ ئاشی شێخ نەبی لە گەڕدا بوو؟

کێ دەڵێ بەینێک وەیا چەند ساڵێک بەسەر هاتنەوەی حاجیدا تێنەپەڕیوە بەر لەوەی
شێخ نەبی لیسی خۆی هاویشتبێتە کۆیێ! هەڵبەت کە مەعلوم کرا هاتنی شێخ نەبی
بەنیسبەت گەڕانەوەی حاجییەوە بە درەنگەوە بوە ئەوسا ڕاگەیاندنی کەم و زۆری
میقداریی هەڵبەستەکانی حاجی دژی شێخ نەبی تەنها ماوەی دوشمنایەتیەکە
دەگرێتەوە نەک هەموو قۆناغە ناوەندییەکەی عومری حاجی کە دیارە درێژتر دەبێ
لە ماوەی دوشمنایەتیەکە. «دوای کەمێکی تر ئەم لایەنە ساغ دەکەینەوە».

لەم موقارەنە و بەیەکتر گرتنە سەرەتاییەدا ئەوەی جێی متمانەیە کەمیی میقداری
هەڵبەستەکانە: بە وردی سەیری دیوانی حاجی بکەین لە چەند پارچە هەڵبەستێکی

کەم بەولاوە شیعری تێدا نادۆزیتەوە خەریکی زڕاندنی ناوی شێخ نەبی بێت وەیا هەر ناوی هێنابێت.

لەمەوە بە جۆرێکی ژوورووی گومان لێ کردن ساغ دەبێتەوە کەوا ماوەی ئەو هەرا و دوشمنایەتییە لەوانە نەبوە 5-6 ساڵی خایاندبێت. ژمارەی شعرەکان، کە زۆر کەمن، هەرگیز لە ماددەی دوو ساڵ پتر بەدەستەوە نادەن. بەڕاستی من کە ناوی دوو ساڵ دەهێنم پاڵ بە خامەی خۆمەوە دەنێم بەرەو مەودایێکی زەمەنی ئەوتۆ بشێ پێی بگوترێ «قۆناغی ناوەندی» لە بەرخاتری واتای وشەی «قۆناغ» کە دیارە دەبێ ئەوەندە درێژەی هەبووبێ پشووی تێدا وەرگیرابێت ئەگەرنا هەڵبەستەکان ئەوەند کەمن بایی چ ماوەیێکی دوو ساڵی ناکەن.

لێرەدا تێبینییەک دێتە بەر لێکدانەوەکەمانەوە کە دەبێ لە حیساباندا تێبخوێندرێتەوە، وەیا وەک پرسیار وەرامی بدرێتەوە: کێ دەتوانێ بڵێ بەشێکی ئەو شیعرانە لەناو نەچوون؟

بە پێی وردبوونەوەی من، یەکلا کردنی ئەم پرسیارە بەم جۆرە دەبێ:

1) لە ناوچوون تەنها بۆ شیعری ئەم قۆناغەی تەمەنی حاجی قادر بە ڕووداوی چاوەڕوان کراو دانانرێت، شیعری دوو قۆناغەکەی تری تەمەنیشی هەر لە ژێر حوکمی ئەم ئیحتیمالەدان.

لەبەر ئەمە نیسبەت و تەمەنیشی هەر لەژێر حکومی ئەم ئیحتیمالەدان. لەبەر ئەمە نیسبەت و تەناسوبەکە لە تێکڕای قۆناغەکانی ژیانی حاجی وەک خۆی دەمێنێتەوە، واتە زۆری و کەمی شیعری یەکێک لەو قۆناغانە بە زۆری و کەمی شیعری قۆناغێکی تر دەگیرێت و بەو پێیە درێژی و کورتی مەودایان ڕەچاو دەکرێت چونکە ژیانی حاجی چەندە، هەر هەندە بە بزربوون وەیا زۆربوونی شیعرەکانی ئەو ژیانە وێکهاتنەوە و لەبەریەک کێشرانەوەی بەسەردا نایەت بۆیێ مومکینە لە پەراوێزی مەحدودی ئەودا یەکێک لە قۆناغەکان لە چاو ئەوانی تردا کورت وەیا درێژ بێت.

2) لەلایەن فۆتان و لەناوچوونەوە، شیعری قۆناغی سێیەمی ژیانی حاجی قادر پتر لەگەڵ فۆتان و لەناوچوون دەگونجێت چونکە لە غەریبی و

بێکەسیدا شەخسی شیعرپاراستوو کەمتر چنگ دەکەون نەک لە مەفتەن و ناو خزم و عەشیرەت. ئەم تێبینییە یەکجاریش ڕێک دێت لەگەڵ ئەو شایەدیە گومان لێ نەکراوەی «جەلادەت بەدرخان» کە دەڵێ دیوانی حاجی قادرم بە منداڵی دیتوە و 800 لاپەڕەی ورد نووسراو بوە. وەک بەدیهیە ئاشکرایە بەشی هەرە زۆری ئەو دیوانە شیعری قۆناغی سێیەمی ژیانی حاجی بوون چونکە دیارە حاجی لە ڕۆژانی نیشتەجێبوونی یەکجارەکی کۆتایی ژیانیدا کە چ ئاوارەبوونی تازەی بەدوادا نایەت بۆی لواوە بە ڕاشکاوی شیعرەکانی ئەو ڕۆژگارەی لە کتێبدا کۆ بکاتەوە و بیانخاتە شێوەی «دیوان».

کە ئەمە دەڵێم ڕاستییەکی گرنگم لە بیروباوەڕەکەم پتەو دەکات: گەلێک لە شیعرەکانی دوو قۆناغەکەی تری تەمەنی حاجی، زووتر لە کۆیە و کوردستان بەجێ مابوون و هەر لەو شوێنانە پارێزرابوون، شیعرەکانی قۆناغی سێیەمی ژیانیشی هەر ئەوانەیان لێ پارێزران کە گەیشتنەوە کوردستان چونکە دەزانین دیوانە 800 لاپەڕەییەکەی جەلادەت بەدرخان دیتبوی دوای مەرگی حاجی لە ناوچوە و سووتاوە. هەموو دیوانی حاجی قادری پارێزراو لە 200 لاپەڕە تێپەڕ ناکات، بەو پێیە سێ بەشی پتری ئەو کتێبە 800 لاپەڕەییە بزر بووە کە زۆربەی شیعرەکانی قۆناغی سێیەمی تەمەنی حاجی پێک دێنن لەوانەی بە خەڵقی کوردستان نەگیشتون تا بیانپارێزن. ئەو شیعرانەی کە گوتم لە کۆیە و کوردستان دوای ڕۆیشتنی حاجی مانەوە و باشتر ئەوەیە بڵێم لێی بەجێمان هەر خۆیانن لەم دوو بەیتەی حاجیدا یاد دەکرێنەوە:

ئەی ڕەفیقانی وەتەن چەند غەزەلم ماوە لەوێ
لە کنارێکەوە تەقدیرە وەکو هەڵ بکەوێ

وەک سەفینە بگەڕێ بیخەرە بەر بەحری قسەم
حەیفە وەک من لە غەریبی بمرێت و نەتەوێ

بەمەدا دیارە حاجی قادر بەشێکی غەزەلەکانی لە کوردستان ماونەوە و لە یادی کردوون و ناتوانێ بیاننووسێتەوە و لە فۆتان ڕزگاریان بکات بۆیەیە داوا لە برادەرانی دەکات بۆی کۆ بکەنەوە و بیانپارێزن. بەڵام لە ناو ئەم لێکدانەوانەدا دەبێ جارێکی تریش حیسابی تایبەتیی بکەین بۆ قۆناغی کۆتایی ژیانی حاجی لە ڕووی ئەوەوە کە

کۆتایی ئەو قۆناغە پێویستی بە ساغ کردنەوە نیە وەک دوو قۆناغەکەی تر چونکە دەزانین لە 1897 بەسەر دەچێت. کە گومانێک هەبێ بە نیسبەت ئەو قۆناغەوە لە بارەی سەرەتاکەیەوە هەیە کەوا ڕێی تێ دەچێ لە ئەنجامی لێکدانەوەی هەڵە نەختێکی بدرێتەوە بە قۆناغی دوەم وەیا نەختێکی قۆناغی دوەم بەو بدرێتەوە. بەهەمەحاڵ ئەوپەڕی هەڵە کردن لەو حیسابەدا لە یەک دوو ساڵ تێپەڕ ناکات، کە دەزانین یەک دوو ساڵ لە چاو پتر لە 30 ساڵی مەودای ئەو قۆناغەدا خۆ نانوێنێ. هەر بەو پێیەش بزربوونی شیعرەکانی ئەم قۆناغەی ئەویش کەم تەئسیرە چونکە مەودای قۆناغەکە لایێکی زۆر ئاشکرایە، لایەکەی تریشی کەم بزرە. تەلەزگەی گەورە کە هەبێ لە لێکدانەوەی دوو قۆناغەکەی ترە چونکە دۆزینەوەی هەر دوو سەری سەرەتا و کۆتاییان کاری زیهن و فکرە.

پوختەی قسە و بەراورد کردن ئەوەیە، لە ناوچوونی شیعرەکانی حاجی قادر بنگەی نیسبەت و تەناسوبی دۆزینەوەی درێژی و کورتیی ئەو قۆناغانە تێک نادات. لەبەر ئەمە چەند و چۆنی شیعرەکانی حاجی دژی شێخ نەبی بە تەواوی ئەوە ڕادەگەیەنێ ماوەی دوشمنایەتیەکەیان درێژ بوە یا کورت، کە دەزانین بەپێی کەمبوونی شیعرەکان ماوەکەش کورت بوە.

بەڵام ئاخۆ دەتوانین بڕیار لەسەر ئەوە بدەین ئایا ماوەی دوشمنایەتیەکە بەقەدەر ماوەی هەموو قۆناغە ناوەندییەکە دەبێ، واتە لە ڕۆژی هاتنەوەی حاجی بۆ کۆیێ وەیا لە ڕۆژانی سەرەتای هاتنەوەیەوە دوشمنایەتیەکە دەستی پێکردبێ؟ ئایا شێخ نەبی بەر لە گەڕانەوەی حاجی هاتبوە کۆیێ؟ یاخود پاش گەڕانەوەی هات؟ ئەگەر پاش گەڕانەوەی حاجی هاتبێ چەند کات پاشتر بوە؟ پێی ناوێ من بڵێم، لە خۆوە دیارە ئەگەر شێخ نەبی بەر لە گەڕانەوەری حاجی بۆ کۆیێ لە کۆیێ بووبێت، ئەوسا ماوەی دوشمنایەتیەکە و ماوەی مانەوەی حاجی لە کۆیێ یەک دەگرنەوە چونکە مەعلوومە هۆی هەڵگیرسانی دوشمنایەتیەکە لە یەکەم ڕۆژەوە پەیدا بوە.

بەڵام کە حاڵ وەها نەبووبێت و گەڕانەوەی حاجی پێش هاتنی شێخ نەبی بۆ کۆیێ بووبێت ئەوسا ئیحتیمال زۆر دەبن. ڕەنگە تەفاوتەکە مانگێک بووبێت یا ساڵێک یا پتر.

یەکلا کردنی ئەم گرفتە تا ئەو ڕادەیەی هەموو ئیعتیرازان وەرام بداتەوە کارێکی ئاسان نیە چونکە چ بەڵگەیێکی بێ دەمەتەقە لەلای کەس سەری هەڵنەداوە حاڵ و بارەکە ساغ کاتەوە، نە بە نووسین نە بە گوتەی دەماودەم. خەبەرێکی بێشوبهەیە و پێمان گەیشتوە، شەڕیکی کوشندەی نێوان دوو نموونەی پێچەوانەی یەکترمان بۆ دەگێڕێتەوە بێ ئەوە چۆنایەتی هەڵگیرسان و ماوەی بەردەوامبوون و کاتی دەست پێ کردن و بڕانەوەی باس کردبێت هیچ سەرەپەتێکیشی بە دواوە نیە پەنجەی لێ گیر کەین و شوێنی کەوین.

لەگەڵ ئەمەشدا سەرەپەت لەلاوە پەیدا کردن بۆ یەکلا کردنی پرسیارەکە «مستحیل» نیە، چونکە قسەیێکمان بە دەستەوەیە بە خۆی و دەلالەتیەوە دەتوانێ تا سنووری سەپاندن تەرجیحی یەکێک لەو ئیحتیمالانە بکات. قسەکە لێرە بەپێشەوە (لە بەرگی یەکەمی ئەم نووسینە) بەپێی داخوازی جێگە باسی کراوە، وا لێرەشدا بۆ ئەم مەبەسە نوێیە دێتەوە ناو نووسینەوە. لە جیلی پێش خۆمانەوە پێمان گەیشتوە، لادانی شێخ نەبی لە ڕێی ڕاست و دروستی تەریقەت و ئایین بەیەنێک دوای هاتنی بۆ کۆیێ بوە، تەنانەت لەکاتی خۆیدا گوتومە (لە بەرگی یەکەمدا) ئەگەر شێخ نەبی لە سەرەتاوە بەد بوویایە پیاوێکی وەک حاجی مەلا ئەسعەدی جەلیزادە یارمەتی هاتنی شێخ نەبی بۆ کۆیێ نەدەدا.

ئەم ڕاستییە ڕێ لەوە دەبڕێتەوە کەوا هاتنی شێخ نەبی دوای گەڕانەوەی حاجی بێ بۆ کۆیێ چونکە ماوەی مانەوەی حاجی بایی ئەوە ناکات شێخ نەبی تێدا هاتبێتە کۆیە و بەیەنێک بە پیاوچاکی ڕابواردبێت و ئەوجار کەوتبێتە سەر خراپە، بەدوا ئەوەشدا یەک دوو ساڵان دوشمنایەتیەکەی نێوانیان بەردەوام بووبێت پێش ئەوەی حاجی بۆی دەرچوبێت[75]. بەڵام دەشێ لە پشووی پیاوچاکی شێخ نەبی دا حاجی قادر بۆ کۆیێ هاتبێتەوە، ئیتر بایی درێژایی ئەم پشوە لە ماوەی دوشمنایەتیەکەیان داشکێنرێت، کە ئەمە نەختێک نیسبەت و تەناسوبە کە دەگۆڕێ. لەگەڵ ئەمەشدا ئەگەر ڕووداوەکە بە هەموو ئیحتیمالێکیەوە بخەینە ناو سەرلەبەری باری نەفسی و ماددی حاجی قادر و لەبەر تیشکی داخوازی ئەو حاڵەوە سرنجی لێبگریت، کە لێرە

[75] لە لاپەڕە 255- دا بەرگی دوەمی «حاجی قادری کۆیی» ئەمە دەخوێنیتەوە «کاتێک حاجی هاتۆتەوە، ئاشی شێخ نەبی لەگەڕدابوە».

بەدواوەش ئەو سرنجە هەر ڕادەگرین، دەگەینە ئەو باوەڕە کەوا ماوەی قۆناغەکە و دوشمنایەتیەکە هەندەی یەکترن وەیا چ فەرقێکی ئەوتۆ لە بەینیاندا نیە تێبخوێندرێتەوە. بۆیە دەتوانین دڵنیابین لەوەدا کە دەلالەتی زۆربوون و کەمبوونی شیعرەکانی حاجی دژی شێخ نەبی کورتبوون و درێژبوونی هەموو قۆناغە ناوەندییەکە دەگرێتەوە نەک تەنها دوشمنایەتیەکە.

لەم لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەیەوە بۆم دەردەکەوێ حاجی قادر لە ماوەی دوو ساڵان لە کۆیێ نەماوەتەوە دوای بەسەرچوونی گەشتی خوێندنی مەلایانەی. کورتبوونی ماوەی مانەوەی حاجی لە کۆیێ لەگەڵ هەموو سەروبەرێکی زانراوی باری ژیانیدا ڕێک دێت و دەگونجێت وەک لەم دێڕانەی خوارەوەدا بۆت دەر دەکەوێت:

1) ڕێک دێت لەگەڵ درێژە پێدانی ئانقەستی خوێندنی فەقێیەتیەکەی لە غەریبایەتیدا.
2) ڕێک دێت لەگەڵ کەمبوونی هەڵبەستی دژی شێخ نەبی[76].
3) ڕێک دێت لەگەڵ خەریک نەبوونی حاجی بە ماڵ پێکەوەنانەوە وەیا بەگوزەرانەوە.
4) ڕێک دێت تەنگە لەگەڵ تاوبوونی حاجی بەدەست هەژاری و نەدارییەوە لە جێگەیێکی وەک کۆیێ کەوا چ عوزری غەریبی و ئاوارە و نابێتە دڵدانەوە و خۆ پەڕاندنەوە لە ئاست قسە و توانجی ناحەزانەی یەکێک بیەوێ هەژاری بەعەیب بگرێ. حاجی لە غەریبی و ئاوارەییدا لێی بە کەم نەدەگیرا کە ماڵی دونیای نیە، بەڵام کە نیشتەجێ بوو حاڵەکە دەگۆڕێ.
5) ڕێک دێت لەگەڵ بەخۆنازینی حاجیدا کە دیارە ژیانی بێدەسەلاتانەی یەکجار لێ گران دێت، لە ناو مەفتەن و کەس و ناسیاواندا،
6) ڕێک دێت لەگەڵ هەموو تێبینیەکانی تر کە لێرە بە دواوە دێتە پێش.

---

[76] بۆ پتر ڕوونبوونەوەی لێکدانەوەی ئێرەکانە دەبێ چاو بخشێنرێتەوە بە بەشی دوەمی کتێبی «حاجی قادری کۆیی» بەتایبەتی لە لاپەڕە 190 ەوە بەدواوە.

بەو پێیە ئەگەر نووسینی حاجی قادر بەسەر دیواری مزگەوتێکی سابلاغەوە لە ساڵی 1279 دا بە شایەد قبووڵ کەین و بەمەدا گەڕانەوەی بۆ کۆیێ لە ساڵی 1277 ەوە هەڵەنگێوین، کە دەست هەڵ گرتنی حاجی قادر لە نووسینی حاشیان بەسەر کتێبی سیوطیەوە لە کۆتایی 1276 ڕایگەیاند، شتێکمان کردوە لە هەموو ڕوویێکەوە لەگەڵ داخوازیی حاڵدا دەگونجێت.

سەرەڕای داخوازیی حاڵ و هەموو تێبینی و لێکدانەوەکانی تریش کە بۆ ئەم باوەڕەمان دەبات، لە هیچ لایێکیشەوە دەنگ و سەروسۆراغێک پەیدا نابێت ئەنجامێکی تر بەدەستەوە بدات، واتە ئەگەر ئەم لێکۆڵینەوەیە نەبێ، کە وا بەڕاست یا بەهەڵە، ڕۆژ و ساڵ و زەرفێک دەست نیشان دەکات بۆ گەڕانەوەی حاجی قادر بەرەو کۆیێ، چ تروسکەیێکی تر نیە زرە ڕۆشناییەکیش باوێتە سەر ئەو کەین و بەینەوە و تارماییەکی لێ بخوێنێتەوە. نووسەران و دیوانەکانی حاجی لەوە پتر ناڵێن کە گەشت و گەڕانێکی خوێندنی فەقێیانەی بوە لە باڵەکەتی و کوردستانی ئێراندا، ئاوارەبوونیشی بوە بەرەو تورکیا، لەوە بەولاوە وەرامێکی هیچ پرسیارێک نادەنەوە لە «چەند و چۆن و کەی و کوا و کێ...» ی ئەو گەشت و خوێندن و ئاوارەبوونە.

خۆ ئەگەر بێین لە جیاتی ئەو خەڵقەی تا ئێستا هیچیان لە بارەی ئەو پرسیارانەوە نەگوتوە ساڵێکی تر بکەین بە ژوانی هاتنەوەی حاجی بۆ کۆیێ، دەبێ خەریک بین بەدوا ڕاستیی تری تازە بە تازەدا کە بگونجێت لەگەڵ ڕاگەیاندنی ئەو ساڵەدا، لەو ڕووەوە کە ساڵێکی تر جگە لە ساڵەکەی 1279 مەودای قۆناغە ناوەندییەکەی ژیانی حاجی لە کۆیێ دەگۆڕێت یا بەرەو کەمتر وەیا بەرەو پتر، لە هەردوو حاڵیشدا دەبێ مەوداکە بخرێتەوە ناو چارچێوەی مێژووییەوە و لەگەڵ یەکتردا ڕێک بێن و حوکمی دڵ و دەروون و نەفس و باری ژیانی حاجیش لەو ساڵە ڕازی بێت، ئەوساش کە توانرا گونجانی نێوانیان بدۆزرێتەوە دەبێ قەناعەتێکی نوێ لە بارەی ئەو لایانانەی حاجی قادرەوە پەیدا بێت چونکە ئەوانیش لێیان داوا دەکرێ لەگەڵ کردار و گوفتاری حاجی لە زووتر و دواتردا ڕێک بێن.

بە نموونەی ڕوون کردنەوەی مەبەست دەڵێم ئەگەر ڕازی نەبین بەو شایەدیەی کە گوتی نووسینی حاجی بەسەر دیواری مزگەوتێکی سابلاغەوە هەیە لە ساڵی 1279 ی کۆچیدا و پێمان داگرت لەسەر ئەوە کە دەست هەڵ گرتنی حاجی لە کتێبی سیوطي لە کۆتایی 1276 دا، دەست هەڵ گرتن لە هەموو خوێندنی مزگەوت بە

نیازی هاتنەوە بۆ کۆیێ، ئەم پێدا گرتنەمان پێمان دەسەلمێنێ کە حاجی قادر نیمچە مەلا بوە نەک مەلا چونکە خوێندنی سیوطي کەسی نەکردوە بە مەلا (ئەوەی ڕاستی بێ حاجی تا لاپەڕە 144 ی سیوطي حاشیەی هەن. کتێبەکەش هەمووی 267 لاپەڕەیە). ماددەی بنجی لە خوێندنی مزگەوت هەمووی دەکەوێتە پاش سیوطییەوە. خۆ ئەگەر بۆ ئیسپات کردنی مەلایەتیی حاجی ئەو ئیحتیمالە بگرینەبەر کەوا حاجی دوای گەڕانەوەی بۆ کۆیێ خوێندنی تەواو کردوە ئەوسا دەبێ بکەوینە سەر پەیدا کردنی ئیمکانی خوێندن بۆ حاجی لەو وەزعە تایبەتیەدا، وەرامی ئەو پرسیارەش بدەینەوە کە لە خۆمانی بکەین. ئایا حاجی بەدوا ئەم هەموو ساڵانەی خوێندنی لە کوردستانی ئێراندا بۆچی گەڕاوە کۆیێ بەر لەوەی خوێندنەکەی تەواو بکات؟

چی بوو حاجی هاندا وەیا ناچاری کرد بە کاڵی و ناپوختەیی بگەڕێتەوە؟ سەرەڕای ئەم پرسیار و تێبینیانە و گەلێکی تریش، دەبێ بێسەبەب قسەیێکی نامیلکەکەی مەلا عەبدولڕەحمانی خزمیشی بەرپەرچ دەینەوە کە دەڵێ حاجی قادر هەتاکوو خوێندنی تەواو کردوە هەر لە سابڵاغ ماوەتەوە (ناوەڕاستی لاپەڕە 330 لە بەشی دووەمی حاجی قادری کۆیی).

من ناو ناوە گومانم کردوە لە هەندێک قسەی ناو نامیلکەکە، بەڵام لەم گومانەدا دوو تێبینی هەن:

یەکەم: گومانەکان لەو شتانەن کە مەلا عەبدولڕەحمان لە زاری خەڵقیان دەگێڕێتەوە. سەیرێکی لاپەڕە 332 ی بەشی دووەمی ئەم نووسینە بکە دەبینیت مەلا عەبدولڕەحمان باسی بەیەکەوە ڕۆیشتنی حاجی قادر و کەیفی جوانڕۆیی بۆ ئەستەمبۆڵ دەداتەوە بە قسەی خەڵق و ڕستەی «دەڵێن لەگەڵ فەقێیەکی شارەزووریی کە ناوی کەیفیی بوە لە کۆیێ دەڕۆن... دەچنە ئەستەمبۆڵ» بەکار دێنێت.

دووەم: هۆی گومانەکە ئەوەیە کە شتە گومانلێکراوەکە لەگەڵ ڕووداوی تری گومانلێنەکراودا ڕێک ناکەوێت. لە هەڵوەستی وەهادا پێویستە گومانی بە بنج حیسابی بۆ بکرێت بەڵام ناشێ سێبەر باوێتە سەر باسی ئەوتۆوە لە چ لاییکەوە سێبەری گومانی لەسەر نەبێت.

لەم شادیەی مەلا عەبدولڕەحمان کە دەڵێ حاجی قادر خوێندنی لە سابڵاغ تەواو کردوە نەک هەر هۆی گومان لێ کردن نیە و بەس، هەرچی ڕاستیی بێشوبهە و حوکمی ڕووداو و داخوازی حاڵیش هەیە پشتگیری لێ دەکەن و بەڕاستی دەگێڕن.

بەلای ڕای منەوە بەردەوامبوونی حاجی لەسەر خوێندنەکەی تا کۆتایی پێهێنان لە سابڵاغ و شوێنی تری کوردستانی ئێران تاکە شیمانەیێکە لە ناو تێکڕای وەزعی ماددی و نەفسی حاجی قادر لەو سەردەمەدا. چەند لاپەڕەیەک بەرەوپێش هەڵدەیتەوە دەبینی گوتومانە حاجی بە ئانقەست خۆی لە گەڕانەوە بۆ کۆیێ دەدزیەوە. کە ئەم لێکدانەوەیەم ڕاست بێ، چ هۆیانیش نابینم بۆ گومان لێ کردنی، ڕاستەوخۆ ئەوە دەسەپێنێ کە حاجی بەر لە تەواو کردنی خوێندنەکەی بۆ کۆیێ نەهاتۆتەوە چونکە بەهانەی لە خوێندن باشتر بە دەست ناکەوێ بۆ خۆ تەفرەدان و خەڵق دەمکوت کردن بە هۆیێکی ڕێکوپێک لە ئاست نەهاتنەوەی بەرەو ماڵ و خزم و کەس. ئەرێ کاکە حاجی بۆچی ناچیتەوە کۆیێ؟ کاکە گیان دەخوێنم !!

وازهێنانی حاجی لە کتێبی سیوطي، لە سەرەتاکانی ساڵی 1277[77]، ئەویش لەلای خۆیەوە دەلالەتێکی هەیە کە حاجی بۆ مەبەستی تێهەڵکشان لە ماددەکانی سەروی خوێندنی مزگەوت وازی لە خوێندنی ڕێزمانی عەرەبی هێناوە. بێگومان لێبوونەوە لە باسەکانی دوای سیوطي 2 3 ساڵان بەلای کەمەوە دەخایێنێ. لە بەر ئەمە یەکجار لە باوەڕ نێزیکە حاجی قادر تا ساڵی 1279 لە دیوی کوردستانی ئێران و دەوروبەری سابڵاغ مابێتەوە و ئەو شیعرە باسکراوەی بەسەر دیواری مزگەوتێکی سابڵاغەوە نووسیبێت. دەبینی هەر جارە کە ڕووپەڕێک لە دەفتەری ژیانی حاجی هەڵ دەدەینەوە و بەوردی لە ڕاگەیاندنەکەی دەگەین، لەخۆوە دەگونجێ لەگەڵ ئەو لێکدانەوەیەی لەم چەند لاپەڕانەدا خستمنە بەر چاوی خوێنەرەوە.

---

[77] حاجی لە 20 ی مانگی دوایی ساڵی 1276- ی کۆچی گەییشتۆتە لاپەڕە 121 ی کتێبەکەی سیوطی، لەوە بەولاوە تاکو لاپەڕە 144- بەردەوام بوە لەسەر حاشیە نووسین. دیارە ئەم 23- لاپەڕەیەی دوای 121 چەند مانگێکی خەریک کردوە. ئەم لێکۆڵینەوەیە لە بەشی دوەمی کتێبی «حاجی قادری کۆیی» دا کراوە.

وا دەزانم ڕێی تێدەچێ چەندێک خەبەری نوێ و لێکۆڵینەوەی تازە بە تازە بێتە ناوەوە هەمویان بێ تەگەرە و بێ خۆپێوە ماندوو کردن بچنە جێگەی لەبار و چاوەڕوان کراوەوە لە ناو چارچێوەی ئەم تابلۆیە زیهنیەی هەڵکەوتی نەفسی و ماددی حاجی قادردا. ئەوەندەی ویستبێتم ئەم وێنە خەیاڵییە هەمەڕەنگەی وەزعی حاجی دوای خوێندنی فەقێیەتی بگۆڕمەوە بە یەکێکی تری ئەوتۆ یەک دوو ساڵێکی تر بخاتە سەر ئەو ماوە کورتەی پڕ دەردی سەر و وەتەنگ هاتنەوە، دەستم ناگاتە هیچ بەڵگەیێکی ماددی وەیا بەراوردیی کە نەختێک لە تاکە یەک ڕەنگی ڕەنگەکانی ناو تابلۆکە زڕ بکات بەڵکوو بتوانم، یاخود بوێرم، ڕەنگێکی تری لێ بدەم
کە هەندێک لە شێوەی تابلۆکە بگۆڕێ، بەڵام ئەم ئیمکانە پەیدا نابێ چونکە ڕەنگە نوێیەکە لە ناو تێکڕای تابلۆکەدا وەک پینەی ڕەشی سەر قوماشی سپی لێ بەسەر دێت.

واقیع خۆی لە خۆیدا دژایەتی و «تناقض» لەگەڵ خۆیدا هەڵناگرێ، واتە ناشێ هەندێکی واقیع هەندێکی تری بەدرۆ بخاتەوە، تەنانەت ئەوەی پێی دەڵێن «وحدة الاضداد» کە من هەندێ تێبینیم هەیە لە بارەیەوە، ئەویش لێمان ناسەلمێنێ بۆ ئەوە بچین کە مانەوەی حاجی لە کۆیێ درێژی کێشابێتەوە لە حاڵێکدا هەرچی هۆیەکی بزوێنەر و کاریگەر هەیە لە دەوروبەر و دڵ و دەروونی حاجیدا دژی ئەو درێژکێشانەوەیە بوە. بەلای «وحدة الاضداد» یشەوە پەلە کردنی حاجی لە جێهشتنی کۆیە و کوردستان ڕێکتر و گونجاوتر دێت لەگەڵ ئەو هەموو هاندەرانەی کە حاجی بەرەو دوورکەوتنەوە و دژی مانەوە پاڵ پێوە دەنێن. باوەڕ ناکەم هیچ تیۆرییێک و لێکدانەوەییێک هەبێ بتوانێ «زۆر مانەوەی حاجی لە کۆیە» بکاتە ئەنجامێکی ئاسایی و چاوەڕوانکراو بۆ چەندین هۆی بەهێزی «کەم مانەوە».
تیۆرییێک و ڕاییێک بیەوێ پێمان بسەلمێنێ کەوا حاجی 5 — 6 ساڵان خۆی ڕاگرتوە لەو وەزعە یەکجار ناخۆش و تەنگ و تاڵەدا دەبێ لە گۆڕستانی مێژوو هۆییێکی تازەی نەبیستراو و نەزاندراو سەر ئەرز خاتەوە تەبریری ئەو مانەوە دوور و درێژ و بێلزومە بکات چونکە لەو هێندە زانینە بێگومانەی کە لەبارەی حاجییەوە پێمان گەیشتووە تاکە یەک هێمای ڕاگەیاندنی تێدا نیە بە تەئویلیش ببێتە جێ خۆشکەرەوەی زۆر مانەوەی حاجی.

من له جیاتی کەسێک بیەوێ ڕایەکی ئەوتۆیی بکاتە ماکی لێکدانەوە بۆ شوێن هەڵ گرتنی ڕێبازی ژیانی حاجی، لە لای خۆمەوە بە «تبرع» گەلێک هاتوچۆی زیهنیم کردوە و چەندین هۆی جوداوازی خەیاڵکردم بە ئاسۆی ئیحتیمالدا تێپەڕاندوە بەڵکوو بەسەر شتێکدا دەکەوم لێی بوەشێتەوە بڕیاری یەکجارەکی حاجی بۆ ئاوارەبوون هەندێکی تر بوەخرێنێ لەوەی من تا ئێستا پێی گەیشتوم هیچ هۆیێکی ئەو تۆم نەدۆزیوەتەوە مومکین بێ لەو ژیانە یەکجار کز و بێهێزەی حاجی هەڵقوڵێ و دڵی دابین کاتەوە لە ناو جەهەنەمی بێئۆقرەیی و بێوەزع و بێماڵی و بێحاڵی و بێ هەموو شتێکدا لە تەکە هۆی «عیشق» بەولاوە کە پەکی نەکەوتوە لەسەر سەرمایەی ماددی. لە حاڵی وەهادا ڕێی تێدەچێ سۆزێکی دڵداری سوتێنەر جڵەوی ئیرادە لە دەست مرۆڤ دەرێنێت و گوێ نەداتە تەگەرە و گرفت و هەژاری و ترس و هیچ شتێک، ئیتر ڕەفتارێک بە دڵدار بکات دژی هەموو مەنتیقێکی ژیانی عادەتی بێت. تۆش و منیش دیتوومانە عیشق ئەوەی بە مرۆڤ کردوە و وەهای ئازا و بێپەروا کردوە کە هیچ هۆیێکی ژیانی ئاسایی ڕۆژانە پێی ناکات.

بەڵام ئەم هۆیە خەیاڵییەی عیشق بەر لەوە ڕووناکایی بوون و ژین ببینێت، لە هەناو و منداڵدانی زیهندا دەخنکێت چونکە لە گەلێک لاوە بەڵگەی ڕووخێنەر و خنکێنەر هەناسەی دەبڕن و مردەزادی دەکەن. کە بگەڕێیتەوە بۆ بەشی دووەمی «حاجی قادری کۆیی» لەوێدا بە درێژی لایەنی نەبوونی دڵداری و عاتیفەی خۆشویستنی سوتێنەر باس کراوە و بەلای خۆمەوە بۆتە ڕاستییێکی سەلمێنراوی بێدەمەتەقە. هەر لەگەڵ ئەم ڕاستییەشدا هەموو ئەو هۆیە ماددییەی کە ڕێیان نەداوە بە حاجی بیری بۆ ئافرەت بڕوا، ئەوانیش بەدرێژییەوە هاتونەتە ناو حیسابی لێکۆڵینەوە.

پاش ئەمانەش نەبوونی دەنگ و باسی دەماودەم لە بارەی دڵداری حاجی قادرەوە لەو قۆناغە ناوەندییەی ژیانی کۆیەیدا خراوەتە سەر خەرمانی زیهنکاری و لێکدانەوەوە. پوختەی قسەی زۆر درێژی لێرە بە پێشەوە ئەوەیە کەوا دڵداریی لە هیچ ڕوویێکەوە نابێتە ئەو ئیحتیمالە، ئەو تاکە ئیحتیمالە، کە حاجی وەخراندبێ لە ئاوارەبوون. لێرەدا ئەم وێنە تصورە دێتە بەر چاو: حاجی قادر هەر دڵداری دەیوەستاند لە ناو زەرف و وەزعێکدا کە هەرگیز نەیدەهێشت بیر لە دڵدار بکاتەوە وەیا دڵی بۆ ئافرەت بڕوا.

وا دەزانم پێی ناوێ لەمە زیاتر بەدوا هێنانەوە و پەیدا کردنی بەڵگەی یار و نەیار بکەوم لە زەمینەی ڕوون کردنەوەی لایەنی درێژی و کورتیی مانەوەی حاجی قادر لە کۆیێ، هەرچەند دەشزانم ساغ کردنەوەی پرسیارەکە هەموو جۆرە خۆپێوە ماندوو کردنێک دەهێنێ نەک لە یەک سەرەوە بەڵکوو لە گەلێک سەرەوە:

1) بەنیسبەت خۆمەوە ئەم دەرفەتەی تۆژینەوە لە بارەی سەرلەبەری ژیان و ئەدەب و خەبات و شەخسیەت و هەوراز و نشێوی باسی حاجی جارێکی تر پەیدا نابێتەوە، لە فەرزی پەیداش بێتەوە ساغ کردنەوە و تۆژینەوەی وەهای تێدا دەکرێت کە ئێستا بە بەر هەوڵ و کۆششەوە هەیە، ئەوسا ئەگەر بشکرێ دەبێتە کارێکی پچڕپچڕ و کەم و کەسر. کەواتە ئێستا لێ ببمەوە چاکترە نەک هەڵیگرم بۆ دوارۆژێکی بزر و نەزانراو، وەیا ئەرکەکە باوێمە بەر جوامێری کورددۆستی لێرە بەدواوە کەوا ڕەنگە ئەوەندەی منیش پێی نەکرێ خۆ تەرخان کردوو بکات بۆ هەڵ کردنەوەی شریتەی بەسەرهاتی حاجی.

2) بۆ ئەو کەسانەی لە ئێستا و دوارۆژدا خەریکی نووسین بن لەسەر باسی حاجی قادر و بیانەوێ لەو نووسینانەدا پتر نهێنی لە ژیانی ئەودا وەیا لە تێکرای مێژوو و کۆمەڵایەتیدا دیارخەن و نیگای خەڵقی ئیمڕۆ و دوارۆژی پێ فرەوانتر بکەن، دیارە بێگومان تاکوو سەرچاوەی نووسراوی وەک ئەم نووسینە هەناسەدرێژتر و بە قووڵداچووتر هەبێ چاکتر و سوودبەخشتر دەبێ بۆ خۆیان و بۆ خەڵقەکەش، کەمن بتوانم لە ئیمڕۆوە بە لێکۆڵینەوەی تایبەتی و ئەرکی پێوە خەریکبوونی خۆم دیاردەی زۆربوون و کەمبوونی شیعری حاجی دژی شێخ نەبی بکەم بە بنگەی نیسبەت و تەناسوبی کورتبوون و درێژبوونی ئەو قۆناغەی شیعرەکانی تێدا گوتراون، پێویست بەوە نامێنێ پشکنەری لێرە بەدواوە زیهنکاریی دوور و درێژ و دووبەختی بکا بۆ دۆزینەوەی دیاردەکە، ئیتر یا بۆی دەدۆزرێتەوە یا نادۆزرێتەوە چونکە لەوانەیە ببرای ببرای زیهنی بۆ ئەم لایەنە نەڕوات.

پشکنەری ئەم باسە زاد و تێشوویەکی پوختەی لەبەر دەستدا دەبێ کە دەشێ ببێتە خۆراکی خامە ڕەنگینەکەی بۆ ئامادەبوون لە گەشتی بەولاوەتری ئەو سنوورەی منی گەیشتومێ لە باسی حاجی قادردا. وا بزانم چ ڕەخنە پەیدا نابێ لەوەدا کە بڵێم هەتا

لایەنی زانراو و ساغکرایەوە لە باسێکدا پتر بێ ئەرکی تۆژەرەوە سووکتر دەبێ لە دۆزینەوەی زانیاریی تازەدا.

3) ئێمە کە توانیمان، بە یەکجاری وەیا بە شێوەی تەرجیح، ماوەی مانەوەی حاجی لە کۆیێ بخەینە نێوان سالانی 1279-1281 وەیا 1282 وەوە، دەتوانین شیعری ئەو قۆناغەی ژیانی بخەینە ناو لیستەی زەمەنی ڕاست و دروستەوە، واتە کە بۆمان ساغ بۆوە فلانە بڕە شیعر وەیا تاکە بەیتی لەو ماوەیەدا گوتوە دەرحاڵ پەراوێزێکی زەمەنی سەروبن ئاشکرای نێوانی 1279-1281 وەیا 1282 ی بە دەوردا دەکێشرێت و جێگەی هەڵبەستەکە، وەک دانەی ناو تەزبێح، لە زنجیرەی سالانی عومری حاجی قادردا ئاشکرا دەبێت، ئیتر بەدوا ئەمەدا دەتوانین سرنج ڕاگرین لە پلەی هەڵکشانی بەهرەی بوێژیی حاجی. هەروەهاش کە ساڵی دانانی یەکێک لە هەڵبەستەکانی زانرا، چ بەهۆی واتای ناو هەڵبەستەکەوە بێ وەیا لە ڕێی هۆیەکی دەرەکییەوە بێ وەیا لە ڕێی لێکدانەوەیێکی زیهنییی قووڵ و خەستەوە بێ، دیسانەوە دەزانین نیسبەتی ئەو هەڵبەستە لەگەڵ قۆناغەکەدا چیە. جا ئەگەر لە هەڵبەستەکەدا گیانی کوردایەتیی هەبوو ڕاستەوخۆ دەزانرێ هی ساڵەکانی ناوەندیی نیە و هی دواترە. خولاسە بە زانینی ماوەی قۆناغەکانی ژیانی حاجی گەلێک لایەنەکانی تۆژینەوە لە بارەی هەموو ئەو ژیانەوە ئاشکراتر دەبن. خۆ ئەوەی ڕاستی بێ دەرخستنی مەودای ئەو قۆناغانە خۆی لە خۆیدا بە ئامانج دەگیرێ لە تۆژینەوەدا گریمان هیچ ئەنجامێکی تریشی لێ پەیدا نەبێ. مرۆڤ حەز دەکا شتان بزانێ وەک ئەوەی کە من یا تۆ حەز دەکەین لە خوێندنەوەی مێژووی عەباسیەکان بزانین هەر یەک لە خەلیفەکان چەند ساڵیان فەرمان ڕەوایی کردوە وەیا چەند ساڵ ژیاون وەیا.. وەیا... ئەم گوتەیەشم هەر لە جۆری بەدیهیە حیساب دەکرێت و بەدوا کەوتنی پتری ناوێت، بەڵگەشی پێویست نیە.

4) لێکۆڵینەوەی تێرو پڕ و بێ کەلەبەر لە بارەی حاجی قادرەوە داوا لە نووسەر دەکات، لە ڕادەی توانادا، بەتالایی نەهێڵێتەوە لە هیچ بار و لایەنێکی ژیانی. کە ئەمە وا بێ، دیارە گومانیش نیە لە وەها بوونیدا، ساغ کردنەوەی ماوەی قۆناغی نێوان دوو قۆناغەکەی تر کە ئەو چەند ساڵە دەگرێتەوە وا لێرەدا دەمانەوێ سنوورێکی مەعقولی بۆ دانێین، کارێکە تابڵێی گرنگ لە ناو زنجیرەی سەرلەبەری

باسی «حاجی قادر» دا. ناشێ ئەو قۆناغە گرنگە بێ تۆژینەوە و ساغ کردنەوەی ورد و قووڵ و دروست بەجێ بهێڵین و دڵی خۆشمان خۆش کەین بەو تۆژینەوە و ساغ کردنەوەیە.

ئێمە کە هاتین ڕێمان بە خۆمان دا بە سووک و ئاسانی دەستی کنە کردن و تەتڵە کردن لە چەند و چۆنی ئەو قۆناغە بکێشینەوە چ پێویست نامێنێ خۆمان بە حاجی قادرەوە خەریک کەین چونکە باسی حاجی بریتییە لە تۆژینەوەی ئەوتۆیی، کە دەست لە لێکۆڵینەوەی قۆناغێکی هەڵگرین پێی ناوێ خۆمان بەوانی ترەوە ماندوو بکەین ئیتر دەبێ دەست لە هەموانیان هەڵگرین و دەفتەرمان بپێچینەوە.

حاجی لە نێوان کەسانی مێژووی کورددا کەسێکە دەبێ لەبەر هەر هەنگاوێکی کە بە درێژایی تەمەنی هەڵی نابێ مەشخەڵی ڕوون کردنەوە و تاریکیی ڕەواندنەوە هەڵ بکرێ و سوود لە دۆزراوەکانی بەر ئەو ڕووناکییە وەربگیرێ و پەندی لێ هەڵێنجرێ. تۆ جارێ واز بێنە لە گەورەیی شەخسیەتی حاجی، هەر لەوەندە ڕامێنێ کە حاجی ناو شۆرەت و شوێنەواری چەندین کەسی کوردی لە ئەدیب و مەلا و جوانمەرد و ئەمیر و شێخ و شایەر و چەندین جێگە و وڵات و شاخ و داخ و دەشتودەر و زێ و شار و گوندی کوردستانی نووسیوە و لە فۆتانی پاراستوون و بەو پاراستنە هەرچی قابیلی مردن بوە لە خاوەنی ئەو ناوانە، بۆ ئێمە و دوارۆژی کوردی نەمر کردوە؟ لە ئاست ئەم وەفا و چاکە گەورەیەدا دەبێ ئێمە چ هەڵوێستێک بە خۆمان ڕەوا ببینین؟ بەر لە 1300 ساڵ زیاتر قورئان فەرمویەتی «هل جزاء الاحسان الا الاحسان»! خۆ دەبێ ئێمەی سەردەمی مرۆڤایەتی و نیشتیمانپەروەرایەتی و حەقپەرستایەتیی بەقەدەر بەهای پەند و ژیریی 1300 ساڵ لە مەپێش کە ئەوسا بە جۆرێکی گشتی مەفهومی وەک پەندەکەی ناو قورئان بە ناو گەلاندا بڵاو نەبووبۆوە، چاکەی ئەو خاوەن چاکەیە بدەینەوە بە تایبەتی کە لەم ڕۆژگارەدا پاراستن و زیندوو کردنەوەی ناوی ئەو مرۆڤانەی لە هیچ مەیدانێکدا بە شاگردی حاجی قادریش نابن بۆتە ئەلف بێتەکەی کۆمەڵایەتی، کەواتە بەسەرمانەوەیە کەوا نەک هەر دەبێ لە جێگەی چاکەی ئەودا چاکەیێک دانێینەوە بەڵکوو ئەگەر پێمان بکرێ دەبێ فەرقی بەینی چاکەخوازیی سەردەمی ئەو و سەردەمی خۆشمان لە چاکە دانەوەکەدا تێبینینەوە تاکوو هەر نەبێ لە نەزەر نیگای جیهانی پڕ نووری ئەم

ڕۆژگارەماندا نانکوێر دەرنەچین. پاش ئەم حیسابانەش دەبێ ئەوەمان لەبیر بێ هەموو چاکە کردنێک لەگەڵ ناو و شۆرەت و شەخسیەتی حاجی و پیاوی کوردی وەک ئەودا چاکە لەگەڵ خۆدا کردنە چونکە وەک خێراتی دوای مردوو سوودەکەی بە زیندوان دەگات. بەوپێیە، بێموجامەلە کردن لەگەڵ گیانی مردووی وەک حاجیدا، خەریکبوونمان بە مەزنە پیاوی لێهاتوو و هەڵکەوتووی شانازیی پێکراوەوە ڕاستەوخۆ چاکەیێکی دوای مەردنە لەوەوە بە خۆمان دەگاتەوە. لێرەدا بەیتی شاعیرێکی عەرەبی سەردەمی عەباسیم بە بیر دێتەوە کە لە لاواندنەوەی جوامێرێکی ئەو ڕۆژگارەدا گوتوەتی:

فتى عيش في معروفة بعد موته
كما كان بعد السيل مجراه مرتعا

5) لەمانە هەمووی وازبێنە و دەست بەم ڕاستییەوە بگرە و لە دەستی خۆتی مەترازێنە. هەرچی بابەتێکی سەر بە کوردەوارییەوە هەیە بگرە لە یاری کەوشەک و تەشی و خەڕەکیەوە تاکوو دەگاتە ئەدەب و مێژوو و چارەنووسی، تێکڕایان لە بن تەبەق ئەندەر تەبەقی شراوەیی و نەزانراوی و بایەخ پێنەدراوی و خۆ تێنەگەیاندندا سوڕگوم بوە. چەند ساڵێکی دوایی لێ بترازێ، لەوەتەی کورد هەبوە بە دەگمەنێکی وەک نامەوجود نەبێ لەسەر هیچ بابەتێکیەوە نەنووسراوە، نووسراویش بێ ئەوەندە کەموکورتە وەک جزیرەیێکی بچووکی زانراو لە ناو دەریای محیطی نەزانراو بێ وایە. لەو چەند ساڵەی دوایشدا، بەهۆی گەلێک حاڵوباری جودا جودای بە هێزەوە ئەوەی لە بابەت کورد نووسرابێ بە تێکڕایی لە تۆژاڵی ڕووکەشی ماددەی نووسینەکەی تێپەڕ نەکردوە.

سەیر لەوەدایە نووسەرانی کورد کە دێن لە بارەی شتی غەیری کوردەوە دەنووسن مەیدانی بەرفرەوانتر و بەپیتتر دەگرنە بەر لەوەی کە لەبارەی کوردەوە دەینووسن وەیاخود هەرنەبێ بە زۆری لەکولانەی نیگا و نەزەرییەی خەڵقی ترەوە سەیری بابەتی کوردی دەکەن و تا ئەو ڕادەیەی خزمایەتیی نێوانی نووسینەکە و کوردیبوونی بابەتەکە زۆر جاران بێهێز دەبێ. خۆ ئەگەر بێین تۆژینەوەی خۆماڵیمان لە شتێکی سەر بەکوردەوە بە تۆژینەوەیێکی ئەوروپایی بگرین دەبینین تا چ

ڕادەیێک ئێمە لە چاو ئەوان سەراوین. داخوازی دەکەم لە ڕۆشنبیری کورد چاوێک بەکتێبی وەک Archaeology of Palestine یاخود Prehistoric South Africa دا بگێڕێ و بزانێ قووڵبوونەوە لە بابەت گەیشتۆتە کام پلەی ئیعجازا! کە ئەمە دەڵێم دوو نموونەی یەکجار عادەتی و بازاڕیم کردوە بە شایەد، نووسینی لەوان قووڵتر و وردتر و بەرفرەوانتر و هەناسە درێژتر وەک کورد دەڵێ لە تۆڵەگەی بەهاران پترە.

ئێمە لە سەرەتای لێکۆڵینەوەی بابەتەکانی کوردناسیی داین، بەشێکی زۆری ئەو سەرەتایەش خۆی لە سەرەتای زانینەوە دەستی پێکردوە واتە وەک ئەو سەرەتایە نیە پسپۆڕ و شارەزا دەستی پێ دەکەن. کە بەنیسبەت حاجی قادرەوە قسە بکەین، لێرە بەپێشەوە لەوەندە نووسینانەی کە من دیتومە باشترینیان ئەوە بوە بە دڵێکی پڕسۆز و خۆشەویستیەوە بۆ حاجی و کورد و کوردستان واتای شیعرەکانی کردوە بە زەمینەی لێدانەوە بەرەو نیشتیمانپەروەری و گیان پاکی و خاسیەتە بەرچاوەکانی تری حاجی کە ئەگەر لێشی بێدەنگ بوویایە لە خۆمانەوە ئەوانەمان دەزانی چونکە ئەو شتانە بە کوردیێکی بێ قۆرت و گرێ و هێما و سەرپۆش لە شیعرەکانی حاجی قادردا جلوە دەبەستن و دەیان بینین نەک هەر تێیان دەگەین. کێ بێ نەزانێ مانای ئەم بەیتە و صەدانی تری وەک ئەم چیە؟

کوردی ئاخر بڵێ چیە عەیبی
هەر کەلامی حەقە و نیە عەیبی

وا دەزانم لە ناو ئەو نووسینە دڵسۆزە ساکارانەدا، یەکێکیان لە ئاست مەبەستێک لە مەبەستە زۆر گرنگەکانی حاجی دا قووڵبوونەوە و هەڵێنجانێکی ورد و مامۆستایانەی کردوە لە جێگەی مناسبدا باسی دەکەم و نرخی خۆی پێ دەدەم. وەی کاشکی سەرلەبەری نووسینەکان لە بارەی حاجییەوە بەو پێودانە بوونایە لە هەموو ڕوویێکەوە نەک تەنها لە ڕووی دەستنیشان کردنی ئەو مەبەست و نیاز و خاسیەتانەی کە لە شیعرەکانیەوە بەر نیگا و سرنج دەکەون. بەڕاستی و زۆر بەداخەوە، لێرە بەپێشەوە نەمدیت نووکی خامەیێک وردەکاریی لە کێڵگەی چەندوچۆنی بەسەرهات و ژیانی حاجی قادر بکات وەیا دەلالەت لە ڕەفتار و گوفتاری وەرگرێت و دەروونی پێ ڕوون بکاتەوە، وەیا باسێکی مەیل و مەشرەب و

ڕق هەڵستان و خۆشویستنی بکات کە ئەمانە پێوەندیان بە لایەنی زات و شەخسیەت و «تاکایەتی» ی حاجی قادرەوە هەیە.

من لەم قسانەمدا جارێ باسی ئەو حاپوولە گەورە و ناقۆلایانە ناکەم کە هاوێژراوە لە مەیدانی بیروباوەڕ و جۆری خەبات و دڵ و دەروونی حاجی کە هەمووی حاپوولی ئەوتۆن تەوقی سەری ڕاستییان لەو مەوزوعانەدا لە ئەرز داوە و ڕەگ و ڕیشەی هەرچی واقیعی ئەوان هەیە لە ناخی وجودەوە دەرکێشاوە و بەرەو ئاسمان سەرەوبنیان کردوە.

چەند تاڵە ئەم چەژەی خۆدیتنەوە لە ناو دەوروبەری سەرەوبندا، هەر دەڵێی مرۆڤ سەری تێدا بەگێژەوە دێت.

**خوێنەری بەڕێزی ئەم نووسینە!**

ژیان و بەسەرهات و ویژدان و دەروون و زەرفی تێدا حەوانەوە و ئەو جۆرە لایەنانەی حاجی دەبنە زەوییێک کە تۆوی فەلسەفە و بیروباوەڕ و خەبات و هەڵوەست و گوتە و کردەی حاجیی لێ ڕواوە، کە ئەگەر زەویەکە بە تەواوی ناوکێڵ نەکرێت حەقی ئەوەمان نابێ بڵێین دەزانین ڕەگی ڕوەکەکان بەچییەوە بەند بوون و کام بژێویان کردوە بەهۆی فراژووبوون. نووسەرێک هەرچەند ئاڵای بیری ماددی بەسەر نووسینەکەیەوە بشەکێنێتەوە ناتوانێ لە جغزی نامادددییەت دەرچێ ئەگەر ماددەی نووسینەکەی لە جەرگەی واقیعەوە نەگرێتەوە، واقیعیش تەعبیری قەڵەو قەڵەوی ناو کتێبان نیە، بەپێچەوانە، ڕووداوی بچووک بچووک و هەڵکەوتی خوردە خوردە و دەوروبەری ئاسایی و دڵ و دەروونی ڕاستەقینەیە کە بەشی زۆری پانایی و درێژایی جیهانی مرۆڤ پێک دێنن و هەر خۆیانن، بە عادەت، ڕووداوی گەورە و زرینگەداریان لێ پەیدا دەبێت. جا ئەگەر من یا نووسەرێکی تر بەسەر ئەم وردیلانەدا باز دەین بۆ ناو گرەگرِی نەزەریە زارقەڵەباڵغەکان و لەوێوە بڕیاری حازر بەدەست بخوازینەوە کە بە نەعرەتەی پڕ دەنگ و هەرایان ورتە لەو واقیعە مەیلەو خامۆشە دەبڕن هەر ئەوەندە دەکەین کە دەنگی خۆمان و واقیعیش تێکەڵ بەو هەرایە دەکەین و لە گرەگرِ و نەعرەتەی نەزەریان زیاد دەکەین. بەڕاستی ئەگەر ئاهەنگە نەرمە عادەتیەکەی ڕووداو و واقیعی ڕاستەقینە نەعرەتەی نەزەریان

بێدەنگ نەکەن ڕێبازی بیر کردنەوەی ماددی ڕاست و دروست کوێر دەبێتەوە و ڕێبازێکی مەسرەحی وەیا سینەمایی دەبێتە جێگری، ئەو نووسەرەی پێیدا دەڕوات ئەویش لە واقیعیەت دەشۆرێ و دەبێتە «ممثل». ئێمە دەزانین ئایینەکان مەنهەجی خۆیان بەسەر واقیعدا دادەبڕن لە بری بەڵێنی ژیانەوە و بە سەربردنێکی بێ بڕانەوەی پڕ خۆشیدا، جا ئەگەر نەزەریە ماددیەکانیش خۆیان بەسەر واقیعدا بسەپێنن شتێکی وەک هینەکەی ئایینەکان دەکەن بەڵام بێ هیچ بەڵێنی زۆر دڵڕفێنی ژیانەوە و خۆشی بێبڕانەوە. من لە ئاست ئەو نەزەریانەدا هەر ئەوەندە دەڵێم: ئەوان چی دەڵێن با بڵێن، تەنها ئەوەندە چاکەمان لەگەڵدا بکەن واقیعمان لێ نەگۆڕن، نووسەریش لێی داوا دەکرێ واقیع بە قوربانی نەزەریە نەکات.

تۆژینەوەیێک تا ئێستا لە بارەی حاجییەوە کرابێ و ئەو هەلومەرجانەی بە خۆوە گرتبێ، وا دەزانم هەر ئەوە هەیە کە لێرەدا ئەم نووسینە خەریکیەتی و لە سەرەتاشەوە خەریکی بوە. کەسێک بیەوێ بەدوا مندا لێکۆڵینەوەیێکی تازە لە باسی حاجی قادردا بکات یا دەبێ لە نووسینەکەی من پتر هەڵکشێ یا دەبێ بە بەڵگە و ئیسپاتێکی ڕێکوپێک بایەخی ئەم قووڵ داگرتنە و وردەکارییە بپووچێنێتەوە، واش چاوەڕوان دەکەم بەرەوپێش چوونی ڕۆشنبیریی گشتی بەرەو پووچانەوە ناڕوات.

گەلانی پێشکەوتوو کتێبخانەی سەرلەبەریان هەیە لە بارەی هەر بابەتێکەوە بێ کە بە بیری مرۆڤدا بێت. بە نموونە ناوی «شەکسپیر» دەهێنم، جوامێرێکم دەوێ بزانێ چەند کتێب لەسەر «شەکسپیر» دانراوە، ناڵیم کتێبەکانی خوێندبێتەوە چونکە مومکین نیە هەموو ئەو کتێبانەی دیبێتن چ جایی لە خوێندنەوەیان بووبێتەوە. ئەوەی لەسەر شەکسپیر نووسراوە چی نەهێشتۆتەوە بۆ من و تۆ بە درێژیی یا بەکورتیی لە سەری بنووسین. کە بێین و ئەوەندە خۆ ئازا بکەین بوێرین لە بارەی «شەکسپیر» ەوە بنووسین دەبێ لە نووسینەکەماندا لایەنێکی شراوەی ئەوتۆ بدۆزینەوە وەیا بۆ تصوری ئەوتۆ بچین بە دڵ و دەروونی کەسدا نەهاتبێ و لە هیچ نووسینێکی لە هی خۆمان بە پێشەوەدا نە دیترابێ، چونکە لەوانەیە مەعلووم کرابێ «شەکسپیر» چ جۆرە گرێیەکی لە قەیتانی پێڵاوەکەی داوە وەیا سبەینان چەند هێلکە دەڵەمەی هەڵقوڕاندوە.

باسەکانی سەر بە کوردەوە پێچەوانەی ئەم حاڵەن لە هەموو ڕوویێکەوە، نە چ نووسینێکی ئەوتۆ لە بارەیانەوە هەیە نە ئەوەی هەیشە بۆ دیارخستنی جۆری گرێ

قەیتان قووڵ بۆتەوە. ئێمە کە چاو دەگێڕین بە ناو بازاڕی کوردناسیدا خۆمان لە جیهانی مەتەڵدا دەبینینەوە چونکە سەرچاوەی هیچ یەکێک لە دیاردەکانی کۆمەڵایەتیی کوردەواریی لێنەکۆڵراوەتەوە و بە نەزانراوی ماوەتەوە. پێم بڵێ بۆچی ڕانکی ناوچەی بادینان دەلینگ فەڕاحی ناوفەک تەسکە هی ناوچەی سۆرانیش دەلینگ تەسکی ناوفەک فەڕاحە؟ خەزێمەی لوتی ئافرەتی کورد لە کەی و لە کوێوە هات؟ بۆچی لە هەموو هەرێمەکانی کوردستان نەبوو بە عادەت؟ بۆچی فەلاحی کورد شیربایی (هەقی شو کردنی کچ پێشی دەڵێن «خوێن») وەردەگرێ کەچی بازرگانی شارستانی کورد، بەڕاستی زۆربەی خەڵقی شاری کورد، وەری ناگرێ، خۆ ئەگەر بەڕاستە حیسابی شۆڕشگێڕایەتیی «چین»
مەسەلەکە هەڵسەنگێنین دەبوو فەلاح شۆڕشگێڕتر بێ لە بازرگان و خوێنەکە وەرنەگرێ؟ لە ساڵی 1953 لە پشوویێکی ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەوساکەدا لە کۆیێ بووم، مامۆستای دەرسی ئینگلیزیی فێرگەی سانەویی کۆیێ پیاوێکی ئوستورالیایی بوو لە گەلێک باری کۆمەڵایەتی بەرچاوی وڵاتەکەمانی دەتۆژیەوە. لە خۆمی پرسی:

Why your folk wear bulgy trousers? واتە بۆچی خەڵقەکەتان پانتۆڵی فەڕاح لە پێ دەکەن؟ لە وەرامدا گوتم بەهۆی ئەوەوە کە لەسەر زەوی دادەنیشن چونکە لە کۆنەوە تەخت و کورسییان نەبوە لەسەری دانیشن. قسەکەم چووە دڵیەوە. هەر ئەو کابرایە خۆ وەرامی هەندێک پرسیارەکانی دابۆوە وەک ئەوەی کە دەیگوت چونکە وڵاتەکەتان شاخاوییە و ڕێگاکانتان بەردی زۆرە بۆیە ئەو پێڵاوەتان کە پێی دەڵێن «کاڵەک» سەرەلووتەکەی بەرەو پشت هەڵگەڕاوەتەوە تاکوو لە بەردان هەڵنەئەنگون. ڕاستیشی دەکرد.

من لە هێنانەوەی ئەم نموونانە دەمەوێ سرنجی خوێنەر ڕاکێشم بۆ بیابانی بێ درەخت و بێ گیای کوردناسی کە دەبێ ئێمە بە گاسنی خامە بیکلێڵینەوە و بیکەین بە دارستان و تۆ و شۆ و شیناورد کە ئەمەش کاری پەلەپەل و خێرا کردن و سەرکێڵی و درشتبینیی نیە.

نووسەری کورد کە دەست دەداتە قەڵەم و دەیەوێ لە سەر بابەتێکی کوردەواری بنووسێ، کەمتاکورتێک سەرچاوەی زانیاری لێرە بەپێشەوەی دەست دەکەوێ هانای بباتە بەر و ئەرکی خۆی پێ سووک کات و بەرەکەی لە ئاو دەرێنێ. گەشتی

نووسەری کورد لە کوردەوارییدا هەر دەڵێی گەشتی بەفرستانی قطبە یا ڕەمڵستانی بیابانە، نوایێکی حەسانەوەی تێدا نادۆزرێتەوە.

لێرەدا نموونەیەکی بە یەکدی گرتنی نووسەری کورد و غەیری کوردت بۆ دێنمەوە نەختێک قسەکانم پتر بخاتە بەر شەوقی واقیع: خوا لێخۆش بووی «د. مصطفی جواد» لە ژمارەی لە سالی 1965 ی گۆڤاری «المجمع العلمي العراقي» گوتارێکی بڵاو کردۆتەوە لە ژیر ناونیشانی «دار الخلافة العباسية تعيين موضعها واشهر مبانيها» لە لاپەڕە 98 تا لاپەڕە 115 ی گرتۆتەوە لە حاڵێکدا ئەم سەرچاوانەش یارمەتیان داوە و ڕێی درێژیان بۆ کورت کردۆتەوە:

1) رسوم دار الخلافة
2) رحلة إبن جبير
3) تأريخ بغداد
4) المختصر في اخبار البشر
5) مفرج الكروب في اخبار بني ايوب
6) المنتظم لإبن الجوزي
7) معجم البلدان
8) المشترك وضعا والمختلف صقعا
9) تحفة النظار فی غرائب الامصار
10) جهات الائمة الخلفاء من الحزائر والاماء
11) كتاب الحوادث
12) تأريخ مساجد بغداد واثارها.

لەگەڵ هەبوونی ئەم هەموو سەرچاوانەشدا حەڤدە لاپەڕەی نووسیوە کە ئەگەر ناچار با هەموو سەروبەرێکی مەوزوعەکە بە ئەرکی لێکدانەوە و تۆژینەوەی خۆی ساغ کاتەوە بێ ئەوە سەرچاوەییێکی لێرە بەپێشەوە هیچ لایەنێکی بۆ ساغ کردبێتەوە دەبوو بە ناچاری یا واز لە نووسینەکەی بینێ یاخود 170 لاپەڕەی لەسەر بنووسێ چونکە بە زۆری یەک دێڕی قوتیلە کە خەبەرێکی کۆنی ساغ کردۆتەوە جێگەی گوتارێکی سەرلەبەری پێ دەگیرێتەوە کە لە تاریکایی نەزانینی دوارۆژدا بنووسرێت. سەرەڕای

ئەمە حیسابێکیش بکە بۆ لایەنی گرنگبوونی ساغ کردنەوەی یەکێک لە قۆناغەکانی ژیان و بەسەربردنی حاجی قادر لە چاو دەستنیشان کردنی جێگەی کاکی خەلیفەی عەباسی پێش هەزارساڵێک کە ئەگەر ساغیش نەکرێتەوە وەیا هەڵەشی تێدا بکرێت زەرەر لە کەس ناکەوێت و چ حیسابان سەرەوبن ناکات.

لە تەک ئەم گوتارەی «د. مصطفی جواد» دا گوتاری نووسەرێکی کوردم بە بیر دێتەوە کە لە گۆڤارێکی کوردی بەغدایدا بڵاو کردبۆوە و لە یەک پەڕە و نیوی گۆڤارەکەدا سەرلەبەری بوون و ژیان و مردن و شیعر و ئەدەبی کەڵە شاعیرێکی وەکو «وەفایی» نەمری سیخناخ کردبوو هەر دەتگوت قتوبەستی ماسی ساردینی لەو گوتارەدا کردبوو. بڕوا دەکەم لەو پەڕە و نیوەیەدا نووسەرێکی وەک «چارلز دیکنز» وەیا «سومەرسیت مۆم» لە وەصفی بەڕێ کردنی عەرەبانەیێک نابنەوە، حەقیشیانە.

بابەتی گوتارەکەی «د. مصطفی» گرنگ بێ یا نەبێ سێزدە سەرچاوەی مێژوویی تێروتەژی و حارز بەدەست ڕێی دووریان بۆ نێزیک خستۆتەوە، ڕەنگ بوو ئەگەر بیویستبا هێندەی دیکەشی سەرچاوەی مێژوویی دەست کەوتبا. من کە لەسەر بەشێک لە ژیانی حاجی دەنووسم، هەر بەشێک بێ لەسەرتاسەری ژیانی، لە جیاتی سێزدە سەرچاوەی مێژوویی سێزدە تاریکایی و سەرپۆشی بێ سەروسۆراغی ڕاستیم لێ دەشارنەوە. لە تاکە سەرچاوەی لێکدانەوە بەولاوە یارمەتیدەر و ئاشکرا کەرم بۆ پەیدا نابێ. دەبێ ڕووناکایی لێکدانەوە بکەم بە تیشکێکی ئەوەندە بە شەوق کاری ئەو سێزدە سەرچاوەیەم بۆ بکات و پەردە لە دواپەردەی تاریکایی دەورری باسەکەم بۆ بڕەوێنێتەوە. بایی میلیمەترێک فتیلەی چرای لێکدانەوە کز کەمەوە خۆم و بابەتی نووسین لە تاریکاییدا غەرق دەبین، دەست بەردار بم لە هەرکام سەرەداوێکی کە لەرانەوەی ڕۆژگاری حاجیم بۆ دەهێنێتە بەر هەستی پەنجەکانمەوە وەک ئەو کەسەم لێ بەسەر دێت سەماعەی تەلەفۆنی تەل پچڕاوی بە دەستەوە گرتبێ.

لێرەدا تەجرەبەیێکی کورتیلەی پڕ دەلالەتی ئەم لەراندنەوەی ڕۆژگاری حاجی دەخەمەوە بەرچاوی خوێنەر تاکوو مەعلووم بێ تا چ ڕادەیێک پێویستمان هەیە بە هەموو سەرەداوێک، هەرچەند پسۆک و کورتیش بێ، کە بە ڕیشاڵێکی ئەو ڕۆژگارەمانەوە ببەستێتەوە.

هەمومان بیستوومانە حاجی قادر لە ئەستەمبۆڵ وەک مێوانی بەدریخانیەکان بووبێ وەهای باس کراوە. هەر لەو میوانەتیەوە، بێ دوودڵی کردن، وامان بەزیهندا هاتوە کە لە ماڵی ئەوان بەسەری بردبێ. من ئەمەم لە بیر بوو کە سرنجم کشا بۆ دەلالەتی بەیتێکی لەو بەیتانەی واقیعی حاڵ ڕادەگەیەنن، دەلالەتی بەیتەکەش هیچ لەگەڵ ئەو مێوانەتیەدا ناگونجێت. حاجی لەو نامەیەی بۆ حاجی مەلا عەبدوڵای نووسیوە دەڵێ:

لە جوملەی ماجەرای دوریی ویلایەت
ئەمەش باسێکی خۆشە وەک حیکایەت

شەوێ دانیشتبووم بێ شەمع و میصباح
ئەتۆی هێناوە یادم کاکە فەتتاح

ئەم گوتەیەی «بێ شەمع و میصباح» تارمایی ماڵی هەژاران دەداتەوە نەک دەوڵەمەندان، ڕواڵەتی بەیتەکە لەگەڵ ئەوەدا ڕێک ناکەوێت کە حاجی لە ماڵی بەدرخان پاشاوە نامەکەی نووسیبێت چونکە بێگومان لەو گەورە ماڵەدا مۆم و چرا زۆر بوون کاغەزیان لەبەر بنووسرێت.

بەڵێ دەزانم وا دەبێ شاعیر بۆ مەبەسی ڕاگەیاندنی کەساسی خۆی، پتر لە حەقیقەت وێنەگریی هەژاریی خۆی دەکات، وەیاخود تیژایی هەست کردنی بە حاڵوباری پڕ سۆزی غەریبایەتی وای لێ دەکات لە دڵدا هەموو خۆشی ماددی بە ناخۆشی لە قەڵەم بدات وەک کە لە ڕاستییدا ناخۆش بێت، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا چ مانیع نیە قسەکانی وێنەی ڕاستەقینە بکێشن. ئێمە لە بەرانبەر ئەم بەیتەدا خۆمان لە ئاست ئەم ڕاستییانەدا دەبینینەوە:

- گوتراوە حاجی مێوانی بەدرخانیەکان بوە
- مەعلوومە بەدرخانیەکان «شەمع و میصباح» یان هەبوە
- حاجی دەڵێ «دانیشتبووم بێ شەمع و میصباح»

حاجی بەوە ڕازی نابێ لە شوێنێکدا خەڵق لەبەر چرا دانیشن ئەو لە تاریکاییدا بێ. من هەرچەند نەمدەتوانی بڕیاری یەکجاریی بدەم لە بارەی حەقیقەتی هەڵکەوت بە

نیسبەت حاجی قادرەوە لەو ڕووەوە کە ئایا لە ماڵی بەدرخانیەکان بێ چرا بوە وەیا چرای هەبوە بەڵام لە هەڵبەستدا بەرەو سۆزی غەریبی و «بێ میصباحی» بە قسە خۆی لە تاریکییدا خزاندوە وەیاخود لە ماڵێکی ماڵی بەدرخان پاشادا بەسەری بردوە و چرای نەبوە، لەگەڵ ئەمەشدا هەمیشە دڵم بۆ ئەوە دەچوو حاجی لە تاریکایی حەقیقییدا ئەم یاد کردنەوەیەی بوە. سەرەڕای ئەم دڵ بۆچوونە، ناکرێ ئێمە لە واتای زاهیری وازبێنین بۆ واتاییێکی مەجازی وەیا بۆ ڕواڵەتێکی داخوازیی حاڵ ئەگەر لە لاییێکەوە هۆی وازهێنانەکە پەیدا نەبێ. لێرەدا تەنها یەک تەگەرەمان دێتە پێش لە بەیتی چوارەمی نامەکەوە هەڵدەستێت:

منیش ئەم نامەیەم نووسی بە تەعجیل
شرِ و درِ وەک خرار و کۆنە زەنبیل

تەگەرەکە لەوەوە دێت: ئەگەر لە تاریکایی ڕاستقینەدا بووبێت چۆن پێی کرا «بە تەعجیل - بە خێرایی» دەست بکا بە نامە نووسین چونکە تەعبیرەکە وا ڕادەگەیەنێت دەرحاڵ کەوتبێتە سەر نووسین! بەڵام تەگەرەکە گەلێک ئاسانتر دەڕەوێتەوە لەوەی «بێ شەمع و میصباح»ـەکە بکرێتە مەجاز، چونکە دەشێ شەو بەسەرچووبێت و نامەکە نووسرابێت کە هەر دەکاتەوە «بە تەعجیل» وەیاخود هەر لەو دەمەدا چراییێک پەیدا کرابێت و نامەکەی لەبەر نووسرابێت تا ڕادەی لێ ماندووبوون و سبەینێ تەواو کرابێت چونکە نامەکە ئەوەندەی درێژە هەیە لە یەک دانیشتندا بە کۆتایی نەگات. دەبینی بەهەمەحاڵ بەشێکی نامەکە کەوتۆتە بەر ڕووناکایی سبەینێ کەواتە ئەگەر هەموو «تەعجیل» کردنەکە خرابێتە سبەینێوە نارێکییێک پێک نایەت لەگەڵ واتای بەیتەکەدا.

من لەم گوریسکێشەکێیە زیهنییەدا بووم هەڵکەوتێکی خۆش بەختانە تیشکێکی هاویشت بۆ دەوروبەری تاریکایی ئەو «بێ شەمع و میصباح» ـەی ناو بەیتەکەی حاجی. لە وتوویژێکی ڕۆژانەی عادەتییدا، جارێکیان بێنیاز و بێ پرسیاری تۆژینەوە، کاکە زیادی حەماغای کۆیێ بۆی گێڕامەوە کەوا لە ساڵی 1949 سەردانی ئەستەمبۆلی کردوە و لەوێ «میهری بەگ»ی دیوە و باس و هەواڵی حاجی قادری لێ پرسیوە. کاکە زیاد گوتی:

*«میهری بەگ بۆی باس کردم حاجی لە ماڵی کوردێکی ئەستەمبۆڵ بەسەری دەبرد نەک لە ماڵی بەدرخانیەکان، ئەو کوردەش لە هەموو بنەماڵەکەی تاکە یەک کچی ماوە، لە وەزارەتی کاروباری دەرەوەی تورکیا لە ئەنقەرە فەمانبەرە. منیش کاغەزێکم لە میهری بەگ وەرگرت بۆ کوردێکی ئەنقەرەنشین کە ئەویش هەر خەڵقی دەوروبەری جافەتی و هەڵەبجە بوو و خاوەن قاوەخانە بوو لە ئەنقەرە تاکوو بە کچەکەم بناسێنێ، کاغەزێکیشم لێی وەرگرت بۆ کچەکە خۆی. لە ئەنقەرە کوردە خاوەن قاوەخانەکەم دۆزیەوە کە ئێستا ناویم لە بیر نەماوە هەروەک ناوی کچەکەشم فەرامۆش کردوە. لەگەڵ پیاوەکەدا سۆراغی کچەکەمان لە وەزارەتی خارجیە کرد گوتیان ئێستا لە وەزارەتی مەعاریف فەرمانبەرە لە جێگەیێکی دەرەوەی ئەنقەرەدا مامۆستای قوتابخانەیە و تا پشووی هاوینە ناگەڕێتەوە بۆ ئەنقەرە، ئیتر منیش کاغەزەکەی ئەوم لای کابرای خاوەن قاوەخانەکە بەجێهێشت تا ئەگەر گەڕانەوە بۆ ئەنقەرە پێی بدات و ئەدرەسی خۆشم هەر لەگەڵ کاغەزەکەدا بۆی نووسی بە نیازی ئەوە چ مەعلووماتێکی لە بارەی حاجی قادرەوە لابێت بۆمی بنێرێتە ئەو ئەدرەسە، بەڵام هیچم لێی پێ نەگەییشت».*

لەگەڵ ئەم قسانەشدا باسی ئەوەی کرد کە میهری بەگ لە باسی خۆیدا گوتوەتی لە کۆیێ لای حاجی مەلا عەبدوڵای خوێندوە و دواتر چۆتە هەولێر بۆ خوێندن. بە داخەوە میهری بەگ مرد و هەرچی دەیزانی لەگەڵ خۆی چوە تاریکایی گۆڕستانی عەدەمەوە.

ئەمەیە سەرچاوەی تۆژینەوەمان لە بارەی حاجی قادرەوە. دەلالەتی بەیتێکی بکە بە ڕابەر، ئەوجار چاوەنۆڕ بە تاکوو قەزا و قەدەر بە ڕێکەوت لە لاییێکەوە خەبەرێکی دەماودەم دەنێرێت یا دەلالەتەکە بەدرۆ دەخاتەوە یاخود بەهێزی دەکات، لە هەردوو حاڵیشدا ڕووبەڕووی وشکبوون و نەزۆکی بێ ئاویی زەمینی لێدانەوە دەبێت و لێکدانەوە و تۆژینەوەت لە تینوان دەخنکێت مەگەر لێوی تەڕ کەیتەوە بە هێما و ڕاگەیاندنی بەیتێکی تری و بەینێکی دیکەش بە وشکە ئومێدان تەفرەی خۆت و لێکدانەوەکەشت بدەیت...

لەگەڵ ئەم هەموو دەست بەتاڵیەشدا، کە خۆی بەسە بۆ تێوەستان و ماندووبوون، سەر لە نوێ و بەردەوام، دەبێ مرۆڤ لە کاری سەخت و وردی مەتەڵ هەڵێنان بە هۆی وڕێنە لەگەڵ خۆ کردندا، پەند لە ئامۆژگاریەکەی «نالی» وەرگرێت کە دەڵێ:

«ئەی مەستی ڕیاضەت هە لە هوشیاری جڵەو بە»

چونکە ئەگەر بایی چاوقوچێنێک لە وردبوونەوە غافڵ بێ وەیا بەسەهوو بچێ ناتوانێ هیچ سەرەدەریی لە تاریکایی بەر هەنگاوی بکات.

من لە لێکدانەوەکاندا خەریکی کارێک دەبم کە پێی دەڵێن Jigsaw Puzzle کە بریتییە لە بەیەکەوە نانەوەی پارچەپارچەکانی وێنەیێکی پچڕپچڕکراو تاکوو بچێتەوە سەر باری ئەسڵی خۆی و دیمەنە ڕاست و دروستەکەی بنوێنێتەوە. من دەبێ بێنم تارمایی کەمتاکورتی مەعلووماتی ڕاست و خەیاڵکرد و گوتەی دەماودەم کە پارچەکانی تێکەڵ و پێکەڵ بووبن، سەر لە نوێ بەیەکەوەیانەوە بنووسێنمەوە بە مەرجێک هەر پارچەیە بخەمەوە جێگەی لەبار و ڕاستەقینەی خۆیەوە تاکوو لەگەڵ پارچە دراوسێکانی دەوری خۆیدا بگونجێت و دیمەنێکی مەفهوم پێک بێنێت، کە هاتم پارچەیێکیانم لە جێگەی هەڵەدا دانا سەر لە بەری تابلۆکە دەشێوێت و نامەفهوم دەردەچێت چونکە پارچەی ڕاست و دروستی ئەو جێگەیەش دەچێتە جێگەی پارچەیێکی تر تاکوو وای لێ دێ چاو دەچێتە جێگەی ئەژنۆ و پاژنەی پێ بەسەر سنگەوە بەند دەبێت و پەنجە دەچێتە جێگەی سمێڵ...

بە پێی قەناعەتی خۆم، لەو لێکدانەوانە و بەراورد کردنانە و بەیەکتر گرتنانەی تا ئێستا کردومە هەمیشە ڕەچاوی ئەو لایەنە یەکجار گرنگەی بەیەکەوە گونجانی هەموو کەرت و پارچەکانی «تابلۆ سەرلەنوێ ڕێکخراو» ەکەم کردوە، هەر ئەم گونجان و نەگونجانەش بۆتە هۆی سەلماندنی شیمانەیێک و بەرپەرچدانەوەی یەکێکی تر.

بە نموونەی ڕاستی ئەم ڕایەم دەڵێم کە سەلماندم حاجی دوو چاری دڵداریی سوتێنەر بوە لە قۆناغی گەنجایەتیدا ناتوانم چ تەئویلان بێنمەوە بۆ غەلەبە سەندنی دروشمی وەستایی بەسەر لایەنی کزە و سۆز لە هەڵبەستە دڵدارانەکانیدا، هەروەهاش لێکدانەوەکەم زۆر دادەمێنێ لە ئاست ئەو هەڵبەستە یەکجار دژ و

دوشمنانەی عیشق کە لە ساڵانی دوایی ژیانیدا لە ئەستەمبوڵ دایناون وەک «باسی زولفی درێژ و چاوی بەخەو» و «حەیفە بۆ پیاوی صاحیبی تەمییز»[78].

لە تێکڕای درێژەی ئەم باسەوە دەردەکەوێ کە وا کەمبوونی هەڵبەستەکانی حاجی دژی شێخ نەبی ماویلی ڕاستەوخۆ کورتبوونی ئەو ماوەیەی تێیدا هەڵبەستراون ڕادەگەیەنێ، کە ئەویش ڕاستەوخۆ کورتبوونی سەرلەبەری قۆناغی ناوەندی ژیانی حاجی بەدەستەوە دەدات، کە وەک گوتمان، بریتییە لەو ماوەیەی دەکەوێتە نێوانی بەسەرچوونی دەوری گەشتی خوێندنی لەگەڵ سەرەتای سەفەرەکەی بۆ ئەستەمبۆڵ. ئەم کورتبوونەش لەلای خۆیەوە ڕێک دێت لەگەڵ حوکمی هەموو ئەو ڕاستییانەی لە حاجییەوە پێمان گەیشتوە چ بە گوتەی دەماودەم بێ چ لە ڕێی هەڵبەستەکانی دیوانی حاجی و حاشیەکانی دەستنووسی بێ و چ بە هۆی لێکدانەوەی بەستراو بە واقیع و ڕووداوەوە بێ. لە ئەنجامی ئەم هەموو خواروژوور کردن و بەیەکدی گرتن و تۆژینەوە و ڕاست کردنەوە و بەدرۆخستنەوەیەدا دەگەمە ئەم باوەڕە کەوا حاجی قادر بەر لە ساڵی 1279 نەگەڕاوەتەوە بۆ کۆیێ و پێش ساڵی 1282ش بۆی دەرچوە، واتە هەرگیز ئیحتیمالی مانەوەی لە دوو ساڵان تێپەڕ ناکات.

هەر چەند ناشێ مرۆڤ بڕیاری یەکجارەکی بدات لە ئاست چەندوچۆنی دوارۆژدا، بەڵام من بەنیسبەت ئەم کورتییەی ماوەی مانەوەی حاجی لە کۆیێ خۆم ناگرم لەوەدا بڵێم ڕێی تێناچێ لە دوارۆژدا چ تۆژینەوە بتوانێ ئەم ماوەیە لە دوو ساڵان تێپەڕێنێت، نەک لەبەر ئەوە کە دڵنیام لە پەیدا نەبوونی بەڵگەی ماددی دژی لێکدانەوەکەم بەڵکوو لە بەر یەکجار پتەویی ئەو بنچینەیەی کە لێکدانەوەکەی لەسەر هەڵستاوە. ئەو مەتەڵ هەڵێنانەی Jigsaw کە لەم لێکدانەوەیەدا کراوە هێندە ڕێکوپێک گونجاوە لەگەڵ پارچەکانی خۆیدا زۆر زەحمەتە، ڕەنگە موستەحیل بێ، یەکێکی تری وەک ئەو ڕێکوپێک لەو پارچانە بخرێتەوە سەر یەک.

ئەم لێکدانەوانە و مەتەڵ هەڵێنانە بەلاییێک. من دڵشکستەی نەبوونی شتێکم: زانیمان حاجی شیعری دژی شێخ نەبی داناوn، ژمارەی ئەو شیعرانەش زۆر نین و

[78] بۆ باش تێگەیشتنی ئەم لایەنە دەبێ بگەڕێینەوە بۆ لاپەڕەکانی 271–282 لە بەرگی دووەمی کتێبی «حاجی قادری کۆیی».

کەمن، هەروەک ماوەی تێدا هەڵبەستنیشیان کورت بوە. ئەمە دەزانین، پێشتریش لە بەشی دووەمی ئەم نووسینەدا بە شایەدیی نامیلکەکەی مەلا عەبدولڕەحمانی خزمی ساغ کرایەوە کە شێخ نەبی لە سەرەتای ناکۆکیەکەیدا بە چەکی ژمارە یەک کە پڕوپاگەندە و توهمە تێگرتن و درۆ هەڵبەستنە وەرامی حاجی داوەتەوە. لە لاپەڕە 331 ی بەشی دووەمدا ئەم گوتەیەی نامیلکەکەی مەلا عەبدولڕەحمان دەخوێنیتەوە «لە نەتیجە شێخ نەبی کەوتە عەداوە لەگەڵ حاجی قادر بە کاغەز نووسین بۆ یەکتری[79]. ڕاستیی حاڵ ئەوە بوە، سەرەڕای کاغەز نووسین لە لایەن شێخ نەبییەوە بۆ حاجی لە ئەنجامی خۆشتربوونی ئاگری ناکۆکیەکە دەستە و تاقمی شێخ نەبی چی خراپ و کەم نرخە ئەوەیان بۆ حاجی قادر هەڵبەستوە و قسە و قسەلۆکی پیریێژنانەیان تێگرتوە. دڵشکستەیی من لەوەدایە کەوا لەم بەندوباو و حیکایەتە هەڵبەستراوانە تاکە یەک وشە و پیتی بە ئێمە نەگەیشتوە و هیچی لێ نازانین. چەندم حەز بەوە دەکرد، لە قسەکانی شێخ نەبی خۆی وەیا قسە ڕاسپاردەکانی ئەو بە زاری مریدەکانیەوە دژی حاجی، بە کاغەز یا گوتە، چەند نموونەییێکمان لەبەردەستدا بوویایە وەک گوتەکەی شێخ غەفووری تاڵەبانی کە لە لاپەڕە 200 ی بەرگی دووەمدا باس کراوە. وەیا هەر نەبێ هەندێک لە پڕوپاگەندەی مریدەکانی دژی حاجی قادرمان زانیبایە تاکوو تێگەیشتباینایە ئاخۆ شێوازی ئەو هێرشانە چۆنە و بۆ سەر کام لایەنی شەخسییەت وەیا کردەوە وەیا بیروباوەڕ وەیا زانایی حاجی قادریان وروژم هێناوە.

من کە بەم گوتە دوشمنانە و ناحەزانەی بەرەی شێخ نەبی دژی حاجی قادر دەڵێم هەڵبەستراو، ڕێگەی ڕاستبوونی هەندێک لەوان کوێر ناکەمەوە، واتە دەسەلمێنم گوتەی ئەوتۆ لە حاجی قادر گیرابێ کە هەڵبەستن و درۆی تێدا نەبووبێ لە هەمان کاتیشدا بە کێشانە و پێوانەی ڕاستی و ئینساف مەدح بووبێتن بۆ حاجی وەک ئەوەی حاجی قادریان تاوانبار کردبێ بە قسەی ئازایانە دژی شەعبەدە یاخود لە ڕەفتار و بیروباوەڕی ئەوتۆدا عەیبیان لێ گرتبێ کە لەچاو ئەو ڕۆژگارەدا وەک لەحەد دەرچوون هاتبێتە بەر هەستی خەڵقەوە و ئێستا دەزانین گەورەیی

[79] لەم نووسینەوەیەدا کمێکم دەسکاریی لە ڕێنووسەکەی مەلا عەبدولڕەحمان کرد بۆ مەبەسی ئاسان خوێندنەوە.

ڕاستەقینەیان تێدایە. لەو باوەڕەدام قسەی دوشمنانە لە حاڵی درۆبوونیشیدا، خۆشیی بێ و ترشیی بێ، پەنجەیێک بۆ ڕاستی درێژ دەکات. ئەگەر بێت و قسەی ڕەخنەگری ناحەز بە تەواوی و بێ کەم و زیادی بگاتەوە بەرچاوی هەڵسەنگاندن و تۆژینەوە و وردبوونەوەوە چەند ڕاستییێکی گرنگیان لێ دەفامرێتەوە:

- لەوانەیە کابرای ڕەخنەلێگیراو جێی ڕەخنە لێ گرتن بووبێت و بەمەدا ڕەخنەکە عەیبێکی کابرای ئاشکرا کرد بێیت هەرچەند لە بنەڕەتدا بە نیازی دوشمنایەتی و زەرەر لێدانیش ڕەخنەی لێگیرابێت. ناحەز بەڵێنی نەداوە هەرچی بیڵێت درۆ بێت، ڕەخنەلێگیراویش قۆنتەراتی نەگرتوە هەموو کردە و گوتەیێکی فرشتانە بێ.

- دەشێ ئەو ڕەخنە ڕاستەی کە لە کابرا گیراوە بەپێی ئەو سەردەمە لەلای هەموو وەیا زۆرینەی خەڵق جێگەی عەیب پێهاتن بێ، وەیا خود بەلای مێشک وشکانەوە توهمە بێت و بەلای مرۆڤی ژیر و مێشک فەڕاحەوە هیچی تێدا بەدی نەکرێت، وەیاخود لە ڕۆژگارێکی دواتردا نەک هەر عەیب نەبێ و بەس بەڵکوو ببێتە هۆی شانازیی پێوە کردن بۆ کابرای ڕەخنەلێگیراو لەو ڕووەوە کە ئەو پێش سەردەمی خۆی کەو تۆتەوە و هۆشی بەڕاستی و دروستیی شتان وەها شکاوە کە هێشتان کژوکاتی ئەو هۆش پێشکانە دانەهاتوە. لە نوفتەی موقابیلی ئەمەدا، وا دەبێ کردارێک وەیا بیروباوەڕێک وەیا عادەت و نەریتێک لە سەردەمێکدا باو بووبێت کەچی لە سەردەمێکی دواتردا بۆ خەڵق ئاشکرا دەبێ چەند شتێکی بەدە.

- ئەو گوتە ڕاستەی کە توهمەی ڕاستی لە کابرا گرتوە ئایا لە سەردەمی توهمە تێگرتنەکەدا چەند کەس پەسەندی توهمەکەی کرد و لە کابرای بە عەیب گرت، چەند کەسیش بە وجودی ڕاستبوونی توهمەکە نەکەوتە دژی توهمە تێگیراوەکەوە و هۆی ئەم هەڵوەستە لەیەکنەچوەی خەڵقەکە چی بوو بە تایبەتی هەڵوەستی تاقمەکەی دوەم؟ لە حاڵی وەهادا دەتوانین تا ڕادەیێک دڵ و دەروونی خەڵقی ئەو ڕۆژگارە تێبگەین لە ئاست بیروباوەڕی پەرەسەندوودا، هەروەها ئەو بەرەو تاقمەیەش بناسینەوە کە

حەزی بە گۆڕان و بەرەو پێشچوونی بیروباوەڕی کۆنینە کردوە یاخود هەر نەبێ لە قووڵایی دڵدا پەرۆشی تێچوونی ئەو بیروباوەڕە کۆنینانەی بوە کەوا خەریکە بە سەر زمان و خامەی مرۆڤی بێباک و جەربەزەوە بێحورمەت دەبێ.

- بە نموونە دەڵێم مێژوو پێت دەڵێ لە صەدەی یەکەمی هیجری، لە کاتی خەلافەتی ئەمەویەکاندا خەڵقی کوفە و واسط و بەصرە پتر دڵ کرایەوە بوون بۆ ئەوانەی سەرپێچییان لە دەوڵەت دەکرد، دواتر لە کاتی خەلافەتی عەباسییدا بە تایبەتی لە پاش کۆتایی صەدەی دووەمەوە خەڵقی بەغدا زۆر جاران وروژمیان هێناوە بۆ کوشتنی پیاوێک کە ناوی بە زندیق دەرچوە و نووسینی پشت لە دین و دەوڵەتی هەبوە، لە حاڵێکدا مرۆڤی دەسەڵاتدار ئەو تەرزە پیاوەی لە تەنگانە ڕزگار کردوە و گیانی پاراستوە.
- وا دەبێ ڕاستبوونی توهمە نەک هەر لەو سەردەمە کۆنانەدا کابرای توهمە تێگیراوی تاوانبار کردوە، بەڵکوو ئەمڕۆ و دوارۆژیش هەر تاوانباری دەکات. لە حاڵی وەهادا لایەنی توهمەگر گلەیی لێ ناکرێ بەڵکوو مەدحیشی دەکرێ. هەر بەو پێیە هەموو ئەو لایەنانەی دژی توهمە تێگرتنەکەش بوون دەبێ بە چاوی توهمە تێگیراوەکە سەیریان بکرێت واتە ئەو عەیبەی لەو گیراوە دەبێ لە هەموو ئەو کەسانەش بگیرێ کە بۆی بە پەرۆش بوون. بە نموونە دەڵێم چ فەرقێک نیە لە نێوانی ئەو زاڵمەی لە سەردەمی «تۆقاندن»ـەکەی شۆڕشی فەڕەنسەدا خەڵقی بێتاوانی دەکوشت لەگەڵ ئەو کەسانەی بە دیار گیلۆتینەوە چەپڵەڕێزانیان دەکرد، هەروەک فەرقێکیش لە نێوان دەستدرێژیی دەرەبەگێک و مەدح کردنی دەرەبەگەکە لەلایەن شاعیرێک وەیا مفتەخۆرێکەوە.

ئەمانە و گەلێکی تریش لە ڕاستبوونی ماددەی توهمەکەوە وەردەگیرێن، بەڵام وەنیە تەنها دەلالەت لە «ڕاستبوون» وەرگیرێت، بە پێچەوانە «درۆبوون» ی توهمەش بێ دەلالەت نیە. ئەگەر گێڕانەوەی دەماودەم وەیا خەبەری نووسراو بێ زیاد و کەم هەڵبەستراوەکەی ڕاگەیاندبێ، گوێ سووک و بەهەست دەتوانێ گەلێک پەیامی بێدەنگ و هەرای لێ ببیسێ کە ئەمانەی خوارەوە هەندێکن لەوان:

أ) وا دەبێ لایەنی ناحەز و دوشمن هێرشی توهمەی هەڵبەستراو دەباتە سەر گەورەترین قەڵای شۆرەت و شەخسیەتی دوشمنەکەی بۆ ئەوە یەکجاری بێ چەک و بێ دەسەڵات و بێ هەموو شتێکی بکات. ڕەنگە لە حاڵەتی وەهادا هێرشبەر زانیبێتی ئەگەر کۆڵەگە و کاریتەی خانەی شەخسیەتی کابرای توهمە تێگیراو نەشکێنێت سوودێکی ئەوتۆ لە تەقەڵاکانی پەیدا نابێ چونکە لەوانەیە خانەی شەخسیەتی بەسەر تاکە کۆڵەگەیێکی زۆر مەحکەمەوە ڕاوەستا بێ.

نموونەی هەرە مەشووری مێژوو لەم جۆرە توهمەیە ئەوە بوو کە ناحەزانی پێغەمبەر (د.خ) هێرشیان بردە سەر قورئان و گوتیان کاری ساحیرە، لەوەشدا «ولید مخزومي» کە لە هەرە فەصیحەکانی قورەیش بوو، قسەی لێ وەرگیرا دژی قورئان، هەر هەمان تین و تاوی ئەو توهمە پڕجورئەتەیە کە لە ئایەتەکانی سورەی «المدثر» وەک گوللەی شەستیر بەرەو «ولید» و کافرەکان بەڕێ دەکرێنەوە:

*«ذرني ومن خلقت وحيدا. وجعلت له مالا ممدودا. وبنين شهودا. ومهدت له تمهيدا. ثم يطمع ان أزيد. كلا انه كان لاياتنا عنيدا. سارهقه صعودا. انه فكر وقدر. فقتل كيف قدر. ثم قتل كيف قدر. ثم نظر. ثم عبس وبسر. ثم ادبر واستكبر. فقال ان هذا الا سحر يوثر. ان هذا الا قول البشر. ساصليه سقر. وما ادراک ماسقر. لاتبقى ولاتذر. لواحة للبشر. عليها تسعة عشر».*

توهمە تێگرتنەکە و وەرامە پڕ هێز و هەڵمەت و ئیعجازەکەی ئایەتەکانی قورئان تیشکی گەلێک باری ئەو زۆرانبازییە زلەی نێوانی ئیسلام و بوتپەرستەکان دەدەنەوە و ساغی و ناساغی خەبەری تری ئەو سەردەمە بە ئیسپات دەگەیەنن. باوەڕ دەکەم ئەگەر چەند ڕەخنە و توانجێکی شێخ نەبیمان دەرحەق حاجی قادر چەنگ کەوتبایە، لێرەشدا دەمانتوانی بزانین کام لایانەکانی شەخسیەت و شۆرەتی حاجی لە نەزەر شێخ نەبیدا یەکجار بنجی و بەهێز بوە چونکە بەعادەت درۆ هەڵبەستن دژی شتی بەهێز ڕێکوپێکتر و بە داکوبابتر دەبێ لە چاو درۆی دژی شتی بێهێز، بێگومان شێخ نەبیش لێی دەوەشێتەوە لە حاڵی وەهادا ئەو توهمەیە هەڵبەستێ وەیا ئەو ڕەخنەیە ڕێک خات کە بابەتی توهمە تێگیراو و ڕەخنە لێگیراو داوای دەکات. هەر لە هەمان ڕێگەیشەوە دڵ و دەروونێکی خەڵقەکەی ئەوسای کۆیەشمان بۆ دەخوێندرایەوە لەو

ڕووەوە کە مەبەستی هەرە گەورە لە توهمەکارییەکە ئیقناع کردن و بە هەڵە بردنی خەڵقەکەیە تاکوو لە حاجی بتەکینەوە. بەڵام داخم ناچێ هیچ شتێکمان لەو بابەتە بەدەستەوە نیە.

ب) واش دەبێ ناحەز لایەنێکی بێهێز و نامەحکەمی کابرای توهمە تێگیراو دەگرێتە بەر ڕەخنە و توانج، لەمەشدا دوو سوودی دەست هەڵێنج ڕەچاو دەکات: یەکەمیان ئەرکی کەم، دوەمیشیان بە ئاسانی خەلق ئیقناع کردن. بەرچاوترین نموونەیێکی ئەم بابەتە لە ڕووداوەکانی مێژوو بێتەوە یادم، توهمەی «کافریی» بوو کە گیرایە «إبن سینا»، لەمەشدا ناحەزەکانی هەندێک ڕەفتار و گوفتاری ئەویان کردە هۆی کافرکردن کە بەلای خەڵقەوە دژبوونیان لەگەڵ ديندا شتێکی ئاشکرا و سەلمێنراو بوو وەک شەرابدۆستی و چەند بیروڕایەکی فەلسەفیی زۆر مەشووری ئەو کە لەگەڵ ڕاستە باوەڕی ئیسلامدا نەدەگونجان. ئەم چوارینەیەی «إبن سینا» دەنگدانەوەیێکی کافر کردنەکەیە:

کفری چو منی گزاف و اسان نبود
محکمتر از ایمان من ایمان نبود

در دهر چو من یکی و ان هم کافر
پس در همه دهر یک مسلمان نبود

واتاکەشی بە کوردی ئەمەیە:

کافربوون وەیا کافر کردنی یەکێکی وەک من بە خۆڕایی و ئاسانی نابێ
ئیمانی مەحکەمتر لە ئیمانی من پەیدا نابێ

لە هەموو زەمانەدا یەکێکی وەک من هەبێ و ئەویش کافر بێ
کەواتە لە هەموو زەمانەدا یەک مسڵمان پەیدا نابێ

مێژوو لەم بابەتە توانج تێگرتن و وەرامدانەوەی زۆر تێدایە، من بەم دوو نموونەی زۆر مەشوور واز لەهی تر دێنم چونکە بایی مەبەست دەکەن.

بێگومان شێخ نەبیش ئەوەندەی دەزانی لە چ ڕێبازیکی ئاسانەوە پارێز ببات بۆ سەر کولێنی حاجی قادر، ئەگەر هیچ ڕێبازێکی چەنگ کەوتبێت. بە داخەوە ئێمە ئێستا نازانین ئایا شێخ نەبی چ ڕێبازێکی ئەوتۆیی چەنگ کەوتوە یا چەنگی نەکەوتوە چونکە وەک گوتم هیچ تاکێک لە توهمە و توانجەکانی دژی حاجی قادر لەوەوە بە ئێمە نەگەیشتوە، بەڵام ئەگەر شتێکی ڕاست و دروستمان لە ڕێگەی ڕیوایەتی بێ دەسکارییەوە لەو توهمانە پێگەیشتبایە دەمانتوانی بزانین ئاخۆ لە نەزەر خاوەنی ئەو توهمانەدا کام دیواری شەخسیەتی حاجی کەلێنی پارێز بردنی بەدەستەوە داوە، ئەوساش جارێکی لەوانە بوو بتوانین بزانین ئایا ئەو توهمانە کەلێنی ڕاستەقینەیان دۆزیوەتەوە یاخود لێی بە سەهوو چوون چونکە ئێمە بایی ئەوەندەی ڕاستی و درۆیی ئەو توهمانە بزانین شارەزایمان بە حاجی هەیە، لەوەش بەڵەدین ئایا کام بۆرە توهمە لێی دەوەشێتەوە لەو سەردەمەدا بەڕاست و دروست حیساب کرابێ دژی حاجی. سەرەڕای شارەزایمان لە بارەی حاجی قادرەوە، لە ڕێی قیاس کردنی ئەوسا لەگەڵ ئەم ڕۆژگارەدا کەوا جارێ زۆر لەیەکتر دوور نەکەوتونەتەوە، دەتوانین بارێکی نەفسی و عەقائیدی خەڵقی ئەوسای کۆیەش بە بیری خۆماندا تێپەڕێنین بۆ چاوەڕوان کردنی جۆری ئەو توهمانەی کە لەوانەبوو دژی حاجی ببیسترێ و گوێی بۆ شل بکرێ، ئیتر ئەگەر شتێکمان لەو توهمانە زانیبایە لەوانەبوو بگەین بە حەقیقەتی نیازی حاجی قادر لە دانانی ئەم بەیتانە:

لە قوشخانەوە تا دەمی ئیچ قەڵا
لە بایزاغاوە تا محەللەی قەڵات[80]

هەموو خزمی خۆمن دەزانم دەڵێن
لە بێ حورمەتیمان بوو حاجی هەڵات

ئایا ئەم شیعرە دەنگدانەوەی گلەیی ئامێزانەی دڵ و ویژدانی حاجی قادرە لە ئەنجامی بیستن و سەلماندنی ڕەخنە و توانجەکانی شێخ نەبی لە لایەن خەڵقی کۆیەوە؟ ئایا ئەم شیعرە دەبێتە بەڵگە بۆ کاردانەوەیێکی پەرەسەندووی

---

[80] «قوشخانە، ئیچ قەڵا، بایزاغا، قەڵات» چەند جێگە و گەڕەکێکی کۆیەن.

پڕۆپاگەندەکانی شێخ نەبی لە دڵ و دەروونی زۆربەی دانیشتوانی کۆیێ دژی حاجی؟ یاخود ئەمە نیە و شتێکی ترە کە لە دواتردا باسی دەکەم؟ ئەگەر چەند لەرە و ئاوازی ئاهەنگی ئەو پڕۆپاگەندەمان پێ گەیشتبا دەمانتوانی ئەوانیش وەک پارچەکانی تری مەتەڵی Jigsaw بخەینەوە شوێنی ڕاستەقینەی خۆیانەوە لە تابلۆی وەزعی ئەو ڕۆژگارەدا، لەبەر تیشکی ئەم گونجانەی پارچەکانیش لەگەڵ تیشکی تێکرای تابلۆکە چەند هەنگاوی تر ڕێگە دەرکەین بەرەو پتر ناسینی حاجی قادرەوە، باشتریش شارەزای باری ماددی و زیهینی و عەقائیدیی حاجی ببین. بەڵام چ سوود!!!

ج پلانگێڕ و خەبەرسازی بەڵەد لێی دەوەشێتەوە لە دروست کردنی ناو و ناتۆرەدا ئەم دولایەنەی باس کراوی لێرە بە پێشەوەی (خاڵەکانی أ، ب) مەبەست نەبووبێ و شتێکی گرنگتری بە ئامانج گرتبێ: لەوانەیە وەک پسپۆڕی مەعلان لە فابریقەی خەبەرسازی و پڕوپاگەندەدا خەبەرێک هەڵبەستێت و بەناو خەڵقدا بڵاوی بکاتەوە کە دەزانێ لەسەر تەلێکی گشتی بیروباوەڕی زۆربەی خەڵق لێ دەدات و خێرا دەیان ورووژێنێت و قۆتاغیان دەکات، لەم کارەشدا دەتوانێ بە ئاسانی زمانی تەڕوپاراوی پەیڕەوە ماهیرەکانی وەک ئیستگەی بێتەلی ئەم سەردەمە بخاتە گەڕ و بە شێوەیێکی بەردەوام و بێوچان ئەو توهمانەمان پێ کاوێژ بکاتەوە کە جار لە جار پتر دەچنە دڵانەوە و باوەڕیان پێ دەکرێ.

ئەم کارەی گێل کردنی خەڵق لە سەردەمی ئاتۆم و ئاسمانگەردیدا زۆر سەرکەوتوە چ جایی لەو سەردەمە هەژارە ڕووت و ڕەجاڵەی کۆیەی بەر لە 100 ساڵ پتر. لە ئاست توهمەی وەهاشدا مرۆڤ دەتوانێ بە لێکدانەوە و قیاس و تۆژینەوە ڕایەکی پوخت و نیشانەئەنگێو پێک بێنێت. خۆ ئێمە ئەو خەڵقە بێخەبەرە کەم تەجرەبەیەی سەردەمی شێخ نەبی نین لەبەر سادەیی خۆمان و بە ئەفسوونی مریدەکانی هەڵخەڵەتێین و توهمەی درۆ بەڕاست بزانین. کاشکی چەند توهمەیێکی ئەو بابەتە عەوام خەڵەتێنەمان لە شێخ نەبییەوە بۆ مابایەوە قیرسیا با ئێمەشی هەڵخەڵەتاندبا. سەرسوڕمان لە بێسەروشونی پتر پەیدا دەبێ نەک لە سەروشونێکی هەڵەی تێدا بێ. مێشکێک نەتەپیبێت دەتوانێ وەک دایەرەی «تحریات فنیة» شوێن پەنجەی ڕاست بدۆزیتەوە لە نێوان هەزارانی درۆزندا، یاخود خەتی نووسەر بناسێتەوە با نووسەرەکەش ویستبێتی خەتی خۆی بگۆڕێ. بەڵام کوا شوێن پەنجەی ڕاست و

درۆ؟ کوا خەتی بەئانقەست گۆڕاو؟ کوا توهمەی هەڵبەستراو؟ کوا پڕوپاگەندەی عەمەلی...؟

ئەگەر شێخ نەبی توهمەی هەڵبەستبێ دیارە بۆ زڕاندنی ناوی حاجی قادر بوە لە لای زۆربەی خەڵقی کۆیێ بەگشتی، لەلای پیاو ماقوڵ و دەسەڵاتدارەکانیش بە تایبەتی، کە دەزانین بەشی زۆریان دۆستی حاجی بوون. لە زڕاندنی ناوی حاجی سوودێکی گەورە بە شێخ نەبی دەگەییشت، سوودەکەش بێبایەخ کردنی تیر و شیرە زەهراویەکانی هەڵبەستی حاجییە دژی شێخ کە ئەمەش ڕاستەوخۆ ئیفلاسی هێرشەکانی حاجی ڕاگەیاند.

بەداخەوە چ نموونەییێکی جۆری لەسەرخۆکردنەوەی شێخ نەبیشمان پێ نەگەیشتوە، چەندێکی پرسیارم لەو کەسانە کردبێ کە لێیان دەوەشێتەوە دەنگ و باسێکی ئەو سەردەمەیان لابێ لە «چم نەبیستوە» بەولاوە وەرامم لێیان وەرنەگرتۆتەوە. لە حاڵی وەهادا کە باس و خواسی کۆنینە دێتە ناوەوە هەر دەڵێی باسی دار و بەرد دەکرێ نەک مرۆڤی گیانلەبەری زمانگەڕاوی دەست و قاچ ساغڵەم چونکە ڕووداوەکە دەگێڕدرێتەوە وەک سینەمای بێدەنگ، وەیا لەوەش خراپتر وەک وێنەی فۆتۆغراف کە نە دەنگ و نە جووڵەی هەیە.

گەلێک لە هەزار ساڵ پتر لەمەوپێش کە حیکایەتخوانانی عەرەبی وەک «خلف الاحمر، حماد الراوية» باسی عەرەبی لە خۆیان بە پێشەوەیان بۆ خەڵق دەگێڕایەوە، بە هەموو چەند و چۆن و گوتە و کردە و بردە و بێنە و بەرەییێکیان دەگێڕایەوە، تەنانەت ئەگەر لە حیکایەتەکەدا پیرەژنێک دوو قسەی لەسەر لێوان هاتبێتە دەرەوە ئەویش دەکەوتە ناو حیکایەتەکەوە و بۆ دوارۆژ دەبوە سەرچاوەیەکی مێژوو وەیا زمان وەیا ڕێزمان وەیا کۆمەڵایەتی، بەڵام بەداخەوە سەرگوزەشت و بەسەرهاتی کوردەواری بەدەگمەن نەبێت شتێک بەدەستەوە نادات، هەر لە گفتوگۆ تا دەگاتە پۆشاک و خۆراک و هەموو شتێک. تەنها سەرچاوەییێکی فۆلکلۆریی هەبێ درێژەیەکی بەسەرهاتان بلێتەوە لە ناو کورددا «لاوک» تا ڕادەییێکیش «حەیران» و «بەیت» ـە.

تەعلیلی ئەم دیاردەیەی خەریکبوونی لاوک و بەیتی فۆلکلۆری کوردی بە ڕووداو و حیکایەتانەوە شتێکی نهێنی نیە بەڵام ئێرە جێگەی لێدوانی نیە، بەداخەوە ئەوانیش

خۆ لە هەموو بەسەرهاتێک ناگەیەنن: بەڕاستی ساغکردنەوەی چۆنەتی پەیدابوونی بابەتی فۆلکلۆری و موقارەنەی لەگەڵ بابەتی ئەدەب و هونەردا باسێکی زۆر خۆشە، سەرەڕای خۆشیی پێویستیشە، بەولای پێویستەوە تا بڵێی کارێکی بنجیشە بۆ پێکهێنانی نیگاییێکی گشتی ڕاست و دروست بەرانبەر تێکڕای تابلۆی کۆمەڵایەتیمان. ڕۆشنبیری کورد تا نەزانێ بۆچی شاعیری صەدەی نۆزدەم و لەویش بە پێشەوەی کورد خەریکی تەجرید و واتاسازی و ئارایشت بوە لە حاڵێکدا «شایەر» و بەیتخوێن و لاوکبێژی کورد لەگەڵ واقیع دواوە، هەر لە تاریکاییەکی خەستدا دەمێنێتەوە لە ئاست گەلێک لە پرسیارەکانی سەر بە ئەدەب و فۆلکلۆر و کۆمەڵایەتی و باری ماددی و مەعنەویی کوردەوە کە ئەویش نموونەی میللەتانی ترە لەگەڵ هەندێ جوداوازی تایبەتی ژیان و دەوروبەری خۆیدا. ئەو «Jigsaw» ەی کۆمەڵایەتی پچرپچرِی لێرە بەپێشەوەمان کە بە میرات بۆمان ماوەتەوە ناکرێتەوە تابلۆییێکی مەفهوم ئەگەر ئەوەی تازە باسم کرد بە چاکی نەزانرێ زۆر بە ڕوونی نەنیشێتە دڵ و مێشکی ڕۆشنبیرانی کوردەوە. دیاردەی کۆمەڵایەتیی وەیا مێژوویی وەیا ئەدەبی وەیا هەر شتێکی تر بێ، لەخۆوە بێسەبەب وەک بڵقی سەر ئاو[81] پەیدا نەبوە، کە سەبەبەکەش نەزانرا کۆمەڵایەتی و مێژوو دەبنە مەتەڵ وەیا ئەوپەڕەکەی بەرەو ڕوونبوونەوە بێت، دەبنە ڕێکەوت و «صدفە» ی کوێر.

کورتەی گوتە لەبارەی توهمەکانی شێخ نەبی دژی حاجی قادر ئەوەیە کەوا هیچ شتێکمان لەو توهمانە پێنەگەیشتوە، ئەگەر لای کەسێکیش چ باس و خواسی ئەو توهمانە هەبێ من نەمبیستوە. تا بڵێی مەمنونی ئەو کەسە دەبم شتێکم لەم بابەتەوە پێ بگەیەنێت.

د- لەم حاڵەی تایبەتی دوشمنایەتیی نێوان شێخ نەبی و حاجی قادردا، ئەگەر چی ئەوتۆمان لە توهمە و توانجەکانی شێخ نەبی بەدەست کەوتبایە، لەوانەی بەڕاستی و بێ زیاد و کەم دەماودەم گلێر دەبنەوە، لەوانە بوو پەیامێکی یەکجار گرنگی لێوەرگرین و لایەنێکی زۆر سرنجڕاکێش لە ژیانی حاجی قادری پێ ڕوون کەینەوە. ئاخۆ ئەو توانجانە چی وەهایان تێدایە ببێتە شکات کردن لە حاجی لای دەسەڵاتی

---

[81] ئەوەی ڕاستی بێ «بڵقی سەر ئاو» یش بێ سەبەب پەیدا نەبوە بەڵام لە نەزەر خەڵقدا سەبەبەکەی نادیار بوە بۆیە بۆتە ماکی ئەو مەتەڵۆکە.

میری کە داگیرکەری عوسمانلی بوو؟ بە شێوەیەکی ئاشکراتر، ئاخۆ شێخ نەبی لەو تومەمە و توانجانەدا چ ئیخبارییەیێکی کوردایەتی حاجی قادری خستۆتە بەرگوێی میری؟ ئایا گوتوەتی ئەم حاجی قادرە دژی خەلافەتە وەیا ناحەزی دەسەڵاتی عوسمانلییە؟ ئەگەر قسەیەکی وەهامان لەو توهمانەوە وەرگرتبا ڕاستەوخۆ ئیسپاتی ئەوەی دەکرد کە حاجی قادر بەر لەسەفەری بەرەو تورکیا دەستی کردوە بە خەباتی کوردایەتی، ئەوساش دەبوو هەموو نووسەرێک و ڕۆشنبیرێک کە لە بارەی حاجیەوە بنووسێ ئەم ڕاستیە زلە، وەک چرای تاریکە شەو، لە پێش خۆیدا هەڵکات و مەشقی نووسین لەبەر شەوقی ئەودا بکات. بەنیسبەت خودی خۆمەوە دەبوو تەقڵە بەهەموو قەناعەت و بیروباوەڕاکانم لێ بدەم و سەرەوبنیان بکەم و لەنوکەوە تێهەڵبچمەوە. بەڵام لێرەدا لێم بەسەهوو مەچۆ. من ئەو خەسارەتمەندە نەدەبووم کە ڕواڵەتی قسەکەی خۆم ڕایدەگەیەنێ، چونکە ئەگەر خەبەرێکی ئەوتۆ هەبوویایە کەوا لە ڕێی دوشمنایەتی نێوان شێخ نەبی و حاجی قادرەوە ئیسپاتی خەباتی سیاسی و کوردایەتی حاجی قادرمان بۆ بکات، لە یەکەم وشەی نووسینمەوە ئەو خەبەرەم بۆ دەبوو بە ڕێنیشاندەر نەک لەدوای نووسینی صەدان لاپەڕەدا بۆم ببێتە ئەو شتەی ڕیس دەکاتەوە بە خوری. بەهەمەحاڵ چ خەبەری ئەوتۆ کە کوردایەتی حاجی قادر بگێڕێتەوە بەر لە چوونی بۆ ئەستەمبۆڵ نە لەڕێی توهمەکانی شێخ نەبی و نە لە چ ڕێیەکی ترەوە بە کەس گەیشتوە و نە بە کەسیش دەگات و نە وجودیشی هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ئەگەر هیچ خەبەرێک و سەروسۆراغێکی قسە دوشمنانەکانی شێخ نەبی بە ئێمە گەیشتبا دیسانەوە بە نیسبەت بوون و نەبوونی گیانی کوردایەتیی لای حاجی قادر لەو سەردەمەدا سوودێکی باشمان لێ وەردەگرت هەرچەند لەو توهمانەشدا چ دەلالەتێکی «کوردایەتیی» پەیدا نەبوویایە چونکە لەو حاڵەدا بۆمان دەردەکەوت کە یەکێکی تریش لەو سەرچاوانەی لێی چاوەڕوان دەکرێ باسێکی کوردایەتیی ئەوسای حاجی قادرمان بۆ بگێڕێتەوە، با لە قاڵبی سەلبی و دوشمنایەتیشدا بێ، ئا ئەو سەرچاوەیەش لە بەڵگەی سەلبی و ڕاگەیاندنی نەبوون بەولاوە چی ترمان پێناڵێت، لەمەشدا جارێکی تر ئەو قەناعەتەمان پتەوتر دەبوو بەوە کە حاجی دوای چوونی بۆ ئەستەمبۆڵ دەستی کردوە بە کوردایەتی و خەباتی سیاسی.

من دەزانم نەبوونی چ قسە و قسەڵۆکێک لە شێخ نەبیەوە دژی حاجی قادر ئەرکی سەرشانی من قورستر ناکات لە بەرانبەر ئەو کەسانەی دەیانەوێ بێ بنج و بەڵگە خەباتی کوردایەتیی بۆ حاجی قادر بخولْقێنن بەر لەوەی بەڕاستی خولْقابێ، چونکە لەم هەڵوەستەمدا کە من لایەنی «سلبی» م گرتوە و دەڵێم لەو قۆناغە ناوەندییەی تەمەندا حاجی قادر کوردایەتیی نەکردوە، نەبوونی قسە و خەبەر و حیکایەت لە هێزی هەڵوەستە سلبیەکەم زیاد دەکات و باری سەرشانی هەڵوەستی داواکار و ئیجابی قورستر دەکات. ئەمە دەزانم بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ئەگەر لە شێخ نەبیەوە چەند قسە و قسەڵۆکێکمان پێگەشتبایە دژی حاجی، ئەوسا بەهۆی نەبوونی کوردایەتیی لەو شتانەدا، تارمایی ئەوەندە بەهانەش نەدەما کە مام نەسەلمێنێک بێت و بڵێت «چ فایدە! قسەکانی شێخ نەبیمان پێ نەگەیشت... ئەگەر پێمان گەیشتبایە مەعلووم دەبوو چەند ئیخباریەیان تێدایە بۆ لای دەسەڵاتی میری عوسمانلی دژی کوردایەتی حاجی قادر..».

کە ئەمە دەڵێم لەوەش باخەبەرم من لەخۆمەوە ئەو تەرزە قسە و بەهانانە بە بیری جوامێرە نەسەلمێنەکاندا دەهێنم و لەجیاتی ئەوان دەیکەمە جێگەی لێکدانەوە و نرخ پێدان، چونکە بێگومان ئەگەر ئەوان هێندە لە حاجی قادر ورد بووبانەوە کە ئەم تەرزە لێکدانەوانەی لەبارەوە بکەن، بەزوویی دەگەیشتنە ئەو قەناعەتە کە حاجی پاش ڕۆیشتنی لە کۆیێ دەستی کردوە بە کوردایەتیی. کشانی بیری تۆژەرەوە و لێکۆڵەرەوە بۆ ئەم تەرزە لێکدانەوانە کاری سەرپێیی نیە، بەرهەمی پەلەکردن و سەرچڵیش نیە. تا مرۆڤ دەتوانێ بۆ ڕەگ و بنجی مێژوو قووڵ ببێتەوە دەبێ مێشک و هەستی خۆی وەک ئاو لە ناو ئەو ڕەگ و بنجەدا بگێڕێت و پێیاندا بچێتە خوارێ... دەبێ لە ئاست مێژوودا ئەوە بکات کە «عمر خیام» لە ئاست مەیل و ئارەزوی دڵی خۆیدا لەم چوارینەیە کردوەتی:

امشب می جام یک منی خواهم کرد
خودرا بدو جام می غنی خواهم کرد

اول سه طلاق عقل و دین خواهم‌گفت
پس دختر رزرا بزنی خواهم کرد

هەر ئەو فەرقە هەیە لە نێواندا کە دەست لە ملی مێژوو کردن ڕێبازێکی تری هەیە بەڵام لەوێشدا هەمان خۆتەرخان کردن و جیهان لە بیرە خۆبردنەوە پێویستە.

لە وانەیە خوێنەر بە دەنگێکی نەرم پرسیارێکم لێ بکات و بڵێت تۆ کە هیچت بەدەستەوە نیە لە توهمە و توانجەکانی شێخ نەبی دژی حاجی قادر، ئیتر بۆ چی وا بە درێژی خەریکی وشکەمەلە لە حەوزی بێ ئاودا دەکەی و دەغڵی بەری دەستت دەدرووویتەوە؟ ئەم هەموو گەشتە دورودرێژە لەناو جیهانی نەبووی و نەزاوی خەبەری لە کەس نەبیستراودا چ سوودێکی هەیە و لە کوێوە ئامۆژگاریمان بۆ دێنی کەلێنی ئەو هەموو ماندوبوونە و چاوئێشانە و سەرئەستور بوونە و کاغەز و چاپەمەنی بە خەساربردنەمان بۆ پڕ بکاتەوە.

لە وەرامی پرسیاری وەها ڕەخنەگرانەدا دەڵێم ئەگەر مزەی ئامۆژگاری شتێکی ماددی بەرهەست و بەردەست بێ، بایی فلسێک مزەم لێ وەرناگریت و یەک تۆز ئارد لە بەرداشی لێکۆڵینەمەوە ناکەوێتە کاسە و کەوڵتەوە چونکە ئاشکرایە تا ئێستا لەلای من چ خەبەر و ئەسەرێکی گوتەکانی شێخ نەبی پەیدا نابێ، بەتەماش نیم لە هیچ لایێکەوە پەیدا بێت هەر لە ئێستاکەوە تا کۆتایی ڕۆژگار. من ئەمە دەڵێم تاکوو لە هەڵوەستی دەست بە هیچ ڕانەگەشتنەوە، یاخود بە گوتەیێکی کوردانە، لەسەر ساجی عەلییەوە وەرامت بدەمەوە. دەنا ڕێی تێدەچێ ڕۆژەک لە ڕۆژان و جێیەک لە جێیان و مرۆڤێک لە مرۆڤان خەبەرێکی توهمە و توانجەکانی شێخ نەبیمان پێ ڕابگەیەنێ یاخود ئەگەر ئێمەش بەسەرچوین چینی دوا خۆمان خەبەرەکەیان پێبگات ئەوساش مزەی ماددی لەبەر کێش و تەرازوی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا پڕی کاسە و کەوڵەکەت دەبێ لەو ڕووەوە کەوابێ ماندوبوون و ئەرککێشان دەزانیت دەلالەتی ڕاستەقینەی ئەو خەبەرە چیە و چ لایەنێکی باری شەخسیەت و نەفسیەت و بیروباوەڕی حاجی قادر ڕوون دەکاتەوە و بەرەو کام چەشن و شێوە و چەندوچۆنی دەبات و چ «هویە» یێکی پێ دەدات... ئەوسا مەودای بەسەردا تێپەڕین و لێ بەسەهوچونیش کورت دەبێتەوە یاخود ئیحتیمالی بەسەهوچونەکە هەر بەجارێ نامێنێ چونکە تۆ لەپێشەوە لەڕێی لێکدانەوەکانی ئێرەوە ئالەتی کێشانە و پێوانەت بۆ ئامادەکراوە، هەر ئەوەندەت پێ دەوێ بەسەر ئەو بابەتەدا بکەوی کە کێشانە و پێوانەکەی لێ بەکار بێنێت... بەڵێ من نامەوێ لە پەنا ئیحتیمالێکی وەهادا کە دەستم تێیدا پڕە و بەتاڵ نیە وەرامت بدەمەوە و نووسینەکەم بخەمە بەر نیگای

ڕەخنەتەوە بۆ پەسەند کردن و ئێسکسووکبوونی. من دەمەوێ نووسینەکەم «بەدەستی بەتاڵەوە» هەڵسەنگێنم لە تای تەرازووی ڕەخنەی ڕۆشنبیری و زانست و ژیاری نوێدا.

چارمان ناچارە، ئەی خوێنەری کورد، بۆ ڕوون کردنەوەی ڕابوردوی تاریکمان بست بە بستی «کات و جێگە- زمان و مکان» ی ئەو ڕابوردوە ناوکێڵ بکەینەوە و پێبەپێ لەو ناوکێڵ کردنەدا قووڵتر بینەوە بەڵکوو لە ئەنجامی لێکدانەوەی ورد و قووڵەوە بتوانین لە خۆمان بگەین و دەماری بەسترانەوەی ئێستاکەمان بە ڕابوردومانەوە لە ژێر تەبەق ئەندەر تەبەقی فەرامۆشی و لە ناوچوون و سەرگومبوون و لەناوبردن و داپۆشین و یاساغ کردنەوە دەرکێشینەوە بۆ بەر تیشکی زانین و هەست. تۆ ئەگەر لە خۆت و نیشتیمانەکەت و میللەتەکەت و ئێستاکەت و ڕابوردوەکەت و دواڕۆژەکەت بە سەهوو نەچووبیت، وەک نوێژ و ڕۆژوی مرۆڤی دیندار لەسەرتە، ڕاپەڕیت و قوماشی «خاک و مێژو»ت بە نووکی خامە ئەنجن ئەنجن بکەیت و هەڵیوەشێنیتەوە و تەقەڵەکانی لەبەر یەکتر بەریت و بچیتە ناو ڕایەڵە و تانوپۆیەوە تا تێیان دەگەیت و وەک خۆراکی هەزمکراو دەیان کەیت بە بەشێکی بنجیی لە سەقافەتت.

بەڕاستی و بێ وشەکاری و موبالەغە، مرۆڤ- کە تۆیت- هەستی ڕاست و تەواو بە بوونی خۆی ناکات ئەگەر نەزانێ چ جۆرە هەناوێک و منداڵدانێک زات و گیان و لەش و هۆش و هەست و نەستی گووراندوە. مرۆڤی لە خۆنەگەییشتو و لە مێژوو بەسەهوچوو ڕەگ لە میللەت و مەفتەنی خۆی داناکوتێت و پێوەندی پێیانەوە ئەوە نابێ کە لە بەردەمی تیغی بڕندەی ڕۆژگاردا خۆی ڕاگرێت. مرۆڤی بێ ڕەگی پێوەندیی بە ڕابوردوی دێرینەی میللەتەکەیەوە دەبێتە مێوانی وەخت و سەعات، هەر تێی ڕاخوڕن وەک مێوانی ئوتێل نیشیمەنەکەی چۆڵ دەکات... نەختێکی تریش تینی بۆ بێنن پێستی نژادەکەشی لە خۆی دادەماڵێ وەک جل و بەرگی خوازرایەوە، چ هەستێکیش ناکات بە کەموکەسری، گورجیش پەندەکەی «ئێرە نا دێرە» لە قەناعەتیدا دەجریوێنێ.

خۆنەناسینی ئەوتۆیی مرۆڤ دەکا بەو کۆزمۆپۆلیتەی کە دەربەستی ئێرە و دێرە و کوردبوون و کوردنەبوون نایێ، جوداوازیش لە نێوان ئەو مرۆڤە و کۆزمۆپۆلیتەکە هەر ئەوەندەیە کابرای کۆزمۆپۆلیت لە ڕێی فەلسەفەیێکەوە ڕەگی بە «میللەت و

نیشتمان»ـەوە پچڕیوە و خۆی بە جێگیرێکی ئەوانەوە لکاندوە کەچی مرۆڤی لەخۆ بەسەهوچوو و خۆنەناس ڕەگی پێوەندیی لە بنەڕەتەوە پچڕاوە، بەڵکوو ڕەگەکەی پەیدا نەبوە تا بپچڕێت. دەرکێشانی ئەو جۆرە مرۆڤە لە بێخ و بنجی مێژووی میللەتەکەی کارێکی ئەوەندە ئاسانە وەک ئەوەیە مووی بێ بنج و بێخ لە ماستی نەمەییو دەرکێشیت. هەر بۆیەیشە ئەوکەسانەی خۆیان بە بیروباوەڕێکی جوداواز لە بیروباوەڕی قەومی ڕاستەقینەوە دەلکێنن بە ئاسانی لە هەڵوەستی دژی بەرژەوەندی میللەتەکەیان بوەستن و شانازیش بەو هەڵوەستەوە بکەن، ئەوان کەسانە ڕەگ و ڕیشەی پێوەندییان بە باوک و باپیر و بابەلباپیر پەیدا نەبوە تاکوو هەست بە ئێش و ئازار بکەن لەو هەڵوەستانەدا کە پێوەندییان بە ڕابردووەوە نیە یاخود پێوەندیی بە ڕابردووەوە هەڵدەبڕنەوە، وەک ئەو «أبو رغال» ـەی کە ڕێنمایی لەشکرەکەی «ئەبرەهە» ی دەکرد بۆ سەر کەعبە بەنیازی تێکدانی، بەمەشدا بوە نموونەی مەلعوونی لە مێژووی عەرەبدا.

بێگومان هەموو ئەو خۆفرۆشانەی ئێستاکە ڕەخنە و کەلێن دەدۆزنەوە بۆ دوشمنی عەرەب لە فەلەستیندا هەموویان «أبو رغال» ی سەردەمی ئاتۆمن،
بۆیەیشە عەرەبە خەباتکەرەکان فەرقی ئەوان ناکەن لە ئیسرائیل، بگرە گوناهی ئەوان بە گەورەتر دەزانن، حەقیشیانە.

ئەو تەرزە کەسانە، چ عەرەب چ کورد چ غەیری عەرەب و کورد، هەستێکی حەسانەوەش دەکەن لەو هەڵوەستانەدا کە پێوەندییان بە ڕابردوی میللەتەکەیانەوە دەبڕێتەوە لەو ڕووەوە کە پچڕانەوە لە ڕابردوو دەبێتە بەڵگەیێکی ڕاستبوونی ئەو بیروباوەڕەیان کە پەکی لە سەر پێوەندیی بە ڕابردووەوە نەکەوتوە. زمانی حاڵی ئەو کەسانە لە هەڵوەستی وەهادا هاوار دەکات و دەڵێت: هۆی خەڵقینە تەماشاکەن چەند ئاسانە خۆدزینەوە لە ڕابردوی ڕووت و ڕەجاڵ... تەماشاکان ئەو کورد و کوردستانە وەیا ئەو عەرەب و عەرەبستانە و تورک و تورکستانەی کە لێیان کردبووین بە بوت و صەنەم و وەک تۆقی عەزرایل خستبوویانە ئەستۆمانەوە چەند درۆزن و شل و شەکەت بوو، کە لە ئەستۆی خۆمان دارِنی چ ئەرکێکی ئێسک قورسی بەدفەڕمان لە خۆمان دوورخستەوە... وەرن خزمینە سووک هەڵپەڕن لەو مەزرایە بەرین و بەربەڕەڵڵایەی ڕەهابوون لە کۆت و زنجیر و بەند و باوی دێرینەی مەفتەن و باب و باپیر و داب دەستوور و نەریت و ئەفسانە و قسەی

پوچ... بێگومان حاجی قادری شێت و شەیدای کورد و کوردستان و هەستکردوو بە هەڕەشەی ڕۆژگار لە میللەتی کورد، بە دیتنی لە کوردایەتیی دەرچوونی چەندین کوردی سەردەمی خۆی ئاگر بەر بۆتە دڵ و شعووریەوە بەڕادەیێک جڵەوی شەرم و شکۆی لە دەستان دەرهێناوە بێئیختیار زیرەی لە هەناوی هەڵستاوە و بورکانی غەزەبی بەسەر ئەو زۆڵە کوردانەدا تەقیوەتەوە و نرکەی لەعنەتی بەدەنگ هاتوە و گوتوەتی:

ئەگەر کوردێ قسەی بابی نەزانی
موحققەق.................................

بەڵێ، لەم بەیتەدا هەرچەندێک وشەی سووک بەکار هاتبێ، کە خۆم هەرگیز لە بەکارهێنانیان دڵ ئارام نابم، بۆ شتێکی دە ئەوەندەی خۆی سووک بەکارهاتوە، ئەویش لە کوردایەتیی دەرچوونە. حاجی بە چاوی خۆی دیتوەتی هەر بابەیە و لە کوردستان دوور دەکەوێتەوە و بۆ دەوڵەتپارێزیی خۆی[82] دەچێتە ناو کڵێشە و پێست ئەو میللەتەی کە بنجی نوێی تێدا دادەکوتێت و واز لە نژاد و زمانەکەی دێنێت و دروشمی «ئێرە نا دێرە» هەڵدەگرێت وەک ئەوەی کە ڕۆژەک لە ڕۆژان لە هەوای کوردستانی هەڵ نەمشتبێ وەیا لە ئاوی نەخواردبێتەوە وەیا فرچکی بە داب و دەستوور و نەریتی نەگرتبێ، لە حاڵێکدا کوردستان موحتاجی هەموو ڕۆڵەکانی دوور و نێزیکی بوە، لەگەڵ مێردەزمەی مێژووی چەندین هەزار ساڵەی مافخوراوی و ڕۆڵەکوژراوی و قیمەکران و چەوسێنراوەییدا چەنگەوباز بوە و بەقەدەر خوێنی ڕژاوی ڕابردووی، لەویش پتر، چاوەڕوانی خوێن ڕژانی سامناکی دوارۆژی خۆی دەکات، حاجی قادر لەو سەردەمەدا ئەمەی دیتوە و تێیگەیشتوە و لە ئەنجامەکەی تۆقیوە و بەرانبەری وەستاوە نەک لەبەر خاتری خۆی، کە لە هەموو حیسابێکی خاترانە ترازا بوو، نەک لەبەر خاتری وەچە و نەوەی خۆیشی کە دەزانین وەک «أبو

---

[82] ئەمەش یەکێکە لە ئەنجامی ئەو دیاردەیەی کە لە بەردەوامی بەرگی یەکەمی «حاجی قادری کۆیی» ناوم نا «نزیف اقتصادي».

العلاء المعري» ئەم بەیتەی، لە مەعنادا، کردبوە دروشمی سەر کێلە قەبرەکەی ڕۆژی مردنی:

هذا جناه ابي عل ي وما جنيت على احد

حاجی قورپێوانەکە و خۆپساندنەکە و جنێودانەکەی بۆ خاتری باب و باپیرانمانە و بۆ خاتری ئێمە و وەچە و نەوەی ئێمە بوو کە وا کەمتەرخەمی و بێدەماری و بێهەستی قەومایەتی لەوسا و لە دوارِۆژدا دەی کردین بە مەڕی بێشوان و بێستانی بێپەرژین و ئاوی بێجۆگەلە و پاوانی بێسنوور، دەخوراین و بڵاودەبوینەوە و دەبڕاینەوە.

موژدەش لەو کەسانە بێ کە دەرچوون لە تۆق و کۆتی قەومایەتی بە ڕەهابوون لە زنجیری دواکەوتن دادەنێن، موژدەی چارەڕەشیی خۆیان و ئەولادیان لێ بێت بەوەدا کە بڕیاری مێژووی کۆن و نوێ لەعنەتی بێدەسەڵاتی کردوە بە تەمغەی نۆکەرایەتیی میللەتی بێدەسەڵات، تەمغەکەش چوونەوە و سوانەوەی بۆ نیە لە ڕێی ئینکار کردنی نژاد و دەماری قەومایەتیەوە. ئەو گومرایانەی لە سەردەمی عەبدولکەریم قاسم نەشیدی «ئێمە کوردین نەتەوەی کوردین» یان دەگۆڕی بە «ئێمە گورگین نەتەوەی گورگین» وەیا دروشمی «مەعاریفی کوردستان» یان دەکردە «مەعاریفی قلیاسان» هەر ئەوەندەیان لەدەست هات گاڵتەیێک بە خۆیان بکەن لە ڕێی سووک کردنی کوردایەتییەوە چونکە هەرگیز گاڵتەبەخۆ کردنەکە بۆیان نەبوە پاکانە نە بۆ خۆیان نە بۆ کوردیش. ناوە شرە دڕەکەی «کورد» کە ئەوان لێی وەتەنگ دەهاتن لەو گاڵتەبەخۆ کردنەشدا لێی دیار دەدان و دەهاتەوە ناو حیسابیانەوە، خۆشیان بەسەر بچن لە ئەولادیان دیار دەداتەوە.

من لێرەدا نامەوێت لە کوردایەتی دەرچوون بە عەیبێکی سەلمێنراوی بێدەمەتەقە حیساب بکەم و بەمەشدا بیروباوەڕی خۆم لە ڕێگەیێکی ئاسانەوە نزیک خەمەوە بۆ بەر قەناعەتی خوێنەری کورد، خۆ ئەگەر ئەمەشم کردبا دیارترین مافی کورد و گەورەترین بەڵگەی پرسیارانم دەکردە پاڵپشتی خۆم و قسەکانم... نەخێر من ئەم تیغە بڕندەیە لەکالانی بەڵگان دەرناکێشم تاکوو قسە و دەمەتەقەی پێ ببڕمەوە وەک کە «نالی» لە زمانی خۆی ڕادیتوە و دەڵێ:

ڕاستی صەیقەلییە تیغی زمانی نالی
نەرم و توند ئاوی گەڕوگییرە قسەی پێ دەبڕێ[83]

من بە تیغە کولەکەی ئەنجامەکانی «لە کوردایەتیی دەرچوون» زمانی ئەو کەسە دەبڕمەوە کە لە قەومایەتی دەرچوە و بەتەمایە خۆپاراستن و زەرەر گێرانەوە بکاتە شەفاعەتکاری لێ دەرچوونەکە و پەندی «ئاگرەسورە لە خۆم دوورە» هەڵکات و بە سایەبان و لە ژێر سێبەریدا بحەسێتەوە. من بەو تەرزە کەسە دەڵیم: بەرگی نوێت لێ موبارەک نەبێ، ڕەنگ گۆڕینت چ چاوێکی لێ بەسەهوو نەبردوویت و لە چ قۆرتانی دەرنەهێناویت. تۆ هەر ئەو کوڕەیت کە پێستی کوردانەت لەبەر بوو، بە پێستداڕنین و لە قەپێلکدەرچوونت نەبووی بە شتێکی تر. ئەگەر لایەنێک هەبێ بە «کورد» ت قبووڵ نەکا بە «نیمچە کورد» یشت هەر قبووڵ ناکات. کە ئیمان نەبێ لە ڕێگەیێکی ڕاست و شەرافەتکارانەی برایەتی و بەیەکەوە ژیانی میللەتانەوە قبووڵت بکا بە خۆت و کوردایەتی و مرۆڤایەتیتەوە هەرگیز ناشێ دەستی برایەتیی لە ناو دەستە چڵکنەکەی ئینکاری نژادی خۆ کردنت بنێت و بە برات قبووڵ بکات. یەکێک ڕازی بێ برای خۆگۆڕیت بێ دەبوو پێشتر ڕازیتر بێ بە برایەتیی دڵسۆزی و شەرەفت. یەکێک بەشەرەفەوە ڕەفز بکرێت، لە بارێکی پێچەوانەدا بە نۆکەریش وەرناگیرێت... کەس فلسێکی پێنادات چونکە دیارە فلسێک ناهێنێت. ئەو کەسەی نژادی خۆی ئینکار دەکات بە چ چاوێکی سووکاییەتەوە سەیری خۆی دەکات خەلقی تر دەئەوەندە بە سووکی دەزانێت. مەلای گەورە لە هەڵبەستێکیدا دەڵێ:

کەسێ قەدری لەلای خزمان نەمێنێ
لەلای بێگانە قەدری چی دەمێنێ

---

[83] ئەم بەیتە بە زۆر جۆر نووسراوەتەوە، وا دەزانم ڕاست و دروستەکەی ئەوەیە لە بەیازێکی حەفتا ساڵەدا کە لە کتێبخانەی کۆڕدا وێنەی وەرگیراوە، نووسراوە، ئەمەش دەقەکەیەتی:

ڕاستیی جەوهەرییە تیغی زوبانی نالی
نەرم و توند ئاوی گەلوگییرە قصەی پێ دەپەڕێ

ئەو کەسە خۆی وەیا میللەتی کورد چ نرخێک دادەنێت بۆ یۆنانییێکی نژاد ئینکار کردوو، میللەتێکی تریش هەر ئەو نرخە بە کوردێکی ئەوتۆیی ڕەوا دەبینێت، هێندە هەیە ئەو بۆرە دەمارەی ڕەحم و سۆزی خزمایەتیی کە بزەیی کوردیک بۆ ئەو کوردە دەبزێوێ و ناچاری و بێدەسەڵاتیی بۆ دەکاتە عوزر و بەهانەی خۆگۆڕی، ئەو دەمارە لای بێگانە پەیدا نابێ و بە مەخلوقێکی خۆگۆڕی بێباری بێنرخی ڕاست و ڕەوانی دادەنێت چونکە دەماری خزمایەتی و خوێن و ئاشنایەتیی تێدا بەخەبەر نایەت تاکوو یەک دوو پلەی بەرەو ڕێکاری شەرافەت و ڕێزەوە هەڵستێنێتەوە.

وا دێتە بەر چاوی «تصور» مەوە، حاجی قادر هەموو ئەم لێکدانەوانەی بە دڵ و دەروونی خۆیدا تێپەڕاندبێ بەر لەوەی هاتبێتە سەر شکاندنەوە و ڕیسوا کردنی کوردی بێهەستی غیرەتی کوردایەتی، ئەم خەیاڵانەشی نەکردبێ شتی وەک ئەوانی بە بەرچاوی خۆیەوە گرتوە لەوانەی کە گوتونی.

خورتی و سەرکەشی و بە خۆنازین و بڕوا بە خۆکردنیش تێکڕایان ڕێی قسەی بێباک و «ئەوپەڕ» ی لە بەر زمان و خامەی حاجیدا تەخت کردوە چ لە مەیدانی شکاندنەوەی نیمچە کوردان بێ چ لەو مەیدانانەی تر بێ کە فکری خۆی پێدا تێپەڕاندوون.

من و تۆش لەم ڕۆژگارەی دەرکەوتن و چوونە پێشەوەی میللەتاندا هەتا قووڵ بینەوە لە کوردایەتیماندا، پتر لە پەندی حاجی بە تێگەیشتوو دەردەچین باشتریش ئامۆژگاریی ئەومان پێوە دیار دەبێت. ئەم هەلە یەکجار پەسەند و لەبارەی دانهێنانی حکومەتی شۆڕشی «بەعث» بە مافی نەتەوایەتیمان کە تێهەڵکشانێکی شۆڕشگێرانەیە لە «بەعث» و لە کوردیشەوە، هەر لە بەیانەکەی «لامەرکەزیی» ساڵی 1963 وە تا بەیاننامەکەی حوکمی زاتی 11 ی ئازاری 1970 دەرفەتێکە لە تەنگژەی ڕابردووەوە پێیدا دێینە ناو گۆڕەپانێکی فکر و تۆژینەوە و لێکۆڵینەوەی کوردایەتیی پوختەی بێ ترس و لەرزەوە کەوا ڕاستەوخۆ دەبێتە زادێکی مەعنەویی بێپایانی میللەتی کورد بە تایبەتی و میللەتی عێراقیش بە تێکڕایی چونکە شتێکی ئاشکرایە، تا بازوومان بەهێزتر و مێشکمان ڕۆشنتر بێ پتر بە کەڵکی خۆمان و عێراقیش دێین. ئەوەندەی چاویش بەم جیهانەدا دەگێڕم لە غەیری ئەم ڕۆشنەی مافی نەتەوایەتیمان کە مەشخەڵێکی بەیاننامەی ئازارە چ ڕووناکیەکی ترم نایەتە بەرچاو شوێن پێی هەنگاوەکانمان بۆ ئاشکراتر بکات.

لەبەر شەوقی ئەو هەڵکەوت و تێبینی و ڕاستییانەدایە ئەم نووسینە دەیەوێ، ئەگەر بۆی بلوێ، وەک «باکتیریا» بابەتەکەی پێوە خەریکبوونی شل کاتەوە و «تفاعل» ی لەگەڵدا بکات. سەرەتاتکە و تێوەڕامانی بەردەوامم لە دوشمنایەتیەکەی حاجی قادر و شێخ نەبیش هەمان نیازی تێگەڕان لە دەمار و ڕەگی ئەو ڕۆژگارەی کۆیێ و ئەو قۆناغەی ژیانی حاجی پێمی دەکات، وەک ئاو کە لە ڕەگ و دەمار و پەلک و لکی درەخت دەگەڕێت و خۆراکی بۆ دەبات لە گەڵیشیدا تێکەڵ دەبێت.

بەدوا ئەو وردبوونەوە و لەگەڵدا تێکەڵبوون و بەدەوردا گەڕانەی کردمان، زۆر بەداخەوە، دەست بەتاڵماینەوە لە هەرچی توانج و توهمە و ناو و ناتۆرەیێک هەیە کە شێخ نەبی لە حاجی گرتبێ چونکە هیچمان لەو بابەتەوە پێ نەگەیشتوە. سەیر ئەوەیە جارێکی تریش دەست بەتاڵ دەبینەوە لە هەوڵی دەلالەت وەرگرتن لەو هەڵبەستانەی کە حاجی قادر ڕاماڵی شێخ نەبی کردوە چونکە ئەوانیش قاڵبی لەسەرخۆ کردنەوەیان نیە تاکوو لەوەوە تێ بگەین حاجی چ جۆرە توهمەیێکی لە خۆی تەکاندۆتەوە.

دیتمان «إبن سینا» توهمەی کافربوونی خۆی بە درۆ خستۆتەوە، بەرەژورتریش هەڵکشاین ئایەتەکانی قورئانمان دیت ئەو کەسەی ڕیسوا دەکرد کە گوتبوی قورئان کاری سیحرە، لە شوێنی تردا توهمەی «شێتبوون» تاوانبار دەکات. صەد حەیف و مخابن، حاجی قادر لە هیچ شیعرێکیدا کە ڕوەو ڕووی شێخ نەبی دەبێ لەسەرخۆی ناکاتەوە و توانجان بەدرۆ ناخاتەوە، بە پێچەوانە هەموو قسەکانی حاجی توهمەی بێ پەردە و کینایەتن لەوانەی ئەوپەڕی ڕیسوا کردنیان گرتبێتەبەر.

من لێرەدا نامەوێ هانا ببەمە بەر ئەو هەڵبەستانەی کە بەتێکڕایی شەعبەدە تاوانبار دەکات و لەناو ئەواندا دەلالەتی تایبەتی بدۆزمەوە کە مەبەس شەخسی شێخ نەبی بێت، هەرچەند دەزانم لە نێوان ئەو هەڵبەستانەدا تاکەبەیتی وەها هەیە دروشمی نیازی تایبەتی و شەخسی تەنهای تێدا دەدیترێ بەڵام بەڕاستی ئەو تەرزە لێکدانەوە یەکجار وردە دەبێ لە شێوەیێکی سەربەخۆدا بکرێت نەک لە زیمنی لێکۆڵینەوەی گشتیدا، دووریش نابینم هەر خۆم لە بەرەودوای سەرلەبەری ئەم نووسینەدا لێکۆڵینەوەیێکی تایبەتی و سەربەخۆی ئەم لایەنە بکەم و هێماییێکی توهمەکانی شێخ نەبی دژی حاجی لە پشت پەردە و بن سێبەری هەندێک لەو هەڵبەستانەدا

بدۆزمەوە و، تا ڕادەیێک شکڵ و شێوەییێکی تەپ و تۆزی ڕەخنان بە دەوری حاجی قادرەوە لەو ڕۆژگارەدا بێنمە ناو تابلۆی بەسەرهاتی حاجی.

لەم بارەی ئێستاکەمدا قسەم لەگەڵ ئەو هەڵبەستانەیە کە ڕاستەوخۆ لە شێخ نەبی گیراون کە هەر ئەوانیش بوون پێوانەی مەودای قۆناغی ناوەندیی ژیانی حاجیمان پێ کرد.

لەسەرخۆ نەکردنەوەی حاجی لەو هەڵبەستانەدا خەیاڵی سرنجگر بۆ ئەوە دەبا کەوا حاجی خۆی و شێخ نەبی لە بارێکی وەها ئاشکرا و مەفهومدا دیتوە چ پێویستی بەوە نەبوە بایەخێک بە قسەکانی شێخ نەبی بدا و ئەرکی بە درۆخستنەوەی توهمەکانی هەڵبگرێ، وەک بڵێی بەلای حاجییەوە ئەو توهمانە لەخۆیانەوە بەدرۆ خراونەوە. تۆ سرنجێک بدە ئەم بەیتە:

شێخ دەڵێ باری ڕیا شانم جدەو ناکا ئەگەر
کێوی کارۆخ بێ گوتم صەد «بارک الله» کەرنەبی

سەیری چەند بێپەروا، بە وشەی صریح و تەورییە، کەرایەتیی شێخ ڕادەگەیەنێ و یەک ئینجی لەم مەقامە هەڵ نائەنگێوێ. لە هێزی شیعرەکە و باوەڕ کردنی حاجی بە خۆیەوە وا دەردەکەوێت کە وەپاڵدانی «کەرایەتی بۆ شێخ» وەک وەپاڵ دانی «کەرایەتیی بۆ کەر» بێ بەلای حاجی قادرەوە، تەنانەت کە هاتوە لە نێوان شاخەکاندا شاخەکەی «کارۆخ» ی کردوە بە هاوسەنگی «باری ڕیا» ی شێخ نەبی، لەبەر ئەوە بوە کە ناوی شاخەکە بە بێژەی «کا» دەست پێ دەکات و کاش خواردنی کەرە، ئەگەر ئەمەی مەبەست نەبووایە ناوی شاخی مەشوورتری دەهێنا کە کێشی بەیتەکەشی پێ لەنگ نەبێ وەک «بێستون، ئەلوەند، قەندیل، هەڵگورد...» و چەندین کێوی تریش. دیسانەوە لە وشەی «بارک الله» دا بە نەختێک زار پەل کردنەوە «بارەکا...ڵڵا» پەیدا دەبێت کە ئەویش «بارەکا» ی تێدایە دەشزانین لە بەیتەکەدا گورج «کەرنەبی» بەدوادا دێت.

پوختەی گوتە لە دەلالەتی هەڵبەستەکانی حاجی دژی شێخ نەبی و پەیدا نەبوونی هیچ توهمە و لچک و لێو بادانێکی شێخ نەبی دژی حاجی لەبەردەستماندا ئەوەیە کەوا بەداخەوە سەرچاوەیێکی موحتەمەلی لێکۆڵینەوە و واتا لێ وەرگرتن بۆ ئاشکرا

کردنی باری ماددی گیانی نەفسی و کۆمەڵاتیی حاجی وشکێن و برینگێنە کە هیچ دڵۆپە ئاوێکی تێدا نەبێ. سەرچاوەکەش شتێکی لاوەکی و کەمبایەخ نیە کە پەرۆشی وشکبوونی هەڵنەگرین، چونکە وەک گوتم قۆناغێکی ناوەندیی سەرلەبەری ژیانی حاجی لەگەڵ ئەو سەرچاوەیەدا ناوی دێت و تێکەڵ بەیەکترن، دواتریش لە هەندێک شیعرەکانی حاجی دەنگ دەداتەوە نەک هەر ئەوەندە و بەس:

دەتوانم دان بەوەدا بنێم کە دوشمنایەتی حاجی لەگەڵ شەعبەدەی شێخی عەوام خەڵەتێن بە هۆی ئەم ناکۆکییە سەختە کاریگەرەی نێوان حاجی و شێخ نەبی هێندە بەهێز و بنج داکوتاو بوە لە دڵ و دەروونی حاجیدا، تەجرەبەی شەخسی حاجی لە لایێکەوە، کارە ناڕەواکانی شێخی ماویلی لە لایێکی ترەوە بوون بەو «ئەستێ و قاوت»ـەی کە بڵێسەی دوشمنایەتی و نەیاریی لە هەست و نەستی حاجیدا هەڵایساند بەرانبەر بە شێخایەتیی درۆزن. قووڵایی ئەو دوشمنایەتییە، وێڕای مەشرەبی حاجی دژی تەڵەکەبازی، هۆی بەردەوامبوونی هەڵوەستی بێ هودنە و هێوربوونەوەی حاجی بوو لە ئاست فێڵ و فڕی شێخ و صۆفی درۆزندا. بە وردی و قووڵی سەیرێکی دیوانەکەی بکەیت ئەم ڕاستییەت بۆ دیار دەکەوێ، تەنانەت لەم مەیدانەی بەرهەڵستی کردنی شێخایەتیی درۆزندا، حاجی قادر ڕۆژ بە ڕۆژ پتر مەودای دەبڕی و لەسەر کارەکەی خۆی سوورتر دەبوو تاکوو دەبینین لە ئەنجامدا، ئابڕوو بردن و ڕیسوا کردنی بەکارهێنانی دین بۆ مەبەستی دونیا لە لایەن شێخ و سەیدی دونیاپەرستەوە دەبێتە یەکێک لەو ناوەڕۆکانەی کە تابلۆی کوردایەتیی حاجی قادر پڕ دەکەنەوە، واتە دژایەتی تەڵەکەبازیی شێخ و سەیدیماڵپەرست دەبێتە پێکهێنەرێکی بنجیی لە گیانی کوردایەتیی لای حاجی.

ئەم ڕاستییە دیاردەیێکی گەورەیە لە بەشێکی گرنگی دیوانەکەی حاجی قادردا. ئەم قەصیدەیەش باشترین نموونەیێکە لەم زەمینەیەدا بە شایەدی بگرین:

حاکم و میرەکانی کوردستان
هەر لە بۆتانەوە هەتا بابان

یەک بە یەک حافیظی شەریعەت بوون
سەیید و شێخی قەوم و میللەت بوون

سەیید و شێخەکان لە ترسی ئەوان
مونزەوی بوون و ذاکری ڕەحمان

ئەو کە فۆتان ڕیای ئەمان دەرکەوت
سەیری چۆن بوونە پووش و ئاگر و نەوت

یەکی لەم لاوە ڕوو دەکاتە عەجەم
دووشی لەولاوە بوونە دوشمنی هەم

دوو هەزار ژن فەساد کرا لەم لا
بوونە قاتیل ئەوانی تر لەولا

یەک بە یەک بوونە نائیبی هەمەوەند
صاحیبی مارتین و ماری گەزەند

میللەتیش هێند کەرن وەکو جاران
دەستیان ماچ دەکەن دەڵێن قوربان

گەر لە سەحرا مەلا[84] نەمردایە
گورگە شین با کەری بخواردایە

شێری نەڕ وەک لە ناو بێشە نەما
گورگ و مام ڕێوی دێنە ڕەقص و سەما

---

[84] مەبەستی لە نەمانی حاکم و میرەکانی کوردستانە.

تاڵایی شیعرەکان لە قووڵایی نەفسێکی تاڵاو چێشتووەوە هەڵ دەقوڵێ. هەرچەند حاجی لەم قسانەیدا دەیەوێ ڕاستییێکی کە خۆی باوەڕی پێی هەیە بکا بە پێوانەی هۆی تەڵەکەبازی و لەحەد دەرچووی شێخ و سەیدە دونیاپەرستەکان، هۆیەکەش نەمانی حاکم و میرەکانی کوردە کە جاران نەیان دەهێشت لە پەنا دینەوە دونیا بپەرسترێ، لەگەڵ ئەمەشدا زۆر ئاشکرایە یەکەمین مەبەستی حاجی ڕیسوا کردن و حەیا بردنی شێخ و سەیدی دونیاپەرستە، بەدوا ئەوەدا هەڵدانەوە و بەرز کردنەوەی پایەی حاکم و میرەکانی کوردە.

من لێرەدا ماوەم نیە بگەڕێمەوە سەر ئەو حاکم و میرانەی بەر مەدحەکە دەکەون و ئەو شێخ و سەیدانەی بەر ڕیسوا کردنەکە دەکەون، سەرەڕای نەبوونی ماوە، لێرەدا مەبەستیشمان نیە ئەو لایەنانە ساغ کەینەوە چونکە ئێمە خەریکی شتێکی ترین. ئێمە دەمانەوێ بزانین تەجرەبەی زاتیی چ تاو و تەئسیرێکی تایبەتی هەبوە لە دڵ و ویژدانی حاجیدا.

بەڕاستی دیاردەی کار تێکردنی مرۆڤ لە ڕێی تەجرەبەی خودی خۆیەوە شتێکی زۆر ئاساییە. هەموو مرۆڤێک لە هەر مەیدانێک بێ، هەست و هۆش و دڵ و دەروونی بۆ تەجرەبەی خۆی بەرتاوتر و کارتێکراوتر دەبێ. بوێژ و هونەرکاریش، بگرە قوطب و ئەولیاش، لەوەدا وەک خەلقی تر ملکەچن بۆ حوکمی دەستوورەکە، بەڵام کە قسەمان لەگەڵ بوێژ و هونەرکار بێ حیسابی ئەوان لە دوو ڕەوەوە لە حیسابی خەڵقی تر جودا دەبێتەوە.

1) لە ڕووی ئەوەوە کە بوێژ و هونەرکار، ئەوەی ڕاستی بێ هەموو مرۆڤێکی خاوەن فکر، هەستیارترن و پتر سرنج ڕادەگرن، بەو پێیەش تین و تاوی تەجرەبەی شەخسی لای ئەوان لێی چاوەڕوان دەکرێ کاریگەرتر و بەردەوامتر بێ لەچاو هی خەڵقی تر کەوا ڕەنگە نەتوانن لە دەلالەتی شتان قووڵ ببنەوە چ جایی تەئسیری ئەو شتانە بەردەوام لە هۆش و دڵیاندا بژیت. ئەم لایەنە دەبێتە شەفاعەتکار بۆ کارتێکردنی نەفس و هۆشی مرۆڤی هەستیار و هۆشیار.

2) بوێژ و هونەرکار، لێرەشدا دەبێ بڵێین هەموو خاوەن فکرێک، بە هۆی ئەوەوە وتووێژیان، کە شیعر و نووسین و هونەرە، لەگەڵ هەموو خەڵقە و لەوانەیە کار بکاتە سەر قەناعەت و بیروڕای غەیری خۆیانەوە، لێیان داوا دەکرێ

زاڵ بن بەسەر تەئسیری لایەنی ناپەسەندی تەجرەبەیاندا نەوەک لە ڕێی خۆ خۆشویستنەوە نرخ و بایەخی زیاد بۆ ئەو تەجرەبەیەیان دانێن و خەڵقی تر بەسەهوو ببەن وەک ئەوەی یەکێک لەبەر سەبەبێکی شەخسیی ڕقی لە ئافرەت دەبێتەوە ئیتر زەهری هەناوی خۆی دەڕژێنێتە ناو هەڵبەست وەیا نووسین وەیا هونەرەکەیەوە دژی هەرچی مێینەیە. ئەوەی بەزۆریی لە حاڵی وەهادا دێتە بەرچاوەوە ئەوەیە کە کابرای ڕق هەڵگرتوو، لە هێرشەکانیدا دڵگەرمتر و بەهێز و پێزترە نەک لە مەدح کردن وەیا لەسەرکردنەوەی ئەو شتەی خۆشی دەوێ. ڕەنگە ئەم تێبینییە بشێ ببێتە میقیاسی دۆزینەوەی بوون و نەبوونی نەخۆشی نەفسی لای کابرای ڕق هەڵگرتوو چونکە ڕێی تێ دەچێ دژایەتی کە لە ڕادەبەدەر بوو نیشانەی شێوانی نەفس بێت.

بایەخدانی زیاتر بە تەجرەبەی زاتی خلیسکێکی پڕمەترسییە لەبەر هەنگاوی تێکڕای ئادەمیزاددا. ئەگەر کەسێک ئاگاداری خۆی نەبێ و فەرق بەو زێدە تەئسیرەی تەجرەبەی زاتی نەکات لەوانەیە یەکجار بە ڕاشکاوی لە پشت دووربینی تەجرەبەی تایبەتی خۆیەوە سەیری هەموو جیهان بکات ئیتر، بەپێی حەزی دڵی خۆی، هەموو شتێک بنرخێنێت یا بە چاک یا بە خراپ. تۆ سەیری مرۆڤی سادەی نەزان و نەخوێندەوار بکە چەند مەجزووبانە خەنجەر وەشێنیی بۆ بیروباوەڕی خۆی دەکات با ئەو بیروباوەڕە مەیموونپەرستیش بێت. بەشێکی یەکجار زۆر لە ناکۆکی و دوشمنایەتیی نێوان خەڵق بە تێکڕایی لەوەوە دێت کەوا هەر کەسە و هەر تاقمە خۆی و دوشمنەکەشی بە تەرازووی قەناعەتەکەی خۆی هەڵدەکێشێ زۆریش لە ئەنجامی هەڵکێشانەکە ڕازییە و بەڕاستی دەزانێ، کەچی لەوانەیە هەر نیوەی باوەڕەکەی خۆی ڕاست بێ و هەر نیوەی هی دوشمنەکەشی ناهەق بێ. دەڵێن ئافرەتێک پرسی ئاخۆ فلانە ئافرەت چۆنم باس دەکات، پێیان گوت تۆ چی بەو دەڵێی ئەویش وەها بە تۆ دەڵێتەوە. لە ناخی دڵیەوە و بە هەموو خۆ لەسەر هەق زانینەوە گوتی دەک ڕووی پێوە نەبێ ئەو بێ حەیا و شەرمە....

من لەم هەست بەخۆ کردنەدا، هەوڵم داوە لەجیاتی ناحەز سەیری خۆم بکەم و عوزرێکی هەیبێ بۆی تێبخوێنمەوە. هەرچەند دەزانم ئەگەر ناحەزەکەم دۆستم با هەموو خراپەکانمی بە چاکە لە قەڵەم دەدا، وەک کە لە ناحەزیدا هەموو چاکەکانم بە خراپە لە قەڵەم دەدات، لەگەڵ ئەمەشدا دەمەوێ بزانم چەندی هەڵوەستەکەی

لە بارەی سادەوەیە و چەندیشی خۆبەسەهوو بردنە بۆ مەبەسی زاتی و سوودی شەخسی...

پیاوی یەکجار بەناوبانگی مێژوو، لەوانەی جیهانیان هەژاندوە و پێشەوای بزووتنەوەی جیهانی بوون، بگرە دەشپەرسترێن، شتی وەهایان لە غەیری خۆیان بە عەیب گرتوە کە لەچاو کرداری خۆیان، بە گوتەی بازاڕی، سەلاتەش نەبوە.

ئەم باسەی ڕەفتاری مرۆڤ بەپێی تەجرەبەی شەخسی و بیروڕای تایبەتی خۆی باسێکی یەکجار بەرفرەوانە، لە سەرانسەری مێژووش دیاردەیێکی کاریگەرە، ئەوەی ڕاستی بێ تا بڵێی ڕووخێنەریشە، لە مەتەڵ و پەندی کۆنینەش دەنگی داوەتەوە بێ ئەوە پەند و مەتەڵەکە توانیبێتی بچێتە بنج و بناوانی مەسەلەکەوە، ڕەنگە دانەری مەتەڵەکەش دووچاری هەمان خەسڵەت بووبێت کە مەتەڵەکە بەعەیبی داناوە وەک ئەوەی دەڵێ «پوشکە بە چاوی خەڵقەوە دەبینێ و کۆڵەوژ لە چاوی خۆیدا نابینێ».

ئەم نەختە درێژە پێدانە بەم باسەوە بۆ ئەوە بوو بە چاوێکی کراوەوە لەبەر تیشکی باسەکەدا سەیری هەڵوەستێکی مەعلوومی حاجی قادر بکەین و بە تەرازوویێکی هەق و ڕاستی شارەزایی و ئینساف هەڵی سەنگێنین و نرخی ڕاستەقینەی پێ بدەین. دەمانەوێ بزانین: ئایا حاجی قادر بایەخی زیادی داوە بەو ناکۆکیەی نێوانی خۆی و شێخ نەبی تا ئەو ڕادەیەی کاری کردبێتە سەر حوکم و قەناعەتی حاجی بەرانبەر سەرلەبەری شێخایەتی و تەریقەتی نێوان کوردان دوای ئەو هەرا و ناکۆکییە، هەر لەو کەلەبەرەیشەوە تەلەکەبازیی شێخی دونیادۆست لەبەر چاوی حاجیدا سەری نابێ بە تێچوونی حاکم و میرەکانی کورد وەک لە هەڵبەستەکەدا خوێندومانەوە. تۆ بڵێی ئێش و ئازاری شەخسیی خۆی لەو دوشمنایەتیەدا وای کردبێ پتر لە پێویست پێوەی خەریک بێت و لەو دوشمنایەتییێکی شەخسیەوە ڕایگوێزێ بۆ ناو مەیدانە بایەخدارەکانی کوردایەتی و کۆمەڵایەتی و چارەنووس. ئەم مەسەلەیە یەکێکە لەوانەی لێکۆڵینەوەی بەهێز و پێز نابێ لێی هەڵبێت، نیگای وردبینیش نابێ بەسەریدا بکشێت: حاجی قادرە و یەخەگیری شێخ نەبی فێڵباز و بەتەماع بوە و گەیشتۆتە سەر لێوی کوژران و تێداچوون، دواتریش کە دەگاتە پلەی کوردایەتی، فێڵبازیی شێخ و سەیدی دونیادۆست دەبەستێتەوە بە نەمانی حاکم و میرەکانی کوردستان. ئایا ئەم دوو هەڵوەستە کە یەکەمیان بەندە بە تاکەوە ئەوی تریشیان

تێکەڵە لەگەڵ کۆمەڵایەتی و گیانی کوردپەروەرییەوە چ پێوەندییان بە یەکترەوە هەیە؟ ئاخۆ ئەگەر حاجی دووچاری دوشمنایەتیەکەی شێخ نەبی نەبوایە هەر هەمان حاجی دەبوو کە لە قەسیدەکەی «حاکم و میرەکانی کوردستان» دا دێتە بەر چاومان؟

وەرامدانەوەی ئەم پرسیارە بە جۆرێکی قەناعەت بەخش کە پرسیارەکە یەکلا بکاتەوە وەها ئاسان نیە کە بەڕواڵەت دێتە بەر هەست و چاوی مرۆڤی بەپەلەوە. با ئەو جورئەتەش بکەم و بڵێم تا ئێستا ئەم باسە نە بەتێکڕایی و نە لە باسی حاجی قادردا، کەس بۆی نەچووە، ئەگەر کەسیش لێی دوا بێ من ئاگاداری نیم. بەهۆی بێ سابیقەیی و بێ سەرچاوەیی مەوزوعەکەوە، کە ویستت شتێکی لێ تێبگەی هەر دەبێ خەریکی تێوەڕامان و لێکدانەوەو لێکۆڵینەوە و بە یەکدی گرتن و تێکبەستنی شتانەوە بیت چونکە، وەک بزانم، لە چ سەرچاوەیێکی نووسراودا چەنگت ناکەوێ تاکوو بیخوێنیتەوە و بە ئەرکێکی کەم لێی ببیتەوە. نووسەرانی فەلسەفەی ماددی ڕێی تێخوێندنەوەی «عامیلی زاتی» یان لە خۆیان بەستوە بۆیێ هیچ کامێک لەوان بایی فلسێک بایەخ بە تەجرەبەی شەخسیی لە ڕووداوی مێژوویی نادەن، ئەگەر ناوناوەیێک باسی مەوقیفی شەخسی بەسەر قەڵەمی یەکێک لە نووسەرانەشدا هاتبێت زۆر بە سەرکێڵی و وەک شتێکی لاوەکیی بێنرخ و هەر بە نیازی پووچاندنەوەی تەئسیری ئەو مەوقیفە لە ئاست حوکمی ماددەدا باس کراوە، هەرگیز وەک عامیلێکی هەمیشەیی و کاریگەر لە ژیانی تاک و گەل و بزووتنەوەی مێژوودا نە دانی پێداهێنراوە و نە جێگەشی بۆ بەجێ هێشتراوەتەوە. ئەو هۆیانەی بە بزوێنەری مێژوو و وروژێنەری تاک دانراون لە نووسینەکانی نووسەرانی ماددیدا هەموو مەیدان و ڕێگەیێکیان لەو عامیلە هەمیشەییە کاریگەرە داخستوە، بەڵکوو تا ڕادەیێک تێخوێندنەوەشیان تاوانبار کردوە وەک بڵێی بەلای وانەوە نرخ دان بە مەوقیفی شەخسی دەبێتە کەم کردنەوە لە نرخی واقیع. ئەوان ڕێی دووریان لە خۆیان نێزیک و کورت کردۆتەوە و گرێوگاڵی تەفسیری ڕاستەقینەیان ئاسان کردوە لە ڕێی تەنکاو کردنی قووڵایی مێژوو و کۆمەڵایەتی و ئابووری و ڕامیاریی کە دێن تاکە عامیلی ماددی بەگەڕ دێنن و چەرخفەلەکی بوون و گۆڕان و بەسەرچوونی پێ دەخولێننەوە دەشزانین زۆر جاران تەفسیری ماددی و بەرژەوەندی ڕووت بایی ڕوون کردنەوەی نیوەچڵیش ناکات. ئەم بێبایەخ کردنەی مەوقیف و تەجرەبەی

شەخسی ڕاستەوخۆ سەر دەگەیەنێ بە پووچاندنەوەی دەوری تایبەتی و سەربەخۆی «تاک» لە مێژوودا، هەر لەو ڕێبازەشەوەیە زۆر بە سادەیی گوتراوە و دەگوترێ ئەگەر ئەو تاکەش نەبوویایە یەکێکی تری وەک ئەو وەیا لەو چاکتر ڕۆڵی ئەوی دەدیت. ئەم گوتەیە گەلێک خوێندەواری عادەتی، ئەوەی ڕاستی بێ هی هۆشیار و پەنجەنیشانیشی بە سەهوو بردوە و خۆی بەسەر زمان و قەڵەمیاندا هێناوە و دەهێنێت و بەلایانەوە لە ڕادەی بەدیهیەدایە، خۆ ئەوەی دژی ئەمەش شتێکی گوتبێت بەخۆی و گوتەکەیەوە لە لیستەی مرۆڤدۆستی دەرهاوێژراوە. بە پێی باوەڕی من، کە هەرگیز نرخی حەقیقی مادده و بەرژەوەند و گوزەران و هەموو پێوەندیەکانی پێداویستی کۆمەڵایەتی و ئابووریی... و هتاد لە بیر ناکەم، ئەم گوتەیەی «ئەگەر فڵانە تاک نەبوویایە یەکێکی تر دەبوو جێگەی بگرێتەوە و دەوری ئەو ببینێت» دوو ڕاستی ئەوتۆی لە بیر خۆی بردۆتەوە کە هەریەکەیان چەند جاران لە گوتەکە گەورەتر:

ڕاستیی یەکەم ئەوەیە تاکی وەها هەیە لە ئیمکاندا نیە کەس جێی بگرێتەوە، واتە ئەگەر ئەو نەبا هەموو ئەو شتانەش نەدەبوون کە لە ڕۆژگاری ئەودا لەوەوە پەیدا بوون، وەک ئەسکەندەری مەکدۆنی و پێغەمبەر. هەر لەم بابەتە، مرۆڤی تریش هەیە هەرچەند کردەوەی بۆ مومکین نەبوە، بەڵام لە لایەنی فکرەوە تاکێکی ئەوتۆ بوە لە هەموو ڕۆژگارەکەیدا هاوتای نەبوە. حاجی قادر لە مەیدانی فکرەی قەومایەتی کوردەوارییدا یەکێکە لەو تاکانە. ئەحمەدی خانی لەویش بێمانەندترە بەپێی کۆنیەتی ڕۆژگارەکەی. ئەمانە تاکی هەند بێمانەند بوون و ماوەیێکی ئەوتۆ پێش میللەت و کاتەکەی خۆیان کەوتبوونەوە، کەس نەبوو دەنگیان بداتەوە.

ڕاستیی دوەم، کە گرنگتریشە لە هی یەکەم بۆ وەرامدانەوەی گوتەکە، ئەوەیە ئەگەر بشسەلمێنین یەکێکی تر دەبوو جێگەی ئەو تاکە بگرێتەوە، بەو سەلماندنە بایی تۆسقاڵێکمان لە سەنگی تاکەکە دانەشکاندوە بە پێچەوانە لێمان زیاد کردوە چونکە جێگرەکەش هەر تاکێکی وەک خۆی دەبوو، خۆ هەزاران کەس نەدەهاتن جێی ئەو تاکە بگرنەوە. با وەها دانێین ئەگەر «لینین» نەبا ستالینێک وەیا کالینینێک دەبوو جێگەکەی «لینین» بگرێتەوە، کە ئەمە قسەیێکە هی سەلماندن نیە بەڵام بۆ مەبەستی کورت کردنەوەی موناقەشە دەیسەلمێنین ئەوساش ستالین و کالینین هەر ئەو «تاکە» بێمانەندە دەبوون چونکە دیارە وەک لە قسەی خۆمان

دەردەکەوێ «تاک» دەبوون نەک صەد هەزار. پەیدابوونی جێگری «تاک» لەو مەیدانانە بەڕاست دەگەڕێ و دەوری تاکەکە بێبایەخ دەکات کە هەزاران جێگری تێدا دەست دەکەوێت وەک ئەوەی ئەگەر فەلاحێک وەیا بەقاڵێک وەیا قوتابییێک لەناو هەزارانی وەک خۆیدا بزر بوو وەیا گورگ خواردی پەکی هیچی لەسەر ناکەوێت و هەزارانی تر هەن جێگەی بگرنەوە. ئەو تاکانە جێگایان بە تاکی تری وەک خۆیان پڕ دەبێتەوە کە زۆری تری وەک خۆیان حازربەدەست لە نێوان میللەتدا کەڵەکەیان کردوە. زوربەی ئەو تاکە عادەتییانەش لە بەر سوودی شەخسی، خواخوایانە ببنە جێگری یەکێکی تر و چ پێی ناوێ من و تۆ بەهۆی لێکدانەوەی فەلسەفییەوە بیان کەینە جێگری غەیری خۆیان وەیا لە غەیبەوە جێگریان بۆ بخوازینەوە وەیا بۆیان خەڵق کەین، تەنانەت لەو مەیدانەش، لە نێوان هەزاران کەسی هاومەسلەکەدا، ئەگەر یەکێکیان بەهرەی بلێمەتانەی هەبوو لە کارەکەیدا ڕەنگە جێگری بە دەست نەکەوێ. ئەمە بەدیهیەیێکە ئەگەر نەزەریەکان لێمان گەڕێن هی دەمەتەقە و نەسەلماندن نیە.

ئەو تاقمانەی هەزاران تاکیان هەیە هەر تاکەی هەزاران جێگری هەیە، بەڵام سەرلەبەری تاقمەکە جێگری پەیدا نابێ: کە هەموو فەلاحت بە لاوە نا ژیان دەبڕێتەوە، کە هەموو دارتاشت بە لاوە نا جووڵەی بەرەوپێش چوون ڕادەوەستێ... هەروەهاش تاقمەکانی تر پێ بەپێی گرنگیی دەوریان لە ژیاندا.

تاکی ئەوتۆش هەیە دەورەکەی هێند بێنرخە دەتوانێ ئالەتێکی بخرێتە جێگەیەوە. من لە لێکدانەوەکەمدا پێڕەویی واقیع دەکەم، لەبەر خاتری موجامەلە واز لە واقیع ناهێنم، بەدرۆشی ناخەمەوە.

وا لەبەر چاومانە، حاجی قادر بایەخێکی زۆری داوە بە دژایەتی و بەرهەڵستی کردنی شەعبەدە تا ڕادەیێک پەرەسەندنی شەعبەدەی لە کوردستاندا بەستۆتەوە بە نەمانی میر و حاکمی کورد. دەشزانین لە ڕابردویدا دوشمنایەتیەکی خەست و بێمەسڵەتیی هەبوە لە نێوان ئەو و یەکێک لە قارەمانەکانی شەعبەدە تا ئەو سنوورەی سەری گەیاندە هەوڵی کوشتنی حاجی، کۆتاییەکەشی بە ئاوارەبوونی حاجی هات. کە ئەمە ڕاست بێ، لە ڕاستیش بەهێزترە چونکە بەرچاو و بەدیهیەیە، دەبێ پرسێک لە خۆمان بکەین: ئایا ئەو دوشمنایەتیە شەخسییە چ دەخلێکی بوە، یاخود نەبوە، بەسەر

پەیدابوونی قەناعەتێکی ڕەگداکوتاوی، بەرفرەوانی بەردەوامی بێوچان دژی شەعبەدە بە تێکڕایی لای حاجی قادر؟

من گەلێک لەم پرسیارە وردبوومەتەوە و پێوەی خەریک بووم، هەر وەک بە گەلێک پرسیاری وەک ئەمە لە بەسەرهاتی حاجی و ڕووداوی مێژووەوە خەریک بووم، وا بوە لە ئاست هەندێک لەو پرسیارانە گەیشتوومە قەناعەتێک کە خۆم پێی ڕازیی بم، بەڵام ئەوەی ڕاستی بێ لە ئاست ئەم پرسیارە تایبەتیەدا ئێستاش دوودڵم. لەگەڵ ئەمەشدا دەبێ بڵێم دوودڵیەکەم بەرانبەر بوونی تەئسیری تەجرەبەکە نیە چونکە گومان لە بوونی ناکرێ، دوودڵیەکەم بەرانبەر میقداری تەئسیرەکەیە: ئایا تەجرەبەی حاجی لەگەڵ شێخ نەبی هەر ئەوەندەی کرد کە هێزێکی تازەی، وەک سەربار، دایە پاڵ مەیل و مەشرەبی حاجی دژی شەعبەدە، یاخود ئەم تەجرەبەیە بوو وای کرد کە لە بەرچاوی حاجیدا «تطور» ی شەعبەدەی سەید و شێخەکانی کوردستان ببەسترێتەوە بە ڕووداوێکی مێژوویی زۆر گرنگی ژیانی سیاسی کوردەواری کە ئەویش نەمانی حوکمی حوکمدارانی کوردە «هەر لە بۆتانەوە هەتا بابان» بە تەعبیری حاجی خۆی. لێرەدا وەک سێبەری ئەم پرسیارە، شتێک دەهێنمەوە بیری خوێنەر کە لە بەرگی دوەمی ئەم نووسینەدا ئیشارەی بۆ کراوە. کاتێک کە باسی ئەو سێ بەیتە فۆلکلۆرییەم کرد کە دەدرێتە پاڵ «مەلای ئیبنو ئادەم» و شکاتی کتێبخانە سووتاندنی لەلایەن تورکەکانەوە تێدایە، گوتم پێشووتر نەدیتراوە براگەورە بێحورمەتی لەگەڵ کتێبدا بکەن. ئەم حورمەت گرتنەی کتێبان لەلایەن میر و براگەورەی کوردەوە ڕوون کردنەوەیێکی تێدایە، تاڕادەیێک، بۆ ئەوەی لەگەڵ حاجیدا حیسابێک بۆ حورمەتی کتێبان لای میرەکانی کورد بکەین و وەک دیاردەیێکی دینداریی ڕاست و دروستی ئەوان تێی بخوێنینەوە و لە زیمندا دیاردەکە بگێڕینەوە بۆ سەر حیسابی دژایەتی ئەو حاکم و میرانە لەگەڵ شەعبەدەدا. هەر چۆنێک بێ من لێرەدا بەدوای ئەم تێبینییە کورتیلەیە ناکەوم، پرسیارەکە هەڵدەگرم بۆ جێگەیەکی لەبارتر کە لەوێدا پرسیاری تریش وەک ئەمە داوای وەرامدانەوە دەکەن.

**سرنجێکی ورد**

هەوڵی سنووردانان بۆ قۆناغی ناوەندیی تەمەنی حاجی، ڕووبەڕووی تایبەتیی دژایەتی نێوان حاجی و شێخ نەبی کردین کە شەقڵێکی هەرە دیاری ئەو قۆناغەیە. هەر وەک تایبەتیی ئەو دژایەتییە پرسیاری گرنگی هەڵستاند کە هەندێکیان بێ وەرام مانەوە هەندێکیشیان بە نیوەچڵی وەیا تەقریبی وەرام درانەوە، هەروەهاش گەشتە دوور و درێژەکەی خوێندنی، لە پاش بەسەرچوونی باسەکەی و ماوەکەی و چەند و چۆنیەکەی، سەرلەنوێ دەبێتەوە بابەتی پرسیارێکی یەکجار گرنگ کە پێویستە وەرام بدرێتەوە و نرخ و بایەخی پرسیار و وەرامەکەش دیار بخرێ.

ئێمە لە لێکۆڵینەوەکانی دوو بەشی یەکەم و دوەمی ئەم نووسینەدا گەلێک سەروبەری ئەم گەشتەمان باس کردوە، ناوناوە نرخەکەشمان نیشان داوە لە پێکهێنانی دەروون و ویژدان و شەخسیەتی حاجی قادر تا ئەو ڕادەیەی کە دەمان دیت لە چەندین موناسەبەدا ئەم گەشتە و ڕووداوەکانی دەهاتنەوە ناو هەڵبەست و یاد کردنەوەی حاجی، با لەوە هەر گەڕێین کە مەلایەتی و خوێندەواریی حاجی لەم گەشتەدا گەشەی کردوە و بە پایان گەیشتوە، واتە گەشتەکە خۆی زەرفی خوێندەواری و ڕۆشنبیریی حاجی قادرە لەو ڕووەوە کە هەموو خوێندنی حاجی بەر لەو گەشتە پلەی سەرەتایی بوە و ڕسکان و پێگەیشتنی بەرهەمی گەشتەکەیە. ئەمە لە لایێکەوە لە لایێکی ترەوە شاعیریەتەکەشی لەگەڵ هەڵکشانی خوێندنەکەی توانیوەتی تێهەڵکشێ و بەرەو تەواویی بڕوات. ئەمانە و گەلێک تێبینیی تر هاتنە ناو نووسینەکەوە کە هەموویان بایەخی ئەم گەشتە لە ژیانی حاجیدا ئاشکرا دەکەن. ئێستا کاتی ئەم پرسیارە هاتووە لە خۆمانی بکەین: ئایا ئەم گەشت و گەڕانە بەردەوامە خۆی لە خۆیدا بێ تێخوێندنەوەی ڕۆشنبیری و سوود وەرگرتن لە بیروباوەڕەکانی «ئیبنو ئادەم» و دیتنی بەسەر بردنی هەمەچەشنە... و... شتی ئەوتۆیی، هیچ کارێکی تایبەتی کردۆتە سەر ویژدان و دەروونی حاجی قادر؟ چ سوود و هێزێکی بەو ویژدان و دەروونە گەیاندوە کە ئەگەر گەشتەکە نەبووبایە لە خوێندن و شاعیریەت و پەندی ئیبنو ئادەمەوە پێی نەدەگەیشت؟ ئاخۆ ئەو حاجییەی ئێمە دەیناسین کەم و زیادی دەکرد ئەگەر هەشت نۆ ساڵان بە کوردستانی عێراق و ئێراندا نەگەڕابایە؟ هەر وەک ڕاوکەر سەرەڕای نێچیر گرتن لە هەڵمشتنی هەوای پاک و خواردنەوەی ئاوی سازگار سوودی تەندروستی وەردەگرێ

که شتێکه غەیری نێچیر و یەکەم مەبەستی ڕاویش نیە، ئایا حاجیش وەک ئەو ڕاوکەرە لە عەینی گەشتەکە، بێ خوێندن و شاعیریەت، چ سوودی تایبەتیی پێ گەییشتوە؟

وەرامی ئەم پرسیارانە، کە بەڕاستی پرسیارەکان تێکڕایان یەک پرسیاری گەورە پێک دێنن، وەک دەبینی لە لێکدانەوەی زیهنی و ژیربێژیی[85] پەیوەست بە بنگەی ماددییەوە سەر هەڵدەدات چونکە ڕووداوی گەشتەکە شتێکی بەسەرچوو و تێپەڕیوە لە دەست ئەو ئیحتیمالە دەرچوە کە ئاکامی نەبوونەکەی تاقی بکرێتەوە، تازە بە تازە ناکرێ مێژوو هەڵکەینەوە بەرەو دواوە و سەرلەنوێ ژیانێکی دیکەی بێ گەشت و گەڕانی هەشت نۆ ساڵان بە حاجی قادر بکوتینەوە هەموو ڕووداو و ڕاستییەکانی تری ژیانی حاجیش وەک خۆیان بهێڵینەوە تا بزانین چ گۆڕانێک لە سەرەنجامی فکر و خەبات و قەناعەتەکانی حاجی پەیدا دەبێ لەچاو ئەوەی کە لە واقیعدا پەیدا بوە و دەیزانین.

لە ژووری موختەبەر[86]دا دەتوانین هەرجارە ماددەیێک کەم کەین وەیا زیاد کەین لەو عەمەلیەتە کیمیاییەدا کە بە دەستمانەوەیە، ئەنجامی کەم کردن و زیاد کردنەکەش بە چاوی خۆمان دەبینین، هەروەها دەتوانین ئەزموونی زیاد کردن و کەم کردنی ماددەی تاقی کردنەوەی گیانلەبەریش بکەین بەو جۆرەی ئارەزۆی خۆمانە، بەڵام ڕووداوی تێپەڕیو هەر ئەوەندە گۆڕان و گۆڕین و لێ زیاد کردن و کەم کردنەوە هەڵدەگرێ کە لە کارگەی فکردا بە خەیاڵ و لێکدانەوە و گریمانە (فرضیة) بیکەیت، ئەنجامەکەشی هەر ئەو ئیحتیمالە دەبێ کە بڕیارەکانی ژیربێژیی دەیسەلمێنن.

دەبینی خەریکبوونمان بە هەڵستاندنەوەی پرسیارەکە و وەرامدانەوەی، لە سەرەتاوە تا ئەنجام، کارێکی لێکدانەوە و بەرهەمی شیمانەیە کە دەزانین وەک تاقی

---

[85] ژیربێژی: منطق. پێشتریش واتای ئەم وشەیەم ڕوون کردۆتەوە، ئەمجارەشیان بە نیازی بیر هێنانەوەی دواجار واتاکەم نووسی وشەی «شیمانە» ش کە نەختێک دواتر دێتە پێشەوە بە واتای «احتمال» ـە.

[86] موختەبەر: بەکوردی «ئەزمووگە»

کردنەوەی ئەزمووگە و پرسیاری حیساب نیە مەبەستەکە بەئیسپات بگەیەنێ و ڕەخنان بێدەنگ کات. لەگەڵ ئەمەشدا دەبێ بە بیر خۆمان بێنینەوە کاری زیهنیی وەها گەلێک جاران لە لێکۆڵینەوەی مێژووییدا کراوە چ لەبارەی ڕووداو بێ چ لە بارەی تاکەوە بێ. لە چەند نووسیناندا دەخوێنیتەوە ئەگەر ناپلیۆن هروژمی نەبردبایە بۆ سەر ڕووسیا لەناو نەدەچوو چارەنووسیش بە نیسبەت ئەورووپاوە ئەوە نەدەبوو کە لە پاش تێشکانی دواجاری «ناپلیۆن» لە شەڕی «واتەرلوو» هاتە دی... گەلێک نووسەری ئیسلام دەڵێن پەروەردەبوونی پێغەمبەر (د.) لە نێوان قەبیلە و دەشتودەردا بوو بە یارمەتیدەر لە پێکهێنانی نەفسێکی بێگرێ و دەروونێکی بەرفرەوان بۆی... مێژووناسان دەڵێن ئەگەر خەلیفەی عەباسی «معتصم» خاڵوانە تورکەکانی خۆی نەهێنابان بۆ پاسەوانیی دەربار (بلاط) لە دواتردا دەسەڵاتێکی تورکیی لە دەربار و ناو خانووی خەلیفەدا پەیدا نەدەبوو کە ببێتە هۆی نەمانی دەسەڵاتی خەلیفە خۆی... «معتصم» تورکی نەدەهێنان ئەگەر دایکی تورک نەبوویایە. لەم جۆرە نموونانەی موناقەشە کردنی ئاکامی نەبوونی هۆیەک وەیا هەبوونی هۆیەکی تر گەلێک شتان دەخوێنیتەوە، تەنانەت یەکێکی وەک «عباس محمود العقاد» کە بەراوردی خەلیفەی چوارەم «علي إبن ابی طالب» لەگەڵ «معاوية إبن ابي سفيان» دا دەکات بەوە ڕازی نابێ کە هەر یەکەیان لە جێگەی خۆیدا سەیر بکات، بەڵکوو بە خەیاڵ جێگەیان بە یەکتری دەگۆڕێتەوە و ئەنجامە خەیاڵیەکانیان قسە لێ دەکات. ئەوەی لە بیرم بێ عیبارەتی «خالف بين كفتيهما» بەکار دێنێت واتە تا تەرازووەکەیان بەیەکدی بگۆڕەوە.

بەڕاستی ئەوەی دەیبیەین و دەیخوێنینەوە لە گوتە زۆر مەشوورە پەرەسەندووەکەی «حتمية» تەرزە فێڵ لەخۆ کردنێکە لەلایەن کابرای نووسەر و بێژەرەوە کەوا بە شێوەیێکی هۆشیارانە وەیا نیوە نوستوانە بەسەر بابەتی نووسین و ئاخاوتنەکەیدا دادەبڕێت، ئێمەش وەک ڕیکۆردەر وەیا تووتی دووپاتی دەکەینەوە.

«حتمية» ی پڕ ئەفسون بەسەر ئەو ڕووداوانەدا دەسەپێنرێ کە تێپەڕیون و بەسەرچوون و تازە بەکەس ناکرێ جارێکی تر بیانداتەوە بەر تەجرەبەیێکی نوێوە تا بزانرێ ئاخۆ ئەم جارەش هەر ئەو ئاکامە بەدەستەوە دەدەن کە «حتمية» ی دوای ڕوودان باسی دەکات یاخود شتێکی ئەوتۆ بەرهەم دێت دیمانەی حەتمیەتەکە بەدرۆ دەخاتەوە. هەرچەند مومکین نیە هەمان ڕووداو دووبارە ڕوو بداتەوە، بەڵام

بایی ئەوەی بتوانین بڕیارێکی بە پێوانە و کێشانە لە بارەی «حتمیة» ەوە بدەین، ڕووداوی تر هەن یەکجار خزم و هاوچەشنی یەکێکی تری ڕابردوو، ئاکامی ئەوتۆ بەرهەم دێنن چ خزمایەتی و هاوچەشنیی نەبێ لەگەڵ ئاکامی ڕووداوە تێپەڕیوەکەدا کەوا ڕاستەوخۆ دەبێتە هەڵوەشێنەوەی سیحر و ئەفسونی ئەو «حتمیة» پاک و پیرۆزە، بەڵام لە هەمان کاتدا مەیدانێکی پان و بەرینی سەلماندن و نەسەلماندن دەمێنێتەوە لەبەر دەستی کابرای خاوەن «حتمیة» کە بە ئاسانی لەلای خۆیەوە ڕێی نەسەلماندن لە غەیری خۆی دەبڕێتەوە بەوەدا بڵێ هەندێ هۆی کاریگەر وەیا زەرفی مێژوویی وەیا سەرما و گەرما و نازانم چی لەمەیانەوە بۆ ئەویان جوداواز بوو بۆیە ئەنجامیان وەک یەکتر نەبوو.

بە نموونە دەڵێم وا دەبێ بەرەی سۆشیالیست لە وڵاتێکی دواکەوتووی مەڕلەوەڕێندا شۆڕشێکی گڕوپفانە دەکەن و دەسەڵات بەدەستەوە دەگرن کەچی لە وڵاتی پیشەساز و خاوەن تەکنیک و هەموو کەرستەییێکی شۆڕشی سۆشیالیست، بەرەی شۆڕشگێڕ هەنگاوی کورت و شەکەت هەڵدێنێت لە بزووتنەوەی بەرەو پێشەوەدا، بە هەردوو ڕووداوی سەرکەوتن و سەرنەکەوتنەکەش دەڵێن کاری حەتمیەتی مێژوە، لە حاڵێکدا دەبوو حەتمیەتەکە بە پێچەوانە بوویایە چونکە هەمووومان لەوە گەیشتوین کە پەیکەری فەلسەفەی سۆشیالیست هەڵچەقیوە لەسەر بەرەوپێش چوونی بزووتنەوەی پرۆلیتاریی لە ئاکامی پەرەسەندنی صیناعەت و تەکنیکدا، ئەمەش قسەییێکە هەزاران جار لێرە بەپێشەوە گوتراوەتەوە بەڵام من لێرەدا بۆ مەبەسی هەڵسەنگاندنی «حەتمیەتی مێژوویی» هەزارویەک بارەی دەکەمەوە لەبەر تیشکی خوێندنەوەی یەکێک لە ڕووداوەکانی ژیانی حاجی کە گەشتێکی هەشت نۆ ساڵییە بە کوردستاندا بۆ ئەوە لە ڕێبازێکی بەرفەڕاحی لێکۆڵینەوەی هەمە چەشنەدا بگەین بە کۆتایی ئەو لێکدانەوە بایەخدارە لە زیمنی باسی هەوڵ و تێکۆشانی نیشتیمانپەروەری و کۆمەڵپەروەریی حاجی قادردا. نابێ لە ڕێی چاوبەستەکێی گەپی «حتمیة» واز لە هەڵسەنگاندنی تەجرەبەی تایبەتیی حاجی بێنین لە مەیدانی گەشت و گەڕاندا هەر وەک نابێ وازی لێبێنین لە هیچ مەیدانێکی تردا. ئەوەی ڕاستی بێ، من وا دەزانم ملکەچ کردنمان بۆ بڕیاری «حتمیة» بەو جۆرە دەروێشانەیەی کە نووسەران خەریکن لێی ڕابێن، نزیکمان دەکاتەوە لەوەی پێی دەڵێن «مادیة الیة» چونکە کە ئەنجامی هەموو کاران هەر ئەوەبێ کە بوە

ڕووبەڕووی ماددیەتێکی ئالی بێ پێچ و پەنامان دەکات چ تەئویلێکیش ناتوانێ لەو ڕووبەڕووبوونەمان وەرگرێتەوە بۆ لایەنێکی عیلمانی تر مەگەر تەئویلی زۆرە ملێ وەیا خۆتەفرەدان.

ئەوانەی باسی «حتمیة» دەکەن لە مەوزووعی وەک تێشکانی ناپلیۆن و هیتلەر وەیا دۆزینەوەی هێزی ئاتۆم وەیا سەرنەکەوتنی پارتی «محافظ» ی ئینگلیز لە دوای بردنەوەی شەڕی جیهانی دووەمدا، لە ڕووداوی حازربەدەستدا بەڵگەی حەتمیەت دێننەوە کە ئەگەر ڕووداوەکان بە پێچەوانەش ڕوویان دابایە بەڵگەی حەتمیەتی ئەوانیشیان دەهێنایەوە. ئەو کەسانە ئەگەر ڕاست دەکەن با داینەمۆی حەتمیەتەکە لە ئاست ڕووداوی دواڕۆژدا بەگەڕ بێنن و پێمان بڵێن چ دەقەومێ و کەی دەقەومێ و بۆ دەقەومێ و چۆن دەقەومێ و چەند دەقەومێ و بەچەند دەقەومێ و لە کوێ دەقەومێ؟ بەڵام نەک ئەو قەومانە بەدیهیانەی وەک داهاتنی زستان و بەسەرچوونی پاییز و هەڵاتنی ڕۆژ و ئاوابوونی مانگ کە منداڵیش بەتەمایانە و چاوەنۆڕییان دەکات.

هەمووماں دەزانین مرۆڤ لە پێشکەوتندایە و گیروگرفتی ژیانی لە زۆربووندایە و ژمارەی مرۆڤان بەنیسبەتی ئەندازەیی تێهەڵدەکشێ و نەوت وشکایی دێت و گەلان بەرە بەرە بە مافی کۆمەڵایەتی و نەتەوایەتی و ڕامیاری و ئاینیی... و هەموو شتێکیان دەگەن... ئەمانە و گەلێک شتی تری وەک ئەمانەش دەزانین کە دێن و دەبن و ڕوو دەدەن کە ئەگەر بیان نووسین دەبێ زۆریان پێوە خەریک بین، بەڵام بەمانە و هەموو ڕووداوێکی گەورە و گچکەی وەک ئەمانە یەک ئینج بەرەو زانینی «حتمیة» ێک نەڕۆیشتوین فلسێک بێنێ. چ فەرقی زانینی ئەمانە و زانینی بوون و ژین و مردنی گیانلەبەر نیە کە هێندەی بەری دەستی خۆمان لێیان باخەبەرین و دەزانین حەتمین. ئەوەی بایەخی هەیە لە زانینی دواڕۆژ و ڕووداوەکانی، ئەو شتانەن کە «حەتمی» نین و لەسەر خەتی نێوانی بوون و نەبووندان، واتە لەوانەن ببن یا نەبن، لە خۆیانەوە بەلایەکدا ناکەون بەڵکوو شتێک وەیا کەسێک وەیا زەرفێک دێت و بەلای بوون وەیا نەبوونیاندا دەخات. بەڕاستی زانینی ئەو شتانە نرخدارە کە ڕوودانیان حەتمی نیە چونکە لەم حاڵەتەی لەنگەربەستنی دوولانەی تەرازووی بوون و نەبووندا هەوڵی مرۆڤ و زەکایەکەی و زانینەکەی و فیداکاریەکەی بایەخی دەبێ

بۆ قورس کردنی ئەو دەستەیەی کە سوودی تێدایە وەیا هەر نەبێ بۆ نەهێشتنی قورسبوونی دەستەکەی تر.

پسپۆرەکانی کۆمەڵایەتی و مێژوو و ئابووری و سیاسەت کە خۆیان هەڵدەداوە بە پێشبینی کردنی جۆری نوێ لە بەیەکتر کەوتنەوەی هێزە ئیمپریالیستەکان و سۆشیالیستەکان، هەموو جارانیش تێیدا بە سەهوو دەچوون هەر بەجارێک چ ماددەیێکی خۆپێهەڵدانەوەیان لە دەستدا نەما کە دوشمنایەتی نێوان هێزەکانی بەرەی سۆشیالیست گەیشتە سنووری لەشکەرکێشی و خوێنی یەکتر ڕشتن. بەڕاستی هەموو گوتەیێک بەسەر زمانیانەوە وشک بووبوو ئەگەر داخوازی مەسڵەحەت ناچاری نەکردبان بۆ دۆزینەوەی شرە بابەتێک کە بازاڕی پێشبینی و وڕێنەی «حتمیة» ی پێ نیوە پڕ بکەنەوە.

هەرچۆنێک بێ دۆزینەوەی «حتمیة» لە پاش ڕوودان وەک کەرامەتی ئەو شێخەیە کە دەڵێن جارێکیان ولاغێکی سەرپەت لوشماندی، شێخیش بە کەرامەت گوتی ئاوی بدەن تینویەتی، گوتیان قوربان ئاو دراوە، گوتی ئالیکی بدەنێ برسیەتی. کە کا و جۆیان بۆ برد ولاغەکە تێی بەربوو خواردی مریدەکان واقیان وڕما لەو هەموو غەیب زانینەی شێخ...!!

لە دەفتەری ژیانی حاجی قادردا گەلێک لایەنی وەک «بەرهەڵستی کردنی شەعبەدە»، «گەشتی نۆ ساڵەی خوێندن» هەیە جێی باس کردن و هەڵسەنگاندن بێ لە ڕووی دۆزینەوەی کار کردنیان لە پێکهێنانی ویژدانی حاجی و دەستنیشان کردنی ئەو ڕێبازانەی تێیاندا بەردەوامی ڕۆیشتن بوو تا کۆتایی ژیانی. ناوناوە بەدەم باس کردنی قۆناغە جوداکانی حاجیەوە بەرەنگاری لێکدانەوەی ئەوتۆ بووین کە نرخی «هەڵکەوت» و واقیعی لە پێگەیشتن و فراژییبوونی شەخسیەتی حاجی شی کردۆتەوە، وەک ئەوەی کە کۆییبوونی حاجی دەخلی بوە بەسەر هەڵکەوتنی حاجییەوە بەو مانایە کە ئەگەر حاجی لە شوێنێکی پێشکەوتووی وەک کۆیەی ئەوسادا نەهاتبا جیهانەوە لەوانە بوو بۆی نەلوێ ئەو شێوازە لە ڕەفتار و گوفتار و کرداردا بگرێتەبەر کە لە واقیعدا گرتییەبەر و ئەنجامەکەشی پەیدابوونی ئەو حاجییە نیشتیمانپەروەرە بوو کە دەزانین لە سەردەمی خۆیدا نە تاکی هەبوو نە تاکی وەک خۆشی بەدوادا هات تاچەندین ساڵ دوای مردنی، هەروەها ئەوەش گوترا کەوا

لە هەمان ڕێبازەوە مەلای گەورە بوو بە پێشکەوتووترین مەلای کورد، ئەگەر نەڵێم هەموو مەلاییک، تا ئەوەی لە گەلێک مەیداندا حاجی قادری بەجێ هێشتوە.

نووسەر من بم یاخود کەسێکی تر بێ لەسەریەتی پێوەندیی نێوان مرۆڤ و دەوروبەرەکەی دەرخات، ئەو بایەخەش کە پێوەندییەکە هەیبوە لە چۆنیەتیی ڕەفتاری مرۆڤەکەدا بخاتە جێگە و بارستی ڕاست و دروستی خۆیەوە لە تابلۆی شەخسیەت و دەروونی مرۆڤەکە و لەهەموار کردنی ڕێگەی ڕەوتی بەرەو چارەنووس.

بێ ئەوەی جارێ وەرامی ئەو پرسیارەم دابێتەوە لە بارەی ڕادەی تەئسیری دوشمنایەتی حاجی و شێخ نەبی لە پێکهێنانی قەناعەتی قووڵ و یەکجاری حاجی قادر دژی شەعبەدە بەتێکڕایی، ئەوەندم گوت کە ئەم دوشمانایەتییە بەهانەیێکی باشی بەدەست حاجییەوە دا لە کۆیێ ڕاگویێزێت بەرەو تورکیا، دیاریشە ئەم ڕاگوێستنەی چەند تەئسیری بوو لە کرانەوەی بێئەندازە و بێسنووری فکری نیشتیمانپەروەریی حاجی. تۆ سەیرکە ڕووداو لە چەند لاوە دەتوانێ کاریگەر بێ، چۆنیش مومکینە ئەنجامێکی لابەلای ڕووداوەکە گەلێک گرنتربێ لە ئەنجامێکی یەکسەری ڕووداوەکە. لەم بەسەرهاتەی دوشمنایەتیی نێوان حاجی قادر و شێخ نەبی ڕاگوێستنەوەی حاجی بۆ ئەستەمبۆڵ کە ئەنجامێکی لابەلای دوشمانیەکەیە گەلێک گرنترە لە ڕەگ داکوتانی زویربوونی حاجی لە شەعبەدە کە بەرهەمی یەکسەرەی دوشمنایەتیەکەیە لە ڕووی ئەوەوە کە پێکهاتنی هەستی کوردایەتیی خەست و خۆڵ لای حاجی بەند بوە بەو ڕاگوێستنەوەوە، چونکە مەعلوومە قووڵبوونی ڕەگی دژایەتی شەعبدە لە ناخی نەفسی حاجیدا نەیدەگەیاند بە پلەی کوردایەتی و هۆنینەوەی شیعری سیاسی ئەگەر هەر لە کۆیێ مابایەوە.

ئەم پێشەکیە و درێژەپێدانەی ڕوونکەرەوە بەر لە چوونە ناو لێکۆڵینەوەوە، هەوڵدانێکە لە منەوە بۆ ڕاکێشانی هۆش و سرنجی خوێنەرەوەی کورد بەرەو ئەو شتە گرنگانەی کە پێوەندییان هەیە بەحاجی و شەخسیەت و ویژدان و خەباتیەوە، بەدەگمەنیش نەبێ لە دیراسەی نووسەرانی کورد لە بارەی کەسێکی وەک حاجی قادرەوە بایەخی پێنەدراوە هەر دەڵێی بەلای ئەو نووسەرانەوە مرۆڤ شتێکە و ڕووداوەکانی ژیانیش شتێکی سەربەخۆی دوور لەون. ئەم تێنەخوێندنەوەی بەسەرهاتی تاک لە ویژدانی تاکەکەدا پتر پیشەی ئەو نووسەرانەیە کە بە زاهیر

خۆیان بەلای شی کردنەوەی ماددییدا دەشکێننەوە چونکە ئەوان حەز بەوە دەکەن تین و تاوی دەوروبەری ماددی کاریگەر بووبێ لەو ویژدانەدا، بەمەشدا ئاگایان لەوە دەبڕێ کە دەوروبەر کۆمەڵێکە لە شتی وەک تەجرەبەی تایبەتیی تاکەکە.
تەجرەبەی تاک هەر ئەوەندەی نوقسانە ببێتەوە دەوروبەر بۆ تاکەکە کە هی جیرانەکەی نیە و هی خۆیەتی واتە ئەگەر تەجرەبەی شەخسیی «ئازاد» هی تاکەکانی تری کۆمەڵ بوویایە بەلای نووسەرانی ماددییەوە بە دەوروبەر و واقیع حیساب دەکرا. وا دەبێ لە پەراوێزیکی گشتی نووسیندا دەورێکی تەجرەبەی شەخسی و تەئسیری لە کۆمەڵدا وەیا لە چارەنووسی تاکدا دانی پێدا دەهێنرێ بەڵام لە کاتی باس کردنی شەخسدا تەجرەبەکە بەلاوە دەنرێ و شەخسەکە دەدرێتەوە بەر تین و تاوی واقیعەوە، وەک ئەوەی من بێم لە نووسینمدا بڵێم ڕووداوی تەجرەبەی شەخسی کاریگەرە لە ژیان و چارەنووسی تاک بەڵام کە هاتمە سەر لێکۆڵینەوە لە «هارون الرشید» قسەکەی خۆم بەلاوە بنێم و بە هارووونە ڕەشیددا بێمە خوارێ بێ ئەوەی چ پێوەندیێکی تەجرەبەی شەخسی ئەو تێبخوێنمەوە بەو ڕەفتارانەی کە ڕووپەڕەی مێژوویان ڕەش کردۆتەوە. تا ئێستا بە زۆری کە لە بارەی ئەدیب و پیاوە ناودارەکانی کوردەوە نووسرابێت، نووسینەکە وەک دەور کردنەوەی ڕۆژەکانی هەفتە و مانگ و ساڵەکانی ژیانی بوە. هەر چۆن دەگوترێ شەمو بەدوای هەینیدا دێت و یەک شەموش دەکەوێتە پێش دوشەموەوە، هەروەهاش لە باسی شاعیرێکدا دەخوێنێتەوە فلانە ساڵ لە تۆپزاوا لە دایک بوو، لە توزخورماتوو قوتابخانەی سەرەتایی تەواو کرد، فلانە ساڵ ژنی هێناو چو بۆ حەج دوایی بەسەر نەخۆشیەکی قورسدا گیانی سپارد... شیعری دەگوتن تا مرد، زۆریش تووتی باز بوو، ناوناوەش دەچوە ڕاو... ڕیشی بە مەکینە دەتاشی مێزەرەکەشی گورزەوهۆن دەخستە سەر تۆقەڵەی سەری هەتا بشلێی خەوی سووک بوو..

ئێمە ئەگەر لە لێکۆڵینەوەی باسی حاجی قادردا وەک ئەو ڕێکۆردەرە بین کە ڕاستییە سادەکان و هەڵبەستە پارێزراوەکانی لێ بداتەوە شتێک دەکەین لە سەرەتاوە بێلزومە چونکە ئەمانە شتی زانراو و قسەلێکراو و دەگاسن کراویشن. ناوناوەییێک کە نووسەرێک وستبێتی لە گۆشەی نیگاییێکی تایبەتی خۆیەوە ڕایەکی نوێ لە بارەی یەکێک لە ڕووداوەکانی بەسەرهاتی حاجی پێشکەش بکات، ئەویش بە هۆی نەبوونی دیراسەی قووڵ و وردی لێرە بە پێشەوە لە بارەی سەرلەبەری باسی حاجی

و ئەو ڕۆژگار و واقیعەی ئەوی تێدا ژیاوە لە گۆشەی تایبەتی خۆشیەوە بە سەهوو چوە وەیا سەر ڕوو ڕۆیشتوە وەیا گەلێک ڕاستیی گەورە و گرنگی شێلاوە.
نموونەیێکی ئەم حاڵەمان لە بەشی یەکەمی «حاجی قادری کۆیی» دا دێت کە زانیمان نووسەرێک لە ئەنجامی پەلە کردن لە دابڕینی حوکمی نەزەریە بەسەر واقیعدا حاجی قادری گەیاندە ئەستەمبۆڵ بیست ساڵ بەر لەسەفەرە حەقیقیەکەی، هەروەها کردیشی بە خزمەتکاری دەرەبەگ لە ژیانی پێش سەفەرەکەیدا کەچی لە هەموو ئەو ژیانەیدا تاکە یەک قەصیدەی پێنج بەیتی هەیە، بە پێچەوانەی بڕیاری نەزەرییە.

لەم نمایشتەی ڕابواردنە کورتەی حاجی لە کۆیێ بەدوا گەشتی خوێندنیدا دوو ڕووداوی بەرچاوی بەسەرهاتی حاجیم خستە بەر تیشکی لێکدانەوەوە، یەکەمیان گەشتی نۆ ساڵەی خوێندنی فەقێیەتی، دوەمیان دوشمنایەتی شەعبەدە و تەئسیری ناکۆکی نێوان حاجی و شەعبەدەبازێکی وەک شێخی ماویلیی لەو دوشمنایەتیەدا.

لە ئاست دژایەتی حاجی لەگەڵ شەعبەدەدا گوتم دواتر وەرامی یەکجارەکی پرسیارەکە دەدەمەوە تا ئەو کاتەش خوێنەر لەلای خۆیەوە بیرێک لە باسەکە دەکاتەوە و ئەویش وەک من، کەم یا زۆر، خەریکی پێکهێنانی وەرامێک دەبێ کە لەگەڵ پرسیارەکە بگونجێت.

پرسیاری تاو و تەئسیری گەشتی خوێندنی حاجی بە کوردستاندا دەبێ لێرە لێی بدوێین چونکە ئەوەندەی بە خەیاڵمدا بێت بار و وەزعێکی باشتر و لەبارتر لەم جێگەیە، بۆ ئەو لێدوانە پەیدا نابێ بە تایبەتی دوای ئەم هەموو پێشەکی و پرسیار و ڕوون کردنەوەیە کە بەینێکە خۆم و خوێنەری پێوە مەشغوڵ دەکەم.

ئایا گەشتەکە خۆی لە خۆیدا بێ تێخوێندنەوەی فەقێیەتی و مەلایەتیی کە لەگەڵ گەشتەکەدا بە یەکەوە بەستراونەتەوە، چ دەورێکی تایبەتی هەبوە لە پێکهێنانی شەخسیەت و ویژدان و قەناعەتەکانی حاجی کە دەزانین لە قۆناغێکی دواتردا سەرلەبەریان بوون بە ماڵی بێ هاوبەشی کوردایەتی؟ دەبێ لەم لێکۆڵینەوەیەماندا کە تازە بە تازەی دەکەین گەشتەکە و خوێندنەکە لەبەر یەکتر بترازێنین و گەشتەکە لە حیسابی خوێندن دەرباوێژین وەیا بە پێچەوانە خوێندنەکە لە حیسابی گەشتەکە دەرباوێژین و نرخی تاکە ماکی گەشتەکە دەرخەین کە ڕاستەوخۆ بە

تەنها کاری کردبێتە سەر هەست و نەستی حاجی. خوێندن بۆ خۆی ماکێکی سەربەخۆیە و سەرچاوەی شاعیریەت و ڕۆشنبیریی حاجی قادرە کە زوربەی لایەنی نرخی مەعنەویی حاجی لەوەوە هەڵقوڵیوە، بەسترانەوەشی بە گەشتەکەوە ڕووکەشی و سەراوە لەو ڕووەوە خوێندنەکە بە گەشت و بێ گەشت لە ئیمکاندا بوە، بە تایبەتی کە دەزانین سەرەتای خوێندنی حاجی بۆ ماوەی چەندین ساڵ لە کۆیێ بێ گەشت و گەڕان بوە، تەنانەت مەیلەو ساغمان کردەوە کە ڕاگوێستنی حاجی لە گۆڕقەرەجەوە بۆ کۆیێ لە بنەڕەتدا بە نیازی خوێندن بوە. کەواتە لەوانە بوو حاجی ئەم گەشتەش نەکا و خوێندنیشی تەواو کردبایە. کاتێک بەیەکەوە بەسترانەوەیان بایەخی دەبوو ئەگەر حاجی لەم گەشتەدا بۆی ڕێک کەوتبا دەستی بە خوێندنێکی وەها ڕاگەییشتبایە کە لە بارێکی تردا دەستی پێی نەگا ئەو خوێندنەش وەها تایبەتی بووبایە ڕێبازێکی نوێی ئەوتۆی فکر و باوەڕی نابایە بەر حاجی کەوا نە بێ ئەو گەشتە بهاتایە بەری نە بێ ئەویش حاجی ئەوە بوویایە کە هەیە.

لەم نووسینەدا (بگەڕێوە بۆ بەرگی دوەم) هەڵکەوتی ئەوتۆمان لە ژیانی حاجی قادردا هەڵسەنگاندوە کەوا بە بەریەوە هەبوە چەند و چۆنی تەئسیرەکەی لێ بکۆڵرێتەوە بۆ دیارخستنی جۆری کارتێکرانی گیانی حاجی قادر لە نوختەی نیگای کوردایەتییەوە وەک بە درێژیی لە بارەی بیروباوەڕەکانی مەلای ئیبنو ئادەم دواین و ویستمان کاری ئەوان لە گیانی حاجی قادردا بدۆزینەوە.

بەر لەوە بەپێی بۆچوونی خۆم بکەومە سەر لێکۆڵینەوە لە تاو و تینی گەشتەکە بۆ ناو دڵ و دەروون و قەناعەتەکانی حاجی، دەبێ شتێک ڕوون کەمەوە لە بارەی ئەم گەشتەوە نەک لە ڕووی تەئسیری لە حاجی، بەڵکوو بە پێچەوانە لە ڕووی دەخلی نەفسی حاجی بەسەر ڕوودانی گەشتەکەوە. ئایا ئەگەر ئەو خەسڵەتەی خورتی و سەرکەشی و بە خۆنازی و ڕێز لەخۆنانی وەها بەهێز نەبوویایە گەشتێکی نۆ ساڵەنەی بە غەریبی دەگرتە بەر؟

وا دەزانم نەء!!

هەروەک لە سەرەتاکانی ئەم بەشەی نووسینەکەمدا باسم کرد حاجی قادر بەهانەی پەیدا دەکرد بۆ بەردەوامبوون لەسەر خوێندنی دوورەوڵات و غەریبیی. حاجی نەیدەویست بگەڕێتەوە بۆ بێشکە و مەفتەنێک کە خاوەنی هیچ شتێک نیە تێیدا

وەک پاڵەوانەی دیوار بیداتە بەر بەژنە کەڵەگەتە سەر کەشەکەی نەفسە زلەکەی تاکوو بە گەردەنکێڵی و بەسەر پێیانەوەی ڕاگریێت، هەر بۆیەش بوو، وەک گوتم، کاتێک کە ناچاری گەڕانەوە بوو بۆ کۆیێ خێرا لێی دەرچوو و خۆی هاویشتەوە باوەشی غەریبییێکی تازەوە کە بەڕاستی سەرلەنوێ ئەو عەیبانەی هەژاری و بێماڵی و بێ هیچ شتیی بۆ حاجی شاردەوە کە بە عادەت لە حاڵی نیشتەجێبووندا ناشرێنەوە و لە مرۆڤ دەبن بە کەمایەتی و جێی بەخۆدا شکانەوە. کە ئەم بۆچوونە ڕاست بێ، وا دەزانم هەموو لێکدانەوەییێکی ڕێکوپێکیش بەڕاستی دەزانێ، گومان لەوەدا نامێنێ کەوا حاجی قادر لە سەرەتاوە بە هۆی پاڵەپەستۆی نەفسە خورتە سەرکەشەکەیەوە ملی لە موویێک باریکتر بوە بۆ گرتنەبەری گەشتی دوور و درێژی خوێندن چونکە ئەو هێزەی وای کرد درێژە بە خوێندنەکەی بدات و دواتریش خێرا لە کۆیەی ترازاند، هەر خۆی بوو لە پێشەوە ئۆقرەی لێ هەڵدەگرت لە ژیانێکی سەر کزەڵانەی هەژارانەی ناو قەوم و خویش و ناسیاواندا. حاجی کە نەیدەویست لەبەر هەژاری و بێدەستیی بێتەوە کۆیێ، دوای هاتنەوەشی تەحەمولی نەکرد بە بێدەسەڵاتی لە کۆیێ بمێنێتەوە، هەر خۆشی بوو زووتر بە بەهانەی خوێندن ماڵاوایی لە کۆیێ کرد. نەچوونی حاجی بۆ گەشت و گەڕانی خوێندن شتێک بوو دژی جۆشی هەناو و تەکانی نەفسی. کاتێک دەشیا حاجی لە کۆیێ بمێنێتەوە ئەگەر ئەویش وەک خەڵقی تر ڕازی بووبایە بەو لوقمەیەی قەدەر دەیخستە کەشکۆڵە شکاوەکەیەوە، وەیا لە سێبەری برا گەورەییێک و دەوڵەمەندێکدا نوێنی چاوچنۆکی و چاوشۆڕی ڕایەخستبا و قسەی پانکە پانکەی چەور و لووسی لە دیوەخاناندا کردبایە و سەڵەواتی بۆ چاکە و سەدەقەی خێرەومەندان لێ دابایە.

پوختەی قسەم لێرەدا ئەوەیە. ئەگەر حاجی سەفەری خوێندنی دوور و درێژی نەگرتبایە بەر، دەبوو جڵەوی نەفسە سەر ڕەقەکەی بەرە و دواوەی سروشتی خۆی بادابایەوە بۆ ناو شکەفتی «دابینبوون و قەناعەت و ملکەچی» لە کەچەخانوییێکدا بە دیار ژن و خێزانێکی هەناسە ساردەوە دەستی لە ئەژنۆیان وەرهێنابایە. ئەویش وەک هەزاران بێدەسەڵات و هەژاری کۆیێ بووبایە دڵۆپێکی بێ ڕەنگ و سەنگی دەریای بێدەسەڵاتی و هەژاری، بەمەشدا هەر لە سەرەتاوە دەبوو بە نامزەدی بێناوی و نەناسراوی و هیچ لەدەست نەهاتوویی، واتە نابێ بڵێم ناوی لە مێژوو دەسڕایەوە چونکە ناوی نەدەبوو تاکوو بسڕێتەوە.

کەواتە گەشتی خوێندن تاکە یەک ڕێبازی ڕەفتاری ڕێز لەخۆ گرتن بوو لە پێش حاجیدا چونکە هەموو ڕێبازێکی تر کە بە بیردا بێت چرا و بڵیسەی نەفسی حاجی قادری تێدا دەکوژایەوە، کەچی بەردەوامبوون لەسەر خوێندن بەدەم گەشت و گەڕانەوە لە دوو لاوە بارە شڵۆقەکەی بۆ ڕاست دەکردەوە. یەکەم ڕاست کردنەوەی بارەکەی لەوەدا بوو کە ڕزگار بوو لە کوژانەوە. دوەم لەوەدا بوو کە خستییە سەر ڕوونبوونەوە بەو زانستانەی کە ئەوسا دەستی خوێندەواری پێ ڕادەگەیشت. ئەم ڕاستییانە کە بە لێکدانەوە بۆمان دەردەکەوت، لە هەموو هەنگاوێکی حاجی بەدی دەکرێن، بە نموونە دەڵێم دیتمان (لە بەرگی یەکەم) حاجی بە هاوڕێیایەتی حاجی مەلا عەبدوڵا بۆ خوێندن چوونە باڵەکەتی، دواى پێنج ساڵان حاجی مەلا عەبدوڵامان لە کۆیێ دیتەوە ژنیشی بۆ هاتبوو کەچی حاجی جارێ تا چوار ساڵی تریش لە کوردستانی ئێران خۆ بە خوێندنەوە خەریک دەکات، دیارە ئەگەر حاجی قادریش حاڵ و بارێکی گوزەران و دابینبوونی شک بردبایە ئەو شەڕە دوور و درێژەی بە خوێندن نەدەفرۆشت.

بەڵی بێگومان، گەشتی خوێندن بڕیاری جووتە عامیلی کاریگەری «نەفسی سەرکەشی حاجی و داخوازی دەوروبەر» ەکەی بوو. ئەو حاجییەی کە ئێمە دەیناسین، لەو ژیانە ناگزوورەدا کە باشی لێ شارەزاین، دەبوو چەند ساڵان خەریکی گەڕان و خوێندن بێ. مۆری چارەنووس لەو گەڕان و خوێندنەی حاجی قادر درابوو. ئێستا کاتی ئەوە هاتوە لایەنی تاو و تەئسیری گەڕانەکە لە ناو دەروونی حاجیدا بدۆزینەوە، ئەگەر چ تاو و تەئسیرێکی تایبەتی خۆی هەبوویێت لە ناو ئەو دەروونەدا.

خوێنەر وا نەزانێ ئەم باسە نەفس کورت و کەم مەودایە. هەر ئێستا دەبینێت، ئەگەر لە هەموو لایێکەوە پێوانە و کێشانەی لەگەڵدا بکرێت، ئەویش بایی خۆی چ گۆمێکە.

منیش نەڵێم لە خۆوە دیارە تاو و تەئسیری ڕووداو لە نەفس و دەروونی مرۆڤدا شوێن پەنجەییێکی بەرچاو وەیا نهێنی بەجێ دەهێڵێ لەوانەی دەتوانین پێیان بڵێین شوێن پەنجەی مەعنەوی نەک پاشماوەییێکی ماددی کە دەست هەستی پێ دەکا وەیا گوێ دەیبیسێ وەیا سەنگ و ڕەنگی هەیە. ڕووداو کە کار دەکاتە سەر دەروونی مرۆڤ، لە حاڵی عادەتیدا، تین و تاوەکەی وەک گەرمایی خوێن وایە کە دەزانین

هەیە بەڵام نادیتریێت و سەنگ و پانایی و درێژایی نیە. ڕووداو مریشک نیە تین و تاوەکەی وەک هێلکە بە دەست بگیرێت، هەر بۆیەیشە ئەو تین و تاوەی لە ڕووداوێکی نەزانراوەوە مابێتەوە زۆر بەزەحمەت هەستی پێدەکرێت لە حاڵێکدا ئەگەر ڕووداوەکە لەبەرچاوان ڕووی دابێت وەک ئەوەی کە یەکێک لە ترسان دەشێوێت و خەڵق بە ترسەکەی دەزانن شێوانەکەشی دەبێتە شتێکی مەفهووم.

کە بمانەوێ شوێن پەنجەی گەشتی نۆ ساڵەی خوێندن لە نەفسی حاجیدا بدۆزینەوە دەبێ بگەڕێین لە ناو گوتە و شیعر و کردەوەکانی، دەنگدانەوەی ببیەین وەیا دروشمی ببینین. ئەم بەدوادا گەڕانەی «دەنگدانەوە و دروشم»، سەرەڕای زەحمەتێکی کە تێیدایە وەک لە هەموو کارێکی عەقڵیدا هەیە جارێکی تریش بە زەحمەتتر دەکەوێ لەوەدا کە دەشێ تین و تاوی ڕووداو لە دەرووندا ئاکامی هێندە ورد و نهێنیی پەیدا بکات کە هەست پێ کردنی یەکجار ئەستەم بێ، وەیا کە بۆرە هەستیشی پێ کرا لەوانەبێ هەر بایی ئەوە بێ خاوەن هەستەکە خۆی بەشێوەیێکی لێڵ پێی بزانێت و نەتوانێ بە خەڵقی ڕابگەنێت یاخود ئەگەر ڕاشیگەیاند پێیان بسەلمێنێت.

بەڕاستی زۆر جاران لە زیهنکارییدا مرۆڤ پێویستی بە ئالەتێکی زێدە هەستیاری پێزانین هەیە وەک ئالەتی «سیسمۆگراف» کە لەرزینەوەی زەوی تۆمار دەکات. جاری وەها هەیە لەرزینەکە ئەوەندە بێهێزە کە ئەگەر دەجارانیشی بەهێزتر کەیت مرۆڤ بە بێ ئالەتی «سیسمۆگراف» هەستی پێ ناکات. یەکێک لە نموونەی وردی و هێمایی و ناسکی و تەنکیی ئەو تەرزە هەستەی کە دەربڕینی وەیا ڕاگەیاندنی بۆ خەڵق کارێکی ئەستەمە، تایبەتییێکە لە هەندێ هەڵبەستی «نالی»دا کە لەوانەیە تەنها بەر پەنجەی هۆش و زیهن بکەوێت و نەخرێتە ناو چارچێوەی وشەوە. ئەوەی ئێستا خەریکم لێرەدا بۆ مەبەستی ڕوون کردنەوە بیخەمە سەر کاغەز، هەرگیز لێرە بەپێشەوە ڕێم بە خۆم نەداوە بیخەمە بەر گوێی گوێگرەوە نەوەک ئەرکەکەم ببێتە ماندووبوونی بێسوود وەیا، لەوەش زیاتر، گوێگری پێ گوماناویی بکەم لەوەدا ئاخۆ قسەکانم باسی حەقیقەتی ناو بەیتەکە دەکەن وەیا هەزەیانی دەروونی خۆمە لە بەیتەکەی بەدەنگ دەهێنمەوە. ئەوەی ڕاستیش بێ هەمان ترس لێرەشدا سواری شانم دەبێ چ لە ئاست بەیتەکەی نالیدا بێ و چ لە ئاست گەشتەکەی حاجی قادردا بێ، چونکە قەڵەم لە زمان ئازاتر نیە بۆ نەخشەکێشانی جووڵەی دەروون.

بەیتەکەی نالی زۆری بەبەرەوە هەیە تا بەتەواوی ئەو ناسکی و هێماییەی من مەبەستمە بۆ بەرچاوی بینەر ئاشکرا دەبێت، من لێرەدا یەکجار بەکورتی لەسەری دەڕۆم. نالی دەڵێ:

بۆ شەهدی کەلامت کە بە ئیشرابی لەطافەت

«لذة» دەگەیێنێ بە دڵ و دهنی موخاطەب

ڕاستە واتاکەی ئەمەیە: بۆ هەنگوینی قسەت کە بە پاراو کردنی نازکی، لەززەت بە دڵ و دهنی «دهن زار» ئەو کەسەی قسەی لەگەڵدا دەکەیت، دەگەیەنێت. «کەلام» لە زارەوە دەردێت، کە بە نازکی پاراوکرا جێی خۆیەتی تامەکەی بگاتە زاری یەکێکی تر کە ڕووی قسان لەوە. دیارە ئاودانی کەلامەکە بە نازکیی وای لێ دەکا تامی بگاتە زاری «موخاطەب» وەک ئەوەی کە لێوەکانی ماچ کردبێت. گەیشتنی لەزەتەکە بە دڵ، کە گەییشتنێکی مەعنەویی وەیا لەزەتێکی مەعنەویی بێت شتێکی عادەتییە، بەڵام دڵیش لێرەدا خەریکە هەستی شیرنایی ڕاستەقینەی کەلامەکە بکات نەک هەر خۆشیە مەعنەوییەکەی، بەهۆی ئەو تێراوبوونەی بە نازکی و «لەطافەت». ئەگەر لە ڕێی ئەم واتایە بەرفرەوانەدا خۆت بە بەیتەکەوە خەریک کەیت باشتر دەتوانی قەناعەت بێنی بە مومکینبوونی گەیشتنی شیرنایی هەنگوینەکە «بە دڵی موخاطەب» لە ئاکامی تێکەڵبوونی «لەطافەت» لەگەڵ هەنگوینەکە. من لەم قسانەدا ڕێ بۆ شتێکی تر خۆش دەکەم کە ئەوم مەبەست بوو لە پێشەکی ڕوون کردنەوەکەمدا. دەمەوێ دەست بۆ لایەنیێکی هێمایی واتای بەیتەکە درێژ کەم کە دەزانم زەحمەتە بەردەست بکەوێ هەروەک گوتم زەحمەتە تین و تاوی گەشتەکەی حاجی بەرهەست بکەوێ.

سرنج لە وشەی «لذة» بگرە کە پیتی «ذ» تێیدا گوشراوە و نیوەی وشەکە پێک دێنێت واتە دوو پیت لە چوار پیتی وشەی «لذة» ئەو «ذ» ەیە. ئەمەت لە بیر بێ. ئەمجار سرنج لە هەنگوینی کەلام بگرە کەوا بە هۆی پاراوبوونی بە «لەطافەت» وەها شل دەبێتەوە خەریکە بەرەو مەعنەوییەت دەڕوات بەتایبەتی کە هەنگوینەکە هی «کلام» ـە کەلامیش خۆی ماددی نیە و مەعنەوییە.

شەهد بە «دهن زار» تام دەکرێ، بەڵام کە شەهدەکە هی کەلام بوو بە لەطافەتیش ئاو درا بێ لێی دەوەشێتەوە بە «دڵ» یش تام بکرێ.

ئەم جارەیان سەیرێکی وردی ئەم شێوەیە بکە کە مەبەسی بنجیمە لەم قسانەمدا:

«شەهدی کەلام» شل کرایەوە بە پاراوبوونی بە «لەطافەت».

ئەم شەهدە کەلامەی پاراوکراو بە لەطافەت «لذذة» دەگەیەنێ بە.... دهنی موخاطەب. عیبارەتەکە «گەیاندن» ی تێدایە کە دەکا ڕاگوێستنی شت. لەمەوە ئەگەر لە وشەی «لذذە» ەوە شتێکی قابیلی ڕاگوێستن ببەین بۆ «دهن» کە ئەویش پیتی «ذ» ە، وشەی «دهن» دەبێتە «ذهن» کە ئەویش وەک «دڵ» لە تامی مەعنەویی «شەهدی کەلام» سوود وەردەگرێت. بەمەدا: دڵ و دهن هەردووکیان وەک یەکتر لە تامی ماددی و مەعنەویی شەهدی کەلام سوودمەند دەبن. واتا هێمایيەکەی کە من مەبەستمە و دەزانم بە قسە و نووسین پێم دەرنابڕێ، ئەو وەرگەڕانە مەعنەوییەی وشەی «دهن» ە بۆ «ذهن» لە ڕێی پەڕێنی نوقتەی «ذ» لە وشەی «لذة» ەوە بۆ لای پیتی «د» لە وشەی «دهن» دا.

ئەم جۆرە هێمای زێدە بزر و شرایەوە ناوناوە لە شیعر و ڕەمزدا، بەتایبەتی لە بەرهەمی سورياليدا، پەیدا دەبێ و خوێنەریش وەک من بەسەریاندا کەوتوە کە ئیتر پێی ناوێ چی تری بەدوا بکەوم، هەر ئەوەندە دەخەمە سەر قسەکانم کە دۆزینەوەی تین و تاوی ڕووداو وەیا زەرفی تێپەڕیوو لە هێمای کردە و گوتەی خاوەن تەجرەبەدا یەکجار زەحمەتترە لە زانینی هێمای شیعر و پەیکەر و هەموو ئەو شتە زەحمەتانەی حازرن لەبەر دەستدا و لێک دەدرێنەوە. من لە هێنانەوەی نموونەی شیعری نالی مەبەستم بەرچاوخستنی زەحمەتی ئەو کارەی نهێنی دۆزینەوە بوو کە دەشزانم خوتخوتەی دڵم ئەوە نەبوو لە شی کردنەوەی بەیتەکەدا خستمە سەر کاغەز لەگەڵ ئەمەشدا دۆزینەوەی تەئسیری گەشتەکەی حاجی لە دەروون و ویژدانی حاجیدا گەلێک لە زانینی هێمای ئەو بەیتە ئەستەمترە.

هەرچۆنێک بێ و چەندێکیش زەحمەت بێ پێویستە ئەم لایانە باس بکرێت و لێی بکۆڵرێتەوە، وەک من لێرەدا خەریکی دەبم، دووریش نابینم لێکدانەوەکانی من یەکێکی تری وەک خۆشم بخاتە سەر ئەو تەرزە ڕێبازەی زیهنکارییەوە لە مەیدانی

وەک ئەم مەیدانەدا، ئەگەر ئەمە ڕوو بدات ئاکامێکی خۆش و سوودمەندی حیساب بۆنەکراو لە کارەکەی منەوە دێتە ناو خەرمانی ڕۆشنبیرییمانەوە.

تاو و تەئسیری گەشتەکە هەندێ ئاکامی ئاشکرای هەیە لەوانەی بێ لێوردبوونەوەی بە ئەرک مەیلەو بە خێرایی دێتەوە ناو حیسابەوە. خوێندنەوەیێکی سەرپێیی دیوانەکەی حاجی، لێرە و لەوێ، گەلێک دەنگدانەوەی ئەو گەشتە دەخاتەوە بەر گوێی گوێگرەوە. لە دوو بەشی یەکەم و دوەمی ئەم نووسینەدا ناوناوە بەپێی داخوازی جێگە نموونەی شیعری حاجی هێنراونەوە کە زادەی گەشتەکەن واتە ئەگەر گەشتەکە نەبووایە ئەو نموونانەش نەدەبوون بە خۆیان و ڕاگەیاندنەکانیانەوە. یەکێک لەو نموونانە ئەو چەند بەیتە بوو کە ناوی سێ شاعیری جەربەزەیان تێدا هاتوە «مەلکەقۆڕ، حیماری، کیسەشکەل». لە بەشی دوەمدا، بەپێی توانا، بۆ خوێنەرم ڕوون کردۆتەوە کە ئەگەر هاوڕێی خوێندن و وەفاداری بۆ ئەو هاوڕێیەتیە لە نێواندا نەبووایە ڕەنگ بوو حابی قادر وا بە ڕاشکاوی پێیدا هەڵنەگوتبانایە لە حاڵێکدا ئەو لەو بەیتانەدا دان بە بێعاری و بەدناوییاندا دێنێت. بۆ مەبەستی بیرخستنەوە لێرەدا بەیتەکان دەنووسمەوە شتێکی تازەشیان لێ هەڵدێنجم کە پێوەندی بەم باسەی ئێرەوە هەیە:

مەلکەقۆڕ و حیماری کیسەشکەل
«قس من اسمائهم ولا تسئل»

شیعریان جوانە بەس نیە کوردن
گەرچی بەدناون و گەلێ وردن

بەفیدایان دەکەم صەد «إبن یمین»
چونکە دەربەستی غیرەتی کوردیین

لە بەشی دوەمدا گوتومە حاجی لەم لەسەر کردنەوەیەدا سەرەڕای «دەربەستبوونی غیرەتی کوردی» هاوڕێیی و وەفادارییشی ڕەچاو کردوە. لێرەدا دەڵێم ئەم دەربەستبوونەی غیرەتی کوردی کە دەیکاتە بنگەی لەسەر کردنەوەیان، شتێکە حاجی قادر لە کاتی بەیەکەوە خوێندنی باڵەکەتییان لەوانی دیتوە، شتەکەش بێگومان لە پێش هەموو شتێکدا هەڵبەستنی شیعرە بە کوردی، بەڵام وا دەزانم

بەولای شیعری کوردییەوە ڕەفتاری ئەوتۆشی لێ دیتوون کە دواتر لە کاتی پیری و یاد کردنەوەدا بۆیانی بە دەربەستبوونی غیرەتی کوردی حیساب بکات، ئیتر ئەم ڕەفتارە چی دەبێ با ببێ. هەرچەند ناتوانم بڕیار بدەم ڕەفتارەکە چیە، بەڵام دوور نابینم حاجی دیتبێتی مەلکە و هاوڕێکانی لەگەڵ پیاوی میریدا (عوسمانلی یاخود ئێرانی) بە سەربەستی و نەترساویی قسەیان کردبێت و وەرامیان دابێتەوە وەیا موچە و بەراتی وانیان ڕەفز کردبێت، وەیا لە کاتی «میر میرانێ» دا[87] ئەو فەرمانبەرانەشیان وەک خەڵقی تر بەر تەکلیف خستبێت.

من کە ئەمە دەڵێم لەوەوەیە کەوا حاجی پتر مێشک زاخاودراوی ناو و شیعری ئەم شاعیرانەیە لە کاتی خوێندنەکەی باڵەکاتییەوە نەک ئەو شیعرەی دواتر لەوانەوە گەیشتۆتە ئەستەمبۆڵ چونکە بڕوا ناکەم شیعری ئەوان وەک هی کوردی و شێخ ڕەزا و سالم بەسەر زارانەوە یاخود لە ڕێی نووسینی دەستاودەستەوە بەرەو وڵاتی دوور بڕوات. بەڵگەی ئەم گوتەیەشم فۆتانی هەموو شیعری ئەم تاقمە شاعیرەیە تا دەبینین لەم ڕۆژگارەدا، نەک هەر شیعریان بگرە ناویشایان لە بیران چۆتەوە. خۆ ئەگەر حاجی پاراستنێکی ناوەکی نەکردبانایە و ئەم نووسینەش بەدوا حاجیدا شوێن پێی ئەوی ئاوەدان نەکردبوویایە بێگومان هیچیان لێ نەدەپارێزرا. خولاسە گومان نیە لەوەدا کە ئەم چەند شیعرە و لەسەر کردنەوەیێکی تێیاندایە بەرهەمی ڕاستەوخۆی خوێندنەکەی حاجی قادرە لە باڵەکەتی. وەک ئەم بابەتەی «مەلکە» و هاوڕێکانی گەلێکی تریش هەن لە دیوانی حاجیدا کە ئەگەر گەشتەکەی نەکردبوویایە نەدەبوون. ئەم چەند دانەیەی خوارەوە هەندێکن لە زنجیرە ئاڵقەیێکی وەک خۆیان کە لە دیوانەکەیدا دێتە بەر چاو:

1) قەصیدەکەی «گۆڵێ» لە دەشتی لاجان.
2) بەشێکی زۆری بایەخداری بەهارییەکەی کە وەصفی ژیانی ژێر ڕەشماڵ و کۆچەری و ئاژەڵداری و ڕاو و دەشتودەری تێدایە.
3) ناوی ئەو شوێن و جێگا و هەوار و شاخ و دۆڵانەی تێیاندا ژیاوە وەیا پێیاندا ڕابردوە و لە شیعرەکانی باسی کردوون.

---

[87] «میرمێرانێ» لە بەشی دوەمی «حاجی قادری کۆیی» دا بە درێژی باس کراوە.

4) شارەزابوون بەگەلێک شێوە ئاخاوتنی نێوان هۆزەکانی کوردی کوردستانی عیراق و ئێران کەوا ناوناوە، وەک شوێن پەنجە، لە هەندێ هەڵبەستدا شەقڵی خۆی بەجێ هێشتوە:

بەدرخانی و لەسەر لاچێ لەمەوپاش

لە هەرلایێ دەتان هاڕن وەکو ئاش

دەبینین حاجی لەجیاتی «بەدرخانی تان» کە شێوە ئاخاوتنی کۆیە و سلێمانی و گەلێک جێگەی تری کوردستانی ژێرووە «بەدرخانی و» ی بەکارهێناوە کە شێوە ئاخاوتنی بەشێکی کوردی دێنشینی کوردستانی عیراق و ئێرانە بە تایبەتی ئەو ناوچانەی حاجی گەشتی تێدا کردوە.

5) جگە لەو دەنگدانەوەی گەشتەکەی لە هەندێک بەیتی دیوانەکەیدا، لە گەلێک پەراوێزە دەسنووسەکانی حاجی بەسەر کتێبی سیوطیشەوە دەنگ و صەدای گەشتەکە دەبیسترێت و دەدیترێت وەک ئەو دوو بەیتەی کە بە فارسی دایناوە لە شکایەتی غەریبی و عەزابی بەسەر حەسیرەوە نووستن و بێخەوی و برسیەتی:

یا رب بکرم بجای طاعت از من

این کوشش و این سعی دمادم بپذیر

و این گرسنگی و غربت و بیخابی

فرسودن پهلوان ببالای حسیر

وەیا ئەم چوارینەیەی[88] کوردی کە لە سەفەرێکی بەرەو «بێتووش» ی داناوە:

[88] حاجی چوارینەکەی بە مەرەکەبی ڕەش نووسیوە، لە ژێر هەر وشەیێکی قافیەکانیش واتای وشەکەی بە مەرەکەبی سوور نووسیوە، لە ئاست یەکەم وشەی قافیەکەدا نووسیویەتی «زاد» لە هی دوەم «سواک» لە هی سێیەم «صعب» لە هی چوارەم «قریة».

سەفەرێکە سەفەری ڕاهڕەوی بێتووشە
خاسەتەن ئەم سەفەری بەدئەثەری بێتووشە
بەدڕەقەی ڕێگە ئەگەر خضری نەبی بێتووشە
کافیە کافیە کوا مەنزیلی من بێتووشە

ئەم چوارینەیە لێرە بە پێشەوە جارێکیان لە گۆڤارێکی کوردی بەغدا بڵاوکراوە و زۆر هەڵەی گەورەی تێکەوتبوو وەک ئەوەی لە جێگەی «بد اثر» وشەی «بەلاش» دانرابوو، چی لێرەدا من بەرێنووسی نوێی کوردیم نووسی خوێندنەوەی ڕاست و دروستی چوارینەکەیە وەک حاجی بە دەستی خۆی لە لاپەڕەیێکی کتێبەکەی سیوطي نووسیوەتەوە بەشێوە نووسینی ئەوسای کوردی.

کە بمانەوێ بگەڕێین بەدوا شوێن پەنجەی گەشت و گەڕانەکە لەو هێندە میراتە نووسراوەی حاجی کە بۆمان ماوەتەوە، بەسەر گەلێک شتی تریشدا دەکەوین و بەدوا یەکتردا زنجیرە دەبەستن لەم نووسینەدا، بەڵام ئەوەی من مەبەستمە دۆزینەوەی تاو و تەئسیری دەروونی و مەعنەویی گەشتەکەیە لە ویژدانی حاجیدا کە دەبێتە یەکێک لە ماکە پێکهێنەرەکانی «کەسایەتی» ی حاجی، ئەو کەسایەتیەی کە کوردایەتی و نیشتیمانپەرستی ناوەڕۆکە هەرە گەورەکە و هەرە نرخدارەکەیەتی. من دەمەوێ بە پەنجەی هەست و پێزانین، لە ڕێی دەمارە مەوهوومەکانی گیانەوە سفت و سۆی ئەو دەستەچیلەیە لە بورکانی جۆش و خرۆشی جودا بکەمەوە کەوا بەر گەشت و گەڕانەکە دەکەوێت و بتوانم بڵێم ئەم کڵپەیە و ئەم بڵێسەیەماڵی حەلاڵی چیلکە و گزرەی مەعنەویی «ڕاتبێ ڕەحمەتو لێ بێ» و دەرکا و دەرک گەڕانی باڵەکەتی و بێتووش و سەردەشت و لاجان و سابڵاغ و بانەیە...

ئەم کارە هەرچەند تارماییشی وەک سەراب لەبەرچاوان بێ،کارێکی ئاسان نیە، چونکە گرتن و دەردەست کردنی شتی سەرابی مەگەر بە خەیاڵ و خەون بکرێ دەنا مەعلوومە ناکرێ خۆ دیارە نووسین و لێکۆڵینەوەش نە خەونە نە خەیاڵ.

ڕەنگە لەم خۆهێنان و بردنەی تا ئێستا کردوومە و چەندین لاپەڕەم پێ ڕەش کردەوە و فکرم بەملا و بەولادا گێڕا، لە پێشەکیەکی سەرەتایی و سەراسۆیی کردنێکی ناتەواو بە دەوری مەبەست بەولاوە چی ترم جێبەجێ نەکردبێ، بەڵام وا

دەزانم تێکڕای قسەکان زیهن ئامادە دەکەن بۆ تێوەڕامان و سرنج گرتن و خۆ دانوساندن. بەدوای ئەم ڕووپەڕانەدا خوێنەر دەزانێ لە پشت پەردەی ئەنجامە بەرچاوەکانی گەشت و گەڕانەکەدا شتی تریش هەن کە بەرهەست و بەردەست نین بەڵام ئەو بێبایەخەش نین پشتگوێ بخرێن، ئیتر دەبێ بە فکر و خەیاڵ و لێکدانەوە بۆیان بچین.

لێرە بەپێشەوە، تاڕادەییەک بەدوا ئەنجامەکانی دوشمنایەتیی شێخ نەبی و حاجی قادردا گەڕاین و ویستمان جێگەی لەبار بۆ ئەو دوشمنایەتییە لە نەفس و ویژدانی حاجیدا دیار خەین. وا بوو لە پاش پێوەخەریکبوونێکی زیهن ڕاهێنانەدا، تەواو کردنی باسەکەمان هەڵگرت بۆ جێگەیێکی مناسبتر هەر لەم نووسینەدا.

هەروەک چەند لایەنێکی ئەو دژایەتیەمان باس کرد، هەروەها هەندێک شوێن پەنجەی گەشتەکەشمان لە دیوانی حاجی و حاشیەکانی بەسەر کتێبەکەی سیوطیەوە دۆزیەوە، ماوەتەوە ئاکامە هەرە گرنگەکەی کە گوتم بەر هەستی سادە ناکەوێ. لێرەدا بەرلەوەی ڕووبەڕووی ئەو لێکۆڵینەوەیە ببین، تێبینیێکی مامناوەنجی هەیە کەوا نە زۆر بەرهەستە و نە ئەو ئاکامەیشە کە دەڵێم تەنها بە تصور دەزانرێت. ئەم تێبینییە دێتە ناو باسەوە ئەویش پاڵێک بە خەیاڵمانەوە دەنێت بۆ ناو تاریکایی و نهێنی جغز بەستوو بەدەوری مەوزوعەوە:

حاجی قادر لەم مانەوەیەی دوور و درێژ و گەشت و گەڕانی پان و بەریین لە کوردستانی ئێراندا بۆی ڕێککەوت بەچاوی خۆی شێواز و ڕێبازی فەرمانفەرمایی و حوکمڕانی دەستەودایەرەی شای عەجەمی بنەماڵەی قاجاری ببینێت و تێی بگات و لێی بپێتەوە. هەرچی جەردەیی و بێڕەحمی و زۆر و ستەمی ئەو ڕێژیمەیە هەبوو بۆ ماوەی چەندین ساڵ وەک چیرۆکی تەمسیلی لەسەر شانۆی دێ و شارەکانی کوردستانی ئێراندا لەبەر چاو و دەست و هەستی حاجی ڕۆژ بە ڕۆژ دووبارە دەبۆوە و جاربەجار نەقش بەستووتر دەبوو لە دەروونە قێز هەڵستاوەکەیدا. بەڕادەی ئاشکرابوونی ستەم و ناڕەوایی و جەردەیی کارەکانی کاربەدەستانی عەجەمی قاجاری، بێهێزی و خۆیڕیەتی و پووچەڵی و بێگەنیەتیی ڕژێمەکەش ئاشکرا دەبوو و نرخە کەمە بێبایەخەکەشی لە بەرچاوی حاجی قادردا بەرەو ئیفلاس دەڕۆیشت. من دوور نابینم یەکێک لەو هۆیە بنجیيانەی وای لە حاجی کرد حوکمی میرەکانی کورد مەدح بکات و لە مەیدانی هێرش بردنە سەر شەعبەدەدا ئەو حوکمانە بە

پێڕەویکەری شەرع و حەق دابنێت و بە مانیعی شەعبەدەیان لە قەڵەم بدات، چەپەڵیی حوکمی قاجاریەکان بووبێت کە لە تەرازووی موقارِەنەدا پاکی و پیووریتانیزمی حوکمی ئەمیرەکانی کوردی ئیسپات دەکرد چونکە گەلێک جاران بڕیاری مرۆڤ بەسەر شتێکدا لە ڕێی بەراورد کردنی ئەو شتە لەگەڵ شتی وەک خۆیدا یا بە چاک یا بە خراپی دادەنێت واتە ناشیرنیی ئەمەیان جوانیی ئەویان دەردەخات «الضد یظهر حسنة الضد».

ئەمانە بەلایەکدا، لە لاییێکی تریشەوە:

دەنگ و ناوی فارس لەبەر گوێی کوردێکی کوردستانی عێراقدا کە بۆ خۆی وڵاتەکە و جۆری حوکمەکەی نەدیتبێت وەیا لە نێزیکەوە ئاگاداری نەبێت، هەر ئەو دەنگ و ناوە خۆش و زرینگەدارە دەبێ کە لە ئەفسانە ئێسکسووکەکانی ئەسکەندەرنامە و مەلیک ئەرسەلان و شانامە و گوڵستان و بۆستان و دیوان و کتێبە ئەدەبیەکان و ناوی شاعیرە مەزنەکانی فارسییەوە هەڵدەستێتەوە و دڵ دەروونی گوێگر و خوێنەرەوە بۆ خۆی ڕادەکێشێت و بە خۆشویستنی خۆی زاخاویان دەدات. من وا دەزانم ئەم ڕاستییەیە وای لە شێخ ڕەزای تاڵەبانی کردوە کە لە نامەیێکی بۆ حاجی مەلا عەبدوڵا ئەمە بڵێ:

میرود شعر من و علم جهانگیر شما
هر دوو بی فایده تا جای اقامت رومست

واتە: شیعری من و عیلمی جیهانگیری ئێوە بە فیرِۆ دەڕۆن هەتا جێگەی نیشیمەنمان ڕۆم بێت. مەبەستیش لە ڕۆم تورکی عوسمانلییە. دیارە شێخ ڕەزا لەم بەیتەیدا وڵاتی فارسی لە نەزەردا بوە وەک جێگەی لەبار بۆ بەسەر بردن، چونکە هەموو ئەو وڵاتانەی تری مسڵمان کە لەوانە بووبن شێخ ڕەزا خەیاڵی تێدا ژیانیان لێ بکاتەوە لەبەر دەستی تورکی عوسمانلی بوە.

دیارە ئاورینگی ناو و شیعر و ئەدەبی شاعیر و ئەدیبە نەمرەکانی فارس وەک خەرمانە بە دەوری وڵاتی فارسەوە جلوەی بەستوە لەبەر چاوی تصوری شێخ ڕەزادا، لەوانە بوو ئەگەر وەک حاجی قادر تەجرەبەیێکی چەند ساڵەی زوڵم و زۆری قاجاریەکانی کردبایە شتێکی تری بە خەیاڵدا هاتبایە. هەر ئەو بێتەجرەبەییە بوو

جارێکیان شێخ ڕەزای بۆ لای مامی هێنا کۆیێ و یەکجار بە پەشیمانی گەڕاوە بۆ کەرکووک.

هەموومان، لەوانەی ئاگاداری مێژووی نێزیکی ڕۆشنبیریی کوردی عێراق و تورکیاین، دەزانین زمان و ئەدەبی فارسی بەلای ئەدیبی کوردی ئەو دوو پارچەی کوردستانەوە لە هەموو زمان و ئەدەبێک باوتر و شیرنتر و ئاشناتر بوو هەرچەند کوردەکە خۆی لە بەردەست و لەژێر تاوی تورک و زمانی تورکیشدا دەژیا. ڕێی تێدەچێ خزمایەتیی زمانی کوردی و فارسی دەخلێکی هەبووبێ لەم حەز پێ کردنەدا، بەڵام بە تەنها خزمایەتییەکە نەیدەتوانی بەسەر تاو و تەئسیری زمان و ئەدەبی تورکی فەرمانڕەوادا زاڵ بێت ئەگەر زمان و ئەدەبی فارسی خۆی لە خۆیدا لە بەر هەستی ئەدیبی کورددا شیرین و نرخدار نەبوویایە. تۆ سەیری ئەوە بکە کەوا زوربەی شیعر و نووسینی کوردەکانی عێراق نەک هەر تورکی نەبوو بەڵکوو کوردیش نەبوو، فارسی بوو.

ئەگەر خزمایەتیی کوردی لەگەڵ فارسیدا خۆی بە تەنها هۆی زاڵبوونی فارسی بوویایە بەسەر تورکیدا، دەبوو زمانە ئەسڵیەکە کە کوردییە بەسەر هەردووکاندا زاڵ بوویایە. ڕێ چۆڵ کردنی کوردی بۆ تورکی جێی سەیر پێهاتن نەدەبوو چونکە زمانی تورکی، چ قسە کردنی چ نووسینی، بەتایبەتیش نووسینی، زمانی حکومەت و هۆی گوزەران و ئامێری خوێندنی فێرگەکان و بڵاو کردنەوەی ڕۆژنامەکان و چاپەمەنیەکان بووە، لە حاڵێکدا وەک دەزانین زمانی کوردی نە نانی پەیدا کردوە نە دڵسۆزێکی دەسەڵاتداری هەبووە نە لە نێو بازاڕی ئەدەبی ڕۆژهەڵاتدا کڕیاری هەبووە، بەڵام لە ئاست فارسیدا ئەم بەهانەیەی دەسەڵات و بێدەسەڵاتی و نان پەیدا کردن و نەکردنە دەڕەوێتەوە و نایەتە حیسابەوە چونکە لە کوردستانی دەرەوەی ئێراندا فارسیش نانی پەیدا نەکردوە و پەکی ئیشانیشی لەسەر نەکەوتووە تاکوو لە نووسیندا جێ بە کوردی لەق بکات و خۆی بەسەر قەڵەمی ئەدیبانی کورددا بسەپێنێ. دیارە شیرینی و پاراویی زمان و ئەدەبی فارسی هۆی هەرە گەورەی ئەم خەریکبوونەی کوردی دەرەوەی ئێران بوە بە فارسیەوە. تەنانەت لێرەدا موقارەنەیێکی زمانی فارسی لەگەڵ یۆنانی وەیا لاتینی سەرلەنوێ ئەم بۆچوونە بەهێزتر دەکات چونکە بەکارهێنانی ئەم دوو زمانە لە لایەن غەیری میللەتەکەیانەوە لەوەوە بوە کە زمانی زانست و «منطق» و هونەر بوە، لە حاڵێکدا

بەنیسبەت کوردەوە عەرەبی زمانی زانست و ئایین بوە نەک فارسی کەچی عەرەبی ئەو برەوەی نەبوە کە فارسی هەی بوە نە لە ئەدەب نە لە ئاخاوتندا: عەرەبی زمانی ئایین و زانستەکانی مزگەوت و مەلایەتی بوە و بەس.

پەندی فارسی دەڵێ: «شنیدن کی بود مانند دیدن» واتە کەی بیستن وەک دیتن بوە! هەر بەو پێیەش تەجرەبەی حاجی لە سایەنیشینی حوکمی قاجاریی ئەو دیتنە بوە کە پەکی بیستنی خستوە و خۆی بە تەنها بۆتە هێوێنی بیروباوەڕێک کە حاجی لە بارەی ئەو حوکمەی پەیدا کردوە، شیرنی و پاراویی زمان و ئەدەبی فارسی و ئەفسانەکانیشی بوونەتە نرخێکی جوانەکی (جمالی) ی سادە و ڕووت، لە زەوق و دەروونی حاجیدا کە چ دەخلێکی نەماوە بەسەر جۆری تێوەڕامانی حاجی لە حوکمی قاجارەکان، ئەو تێوەڕامانەی کە ئەگەر دوور بە دوریی بوویایە لەوانەبوو تەم و مژێکی قودسیەتی لێ نیشتبا وەک ئەو خۆشییەی لە دەنگی دەهۆڵی دوورەوە دەکەوێتە بەر گوێی بیسەرەوە، سەرەڕای زرینگە و تریقەی ئەدەب و ئەفسانە و زمانە شیرنەکە ئەوانیش بێگومان لەلای خۆیانەوە مشتومالێکی قودسیەتەکە دەدەن، بە زیادیشەوە نەک بە کەمەوە.

دیتن و شارەزابوونی حاجی، کە تەجرەبەی شەخسین لە مەیدانی ناسینەوەی ئاکارە دزێوەکانی ستەم و زۆر و چەپەڵی کاربەدەستانی عەجەم لە سایەی حوکمی قاجارەکاندا، وەک دیتمان ئەنجامی ڕاستەوخۆی گەشتەکە بوون و سەریان کێشاوە بۆ سەر ئیفلاسی هەموو جۆرە ڕێز و باوەڕ پێ کردن و بایەخ پێدانێکی ئەو حوکمە لە دڵ و ویژدانی حاجی قادردا. ئەم ئیفلاسە مەعنەوییەی فەرمانڕەوایی و حوکمی قاجارەکان بەلای قەناعەتی حاجی قادرەوە بوو بە تەواوکەری موعادەلە گەورەکەی «ئیفلاسی حوکم» لە هەموو ڕۆژهەڵاتی ئیسلامدا لەو ڕەوەوە کەوا کەرتە گەورەکەی تری موعادەلەکە «کە عوسمانلی بێ» ئەویش وەک کەرتی عەجەمی قاجار، لەبەر چاوی حاجیدا ئیفلاسی کردبوو. عەجەم و ڕۆم کە جووتە هێزی حوکمی ئیسلام بوون لە ڕۆژهەڵاتدا بە جووتەش زاڵ بوون بەسەر چارەنووسی کورددا، بایی ئانەیێک نرخی مەعنەوییان پێوە نەمابوو لە بەر هەست و ئیدراکی حاجی قادردا.

دەزانین حاجی لە سەرەتای ژیانیەوە، ساڵەها بەر لە چوونی بۆ ژێر زەبری حوکمی قاجار، ستەمی تورکەکانی عوسمانلی دیتبوو و تێیگەیشتبوو، کە چووشە ئەستەمبۆڵ تین و تاوی بەدئەسەری ئەم ستەم و ناپەسەندییە پتر گیانی حاجی هەژاند و بەرەو

قێز لێ کردنی برد. ئەم دڕدۆنگییەی حاجی لە تورکانی عوسمانلی خۆی لە خۆیدا هاندەرێکی حاجی بوو بێ ئەوە هەستی کوردایەتی و پەرۆش بۆ مافخوراویی کورد بەدەست عوسمانلییانەوە، جارێ چ تەدەخولێکی کردبێ لە میزاجی شەخسی وەیا لە قەناعەتی حاجی هەروەک دەزانین هەستی کوردایەتی چ تەدەخولی نەبوو لە دوشمنایەتی حاجی بەرانبەر شەعبەدە و تەڵەکەبازیی لەو ڕووەوە کە ئەو بەر لەپژانی هەستی نەتەوایەتی دژی شەعبەدە بوو.

لەم گوتەیەمدا هەر لێکدانەوەی «ماددی» ناکەم بە بنگەی بۆچوونەکانم، وێڕایی لێکدانەوە هەموو کەلەپۆری حاجی قادریش کە بە ئێمە گەیشتوە دەکەم بە شایەد و بەریوان. سەرانسەری قۆناغەکانی عومری حاجی بەر لە گەیشتنی بە پلەی بیری کوردایەتی بپشکنەوە و هەموو گوتە و کردەکانی باوێژە ژێر تیشکی سرنج گرتن و وردبوونەوەوە، تاکە یەک وشە و یەک جووڵەی حاجی نادۆزریێتەوە پەنجە ڕاکێشێ بۆ ئەوەی ڕێزی لە تورکانی عوسمانلی نابێ وەیا لێیان ڕازی بووبێ، چ سەیرێکیش لەوەدا نیە چونکە ئەو حاجی قادرەی دەیناسین بە خۆی و نەفسە زلە لە خۆڕازییەکەیەوە کە شەڕی بێوچانی پێ دەکرد لەگەڵ شەعبەدە و کاری بەددا هەرگیز لێی چاوەڕوان ناکرێت سروشتی خۆی لەبیر بچێتەوە و بکەوێتە سەر باری ڕازیبوون وەیا ڕاڵیبوون لەو ستەمەی کاربەدەستانی عوسمانلی کردوویانە لە کوردستاندا بەدرێژایی ڕۆژانی حوکمڕانییان. ستەمەکەش لەوەدا نەبوە چاوی حاجی نەیدیتبێت وەیا بەرهەستی فطری حەز لە ستەم نەکردنی نەکەوتبێ. لەبەر ئەمە بێگومان حاجی قادر بە دیتن و چێشتنی تامە ناخۆشەکەی حوکمی قاجار موعادەلە دولایەنەکەی «لەبەرچاو کەوتنی جووتە حوکمی ئیسلام» ی ئەو سەردەمەی بۆ تەواو کراوە و لە هەردووکیان بێئومێد و بێزار بوە. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا کە ڕاستییێکی ئاشکرایە، بۆ ئەوەی لە هیچ هەنگاوێکی فکریماندا تەلەزگە نەبەستین پێویستە یەک دوو تێبینی کاریگەر و بە ئەنجام لە هەڵوەستی حاجی بەرانبەر بە ستەمی تورکی عوسمانلیی بێنێنە ناو لێکدانەوەوە نەوەک بۆچوونەکانمان لە واقیع بترازێن و ببنە باڵە فڕەی خەیاڵی، چونکە هەموو دوور کەوتنەوەیێک لە واقیعی ڕاستەقینە نێزیک بوونەوەیە لە وشکەمەلەی فکری:

تێبینی یەکەم کە تێکەڵ بە تێبینی دوەم دەبێتەوە، ئەوەیە کەوا حاجی قادر لە سەرەتاکانی پێگەیشتنیدا سایەنشینی حوکمی تورکان بوو نەک لە تەمەنی کامڵیدا،

چونکە وەک لە بەشی یەکەم و دووەمی ئەم نووسینە بۆمان دەرکەوت، گەشتەکەی حاجی بەرەو باڵەکەتی و کوردستانی ئێران لە دەوروبەری ساڵی 1270 ی کۆچی دەستی پێکردوە کە ئەوسا تەمەنی 30 ساڵەیی بوە. ئەم تەمەنەی حاجی قادر ئەگەر بیخەیتە بەر تیشکی ڕاستییە ناخۆشەکانی دامان بەدەستی هەژاری و بێکەسی و کولەمەرگی و خوێندنی پچڕ پچڕ و درەنگەکاتەوە، کە زورتر لەم نووسینەدا ساغ کراوەتەوە، دەردەکەوێ تەمەنەکە ئەوەندەی بەبەرەوە نەبوە لە تەجرەبەی ستەم و زۆری تورکەکان فکرەیێکی ڕوون و پوخت هەڵێنجێت و بیکات بە باوەڕێکی پتەو و مەحکەمی ئەوتۆ کە لە کردە و گوتەی ئەو دەمەیدا دووبارە ببێتەوە و تیشک بداتەوە.

هەڵێنجانی فکرە و فەلسەفە، بەلای باوەڕی منەوە، لەگەڵ کوێرەوەری و هەژاری و داماوییەوە ڕێک ناکەوێت تا ئەو ڕادەیەی چاوەڕوان بکەین لە زوێکەوە بەدەم نەدارییەوە فەلسەفە پێک بێت مەگەر مامۆستایەک لەلاوە بێت و لەو زەرفە ناخۆشەدا هەستی هەژارەکە ببزێوێت و بەرەو بیر کردنەوە و لێکدانەوەی ببات کە دەزانین ئەمە شتێکە بۆ حاجی قادری ڕوونەداوە چونکە کەسمان پێ شک نایەت لەو ڕۆژگارەدا دەرسی کۆمەڵایەتی و ڕامیاری بە حاجی گوتبێت. لە حاڵی وەهادا بەتایبەتی کە خەرمانەی قودسیەت بەدەوری ناو و عینوانی خەلافەتەوە نیگای نارِەزا و ڕەخنەگر لێڵ بکات هەر ئەوەندە چاوەڕوان دەکرێ لە یەکێکی بە سروشت نارِەزایی وەک حاجی قادر، کە گەڵاڵەی هەستی ڕق هەڵ گرتن لە دڵدا پێکەوە بنێت و خلْتەی قێز هەڵستان بنیشێتە هۆشی ونیەوە (العقل الباطن) تاکوو لە دوارِۆژدا باوەڕێکی مەحکەمی لەسەر هەڵستێنێت. ئەو هێندە دڕدۆنگییە لاشعوورییەی کە ناگاتە پێکەوەنانی باوەڕ و قەناعەت بایی ئەوەندەی کردووە نەهێڵێ ڕۆژەک لە ڕۆژان یەک وشەی لێڕازیبوون بە زاری حاجیدا بێت، لەوە گەڕێ مەدح و پێداهەڵگوتنی کردبێ، لە ئاست تورکاندا، کە ئەمەش ڕاستیەکە دەبێ بێتە ناو حیسابی هەڵوەستی حاجییەوە بەرانبەر عوسمانلییەکان بە تایبەتی کە بخرێتە بەر تیشکی تێبینی دوەمەوە، کە هەر ئێستا بەسەریدا دەکەوین.

تێبینی دوەم ئەوەیە، حاجی لە پلەی دوای بەسەرچوونی پلە سەرەتاییەکەی ژیانیشیدا بۆی ڕێک نەکەوت بە چاکی و بەتەواویی ڕوەو ڕووی زۆر و ستەمی حوکمی عوسمانلیی بێت، ئەو ڕووبەڕووبوونەوەی وەک بەردی بناغە وایە بۆ

پێکهێنانی فکره و فەلسەفە لە پێوەندییەکانی کۆمەڵایەتیدا. ئەو چەند ساڵەی حاجی خەریکی خوێندن بوو لە باڵەکەتی، بەهۆی ئەوەوە کە هەمیشە لە جێگەی دوورەدەستی دەسەڵات و ستەمی حکومەت بەسەری دەبرد لەوانە نەبوە دووچاری تەجرەبەی ڕۆژانەی تاڵ و تفتی تێک هەڵەنگوتن لەگەڵ جەندرمە و جەردەی پیاوانی حکومەتی بکات. جگە لەم لایەنەی دووربوون لە دەسەڵاتی یەکسەرە و نێزیکی حکومەت، حاجی قادر، لە دوو لایەنی تریشەوە لە زۆر و ستەمی عوسمانلییەکان چەپارە دەدرا. یەکەمیان بەهۆی ئەوەوە کە حاجی فەقێیەکی مزگەوت بوو بەعادەتیش مەلا و فەقێی مزگەوت درەنگتر لە خەڵق و جێگەی تر دەکەونە بەر زۆر و زەبر و زەنگی دەسەڵاتدارە بێڕەحمەکانی میرییەوە. دوەمیان بەهۆی ئەوەوە کە حاجی قادر خاوەنی هیچ ماڵ و حاڵ و بەرژەوەندێکی دنیایی نەبوە، وەک خەڵقی تر، زەرەر و زیانی بەرتیلدان و ماڵ داگیرکران سات بە سات هەستی بریندار بکات و بیری بۆ لای سەرچاوەی ئەم زۆر و ستەمە ببات.

کە ئەمە دەڵێم ڕووی قسەم لە حاجی قادرە نەک لە خەڵقەکەی تر کەوا، بەداخەوە، بە درێژایی مێژوویێکی بێ سەرەتا و بێ کۆتایی لە ژێر قەمچیی زۆر و ستەمی خوێش بێگانە بوون و چ ڕق و غەزەبیان لێ هەڵنەستاوەتەوە و ناڕەزامەندیێکی هەست پێکراویان دەرنەبڕیوە کەوتبێتە بەر گوێی بیسەری دواڕۆژەوە و من تۆ خەبەر و ئەسەرێکی لێبزانین مەگەر من و تۆ لە دوای نەمانیان لەسەر ڕووی کاغەز ڕق و غەزەبیان هەڵستێنین و بەگژ داگیرکەر و دەسەڵاتدار و ئاغا و خوێنمژانیانەوە بنێین. بەمەشدا نە قازانجێک بەو ستەمدیدانەی ئەزەل و ئەبەد دەگەیەنین نە چ تاکە یەک پەنجەی زۆردارێکی ئەو سەردەمانە لە خوێن دێنین نە هیچ درۆزنە ڕێگایانیش بۆ ڕزگار کردنی مەزڵوومی دواڕۆژ تەخت دەکەین. ئەوانەی لەسەر کاغەز خەریکن ڕقی مەزڵوومی دوێنێ هەڵستێنن و هەر لە سەر کاغەزیش ستەمکارەکەیان بۆ لە ئەرزی بدەن، دەبێ ئاگایان لە خۆیان بێت ئەمڕۆ خۆیان چاکە و خراپەیان پێ دەکرێ و دەتوانن زەرەر و قازانج بە مەزڵوومان بگەیەنن... هەر نەیسە.

بادانەوەی قسەم بۆ سەر حاجی قادر زێدە لە خەڵقی تری سەردەمی خۆی شتێکە بەملەوەیە هەم لەبەر ئەوەی کە نووسینەکە خەریکی حاجی قادرە و هەم لە ڕووی ئەوەوە کە هەست کردن بەستەم و لێ بەدەنگ هاتنیشی نە لەو کاتەدا کاری

تێکڕای میللەت بوو نە دوای ساڵەهای تر کە حاجی نرکەی ڕق و غەزەبی وەک هەوری بەهار دەیگرماند کەسی ئەوتۆی لە خەوی سڕبوون و حەپەسانی بێهەستییەوە ڕاپەڕاند، ئەمەش ڕاستییەکە، زۆر بەداخەوە، هێند بەرچاوە منداڵیشی لەسەر بەشەرِ نایەت تەنانەت بەشێکی یەکجار جگەرسووتاوی شیعرەکانی حاجیش چڕەدووکەڵی ئەم حەسرەتەیە بەدەست بێدەنگی و بێجووڵەیی زۆربەی میللەتەوە.

دوای ئەڵوەدای حاجی لە باڵەکایەتی بەرەو کوردستانی ئێران پێوەندی حاجی بە چاکە و خراپەی عوسمانلییانەوە بڕا. بە درێژایی ئەو ساڵانەی لەوێدا خەریکی خوێندن بوو، بە بۆنەی پێوەندی بڕانیەوە، سەرەڕای هەندێ تێبینی تر کە وردە وردە دێنە ناو نووسینەوە، ناشێ ئەو چەند ساڵانە بخەینە بەر دەمەتەقەی چەند و چۆنی بوون و نەبوونی هەڵوەستێکی تایبەتی حاجی دژی عوسمانلییەکان چونکە هەرچی هاندەری دژایەتییە لەو چەند ساڵانەدا بەدەست حاجیەوە نەماوە. کە نەختێک لە هەڵکەوتەکە وردتر بینەوە وەیا بە چاوی خەیاڵ خۆمان لە جیاتی حاجی لەو هەڵکەوتەدا دابنێین و بمانەوێ لەو جێگە و بارەدا وەک ئەو هەست بکەین و ڕق و خۆشویستنمان بجووڵێنینەوە، بە پێچەوانەی ڕق لێبوونەوە، هۆی چاوپۆشی ئەگەر نەڵێم فەرامۆشی لە ستەمی عوسمانلییەکان پێدزیلکە دەکەن بۆ ناو دڵ و دەروونمان. ئەم پێدزیلکەیە نەک هەر لە سەرێکەوە بەڵکوو لە دوو سێ سەرەوە خشکە دەکات.

یەکەم لەو ڕووەوە کە ستەمی قاجاریەکان زۆر بە ئاسایی نارەزایی کوردێکی عێراق بۆ خۆی دەدزێتەوە و ستەمی دوورەوڵاتی لە بیر دەباتەوە.

دووەم جوداوازیی مەزهەبی ئایین لەگەڵ قاجارەکاندا جارێکی تریش پەردە دەخاتە نێوان نارەزایی ئەو کوردە و عوسمانلییەکانەوە چونکە تورکەکان وەک کوردەکەی کوردستانی عیراق سوننی بوون نەک شیعە. ئەم هەست کردنە بە جوداوازیی مەزهەب لە دڵ و ویژدانی حاجی قادردا بەردەوام بوو تا کۆتایی ژیانی چونکە دواتر لە نێوان تورکان لە ئەستەمبۆڵدا کە دێت و هێرش دەباتە سەر عەجەمەکانی ئەو سەردەمە تیری «... موتعە و باوک مەوهومبوون» یان تێدەگرێت، هەڵبەت کە ئەو دوای بیست ساڵ، بەڵکی زیاتر، لە جێهێشتنی زوڵم و زۆری قاجارەکان و لە دوورایی هەزار و ئەوەندە کیلۆمەترەوە ئەو توانجەیان تێبگرێت دیارە لە کاتی دراوسێیی و سایەنشینییاندا پتر دەربەستی جودایی مەزهەب بوە هەم لەبەر کەڵە

کردنی ڕقبوونەوە لە قاجارەکان هەم لەبەر کەمتربوونەوەی هەستی نەیار و نەریتی بەرانبەر عوسمانلییەکان.

سێیەم بزووتنەوەی سۆزی غەریبی بۆ کوردستانی عیراق کەم و زۆر تارمایی لێبوردنێکی بەسەر حاکمی وڵاتەکەشدا کێشاوە بەتایبەتی کە لەبەر تیشکی خاڵی یەکەم و دوەمدا سەیری غەریبیەکە بکرێت، ئەو تێبینیەش بهێنێتەوە یادمان کە حاجی لە هەموو ڕۆژگاری پێش ئاوارەبوونی بەرەو تورکیا هیچی لێنەبیستراوە دژی عوسمانلییەکان لە حاڵێکدا ئەو لە کاتی خەریکبوونی بە «سیوطي» و خوێندنی مەلایانە لە دیوی ئێراندا بە نووسین و شیعر دژایەتیی خۆی بەرانبەر شای عەجەم و چاپی عەجەم و کاربەدەستانی عەجەم دەربڕیوە. نموونەی ئەم دژایەتیانە لە پەراوێزی «سیوطي» دا زۆر بەرچاوە.

ئەم ڕاستیانە وادەکەن سەرلەبەری ساڵەکانی خوێندنی حاجی لە کوردستانی ئێراندا لە دەفتەری دژوەستانی بەرانبەر تورکی عوسمانلیی بسڕێنەوە، چونکە وەک دیتمان کاری پێچەوانەیان کردوە پشتەو دژایەتی نەک بەرەو تیژ کردن.

پاش بەسەرچوونی دوو پلەی سەرەتای ژیان و گەشتی نۆ ساڵەی خوێندن لە کوردستانی عیراق و کوردستانی ئێراندا، دەمێنێتەوە ئەو ماوە کورتیلەیەی دوای خوێندن کە حاجی لە کۆیەی ڕابوارد بەر لە چوونی بۆ ئەستەمبۆڵ. وا دەزانم لێرە بە پێشەوە دوو لایەنی هەرە گرنگی ئەم ماوەیەمان ڕوون کردەوە یەکەمیان کورتبوونی ماوەکە بوو، کە دەرکەوت نابیّ لە دوو ساڵان پتر بووبێت، دوەمیان تەنگەتاوبوونی حاجی بوو لەو ماوەیەدا بەدەست تەنگوچەڵەمە و گیروگرفتی یەکجار سەخت و کوشندەوە کە ئەمیشیان وەک ماوە کورتییەکە هەنگاوی حاجی بەرەو پێکهێنانی فەلسەفەی دوشمنایەتیی داگیرکەر کورت دەکەنەوە، با لەوە هەر بگەڕێین ئایا لەو دەمەدا ئیمکان هەبوو بیری حاجی وەیا غەیری حاجی لە جێگەی وەک کۆیەدا بۆ بەدیلی حوکمی عوسمانلیی بڕوات؟

بەدیلەکە چیە؟ پێی ناویّ لێرەدا ئەو شتانە دووبارە بکەمەوە کە پێشتر لێیان بووبوومەوە، بەڵام شتێکی تازە هەیە لە تێکڕای تابلۆی هەڵوەستی حاجی بەرانبەر حوکمی عوسمانلی کە ئەویش تا ڕادەیەک نیگای بینەر و لێکۆڵەرەوە ڕووناکتر دەکات بەسەر دیمەنێکی پتر ڕوونکرایەوەدا. تازەیی ئەو شتە لەوەدایە کە تا ئێستا

نەهاتۆتە ناو حیسابانەوە نە ئەوەی من کردومە نە ئەوەی بەر لە منیش خەڵقی تر کردوەتی هەرچەند شتەکە بۆ خۆی کردەوەی حاجی قادرە واتە زادەی سەردەمێکی بەر لە صەد ساڵ پترە و چەندین جاریش بەسەر زار و زمان و قەڵەمی من و غەیری مندا هاتوە و دێت، شتە تازەکە بریتییە لەوە کە ئەگەر حاجی قادر فەلسەفەیەکی خەست و خۆڵی دژایەتی داگیرکەر لە دڵ و مێشکیدا جێگیر بوویایە وەها بە ڕاشکاوی و یەکسەرە ئەڵوەدای لە نیشتیمان نەدەکرد بەرەو ئەو شوێنەی ڕقی هەرە گەورەی لەوە. بەڵێ وا دەبێ مرۆڤ بە نیازی تایبەتیەوە دەچێ بۆ جێگەیێک کەوا نەک هەر ڕقی لێهەڵگرتوە بەڵکوو لەوانەیە مردنیشی بەرەنگار بێت لەو جێگەیەدا، بەڵام ئەم مەبەستە لە بار و حاڵی حاجی قادردا نە هەبوە و نە بە دەسکردیش هەڵدەبەسترێ چونکە ئەو لاپەڕە شرایەوانەی کە تا ئێستا لە دەفتەری بەسەرهاتی حاجی هەڵدرانەوە، هەر لە ڕۆژی هاتنە دنیایەوە تا ئەو ڕۆژەی بەرەو تورکیا ڕۆیی، بۆرایی تاکە یەک ئیحتیمالی هەبوونی ئەو تەرزە مەبەستەش ناخوێننەوە. حاجی قادری هەژاری بێ دەرەتانی ئاوارەی بێ هەموو شتێک کە ژیانی کولەمەرگی پتر گیروگرفتی بەسەر دەبرد، کەی پەرژاوەتە سەر هەڵ گرتنی نیازی تایبەتی لە دڵی خۆیدا کە جێگۆڕکێی پێ بکات و ڕایگوێزێت بەرەو ماڵی ئەو میللەتە و دەستە و تاقمەی کە وڵاتی لێ داگیر کردوە!

ئێمە ئەگەر لەو بارە کز و پەژارە و سەغڵەتەی حاجی قادردا تارماییبوونی مەبەستی تایبەتی بە دڵی خۆماندا بێنین لە ئاست چوونی بۆ ئەستەمبۆڵ، خۆمان لە هەڵوێستێکی وەهادا لەرزۆک دادەنێین کە نەهێڵێ هەست بە ڕاستی و هەڵەیی شتان بکەین و هەمیشە ئامادەبین ڕەش و سپی تێکەڵ بە یەکتر بکەین وەیا یەک حوکم بەسەر دوو شتی پێچەوانەدا بدەین. بوونی مەبەستی وەها گرنگ لە حاڵ و وەزعی وەها بێهێزدا نەک هەر لەبەر مومکین نەبوون دەپووچیتەوە و لە حیسابان دەردەهاوێژرێت. سەرەڕای مومکین نەبوون کە خۆی هۆیەکی قەتعیە لە موناقەشەدا لێکدانەوەی جۆرجۆری تریش هەر دەیپووچێنێتەوە. یەکێک لەو لێکدانەوانە ئەوەیە کە ئەگەر حاجی مەبەستێکی وەهای هەبوویایە دەبوو پێشتر هەڵوەستێک وەیا هەڵبەستێک وەیا گوتەیێکی لێ زانرابایە دژی تورکی عوسمانلیی ببێتە ئەو نیشانەیەی کە لە دوارۆژدا مەبەستەکەی پێبناسینەوە وەیا حیسابێکی بۆ بکەین.

جگە لەم لێکدانەوەیە هی تریش هەن کە پێویست نابینم ڕووپەڕەی دەفتەرانیان پێ پڕ بکەینەوە، لەبەر بێهێزیی ئیحتیمالی هەبوونی مەبەسێکی وەها گرنگ و نهێنی.

تێکڕای ئەم لێکۆڵینەوەیە ئەوە دەسەپێنێ کە حاجی قادر لە هەموو ژیانی پێش چوونی تورکیا گەر ئەوەندە ماوەیەی لە پێکهێنانی فەلسەفەی دژایەتی بێگانەی داگیرکەر بڕی بوو کە مەنعی بکا لە پێدا هەڵگوتنی و خۆتێهەڵسوونی لە حاڵێکدا دەزانین زۆر لە پیاوانی کورد و عەرەب و تورک و میللەتانی تریش بە شانازییەوە مەدحی خەلیفەیان دەکرد و ئەوەی مسڵمان بوون، بە جێنشینی پێغەمبەریان دادەنا. بەلای منەوە، بەلای واقعیشەوە، ئەوەندە لاتەریکیەی حاجی لە هەرچی تورکە و عوسمانلییە، دەگونجێ لەگەڵ حاڵ و باری حاجی، چ ماددی بێ چ نەفسیی بێ، لەهەمان کاتیشدا ڕێک دێت لەگەڵ هەڵوەستی دواتریدا کە دژایەتی و دوشمنایەتیی ڕووبەڕوو و پاتەوپاتە لەو قۆناغەدا کە پێکهاتنی فکرەی کوردایەتی لای حاجی قادر بوو بە ڕووداوێکی مومکین بەڵکوو چاوەڕوان کراویش. ڕێک هاتنەکەش لەوەوە دێت کە یەک وشە و یەک هەڵوەستی حاجی قادر لەو قۆناغە بە پێشەوە بێنی دۆستخوایی عووسمانلییانی لێ نایەت تاکوو لە دوارۆژدا دژایەتیەکەی بە پاشەکشە حیساب بکرێت. هەڵکشانی لە لاتەریکی و دوورەپارێزیی سادەوە بەرەو دوشمنایەتی و ناحەزیی ئاشکراوە ڕەوتێکی ئاسایی و بێگرفتە چونکە لە هەموو ژیانیدا هەڵوەستێکی وەیا قسەیێکی نەبوە بەرانبەر تورکی عوسمانلیی تارمایی ڕەزامەندیی وەیا دۆستایەتیی تێدا بووبێت.

لەم نمایشتە دوور و درێژەی ئاکامەکانی گەشتەکەی خوێندنی حاجی، بەشێکی تین و تاوی گەشتەکە بۆ ناو نەفس و و یژدانی حاجی ڕوون بۆتەوە کە دواتریش بە دیار دەکەوێت، بەڵام ئەوەی ڕاستی بێ هیچ یەکێک لەو ئاکامانە ئەو تین و تاوە مەعنەوییە نیە کە من لە ناخی دڵمدا، وەک حاجی و لە جیاتی ئەو هەستی پێ دەکەم و ڕێی دەربڕینی نادۆزمەوە. ئەو ئاکامەی کە من بە دیاری هەرەگەورەی گەشت و گەڕانەکەی دەزانم بۆ حاجی قادر شتێکە تێکەڵ بە گەرمایی خوێن و فرکەی دەمار و لێدانی دڵ و تەوژمی عاتیفەی حاجی، کە لە حاجی ناپچڕێنەوە و دەبنە بەشێک لە بوونی. هەرچەند ناتوانم بە شێوەیەکی خۆڕوونکەرەوە ئەو بەشدارییە دەروونییە قووڵ و نهێنیەی گەشتەکە لە ویژدانی حاجیدا بێنمە بەر هەڵمەت و شاڵاوی خامەیێکی نەخشەکێشەوە، دیسانەوە بایەخی ئەو بەشدارییەیە،

نەک شەرمی هەڵاتن و کوردەغیرەتییە، کەوا پاڵم پێوە دەنێ ئەوداڵی وەدەست هێنانی تین و تاو و تەئسیرە نەفسییەکەی ببم لە دەروونی حاجیدا. هەرچەند دەشزانم شتی مەعنەویی و نەفسیی ناکەوێتە بەر دەست و ناو پەنجانیشەوە بە تایبەتی کە هەرچی هەیە لە بەسەرهات و کات و مرۆڤ و دەوروبەر و قارەمانانی سەر شانۆی چیرۆک و، بگرە زۆر پارچەی شانۆی تەمسیل کردنی ئەو بەسەرهاتەش کە هەندێ مەڵبەندی کوردستانە، بەسەرچوون و لە ڕووپەڕەی وجود سڕاونەتەوە تەنها شتێکی لەوان مابێتەوە چەند شوێنپێیەکی حاجییە کە لە دیوانەکەیدا وەک شوێنپێی ڕێبوار بەجێماوە، لەگەڵ وێنەی خەیاڵی پچڕپچڕی چیرۆکەکە لەسەر پەردەی مێشکی تاک تاکە سرنجگری وەک من... من مردووی صەد ساڵە لە کفنی مێژوو دەردێنمەوە و تێوەی ڕادەمێنم بەڵکوو بیناسمەوە...

من بە چاوی خەیاڵ و هەستی دەروونمدا دەزانم و دەبینم هەمان نەسرەوتنی سەردەمی فەقێیەتی و گەشتی خوێندنەکەی کە نۆ ساڵانی بە شار و دێ و دەشت و هەوار و شاخ و داخ و کەند و لەندی باڵەکەتی و کوردستانی ئێراندا گێڕا، بێ ئەوەی تارمایی ئۆقرە گرتن و دابینبوون بە ئاسۆی ڕۆژەک لە ڕۆژانی ئەو نۆ ساڵانەدا ڕابرێ، بەڵێ هەر هەمان نەسرەوتنە، دوای بەسەرچوونی گەشتەکە، حاجی قادر دەکا بە دانەتۆپی قەدەر و لە لوولەی تەنگوچەڵەمە و نەداری و هەژاریی ژیانی کۆیەوەی بەرێ دەکا بەرەو ئەو چارەنووسە، کە وێرای نەسرەوتن و بێ ئۆقرەیی، دەبێتە دەستەچیلە و گڕ و گڵپە و هەڵپە و سۆز و سەودا و ئاگر تێ بەربوون. من لەو چارەنووسە بڵێسەدارەی پلەی دوایی تەمەنی حاجی قادر هەست بە نەبزی گەشت و گەڕانەکە دەکەم بایی ئەوەی گەرمایی ئاگر لە ئاوی ناو سەماوەردا تین دەداتەوە وەیا ڕۆشنایی ڕۆژی پشت ئاسۆی خۆراوا دەبێتە خەنەبەندانی ئێوارە. حاجی قادری بێ گەشت و گەڕان و غەریبایەتی نۆساڵەی خوێندنی مزگەوت هەرگیز نابێتە حاجی قادری بورکانی کوردایەتی.

تۆ بێنە بە خەیاڵ ئەم گەشتە بەردەوامە لە نەخشەی بەسەرهاتی حاجی بسڕەوە و جبە و عەمامێکی دامەزران و سرەوتن لە گۆشەی مزگەوتێکدا بەسەر و شانی حاجی بدروو، وەیا حاجی هەڵقوتێنە بە دیار ماڵی عەتاری و بەقاڵیی لە دوکانێکی بازاڕی هەولێر و کەرکووکدا وەیا بیخولێنەوە بە دەوری خەلە و خەرمانی گۆڕقەرەج و ئۆمەرگونبەتدا وەیا دووچاری هەر جۆرێکی تری کولەمەرگی گوزەرانی دەکەی بکە

و پێم بڵێ کوا حاجی قادری نەمری پەیامدەری کوردایەتی، ڕابەری بیری ڕوون و قاڵبوویەوەی نیشتیمانپەروەری، هاندەری میللەتی بێجووڵە، قەڵەمی تیژی هەڵمەت بردن، زمانی بڕندەی پاراستنی مافی نەتەوایەتی، حاجیەکەی:

به شیر و خامە دەوڵەت پایەدارە
ئەمن خامەم هەیە شیر نادیارە

کوا ئەم حاجی قادرە؟

بە لەناوچوونی گەشتی خوێندنی نەک هەر چیلکەی ئاگر خۆشکەرەوەی دەروونی حاجی دادەمرکێت و بەس، بەو لەناوچوونە هەموو پردێکی پێوەندی لە نێوان حاجی قادری ئازا و بزۆز و خورت و لەخۆڕازیی تەمەنی سی ساڵەیی و حاجی قادری دەستەویەخەی شێخ نەبی و حاجی قادری ئاوارەکەی ئەستەمبۆڵ و جەهەنەمەکەی سووتان بۆ کورد و کوردستان لە خۆوە دەڕمێ و دەبێتە ئەو بەتاڵاییەی کە کەس بە ئەنباز لێی ناپەڕێتەوە.

نامەوێ خوێنەر بەوەندە نرخەی من لە نووسینەکەمدا بە گەشتەکەم بەخشیووە ڕازی بێت چونکە بەڕاستی هەموو نووسینەکە دەوری شتێک دەدات کە لە دڵدا هەستی پێدەکرێت و بە تصور تارماییەکەی دەدیترێت بەڵام ناگیرێت و ناخرێتە ناو چارچێوەی تەعبیرەوە. پێش من «گۆران» گوتوەتی:

هەرچەند دەکەم ئەو خەیاڵەی پێی مەستم
بۆم ناچێتە ناو چارچێوەی هەڵبەستم[89]

من لەم هەوڵەمدا دەڵێی ئەو کەسەم نووسینی ناو دەفتەرێکی دوور دەخوێنێتەوە کە پیت و وشەکانی لە یەکتەر جودا ناکرێنەوە، وەیا ئەو کەسەی حیکایەتی

[89] ئەم بەیتەم لە بیر کردنەوەی خۆمەوە نووسی، ڕەنگە هەندێک جودایی هەبێ لەگەڵ ئەسڵەکەی وەک ئەوەی «گۆران» گوتبێتی «ئەکەم» لەجیاتی «دەکەم».

حیکایەتخونێک دەگێڕێتەوە کە بەحاڵ دەنگەکەی دەبیسترێت وەیا... وەیا کە هیچ کامێکیان جەرگەی ڕاستی ناپێکن و باوەش بە سەرلەبەری مەبەستدا ناگرن.

گەشتەکەی حاجی تەلێکی زرینگەدارە لە ناو ئامرازە مۆسیقاییەکانی سیمفۆنی شۆڕشی دڵ و دەروونە پڕ ئاهەنگەکەی بورکان و تەقینەوە و هەڵچوون.

## لەبەرچی حاجی قادر کۆیەی جێ هێشت؟

ئەم سەرەباسە، بەڕواڵەت، هەر دەڵێی لێرەدا بێلزوم خۆی دووبارە و سێبارە دەکاتەوە چونکە لەوەی تا ئێستا نووسراوە، تۆژینەوەی دوور و قووڵ و ورد کراوە لە سنوورکیشان بە دەوری مەودای قۆناغە ناوەندییەکەی ژیانی حاجی کە دەکەوێتە دوای گەشتەکەی خوێندنی و مەوداکەش بە دوو ساڵێک دانرا، هەموو ئەو هۆیە بەرچاوانە و نهێنیانەش کە خێراییان کردوە لەو ئەڵوەدایە یەکجارەکییەی حاجی خرانە سەر خوانی لێکۆڵینەوە، هەر لەو بەینەشدا بەپێی داخوازی ڕوون کردنەوە لاباسی سەربە باسە ئەسڵییەکە و ئەو بەڵگانە و لێکدانەوانەی کە وێنەی پچڕپچڕی Jigsaw ەکەی مەتەڵ هەڵێنان و نهێنی دۆزینەوەی دەوروبەر و دڵ و دەروون و بەسەرهاتی حاجی دەخەنەوە سەریەک و تابلۆی مەفهومیان لێ پێک دێنن هەموویان بەوپەڕی هەناسە درێژییەوە لێیان کۆڵراوەتەوە کە لە زیمندا باسی ئەوەش دەکەن ئایا حاجی بۆچی لە کۆیە دەرچوو و ئاوارە بوو. کە ئەمە وا بێ ئیتر بۆ خاتری بەسەر خستنەوەی کام نهێنی نوێ لە بنی گۆمی نەزانراوییەوە تێهەڵچینەوە لەوەی تازە بە ماندوبوونێکی زۆر لێی بووینەوە؟

هیچ تێشویەکی سەفەرمان بۆ دوارۆژ هەڵگرتبوو کە لە قۆناغێکی حەسانەوەدا بیخەینە سەر سفرەی نووسین و ناو لەوەڕگەی قەڵەم؟ یاخود تۆ بڵێی پەشێمان ببینەوە لە بڕیار و ئاکامی ئەو لێکۆڵینەوانە و بەیەکتر گرتنانە و لێکدانەوانەی وەک کاری زانای ئاسار و پسپۆڕی ئاو دۆزینەوە و شون هەڵ گرتن وا بوون؟ چ ڕێگەی نادیار ماوەی ڕووی خۆمانی بۆ وەرگێڕین و لێوەی بڕۆین بەرەو ئامانجێکی باس لێ نەکراوەوە؟ چی ڕێگەی نادیار ماوە ڕووی خۆمانی بۆ وەرگێڕین و لێوەی بڕۆین بەرەو ئامانجێکی باس لێ نەکراوەوە؟ چی ماوە نەکرابێ و نەگوترابێ وەیا هەڵنەکێشرابێ و نەپێورابێ؟

ئەوەی ڕاستی بێ، لە بن سێبەری سەرەباسی سەرەوەدا هەناسەیێکی ئەوتۆ بە
نووسینەکە هەڵدەهێنین کە ببێتە پشووی کۆ کردنەوەی تین و تاقەتی تەکانێکی
نوێی بەرەو پێش چوون بێ ئەوە چ نیازی ئامانجگۆڕیی لەو پشوەدا هەبێت چونکە
وەک بە هەموو باوەڕێکمەوە گوتومە، بەدڵمدا نایەت گۆڕینی ئەنجامی ئەو
لێکدانەوانەی کە لەم نووسینەدا ڕێبازی تۆژینەوەیان ڕووناک کردۆتەوە
لە دەسەڵاتی هیچ پشکنینەوە و لێکۆڵینەوەییێکی تر هەبێ بە مەرجێک هەر ئەوەندە
کەرستەیە هەبێ کە لە بەر دەستی مندا هەبوە.

ئەگەر خوێنەر ئەو خولقە درێژەی لابێ بە وردی لێکدانەوەکان باوێتە بەر سرنجی
خۆیەوە، ئەویش وەک من دەگاتە ئەو ئاکامانەی من لە نووسینەکەمدا پێیان
گەیشتوم چونکە هەر ئەمانە هەن لەگەڵ یەکتردا ڕێک بکەون و لەگەڵ زروف و
باری حاجیشدا بگونجێن. کە ئەمە وابێ دیارە گۆشەنیگای تازە و بابەتی قسە
لێنەکراو کە ئەوانیش درێژەکێشان و پێداویستی لێکدانەوەکانی لێرە بە پێشەوە
دەبن، ئەم سەرەباسە وەک سایەبان بەسەر خۆیانەوە دەگرن.

دەسا بابزانین لەبەر چی حاجی قادر کۆیەی بەجێ هێشت؟

وا دەبێ خەبەر و دەنگوباسێک باو دەسێنێت و لەسەر زاروزمانان خۆش دێت و
بەڕاست دەزانرێت کەچی زۆر و کەم پێوەندی بە ڕاستییەوە نیە. هەندێ جاریش
ڕاستییەکە بە جۆرێک لە ژێر هەڵبەستراودا سورگوم دەبێت هەر دەڵێی لە
مندالّدانی زەمانە نەگووراوە و نەڕسکاوە.

یەکێک لەو خەبەرە پەرەسەندووە درۆزنانە، چۆنیەتی و هۆی دەرچوونی حاجی قادرە
لە کۆیێ بەرەو ئەستەمبوڵ. گۆیا حاجی قادر لە ترسی زۆر و ستەمی شێخ نەبی
ماوێلی بە ڕەفاقەتی کەیفی جوانڕۆیی، بۆ دەرباز کردنی خۆی لە کوشتن، کۆیەی
تەرک کرد و ڕووەو تورکیا ڕۆیی. لێرەدا هەرچەند سەرەداوێکم بەدەستەوە نیە
بمگەیەنێ بە سەرەکەی تری خەبەرەکە تابزانم هەوەڵ جار لە چ زارێکەوە
کەوتۆتەوە و بەناو زاراندا بڵاوبۆتەوە، لەگەڵ ئەمەشدا دەتوانم بەهەست و زانینی
عادەتیم بنیچەی خەبەرەکە بدۆزمەوە:

سەرەڕای دوشمنایەتیە زۆر مەشوورەکەی نێوان حاجی قادر و شێخ نەبی کە بەبەریەوە هەیە ببێتە زەمینەی شت لەسەر هەڵبەستن مەیلێکی ئاشکراش لەو هەڵبەستنەدا بۆ ڕێکخستنی هەڵوەستی تراجیدیی شانۆگەرانە خۆی تێکەڵ بە ڕووداو کردوە و دیمەنێکی هەستبزوێنی دروست کردوە کە تام و ڕەنگێکی تایبەتیش بە ڕۆیشتی حاجی بدات و تامەزرۆیی خەڵقیش بۆ دەنگ و صەدا و خەبەری بە هاتوبات بشکێنێت.

ئەو کەسەی خەبەرەکەی هەڵبەستوە، وەک زۆربەی خەلق، حەزی بەوە کردوە لەم ڕووداوە گرنگەی دەرچوونی حاجی لە کۆیێ سەرگوزەشتی دەرچوونی ئادەم لە بەهەشت دووبارە بکاتەوە بەڵام ئەم جارەیان بێ حەوا، لە جێگەی شەیتانیش شێخ نەبی. تۆ بڵێی ئەم حیکایەتە چەندی ڕاستە و چەندی درۆ؟ شێخ نەبی ماوێلی پیاوێکی بەفەندوفێڵ و عەوامخەڵەتێن بوە لە مەدا گومان نیە. شێخی ماوێلی هێز و تواناییێکی بەرچاوی پەیدا کردوە و ئامادە بوە بە هەموو چەکێکی لەسەر خۆ کردنەوە و هەڵمەت بردن دەسەڵاتەکەی بپارێزێت لەمەشدا گومان نیە.

حاجی قادر پیاوێکی ئازا و حەقپەرست و هێرشبەر بوە و لە ئاست قەناعەتی خۆیدا گوێی نەداوەتە خوتخوتەی کۆمە کردن و دوودڵی. ئەمەش ڕاستە و دروستە. بەیەکدی کەوتنەوەی ئەم دوو تەناقوزە لە شوێنێکی وەک کۆیەدا کە هەموو ڕۆژێ خەڵق تێیدا ڕووەوڕووی یەکتر دەبنەوە ئەویش ڕووداوێکی چاوەڕوان کراوە، گومان لێ نەکراویشە چونکە جووتە بەڵگەی شیعری حاجی قادر و گوتەی دەماودەم ئەم بەیەکدی کەوتنەوەیە دەسەلمێنن، تەنانەت سەرچاوەیێکی نووسراوی وەک نامیلکەکەی مەلا عەبدولڕەحمانی[90] خزمی حاجیش بایەخی زۆری بە دوشمنایەتیەکەیان داوە، منیش لەم نووسینەدا بە درێژی باسم کردوە. بەڵام ئایا ڕاستبوونی ئەم خاڵانەی سەرەوە ڕاستەوخۆ دەبنە هۆی ئاوارەبوونی حاجی قادر؟ بەدەست زوڵمی شێخ نەبییەوە؟ لە ترسی کوشتن؟ تۆ بڵی ئەو حاج قادرەی دەیناسین ڕەفتارێکی وەها بکات دژی سروشتی خۆی بێت و مەیلی ناحەزەکەشی بهێنێتە جێ؟

---

[90] لە بەرەو دوای بەرگی دوەمی ئەم نووسینەدا چاپ کراوە.

ئەو خەبەرە مەشوورەی باسمان کرد، حاجی قادر و کەیفی جوانرۆیی بەیەکەوە لە کۆیێ ڕووەو ئەستەمبۆڵ دەکات. بەڕاستی ئەم کۆ کردنەوەیەش مەیلێکی شانۆگەریی بە حیکایەتخونەکەی کردوە چونکە زرینگەی سەرگوزەشتی دوو قارەمانی ئاوارە و برادەر ڕێگەی غەریبی بگرنە بەر پتر لەبەر گوێیان دەنگ دەداتەوە، ستەمی ستەمکارەکەش بێئەمانتر نیشان دەدات لەوەی تاکە یەک قارەمانی دەربەدەر کردبێت.

لێرە بە پێشەوە، چ لەم نووسینە و چ لە نووسینی دیکەم بووبێت، بە ئیسپات گەیشتوە کە وا کەیفی جوانرۆیی نە لەگەڵ حاجی قادردا ڕۆیشتوە نە ڕۆیشتنەکەشی چ دەخلێکی نێزیک و دووری بەسەر شێخی ماویلییەوە هەبوە. بەداخەوە هەر وەک حاجی قادر بە خۆڕایی لە نەزەر خەڵقدا کرا بە دەربەدەر و ئاوارەی ترس و ستەمی شێخ نەبی، ڕەفاقەتەکەی کەیفیش لەگەڵ حاجی لەم ئاوارەبوونەدا هەمان شوێنی غەڵەتی لە مێشکی مەردمدا گرتەوە[91] بە ڕادەیێک خۆم گوێم لە چیرۆکێکی تەمسیلی بوو بەر لە بیست ساڵێک لە بەشی کوردی ڕادیۆی بەغدادا بڵاو دەکرایەوە، سەرگوزەشتی ئاوارەبوونی حاجی قادر و کەیفی بەم شێوەیەی کە لێرەدا ڕەخنەی لێ دەگرم و بە درۆی دەخەمەوە دەخستەبەر گوێی گوێگرانەوە.

نەخشەی باری ماددی و گیانی و نەفسی حاجی قادر لە پلەی دوای گەشت و گەڕانی خوێندنی فەقێیەتی لە هەموو سوچێکەوە بەو درێژپێوییەی کە لە دەسەڵاتدا بێت لەم نووسینەدا کێشراوە و باوەڕام نیە چی ئەوتۆی تری بە بەرەوە مابێت بۆ سرنجێکی وردتر و بەردەوامتر، هەرچەند درێژەی هەندێ شتانم بەلاوە ناوە کە دەزانم نەهێنانە ناوی زەرەری بە تەواویی باسەکە نەگەیاندوە. لەم نەخشەکێشانەدا دەوری زۆر و ستەمی شێخی ماوێلی جێگەی ڕاستەقینە و بارستی حەقیقەیی خۆی پێدراوە لە نێوان ئەو هۆیانەی کە دەوریان هەبوە لە بەسەرهاتی ئاوارەبوونی حاجی قادردا. ئێستا جارێکی تریش بەدەم لێکۆڵینەوەکەی سەربەخۆ و یەکسەرەی ئەو بەسەرهاتەی دەرچوونی حاجی لە کۆیێ وەرامی هەندێک پرسیار دەدەمەوە لە

---

[91] لە کاتی پاکنووس کردنی ئەم باسە بۆ چاپ کردن، لە کۆتاییەکانی مانگی شباطی 1976 هەمان حیکایەتە غەڵەتەکە لە بڵاو کردنەوەیەکی ڕادیۆی کرماشان بە کوردی پێشکەش بە گوێگرانی کورد کرایەوە.

بارەی باسەکەوە پتریش تاریکی دەرەوێنمەوە لە دەوری، وەک دەشبینی ئەو پرسیارانە لە خۆیانەوە نایەنە بەر زیهن و نیگای ڕێبواری بە پەلە و کەمتەرخەم تاکوو ڕاستەوخۆ و بێ ئاگادارکەرەوە بکەوێتە سەر جواب دانەوەیان وەیا تاریکیی ڕەوەندنەوە بە دەوری باسەکەوە.

وەک لێرە بەدواوە بۆت ڕوون دەکەمەوە، ئەم شی کردنەوەیە و گرێ ڕەواندنەوە و وەرامدانەوەیە هیچیان ئەو تروسکەیان نیە لە خۆیانەوە نیگای مرۆڤ ڕاکێشن، بە پێچەوانە، ئەوانیش وەک زوربەی پرسیارەکانی بەسەرهات و حاڵ و باری حاجی قادر بە سەیر کردنی موقلاش و زەڕڕەبین نەبێ نادیترێن. سەرەڕای نەدیترانیان هۆی ئەوتۆش هەیە لە زاهیری حاڵدا مرۆڤی عادەتی دڵی خۆی پێ دابین کات لە ئاست ئەم ئاوارەبوونەی حاجی کە ئیتر پێویستێک نەهێڵێت بۆ دۆزینەوەی هۆی بەڕواڵەت مەوهوم، وەک ئەو هۆیە زاهیر خەڵەتێنەی کە گوتم کرایە بنگەی چیرۆکی تەمسیلی و لە ئیستگەی ڕادیۆشەوە زۆر بە شانازییەوە بڵاو کرایەوە، کەسیش ڕەخنەی لێ نەگرت بگرە کەس نەبوو پێی خۆش نەبێت: حاجی قادری حەقپەرستە و لە لایەن ستەمکارەوە ئاوارە دەکرێت و وەک تۆپی یاری بۆ غەریبی یەکجاری تورِ هەڵدەدرێت...

تابلێی خەبەریکی سادە و بێگرفت و یەکجار ئاسایی و چاوەڕوانکراویشە کە دەزانین گەلێک ڕووداوی وەک ئەو لە پزدانی ڕۆژگار کەوتۆتە کۆشی مێژووەوە ئیتر چی ترمان لە گێڕانەوەی دەماودەم بوێ هێندە لە زاران خۆش و لە قەناعەت نێزێک و عادەتیی. بە ڕاستی کارێکی تابلێی ئەستەمە بێنی خەبەرێکی لە زاران خۆش هاتوی پەرەسەندووی لە قەناعەت نێزیک و عادەتی بسرِیتەوە و یەکێکی تری لە جێگەدا دانێیت مەگەر بە ئەرکێکی قورس و بە ئیسپاتی بێگومان. بەڵام لێرەدا، خۆ و بەخت، شتێکی گرنگ و ئێسک سووکیش یارمەتیم دەدات بۆ ئاسان کردنی ئەم زەحمەتییە. ئەو هۆیەی من بە هەویام بیکەم بە جێگری هۆیە مەشوورەکەی ترس و ستەمی شێخ نەبی، ئەویش عادەتی و لە قەناعەت نێزیک و بگرە لەسەر زارانیش خۆش هاتوو دەبێت ئەگەر گوێگر بە هەموو دڵیەوە هۆشی خۆی بداتێ. لەمەش بترازێ بۆچوونەکەی منیش هەمان حەقپەرستی و خۆ بەخت کردنی حاجی قادر دەگێڕێتەوە کە لە خەبەرە درۆزنە خۆشکەڵانەکەدا دەبیسترێت، گەلێک لەویش زیاتر ئەم خەسڵەتە بەرزانەی حاجی بەرەو قووڵایی و ڕەسەنی و زگماکی و

نەمرییەوە دەبات، لە هەمان کاتیشدا تێکڕای ڕووداو و زەرفی تێدا پەیدابوون و هەموو دەوروبەرێکی دەخاتەوە پەراوێزی ڕاستی و مێژووەوە چ مەیل و ئارەزۆی شانۆگەرانە و چیرۆکسازیشی تێدا نیە کە لەلاوە ڕەنگ و دەنگ و تیشک بۆ سەر شانۆکە بخوازێتەوە.

وەک دەشبینیت گرتنەبەری کاری وەها زۆر لایەن کە بیەوێ ڕۆژگارێکی ڕابردوو بە ڕووداو و تاک و زەرفی مێژوویی و کۆمەڵایەتییەوە ساغ بکاتەوە، ئەوە نیە بە دوو گوتەی قوت و قرتاو لێی ببینەوە و بڵێین «حاجی ترسا... حاجی نەترسا... شێخی ماوێلی دەرپەڕاند... دەرینەپەڕاند...» بە شتی سادە و سەراو لەم باسە گرنگەی ئاوارەبوونی حاجی خۆمان دەرباز بکەین و تێیدا بە قەناعەت بگەین. بە نموونە دەڵێم بۆ خۆت لە تەجرەبەی ڕۆژانەت و لە شتی یەکجار بێبایەخ بە خەبەری سادە و سافیلکە ڕازی نابیت: تۆ ئەگەر لە باغچەتەوە توور و سڵق ببەیتە لای سەوزەفرۆش بۆتی بفرۆشێت، کە دیتت ڕۆژەکیان پارەی سڵقەکە لە ڕۆژانی پێشوو کەمتر بوو هەر بەوەندە لە کابرای سەوزەفرۆش ناسەلمێنیت بڵێ ئەمڕۆکە بازاڕی سەوزە کز بوو بۆیە سڵقەکەت پارەی ڕۆژانی نەگرتەوە، دەتەوێ دڵنیات بکات کە فێڵی لێ نەکردویت، پرسێکیش لەم و لەو دەکەیت بەکڕیار و فرۆشیاریەوە ئایا بازاڕی سەوزە و نرخی ئەو ڕۆژەی توور و سڵق چۆن بوە... ئەوساش خوتخوتەت هەر دانامرکێت و دڵت تەسکین نابێت. خۆ لەکاری گرنگتردا، وەک ئەوەی بزانی ئامۆزاییێکت ناچار کراوە وەیا ناچار بوە ماڵەکەی لە هەڵەبجەوە بۆ ڕەواندوز ڕاگوێزێت ئەوسا بێگومان گەلێک بەولای پرسیاری نرخی بازاڕی سەوزە دەکەویتە سەر تۆژینەوە بۆچی؟ چۆن؟ کەی؟ ئایا؟ کوا...؟

ئاوارەبوونی حاجی قادریش بەلای ئەو کەسەوە کە تۆژینەوە بکات لە چەند و چۆنی ڕووداوی گرنگ و ئەنجامداری وەک ئەم ئاوارەبوونە لە مێژووی کورددا، ئەویش شتێکە دەبێ ساغ بکرێتەوە و تۆزی گومانی لێ بتەکێت و تیشکی ساختەی لێ هەڵئەنگێورێت و درۆی لێ بڕەوێندرێتەوە. ئاوارەبوونەکە بەوەندەش بێبایەخ نابێ کە حاجی ئامۆزات نیە وەیا ئاوارەبوونەکەی کار ناکاتە سەر بەرژەوەندت، چونکە ئاوارەبوونی حاجی لە تەرازووی مێژووی کوردایەتییدا هەزار ئەوەندەی ڕاگوێستنی ماڵی ئامۆزاکەت بەسەنگترە و هەزار هێندەش پێویستی بەساغ کردنەوە هەیە.

لە بەر تیشکی ئەم ڕاستی و تێبینیانەدا بوو خامەی من خەریکی وردکێڵیی ئەو سەرچاوانە و هۆیانە و کاریگەڕانە بوو کە ئاوارەبوونی حاجی قادریان کردە ڕووداوێکی حەتمی ناچاری کە دەبوو هەر ببێ و نەبوونی لە ئیمکاندا نەبوو، تەنانەت دوشمنایەتیە کوشندە بێسرەوتەکەی نێوان ئەو و شێخ نەبی لەچاو ئەو حەتمیەتیەدا تەنها دەوری بەهانەیێکی مەعقول وەیا دوا تەکانی ڕیشەهەڵقەنی دێت کە ئەگەر ئەویش نەبا هەڵقەنانەکە هەر دەبوو چونکە هۆی بەهێزی تر هەبوو کاری گەلێک پتری دەکرد لە چاو دوشمنایەتیەکە. بە نموونە دەڵێم، چ شێخ نەبی لە بەیندا نەبوو کە حاجی بەپێی بڕیاری زەرفی ژیانی خۆی و داخوازی نەفسە لەخۆڕازییەکەی نۆ ساڵان بە بەهانەی خوێندن خۆی لە کۆیێ دزیەوە و سەری پێدا نەکردەوە تا ئەو ڕۆژەی چ عوزر و بەهانەی خۆ لێ دزینەوەی بەدەستەوە نەما.

لەم قسانەشمدا پێشدەستیم لە نووسینی دانەهاتووم نەکردوە چونکە لێرە بە پێشەوە لە ناو تێکڕای باسەکەدا بەپێی داخوازیی بەراورد کردن و هەڵسەنگاندنی ڕووداوەکانی پێوەندیدار لەگەڵ حاجی قادردا ئەم دوشمنایەتیە نرخی ڕاستەقینەی بۆ دیار کراوە لە نێوان ئەو هۆیانەی کاریان کردۆتە سەر خەتی بزووتنەوەی حاجی. ئێستا کەوا لە ڕواڵەتدا بەرەو دوا دەکشێمەوە لەو ڕێگایەی کە پێشتر بڕیبووم، خۆم وەک ئەو کەسە دێتە بەرچاو کە لە یاری یەکبازدا لێی دەکشێتەوە بە نیازی ئەوە گوڕی لێ ببەستێت و بە یەکجاری دوابازی لێبوونەوە و پایدۆست کردن بهاوێت.

من کەبێمە سەر لێکۆڵینەوەی تایبەتی و سەربەخۆ لە هۆی ئاوارەبوونی حاجی، مەیدانێکی فرەوانتر درێژتر دەگرمە بەر لێکۆڵینەوە لەو مەیدانەی کە لە حاڵی پێکەوە باس کردن لەو و لەشتی تر بەری دەکەوت.

بێگومان هەر مەوزوعێکی بە سەربەخۆیی باس بکرێت پتر خۆی لێک دەکێشێتەوە لەوەی بخرێتە چارچێوەی مەوزوعێکی تری لە خۆی فرەوانتر وەیا بکرێ بە ئاڵقەی زنجیرەیێکی باسی وەکو خۆی. لەم گۆشەنیگایەوە ئێستا وا سەیرێکی ئەو هۆیە زۆر مەشوورەی دوشمنایەتیەکەی شێخی ماوێلی و حاجی قادر دەکەین کە بەلای خەڵقەوە ئەو بوو حاجی لە کۆیێ دەرپەڕاند.

مرۆڤ، بە شێوەیێکی گشتی، بەدەست دوشمنایەتیەوە خەریک و داماو دەبێ. هەڵبەت بەڕادەی تیژیی دوشمنایەتییەکەوە و بێدەسەڵاتی لایەنێک لە هەردوو

لایەنی تێکهەڵقژانەکە، داماوی و تەنگەتاویی بێدەسەڵاتەکە زیاد دەکات. کە بێین حاجی قادر و شێخ نەبی بە تەرازوی تاقی کردنەوەی دەسەڵات هەڵکێشین، دیارە لادەستەتەرازوی شێخ نەبی گەلێک بەسەنگتر دەبێ لە هی حاجی کە دەزانین حاجی بە کێشانە و پێوانەی خزم خزمێنە و عەشیرەتگەریی ئەوساکە مەیلەو تەنها بوە چونکە لەو بەربەرەکانیەدا حاجی پشت ئەستور بوە بە هێزی شەخسیەت و زیرەکی و ئازایی و شاعیریەتیی خۆی سەرەڕای خۆدانە پاڵ حەق و ڕاستی نەک بەهێزی چەک و خزم و عەشیرەت. بێگومان لەم ڕووبەڕووبوونەی حاجی لەگەڵ شێخ نەبی هەرچی هێزی ماددی ڕاستەقینە هەیە لە دەست شێخ نەبیدا بوە. بەڵام ڕووبەڕووبوونەکە لە چارچێوەی کۆمەڵایەتیی ئەوسای کۆیەدا بوە نەک لە دەشتی چۆڵ و هۆڵ و بێئاوەدانیدا تاکوو هێزی ماددی شێخ نەبی کاری سەربەخۆی بێسنوور بکات.

باری کۆمەڵایەتی جێگەیەکی وەک کۆیەی ئەوسا و ئێستاش[92]، بە عادەت، لە ئەنجامی گوریسکێشەکێی پەلەی ژیان و هەوڵی دەرکەوتن و چونەپێشەوە و سامان پەیدا کردن، تا ڕادەیێکیش بە پێی حوکمی دابونەریت، لەنگەرێکی تەوازون ڕادەگرێ لە نێوان ئەو هێزانەی خەریکی گوریسکێشەکێکە دەبن بە شێوەیێک کە نەهێڵێ هێزی تاکە یەک لایەن پەکی لایەنەکانی تر بخات و خۆی ببێتە تەنها قارەمانی سەر شانۆی واقیع و چی بیەوێ بیکات. لە جێگەیێکی وەک کۆیەدا کە بەپێی حەجمی خۆی پڕ بوە لە بنەماڵە و قۆناغ و مزگەوت و تەکیە و خانەقا و پیاوی دەوڵەمەند، ئەگەر خواروژورێکیش هەبووبێ لە پیاوێک تا پیاوێکی تر، هیچ تاکە کەس لەوانە نەبوە مونافیسەکانی خۆی هەڵپەساردبن و مەیدانی پێ چۆڵ کردبن.

ئەم یەک دەستیە و تاک دەسەڵاتییە بۆ هیچ کامێک لە کەسان و لە بنەماڵەکانی کۆنینەی کۆیێ پێک نەهاتوە چ جایی ئەوەی بۆ غەریبێکی تازە مێوان پێک هاتبێت. شێخ نەبی لەو بارەدا ئەو غەریبە مێوانە بوە. لە زەمینەی شێخەتییدا بەرهەڵست و هاوتای وەهای هەبوون کە حەز نەکەن شێخ نەبی لێیان بە پێشەوە بکەوێتەوە بە

[92] ئەم نووسینە لە 1972 دەستی پێ کراوە و سەرلەبەری بە گەلاڵەیی تەواو کراوە. وشەی «ئێستا» ساڵەکەی دەست پێ کردنی نووسینەکە دەگرێتەوە.

بەریشیانەوە هەبوو لە کاتی پێویستدا جڵەوی بگرن و مەودای لێ ببڕنەوە. کە ئەمە لە مەیدانە بێفێڵەکەی مەهارەتی خۆیدا وەها بووبێت، دیارە کە داوی لەگەڵ داوی خاوەن قۆناغ و عەشیرەت و ملک و ماڵ و دەسەڵاتدا تێک ئاڵقا، بەرهەڵستی لە خۆی بە هێزتری لێ ڕاست دەبێتەوە.

ئەمەی لێرەدا دەیڵێم واقیعێکی عادەتی و چاوەڕوان کراویشە لە کۆیەی ئەوسا و لە کۆیەی ئێستا و لە هەموو شوێنێکی تری وەک کۆیەی ئەوسا و ئێستاکەدا. کەسێک کە لەلاوە دێتە شارێک، مەگەر ئەو کەسە بە زەبری گورز شارەکەی داگیر کردبێت، دەنا ناشێ بە پێنج و دوو ڕۆژێک ببێتە میری سەربڕی ئەو شارە. ئەم ڕاستییەت لە بیر بێ تاکوو بپەڕینەوە بۆ ڕاستییەکەی بەرانبەری ئەو لەم دووبەرەکیەدا کە خەریکی ڕوون کردنەوەین، ئەویش حاڵ و باری حاجی قادرە.

بەڕاستی لەم ڕووداوەی موقاڕەنەی حاڵی حاجی گەلێک ئاسانترە لە هی شێخ نەبی چونکە لە هی ئەو سادەتر و بێ قۆرت و گرێترە. شێخ نەبی پەلی بۆ گەلێک لایەن دەهاوێشت و لە زۆر مەیداندا جووتی سیاسەتی دەگێڕا، مرید و دیعایەچی و پەیڕەویکەرێکی بێئەژماری هەبوون لە گەلێک لایەنیشەوە دووچاری موناقەسە و بەرهەڵستی دەبوو. دەنگوباسی هەندێک لەو ڕووبەڕووبوونەی شێخ نەبی لەگەڵ هاوچەرخی خۆیدا بە ئێمە گەیشتوە و بەشی زۆریشی لە ناوچوە. بەهەمان حاڵ وەزعی شێخ نەبی لە گەلێک بارەوە لە هی حاجی ئاڵۆزتر و تێکەڵپێکەڵترە، ساغ کردنەوەشی زەحمەتترە چونکە لایەنە نەزانراوەکانی لە هی حاجی پترە گەلێکیش پترە. ئەوەی ڕاستی بێ وەزعی ماددی زۆر سادە و بێ بارستی حاجی لەبەر تیشکی وەزعە نەفسیەکەیدا ڕەونەق وەردەگرێت چونکە زەرفی ئەو وەزعە نەفسیەیە دەنا وەزعێکی هیچ نەدار و موفلیس لە خۆوە نابێتە جێی سەرسوڕمان و تێوەڕامان و پشکنینەوە. زۆر جاران شتی بێ بایەخ لە پەنا شتی بایەخداردا نرخ پەیدا دەکات:

بازاڕی دەهرە قیمەتی ئەشیا بە جێگەیە
مێشێ گەیشتە ڕووی نیگار هەر لە خاڵ ئەچێ

حاجی قادر هەرچەند هێزی دنیای ماددی وەک چەک و پارە و دەسەڵاتی نەبوە، لەگەڵ ئەمەشدا لە تای تەرازووی ئەو لەنگەر بەستنەی کۆمەڵایەتیدا سەنگی

تایبەتی خۆی هەبوە و حیسابی بە بنج و بناوانی بۆ کراوە و هەمیشە کات تێخوێندراوەتەوە. حاجی لای زۆرینەی پیاوە ناودارەکان و بەهێزەکانی کۆیێ مرۆڤێکی بەقەدر و خۆشەویست بوە، خۆشویستنەکە و قەدر گرتنەکەشی ئەوە بوە لە هەڵبەستەکانی دوایی تری دەنگی داوەتەوە کە دەکا دەنگدانەوەیێکی وەفاکارانە. لە وەزعی وەهادا کە ناکۆکی بکەوێتە نێوان حاجی و شێخ نەبییەوە هەتا ناکۆکییەکە لە سنووری تێکراخورێن و شەڕە شیعر و پلار تێک گرتن و جنێو بەیەکتردان‌دا بێت کەس بۆ کەس بەدەنگ نایەت مەگەر خۆی لایەنی دەمەتەقە بێ. ڕەنگە گێڕانەوەی ڕووداوی ڕۆژانەی ئەو ناکۆکییە زەردەخەنە و پێکەنینیش بێنێتە سەر لێوان، بەڵام کە کار گەیشتە ئەوەی پیاوێکی وەک حاجی قادر لە کۆیێ دەربکرێ وەیا لەترسان هەڵبێ دەبێ تەوازونەکە ئەوەندە تێکچو بێت و شیرازەی کۆمەڵایەتی بە جۆرێک هەڵوەشا بێ ئەو کۆیە نەمابێ کە دەیناسین.

بە پێی ئاگاداری و شارەزایمان لە وەزعی ئەوسای کۆیێ، کە جیلاوجیل پێمان گەیشتوە و باری ڕاستەقینە و میراتیش هەروەها ڕادەگەیەنێ، ئەو شلۆقیەی حاڵ و زەرفی کۆمەڵایەتی و سەرەوبنبوونی لەنگەری دەسەڵات هەرگیزا و هەرگیز ڕووی نەداوە. سەردەمی شێخ نەبی ئەوەندە دوور نەکەوتۆتەوە کۆمەڵایەتیەکەی بووبێتە نهێنیی مێژوویی، تەنانەت بەشێک لەو کارانەی کە شێوەی خودنمایی و خەڵق شکاندنەوەی ئەو تەڵەکەبازە نیشان دەدات بە نووسراویی لای ئێمە پارێزراوە. وێڕای ئەو نووسینە تایبەتیانە، لە پەراوێزێکی فرەواندا، لە ڕێی مەعلووماتی خانەوادەیی و وردە نووسینی پەڕاگەندە بەدەوری کتێباندا کە هەموویان لەگەڵ قسەی دەماودەمی ناو خەلق ڕێک دێن، چەندوچۆنیەکی ئاکار و حاڵ و باری شێخ نەبی تا ڕادەیێک ڕوون دەبێتەوە. بە نموونەی ڕاستبوونی ئەم ڕایە دەڵێم شێخ نەبی بەسەر کتێبێکی مزگەوتەوە، کە لای منە، لە پەراوێزێکدا نووسیوەتی دەرسی خوێندوە لای شێخ مستەفا لە مزگەوتی مەلای خەتێ، حاجی مەلا ئەسعەدی باوکی باپیریشم لە پەراوێزی کتێبێکی تردا نووسیوەتی لای مەلای خەتێی خوێندوە. هەر ئەم هاوڕێیەتیەی بەیەکەوە خوێندنیان بوە دواتر حاجی مەلا ئەسعەد یارمەتی شێخ نەبی داوە کە لە کۆیێ بگیرسێتەوە کە ئەوسا جارێ هیچ بێ دینیێکی لێ نەدیترابوو. ئەمە دەڵێم تاکوو بزانرێ شتێک لە بارەی شێخ نەبییەوە بێتە ناو ئەم نووسینەوە، وەیا کارەساتێکی سەردەمی ئەو کە پێوەندیی بە حاجی قادرەوە هەبێ و لێرەدا باسی

بکەین لە مەجهولەوە هەڵنەقوڵیون، چ دەسکاریشیان تێدا نەکراوە. کە دێم و باری کۆمەڵایەتیی کۆیەش بەشایەد دەگرم لە ڕاستی و درۆیی ئەو خەبەرەی کە دەڵێ حاجی لە ترسان وەیا بە دەرکردن لە کۆیێ ڕۆیشتوە، شایەدێکی ڕاستگۆ و مەعلوومیشم هێناوەتەوە کە دەیناسین و پێی باوەڕ دەکەین.

ئەو کەسانەی خۆشباوەڕن لە سەلماندنی دەرکرانی حاجی، وادەزانن بەڵگەیەکی گەورەیی و قارەمانیەتیی حاجی لەوەدایە لەلان ستەمکارەوە دەرکرابێ و لە کاتی دەرکردنیشیدا کزەی سۆز و پەرۆش و هەستی غەریبیی لە جەرگیەوە هەڵستابێ. ئەوەی ڕاستی بێ، مەیلی وەها ساکار بۆ کێشانی خەرمانەی ئاورینگاویی بەدەوری ناو و شەخسیەتی قارەمانی خۆشەویستەوە لەوە تێپەڕ ناکات کە مەیلێکی سادە و ساکارە چونکە هیچ سوودێکی ڕاستەقینە بەو قارەمانە ناگەیەنێ و لە نرخ و بایەخی شەخسیەتیشی زیاد ناکات. ڕاوەستانی حاجی قادر دژی شەعبەدەی شێخ نەبی ڕاستییێکە پەکی لەسەر ئەوە نەکەوتوە هەڵاتنی حاجی ئەنجامەکەی بێ. حاجی بە خوایشتی خۆی ڕۆیشتبێ وەیا دەرکرابێ وەیا، لە فەرزی موستەحیل، کۆیەشی جێنەهێشتبێ هەر ئەو حاجیە دەبێ کە یەکە و تەنها بێ چەک و پارە و دەسەڵات یەخەگیری شێخ نەبی بوە.

ئەگەر بە وردی سەیری ئەو حیکایەتە بکەین کە حاجی دەکاتە دەرکراوی زەبروزەبگی شێخ نەبی، دەبینین دەلالەتی حیکایەتەکە، تا ڕادەییێک، لە نەترساویی حاجی کەم دەکاتەوە چونکە ئازایەتی لە مەیدان چۆڵکردندا نیە، بە پێچەوانەوە لە بەردەوامبووندایە. ئەگەر حاجی هیچ نیاز و خوایشتێکی خۆی لەو ڕۆییشتنەدا نەبووبێ و لەبەر تاکە هۆی ترس وەیا بێچارەیی کۆڵی دابێ، دەبێ ئەوانەی گەورەیی حاجی لەو کۆڵدانەدا دەبینن چاوێک بە ڕایەکەی خۆیاندا بگێڕنەوە، پرسیاریکیش هەڵبستێنن لەوەدا کە ئەگەر ئەنجامی تیژ کردنی هەرا و ناکۆکیی سەربکێشێتەوە بۆ کۆڵدان و هەڵاتن ئایا چاکتر و شیرینتر ئەوە نەبوو بایی هەڵنەهاتن لە هەراکە کەم کرابایەوە؟

بەلای منەوە، بەلای واقیعیشەوە، سادە مەیلی نیشاندانی حاجی بە «قوربانیی خەبات» نە دەشێ و نە دەکرێ ببێتە جێگر (بدیل) ی ڕاستی، بە تایبەتی کە گەورەیی ڕاستەقینەی حاجی قادر لەو ڕاستییەدا بێ. کەواتە بۆچی لە خۆڕایی گەورەیی حاجی بەند کەین بە غەڵەت و بیبەستینەوە بە ڕوونەداو! ئەوەندە

قارەمانەتییە هەڵبەستراوەی کە دەزانین لە ڕاستییدا پێچەوانەی قارەمانەتییە بە حاجی دەبەخشی نابێتە جۆگەلەیەکیش لەچاو ڕووباری پڕ شەپۆلی قارەمانەتی حەقیقی ئەو. حاجی ئەو هەژارەی مەیدانی شەخسیەت نیە کە دۆستەکانی هەڵوەستی شلۆقی بۆ بکەن بە داروەکازی خۆ بەسەرەوە ڕاگرتن، لەمەشدا بێلزوم ڕووداو و مێژوو بەدرۆ بخرێتەوە.

تا حاجی دەبێ بە دەربەدەرێکی ستەمی شێخ نەبی هەرچی ڕاستی هەیە لە بارەی کۆمەڵایەتی و لەنگەری دەسەڵاتی ئەوسای کۆیێ دەبێ بسڕێتەوە و زەرفێکی دەسکردی دوور لە واقیعی لە جێگەدا دابندرێ کەوا نە حاجی پەکی لەسەر کەوتوە نە ئێمەش چ کارێکمان پێیەتی. سەیر لەوەدایە کە ئەگەر قبووڵیش بکەین حاجی لەبەر شێخ نەبی هەڵات دیسانەوە چوونی حاجی بۆ ئەستەمبۆڵ هەر بێتەفسیر دەمێنێتەوە.

دامانا حاجی دەرکراوی شێخ نەبییە، لە ترسی ئەو لە کۆیێ هەڵات، بۆچی نەچوە کەرکووک وەیا هەولێر وەیا سلێمانی وەیا هەر شوێنێکی کوردستانی عیراق کە دەسەڵاتی شێخ نەبی پێی ڕانەگات؟ ئەستەمبۆڵی ساڵی 1280. ک جێگەیێکی وەها نزیک و هەرزان بایی نەبوە هەر کەسێک لە ماڵی خۆی دەرچوو وەیا دەرکرا بۆ ئەوێ خۆی هەڵکوتێ. فەرقێکی گەورە هەیە لە نێوان هەڵاتن بەدەم ترسەوە لەگەڵ گرتنە بەری سەفەری دوور و بە ئەرک و بۆ شوێنی بێگانەی بە مەسرەف و بە نیازی لێمانەوەی هەموو عومر. هەڵاتنی حاجی لە ترسی شێخ نەبی هەر ئەوەندەی بەبەرەوە هەیە کە لە کۆیێ دەرچووبێت، هەرگیز لێی چاوەڕوان ناکرێت بۆ ئەستەمبۆڵی بەڕێ کات. لەوانەیە بگوترێ چوونی حاجی بۆ ئەستەمبۆڵ ئەو موستەحیلە نابێ، کە لە بەر تیشکی واقیعی دوای دەرچوونی لە کۆیێ ڕابگیرێت. واتە کە ئەو هەر ناچار بوو لە کۆیێ دەرچێت ئیتر بۆ نەچێتە جێگەیەکی وەها ئەوە بێنێت بۆی ئاوارە بێت؟ ئەم پرسیار و تێبینییە بێبایەخ نین، جێی سرنج لێ گرتنیشن بەڵام بایی خۆسەپاندن و تەگەرە ڕەواندنەوە ناکەن. ئەم تێبینییە خۆی لە خۆیدا و بە تەنها هێزێکی وەهای تێدا نیە هەموو تێبینییەکی ترمان لە بیر بباتەوە و حاجی قادر بکاتە گوللە تۆپێکی قەزاوقەدەر و بۆ ئەستەمبۆڵی باوێژێ. هێز و پاڵەپەستۆ و تەکانێک کە بە یەکجاری حاجی لە کۆیێ هەڵقەنێ و لە ئەستەمبۆڵی بە زەویدا بدات، تەقینەوەیێکی گەلێک زلتری دەوێ لەوەی کە گوتبێتی «کوڕینە لە

کۆیێ دەرچووم، وا ڕۆییشتم بۆ ئەستەمبۆڵ» وەک ئەوەی کە بڵێ «کەوا و سەڵتەکەم بە ڕانک و چۆغەڵ دەگۆڕمەوە...».

هەڵقەنانی حاجی لە کۆیێ دەبێ بخرێتە بەر ڕووناکایی ئەو لێکدانەوانەی پێشتر لێی بوومەوە، واش دەزانم شتێکی ئەوتۆیان نەهێشتۆتەوە لەو بنگە و بنیچەی بەراورد کردنیان بەسەرەوە دەوەستێ، ئەگەر هیچیشم لە بیر چووبێ وەیا بە بیرمدا نەهاتبێ باوەڕناکەم لەوانەبێ بڕیاران هەڵوەشێنێتەوە.

وەک لەو لێکدانەوانەدا بۆی چوم، وا دەزانم حاجی قادر بەهەمەحاڵ لە کۆیێ دەردەچوو ئیتر شێخ نەبی پەیدا بووبا یان پەیدا نەبووبا. ناشی لێرەدا ئەو لێکدانەوانە و بە یەکتر گرتنانە دووبارە بکەمەوە، تەنها بەپێی داخوازیی جێگە و لێکۆڵینەوە لەو دەمەتەقەیەی تازە خستمە بەرچاو، زۆر بە کورتی دووسێ خاڵی گرنگ لەوانەی پاڵیان بە حاجیەوە نا بۆ ئاوارەبوون وەیا ئاوارەبوونیان لێخۆش هێنا لێرەدا دەکەمە کورتەی پوختەکراوی گەلێک لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی دوور و درێژ:

1) هیچ بەرژەوەندێکی ماددی وەک سامان و دوکان و دیوەخانە و مزگەوت و مەدرەسە و وەزیفە، حاجی قادری بە کۆیەوە نەبەستبۆوە.
2) ژن و منداڵی نەبوە ئاوارەبوونی بە زەحمەت بیەخێت.
3) نەفسە زلەکەی لێی نەسەلماندوە دەست لەبەر خەڵقی پان کاتەوە بۆ پێکهێنانی گوزەران.
4) هەر ئەو نەفسە زلەی وای کردوە شەرمی بێتەوە کە بەردەوام لەو مزگەوت و لەو ماڵ و لە سێبەری براگەورە و خێرەوەمەنداندا بژیت – بەڕاستی ئەم هۆیە یەکجار بەهێزە لەناو هۆیە بەهێزەکاندا.
5) تاکە سامانی حاجی کە بوێژی و ئەدەبەکەیەتی لە قەپێلکی تەسکی کۆیەدا نەدەگونجا، بە تایبەتی کە حاجی سەر بەشیعرەکانی شۆڕنەکاتەوە بۆ مەدحی دەسەڵاتدار و خاوەن سامانەکانی ئەو سەردەمەی کۆیێ وەیا غەیری کۆیێ وەک هەولێر و کەرکووک.

تۆ لەوەزعی حاجی وردبەوە، هەرچی هۆی مانەوەیە لەکۆیێ پەیدا نیە، هەرچی هۆی دەرچوونە پەیدایە. کە ئەمە وابێ چیمان پێ دەوێ لەوە زیاتر ببێتە هۆی

دورکەوتنەوەی؟ هەراکەی شێخ نەبی لەو وەزعەدا بایەخێکی تایبەتی پەیدا کرد کە بەزاهیر بوە هۆی دەرچوونی حاجی، وەیا ئەوپەڕەکەی بوە بەهانەی دەرچوون.

بە چاوی خەیاڵ خۆت لە وەزعی حاجی قادری ئەو جێگەیە و کاتەدا ببینەوە و بە دڵی ئەو هەست بکە و بە مێشکی ئەو لێکدەوە بزانم بڕیارت چی دەبێ! لەو هەموو بێ حاڵ و باری و بێ سامانیەدا بەو هەموو قابلیەت و شاعیریتەوە لەگەڵ ئەو هەموو ڕێز لەخۆ گرتنە و سەرکەشی نەفستەوە بەدەم شەڕەدەندووکێ و هەرا و دەمەتەقەی ڕۆژانەوە چەند ساڵان ئەم ماڵ و ئەو ماڵ و ئەم مزگەوت و ئەو مزگەوت خانەخوێگۆڕیی دەکەیت؟

تاکەی؟ بۆچی؟ بە کام ئومێد؟ بۆ کام ئامانج؟ لەبەر خاتری کێ؟ نە ژن نە ماڵ نە منداڵ نە مزگەوت نە دیوەخانە نە دوکان نە نان نە خوان نە ڕاحەتی نە سرەوتن نە بازاڕی شیعر نە هیچ شتێکی بەکەڵکی حاجی ئەوسا بێت وەیا لە سنووری بەخۆنازیندا دەستی پێی بگات!! تۆ لەو حاڵەدا بیت چ بە خۆت ڕەوا دەبینی؟ مانەوەی سەر کزەڵانەی مێوانانەی بێ دەسەڵاتانە، یاخود ئەوەی حاجی کردی؟ وا دەزانم دیمەنەکە ئەوەندە ڕوون و ئاشکرایە هەر دەڵێی تین و تاو بە ئیرادەی تۆ و منیش دەدات کە بە لاشعووری بڵێین: کاکەینێ خۆ حازر کەن با بۆی دەرچین.

لە نێوان ئەم پێنج خاڵەی سەرەوودا کە بوونە پوختەی ئەو هۆیانەی ڕێی ئاوارەبوونیان خستە بەر حاجییەوە، خاڵی دوەم کە نەبوونی ژن و منداڵە هۆیێکە هەموو ئاوارەبوەکانی وەک حاجی قادر تێیدا بەشدارن. مەبەست لە ئاوارەبوەکان ئەوانەن کە وەک حاجی دەستکورت و بێ ڕێوجێ بوون، نموونەی زۆر بەرچاویش لەوان جوتە قارەمانە ڕووتەی «نالی و کەیفی» ن کە یەکەمیان بەر لە حاجی بە بیست[93] ساڵێک، بەڵکوو پتریش، ئاوارە بووبوو، دوەمیشیان بە چەند ساڵێک دوای حاجی ئاوارە کرا. ئەم دوو قارەمانەش وەک حاجی قادر بایی پێوەندی سەرەداوێک، بەرژەوەندیان نەبوە بە سلێمانی و کۆیەیانەوە ببەستێتەوە.

---

[93] ئەم باسە بە وردی لە پێشەکیی «چەپکێک لە گوڵزاری نالی» لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد ساڵی 1974 لە نووسینی مەسعود محەمەد لێی کۆڵراوەتەوە.

بەڵام لە بێ بەرژەوەندیی کاریگەرتر ئەوە بوە کە ژن وماڵیان لێ نەبۆتە تەوق و تەڵەی پەکخستن چونکە دەزانین هەزاران کەسی هەژاری بێ مڵک و پارە و دەرەتان بە هۆی ژن و منداڵەوە بە شوێنێکەوە دەبەسترێنەوە و تا مردن بە کڵۆڵی و چارەڕەشی تێیدا بەسەر دەبەن.

دوو شەقڵی زۆر ئاشکرای «بێ ژن و منداڵی و بێ سامانی» دەبنە جوداکەرەوەی ئەو کوردانەی لە شوێنی وەک کۆیە و هەولێر و سلێمانییەوە ڕوەو ئەستەمبۆڵ دەبوون. هەموو ئەو هەژارانەی ئاوارە دەبوون ژن و منداڵیان نەبوو، بەزۆریش نەدەگەڕانەوە بۆ خاکی وڵات، وا بزانم لە غەریبیشدا هەر ژنیان نەهێناوە، مەگەر تاک تاکەیان. ئەوانەی حاڵ و بارێکی ئابووری ڕێکوپێکیان بووبێت، ناچار نەبوون بێ ژن و ماڵی تێکەڵ بە حیسابی سەفەرەکەیان بکەن. چ بە نیازی گەشت و گەڕانی تەبدیل هەوا بووبێ چ بە نیازی وەرگرتنی وەزیفە و ڕوتبە و نیشان وەیا بەرەوپێش بردنی بەرژەوەندیێک بووبێ، چوونەتە ناوچەی خەلافەت، کەیف و سەیرانی خۆیان تێدا کردوە وەیا خەریکی کاروباری بەرژەوەندەکەیان بوون، ژن و ماڵیشیان بووبێ پەکی چوون و هاتنەوەی نەخستوون، وا بوە بە ماڵەوە سەفەریان کردوە و گەڕاونەوە، واش بوە بە نیازی نیشتەجێبوون ڕایانگوێستوە. بەڵام بە زۆری ئەوەی بنگەیێکی ژیان و گوزەران و ناوونیشانی لە وڵاتی خۆیدا شک بردبێ گەڕاوەتەوە هێلانەکەی خۆی، تەنانەت هی وابوە بە نوێنەری وەیا بە وەزیفەی گەورە چەند ساڵان لە ئەستەمبۆڵ ماوەتەوە پاشان لەگەڵ بەسەرچوونی ئەو وەزعە ڕوەو ماڵ وڵاتی خۆی بۆتەوە. دیارە غەریبیی ئەو شیرنە نیە بە عادەت خەڵقی بۆ خۆی ڕاکێشێت، وڵاتیش ئەو ناحەزە نیە بێ سەبەب بەلاوە بنرێت:

وەتەن مەحبوبەیێکە جلوە ئارای
نیشانەی دین و ئیمانە تەمەننای

ئەگەر لە میراتی ئاوارە بوەکانمانەوە کەلەپۆری نووسراومان پێگەیشتبا بێگومان، لە هەموانەوە سۆز و کزەی غەریبیمان دەخوێندەوە. نالی کە سەرامەدی ئەو ئاوارانەیە چەند بەلیغانە گڕوگڵپەی دەروونی خۆی خستۆتە ناو هەڵبەستە بێهاوتاکەیەوە کە لە غەریبیدا بە نیازی ڕوخسەت خواستنی گەڕانەوە بۆ سالمی ناردوە:

قوربانی تۆزی ڕێگەتم ئەی بادی خۆش مروور
وەی پەیکی شارەزا بە هەموو شاری شارەزوور

نالی لەو هەڵبەستەدا، بەدەم سۆزی غوربەتەوە، ئەوەی لەگەڵ شێوەی وڵاتەکەی کردوە کە لە کاتی سەفەری حەجدا بەرەو کەعبە و قەبری پێغەمبەر لەگەڵ ڕەمڵ و خاک و دار و بەرد و گیا و حەوش و حەسار و دیواری حیجاز و مەکە و مەدینەدا کردوەتی:

هەر لە شیوەسوورەوە تا سەرچنار و بەکرەجۆ و سلێمانی و بەردی سەرشەقام و داری پیرمەسوور و حەوز و حەوش و حوجرەی مزگەوت و گردی سەیوان و کانیئاسکان و خاکوخۆڵ بە هەناسەی گەرم و قوڵپی گریان خولی میحنەتی داوە و تلاوەتەوە.

کوڕم دەوێ لە غەریبیدا ئەو پارچە ئاگرەی هەڵبەستی نالی بە جەرگی خۆیەوە بنێ و بۆسۆی لێ هەڵنەستێ.

ئێمە زۆر جاران دادەبڕێین لە هەست کردن بە سۆز و عاتیفەی مرۆڤی هەستیاری ئاگر تێبەربووی وەک نالی و حاجی کە نرخدارترین و عەزیزترین و جوانترین هەڵپە و لەرزە و لەرەی هەناوی خۆیان بۆمان کردوە بە دەستەچیلەی هەڵبەست و دەروونی مرۆڤایەتیمانی پێ گەش دەکەنەوە، ئەگەر گوێیان بدەینێ و تێیان بگەین. لەو دابڕانەشمان ئەوەی زۆر جێگەی پەرۆشمە ئەوەیە کە نازانین چەندمان لەکیس چووە، بەڵام دابڕانمان لە دیتنێکی سینەمایی وەیا ئاهەنگێکی کۆکتێل وەیا شاییەکی ڕەشبەڵەک ناڕاحەتمان دەکات، بگرە دابڕانەکەمان بە خەسارەتمەندیش حیساب دەکەین. بەڵی مرۆڤ هەقیەتی پەرۆشی لەدەس چوونی خۆشیەکی ماددی بێت، بەڵام پێویستە لەسەری، هەر نەبێ لەبەر خاتری حەسانەوەی گیانی خۆی، بەشداری ویژدانی خاوەن ویژدانە زلەکانی میللەتەکەی بێت و گوێیان بداتێ و تێیان بگات و کە پێی کرا لە بەخشندەگیی وانەوە فێری بەخشین بێت.

بەڕاستی ژیان هەمووی هەر خواردن و خۆشیی و هەڵپەڕکێ و جنس نیە، ئەمانە تێکڕایانماڵی هەموو گیانلەبەرانە، نەک هەر هی ئادەمیزاد. بەڵێ بێ ئەمانە ژیان تامی نابێ، یاخود بەجارێ نابێ، بەڵام بە هەموویان یەک خاسیەت و تایبەتی پێک

نایەنن کە تەنها هی مرۆڤ بێ، چونکە جارێ ماکە هەرە گرنگەکەی مرۆڤایەتی، کە هەستی هاوبەشی کردنە لەگەڵ غەیر، نادیارە. بە تۆ چی دراوسێکەت لە خۆشیدا خنکا بێت، هەروەهاش بە من چی تۆ لە سینەما دەرچیت بۆ پارتی کۆکتێل بادەنۆشی بکەیت وەیا لە کۆش و باوەشی گەرم و نەرمدا سەرخۆش بیت. من هەرگیز گلەییم نەبوە لەو شاعیرەی کە دەڵی:

کە من نەخلی مرادم بێ سەمەر بێ

بە من چی باغی عالەم جوملە بەر بێ

چونکە بەڕاستی ئینسافی لەگەڵ خۆیدا نواندوە. ئەوەی دەڵێ شاعیر لێرەدا خودپەسندیی کردوە ئاگادار نیە لەوە کە هەر یەک دوو وشەی بەیتەکە بگۆڕێ چ خودپەسندیی تێدا نامێنێت:

کە تۆ نەخلی مرادت بێ سەمەر بێ

بە تۆ چی باغەکەی من جەملە بەر بێ

لە دەربڕینی حەقیقەتی وەها زلدا، پاڕانەوە بۆ نەفس یا بۆ غەیر فەرقێک بە حەقیقەتەکە ناکات، ڕەنگە ئەو ئازاییەی لە دەربڕینی حەز و ئارەزۆی نەفس پەیدا دەبێت گەلێک پتر نرخی حەقیقەتەکە دیار خات لەوەی شەرم و زمان گرتن ئەو حەقیقەتە لە غەیردا دیار خات. لە جێگەی وەهادا چ فەرق نیە لە نێوان شانازی کردن بە جانفیدایی و نەفس کردن بە ئاوێنەی حەقیقەتی گەورە. لە خۆنواندن بە فیداکاریی چ شەرەفێک هەیە هەمان شەرەف لە دەربڕینی ئارەزۆی ڕەواشدا هەیە، ئەو ئارەزۆیەی کە مافی بێفێڵی ئادەمیزادە. ئێمە لێمان داوا ناکرێ هەر لە خۆ بەخت کردندا دەنگ دلێر بین کە دەزانین خۆبەخت کردنەکە لەوەدا شەرەف پەیدا دەکات کە بۆ خێر و خۆشی ئادەمیزاد بێت دەنا فلسێک ناهێنێت، زۆر جارانیش بەکاری بەد لە قەڵەم دەدرێت.

من کە دێم داوا دەکەم لە خوێنەری کورد پڕیشکی ئاگری هەناوی نالی و حاجی بە جەرگی خۆیەوە بنێ و بەشداری ویژدانە بڵێسەدارەکەیان بێ، دەمەوێ تابلۆی

مرۆڤایەتی بە هەر دوولای خۆویستی و غەیرویستی لە خۆیدا بە تەواوی دروست بکات، خۆ ئەگەر بیەوێ نموونەیێکی گونجاو بێ لەگەڵ حاڵوباری کوردەواریی بە هەردوو لای خۆشی و ناخۆشیی میراتی کوردەوە دیارە دەبێ پتر خۆی بەلای غەیرویستی و هەستی برینداردا بشکێنێتەوە. بەڵام هەرگیز نامەوێ تەنگژەی ژیانی لێ تەنگتر بکەمەوە… نامەوێ هەلی خۆشیی لێ بدزمەوە بە ناخۆشیی… نامەوێ بەهرەی داشکێنم. من باوەڕم بەوە هەیە کە ئەگەر گەنجێکی ڕۆشنبیری کورد توانی ئەوەندە ناسک بێتەوە کە بە فرمێسکی حاجی و نالی بگری… بڵێسەی هەناسەی ئەوان لە دەروونی خۆیدا هەڵگیرسێنێتەوە، بە سامانێکی مەعنەوی، بگرە ماددی، زلتر دەگات لەوەی تامەزرۆشکاندنی ئارەزۆی نەفسی برسی پێی دەگەیەنێت.
تامەزرۆشکاندن فەرمانی سروشتە و نامەوێ لە نرخی کەم کەمەوە، بەڵام هەرگیز نرخی تامەزرۆشکاندن کەم نابێتەوە بەوەدا لە پاڵ پەلەفرەی دڵی نالی و حاجی بە چنگاڵی میحنەتەوە، بیخەمە سێبەری پلەی دووەمەوە. من هەرگیز بە مۆرفینی خەیاڵی بەتاڵ سەرگێژم نەکردوویت کە لێت بپاڕێمەوە تۆش وەکوو من نیگایێک بشکێنیتەوە بەلای مەینەتە زلەکەی حاجیدا لەو زەرفە بێڕەحمەدا کە تاڵ تاڵ دەماری پێوەندیی بە مەفتەنیەوە هەڵدەبڕێتەوە وەک ئەوەی گیانی لە ناخی وجوودی دەرکێشن، چونکە نیگاکەت بەلای دەوڵەمەندترین دیمەنی مرۆڤایەتیدا دەشکێتەوە.

دەرچوونی حاجی لە کۆیێ ڕووداوێکی ئاسایی ڕۆژانە نیە کە لە نێوان دەیان و صەدان ڕووداوی وەک خۆیدا بشاردرێتەوە. ئێمە لەوە بووینەوە بزانین چ بوون ئەو هۆیانەی تراجیدیای ئاوارەبوونی حاجییان پێکهێنا، هەر لەو زانینەشدا بۆمان ڕوون بۆوە کە عامیلی هەرە گەورەی ئەو تراجیدییە نەفسە زلەکەی حاجی بوو بەوەدا کە بەقەدەر یەک موو سەری پێدانەنواند بۆ پێداویستی بەرژەوەند و حوکمی ژیان و فەرمانی دەوروبەر تا بکەوێتە سەر بارێک کە نانێکی تێدا پەیدا بکات وەیا ماڵێک پێکەوە بنێت وەیا لە بن نواییێک بحەسێتەوە ئیتر مایەوە وەک مێوان کە پێی بە قۆناغەوە گیر نابێ و بەردەوامبوونی لە مێوانەتییدا دەبێتە شتێکی سەیر.

ئەم ئیمکان نەبوونی مانەوەی حاجی لە کۆیە کە ڕابگیرێ لە بەرانبەر خۆشویستنە بێسنوورەکەی حاجی بۆ کۆیە و دانیشتوانی کۆیە، پۆپی تراجیدیاکە نیشان دەدات. تاکە یەک هۆی کزبوونەوەی ئاورینگی کارەساتەکە لەوەدایە کە لە کوردێک قەوماوە و لە شوێنێکی وەک کۆیەدا ڕووی داوە، ئەگەر لە گۆشەیێکی ئەورووپادا

کارەساتێکی وەها فرمێسکاوی، شەکسپیرێکی بۆ ڕەخسابایە ئێستا لەو دەمەدا کە جەنابت بە گۆشەیێکی چاوە بێزارەکانت ئەم دێڕانە دەخوێنیتەوە، لە گەلێک جێگەی جیهاندا کارەساتەکە وەک هاملێت و ڕۆمیۆ و جۆلییێت بەسەر شانۆ گەشەدارەکانەوە چەپڵەڕێزانی بۆ دەکرا، خۆشت لەوانە بوویت چیرۆکەکەت بەوپەڕی تەقدیر و تەقدیسەوە بخوێندایەوە و هەر جارەش نەفرینت لەو چارەنووسە کردبایە کە ستەمی وەها بێسامان لە دڵی وەها گەورە و هەستیار دەکات. بەڵام چ سوود!
کارەساتی دەربەدەربوونی حاجی هیچ ناوێکی زرینگەداری تێدا نایەت، ئەو زەرف و هۆیانەی پێکیشیان هێناوە بە دەوری ڕووداوێکی ئەورووپاییدا سەریان هەڵنەداوە، دەست و قەڵەمێکی لە بارەشیەوە خەریکە خۆی فێری مەشقی نووسین بکات لە ناو تاریکایی نەناسراویی خۆی و بابەتی نووسینەکە و سەرلەبەری میللەتەکەیدا کوتەکوتی شەو کوێرانەیتی، ئیتر بۆ دەبێ گەنجێکی کورد ئەو چاوە تیژەی هەبێ کە گەوهەر لە ژێر تەبەق ئەندەر تەبەقی تاریکی و سەرپۆش و کفندا بدۆزێتەوە! تا دەسەڵاتێکی مەحدوودی وەک هی ئەم نووسینە کزە خۆ هەڵدەبەزێنێتەوە بۆ بەر نیگا بەرزنۆڕە شادی خوازەکەی گەنجێکی کورد، لە دەیان لاوە پرۆجەکتۆری نووسینە پێدا هەلگوتراوەکانی ئەم جیهانە پڕ ڕووناکی و شادییە سرنج و هۆش و حەز و ئارەزۆی ئەو گەنجە، وێڕای نیگاکەی، بۆ خۆیان ڕادەکێشن و لە من و کۆیە و حاجی قادری بێدەرەتانی دەستێننەوە.

بەڕاستی گەیشتنەوە یەکتری ئەم دوو تەناقوزە زۆر بەهێزەی خۆشویستنێکی بێسنوور و دوور کەوتنەوەی ناچاری کە لەم ئاوارەبوونەی حاجی قادردا پەیدایە هەروەک چەخماخەی بروسکە دوو ڕاستیی گەورەی 1- گەرمایی 2- ڕووناکایی، لە نەفسی حاجی قادردا دەردەخات: گەرماییەکە ئەو ئاگرەیە کە لە دوور کەوتنەوەکەدا بەردەبێتە گیان و دڵی حاجی و هەتا مردن ناکوژێتەوە و یەکێکە لە دیاردە بنجی و بەهێزەکانی ناو دیوانەکەی کە ئەگەر هەڵبەستەکانی دابەش بکرێن بەسەر ئەو مەبەسانەی بۆیان هۆنراونەوە پشکی کڵپە و سۆزی غەریبی بۆ کۆیە و دۆستەکانی خۆی پشکێکی زۆر بەرچاوە، سەرەڕای بەرچاوی، لە هەڵبەستە هەرە سۆزناکەکانیەتی کە بێ فێڵ و بێ هەناسەسواری لە ناخی دڵیەوە هەڵدەقوڵن.

ڕووناکایەکەش ئەوەیە کە لە تەحەمول کردنی ئەم هەموو ئێش و ئازارەی دوور کەوتنەوەدا جارێکی تریش دوای دەیان جار لێمان مەعلووم دەبێ نەفسی سەرکەشی

حاجی تا چ ڕادەییێک دژی ئەو ئارەزۆیانەی هەڵوەستاوە کە بە نزمایەتی دەبەستنەوە، وەک یەکێک زۆری برسی بێت بەڵام نەچێتە سەر بانگهێشتنێک کە لە ڕیزی سەرووی داوەت کراوەکاندا جێی نەکرێتەوە.

ئەگەر ئیمکان هەبێ هەموو شتێک مافی تەواوی خۆی پێ بدرێت، لە پێویست پێویستترە بۆ ئێمەی شوێنەوارتاریک و ڕابردوو بزرکراو، تۆز بتەکێنینەوە لەو هەڵوەستە پڕ شەوق و تینانەی کە تاکە قارەمانەکانمان دلێرانە تێیدا هەڵایساون چونکە لە دوو نوقتەی زۆر گرنگەوە سوودی لێ وەردەگرین.

یەکەم: لە تێوەڕامانی ڕابردوومماندا ڕووبەڕووی تاریکایی و بێ چرایی و بێ وەجاغی نابین، ئیتر کە ویستمان دیوەخانەیێکی فکر و ئەدەب و «هەڵوەست» ی کوردیی لە ئۆردوبازاڕی میللەتاندا بکەینەوە دەتوانین چراقۆدیلەیێکی خۆمانی تێدا هەڵکەین و نوقڵ و باسوغ و بادامی مەعنەویاتی کوردەواریشی تێدا پێشکەش بە مێوانان بکەین. ڕێبوارێکی بێگانە کە سەر بە ماڵە وێرانەکەماندا دەگرێت بەتەمایە کاڵاییێکی خۆماڵی ئێمەی تێدا ببینێت، زۆریش دڵشکستە دەبێ، پایەشمان لە بەرچاوی دادەشکێ، کە خۆی لەسەر سفرەی بەتاڵدا ببینێتەوە، بۆ ئێمەش مردەنییە پەکمان بە ئیفلاسی مەعنەویمان نەکەوێ. ئەو کەسەی حەز دەکات شانازیی کردن و لە خۆڕازییبوون لە ئیفلاسی مەعنەوییدا بدۆزێتەوە، بێگومان، دەمارێکی نەخۆشی «مازۆختەیی» لە نەفسیدا هەیە.

مرۆڤێک نەفسی نەخۆش نەبێ حەز دەکات لە زەمینەی «هەبوویی» یەوە بەرزتر بێتەوە، نەک لە بنی بیرەوە بەحاڵ سەر ئەرز بێتەوە.

دووەم: سەرەڕای ڕووناکبوونەوەی ڕابردومان، ئەم ڕۆژگارەشمان بە شەوقی چرای کوردیی ڕووناک دەبێتەوە. بەڕاستی بەر لە هەموو کەسێک ئەدیب و ڕۆشنبیر پێویستی بە ڕابەر و نموونەی نژادیی هەیە تا بتوانێ لە ئاهەنگی خۆ هەڵدانەوەی کۆڕی ئەدەبدا، وەک ئەدیبی میللەتانی تر، شانازیی بە ڕەسەنیی ئەدەبەکەی خۆی بکات کە دێت و درەختی خانەوادەی ئەدەبەکەی خۆی دەباتەوە بۆ سەر ئەو نموونە و ڕابەرانە. ئەدیبیش وەک هەموو ڕۆڵەیێکی ڕێز لەخۆ گرتو دەبێ حەز بە بەرزیی ئەو باوک و باپیرانەی بکات کە ڕابەر و نموونەی ئەدەبن نەک وەک ئەو سواڵکەرە

بێت کە هەستی بە خۆ نازینی پێ نەماوە و دەم نادەم لە ڕووتەڵەیی خۆی زیاد دەکات بۆ بزواندنی بەزەیی خێرەومەندان.

من لەگەڵ ئەوەشدا کە دەزانم ئەدیب نابێتە ئەدیبی ڕاست و دروست ئەگەر ئاگاداری ئەدەبی میللەتانی تر نەبێت و لە زادی مەعنەویی ئەوان تێر و تەژی نەبێت، زۆر جارانیش دەبێ چاو ببڕێتە هەڵوەستی ئەدیبەکانیان بۆ بەهێز کردنی هەڵوەستی خۆی، دیسانەوە هێندەی بڵێی نارەحەت دەبم کە ببینم ئەدیبێکی کورد لە کاتی ڕازاندنەوەی نووسینەکەی بە هێنانە ناوی شێوە مرۆڤایەتیی پڕ دەلالەت و شانازیی مرۆڤێکی غەیری خۆی، هانا بباتە بەر هەڵوەستی مرۆڤی غەیری کورد لە حاڵێکدا نموونەی قارەمانەتی لە نێوان ڕیزی میللەتەکەی خۆیدا بەرچاوتر و کەڵەگەتتر و گەشتر لە هی بێگانە پەیدایە، یاخود هەر نەبێ وەک هی بێگانەیە لە هەموو تەرازوییێکی نرخ هەڵکێشدا. عوزرێکی بەدەست نووسەرێکی کوردەوە هەبێت لەم هەڵوەستە بەرەواژەیدا هەر ئەوەیە قارەمانانی بێگانە لە سەریان نووسراوە و پەیکەریان بۆ دروست کراوە و فیلمیان لەسەر دەرهێنراوە و گەورایەتیەکەیان خراوەتە بەر عەدەسەی گەورەکەرەوە، لە حاڵێکدا قارەمانێکی کورد لە ژێر تاریکاییدا شراوەتەوە، چ جایی ئەوەی لەسەری نووسرابێ وەیا پەیکەری بۆ کرابێ[94]. بەڵام بەڕاستی ئەمەیە پێی دەڵێن عوزری لە قەباحەت گەورەتر چونکە یەکێک لە داخوازیە هەرە سەرەتاییەکانی لە ڕۆشنبیر دەکرێت ئەوەیە خۆی نەکاتە ڕێکۆردەری شریتی پڕکرایەوە وەیا جامی کامێرای ڕەسمی بە تایبەتی کە پڕبوونەوەی شریتەکە و نەقش بەستنی وێنەکە ڕێ لە بابەتی میللەتەکەی خۆی بگرێت.

لە ئەدیب و خاوەن فکری کورد داوا دەکرێت نەک هەر هەڵوەستی قارەمانانەی میللەتی کورد و تاکەکانی کورد بخاتە سەر ڕووپەڕەی مێژووەوە بەڵکوو دوای بەجێ هێنانی ئەم فەرمانە جارێکی تریش لەسەریەتی هەڵوەستی شەرافەتکارانەیان بکاتەوە هێز پێدەری نووسینەکانی خۆی بە یاد کردنەوەیان و پەند لێوەرگرتنیان.

---

[94] دوای گەلاڵە کردنی ئەم نووسینە کە لە 1972دا دەستی پێکراوە لە ساڵی 1973دا لە کۆیێ پەیکەرێکی بچووک بۆ حاجی قادر بەرپا کرا.

ئەم هەڵوەستەی حاجی قادر لە ناو ئاگری بێ دەرفەتی دوو هێزی موتەناقیزی «وڵات خۆشویستن و تێدا نەحەوانەوە» دا کە ئەنجامەکەی دەرکێشرانی ڕەگ و ڕیشاڵی بوو لە ناخی مەفتەن و جەرگەی خزم و خوێش، لەو هەڵوەستە کەممانەندانەیە کە ئەگەر لە تاکی میللەتێکی نەناسراوی وەک کوردەوە نەبوویایە مێشک و دڵی گەورەترین نووسەرانی خەریک کردبایە. دەزانین چیرۆکنووسی زۆر مەزنی ئەم جیهانە کتێبی گەورەی داناوە لەسەر شی کردنەوە و دیارخستنی ئەو هۆیانە و دەوروبەرانە و هێزە نەفسییانەی تاکێکی بەرەو قومار بردوە، نووسینەکەش کراوە بە فیلم و لە سەرتاسەری دنیا تەماشاکەری بۆ خۆی ڕاکێشاوە، دەشزانین قومارچی نموونەی تاقمێکی کەمی میللەتە، واتە لەلایەن نواندنی «چەند»ەوە مەوداکەی بەرتەسکە، لەلایەن «چۆن» یشەوە ئەگەر تاکەکە نەکرێ بە ئاوێنەی باری کۆمەڵایەتی و ژیاریی (حضاري) و ڕاستییەکانی تری کۆمەڵ، قومارچی لەوانە نیە «چۆنایەتی» میللەتێک نیشان بدات وەیا لەو چۆنایەتیانە بێت لەبەر نرخی زیادی چاوپۆشی لە کەم دەلالەتی بکرێت.

بەڵێ من دەزانم نووسینی ئەدەبی لەم بابەتە دەبێ هەبێ، لەوانەشە نووسینەکە بەهۆی هێزی خاوەنەکەیەوە وەک گەوهەر وابێ لە ناو نووسینانی تری وەک ئەمدا. ئەمە ڕاستە و جێی سەرپێچی نیە، بەڵام لەمە ڕاستتر و بایەخدارتر ئەوەیە واقیعی تاکێکی تری وەک حاجی قادر، کە قورماچی نیە و ڕێز لەخۆ گرتوە، نموونەی تاقمێکی کەفەلوولکاویی نیە و نموونەی پۆپی شەرەفی میللەتێکە، بە دەوری مێزەکانی قومارەوە بێنرخ نەبوە لەسەر سفرەی مێژووی مرۆڤایەتی باری هەرە سەرەوەی گرتوە، فیشە و پارەی کاغەزانیش ئیفلاسی پێ نەکردوە نەفسە بەرزەکەی ژووروری تەماعی خستۆتەوە... مەبەستی شەخسی لە مەفتەن هەڵی نەقەناندوە، سەردانەنواندن بۆ بارە نالەبارەکانی ئەو مەفتەنە هەڵی داوە بەرەو غەریبی و ئاوارەیی و تەنهایی و نەداریی هەتاهەتایی، بەڵێ واقیعی پیاوێکی وەک ئەم حاجی قادرە لە دەمی دەرکێشرانی ڕیشەی لە هەناوی مەفتەن و میللەتەکەی کارەساتێکە خۆی لە خۆیدا، بێ تێخوێندنەوەی سۆزی کوردایەتی و ئاشنایەتیی نێوان ئێمە و حاجی، لەوانەیە گەورەترین هۆش و هێژاترین خامە بە خۆیەوە خەریک کات. لەوانەی بە «ماکبث» ەوە خەریکبوون وەیا گەردەلوولی دوای «گیڤارا» دەکەن بە کلی چاوی شۆڕشگێڕان.

بەڕاستی ئەم هەموو لایەنە کۆمەڵایەتییە و ڕامیارییە و ئابوورییە و مێژووییە و مرۆڤایەتییەی کە لە هەڵکەوتی پچڕانی ڕەگی حاجی بە خاکی کوردستانەوە وەک گرێ تەندوور ڕووی تەماشاکەر هەڵ دەپڕوکێنێت بە دەگمەن نەبێ لەو هەڵکەوتانەدا بەدی ناکرێت کە ئەدیبە زلەکانی جیهان کردویانە بە زەنگی قەدەر لە بەر گوێچکەی هەموو ئادەمیزاددا. چ لە ڕووی پەژارەیی و کەساسی و کزیی ئەو میللەتەوە بێ کە زەرفی بەسەرهاتەکەیە، چ لە ڕووی بەرزی نەفسی ئەو قارەمەنەوە بێ کە ئازاری ماددی و مەعنەوی دڵی ئەنجن ئەنجن دەکات، چ لە ڕووی ژان و ژواری عەمەلیەتی دەرکێشانەکەوە بێ کە تەواوکەری سەر لەبەری تراجیدیاکەیە.

کارەساتی ئاوارەبوونی یەکجاریی حاجی قادر گەلێک زیاتر نوێنەری مێژووی زوڵم کردن و زوڵم لێکرانە لەو بەسەرهات و چیرۆکانەی کە بەلای خۆیانەوە هەڵوەست و هەڵکەوتی پڕ دەلالەت دەکەن بە ئاوێنەی مێژووی ستەم چونکە لە زەحمەت زەحمەتترە چیرۆک بتوانێ میللەتێکی بە قەدەر میللەتی کوردی ئەو ڕۆژگارە زوڵملێکراو بکاتە زەرفی بەسەرهات و کارەسات، خۆ هەر مومکین نیە تەمەنی زوڵم لێکرانی هیچ میللەتێکی تر ببردرێتەوە بۆ دووسێ هەزار ساڵ لەمەوبەری بەسەرهات وەک کە میللەتی کورد بەڕاشکاوی بۆ ئەو ماوەیە تێهەڵدەکشێ لە مێژووی زوڵملێکراویدا. وێڕای زەرف و تەمەنی زوڵمەکە، یەکجار زەحمەتە چیرۆکنووس لە واقیعی مێژوودا نموونەیێکی تری ڕاستەقینەی وەک حاجی قادر بدۆزێتەوە کە بەنیسبەت میللەتی خۆیەوە (وەیا زەرفی بەسەرهاتەوە) ئەو بێمانەندە بێت چونکە زوربەی ئەو قارەمانانەی چیرۆکنووسان پەیکەری نایابی و سەرامەدییان بۆ دەتاشن لە واقیعدا کەم و زۆر هاوسەنگیان هەبوە بەڵام ڕێکەوتێک وەیا زەرفێکی تایبەتی خستونیەتە باری بێمانەندی و سەرامەدییەوە، لە حاڵێکدا حاجی قادر بێ یارمەتیدانی زەرف و هەڵکەوت و ڕێکەوتی دەرەوەی وجودی خۆی لە هەڵوەستێکی بێمانەندا ڕاوەستاوە کەوا لە هەر گۆشەیێکەوە سەیری بکرێت دەبێتە نموونەی دەرس لێوەرگرتن و بەرابەر زانین کە نموونەی تر لە تەک ئەودا کز دەبنەوە ئەگەر سەرلەبەری مەسەلەکە لە جێگە و لە ناو میللەتێکی کزدا ڕووی نەدابایە.

ئاوارەبوونی حاجی قادر لە لایەن نواندنی سۆز و پەرۆشی مرۆڤایەتی بە دیار ڕووداوی پڕئێش و ئازاری بێ دەرمانەوە... بە دیار چارەنووسی ڕەش و تاریکی مێژووکردەوە، لەو کارەساتە عادەتیانە نیە بە ئاسانی لە هەگبەی ڕێبواری قافڵەی

مێژوودا بە دوا دەست تێگیرانی بە پەلەدا بێت چونکە هەر نموونەیێکی زەق و بە پۆز هەیە لەوانەی مەشووری داستانانن هیچ یەکێکیان دەست نادا ببێ بە جێگەی موقارەنە لەگەڵ حاجی قادردا نەک هەر لە ڕوویەکەوە بەڵکوو لە زۆر ڕووەوە:

1) کەم وەها بوە، ڕەنگە وەک نەبوو وابێ، ئاوارەبوون تاکە یەک ڕێگەی حوکمی قەدەر بووبێت وەک کە ئاوارەبوونەکەی حاجی تاکە یەک ڕێگە بوو لەبەر هەنگاویدا. ئەگەر ئاوارەبوونی یەکێکی تر تەشبیهـ بکەین بە تەلەزگە بەستنی تاشە بەردێک کە پاڵی پێوە دەدرێت، ئاوارەبوونی حاجی وەک گلۆربوونەوەی ئەو تاشە بەردەیە کە ئەگەر بشیگری هەر گلۆر دەبێتەوە چونکە خاکەکەی ژێری داخوراوە و خۆی بە بۆشاییەوە ڕاوەستاوە. دەتوانم لە موقارەنەدا بڵێم حاجی ئەو ئاوارەیە بوو کە قەدەر پێی نەدەکرا لە ئاوارەبوونی بوەستێنێت و بە خاکی مەفتەنەکەیەوە ببەستێتەوە.

2) جارێکی تریش بێمانەندیی نموونەی حاجی لەوەدا دێتەوە کەوا نەک هەر بێشکەی لێ بەوەلەدبوون و تێدا گەورەبوونی لێ حەرام بوو، هەموو کوردستان بۆی بوو بە ئەرزی حەرام چونکە هەمان هێزی پاڵپێوەنەری نەفسی و مێژوویی و کۆمەڵایەتی کە لە کۆیەی دەرپەڕاند لێی دەبۆوە بە بەرهەڵست لە هەر شوێنێکی تری کوردستان کە حاجی پێی کرابا تێیدا بژیت. ئەم وەتەنگ هاتنەی هەموو وڵات لە ڕوڵەیێکی خۆی، بە تایبەتی ڕۆڵەی وەها دڵسۆز و بەشەرەف و هەستیار و هۆشیار، ناوناوە لە زەمینێکی زۆر دوور و درێژدا پەیدا دەبێ یان نابێ.

نووسەرێک بیەوێ خامەی بەناو بەسەرهاتێکی حەقیقیی بێمانەندا بگێڕێت دەبێ خەریکی ئەم بەسەرهاتە پڕئازارەی ئاوارەبوونی حاجی بێت وەیا بەهێزی قەڵەمەکەی هەڵکەوتێکی تری وەک ئەو لە خەیاڵەوە بتەنێتەوە.

3) هەروەک ئەو لایەنە زاتییانەی کە لە حاجیدا کۆبوونەتەوە تەمغەی بێمانەندی لە کارەساتەکە دەدەن، هەروەهاش باری کۆمەڵایەتی و زەرفی مێژوویی و هەموو سەروبەرێکی کۆیە و کوردستان لە بێمانەندیی

کارەساتەکە زیاد دەکەن چونکە «زەرف و زات» وەک منداڵدان و منداڵ لە یەکتر وەردەگرن و بەیەکتر دەدەنەوە، بەڕادەی هێزی بەیەکەوە بەسترانەوەشیان ئازاری لە یەکتر دابڕینیان پتر دەبێ، لەم حاڵەتەی حاجییشدا پێوەندیی نێوان زەرف و زاتەکە ملْک و ماڵ و پارە نەبوە، هەرچی هەبوە لە ڕوحی و مەعنەوی بوە، بۆیەیشە بە هەموو عومری غەریبی و ئاوارەیی ڕۆژەک لە ڕۆژان یادی ئەو زەرفە لەو زاتەدا کز نەبۆوە، بەپێچەوانە دەم لە دەم پتر گڕی دەستاند.

4) تیشکێکی زۆر بەهێزی دواڕۆژ و ئاکامی ئاوارەبوونەکە دەگەڕێتەوە بەرەو ئەو ساتەی کە هەڵبڕانەوەی پێوەندیی حاجی بە کوردستانەوە تێیدا ڕووی دا و پتر ئێش و ئازارەکەی ئاشکرا دەکات: ئاوارەبوونی حاجی ڕوەو خۆشی و کەمبوونەوەی ئازار نەبوو وەک کە زۆر جاران هەرچی ئێش و ئازار هەیە لەگەڵ دەست پێکردنی ئاوارەبوونەکە کۆتایی دێت. ئێمە ئەگەر بە هەموو هەست و زانینی ئێستاکەمانەوە لەو ڕۆژەدا ژیابایین کە حاجی بەرەو غەریبی دەچوو، نەمان دەتوانی بەقەدەر ئێستاکەمان لە قووڵایی تراجیدیاکە بگەین چونکە ئەوسا نەمان دەزانی کۆتایی عەزابی حاجی بە ئاوارەبوون نایەت، بە پێچەوانە لەوانە بوو بڵێین سەفەری خێرە و بەرەو خۆشیانە.

خولاسە نموونەی تەواوتر و بێفێڵتر بۆ هەڵوەستی تراجیدیی پڕ کڵپە و خاوەن دەلالەتی کۆمەڵایەتی بە واتای هەرە بەرینی، لەم هەڵوەستەی حاجی قادر لە دەمی پچڕانەوەی لە هەناوی خاک و میللەتەکەی، پەیدا نابێ وەیاخود یەکجار بە زەحمەت پەیدا دەبێ. نووسەری کوردیش ئەگەر چاوی ڕەشکەوپێشکەی نەکردبێ وەیا عەدەسەکانی وەرنەگەڕابن لێی ناسەلمێندرێ نیگای خۆی لەم کارەساتە بۆ نموونەیەکی تری غەیری کورد، ئەو نموونەیە هەرچی دەبێ بابێ، لە چ مەیدانەکیش دەبێ بابێ.

ڕەنگە بۆرە عوزرێک لەوەدا بهێنرێتەوە کە بگوترێ نموونەی غەیری کورد بەلای هەموو عالەمەوە ناسراوە لە بەر ئەمە نووسینی کوردی بەلای بێگانەوە ئاشناتر دەبێ

ئەگەر نموونەکانی ئاشنا بن، بەڵام ئەم بۆرە عوزرە پتر قەباحەتەکەی نووسەری کورد دەردەخات چونکە خۆی لە خۆیدا ئەوە ئیسپات دەکات کە نووسەرەکە پێشتر گوناهێکی گەورەتری کردوە بەوەدا هەوڵی نەداوە قارەمانی میللەتەکەی بە بێگانە بناسێنێت تاکوو دواتر لە نووسینی خۆیدا بە نموونەی مرۆڤایەتی بیهێنێتەوە بەر نیگا و هۆشی خوێنەری غەیری کوردەوە.

ئەوەی ڕاستی بێ تاکێکی هەڵکەوتووی کورد کە بشێ ببێتە نموونە و ڕابەری پەندی مرۆڤایەتی لە نووسیندا، بە تایبەتی ئەو تاکەی کە لە صەدەی نۆزدەم و زووتردا ژیاوە، بە هۆی ئەو ژیانە سادە و سافیلکە و بێگەردە و ئالوودەی چڵکی دنیا نەبوویەوە کە بەسەری بردوە و بە پاکیی لێی بۆتەوە گەلێک شیاوتر و لێهاتووتر و پڕشانازیترە لە تاکێکی تری میللەتێکی تر کە لە ژیانی پڕ دەنگ و هەرا و تێکهاویشتنی پوورەهەنگیدا چەندین جار قوڕاویی بوە و لە بەندیخانەی سەرخۆش و بێپەردانڈا شەوی بە ڕۆژ گەیاندوە وەیا لەسەر بێپارەیی لە قومارخانان و خانەی گومانلێکراو دەرکراوە... وەیا... وەیا... کە هەموو شارەزاییێکی ژیانی دووسێ صەدەی دوایی ئەورووپا دەیزانێت و لە خوێندنەوەیدا ڕووبەڕووی بوە. گەلێک لەوانەی ناویان بە ئەدیبی بێهاوتا و مرۆڤدۆستی قارەمان دەرکردوە بە جۆرێک غەرقی ژیانی بەدمەستی و بێپەروایی بوە پڕیشکی ئەو زەلکاوانە بە ئەدەب و مرۆڤایەتیەکەشی هەڵپرژیوە. بەڵێ منیش دەزانم ئەم ئالوودەبوونە بە چڵکی ژیانی تێکەڵپێکەڵ و پڕگرێوگاڵ و تەنگوچەڵەمەی ئەورووپای دووصەد سێصەد ساڵی دوایی ئەنجامێکی ئاسایی و مەفهومە، ڕەنگە هەندێ جاریش هەڵێنجانی واتای مرۆڤایەتیی ڕەسەن لە ئاکامی بەیەک کەوتنەوەی گەوهەری نەفسی بەرز و چڵکی ژیان پتر قووڵبوونەوەی بووێت و باشتریش ئیمانمان بە ڕەسەنیی مرۆڤایەتیەکەی ئەو تاکە و هەموو ئادەمیزاد مەحکەم بێت لەو ڕووەوە کە دەرچوونی مرۆڤ لە ئیمتیحانی سەخت زیاتر پەسندایەتیی مرۆڤەکە بە ئیسپات دەگەیەنێت، بەڵێ ئەمانە دەزانم و لێشیان ڕازیم بەڵام لزوم نابینم لە پەنا ئەمانەدا ڕاستیی تری پڕ نرخ و بایەخ لە بیر خۆم ببەمەوە: قبووڵ کردنی عوزری ئەدیبێک لە قوڕاویبوونی وەیا کەوتنی وەیا زەعیفبوونی بەدەست ژیانی تێکەڵپێکەڵ و بێڕەحمەوە نابێ ببێتە هۆی ئافەرین نەکردن لە قوڕاویی نەبوونی ئەدیبێکی تر. حاجی قادرێکی پاک و سەربەرماڵ دەبێ بەحورمەتتر بێ لە حاجی قادرێکی کە هەر شەوە بە سەرخۆشیی لە قوژبنی

بەندیخانەییەکی ڕابواردبێت. قوڕاویبوون ڕاستییەکی بێنرخە، پاکی و بێگەردیش ڕاستییەکی بەحورمەتە. لەم ڕوانگەوە سەیری ژیانە سادە بێچڵکەکەی ئەدیبێکی وەک حاجی و نالی بکەیت، لە پەنا ئەوانیشدا دەموچاوە تفلێکراوەکەی ئەدیبێکی تری بەناوبانگ بهێنیتەوە بەر یادی خۆت وا دەزانم تۆش وەک من بەلای ئەو باوەڕەدا دەشکێیتەوە کە پەند وەرگرتن لە نموونەی مرۆڤایەتی و ئەدەبی تف لێنەکراو پتر ڕێزی لێ دەگیرێت، یاخود دەبێ پتر ڕێزی لێ بگیرێت.

ئەدیب و نووسەری کورد ئازادە لە هەر جۆرە بیر کردنەوەیێک و قەناعەتێکی خۆی کە بە دەوری ئەم تەرزە باسەیانەوە بگێڕێت، بەڵام ئازادیەکەی هەر لەو سنوورەدایە کە خولیاکەی لە دڵ و هەناوی خۆیدا پەنگ پێ بخواتەوە مادام ئەو خولیایەی لەوانە بێت ملەچەرخێ بە بیروباوەڕی میللەتەکەی بکات بەرەو نموونە و ڕابەری غەیری کورد لە حاڵێکدا نموونە و ڕابەری کورد لە کۆڕی مرۆڤایەتیدا پەیدا بێت.

ئەمەی وەها… بادەینەوە سەر قسەمان لە ئاوارەبوونی حاجی.

لە هێندە شی کردنەوە و دیارخستنەی تا ئێستا کردمانە تیشک بە دەوروبەری وەزعی نەفسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و هەموو لایەنێکی حاجی قادر، بۆمان ڕوون دەبێتەوە ئەو هۆیانەی وایان کرد حاجی ئاوارە بێ گەلێک قووڵتر و پانتر و بنجیتر و مێژوویتر و کاریگەرترن لەوەی تاکە هۆی ستەمی شێخی ماوێلیی بە بەر خۆیانەوە بگرێت، هەروەهاش صەد جاران ئیفلاس بەو قسە سافیلکەیە دەکەن کە دەڵێ حاجی ئاوارە و دەرکراوی «دەرەبەگ» بوو. بەڕاستی جێوانەوەی بنیشتۆکەی وشەی «دەرەبەگ» لە تەعلیلی دیاردەی ئاوارەبوونی کەسانی وەک حاجیدا بە تەواوی وەک هێنانەوەی ناوی «شەیتان» ـە لە تەعلیلی ئەو بێشەرعیانەی کە دینداری سۆفیی مەشرەب دڵی خۆی پێ تەسکین دەکات. ڕۆشنبیری سەراو کە نەیتوانی بەرەو بنج و ناخی هۆی شتانەوە قووڵ بێتەوە وەیا ڕوحپەرەیی خۆهەڵدانەوە و خۆڕەپێش کردن دەستی لە هۆیەکی خۆشکەڵەی وەک شەیتان و دەرەبەگ گیر کرد، سەنگەرێکی مەحکەمی بیروڕای پووچەڵی ڕێز لێگیراو بە دەوری خۆیەوە هەڵدەنێت کە فلسێکی تێ ناچێت بەڵام گەورەترین و زۆرترین و بەشەرەفترین سۆز و پەرۆشی مرۆڤایەتی بە هەڵەبراویش دەکاتە دۆستی خۆی و بەرەنگاری ئەو کەسەشیان دەکات کە بڵێ شەیتان و دەرەبەگ دەخڵیان بەسەر فلانە بێشەرعی و

فیساره کارەساتەوە نەبوە. کێ دەوێرێ ڕووی شەیتان و دەرەبەگ سپی کاتەوە بە هێنانەوەی تەعلیلێک لە ڕووداوی ناخۆش کە ئەو دوانەی تێدا بەرپرسیار نەکرابن.

ئەی خوێنەری کورد، ئێمە لە پێشمانە باسی «دەرەبەگ» بکەینەوە لە کاتی هەڵسەنگاندنی هەڵوێستی حاجی بەرانبەر دیاردە زۆر بەرچاوەکانی کۆمەڵایەتیی کورد، بەڵام لێرەدا لە گۆشەی نیگای ئاوارەبوونی حاجییەوە سەیری دەرەبەگ دەکەین تا بزانین ئەو ڕایەی دەرەبەگ دەکاتە دەربەدەرکەری حاجی چەندی ڕاستیی پێکاوە و چەندیش بەهەڵەدا چوە.

من لێرەدا بایەخێکی ئەوتۆ نادەم بە ساغ کردنەوەی بوون و نەبوونی دەخلی دەرەبەگ بەسەر دەربەدەر کردنی حاجییەوە چونکە بەر لە من حاجی قادر بە هەڵبەستی خۆی ئەم لایەنەی بۆ ساغ کردووینەوە و شادیەدی داوە لەوەدا گەورەترین دوو کەسی دەرەبەگی ئەوسای کۆیێ نێزیکترین دوو دۆستی ئەو بوون، بە هەڵبەستیش لە ئەستەمبۆڵەوە مەدحی هەردووکیانی کردوە.

ئەوەی ڕاستی بێ یەک لەو دوو دەرەبەگانە تاکە یەک براگەورەی دنیاییە کە حاجی لە کۆیێ بەر لە ڕۆیشتنی بۆ تورکیا مەدحی کردوە... ماشاڵڵا ئەم جیهانە چەند گاڵتەچییە: حاجی قادر بەر لەوەی مەدحی کوردستانی کردبێ مەدحی دەرەبەگی کۆیێ کردوە، کە کەوتە سەر مەدحی کوردستانیش لە مەدحی دەرەبەگانی زیاد کردوە... مەعلوومە دوو دەرەبەگەکە یەکیان «ئەمین ئاغای حەوێزی» و ئەوی تریشیان «حەماغای غەفووری»یە کە لە سەردەمی حاجی قادردا ناودارترین و دەسەڵاتدارترین کەسێک بوون لە کۆیێ پێی بگوترێ «دەرەبەگ». دیوانەکەی حاجی چەند نموونەیێکی بەهێزی تێدایە لە مەدحی ئەم دوو مرۆڤە کەوا هەم چاکەیان بە ئیسپات دەگەیەنێت و هەم ئەو قسەیەش بە درۆ دەخاتەوە کە بڵێ دەرەبەگ حاجی قادری ئاوارە کردوە.

سەیر لەوەدایە ئاوارەیێکی تریش کە کەیفیی جوانڕۆییە و بەدوا حاجی قادردا کۆیەی پێ تەنگ کرا لە لایەن مامۆستای خۆیەوە، کە نێزیکترین برادەری حاجی قادر بوە، دەرپەڕێندرا... سەیرتریش ئەوەیە دوای دەرکردنی کەیفیی دەرەبەگێک (ڕەشید ئاغای حاجی بەکر ئاغا) کاغەزی بۆ نووسی و تەکلیفی گەڕانەوەی بۆ کۆیەی لێکرد... هەرە سەیرتریش ئەوەیە، «کەیفی» نامەیێکی

هۆنراوەی هێندە حورمەتکارانە بۆ ئەو دەرەبەگە بە وەرام دەنێرێتەوە کە چی تری بەبەرەوە نەبێ:

ئەی نوحی نەجاتم لە دەسی چەرخی جەفاکار
وەی ماڵ و سەر و جانی منت جوملەبێ نیثار

بەڵێ، بێگومان دەوری دەرەبەگ لە دەربەدەر کردنی حاجی ئەگەر هەبوویایە دەورێکی پێچەوانە دەبوو، واتە نەیدەهێشت حاجی کۆیێ تەرک کات هەروەک دیتمان دەرەبەگێک دەیویست کەیفیی بۆ کۆیێ بهێنێتەوە بەڵام بێبایەخبوونی ئەم باسەی دەرەبەگ لە سەروبەری ئاوارەیی حاجیدا هەر لەوەندە ڕاناوەستێ کە چ دەورێکی تێدا نەبوە، هەر بەو پێیەش بەسەهوو چوونی ئەو کەسەی دەربەدەریی حاجی بۆ دەرەبەگ دەگێڕێتەوە لەوەندە سەرلێشێواویە ڕاناوەستێ کە هۆیەکی درۆزنی کردە پێکهێنەری ڕووداوێکی وەها گرنگ: بەولای ئەم ئاکامە ڕووکەش و سەراوانەوە، ڕاستیی یەکجار گرنگیش لە بوون و مێژوو و چارەنووسی کورد لەودیو ئاوارەبوونەکەی حاجی پەنهان دەمێننەوە و مێشکی بیرکەرەوەی کوردی بەسەردا دەکشێت.

بە نموونە دەڵێم من کەهاتم گوتم جنۆکە و دێو مانگ و ڕۆژ دەگرن هەر ئەوەندە هەڵەیەم نەکردوە کە هۆیەکی درۆزنم کردە پێکهێنەری ڕۆژگیران و مانگگیران، بەولای ئەو هەڵە سافیلکەوە هەرچی ڕاستییەکانی فەلەکیش هەیە هەمووم زندەبەگۆڕ کردوە. بەڕاستی چ فەرقێک نیە لە نێوان ئەو کەسەی نەسەلماندنی دەوری دێو و جنۆکە لە ڕۆژگیران و مانگگیراندا بە کوفر دادەنێ لەگەڵ ئەو کەسەی بەدرۆخستنەوەی دەوری دەرەبەگ لە ئاوارەبوونی حاجی و ئەمسالی حاجیدا بە ڕەجعیەت دادەنێ. لە هەردوو حاڵدا نەسەلمێنی دەوری جنۆکە و دەرەبەگ ڕاست دەکەن، داواکاری ئەو دەورەش بە ناخی تاریکبیرییدا دەچنە خوارەوە.

ئەو بیرە تەنکانەی بە ڕاشکاوی لە ژێر سێبەری فکری حازر بەدەستدا گیروگرفتی کۆمەڵایەتیی کورد وەها تەنگ و باریک دەکەنەوە کە لە ژێر تاکە تیرۆگی «دەرەبەگایەتی»ـدا وەک نان پان بێتەوە و بخرێتە سەر ساجی مێژوو تاکوو بە

برژاوی لەسەر خوانی ڕۆشنبیری کوردییدا دابنرێت و نەوباوی کورد پێی تێروتەسەڵ بێت، بەڵێ ئەو بیروڕایە تەنکانە نە دەزانن کورد چیە... نە دەزانن گیروگرفت چیە... نە دەزانن مێژوو چیە... نە دەزانن دەرەبەگ چیە... نە دەزانن چەوساندنەوە چیە... نە دەزانن ئابووری چیە... نە دەزانن حاجی قادر چیە... نە دەزانن هیچ شتێک چیە... نە لەم قسانە دەگەن... نە ئەگەر تێیان گەیشتن دەتوانن بیانخەنە بەر حوکمی واقیعی ڕاست و ڕەوانەوە.

تەنکبوونی ئەو بیروڕایانە لەو ڕادەیەدایە ئەگەر هەموو ئەوشتانە و غەیری ئەو شتانەش بە ناو قەفەلولکەیەدا نەیەت، کە وەک کونی دەرزی دلۆپ دلۆپ ڕووداو و هەڵوەست و مێژوو و تاک و کۆمەڵی دەسکرد و لەقاڵبدراو بەڕێ دەکات، تێیان ناگات، تێشیان بگات باوەڕیان پێ ناکات، باوەڕیشیان پێ بکات نایان سەلمێنێ، بشیان سەلمێنێ ئینکاریان دەکات ئینکاریشیان نەکات دانیان پێدا نایەنێت، دانیشیان پێدا بێنێت بەکاریان ناهێنێت. یەکێک بەو کەسە بڵێ دەرکراوی دەرەبەگە کەوا خۆی مەدحی دەرەبەگی کردوە، پەکی ئەوەی دەکەوێ لە هیچ مەیدانێکی سیاسەت و فکردا بوێرێ دان بە ڕاستییدا بهێنێت چونکە هەتا خەریک بین ڕاستییێک بدۆزینەوە لە شتی سەر بە کۆمەڵایەتییدا کە هێندەی هەڵبەستەکانی حاجی بێ تەگەرە و ڕەوان بن ناگەین بەهیچ ئاکامێک. ئەگەر پێمان داگرت لەسەر ئەوەی حاجی قادر دەربەدەرکراوی کەسانێکە کە حاجی خۆی لە ئەستەمبۆڵەوە ئەمانەی بۆ ناردوون:

دو ئاغای ماوە وەک بیستوومە ئەخبار
ئەمین ئاغا و حەماغای صاحیبی کار

ئەمین و پشتیوانی قەصری میللەت
نیگەهبانی خەزێنەی مڵک و دەوڵەت

لە دونیادا خودایە هەر بمێنن
بینای بێ ئیتیفاقی هەڵکەنێنن

وەیا ئەمانەی بۆ ناردوون:

که نەفعێکت نەبوو بۆ مڵک و میللەت
به من چی نەقشبەندی یانه مانی

کەسێ پیاوه که دانێ وەک حەماغا
له بۆ ئەبنایی جینسی نان و خوانی

وەیاخود وەک ئەمین ئاغا به هیمەت
بکا بۆ قەصری میللەت پاسەوانی

بڵێ لەم بەحسە هەرکەس مونکیری تۆن
بفەرموو سەهله ڕێگای ئیمتیحانی

دەبێ خەریک بین ئیسپاتی ئەوەش بکەین که گەورەترین ناحەزی «لەیلا» شەخسی «مەجنون» بوە وەیا خۆبەختکەرەکانی «ستالینگراد» دەیانەویست شارەکە بێ شەڕ تەسلیم به نازی بکەن وەیا «گوتنبەرگ» به داهێنانی چاپ دژی خوێندەواری هەڵدەستا...

من له سەراوی و سافیلکەیی قسەی ئەوتۆیی بۆ شەخسەکە به پەرۆشم که چۆن دەتوانێ تا ئەو ڕادەیە پشت له ڕاستی بڕوات. بۆ دەبێ ڕۆشنبیرێکی کورد وەها چاو نووقاو بێ تیشکی ڕۆژی نیوەڕۆ نەبینێت. پەرۆشم له ئاست هەڵە تێخستنی باسی ئاوارەبوونی حاجی قادردا بۆ خودی باسەکە نیە که دەتوانین به دوو دێڕ نووسین و دوو بەیتی حاجی ڕاستی بکەینەوە، پەرۆشم بۆ شتێکی یەکجار لەم شتە بێبایەخ و بێنرخانه گرنگترە که پێوەندیی هەیە به بوون و مێژوو و چارەنووسی کوردەوە. ئەم بیروباوەڕە چەوتانە که خۆیان له خۆیاندا وەک ژەنگی سەر زیو وان و به پەنجە لێخشاندنێک دەچنەوە، خەتەریان لەوەدایە که زیوەکە دادەپۆشن و خۆیان دەکەن به ڕووی درۆزنی زیوەکە به جۆرێک که نەشارەزا لێی بەهەڵە دەچێت و وا دەزانێ ڕەنگی ژەنگەکە هی زیوەکەیە.

نووسەرێکی کورد وەیا خاوەن بیروڕایەکی کورد که دێت و بەزاهیر له ڕێی پەرۆش بۆ کوردەوە دەرەبەگ دەکا به هۆی دواکەوتن و هەموو نالەبارییێکی ژیانی کورد تا ئەو ڕادەیەی گوناهی ئاوارەبوونی دۆستی خۆشی هەر دەداتەوە پاڵی ئاگادار نیە لەوە دەردی کورد گەلێ کوشندەتر و کاریگەرتر و بێچارتر و بەردەوامترە لەوەی دەرەبەگ پێکیهێناوە. ئەگەر دەستێکی قودرەت هاتبا و به موعجیزە تۆوی دەرەبەگی

له کوردستان براندبایەوە و تاکێکی لێ نەهێشتبایەوە بۆ ئەوەی خاوەن بیروڕایەکی بەسەهوچووی ئەمڕۆی کورد کرمی دڵی خۆی بە جنێو پێدانی ئەو تاکە دەرەبەگە بکوژێ میللەتی کورد هەر ئەو پارچەکراوە دەبوو کە هەیە، هەمان ڕێی خەباتی سەختی لەبەردا دەبوو کە لە بەریەتی، هەمان هەڕەشەی کوشندەی لێ دەکرا کە بە درێژایی مێژوو لێی کراوە، وڵاتەکەشی ئەو نیوە ئاوەدانە نیوە شارستانە دەبوو کە دەیبینین. بە داخەوە و صەد جار حەیف و ئەفسووس و مخابن کوردی چارەڕەش وەک میللەتانی تر نەبوو بتوانێ ڕووبەڕووی دەردە کۆمەڵایەتیەکانی خۆی بێت و وەک ئەوان خۆتەرخانکردوو بکات بۆ چارەسەر کردنی ئەو دەردانە. کوردی قوڕبەسەر وەها لە ژێر پێلەقەی مێژوودا کەنەفت و لێکەوتە بوە حیسابی دەرد و دەرمانیشی لێ تێکچوە. لە حاڵێکدا میللەتی ڕووس وەیا فرەنسە وەیا تورک لە بارێکدا بوون کە بتوانن «دەرەبەگ» بە جەلاد حیساب بکەن، کوردی چارەڕەش لە بارێکی ئەوەندە سەختدا بوە و دەردی وەهای پێوە نووساوە کە لەچاو ئەواندا «دەرەبەگ»ی کورد بە شیفای دەردەکە شیاوە چونکە زۆر بە داخەوە کوردەکە چاری ناچار بوە لە ترسی دەردەکە پەنای هێناوە بۆ دەرەبەگ. بێسامانی و بێئامانیی دەردەکە لەوەدا بوە هەڕەشە کوشندەکانی کورد خۆی بەسەر هەموو کورددا هێناوە بە فەقیر و دەوڵەمەند و شار و گەدا و فەلاح و دەرەبەگیەوە، واش بوە بە یەک چەپەڵۆکی ڕمێنەری ڕووخێنەری بێ ڕەحم و ئینساف یەک تاکی کوردی چەپارە نەداوە، بەر لە هەموان دەرەبەگەکە.

لە بەیتی قەڵای دمدم نموونەیێکی ئەم دەردە بێ دەرمانە بێ ئەمانە بێ پایانە پەیدایە کەوا زۆر و کەم بە درێژایی مێژووی چەندین هەزارساڵە، کورد خۆی لە ئاست هەڕەشەی ئەوتۆییدا دیوەتەوە، نیوە خوێندەوارێکی سەرلێشێواوی کوردی ئەمڕۆکەش زۆر بە سافیلکەیی لە پشت چاویلکەی گەشبینەوە سەیری واقیعی کورد دەکات و وەها خۆی لێ بە سەهوو دەبات هۆی بنجی هەرە زۆری دەردەکانی کورد لە بیر خۆی دەباتەوە تاکوو بتوانێ بەپێی مەیلە ڕیزپەڕەکەی خۆی تاکە دەردی «دەرەبەگایەتیی» لە پارزۆنگی فەلسەفەکەیدا بکاتە خڵتەی کۆمەڵایەتیی کورد و وەک دۆنکیشۆت تێی بەر بێت... لە ئاکامیشدا نە هیچ دەرد دەرمان کراوە و نە کوردیش بستێک بەلای سەلامەتییەوە چوە.

ڕۆشنبیری کورد دەتوانێ ئاوڕێک لەو میللەتانە بداتەوە کە بەرداشی مێژوو هاڕینی و کردنی بە ئاردی ناو دڕک. کورد میللەتێکی نامزدە بوە بۆ هاڕدران و نەمان، هەموو ئەو کارەساتانەشی بەسەردا تێپەڕیوە کە میللەتی تری لەناو بردوە. تەنانەت بۆشی ڕێک نەکەوت ڕۆژەک لە ڕۆژان[95] هەلی دەسەڵاتداریی بگرێتە دەستیەوە وەک کە ئەو میللەتە لەناوچوانەی کە بەر لەوەی لەناو بچن دەسەڵاتدار بوون. تا دێین ئەو ڕاستییە پڕمەترسییە و کوشندەیە لە بیر خۆمان دەبەینەوە و دڵی خۆمان بەوە خۆش دەکەین کە گرتنی بینەقاقەی دەرەبەگی سەدان ساڵی پێش ئێساتەکەی کورد دەستنیشان کردن و چارەسەر کردنی گیروگرفتی کۆمەڵایەتیی کوردەوارییە، لەوە دەشۆرێین بە کەڵکی کورد بێین وەیا بشێین ببینە پزیشکی دەردەکانی کورد. ئەگەر چاوی خۆمان لە ڕاستییان نەبەستینەوە، زەق زەق دەبینین کورد ئەمڕۆکەش لە بارێکدا نیە بتوانێ بۆ خۆی ڕازی بێ وەیا ڕازی نەبێ بە مان و نەمانی دەرەبەگ. ئەمە دەڵێم لە حاڵێکدا باس کردنی «دەرەبەگ» لە کوردستانی عێراقدا وەک باس کردنی خەیاڵاتە چونکە یاسای کشتوکاڵسازیی نەک هەر دەرەبەگی نەهێشت، مڵکایەتیشی هێنایە ڕیزی مڵکایەتیی فەلاح، هەزاران جاریش دەستی خۆش بێت.

ئەم دەسەڵات بەسەرخۆدا ڕانەشکانەی کورد بەدرێژایی مێژوو هەموو بارێکی کۆمەڵایەتی و دەرد و دەرمان و چاکە و خراپەی کوردی سەرەوبن کردوە لەچاو باری میللەتێکی تردا کە دەسەڵاتی بەسەر خۆیدا ڕاشکاوە. مرۆڤی عەبد چەند بێچارەیە لەچاو مرۆڤی ئازاددا، میللەتی خاوەنی چارەنووس نەبوویش وەهایە لەچاو میللەتێکی تردا کە بە مافە هەرە گەورەکەی نەتەوایەتیی خۆی گەیشتوە، من و تۆش کە نەمانەوێ ئەم ڕاستییە بنجییە ژیوەرییە بهێنینە ناو حیسابی شی کردنەوەی مێژوویی و دۆزینەوەی دەرد و دەرمانی میللەتەکەمانەوە پێوەندیمان بە کوردەوە نامێنێت دەبینە سوارچاکی مەیدانێکی غەیری کوردایەتی و قەومایەتی و چارەنووسی نەتەوایەتی، کە لەوێدا بوون و نەبوون و بەسەرچوونی کورد و ڕەشبوونەوەی لە ڕووپەڕەی جیهان بایەخی پێ نادرێت چونکە بابەتی بایەخ پێدان

---

[95] من دەسەڵاتی ماد لەم لێکدانەوەیەدا تێناخوێنمەوە چونکە وەک دەزانین بەهۆی کورت بوونی ماوەی و بەرتەسک بوونی وڵاتەکەی نەیتوانی ببێتە چەپارەدەری میللەتی کورد، نەفۆتانی کورد بەرهەمی ماد نیە.

فکرەیێکی ترە غەیری قەومایەتی، وەک ئەوەی من خولیای خۆم باوێمە سەر مەوزوعی نەهێشتنی بەندیخانان لە هەموو دنیادا، واش بزانم نەهێشتنی بەندیخانە مرۆڤ دەحەسێنێتەوە، ئیتر گوێ نەدەمە فەقیری و دەوڵەمەندی و مافی نەتەوایەتی و چینایەتی و شەڕ و ئاشتی و هیچ شتێک.

ئاوارەبوونی حاجی قادر کە دەزانین پێوەندی بە دەرەبەگایەتییەوە نیە، ئەگەر لە فەرزی موستەحیل بەرهەمی یەکسەرەی دەرەبەگایەتیش بوویایە، بنج و بێخی دەگەڕێتەوە بۆ سەرچاوە ڕەش و لیڵ و تاریکەکانی مێژووی دێرینەی کورد، هەر نەبێ لە دوو شادەماری یەکجار ئەستورەوە:

شادەماری یەکەم ئەوەیە ئەگەر کوردی چارەڕەش ئەو بێ ماڵ و حاڵ و هەژار و چەوسایەوەی هەزاران ساڵ نەبوویایە ئەوەندەی بەبەرەوە دەبوو ڕێز لەخۆ گرتوێکی وەک حاجی قادر ژیانێکی وەهای تێدا بەسەر ببات کە لە خۆی بەعەیب نەزانێ. ئەدیبی وەک حاجی لە میللەتێکی تر هەمیشە توانیوەتی ئەگەر ویستبێتی، ژیانێکی مەیلەو موحتەرەم لەناو قەوم و خوێشی خۆیدا ڕابوێرێت، کە ئاوارەش بووبێت بەهۆی ناو و شۆرەتی میللەتەکەیەوە وەیا لەبەر نرخی زمانەکەی بەلای بێگانەوە هەر ڕێزی لێگیراوە و خۆشئامەدی لێ کراوە. خواجە کەلیمی هەمەدانی لە دەرباری مەلیکی دەلهی لە هندستان پتر لەمەفتەنەکەی خۆی بەرز کراوەتەوە، تەنانەت جارێکیان لە موناسەبەی مەدحی مەلیکەکەدا بە قورسایی خۆی ڕوپیەی پێ دراوە.

شادەماری دوەم ئەوەیە ئەگەر کورد یەکەم میللەتی لێقەوماوی جیهان نەبوویایە نەدەشیا سەرلەبەری کوردستان لە حاجی وەتەنگ بێت وەک کۆیەی لێ وەتەنگ هات. ئەدیبێکی فارس کە لە شیراز تۆرابێت لە ئەسفەهان بەخێر هێنراوە، موتەنەببی لە حەڵەب و «سەیفوددەولە» تۆرا چوە لای «کافوری ئیخشیدی» لە میسر کە هەردوویان وڵاتی عەرەبن...

کە ورد بیتەوە لەو یەکچونییەی هەموو کوردستان بۆ حاجی قادر لە نوقتەی نەزەری مومکین نەبوونی تێدا ژیانەوە، جارێک و دوو جاری تریش لایەنی چارەڕەشیی مێژوویی و میراتی کوردت بۆ ڕوون دەبێتەوە لەو ڕووەوە کە ئەگەر مێژوو فرزەی کوردی نەبڕی بوایە و کەنەفتی نەکردبایە دەشیا لەو کوردستانە پان و بەرینەدا کونێک هەبێت پیاوی ئابڕووداری وەکو حاجی قادر بحەوێنێتەوە و

ئابرووشی بپارێزیت. خۆ ئەوەی ڕاستی بێ ئەو دەردە بێدەرمانە چارەڕەشییەی مێژوویی و ئەزەلیی کورد وای کردبوو زمان و ئەدەبی حاجی قادر لە بەشی هەرە زۆری کوردستاندا نائاشنا بێت و کڕیاری نەبێت. نەبوونی زمانێکی ئەدەبی کوردی یەکگرتووی ئاشنا لەبەر گوێی هەموو کورددا خۆی لە خۆیدا بەرهەمێکی ڕاستەوخۆی ئەو دەردە بێدەرمانەیە کە چ پێوەندییێکی بە دەرەبەگ و شێخ و صۆفی و مەلاوە نیە، تاکە تاوانباری ئەم دەردەی کورد بڕیاری مێژووە.

وەک دەبینیت، ئەی خوێنەری کورد، گێڕانەوەی دەربەدەربوونی حاجی قادر بۆ دەرەبەگ چەند هەڵەیێکی بێڕەزای فکری و مێژوویی تێدایە:

1) سەپاندنی زرە درۆییێکە بە سەر ژیانی حاجی قادردا کە هەڵبەستەکانی خۆی داد و بێدادیانە لە چەنگ درۆیەکەدا. ئەم هەڵەیە گەلێک گەورەتر و ناقۆڵاترە لەوەی کە ترس و ستەمی شێخ نەبی بکرێ بەهۆی دەرچوونی حاجی لە کۆیێ چونکە هەر نەبێ حاجی لەگەڵ شێخ نەبیدا هەرای بوە تا ڕادەی نزیکبوونەوە لە کوژران. هەڵبەستی تاڵ و تفتیشی هەیە دژی شێخ نەبی بە پێچەوانەی مەدحەکانی بۆ ئەمین ئاغا و حەماغا.

2) تەنک کردنەوەی بارستی زۆر ئەستووری چارەڕەشیی کوردە کە بۆ چەند هەزار ساڵان سەرەژوور دەچێتەوە. بەم تەنک کردنەوەش چەند نرخی گەورەی مێژوویی و زاتی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و ڕۆشنبیریی ڕاست و دروستی کارەساتەکەی ئاوارەبوونی حاجی تێدەچێت هەروەک ڕاستییە هەرە زلەکەی چارەنووسی کورد تێبردرا. وەک لێشتەوە دیارە تاوانبار کردنی دەرەبەگ لە کارەساتەکەدا هیچ وەرامێکی ئەو پرسیارانە ناداتەوە کە بڵێ ئایا بۆچی حاجی نەچوە شوێنێکی غەیری کۆیێ لە کوردستاندا وەیا کام هۆی گرنگ وای کرد ئەستەمبۆڵ هەڵبژێرێت بۆ تێدا ژیان، لە هەموو ئەو شتانەش بێدەبگ دەبێت کەوا لەم نووسینەدا حیسابیان بۆ کراوە.

ئەم لێکدانەوانە و بەدرۆخستنەوانە و ئیسپات کردنانە سەرلەبەریان خزمەتی ڕاستی و حاجی قادر و کورد و کوردستانیان بەمەبەست گرتوە، هەڵبەت چ نیازێکم نەبوە لە ڕووی پەرۆشەوە تاوانێکی درۆزن لە دامەنی دەرەبەگایەتی بتەکێنمەوە کەوا باوەڕ ناکەم کەس هەبێ بەقەدەر من ڕقی لە هەموو هێز و دەسەڵاتی ناڕەوای دەرەبەگ

و بیرۆکراسی و هەرچی خۆبەدەعیە و فیزگرتوە، ببێتەوە، هەر ئەم قێز هەستانەم لە دەسەڵاتی نارەوایە وام لێخۆش دەهێنی کە لەگەڵ «معین» ی ژووری دایەرەکەم بە حورمەتی دوولایەنە و خۆشەویستانە برادەر بم. بە هەموو عومری وەزیفەشم وا بووم... دڵراحەتی بێپایان لەوەدایە پیاو بتوانێ بیروباوەڕی خۆی لە کردەوەدا بەکاربێنێت، نەک بە زار دۆستی بێدەسەڵات بێت و لە واقیعیشدا دەرگای ماڵەکەی و دایەرەکەی و دڵەکەی لێ داخات. وەک پێشتر گوتم جارێکی تریش جڵەوی خامە با دەدەینەوە سەر دەرەبەگ، بەڵام ئێستا هەر ئەوەندەی لەسەر دەڕۆم کە تازە لێی بوومەوە، واش دەزانم چەند جاران بایی ئەوە دەکات هەڵوەستی دەرەبەگ لە کارەساتی ئاوارەبوونی حاجی ڕوون بکاتەوە.

با بچینەوە بەرەو پیری ئاوارەبوونەکە خۆی.

ئێمە لەوە بووینەوە کە بزانین ترس و ستەمی شێخ نەبی هۆی ڕاستەقینەی دەرچوونی حاجی نەبوو لە کۆیێ، بەڵکوو ئەوپەڕی بایەخی ئەو ستەمە لەوەدا بوو کە بەهانەییێکی تازەی خستە سەر ئەو هۆیە پاڵپێوەنەرانەی کەوا بەهەمەحاڵ حاجییان لە کۆیە و کوردستان هەڵدەقەناند.

وەک من بۆی دەچم و بە درێژیش لەسەری ڕۆییشتم، دەرچوونی حاجی لە کۆیێ لە جووتە هۆی یەکجار کاریگەری:

1) دڵخوازی خۆی.
2) زەرفی ماددی و کۆمەڵایەتیی ئەوسای کوردستان و کۆیە و حاجی قادر بەرهەم هاتوە کە هەردووکیشیان لە پەنا بڕیاری نەفسە سەرکەشە لەخۆ ڕازییە بەخۆ نازیوەکەیەوە بوونە هێز و تەکانی ڕیشەهەڵکەنی خۆی.

ئەم بۆچوونە لە هەموو سەرێکەوە و بە هەموو لایاندا هەر ڕاست دەردەچێت، تەنانەت چوونی بۆ ئەستەمبۆڵ زێدە لە هەموو جێگاییێکی تر سەرلەنوێ بەڵگەییێکی بەهێزمان بەدەستەوە دەدات لەوەدا کە حاجی بەپێی بڕیار و دڵخوازی خۆی لە کۆیێ دەرچوو هەرچەند بڕیار و دڵخوازەکەش بە بنیچەی ماددی زۆر مەحکەم و پاڵەپەستۆدەریشەوە بەند بوویێت، واتە لە نرخی بڕیار و دڵخوازەکە شتێک کەم ناکا لە هۆی ماددیی وەیا نەفسی، ئەرێتی و نەرێتی، هەمەچەشنەوە پەیدا بووبن. دەلالەتی چوونی بۆ ئەستەمبۆڵ زێدە لە جێگەی تر، لەو ڕووەوە ئیسپاتی بڕیار و

دڵخوازەکەی حاجی دەکات کە ئەگەر دەرچوونی لە شێوەی ناچاری و بەهۆی ترس و لەرزەوە بوویایە، ئەستەمبۆڵی هێندە دوور و هێندە مەسرەف قورس و ناوچەی حوکم و خەلافەت ئەو جێگایە ئاسانە و نێزیکە نیە ببێتە حەشارگەی دەست و مستی پیاوی ناچار و ترساو.

صەدودە ساڵێک لەمەوبەر کە حاجی ڕووی لە ئەستەمبۆڵ کرد بە هەمووی یەک دوو پیاوی کۆیی توانیبوویان بۆ پێکهێنانی بەرژەوەندی گرنگ ڕێی ئەستەمبۆڵ بگرنە بەر، ئەویش دوای وەرگرتنی نامەی سفارش لە گەورەپیاوی میریی ئەوسای ویلایەتی موصل و سنجەغی کەرکووک. دیارە کە بەرژەوەندی گرنگ ئەوان کەسانەی بەرەو ناوچەی حوکم بردبێت سواری گوێدرێژ وەیا بە پێیان نەبوە، واتە ئەوانەی ئەو ڕێگەیان گرتبوە بەر سەفەری کولەمەرگی و کوێرەوەرییان نەکردبوو. خولاسەی قسە ئەوەیە، یەکێک عەزم بەستوو نەبێ بە بادی هەوا ناگاتە جێگەی وەک پایتەخت لە دوورایی هەزار کیلۆمەترەوە.

ئەم تێبینیانە زۆر ڕاستن، بەڵام لێرەدا پرسیارێک هەڵدەستێ. زانیمان حاجی بە دڵی خۆی ویستی کۆیە تەرک کات، ئەوەشمان زانی چ شوێنی تری وەک کۆیێ لە کوردستاندا نەدەبوو بە هێلانەی نوێی حاجی قادر، ئایا بۆچی حاجی جێگەیێکی تری غەیری ئەستەمبۆڵی نەکرد بە دڵخواز لە دەرەوەی کوردستاندا وەک بەغدا وەیا شام وەیا حەڵەب کە هەموویان لە ئەستەمبۆڵ نیزیکترن و ڕێگای گوزەرانیان لەو نزمترە؟ پێشتر شتێکمان لەم ڕووەوە گوت، چی ماوەتەوە بگوترێ ئەویش هەر لەو بابەتەیە و تێکڕای هەموو ئەو هۆیانەی دڵی حاجییان بۆ ئەستەمبۆڵ برد شتی ئاشکرا و بەرچاون و خێرا بیری مرۆڤیان بۆ دەکشێ. وێڕای ئەو هۆیانەی پێشتر باس کران دەشێ لێرەدا ئەم تێبینیانەش حیسابی خۆیان بۆ بکرێت:

1) هەرچەند ناوچەی حوکم مەسرەفی گرانترە لە شاری تر، بەڵام لەوانی تریش پتر کەسب و کاری تێدا دەدۆزرێتەوە. ئەم ڕاستییە ئێستا و ئەوساش کاریگەرە، هەر بۆیەیە هەمیشەکات پایتەخت خێراتر گەورە و قەوغا دەبێ. ئەم ڕاکێشانەی خەڵق بۆ پایتەخت دیاردەیێکی ئاشکرا و گشتیشە، واتە هەر وەک بە ئاسانی هەستی پێدەکرێ لە هەموو چین و بەرە و تاقمێکیش دەردەکەوێ نەک هەر لە پیاوی فکر و ئەدەبدا.

2) ناوچەی حوکم بە هۆی هەمەچەشنەیی دانیشتوەکانی وێنەیێکی کۆزمۆپۆلیتی وەردەگرێت کە وا غەریبە تێیدا کەمتر هەست بە بێگانەیی دەکات تا شوێنێکی تر. بە نموونە دەڵێم بەنیسبەت غەریبەوە ئەستەمبۆڵی 1860 کەمتر تورک بوە لەوەی شام عەرەب بوە، هەروەهاش شارێکی تری غەیری تورک لە کاتێکی تری غەیری ئەو کاتەدا بە نیسبەت غەیری حاجی قادرەوە.

3) قەڵەباڵغی و هات و بات هەمیشە عەیبپۆشتر بوە بۆ فەقیر، بە نیسبەت دۆڵەمەندیشەوە پتر لەبەر چاوانی شاردۆتەوە، کە ویستبێتی نەکەوێتە زار و زمانەوە.

4) بە هۆی ئەوەوە ناوچەی حوکم لە هەموو ڕەگەز و ئاینێکی تێدایە، مرۆڤی تازە میوان لەوێدا پتر یاریدەر و پشتوپەنای چنگ دەکەوێ. لەو سەردەمەدا کە حاجی بۆی دەرچوو، شاری ئەستەمبۆڵ لە هەموو شارێکی تری غەیری کورد پیاو و بنەماڵەی کوردی تێدا ژیاوە وەک ئێستاکەی بەغدا کە وا لە هەموو شارێکی عیراق بە کورد و عەرەبیەوە پتری کورد تێدا دەژیت. پێش چەندین ساڵ دەنووسرا «نیویۆرک» ی ئەمەریکا لە هەموو شارێکی ئیتالیا پتر ئیتالیایی تێدا دەژیت. ئەم ڕاستییە بەنیسبەت حاجی قادرەوە لەو دەمەدا کە لە کۆیێ دەرچوو شتێک نەبوە بە درەنگەوە سرنج ڕاکێشێت، بە پێچەوانە ڕاستییێکی هەند گەورەیە و بە جۆرێک خۆی تێکەڵ بە حیسابان دەکات دەبێ لە سەرەتای هەموو لێکدانەوەییێکی حاجی، بەڵکوو پێش هەموو بەراوردێک ئەم ڕاستییە ڕەچاو کرابێت، بەتایبەتی کە دەزانین حاجی چی ئەوتۆی نەبوو لە کاتی دەرچوونی لە کۆیێ، وەهای پشت ئەستوور و مەشغووڵ بکات کە چۆنیەتی وەزعی ئەستەمبۆڵی تێدا فەرامۆش بکرێ وەیا بە درەنگەوە بیری لێبکرێتەوە. بێگومان ئەم بە ئومێدبوونەی حەوانەوە لە ناوچەی خەلافەت هەم لە سەرەتاوە حیسابی بۆ کراوە هەم هەبوونی شەخسی کورد و بنەماڵەی کوردیش لەوێدا وەک هۆی حەوانەوە تێخوێندراوەتەوە.

وەنیە لەمەشدا شتێکی سەیر هەبێ، لە پێچەوانەی ئەمەدا هۆی سەیر پێهاتن پەیدا دەبێ بەتایبەتی لە حاڵی یەکێکی وەک حاجی قادردا کە وا بە نەداری و هەژاریی

سەفەری غەریبی دەکات و هیچی بە دەستەوە نیە بۆ ژیانێکی دوورودرێژ لەو حیسابانەی بێنیاز بکات، واقیعی ڕاست و دروستیش لەو دەمەدا ئەوە بوە، جگە لە بەدرخانیەکان، کەسانی دیکەی کورد بەزۆری لە ئەستەمبۆڵ ژیاون و تێیاندا پیاوی خاوەن وەزیفەی گەورە و دەسەڵاتی دنیایی هەبوە، تەنانەت هەر لەو سەردەمانەدا کە حاجی لە ئەستەمبۆڵ بوە پیاوی وەک «ئیبراهیم حەیدەریی» هەبوە کە مەلاییێکی هەولێری بوە و بۆتە «شێخ الاسلام» یش.

ئەمانە شتی ئاسایی و بەرچاوی هەموو کەسێکن، بەڵام بەداخەوە چ خەبەرێکمان بە دەستەوە نیە تێمان بگەیەنێ ئایا حاجی بەر لەوەی بۆی دەرچێت سفارشنامەی لە کەس وەرگرت یاخود هەر بەتەمای خوا ملی لە ڕێگا نا، ئەگەر سفارشنامەشی وەرگرتبێ لە کێی وەرگرت و بۆ کێی وەرگرت؟

ئەو ڕیوایەتەی کە دەڵێ حاجی لە کەرکووکەوە بە هاوڕێیەتی کەیفی جوانڕۆیی سەفەری کرد، لەوەدا کە کەرکووک ناوچەی موتەسەڕیفایەتی بوە، زیهن بۆ هێندێ دەبات کە وا حاجی لە دەسەڵاتدارانی کەرکووکەوە نامە و پەیامێکی بۆ ئەستەمبۆڵ وەرگرتبێ، بەڵام هاوڕێیەتیەکەی لەگەڵ کەیفی حیسابەکە هەڵدەوەشێنێتەوە چونکە دەزانین بە یەکەوە نەڕۆیشتون. بەلای منەوە بڕوا کردن بە نیوەی حیکایەتەکە، بە لێدەرهاویشتنی کەیفی، بێ بەڵگە نابێ. دەبێ لە لایێکەوە خەبەرێکی بڕواپێکراو پێمان بسەلمێنێ حیکایەتبێژان بە درەنگەوە کەیفییان کردە هاوڕێی سەفەری حاجی.

ڕیوایەتی نامیلکەکەی[96] مەلا عەبدولڕەحمانی خزمی حاجی لەوەدا لەگەڵ ڕیوایەتەکەیتر یەک دەگرنەوە کە دەڵێ لەگەڵ کەیفی بەیەکەوە دەڕۆن بۆ ئەستەمبۆڵ بەڵام ئەمیان لە هەولێرەوە بۆ ماوەرانیان دەبات و لە وێوە بۆ ئەستەمبۆڵیان بەڕێ دەکات. ئەگەر مەلا عەبدولڕەحمان گوتبای لە کەرکووکەوە بەڕێ کەوتوون دەمگوت هەر خۆی سەرچاوەی ڕیوایەتەکەی پێشووترە...
بەهەمەحاڵ ئەم قسە لەیەکتر نەچوانە هەن کە هیچیان لەگەڵ واقیعی حاڵدا ڕێک ناکەون، تەنانەت ئەوەی دوای جێهێشتنی کۆیێ چۆتە هەولێر، جوانڕۆیی بوە نەک حاجی، کەسیشی لەگەڵ نەبوە، بە تایبەتی حاجی، کە دەمێک بوو بۆی دەرچوو بوو،

---

[96] بگەڕێوە بۆ لاپەڕە 332 لە بەرگی دوەمی «حاجی قادری کۆیی».

له ماوەرانیشەوە بەرەو ئەستەمبۆڵ چوون چ بە نیسبەت حاجییەوە چ بە نیسبەت کەیفییەوە بێ، نە ڕووی داوە و نەهی ڕوودانیشە. کە دەڵێم ڕووی نەداوە لەوەوە دێت کە مەعلوومە کەیفی دوای جێهێشتنی کوردستانی عێراق ماوەیێک لە حەڵەب[97] ماوەتەوە و دەرسی بە کوڕانی والی حەڵەب گوتوە، دیاریشە مرۆڤ لە هەولێرەوە بەڕێی موصڵدا بۆ حەڵەب سەفەر دەکات، با جارێ لەوە هەر گەڕێین کە وا کەیفی یەکسەر بۆ ئەستەمبۆڵ نەڕۆیشتووە، بە ڕەفاقەتی حاجیش سەفەری نەکردوە. کە دەشڵێم «هی ڕوودان نیە» قسەکەم لەوەوە دێت بە عادەت کەس لە هەولێرەوە بە نیازی ئەستەمبۆڵ ناچێتە ماوەران، تەنانەت ئەگەر لە ماوەرانیشەوە یەکەم جار خەیاڵی سەفەر بۆ ئەستەمبۆڵ بە مێشکی کەسدا بێت ڕێی تێناچێ ئەو کەسە ملی شاخ و دۆڵی بێ شەقام و کاروان و هاتوچۆکەر بگرێت و خۆی بۆ ئەو دوورەوڵاتە هەڵکوتێت.

پێی ناوێ زۆری بە دواکەوین، ئەم ڕیوایەتانە هیچیان ڕاست نین، بەڵام لەوە بەولاوە کە دەزانین حاجی پێش کەیفی ڕۆیشتوە و کەیفیش لە کۆیەوە بۆ هەولێر چوە و لەوێوە بۆ حەڵەب، هەرچی سەروسۆراغێکی چۆنیەتی سەفەرەکەی حاجی هەیە لە کەسەوە مەعلووم نیە.

ئەوی ڕاستی بێ نەزانینی زەرف و بار و چۆنیەتی سەفەرەکەی حاجی گەلێک شتی گرنگی لێشاردووینەوە چونکە شێوەی سەفەر کردن گەلێک لایەنی بایەخداری وەزعی سەفەرکردوەکە ڕادەگەیەنێت. من تا ئەم کاتەی کە لە بارەی سەفەرەکەی حاجی قادرەوە دەدوێم لێم ڕوون نیە ئاخۆ حاجی وردە خەرجی ڕێگای چۆن پەیدا کردوە، خۆ دەبێ بایی نان و ماستێکی سێ جەمەی ڕۆژانەی پارە پێ بووبێت. دڵم بۆ ئەوە دەڕوا حاجی سێ پارچە زەویەکەی گۆڕقەرەجی[98] بە خزمەکانی خۆی

[97] ئەم باسە لە گوتارێکی خۆم بە ناونیشانی «کەیفی جوانڕۆیی» لە بەرگی دوەمی گۆڤاری دەفتەری کوردەوارییدا بڵاوکرایەوە.

[98] لە لاپەڕە 329 لە بەرگی دوەمی کتێبی حاجی قادری کۆیی، نامیلکەکەی مەلا عەبدولڕەحمان ناوی هەر سێ زەوی دینێت کە ئەمانەن: قەرەقاجین، هاوینەهەوار، زولفەقار.

فرۆشتبێت هەرچەند مەلا عەبدولڕەحمان لە نامیلکەکەیدا بۆ ئەم لایەنە نەچوە و لەسەرەنجامی ئەو سێ پارچە زەویە بێدەنگە. زەویەکانیشی نەفرۆشتبێتن دەبێ لە لایێکی ترەوە تەدبیری خەرجی کردبێت. ئایا قەرزی کرد؟ کێ قەرزی پێدا؟ مزەی دەسنووس و مۆرهەڵکەندنی کۆ کردەوە؟

کە نازانین چۆن وردە پارەی سەفەری پێکهێنا ناشزانین بە کوێدا ڕۆیی و لەگەڵ کێ ڕۆیی و چۆن ڕۆیی، بە پێیان یاخود بە سواریی؟ خولاسە ببڕای ببڕای هیچ شتێک لە سەروبەری ئەو سەفەرە بەلای کەسەوە مەعلووم نیە، هەرچی تێدا بگوترێ خەیاڵکردە.

کە ئەم شتە سەرەتاییانە نەزانرابن دیارە ناوێرم لەگەڵ خۆشمدا ئەم پرسیارە هەڵستێنم. ئایا حاجی لە کۆیەوە هیچ ناو و ناوبانگێکی ماڵی بەدرخانیانی بیستبوو کە بۆرە ئومێدێکی حەوانەوە لای ئەوان ئازاتری کردبێ بۆ بەرەو ئەستەمبۆڵ چون؟ هەڵستاندنی ئەم پرسیارە لە زیمندا داخوازیی دەکات کە حاجی لە کۆیەوە بایەخدانێکی بە چەندوچۆنی کوردەکانی تورکیا و ئەستەمبۆڵ کردبێ و بایی ئەو بایەخدانە ئاگاداری ئەحواڵیان بووبێ کە ئەمە سەرلەنوێ بەرەو تۆژینەوەیێکمان دەگەڕێنێتەوە کە دەمێکە بەلای خۆمانەوە لێی بووینەوە، پرسیارەکەش لەخۆوە بێبنجی ماددی دێتە بەر لێکدانەوەوە، ئەو بنجە نەبێ کە دەزانین دواتر لە ئەستەمبۆڵ پێوەندیی بەردەوام هەبوە لە نێوان حاجی و بەدرخانیەکاندا.

صەد جاران حەیف و مخابن کە هیچ شتێک لە چەندوچۆنی سەفەرەکەی حاجی نازانین. نەزانینەکەمان لەو ڕادەیەدایە کە ئەگەر لە ڕێگای ترەوە نەزانرابا حاجی بۆ ئەستەمبۆڵ چوە چ خەبەرێکی سەفەرەکەمان بەدەستەوە نیە ببێتە بەڵگەی ڕوودانی. شتی وەک ئەم سەفەرە بێ خەبەر و ئەسەرەیە کە لە مێژوودا ڕووی داوە بەڵام بەڵگەکانی فۆتاون و بەلای مێژووناسانەوە کەڵکی سەلماندنی پێوە نەماوە.

من یەکجار بە دڵشکستەییەوە واز لە چەندوچۆنی سەفەرەکە دێنم، لە گۆشەیێکی ئومێدی گەشبینانەشەوە هەستێکم بە دیار خەبەرێکی ئەو سەفەرەوە چاوەچاو دەبێ بەڵکوو خواوڕاستان...

**وردبوونەوەیێکی تایبەتی**

لە لاپەڕە 94 ی ئەم نووسینەدا ڕوون کردنەوەی چەند بەیتێکی گلەمەندانەی حاجی قادرم کرد بە بەڵێنی کاتێکی دواتر.

کۆتایی بەیتەکان کە دەڵێ «لە بێحورمەتیان بوو حاجی هەڵات» بە زاهیر پێوەندیی هەیە لەگەڵ ئاوارەبوونی حاجیدا. ئەوەی ڕاستی بێ دیوانەکەی حاجی سەروبن بکەین لەم نیوە بەیتەی پتر تێدا نادۆزینەوە بە تەئویلیش ئەوە هەڵبگرێ حاجی لە ترسی شێخ نەبی کۆیەی جێهێشتبێ.

لێرە من شایەدێکی تریش دەهێنمەوە سەر بەرزەکی شەهادەت دان لەم کارەساتەی ئاوارەبوونی حاجی، ئەویش گێڕانەوەی جیلی لە ئێمە بە پێشەوەیە لەوانەی ڕاستیی ڕووداوەکەیان دەزانی. هیچ کامێک لەوانەی ئەم باسەیان دەگێڕایەوە، بەر لە هەموویان باوکم و مامم کە ڕاستەوخۆ باسەکەیان لە زاری باوکیان «حاجی مەلا عەبدوڵا» وە نەقڵ دەکرد، بەلای ئەوەوە نەدەچوون کە ترسی شێخ نەبی دەخلێکی بووبێ لە ئاوارەبوونی حاجی وەیا حاجی حیسابێکی بۆ ئەو ترسە کردبێت بایی ئەوەی لە کۆیەی دوور بخاتەوە. ئەمەش بەلاوە بنێین، بە زەحمەتێکی فێلبازانە نەبێ واتای «بێحورمەتی» کە حاجی لە بەیتەکەدا دەیکاتە بەهانەی «هەڵاتن» نەدەشێ بە «ترس» تەئویل بکرێ نەڕاستەوخۆش دەچێتەوە بۆ لای ئەو هەرایەی بەینی ئەو و شێخ نەبییەوە. واتای بەیتەکە هێندە لە واتای «ترس» دوورە دەشێ ببێتە بەڵگەیێکی نوێ بۆ ئەوەی حاجی لەبەر «ترس» ئاوارە نەبوە. بەڵام وەک گوتم مومکینە مرۆڤ بە فەند و فێڵ واتاکە باهەڵداتەوە بۆ لای ناکۆکییەکە بەوەدا بڵێ حاجی لەم بەیتەدا دەیەوێ بە کۆییان بڵێ ئێوە ئەگەر ڕێزتان لە من نابایە دەبوو لایەنی منتان گرتبایە لە دژی شێخ نەبی نەک بەشێکی زۆرتان ببنە مرید و صۆفی ئەو. بەهەمەحاڵ ئەم تەئویلەش بۆ لای «ترس» ناچێتەوە. بەڕاستی کە بێین گوتەی «هەموو خزمی خۆمن» لە بەیتێکیاندا بەدەنگ بهێنین، پتر لەوەمان دوور دەخاتەوە کە حاجی لەم گلەییانەدا مەبەستی ئیشارە بێ بۆ ماجەراکەی نێوانی خۆی و شێخ نەبی. ڕاز و گلەیێکی خۆییانەیە لەگەڵ «خزمان» دا تارمایی شێخ نەبیشی بەناودا تێناپەڕێت.

بەدەوری ئەم لێکدانەوە و بەراورد کردنەدا ئایا فکر بۆ چ مەبەسێکمان دەبات کە حاجی لەو بەیتانەدا کردبێتیە ئامانجی گلەیی؟ با لە پێشەوە ئەوەش بخەمەوە سەر تێبینییەکانی تازە لێیان بوومەوە و بڵێم لە کەس نەبیستراوە شتێک ڕوویدابێت، غەیری هەراکەی شێخ نەبی، بۆنی بێحورمەتی لێ بێت لە ئاست حاجی قادر، کە هەراکەشمان لە حیسابی گلەییەکان دەرهاویشت، ئەوەی ڕووداوی بێحورمەتانەیە دژی حاجی پەیدا نابێ. ئەمە دەڵێم چونکە هەر لە بیرمە چەند ساڵێک دوای ڕۆیشتنی حاجی، هاوڕێ بچوکەکەی خۆی «کەیفی جوانڕۆیی» لە ئاکامی ڕووداوێکی زۆر بێحورمەتانە دەربەدەر بوو، زۆر بەداخەوە.

من لێرەدا کە دەڵێم هیچی بێحورمەتانە دژی حاجی ڕووی نەداوە، قسە لە غەیبەوە ناهێنم، لە جووتە سەرچاوەی تەواتور و واتای هەندێ هەڵبەستی تری حاجی بیروڕایەکەم هەڵدێنجم. تەواتور ئەوە بوو کە گوتم کەس نەیبیستووە بێحورمەتی لەگەڵ حاجیدا کرا بێ، بە پێچەوانەوە بیستراوە کە حورمەتی گیراوە. هەڵبەستەکانی حاجی کە بەشایەدیان دەگرم ئەوان بۆ پیاوە ناودار و دەسەڵاتدارەکانی ئەوسای کۆیەی ناردوون، چونکە بەپێی پێوانەی ئەو سەردەمە حورمەتگیرانی مرۆڤ لەلایەن براگەورانەوە دەبوە حورمەتگیران لای هەمووانەوە. بڕوا دەکەم ئەم وەزعە ئێستاکەش هەروەهایە، نەک لە کۆیە بگرە لە هەموو جیهان. نامەوێ هەڵبەستەکانی تری حاجی کە لە مەدح و ستایشی هەموو دانیشتوانی کۆیەی داناون بکەمە بەڵگەی ڕوونەدانی بێحورمەتی، چونکە دەشێ قسەیێک و مەدحێک کە ڕووی لە تاکە شەخسی ناسراو نەکرابێ لە ڕێی چاوپۆشی و سۆز و ئاکاری بەخشندەییەوە هاتبێت و لەمەشدا گلەیی و گازاندەی بە ڕێوجێ و ڕاستەقینەش تێ بردرابێ. بەڵام مەدحێکی بۆ حەماغا و ئەمین ئاغا دانرابێ لە حاجی قادرێکەوە کە مەدحی کەسی زیندووی نەدەکرد بە تایبەتی مەدحی بەخشین و نان و خوان دەشێ و دەبێ بکرێ بە ئاوێنەی ئەو حاڵ و بارەی حاجی تێدا بوە لە سەردەمی بەیەکەوە ژیانیاندا لەلایەن بوون و نەبوونی هۆی گلەیی کردنێک کە پێوەندی بە بێحورمەتیەوە هەبووبێت. حاجی قادر ئەو هەستیارەیە کە دەزانین لە هەر لایێکەوە پلارێکی لچ و لێو لێ بادانی بۆ هاتبێت، نەک بێحورمەتی تێدا بووبێت، دەرحاڵ لەبری مایە و قازانجیش وەرامی بەزیادەوە دەداتەوە، تەنانەت ئەو هێندە قسە توێکڵدارەی کە لە

شێخ غەفووری[99] تاڵەبانییەوە پێی گەیشتەوە و خێرابەخێرا کرایەوە تیرێکی زەهراوی بۆ شێخ غەفوور بەڕێ کرایەوە، پاش چەندین ساڵ لە ئەستەمبۆڵ دەماری هەستی حاجی دەبزوێنێتەوە و سەرلەنوێ بورکانی ڕق و غەزەبی بەسەر شێخ غەفووردا دەتەقینێتەوە[100]، بەمەدا و بە هەموو بەڵگەیێکدا مەعلووم دەبێ ئەگەر حاجی قادر بێحورمەتی لە دانیشتوانی کۆیێ دیتبایە بەوە دابین نەدەبوو لەبری ئەو بێحورمەتییە بە نیو بەیت گلەییان لێ بکات و بە قەصیدەی سەرلەبەری جۆراجۆر بۆ ئاسمانیان بەرز بکاتەوە.

وردبوونەوە دەریدەخات حاجی قادر لە نێو عیشقی بۆ تێکڕای کوردستان عیشقێکی تایبەتی هەبوو بۆ کۆیە و خەڵقی کۆیێ، لەوەشدا چ ڕەخنە لە حاجی قادر ناگیرێت چونکە لە کەس داوا ناکرێ بێشکەی منداڵی خۆی و بەر ئاگرادان و شوێنەواری کەسوکاری لە دڵدا نەقش بەستوتر نەبێ تا بێشکە و بەر ئاگردان و شوێنەوارێکی تر کە بە ڕاستی لێی نەبوە و تێیدا نەژیاوە. گەلێک لە جانەوەر و ڕوحلەبەرانی تریش وەک ئادەمیزاد لان و هێلانەی خۆیان بە هەموو دنیا ناگۆڕنەوە، بگرە لە لانی خۆیاندا نەبێ زاوزێ ناکەن. بێگومان ئەگەر مرۆڤ لە ئاست هێلانەی خۆی و کەلاوەکەی باب و باپیرانی بێباک بوو چ پێی ناوێ شەیدای خاک و ئاوی تر بێ کە نیو هێندەی ئەو هێلانە و کەلاوەیەش مافی دایک و ڕۆڵەیەتی بەسەرەوە نیە.
کوردستان بەنیسبەت حاجی قادرەوە کۆمەڵێکە لە جێگە و جۆبار و شاخ و دەشت و چۆڵ و ئاوەدانیی کە نیسبەتیان لەگەڵ هەموو کوردێکی تریش وەک هی حاجییە، بەڵام کۆیە بەنیسبەت حاجییەوە ئەو شتە نیە کە بۆ هەموو کوردێک وەک یەک وایە، هەر یەکێکیش لەو کوردانە شوێنێکیان هەیە لە کوردستاندا بە لایانەوە وەک شوێنی تر نیە.

ئەم ڕاستییەش هەر لە نێوان کورددا ڕاست نیە لە هەموو جیهان ڕاستە، کەواتە بۆچی حەرام بێ لە حاجی خۆشەویستنی بۆ ئەو مەڵبەندە پتر بێ کە یەکەم جار

---

[99] لە بەرگی دووەمی کتێبی «حاجی قادری کۆیی» ئەم سەرگوزەشتە باس کراوە، لاپەڕە 200.

[100] بگەڕێوە بۆ لاپەڕە 163 لە بەرگی دوەمی «حاجی قادری کۆیێ».

چاوی لێتروکاندوە و سەری تێدا دوپەلکە بوە و باوەشی بە سەردەمی منداڵی و خولیا و هەست و تاسەی گەنجایەتییدا گرتوە؟

هەندێ جار وا دەبێ نازانرێ «نیشتمان» لە کوێوە تاکوێیە و پانایی چەندە تاکوو مرۆڤ بتوانێ عاتیفەی خۆی بەو ئەندازەیە پان بکاتەوە. واش بوە لە گۆڕینی سنووری نێوان دوو وڵاتدا هەندێک زەوی لە یەکێکیانەوە دراوەتە ئەوی تریان، لە حاڵی وەهادا ئەو مرۆڤەی نەخشەیێکی خەیاڵی مەفتەن دەپەرستێ دەبێ بەپێی گۆڕانی سنووری وڵاتەکەی ئەویش سنووری نەخشەی سۆز و خۆشویستنەکە و پەرستنەکەی بگۆڕێ، جا ئەگەر لە وڵاتی ئەوەوە پارچەیێک دابڕابێت و بە وڵاتێکی تر درابێت دەبێ بەشە سۆزی بۆ ئەو پارچەیە بداتەوە پارچەکانی تر، ئەگەر لە وڵاتێکی تریشەوە پارچە ئەرزێک خرابێتە سەر وڵاتەکەی خۆی دەبێ خۆشویستنەکەی پان بکاتەوە تاکوو ئەو پارچە نیشتمانە تازەیەش بگرێتەوە. لە فەرزی ئەم ئاڵوگۆڕە مەعنەوییە بشکرێ، گومان لەوەدا نیە ئەگەر ئەو پارچە ئەرزەی دەردێ بە وڵاتێکی تر جێگەیێک بوو کە خۆی تێیدا بەوەلەد هاتبوو و لێی گەورە بوو بوو هەرگیز بەر تەعدیلەکە ناکەوێت، بە پێچەوانە سۆزەکەی لەگەڵ ئەو پارچە زەویەدا سنوور دەبەزێنێت و ئاودیو دەبێت بۆ ئەو وڵاتەی ماڵ و بێشکەکەی خۆی بەرکەوتوە. ئەو بڕیارەی کە پارچە ئەرزە خنجیلانە نازدارە خۆشەویستەکەی دادەبڕێ، لە هەمان کاتدا کەرتێکی زلی سۆز و پەرۆشی ئەویش دادەبڕێت و دەیخاتەوە سەر ئەو هێندە ئەرز و ئاواییەی کە یەکەم دەستەچیلەی مەفتەنویستی لە دڵ و دەروونیدا هەڵایساندبوو.

لە کتێبی «الکامل» ی «إبن الاثیر» دەخوێنێتەوە «إبن لؤلؤة» لە تۆڵەی داگیرکرانی شاری «نەهاوەند» لەلایەن سوپای ئیسلامەوە خەلیفەی دوەم «عمر إبن الخطاب» ی کوشت چونکە «إبن لؤلؤة» خۆی خەلقی ئەو شارە بوو... لە سەرگوزەشتی گەڕانەوەی دە هەزار یۆنانی بە سەرکردایەتیی «زەنەفۆن» بۆ یۆنان داستانێکی کورتیلەی پڕسۆز هەیە لەوەدا کە کوردێک ڕازی بوو بیکوژن، کوشتیشیان، بەڵام ڕێگەی نیشان نەدان چونکە ئەو ڕێگایە بەسەر ماڵی کچەکەیدا دەڕۆیشت، هاوڕێکەی دوای کوشتنی ئەو، ڕێگاکەی نیشان دان...

کە بمانەوێ دەتوانین صەدان نموونەی ئەوتۆیی بێنینەوە ئیسپاتی ئەوە بکات کە نشیمەن چ نرخێکی هەیە لە دڵی مرۆڤدا، مەگەر بە دەرسدان و فێڵ لێ کردن ئەو

نرخە کەم بکرێتەوە، بەڵام هەر دەڵێی نموونە هێنانەوە ئەو نرخە کز دەکاتەوە چونکە وا ڕادەگەیەنێ پێویستی بە بەڵگە و سەلماندن هەبێت لە حاڵێکدا نرخەکە لە دڵی هەموو کەسێکدا دەژیت و چ مامۆستا و ڕابەریشی پێ ناوێت.

کەواتە حاجی قادر وەیا نالی وەیا هەر کەسێکی دیکە بێ گلەیی لێ ناکرێ کزە و سۆزی بۆ لانە و خانە و گەڕەک و کوچە و بازاڕی نشیمەنی خۆی هەبێت، بەڵام هێندە دەمێنێتەوە بگوترێ نابێ خۆشەویستی بۆ نشیمەن کار بکاتە دادپەرستی و ڕەفتاری ڕاست وەیا سەر بکێشێتەوە بۆ لایەنگیریی کوێرانە. لەبەر شەوقی ئەم ڕاستییانەدا سەیری حاجی قادر دەکەین و دەبینین ئەم مرۆڤە لەم خۆشەویستنە تایبەتیەی بۆ کۆیێ، نەک هەر ڕەخنەی لێ ناگیرێت و بەس چونکە کە قیاسی دەکەی لەگەڵ شاعیرێکی تری وەک خۆی لە لایەن خۆشویستنی مەفتەنەوە مرۆڤێکی ئەوەندە پاک و فریشتانە و بێتەرەف خۆ دەنوێنێت ئەوەت لەبیر دەباتەوە کە سۆزێکی تایبەتی هەبوە بۆ بێشکەی منداڵی و سەرەتای عومری لەو ڕووەوە کە تەنها ئەو لە نێوان هەموو شاعیرەکانماندا وەکو بولبول بۆ هەموو شار و دەشت و مەڵبەندێکی کوردستان چەهچەهەی کردوە و هەناوی سووتاوە. لە دیوانەکەیدا چەند جاران نەخشەی ئێرە و ئەوێی کوردستان دەکێشیت و دەستەملانی ئێرە و ئەوێی دەبێت. وا دەزانم هیچ کامێک لەو کەڵە شاعیرانەی هاوچەرخی حاجی بوون باسی جێگەیێکی نەهێناوەتە ناو هەڵبەستەکانیەوە کە بێشکەی خۆی نەبووبێت، مەگەر شێخ ڕەزا کە ئەویش بەپێی مەیلی کاتیی خۆی، جارێکیان مەدحی جێگەیێکی کردبێت جارێکی تریان، وەیا گەلێک جاری تر، زەمی کردوە، مەدح و زەمەکەشی پێوەندی بە سۆزی کوردایەتییەوە نەبوە، لەو پارچە هەڵبەستەی بترازێ کە لە سەرەتاکەیدا دەڵێ:

بەبیرم دێ سولەیمانی کە دارولمولکی بابان بوو
نە تەسخیری عەجەم نە سوخرەکێشی ئالی عوسمان بوو

بەداخەوە یەکێک لەو شاعیرانە بە دەستەوایش لەگەڵ حاجیدا ناوی کۆیەیان نەبردووە. بەڕاستی ئەم دیاردەیە تا ئێستاش لە چاوان دەچەقێ کە دەزانین سەردەمی زانست و ڕۆشنبیری و پەرەسەندنی نیگافرەوانی و لە قەپێلک دەرچوونە و

چاوەڕوان دەکرا گیانی ناوچەپەرستی تێدا بزر بێت و جێگە چۆڵ بکا بۆ گیانە فرەوانترەکەی نیشتیمانپەرستی. نووسەری کوردی عیراقم دیتوە لە گۆڤاری دەرەوەی عیراقدا گوتاری لە بارەی ئەدەبی کوردییەوە بڵاو کردۆتەوە، لە ناوی نالی و گۆران بەولاوە ناوی شاعیرێکی تری کوردی کوردستانی عێراقی نەبردوە. من نازانم، کەسێک بە گوتە و نووسین چاکەی یەکێکی وەک حاجی قادر نەداوەتەوە و پێی ڕەوا نەبینێت لە باسی ئەدەبی کوردییدا ناوی بێت چۆن ڕێگە بە خۆی دەدا داوا لە دەسەڵاتداران و داگیرکەران بکات کە بە کردەوە مافی ڕامیاری و ئابووری و کۆمەڵایەتی و چارەنووس بە غەیری خۆیان بدەن.

لە ڕێی بەراورد کردنەوە دەردەکەوێت حاجی قادر صەد ساڵ پتر پێش ئەو تەرزە ڕۆشنبیرەی سەردەمی ئاتۆم و ئاسمانگەردی کەوتۆتەوە لە مەیدانی بەلاوەنانی گیانی تەسکی ناوچەپەرستیدا. من لەگەڵ خۆمدا بە وتووێژی دەروونی دێمە سەر فەرامۆش کردنی هەموو گلەییەک کە لە سالم و کوردیی بکەم کە دەبینم خاوەن شەهادەی بەرزی ئەم سەردەمە لە کاتی دەروون کردنەوەدا هێندە ناوچەپەرست دەردەچێت.

بەڕاستی ئینصاف لێمان داوا دەکات موقارەنەی حاجی لەگەڵ کەسی تردا نەکەین لە زەمینەی ناوچەپەرستی و کوردستانپەرستییدا چونکە هەرچی نێزیکی هەیە لە نێوان ئەو و غەیری خۆیدا پەیدا نیە. حاجی قادر دەبێ لەگەڵ خۆیدا موقارەنە بکرێت لەو ڕووەوە ئایا حاجی قادری کۆیەدۆست و حاجی قادری کوردستاندۆست کامیان لە تای تەرازووی موقارەنەدا قورستر هەڵدەستێت!

لەم وتووێژەم لەبەر ڕۆشنایی ئەو گلەییە بوو کە حاجی قادر لە هەڵبەستێکیدا بە ڕووی خزمانی کۆیەیدا دەداتەوە، وەک بۆشمان دەرکەوت لە دوو سەرەوە زەمینەی گلەیی لە نێواندا نامێنێ. یەکەم لەلایەن ئەوەوە کە دانیشتوانی کۆیەی تێدا شەرمەزاز ببن. دوەم لەبەر ئەوەی کە حاجی بۆ خۆی لە چەندین هەڵبەستی پڕسۆزدا مەدحی خەڵقی کۆیەی کردوە و پەرۆش و وەفای خۆی بۆیان دەربڕیوە.

ئەم لێکدانەوەیە کە بە شایەدیی هەڵبەست و کردە و گوتەی حاجی قادر، وێڕای گوتەی دەماودەم کە لە جیلی حاجی و دوای ئەوەوە بە ئێمە گەییشتوە، لێکدانەوەیێکی ڕاست و دروست و بێلایەنە داوا دەکا تەوجیهێکی ئەو گلەییەی

حاجی بکرێت کە لەو نیوە بەیتەدا خوێندمانەوە بە جۆرێک لەگەڵ واقیعی بێفێڵدا بگونجێت. گلەییە و لە حاجییەوە بەرەو پیری دانیشتوانی کۆیێ دێت «لە قوشخانەوە تا دەمی ئیچ قەڵا لە بایزاغاوە تا محەللەی قەڵات». ئاخۆ هۆی گلەییەکە چیە؟ بێحورمەتیەکە لە چیدا بووە؟

ئەوەندەی دیبێتم ئەدیبێک وەیا شاعیرێک کەوتبێتە سەر باری ڕاز و گلەیی لەگەڵ زەمانەدا وەیا ڕووی قسانی کردبێتە ئەهلی زەمانە و کەس و خزمانی، داخ و کەسەرێکی زۆری هەڵڕشتوە و گازندەی تاڵ و تفتی نیشان داوە. لە حاڵی وەهادا گلەیی کردن خۆی لە خۆیدا نابێتە بەڵگە بۆ ڕەوابوونی، هەر وەک بێ بەڵگەش بەدرۆ ناخرێتەوە چونکە لەوانەیە هۆی ڕاستەقینە هەبێ بۆ گلەیی کردن، هەروەک مومکینە نەشبێت.

هەندێ جار دەمودووی گلەیی لەخۆوە هاواریەتی کە وا لە هەناوێکی ڕقهەڵگرتو و دڵێکی ڕەشەوە دەرهاتوە و چ پێوەندیی بە ڕاستی و ئینسافەوە نیە کە ئەمەیان بە هیچ جۆر لەم باسەدا جێی بۆ ناکرێتەوە، ڕەنگە لە نێو خوێنەرانی ئەم قسانەدا هی وا هەبێ ڕۆژەک لە ڕۆژان خۆی بەر گلەیی بێرەحمی ئەوتۆیی کەوتبێت. قسەیێک کە لە دڵەوە دەردێت چەژی ناو ئەو دڵە لەگەڵ خۆیدا دێنێتە سەر زمان و دەگاتەوە بەر چەژ و تامی گوێگرەوە، لەبەر ئەمە ڕێی تێدەچێ قسەی بەزاهیر تاڵ لە ڕاستییدا شەکر بێت وەک ئەوەی کە «جواهری» لە دوای «وثبة» ی ساڵی 1948 ڕووی قسەی دەکاتە خەڵق و تانووتی ماف گرتنەدەستیان لێ دەدات و دەڵێ:

تفحم لعنت لزيز الرصا
ص وجرب من الامر ما يقسم

ئەم وشەیەی «لعنت - لەعنەتت لێ بێت» لەم جێگەیەدا فەرقی نیە لەگەڵ ئەوە کە بیگوتبایە «قوربانی هەڵمەتت بم، بمرم بۆ مەردایەتیت». لەم حاڵەی «لعنت» ی جەواهیریدا زەرفی هەڵبەست مەبەستەکەی ڕوون کردۆتەوە تا ئەو ڕادەیەی ڕێگە بە کەس نەدات چ واتای تاڵ و تفتی لێ هەڵێنجێت، بەڵام واش دەبێ قسەی لە «لعنت» تاڵتر و لە زەرفی نادیارتردا گوتراوە کەچی دیسانەوە بەقەدەر تاڵایی قسەکە سۆز و پەرۆش و شیرنایی دەداتەوە. نموونەیێکی زۆر

بەرچاوی ئەم تەرزە قسە تاڵەی پڕسۆز و سووتانە شیعری شاعیرێکی عەرەبی ئاوارەیە کە دوابەدوای تێشکانی ئومێدە زلەکانی پاش جەنگی جیهانی یەکەم ئەم وشانە لە میللەتەکەی خۆی دەگرێت:

كفنوه
وادفنوه
واسكنوه
هوة اللحد العميق
واذهبوا لا تندبوه فهو شعب ميت ليس يفيق!

واتە «کفنی بکەن و بیشارنەوە و بیخەنە قووڵایی قەبرەوە، بڕۆن و بۆی مەگرین، ئەم میللەتە مردوە ڕاست نابێتەوە».

هتك عرض
نهب أرض
شنق بعض
لم تحرك غضبه
فلماذا نذرف الدمع جزافا ليس تحيى الحطبة!

واتە:

> «ناموس بردن و وڵات تاڵان کردن و خەڵق بە پەتەوە کردن غەزەبی نەجووڵاند کەواتە بۆچی لە خۆڕایی بۆی بگرین، خۆ داری سووتەمەنی نارِوێتەوە».

ئەم ڕاوێژە تاڵ و تفت و ژەهراوییە کە وا بەزاهیر دەڵێی لە دوشمنی بابکوشتەوە بە نیازی حەیا بردن ڕازاوەتەوە، بەڕاستی جۆشی خوێنی شاعیرەکەیە بە برینەکانی

دڵیدا لەگەڵ پارچەی جگەر سەر وەدەر دەنێ. گوتەی بە پەرۆش وەک نەشتەری دکتۆر وایە هەتا تیژتر بێ شیفادەرترە.

لە نموونەی شیعری وەها دەروو‌ناوی لە یەکتر نەچوودا ئەمانە هی مەلای گەورەن کە هاومەشرەبی حاجی قادر و هاومەفتەنیشی بوە:

ئەرێ ئەی مامە کوردە پێم بڵێ چیت؟
کڵاش خواری کەوا دڕیای کراس چیت!

کەپو فیچ و لچ ئەستور و ددان گڕ
کوتوکوێر و گەڕ و گێڕ و سەلک خڕ

بە گیان و دڵ لە ڕەببی خۆت دەخوازی
زگت پڕبێ لە ئەستورک و پیازی

ئەم تاڵاییەی حاڵەتی هەست بە پەستی میللەت کردن هەر خۆیەتی لە کاتی شانازیی بە میللەت کردندا ئەمەی داوەتەوە:

دەتەوێ پێت بڵێم چیە کوردی
عاقڵی و چاپوکی و جەوانمەردی

میللەتێکە لە فەوقی تورک و عەجەم
صاحیبی حەزم و ڕەزم و بەزم و کەرەم

بۆ تێگەیشتنی ئەم تەرزە هەڵبەستە لەیەکتر نەچوانە دەبێ زەرفی دانانیان و مەبەستی شاعیر لەواندا بزانرێت، وەک ئەوەی کە قوماندانی ئازا و دڵسۆز جارێکیان ڕووبەڕووی هێزی دوشمن فەرمانی خۆبەخت کردن بە سپاکەی خۆی دەدات و دەڵێت: «بۆ پێشەوە و بێ گەڕانەوە...»، جارێکی تریش بە هەمان ئازایی و دڵسۆزییەوە، بە هەمان سپا خۆبەختکەرەکەی دەڵێ: «بەرەو دواوە و بە غار...».

هەر بەو پێیە شیعری گلەیی ئامێزی شاعیری دڵسۆز دەبێ بخرێتەوە شوێنی لە باری خۆی لە هەیکەلی شیعر و ویژدان و باوەڕی شاعیرەکەدا تاکوو لەبەر تیشکی

عاتیفەی جۆرجۆری سەر کردن و دامرکانەوەی نەرم و توندی سرنجی لێ بگیرێت بەڵکوو شیعرەکە لەوانە بێت بەپێی کات و هەڵوەست و شوێن و تام و بۆن، پێی بگوترێ تواندنەوەی دڵ و هەڵایساندنی گیان... هەر بارە و هەر شوێنە پێداویستی خۆی هەیە چ لە کردەوە بێ چ لە گوتە بێ، تەنانەت باوک و دایک لەگەڵ منداڵی خۆیاندا هەمیشەکات یەک کردار و یەک گوفتار نابن دەنا لە باوکایەتی و دایکایەتی دەشۆرێن.

بەڕاستی شاعیرێک سەرلەبەری شیعرەکانی هەمووی یەک دەنگ و یەک ئاواز و یەک ئاهەنگ و یەک مەبەست و یەک واتا بن، تێکڕاشیان لە مەدح کردن و پێدا هەڵگوتن بێت، دیارە ئەو شاعیرە ڕاست نیە و ساختەچییە چونکە مومکین نیە لە خوا بەولاوە شتێک هەبێ هەمووی هەر پاک و چاک، تەنانەت قورئان لە زاری «موسی» قسە دەگێڕێتەوە کە بە جورئەتەوە عەرزی خوای کردوە و گوتوەتی «ان هی الا فتنتک» - کە بە کوردی پاتەوپات «هەر فیتی خۆتە» ڕادەگەیەنێت.
هەروەهاش ئەم نووسینەی من، کە دیارە چەند ڕێز لە حاجی قادر دەنێت، لە هەموو ئەو شوێنانەدا کە مانا ڕاست و دروستەکەی شیعرەکانی بێتەئویل و باهەڵدانەوە دەخاتە ڕوو ئەوەی بە چاوی خۆیەوە گرتوە کە لەوانەیە ماناکەش زۆر باش و ڕەوا نەبێت: تەنها شتێکی لەم مەیدانەدا بە دۆستایەتیی حاجی قادرم کردبێ ئەوەیە زەرف و کات و هەڵوەستی حاجیم لەو شوێنانەدا ڕوون کردۆتەوە...

هەندێ شاعیر و نووسەر هەن بەردەوام و بێوچان مەدحی ئەو شتە دەکەن کە وا لەسەری دەنووسن، یاخود با بڵێین تەنها لە بارەی مەدحەوە بۆ بابەتەکە دەڕۆن. بێگومان ئەو تەرزە نووسینانە لەسەر بنیچەی خۆخۆشەویست کردنەوە هەڵدەستن، وەیاخود بەپێی فەرمانێک کە بەسەر خاوەنەکەیانەوەیە نووسراون، وەیاخود لە بری مزە و پاداشت هاتوونە ناوەوە چونکە کابرای نووسەر پێوەی دیارە جڵەوی خامەی لەگەڵ گۆڕانی ڕووی بابەتەکە با دەداتەوە. بابەت خوار بڕوات ڕاست بڕوات، چاک بکات و خراپ بکات، سەرەژوور تێهەڵکشێ وەیا بەرەژێر گلێر بێتەوە، لە هەموو حاڵ و بارێکدا هەر مەدح دەکرێت وەک ئەوەی جیهان هەر بۆیێ خەڵق کرابێت کە ئەو بابەتەی تێدا بەڕاست بگەڕێت، بە تەواوی وەک حیکایەتەکەی «لولاک لولاک لما خلقت الافلاک». نووسەری ئەوتۆیی پێویستی بەوە نیە شتان ببینێت و ڕای لێیان بێت، بە پێچەوانە وا باشترە بە تەلەفۆن پێی بگوترێ وەیا ئەمری ئیداریی بۆ

دەرچێت چ بنووسێت چۆنی بنووسێت. ئەگەر مومکین بێ ئالەت فێری نووسین بێت، ئەو باشترە لەو نووسەرە ئالییە...

خولاسە مرۆڤی شاعیر و هەستیاری عادەتی ئازاد و بێ چاوسوورکەرەوە لێی چاوەڕوان دەکرێ گەرمایی دەروون و زەنەی گیانی خۆی بهاوێتە ناو هەڵبەستیەوە، هەر بەو پێیەش دەبێ ئاخاوتنەکەی لەو بابەتە بێت چ تاڵ چ شیرن، خۆ شاعیر مامڵەتی شتی بازاڕی ناکات، خەریکی ماددەی زانست و ژیربێژیش نیە تاکوو قسەکانی هەڵبەستی بخەینە بەر هەڵسەنگاندنی ڕیازی و معادەلەی جەبر و موقابەلە بۆ ئەوەی بزانین هەردوو لایەنی دەوری «یەکسانە»کە پێکەڵپێکن. هەر کاتێک شاعیر، هونەرکاریش خەریک بوو بە ژیربێژی و لە ڕێی پێسەلماندنی زانستییەوە ئیقناعت بکات لە شاعیریی دەشۆرێت و دەبێتە پەندیار (واعظ) یاخود فەیلەسوف یاخود مامۆستا. ئاخاوتنی شاعیر فەرهەنگۆکی تایبەتی خۆی هەیە وەیا هەر نەبێ وشە لە وتووێژی شاعیردا واتای تایبەتی هەیە. تۆ سەیری کە شاعیر دەکەوێتە سەر باری مەدح کردنی یارەکەی، ئارایشتێکی وەهای دەدات لە هیچ کارگەیێکی ئارایشت و بە هیچ پسپۆڕێکی ئارایشت پەیدا نابێت، هەرچەند شێوازی شیعر لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێک وەیا لە جێگەیێکەوە بۆ جێگەیێکی تر بشگۆڕێ، پەروازی شاعیر لە ئاسۆی خەیاڵدا جودا دەبێ لە کاری فەیلەسوف و واعیز، وتووێژ و گرۆگاڵیشی سەربەخۆ دەبێ لە چاو هی ئەواندا.

حاجی قادر کە سۆزی سەر دەکات و بورکانی دەروونی دەجۆشێت، ئەویش وەک هەموو شاعیرێک بە زمانی عاتیفە دەدوێت و لە کانیاوی دڵ هەڵدێنجێت نەک لە گۆمی فکر. هەر بەو پێیەش وتووێژی لە بارێکی عاتیفییەوە بۆ بارێکی تر جلوەگۆڕیی دەکات تا ئەو ڕادەیە کە ڕواڵەتی قسەکانی لە بارێکەوە بۆ ئەوی تر لەیەک ناکەن هەرچەند لە ڕاستییدا یەک تیشکی سۆزە لە ئاگری دەروونیەوە شەوق دەداتەوە، بەڵام عەدەسەی «زەرفی نەفسی» هەر جارە بە جۆرێک تیشکەکە دەشکێنێتەوە.

حاجی لە حیسابێکی تریشەوە هەست بەوە دەکات کە مافی گلەیی کردنی هەیە، بەڕاستی ئەم حیسابەیان لە قووڵایی و گەرمایی سۆزێکی یەکجار تایبەتیەوە هەڵدەچێت کە دەبێ پێوانە و کێشانەی لایق بەخۆی لەگەڵدا بکرێت، هەر نەبێ بۆ تێگەیشتنی، وێڕای تێخوێندنەوەی تین و تاوی لەو هەڵوەستەی حاجیدا، کە هەڵوەستی گلەمەندانەیە. هەتا سۆز و تاسە و خۆشویستن لە دڵی مرۆڤدا کاریگەرتر

و ڕەگداکوتاوتر بێت، ئەو مرۆڤە خێراتر خۆی لەسەر حەق دەزانێ بۆ گلەیی کردن. بە نموونە دەڵێم باوک و دایک لە ئاکامی ئەرک و ڕەنجێکی بە منداڵەکەیانەوەی دەدەن پتر بەتەمای چاکەدانەوەن لە منداڵەکایانەوە تا یەکێکی تری بێگانە کە ئەو حەقەیان بەسەریەوە نیە، هەروەهاش خۆیان بە خاوەن حەق دەزانن گلەیی لە منداڵەکەیان بکەن لە کاری وەهادا کە ئەگەر بێگانە بیکردبا جێی گلەیی نەدەبوو. حاجی قادریش وەک ئەو باوک و دایکە، سەبارەت بە سۆز و پەرۆش و خۆشویستنی بێئەندازەی بۆ خەڵقی کۆیێ، بە ڕاشکاوی لە ناخی دڵیەوە هەست بەوە دەکات کە مافی گلەیی کردنی هەیە و دەبێ گلەیی بکات. لەو بارە نەفسییەی حاجی تێیدا بوە گلەییەکی ئەوندە سادە و تەبیعییە هەر دەڵێی وێنەی ناو ئاوێنەیە و واقیع دەداتەوە لەو ڕووەوە کە دەنگدانەوەی سۆز و خۆشەویستییە نەک شتێکی تر.

حاجی لە دەمی سەر کردنی هەستی غەریبییدا بە ئاسایی دەکەوێتە سەر باری بەیەکدی گرتنی هەڵوەستی خۆی و خزمانی کۆیێ، لەو بەیەکدی گرتنەشدا خزمان قەرزدار دەبینێ بەرانبەر ئەو هەموو سۆز و پەرۆشەی کە بۆیانی هەبوە چ لە پیشوتردا کە جارێ هەر لە ناویاندا دەژیا، چ لە دەمی سەر کردنی هەستی غەریبیدا. بێگومان لە باری وەها تایبەتیدا دڵ ناسکیەکی بریندارانە بەسەر هەست و پێزانینی مرۆڤدا زاڵ دەبێت و دەیهاوێتە باوەشی خۆلاواندنەوە و ناز کردن وەک ئەو ساوایەی بە فطرەت دەم دەگێڕێ تاکوو لە گۆی مەمکێکی دایکانە شیری بەزەیی بمژێت هەرچەند برسیش نەبێ.

لە حاڵەتی وەها نازک و نائارام و تەلەزگە بەستوودا ئەگەر هیچ هۆییێکی گازاندەش پەیدا نەبێ، دیسانەوە لەخۆباییبوونی خۆشویستن و ئازاری غەریبی و بڵێسەی یاد کردنەوە و تلانەوە بە دەست ئارەزووی سوتێنەر، مرۆڤ دەخاتە سەرباری گلەیی کردن و خۆ بەمەغدور زانینەوە. کە کزەی دەروون گەیشتە پایەیێک داد و فیغان و زیرە لێ هەستان داینەمرکێنێتەوە چ دەمێنێ بۆ دەرمانی دەرد جگە لە گلەیی دۆستانە و عاشقانە و خۆشەویستانە؟ دڵی حاجی بۆ خەیاڵێکی تریش دەکشێ. خەڵقی کۆیێ، کاتی خۆی، ئەو دڵسۆزە و موشفیقە و وەفاکارە نەبوون لە ئاست ئەو هەموو کڵپە و سووتان و بڵێسەی خۆشویستنی ئەوسا و ئێستاکەی بۆیان کە وا خەریکە دەیکا بە کۆی زووخاڵ! ئەم لە کوێ و ئەوان لە کوێ؟

ئەگەر منم لە فیراقیان کزەم لە جەرگەوە دێ
ئەگەر دڵە وەکوو جەرگم دەڵێی ئەوا سووتا

مەگەر «نالی» گەیشتبێتە ئەم تەندوورەی ئاگر تێبەربوونی سۆزی غەریبی:

لەم شەرحی دەرد و میحنەتە لەم سۆزی غوربەتە
دڵ وەختە بێ بە ئاو و بە چاوما بکا عبوور

پێی ناوێ من بڵێم، لە کاتی وەها پڕ هەیەجان و جۆش و تلانەوەدا گلەیی و گازندە لە خۆوە زەنە دەکات. سەیری نالی لە کۆتایی هەڵچوونی مەنجەڵی دەروونیدا چ بە سالم دەڵێ:

حاڵی بکە بە خوفیە کە ئەی یاری سەنگدل
نالی لە شەوقی تۆیە دەنێرێ سەلامی دوور

یارەکەی «سەنگدل» نەبوو، بەڵام نالی لە کۆتایی نامەدا وەها سووتاوە بەدەم سۆز و کڵپەی غەریبیەوە، خۆشەویستیی عادەتی لێ بۆتە دڵڕەقی.

«کوردی»یش وەک نالی و حاجی لە برە شیعرە پڕ کزە و گڕی بەرەو غەریبی چوونەوەی «عەزیزان من ئەوا ڕۆییم لە لاتان» دا ئەم بابەتە گلەییە نازکارانەی هەڵڕشتوە. سەرلەبەری شیعرەکان گلەمەندانەن بەڵام ئەم تاکەیان نموونەییە لە لایەن نیشاندانی گازاندە و خۆشویستنەوە:

جەفاتان دام و کوشتمتان بە زاریی
نزولی ڕەحمەتە جەور و جەفاتان

من لە ڕوون کردنەوەی زەرفی گلەییەکەی حاجی نموونەم لە شیعری دوو شاعیری کورد هێنایەوە کە وەک حاجی بە دەم سۆزی غەریبیەوە گلەییان لە خزم و دۆستان کردوە، هەمان دیاردە لە شیعری غەیری کوردیشدا بە زۆری دەدیترێت، بەڵام پێویست نابینم خوێنەریان پێوە خەریک بکەم هەم لەبەر ئەوەی کە دوو نموونەی گەورەی شیعری کورد بەسە بکرێن بە ڕوونکەرەوەی مەبەست، هەم لەبەر ئەوەش

که تێکڕای باسەکە لەگەڵ بەراورد کردنی وەزعی حاجی قادر خۆی بێ هێنانەوەی نموونەی شاعیری تر گەلێک بەرەو ڕوونبوونەوە چووە.

کەواتە وەک من بۆ مەسەلەکە دەچم، حاجی قادر هۆیێکی زاتی و یەکێکی مەوزوعی، بە جووتە و تا ڕادەیێکیش بە شێوەیێکی عەفوی کە زۆر دەربەستی لێکدانەوە نیە، پاڵی پێوە ناوە بۆ دەربڕینی گلەیی. هۆیە زاتییەکە لەوەوە دێت کە نەفسی تینووی دیداری خوێش و وڵات وەها کول و تەلەزگە بەستوو دەبێ کە بەبەریەوە هەیە لە خۆوە بکەوێتە سەر گلەیی کردن، با ئەو گلەییە لە نێزیکترین و خۆشەویسترین کەسیش بێ. هۆی مەوزوعیش ئەوەیە کە حاجی لە بەیەکتر گرتنی خۆشویستنی خۆی بەرانبەر کۆییان و لێوەرگرتنی خۆشەویستی لەوانەوە بە جێگەی گلەییان دەزانێت تا ئەو ڕادەیەی هەست بە بێحورمەتی بکات لەو درێغ کردنەیاندا.

ئەوەی ڕاستی بێ ئەم هۆیە مەوزوعیەش بەشێکی بەرچاوی «زاتی» تێدایە چونکە ئەگەر هەستە زاتییەکە زۆر کول و نازک و تەنک نەبوویایە گلەییەکەی نەدەگەیاندە ئەم سنووره تێهەڵکشیوەی «بێحورمەتی» لە حاڵێکدا دەزانین هەموو قسە عادەتیەکانی تری حاجی بەرانبەر خەڵقی کۆیێ لە زەمینەیەکەوە هەڵستاوە کە وا هەرگیز تارمایی هەست کردنی بێحورمەتی پێدا تێناپەڕێت. دەمەوێ بڵێم سەر کردنی سۆزی غەریبی پاڵی بە تەعبیری حاجیەوە ناوە بەرەو بەکارهێنانی وشەی «بێحورمەتی» دەنا لەوانە بوو بەدەم لێکدانەوەوە بیگوتبا «لە کەمتەرخەمیمان بوو حاجی هەڵات» وەیا بێژەیێکی تری لەم بابەتەی بەکارهێنابایە.

لەبەر تیشکی ئەم بۆچوونە و لێکدانەوەیەدا کە هەمووی بەندە بە بنگەی واقیعی و ڕاستی و دروستەوە هەڵوەستی حاجی لەم گلەییەیدا ڕوون دەبێتەوە تا ئەو ڕادەیەی گۆشەی پەنهانی تێدا نەمێنێت. ئەوەندە دەمێنێتەوە بڵێم حاجی قادر لەوەی گوتوەتی هەستێکی ڕاستی، بێ چاوڕاوی، دەربڕیوە و خۆی تێدا لەسەر هەق زانیوە چونکە لەو زەرفە پڕ هەیەجانەی هەڵبەستەکەی تێدا هۆنیوەتەوە بە ڕاشکاویی ئاخ و کەسەر و خەفەتی غەریبایەتیەکەی گەییشتوەتە پلەی گلەیی تێدا کردن، لە گلەییەکەشدا بەلای هەست بە بێحورمەتی کردندا شکاوەتەوە.

لەم شی کردنەوەیەدا لایەنی سەرچاوەی گلەیی، کە حاجی قادرە، درایە بەر لێکۆڵینەوە و خرایە ژێر تیشکی فەرمانی واقیعی پڕ کڵپە و هەڵپەوە.

دەمێنێتەوە قسەیێکیش لە حاڵ و باری لایەنی گلەییلێکراو بکەین کە خەڵقی کۆیەی صەدودە ساڵ پێش ئەمڕۆکەیە. ئاخۆ بەپێی کێشانە و پێوانەی ئەو سەردەمە لەو پلە ژیارییەی کۆیەی تێدا بوە بە هەموو لایەنەکانی کۆمەڵایەتی و ئابووری و ڕۆشنبیری و خوێندەواری و ڕامیاری و بیروباوەڕی میراتی و فەرمانی یاساکانی بەیەکەوە ژیان و سەروبەرەکانی تری بەڕێوەچوون و تەگەرە و کۆسپ و خۆشی و ناخۆشیی ڕۆژانەوە چ چاوەڕوان دەکرا ڕوو بدات غەیری ئەوەی ڕووی دا؟ ئەگەر بشێ ناچاربوونی حاجی بۆ ئاوارەبوون، کە زانیمان شتێکی حەتمی بوو، بکرێ بە هۆی عەیبداربوونی خەڵقی کۆیێ لەو سەردەمە مەیلەو کۆنەدا، ئایا ئەوەی مومکین بوو بکرێ و نەهێڵێ عەیبەکە پەیدا بێ چی بوو؟ دەبوو کۆیی چی بکەن بۆ ئەوەی نەبنە جێگەی گلەیی؟

بەڕاستی ئەم پرسیارانە، کە لە ڕواڵەتدا زۆر سادەن، بە زەحمەتێکی لەحەد بەدەر وەرام دەدرێنەوە وەرامدانەوەکەشیان لە دەمەتەقە ڕزگار نابێ، واتە لەوانە نیە وەک ئیسپاتی پرسیاری حیساب بە بەڵگە بسەپێ و ڕێی نەسەلماندن لە ڕەخنەگر ببڕێتەوە وەیاخود هەموو وەرامێکی تر پاشگەز بکاتەوە. لەگەڵ ئەمەشدا مێژووی کۆن و نوێ پڕی ڕووداوی وەهایە بخرێتە بەر پرسیاری دواکاتەوە، ئایا ئەو گەلەی ڕووداوەکەی لە نێواندا قەوماوە بۆچی هەڵوەستێکی پیاوانەتری نەگرتە بەر؟ «أبو ذر الغفاري» بۆچی تەنها مایەوە و کەس لێی نەپرسییەوە؟

بێ ئەوەی پێویست هەبێ ناوان بهێنم پرسیارێکی گشتی دەکەم و دەڵێم ئەو هەموو مرۆڤە گەورانەی کەوا دوای دەیان و صەدان ساڵ لە بەسەرچوونیان ناویان بە تەقدیسەوە دێت لەبەرچی گەلێکیان خەریکی لە برسان مردن بوون؟ بۆچی حورمەتیان نەگیرا؟ کەس بەقسەی نەکردن؟ بەڵکوو گاڵتەیان پێ دەکرا؟ من لەم مەوزوعە گرنگەدا ڕای تایبەتی خۆم هەیە کە چ پێوەندییێکی بەو ڕایانەوە نیە کە هەر یەکەیان پرسیارەکە بەرەو مەبەستێکی تایبەتی دەبات و وەرامێکی دڵخۆشکەرەوەی خۆی دەداتەوە، ڕایەکەم لەو بابەتەش نیە عوزری بێجێ بۆ گەلان بهێنێتەوە وەیا ئافەرین لەو تاکانە بکات کە هەڵوەستی ناواقیعییان هەبوە. بەلای قەناعەتی خۆمەوە لەو پرسیارانەدا وەرامێکم هەیە پاڵاوتەی هەڵکەوت و واقیعی ڕاستەقینەی بێفێڵە بەنیسبەت گەلان و تاکان و زۆرداران و زەرفی مێژوویی و پلەی گۆڕان و باری کۆمەڵایەتی و... هتاد-ەوە، تەنانەت لەگەڵ خۆمدا وەرامی ئەو

پرسیارەشم داوەتەوە کە ئەگەر گەل پێڕەوی مرۆڤێکی بلیمەتی کردبایە لەو بانگەوازەی کە پێش کات و زەرفی خۆی کەوتۆتەوە ئایا ئامانجی ئەو بزووتنەوە بێ وەختە چاک دەبوو یا خراپ، بەڵام لەم باسە دوور و درێژە و پڕ گرێوگاڵە واز دێنم و دەلکێم بە جۆرە هەڵسەنگاندنێکی پرسیار و وەرامەکەوە کە بەگشتی لەگەڵ پرسیار و وەرامی وەهادا دەکرێت و بایی ڕوون کردنەوەی باسی قسهلێکراو دەکات.

لە چارچێوەی ئەم شی کردنەوە عادەتیە بەرتەسکەدا دەتوانم بڵێم کەمتەرخەمیی دانیشتوانی کۆیێ لە ئاست حاجی قادردا بەپێی کێشانە و پێوانەی چەرخێک لەمەوبەری کۆیە و شوێنی وەک ئەو، کەمتەرخەمیەکی عادەتی و گشتی بوە لە ئاست مرۆڤی وەک حاجی قادردا، واتە ئەگەر حاجی بە هەموو خاسیەتەکانیەوە لە جێگەیێکی تری کوردستاندا ژیابا هەر ئەوەندە ڕێزەی لێدەندرا کە خەڵقی کۆیە، بە تایبەتی براگەورەکانی، لێیان ناوە. بەڕاستی من کە ئەمە دەڵێم دەمەوێ خۆم لەدەمەتەقەی بێلزوم بدزمەوە بەوەدا کە ناڵێم حاجی قادر لە غەیری کۆییدا پێی نەدەکرا وەها بێپەروا و لەخۆڕازی و باوەڕ بەخۆهاتوو بێت و گوزەرانیش بکات چونکە بەدوا ئەم قسەیەمدا پرسیار هەڵدەستێ و پێم دەڵێ «بە چ مەعلووم؟» ئەوساش دەبێ بەدوا بەراورد کردنی وەزعی کۆیە و غەیری کۆیە بکەوین و بەڵگان پەیدا بکەین و گریمانە (فرضیە) ی خەیاڵی بدەینە بەر هەڵسەنگاندن و ئەزمونەوە... کە دەزانم ئەنجامەکەی بەهەمەحاڵ لە نەسەلماندن ڕزگار نابێ چونکە ئەنجامی ڕووداوێکی واقیعی نیە. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا تیشکێکی هەندێ بیروڕای لێرە بە پێشەوەم نەختێک ڕووناکایی داوێژێت بۆ سەر ئیحتیمالی ئەوەی ئەگەر حاجی لە غەیری کۆیێ ژیابا وەزعی چۆن دەبوو. تیشکەکە لەوەوە دێت کە من لە موناسەبەدا گوتومە باری ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتیی پێشکەوتووی کۆیێ لە چاو جێگایانی تری کوردەواریی ڕێگەی دا حاجی قادرێک هەڵ بکەوێت. بەدوا ئەویشدا مەلای گەورە بێت وەیاخود تاکە جێگەیێک بێ لە نێوان هەردوو زێیاندا بتوانێ شانبەشانی سلێمانی مەیدانی ئەدەب و کوردایەتی ببڕێ هەرچەند خۆی ناوچەی حوکمداریش نەبوە... ئەم بیروڕایە لە زیمندا وەرامی ئەو پرسیارەش دەداتەوە کە بڵێ ئەگەر حاجی لە شارێکی تری کورد بوویایە چ پلەیێکی حورمەتی دەبوو؟ من لەمە پتر بەراوردی ئیحتیمالی ڕوونەداو ناکەم لەگەڵ ڕوونەداوێکی تردا و دەگەڕێمەوە بۆ سەروکاری هەڵوەستی کۆیێ لە ئاست حاجی قادر.

ئێمە دەزانین، بەپێی ساغ کردنەوەی کە لە بەشی دووەمی ئەم نووسینەدا کرا، حاجی قادر بەر لە ئاوارەبوونی دەستی نەکردبوو بە خەباتی کوردایەتی و نەکەوتبوە سەر شیعری نیشتیمانپەروەری، لەبەر ئەمە پایەی حورمەت و بێحورمەتی کە کۆیی بۆ حاجییان ڕەچاو کردبێت دەخلی بەسەر لایەنی کوردایەتی و سیاسەتەوە نیە، هەرچی هەیە لەو مەسەلەیەدا بەندە بە ڕێزی کۆمەڵایەتی و وەفاداریی بەرانبەر دڵسۆزی و حەقپەرستیی حاجی قادرەوە، کە دەزانین مەسەلەیێکی کەم بایەخ نیە بەڵام چەندێکی بایەخداریش بێ کارەکە ناگەیەنێ بە تاقی کردنەوەی هەستی نەتەوایەتی و کوردایەتی و لای خەڵقی ئەوسای کۆیێ. لەگەڵ ئەمەشدا بایی ئەوەندەی بتوانین بڕیار بەسەر چۆنیەتیی هەڵوەستی کۆییاندا بدەین بەرانبەر کوردایەتیەکی حاجی قادر لەو سەردەمەدا کردبای بنگە و بەڵگەی لێکدانەوەمان بەدەستەوە هەیە.

بە لامەوە وەک بەدیهیە ئاشکرایە چ ئیمکانی دەنگدانەوەی بانگەوازی سیاسی و کوردایەتی لەو سەردەمەی کۆیە و جێگاکانی تری کوردستانی ژێرووودا نەبوو تا ئەگەر حاجی قادر یان یەکێکی وەک ئەو تانووتی کوردایەتی لێدابان بۆی بکەوتبانایە جموجوڵ. ئەو وڵاتە لە بارێکی وەهادا نەبوو فکر و هۆشی خۆی بۆ ئەو تەرزە دەنگ و ئاوازانە بکاتەوە و هەنگاویان بە دوادا هەڵبێنێت و خۆیان بۆ بهاوێتە تەنگوچەڵەمەوە بە تایبەتی کە خاوەنی بانگهێشتنەکە هەژارێکی تاک و تەنها بێت و بەحاڵ توانای ئەوەی هەبێ ڕاز و نیازی خۆی لەگەڵ دەر و جیران و دۆستخوایاندا بکات. هەموو مێژووی بزووتنەوەی سیاسیی بەدەنگ و هەرا کە لە کوردستان خەڵقی بزواندبێ بە سەرۆکایەتیی خاوەن دەسەڵات و سامان و عەشیرەت و چەک و ماڵ بوە، زوربەی زۆرینەشیان ڕەنگێکی دینداری و بەرماڵنشینیی پێوە بوە بە تایبەتی لە ڕۆژانی حاجی قادر بە دواوە.

لەمەش بترازێین بەڵگە لە بەسەرهاتی حاجی قادریش هەر پڕی ناو دەستمانە. ئەو بانگەوازەی کە دواتر لە ئەستەمبوڵەوە وەک پەیامی ئاگر لە هەناوی حاجی قادرەوە بەرەو دڵ و ویژدانی میللەتەکەی زمانەی دەکێشا چ کەسی نەوروژاند، بۆ ماوەی دەیانساڵیش دەنگێکی لە هیچ لاییکەوە هەڵنەستایەوە، ئیتر بۆ دەبێ ئەگەر زووتر و ناکامتر دەنگەکەی حاجی بەرز بووبایەوە میللەتەکەی بەدوا دەنگیدا هاتبان؟ ئەم موعجیزەیە چۆن ڕووی دەدا؟ بەڕاستی لێرەدا موناقەشەی «ڕوونەداو» ێک دەکەین کە لە چەند سەرانەوە ڕووی نەداوە. یەکەم لەوەوە کە دەزانین ڕووی نەداوە، دووەم

لەوەوە کە باوەڕ دەکەین ئەگەر حاجی بانگهێشتنی کوردایەتیشی کردبانایە چ وەرامێکی لێ وەرنەدەگرتنەوە بە دەلیلی ئەوەی دواتریش وەرامی لێ وەرنە گرتنەوە، سێیەم لەو ڕووەوە کە حاجی قادر خۆی چ دەنگێکی کوردایەتی لێ بەرز نەبۆوە تا بە خەیاڵ بیکەینە هۆی ئیمکانی دەنگدانەوەی لای خەڵقەکە. لەگەڵ ئەمەشدا گێڕانی فکر بە هەموو ئیحتیمالاندا بێسوود نیە چونکە هەر نەبێ ڕای دێنێ بەم تەرزە وردپێوییە لە تۆژینەوەدا. دەڵێن زاناکانی مەزهەبی حەنەفیی وەرامیان بۆ ئیحتیمالی وەها حازر کردوە کە بە درێژایی هەزار و دوو صەد ساڵ ڕووی نەداوە.

بە پێی ئەم لێکدانەوەیە و لەبەر ڕۆشنایی تێبینی هەموو سەروبەرێکی ئەو کاتەی گلەیەکەی حاجی قادری بەر دەکەوێ، خەڵقی کۆیێ هەڵوەستێکی عادەتی و چاوەڕوانکراویان هەبوە بەرانبەر حاجی. من نایاتە بیرم لە هیچ شوێنێکی تری کوردستاندا چ کەسی بەقەدەر حاجیی هەژار و بێکەس هێندەی ئەو حورمەتی پێ درابێت وەیا بەقەدەر ئەو هەڵوەستی پڕجورئەت و قسەی ڕەقی لێ سەلمێندرابێت، بە مەرجێک هەڵوەست و قسە پڕجورئەت و ڕەقەکان ڕوویان لە مرۆڤی بەدەسەڵات بووبێت چونکە نە لەو سەردەمە و نە ئێستاکەش خۆگیڤ کردنەوە لە مرۆڤی بێدەسەڵات دەلالەتی ئازایی تێدا هەبوە. مرۆڤی بێدەسەڵات وەک ئەو «بەردە عازەبانە»یە کە هەموو خاوەن تین و هێزێک تێی دەنووسێت و خۆی پێ تاقیدەکاتەوە و چ گلەیانیش ناهێنێتەوە سەر خۆی. یەکێک لە جوانمەردیەکانی حاجی قادر ئەوەیە هەرگیز لێی نەبیستراوە لە ئاست هەژار و بێدەسەڵاتاندا خۆی هەڵپرینگاندبێتەوە، مەگەر لەو حاڵانەدا کە لە زەمینەی پەند و ڕەخنەدا بۆ سوودی گشتی، تێکڕای میللەتی سەرشکێن کردبێت وەک کە لەم چەند شیعرەیدا دەڵێت:

حاجی کەسێکە بێکەس بۆ ئێوە قوڕ دەپێوێ
گوێی لێ دەکەن زەریفە، نەیکەن بەڵا لە خۆتان

میللەتیش هێند کەرن وەکو جاران
دەستییان ماچ دەکەن دەڵێن قوربان

بەڕاستی حورمەتی کۆییان بۆ حاجی قادر، کە حورمەتێکی لایەق بە حاجی قادری ئەو سەردەمانە بوە، بەر لە هەموو شتێک لە ئاکارە جەوانمەردانەکانی حاجییەوە سەری هەڵداوە.

ئەو حاجییەی کە یەکەو تەنها بەرانبەر شەعبەدەی شێخی ماوێلی ڕاوەستا وەیا لوقمەیێکی گەورەتر بوو لەوەی بە گەرووی شێخ غەفووری تاڵەبانییدا بچێت، هەر خۆی بوو دەستیشی لەبەر کەس پان نەکردەوە و خۆی بە چووکەی کەس نەزانی و ڕێزی خۆی بەسەر هەموو مەردمدا سەپاند. خەڵقی کۆیێ خێریان بە حاجی نەکردوە لەو حورمەتەی پێیان ڕەوا دیتوە. لەگەڵ هەموو نەداری و هەژاری و بێ ماڵ و حاڵیدا کە نەقشی سەرلەبەری ژیانی حاجی بوو، هەمیشە لە ڕیزی پێشەوەی ڕێز لێگیراوەکانی کۆیێ بوە.

من لەوەدا دڵنیام کە ئەگەر یەکێکی وەک حاجی لەم سەردەمەدا پەیدا ببێت، لە کۆیێ یا لە شوێنێکی تری کوردستانی وەک سلێمانی و هەولێر، هەر بەقەدەر ئەوسایی کۆیێ ڕێزی لێ دەنێن. خۆ ئەوەی ڕاستی بێ لەم سەردەمەدا[101] نە سلێمانی و نە کۆیێ و نە هیچ جێگەیێکی تر لە کوردستانی پان و بەرین، بەقەدەر کۆیەی صەد ساڵ پێش ئەمرۆ ناتوانێ بە ئارەزۆی خۆی ڕێزوپایە لە یەکێک بنێت چونکە زۆر ئاشکرایە بەدوای پەیدابوونی بزووتنەوەی سیاسیی جۆراجۆر کە هەر یەکەیان بیروڕا و فەلسەفەی تایبەتی خۆی هەیە، ڕێزوپایەش بوو بە ماڵی سیاسەت واتە ئەگەر یەکێک باوەڕی سیاسیی وەیا ئابووریی لەگەڵ هی لایەنە سیاسییەکان ڕێک نەکەوت چ ڕێزی لێ نانرێت، بگرە دوشمنایەتیشی دەکرێت بەڵکوو ئازاریش دەدرێت هەر نەبێ بە قسەی سووک و بێحورمەت کردن.

حاجی قادرێک کە لەو سەردەمە زووەدا هێندە سەربەخۆ بوە لە بیروباوەڕدا کە ڕووبەڕووی هەموو بیروباوەڕێکی پەرەسەندووی ئەوسای کرد بێگومان لەم ڕۆژگارەشدا هەمان سەربەخۆیی بیروباوەڕ و بەخۆنازین و ئیمان بەخۆ هێنان ڕووبەڕووی بیری پەرەسەندووی ئەم سەردەمەشی دەکرد و ناحەزی هەموانی بۆ

---

[101] ئەم «سەردەمە» ساڵی 1972 دەگرێتەوە کە گەلاڵەی نووسینەکەی تێدا بە پایان گەیشتوە.

خۆی ڕادەکێشا. ڕەنگە نیشانم پێکا بێت لەوەدا کە بڵێم حاجی قادر بەو هەموو ئازادییەی کە هەیبوە لە بیروباوەڕ و لە کردەوەدا نەیدەتوانی لە هیچ شوێنێک بحەوێتەوە ئەگەر ئەوساش وەک ئێستا هەموو جیهان کەرتکەرت و بڕبڕی عەقیدە بوویایە. تەنها لە حاڵێکدا دەیتوانی بحەوێتەوە کە هاتبا و خۆی دابایە پاڵ یەکێک لە عەقیدە پەرسەندوەکانەوە.

لە شوێنێکی وەک ئەو کوردستانەی ئێستاکەماندا کەس ناتوانێ بە تەنها خۆی ئاڵای باوەڕێک هەڵگرێت کە لەگەڵ هیچ یەکێک لە باوەڕە برەودارەکانی نێوان کورددا ڕێک نەکەوێت. کەسێک بیەوێت باوەڕی سەربەخۆی خۆی بکات بە ئاڵا دەبێ ڕێکخراوێکی سیاسی بۆ پێکەوە بنێت و ناوێکی خۆشکەڵەی لێبنێت و چەند دروشمێکی ئاورینگانەی بەسەر ڕێخراوەکەدا بشەکێنێتەوە ئەوسا بچێتە کۆڕی سیاسەت و میللەتپەرستی و نیشتمانپەروەرییەوە، خۆ ئەگەر ئەمە نەکات بە هەموو مەزهەبان کافر دەبێت هەرچەند هەموو وجودیشی ڕووناکی و قودسیەت بێت و هەرچی دەیڵێت ڕاستیی موتەڵەق بێت[102]. حاجی قادریش، لە باشترین حاڵەتدا، هەر ئەوەندەی لێ دەسەلمێندرا کە بە خۆی و دەستە و دایەرەیێکی سەر بە سیاسەتەوە خۆ لە کاروباری گشتی میللەت هەڵقوتێنێت، ئەوساش بێگومان «شێخ نەبێێکی ماویلی» ی زەمینەی سیاسەتی لێ پەیدا دەبوو بەگژیدا بێتەوە و چی ناجایەزە ئەوەی بەڕوودا بداتەوە، ئەگەر نەیدابایە بەر توهمەی خیانەتەوە.

من لەم بەیەکەوە ژیانەی بیروباوەڕی جودا چ گلەیم نیە، بە پێچەوانە زۆریشی حەز لێدەکەم، بەڵام ڕەوا نابینم بیروباوەڕە پەرەسەندووەکان گەلەکۆیی لە بیروباوەڕی نوێ بکەن و تێکڕایان بەگژیدا بێنەوە. چ گومانم لەوەدا نیە ئەم قسەیەم پشتگیریی کردنە لەو حاجی قادرەی کە لەم سەردەمەدا پەیدا بوویایە، هەروەها پشتگیریی

[102] لێرە بەپێشەوە ئەم دیاردەیە زۆر سەیرەی مرۆڤم باس کردوە، لە وتووێژدا گوتم: ئەگەر لەو جیهانەدا هەزار باوەڕی لە یەکتر جودا هەبێت، لە واقیعدا هەریەکێکیان 999- باوەڕەکەی تر بەدرۆ دەخاتەوە و هەراش پەیدا نابێ بەڵام کە یەکێک هات و گوتی سەرلەبەری هەزار باوەڕەکە درۆیە تێکڕایان بە سەروپۆتەراکیدا دەدەن، کەچی لە حەقیقەتیشدا ئەو لە چاو ئەوان تەنها یەک باوەڕی پتر بە درۆ خستۆتەوە واتە ئەوان 999- یان بەدرۆخستبۆوە، ئەویش هەزار.

کردنه لە هەموو ئەو بیروباوەڕانەی لێرە و لەوێ یاساغ دەکرێن، ڕەخنە گرتنیشە لەو بیروباوەڕە یاساغ کراوەی کە ئەگەر دەسەڵاتی هەبێ غەیری خۆی دەمکوت دەکات.

سەیرێکی دیوانەکەی حاجی قادر بکەیت دەبینیت هێرشی بە زۆر لایەندا بڵاو کردۆتەوە، چ لە ئەستەمبۆڵ بووبێت و چ لە کۆیەش بووبێت بە پێی نەریت و باری کۆمەڵایەتی ئەوسا یەخەگیری کاری وەها بوە کە ئەگەر لەم ڕۆژگارەدا یەخەگیری بابەتی هێندە بەهێز بوویایە دووچاری هەرای گەورەتر دەهات لەوەی کە دووچاری بوو. ئەم ڕاستییە بەسە بۆ دیار کردنی پایەی حورمەتی حاجی لای خەڵقی کۆیێ، بەڵام لە نوقتەی نەزەری بەدەنگ نەهاتنی حکومەتی عوسمانلی لەو شیعرە سیاسیە هێرشبەرانەی حاجی کە لە ئەستەمبۆڵ دایناون دەبێ ڕەچاوی ئەوە بکەین کە شیعرەکان ئەوسا لە چاپ نەدراون، بە ڕۆژنامەش بڵاونەکراونەوە، سەرەڕای ئەوە کە بە زمانی کوردی بوون دەشزانین کوردی نائاشنا بوە لەبەر گوێی تورکەکان و تێی نەگەیشتوون. هەرچەند ئێمە نازانین لەو شیعرانەی کە سووتاون و خەریکی کوردایەتی بوون ئایا هیچی وەهایان تێدابوە بە زمانی تورکی دانرابن وەیا بە زمانی تری وەک فارسی کە خوێندەوارەکانی تورک بەزۆری تێی دەگەیشتن، لەگەڵ ئەمەشدا تێبینی دوو شتی پێچەوانەی یەکتر لەو شیعرە سووتاوانەدا دەکرێت:

تێبینی یەکەم ئەوەیە کە حاجی لەو پەند و پەیامانەی بۆ کوردانی بەڕێ کردوون چ پێویستی نەبوە زمانێکی نامەفهوم بەلای کوردانەوە بەکار بێنێت، با لەوە هەر گەڕێین کە حاجی خۆی چەند شەیدای زمانی کوردی بوە و چۆن ئەو کەسانەی شکاندۆتەوە کە کوردن و بەغەیری زمانی کوردی دەنووسن. لەمانەش بترازێ ناچێتە عەقڵەوە خەباتی کوردایەتی بە غەیری زمانی کوردیی بکرێت. تاکە ئیحتیمالێک هەیە بۆ ئەوەی حاجی بە تورکی شیعری کوردپەروەرانەی گوتبێت ئەویش حاڵەتی پاشگەز کردنەوەی هێرشی ئەدیبەکانی تورک بێت بۆ سەر کورد، کە من هەرگیز شتی وەهام نەبیستوە و نەخوێندۆتەوە هەرچەند ناموکینیش نیە.

بە نموونەی مەبەس دەڵێم جارێکیان موفتی زەهاویی لە مزگەوتیکی بەغدادا دەبینێ چەند کوردێک بەدیار نووسینی سەردیوارێکەوە داماون، ئەویش هۆی دامانەکەیان لێ دەپرسێت، لە وەڵامدا دەڵێن شۆخێکی جەربەزە لە دیوارەکەی نووسیوە «لولا الاكراد لهلكت الحمير في بغداد» زەهاویش گورج دەڵێ لە ژێر ئەو نووسینە

بنووسەوە «صدقوا لولانا لهلكوا». دیارە لە هەڵکەوتی وەهادا بە کوردی وەڵامدانەوە نە تامی دەبێت نە سوود.

تێبینیی دوەم کە وا ڕاگەیاندنەکەی پێچەوانەی ڕاگەیاندنی تێبینیی یەکەمە ئەوەیە ئەو دەسەڵاتەی شیعرەکانی حاجی سووتاند دەسەڵاتێکی تورک بوە، دیارە لەم سووتاندنەدا نرخی شیعرەکانی ڕەچاو کردوە لە دوو تای تەرازووی

1) سوودی کوردی
2) زیانی حکومەتی عوسمانلی دەنا بۆچی خۆی بە سووتاندنیانەوە ماندوو دەکرد؟

«زەحمەتی بێهودە چ لازم؟» مصباح الديوان گوتەنی!

پوختە و کورتەی ئەم قسانە لەوەدایە کە حاجی قادر ڕێزێکی مناسبی ئەو سەردەمانەی لە خەڵقی کۆیێ دیتوە، وەک گوتیشم بەپێی سروشتی هەڵمەتبەری حاجی خەڵقی کۆیێ تا ڕادەیێک ڕێزلێنانەکەیان گەیاندۆتە پلەی ناز ڕاگرتن چونکە بێگومان لە هەموو کوردستاندا تاکە کەسێک هەبووبێ گوێی نەدابێتە غەیری دەنگی بیروڕا و ویژدانی خۆی، لەم پێناوەشدا دووچاری تەنگوچەڵەمە و بێنەوبەرەی سەخت و کوشندە بووبێت هەر حاجی قادر بوە، من زۆر گوێم ڕاگرتوە بۆ ئەو دەنگانەی لە کوردستاندا هارمۆنی مەند و داوەستاوی کۆمەڵایەتیی دێرینەی قاڵب بەستوویان لەراندبێتەوە بەرەو گۆڕان، ئەم سرنجەشم بەرەو دوا گێڕاوەتەوە تا ئەو سەردەمانەی زرینگەیێکی ئاوازیان بە ئێمە گەییشتبێت. بێگومان لە سەردەمی حاجی قادردا، بەر لەوەی کۆیێ جێبهێڵێت، تاکە دەنگێکی هارمۆنیگۆڕ دەنگی حاجی قادر بوە. گوڕینەکەشی لە سنوورێکدا بوە کە ئێمە دوای صەد ساڵ پتر لە تێپەڕین و بەسەرچوونی هەست بە لەرزە و لەرەی دەکەین و لێی دەکۆڵینەوە و دەیخەینە بەر بڕیاری مێژوو و پێداویستی کۆمەڵایەتی و فەرمانی سروشتی خاوەنەکەیەوە.

بەداخەوە ئەو تاکە بێمانەندانەی بەر لە حاجی گۆمی واقیعیان شڵەقاندوە، تا ئێستا، نە دەستنیشان کراون نە هیچی ئەوتۆ لە سەر هیچ یەکێکیان نووسراوە. ئەم نووسینە لە بەرگی دوەمیدا ڕووناکییێکی کزی خستە دەوروپشتی «مەلای ئیبنو ئادەم»ەوە، ئەویش نەک بە جۆرێکی سەربەخۆ بەڵکوو لە کولانەی باسی حاجی قادرەوە. هەروەهاش نووسینەکەم، لەو بەرگەدا بەپێی داخوازیی بابەت، ویستی گەردی

توهمەیێکی نارەواش لە دامەنی یەکێک لە قوتابیەکانی ئیبنو ئادەم بتەکێنێ کە «مەلای خەتێ»ـیە. بەڵێ ئەم کەمتاکورتە ڕوون کردنەوەیە چاکترە لە هیچ بەڵام گەلێک کەمترە لە پێویست.

بەڕاستی هۆیەکی بەهێزی خۆ خەریک کردنم بەدەرخستنی لایەنی ڕێزنانی کۆییان لە حاجی قادر لەوەوە دێت خەریکبوونەکەم پتر شەخسییەتی حاجی بەلای خوێنەری کورد و کوردییەوە ئاشنا دەکات و ناوەڕۆکی گەورەیی ئەو شەخسیەتە ئاشکراتر دەکات. مێژووی کورد و کۆیە و حاجی لەوە سوود وەرناگرێت بە کورتی و قوتیلەیی بڵێین خەڵقی کۆیێ ڕێزیان لە حاجی ناوە ئەگەر نەزانین حاجی چ هەڵوەستێکی ئازایانە و بێهەمتای هەبوە لەو سەردەمەدا، خەڵقی کۆیەش ئەو ڕێزەیان بە چاکەیێکی ڕاست و دروست بۆ حیساب ناکرێ ئەگەر مەعلووم نەکرێ هەڵوەستەکانی حاجی لەگەڵ بێدەسەڵاتییدا بە عادەت خەڵقی ئەو سەردەمەیان دەسڵەماندەوە و دەیانترساندن نەک بەرەو ڕێزلێنانی دەبردن، خوێنەریش ئەگەر پەنجەی نەخرێتە سەر کانگە و جێگەی شانازیی پێوە کردن لە ڕابردووی شرایەوەی میللەتەکەیدا لە خۆوە بە ڕاشکاویی هەست بەو کانگە و جێگایانە ناکات، گریمان بۆرە هەستێکیشی پێ کردن ناتوانێ بەرە و قووڵاییان ڕۆ بچێت و لە هەموو پانایی و درێژاییان بگات.

دەبیەینەوە لەم ڕۆژگارەدا ناوناوە قسەی کەم حورمەت لە حاجی قادر دەگیرێت وەیا چاو لە مەردایەتی و ئازایی و دڵسۆزی و هەڵوەستە بێهاوتاکانی دەپۆشرێت، کە ئەمە وابێ دیارە زانینی گەورەیی ڕاستەقینە و تەواوی حاجی قادر کارێکی ئاسان نیە، ئەوەی ڕاستی بێ دوای شل کردنەوە و شی کردنەوەشی بایەخ پێدانی بێ کەم و کەسر هەر ئاسان نیە چونکە جارێ خوێندەواری کورد ڕانەهاتوە گەورەیی لە شتی بچووکدا ببینێت، تەنانەت لەگەڵ ئەو هەموو پەرەسەندنی بایەخدان بە هۆی ئابووری لە گۆڕانی کۆمەڵایەتیدا کەم وا دەبێ گەنجی کورد لە ئاست ئەو هەڵبەستانەی حاجی قادردا هەڵوەست بکات کە بیری هاونیشتیمانیە هاوچەرخەکانی خۆی بۆ لایەنی گرنگی گوزەران و ژیان ڕادەکێشێت و فێری کەسب و کاریان دەکات. بەعادەت گەنجەکانمان حەز لە بەیتی زرینگەداری خەیاڵ وروژێن، تەنانەت شاعیرە تازەکانیشمان یەکجار بە ڕازاندنەوە و نماییشتەوە خەریکن تاکوو

هەندێ جار دەبینین شاعیر بەقەدەر نەققاش ئەرکی «تناظر» لە هەڵبەستدا هەڵدەگرێ.

من نامەوێ لەم قسانەمدا بە ناحەزی نمایيشت و ئاراييشت و زرینگە و ئاورینگی هەڵبەست بناسرێم چونکە بەلای منەوە هەموو جوانییێک نرخی خۆی هەیە، هەرگیزاو هەرگیزیش خۆم ناهاوێمە ناو ئەو چارچێوە تەسکەی کە هەندێ ڕواڵەتپەرست بە ناوی «هونەر بۆ گەل و هونەر بۆ هونەر» دەیکەن بە بەندیخانەی بەرهەمی ئەدەبی و هونەری، وەهاشی تەسک دەکەنەوە هەموو بەرهەمێکی تێدا دەخنکێت. من دەمەوێ زەینی ئەدیب و خوێندەواری نوێی کورد نەختێک لە بریق و باقی بەرهەمی ئاورینگدار بدزمەوە بۆ ئەو کردە و گوتانەی مومکین نیە بێ سرنجڕاکێشان نیگای خەڵق بۆ خۆیان ڕابکێشن، مومکینیش نیە بێ شەرحدان نرخیان دەرکەوێت. شەرحیش بە دوو قسەی بێسەروپێ و بە پەلە و کەمبڕشت هیچ سوودی نابێت. من لە تەجرەبەی خۆمەوە دەزانم، بە تایبەتی هی سەردەمی سەرەتاکانی خوێندنەوەی بە هێز و پێزم، چەند زەحمەتە دڵ و مێشکی خوێندەواری ئۆقرەنەگرتوو بەسەر شتی بچوکەوە ڕاوەستێ و ڕاگەیاندنەکانی وەرگرێ لە حاڵێکدا ئەو لە خوێندنەوەدا حەز بە بابەتی گەورە و زینگەردار دەکات وەک ئەو ساوایەی گەمەی وەهای پێخۆشە تەقە و چەقە و هەرای لێوە هەڵستێت.

بەڕاستی لێرەشدا من خەریکی بابەتی ئەوتۆم ئەگەر بە لێکۆڵینەوەی ورد و قووڵ نەبێ چ دەنگ و ڕەنگێک ناداتەوە. حاجی ڕێزی لێگیرا یاخود نەگیرا، بە زاهیر ڕووداوێکی تێپەڕیوە و بۆتەماڵی مێژوو چەندێکی بە درەنگە کاتەوە پێوەی خەریک بین گۆڕانی بۆ نیە و لێی زیاد و کەم ناکرێ ئیتر چ سوود لەوەدا هەیە بە کارکارەیدا بچینە خوارێ وەیاخود وەهای هەڵگوشین دوا دڵۆپی تەڕایی لێ بچۆڕێنینەوە...! ئەم تەرزە پرسیارە نارەزامەندانە بە بەریانەوە هەیە نەک هەر لەم لاباسە بچکۆلانەی حاجی قادردا بکرێن، بەڵکوو هەرچی تۆژینەوەی مێژوویی ورد و بەکەڵک هەیە بدرێتە بەر سوئالی وەها ڕەخنەگرانەوە، بەڵام بەڕاستی خۆدزینەوە لە تۆژینەوەی ورد و قووڵ و نەفەس درێژ لە هەرچی بابەتی مێژوویی و کۆمەڵایەتی و بابەتەکانی تری سەر بە ئادەمیزاد و بەرەوپێشچوون و تەنگوچەڵەمە و بێنەوبەرەی ژیانیەوە هەیە یەکسەر دەبێتە کوێر کردنەوەی ڕێگەی تێگەیشتن لە «چەندایەتی و

چۆنایەتی»ی ئادەمیزادەکە خۆی، چ لە مێژووی کۆنی بێت چ لەم ڕۆژەی بێت، چ لە دوارۆژی بێت.

وەی کاشکی هەموو خوێنەرێک دەیزانی زانایێکی «داروینیزم» چەند ماندوو دەبێ لە تەعلیلی ڕەفتاری پشیلە و مەیمون و ژیشک بۆ ڕوون کردنەوەی ڕێبازی گۆڕانی لێرە بە پێشەوەیان وەیا لەبەر خاتری بڕینی هەموو ناتەواویەک لە زانستەکەدا، ئەوسا بۆی ڕوون دەبۆوە خۆ خەریک کردنی من وەیا یەکێکی تر بە هەموو سەروبەرێکی ژیانی مرۆڤێکی وەک حاجی قادر چەند فەرمانێکی پێویست و ناچارییە ئەگەر مەبەست سوود وەرگرتنی تەواو بێ لە لێکۆڵینەوەی ئەو تەرزە بابەتە، بگرە سوودیش مەبەست نەبێ ڕوون کردنەوەی هەموو لایەنێکی باسەکە داخوازیی ئەو خەریکبوونە دەکات. ساغ کردنەوەی ئەم لایەنەی ڕێز گرتنی خەڵقی کۆیێ لە حاجی قادر لەبەر تیشکی واقیعی تایبەتیی کۆیە و تێکڕای کوردستان بە ڕێنمایی هەڵبەستەکانی حاجی خۆی کە جارێکیان گلەیی بێحورمەتییان لێ دەکات و دە جاران بۆ ئاسمانیان بەرز دەکاتەوە، کارێکە لەبەر هەنگاوی هەموو لێکۆڵینەوەیێکی بە نرخدا، کە ئەگەر نەکرێ، ببێتە جێگەی ڕەخنە و هۆی ناتەواوی لێکۆڵینەوەکەش.

لە ئاکامی ئەم وردپێویەدا گەییشتن بەو قەناعەتە کە هەڵوەستی کۆیێ لە ئاست حاجی قادردا هەڵوەستێکی چاوەڕوانکراوی ئەوسای کۆیێ بوە و بەپێی ڕۆژگارەکە چ بێحورمەتی تێدا نەبوە هەرچەند حورمەتەکە و بەقسە کردنەکە و بایەخدان بە پەندەکانی حاجیش لەوە کەمتر بێ کە ئیمڕۆ حەزی لێدەکەین چونکە واقیعی ئەو سەردەمە لەوەندەی پتر نەسەلماندوە، دیارە لە حاڵی وەهادا واقیعی ئێستاش لەوە پتر ناسەلمێنێ، پاشەڕۆژیش تا ئەو ئاسۆیەی لێمانەوە دیارە موژدەیێکی خۆشترمان پێڕاناگەیەنێت. میللەتی دواکەوتوو کە ڕۆژبەڕۆژ خەریکی گوزەرانی کولەمەرگییە لە ناو دەریای فکری میراتییدا وا بە ئاسانی ناتوانێ دڵی داخراوی خۆی بۆ فکری ڕوون و هەڵوەستی ئازایانە بکاتەوە، بە پێچەوانە وەک بە چاوی خۆمان دەبینین، ڕووی لە فکر و ڕەوشت و ڕەفتاری قاڵبگرتووی کۆنینەخوازە. زوربەی ڕۆشنبیران، نەک هەر میللەتی نەخوێندەوار، سڵ لە فکری نوێ دەکەنەوە، دواتریش کە فکرە نوێیەکە دەوری بەسەرچوو بە زەحمەت وازی لێدەهێنن بۆ یەکێکی لەو نوێتر و پێشکەوتووتر.

ئەوەندەی دیتبێتم و بیستبێتم، ڕۆشنبیر کە باوەڕی هێنا بە ڕاستیی بیروڕاییێک بەقەدەر تەعەسوبی نەخوێندەوارێک بۆ دەروێشی، ئەویش تەعەسوب بەکاردێنێ بۆ بیروڕایەکەی خۆی واش دەزانێ نوێخوازی وەک خۆی لە دایکی زەمانە بەوەلەد نەهاتوە، وەک دەروێشە نەخوێندەوارەکەش هەڕەشە لەو کەسە دەکات کە ئیمانی بە بیروڕایەکەی ئەو نیە کتێبیشت بۆ دادەنێت لەسەر پووچەڵیی فکری ئەو دەروێشەی پێشتر هەڕەشەی لە غەیری خۆی کردوە کەچی ئاگاداری خۆی نیە ئەویش بۆتە دەروێشێکی فکر وشکی پاشکەوتووی نیگاتەسکی موتەعەسیب. ڕەنگە لە هەڕەشە کردندا دەروێشەکەشی بەجێهێشتبێتەوە. ئەمە حاڵەتی بەرچاوی ڕۆژگاری خۆمانە، کە من زۆریشی لێ کەم دەکەمەوە، کوردیی گوتەنی بایی بەرقنەیێکی لێ باس دەکەم، کەواتە لە ڕێی قیاسەوە دەبێ هەر بە تەمای ئەو هەڵوەستە ببین کە خەڵقی کۆیێ بەر لە 110 ساڵ پێشوازی حاجییان پێکردوە.

دەگێرنەوە ئەدیبێکی زۆر موحتەرەمی 20 ساڵێک لەمەوپێشی سلێمانی منداڵان لە کوچە و کۆڵاناندا بەردبارانیان دەکرد، کە مردیش کەس ئاگاداری مردنی نەبوو... ئەم قسەیە و هی وەک ئەو تاڵ و ناخۆشە بەڵام بەداخەوە ڕاستە و لە دەست من و تۆدا نیە هۆیەکەشی لە هەناوی میللەت و واقیعەوە هەڵقوڵیوە لە ئاسمانەوە بەسەرماندا نەباریوە، دێو و جنۆکەش بە چاوبەستەکێ هەڵیان نەبەستوە.

حەقیقەت تا ڕوون دەبێتەوە کاڵاییێکی زۆر بزر و نهێنییە بە تایبەتی کە باری گشتیی بیروباوەڕ و کۆمەڵایەتی بەرهەڵستی لێ کرد، واتە ڕاستییەکە بێ تەرەف نەبوو، وەک ئەوەی بەر لە 200 ساڵ لە جێگەییێکی وەک ناوچەی «مەرگە» دا یەکێک گوتبای ئەم شینە پانەی دەڵێن ئاسمان لە ڕاستییدا نە شینە و نە پانە و نە ئاسمانە و نە بەرزە و نە هیچ... گوتەییێکی وەها کە خاوەنەکەی بە کوشت دەدا چ بەرژەوەندێکی ماددیشی تێک نەدەدا بەڵام بەرەنگاری باوەڕێکی بنجی خەڵقەکە دەبوو کە زۆر لە بەرژەوەند بەلایانەوە گرنگتر بوو. هەڵوەستەکان و ئازایەتیەکانی حاجی قادری بەر لە صەدودە ساڵیش جڵەوی خەڵقی بۆ لایەنی وەها ڕادەکێشا کە تێیدا ڕووبەڕووی نەریتی ڕێزلێگیراو و باوەڕی پەرەسەندوو دەبوون[103]، لە چ

---

[103] لە کتێبەکەی محەمەدی مەلاکەریم «حاجی قادری کۆیی شاعیری قۆناغێکی نوێیە لە ژیانی نەتەوەی کورد»، پەراوێزی لاپەڕە 90، تەعلیلی دەنگ نەدانەوەی

بانگەوازەکانی حاجی لە نێوان کوردی ئەو سەردەمەدا گێڕدراوەتەوە بۆ ئەوەی کە فکری حاجی نوێنەری ئایدۆلۆجیای سەرمایەداری بوو لە حاڵێکدا باری کۆمەڵایەتیی کورد و پلەی گۆڕانی هۆیەکانی بەرهەم هێنان (وسائل الانتاج) لە کوردستاندا جارێ قۆناغی دەرەبەگایەتی تێنەپەڕاندبوو هەروەهاش هێرشی حاجی بۆ سەر شێخ و مەلا، ئەویش لەو پەراوێزەدا گێڕدراوەتەوە بۆ ئەوەی کە نەزانی و شێخ و مەلا نیشانەی یاسای دەرەبەگایەتیین.

من لەوەدا لەگەڵ بیروڕای ناو پەراوێزەکەم کە دەڵێ فکری پلەیێکی کۆمەڵایەتی پێشکەوتوو لە نێوان میللەتی پلەیێکی کۆمەڵایەتی پاشکەوتوودا دەنگ ناداتەوە بە تایبەتیی لەو سەردەمە کۆنانەدا کە هۆی بڵاو کردنەوە و خەڵق تێگەیاندن و پڕوپاگەندە پەیدا نەبووبوو، بەڵام تێبینیی چەند ڕاستییێک لێ ناگەڕێ وا بەڕاشکاوی مەسەلەکە بدەینەوە بە پلەی گۆڕان و نەگۆڕانی باری کۆمەڵایەتی و هۆی بەرهەم هێنان.

تێبینی یەکەم ئەوەیە کە ئەو وڵاتە سەرمایەدارانەی حاجی قادر نوێنەری فکریان بوو، ئەوانیش شێخ و مەلا و پیاوی ئاینیی و پەرستگەیان زۆر تێدا هەبوو تەنانەت وڵاتێکی وەک ئیتالیای سەرمایەداری صیناعی ناوچەی حوکمی پاپا و دەسەڵاتی قەشەکان بوو. شاری ئەستەمبوڵ لە هەموو شارێکی مسڵمان پتر منارە و مزگەوت و تەکیە و خانەقای تێدا هەبوو. کە بێین و پایە و شۆڕەتی مەلا و شێخەکانی کوردستانی بێ پارە و پوول و دواکەوتوو بە پایە و شۆرەتی شێخی ئەزهەری قاهیرە و مەزاری سەیید بەدەو طەنطا و جەلالەددینی ڕۆمیی قۆنیە بگرین دەبینین شێخ و مەلای کوردستان چەند کزبوون لەچاو ئەوان.

تێبینی دوەم لەوەوە دێت کە بەسەرچوونی باوەڕی سەربە غەیب وەها ئالی و یەکسەرە و کوتوپڕ لەگەڵ داهاتنی پلەی سەرمایەداری، بگرە سوشیالیزمیش، نابێت. بەڵێ ڕاستە گۆڕانی پلەی ئابووری و کۆمەڵایەتیی داخوازیی گۆڕانی بیروباوەڕ و قەناعەت دەکات، بەڵام ئەوەش ڕاستە کە بیروباوەڕ و دین و مەزهەب، بگرە ئەفسانەی ڕووتیش، دەتوانێ لە چەرخێکەوە بۆ چەرخێک بەرگی خۆی بگۆڕیت و خۆی لەگەڵ دەوروبەری تازەدا بگونجێنیت، تەنانەت زۆر جاران دەبێتە پێشەوا و پشرەوی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەش. عێراق بە بەشی کورد و عەرەبیەوە یەکێکە لە

نموونەی ئەو وڵاتانەی ئایین تێیدا پێشەوای شۆڕش بووە. هەر لەم ڕۆژانەدا پیاوە ئاینیەکانی ڤێتنام لە دژی ڕژێمی سەر بە ئیمپیریالیزم خۆیان دەسووتێنن.

تێبینی سێیەم ئەوەیە، بیروڕای بانگەوازەکانی حاجی لە جێگەی وەک لە ئەستەمبۆڵیشدا دەنگی نەدەدایەوە، چونکە دەزانین بزووتنەوەی سیاسی لە پەراوێزیکی تەسکی ئەفەندیاندا دەجمی، زوربەی میللەت جارێ یەکجار دوور بوون لە بەشداری کردنی نارەزامەندی و هەڵگەڕانەوە لە دەسەڵاتی خەلیفە. کە قسەمان لەگەڵ دژایەتی ئەفسانە و شێخایەتیی درۆزن بێ نەک سیاسەت، لێرەدا نموونەیێکی بیروبارەڕی سەربە ئایینی ئەوسای تورکیا دەهێنمەوە. بەر لە شەڕی گەورەی یەکەم فەریقێکی سپای تورک دێتە کۆیێ و لەگەڵ «مەلای گەورە» دا دانیشتنێک و وتوویژێکی دوورودرێژی دەبێ بەتایبەتی لەبارەی ئایینەوە. هەرچی تورکەکە لە عەقیدەی خەڵقی تورکیاوە دەیگێڕێتەوە مەلای گەورە بە ئەفسانەی لەقەڵەم دەدات، تا دێتە سەر باسی حیکایەتەکانی «قصص الانبیاء» و دەپرسێ بەرانبەر ئەمانە چی دەڵێی؟ مەلای گەورە دەڵێ «سەراپا هەزەیان...» واتە هەمووی ورێنەیە. فەریقەکە لە گەلێک لایەنی ئەو حیکایەتانەوە پرسیار هەڵ دەستێنێت و بە وردی لەوە دەپرسێ کە گۆیا سلێمان پێغەمبەر هەزار ژنی هەبووە هەموو شەوێکیش سەر جێی هەموویانی کردوە، مەلای گەورە وەرامێکی وەهای دەداتەوە کە بەدوای ئەوەدا کابرای تورک خەڵقی مەجلیسەکەی بە شایەد گرتبوو گوتبووی من ئێستا لەسەر دەستی ئەم زاتە مسڵمان دەبمەوە...

بەڕاستی باری عەقیدەی ئایینی تورکیاش هیندەی بیرە ڕەوشەنەکانی حاجی قادر بەرەوپێش نەچووبوو هەرچەند لە لایەن پلەی گۆڕانی ئابوریی و کۆمەڵایەتییەوە قۆناغێکی سەرلەبەر کوردستانی بەجێهێشتبۆوە. ئەم دیاردەی وەخرانی گۆڕانی بیروباوەڕ و نەریت و ڕەوشتی کۆمەڵایەتی لەچاو پێشکەوتنی مادديدا زۆر نووسەری گەورەی فەلسەفەی ماددی قسەیان لێکردوە گەلێکیش لەو قسانە جەرگەی ڕاستیی پێکاوە و بەدرێژایی کات بەڕاست دەگەڕێ.

تێبینی چوارەم ئەوەیە ئەگەر حاجی بۆ شیرن کردنی تامی کوردایەتیی لە بەر زمانی نەخوێندەواری کوردا مەدحی ئەفسانەشی کردبا و لە شێخ و مەلای دنیادۆست بێدەنگ بووبا دیسان کەسی بۆ ئیقناع نەدەبوو، واتە جارێ ماکە پێکهێنەرەکانی

لاییکیشەوە مزە و سوودی ئەو ڕووبەڕووبوونەیان لێوە دیار نەبوو. پەندی کوردی دەڵێ «بۆیە پێت دەڵێم خاڵە چوێلەکانم بۆ بگری». کە ئەمە نەخشەی ڕاستەقینەی دڵ و دەروونی خەڵقی ئەوسا و ئێستاکەش دەکێشێت ئەگەر لە ڕێی تەئویلانەوە بەرەو شتی وەهای نەبەین کە مەبەسی خەڵق نیە و پەندەکەش بۆی نەچوە.

حاجی قادر بۆ خۆی هیچ چوێلەکەی نەبوو چ جایی ئەوەی نەیدەتوانی چوێلەکە بە خەڵقی ببەخشێ، ناحەزەکانیشی کار و بازاڕی وەهایان بەگەڕ دەهێنا کەوا هەر لە بەخشندەیی خەڵقەوە بتوانن چوێلەکە و مریشک و عەلیشیس بە دەوری

---

گیانی کوردایەتی پەیدا نەبووبوو. باشتریش ئەوەیە بڵێم ئەو ماکانە جارێ واقیع و مێژوو دەستیان لە بینەقاقەی شل نەکردبۆوە تا نەفس هەڵێنن. چارەنووسی کورد و مافە نەتەوەییەکانی لەبەر حوکمی ئەو واقیعە سەخت و بێمانەندەدا بوون کە لە کۆتایی بەرگی یەکەمی «حاجی قادری کۆیی» ـدا باس کراوە. میللەتی ئەوتۆ هەبوون پتر لە میللەتی کورد بەردەستی ئەفسانە و نەخوێندەواری و دەرەبەگایەتی بوون کەچی زۆر لە کۆنەوە خاوەن کیانی سیاسیی و نەتەوایەتیی بوون.

تێبینی پێنجەم ئەوەیە، حاجی قادر هەر لە کۆیەوە کەوتبوە سەر دژایەتی شێخ و ئەفسانە پەرستانەوە، صەدەها ساڵیش پێش حاجی مەلا و زانای وا هەبوون لە دژی تەڵەکەبازی و شەعبەدە گوتویانە و کردویانە. کە بمانەوێ قسەمان بگەیەنینە ئەوپەڕی بابەت، دەڵێین «إبن الراوندي» و «صالح بن عبدالقدوس» پیاوی وەک حاجی قادری هەزار ساڵ دوای خۆشیان بە نەزان لە قەڵەم داوە.

لەبەر ئەم تێبینیانە و هی تریش کە پێویست بەدوا کەوتنیان نابینم فەرقی پلەی گۆڕانی مێژوویی نێوان کوردستان و شوێنانی تر بۆ خۆی بە تەنها بایی تەعلیلی دەنگ نەدانەوەی ڕاگەیاندنەکانی حاجی قادر ناکات.

محمدی مەلا کەریم لەم بۆچوونەیدا ئەگەر تەواوی نیشانەشی نەپێکابێت ئەوەندە بەسە بۆ ئەو لە خۆوە بۆ تەعلیلێکی ڕوون ڕۆیشتوە بەتایبەتی لەو تەمەنە شلکەیدا کە کتێبەکەی تێدا نووسیوە. لێرە بەدواوە دەگەینە شوێنی وەها لە باسی خەبات و ئامانجەکانی حاجی قادردا دەبینین محمەی مەلا کەریم جەرگەی ڕاستیی مەسەلەکەی پێکاوە.

خواردەمەنییەوە بخەنە سەر خوانی مەجلیسانەوە. کە بە چاکی لە هەڵوەستی حاجی ورد بیتەوە دەبینی ئەو لە لایەن ماددە و مەعناوە ڕێگەی سەخت و ناهەمواری گرتبوە بەر کە خەڵق تێیدا ماندوو دەبێت سەرەڕای ئەوە پێوەندیی نێوان گرتنەبەری ئەو ڕێگەیە و نێوان سوودی نێزیک و بەرچاوی خەڵق لە کەسەوە دیار نەبوو.

لێرەدا قسەیێکی «ئەنجلز» م بە بیر دێتەوە لە کتێبەکەی «دژی دۆهرینگ» دا کردوەتی، من مانای قسەکە دەخەمە ناو کەوانەوە نەک وشەکانی چونکە لەبەرم نەکردوون. ئەنجلز دەڵێ «گیروگرفتی کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵی دواکەوتوودا هەر بە شێوەی «مەئسات» دەمێنێتەوە و چ چاری بۆ نابێ تاکوو گۆڕان و بەرەوپێش چوونی ئابووریی چارەی دەکات». من نەختێک یارمەتی لێکدانەوەکەی خۆم دەدەم بەوەدا کە کمێک پەراوێزی گوتەکەی ئەنجلز لێک دەکێشمەوە تاکوو بتوانێ باوەش بە هەموو ئیحتیمالێکدا بگرێت و دەڵێم «...تاکوو گۆڕانی واقیعی کۆمەڵایەتی چارەی دەکات» چونکە وا دەبێ لایەنی مەعنەویی بەسەر لایەنی ماددیی گیروگرفتدا زاڵ دەبێت، ئیتر لەم حاڵەتەدا ئابووری بۆ ئاسمانیش بەرز بووبێتەوە نابێتە ڕەوێنەرەوەی ئەو گیروگرفتە[104]. بەهەمەحاڵ تەعبیری «واقیعی کۆمەڵایەتی» مانای ئابوورییش دەگرێتەوە کە بێت و هەندێکی گیروگرفتەکە وەیا سەرلەبەری پەکی لەسەر بەرەو پێش چوونی ئابووری کەوتبێت.

لەبەر تیشکی ئەم ڕاستییەدا، هەڵسەنگاندن و نرخاندنی هەستی ئەدەبیی میللەت لە پلەی ساواییدا دەمانگەیەنێ بەو قەناعەتە کە وا لە ئیمکاندا نیە، نە ئیمکانی ماددی نە ئیمکانی زیهنی، هەموو مرۆڤێک لە پایەی ڕەوای خۆیدا دابنرێت و بەپێی لێوەشانەوە یا ڕێزی لێبنرێت وەیا بە خواری و سووکی سەیری بکرێت. کە تێکڕای گەل لە پلەی وەها نزمی هەستی ئەدەبی و کۆمەڵایەتییدا بوو تاکەکانیشی بە دەگمەن نەبێ ناگەنە ڕادەی ڕەچاو کردنی سوودی گشتی وەیا پێش خستنی بەرژەوەندی میللەت بەر لە بەرژەوەندی شەخسی. خۆ ئەوەی بەرچاوە لەم ڕۆژگارەشدا هەر چشتێکی وەهایە کە لە ڕۆژگاری حاجی قادری بە کەم دەگرین.

---

[104] سەیری باری پێشکەتووی ئابوریی «لبنان» بکە و ببینە گیروگرفتەکانی کۆمەڵایەتیشی لە چ دەریایێکی خوێن و وێرانیی نقومی کردوە (ئەم تێبینیە هی ڕۆژی 1976/4/3 ـە نەک ساڵی دەست پێ کردنی ئەم نووسینە).

له بیرمه جارێکیان نووسرابوو ئاهەنگێکی «تکریم» بۆ چارلی چاپلن له لەندەن بەرپا دەکرێ، وابزانم سەرەک وەزیرانی ئەوسای ئینگلیز ڕامسی ماکدۆنالد بوه و له ئاهەنگەکەدا حازر بوه، برناردشۆ دوانێک دەکات و له قساندا دەڵێ لەم ئاهەنگەدا دەبوو دوو کەس جێگەیان به یەکتر بگۆڕنەوە، چارلی چاپلن سەرەک وەزیران بێت و ڕامسی ماکدۆنالدیش ئاکتۆری کۆمیدی بێت...

گەیشتنی تاکی میللەت به پلەی زانایی و ڕۆشنبیری و قەدرشناسی و ڕەوشتی وەها پێگەیشتوو هەزاران جار ئاسانترە له گەیشتنی تێکڕای میللەت، وەیا زۆرینەی میللەت، بەو تەرزە ڕەوشتانە چونکە میللەت ملیۆنەها تاکە و ملیارەها گیروگرفت و کەموکوڕی یەخەی دەگرێت و دەیوەستێنێ. دیارە ڕەهابوونی تاک لەو گیروگرفتانەی دەوریان گرتوە ئاسانترە له ڕەهابوونی ملیۆنان جگە لەوە کە هەڵکەوتنی تاکێک له هەڵکەوتنی ملیۆن کەس چاوەڕوانکراوتر و ئاساییترە. لەگەڵ ئەمەشدا دەبێ بزانین لەخۆ بوردن و خۆبەخت کردنی تاک دوای هەڵکەوتن و پێگەیشتنی کارێکە تابڵیی سەخت، هەم لەبەر زەحمەت و ئەرکێکی کە تێیدا هەیە و هەم لەبەر بەفیڕۆ چوونی خۆبەخت کردنەکە ئەگەر له کێڵگەی هەمواردا تۆ نەداربێت. چاکە و دڵسۆزی و ئازایی و لەخۆ بوردن و هەموو جۆرە فیداکارییێک کە له نێوان میللەتدا دەنگی نەدایەوە و کەس ئافەرینی لێنەکرد هەر جارێک و دوو جاران خۆی دەکاتە مەسیحی صەلیبکراو ئیتر کز دەبێتەوە تا خامۆش دەبێت.

چ دوور مەبینە یەکێک کە هات و دوای دەنگ نەدانەوەی فیداکاریەکانی له نێو گەلدا هەر سوور بوو لەسەر هەڵوەستی خۆی خەڵق وەهای لێ بێزار ببن تا له ئاکامدا بکەونە لێوەتەنگ هاتن و بەلاوەنانی ئەگەر نەڵێم ئافەرۆز کردنی.

من لەوە تێدەفکرم، ئەگەر حاجی هەر له کۆیێ مابایەوە و کەوتبایە سەر بڵاو کردنەوەی باوەڕی کوردایەتی و شیعری سیاسی، لەوەندەش نەوەستابا کە پەرۆش و فکری خۆی به هەڵبەست دابایەوە بەڵکوو داوای له خەڵق کردبایە بکەونە سەر باری خەباتی سیاسی و وەدەست هێنانی مافی نەتەوایەتی وەک کە له ئەستەمبۆڵەوە به هەڵبەست لێی داوا دەکردن، ئایا هەڵوەستی خەڵقەکە له ئاست حاجی قادری ئەم جۆرە داوا کردنە چی دەبوو. لێرەدا هەڵوەستی عوسمانلییان بەدەنگ ناهێنم چونکە کە ئەوان بەدەنگ هاتن مەودا له پێش خەڵقی کۆیە و کوردستان نامێنێتەوە هەڵوەستی یار و نەیاری تێدا بکەن.

ئەم پرسیارە هەرچەند لە زاهیردا پرسیارێکی خەیاڵیی ڕووت و سادەیە چونکە لە شتێک دەتۆژێتەوە کە ڕووی نەداوە بەڵام لە لای خۆیەوە واقیعیبوون و واقیعی نەبوونی پەیام و خەباتی سیاسی دەداتە بەر فکر و لێکدانەوەمان. تەنانەت ئەوەشمان بە بیر دێنێتەوە کە وا گەنجانی کوردی شۆڕشگێڕی دوای ساڵانی سەرەتای 1930 چەندین ساڵ خەریکی خەبات بوون بۆ ئەو ئامانجە نۆژەنانەی کە وا تازەبەتازە لەگەڵ مەفهومی چینایەتی تێکەڵ دەبوون، بەر لەوەی ژمارەیێکی بەرچاوی گەل گوێ لە قسەیان بگرن لە حاڵێکدا دەزانین ئەو ئامانجانە پشتیوانی بەهێزیشیان هەبوو کە هەمیشەکات لە تین و تاویان زیاد بکات و پاڵ بە خەڵقەوە بنێ بۆ باوەڕ پێهێنانیان، ئەوانەی کە پەیامەکەشیان بە خەڵق ڕادەگەیاند، سەرەڕای هەبوونی مامۆستا و یاریدەدەر و پشتیوان، تاکە کەسیش نەبوون وەک حاجی قادری بێدەسەڵاتی هەژاری بێپشتیوان و بێڕابەر، سەردەمەکەشیان 70- 80 ساڵ لە سەردەمی حاجی قادری پێش ئاوارەبوون نوێتر بوو. بێگومان هەر پەیامێکی سیاسی لەو ساڵانەی سەرەتای 1930 دا تاکە کەس بەبەر خۆی گرتبایە لە هەناوی خاوەنەکەیدا دەخنکا بەر لەوەی لە لێوانی بێتە دەرەوە وەیا ئەگەر هاتیشە دەرەوە چ گوێچکەیێک ببیێت هەر نەبێ لەبەر ئەوەی نەیدەتوانی بە تەنها بیروڕای خۆی چاپ بکات و بە ناو خەڵقدا بڵاوی بکاتەوە...

پەیام و خەباتی پێش کاتی خۆی بێبەر دەبێ، بەڵکوو وەک ئەو نەمامە دەبێ کە لە سەرەتای زستاندا بنێژرێ ئیمکانی شینبوونی نابێ تا بەهاری لێ دادێت. ئێمە دوای زانینی ئەو هەموو پێداویستە پڕ زانست و تەکنیک و پیشەسازی و بەرەو پێشچوونی میکانیک و سەرلەبەری لایەنەکانی ژیار (حضارة) کە دروست کردنی فڕۆک پەکی لەسەریان دەکەوێت، ئەوجار بە چاکی تێدەگەین هەوڵ و تەقەڵای پیاوێکی وەک «عباس بن فرناس« بۆ فڕین چەند کارێکی بێ سەروبەر و بێ لێکدانەوە و بێ حیساب بوە.

ئەم جیهانە پڕی نموونەی ئەوتۆیە قەناعەتمان پێبێنێت بەوەدا ئەگەر حاجی قادر لە کۆیێ کەوتبایە سەر خەباتی کوردایەتی کەس بەدوا دەنگیدا نەدەهات، دووچاری ناڕەحەتیش دەبوو لە خەباتدا نەک هەر لە لایەن عوسمانلییانەوە بەڵکوو لەلایەن واقیعی کۆیە و کوردستانی ئەو ڕۆژگارەشەوە. بڕیاری ئەوتۆیی لە منەوە بەسەر گریمانەیێکدا (فرضية) کە ڕووی نەداوە نابێتە وشکەمەلە و خەیاڵبازی لە حاڵێکدا

من نموونەی زیندووی وەک ئەو فەرەزییە ڕوونەداوەم لە واقیعی خۆمان هێنایەوە، نموونەکەشم لە شتی ڕوونەداوی وەها هێناوەتەوە کە بەپێی زەرفی مێژوویی پتر لە ڕوودان نێزیک بوو تا ئەوەی خەڵقی صەدودە ساڵ پێش ئێستاکەی کۆیێ و کوردستانی خواروو شوێن خەبات و پەیامی حاجی قادر کەوتبانایە.

پوختە و کورتەی ئەم دوور و درێژەیەی لێکۆڵینەوە بەوە دێت کە دووبارە بڵێمەوە هەڵوەستی کۆیێ لە ئاست حاجی قادردا چ بێحورمەتی تێدا نەبوە هەرچەند مومکین نەبوە بە ئارەزۆی ئەو، وەیا لە گوێرەی دڵسۆزی ئەو، گوێ و دڵی خۆیانی بۆ بکەنەوە و پشتگیریی جەنگاوەرانەی لێ بکەین، کە دەزانین ئەمڕۆکەش بۆ یەکێکی وەک حاجی قادری صەدودە ساڵ پێش ئێستاکە ناکرێت.

**حاجی قادر و دەرەبەگایەتیی سەردەمی خۆی**

بەدەم باسی هۆیەکانی ئاوارەبوونی حاجی قادرەوە، کە وا نەختێک لێرە بە پێشەوە لێی بووینەوە، بە ناچاری کمێک دەوروبەی دەرەبەگایەتی هەڵاتین، بایی ئەوەی دەرخستنی ڕاستیی هۆیەکانی ئەو ئاوارەبوونە داخوازی کرد، پێشتریش لە هەندێ شوێنی بەرگی یەکەم و دوەمی ئەم نووسینەدا دەرخستنی هەڵوەستی حاجی بەرانبەر دەرەبەگ بووبوە بەڵێنی دوارۆژ کە لە جێگەی مناسبی خۆیدا باسی بکەم.

بەڕاستی ئەم باسە گەلێ جار لەم نووسینەدا جێگەی لەباری هاتۆتە پێش، بەڵام هەرجارە باسێکی تر خۆی پێش ئەمیان خستۆتەوە تاگەیشتینە ئاخەلێوەی قۆناغی ناوەندیی ژیانی حاجی کە ئیتر لەوە بەولاوە پێوەندیی نیشتەجێبوونی بە کۆیە و کوردستانەوە دەبڕێت و دەکەوێتە باوەشی غەریبییێکی بێ بڕانەوە، لە بەر ئەمە وا دەزانم مەودا نەماوەتەوە چی تر باسی «دەرەبەگایەتی» لە جغزی قۆناغی دوەمی ژیانی حاجی بوەخرێنین چونکە لەو جغزە دەردەچێت و دەچێتە ناو جغزی قۆناغێکی ترەوە کە ئەویش پڕە لە مەوزوع و باس و لاباسی جۆراوجۆر و پڕ دەمەتەقە.

لە ژێر سایەبانی ئەم سەرەباسەدا، وەک لە ئێستاوە دیارە و پێ بەپێی ئەم نووسینەش ڕوونتر دەبێتەوە، گرنگترین و گرێیاویترین و ناسکترین موناقەشەی

بیرورِا و واقیع بەدەوری باسی حاجی قادرەوە هەڵدەستێت، کەوا ڕەنگە گەلێک باوەڕی چەسپاو و حەسایەوە و ڕەگ داکوتاو لە خۆی بەدەنگ بێنێت. ئەم بەدەنگ هێنانە کارێکی ناچارییە چونکە ڕاستیی مەوزوعەکە، چ لە لایەن پێوەندیی حاجی قادر پێیەوە چ لە ڕووی پێوەندیی کورد و کوردستان و چارەنووسی مێژوویی کوردەوە بەو دیاردە کۆمەڵایەتییانەی دەوریان هەبوە تێیاندا و چ لەلایەن ناوەڕۆک و مەوزوعیەتی مەوزوعەکەوە بێت، شتێکە تابڵێی جوداوازە لەو بۆچوونەی کە وا بە شێکی باوەڕی ڕەگ داکوتاو لە خۆی کردوە بە ئایین.

شتێکی یەکجار بەرچاو لە وڵاتی بەرتەسکی عەزاب دیتوی چاو لە بێگانەی لاساکەرەوەی وەک کوردستان ئەوەیە خێرا لەسەر بیرورِای« مۆدێل» کورک دەبێت و دەشیکات بە جوجەڵە. هەرگیز چاوەڕوان ناکرێت لە وڵاتی بچوکی کەم سامانی دواکەوتووی دابڕاو ببێتە ڕابەری فکر و مامۆستای فەلسەفە و ڕێنمای بۆچوون و شی کردنەوە، نەک هەر لەو پرسیارانەدا کە شێوەی «جیهانی» یان وەرگرتوە بەڵکوو لە هەموو ئەو لایەنە و دیاردە کۆمەڵایەتیانەشدا کە تایبەتیی وڵاتەکەیە و بەشێکی مێژوو و حازریشیەتی[105].

بەداخەوە دواکەوتەیی چەند هەزار ساڵ وای لە کورد کردوە نەوێرێ لە خۆوە بڕیار بدات قاوە خۆشترە یا چایە نەوەک ئەم بڕیارە لەگەڵ میزاجی لایەنێکی ڕابەر و باوەڕ پێکراودا نەگونجێت[106]. بە جۆریکی ئاسایی و عەفەوی خوێنەری کورد گوێ ڕادەگرێ بۆ بیرورِای ڕۆشنبیران و خاوەن ڕایانی وڵاتە پێشکەوتوان، بە تایبەتی

---

[105] لە نمونەی بەگژدا چوونەوەی تەقلیدی کوێرانە مەلای گەورە ئەمەی گوتوە:

ئەگەر ئێکێک بڵێ نابێ وەها بی
دەڵێن ئەو کافرە بۆتە وەهابی

[106] دوای دەرچوونی بەرگی یەکەمی کتێبی «حاجی قادری کۆیی» ڕەخنەی ڕۆشنبیرێکی کوردی خاوەن شەهادەی بەرزم بۆ هاتەوە لەوەدا کە گوتبوم «حاجی شەقڵێکی وەهای لە خەرمانی شەرافەت دا کە بەکەس نەشکێت» ڕۆشنبیرەکە گوتبوی چۆن ناوی شەقڵ دەبات، خۆ شەقڵ هی دەرەبەگانە!

وڵاتی شۆڕشگێڕ، تا بزانێ ئەوان لەبارەی پرسیارەکانی سەر بە گیروگرفتی کۆمەڵایەتییەوە چ دوڕڕێک دەقەڵیشن و کام بڕیار بەسەر ڕەگ و ڕیشاڵ و قەد و لک و پەلک و بەر و هیشکەڵەکانیاندا دەدەن بەڵکوو بتوانێ لەبەر ڕۆشنایی ئەو بڕیارانەدا هەنگاوی مەوزون هەڵێنێت.

ئەم پەیڕەویی کردنەی خوێنەرێکی کورد بۆ بیروڕای خاوەن ڕایەکانی وڵاتی پێشکەوتوو لە سەرەتاوە فەتوای ڕاستبوونی دەرچووە بەوەدا کە گوتراوە و سەلمێنراوە کۆمەڵان هەموویان وەک یەکترن لە مەیدانی کۆمەڵایەتی و گۆڕانی مێژوویی و گیروگرفتی ئابووری و هێزە بەرەوپێشەکان و هێزە بەرەوپاشەکان و دەرد و دەرمان و... هتادەوە کە ئیتر پێویست بەوە نامێنێ هەرجارە لە تۆژینەوە و چارەسەر کردنی یەکێک لە دەردەکانی کۆمەڵایەتی کورد خەریک بێت تەزکەرەیێکی نفوسی «کوردیی» بۆ ئەو دەردە دەربهێنێت تاکوو لە ئەجزاخانەیێکی «کوردیی» دەرمانی بۆ بکرێت. خۆ ئەوەی ڕاستی بێ ئەگەر دەردی کۆمەڵایەتیی کورد لە صەدی صەد «کوردی» بێت و چ نموونەی وەک خۆی لە نیوان هیچ میللەتێکی تردا پەیداش نەبێ، نە دەرمان و نە پزیشک و نە ئەجزاخانە و نە ڕەچێتە و نە هیچ جۆرە چارەسەر کردنێکی «کوردی» پەیدا نیە تاکوو خوێنەری کورد وەیا نووسەری کورد هانای بباتە بەر و تریاقی لێ هەڵێنجێت.

خوێنەر و نووسەری کورد کە لە تەقلید کردنی غەیردا ئەم لایەنە زۆر بەهێزەی نەبوونی دەرمانی «کوردی» شەفاعەتیان بۆ دەکات گەلێک کەمتر جێگەی گلەیین لەچاو خوێنەر و نووسەری ئەو میللەتەی دەسەڵاتی چارە کردنی خۆوڵاتیشیان هەیە و هەر سووریشن لەسەر تەقلید کردنی[107] غەیری خۆیان.

ئەگەر خەسارەتمەندبوونی کورد و خوێنەری کورد لە تەقلید کردندا هەر ئەوەبێ کە ئەرکێکی بێسوود لەو تەقلیدەدا بەخەرج دەدەن، خەسارەتمەندبوونی میللەتێکی تری خاوەن دەسەڵاتی خۆی لە تەقلید کردندا دوو هێندەی هی کورد دەبێت چونکە

---

[107] تازەبەتازە پارتی کۆمیونیستی فرەنسە وێراوەتی بڵێ لە فرەنسەدا دیکتاتۆرایەتی پرۆلیتاریا مەبەستی خەباتی پرۆلیتاریای فرەنسا نیە... نەمبیستوە چ پارتییێکی تری وەک ئەو جارێ ئەم جورئەتەی کردبێت.

هەم ئەرکی بێسوود دەگرێتە ئەستۆیەوە هەم دەرمانی ڕاستەقینەشی لێ حەرام دەبێت. لەگەڵ ئەمەشدا دەبێ حیسابی هەژاری کورد بکەین کە هەموو جۆرە خەسارەتێکی لێ گران دێت تا ئەو ڕادەیەی کە تەقلید کردنی هەڵە لێی دەبێتە دەردی کوشندە، واتە بەر لەوەی بێدەرمانی کاری زەهراویی خۆی بکات، بەهەڵەچوون لە چەند و چۆنی دەردەکە فرزەی دەبڕێت.

ئەم وەتەنگ هاتنەی نووسەری کورد بەدەست ئەو بارە نالەبارە مێژووییەی کە دەسەڵاتی ڕابەربوون و پێشەنگبوونی فکری لێ ستاندوە جارێکی تریش کاری تێکرد لەو ڕووەوە کە وەتەنگی هێنا لە هەموو جۆرە ڕەخنەیێک کە لەو بیروڕا و فکرە حازربەدەستانە بگیرێت هەرچەند ڕەخنەش جەرگەی ڕاستی پێکا بێت و بیروڕایە ڕەخنە لێگیراوەکەش هەڵەی ڕووت و سادەش بێت.

لەم مەیدانەی قبووڵ کردن و نەکردنی ڕەخنەدا، کە دەزانین ڕێگەدان بە ڕەخنە نیشانەی بەرەو پێشچوونی ئادەمیزادە، گەلی کورد بەپێی فەرمانی واقیع و مێژوو دواکەوتوترە لە گیانی زانستی سەردەمە گەشەدارەکانی عەباسیان. لەو ڕۆژگارەدا زانایێکی ئایین موناقەشەی بوون و نەبوونی پەروەردگاری دەکرد و لە ناو کوفرەوە بەرەو ئیمان دەگەڕایەوە. لە ئاکامی ئازادیی موناقەشە و ڕەخنە گرتندا شانزە مەزهەبی ئاینیی باوەڕپێکراو لە نێوان بەرەی سوننیدا پەیدا بوو جگە لە دەیان ڕاڕەوی فکری تر کە بەرەو تاقمی کەم ژمارەی نابەرچاو لێرە و لەوێ کردبوویانە مەزهەبی خۆیان.

نووسەرێکی ئێستای کورد کە فکری غەیری خۆی دەڵێتەوە هەرگیز ناتوانێ بەقەدەر ڕۆشنبیرەکانی ئەو سەردەمەی «الا رأیتون» ی تێدا پەیدا بوو نیگافرەوان و دڵ کراوەیە و لێبوردوو بێت. بەڕاستی نووسەری ئەوتۆیی کورد کوتومت وەک «إبن بطوطة» یە کە جیهان بەلایەوە دوو کەرتی گردەبڕ و لەیەکتر جودا بوو. لایەکیان «دار الأسلام» و لایەکەی تریشیان «دار الکفر»، هەر بەو پێیەش ئەمیان «دار السلم» و ئەوی تریشیان «دار الحرب» بوو، کە دەزانین هەموو شتێکی «دار الحرب» بۆ غازییەکەی «دار السلم» حەڵاڵ بوو. بەلای پیاوی وەک «إبن بطوطة» وە مەرجی یەکەمی پاک و چاکبوونی جێگەیێک و میللەتێک ئەوە بوو کە مسڵمان بێت، ئیتر «المحروسة، حرسها الله، المعمورة» بۆ ئەو جێگایانە بەکار دەهات، هەرچەند چەپەڵترین جێگاش بوونایە، هەروەها «دمرها الله، احرقها الله...»

بۆ جێگای نامسڵمان بەکار دەهات ئەگەر خشتێکی لە زێڕ و یەکێکیشی لە زیو بوویایە. هەمان «إبن بطوطة» ی فکر و باوەڕ ئێستاکە لە نێوان کورددا دەدیترێت چونکە ئەویش هەمان کێشانە و پێوانەی حازربەدەستی پێیە کە ڕاستەوخۆ فکر و بیروباوەڕ و هەڵوەست و مێژوو دەخاتە بەر یەکێک لەم دوو دوعایە:

1) عمرها الله
2) دمرها الله

چ دەربەستیش نیە لەوەدا فکری چاک وردوخاش ببێت وەیا فکری چەوت بپەرسترێت.

جگە لەلایەنی بڕیاری مێژووی زۆر سەخت و ناهەمواری میللەتی کورد کە وا بە شێوەیێکی حەتمی فرەوانی نیگا لە کورد و هەموو میللەتێکی تری وەک کوردیش حەرام دەکات ئەگەر مێژوەکەی وەک هی کورد بێت، نووسەران بەعادەت کە شۆرەتیان بە جۆرە فکر و شی کردنەوە و بۆچوون و بیروباوەڕێکی تایبەتی دەرکرد و بەشێکی گرنگی کەسایەتییان بەوەوە بەند بوو، لایەنی «ذاتی»شیان دەخەنە پاڵ ئەو لایەنە «موضوعی»یەی کە بۆتە ئایینێکی نوێ و «دار الحرب» و «دار السلم» ێکی تازەی دروست کردوە ئیتر هەر بەجارێ ئیمکان نامێنی لە ڕێی چاو پێداگێڕانەوە بە بیروڕادا وەیا هەڵسەنگاندنی ڕاستییەکانی مێژوویی و کۆمەڵایەتی بە جۆرێکی بێتەرەفانە وەیا بە حەکەم دانانی ئاکامی ڕووداو و گۆڕان و بەرەو پێشچوون هیچ شێوە تەعدیلێک بخەنە هەڵوەستیان وەیا یەک دێڕ لە دەفتەری قەناعەتیان ڕاست بکەنەوە. ئەم ڕەگ داکوتانە سەرلەنوێ ڕەگ داکوتاوتر دەبێ لای ئەو نووسەرەی شەهادەی بەرزی لەو دینە تازەیە وەرگرتوە و نووسینی تێدا کردوە و بازاڕێکی نمایيشتی پێ سازداوە. بێ زیاد و کەم ئەم تەرزە ڕۆشنبیرە نوسخەیێکی تازەی «إبن بطوطة» دەردەچێت کە وا هەرگیز لە «عمرها الله و دمرها الله» ڕاناگوێزێت چونکە ڕاگوێستنەکەی دەبێتە دەست بەتاڵبوون.

خوێنەر با سەیری بەم قسانەم نەیێت وا نەزانێ چ مەبەستێکی شەخسی ئەم قسانەم پێ بکات، چونکە من خەریکم لە داستانی حاجی قادر سەرگوزەشتی دێوە سپیەکەی «دەرەبەگ» بگێڕمەوە وەیاخود لە دەفتەری بەهەشتی ئادەم و حەوا باسی شەیتان و دەورە ناپەسەندەکەی بخوێنمەوە لە دۆڕاندنی بەهەشتیان. بەڵێ

بەڕاستی ناوی «دەرەبەگ« بەقەدەر ناوی دێو و شەیتان ڕەجم دەکرێت و هێندەی ئەوانیش، دەرەبەگ، بە مەسئوولی بەدحاڵیی «ئادەم و حەوا» ی کورد دانراوە لەلایەن بەشێکی بەرچاوی نووسەرانی کوردەوە. لەبەر ئەمە ئەگەر ڕۆشناییەک نەخرێتە سەر دەوروبەری هەموو ئەو لایەنانەی کە پێوەندییان بە دەرەبەگەوە هەیە ڕێم نابێ ڕاستیی بێفێڵ و نەترساو لە باسی «حاجی قادر و دەرەبەگ» بخەمە بەر چاوی خوێنەری کوردەوە چونکە لەوانەیە دووچاری وەزعێکی وەها ببین کە حاجی قادر لەعنەتی لە دەرەبەگ نەکردبێ وەیاخود لەو وەزعەدا دەرەبەگ ئەو مەلعونە نەبێ کە ڕەجم کردن هەڵ بگرێ.

من کە بمەوێ هەڵکەوتی ڕاستەقینە لە بارەی دەرەبەگەوە بنووسم، لە پێشەوەش بزانم هەڵکەوتەکە لە ژیانی کوردەوارییدا ئەوە نیە کە بەشێکی نووسەر و خوێنەری کورد مرخی خۆیان لێ خۆش کردوە... من کە بزانم «ئادەم و حەوا» ی کورد بە تاکە شەیتانی «دەرەبەگ» لە بەهەشتی کامەرانی دەرنەکراون، تەنانەت ئەگەر شەیتانی دەرەبەگ لە ناویشدا نەبوویایە ئادەم و حەوای کورد لەو بەهەشتە هەر دەردەکران... من کە ئەمانە و چەندین ڕاستی تری مێژوویی بزانم لە بارەی دەرەبەگەوە کە هیچیان ئەوە نین بە ڕاشکاوی تێکەڵم بەو سیمفۆنیە یەک ئاهەنگە بکەن لە بەردباران کردنی «سەلکەکافری دەرەبەگایەتی» ی کورد... لەم ڕووەوە بە پێویست دەزانم هەموو ئەو هۆیانە ڕوون بکرێنەوە کە وا تا ئەم ڕادەیە، بێلزوم، دەرەبەگی هێناوەتە ناو هەموو حیسابێکی مێژوو و چارەنووسی کوردەوە چونکە ئەگەر ئەم ڕاستییانە دەرنەخرێن نە واقیع بە تێکڕایی ڕوون دەبێتەوە نە هەڵوەستی حاجی قادریش بەرانبەر دەرەبەگ دەچێتە ناو چارچێوەی مێژوویی و کۆمەڵایەتیی ڕاستەقینەوە. نووسینەکەی منیش لە خۆڕایی بە چاکەخوازی دەرەبەگ لە قەڵەم دەدرێت لە حاڵێکدا هیچ کەس شک نابەم لەوانەی دەیانناسم بەقەدەر من دژی دەسەڵاتی ناڕەوا بێت، چ هی دەرەبەگ چ هی غەیری دەرەبەگ بێت.

من شۆڕشگێرم دیتوە لە ماڵی یەکێک لەوانەی پێیان دەڵێن دەرەبەگ، چەند مانگێک بەسەری بردوە بەدیار ئەو کاتەی کە دەرەبەگەکە بۆ نەخۆشخانەی دەرەوەی عێراقی بەڕێ دەکات بە ئەرک و مەسرەفەوە. دەرەبەگەکە ناسیاوی خۆم بوو، شۆڕشگێڕەکەش بە نیسبەت ئەوەوە بێگانەیێک بوو، لە وتوویژدا بەمیانم گوت ئەوەی تۆ بە خۆتی ڕەوا دەبینیت لەم پشت بەستنەت بە لطفی «دەرەبەگ» من لە

خەونیشمدا بە خۆمم ڕەوا نەدیتوە هەرچەند شەخسەکەش ناسیاومە، ڕەنگە چاکەییکیشم بۆی بوو‌بیت... کە ئەمەم پێگوت لە ڕووی ڕق لێبوونەوە و شکاندنەوەوەم پێنەگوت، بەڵکوو لە وتوویژێکدا بوو داخوازیی گوتنی ڕاستیی وەهای دەکرد.

لە سەردەمی پێش شۆڕشی چواردەی تەموزدا چەندین شۆڕشگێڕی سەر بە قەومایەتی و چینایەتی لە ماڵی دەرەبەگەکان خۆیان حەشار دەدا و لە سێبەریاندا دەحەوانەوە، وا دەزانم هەر لەو بارەشدا ئەگەر لە بڵاوکراوەی نهێنیدا شتێکیان نووسیبایە بەسەر و پۆتەراکی دەرەبەگدا دەهاتنە خوارەوە. هەڵبەت من لێرەدا تەبریری ئەوە ناکەم دەرەبەگ بتوانێ شۆڕشگێڕ بپارێزیت چونکە دەزانم دەتوانێ جەردە و خایەنیش بپارێزێت، من دەمەوێ بڵێم واقیعی کورد ئەوە نەبوە، وەک لە نووسیناندا دەیخوێنینەوە، خەتێکی ئاشکرا کێشرابێت لە نێوان بەرەی چڵکن و خوێنمژ و دەرەبەگ و نێوان بەرەی خاوێن و خوێنمژراوی فەلاح و شۆڕشگێڕ و ڕۆشنبیران. ئەم خەتە نەکێشرابوو تاکوو ساڵانی دوایی، هەرچەند لە نووسینی نوێشدا هەزار خەت کێشرابێت هەر لە سەرەتای دەوری ئادەم و حەواوە، دیارە لە ڕۆژگاری حاجی قادر و پێشوتردا هەڵوەستی کۆمەڵەی کورد لە ئاست دیاردەی «دەرەبەگ» شتێکی تا بڵێی جوداواز بوە لەوەی هەڵپە و کڵپەی گیانی شۆڕشگێڕانەی ئەم ڕۆژگارە دەیداتە بەر گڕ و هێرشی لەناوبردنەوە.

بێگومان هەموو ئەو دیاردە و ماکە کۆمەڵایەتیە کۆنینەی کە بەپێی لێکدانەوەی نوێ بە لەمپەڕی پێشکەوتن حیساب کراون دەردێنە بەر گڕ و هێرشی لەناوبردنەوە نەک هەر «دەرەبەگایەتی» کە دەزانین لە زۆر شوێنی ئەم جیهانەدا ڕەگ و ڕیشاڵی دەرکێشراوە[108] عیراقیش یەکێکە لەو شوێنانە.

ئەوەی ڕاستیش بێ، وا پێ دەچێ، نووسەرە کوردەکانی نوێخواز کە دەبینن دەستوور و یاسا و کۆمەڵایەتی و بیروباوەڕی گشتیی میللەت و گەلێک هێزی کاریگەری

---

[108] چارەسەر کردنی مڵکایەتیی زەویی لە کوردستانی عێراقدا تایبەتیترە لە هی تێکڕای عیراق کە ئیتر هەر بەجارێ تارمایی دەربەگایەتیشی لە ناودا نەهێشت، بگرە فەلاحیشی لە پلەی خواری «خوردەمالیک» دا دانا.

دیکە ڕێیان نادەن بە دڵی خۆیان ڕەخنە لە هەموو ئەو شتانە بگرن کە بەپێی فەلسەفەکەیان بەد و ناپەسەند و کۆنەپەرستانەن، با دەدەنەوە سەر دەرەبەگایەتی و لە قەبری دەردەهێننەوە و دەیکەن بە ئامانجی تیری غەزەب و ڕقی لە دڵدا پەنگخوارد و بەڵکوو هەر نەبێ لەو ڕێگەیەوە نەختێک گەرمایی دڵی دامرکێنێتەوە. هەر لە پەنا تیرەباران کردنی کەلەشە کوناش کوناش بوەکەی دەرەبەگایەتیشەوە، بە قاچاغ، چەند پلارێک دەگرنە ئەو نیشانانەش کە لێیان مەنعە، ئەمەش فێڵێکە لە هەموو کات و جێگایەکدا کراوە زۆریش ژیرانە و بێدەسەڵاتانەیە.

ئەم ڕاستییانە لە پێشەوە دەریدەخەن بۆچی ئەم جوداوازییە گەورەیە هەیە لە نێوان هەڵوەستی حاجی قادر لە ئاست دەرەبەگدا لەگەڵ هەڵوەستی نووسەرانی نوێخوازی کوردی ئەم سەردەمە، هەروەها شەفاعەتێکیش بۆ ئەم نووسینە دەکەن لەوەدا کە دێت و خۆی بە ڕاستیی بێ پێچ و پەناوە دەبەستێتەوە هێندە لە نووسینی نووسەرێکی «مقلد» ی دڵسۆز دوور دەکەوێتەوە.

با ئەوەش بڵێم چ ترسێک نیە لەوەدا کە ڕاستیی باری «دەرەبەگایەتی»ی کورد و هەڵوەستی حاجی قادر لە ئاستیدا دەربخرێت چونکە ڕاستییەکە هەرچی هەبێ ناتوانێ نوقتەیێکی واقیعی ئێستاکەمان بگۆڕێت وەیا بایی پوشکەیێک لەبەر هەنگاوی ڕەوتی ئەمڕۆکەمان ڕاوەستێت، بە پێچەوانە دەربڕینی ڕاستیی لەم باسەدا، وەک هەموو باسێکی تر، نیگای بینەران بەسەر دیمەنێکی مەفهومدا دەخولێنێتەوە کە لەوێدا جنۆکە و دێوی مەوهومی ناو تاریکایی جێی نابێتەوە، دەرفەتی ئەو هەڵەیەش نادا کە بە زیادەوە ڕق هەڵ گرتن و خۆشویستن و دژکاری و لایەنگیریی بێلزوم بەکار بێت.

خوێنەر و ڕۆشنبیرێک کە ڕاستیی واقیعی دوێنێی زانی نایەت وەک ئەو کوردە مسڵمانە سافیلکەیەی بێ لێکدانەوە بەرد بە «سەلکی کافر» ی باپیرە گەورەی خۆیدا دەدات لێشی مەعلووم نیە سەلکی فەلاحە وەیا کاسبە وەیا منداڵە وەیا هی بەرخ و گیسکە. بەڵێ ڕۆشنبیرەکە پلاری کوێریی ناگرێتە ڕابردووی تێپەڕیووی مردووی پێچرایەوە بەو نیازەی کەوا بەر هەر کوێیەکی ئەو ڕابردوە بکەوێت بەر دوشمن کەوتوە وەیا هەرنەبێ شتێکی وەهای پێکاوە زەرەر لە پێکانیدا نیە، ڕابردوویێک کە دەسکردی مێژوو بێت و بە هەموو لێکدانەوەیێک و فەلسەفێک و بیرەباوەڕێک دەبوو ئەوەبێ کە بوە، تەنانەت ڕاستە حیسابی فەلسەفەی ماددیش

پلەی گۆڕانی کۆمەڵایەتی دادەنێ بەو حەتمییە کە نەبوون و ڕوونەدانی نامومکین هەروەک بەدوا یەکتردا هاتنی ساوایی و منداڵی و گەنجایەتی و کامڵی و پیریی حەتمییە و نەبوونی نامومکینە. کە حاڵ وەها بێت چۆن ڕەوایە ڕۆشنبیری نیگافرەوان ڕق هەڵگرێ لە حەتمییەتی مێژوو، کە ڕقیشی هەڵگرت لە کوێوە بەدیلێک دینێت بۆ ئەو پلە مێژووییەی حەتمی تاکوو مرۆڤی ژیر و ئینساف ڕقهەڵ گرتنەکە تەبریر بکات و بڵێ ئەگەر ئەم ناپەسندە نەبوویایە فلانە پەسند جێی دەگرتەوە.

ئێمە ئەگەر بە ئانقەست خۆمان بە سەهوو نەبەین زۆر چاک دەزانین بوونی خاوەن زەوی و سەرەک عەشیرەت و کوێخا و خوردەمالیک لە ڕۆژگاری کۆندا بوونێکی ناچاری و بەملەوە بوو، کە ئەگەر یەکێک لەوان تێچوبایە حەتمییەت یەکێکی تری لە جێگەی ئەودا دادەنا، خەڵقی ئەو سەردەمانەش بەو واقیعە ڕازی بوون بە مەرجێک ستەمی بە مەفهومی ئەوسای لەگەڵدا نەبووبێت. هەرچەند ئاشکرایە دەسەڵاتی ستەم کردن لە سەرەک عەشیرەت و خاوەن زەویی گەورە پتر دەوەشێتەوە تا کوێخا و خوردەمالیک و فەلاح بەڵام لە واقیعدا هەر کەسە و هەر تاقمە بەپێی دەوروبەری خۆی ستەمی کردوە هەمووشیان ئەو ستەمەیان لێ بەعەیب گیراوە، بەڵام لە ئیمکاندا نەبوە چارەسەری ئەو حاڵ و بارە بکرێت کە ڕێی داوە بە ستەم کردنەکە، ئیمکان نەبوونەکەش بە هیچ مەزهەبان ئەوە ڕاناگەیەنێ کە زوڵم کردن پەسند بوە وەیاخود یاسا و نەریتی کۆمەڵایەتی لێی ڕازی بوە چونکە هەرگیز ئیمکان نەبوون نابێتە پێڕازیبوون هەر وەک مەنعی مردن مومکین نیە و کەسیش نەیگوتوە خەڵق پێی ڕازییە بە واتای پێخۆشبوون و پەسند کردن.

ئەو نووسەرە کوردانەی چاو لەم ڕاستییانە دەپۆشن، ڕاستیی تریش ماون جارێ نۆرەی باس کردنیان نەهاتوە، ئەوانیش چاویان لێ پۆشراوە وەیا زیهنی نووسەران بۆیان نەچوە، خۆیان داوەتە بەر لوزەو (تیار)ی فکری پەرەسەندوو، کە دەزانین لێ بەدەنگ هاتن و ڕەخنە لێ گرتنی بۆیان دەبێتە هۆی سەرێشە و ناڕاحەتی، واش تێدەگەن لێ بەدەنگ هاتنەکەیان چ سوودی بۆ کەس نیە و لە مەعنادا دەشبێتە خۆدانەپاڵ دەرەبەگایەتی و هێزە ناپەسندەکانی بەرەوپاش. کە ئەمە دەڵێم قسەی خەیاڵکرد ناگێڕمەوە بەڵکوو شتێک دەردەبڕم کە وا بارەها و جارەها لە ڕۆشنبیری پێشکەوتنخوازی خاوەن نووسینم بیستوە لەوانەی دۆستی نێزیک و خۆشەویستیان بوە لە نێوان ئەو چینەی پێیان دەڵێن دەرەبەگ. بەر لەوەی لەم ڕاستییە بە دەنگ

بێم جارێ با ئەوە بڵێم دەرەبەگ لە کۆن و نوێدا هەرچی دەبێ بووبێ، لەو ڕۆژگارەی بە چاوی خۆمان دیتومانە پیاوی دەرەبەگ کە خۆی کردە دۆستی لایەنێکی خەباتکەری پێشڕەو دەرحاڵ دەفتەری ڕەشی بۆ سپی دەبێتەوە و بەتاقمی «ملاک احرار« لەقەڵەم دەدرێت. ئەوەی بە چاوی خۆم دیتومە لە کوردستانەکەی خۆماندا ئەوە بوە هەر لایەنێکی شۆڕشگێڕ دۆستی دەرەبەگ و ئەفسانەپەرست و ڕەجعی هەبوو‌بێت لە کانیاوی زەمزەمی پاکبوونەوەی هەڵکێشاوە و لەقەبێکی گوناحپۆشی بۆ داناوە، بەڵام دەرەبەگ و ئەفسانەپەرست و ڕەجعیی سەر بە لایەنێکی تری شۆڕشگێڕی لە جاران پتر گوناهبار و ناوبەد کردوە. مەتەڵی کوردی کە دەڵی «بانێکە و دوو هەوا» لە گوریسکێشەکێی نێوان هیزە سیاسیە شۆڕشگێڕەکانی کورد بە تەواوی و بەردەوام لە مەیدانی ڕیسوا کردنی ناحەز و ئابڕوو پاراستنی دۆستخوایان لە باودا بوە.

بەڕاستی نەدیترا و نەبیسترا ئەو هێزە شۆڕشگێرانە لە نێوان چینی هەژار و، بە اصطلاح، ڕەشوڕووتی کورددا نامزەدی پایەی بەرزی وەزیفە و موچە و بەرات پێش بخەن، ئەوەندەی دیبێتم و زانیبێتم پارووی چەور هەر بۆ ئەوانە بوە لە جەرگەی دەرەبەگایەتی و ئەفسانە و پارەدارییەوە سواری شەپۆلی «جەماهیر» بوون و بە دەستەوانەی ئاوریشمین ئاڵای پێشڕۆیی و گەلدۆستی و شۆرسگێڕییان هەڵکردوە. کام نەعرەتەی بەهێزیشە ئەوەیان بە لەعنەت کردن لە دەرەبەگ و خوێنمژی و ڕەجعیەت بەرز کردۆتەوە.

ئەو ڕۆشنبیرە کوردانەی دەست درێژ دەکەن، بێلزوم، دەرەبەگایەتیی هەزار ساڵ پێش ئەمڕۆکە بخنکێنن بۆ دڵدانەوەی فەلاحی هەژاری بێچارەی شارەزور و بیتوێن، زۆر ژیرانە و مامۆستایانە دێن لەسەر کاغەز هەموو ڕابردوو و مێژوو دەکەن بە مەخلوقی گەل و بەوی دەدەن، دوارۆژیش دەدەنەوە بەو گەلە، واتە دوو سێیەکی ڕۆژگار لە گەل مارە دەکەن، دەمێنێتەوە ئەو سێیەکەی پێی دەڵین «ئێستا» لەوێدا خۆیان دەکەنە وەکیلی گەل ئیتر بە ناوی ئەوەوە و لەجیاتی ئەو سواری حازرەکە دەبن، دیارە پێ بەپێی تێپەڕینی کات دوارۆژەکەش کە لەسەر کاغەز مارەبڕی گەل کرابوو دەبێتەوە حازر و دەچێتەوە بەر حیسابی وەکالەتەکە، بەتەواویی وەک مەسەلەی کابرای دوکاندار کە بە خەتی گەورە لە سەرووی دوکانەکەی نووسیبوی «ئەمڕۆ بە حازر، سبەی بە قەرز» ئیتر هەتا ڕۆژ بەدوا یەکتردا دەهاتن قەرزەکە

هەر دەکەوتەوە سبەینێ... لەم قسانەمدا دەمەوێ عەیبی خۆمان بهێنمە بەرچاو هەر چەند عەیبەکەش زۆر ڕووشکێن بێت و باس کردنیشی کارێک بێت هەموو نووسەران خۆی لێ لابدەن، لەم عەیب خستنە بەرچاوەیشدا چەند بنگەیێکی «ماف و واجیب» شەفاعەت بۆ نووسینەکەم دەکەن:

1) لە من بەپێشەوە نووسەری گەورەی ئەم جیهانە ڕێگەیان خۆش کردوە بۆ نووسینی هەرە بە جورئەت بەوەدا کە هاتوون بێپەروا لە شتی وەها دواون بەردی بناغەی بیروباوەڕ و کۆمەڵایەتیی لە خۆیان بە پێشەوە هەڵتەکێنێت و ڕووبەڕووی نازکترین و پیرۆزترین و موقەدەسترین هۆی شانازی و ڕێز گرتن و فەخری سەرلەبەری خەڵق ببێت وەک ئەو نووسینانەی کە لە داروین و مارکس و فرۆید بەجێمان. پێم بڵێ ئەم سێ بلیمەتە، کەوا دەزانین کەسانی تریش زۆرن وەک ئەمانە ناوەڕۆک و هەناوی هەموو بیروڕا و ئایین و کۆمەڵایەتی و مێژوویان خستۆتە سەر مێزی ئەزمون و تاقی کردنەوەی یەکجار صەریح و بێ ترسەوە، پێم بڵی چی ماوە نەیڵێن و نەیکەن و نەینرخێنن و نەیرەخنێنن.

ڕۆشنبیرێکی کورد کە بەتەما بێ لە نووسینەکەم توڕە بێ با لە پێشەوە ئەوە بە بیری خۆیدا بێنێتەوە کە ئەو نووسینی ئەوەندە بە جورئەتی پەسەند کردوە کە لەتەک ئەواندا قسەکانی من وەک یاری تۆپێنەیە لە تەک شەڕەتۆپدا. دەمێنێتەوە بڵێ نووسینە بە جورئەتەکانی ترم بەلاوە ڕاست و پەسەندن بۆیەیە بڵاوبوونەوەیان بە باش دەزانم.

لە ئاست ئەم تێبینیەیدا هەر ئەوەندە دەڵێم نابێ ڕۆشنبیر زەوقی خۆی بکات بە کێشانە و پێوانەی ڕاست و دروست بوونی شتان چونکە ئەوسا ڕۆشنبیرێکی تریش هەمان ئیمتییاز بۆ خۆی داوا دەکات و لەوانەیە بیروڕای ئەوی تری بە دڵ نەبێت و بڵاوبوونەوەی بە کارێکی ناپەسەند دابنێت... ڕۆشنبیرێکی سێیەم و چوارەم و... پەنجاوشەشەمیش هی هیچ کامێکیانی پێ ڕاست نەبێت و هەموویان مەنع کات، ئەگەر دەسەڵاتی مەنع کردنی هەبوو.

2) باسی دەرەبەگ لەبەر تیشکی هەڵوەست و هەڵبەستەکانی حاجی قادردا لەچاو بەرینایی باسە زۆر بەجورئەتەکاندا هێندەی جۆگەلەیێکی بەر تەسک

نابێت لە تەک زێیەکی وەک «جەیحوون»ـدا. ئەو نووسینانە لە خوا و ئایین و نرخە زلەکانی غەیبەوە پێدا هاتوونەتە خوار تا دەگاتە نرخی توور و چەوەندەر، ڕەنگە لەو بەینەشدا زرەهەڵەی وەهایان کردبێ گەورەتر بێ لەوەی ئەوان بە هەڵەیان زانیوە.

کەواتە دەربڕینی ئەو ڕاییەی کە من بەڕاستی دەزانم لە بارەی دەرەبەگ، لەبەر ڕۆشنایی هەڵوەست و هەڵبەستی حاجی قادردا، هەر پێی ناگوترێ کارێکی بەجورئەت. ئەگەر لە خۆمانەوە خۆمان نەتۆقێنین لە دەربڕینی بیروباوەڕی بێ پێچ و پەنا، هەرگیز زەرەر پەیدا نابێ لە موناقەشەی فکر و ڕووداو هەڵکەوت، بە پێچەوانە، خەفە کردنی هەناسەی ڕەخنە لە هەناوی ڕەخنەگراندا دەبێتە ئیفلاسی فکر، کە فکریش ئیفلاسی کرد ماددەش بەدوا ئەودا کز دەبێتەوە، جگە لە کزبوونەوە تامیشی نامێنێ.
توخوا ژیان چ تامی دەمێنێ کە نەوێریت تێیدا دەنگی دەروونی خۆت بەرز کەیتەوە!! خەفەبوونی دەنگی ڕەخنە لە نێوان کورداندا کفنە میراتیەکەی بێچالاکیی هەزاران ساڵەمان تێ وەردەپێچێتەوە لەوەشدا هەر خۆمان تاوانبار دەبین، هەر خۆمان چەنگاڵی خەفە کردن لە بینەقاقەی بیر و فکر توند دەکەین...

3) خۆبواردنم لە واقیع و ڕاستیی مەسەلەی دەرەبەگایەتیی کورد دەبێتە چاو نووقاندنێکی کۆڵدەرانە لە لایەنێکی یەکجار گرنگ و بنجیی لە هەڵوەست و خەبات و بیروباوەڕی حاجی قادر کە گۆیا ئەم نووسینە خەریکە پەردەیان لەسەر هەڵدەداتەوە هەم بە نیازی دەرخستنی حەقیقەتی «کەسایەتی»ی حاجی و هەم بە نیازی سوود وەرگرتن لە تێکڕای ئەو ڕاستییانەی بە دەوری باسی حاجی قادرەوە ڕوون دەکرێنەوە. نووسین کە خۆی عەیبدار کرد بە چاو نووقاندنی خاترانەکار دەشگاتە پلەی درۆ کردنی خاترانەکار، کە ئیتر نەبوونی، کوردی گوتەنی، هەزار کاوڕەمێ دێنێ...

4) کوتانەوەی باسی دەرەبەگایەتی لەلایەن بەشێکی نووسەران و ڕۆشنبیرانی کوردەوە بەو شێوە یەکجار سەرشێوێن و دوور لە واقیع و نارەوایە، قاڵب بەستن و شەختە کردنی فکری کوردی لێ پەیدا دەبێت کە ئیتر دەماری پێوەندیی

به ڕاستییەوە هەڵدەبڕێتەوە و دەبێتە جۆرە حەپەساندنێکی میتافیزیکی لە پەرستگەی بیری وەستاودا، کە بە زاراوەی نێوان نووسەران پێی دەڵێن «الفکرة الثابتة».

بەڕاستی وزەبەردانی نووسەران لە ئاست برەوبەستنی بیروباوەڕی هەڵەدا نموونەی دەروێشایەتیی «علمانی» دادێنێتەوە لە صەدەی بیستەم و بیستویەکەمدا. سەیری هەرە سەیریش لەوەدایە ڕۆشنبیران بە قسە و لە کاتی وتووێژی عادەتیدا دان بە هەموو ئەو ڕاستییانەدا دێنن کە بە نووسین ئینکاریان دەکەن، سەیرتریش لەو سەیرەدا ئەوەیە ڕۆشنبیران لە ترسی خۆیان، نەک لە ترسی دەسەڵاتێکی دەرەوەی جغزی ڕۆشنبیرایەتی، ڕاستییان لە خۆیان حەرام دەکەن واتە ئەگەر بڕیار بدەن لەسەر ئەوەی کە بە نووسین ئەو ڕاستییانە بڵاوبکەنەوە کە بە زار دەیڵێن چ ناقەومێ و هیچ زەرەریان پێ ناگات، تەنانەت دەسەڵاتی سیاسیش کە دێت و هەندێ ڕاستییان حەرام دەکات هەر لەبەر خاتری ڕۆشنبیرانە یاخود لە ڕێی ڕۆشنبیرییەوە حەرام کردن بەسەر ڕاستییەکاندا دێت چونکە ڕۆشنبیران خۆیان دەبنە خاوەن دەسەڵاتی سیاسی. ئیتر گوتن و نووسینی ئەو ڕاستییانە حەرام دەکەن کە پێشتر لە خۆیانیان حەرام کردبوون، وەک ئەوەی کە گوتم شۆڕشگێڕم دیتوە پەنای بردۆتە بەر «دەرەبەگ» بەڵام لە نووسیندا هەر جنێوی پێ داوە، ڕۆژەک لە ڕۆژانیش نەیوێرا دان بەو چاکەیەی دەرەبەگەکەدا بێنێت لە ڕێی نووسینەوە نەکا لەسەری حیساب بکرێت و لە قورسایی شۆڕشگێڕایەتی دابشکێنێت.

دیسانەوە دەڵێم من دژی ئەوەم دەرەبەگ یا یەکێکی تر دەسەڵاتی ئەوەی هەبێ زێدە لە عالەم بتوانێ پیاوەتی و کوڕێتی بکات، ئەگەر دەسەڵاتێکی غەیبیشم هەبا لە سەرەتای مرۆڤایەتییەوە نە دەرەبەگ و نە سەرمایەدار و نە هیچ دەسەڵاتێکی تری چاوسوورکەرەوەم نەدەهێشت هەناسە هەڵبێنێ کە ئەوسا خەریتەی مرۆڤایەتی شتێکی وەها دەبوو ئێستا ناتوانین بە خەیاڵی خۆمانیدا تێبپەڕێنین[109]. ئەمە دەڵێمەوە

---

[109] عومەر خەییام ئەم خەیاڵەی خستۆتە نێوان ڕوباعییێکیەوە:

گر بر فلکم دست بودی چون یزدان
برداشتمی من این فلکرا زو میان

تاکوو بیرخستنەوەی قەرزداربارییی هەندێک لە شۆرشگێڕەکانمان لە ئاست دەرەبەگ و، بە اصطلاح، براگەوراندا بە تەبریری دەرەبەگایەتی و براگەورایەتی دانەندرێ.

زۆر بەداخەوە دەڵێم ئەم پیشەیەی هەڵدانەوە و پێداهەڵگوتنی فکرەی باو و پەرەسەندوو لە کۆنەوە فەرمانڕەوا بوە و بە زۆری پەکی بیروباوەڕی تری خستوە کە وا بیر کردنەوە بە زۆری دەوری غەیبی داوە هەرچی فکرێکی ماددی وەیا سەر بە ماددییەتی صەریح هەیە تەنگی پیهەڵچنراوە و تاوانبار کراوە.

لە کتێبی «الحیوان» ی نووسەری گەورەی موعتەزیلی «الجاحظ» لە زەمینەی بەدرۆ خستنەوەی «زندق» دا هەر لە مەیدانی گۆڕانی بایۆلۆجیدا بیروڕای وەها دەخوێنیتەوە کە زندیقەکانی ئەو سەردەمانە موناقەشەی باوەڕی ڕەسمییان پێ کردوە بە تەواویی دەڵێی مامۆستای «داروین» وتووێژ لەگەڵ قوتابی زانکۆیەک دەکات.

کە بگەڕێیتە بۆ هونەری پێش قۆناغی بووژانەوەی زانستی ئەورووپا دەبینی هەرچی هونەرێکی بایەخدار هەیە خەریکی جێبەجێ کردنی فرمانەکانی کەنشتەیە. ئەم دیمەنەی تێکەڵبوونی زانا و ئەدیب و هونەرکاران لەگەڵ هارمۆنیی تێکڕای سیمفۆنیی بیروباوەڕ و کۆمەڵایەتی، هەر خۆیەتی سێبەری بەسەر ڕۆشنبیریی کوردیدا هێناوە کە وا لە کۆن و لە نوێدا تاک تاکەیێک نووسەر و هونەرکار نەبێ جورئەتی نەکردوە خۆی لەو سێبەرە بدزێتەوە و نەختێک لە ئاهەنگی سیمفۆنیەکە بگۆڕێت.

من لە پێڕەویی کردنی زانا و ئەدیبی کۆن لە بیرباوەری گشتی، چ ڕەخنەیێکم نیە چونکە وا دەزانم هەر ئەو تاکە ڕێگەیەیان لەبەر هەنگاودا هەبوو، بەڵام ڕۆشنبیری سەردەمی ئاتۆم چ عوزری نیە لەوەدا کە دەرگایان لە ڕووی خۆی داخات و خۆی بکاتە پاسەوانی «یاساغ کردن و تەنگ پێهەڵچنین». جاران، بەر لە بڵاوبوونەوەی خوێندەواری و ڕۆشنبیری و گیانی زانستی و دۆزینەوە و داهێنان، کە یەکێک بە

---

وانگاه فلکی زو نو چنان ساختمی
که ازده بەکام دل رسیدی آسان

پێچەوانەی بڕیاری کۆمەڵایەتی جووڵابایەوە لەوانە بوو بێتە قوربانی بیروڕای ئازادی خۆی، بەڵام لەم سەردەمەدا ڕەوا نیە بە هیچ کێشانە و پێوانەیێک، ڕۆشنبیران ببنەوە ئەو کۆمەڵە دواکەوتوەی کەوا پێش 500 ساڵ باوەڕ و لێکدانەوەیان یاساغ دەکرد وەیا دەرگەی موناقەشە و ڕەخنە گرتنیان لە ڕووی جیهان دادەخست. مرۆڤایەتی و نرخی ڕۆشنبیر لە بیرە ئازادەکەیدا دەبێ کە نەترسێ لە دەربڕینی بیروباوەڕی خۆیان. کە ئەم حاڵە لە بەیندا نەما و ڕۆشنبیر خۆی کردە جەللادی بیروباوەڕ حەقێکی نامێنێ ناوی کەسی دوێنێ و پێرێ بە خراپی و نیگاتەسکیی بێنێ.

بەهەمەحاڵ، چەندێکی ڕۆشنبیری ئەم سەردەمە بێ ئینسافی لەگەڵ باری ڕۆشنبیری ئێستاکەدا بکات و چاو لەو بیروڕایانە سوورکاتەوە کە لێیان نارِازییە، چ حەقێکی نیە لەوەدا ڕۆژگاری کۆن بداتەوە بەر هەمان کێشانە و پێوانەی کە هاوچەرخەکانی خۆی پێ دەنرخێنێ، وەیا دەتۆقینێ. نابێ دوێنێ بەم ڕۆژە بگرێت و بڕیاری ئەمرۆکەی بەسەردا بدات چونکە کە ئەمەی کرد دەبێ بەپێی داخوازیی مەتنیق ئەمرۆکەش بە دوارۆژ بگرێت و لە خەیاڵەوە کێشانە و پێوانەی ئەو دوارۆژە بۆ ئەم ڕۆژە بخوازێتەوە و پێی هەڵکێشیت و عەیبداری بکات چونکە دیارە ئەمرۆ لە هیچ ڕووییێکەوە بە 100 ساڵ دواتر نابێ. لە ڕووی پێشکەوتنەوە ئەمرۆ پتر خزمی دوێنێیە تا سبەیرۆژ چونکە بەرەو پێشچوون بە پێوانەیێکی ئەندازەیی ڕوو دەدات. ئەگەر دوێنێ پلەی پێشکەوتن 20 بووبێت و ئەمرۆ 30 بێت، سبەی ڕۆژ 60 دەبێت وەیا زیاتریش.

بەڕاستی ئەم ناواقیعیەتەی سەیر کردنی دوێنێ بە دووربینی ئەمرۆ هەموو حیسابان سەرەوبن دەکات و سەرشێوانێک پێک دێنێت هیچ سنووری نەبێت چونکە دەرگەی ناواقیعیەت دەکاتەوە لە ڕووی هەموو کەس و بۆ هەموو شتێک. تۆ کە هاتی حاجی قادرت بەرپرس کرد لەو دۆستایەتیەی کە هەیبوە لەگەڵ براگەورەکانی ئەوسای کۆیێ، منیش تۆ دەشکێنمەوە بەوەدا کە پاداشی «نۆبل» ت وەرنەگرتوە، گلەییش لە پێنجوێن دەکەم لە نەبوونی یانەی فرۆکەوانان تێدا، لەوەش دەپرسمەوە بۆچی خەتی شەمەندەفەر نەگەییشتۆتە حاجی ئۆمەران، یاخود کوڕەکەت چارەی دەردی شێرپەنجەی نەدۆزیوەتەوە… کوا کۆشکی چلوپێنج نهۆمی لە چوارتا…؟ بۆچی کۆلێجی «طب» لە ناوچەی بامەڕنی نیە؟

نووسەرانی کورد کە دێن و باسی حاجی قادر دەکەن یا پاتەوپات بە خزمەتکاری دەرەبەگی دادەنێن یا ئەگەر خۆشیان بوێت بە زۆری ئینکاری پێوەندیی دۆستایەتی دەکەن لەگەڵ دەرەبەگدا هەردوو هەڵوەستیش زادەی بێ دەمەتەقەی ناواقیعیەتەکەی کێشانی دوێنێ و پێرێیە بە پارسەنگی ئەمڕۆکە.

ئینکار کردنی پێوەندیی دۆستایەتی و ڕێز گرتنی دوولایەنە لە نێوان حاجی قادر و براگەورەکانی ئەو سەردەمەی کورد، بەتایبەتی کۆیێ، خۆ بەسەهوو بردنێکە کەڵکی تۆژینەوە و لێکۆڵینەوە لە باسی حاجی قادر بە بەر کەسەوە ناهێڵێ چونکە چەندێک خەریکی دەرخستنی ڕاستیی مێژوویی بین لە ڕابردووماندا ناتوانین شتی هێندە ئاشکرا و ڕوون و بەڵگەنەویست بدۆزینەوە کە بە شیعر و گوتە و کردەی بێگومان ئیسپات کرابێ و پێویستی بە هەوڵدانی من و تۆ نەمابێ. تا ئەم دۆستایەتییە و ڕێزی دوولانەیە دەسڕێتەوە دەبێ ڕابردوەکە و مێژوەکە و بەسەرهاتەکە و شیعرەکە هەموو واقیعەکە بسرێتەوە وەک ئەوەی کە مێژووناسی بێئینساف بۆ نیازێکی تایبەتی پێوەندیی نێوان لینین و ترۆتسکی بسرێتەوە وەیا، لە بارێکی پێچەوانەدا، قەتلوعامی بەرمەکییان نەگێرێتەوە بۆ هارونەرەشید.

مرۆڤ کە هێندە بێپەروا بوو لە ئاست ڕاستی و ڕووداودا هیچ ڕاستییێک خۆی لەبەر زەبرە وێرانکەرەکە و نەسەلمێنەکە و ئینکارکەرەکەی ناگرێ، تەنانەت لە سنووری قسەکەی مەلای مەشووریش ناوەستێ کە گوتی ژمارەی ئەستێرەی ئاسمان بەقەدەر ژمارەی مووی کلکی کەرەکەمە، هەرچی باوەڕیش ناکا با بچێ بۆ خۆی بیان ژمێرێ، چونکە کابرای نەسەلمێن لە باسی حاجی قادردا بە ژماردن ڕازی نابێ لەو ڕووەوە کە ئەگەر پێی ڕازی بوویایە لە سەرەتاوە ڕێی نەسەلماندنی نەدەگرتە بەر. خۆ ئەوەی ڕاستی بێ مەسەلەی دۆستایەتی حاجی و براگەورەکانی سەردەمی خۆی بە ژماردن و پێوان و بە کێشان و بە هەموو میقیاسێک بۆتە بەدیهیە کە ئیتر ئینکار کردنی دەبێتە شەرفرۆشتن، تەنانەت ئەوانەی حاجی قادر بە خزمەتکاری دەرەبەگ دادەنێن لە بەدیهیبوونی دۆستایەتیەکەوە جورئەتی قسەی وەها دەکەن دژی مرۆڤێک کە مەعلوومە بەلای میللەتی کوردەوە وەک موقەدەس وایە چونکە ئەگەر چ گومان هەبوویایە لەو دۆستایەتییە یاخود ئەگەر دۆستایەتییەکە لە ڕێگەی هەڵبەستی مەدحکارانەی حاجی قادرەوە نەبوویایە بەدیهییە، خۆیان ناچار دەکرد

ئیسپاتی پێوەندییێک بکەن کە لە زاهیردا هۆی ئیسپاتی نەبێ بەمەشدا لە خۆڕایی ئاڵای دوشمنایەتیی کوردپەروەران هەڵکەن.

ڕەنگە نەسەلمێنانی دۆستایەتیە بەدیهیەکە ئەوەیان بە چاوی خۆیانەوە گرتبێ کە گۆیا سڕینەوەی ئەم ڕووپەڕەیە لە دەفتەری ژیانی کورد و حاجی قادر سڕینەوەی پەڵەیێکی ڕەشی سەر سپیایی بێت کە لێی بوە بە عەیب، بەڵام لەمەدا دوو ڕاستیی زۆر گەورە و بایەخدار لە مێژووی کورد و ژیانی حاجی قارد مەحوو دەکەنەوە. بە نیسبەت مێژووی کوردەوە نەسەلماندنەکە وا ڕادەگەیەنێ کە دۆستایەتیەکە لە سەردەمی حاجی قادریش بەعەیب حیساب کرابێت، کە ئەمە بە تەواویی سەرەوبن کردنی هەموو ڕاستییێکی مێژوویی و کۆمەڵایەتی و ئەدەبی ئەو سەردەمە و لەویش بە پێشەوەیە، سەرەوبن کردنێک کە هەرچی کاسەی زانین و ڕۆشنبیریی هەیە پێی بەتاڵ دەبێت... بە نیسبەت ژیان و بەسەرهاتی حاجی قادریشەوە، سەرەڕای پووچاندنەوەی بەشێکی زۆر بایەخداری هەڵبەستەکانی و کوژانەوەی ڕاگەیاندنە ڕاستەوخۆکانی ئەوان هەڵبەستانەی بەشێکی زۆر گەورەش لە ناوەڕۆکی خەباتی حاجی قادر تەفروتونا دەکات کە ئەگەر تەفروتونا بوو حاجی قادر لە تۆقەڵەی ڕابەرایەتی و ڕانمایەتیی هاندەر و تەکاندەرەوە نزم دەبێتەوە بۆ پایەی پەندیاری خەیاڵبازانە. (ئەم ڕاستییە لەگەڵ درێژەکێشانی شی کردنەوەی لێرە بەدواوە پتر خۆ ڕوون دەکاتەوە).

حاجی قادر بەپێی هەموو لێکدانەوەیێک و هەڵسەنگاندنێکی ژیرانە و ئینسافکارانە و بێتەرەفانە مرۆڤێک بوە لە سەردەمی خۆیدا و لەچاو هاوچەرخانی، بگرە لەچاو چەند جیلی دواتریش، نموونەی مرۆڤی ژیر و دادپەروەرە و خاوێن و ڕەوشەنفکر بوە کە لەوە پێشکەوتوتر مومکین نەبێت. دۆزینەوەی ئەم ڕاستییە، کەوا چەندین جار بەپێی داخوازیی لێکدانەوە گوتراوەتەوە و لە غەیری ئەم نووسینەشدا باس کراوە، کارێکە تا بڵێی ئاسان چونکە نەختێک سرنجی سەرپێیی بۆت دەردەخات کە لە سەردەمی خۆیدا چ کوردێک نەیزانیوە و نەیوێراوە ئەو شتانەی حاجی گوتونی بیانڵێت. چ نووسەر و شاعیرێکیش بیری بۆ ئەو تەرزە ئامانجە قەومییانە نەڕۆیشتوە کە حاجی بیری بۆیان چوە. لەلایەن ڕۆشنبیری و زانستخوازی و فکری ڕووتیشەوە گەلێک پێش هاوچەرخەکانی خۆی کەوتۆتەوە.

بەڵێ ئەم ڕاستییانە یەکجار ئاشکرا و دەست هەڵێنجن، بەڵام لە ڕێی پێوانە و بەیەکدی گرتنی «زاتی» یەوە پایەی حاجی چاکتر دەناسرێت و مافی خۆی تەواوتر وەردەگرێت. مەبەستم لە پێوانەی «زاتی» ئەوەیە کەسێک بیەوێ حاجی بناسێت، چ ناسینی دۆستانە چ دوشمنانە بێ، با ئەوەندە جورئەتە بکات بە خەیاڵ حاجی قادر لە دەستە تەرازوی صەدەی نۆزدەمدا دابنێت، سەیری پایەی لە نێوان هاومەسلەک و ئەمسالی حاجیدا بکات، ئەوجار خۆیشی لە دەستە تەرازوی صەدەی بیستەمدا دابنێت و پایەی خۆی لە نێوان پایەی پایەدارانی هاوچەرخی خۆیدا ببینێتەوە و بە پایەی حاجی قادری بگرێت و پێم بڵێت ئەو لە کوێیە و حاجی قادر لە کوێ!

من هەڵوەستی ئەو تەرزە ڕۆشنبیرە بەرەو ئاسانی دەبەم و لێی داوا ناکەم لە مەیدانی فکر و بیروڕای بێ سابیقە و نەترساوی و بەخۆنازیندا خۆی بە حاجی بگرێت، تەنها لەو مەیدانەدا کە حاجی تێدا دەشکێنێتەوە، واتە مەیدانی خزمەتکاریی دەرەبەگ، خۆی بەو بگرێت و بزانم لە نێوان ئەو و حاجییدا، ئاغا کێیە و نۆکەر کێیە! بۆ ئەوەی لەو بەیەکتر گرتنەدا تەرازوی ئینساف خوار نەکاتەوە با بیر خۆی بێنێتەوە هەر جارەی کە بەرژەوەندی گوزەران وەیا پەلەفرەی ناگزووری و تەنگوچەڵەمەی ژیان تەکانی پێ داوە چەند پلە ژورووی تەماع و بەرژەوەند ڕاوەستاوە؟ چەند جاران سوودی ماددی پێشێل کردوە؟ کام دەستی بەهێزی یارمەتی ڕەد کردۆتەوە؟ بە دوا ئەمانەدا چەند ساڵان بەردەوام بوە لەسەر هەڵوەستی قارەمانانە بەدیار تێچوونی مەسڵەحەت و لەدەست چوونی پایە و بەسەر چوونی ئومێدی دنیاییەوە؟ لەو زەرفانەدا کە پاڵەپەستۆی پێداویستی ژیان و بەرتەکدانەوەی هەستی بەخۆنازین لە دوولاوە وەک دوو بەرداش لەش و گیانیان دەقوپاند لەسەر کام پۆپی گەردەن کێلییەوە وەک حاجی قادر ئەم بورکانانەی دەتەقاندەوە؟:

شیر و قەڵەم شریکن لەم عەصرەدا دریغا
شیرم قەڵەمتراشە و کالانییە قەڵەمدان

من لە غەمخواری ئێوە ئەم قسانە دەکەم
وەرنە پەشمە لەلام هەموو عالەم

ئەم قسەی ئێستە عەیبی لێ دەگرن
ئەو دەمەش دێ زەمانی بۆی دەمرن

ئەم بە ئەو، ئەو بە ئەم دەڵێ کاکە
سەیر قانونی حاجی چەند چاکە

هەر چلۆنێ ئیشارەتی فەرمو
وەک کەرامەت هەموی وەها دەرچو

یەکتان نەچوونە گەردش وا تێدەگەن لە دونیا
هەر پادشاهی ڕۆمە و شاهی عەجەم لە تاران

بە شیر و خامە دەوڵەت پایەدارە
ئەمن خامەم هەیە شیر نادیارە

صەلاحی ئێوە ئیستێکە سیلاحە
تەماعی گەورەیی بێ چەک نەکەن نەک

بەڵێ غەم گەورەیە یا گریە وردە
ئەمە گەرداوە ئەویان ئاوەگردە

دەسا ئەی خامە با ئەم باسە پەی بێ
وەرە سەر باسەکی وا فائیدەی بێ

ئەمانە قسەیێکە زۆر کراوە
وەکو ئاوی شەوی تامی نەماوە

گەلێ ساڵە ئەهالی شارەکەی کۆ
شەو و ڕۆژێ لەگەڵ شێخانی بێ پۆ

میسالی ئاگر و ئاگر پەرستن
دەسوتێن و هەمیسان دەیپەرستن

لەکن خۆتان فلان ئیبنی فلانن
لە دونیا ئایین و ئۆیین دەزانن

کەچی کەچ مەشرەبێکی بێ دیانەت
بە حیلە مل دەنێتە بەر عیبادەت

شەریعەت گەر بزانی یا نەزانی
وەکو کەر دەچنە بەر باری گرانی

ئەوی شاعیر نەبێ کوێرە وەجاغی
لە سایەی شیعرەکان بابی کوڕانم

مەڵێن بێکارە بوو حاجی لە ڕۆما
ئەمن پیاوم لە نێو شاری ژنانم

داری دونیا هەر کەسێکی تێی گەیی
میوەیی خامی هەیە و میوەی گەیی

تاکوو دونیا ماوە پوختەی هەر هەیە
لەم کەر و خامەی هەیە باکم نیە

با بڵێین ئەم شێتە قەحپەمردوە
چەند وەڕیوە و چەند وڕێنەی کردوە

حەق تەعالا واقیفی ئەحواڵمە
بۆ ڕەزایی خوایە تەرقیمی ئەمە

بەیتەکان عەیبی مەکەن خوار و کەچن
مەقصەدم لەم بەند و باوە دەربچن

وەرنە ئەم دونیایە نەفسی نەفسییە
گەر لەبەر ئێوە نەبێ باکم چیە

من لە تۆفانا ببم خۆم دەردەکەم
وا مەزانە دامەنی خۆم تەڕ دەکەم

ئێستە هەرچیم پێ بڵێن عەیبی نیە
چونکە ئینسان عیلمی غەیبی پێ نیە

ئاخری چی وەحشیە ماڵیی دەبێ
جاهیلیش ئەو ڕۆژە دێ حاڵیی دەبێ

میللەتی بێ کتێب و بی نووسین
غەیری کوردان نیە لە ڕووی زەمین

قەومی جو چاکە ئیتیفاقی هەیە
کوردی بێغیرەتیش نیفاقی هەیە

ئەمان کوڕانی ڕەفیق و برادەرانی وڵات
بە ئێوە هەرکە گەییشت ئەم کەلامی بێ سەر و پا

لە پاش ئەوە تەصحیح و موطالەعەی بکرێ
بە یادی من لەبەریکەن لە ڕوویی میهر و وەفا

هەتا لە خوططەیی بێگانە فەخری پێوە بکەم
لەبەینی زومرەیی ئەحیاو و مەجمەعی مەوتا

ونی مەکەن وەکو ئاساری نالی و کوردی
لە سەهوی دیدە بپۆشن گوزەر بکەن لە خەطا

ئەمانە زادەیی ئەفکار و خۆشەویستی منن
ئەگەر قەبیح و کەریهن وەگەر شەل و ئەعما

میسالی فەرخەیی ژیشک کە پێی دەڵێ دایکی
ئیلاهی قاقومە یانە سەمموره یا دیبا

شەبیهی جۆلا ڕازی نەبێ بە سەردڕی خۆی
مەڵێن فەصاحەتی کوردی بە فارسی ناگا

بەلاغەتێکی هەیە هیچ زمانێ نایگاتێ
لە بێ تەعەصوبی کوردانە بێ ڕەواج و بەها

نەکا خەیاڵی بۆ ئەوە بڕوا، گۆیا حاجی قادر لە تاریکایی نەناسراوییەوە قسەی قەڵەوی داوەتە بەر ڕەشەبای پاڵەوانیفی و هەڕوگیڤی فیشاڵەوە چونکە دڵنیا بوە لەوەدا کەس قسەکانی لێ بەسەر ناگرێتەوە. ئەم خەیاڵە بێ ئەساسە لەو ڕووەوە کە حاجی پەیتا پەیتا شیعرەکانی بڵاو دەکردەوە و بەپێی داخوازیی واتای ئەو شیعرانەش کردار و ڕەفتاری دەکرد. بەڵگەی ئەم ڕاستییەش هەموو ژیان و بەسەرهاتی ڕۆژانی ئاوارەییەتی لە وڵاتی بێگانەدا.

نەبیستراوە ڕۆژەک لە ڕۆژان حاجی قادر خۆی لە کەسی دەسەڵاتدار هەڵسووبێت وەیا بۆ سوود و تەماع چاوی لەبەر کەس نزم کردبێتەوە وەیا بە تێبینیی ترس و ڕەجا قسەی دەروونی لە گۆڕستانی دەفتەران شاردبێتەوە. خۆ هەموو دیوانەکەی سەروبن بکەیت تاکە وشەیێکی دەست پان کردنەوەی تێدا پەیدا نابێت. سەیرێکی دیوانەکەی بکەیت دەبینیت لە زۆر جێگەدا قسەکانی بۆ میللەتەکەی بەرێ دەکات و پەیامی کوردایەتی و پەندی ئازایەتی و مرۆڤایەتییان لە ڕێی ئەو قسانەوە بۆ دەنێرێت.

ڕاسپاردە ئاگرینەکانی حاجی قادر بابەتێک نین لە تاریکاییدا خۆی بشارێتەوە حاجیش ئەو کەسە نەبوە گوتەی شتێک بووبێت و کردەوەی شتێکی تر. سۆز و ڕاستی ئەو نموونە هەڵبەستانەی تازە خستمنە بەر چاوان نەک هەر هی خزمەتکار نیە و بەس، بەڵکوو لە نێوان گەردەنکێلانیشدا هی مرۆڤێکی ڕابەری بە خۆنازیوی باوەڕ بە خۆ هێناوە کە هەموو جۆرە قسەیێک بە مافی خۆی دەزانێت هەر لە پێداهەڵگوتن هەتا دەرسدان، هەتا شکاندنەوە، هەتا خۆ بەقوربان کردن، هەتا جنێو پێدان، هەتا هەر شتێکی کە ئازایی و ئازادی و پەرۆش و دڵسۆزیی بە مرۆڤی لە خۆڕازیی دەکات.

ئەو ئەدیب و ئەو شاعیرە و ئەو خوێنەرە کوردەی لە سەری زمانەوە بێباکانە عەیب لە شاعیریەتیی حاجی قادر دەگرێ کە بەدڵخوازی ئەوان بۆ صەد ساڵ دواتر قاڵب و ناوەڕۆکی شیعری نەدۆزیوەتەوە، وەیا لە پایەی هەڵوەستە ئازایەکانی دادەلەنگێنن

بەوەدا کە بەر لە صەد ساڵ وەک دێوانەی شارانگەڕیدە دروشمە ناواقیعیەکانی خوێن گەرمێکی ئەمرۆکەی هەڵنەکرد، با لە پاڵ ئەم بێ ئینسافیەیاندا ئەوەندە واقیعیەتە بەکار بهێنن و فکرێک لەو جموجۆڵەی بەرژەوەندویستییەی خۆیان بکەنەوە کاتێک کە دەیانەوێ بەپێی «بنگەی ژن و مێردایەتی» خێزانەکەیان بۆ شوێنی وەزیفەی خۆیان ڕاگوێزن وەیا لە پلەی 50 دینارەوە بۆ 70 دینار هەڵکشێن. هەر لەو حاڵانەدا، بۆ جێبەجێ کردنی کارەکەیان، گەورایەتیی چەند مەئموری لە خۆیان گەورەتر دەسەلمێنن و دەستی ڕێز لێ گرتنیان بۆ بەرز دەکەنەوە سەر گۆشەی برۆیان و لە باری «زینهار» دا بۆیان ڕادەوەستن! کە کارەکەشیان وەستا لە چەند براگەورەی ترەوە نامەی سفارش دەهێنن بۆ لای کاربەدەستەکە بەڵکوو سەرچاوەی بەزەیی دێتە جۆش و دەستێکی ڕەحم درێژ دەکات بۆ ئیمزا کردنی ئەو فەرمانە کە هێندەی «صک الغفران» ی جاران چاوەڕوان دەکرێت... لەم حاڵانەدا با خۆیان بەو حاجی قادرە بگرن کە بەدێژایی ژیانی دەستی بۆ کەس پان نەکردۆتەوە و تەمەنناى تەماعی بۆ کەس نەکردوە و کاغەزی سفارشی لە کەس وەرنەگرتوە.

من لێرەدا ئەو کەسانە عەیبدار ناکەم کە خەریکی بەرەوپێش بردنی بەرژەوەندیانن و یارمەتی لەم و لەو داوا دەکەن وەیا لەبەر ناچاریی حورمەتی ئەم و ئەو دەگرن چونکە دەزانم کامەرانی بەندە بە بەرژەوەندەوە، واقیعەکەشمان فێر نەبوە لە خۆوە مافی خاوەن مافان بڕوێنێ تا پاڵپێوەنەرێک دێت و دەیڕوێنێ. من ئەو کەسانە لەوەدا عەیبدار دەکەم کە هەوڵی خۆیان بەلاوە ڕەوایە بەڵام یەکێکی وەک حاجی بە نۆکەری دەرەبەگ دادەنێن لە حاڵێکدا دەیێکی ئەوانیش سەری فروو نەهێناوە نە بۆ دەرەبەگ و نە بۆ غەیری دەرەبەگ.

ئەوەی ڕاستی بێ من لەلایەن خۆمەوە پتریش لێ بوردن بەکاردێنم لەگەڵ ئەو ڕۆشنبیرانەدا چونکە عوزری بەسەهوو چوونیان بۆ تێدەخوێنمەوە لەو ڕووەوە کە وا دەشێ نەپەرژابێتنە سەر وردبوونەوە و بەراورد کردن و بەیەکتر گرتنەوە بەتایبەتی کە تیژڕۆیی ئەم سەردەمە لە هەموو مەیدانێکدا وا لە مرۆڤ دەکات هەنگاوە بڵاوەکانی بەسەر زۆر ڕاستییدا بکشێت بێ ئەوەی هەستیان پێ بکات بەڵام نابێ ئەم عوزرە ببێتە شەفاعەتکارێکی ئەبەدی، ئەگەرنا هەموو هەڵەیێک و بێ ئینسافییێک و بەسەهوو چونێک شێوەی نەمری و ئەبەدیەت وەردەگرێت. دوای ڕوون کردنەوەی ڕاستی و واقیع دەبێ هەڵوەست ڕاست بکرێتەوە، خۆ ئەگەر

یەکێک ویستی بەردەوام بێ لەسەر هەڵوەستی پێشووی، لێی داوا دەکرێ بە بەڵگە ڕاستبوونی هەڵوەستەکەی بسەپێنێ و وەرامی ئەو ڕەخنانەش بداتەوە کە وا لەخۆی دەگیرێت لەو تەرزە ڕەفتارانەی کە ئەو لە خەڵقی بەعەیب دەگرێت و خۆشی دەیانکات.

لێرە بە پێشەوە گوتومە و لێرەشدا دووبارەی دەکەمەوە. ڕوشنبیر بە تێکڕایی، چ شاعیر چ زانا چ هونەرکار بێت تاکێکی بەرچاو و مومتازی گەلە، لەوانەیە ببێتە ڕابەر و نموونەی کردەوە و ڕەفتار، کەواتە پتر لە خەڵقی تر لێی داوا دەکرێت ئاگاداری دەست و قاچ و زمانی بێت، کەمتریش لێی دەسەلمێندرێت پوشکە بە چاوی خەڵقەوە ببینێت و چیلکە لە چاوی خۆیدا نەبێنێت.

لە ئاکامی ئەم لێکدانەوەیەدا دەگەین بە سەرەتای قەناعەت بەوە کەوا حاجی قادر لە دوو لایەنی یەکجار گرنگی بەراورد کردنەوە بڕیاری بێ عەیبی بۆ دەدرێت لەو پێوەندییەی کە بە براگەورە و سەرۆکەکانی سەردەمی خۆیەوەی هەبوە. یەکەم بەپێی داب و دەستوور و نەریتی کۆمەڵایەتی ئەو ڕۆژگارە کە پێوەندیی ئەوتۆیی لە کەس بەعەیب نەگرتوە بەتایبەتی کە دەزانین حاجی بەهیچ جۆرێک لەو پێوەندییەدا کەمایەتی نەهێناوەتەوە سەر خۆی. دوەم لەلایەن ئەوەوە کە دێین هەڵوەستی ئەوسای حاجی بە هەڵوەستی ڕۆشنبیرانی ئەمڕۆکەش دەگرین لەوان پتر بە مرۆڤێکی ڕێز لەخۆگرتوو دەردەچێت.

ئەم ڕاستییە بەدەم درێژەکێشانی نووسینەوە لە بەراورد کردنی بەهێزتر و بەرچاوتریشدا خۆی بەسەرماندا دەسەپێنێ.

دابڕینی دیاردەی کۆمەڵایەتی وەیا هەڵوەستی مرۆڤ، چ تاک چ گەل، لە زەرفی مێژوویی و دەوروبەر واقیع بە نیازی ڕاگوێستنی بۆ بەر تیشکی واقیع و دەوروبەرێکی نوێتر وەک ڕاگوێستنی ئێستایە بۆ بەر تیشکی پێوانە و کێشانەی مێژووی تێپەڕیوو. ئەگەر بسەلمێنین عەیبدار کردنی هەڵوەستی لێرە بە پێشەوە بەپێی نرخە کۆمەڵایەتیەکانی ئەم ڕۆژگارە کارێکی ڕەوایە، دەبێ عەیبدار کردنی واقیعی ئێستاکەش بەپێی نرخی کۆمەڵایەتی دوێنێ بەکارێکی پەسند و ڕەوا لە قەڵەم بدەین. کە بێین و قبووڵ کەین ئافرەتی صەد ساڵ پێش ئەمڕۆ لە ڕێی پەچە و عەباکەیەوە تاوانبار کرێ بە گیانی کۆنەخوازی، دەبێ ئافرەتی نوێخوازی ئەم

سەردەمەش بدەینەوە بەو نرخانە کە وا صەدان ساڵ پێش ئەمڕۆ ئافرەتێکی مایۆ لەبەری شارەزوری پێ دەنرخێنرا. خۆ ئەوەی ڕاستی بێ لەم ساڵەی 1972 ە دا[110] پەچە و عەباکە جارێ شوێنەواری کوێر نەبۆتەوە، ئافرەتی عەشیرەتیش چ فەرقێکی نەکردوە لە ئافرەتی عەشیرەتی سەردەمی حاجی قادر. کەواتە نرخی کۆمەڵایەتیی کۆنی کوردەواریی سەر بە مامڵەت کردن لەگەڵ ئافرەتدا هەتا ئێستاش پاشماوەی بەرچاو و ڕێز لێگیراویشی هەر ماوە، کەچی نرخە کۆمەڵایەتیەکانی نۆژەی ئافرەتی مەکتەبدیدەی کورد تاکە یەک بنگە و ڕیشاڵی نەبوە لە هەموو ڕابردووی کۆندا. لایەنێکی ماددی و نامادی کۆمەڵایەتیمانی پێ دەگرینەوە دەبینین دیاردەی ئەوتۆمان هەیە نرخ و ڕێزی هەزار ساڵەی لەگەڵ خۆیدا هێناوەتە خوارێ تا ڕۆژی ئەم نووسینە، لێرەش بەدواوە بە لێژگەی ڕۆژگاردا دەچێتە خوارێ بە خۆی و ڕێز لێنانیەوە تا ئەو ئاسۆیە مەوهوومەی کە خەیاڵ لێمانەوە دیارە.

بەو پێیە کە بێین و بەردەوامبوونی یاسا و نەریتی کۆن لە حازردا ڕابگرین بەرانبەر موستەحیلبوونی نەریت و یاسای نوێ لە کۆندا، دەبێ بەلای دڵ ڕاگرتن و نەتۆراندنی خەڵقەکەی لێرە بە پێشەوە بشکێینەوە بەوەدا کە یاسا و نەریتەکەیان لێ بەعەیب نەگرین چونکە دەزانین یاسا و نەریتەکە نە جێگریان هەبوە نە لە ئێستاکەشدا هەموویان بەعەیب حیساب دەکرێن سەرەڕای ئەوە کە ئیمکان نەبوە نەریتە ڕێز لێگیراوەکانی ئەمڕۆکە لەو ڕۆژگارەدا هەبێ وەیا ئەگەر کەس پێڕەوی کردبان ڕێزیان لێگیرابا.

بەلای ڕاستیی بێتەرەفانەوە ڕەوابوون و ڕەوانەبوونی دیاردەی کۆمەڵایەتی لە چارچێوەی مێژوویی خۆیدا سەیری دەکرێت و بڕیارەکەشی دەدرێتەوە بەو خەڵقە کە لەگەڵ دیاردەکەدا ژیاون. نووسەری دڵسۆز و بەئینساف و تێگەیشتوش هەر ئەوەی لێدەکرێ هەڵوەستی ڕاستەقینەی خەڵقەکە دەربارەی دیاردەکە ڕوون بکاتەوە و خۆی نەکاتە لایەنێکی دۆست وەیا دوشمنی پرسیارەکە. بە نموونە دەڵێم میللەتێک کە لە پلەیێکی مێژووییدا کارێکی زۆر ناپەسەندی کردە یاسا، پێی ناوێ من و تۆ لەم ڕۆژگارە و لەم هەڵکەوتەمانەوە بکەوینە سەر تەئویلی ئەو هەڵوەستە بۆ پەڕاندنەوەی میللەتەکە لە توانجی بەدواکات.

---

[110] کە دەکا ساڵی دەست پێ کردنی ئەم نووسینە 1972

وا بوە «عەبدایەتیی» لەسەر هەموو دزێوییەکی کە تێیدایە یاساییەکی ڕێز لێگیراو بوە، لە هەندێ حاڵدا بەلای عەبدەکە خۆیەوە، وەیاخود دانیشتوانی هەرێمێکی پان و بەرین لە لایەن پاراستنی ڕووسووری ئافرەتەوە یەکجار بێباکبوون وەک ئەوەی لە کتێبی گەشتەکەی «مارکۆ پۆلۆ»[111] دەربارەی هەندێ شوێنی تورکستانی چینییەوە دەیخوێنیتەوە، وەیاخود یاسای Polygamy[112] بەلای هەندێ ئایینەوە ڕەوا بوە و ڕەوایشە، هەندێکی تریش یاساغی کردوە کە دەزانین لە بەرانبەر ئەودا یاسای Polyandry[113] لە هەندێ نەریتدا برەوی هەبوە و تا ئێستاش پاشماوەی هەر هەیە. وەیاخود دیاردەیێک لە شوێنێک ڕێزلێگیراو بوە لە شوێنێکی تردا هۆی ئابڕووچوون بوە.

کە بمانەوێ نموونان بێنینەوە دەتوانین بەدوایان بکەوین و لە هەموو کات و لە هەموو جێگەیەک و لە نێوان هەموو میللەتانیشدا بابەتی وەهایان لێ دەسبژار بکەین کە سەیرمان بێنێتەوە لەوەدا چۆن مرۆڤ لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێک و لە کاتێکەوە بۆ کاتێک هێندە لە یەکتر جوداواز و دوورکەوتە دەبن.

بێگومان دیاردەی «دەرەبەگایەتیی» ش یەکێکە لەو دیاردە کۆمەڵایەتیانەی کە عەمەلیەتی بەرەوپێش چوونی مرۆڤ پەیدای کردوون، هەروەک واش بوە بە هۆی پاشکشەی بزووتنەوەی مێژوویی لە شوێنێکدا وەیا لە ڕۆژگارێکدا پتر لە تەمەنی خۆی ژیاوە. ئەوەی ڕاستی بێ گەلێک لەو نەریت و یاسایانەی کە لەگەڵ

---

[111] مارکۆپۆلۆ دەڵێ کوبیلای خان ئەم نەریتەی بەکرێ دانی «ئافرەتایەتی» یاساغ کرد، بەڵام خەڵقەکە وەفدی گەورەپیاوی خۆیان نارد کە تکای لێ بکەن دەرگەی ڕزقیان لێ نەبەستێ. بە پێی گێڕانەوەی مارکۆپۆلۆ، کوبیلای خان بەوپەڕی تەحقیرەوە تکایەکەی لێ سەلماندن و گوتی ئێوە کە هێندە بێدەماربن کەمایەتیی و سووکایەتیی وەها بێڕەزا بە خۆتان لایەق ببینن بڕۆن چاوتان دەرێ چی بە نامووسی خۆتان دەکەن بیکەن. بەدوا ئەمەدا یاساکەی هەڵوەشاندەوە و ئافرەت بەکرێ دان لەو هەرێمەدا حەڵاڵ کرایەوە.

[112] زۆرژنە Polygamy – تاکژنە Monogam

[113] زۆرمێردە Polyandry – تاکمێردە Monandry

دەرەبەگایەتی لە کۆنەوە بەیەکەوە لە کۆمەڵدا برەویان هەبوە و بەلای هەندێ خاوەن ڕایانەوە هەموویان زادەی یەک پلەی گۆڕانی کۆمەڵایەتین، پتر لە دەرەبەگایەتی بەردەوام دەبن و ڕێزیان دەمێنێ بە هۆی ئەوەوە کە ئەوان لایەنێکی مەعنەویاتی کە تێیاندایە پاڵپشتیان لێ دەکات و خۆراکی ژیانیان پێ دەدات لە حاڵێکدا دەرەبەگایەتی پێوەندیێکی ماددی ناحەزی ڕووتە و چ سەروکارێکی لەگەڵ مەعنەویات و غەیبدا نیە، ئەگەرنا زۆر جاران شێخایەتیی تەریقەتی چاو لە دنیا هێندەی دەرەبەگایەتی قورسایی خۆی خستۆتە سەر شانی فەلاح و هەژارانەوە بەڵام وەک دەرەبەگایەتی ناحەز نەبوە، بە پێچەوانە ئەو پەڕی ڕێزی لێنراوە.

لەم نووسینەدا نموونەیێکی ئەم دیاردەیەمان دیت لە مەسەلەکەی شێخ نەبی ماویلی کەوا نەک هەر بەلای خەڵقەکەی سەردەمی خۆیەوە ڕێز لێگیراو بوو بەڵکوو سەرەڕای ڕێز لێ گرتن، بە ئەرک و مەسرەفی خۆیان قورسایی داخوازیەکانیان هەڵدەگرت و یەخەی حەقپەرست و دڵسۆزێکی وەک حاجی قادریشیان بۆ دەگرت.

سرنجێک لە شۆڕشی فرەنسە بگرە دەبینی کەنشتەش وەک کۆنتەکان خاوەن زەوی بوو بەڵام بە هۆی خەرمانی پیرۆزیی «غەیب» بەدەوریەوە هێندەی کۆنتەکان دووچاری هێرشی شۆڕش نەبوو، دواتریش کە کڵپە و هەڵپەی شۆڕش بەسەرچوو کۆنتایەتی و دەرەبەگایەتی لە فرەنسەدا دوابڕاو بوو بەڵام کەنشتە هەر مایەوە بۆ ڕێز و خۆشەویستی خەڵقی فرەنسە.[114]

ئەم نموونە کۆمەڵایەتیانەی تازە خستمنە بەرچاوی خوێنەرەوە، کە هەموویان زادەی مێژوو و واقیعن هەرچەند بەد و ناپەسەندیش بن، هەر یەکێک لەوان ناحەز و نەیاری تایبەتی خۆی هەیە، واتە سەرلەبەریان بەلای هەموو بیروڕایانەوە لە یەک پلەی نەخۆشەویستییدا نین. بێگومان پیاوێکی ئایینذۆست پتر ڕق لە ئافرەت

---

[114] لە هەندێ نووسینی بەحورمەتدا دەخوێنیتەوە چۆن «عبدالناصر» لەگەڵ «خرۆشچێڤ» دا بە وتووێژ دەربارەی مەلاکانی ئیسلام ئەوەی بۆ ڕوون کردۆتەوە کە مەلاکان نە مڵکدار بوون و نە هەرگیز لای زۆر و ستەم بوون، تەنانەت لە سەردەمی ناپلیۆنەوە لایەنگیری شۆڕش بوون. کەنشتەی ئەورووپا زۆر ساماندار بووە.

فرۆشیی هەڵدەگرێت تا زەویداریی کە بەلای ئەوەوە چ بێ شەرعیی تێدا نیە. کەچی وا دەزانم ڕۆشنبیرێکی خولیای پلەی گۆڕان و خەباتی چینایەتی و هێزی پێشڕەو و فکری ئەوتۆیی لە دڵ و مێشکیدا جێگیر بووبێت بەلایەوە ئاسانترە عوزری ئابووریی بدۆزێتەوە بۆ چاوپۆشیی کردن لە پامالبوونی ڕووسووری ئافرەت[115] تا ئەوەی دەربەگایەتی بە دیاردەییێکی کۆمەڵایەتی چاو لێپۆشراو حیساب بکات. لەوانەیە یەکێکی تریش کە ئایینەکەی تاکژنیی دەسەلمێنێ ڕقی هەرە گەورەی لەوە بێت کە پیاوێک دوو ژنی هەبێت.

ئەم هەڵوەستە لە یەکتر نەچوانە بەرانبەر دیاردە کۆمەڵایەتیەکان دەخلی مەوزوعیی بێتەرەفانەی بەسەر چاکە و خراپەی دیاردەکانەوە نیە، چونکە دەشێ خاوەنەکانیان کە هێندە لە یەکتر دوورن هەمویان مرۆڤی چاک و نیازپاک بن و هەریەکەیان بەوپەڕی دڵسۆزییەوە پێڕەویی باوەڕەکەی خۆی بکات، کە ئەمە وای داوا دەکرد نیازی پاک لەسەر یەک باوەڕیان کۆ بکاتەوە نەک تا ڕادەی دوشمنایەتی لە یەکتر جودا بن.

هەڵبەت من لێرەدا مەبەستم ئەوە نیە دەربەگایەتی بە دیاردەیێکی ڕەوا وەیا چاک دابنێم، یاخود چاوپۆشی لە پامالبوونی ڕووسووری ئافرەت پەسەند بکەم چونکە لەم نماییشتەدا مەبەستم ئەوەیە بڵێم مرۆڤ لە کولانەی نەفسی خۆیەوە سەیری چاکە و خراپەی دیاردەکانی کۆمەڵایەتی دەکات ئیتر ئەو نەفسە یا بەسەهوو چوە یا نەچوە، بەپێی بەسەهوو چوون و نەچوونیشی هەڵوەستەکەی ڕاست دەبێ وەیا هەڵە. ئەگەر لە جیاتی مرۆڤەکان صەد جیهازی کۆمپیوتەر بڕیاری چاکبوون و چاک نەبوونی

---

[115] مەحمود حەسەن ئیسماعیل لە ژێر ناونیشانی «هکذا قالت بغی» ئەم دیفاعەی لە ئافرەتی خۆفرۆش کردوە:

ساقنی القوت و ساقتکم الی شهوات
جذبتکم للهوی من شفتی جمرات
هی فی شرعکم الجانی علی صبوات
ازهرت حمرتها من رئتی زفرات
وهی لعن الزاد غنته لدی قبلات

دیارده کۆمەڵایەتیەکانیان دابا بێگومان هەر صەدیان یەک بڕیاریان دەدا چونکە ئەوان نەفسیان نیە بیکەن بە ئاوێنە و جیهانی تێدا بخوێننەوە. کۆمپیوتەر ئەگەر زانیاری ڕاستی بدرێتێ نە بەسەهوو دەچێ و نە هیچ لایەنگیریش دەکات، بەتەواوی بە پێچەوانەی مرۆڤ کە لەوانەیە هەر دوو عەیبی تێدا کۆبێتەوە.

ڕۆشنبیر کە بیەوێ لە هەڵوەستێکدا بێ بتوانێ شانازی بە ڕاستبوونیەوە بکات، لەسەریەتی بەقەدەر کۆمپێوتەر مەوزوعی بێت و خۆی لە مەیلی دڵی خۆی بدزێتەوە. هەرگیز خۆ کردنە سەربازی عەقیدە نابێتە عوزری خۆ بەسەهوو بردن و چاو لە ڕاستی پۆشین چونکە عەقیدەی ڕاست خۆ بەسەهوو بردن قبووڵ ناکات و پەکیشی لەسەر چاوپۆشی نەکەوتوە. کە هات و عەقیدە لە ڕاستی وەتەنگ هات دیارە هەڵەی تێدایە. ئەمەش بەدیهیەیێکە نەسەلماندن هەڵناگرێت.

ڕاگرتنی دەرەبەگایەتی لە نێوان دیاردە کۆمەڵایەتیەکانی جۆراجۆر کە لەگەڵ ئەودا ژیاون، یارمەتی سرنجگر دەدا کە وا هەمیشە لە چارچێوەی واقیع و هەڵکەوتدا سەیری مەسەلەکە بکات. من لەم چەند دێڕەی بەرایی یەک دوو دیاردەم کردە پەراوێز، کە ئەگەر لەگەڵ پرسیارەکەدا بە تەواویی و تاڕادەی ڕەواندنەوەی هەموو تاریکاییەک بەدەورییەوە لە گەڵی خەریک بین پێویستە پەراوێزی چەشمەنداز لێک بکێشینەوە تاکوو هەموو ئەو دیاردە کۆمەڵاییەتیانە بگرێتەوە کە وا وەک ئەو بەلای بیروڕای بەزاهیر نوێخوازەوە ناپەسند و دژی پێشکەوتنی گەلانن بۆ ئەوەی هەر یەک لەوان پشکێکی ڕق لێبوونەوە وەرگرن نەکا سەرلەبەری ڕقەکە ڕوو لە تاکە دیاردەیێک بکات، ئەوساش دوو کەلەبەری گەورە دەکەوێتە ناو نیگای سرنجدەر. یەکەمیان ئەوەیە بەزیادەوە دوشمنایەتی بەکار دێنێت لەگەڵ بابەتەکە چونکە تاکە دوشمنی مەیدانی سەیر کردن دەبێت، دوەمیان ئەوەیە کە وا لە دیاردە کۆمەڵایەتیە دراوسێکانی دادەبڕێت و دەکەوێتە بەتاڵاییەوە. دەشزانین دابڕانی مەوزوع لە واقیعی مێژوویی خۆی نائاشنا و نامەفهومی دەکات.

من ڕێگەم نیە بابەتی دەرەبەگایەتیی کورد، لە هەموو ڕوویێک و لە هەموو لاییێکەوە، بخەمە بەر تیشکی سەرلەبەری واقیعی کوردایەتی و ناوەڕۆکی کۆمەڵایەتیی کوردەواری. تەنانەت ناتوانم لەم نووسینەدا دەرەبەگایەتی ببەمەوە بۆ سەرچاوەی مێژووییەکەشی چونکە باسەکە بەگشتی خەریکبوونێکی سەربەخۆ و درێژی گەرەکە. چارم ناچارە لە گۆشە نیگای پێوەندیی باسی حاجی قادر بە مەوزوعەکەوە، بایی

ئەوەی لە تاریکایی «مطلق» دەرچێت و قسەی ڕاستی پێوە بەند بێت، لەسەری دەڕۆم. لەوە بەولاوە خوێنەری باسەکە دەبێ زیهنی خۆی بە مێژووی دەرەبەگایەتی و بە جێگەی ڕاستەقینەی لە نێوان جغزی دیاردە کۆمەڵایەتییەکانی تری بەد و ناپەسنددا بگێڕێت و تێکڕای وردبوونەوەکەشی لە عمومیاتی مێژوو وەرگرێتەوە بۆ ناو مێژووی میللەتی کورد ئەوسا بە چاوێکی کرایەوە سەیری باسی دەرەبەگایەتی و خەریکبوونی ئەم نووسینە پێیەوە، بکات.

ئەم تەرزە وردبوونەوەیە مێشکی ڕۆشنبیر لە چەندین قۆرت و تەڵەی فکری ڕزگار دەکات بەوەدا کە ڕێ دەبەستێتەوە لەوەی تاکە عامیل ببێتە ئاکتۆری سەر شانۆی مێژووی بەدکاری و هەموو بەرد باران کردن بۆ خۆی بدزێتەوە و بەشی عامیلەکانی تری لێنەدات وەیاخود واقیعی کورد و بارە ناخۆشەکانی بە واقیعی میللەتێکی تر بگیرێت و لە حاڵێکدا ناشێ کورد و هیچ میللەتێکی تر وەک یەک سەیریان بکرێت ئەگەر ئەویش لە زەرفی وەک هی کورددا نەژیا بێت، کە دەزانین زەرفی وەها نالەبار و پڕفەلاکەت لە نێوان ئەو میللەتانەی تا ئێستا ماون ڕەنگە هەر پەیدا نەبێ.

ئەگەر بێین و بە خەیاڵ حاجی قادر باوێینە بەر تاقی کردنەوەی بیروباوەڕ لە ئاست ئەو دیاردە کۆمەڵایەتیانەی لەو چەند دێڕەی پێشووتردا هاتنە ناو شریتەی نووسینەوە، گومان نیە لەوەدا حاجی بەر لە هەموو شتێک دژی ئەو یاسا و نەریتە دەوەستێ کە بەرانبەر ڕووسووریی ئافرەت کەمتەرخەم بێت چونکە ئەو لە چەند موناسەبەدا کوردی بەوە هەڵداوەتەوە کە ناموسی مێردایەتی و ژنایەتییان دەپارێزن لە حاڵێکدا میللەتێکی تر، لەوانەی حاجی بە هەڵبەست دەیانشکێنێتەوە، تا ئەو ڕادەیە دەربەست بە «ناموسپارێزی» نەبوون، تەنانەت بە صەراحەت لە دژی «متعە» دواوە کە بەلای هەندێ مەزهەب و نەریتەوە کارێکی ڕەوایە. دیوانەکەی بخوێنەوە و نموونەی ئەم بیروڕایانەی حاجی بە چاوی خۆت ببینە. من لێرەدا تاکە بەیتێک بە شایەدی دەربەست بوونی حاجی بە ڕووسووریی ئافرەت دەهێنمەوە تاکوو باشتر بە بەرچاوی خۆمانەوە بگرین کام ئاکار و ڕەوشت و یاسا لەو سەردەمەدا جێی پێوەنازین وەیا لێڕازیی نەبوون بوە.

کوڕی غیلمانە کچیان عەینی حوری
نەزەربازن وەلێکین[116] دوربەدوری

دەبینی لێرەدا حاجی قادر بە جۆرێکی گەنجی مێیینە و نێرینەی کۆیێ لە بێپەردەیی دوور دەخاتەوە کە توهمەی لە نزیکەوە سەیری یەکتر کردنیشیان لێ دەتکێنێتەوە وەک ئەوەی کە بە عەیبێکی شەرم هێنەوە حیساب کرابێت. سەیر لەوەدایە حاجی قادر کە بەپێی قەناعەتی ئەو سەردەمە تا ئەم ڕادەیە دەربەستی ڕووسووریی ئافرەت بوە چ دەوڵەتپاریزیی خۆی تێدا مەبەست نەبوە چونکە هیچ خزمێکی ئافرەتی وەها نێزیکی نەبوە کە بە شەرع «دەستنوێژی لێی نەشکابێ» تاکوو خەیاڵ بۆ ئەوە بڕوا حاجی لە هەڵوەستێکی شەخسییەوە نەزەر کردنی لە نزیکەوەی بە حەرام دانابێت وەیا ئەم شیعرەی دەنگدانەوەیێکی لاشعووری پەرۆش هەڵ گرتنی دامەن پاکیی ئافرەتی مەحرەمی خۆی بێت چونکە دوای مەرگی دایکی خوشکی نەبوە، ژنیشی نەهێناوە، کە ژنی نەهێناوە دیارە کچیشی نەبوە ئەم سێیانەش (ژن و کچ و خوشک) نێزیکترین سێ ئافرەتن بۆ حاجی کە چاکە و خراپەیان لەسەر ئەو حیساب بکرێت.

بەمەدا پتر حاڵی دەبین کە وا حاجی لە هەڵوەستەکانی بەرانبەر «دیاردەی کۆمەڵایەتی» زەرفی شەخسی خۆی تێکەڵ بەحیسابان نەکردوە، چی گوتوەتی بیروڕای بێ پێچ و پەنای بوە. هەر لەم لێکدانەوەشەوە دەگەم بەو باوەڕە کە وا حاجی لە ئاست «دەرەبەگایەتی»یشدا هەڵوەستێکی مەوزوعی هەبوە بەپێی واتەی وشەی «موضوعية« بەرانبەر دەرەبەگایەتی لەو سەردەمەدا. واتە لەو باوەڕەدام کە ئەگەر حاجی چەند پارچە ئەرزێکی کەوتبایە کێشەی دەست بەسەردا گرتن

---

[116] هەندێک خوێنەر وشەی «وەلێکین» دەکەن بە «وەلاکین – ولکن» ی عەرەبی، لەمانە تیپی مۆسیقای «باواجی« یش هەرووەهای خوێندۆتەوە بەڵام ڕاستی خوێندنەوەی وەهایە وەک نووسیومە. لە فارسیش هەر بەم جۆرەیە:

بگفتا من گلی ناچیزە بود
ولیکن مدتی با گل نشستم

لەلایەن زۆرداریکەوە گۆڕانێکی گەورە بەسەر هەڵوەستەکەیدا نەدەهات بەڵکوو هەر لەوەندە دەوەستا کە لە ڕێی لەسەرخۆ کردنەوەوە دەستەویەخەی ئەو زۆردارە بوویایە نەک ئازار و زیانی شەخسیی فەلسەفەیێکی نوێ و فرەوانی بەرانبەر زۆرداری و دەرەبەگایەتی بۆ حاجی پێک هێنابایە. هەرچەند لەم ڕایەمدا بەسەر تاکە بنگەی لێکدانەوەوە دەوەستم چونکە ڕووی نەدا زەوی لە حاجی داگیر بکرێت و ئاکامەکەی بە چاو ببینین، بەڵام ڕوونەدان ڕێگەی لێکدانەوەم لێ نابەستێ چونکە هەموو ژیان و بەسەرهاتی حاجی ئەوە بە ئیسپات دەگەیەنن کە حاجی لە ڕوانگەی سوودی شەخسییەوە سەیری جیهانی نەکردوە.

خۆ ئەگەر لە نوقتەی سوودەوە بەرەو «هەڵوەست» ڕۆییشتبایە دەبوو یەک لەفزی کوردایەتی لە دوو لێوەیەوە دەرنەیەت و یەک وشەی ناحەزانە لە شێخ نەبی نەگرێت و هەرگیز لە دوورەوە مەدحی براگەوران نەکات. کەواتە حەقمە بڵێم حاجی هەر ئەو حاجییە دەبوو ئەگەر زەویەکانیشی لێ داگیر کرابایە هەرچەند دەشێ بیر بۆ ئەو بڕوات کە ئەگەر لە تەجرەبەی شەخسییدا ڕووبەڕووی زۆرداریک بوویایە، هەر لە کولانەی تەجرەبەی شەخسییەوە هێرشیکی بردبایە سەر زۆردارەکە بە شیعر وەیا بە قسە هەر وەک دیتمان کە لەگەڵ شێخ نەبیدا دووچاری ئەو هەرایە بوو کەوتە سەر ئابڕوو بردنی بە شێوەیێک بیرمان لەوە کردەوە ئایا ئەم دوشمنایەتیە و ناکۆکییە دەخلی بوە یا نەبوە بەسەر هەڵوەستی حاجی بەرانبەر شەعبەدە.

من کە لێرەدا دەڵێم هەڵوەستی حاجی بەرانبەر دەرەبەگایەتی و زەویدارییی لە ڕێی تەجرەبەی شەخسییەوە نەدەگۆڕا لە زیمندا قسەکەم ڕێگە خۆش دەکات بۆ ئەوەی کە وا هەمان بڕیاریش بدەم بەسەر مەسەلەکەی شەعبەدە و شێخایەتیی درۆزندا، واتە ئەم قسەیەم نەختێک پێشدەستی دەکات لەو کات و بارەی جارێ دانەهاتوە بۆ یەکلا کردنی پرسیارەکەی شەعبەدە و هەڵوەستی حاجی لە ئاستیدا لە نوقتە نەزەری دەوری تەجرەبەی شەخسیی حاجییەوە.

بەهەمەحاڵ دەوری تەجرەبەی شەخسیی لە هەڵوەستی حاجی قادر بەرانبەر دیاردەکانی کۆمەڵایەتی چەندێک بووبێت یا نەبووبێت ناشێ خەیاڵمان بۆ ئەوە بڕوات کە «سوودی شەخسیی» ش جۆرێک بووبێت لە تەجرەبەی شەخسیی

چونکە بەڕاستی حاجی قادر حیسابی سوود و زیانی تێکەڵ بە قەناعەتەکانی نەکردوە لەمەشدا کردە و گوتەی بەیەکەوە شایەدی بێدەمەتەقەی حاڵن.

ئێستا با دەوری تەجرەبەی شەخسیی لە هەڵوەستی حاجی بەرانبەر دەرەبەگ بەلاوە بنێین و بەوەندەی تازە لێی دواین، کە دەزانم بایی قەناعەت دەکات، وازی لێ بێنین تاکوو لە بەر تیشکی واقیعی فرەوانەوە سەیری هەڵوەستەکەی بکەین.

واقیعی فرەوان کە تەجربەی شەخسیی لێ دەرهاوێژرا سێ بنگەی بنجیی تێدا دەمێنێتەوە، قسەکەشم لێرەدا لەگەڵ «واقیعی فرەوان» ی حاجی قادر نەک هی هەموو جیهان، بەدەوری «دەرەبەگایەتی» یشەوە دیاردەکانی تری کۆمەڵایەتی، دەرەبەگایەتیی کوردیش نەک هی میللەتانی تر.

بنگەی یەکەم چەند و چۆنی دەرەبەگایەتیەکە خۆی لەو زەرف و کاتەدا کە تێیدا هەڵدەسەنگێندرێ. دیارە لێرەدا کاتەکە ئەو ماوەیە دەگرێتەوە کە حاجی قادر تێیدا خاوەن فکر و بیروڕا و هەڵوەست بووە و لەگەڵ دەرەبەگایەتیی کوردیشدا ژیاوە. لەم ڕووەوە دەبێ ساڵانی سەرەتای ژیانی حاجی لە ماوەی عومری دابشکێنین چونکە جارێ لێی چاوەڕوان ناکرێ، داواش ناکرێ، هەڵوەست نیشان بدات. بەدوا ئەمەدا دەبێ جارێکی تریش ئەو ساڵانە لە حیسابەکە دەرباوێین کە حاجی لە ئەستەمبۆڵی بەسەر بردوە چونکە پێوەندیی ڕاستەوخۆی بەدەرەبەگایەتیی کوردەوە نەماوە (لەگەڵ هیچ جۆرە دەرەبەگایەتیی تریشدا پێوەندیی نەبوە تاکوو حیسابێکی خەیاڵی ئەو پێوەندییە بگێڕینەوە بۆ ناو حیسابی هەڵوەستەکە).

بەو پێیە ئەگەر بسەلمێنین حاجی لە 1240 ی کۆچی هاتبێتە دنیا و لە 1281 یش بەرەو ئەستەمبۆڵ ڕۆشتبێ دەمێنێتەوە 20 ساڵێک کە بیکەین بە ئاوێنە و تارمایی دەرەبەگایەتی پێدا تێپەڕێنین و هەڵوەستی حاجی لێهەڵێنجین. هەڵوەستی حاجی بەرانبەر دەرەبەگایەتی لەو ساڵانەی کە لە ئەستەمبۆڵی بەسەر بردوە دەخرێتە بەر تیشکی دوو بنگەکەی ترەوە کە لە کوردستان و لە تورکیاش کاریگەر بوون.

من درێژەی قسەم لە بارەی بنگەی یەکەمی واقیعی فرەوانەوە دەخەمە دوای لێبوونەوە لە باسی دوو بنگەکەی تر کە خێرا پێیاندا تێدەپەڕم چونکە بنگەی یەکەم هەم خۆی بابەتی ئەسڵی نووسینەکەیە هەم هی تایبەتی کوردیشە، دوو بنگەکەی تر

نە تایبەتی کوردن و نە بە ئەسڵیش بابەتی نووسینن هەرچەند بنگەی واقیعی فرەوانیش بن.

بنگەی دوەم هەڵکەوتی دەرەبەگایەتییە لە جغزی ئایین و یاسادا.

ئەوەی ڕاستی بێ بەنیسبەت حاجی قادرەوە ئایین پتر جێی بایەخ پێدان بوە چونکە جێی قەناعەت و باوەڕهێنانی بوە، بە پێچەوانەی یاسا کەوا تا ڕادەیێک بەلای دیندارەکانی ئەو سەردەمەوە جێی گومان لێ کردن بوە چونکە بە کوتەکی دەستی حکومەت زانراوە. زۆر جارانیش حوکمی یاسا لەگەڵ ڕاستە حوکمی ئایین جووت نەڕۆییشتوە کە ئەمە جارێکی تریش لەبەر چاوی دینداراندا ناحەزی کردوە.

من نامەوێ لێرەدا بێلزوم بە دوا لێکۆڵینەوەی باری «یاسا و دەرەبەگایەتی»ی سەردەمی عوسمانلیی بکەوم کە دەزانم تین و تاوێکی بەرچاوی بۆ دڵ و دەروونی حاجی نەهێناوە بە بەڵگەی ئەوە کە سەردەمی عوسمانلیی دوشمنایەتیی دەرەبەگایەتییان نەکردوە بە ئامانج تاکوو بکەوینە سەر باری لێکدانەوەی ئاکامی ئەو دوشمنایەتیە لە بیروڕای حاجی قادردا وەیا خەریک بین هاندان و تیژ کردنی غەزەبی حاجی قادر دژی دەبەگ لەو یاسایانەدا دەرخەین. بە پاڵپشتی کردنی ئەم بۆچوونەم دەڵێم وەزعی عەشیرەتی شتێکی سەلمێنراو بوە تەنانەت لەم عیراقەی خۆماندا تا ساڵانی دوای شۆڕشی تەمموز «نظام دعاوى العشائر» پێڕەوی دەکرا و مەحکەمەی بۆ دادەندرا. (سەیر لەوەدایە من بۆ خۆم کە شارنشین بووم و وەزیفەی حاکمایەتیم دیتبوو، بووشبووم بە نائیب کەچی لە حوکمی ئەم نیزامەی عەشائیریی ڕزگار نەبووم و بەپێی ماددەکانی جارێکیان پێش شۆڕشی تەمموز حەبس کرام).

من نامەوێ بڵێم یاسای دەوری عوسمانلییەکان بۆ خزمەتی عەشیرەت و دەرەبەگ دادەندرا چونکە ئەمە نە ڕاستە و نە دەشبوو ڕاست بێ. حکومەتی مەرکەزی عوسمانلی مەبەستی هەرە گەورەی خۆپاراستن بوە و هەرگیز نەیویستوە دەرەبەگ بکات بە هاوبەشی حوکم، بە تایبەتی دەرەبەگی کورد کە هەر بەجارێ ڕێی هاوبەشیی حوکمی لێ بەستراوە، هەر نەختێک دواتریش تووشی باس کردنی ئەم لایەنە دەبینەوە.

کورتەی قسە لە بارەی «یاسا و دەرەبەگایەتی» ی زمانی عوسمانلی ئەوەیە کەوا هەرگیز تەئسیرێکی هاندەرانەی نەبوە بە نیسبەت دڵ و دەروون و بیروڕای حاجی قادرەوە.

دەمێنێتەوە تین و تاوی بڕیارەکانی شەریعەت. قسە لە هەڵوەستی ئایین بەرانبەر دەرەبەگایەتی و سەرمایەداری و داد و ستەم و چینەکان و ڕەگەزەکان و دینەکانی غەیری ئیسلام و دیاردەکانی کۆمەڵایەتیی عەرەب و غەیری عەرەب و چەندین مەسەلەی تر کە لە جغزی حوکمی ئاییندان دەریاییێکی بێ کنار و بێ قەرارە و صەد کەشتیی نووسەرانی تێدا غەرق دەبێت. من لێرەدا نە لزوم دەبینم نە مەودا دەبینم بۆ چوونە ناو ئەو دەریایەوە، بەڵام چونکە بێدەنگیی تەواو لە ئیمکاندا نیە ئەوەندە دەڵێم فکرەی «داد» لە ئیسلامدا لەسەر بناغەی «چینایەتی» هەڵنەستاوە تاکوو بێین لە جیاتی حاجی قادر بە درەنگەکاتەوە دەرەبەگایەتیی زەویداری بخەینە بەر تیشکی ئایینەوە و بزانین ئاخۆ دەبێ خۆشبویسترێ وەیاخود ڕقی لێهەڵبگیرێ.

بێگومان ئیسلام دەوڵەمەندێکی نویژکەری خۆشتردەوێ لە هەژارێکی نوێژنەکەر بەڵام گومان لەوەشدا نیە کە پتر لەسەر هەژار دەکاتەوە تا دەوڵەمەند هەرچەند لەسەر کردنەوەکە لە نوقتەی «دژایەتیی دەوڵەمەند»ەوە سەری هەڵنەداوە چونکە ئیسلام سەربە چین بوون و سەربە ڕەگەز بوونی نەکردوە بە تاوان. لە هەمان کاتیشدا ئەمەی لە خۆی نەکردوە بە ئامانج دەوڵەمەند و زەویدار و دەرەبەگ هەتا قافی قیامەت دەبێ ئیمتیازەکەیان هەر بمێنێ چونکە مەعلوومە سوودی گشتی بەپێی کات و بار لە چدا بێت ئیسلام ئەوە بە یاسا دادەنێت و لە ڕێی مەبدەئی وەک «استحسان» و «المصالح المرسلة» وە چی پێویست بێ لە گۆڕینی باری قانوونی «سوودی تایبەتی و گشتی» ئەوە دەکات و لە مێژوودا کردوەتی.

کورتەیێکی یەکجار کورتەی قسە ئەوەیە، حاجی قادر لە ڕاگەیاندنەکانی ئایینەوە بەرەو دوشمنایەتی زەویدار و دەرەبەگ و سەرەک عەشیرەت و دەوڵەمەند نەچوە چونکە لە نێوان ڕاستە شەقامەکانی ئەو مەزهەبانەی کە لە ئایینیان هەڵێنجاوە هیچیان بەرەو «چینایەتی» نەڕۆیشتون و هەمویان فکرەی دادیان داوەتەوە بە ڕەفتاری «تاک» کە لەبەر تیشکی فەرمانەکانی شەریعەت ڕابگیرێت. خۆ ئەگەر ئێمە ئەو قسە سادەیە بسەلمێنین کە دەڵێ یاسا بۆ سوودی چینی دەسەڵاتدار دادەندرێت دەبێ چاوەنۆڕبین مەزهەبەکانی ئیسلام پشتگیریی لە دەوڵەمەند و

دەرەبەگ بکەن چونکە ئەوان بەر لە هەزار ساڵ دەسەڵاتدار بوون، کە مەعلوومە ئیسلام ئەوەندەی لە ئیمکاندا بووبێت خەریکی پاراستنی مافی هەژار و بێدەسەڵات بوە. تەنانەت ئایەتی قورئان لە شوێنێکدا گلەیی لە پێغەمبەر (د) دەکات کە گوێی لە کوێرێکی هەژار نەگرتوە و ڕووی وتووێژی لە کۆمەڵێکی خاوەن وەجاهەت کردوە

«بسم الله الرحمان الرحیم. عبس وتولی. ان جاءە الاعمی. وما یدریک لعله یزکی. او یذکر فتنفعه الذکری. اما من استغنی. فانت له تصدی. وما علیک الا یزکی. واما من جاءک یسعی. وهو یخشی. فانت عنه تلهی».

من لەم باسەی سەر بە لایەنی دینەوە تەنها ئەوەندەم مەبەسە ڕوون بێتەوە ئایا لە شەریعەتدا هیچی وەها هەیە خاوەن بیروڕاییێکی مسڵمانی صەد ساڵ پێش ئیمڕۆ ڕاستەوخۆ بخاتە سەر دوشمنایەتیی یەکێک لەو تاقمە کۆمەڵایەتییانەی بە زاراوەی نوێ پێی دەگوترێ «چین»؟ بەڕاستی ئەم هەوڵە لە منەوە وەک «تحصیل حاصل» وایە چونکە ئەگەر شتێکی وەها هەبوویایە حاجی قادر، بەر لە ئەویش صەدان لە زاناکانی ئایین بەپێی فەرمانی شەریعەت دوشمنایەتیی ئەو چینەیان دەگرتە بەر هەر وەک لە نووسینی هەموویان فەرمانی «جهاد» لێی کۆڵراوەتەوە و بە درێژیی هەموو لایەنێکی ڕوون کراوەتەوە، تەنانەت دەسکەوتەکەشی بەپێی بڕیاری ئایەتەکانی سەر بە «جیهاد» ەوە نەخشەی دابەش کردنی کێشراوە، بێگومان شەریعەتی ئیسلام یاسای بێکەلەبەری داناوە بۆ هەموو ئەو شتانەی کە بەلای ئەوەوە چاکن یا خراپن. یەکێک لە ڕۆشنبیرانی سەردەمی نوێ بتوانێ دەریا دەریای کتێبی شەریعەت بخوێنێتەوە کە بەوپەڕی وردی و بەرینی و قووڵییەوە لە هەموو سەروبەرێکی ئادەمیزاد دواوە لەو لایەنانەوە کە بەپێی باوەڕی ئیسلام جێی خۆیەتی یاسای بۆ دابندرێ، سەری لەوەدا سوڕدەمێنێ کە ئەم هەموو وردەکارییە چۆن کراوە و لە کوێ ئەم هەموو لێکدانەوە و بەراورد کردنە و دەستووراتە و لێکۆڵینەوە و هەڵێنجانە و پاڵاوتنە هەڵقوڵیوە کە لەتەک ئەودا کەم کاری عەقڵی و قانوونی ئەم سەردەمە خۆی دەنوێنێ.

بێگومان لە سەرتاسەری شەریعەتی ئیسلام بە هەموو سەرچاوەکانی یاسا دانانیەوە، وەک قورئان و حەدیس و قیاس و ئیجماع… تاکە یەک ڕێچکۆڵە بەدەست ناکەوێ ببڕێتەوە بۆ فکرەی چینایەتی تاکوو بە ئومێد بین لە شەریعەتەوە مامۆستایێک پەیدا بێت دوشمنایەتیی دەرەبەگ فێری حاجی قادر بکات. کە ئەمە دەڵێم دوو خاڵی

یەکجار گرنگم هەر لە بیرە دەبێ ڕوونی بکەمەوە نەوەک تەفسیری خراپ و ناحەزانە لە قسەکانم بدرێتەوە:

خاڵی یەکەم ئەوەیە، وسکوتبوونی شەریعەتی ئیسلام لە فکرەی چینایەتی بە هیچ جۆرێک ئەوە ڕاناگەیەنێ کە ئیسلام لە دەستدرێژیی خاوەن دەسەڵات و دەرەبەگ و دەوڵەمەندان وسکت بوە، بە پێچەوانەوە لە هەموو ئەو ڕۆژگارانەدا کە شەریعەتی ئیسلام بە ڕاستی و دروستی لە کاردا بوە هەمیشەکات دادگەی ئیسلام بە یەک چاو سەیری گەورە و گچکە و هەژار و دەوڵەمەند و پاشا و گەدای کردوە تەنانەت یەکێکی وەک «جبلة بن الایهم» کە لە ئیسلامەتی هەڵگەڕایەوە لەوەوە بوو کە نەیتوانی مەبدەئی یەکسانی و بێفەرقیی نێوان مەردم تەحەمول بکات وەک کە خەلیفەی دوەم «عمر إبن الخطاب» پێڕەوی شەریعەتی دەکرد.

بەڕاستی ئەو دادە و یەکسانییەی لە سێبەری شەریعەتی ئیسلامدا بەکارهێنراوە لە ڕووی فەرق نەبوونی نێوان هەژار و دەوڵەمەندەوە لە هیچ ڕژێمێکی ئەم ڕۆژگارە چ ئەوانەی پێیان دەڵێن لیبەراڵ چ ئەوانەی پێیان دەڵێن پرۆلیتاریی بەدی ناکرێت، ئیمکانی بەدی کردنیشی نیە. من ئەمە باوەڕمە و بە سەراحەت دەریدەبڕم هەرچەند مەوداشم نیە لێرەدا بە ئیسپاتی بگەیەنم، بەڵام ڕێی ئەوەم هەیە شتێک بخەمە سەر قسەکانم بەوەدا کە بڵێم ئیسلامەتی بەوەندە ڕانەوەستاوە دادی مەزڵوم لە زاڵم وەرگرێت تا ڕادەی تەسلیم کردنی قاتڵ بەدەستی خوێنگری کوژراو، چونکە جگە لە سزای دنیایی سزای قیامەتیشی نیشان خەڵق داوە کە بەلای ئەهلی ئیمانەوە ئەویان قورسترە. هەڵبەت نابێ بگوترێ ئەم سزایە بایەخی نیە لە ڕووی ئەوەوە ڕژیمە دنیاییەکان باوەڕیان بە قیامەت نەهێناوە، چونکە هەر بیروباوەڕە بەپێی قەناعەتی خۆی، نەک هی غەیری خۆی، سزا و پاداش دادەنێ ئەو خەڵقەی پێڕەویی بیروباوەڕەکەش دەکەن بایەخ بەو سزا و پاداشە دەدەن، نەک سزا و پاداشی عەقیدەیێکی تر بەلایانەوە ڕاست نیە. بە نموونە دەڵێم یەکێک لەو گۆرانیانەی لە بیرەوەریی سالانەی شۆڕشی 23 ی یۆلیەی میسر، ساڵی 1964 بلاوبۆوە ئەم دێڕە شیعرەی خوارەوەی بە توانج دادەنا لە زەمینەی شکاندنەوەی ئەو کەسەی پەرۆشی بۆ سۆشیالیزم نەبوویایە:

یا خاین المسؤولیة!
یا عدیم الاشتراکیة!

مسڵمان بە ڕادەی گەورەیی سزای قیامەتی دیارکراو بۆ گوناهێک، خۆی لەو گوناهە دوور دەخاتەوە.

خاڵی دوەم ئەوەیە، نەبوونی بنگەی چینایەتی لە شەریعەتی ئیسلامدا ئەوە ڕاناگەیەنێ کە بە درێژایی زەمان نابێ بنگەی چینایەتی لە یاسا و پێڕەودا تێبخوێندرێتەوە چونکە دیارە مەبەسی دەستووراتی شەریعەت چاکەی میللەتە، ئیتر دەشێ هەروەک لە سەرەتای ئیسلامەتییدا «... الیتامی والمساکین وإبن السبیل..» پشکی تایبەتیی خۆیان هەبوو لە دەسکەوتی غەزا، بێ ئەوەی هیچ ئەرکێکیان خرابێتە سەر شان لە بری ئەو پشکە. دەشێ یاسا دەرچێ بە چاکەی عەمەلە وەیا فەلاح وەیا بەرە و تاقمی جۆرجۆری تری کۆمەڵ کە سوودی گشتی داخوازی بکات. ئەم هەڵاواردنەی چین و بەرە و تاقمی جۆرجۆری کۆمەڵ بە دانانی یاسا و نیزامی تایبەتی بۆیان، لە سەرانسەری جیهانی ئەمڕۆکەدا دیاردەیێکی بەرچاوە، چ ڕەخنەشی لێ ناگیرێت ئەگەر بە خۆڕایی فەرق و جودایی لە نێوانیاندا نەکرێت وەیا یەکێکیان لەسەر حیسابی ئەوانی تر نەبوژێنرێتەوە. بێگومان نەهێڵان وەیا کەم کردنەوەی تەفاوت لە نێوان دەسکەوتی تاکاندا لە نەزەر ئیسلامدا نەک هەر ڕەوایە بەڵکوو واجبیشە. وا دەزانم ئەوەندە نووسینە بەس بێ بۆ ڕوون کردنەوەی مەبەس.

بنگەی سێیەم، خوێندنەوەی ئەو بیروباوەڕ و نەزەریە نوێیانەیە کە لە شەریعەت و یاساکاندا نادیترێن و واقیعی کۆمەڵایەتیی ناوخۆییش جارێ بەوەڵەدی نەهێناون. بۆ ئیسپات کردنی لایەنی باخەبەربوون و نەبوونی حاجی قادر لە نەزەریە نوێکانی سەر بە کۆمەڵایەتی و ئابووری و ڕامیاری و هونەر و ئەدەب کە لە صەدەی نۆزدەمدا شۆڕشیان بەرپا دەکرد لە ئەورووپادا چ بەڵگەیێکی بەرهەست و ڕۆشنمان لە بەردەستدا نیە بیکەین بە یەکلاخەری پرسیارەکە و کۆتاییهێنی دەمەتەقە. مەبەسیش لە بەڵگەی بەرهەست و ڕۆشن سەرچاوەی دەماودەم و نووسینی بێ شوبهەیە یاخود نا. ئەوەی بتوانین بیکەین بە شایەد و بەڵگە بۆ وەرامدانەوەی پرسیارەکە هەڵبەستەکانی خۆیەتی کە لە واتاکانیانەوە تیشکی پاشخان (خلفیة)ی سەقافەتی حاجی دەدەنەوە. وا دەزانم هەڵبەستەکانی حاجی لەم ڕووەوە هێندە ئاشکرا و بێ قۆرت و پێچ و پەنان کە ئیتر بەبەریانەوە نیە تەئویلان هەڵبگرن مەگەر وەک تەئویلەکانی «إبن الرومي» کە دەڵێن جارێکیان بەبەر دوکانێکدا تێپەڕی هەردوو دەڕابەکانی کرابوونەوە، دەنکە خورمایەکیشی دیت لەسەر ڕێگاکەی کەوتبوو،

ئەویش دەستبەجێ بە ڕێی خۆیدا گەڕایەوە کە لێیان پرسی ئەم گەڕانەوە کوتوپڕەت لە چی بوو؟ گوتی دوو دەڕابەکە وەک شکڵی «لا» بوون دەنکە خورماکەش وەک «تمر» واتە، بە هەردوکیان بوونە «لاتمر» منیش بۆیە گەڕامەوە.

صەراحەتەکانی حاجی قادر لەوانە نین ڕێ بدەن خەیاڵان بۆ واتا و مەبەس و پاشخانی نهێنی و نەپەنی بڕوات کە لەوێوە شتی داپۆشراو ئاشکرا کەین. لە لایەنی دۆزینەوەی شتی نهێنیەوە، ئەم صەراحەتانەی تەنها بۆ دۆزینەوەی نهێنیەکانی نەفسی خۆی، واتە سەرچاوەی هێز و گەورەیی شەخسیەتی حاجی، دەست دەدەن کە ئەگەر بۆ قووڵایی هەرە خواری هەندێک لە بەیتەکانی سەرەژێر نەبینەوە ناتوانین حەقیقەتی حاجی قادر تێبگەین. کە ئەمەش باسێکە جارێ نۆرەی نەهاتوە ئەوەندەش گرنگە ئەگەر ئەنجام نەدرێ حاجی قادر بە نەناسراوی دەمێنێتەوە. لەوە بەولاوە گۆشەیێکی تاریک نیە لە هەڵبەستەکانی حاجیدا کە بتوانین لەسەر مەبەستەکانی بەشەڕ بێین.

دیارە قسەمان لێرەدا لەگەڵ ئەو هەڵبەستانەیە کە لە حاجی بەجێ ماون و بە ئێمە گەیشتون نەک ئەو بەشەی کە سووتێنران و لە ناوچوون چونکە ئەم بەشەیان لە هیچ مەیدانێک و لێکدانەوەیێکدا حیسابی بۆ ناکرێ و لە کەس ناسەلمێندرێ لەو بەشە سووتاوەوە سێبەری گومان بخوازێتەوە بۆ سەر ئەو هەڵبەستانەی کە نەفۆتاون لەو ڕووەوە کە ئایا چی لە حاجی بەجێ ماوە بیروڕای نیهائی بێت یاخود بیروڕای جوداتر و پێشکەوتوتری هەبوە بەڵام سوتاوە، ئەم نەسەلماندنەش لە سێ نوقتەی یەکجار بنجی و بەهێزەوە خۆی دەسەپێنێت:

یەکەم، لەوەدا کە بیروڕایەکانی حاجی سەر بە کۆمەڵایەتی و سیاسی و قەومایەتی و ئایین و زانست و ئەفسانەوە، واتە هەموو ئەو لایەنانەی کە لەوانەبن دەخلێکیان بەسەر «چینایەتی» یەوە هەبێت، ئەوەندە ڕەگ داکوتاو و یەکتر تصدیقکەر و لەگەڵ یەکتردا گونجاون ڕێ نادەن خەیاڵ بۆ ئەوە بڕوات کە وا ڕەنگە بە ڕێکەوت هەر ئەوەندە هەڵبەستانە پارێزرابن کە لەگەڵ یەکتردا ڕێک دەکەون چونکە «ڕێکەوت» سنووری هەیە بۆ قبووڵ کردنی و ناشێ بێ بەڵگە ببێتەوە هۆی گومان کردن لە ڕاستی واقیعێکی ئاشنا و ئاسایی کە سەیر لە بوونیدا نیە.

دووەم، بەوەدا کە نموونەی شیعری پلەی هەرە دوایی ژیانی حاجی، واتە پلەی پیری، لەبەردەستماندا هەیە کە ئیتر مەواد نەهێڵێتەوە بۆ ئیحتیمالی پەیدابوونی گۆڕانێکی گرنگ لە سەقافەتی حاجی قادردا.

سێیەم، لەوەدا کە ئەگەر ڕێ هەبێ لە ناوچوونی بەشێکی شیعرەکانی ببێتە هۆی گومان کردن لەوەی کە شیعرە پارێزراوەکانی نوێنەری بیروڕای دوایەکی حاجی قادر بن، دەبێ ڕێش هەبێ بۆ ئەوەی کە لەناوچوونەکە بکرێتە بەڵگەی ئیحتیمالی بۆ پتەوتربوونی بیروڕاکانی حاجی واتە ئەگەر شیعرە فۆتاوەکانی نەفۆتابن ئەوانیش ئەو بیروڕایانەیان ڕادەگەیاند کە لە شیعرە پارێزراوەکانی دێنە بەر چاو. ئەوەی ڕاستیش بێ ئەم ئیحتیمالە یەکجار بەهێزترە لەوەی تر چونکە چەندین پارچە هەڵبەستی ڕێکوپێکی نەفەس درێژی لەگەڵ یەکتردا گونجاو داخوازی ئەوە دەکەن چی بزربوە درێژە کێشانێکی ئەمانە بن.

بەهەمە حاڵ لێکدانەوەکەمان پەکی لەسەر ئەوە نەکەوتوە ئاخۆ لێمانی دەسەلمێنن شیعرە پارێزراوەکان بەزیادەوە پرسیارەکە بەلای خۆیدا بشکێننەوە چونکە ئەوەندە بەسە لە موقارەنەدا شیعرە پارێزراوەکان گومانە خەیاڵیەکە بەلاوە بنێن و شیعرە فۆتاوەکان لە حیسابان دەرباوێن، ئەمەش کەمترین مافی ئەو شیعرانەیە.

وردبوونەوە و سەرنج گرتنێکی ژیرانە لە هەڵبەستەکانی حاجی تێمان دەگەیەنێ، پاشخانی سەقافەتی حاجی پاشخانێکی ئیسلامی مێشک کراوەیە کە پەندی لە داهێنان و دۆزینەوە زانیستییەکانی ئەورووپای صەدەی نۆزدەم وەرگرتبێت و باوەڕی بە سوود و دروستبوونیان هێنابێت، لە حاڵێکدا دەزانین ژمارەیێکی زۆری پیاوە ئایینیەکانی کورد و غەیری کوردیش صیناعەتی نوێیان بە «بدعة» و شتی بێ شەرعی دادەنا. هەندێک لەوان کە تا ئێستا نموونەیان ماوە دروستکراوی وەک تەلەفۆن و شەمەندەفەر و، دواتریش، ڕادیۆ و تەلەفزیۆنیان حەرام دەکرد لە خەڵق.

شیعرەکانی حاجی هاواریانە لە ئیعجاب بە هونەر و زانستی ئەورووپا بەڵام ئەم ئیعجابە پەکی لەسەر خوێندنەوە نەکەوتوە چونکە دروستکراوەکان بە چاو دەدیترێن و دەست لێ دەدرێن و شتی فکری نین تاکوو بیخەینە بەر تیشکی قەناعەت و دیانەتی حاجی قادرەوە و ڕەوا بوون و نەبوونیان بکەین بە میقیاس بۆ پلەی دوور کەوتنەوەی حاجی لە باوەڕی دینی مێژوویی و میراتی. ئێمە کە نەمانەوێ دەتوانین

له زۆر ڕووەوە سەقافەتی حاجی بە سەقافەتی نوێی ئەورووپای هەڵێنجین، بەڵام لزوم نابینم بەراورد کردنەکە بە خۆڕایی درێژ بێتەوە چونکە تاڕادەیێک مەسەلەکە لە خۆوە ئاشکرایە لێرەوەش بەدواوە بەدەم شی کردنەوەوە ئاشکراتر دەبێت، لەبەر ئەمە تا یەک نموونە دەهێنمەوە لە هەڵبەستەکانی حاجی بەرانبەر دیاردە کۆمەڵایەتیەکانی کە لە صەدەی نۆزدەمدا بابەتی پێوە خەریکبوونی نوێخوازەکانیی ئەورووپا بوە. نموونەکە بیروڕای حاجی قادرە لە ئاست مافێکی گرنگی ئافرەتدا، ئەویش مافی خوێندن و ڕۆشنیرییە. حاجی قادر دەڵێ:

بۆچی فەرمویەتی ڕەسولی ئەمین
اطلبوا العلم[117] ولو بالصين

نێر و مێ لەم حەدیسە فەرقی نیە
گەر مەلا نەهیی فەرموو دینی نیە

حاجی قادر لە کولانەی تێوەڕامانی ئایینەوە سەیری مافی خوێندنی ئافرەت دەکات نەک بیروڕای فەیلەسوفەکانی ئەوسای ئەورووپاوە بۆی دەڕوات، لەوەش بەولاوە باسی تری بارەکانی ئافرەت ناکات لەوانەی ئەوسا نوێخوازانی ئەورووپا لێی دەدوان، وەک مافی سیاسی، لەوەش بێدەنگە ئایا چاو بگێڕێتەوە بە مەسەلەی مارەبڕینی کیژ بە منداڵی وەیا مارە کردنی زیاتر لە ژنێک وەیا دانانی پشکێکی هاوچوونی پشکی نێرینە بۆ مێینە لە میراتدا وەیا قبووڵ کردنی شایەدی ئافرەت وەک هی پیاو[118]...

---

[117] لە بەشێکی ڕابردووی ئەم نووسینەدا باسی چۆنیەتی لابردنی لەنگیی ئەم دێڕە شیعرە کراوە.

[118] باشترین و نوێخوازترین سەرچاوە لە مەسەلەی شایەدی ئافرەت کتێبەکەی مامۆستا «نظام الدين عبدالحميد» ە کە بریتییە لە سیپارەی ماجیستێر لە 507 لاپەڕەییێکدا بە ناونیشانی «جناية القتل العمد في الشريعة الاسلامية والقانون الوضعي» و پلەی «امتياز» ی تێدا وەرگرتوە. لە لاپەڕە 144 تا لاپەڕە 161 ی ئەم کتێبە لەسەر شەهادەتی ئافرەت دەڕوات و بیروڕای زانا گەورەکانی ئیسلامی تێدا هێناونەوە وەک «إبن القيم» و «إبن تيمية» و «إبن حزم» کە هەموویان شایەدی ئافرەتیان وەک هی پیاو حیساب کردوە بە پێی ئەو بەڵگانەی لە کتێبەکەدا باسیان

که بە شیعر لێیان بێدەنگە هیچ فەتوای شەرعیشمان لە حاجییەوە پێ نەگەیشتوە بیروڕای ئەومان بۆ ڕوون کاتەوە لە بارەیانەوە وەک کە لە مەلای گەورەوە فەتوا بەجێ ماوە (بەتایبەتی مارەبڕینی کیژی منداڵ و قبووڵ کردنی شایەدی ئافرەت...) دەتوانین بە مێشکێکی حەسایەوە بڕیار بدەین لەسەر ئەوە کە بێدەنگبوونی حاجی لەم مەسەلانە دەگەڕێتەوە بۆ بەرچاو نەبوونی حوکمێکی شەرعی بێ خیلاف کە دەست بدات لەگەڵ پەلەپەل و خێرایی شیعر بێژیدا بە ڕاشکاوی بکرێتە بنگەی دەربڕینی ڕایەکی لاسایی نەکەرەوە. کە ئەم حوکمە شەرعییە بێخیلافەی نەدۆزیوەتەوە لە خۆشی ڕانەدیتوە وەک «المجتهد فی المسألة» ڕایەکی سەربەخۆ لە سەرچاوەکانی ئیجتهاد هەڵێنجێت وەیا بکەوێتە سەر تەرجیحی ڕایەکی نامەشوور بە تایبەتی کە جارێ ئەم تەرزە پرسیارانە نەبووبوونە گیروگرفت لە پێش هەنگاوی بەرەوپێش چوونی کۆمەڵایەتی وەیا مافی نەتەوایەتیی کورد یەکی لەسەریان کەوتبێ بەپێچەوانە مەسەلەی «علم» کە بەلای حاجی قادرەوە لەو ڕۆژگارەدا دوو کەلێنی گەورەی پڕ دەکردەوە. یەکەم خەباتی قەومایەتی دەوڵەمەند دەکرد بە فکر و بەرهەم، دوەم خۆدانەپاڵ دەروێشی و تەنبەڵی و ئەفسانە و کاری بێسوودی دەپووچاندەوە.

ئەم دیاردانەی فکرەی«چینایەتی» لە هەڵبەستەکانی حاجی قادردا زۆر بە ڕوونی ڕادەگەیەنێ کە ئەو نووسینەکانی «مارکس» ی نەخوێندۆتەوە، چونکە هەروەک پێڕەوی کردنێکی بیروڕایەکانی «مارکس» لەو هەڵبەستانەدا پەیدا نیە هەروەها بەگژداچونەوەی ئەو بیروڕایەنەشیان تێدا نابێ، واتە نە ڕواڵەتی ئەرێتی و نە ڕواڵەتی نەرێتی دەنگدانەوەی بیروڕاکان لەو هەڵبەستانەدا هەیە کە ئیتر ڕێگەی سێیەم پەیدا نابێت بۆ تێخوێندنەوەی ئیحتیمالان. کە ئەمە دەڵێم هەر لەبەر چاومە لەوانەیە بگوترێ ئیحتیمالی سێیەم ئەوەیە حاجی نووسینەکانی خوێندبێتەوە بەڵام لە هەڵبەستدا بە چاک و خراپ ئیشارەی بۆ نەکردبن، خۆ ئەگەر کەسیش ئەم قسەیەی بە بیردا نەیەت وا لێرەدا بۆ خۆم هێنامە ناو نووسینەوە.

---

کراوە. من ئاگاداری هەندێ فەتوای باوکمم کە شایەدی ئافرەتی وەک هی پیاو حیساب دەکرد لەو مەسەلانەدا کە بەر ئایەتی «ان تضل احداهما فتذکر احداهما الاخری» ناکەوێتە، هەر ئەمەیشە ڕایەکەی «إبن تیمیة».

بەڕاستی ئەم ئیحتیماله وەک نەبێ وایە، چونکە مومکین نیە حاجی قادر نووسینی وەها پڕ جورئەت بخوێنێتەوە و هیچ حیسابێکی بەهیچ لایەکدا بۆ نەکات، با لەوە هەر بگەڕێین کە وا نووسینەکانی «مارکس» لە وڵاتی عوسمانلی و بە زمانێکی حاجی قادر تێبگات جارێ بە شێوەیێکی قانونی بڵاو نەکرابوونەوە تاکوو حاجی و مرۆڤی وەک ئەو دەستیان پێیان بگات، خۆ ناشێ فکرمان بۆ ئەوە بڕوا کە حاجی لە ڕێی پەخشی نهێنیی «نشرة سرية» وە نووسینی ئەوتۆیی خوێندبێتەوە. لەو سەردەمانەدا کە حاجی لە ئەستەمبۆڵی بەسەردەبرد ئەو نووسینانە دەخوێندرانەوە کە لە ڕێی چاپەوە بڵاودەکرانەوە، چاپیش بە فەرمان و ڕالێبوونی حکومەت نەبوویایە نەدەکرا. لەو ڕۆژگارەدا هەرچی نووسینێکی بێنی شۆڕش وەیا ڕامیارییێکی بە جورئەت وەیا ئیلحادی لێ هاتبایە بەر یاساغ کردن دەکەت و بڵاونەدەبۆوە، تەنانەت نووسینی مەلا ئازادبییرەکانیش یاساغ دەکرا کە هەمووی ئایین و باوەڕی پاک و ئازادبوون. حاجی قادر نەک هەر مەرحەبای لە نووسینی مولحیدانە نەکردوە، بگرە گاڵتەی بە هەندێ زمانی میللەتی غەیری مسڵمانیش کردوە کە وا بوە لەلایەن نووسەری ئەم سەردەمە لە حاجی بە عەیب گیراوە.

خولاسە چەندێکی بمانەوێ خەریک بین پاشخانێکی سەقافەتی سەر بە شۆڕش و سەر بە ئیلحادی ئەورووپای صەدەی نۆزدەم وەیا پێشوتر لە هەڵبەستەکانی حاجی قادردا بدۆزینەوە دەستمان لە هیچ پنچکێک گیر نابێت، هەر ئەمەیشە کە وا لەگەڵ نەبوونی فکرەی «چینایەتی» لە هەڵبەستەکاندا ڕێک دەکەوێت.

شتێکی ئاشکرایە فکرەی «چینایەتی» لە شیعری شاعیرەکانی دوای حاجی قادریش زۆر بە درەنگەوە سەری هەڵدا. بەرلەوەی بزووتنەوەی ڕامیاریی سەر بە چینایەتی لە نێو کوردانداً پەیدابێت نەمبیستوە هیچ شاعیرێکی کورد دەنگی یەکێک لە چینەکانی بەتایبەتی بەرز کردبێتەوە، کە لە شیعردا «چینایەتی» بەدی نەکراوە لە پەخشانیش هەر نەدیتراوە، خۆ ئەوەی ڕاستی بێ ئەگەر شاعیرێک وەیا نووسەرێک لە نێوان دەیان شاعیران و نووسەراندا بە هۆی سەقافەتێکی تایبەتیەوە کە بۆی ڕێک کەوتوە فکرەی چینایەتیشی بەکارهێنابێت هەر ئیسپاتی ئەوە دەکات کە مومکینە مرۆڤ لە سەقافەتی دەرەوە سوودمەند بێت هەروەک دەزانین حاجی قادر لە دەوروبەری نوێ و پێشکەوتووی ئەستەمبۆڵدا گەیشت بە فکرەی «قەومایەتیی».

لەو حاڵەدا تاکە نموونەی فکری پێشکەتوو دەبێتە زەنگی ڕەسەنی خەبەردار کردنەوەی میللەتێک کە نموونەکە لە دەوروبەری خۆوڵاتییدا فکرەکەی وەرگرتبێ نەک لە مامۆستای بێگانە و دەوروبەری دورەوەی بە دیاری هێنابێت کە ئەوسا لە نێوان میللەتەکەیدا دەنگ ناداتەوە، واش دەبێ بەسەر لێوی خاوەنەکەیەوە وشک دەبێ. سەیری، پەیامەکانی حاجی قادر کە وتووێژی لەگەڵ پۆرگی بەخۆنازینی ناو هەناوی میللەتەکەشی بوو نەیتوانی لەو سەردەمە ناکاملەدا کار بکاتە سەر دڵ و مێشکیان و چەندین ساڵ دوای مەرگی خۆشی هەر کپ مایەوە.

دیار نەدانی فکرەی چینایەتی لە شیعری شاعیرانی کورد کە چەندین ساڵ پاش حاجی قادر هاتن دیاردەیێکی گشتییە شیعری هەموو شاعیرەکانی کورد دەگرێتەوە، چ ئەوانەی لە گۆشە نیگای ڕومانسییەوە بە «بووکەشووشە» ی کوردایەتییان هەڵگوتوە، وەک زۆربەی شاعیرە قەومییەکان. چ ئەوانەی بیروباوەڕی کوردایەتییان لەسەر بنگەی کۆمەڵایەتییەوە هەڵستاندوە وەک مەلای گەورە کە خۆی درێژە کێشانەوەی بەرەوپێش چووی شەخسیەتی حاجی قادرە و لە شیعری هەردوویاندا زۆر گۆشەنیگای سەربە کۆمەڵایەتی و گوزەران و باری ژیان و واقیع یەکجار ئاشکرایە وەک لەم یەک دوو نموونە بچکۆلەی هەردوویان دەردەکەوێت:
حاجی دەڵێ:

بەڵێ وایە لە ئەلزەمی ئەشیا
ئەوەلا خواردنە دوەم سووکنا

سێیەمین سەتری عەورەتە ئینجا
مەشغەلەی لااله الا الله

دیسان دەڵێ:

تۆ وەرە فێری فەن بە چیتە لەوە
گاورە هیندووە وەیانە جووە

لازمە خول بخۆی وەکو بەرداش
هەمو قەرنێک دەگۆڕێ ئەمری مەعاش

تەمبەڵیی کاری حیز و بێ خێرە
دەستی ماندوو لەسەر زگی تێرە

ئەمەش نموونەییێکی تر لە شیعری کۆمەڵایەتیی حاجی:

کە دەیگوت پیرم و من دەستگیرم
لە لام وابوو لەبەر جەهل و جەوانی

کە پیر بوم تێگەییشتم دەستی گرتم
لە کەسب و کار و تەحصیلی مەعانی
بەڵێ شێخ قطبە ئەمما قطبی ئاشە
بە ئاو و نیعمەتی خەلقە گەڕانی

ئەمانەش نموونەکانی شیعری مەلای گەورەن:

بۆ خۆتان سەعی بکەن نانێکو بێتەدەستی
ئینسانی میعدە خاڵی ناو زگی ڕاناوەستی

شێخ ئەفەندی بترسە سا لە خوا
میللەتی قوڕبەسەر چ حاڵی نەما

هەرکەسێ ماڵی خۆی هبەی تۆ کرد
عاقیبەت خۆڵ بەسەر لە برسان مرد

ڕەحمەکت قەت نەکرد بە منداڵی
خەبەرێکت نەبوو لە ئەحواڵی

ژنەکەی دەربەدەر بوو چەند ساڵان
تاکوو فۆتا لە ڕۆخی ڕەشماڵان

تۆ بەهەشتت فرۆشت بە بستێ عارد
ئەو ئەوا ڕوحی دا بە مستێ ئارد

به خۆت ئەحواڵی لادێ چاک دەزانی
یەکی جوتیار یەکێکی بەرخەوانە

فلاّن ئاودێرە ئەویان عارد دەکێڵێ
شوانە ئەم ئەوی تریان سەپانە

خەریکی کاروبار و جوت و شۆنە
لە فێڵی فێڵکەران نا شارەزانە

بە زگێ تێر بە دوو زگان برسی
هیچ لە چاکە و خراپە ناپرسی

دەبینی لەم نموونانەدا بەیتی وەها هەیە بە جۆرێک خۆی لە باری کۆمەڵایەتی و بەرژەوەندی ژیان نێزیک دەخاتەوە هەر دەڵێی ئێستا شەڕێکی نێوان «خوێنمژ و خوێنمژراو» هەڵدایسێنێت، بەڵام لە سنووری کۆمەڵایەتیی ساکار و ڕاستەڕێی ئایینی پاکی بێ «هویة» ی چینایەتییدا دەمێنێتەوە. ڕەنگە ئەم نموونەیەی خوارەوە لە شیعری مەلای گەورە نزیکترین هەڵبەستی یەکەم سێیەمی ئەم صەدەیە بێت لە فکرەی «چینایەتی»، شیعرەکەش وەرامدانەوەیێکی ئەو کەسانەیە داوایان لە مەلای گەورە کرد فتواییێک دەرچوێنێت بۆ ئەوەی حەیوانێکی ئاغاکان و سەرۆکەکان لە خاوەن مەڕانی دەستێنن بە زەکاتی شەرعی حیساب بکرێ:

زەکاتی مەڕ و بزن بۆ ظالمەکانی مەزن
مەلاش دەستی خۆی گەزن سەیری ئەوێ سەیرانێ

زەکات لە بۆ ڕەئیسان یا بۆ دەستەی ئیبلیسان
مەلاش بمرێ لە برسان سەیری ئەوێ سەیرانێ

بەڕاستی و بێگومان هەموو شیعری کوردی بەر لە پەیدابوونی حیزبە «چینپەروەر»ەکان لە کوردستاندا لە گۆشە نیگای دادپەوەری و فەرمانی ئایینی پاکەوە بەرەو بەرهەڵستی کردنی کاری بەدەوە ڕۆیشتون، ئەویش دیاردەیێکە پتر لە

شیعری چەند شاعیرێکی «واقیعی بەپێی سەردەم» ی وەک حاجی قادر بەدی دەکرێت، تەنانەت شاعیرێکی وەک گۆران دوو سێیەکی تەمەنی شاعیریەتی خۆی ڕابوارد بەر لەوەی دەم لە «چینایەتی» بدات، یاخود «دڵدار» کە خەڵقی مەڵبەندی حاجی قادرە و ساڵانی دوایی تەمەنی بەزۆری لە بەغدا و کۆلیجی حقوقدا ڕابوارد، نەکەوتە سەر ڕاڕەوی فکرەی چینایەتی تاکوو بوو بە محامی ئەویش لە ساڵی 1945، پێشتر سەرلەبەری شیعرە سیاسیەکانی خزمی دوور و نێزیکی سروودی «ئەی ڕەقیب» بوون و خۆیشی ئەندامێکی چالاکی پارتی «هیوا» بوو.

ئەمە ڕاستی حاڵی شاعیرەکانە هەرچەند هەوڵی بێوچان دەدرێت بۆ ئیسپات کردنی پێچەوانەی واقیعەکە، هەوڵەکەش هەندێ جاران ژیرانە و گەلێ جاریش یەکجار ساکارانەیە، وەک ئەوەی کە خۆم لە نووسینی ناو گۆڤارەکانی دوای ساڵی 1971 دیتومە شیعری ئاخەلێوەی عومری دڵدار، کە ساڵی 1946 دەگرێتەوە، کراوەتە بەڵگەی بوونی خەباتی چینایەتی لای فەلاحی کورد بەر لە هەزاران ساڵەوە، نووسینی ژیرانەش هەیە بە تەئویلی دوورەدەست و پسپۆڕانە ویستویەتی فکرەی چینایەتی لە شیعرە کۆنەکانی گۆران هەڵێنجێت کە ئەگەر هەر کەسێک ئەو تەرزە تەئویلانە بکاتە ڕارەوی لێکۆڵینەوە دەتوانێ لە فیلمە کارتۆنیەکانی ڕووسیی بڕوا بە دینداری و جادوو و ئەفسانە و دەرەبەگایەتیی ڕەوا و دادپەروەر لە ڕێی صەراحەتیشەوە هەڵگرێتەوە نەک تەئویل بەڵام دیارە ڕاستییە زلەکانی سۆڤێتستان بەو چەند فیلمە کارتۆنییە ناسڕێتەوە هەر وەک چینایەتیش بە تەئویلی دوورەدەست ناخرێتە هەڵبەستە کۆنەکانی «گۆران» ـەوە. بەڵێ، وا دەبێ لە حاڵەتێکی تایبەتیدا خاوەن بیروڕا پەردەی کینایە و تەورییە بەدەوری قسەکانیەوە دەگرێتەوە بەڵام ئەم حاڵەتە شتێک نیە هەڵبەستی کوردیی خۆی تێدا دۆزیبێتەوە چونکە کام صەراحەتە ئەوە بەکارهێنراوە لە مەیدانی شیعری سیاسیدا، نەک بەدرەنگ کاتەوە بەڵکوو لەو ڕۆژەوە کە فکرە سیاسیەکە تێدا بەوەلەد هاتوە[119].

---

[119] «بیستوحەو ساڵ» ـەکەی فایق بێکەس دەهێنمەوە یادی خوێنەر. هەر لەبیریشمە لە ساڵانی دوای 1925 کە لە پلەی سەرەتایی خوێندنمدا بووم و مەلیک فەیسەڵی یەکەم مەلیک بوو، ئێمەی قوتابی ڕیزمان دەبەست و ئەم نەشیدەمان بە دەنگی بڵند و بە ئاهەنگ دەخوێندەوە:

هاتنی قسەی هەژاردۆست وەیا ستەم نەویست لە هەڵبەست و نووسیندا خۆی لە خۆیدا نابێتە بەڵگەی بوونی فکرەی «چینایەتی» لای خاوەنەکەی چونکە بەزەیی بۆ هەژار و ڕق هەڵ گرتن لە ستەمکار میراتێکی هەزاران ساڵەی مرۆڤە، تەنانەت لەو سەردەمانەدا کە کوشتنی عەبدیش ڕەوا بوو شیعر و گوتەی دادپەروەرانە هەر هەبوون و بەپێی سەردەمەکەیان ڕاستیشیان دەکرد بەڵام هەرگیز «چینایەتی»یان لێ نافامرێتەوە.

بۆ ئەوەی لایەنی چینایەتی لە قسەی هەژاردۆستدا ببێتە فەلسەفەیێکی کۆمەڵایەتی سەر بە چینی هەژار و چەوسێنرانەوە، دەبێ لەو قسەیەدا داوێکی پێوەندیی بەرژەوەندی گشتی و هاوکۆیی نێوان هەژاران دژی خوێنمژ و ستەمکاران پاڵەپەستۆی هەموو چینەکە بدات بەرەو ئامانجێک دەنا قسەکە دەبێتە دەنگدانەوەیێکی عەفویی هەستی دادپەروەریی کە ڕاستەوخۆ مەیلی ساکاری خاوەنەکەی بەلای هەژار و ستەملێکراودا دەشکێنێتەوە.

سرنج لە قسە زۆر مەشووورە نرخدارە جوانمەردانەکەی خەلیفەی دوەم «عمر بن الخطاب« بگرە کە گوتی «کیف استعبدتم الناس وقد ولدتهم أمهاتهم احرارا»!! چەند بە صەراحەت و بە شێوەیێکی دلێرانە و دڵگەرمانە دژی بەندایەتییە، لەگەڵ ئەمەشدا کەس ناتوانێ بڵێ قسەکە لە هەستێکی «چینایەتی»یەوە هەڵستاوە چونکە زۆر ئاشکرایە ئەم قسەیە و گەلێک ئاکار و کرداری تری خەلیفە عومەر بەرەو پێشبردنی فکرە و بنگەی دادپەروەریی ئیسلامەتییە لە چارچێوەی کۆمەڵایەتیی ئەوسای بەرەو گۆڕاندا، وەک کە دێت و لە ساڵی قاتوقڕییدا فەرمانی دەست بڕینی[120] دز دەوەستێنێت هەرچەند لە قورئانیشدا ئەو فەرمانە بە صەریحی ئایەت فەرموراوە.

---

شێخ مەحموود مەلیکی کوردستان
جەنگاوەریی کورد بوو بە داستان

[120] لە لاپەڕە 81 ی کتێبەکەی «چەپکێک لە گوڵزاری نالی» بە سەهوو نووسراوە «حد»ی دزیەتیی 80 دارە کە ڕاستییەکەی ئەمە حەددی سەرخۆشییە.

بێگومان هەڵوەست و بیروڕاکانی «أبو ذر الغفاري» کە دادخوازیی ئەوسایان لێوەتەنگ دەهات، ئەوانیش هەر زادەی دەروونێکی دڵسۆزی هەژاردۆستی ستەمنەویستن کە پشت ئەستور بێ بە فەلسەفەی قورئان و حەدیسە، لە گوڕی تازەداهاتناندا، واتە لە ڕووبەڕووبوونی دوو چینی بەیەکتر دوشمنەوە، ئەو بیروڕایانە زەنەیان نەکردوە چونکە «أبو ذر» هەرگیز لەو باوەڕەدا نەبوە کە یاسا و دەستووراتی قورئان بۆ سوودی لایەنێک و زەرەری لایەنێکی تر سازدراون کە دەزانین، «أبو ذر»یش دەیزانی، پەیامی ئیسلام بۆ هەموو مرۆڤە نەک بەرە و تاقمێک. تاکە شتێک هەبووبێ لە نەزەر ئیسلامدا مرۆڤێک لە یەکێکی تر بە تەواویی جوداکاتەوە تەنها «ایمان» بوە، بە دوا ئیمانیشدا پلەی خواروژوور بەپێی «تقوی» بۆ تاکان دیار دەکرا بەپێی ئایەتی «إن أکرمکم عند الله أتقاکم».

ئێمە چەندێکی خۆمان قووڵ بکەینەوە بۆ بنج و بناوانی فەلسەفەی ئیسلام بە نیازی وەدەست هێنانی بنگەییێکی فکری کە یەکێکی ئازادیخوازیی وەک حاجی قادر بەرەو خۆدانەپاڵ «چین» ببات دەستمان بە شتێک ناگات جگە لە فکرەی «داد»ی ئیسلامی. مەعلوومیشمان کرد و بە هەموو لێکدانەوەیێکی کورت و درێژیش مەعلووم دەکرێ، کە داد لە ئیسلامدا بە ڕەنگ و زمان و چین و نژاد و باب و باپیر و شتی ئەوتۆوە نەبەستراوە، لەبەر ئەمە چەندێکی خەریک بین لە لایەنی ئیسلامەتی حاجی قادرەوە فکرەی «چینایەتی» لە هەڵەستەکانیی حاجی بدۆزینەوە هەر بە دەوری خۆماندا دەسووڕێینەوە بۆ ئەو سەرشارەی کە لە سەرەتاوە لێی کەوتینە بزووتنەوەوە، ئەویش سەرشاری ئیمان و ئەو مەفهومانەیە کە لەوەوە وەردەگیرێن.

من کە خوێنەر ماندوو دەکەم بەو گەشتە دوور و درێژانەی هەر جارە لە کوتانەوەی باسەکاندا پێی دەکەم، دەمەوێ لە ئاست پرسیارەکانی ناو باسەکەدا وەرامی وەهای بەدەستەوە بدەم کە بەپێی قەناعەتی خۆم بایی ئیسپات کردنی بیروڕایەکانم بکات کە دەزانم زۆر جاران بیروڕای پەرەوەسەندوو بە هەڵە

دەردەچوێنێت، لەمەشدا ڕێی تێدەچێ زۆر لایەنان لە خۆی بەدەنگ بێنێت[121]. بە تەماش نیم ڕۆژەک لە ڕۆژان بکەومە سەر وەرامدانەوەی ڕەخنە و ئیعتیرازان مەگەر هەر بە جارێ چارم ناچار بێت. لەبەر ئەمە پێویستە لە پێشەوە چی بە بەڵگەی ڕاستبوونی بیروڕاکانی خۆم بزانم ئەوە بنووسم تاکوو لە دوارۆژدا لە جیاتی من وەرامی ڕەخنەگر بداتەوە، خو ئەگەر ڕەخنەکەش هەڵەی منی دۆزیبۆوە ئەوساش ڕەخنەکە لە شێوەیێکی وەها بەهێزدا دەبێت کە ببێتە ڕاستکەرەوەی بیروڕایەکی درێژە پێدراو و بەڵگە بۆ هێنرایەوە نەک یەکێکی قوت و قرتاو کە بە درۆخستنەوەی نابێتە بەهێزبوون وەیا ڕاستبوونی ڕەخنەکە.

ئێستا دەگەڕێمەوە بۆ بنگەی یەکەمی ئەو سێ بنگەیەی کە گوتم واقیعی فرەوان پێک دێنن بە بنسبەت حاجی قادر لە ئاست دەرەبەگایەتیی کورددا، ئەویش «چەند و چۆنیی دەرەبەگایەتیەکەیە لەو زەرف و کاتەدا کە تێیدا هەڵدەسەنگێندرێت» دیارە زەرف و کاتەکەش هی سەردەمی حاجی قادرە چونکە ئێمە هەڵوەستی ئەو دەنرخێنین، نەک هی کوردێکی ئەم سەردەمە.

لەوەی تا ئێستا گوتومانە تاڕادەییێک ئەو زەرف و کات و هەڵوەستەی حاجی و شاعیرەکانی کوردی دوا ئەویش ڕوون کراوەتەوە، ڕەنگە بەلای هەندێ خوێندەواری بەپەلەوە چی لێرە بە پێشەوە گوترا و شیکراوەیەوە بایی مەبەست بکات وەیا لێشی زیاد بێت بەڵام بەلای خۆمەوە چی ماوەتەوە لە باسەکە هی ئەوە نیە پشتگوێ بخرێت چونکە وەک پێبەپێ دەردەکەوێت لێکدانەوە و ڕاستییێکی لێرە بەدواوە دێتە ناو نووسینەوە ئەوەندە بنجین بە نیسبەت باسەکە و بە نیسبەت واقیعیشەوە کە ئەگەر خۆمی لێ بدزمەوە بەشێکی گەورەی هێزی نووسینەکە تێ دەچێ کەوا ڕەنگە بە تێچوونی کەلەبەری هەموارتر و ئاسانتریش دەست ئەو ڕەخنەگرە بکەوێت کە بیەوێ لە هەموو حاڵ و باریکدا هەر ڕەخنەگر بێت، خۆ ئەگەر ئەم تێبینییەش لە بەیندا نەبێ نووسین تاکوو بێ کەموکەسر بێت نرخی پتر دەبێت پتریش لە قەناعەتی خوێنەر نزیک دەبێتەوە.

---

[121] ئەم پێش بینییە کە لە ساڵی 1972- دا کراوە وردە وردە بەڵگەی ڕاست بوونی پەیدا دەبێت. لە پێشەکیی ئەم بەرگەدا وەرامی ڕەخنەیێکم داوەتەوە کە بەلامەوە بەحورمەت بوو، ساڵی بڵاوبوونەوەی ڕەخنەکەش جێی گومان لێ کردن نەبوو.

ئەم بێدەنگبوونەی ئەدیب و شاعیر و مەلاکانی کورد لە براگەورە و سەردار عەشیرەت و خاوەن زەوی و ئەوانەی پێیان دەڵێن دەرەبەگ بەدرێژایی عومری شیعر و ئەدەب و مەلایەتیی کورد بەر لە پەیدابوونی ڕێکخراوی سیاسی سەر بە چینایەتی، دیاردەیێکی ڕێکەوت نیە، لە ئەنجامی پلانگێڕی و پیاو خراپی و بەکرێگیراوییش نیە، دیارییێکی لەلاوە هێنراوی داگیرکەر و ئیمپریالیزم و چەوسێنەرەوانیش نیە، ئەنجامی چاوسوور کردنەوە و هەڕەشە لێ کردن و تۆقاندنیش نیە چونکە هیچ یەکێک لەو هۆیانە کە وا من لە خەیاڵەوە دەیانخوازمەوە بایی ئەوە ناکەن بۆ ماوەی صەدان ساڵ، هەزاران مەلا و شاعیر و ئەدیبی کورد بێدەنگ بکەن لە حاڵێکدا هی وەهایان تێدا هەڵکەوتوە هەرچی ترس و تەماعی دنیا هەیە بایی زەڕەیێک کاری لە ویژدان و بیروڕا و هەڵوەستی نەکردوە. ئەگەر یەکێکیش بیەوێ گومان لەم قسەیەم بکات با ئەوە بە بیر خۆیدا بهێنێتەوە کە وا ڕەنگە لە نێوان ئەو شۆڕشگێڕانەی خۆی دەیانناسێت جوامێری وەها هەبووبێت سەری بۆ ترس و تەماع دانەنەواندبێت هەرچەند ترس و تەماعەکەش گەلێک لەوە زیاتر بووبێت کە لەسەردەمی ئیبنوئادەمدا بەکاردەهێنران بۆ بێدەنگ کردن.

خۆ خەریک کردن بە دوا دۆزینەوەی هۆی نامەئلووف و تۆژاڵدار بۆ تەفسیری ئەم بێدەنگبوونە بەردەوام و گشتییەی خاوەن بیرانی کورد لە ئاست براگەورە و سەرەک عەشیرەت و زەویداراندا دوورکەوتنەوەیێکی ناواقیعی و بێلزوم و بێسوودیشە لە هەڵکەوتی مێژوویی و کۆمەڵایەتی و پێداویستی بەرژەوەندی گوزەران و بەیەکەوە ژیان و بڕیاری نەریت و داب و دەستووری کوردەوارییە کە لە کۆنەوە وەک تاڤگە بە لێژگەی ڕۆژگاردا هاتۆتە خوارەوە بێ ئەوەی فراژیبوونێکی ئابووری وەیا ڕامیاری وەیا زانستیی نوێ وەیا تێکەڵبوونی چاوکرایەوە لەگەڵ جیهاندا وەیا گۆڕانی باری کەسابەت وەیا هیچ هۆیەک لەوانەی «بیر و بڕیار» ی مرۆڤ دەگۆڕن پێشی تاڤگەکەی گرتبێت و بە ڕووکارێکی تریدا شکاندبێتەوە و کەندڕکی نوێی لە زەمینەی دڵ و دەروون و مێشک و ویژدان و قەناعەتی کۆمەڵدا کردبێتە خوڕگەی «هەڵوەست» ی مێژوویی نەوباو.

کوردەوارییێک کە فەرقێکی ئەوتۆی بە واقیعی کوردستانی صەدەی نۆزدەم نەکردبێت لەگەڵ واقیعی ساڵی 1500، مەگەر فەرقی گۆڕانی داگیرکەر و جۆری وێران کردن و چەندوچۆنی کوشتن و بڕین و لە قوڕنیشتن، ئا ئەم کوردەوارییە لە

کوێوە ئیلهامی هەڵگەڕانەوە لە چارەنووسی خۆی وەرگرێت و بڕیاری گۆڕینی واقیع بخوازێتەوە؟ لە کام فەتوای بەرەو پێش چوون و بەرژەوەند گۆڕان و دەوروبەر هەمواربوون و تەنگوچەڵەمە ڕەوینەوەوە پشت لە ڕابردوە ڕەشەکە و حازرە ڕەشترەکە بکات بەرەو ئافەرۆز کردنی براگەوران و سەرۆک عەشیرەتان و خاوەن تەکیە و خانەقایان و توجاران و ماڵداران؟ کوردێک کە ئەگەر لە خەزێنەی ئیلهاماتی غەیبەوە، بێ هیچ پەک کەوتن لەسەر گۆڕانی کۆمەڵایەتی، کەوتە سەر خولیای ڕیشە هەڵکێشانی «خوێنمژ» ی خۆماڵی و یەکێکیش لە خوێنمژان بەرهەڵستی لێ نەکرد، کە ئەمەی کرد ڕووبەڕووی خوینمژێکی بێ ڕەحمتری دڕندەتری بەهێزتری بێگانە بوو تۆ بڵێ ئەم کوردە چ جۆرە پێوانە و کێشانەی ستەم و داد و سوود و زەرەر و لەسەر خۆ کردنەوە و واقیع گۆڕین و کاری ئەوتۆیی لەبەردەستدا بوو بێت تاکوو ئێمە لەم سەردەمەدا بەڕاشکاوی چەپڵەڕێزانی خەیاڵی بۆ ئەو هەڵمەتانەی بەرپا بکەین کە نەیدەتوانی بیانبات وەیا بیریان لێبکاتەوە!

هەڵبەت لێرەدا مەبەسی من ڕاگرتنی فکری خوێنەری کوردە بەرانبەر بە واقیعە بێفێڵەکەی کە کورد خۆی تێدا دیوەتەوە بەر لەوەی فکری چینایەتی بەناو خەڵقدا بڵاوبێتەوە و لەبەر تیشکی فەلسەفەیێکی نوێدا بیر لە سوود و زیانی خۆی بکاتەوە، دەنا کە بزانین شۆڕشگێڕێکی کوردی ساڵانی دوای 1940 ڕازی بێ هاوبادە و هاومێزی براگەورە و «دەرەبەگ» ی کورد بێت دەبێتە کارێکی غافڵانە لە ئێمەوە بێین هەڵوەستی فەلاح و کاسب و کۆمەڵانی کوردەواریی صەدان ساڵ پێش ئیمڕۆ لە ئاست ئەو براگەورانە و دەرەبەگانەدا بهاوێینە بەر نیگای ڕەخنە و لێڕازییبوون و لێڕازیی نەبوونەوە وەیا ڕاستی و هەڵەیی پێوەندیی حاجی قادر بەوانەوە هەڵسەنگێنین و بەخۆشمان بڵێین زانستدۆست و نیگافرەوان و مێژووناس و کۆمەڵایەتیبین و ئینسافکار و ڕابەی فکری پێشکەوتوو...

ڕق هەڵستاندنی گەنجی کوردی دڵ پاک و بێتەجرەبە لە ڕابردوویێکی مردووی بەسەرچووی کە لە ئیمکاندا نەبوە جێگری هەبێت و شۆڕشگێڕی ئەم سەردەمەش بە برادەرایەتیی واقیعێکی وەک ئەو ڕازیی بووبێت بە تەواویی وەک دادانەوەی پەردەیێکی ڕەش و ئەستوورە بەسەر ڕاستییەکانی مێژوویی و کۆمەڵایەتییدا کە مومکین نەبێت چاوی ڕانەهاتوی گەنجەکانمان لە پەردەکە تێبڕ بکات و ڕاستییەکانی ببینێت ئیتر پێیان نەکرێ خۆیان لەو ڕق هەڵگرتنە نابەجێیە ڕزگار

بکەن و بکەونە سەر ڕێبازی چاوپۆشیی لەو شتانەی ڕق لێبوونەوە هەڵناگرن. ئەوەی پتریش هۆی دڵگرییە لەو ڕق و بوغزەدا ئەوەیە کە گەنجی کورد پشکی هەرە زۆری دوشمنایەتیەکە و ناحەزیەکەی بە ڕابردووی میللەتەکەی خۆی دەبەخشێت نەک بە ڕابردوی تێکڕایی ئادەمیزاد چونکە دەزانم نە لە خوێندنەوەییدا و نە لە بیستنیدا شتی وەهای نابرێتە مێشکیەوە ئەوەندەی ئازا و ئازاد بکات کە بوێرێ ئەو لەعنەتەی لە ڕابردووی کوردی دەکات لە ڕابردووی میللەتانی تریش بکات لە حاڵێکدا میللەتی کورد بەقەدەر حەقخوراوی و لێقەوماوی و چارەڕەشی و دەستبەسەری و بێکیانی و بێنانی و بێ هەموو شتێکی کەمتر ڕەوای لەعنەتە و پتر موحتاجی ڕەحمە. شاعیری دوێنی و پێرێمان کە جارێ فێری سەروبن کردنی جیهان نەبووبوو چەند بە پەرۆش و سۆزی ڕاست و دروست و بێفێڵی کوردایەتی دەیگوت:

قەومی کورد موحتاجی عەطفە چونکە مەحوی کردەوە
زللەیی دەستی حەوادیس لەققەیی دونیایی دوون

من دەزانم و تۆش دەزانیت، ئەو شاعیرە کە باسی زللەیی دەستی حەوادیس و لەققەیی دونیایی دوون دەکات ئەوەندەی کورد بەلاوە مەغدوور و حەقخوراوە چ پێی ناوێ زللە و لەققەکان خورد بکاتەوە و دەست و قاچی زللەوەشێن و شەقوەشێنان نیشانە بکات و ڕومەت و پشتی میللەتی کورد بە ئامانجی شەق و زللە نیشان بدات و بڵێ ئەمەتە شەخسی شەق و زللە وەشێن و ئەمەتەش شوێنە ئاوساوەکانی لەشی کورد. ئەم شاعیرە، بە پێچەوانەی ڕقهەڵ گرتنی خوێندەوارێکی نەوباوی کورد لە ڕابردووی کورد، هەموو ڕقی خۆی داوەتەوە بە دنیای دەرەوەی کورد و هەموو پەرۆشیشی بۆ کوردە بێ ئەوە لە ڕێی تەئویلانەوە جێگۆڕکێ بە ڕق و پەرۆشی خۆی بکات. من هەرچەند پەسەند ناکەم بوغز هەڵ گرتن ببێتە خووی مرۆڤ، بەڵام کە هەر هات و بوغز بوو بەملەوە چاکتر ئەوەیە ڕوو لە شتێک بکات کە ڕەوای بوغز لێ هەڵ گرتن بێت نەک ڕێگە هەڵە بکات بەرەو بێ ئامانجی.

دەرەبەگایەتی و براگەورایەتی و سەرۆک عەشیرەتایەتی و سامانداری و هەموو بنگەییێکی هێز و دەسەڵات لە ڕابردوە بێدەسەڵاتەکەی کورددا دەبێ لەبەر تیشکی

چەند ڕاستییێکی بێ دەمەتەقەدا سەیریان بکرێت و پێی بناسرێتەوە، ئیتر بەپێی ئەو ناسینەوەیە من و تۆش وەک خەڵقی سەردەمی مێژووی کۆنی کورد ڕقیان لێهەڵگرین وەیا لێیان بێدەنگ بین. هەرگیز ناڵێم خۆشمان بوێن هەرچەند دەریش بکەوێ کە لە کۆندا خۆشویستراون مەگەر ئەو تاکانەیان کە لەگەڵ هێز و سەرۆکایەتیەکەیاندا بەپێی توانای خۆیان چاکە و پیاوەتییان بووبێت.

یەکەم ڕاستی ئەوەیە زەویداری و سامانداری و براگەورایەتی و سەرۆکایەتی و پێشەوایەتی و هەموو پایەیێکی بەرچاو لە کۆمەڵدا نەک هەر ڕەوابوون و بەس، بەڵکوو هۆی ڕێزلێنان و سەرەژوور چوون و ناو و شۆرەتێش بوون، لەمەشدا فەرقێک نیە لە نێوان دوێنێ و ئەمڕۆکە چونکە لەم ساڵەی هەزار و نۆصەد و حەفتا و دوەشدا (ساڵی دەست پێ کردنی نووسینەکەیە) بەپێی کێشانە و پێوانەی ئەم ڕۆژگارە هەموو هۆییێکی هێز و دەسەڵات و قسە ڕۆیشتن ڕێزی لێ دەگیرێت، هەر کەسێکیش بتوانێ هەوڵ دەدات بۆ وەدەست هێنانی هەروەک صەدان ساڵیش پێش ئەمڕۆ خەڵق هەوڵی داوە بناسرێت و دەوڵەمەند بێت و ڕێزی لێبگیرێت.

ڕابردوو لەچاو ئەم ڕۆژگارەمان لە عالەم بەدەر نەبوو تاکوو تێهەڵکشان لە پلەی حورمەت و دەسەڵات هۆی بە خۆداشکانەوە بووبێت وەیاخود لە نەزەر مەردمدا جێگەی سەرزەنشت و لێ بە داوێوە کردن بووبێت. سەرۆک نەقابەیەتی وەیا شەهادەی کۆلیجی ئەندازە لەم سەردەمەدا چەند عەیبە سەرۆکایەتی و «دەرەبەگایەتی»ی صەدەی نۆزدەم و... سییەمیش هەر هەند.

لە لایەن مڵکایەتیشەوە کە بە زاهیر بنگەی دەرەبەگایەتییە، فەرقێک نەبوە لە نەزەر خەڵقەکە لە نێوان زەویداری و لە نێوان مڵکی ناوشار و پارە و مەڕ و ئاژەڵ و باغ و هەرچی سەرچاوەییێکی تری سامان هەیە. مڵکایەتیی زەوی لە هەموو ڕووییێکەوە ڕەوا و شەرعی و سەلمێنراو بوە و کەس لە کەسی بە عەیب نەگرتووە، بە پێچەوانە مافی زەویدارییی وەک هەموو مافێکی تر پارێزراوە و تێکڕای خەڵق چاویان لێی بوە و حەزیان لێی کردوە، تەنانەت فەلاح چ ئیعتیرازی نەبوە لەو مڵکایەتیە شەرعیەی کە بە میرات بۆ یەکێک مابێتەوە وەیا بە پارە کڕیبێتی وەیا لە بری قەرز لە یەکێکی تری وەرگرتبێ با ئەو کەسە ئاغا بووبێت وەیا سەرەک عەشیرەت وەیا توجار وەیا مەلا وەیا شێخ وەیا فەلاح...

بەڵگەی ئەم ڕاستییە وەک بەڵگەی ساردی زستان و گەرمیی هاوینە چونکە دیمەنەکە بە درێژایی مێژووی سەرەتا نادیار فەرمانڕەوا بوە، تەنانەت فەلاحی کورد لە سەرەتای بەکارهێنانی یاسای تەسویە، کە جارێ ڕێکخراوی شۆڕشگێڕی سەر بە باوەڕی چیایەتی نەکەوتبوونە چالاکی، خۆی بە شایەدی بێ پێچ و پەنا و دوودڵی کردن و زمان گرتن مڵکایەتیی دەرەبەگەکە و مەلاکە و شێخەکە و هەموو خاوەن مڵکێکی ساغ دەکردەوە، نیزاعێکیش کە دەبوو لە نێوان ئەو کەسانەدا کە داوای مڵکایەتیی هەمان پارچە زەوییان دەکرد. وەنیە لەم ڕاستییەشدا سەیر پێهاتنێک هەبێ چونکە ئەمە بوە بڕیاری شەرع و یاسا و کەلەپۆر و داب و دەستوور و داخوازیی بەرژەوەندی کۆمەڵایەتیی.

کاتێک فەلاح بە دەنگ دەهات لە زۆردارێک و ئاغاییێک و براگەورەییێک کە دەستی بۆ مڵکی فەلاحەکە درێژ کردبایە. ئەوەی جێی دڵخۆشی و شانازییە لەم مەیدانەدا ئەوەیە کە فەلاحی کورد تا توانیبێتی لەسەر خۆی و مڵکەکەی کردۆتەوە و گەلێک جاران لەم تەرزە نیزاعەدا خۆی بە کوشت داوە وەیا زۆرداری کوشتوە وەیا قبووڵی زیللەتەکەی نەکردوە و ئاوارە بوە وەیا دەستی شاخی گرتوە و بۆتە قاشقونج.

نێزیکترین نموونەی بەرچاو و زۆر بەناوبانگی شەڕی فەلاحی کورد دژی زۆردار لەو ڕۆژانەی کە جارێ ڕێکخراوی سیاسی سەر بە چینایەتی لە کوردستاندا پێک نەهێنرابوون ئەو شەڕ و نیزاعە بەردەوامە و بێوچانە بوو کە لە نێوان دانیشتوانی ناوچەی «دۆڵێ«ی هەرێمی ماوەت و بەرەبابێکی میراودەلیاندا ڕوویدا و کۆتاییەکەشی بە سەرکەوتنی فەلاحەکان هات. برا بچوکێکی ئەو نیزاعە لە دەوری کۆیەشدا قەوما لە نێوان بەشێک لە فەلاحەکانی یەکێک لە دێیەکانی دەشتی کۆیە و خاوەن مڵکێکی کۆییدا کە سەری کێشایەوە سەر قاچاغبوونی چەند فەلاحێک و سووتانی خەلە و خەرمان و چەندین ڕووداوی ناخۆشی تر، کۆتاییەکەشی ئەو سەرکەوتنەی «دۆڵێ»یان نەبوو بەڵام تەسلیمبوون و سەلماندنیش نەبوو، واتە جۆرە مەسلەتییێک لە نێوان هەردوو لایاندا پێکهات. هەر لەم شێوە نیزاعە هی تریش لە کۆیێ بەرپا بوو. سەرلەبەریشیان بەڵگەی لەسەرخۆ کردنەوە و دەوڵەتپارێزیی فەلاحەکانی بە دەستەوە دەدا وێڕای دڕی و دەستدرێژی و تەڵەکەبازیی زۆردار. بەشێکی ئەم هەرایانەی وڵاتی کۆیێ لە شیعری «دڵدار»دا

دەنگی داوەتەوە، بەڵام ئەم دەنگدانەوەیە پێوەندیی نیە بە بزووتنەوە سەربەخۆیەکەی فەلاحەکان.

دەست بەسەردا گرتنی ملّکی خاوەن ملّکی بچووک لە لایەن زۆرداری کوردەوە ڕووشی دابێت ئەو ڕووداوە ئاسانە نەبوە بەپێی خوایشتی زۆردارەکە و بێ چەکمەسەریی چووبێتە سەر وەیا فەلاح بە ئاسانی و بێ لەسەرخۆ کردنەوە سەلماندبێتی وەیا هەموو جاران زۆردارەکە تێیدا سەرکەوتوو بێ وەیا بەردەوام دەسەڵاتی میریی لایەنی زۆردارەکەی گرتبێ. ملّک زەوت کردن لە لایەن زۆردارەوە کاتێک زۆر بەرچاو بوە کە لە کۆتایی شەڕی نێوان دوو عەشیرەتدا یەکێکیان بەسەر ئەوی تردا زاڵ بوویایە و ملّکی لێ داگیر کردبایە و ماڵی لێ تالان کردبایە. لەم تەرزە حاڵەدا عەشیرەتە سەرکەوتوەکە ئەوەی بەوی تر کردوە کە ئەگەر ژێر کەوتبایە بە خۆی دەکرا وەیاخود دەوڵەتێکی سەرکەوتوو لەگەڵ یەکێکی ژێرکەوتوودا دەیکات. تا ئێستاش چەند دێیەکی مەنگوڕایەتی لەبەر دەستی ملّکدارانی میراودەلی ماوەتەوە کە لە شەڕێکی چل ساڵێک پێش ئێستا کەوتە چەنگیانەوە ئەگەر یاسای کشتوکاڵسازی لێی وەرنەگرتبێتنەوە. لە حاڵی شەڕە عەشیرەتدا، کە ڕووداوی زۆر دڕندە و خوێناویی لێ کەوتۆتەوە، زوربەی خەڵق لە دەرەوەی شەڕەکەدا سەیرکەر و بێتەرەف بوە، ڕەنگە زۆر کەسیش بە ژێرکەوتووەکەی گوتبێت «حەقەمستی بێ!». ئەگەر کەسێک لە لاوە خۆی تێکەڵ بە هەراکە کردبێت هەر ئەوانە بوون کە پێیان دەڵێن خێرەومەند و دەستوپێ سپی و ماقووڵ ئەویش بە نیازی ئاگر کوژاندنەوە و مەسڵەتی لە بەیندا کردن و کاری ئەوتۆیی.

خولاسە، ملّکایەتیی زەوی لە سەردەمی حاجی قادر و بەر لەو و تا ساڵانی سەرەتاکانی شۆڕشی چواردەی تەمموزیش مافێکی شەرعی و قانوونی و ناوخۆیی و کۆمەڵایەتی بێ دەمەتەقە بوە، لەبەر ئەمە لە هیچ ڕوویێکەوە چاوەڕوان ناکرێ پیاوێکی وەک حاجی قادر ڕقی ملّکداریی ڕەوا لە خەڵق هەڵگرێت، دەمێنێتەوە کە بە چاوی خۆی دیتبێتی دەستدرێژیی بۆ ملّکی فەلاح و خوردە مالیک کرابێت. لێرەدا ئەگەر بۆمان ساغ بۆوە کە حاجی کاری وەها ناڕەوای دیتووە و لێی بێدەنگ بوە دەتوانین گلەیی ئەو بێدەنگبوونەی لێ بکەین، مەبەسیش بێدەنگبوونە لە

هەڵبەستدا، چونکە داوا لە حاجی ناکرێ بە دەست و بە چەک و پارە لەسەر زۆرلێکراو بکاتەوە کە دەزانین خاوەن هیچ شتێک نەبوە لەمانە.

من دەتوانم پاکانە بۆ حاجی بکەم لەوەدا کە کاتێک ئەو لە وڵاتی کۆیەی ڕابواردوە داگیر کردنی مڵکی هەژار ڕووی نەداوە، ئەم لایەنەش بە درێژیی لە بەرگی یەکەمی ئەم نووسینەدا[122] ڕوون کراوەتەوە و پێی ناوێ لێرەدا سەرلەنوێ باسی بکەمەوە، بەڵام بۆ نوێ کردنەوەی بیرەوەریی دوێنێ و بەستنەوەی بە ئەمڕۆکەوە شتێکی زۆر بچووک دەهێنمەوە یادی خوێنەری کۆیی.

نۆرە ئاوی باغەکانی کۆیێ لە سەردەمی حاجی بەکرئاغاوە ڕێکخرابوو و هەر باغە بەشە ئاوی خۆی بۆ دیار کرابوو، شیرازەی کارەکەش بە درێژایی صەد ساڵێک کە سەردەمی حاجی قادریش دەگرێتەوە چ زۆردارێک و ئاغایێک تێکی نەدا تاکوو لەو ساڵانەی دواییدا یەکێک بەشە ئاوی زیادی بۆ خۆی دابڕی، خەڵقەکە لە ڕووی ڕازی نەبوون بە کارەکەوە ئەو لوولەیەی کە ئاوەکەی لە شەلەگەی خاوەن نۆرەئاوان جودا دەکردەوە ناویان لێ نا «کونە گۆسکەی ئەلمۆدە». خاوەن باغەکان لەم لوولە ئەلمۆدەیە هەرگیز ڕازی نەبوون، لێشی بێدەنگ نەبوون چونکە زۆر جاران دەکەوتنە مقۆمقۆی شکات کردن، خۆ ئەگەر شکاتیان کردبایە کەس نەیدەتوانی ڕێیان پێ بگرێ وەیا چاویان لێ سوور کاتەوە، بەڵام وا دەزانم تێبینیی ناسیاوی و پێوەندیی بەیەکەوە ژیان و شتی ئەوتۆیی دەستی گرتن، باسەکەشم بۆیێ هێناوە یادی کۆییانەوە تاکوو ئەوانیش وەکوو من لە ڕێی ڕاگرتنی ئێستاکە بەرانبەر سەردەمی حاجی قادر ئەوە بسەلمێنن کە حاجی بە چاوی خۆی نەیدیتوە دەسەڵاتداری کۆیی مڵکی خوردەمالیک داگیر بکات، وەکو منیش شایەدیی ڕاستیی حاڵەکە بە خەڵقی ڕابگەیەنن.

ئەو پاکانەیەی تازە بۆ حاجی قادرم کرد دەستم ناگەیەنێ بەو تەجرەبانەی لە دیوی کوردستانی ئێران پێیاندا تێپەڕیوە چونکە نازانم زەرفی کۆمەڵایەتی و باری ستەم و

[122] بگەڕێوە بۆ لاپەڕەکانی 228 238 ی بەرگی یەکەم. چی ئێستا لێرەدا خەریکی یەکلا کردنیم، هێنانە دی بەڵێنێکە کە لە کۆتایی لاپەڕە 239 ی ئەو بەشەدا دراوە بە جێ و کاتی لەبارتر، کە ئێرە و ئێستاکەیە.

داد و زەوییداری و فەلاحەت و پاڵە و ڕەنجبەر لەو سەردەمانە لەو بەشەی کوردستاندا چۆن بوە، بە تایبەتی لەو شوێنانەدا کە پێوەندیی نێوان شار و لادێ پێوەندیی عەشیرەتایەتیی بێهێز کردووە و خاوەن مڵکی گەورەی لە نەزەر فەلاحدا ناخۆشەویست کردوە چونکە حیسابی ئەو شوێنانە گەلێک جودایە لە حیسابی ئەو عەشیرەتانەی پێوەندی و گیانی قەبیلەیی تێیاندا فەرمانڕەوا بوە، هەر نەختێکی تریش باسی ئەمەیان دەکەین.

بەهەمەحاڵ ئەوەی من لێرەدا بە مەبەستی پاکانە کردن و نەکردنی دادەنێم بۆ حاجی قادر بە دەنگ هاتن و نەهاتنی لە ڕووداوەکانی ستەمکارانەی ئەو دەمە نیە چونکە دیارە بەو ناکرێ لێیان بەدەنگ بێت، مەبەست دەنگ نەدانەوەی ئەو زوڵم و زۆرەیە لە شیعرەکانیدا کە بە شێوەیێکی لە عادەت بەدەر ڕووی دابێت. هەڵبەت کە نەتوانم پاکانەی بۆ بکەم ناتوانم گلەییشی لێ بکەم لەو بێدەنگیەی لە زوڵم و زۆری براگەوران دژی فەلاحان بە شێوەیێکی گشتی، چونکە نازانم چی دیتوە، تێکڕای قسەکانیشم لێرەدا بەو پێوانە و کێشانەیە کە لە کردە و گوتەی حاجییەوە بەسەر زوڵم و زۆری ئەو سەردەمانەیدا دەهێنن چونکە ئەوسا کەسی تر نەبوو لە چشتی وەها بە دەنگ بێت کە ئێمە چاوەنوارِ دەکەین حاجی لێ بەدەنگ بهاتبایە.

من لێرەدا هەڵوەستی حاجی لە ئاست براگەوراندا ڕادەگرم بەرانبەر هەڵوەستی حاجی دژی شەعبەدە و شێخایەتیی درۆزن، هەردوانیش ڕادەگرم بەرانبەر گیانی کوردایەتی و قەومایەتی لای حاجی قادر خۆی نەک یەکێکی تر، واتە حاجی قادری ئەم مەیدانە بە حاجی قادری مەیدانێکی تر دەگرم تا بزانم لە نێوان هەردوو وێنەدا چەند جوداوازیی هەیە. من نەهاتووم حاجی قادر بە شاعیرێکی وەک وەفایی وەیا حەریق وەیا «مصباح الديوان» بگرم و لەبەر تیشکی هەڵوەستی ئەواندا سەیری هەڵوەستی حاجی بکەم لە ئاست دەرەبەگی کوردستانی ئێرانی بەر لە صەد ساڵ. حاجی قادریشم بە حاجی قادر نەدەگرت ئەگەر هەڵوەستی لە مەیدانی دوشمنایەتیی شەعبەدەدا نەبوویایە و ڕابەری فکرەی کوردایەتی نەبوویایە.

ئەوەی لەگەڵ حاجییدا دەیکەم (زۆر کەسی تریش بێ قووڵبوونەوە لە مەسەلەکە تێیدا ڕووبەڕووی حاجی دەبن) لەگەڵ شاعیرەکانی تری ساڵانی 1930 یش هەر نایکەم چونکە ئەو شاعیرانەی دوای مەرگی حاجی بە چارەگە قەرنێک دەستیان کرد بە خەباتی کوردپەروەرانە هەرگیز تۆژینەوە و پرسینەوەی بەدەنگ نەهاتن لە

دەرەبەگیان لێ ناکرێ لەو ڕۆژانەدا کەوا جارێ نە فەلاح خۆی چ دەنگێکی لێوە هاتبوو نە ڕێکخراوی شۆڕشگێڕی سەر بە چینایەتی و کۆمەڵایەتیش هاتبوونە کۆڕی خەباتەوە.

حیسابی من لێرەدا لەگەڵ حاجی قادرێکە کە وا لە مەیدانی بەرهەڵستی کردنی شەعبەدەدا یەکە سواری صەدەی نۆزدەم بوە، لە مەیدانی فکرەی قەومایەتیشدا دەیان ساڵ پێش تێکڕای هاونژاد و هاومەسلەکانی خۆی کەوتۆتەوە. بانگەوازەکانی خۆیەتی لەو مەیدانانەدا وا من گوێ لە دەنگدانەوەیان ڕادەگرم لە مەیدانی «دەرەبەگایەتی»دا کە وا ڕۆشنبیرانی ئەم ڕۆژگارە خەریکن ڕابردووی صەدان و هەزاران ساڵی لێ بەدەنگ بهێنن. هەر ئەم ڕاستییە گرنگانەش ناچارم دەکات بەوپەڕی وردپێوی و ئینساف و واقیعیەتەوە لە پرسیارەکە بکۆڵمەوە چونکە ئەگەر وا نەکەم دەبمە ناحەزێکی بێفێڵی حاجی قادر و کوێرەوارێکی بێ پێچ و پەنای مێژووش. بەڕاستی ئەگەر بە وردی و بێتەرەفانە و بە چاوی کرایەوە خەریکی ئەم دیاردەیەی دەنگ نەدانەوەی فەلسەفەی «چینایەتی» لە شیعری شاعیرەکانی کوردی پێش پەیدابوونی ڕێکخراوی سیاسی سەربە چین نەبین، دەبینە پەندی ناو ئەو بەیتە فۆلکلۆریە پڕ خەندەیە «حەیران وەرە لە سەری سەفینی، چاوەکی کۆرە ئێکی نابینی، دەست لۆ هەناران دەبا هەنجیران دەپچڕێنێ...».

ئێمە دەبێ هەڵوەستی حاجی قادر بدەینەوە بەو واقیعەی تێیدا ژیاوە و بیخەینە نێوان هەڵوەستی تێکڕای خەڵقی سەردەمی خۆیەوە، ئەوجار لەوە بکۆڵینەوە ئایا بۆچی حاجی لە شەعبەدە بەدەنگ دێت و لە دەرەبەگایەتی بێدەنگە، نزیکی پەنجا ساڵیش دوای مەرگی خۆی ئەدیب و شاعیرانی کورد هەر لێی بێدەنگن. هەر ئەم پرسیارەشە بە جۆرێکی تر ڕوو لە ئێمە و لە حاجیش دەکات لەوەدا کە وا حاجی خۆی بەر لەوەی بکەوێتە سەرباری کوردایەتی و هێشتان کۆیەی جێنەهێشتبوو کەوتە دژی شەعبەدە و شێخایەتیی درۆزن؟ دوا بە دوای ئەویشدا، لەویش بە پێشەوە وەک مەلای ئیبنو ئادەم حەقپەرستی تر هەبوون دژی شەعبەدە و ئەفسانە بوەستن و نەشگەن بە فکرەی جوداوازیی بەرژەوەند لە چینێکەوە بۆ چینێک، هی وەهاش هەبوە دژی شەعبەدە بوە و کوردایەتیشی کردوە نەشکەوتۆتە سەر باری لێکدانەوەی چینایەتی.

بەهەمەحاڵ تەجرەبەی حاجی لەو ماوەیەی کە لە کوردستانی ئێرانی ڕابواردوە هەرچییێک و هەرچۆنێک بوویێت لەوە دڵنیاین حاجی پەندی جوداوازیی بەرژەوەندی

چینایەتی لەو تەجرەبەیە وەرنەگرتوە بە بەڵگەی دەنگ نەدانەوەی ئەو تەرزە بیر کردنەوە لە هەڵبەستەکانیدا. ئێمە هەرچەند چۆنایەتیی ئەو تەجرەبەیە نازانین دەتوانین تێکڕاییێکی فەرمانی حاڵوباری ئەو زەرفە لە نەفس و ویژدانی حاجی قادردا تێبگەین کە بێین ئەم چەند ڕاستییە بە بەرچاوی خۆمانەوە بگرین:

1) حاجی لە هەڵبەستدا نەکەوتۆتە دژی براگەورەکانی سەردەمی خۆی، چ هی کوردستانی ئێران چ هی عێراق. باسی براگەورەکانی کوردستانی تورکیا ناکەم چونکە لە نێوانیاندا نەژیاوە، بنەماڵەی بەدرخانانیش براگەورەیەتی و خاوەن مڵکایەتیی خۆیان لەبەرچاوی حاجی قادردا بەکارنەهێناوە چونکە لە شارستان، دوور لە هەموو کوردستان لەگەڵیاندا ژیاوە.

2) خەڵقەکەی سەردەمی حاجی قادریش لێیان نەبیستراوە چ هەرا و هۆریایان دژی براگەورە و خاوەن مڵک و سەرۆک عەشیرەت و دەرەبەگان نابێتەوە تاکوو لە ڕێی هەڵوەستی ئەوانەوە بێدەنگیەکەی حاجی عەیبدار بکەین. ئەوەی ڕاستیش بێ، بەلای باوەڕی منەوە، لە هەموو مێژووی ئیسلامدا تەنها بزووتنەوەیێکی «چینایەتی» تێدا دەرکەوتبێت شۆڕشەکەی «بابوکی خورڕەمی»یە کە لە سەردەمی عەباسیەکان ڕوویدا دژی داگیر کردنی ئەرزی فەلاحان لە لایەن خاوەن دەسەڵاتی حوکمەوە، ئەو شۆڕشە تا ڕادەیێک هەستی نەتەوایەتیی تێکەڵ بە هەستی غەدرلێکراویی کردوە. بەهەمەحاڵ بابوک و شۆڕشەکەی و سەردەمەکەی لە بیری خەڵقدا نەمابوون تاکوو هەستی بەرژەوەندی «چینایەتی» فەلاحی کوردی صەدەی نۆزدەمی پێ تیژ کەنەوە.

3) بە تێخوێندنەوەی خاڵەکانی لێرە بە دواوەش پتر زەرفی پێوەندیی حاجی بە براگەورانەوە خۆ ڕوون دەکاتەوە چونکە براگەورەیەتی هەر لە گۆشەنیگای ڕەوابوونی زەوییدارییەوە سەیری ناکرێت، لە گەلێک لایەنی تری ڕاستییەکانی کۆمەڵایەتییەوە تیشکی ڕوونبوونەوەی بۆ دێت.

دوەم ڕاستی، لە نێوان ئەوانەی پێیان دەگوترێ «دەرەبەگ» سەرۆک عەشیرەتەکانی ئەو عەشیرەتانەی پێوەندیی قەبیلەییان تێدا مابۆوە خاوەن پایەیێکی تایبەتی ڕێز و خۆشەویستی بوون لە لای ئاپۆڕەی خەڵقی عەشیرەتەکە چونکە شەخسی سەرۆک عەشیرەت بەپێی ئەو زەرف و کاتەی کە پێوەندیی عەشیرەتایەتی پاراستووە نیشانەی هێز و ناو و شۆرەت و حورمەتی عەشیرەتەکە بوە. بە ڕادەی

ئازایی و جوامێری و سوارچاکی و بەرچاویی سەرۆک عەشیرەت خەڵقی عەشیرەتەکە ڕێز لێگیراو دەبوون و کاریان لە پێش دەڕۆیشت و لە حکومەت بێترس دەبوون و دەستی عەشیرەتە دراوسێکانیان لێ کۆتا دەبوو.

عەشیرەت کە سەرۆکی چاکی بوویایە لە دوو ترسی گەورە ڕزگار دەبوو. یەکیان ترسی حکومەت و زەبر و زۆری مەفرەزەی پۆلیس و ڕەشبگیریی ئیجباری و خەرج و باجی مەڕانە و شتی ئەوتۆیی کە ئەگەر پیاوی عەشیرەت لە فەقەرەییێکیان دووچاری تەنگوچەڵەمە بوویایە لەوانە بوو تێبچێ وەیا پێماڵ بێ. من لە ساڵانی پێش شۆڕشی تەموز پیاوی عەشیرەتم دیتووە تا بڵێی ئازا بوە بەڵام کە چاوی بە پۆلیس کەوتووە وزەی بەرداوە، کە لێشم پرسیوە بۆ وەها لێی دەترسێ وەرامی داومەتەوە کاکە! بەرگی گورگی دەبەردایە...

ترسی دوەمیان دەستدرێژیی پیاوخراپان بە تایبەتی هی دراوسێیان. بە داخەوە گیانی عەشیرەتگەریی وا دەکا ماڵی عەشیرەتێک بۆ عەشیرەتێکی تر حەڵاڵ بێ، کە ماڵەکە حەڵاڵ بوو لە حاڵی پێویستدا سەرەکەش حەڵاڵ دەبێ. لەو ساڵانەدا کە ڕەزا شای پەهلەوی عەشیرەتەکانی ئێرانی بێ چەک کردن، هەموو ئەو عەشیرەتانەی نزیکی سنووری عێراق بوون چ حاڵیان نەمابوو بە دەست دز و جەردەی عەشیرەتەکانی دیوی عێراقەوە کە خاوەن چەک بوون و بە ئارەزۆی دڵیان لە بێچەکانیان دەدزی و دەکوشت.

ئەمانە ڕووداوی ڕاستن کە ڕاگەیاندنەکانیان تا بڵێی تاڵە بەڵام بنلێو خستنی لە تاڵاییان کەم ناکاتەوە، داپۆشینیشی لە باری وەک ئێستاکەی مندا کە خەریکی ساغ کردنەوەی هەڵوەستی حاجی قادرم لە ئاست دەرەبەگدا، سەرچاوەییێکی گەورەی لێکۆڵینەوە و قەناعەت هێنان وشک دەکات کە سوود بە کەس ناگەیەنێت و باسەکەش ڕووت دەکاتەوە.

سەرۆک عەشیرەتی ئازا و بەزیپک پیاوخراپی دوور و نێزیکی لە عەشیرەتەکەی خۆی دەتەکاندەوە چونکە دەزاندرا سزای ئەو پیاوخراپە دەداتەوە کە دەستدرێژیی لە عەشیرەتەکەی بکات. کەم وا دەبێ مرۆڤی عەشیرەت خراپە لەگەڵ مرۆڤی عەشیرەتەکەی خۆی بکات، کە هەر هات و خراپەی ناوخۆیی ڕوویدا ئەوساش سەرۆکی بەجورئەت چارەسەری ڕووداوەکە دەکات و ڕێ نادا تەشەنە بکات.

لەمەش بترازێ سەرۆکی جوامێر لە تەنگانەدا بە کەڵکی هەموو تاکەکانی عەشیرەتەکەی دەهات و لە خۆشی و ناخۆشیدا هاوبەشی دەکردن.

بێ موبالەغە سەرۆکی وەها هەبوە، کە خۆم نموونەیانم دیتوە، بەلای عەشیرەتەکەیەوە هێندەی شێخێکی تەریقەت بەلای مریدەکانیەوە خۆشەویست و رێز لێگیراو بوە. بڵباسەکانی نێوانی کۆیە و ڕانیە ئەوەندەیان سواراغای سەرۆکی عەشیرەتەکە خۆشدەویست لەوە دەرچوو بوو خۆشویستنەکە هی ترس و تەماع بێ چونکە لێیان ببوە شێوە ئاینێک، تەنانەت ئەگەر لە ناچاریدا سوێندی درۆیان بە تەڵاق و بە قورئان خواردبایە هەرگیزا و هەرگیز بە خەیاڵیاندا نەدەهات سوێندی ناڕاست بە سەری سواراغا بخۆن، ئەمەش ڕاستییێکە تا ئێستاش خەڵقی ئەو ناوە هەر لەبیریانە و ناوناوە باسیشی دەکەن.

خۆشویستنی دوو لایەنی نێوان سەرۆک و عەشیرەتەکەی، ئەگەر سەرۆکەکە جوامێر بێ، بەهێزتر دەبێ لە خۆشویستنی نێوان خزمان چونکە لەوانەیە سەرەڕای خزمایەتی هەم بەرژەوەند و هەم ڕوەتی دنیایش لە خۆشویستنەکە زیاد کات جگە لەوەی بەرچاوی و براگەورەیەتی و سوارچاکی و پۆشتەیی و سەخاوەت و ئەو تەرزە ڕەوشت و خەسڵەتانە چەندین خەرمانەی گەورەیی و خۆشەویستی و، بگرە تەقدیسیش، بە دەوری سەرۆکی جوامێردا دەکێشێت و دەیکات بە قارەمانێکی ناو ئەفسانان.

ئەو قەبیلانەی لە حاڵی کۆچەری و ڕەوەندیدان[123]، پتریش لە قەبیلەی نیشتەجێ و خاوەن زەویی و کشتوکاڵ بە بنەماڵەی سەرۆکایەتیی عەشیرەتەوە دەلکێن و سەلامەتی خۆیان و ماڵ و ئاژەڵیان بەند دەبێ بە شەخسیەتی سەرۆکیانەوە. ئەم ڕاستییە دەبێ نرخی پێ بدرێت لە هەڵسەنگاندنی هەڵوەستی حاجی بەرانبەر دەرەبەگی کورد، چونکە حاجی دەوری نۆ ساڵێکی تەمەنی هۆشیاری و هەست بە کۆمەڵایەتی کردنی لە نێوان و دەور و ڕۆخی ئەو تەرزە ڕەوەند و کۆچەرانە

---

[123] لە لاپەڕە 342-345 ی بەشی یەکەمی «حاجی قاردری کۆیی» بە پێی داخوازیی جێگە باسی ئەم پێوەندییە بەهێزەی ناو ژیانی عەشیرەتی، بە تایبەتیی هی کۆچەری،کراوە.---

ڕابواردوە و پەندی بەیەکەوە ژیان و پێوەندیی سوودی موشتەرەک و پەلەی ژیان و جۆری ڕاپەڕاندنی کاروباری عەشرەتایەتی لەو شێوە بەڕێوەچوونەوە وەرگرتوە کە وا هەر دەڵێی بەڕێوەچونی یەک خێزانە.

گرنگیی ئەم ڕاستییە لەوەدایە کە گوتم تەجرەبەی حاجی لەگەڵ دەرەبەگ دەدرێتەوە بە بیست ساڵێکی عومری، چونکە ماوەی نۆ ساڵ، نیوەی ئەو بیست ساڵانە دەگرێتەوە بەو پێیە تەجرەبەی بەشێکی درێژی هەموو قۆناغەکە پەندی هاوچوونی و یەک بەرژەوەندی و بێ فەرقیی نێوان دانیشتوانی قەبیلە لە دڵی حاجی قادردا جێگیر دەکات کە ئەمەش ڕاستییێکە لەگەڵ دەنگ نەدانەوەی فکری خەباتی چینایەتی لە هەڵبەستەکانیدا ڕێک دێت و دەگونجێت بێ ئەوە کەس خەریکی گونجاندنیان بێت.

سێیەم ڕاستی ئەوەیە، بەپێی داب و دەستوور و نەریتی ڕۆژگاری لێرە بە پێشەوە ئەوەی پێیان دەگوترا براگەورە بە گشتی مافی تەنبێ کردن و چاوسوور کردنەوەیان بەسەر خەڵقی دەور و پشتی خۆیانەوە هەبوە. لە بەکارهێنانی ئەو مافەشدا بە زۆری سوود و چاکەی برا چوکەکان ڕەچاوکراوە هەر بۆیەش بوو بەشێکی یەکجار زۆری کێشە و داوای مڵکایەتی وەیا میرات وەیا ژن هەڵ گرتن وەیا ماڵی دزیاریی بەسەر گرتنەوە وەیا دەستدرێژی لەیەکتر کردن وەیا مەسەلەی خوێن و لەیەکتر کوشتن و چەندین نیزاع و ناکۆکیی جۆراوجۆری تر لای براگەوران چارەسەر دەکران، تەنانەت دانیشتوانی شارەکانیش کەمتر ڕێی دادگەی حکومەتیان دەگرتە بەر و دەگەڕانەوە بۆ لای مزگەوت و مەلا. ئەم وەزعە تا ئەو سەردەمەی بە بیریشمان دێت هەر بەردەوام بوو، بگرە ئێستاش پاشماوەییێکی لە هەندێ جێگە و حاڵدا ماوە.

هۆی هەرە بەهێزی ئەم دیاردەیەش بۆ دوو سەرچاوە دەگەڕێتەوە. یەکەمیان باوەڕی خەڵق بە چاکتربوونی بڕیارەکانی شەرع و ڕێک کەوتن لەسەر قسەی براگەوران بەپێی داب و دەستوور و نەریتی کۆمەڵایەتیی کوردەواریی. دوەمیان کەم باوەڕی خەڵق بە بوونی داد و چاکە لە کاری حکومەتییدا.

بەهەمەحاڵ، پەناهێنانی فەلاحێک و مەردێکی عەشیرەتی بۆ دادگە وەیا پۆلیس وەیا کارگێڕیی حکومەتی تا بڵێی زەحمەت بوە لەو سەردەمە کۆنانەدا چونکە دەبێ جارەها و ڕۆژەها تەرکی کار و کەسابەتەکەی بکات و ئەرک و مەسرەفی هاتنە شار

هەڵگریت و شایەد بێنێ و نازانم چی بکا و هەمووشی بە ترس و لەرز و پێیەک لە پاش و پێیەک لە پێش، ئەوساش لەوانەبووە لە کۆتایی هەموو بێنە و بەرەیێکدا بەرتیلکاری کردبێت و مەسەلەکەی بەلای نارەوادا شکاندبێتەوە. دەبینین ئەمڕۆکەش بەزۆری دانیشتوی دەشتودەر لە دادگەدا شکاتلێکراوە نەک شکاتکردوو چونکە ئێستاش هاتوچۆی حکومەت بۆ وەدەستهێنانی ئەو مافە بچوکانەی فەلاحێک بۆی دێتە دادگە گەلێک بە ئەرک و مەسرەفترە لە بەرژەوەندەکە.

بەر لە 30-40 ساڵ لایەنی پیاو لێکوژراو تازیەی لێ دەبوو بە دووسێ تازیە کە ناچار دەکرا تەرمی کوژراوەکە بە پشتی وڵاغ ڕاگوێزێ بۆ قەزا لای دکتۆر تاکوو ڕاپۆڕی لەسەر دەرچوێنێ و هۆی مردنەکەی ساغ بکاتەوە، ئیتر کە پێیان کرابا خەبەری کوشتنەکەیان بە حکومەت ڕانەدەگەیاند و تەرمەکەیان بە دزیەوە دەشاردەوە. واش دەبوو خەبەرەکە دەگەییشتەوە حکومەت ئیتر دوای حەفتەیێک یا زیاتر مەیتەکەیان لە قەبر دەردەهێنایەوە و دەیان برد بۆ لای دکتۆر... من بە چاوی خۆم دیتومە لە دوورایی دوو ڕۆژ ڕێگاوە مەیتی کوژراویان لە قەبر دەرهێناوەتەوە و بە سواری گوێدرێژ لەگەڵ ماڵ و منداڵی کوژراو، بە شین و ڕۆڕۆ، لە ژێر ترسی قەمچی پۆلیس، ڕاپێچ دراون بۆ لای دکتۆر... دوای نۆڕینی لە لایەن دکتۆرەکەوە بە هەمان وەزعی فرمێسکاوی و لێقەوماوییەوە تەرمەکە براوەتەوە بۆ گۆڕەکەی و سەرلەنوێ پێی سپێرراوەتەوە. خێزانی لادێیی دەست و پێی هەموو کەسێکی ماچ دەکرد، پارەشی دەدا، لە وەزعی وەها پڕ سفتوسۆی، بە لای خۆیەوە، بێلزوم بە ئەرک عەزاب و، دیسان بەلای خۆیەوە، ئابڕووچوون ڕزگار بکات.

ئەمە نموونەیێکی بچووکە لە جۆری پێوەندیی خەڵق بە دەسەڵاتی حکومەتی لێرە بە پێشەوە. من دڵنیام لەوەدا ئەگەر یەکێک لەو ڕۆشنبیرانەی ئەمڕۆ کە وا بە زۆریی لەعنەت بۆ دەرەبەگ دەنێرێ خۆی دووچاری وەزعێکی وەک وەزعی خێزانە فەلاحیەکە بوویایە دەخیل و ئامانی براگەورە و شێخ و مەلا و مەرقەدی چاک و پیرانیش دەبوو لەو چەکمە سەریەی پۆلیس و دکتۆر[124] و ڕاپۆرتی طبی ڕزگار

[124] گەلێک جار لاسایی کردنەوەی وڵاتی پێشکەوتوو لە لایەن وڵاتی پاشکەوتووەوە لە جیاتی چاکە خراپەی لێ پەیدا دەبێت. لە جەنگی دوەمدا کە دابەش کردنی

بوویایە... نەک هەر لەم بارە یەکجار ناخۆش و بە سفتوسۆیەدا، بەڵکوو لە گەلێک وەزعی تریشدا خەڵق حەزی بەوە کردوە لە دەرەوەی جغزی حکومەت کێشە و گرفتی خۆی چارەسەر بکات.

بەڕاستی، لەو سەردەمانەدا کە دەستەی حکومەت بەلای خەڵقەوە جێی باوەڕ پێ کردن و لێ ئەمینبوون نەبوە مزگەوت وەک دادگەی «مدنی» و دیوەخانەی سەرەک عەشیرەت و براگەورە و بەرەی دەسەڵاتداریش وەک دادگەی «جزائی» بوە، دیاریشە مزگەوت لە شارەکاندا پتر پەنای براوەتە بەر تا دیوەخانان چونکە دەسەڵاتی حکومەتی لە شاراندا بەشێکی زۆری دەسەڵاتی براگەورانی پەک دەیەخست لە هەڵبڕینەوەی ئەو کارانەدا کە پێوەندییان بە دادگەی «جزائی»یەوە بوە وەک کوشتن و دزین و سووتاندن...، لە حاڵێکدا کاروباری سەر بە دادگەی «مدنی حقوقی» لە خواهشتی خاوەنەکەیدا بوە ئایا بۆی دەچێتە دادگە یا مزگەوت وەیا هەر لێی بێدەنگ دەبێت.

ئەم بەسەر ڕاگەیشتنەی سەرۆک عەشیرەت و براگەورە و دەرەبەگەکان لە ناکۆکی و نیزاعی نێوان خەڵقی سەردەمی لێرە بە پێشەوە، کە ڕابگیرێت لە تەنیشت خۆدزینەوەی خەڵقەکە لە حکومەت، باشتر تێمان دەگەیەنێ بۆچی ئەدیب و شاعیر و مەلا و خوێندەواری کورد لە خۆوە بیریان بۆ ئەوە نەڕۆییشتوە «گەورایەتی» و «بچووکایەتی» بە ڕاشکاویی بخەنە ژێر ڕووناکایی لێکدانەوەیێک، بەدیلێکی مومکین و باشتر و باوەڕپێکراوتر بە دەستەوە بدات و داوای لابردنی ڕێژیمی براگەورەیەتی و دەرەبەگایەتی بکەن بۆ چەسپاندنی جێگرەکەی.

من لێرەدا قسەم لەگەڵ ئەوەیە کە ئەدیبەکان و مەلاکان و شاعیرەکان تەنها لە نووسین و هەڵبەستدا ناوێکی ئەو بەدیلە و ئاڵوگۆڕە بهێنن نەک لە واقیعدا گۆڕینەکە پێک بهێنن وەیا بە دڵ هەوڵی بۆ بدەن چونکە مەعلوومە ئەم دەسەڵاتە نە پەیدا بووبوو نە ئەگەر کەسێکیش ئەم بارە قورسەی خستبایە سەر شانی خۆی بیتوانیبا سەرەدەری لە کارەکەی بکات چونکە ئەو کەسە پتر لە حکومەت ناڕازی

---

خواردەمەنی بە بیتاقە خەڵقی ئەورووپای دەژیاند، لای ئێمە هەژاری هەژارتر کرد و سەرۆکی لێکەوتەشی کردەوە بە سەرۆکی تەواو.

بوە تا ئەوەی لە براگەورەکانی کورد نارازی بووبێت، کە حاڵیش وەها بێ، دەبێ داوا کردنەکەی لە مەبەستە مەحدودەکەی بە لاوەنانی براگەورانەوە پەرە بستێنیت تا دەیگەیەنێ بە دروست کردنی دەسەڵات و حکومەتێکی تازە کە ئەمە لە وەهم و خەیاڵیشدا نایێتە هیچ حسابێکی ئەوسا و ئێستاوە.

ڕەنگە خەیاڵ بۆ ئەوە بڕوا بەسەر ڕاگەییشتنی براگەورەکانی کورد لە گیروگرفتی نێوان خەڵقی کوردەواریی وێنەیێک بێ لەو دەسەڵاتەی «فیوداڵ»ی صەدەکانی ناوەندیی لە ئەورووپادا هەیانبوە. هەرچەند لێرە بە دواوە کورتەیێکی زۆر کورتی بەراورد کردنی «دەرەبەگایەتی»ی کورد و «فیوداڵ»ی ئەورووپا باس دەکەین بەڵام لێرەدا دەبێ ئەوەندە بڵێم دوو جوداوازیی یەکجار بنجی، وێڕای جوداوازیی پلەی دوەم، هەر دوو دیاردە کۆمەڵایەتیەکەی کورد و ئەورووپای لەیەکتر جودا دەکردەوە.

یەکەم لەوەدا کەوا سەرەک عەشیرەتی کورد بەردوام و هەمیشەکات بەشداری خۆشی و ناخۆشیی خەڵقی هۆزەکەی خۆی دەبوو و ژیانێکی تێکەڵ بە ژیانی ئەوانی بەسەر دەبرد بە تایبەتی لە نێوان ئەو عەشیرەتانەدا کە گیانی قیبلەییان تێدا پارێزراوە، تەنانەت سەرۆکی ئەو تەرزە عەشیرەتە زۆر جاران ژنی لە خەڵقی عەشیرەتەکە هێناوە واش بوە ژنی بنەماڵەی سەرۆکایەتی لە بۆرە پیاوی عەشرەتەکە مارە کردوە، هەر ئەم تەرزە عەشیرەتەش بوە کە حاجی قادر لە نزیکەوە هاوبەشی ژیانیان بوە. خولاسە نازوفیزی خۆ بە گەورەتر زانینی فیۆداڵێکی ئەورووپایی، جارێ، لە نێوان عەشیرەتاکانی کورد پەیدا نەبووبوو مەگەر ناوناوەییێکی بە دەگمەن نەبێ.

دوەم لەوەدا کە وا چونکە دینی مەسیحی کەمتر لە دینی ئیسلام یاسای گوزەران و بەیەکەوە ژیان و سزا و پاداش و لایەنەکانی تری کۆمەڵایەتی داناوە، خەڵقی ئەورووپا کەمتر گەڕاونەتەوە بۆ کەنشتە لەوەی کە مسڵمانان هانا دەبەنە بەر مەلا و مزگەفت بۆ هەڵبڕینەوەی کێشە و گیروگرفتی نیزاعی نێوان خەڵق، کە حاڵ وا بێ دیارە سەرۆک عەشیرەت لە دەشت و لادێ جارێکی تریش پێوەندیی لەگەڵ کوردەوارییدا پتەوتر دەبێ لە پێوەندیی کۆنتێک و بارۆنێکی ئەورووپایی بەو خەڵقەی کە لە جغزی دەسەڵاتی ئەودا دەژین چونکە لە نێوان عەشیرەتدا پێوەندیی بە مزگەفتەوە درێژەکێشانێکی پێوەندییەکەیە بە دیوەخانەوە وەیا، بە پێچەوانە، لەم ڕووەوە دیوەخانە درێژەکێشانی مزگەفتە.

ئەم تێکەڵیەی سەرۆک عەشیرەت لەگەڵ ژیان و سوود و زەرەری خەڵقەکە بەپێی ئەو دەسەڵاتەی کە نەریت و داب و دەستووری کۆمەڵایەتی و داخوازیی ناچاریی پێی داوە، سەرەڕای دردۆنگیی خەڵق لە حکومەتی ڕۆژگارەکانی تێپەڕیو، زۆر بە شێوەییێکی چاوەڕوانکراو وای کردوە حیسابێکی کەم بۆ زێدە دەستدرێژییێک بکرێت کە براگەورە لە بەکارهێنانی دەسەڵاتی خۆی کردبێتی وەک کە لە هەموو جیهاندا چاوپۆشی دەکرێ لەو سنووربەزاندنەی یاسا کە لێرە و لەوێ لە دایەرەی پۆلیس دەدیترێ وەیا سەرۆکی دایەرەییێکی تر لەگەڵ فەرمانبەرە بەردەسەکانی خۆیدا دەیکات. هەرچەند دەزانین سنووربەزاندنی یاسا نیگا ڕاکێشتر و پتریش جێگەی گلەییە، خێراتریش لەسەر ئەو کەسە حیساب دەکرێ کە سنوورەکەی بەزاندوە تا ئەو زێدە دەستدرێژییەی براگەورەیێک کردوەتی بەر لە صەدان ساڵ. لەمەش بترازێین دەبێ داوا لە ڕۆشنبیری ئەم سەردەمە بکرێ پتر پەرۆشی یاسا پاراستنی ئەم سەردەمەی بێت تا گلەیی کردن لەو سنووربەزاندنەی پێشینان کردویانە. بەهەمەحاڵ لە بارێکی وەهادا کە نیزام و یاسایێک نەبێت بە چاکی تەدەخولی ڕەوا و ناڕەوا لە یەکتر جودا کاتەوە، نیگای پیاوی حەقپەرستی وردبینیش لەوانەیە بەسەر دیمەنی دەستدرێژیەکەدا بکشێت بێ ئەوە بەسەریەوە بەند بێت و بکەوێتە کەڵکەڵەی هەڵێنجانی بیروڕای ئەوتۆوە تێکدانی ئەو داب و دەستوورە بکاتە مەبەست.

من نامەوێ بڵێم، نەشم گوتوە و هەرگیزیش ناڵێم، ئەو براگەورانە هەموویان وەیا زۆریان هەمیشە لە پەرۆشی چاکە و بەرژەوەندی خەڵقەکەدابوون و سوود و بەرژەوەندی خۆیانیان بە لاوە ناوە، کە ئەمە نە ئەوسا ڕاست بوە و نە ئێستاش ڕاستە و تا دواڕۆژێکی دورودرێژیش بەڕاست ناگەڕێ. خەڵقی ئەو سەردەمانەش وەک هی ئێستا تێکڕایان بەر لە هەموو شتێک چاکەی شەخسی خۆیان مەتڵەب بوە کەسیش لەمەدا هیچ ناڕەزامەندیی دەرنەبڕیوە چونکە ئەو کەسە خۆی بەر لە خەڵقی تر خەریکی وەدەستهێنانی سوودی شەخسیی بوە ئیتر چۆن بیری بۆ ئەوە دەڕوات شتێکی بەخۆی ڕەوا دەبینێت و وەک بەدیهیەی دەزانێت لە خەڵقی بە عەیب بگرێت.

خەریکبوون بە سوودی شەخسییەوە یاسای سروشتە و داخوازیی ژیانە، بگرە داینەمۆی مێژووی کۆن و نوێیە، خۆ ئەگەر لەم ڕۆژگارەشدا گیانی هاریکاریی نێوان

گەلان نەختێک لە خۆپەرستی و مرۆڤی تاکی کەم کردبێتەوە و پێداویستی بەیەکەوە ژیانی ئەم سەردەمە خەڵقی بەرەو تەرجیحی سوودی گشتی پاڵ پێوە نابێت، صەدان ساڵ بەر لە ئێستا گیانی ئەوتۆیی جارێ لە پزدانی کۆمەڵایەتیی ڕۆژهەڵاتدا نەترووکابوو مەگەر لەسەر زار و زمانی پیاوی واعیز و لە ناو هەناوی نووسراوی تۆز لێنیشتوو و بەدەم پەند و قسەی نەستەقەوە وەیا لەسەر ڕووپەڕەی یاساکاندا کەوا ڕەفتاری خەڵق زۆریان لێ دوور بوو.

پەند و قسەی نەستەق کە پتر تەرجەمەی جووڵەی مێشک و دڵی مەردم دەکەن نەختێکی کەمی سوودی گشتی گوتۆتەوە، بەشی هەرە زۆری گیانی خۆویستیی عەکس کردۆتەوە[125]. هەر ئەمەیشە چاوەڕوان دەکرێ لەو واقیعە یەکجار کزەی کوردەوارییی کە بە درێژایی هەموو مێژووی دەرفەتی نەبوە بە شێوەیێکی گشتی و لە ڕێی هاریکارییەوە چاکە و سوود و بەرژەوەند دەردەست بکات وەیا زەرەر و ناخۆشی و فەلاکەت بەرەو دوا بگێڕێتەوە. ئەم خەریکبوونەی خەڵق بە سوودی شەخسییەوە کە یاسای گشتیی کۆمەڵایەتیی کوردستان و هەموو جێگەیێکی لێقەوماوی وەک ئەو بوە و پەردەی چاوپۆشیی بەسەر ڕەفتاری هەموو ئەو کەسانەدا کێشاوە کەوا بە ئاشکرا وەیا لە پەنا خزمەتی غەیردا سوودی شەخسییان خزمەت کردوە پتر ڕوون دەبێتەوە کە ڕایبگرین لەبەر تیشکی ڕاستیی چوارەم وەک هەر ئێستا دەیکەین.

چوارەم ڕاستی کە خۆی سێبەری تیشکەکانی واقیعی کۆمەڵایەتییە و هەتا بشڵێی بەد و مەلعوونە، کەمتەرخەمیی تێکڕایی خەڵقە لەو ڕووداوانە کە دووچاری غەیری خۆیان دەبن و زیانەکەیان بەرەو خۆیان ناگەڕێتەوە. من لێرەدا بەتەما نیم بچمە بنج و بناوانی ئەم خەسڵەتە یەکجار بەرچاو و پەرەسەندوو و فەرمانڕەوایەی نێوان گەلانی دواکەوتوو بۆ دۆزینەوەی سەرچاوە واقیعیەکانی لێیانەوە هەڵقوڵیوە چونکە مەبەس شی کردنەوەی ئەو هەڵکەوت و دیاردە کۆمەڵاتیانە و ڕاستییە مێژووییانەیە کە وایان کردوە ئەدیب و پیاوچاک و مەلای دینداری کورد لە ئاست براگەوراندا بێدەنگ بن بۆ ئەوەی تێبگەین سەبەب چیە حاجی قادر لە هەڵبەستەکانیدا یەخەگیری دەرەبەگ نەبوە وەک لە زەمینەی ئاییندا یەخەگیری شێخایەتیی

[125] ئەم باسە لە لاپەڕەکانی 279–284 ی بەرگی یەکەمی «حاجی قادری کۆیی» بە پێی داخوازیی جێگە لێی کۆڵراوەتەوە.

تەڵەکەباز بوە وەیا لە مەیدانی کوردایەتییدا یەخەگیری داگیرکەر بوە. کە ئەمە مەبەست بێ عامیلی کەمتەرخەمی، خۆی لە خۆیدا، یارمەتی ڕوون کردنەوەی باسەکەمان دەدات بێ ئەوە پێویست بێ بزانین لە کام سەرچاوەوە هەڵقوڵیوە و بە کام دۆڵیچکەی مێژوو و کۆمەڵایەتییدا بە میرات بۆ کورد و گەلی دواکەوتووی وەک ئەو هاتۆتە خوارەوە.

بێباکی مرۆڤ لە ئاست ئێش و ئازاری غەیری خۆی بەوەندە بە درۆ ناخرێتەوە کە دێت و پەرۆشێکی بێ ئەرک دەخوا بۆ لێقەوماو و خەفەتبار چونکە پەرۆشی بێ ئەرک بە کەڵکی خەفەتبارەکە نایەت و ستەمکاریش لە ستەمی خۆی ناوەستێت. تۆ سەیری وەزعی لێقەوماو بکە و بە حاڵوباری دەوڵەمەندێک و خوداپێداوێکی بگرە و بزانە ئاپۆرەی خەڵق لە کامیان دەئاڵێن. ئەم دیمەنەی ڕوو هێنانی عالەم بۆ دەوڵەمەند و پشت تێ کردنیان لە هەژار لە هەموو سەردەمێکدا مەوزوعی هەڵبەست و پەخشان و بابەتی فۆلکلۆری بوە، تەنانەت هەموو شکایەتێکی شاعیران لە زەمانە و چەرخی چەپگەرد و بەختی کەچ شکایەت کردنە لە ئادەمیزاد چونکە نە زەمانە و نە چەرخ و نە بەخت هیچ کامێکیان چاکە و خراپەیان لە دەست نایەت، شاعیرەکانیش ئەم ڕاستییەیان زانیوە.

دیسان دەڵێمەوە من ناچمە بنج و بناوانی مەسەلەکەوە، مەبەسیشم تاوانبار کردنی خەڵقەکە نیە چونکە هەر تاکێکی لێی بگری خۆی لە بارێکدا دیوەتەوە هەم لە ئیرادەی بەهێزتر و هەم لە تێبرِ کردنی هۆش و گۆشی بەدەر. من تاکە مەبەستێکم هەبێ لە باس کردنی ئەم دیاردەیەی بێباکیی مەردم لە ئاست ئێش و ئازاری غەیردا تەواو کردنی ئەو نەخشەیەیە کە بێدەنگبوونی شاعیر و ئەدیب و خوێندەواری کوردی لێرە بە پێشەوە لە ئاست دەستدرێژیی براگەوران نیشان دەدات چونکە ئەگەر نەخشەکەم بە ناتەواوی جێهێشت کەسی پێ ئیقناع نابێت لە حاڵێکدا دەزانم حەقیقەتی ناخۆش بە هەموو بەڵگەی ئیسپاتکەریشەوە پێشکەش بکرێت هەر زەحمەتە بسەلمێندرێ چ جایی حەقیقەتێک تاڵاییەکە و ناخۆشیەکەی بگاتە پلەی نەگونجان لەگەڵ ئەو بیروڕایانەی کە بە لایانەوە هەموو ڕابردووی گەلانی خەڵق یەک شریتەی بێبڕانەوەی بەگژدا چوونەوە بوە دژی زۆرداری و خوێنمژی و چەوساندنەوە.

داخم ناچێ ڕووداو شتێکی یەکجار جودایە لە مەیلی سافیلکەی خۆ شاگەشکە کردن بە خەباتی مەردانەی لێرە بە پێشەوە، کە دەبینی هەڵکەوتووترین و ئازاترین و دڵسۆزترین ڕۆڵەی گەل لە مێژووی دوورودرێژدا بە قسە و هەڵبەستیش ئەو خەباتەیان نەکردوە چ جایی مەردی بێ ئەنوای هەژاری بێدەسەڵاتی هیچ لە دەست نەهاتوو. من لێرە بە پێشەوە باسی چەند بەگژدا چوونەوە و هەڵگەڕانەوەی فەلاحانم لە ئاغایان کرد کە نموونەی لەسەرخۆ کردنەوە و پەلەی ژیانی چینی هەژار نیشان دەدەن، ئێستا لێرەدا دەبێ بڵێم ئەو فەلاحانەی بەگژ زۆردارەکاندا دەچوونەوە لە هێزی هاوکاریی ناخۆیی و کەرەمی خوا بەولاوە یاریدەدەریان نەبوو نە لە نێوان برا فەلاحەکاندا و نە لە نێوان سەرلەبەری چینی هەژار و خوێندەوار، ئەگەر محامیێکیش یاریدەی دابن بەرانبەر ئەرک و مەسرەف یاریدەی داون هەروەک محامیێکی تر یاریدەی لایەنەکەی تری داوە.

ڕەنگە لێرەدا ڕاستیی هەرە گەورە ئەوە بێ فەلاحەکانی ناوچەی دۆڵێ، هی جێگاکانی تریش هەر یەکە بە شێوەییێک، پەناییێکیان لە یاسا و دەسەڵاتی حکومەتی ئەوسادا شک بردبێت چونکە بەهەمەحاڵ حکومەت نایەوێ بە ئاشکرایی بێ ئەمری یاساکانی بکرێت، لەو سەردەمانەشدا دەستدرێژیکەرێکی میراودەلی خۆشەویست نەبوە لای حکومەت تاکوو چاوپۆشی لێ بکات چونکە ئەوسا جارێ پشدەر، کە ناوچەی دەسەڵاتی میراودەلیان بوو، حکومەتی تێدا دانەمەزرا بوو لەبەر ئەمە هەر جێگەییێکی تریش بکەوتایە ژێر فەرمانی ئەوان حکومەتی لێ دوور دەکەوتەوە. لەمانەش وازبێنین دەرگەی دادگە بۆ هەموو کەس کرابۆوە و لە شکاتانی دەپرسیەوە. خولاسە مەسەلەکە بە هەر بارێکدا بخەین پەیامی خۆشی لێ وەرناگرین چونکە دیاردەی پەرۆش بۆ غەیرنەبوون پتر ئاشکرا دەبێ.

ئەم لێکدانەوە و سەراسۆیی کردنە کورتیلەیەمان بە دەوری کەمتەرخەمیی خەڵق لەگەڵ یەکتردا باشتر بۆمان ڕوون دەکاتەوە و تێمان دەگەیەنێ چەند ئاسانە دەستدرێژیی کردنی براگەوران لە هەڵبڕینەوەی نیزاعی نێوان خەڵق بەرەو وەدەستهێنانی سوودی شەخسیی خۆیان چاوی بینەرانی بەسەردا بکشێت بێ ئەوەی هەست بە دەستدرێژیەکە بکات وەیا ئەگەر هەستێکیشی پێکرد بەلایەوە سەیر و ناڕەوا بێ چونکە بینەرەکان و سەرلەبەری خەڵقەکە خەریکی سوودی شەخسی بوون و کەمتر خەفەتی مەغدوریەتیی غەیری خۆیانیان کێشاوە. بێگومان دەسەڵاتێکی

بەلای خەڵقەوە ڕەوا و ئاشنا بێت، سنووری خۆی ببەزێنی بەرەو دەستدرێژیی کردن، گەلێک کەمتر خۆی دەنوێنێت لەچاو دەستدرێژییێکی کە لەسەر هیچ بنگەیێکی کۆمەڵایەتی هەڵنەستابێت، وەک ئەوەی براگەورە بە ناحەق لە براگچکەی بدات چاوپۆشی لێ دەکرێت بەڵام بێگانە لێی ناسەلمێندرێ دارێک لە صەگی بەر دەرگە ڕاست بکاتەوە.

ئەم ڕاستییە کە وا بۆ خۆی بە بەریەوە هەیە گەلێک تەنبێ کردنی ناحەق و دەستدرێژکەرانە بە کاری ڕەوا لە قەڵەم بدات هەر بە جارێ دەکەوێتە گۆشەی فەرامۆشییەوە کە ڕابگیرێ لەبەر سێبەری تاریکی کەمتەرخەمیەکەی باسمان کرد. من لێرەدا کە دێم ئەم دوو ڕاستییە بەیەکەوە کۆدەکەمەوە مەبەسم ئەوەیە خەیاڵی خوێنەر بۆ حەقیقەتێکی گەورە ڕاکێشمەوە. هەموو ڕاستییەکانی باسم کردن و ئەوانەی لێرە بە دواوە باسیان دەکەم یەک ڕاستیی گەورەی بێ جەمسەر و بڕگە و بەیەکەوە و سەرانسەرن نەک وەها لە یەکتر پچڕاو و دابڕاو و تەنها تەنهان وەک لەم نووسینەدا ژمارە و زنجیرەیان بۆ دادەنێم، هەڵوەستی خەڵقی ئەو سەردەمانەش لە نێوان ئەو ڕاستییانەدا کە بەشێکی واقیعی فرەوانن بە شێوەیێکی عەفەوی و بێ مامۆستا و خوێندنەوەی نووسراوی وەک ئەمە بوە، واتە ئەوان لە هەڵوەستیاندا وەک خەڵقی ئەم سەردەمە نەبوون کە مەجبوورن بەپێی تەعلیمات و مادده یەک و دوو و سێی یاسا و بەرنامان ڕەفتار بکەن.

خەڵقەکە لە کەمتەرخەمیی پەرۆش بۆ غەیردا نەیاندەزانی بەو کەمتەرخەمییە چەند بیروباوەڕی دوارۆژ سەغڵەت دەکەن کە حەزیان لێیە چینی چەوسێنراوە لە ڕابردوو کەمتەرخەم نەبوو بێ لە ئاست بەرژەوەندی خۆی و پەرۆش بۆ غەیردا هەمیشە کاتیش دەستەویەخەی براگەورە و دەرەبەگ و بۆرجوازییان بووبێت. خۆ منیش هەر حەزم بەوە دەکرد بەڵام حەز پێ کردنەکەم ناگاتە ئەو ڕادەیە لە نەبوویەوە دروستی بکەم و مێژووی کۆن و نوێ بشێوێنم.

هەرچی حەز کردنی شەخسیی هەیە ناتوانێ بێ دەسکاری کردنی مێژوو، حاجی قادر و هاوچەرخەکانی لە کوردستانی عێراقدا، بەگژ براگەورە و دەرەبەگاندا بهێنێت. کە ئەگەر ئەو بەگژدا هێنانە لەسەر کاغەز دروستیش کرا نە سوودێک بە هەژاری صەد ساڵ و هەزار ساڵی پێش ئەمڕۆ دەگەیەنێت نە هەژاری ئەمڕۆش دەتوانێ لە مێژووی دەسکرد سوود وەرگرێت. بە پێچەوانە، لەوانەیە مێژووی ئێستاشی لێ

سەرەوبن بکرێت و برسیایەتی لەسەر حیساب بکرێ بە تێری. دەستەودامەنبوونی من لەگەڵ گەنج و ڕۆشنبیری کورد بۆ نەشێواندنی مێژوو لە پێش هەموو شتێکدا بەرژەوەندی چینی هەژاری ئەمڕۆ و دوارۆژی بە چاوی خۆیەوە گرتوە چونکە لە سەرەوبن کردنی مێژوو و سازدانی واقیعی کارتۆنی سەرکاغەز کە مومکین نیە خێر و خۆشی لێ بڕوێت، ئەوەی تێدەچێ و تێدەشکێ و برسی و ڕووت دەمێنێتەوە هەر ڕەش و ڕووت و هەژارەکەیە، ڕۆشنبیرەکە و خاوەن شەهادە و وەزیفەکە زەرەرێکی ئەوتۆ ناکات پێیەوە دیار بێت، خۆ ئەگەر بە ڕواڵەت شتێکی کەمیشی لەکیس بچێت لە دوو لاوە تێی دەهێنێتەوە. یەکەم لە لایەن خۆهەڵدانەوە و پایە لە خۆنان بە ناو دەر کردنی میللەتپەروەری و ڕۆشنبیری و شۆڕشگێڕی، دەشزانی ڕێگە لە پێش کەس نامێنێتەوە بە درۆی بخاتەوە وەک پێشتر شاعیری عەرەب لە باری وەهادا گوتوەتی:

تلوا باطلا صارما

وقالوا صدقنا فقلنا نعم

مرۆڤیش کە ناوی دەرکرد بەو لەقەبە نازدارانە خێر و خۆشی لە هەموو لایێکەوە بەسەریدا دەبارێت. من شۆڕشگێڕم دیتوە، تۆش هی وەهات دیتوە، لە سەرەتای شۆڕشی تەمووزی 1958 دینارێکی نەبوو، ساڵی تێوەرنەسووڕایەوە بەسەر شانی بزووتنەوەی نیشتمانپەروەرییەوە تێهەڵکشی بەرەو ئەوەی پێی دەڵێن ناز و نیعمەت، کەسیش لێی بە عەیب نەگرت.

دووەم لایەن ئەوەیە کە ئەگەر ڕاستەوخۆش پارە و پوولی بەسەردا نەبارێ، ڕێی چالاکیی جۆر جۆر و هاتوچۆی ناوەوە و دەرەوە و ئاهەنگ بەرپا کردن و چشتی وەهاوە هەموو زەرەران پڕ دەکاتەوە و پاشەکەوتیشی دەبێت. حاجی قادری بێدەرەتان چەند بەدبەخت بوو لەچاو ئەو شۆڕشگێڕانەی کە دوای دەیان ساڵ لە مردنی، چ لە ڕێبازی عەیبدار کردنی ئەوەوە بێت و چ لە ڕێبازی دەسکاریی کردن لە خەباتی ئەوەوە بێت هەموو هەژاری و نەداری و بێ پارەیی و ئیفلاسی ئەویان بۆ خۆیان گێڕا بە خێر و خۆشیی... چەند سەیرە، ڕۆشنبیری کورد لەم ڕاستییە یەکجار تاڵەی

بەردەستی خۆمان بەدەنگ نەیێت بەڵام ڕازی بێ لە گۆڕینی ڕاستییەکانی مێژووی تێپەڕیوی مردوو.

من دەمەوێ لە بەسەرهاتی حاجی و نرخاندنی خەبات و بیروڕاکانی نشتەر بخوازمەوە بۆ خەبەر هێنانەوەی گەنجی خەوێنراو و چاوبەستەکێ لێکراو، ئەویش مومکین نابێ ئەگەر هەموو تاڵایی واقیعی نەخەمە بەرچاو، تەڵەکەبازی مەیدانی نیشتمانپەروەری و چینپەروەریش پاروە نەرم و چەورەکەی لە قوڕگی گیر نابێ ئەگەر گەنجی تێگەییشتووی پێگەییشتووی دڵسۆزی کورد لەڕێی حیساب لەگەڵ کردندا پەنجە لە قوڕگی ئەو تەڵەکەبازە توند نەکات و پاروەکەی پێ نەتفێنێتەوە، ئەوەی لەم قسانەشم دەتۆرێ، ڕازی بێ و ڕازی نەبێ، یەکێکە لەوانەی حەز دەکا پارووی چەور و نەرمی حەرام بە خۆش لە گەرووی خۆی ئاوا کات.

لە پاش ئەم ڕاستییانە دوو ڕاستیی یەکجار گرنگ و بنجی و کاریگەر هەن بە نیسبەت نووسینەکە و بە نیسبەت پێکهێنانی نۆڕینێکی ڕاست و دروستیش بەرانبەر ئەم پرسیارەی دەرەبەگایەتیی کورد و هەڵوەستی حاجی قادر لە ئاستیدا، یەکێکیان بەراورد کردنی دەرەبەگایەتیی کوردە لەگەڵ فیوداڵیزمی ئەورووپا، دووەمیان ڕووبەڕووبوونی حاجی قادرە لەگەڵ براگەورە و دەرەبەگ و سەرەک عەشیرەت و خاوەن دەسەڵات و شۆرەتی کورد لە نوقتە نەزەری خەباتە قەومایەتیەکەیەوە بەپێی زەرف و کاتی کە حاجی تێیدا ژیاوە. لەگەڵ بەسەرچوونی شی کردنەوەی ئەم دوو ڕاستییە گەورەیەدا سەرلەبەری ژیانی حاجی لە کۆیە و کوردستان بەسەر دەچێت و ئەم بەشەی سێیەمی نووسینەکەش بە پایان دەگات کە وا بەڕاستی لە سەرەتاوە هەر سێ بەشیان بە ناوەڕۆکی یەک کتێب دانراون، مسوەددەی هەموشیان بەیەکەوە ئامادە کرا تەنانەت تاکە یەک وشەشم لە بەسەرهات و خەبات و فکر و ژیانی حاجی لە ئەستەمبۆڵ نەخستبوە سەر کۆتایی ئەم قۆناغەی ژیانیەوە بەو بۆنەیە کە هەردوو قۆناغ بە تەواویی لە یەکتر دەترازێن و دەکەونە بەر تین و تاوی کاریگەریی کۆمەڵایەتیی لە یەکتر جوداوە.

من کە دێم دەرەبەگایەتیی کورد بە فیوداڵیزمی ئەورووپا دەگرم مەبەسم ئەوە نیە دیراسەی سەربەخۆی فیوداڵیزم بکەم چونکە ئەم کارە لە پەراوێزی باسێکی تردا جێی نابێتەوە، چی لەم لێکۆڵینەوەشدا دێتە ناو حیسابەوە شتی وەها ئاشکران هەر پێی دەوێ زیهنی خوێنەری بۆ ڕاکێشرێت. نووسەر هەن حەز بەوە دەکەن لە نێوان

دوو دێڕاندا ناوی یەک دوو سەرچاوە بێنن هەرچەند بابەتەکە هێندەی ئەلف بێتەکەش سەرەتایی بێت هەر دەڵێی بەلایانەوە ناوی سەرچاوە هێنان لە نووسیندا وەک دەستنوێژ وابێ لە نوێژ کردندا، کەچی مەعلوومە دەوڵەمەند کردنی نووسین بە سەرچاوەی زۆر لەو کارانەدا دەبێت:

1) بەبێ سەرچاوە ساغ نەکرێتەوە.
2) لە ڕایەک پتر دەربارەی باسەکە هەبێت ئیتر تەرجیحی یەکێکیان داخوازیی ناوبردنی سەرچاوان بکات.
3) سەرچاوەی نوێ لە باسەکەدا دۆزرابێتەوە جارێ خەڵق نەیبیستبن.
4) سەرچاوەی باسی پێشوتر بە درۆ بخرێتەوە...

بەڵام چ پێویست نیە سەرچاوە بهێنرێتەوە بۆ ئیسپات کردنی عەباسییبوونی «متوكل على الله» وەیا خراپبوونی بەغدا لە 656 ی کۆچی بە دەست هۆلاکۆوە.

نووسەری کوردم دیتوە ناوی دووسێ سەرچاوەی بردوە لە کاتی هێنانەوەی نموونە بۆ بەکارهێنانی وشەی عادەتیی کوردی لە ڕستەدا. لەم نووسینەدا کەوا من بە دەگمەن نەبێ ناوی سەرچاوە نابەم ئەگەر حەز بکەم یەک فەرهەنگی ڕێکوپێکت بۆ ساز دەدەم لە ناوی سەرچاوەی هەرچی زانست و ئەدەب و ئایین و هونەر و فۆلکلۆری کۆن و نوێ و ڕۆژهەلات و ڕۆژاوا هەیە کە ناوی هەمویان و دە ئەوەندەی تریش بایی فلسێک یارمەتی لێکۆڵینەوەکە و حاڵیبوونی تۆش نادەن.

لەبەر ئەمە من لە باسی فیۆداڵی ئەورووپا بە لیستەی سەرچاوانەوەت خەریک ناکەم، لە گۆشەی وەهاوە بەراوردی دەکەم لەگەڵ دەرەبەگایەتیی کورد کە نووسەری عادەتی شارەزای بێت، مەعلوومیشە مەبەستەکە بریتیە لە پتر ڕوون کردنەوەی هۆی هەڵوەستە زۆر ئاشکراکەی حاجی قادر بەرانبەر براگەورەکانی کوردی سەردەمی خۆی. کە ئەمە مەبەست بێت چ لزوم هەیە بگەڕێمەوە بۆ باسی دەوری پەیدابوونی باروت لە کز کردنەوەی دەسەڵاتی فیۆداڵ و بەهێز کردنی دەسەڵاتی ناوەندیی حکومەتەکانی ئەورووپا وەیا ئەو یاسایانە و دەستوورە کۆمەڵایەتیانەی پێوەندیی فیۆداڵیان بە ڕەعیەوە ڕێک دەخست وەیا ئەرکی دەرخستنی تەئسیری فیوداڵ لە گیانی چاپوکسواریی بکێشم وەیا باسی هونەر و

فیۆداڵ، کەنشتە و فیۆدال، شەڕی خاچپەرستەکان و فیۆداڵ... بدەمە بەر لێکۆڵینەوە لە حاڵێکدا من دەمەوێ دیاردەیێکی زۆر مەفهومی پێوەندیی حاجی بە
دەرەبەگایەتیی کوردەوە مەفهومتر بکەم لە ڕێی دەرخستنی جوداوازیی نێوان ئەو و فیۆداڵی ئەورووپاوە کە دەزانین نووسەرانی کورد کاتێک کەوتنە سەر هەڵە کردن لە باس و دەوری دەرەبەگایەتیی کورد کە چاویان بە نووسینی نووسەرانی نوێخوازی ئەورووپا کەوت لە بارەی فیۆداڵەوە. بە تایبەتیش لە نوقتەی نەزەری چینایەتی و گۆڕان و بەرەو پێشچوونی کۆمەڵایەتییەوە، واشیان برایە مێشکەوە کە سەرانسەری ئادەمیزاد یەکچوونە لە ڕووی گۆڕان و چەند و چۆنی چینەکان و جۆری ستەم کردنی خوێنمژان و لەسەرخۆ کردنەوەی خوێنمژان و... هتادەوە کەچی نەختێک وردبوونەوەی سەرپێی دەریدەخات جوداوازیی کورد لە میللەتێکی تری خاوەن کیانی بە ماف گەییشتوو پترە لە جوداوازیی نێوان فەلاح و کوێخا و ئاغا وەیا جوداوازیی کرێکار و کاسبکار و بازرگان...

جا ئەگەر ڕەوا بێ مێژووی کورد و واقیعی کورد بخرێتە ژێر حوکمی ئەو نیگایە و بیروڕایەی سەیری مێژوو واقیعی میللەتێکی تری وەک ڕووس و ژاپۆن دەکات دەبێ بە ڕاشکاویی چینی فەلاح و کوێخا و ڕەنجبەر و گاوان و خاوەن مڵکیش بەیەک نیگا سەیر بکرێن، عەمەلە و دوکاندار و توجاری شەکر و چایەش بەیەک چین دابندرێن.

ناشێ خوێندەوارێکی کورد ئەوەندە لەگەڵ خۆی و میللەتەکەیدا بێ ئینساف بێت حەوت بەشی لێقەوماویەکەی لە بیر خۆی بباتەوە هەر بۆ خاتری ئەوەی لە دەستەی تەرازووی نەزەریەدا هاوسەنگی میللەتانی تر بێت نەکا بگوترێ ڕێبازی مێژوویی لە میللەتێکەوە بۆ میللەتێکی تر جوداواز بوە. ڕۆشنبیرێکی کورد کە هات و چاوی خۆی لەم ڕاستییە ناقۆڵایەی وەک یەک نەبوونی کۆمەڵایەتیی کورد و فرەنسە پۆشیی ئیتر بۆ دەبێ بسەلمێنی جوداوازیی هەبێ لە نێوان واقیعی کرێکار و واقیعی کرێگرتوودا خۆ هەتا ئەم دوو واقیعە لە یەکتر جودا بن هێندەی جودایی کورد و فەرەنگ نابێت.

ئەگەر ئەم هەموو خۆماندوو کردنەشی هەر بۆیە بێت کە حەق بداتە فەلاح و کرێکار بۆ ئەوەی خەریکی تاکە ئامانجی سوودی چینایەتی وەیا تاکایەتیی خۆیان بن، بێ ئەوەی گوێ بدەنە مافی نەتەوایەتی، کەواتە بۆچی بەرەی موظەفەکانیش ئەم

مافەی بە خۆوە خەریکبوونیان پێ ڕەوا نەدیترێت... هەروەهاش هەموو بەرە و تاقم و چینەکانی تری کۆمەڵ.

بەڵێ دەزانم کرێکار و فەلاح حەقیانە، هەتا بڵێی حەقیانە، بە مافی ڕەوای خۆیان بگەن و مرۆڤایەتیی خۆیان و خێزانەکانیشیان لە کۆمەڵدا بچەسپێنن. لەمەشدا بەسەر شانی ڕۆشنبیرەوەیە یارمەتیی مەردانەی کرێکار و فەلاح بدات بەڵام دەبێ هەمیشە لەبەر چاومان بێت مافی کرێکار و فەلاح و هەموو کەسێک و بەرە و تاقم و چینێکیش لە ناو جغزی قەومایەتییدا ڕێزی لێدەگیرێت، واتە کە مافەکەیان لە مافی قەومایەتی ترازا دەبێتە لەمپەڕ لە پێش ڕەوتی تێکڕای نەتەوە[126] چونکە بەپێی

[126] لە کاتی چاپ کردنی ئەم دێڕانەدا، بەڕێکەوت ژمارە 8 ی ساڵی 1976 ی گۆڤاری «آفاق عربية» م کەوتە بەرچاو، دوانێکی مامۆستا میشیل عەفلەقی تێدا بڵاوکراوەتەوە. لەو دوانەدا بە پێی ڕوون کردنەوەی بیروڕای خۆی لەبارەی دۆزینەوەی هۆی بەرەو پێشچوونی بزووتنەوەی قەومایەتیی نەتەوەی عەرەب دەکەوێتە سەر لێکۆڵینەوە لە دەستدان و دەستنەدانی شێوازی مارکسایەتی و کۆمیونیزم بۆ ڕزگاربوننی نەتەوەی عەرەب لە ئیستیعمار و دواکەوتن. لێرەدا هەندێک نموونە لە دوانەکەی مامۆستا عەفلەق دەخەمە بەرچاو بە نیازی نیشاندانی چۆنیەتی بۆچوونی ڕابەرێکی نەتەوایەتیی برا عەرەبەکان لەم پرسیارە یەکجار گرنگەی گونجان و نەگونجانی بەرژەوەند و فەلسەفەی قەومی لەگەڵ فەلسەفەیێکی تر کە ڕاڕەوێکی سەربەخۆی جودا لە قەومایەتی دەگرێتە بەر. لە ستوونی یەکەمی لاپەڕە پێنجی گۆڤارەکە ئەمە دەخوێنیتەوە:

*لقد كان الصراع المباشر مع الغرب... اما الصراع غير المباشر فكان مع الشيوعية، كل ممكن وقابل لان يحتل عقول الاجيال العربية. فى مرحلة الثورة او التهيؤ للثورة لا تكون خصومتک الفكرية مع الرجعية - وان كانت تحاربها – انما تكون مع الذى يحارب الرجعية ليأخذ دورک، ومن هنا كان ما يشغلنا هو كيف نستطيع محاربة اوروبا الاستعمارية في الوقت الذي نتفادى فيه خطر الشيوعية، كفكر يؤثر على عقول الشباب ويجعل من نفسه البديل لحركتنا.*

له ستوونی سێیەمی هەمان لاپەرەدا ئەمە دەخوێنیتەوە، کۆتایشی کەوتۆتە لاپەڕەی دواتر:

*قرأنا الاسلام، هذا الاسلام هو الاسلام بعد قراءة الشيوعية... بعد مواجهة التحدى الاستعمارى الغربى وحضارته، وبعد الاطلاع على الحل الثوري الشيوعي الآتى من الغرب أيضا، فهي، أذا، قراءة من خلال موقف مصيري من تحديات الاستعمار والحضارة الغربية ومن تحديات الفكر الشيوعي.*

له ستوونی سێیەمی لاپەڕە شەش بەدوا قسە لە بابەت نەمریی ئیسلامەوە دەڵێ:

*هذا بالذات اعطنا جرأة معينة لنقد الشيوعية... اي ان نقدنا للشيوعية لم ينحصر في ان الشيوعية لا تلائمنا كعرب، بل تعداه الى الكشف عن النقص الاساسي في هذه النظرية... عندما نقول ان القومية شيء خالد، وان الشيوعية قفزت من فوقها وارادت ان تحطمها...*

دوای دەربڕینی گەلێک بیروڕا و بۆچوونی تر دەربارەی دەوری نەتەوایەتیی عەرەب لە جیهان و تێپەڕینێکی برایانەی خێرا بە «قضية الاكراد» – ستوونی یەکەم لە لاپەڕە نۆدا، لە کۆتایی دوانەکەدا ئەمە دەڵێ:

*ان الثورة هي من اجل القضاء على التخلف والاستغلال... من اجل القضاء على الاستعمار... ومن اجل سعادة الناس... الخ. ولكن هذا يأتي في الدرجة الثانية بعد الرسالة... فهذه الاشياء هي المميزة فعلا لحركتنا، لان التفكير الماركسي، وشبه الماركسي، والعلمي وشبه العلمي لا يوصل الى هذه الحقائق... واحيانا يوصل الى الاستهزاء بها والتنكر لها ومجافاتها... وبالتالي الى التعثر والفشل.*

له پەراوێزی یەکەمی سەرەتای ستوونی سێیەمی لاپەڕە نۆشدا دەڵێ:

*النظرية الشيوعية وليدة الغرب وقومياته المتعصبة المتناحرة، وصناعته المتضخمة، لذلک فهي في البلاد العربية تحارب أمراضا غير موجودة اي انها تلهي العرب عن محاربة امراضهم الحقيقية.*

*فالشوعية تهدم العصبية القومية في امة لم تتكون قوميتها بعد، وتخشى من هذه العصبية على الامم الاخرى وعلى السلام العالمي في وقت لا يزال العرب فيه محكومين من قبل غيرهم.*

*واخيرا فالشيوعية تمنع العرب من التفكير في اشتراكيتهم والاهتداء اليها لانها تدعى ان الاشتراكية هي الماركسية، ولا اشتراكية الا فيها وبها....*

من له نیشاندانی ئه‌م نمونانه یه‌ک مه‌به‌ستم هه‌یه. ده‌مه‌وێ خوێنه‌ری کورد له ڕێی نووسینی کوردییه‌وه قسه‌ی ڕابه‌رێکی عه‌ره‌ب بخوێنێته‌وه له باره‌ی ڕا گرتنی فکره‌ی قه‌ومایه‌تی ژووروی هه‌موو فکره‌یێکی تره‌وه، هه‌روه‌ها نه‌گۆڕینه‌وه‌ی فکره به سوودی ماددی. خوێنه‌ر ده‌بینێ من له موناقه‌شه‌ی بیروباوه‌ڕی کوردایه‌تی ده‌یێکی ئه‌و ڕێگه‌یه‌م نه‌بڕیوه که له‌و به‌خۆدا ڕاپه‌ڕموونه‌ی مامۆستا عه‌فله‌ق ده‌رده‌که‌وێت. هه‌ڵبه‌ت گه‌لی کورد له‌و باره‌دا نیه هێنانه‌دی ئامانجی جیهانی له بزووتنه‌وه قه‌ومییه‌که‌یدا جلوه ببه‌ستێت وه‌ک که نموونه‌کانی سه‌ره‌وه و به‌شه‌کانی تری دوانه‌که ڕاگه‌یاندنه‌کانی فه‌لسه‌فه‌ی عه‌ره‌بایه‌تی به هه‌مو جیهان و به درێژایی مێژووی ئاینده ده‌کاته ئاکامی تایبه‌تیه‌کانی عه‌ره‌بایه‌تی و ئیسلام له وێنه‌ی حه‌تمیه‌تی مێژویی که هه‌ر ده‌بێ ببێ. من له نووسینمدا هه‌ر ئه‌وه‌نده جورئه‌تم کردوه بڵێم ناشێ بۆ مرۆڤی کورد هیچ بیروڕا و به‌رژه‌وه‌ندێک پێش بیروڕای قه‌ومایه‌تی بخاته‌وه وه‌یا سوودی چینێک بکاته یه‌که‌م ئامانج له خه‌باتدا، هه‌رگیزا و هه‌رگیزیش نه‌مگوتوه نابێ مرۆڤی کورد ڕێبازی بزووتنه‌وه‌ی کۆمیونیزم بگرێته به‌ر وه‌یا باوه‌ڕ نه‌هێنێ به ڕاستبوونی بنگه فکرییه‌کانی. من پێم له‌سه‌ر دوو مه‌رج داگرتوه، یه‌که‌م مه‌رج ئه‌وه‌یه مافی نه‌ته‌وایه‌تیی پێش مافی چینایه‌تیی بخرێته‌وه، مه‌رجی دووه‌م ئه‌وه‌یه بیروباوه‌ڕ نه‌کرێته ئایین و وه‌ک دۆگما بخرێته مێشکانه‌وه و ئیتر ڕه‌خنه گرتن و ته‌عدیل کردن و ڕاست کردنه‌وه هه‌ڵنه‌گرێ وه‌ک ئه‌وه‌ی له ئاسمان هاتبێته خواره‌وه.

به‌لای باوه‌ڕی منه‌وه بزووتنه‌وه‌ی کوردایه‌تی له بارێکدایه نه‌ک ته‌نها ڕێی نیه وه‌ک بزووتنه‌وه‌ی عه‌ره‌بایه‌تی خۆ بکاته بیروڕا و فه‌لسه‌فه‌یێکی جیهانی، بگره له‌وانه‌یه

داخوازیی مافی بەرتەسکی بەرە و تاقم وەیا چین خاوەن مافە بەرتەسکەکە خۆی لە ڕووباری بەرژەوەندی قەومی و نژادیی دادەبڕێ وەک شەلەگە کە لە جۆگە دادەبڕێ، وەیاخود لە کاتی تایبەتییدا خۆ دەداتە پاڵ حاڵ و بارێک کە سوودی بەرتەسکی تێدا بێت و بەس.

دەمێنێتەوە لە خۆمان بپرسین ئایا مومکینە چینێکی سەرلەبەر بکەوێتە هەڵوەستێک لەگەڵ بەرژەوەندی قەومایەتی ڕێک نەکەوێت؟ لەوەرامدا دەڵێم نەک هەر مومکینە

---

خۆی لە حاڵێکدا ببینێتەوە پاراستنی خۆی، بە شێوەییێکی گشتی، لە خۆدانە پاڵ بەرەی سۆشیالیست وەدەست بهێنێ واتە بەرەی کوردی سەر بە فکرەی قەومایەتیش بچێتە ژێر دروشمەکانی «أممیة». کە ئەمە دەڵێم ئاگادارم لەوە تاکوو ئێستا بەرەی «أممیة» بزووتنەوە و مافی نەتەوایەتیی کوردی تێکەڵ بە حیسابەکانی خۆی نەکردوە، ئاگام لەوەش هەیە مرۆڤی کوردی دەست ڕۆییشتوو لە بزووتنەوەی «أممیة»دا بە درێژایی کات دژی دانهێنان بووە بە بوونی ڕێکخراوی سیاسی و خەباتی قەومایەتیی سەربەخۆی کورد لە هەمو ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا، کە ئەمە گومڕایی و هەڵگەڕانەوەیە لە هەرچی پێی دەڵێی مرۆڤایەتیی و بیری پاک.

بەلای منەوە کورد کە ڕێی خەباتی نەتەوایەتیی لێ حەرام کرا حەقی نامێنێ خەبات بۆ شتێکی تر بکات، هەر ئەوەندەی بەسەر شانەوە دەبێ وەک «مواطن» لە هەر جێگەیێک بێت پێویستەکانی قانوونی جێبەجێ بکات و گوزەرانێک بگێرێت تا ئەو ڕۆژەی لە بیری خۆی وەیا بیری نەوەی دەچێتەوە کە کورد بووە. چەند سەیرە کوردێک ڕێی پێ نەدرێ خەباتی نەتەوایەتی بکات بۆ وەدەست هێنانی مافەکانی قەومایەتیی خۆی بەلام لێی داوا بکرێ هەوڵ بدا بۆ وەدەست هێنانی مافەکانی چینی پڕۆلیتاریای جەزایری واقلواق، پڕۆلیتاریای واقلواقیش گوێ نەداتە مافی کورد. بەو پێیە مامە کورد دەبێتە تۆپەڵە موو بە کۆتایی کلکی بزووتنەوەی جیهانییەوە.

من لە گۆشە نیگای سوودی کوردایەتییەوە دڵم بە قسەکانی مامۆستا عەفلەق بەوەدا خۆشە کەوا لە کولانەی ڕەوا دیتنی جیهانیی بوونی بیروڕای عەرەبایەتییەوە فەتوایێکی سەرەتاییش دەردەچێ بۆ ڕەوا بوونی داوا کردن و چەسپاندنی مافە نەتەوەییەکانی کورد بایی ئەوەی بوونی کورد دەپارێزێت و گەشەشی پێ دەدات.

بەڵکوو ڕووشی داوە، لە دوارۆژیشدا ڕەنگە ڕوو بدات بە تایبەتی لە نێوان میللەتی وەک کورددا کە سنووری ئاشکرا بە دەوری بەرژەوەندی قەومایەتیەکەیەوە نەکێشراوە تاکوو لێدەرچوونی زەحمەت بێ وەیا بەرچاو بێ، چ دەسەڵاتی گشتیی کوردایەتیش نیە لە پانایی و بەرینایی کوردستاندا بتوانێ ڕیزپەڕان بهێنێتەوە ناو کۆمەڵ.

خولاسە... سەیر کردنی فیۆداڵیزمی ئەورووپا و دەرەبەگایەتیی کورد بە یەک چاو و هەڵسەنگاندنیان بە یەک کێش و تەرازوو وەهامان ناشارەزا دەکا لە کۆمەڵایەتی و مێژوو هەر دەڵێی دەمانگێڕێتەوە بۆ ئەو ڕۆژگارەی کە مرۆڤێکی نەخوێندوو سەیری دەشتودەری دەکرد وای دەزانی سەرانسەری زەوی یەک ڕووی پان و تەختە، وەیاخود کە دەیدیت ڕۆژ و مانگ و ئەستێرە ئاوا دەبن پێی وابوو ئەوانیش دەچنەوە بن نوای حەسانەوە تا ڕۆژێکی تر. بەڕاستی گەلی کورد پتر لەوە زەرەرمەند دەبێ کە وەکوو میللەتێکی ئەورووپا سەیر بکرێت نەک لەوەی زەویی بە تەخت و ڕاست بزانرێ وەیا ڕۆژ و مانگ و ئەستێرە لێفەی حەسانەوەی سەوانەیان بەسەردا هەڵکێشرێت چونکە زۆر بە درەنگەوە زەرەرمەندبوونی زانستی فەلەک کار دەکاتە سەر سوود و زیانی کورد.

دەرەبەگایەتی و براگەورایەتی و سەرۆک هۆزایەتیی کورد نەک هەر لەو ڕوانەوە لە فیۆداڵی ئەورووپا جودا دەبێتەوە کە نەختێک لێرە بە پێشەوە باسم کرد، باس کردنەکەش لە گۆشەنیگای پێوەندیی دەرەبەگایەتی و فیۆداڵیزم بە خەڵقەوە بوو نەک لە گۆشەی «تکوین»یانەوە، چونکە بە ڕاستی و بێ فێڵ لە خۆ کردن، بایی جودایی واقیعی صەدان ساڵی لێرە بە پێشەوەی کورد لە واقیعی صەدان ساڵی لێرە بە پێشەوەی ئەورووپا، دەرەبەگایەتیی کوردیش لە فیۆداڵیزمی ئەورووپا جودا دەبێتەوە کە دەکا جوداوازییێکی سەرلەبەر و لە هەموو ڕووییێکەوە.

ئەوانەی گەشتی ئەورووپا دەکەن، کە بە داخەوە من یەکێک نیم لەوان، و قەڵای بنەماڵە فیۆداڵەکانی لێرە بە پێشەوەی ئەڵمان و فرەنسە و ئیسپانیا و بریتانیا و ڕووسیا و ئیتاڵیا... و نەمسە دەبینن دەتوانن بە چاوی خەیاڵ وێنەیێکی شڕە دیوەخانەکانی سەرۆک هۆزەکانی کورد لە تەنیشت وێنەی ئەو قەصر و قەڵاتانەدا دانێن و وەک یەکبوونی بارۆنێکی ئەڵمانیا و مارکیزێکی ئیتاڵیا و کۆنتێکی فرەنسە...

و پیربالْ ئاغاییێکی قڕناقەو[127] و دۆڵی شاربازێڕم لە بەیەکتر گرتنی ئەو دوو دیمەنە بۆ هەڵێنجن.

تۆ بێی هەولێری ساڵی 1600 ی زایینی بە پاریسی ئەو ساڵە بگریت کەمتر بە هەڵە چوویت لەوەی سەرۆک عەشیرەتی کورد و فیۆداڵی ئەورووپای هەمان ڕۆژگار بەیەکتر بگریت چونکە ئەوەی پێی دەڵێن شار چەندێکیش دواکەوتوو بێت بایی وەصفی شارایەتیی خۆی لە مەفهومەکە نێزیک دەخاتەوە، لە حاڵێکدا هۆزەکان، بە تایبەتی ئەوانەی حاجی قادر لە ناو شاخ و داخەکاندا ژیانی لەگەڵ بەسەر بردوون، گەلێکی وەهایان تێدا هەبوو، ئێستاش نموونەیان ماوە و خۆم تێیاندا ژیاوم، لە ڕووی پێشکەوتنی ماددییەوە چ فەرقێکیان نەکردبوو لەگەڵ هۆزەکانی هەزاران ساڵ لەمەوپێش.

بەڕاستی هۆزی هێندە سەرەتایی و دواکەوتوو هەبوە لە نێوان شاخ و داخ و هەڵەت و پەڵەتی کوردستان، ئەوەندە تەفاعولەی لەگەڵ سروشت و دەوروبەردا نەکردوە زۆری دوورخاتەوە لە تەفاعولی ڕێوی و لەکلەکدا. هەروەک لەکلەک دڕک و داری خواکردی هێناوە بەسەر درەختی خواکردەوە کردوەتی بە هێلانە، ئەو هۆزەش ئاو و گڵی خوای کردوە بە قوڕ و لەگەڵ بەردی خوادا دیواری پێهەڵناوە و دار و پووشی خوای کردوە بە ڕایەڵ و بنمیچ… لە لایەن گوزەرانیشەوە، مەڕ و ئاژەڵی خوای بە پووش و پاوانی خوا بەخێو کردوە وەیا بە گاجوتی خوا ئەرزی خوای کێڵاوە و گەنمی خوای پێوە کردوە و بە بارانی خوا ڕواوە… کە ئەمە چالاکییێکە خزمی چالاکی تەیرە ئەبابیلە کە دێت و بە مێشوولە و پەپوولەی خوا تێر دەبێت. خۆ ئەگەر شانەی هەنگ بکەینە نموونەی بەراورد کردن، مەهارەتی هۆزەکە و تەفاعولی لەگەڵ سروشتدا کورت دێنێت.

هۆزە سەرەتاییەکانمان لە چەند فەقەرەییێکی بەڕێوەچووندا پلەی زێدە ساوای مامڵەت لەگەڵ سروشتیان تێپەڕاندوە، وەک دانانەوەی ئاشی ئاو و هەڵبەستنی کاروباری جووت و تەشی ڕستن کە لەوانیشدا بەشێکی کەرستەکەی کارەکان لە

[127] گوندێکە لە نزیک بناری کێوی قەندیل بە دیوی عێراقدا.

شارەوە بە حازریی دەگاتە نێوان هۆزەکان لەوە بەولاوە عەشیرەتی کورد بەڕاستی هێندەی پەڕەسێلکە ڕۆڵەی سروشتە، با بڵێین ڕۆڵەی سروشت بوە.

ئەورووپا گەڕاوەکانمان با چاوێک بە کاتدرایەکانی صەدەکانی ناوەندیی ئەورووپادا بگێڕن و لەگەڵ کەنشتە کاولەکانی کۆیە و دێرە هەریری بەراورد بکەن، ناشڵێم ئەو تابلۆ نەمرانەی بە ڕیشەی گەورەترین وێنەکێشی ئەو ڕۆژگارەی ئەورووپا کێشراون بیانهێنێتە ناو حیسابی بەراورد کردنەوە هەروەهاش ئەو تابلۆیانەی بەسەر دیواری هۆڵ و صالۆن و ڕارەوی قەصری فیۆداڵەکانەوە وێنەی باب و باپیرەکانیان نیشان دەدەن، چونکە نە لە کەنشتەکانی کوردستاندا و نە لە کاولە دیوەخانەی براگەورەکانی عەشیرەتی کورددا تابلۆی هونەریی نیە بە شتێکی تر بگیرێن مەگەر ئەو خیت خیتانەی منداڵەکان بە خەڵوز لەسەر زەوی و دیواری دەکێشن...

قەصر و قەڵاتی فیۆداڵی ئەورووپای بەر لە 500 ساڵ، سەرەڕای ئەوە کە نموونەی هەرە پێشکەوتووی هونەری خانوو دروست کردن و جوانی و قەشەنگیی بوون، ناوچەی هونەر و ئەدەب و زانست و پرۆتۆکۆل و جلکی جوان و سەمای شیرن و داب و دەستووری شاهرستانانە و هەموو دیمەنێکی ژیاریی ئەو سەردەمانە بوون. تەویلە و خانووی عەرەبانەی ئەوسای فیۆداڵێک لەچاو دیوەخانەی ئەمڕۆی سەرۆک عەشیرەتێکی کورد وەک دیوەخانەی سەرۆکەکە بوە لەچاو تەویلەخانەی سەرۆکەکە خۆی. گومانت لەوەدا نەبێ، بارۆنێکی ئەڵمانیای ساڵی 1400 هەرگیز دڵی نەهاتوە ولاغەکەی و صەگەکەی لە ژوورێکی وەک ژوورە دیوەخانەی عەشیرەتی کورددا ببەستێتەوە. تاکوو یەکێک دەگەیشت بە قابلیەتی ژین و حەوانەوە و ڕاهاتن لە ڕابواردنی ناو قەصری فیۆداڵێکی ئەورووپا، دەبوو سەرگوڵی ژیاری ئەو سەردەمە هەزم بکات و لەش و جلک و هەڵستان و دانیشتن و سەلام و مەرحەبا و جۆری ئاخاوتن و دانس کردن و سواربوون و دابەزین و... هەموو کردە و گوتەیێکی ببێتە نموونەی ناسکی و شلکی و جوانی و هونەر. ئێستا لەم ڕۆژەی هاوینی 1972دا یەک سەرەک عەشیرەتی کورد نیە ئەوەندە خاوەن مەدەنیەت و لیاقەت بێ، بە کەڵکی ژیانی ناو قەصری کۆنتێکی 1472 بێت، نەخێر ناتوانێ لەگەڵ مەیتەری مارکیزێکی ئەوسای ئەورووپا ئاخاوتن بکات.

ئەوانەی وا دەزانن فیۆداڵی ئەورووپا و دەرەبەگی کورد یەکچوونن خەیاڵێکی ئەفیووناویی دەخەنە فکریانەوە هەموو سوودەکەشی بۆ کورد ئەوەیە بە ڕاشکاویی

لەعنەت لە مردوانی دەکرێت دەوامەش دەدرێ بە لەعنەت کردن لە دەرەبەگێک کە وجوودی نیە، بە تایبەتی لە عێراق. میللەتی کورد هەرگیز وەکو میللەتانی تر خاوەن فیۆداڵ نەبوە دەستی بەسەر چاکە و خراپەی خۆی ڕابگات. بە درێژایی هەزاران ساڵ کەرتکەرت و سەرکوتکراو و داهێزاو و کەنفت و هەژار و دەربەدەر و دیل و بەندی بێگانە بوە، نەکەوتۆتە سەر ئەو ڕاڕەوەی فراژیبوون و بەرەو پێشچوونە مێژووییەی کە لە کۆمەڵایەتیدا بگات بە پلەی فیۆداڵیزم.

بە نیسبەت کوردەوە پلەی دەرەبەگایەتی بە واتای ڕاستەقینەیەوە قۆناغێک بوە وەک سەراب کە پێگەییشتنی مومکین نیە. میللەتێک کە کیانی نەبوو لە خۆوە دەکەوێتە سەر ڕێبازێکی مێژوویی ئەوتۆوە چ خزمایەتی نەبێ لەگەڵ ڕێبازی میللەتانی خاوەن کیان. هەر وەک کورد نەیتوانیوە باڵیۆزی هەبێ هەروەهاش لە شێوەی بەدیهیەدا نەیتوانیوە فیۆداڵی هەبێ. فیۆداڵ وەک چڵکی لەش نیە بە دوو هەفتە خۆنەشوشتن لە خۆوە پەیدا بێت بەڵکوو دەسەڵات و ڕێکخستن و هونەر و زانست و ئەتیکێت و ژیار و قەصر و قەڵا و تەلار و دەیان و صەدان ئەرک و مافی خۆش و سەختە کە مومکین نیە لە باوەشی مەفتەنە وێرانەکەی کورددا پەروەردە بکرێت هەر وەک مومکین نەبوە بۆرجوازیەتی لە نێوان کورددا پەیدا بووبێت.

ئەو بۆرجوازیەتەی کە گەنجە کوردەکان جنێوی پێ دەدەن ئەویش هەر ئەو سەلکە کافرەیە بە ڕەجم کردنی تامەزرۆی شەیتان بە لەعنەت کردن دەشکێت چونکە جارێ ئەو سەرمایەی کە فکری سۆشیالیست کردبووی بە موژدەی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی و دەرچوون لە ڕژێمی فیۆداڵ لە ناو کورددا پەیدا نەبووبوو تا خۆش بویسترێ وەیا ڕقی لێهەڵبگیرێ، تۆ لەوە هەر بگەڕێ کە وا جارێ نە چینی پێک هێنابوو نە هیچ دەسەڵاتێکی سیاسیشی هەبوو لە کوردستانی لێرە بە پێشەوە و ئەم سەردەمەشدا.

ئەو کوردەی خۆمان لێی شارەزاین، وەک میللەتێکی بێکیان، تێکڕای تاکەکان و بەرە و تاقمەکان و چینەکانی لەچاو هی میللەتێکی تردا وەک منداڵێک دەبێ کە ماوەیێکی درێژ پێش کاتی خۆی لەدایک ببێت، هەموو ئەندامەکانی ناتەواو دەبێ، تەنها فەرقێک لە نێوانیاندا هەبێ ئەوەیە منداڵەکە قابلیەتی ژیانی نیە بەڵام میللەتە بێ کیانەکە ئەگەر دەرفەتی هەبێ دەژیت و ئەندامەکانی تەواو دەبن، دواتریش ددانی دێت و لە شیر دەکرێتەوە... و... دەچێتە قوتابیخانە و...هتاد، خۆ ئەگەر بڵێین

حاڵی کورد وەک حاڵی منداڵی 5 – 6 مانگییە لە زگی دایکیدا قسەیێکی ڕاست و دروستمان کردوەکە ئیعتیرازان هەڵنەگرێت. کورد، بە تێکڕایی و بە جۆری سەربەخۆ، جارێ نەکەوتۆتە ناو ئەو چەرخوفەلەکەی پێی دەڵێن گۆڕانیی مێژوویی.

ئەوەندەی زانرابێت لە بارەی بنەماڵە دەسەڵاتدارەکانی کوردەوە، لەو سەردەمانەدا کە دەکەونە بەر زاراوەی فیۆداڵ و دەرەبەگ و ئەو تەرزە ناوانەوە چەند بنەماڵەیێک دەشێ پێی بگوترێ فیۆداڵ ئەویش نەک لە ڕووی پێکهاتنی پێشکەوتوو و هونەراوی و کەرەستەدارییەوە، کە دەزانین هەموو کوردستان لەوە هەژارتر بوە بتوانێ
فیۆداڵێکی ڕێکوپێک بەوەلەد بێنێت، بەڵکوو لە تاکە ڕووی هێزیماددییەوە کە وا تا ڕادەیێک بۆیان گونجاوە بتوانن بگرن و ببوورن و ببەخشن و بستێنن کارەکانیشیان بە کاری جەردە و پیاوخراپ لە قەڵەم نەدرابێت. ئەو تەرزە بنەماڵە دەسەڵاتدارانەن ئەگەر بە دەست واقیعی هەژاری بێدەرفەتی بێچانسی وەک واقیعی کوردەوە وشک نەبنەوە و زەبری بێگانە لەناویان نەبات وردە وردە پەرە بە دەسەڵاتیان دەستێنن و دەبنە بەگلر و دواتریش یەکێکیان لە ناویاندا بەسەر هەمواندا زاڵ دەبێت و وێنە حکومەت دادەنێت.

هەڵبەت کورد لەو حاڵ و بارەی خۆی تێدا دیوەتەوە بۆی ڕێک نەکەوتوە، مومکینیش نەبوو بۆی ڕێک کەوێت، سەرۆک بنەماڵەی بەهێزی ببێتە حوکمدار و حوکمداریشی ببێتە دەوڵەت. لەمەشدا، وەک لە هەموو بارێکی ماددی و مەعنەویی کۆمەڵایەتییدا، لە ژێر تاو و تەئسیری لەعنەتە مێژوورییەکەی کەرتکراوی و مافخوراوی و توانەوە و کەمبوونەوەدا خەریکی تێشکان و پاشەکشە بوە، بە پێچەوانەی میللەتانی تری خاوەن کیان کە بە هەموو کێشانە و پێوانەیێکی کۆن و نوێ لە صەدەییێکەوە بۆ صەدەیێکی دواتر، کەم و زۆر، بەرەو پێشچوونێکی پێکهێناوە و بنەمای تێهەڵکێشانی گەورەشی بنیات ناوە لە حاڵێکدا گەلی کورد بە وڕێنەش ئەو تەرزە ئیمکان و ئاواتەی نەدیتوە.

خولاسەی گوتە لێرەدا ئەوەیە میللەتی ژێردەست بە تێکڕایی دەکەوێتە هەڵکەوتێک لە هیچ ڕوویێکەوە وەک هەڵکەوتی میللەتی سەربەخۆ نیە، بەڵام لە شێوەیێکی تایبەتییدا میللەتی کورد لەگەڵ میللەتی ژێردەست و داگیرکراوی تریشدا بەیەکتر ناگیرێن چونکە سەرەڕای ژێردەستیی کەرتکراویشە، لە حاڵی کەرتکراویشدا هیچ

کەرتێکی وەحدەی ئابووریی پێکنەهێنا کە لە دیاردەی «نزیف اقتصادی»[128] بپارێزێت چونکە دەزانین هێزی داگیرکەر دام و دەزگایەک دادەنێت لە وڵاتی داگیرکراودا بۆ ئەوەی سوود لە بەرهەم و داهاتی وڵاتەکە وەرگرێت کەوا کەم و زۆر میللەتە داگیرکراوەکەی تێ دەئاڵێ و بەدەوری بنگەکانی حوکم و تیجارەت و مالی و ئابوورییەوە جموجۆڵێکی گوزەرانی تازەڕەنگ دەکات، کەڵک لە زۆر کەرستەی ژیاریش وەردەگرێ لەوانەی داگیرکەر بۆ سوودی خۆی بەکاریان دەهێنێت وەک ڕێی شەمەندەفەر و بەندەری قەراغ دەریا و...هتاد. واش بوە ناوچەی گەورەی صناعی و ئابووری، بگرە ڕۆشنبیریش، لەو وڵاتە داگیرکراوەدا پەیدا بوە ئیتر بۆ هەر ئامانجێک دەبێ با ببێ کە دەزانین کوردستانی گەورە بەهۆی نەبوونی «وەحدەی ئابووری» تێیدا لەم تەرزە دەسکەوتە کولەمەرگانەش سوودمەند نەبوو. ئەو «نزیف اقتصادی» یەی کوردستانی گرتۆتەوە بە درێژایی مێژوو هیچی لێ شین نەبۆتەوە و[129] کاولبوونێکی ڕووت و قووتی پێکهێناوە و بەس. لە هەموو مێژووی ڕابردووی کورددا شارێکی وەک یەکێک لە شارەکانی ئەفەریقای داگیرکراو پەیدا نەبوو.

ئەم حاڵەتەی لێرەدا بە خێرایی پێیدا تێدەپەڕم کە حاڵەتی چەندین صەدەی لەدوا یەکتری کوردستانی گەورە بوە، شەپڕەی کۆمەڵایەتی بە ئابووری و ڕامیاری و ڕۆشنبیریی گشتی و کشتوکاڵ و هەموو لایەن و سەر و بەرێکەوە لە هەموو کوردستان و دانیشتوانی داوە نەک لە تەنها چینی هەژاری. بەر لەوە بڵێم ئەم حاڵەتە شەپڕەی لە گۆڕانی کۆمەڵایەتیی کورد داوە، کە ئەم گوتەیێکە خەیاڵمان بۆ تارمایی پێشکەوتنی تێهەڵکشاو دەبات، دەبێ بڵێم نەیهێشت دیواری جوداوازیی نێوان عەشیرەتەکانی کورد هەڵوەشێت، لە زۆر جێگەشدا ڕێی نەدا کۆچەر نیشتەجێ

---

[128] لە بەرەو دوای بەرگی یەکەمی «حاجی قادری کۆیی» ئەم دیاردەیە لێی کۆڵراوەتەوە.

[129] خوێنەر لە خۆوە دەتوانێ حاڵی کوردستان بە حاڵی وڵاتە ئیستیعمارکراوەکانی ئەفەریقا بگرێت کەوا لەگەڵ ئەو هەموو چەوساندنەوەشدا کە دووچاریان هات زەرفی مادییان وەها گۆڕا زوربەیان شەقێکی مەردانەیان لە داگیرکەر هەڵدا و گەییشتن بەو مافەی کە کورد دوو هەزار ساڵ پترە پێی ناگات.

بێت... نەیهێشت دەرەبەگ پەیدا بێت... ژیانی کوردەواریی قاڵب بەستووی چەند هەزار ساڵ بوو، لەمەشدا هیچ موبالەغە نیە... پێشکەوتنی چی و گۆڕانی کۆمەڵایەتیی چی!!

بەڕاستی فەلاکەت و نەگبەتیی مێژووی کورد گەلێک لەمەش زیاتر و ناقۆڵاتر و کوشندەتر و بڕندەتر بوە. من لە باس کردنی واقیعی یەکجار نالەباری بێمانەندی کورد زرە دەنگ و ڕەنگێکی تەنک و سادەم خواستۆتەوە کە وا بەحاڵ بایی نەخشەکێشانی ئەو کاریگەرانە دەکات کە هەڵوەستی کورد بە تێکڕایی و هی حاجی قادر بە تایبەتی، لە ئاست براگەوراندا دەکەن بە دیمەنێکی مەفهووم و مێژوویی کە جێگری پەیدا نیە و نەبوونیشی لە ئیمکاندا نەبوە، ئەگەرنا داستانی سامناکی ڕابردوە ئەنجن ئەنجن کراوەکەی کورد و خاکە دابێژراوەکەی کوردستان صەد هێندەی نووسینەکەی من پتر پەکی ئەو کەسانە دەخەن بەدەم بێباکییەوە، وەیا نەشارەزاییەوە، تف لەو واقیعە ڕەجاڵە دەکەن کە ئەگەر چاکی تێبگەن تفەکە بەسەر زاریانەوە وشک دەبێتەوە نەک لەبەر بزووتنی ڕەحمیان بۆ براگەوران، بەڵکوو لەبەر ئەوەی کە تێکڕای میللەتی کورد وەک خێزانی تازیەداری خەفەتباری کوڕکوژراوە کە خەڵق دەچێتە پرسەی و، لە جیاتی تف لێ کردن، فاتیحەی تێدا دەخوێنێ.

دەزانم حەسانەوەی نووسەر لەوەدایە خۆی دووچاری دەردیسەری بەهەڵە دەرچواندنی ڕق لە ڕابردوو هەڵ گرتن و جنێو بە مردوان نەکات و بەمەشدا نە مردوو بحەسێتەوە نە زندووش ڕازی بێت، مام نووسەرێکی تریش لەولاوە قوت بێتەوە بڵێ ئەوە لەسەر کردنەوەی دەرەبەگ و خوێنمژانە... بەڵێ دەزانم حەسانەوەکە و دەردیسەرییەکە زۆر ئاشکرایە، سوود و زیانە شەخسییەکەش مەعلوومە لە چیدایە، بەڵام خوا ماڵی خرتەخرتی ویژدان و دڵ و دەروون وێران کات کە وا لە هەر خۆگێل کردنێکدا زیرەی خۆتاوانبار کردن و بە سووکی سەیری خۆ کردن لە گیانی مرۆڤ هەڵدەستێنێ و ئاهەنگی ناوبەدی و نیهادپیسیی لە واقیعی خۆگێل کردوەکە بەدەنگ دێنێ.

ویژدان بە ڕووماندا دەداتەوە و دەڵێ: ئێوەی نووسەرانی کورد ئەگەر مەبەستتان سوودی میللەتە، خۆ دیارە میللەت لە ڕاستی سوود وەردەگرێت، نە کاری ئینسافە و نە جێی ڕەزامەندیی میللەتیشە شیوەنی هەموو ڕابردووی کورد بە تەنکەسەرپۆشی

لەعنەت لە دەرەبەگ کردن بشارێتەوە و زامە کوشندە خوێن لەبەر هەڵنیشتوەکانی بە تف لە براگەورە کردن دەرمان بکرێت...

سەیر لەوەدایە، چی لێرە بە پێشەوە گوترا جارێ ڕاستییە هەرە بەرچاوەکەی واقیعی دەرەبەگایەتیی کوردی باس نەکردوە، ئەو ڕاستییەی کە پێوەندیی هەیە لەگەڵ بیری کوردایەتی و چەوسانەوەی نەتەوایەتیی کورد لە ژێر زەبروزەنگی بێگانەدا چونکە ئەم ڕاستییە وەک دەردەکەوێ یەکسەر دژایەتیی بێگانە بەرانبەر بەرە و دەستەی براگەورەکانی کورد نیشان دەدات پتر لە چینەکانی تری کورد. ڕاستییە بەرچاوەکە ئەمەیە:

داگیرکەرانی کوردستان بە درێژایی ئەو مێژوەی کە دەنگوباسی بە ئێمە گەییشتوە، بەدەم تاڵان کردن و بگرە بەردەی داگیرکەرانەوە، پتر براگەورە و سەرەک عەشیرەت و پیاوی ناوداری کوردیان کوشتوە لە پیاوی بێدەسەڵات و هەژار و بێ ناو و نیشان کە هەرگیز چ حیسابێکی لە داگیرکەر تێک نەداوە و هەمیشە عینوانی ڕەعیەی بەسەرەوە بوە و بۆ ڕاپەڕاندنی کاروباری دەوڵەت سوخرە و بێگاری پێ کراوە سەرەڕای ئەوەی چ پارە و پوولێکی هەبووبێ بە ئەنواعی فڕوفێڵ لێی ستاندراوە. وەنیە لەم وەزعەشدا شتێکی سەیری کەس نەدیتوو هەبێت کە دەزانین ڕەعیەی بێچارە لە هەزاران ساڵەوە ئەم میراتەی بۆ بەجێ ماوە، میراتی سوخرە پێ کردن و تێخوێندنەوە، وەک ئەو هەزاران هەزار عەمەلەیەی هەڕەمەکانی میسریان دروست دەکرد و یەکێکیشیان ناو و نیشانێکی لێ بەجێ نەما.

ڕاگرتنی حیسابی تایبەتی بۆ سەرۆک عەشیرەت و براگەورەکانی کورد لەلایەن داگیرکەرەوە سیاسەتێک بوە بە درێژایی مێژووی ئادەمیزاد پێڕەویی کراوە لە لایەن هەموو داگیرکەرێکەوە لە هەموو کات و جێگەیێکدا چونکە فۆتاندنی سەرۆکی ئەو کۆمەڵەی کە بەپێی وەزعی کۆمەڵەکە هۆی هێز و توانای خەڵقەکەیە ڕاستەوخۆ وەک نەهێڵانی شوانی مەڕگەلە، وەیا با بڵێین وەک نەهێڵانی قومەندانی لەشکرە. ئەمەش ڕاستییێکە لە هەموو مێژووددا بەرچاو بوە و ئێستاکەش بەردەوامە.

پێی ناوێ من بڵێم لە خۆوە دیارە، داگیرکەرێکی بێ ڕەحمی دوور لە شارستانەتیی صەدان ساڵ پێش ئەمڕۆ کە قامچیکاریی بەسەر پشتی میللەتەکەی خۆشیەوە دەکرد، یەکەم چەمبۆڵەی لە هەناوی ئەو کەسانە گیر دەکرد کە لەوانە بوون ببنە

لەمپەڕ لە پێش نیازەکانی، ئەو کەسانەش براگەورە و سەرەک عەشیرەت و خاوەن سامان و قسە ڕۆییشتون، هەر لە بۆیەیشە ئەگەر لیستەیێکی کوژراو و لە سێدارەدراو و خنکێنراو و بەندییکراوی کورد بەدەست داگیرکەری بێگانەوە بگریت دەبینیت زوربەیان لەو تاقمەن کە پێیان دەگوترێ براگەورە. لەو سەردەمانەدا هەرچەند برا گەورەکان خەریکی سیاسەت نەبوون بەڵام بەپێی گەز و گرێی ئەو ڕۆژگارانە، داگیرکەر حیسابی خەباتکارێکی ئەم سەردەمەی بۆ کردوون کە دەزانین زۆر جودایە لەو حیسابەی بۆ یەکێکی تر دەکرێت کە دەخلی بەسەر سیاسەتەوە نیە چ براگەورە بێ چ مرۆڤی عادەتی. ئیمپریالیزمی صەدەی بیستەم لەگەڵ «عمر المختار» و «عبدالكريم الخطابي» چەند بەڕەحم بوە داگیرکەری کوردستانی صەدەی نۆزدەمیش هەر هێندەی ڕەحم جووڵاوە بۆ سەرۆکی مەنگوڕان و میری خۆشناوان و بەگی جافان و ئاغای بڵباسان[130]

کە بگەڕێیتەوە بۆ لاپەڕە 178 ی بەرگی یەکەمی کتێبی حاجی قادری کۆیی ئەم ڕستەیەی خوارەوە دەخوێنیتەوە:

«وەک لە شوێنی تایبەتییدا دەردەکەوێ ئەم کارەساتەی قڕان تێخستنی غەفووررییان هەرچەند لە دیوانی حاجی قادردا دەنگیشی نەدابێتەوە بۆ خۆی دەبێتە وەڵامدانەوەی پرسیارێکی گرنگ دەربارەی هەڵوەستێکی پڕ دەلالەتی حاجی. وەی کە نرخێکی زلە قڕانی بنەماڵەیێک ببێتە وەڵامی پرسیارێک».

شوێنە تایبەتەکە ئەم شوێنەیە، هەڵوەستە پڕ دەلالەتەکەی حاجی قادریش هەڵوەستی بەرانبەر دەرەبەگەکە وا لەم کۆتاییەی بەرگی سێیەمی نووسینەکەمدا خەریکم بەپێی بیروڕای خۆم ڕوونی دەکەمەوە، بیروڕایەکەشم لە جەرگەی ڕوداو واقیعەوە هەڵێنجاوە.

ئەم قڕان تێخستنەی غەفووررییان کە لەو بەشە یەکەمەی نووسینەکەدا باس کراوە لە ساڵی 1237ی کۆچیی ڕووی داوە، دواتریش لە ساڵی 1284 سەرلەنوێ بنەماڵەی

---

[130] هەمان ڕەفتاری کە لەگەڵ سەرەک عەشیرەتەکانی کورد کراوە، لەگەڵ شێخەکانی عەرەبیشدا کراوە بە درێژایی ئەو ڕۆژگارەی وڵاتی عەرەب لە ژێر دەستی تورکی عوسمانلییدا بووە.

غەفووری درانەوە بەر دەمی تیغی قڕ تێخستنەوە. کارەساتەکان نموونەی مامڵەتی بێگانەن لەگەڵ براگەورە و سەرۆک عەشیرەتی کورد بە درێژایی مێژووی سەرەتا بزر.

ئەم کارەساتەی لە ساڵی 1237 ی کۆچی بەسەر غەفوورییاندا هات لە دوو سەرچاوەی نووسراودا ئیشارەی بۆ کراوە، سەرچاوەییێکیان چوارینەییێکی عەرەبیە لە پەراوێزی کتێبێکی ئاینیی کتێبخانەی جەلییزادان، لە لایەن «واثق باللە» مەلا عەبدوڵای[131] کوڕی مەلا عەبدولڕەحمانی کاکی جەلییەوە نووسراوە، ئەمەش دەقەکەیەتی:

لقد جری حکم الحکیم الاحد
فی ثالث الشوال فجر الاحد

بنهب کو والقتل للأکابر
للظهر فی غرلجد بالأبجد

وشەی غرلجد بە حیسابی ئەبجەد ساڵی 1237 دەگرێتەوە. هەرچەند چوارینەکەی «واثق باللە» ناوی غەفوورییانیش ناهێنێ بەڵام بەلای ئەوەی شارەزای حاڵ و باری کۆیە و ئەو کارەساتانە بێت کە لە مێژووی مەیلەو نزیکدا ڕوویان داوە مەعلوومە مەبەسی چوارینەکە قڕانی غەفوورییانە چونکە کارەساتەکە کە دەماودەم بە ناو هەموو خەڵقی کۆیە و وڵاتی کۆیەدا خەبەرێکی بڵاو و مەشوووریشە.

لەگەڵ ئەمەشدا کە هەر داوای بەڵگە بکرێت بۆ ئیسپات کردنی مەبەسی چوارینەکە سەرچاوەکەی دوەم ئەم ئیسپاتە بە دەستەوە دەدات. لە بەیازێکی دەستنووسی فارسی کە کۆڕی زانیاری کورد لە ناوچەی شارەزوور و هەڵەبجە چنگی

---

[131] مەلا عەبدوڵڵای ناوبراو باپیری حاجی مەلا عەبدوڵڵای جەلیزادەی هاوڕێی حاجی قادرە.

کەوت کۆمەڵێک هەواڵی کۆن و نوێی چەند بەشێکی ناوچەکانی کوردستان و[132] ڕۆژاوای ئێران نووسراوە، یەکێک لەو خەبەرانە قەتلوعامەکەی غەفوورییانە کە لە بەیازەکەدا باس کراوە و ڕووناکایی پتریش داوێژێ بۆ سەر مەبەستی «واثق بالله» لە گوتەی «والقتل للأکابر» چونکە بەیازەکە باسی کوژرانی محمدی عیساغا و عبدالله ئاغای غفور و کوڕان و برایانی دەکات لە جەژنی ڕەمەزانی ساڵی 1237 دا. جەژنی ڕەمەزانی بەیازەکە و «ثالث الشوال»ی چوارینەکە یەکتر تصدیق دەکەن، موحەمەدی عیساغاش کە بێتە نێوان کوژراوانەوە واتای «القتل للأکابر» چەسپاوتر دەکات. عیساغا پیاوێکی بەرچاوی بنەماڵەیێکی گەورەی کۆیێ بوە، باپیرەگەورەشی هەر عیساغا بوە و زۆر ڕەز و مڵک و ئاشی بەناوەوە هەبوە کە بەسەر زارانەوە بوونەتە ڕەزی ساغە و ئاشی ساغە.

سرنجێک بدە تەعبیرەکەی «واثق بالله» لەوەدا کە دەڵێ «والقتل للأکابر» چەند بە حورمەتەوە ناوی کوژراوەکان دەبات، چەندیش بە پەرۆشەوە کوشتن و تاڵان کردنەکە بەیەکترەوە دەبەستێتەوە کە لە هەر دووکاندا لایەنی کوژراو و تاڵانکراو بە ستەملێکراو دادەنێت و دەستدرێژکەرەکە بە قاتل و تاڵانکەر دەژمێرێت، چونکە ئەگەر ئەمە بیروباوەڕی نەبوویایە دەیتوانی کوژراوەکان بە «شقاة، عصاة» دابنێت کە دەزانین وابوە داگیرکەریش پیاوی جەردە و ڕێگری کوشتوە و خەڵقە داگیرکراوەکەش کوشتنەکەیان پێخۆش بوە. دەبێ ئەوەندەش بخەمە سەر قسەکانمەوە کە بڵێم «واثق بالله» مەلاییێکی مسڵمانی لە خوا ترساو بوە ئەگەر کوژراوەکانی بە مەزڵووم نەزانیبایە بە «أکابر» ناوی نەدەبردن. مسڵمانەتی «واثق بالله» لەو ڕادەیەدا بوو کە شەش مانگان وەکالەتی مەولانا خالیدی کردوە لە سلێمانی، خۆیشی خەلیفەیێکی ڕێزلێگیراوی مەولانا بوە.

قەتلوعامەکەی غەفوورییان گەییشتە پلەیێک کە بە کوردی دەڵێ نێرەوەزیان لێ بڕا. لە هەموو بنەماڵەکە یەک دوو نێرینەیان لێ ڕزگار بوو، یەکێکیان مەحموداغای باوکی حەماغای گەورەیە کە ئەوسا منداڵی ناو بێشکە بوە و

---

[132] لەو بەیازەدا باسی دروست کردنی «ئیچ قەڵا»ی کۆیەش دەکات کە ناوی لە شیعری حاجی قادردا هاتوە: «لە قوشخانەوە تا دەمی ئیچ قەڵا».

خێرەومەندان لە نۆیینی ئاوی پیسدا شاردبوویانەوە تا کۆتایی فرتەنەکە و نیشتنەوەی ئاگری فیتنەکە.

بەپێی لێکدانەوەی خۆم[133] کە حاجی قادر لە 1240 ی کۆچیی هاتبێتە دونیا کارەساتەکە سێ ساڵ پێش لەدایکبوونی حاجی ڕووی داوە، خۆ ئەگەر نامیلکەی مەلا عەبدولڕەحمانی خزمی حاجی بەشایەد بگرین کە دەڵێ لە 1231 لە دایک بوە تەمەنی حاجی لەو ساڵەدا شەش ساڵان بوە.

هەر لایەک لەم دوو لایە ڕاست بێ فەرقێک ناکا لەوەدا کە حاجی قادر هەست و هۆشی بە دڕندەیی کارەساتەکە زرینگاوەتەوە چونکە کاتێک حاجی گەییشتە تەمەنی هۆش کرانەوەی جارێ دەنگوباسی ڕووداوە سامناکەکە هەر بەسەر زار و زمانانەوە مابوو، ئاکامەکەشی کە کزبوونەوەی بنەماڵەیێکی گەشەدار بوو لەبەر چاوان بوو.

تۆ بڵێی حاجی قادرێکی سالآنی نیوەی یەکەمی صەدەی نۆزدەم لە کارەساتی وەها خوێناوی و ترسێنەر کە لەلایەن بێگانەوە بە پیاو ماقوڵانی وڵاتەکەی بکرێت دەبێ کام پەندی کۆمەڵایەتی و نیشتمانپەروەرایەتی و چینپەروەرایەتی وەرگرێت؟ ئایا مەیل و سۆزی بەلای دەستە خوێناویەکەی بێگانەدا دەشکێتەوە یاخود بەلای نێچیرە خۆوڵاتیەکاندا؟ تۆ، ئەی خوێنەری کوردی شۆڕشگێڕی چینپەروەری ساڵی 1972 ی صەدەی بیستەم، بە خەیاڵ ئەگەر لە کۆیەی ساڵی 1237 ی کۆچی ژیابایت بە خۆت و بیروڕای شۆڕشگێڕانە و چینپەروەرانەتەوە پیرۆزباییت لە داگیرکەر دەکرد بەو نامەیەی کە خەڵقی کۆیەی لە زۆرداران ڕزگار کردوە؟ بێشکەکەی مەحموداغات بە پیاوکوژەکان نیشان دەدا؟ ئاخۆ ئەگەر کارەکە پێچەوانە بوویایە، واتە پیاوماقوڵانیی کۆیێ بەربوونایە گیانی داگیرکەرەکان، هەڵوەستت چۆن دەبوو؟ دەبوویتە هەیتەی عوسمانلیی...؟

بیروڕا و هەڵوەستی گەنجێکی شۆڕشگێڕی ئەمڕۆکەی کورد لە ئاست ڕووداوی وەک ئەم قرتێخستنە هەرچییێک بێت، هەڵوەستی حاجی ڕقهەڵگرتوانە و غەزەب

---

[133] بگەڕێوە بۆ لاپەڕە 78ی بەرگی یەکەمی «حاجی قادری کۆیی»، لە ژێر ناونیشانی حاجی قادر کەی و لە کوێ هاتۆتە دونیا؟ ساغ کردنەوەی ساڵی بەوەلەدبوونی دەخوێنیتەوە.

هەڵستاوانە بوە لە داگیرکەر و خوێنرێژی بێگانە، پەندێکی وەریشی گرتبێ لە کارەساتەکە پتر تیژ کردنی هەستی مافخوراوی و ستەملێکراویی میللەتی کورد بوە چونکە تۆش دەزانیت و منیش دەزانم، نەفسە هەستیارەکەی حاجی بە دیتن و بیستنی ڕووداوی وەها خوێناویی لە ناو جەرگەی میللەتەکەی پتر ڕقی لە بێگانە هەڵگرتووە تیژتریش بەرەو کوردایەتی ڕۆیشتوە. گۆیا ئەگەر ئەو بێگانە دڕندەیی نەکات دڕندەیی لە ئاست بەرژەوەندی ماددی و ژیان و بەرێوەچوون و لە ئاست بەرژەوەندی مەعنەویی وەک زمان و ئەدەب و داب و دەستوور و نەریتی کۆمەڵایەتی و عەقیدە... و بە حوکمڕانێکی عادەتی ڕازی بێت لە کوێوە زێدە بوغز و ڕق بۆ خۆی ڕادەکێشێت لە حاڵێکدا میللەت هەرچۆنێک بێ دەبێ حاکمێکی بەسەرەوە بێت، بە نیسبەت میللەتێکی وەک کوردیشەوە کە بە بیری نەیەت لە لایەن حوکمڕانی کوردەوە فەرمانی بەسەردا کرابێت و بە درێژایی مێژوو بێگانە حوکمی کردبێت ڕەنگە بێگانەیێکی نیمچە دادپەروەر زۆر ناخۆشەویست نەبووبێت، بەڵام تەجرەبەی کورد لەگەڵ حاکمی بێگانە بە درێژایی صەدانساڵی ڕابردوو هەرگیز شیرنایی و بەزەیی و داد و ڕەحمیی تێدا نەبوە. بەڕاستی داگیرکەرانی کورد لەو سەردەمانەدا چ تورکی عوسمانلیی بووبێت و چ عەجەمی قاجاری بووبێت بە جۆرێک چاو لە تەماع و ڕاووڕووت کردن بوون سەرلەبەری خەڵقەکەیان دەدایە بەر یەک سیاسەتی ڕووتاندنەوە، ناوناوەیێکی بە دەگمەن نەبێ براگەورە و دەست ڕۆیشتوی کوردیان تێکەڵ بە هیچ کارێک نەکردوە دوو قرۆشی تێدا بووبێت، هەر ئەمەیشە ئاکاری داگیرکەری نیمچە خوێندەوار کەوا بێجگە لە سیاسەتی کوشتن و بەستن و وێران کردن هیچی تر نازانێت.

ئەم شێوە دڕندەییەی قڕتێخستنی غەفووریيان نموونەی تەجرەبەی کورد و حاجی قادر بوە لەگەڵ حوکمی داگیرکەر، کە ئەگەر لە وەهم و خەیاڵەوە بمانەوێ کوردی بەر لە صەد ساڵ و دوو صەد ساڵ بەگژ براگەورەکانی ئەوسایاندا بهێنین دەبێ دیسانەوە لە وەهم و خەیاڵەوە ئیسپاتی پیاوچاکی و بەزەیی و دادپەروەریی داگیرکەرە دڕندەکان بکەین بۆ ئەوەی هەر نەبێ لەسەر کاغەز و لە عالەمی وەهم و خەیاڵدا بتوانین بنەمایێکی مەعقوول بۆ ئەو بەگژداچوونە پەیدا بکەین، ئەگەرنا چۆن پێمان دەکرێ تەفرەی خۆمان بدەین بەوەدا کە بڵێین میللەتی کورد لە براگەورە زاڵمەکانی خۆی هەڵدەگەڕایەوە و بەرەو پیری جەلادە داگیرکەرەکانی دەبوو. کە بە

زۆرەملێ و چاوبەستەکێش ئەم درۆیەمان بەسەر ڕابردوودا سەپاند لە کوێوە فەخر و شانازیی بخوازینەوە بۆ میللەتەکەمان لەم کارەی وەها سەرەوبندا؟

لەو لاپەڕە باسکراوەی 178 ی بەرگی یەکەمی ئەم نووسینەدا کە گوتبووم قڕتێخستنی بنەماڵەی غەفوورییان دەبێتە، وەڵامدانەوەی پرسیارێکی گرنگ دەربارەی هەڵوەستێکی پڕ دەلالەتی حاجی، مەبەستم هەڵوەستی حاجی بەرانبەر دەرەبەگ و براگەورەی کورد بوو کە هەڵوەستێکی دۆستانەیە نەک دوشمنانە. وەرامەکەش لەوەوە دێت کە حاجی قادر لە سەرەتای ژیانیەوە بیستبێتی و دیتبێتی داگیرکەری کوردستان خەریکی کوشتنی براگەورەکانی کوردە و هەر ئەمەش بەرنامەی سیاسەتی بووبێت تا ئەو ڕۆژەی حاجی دەکەوێتە سەر ڕێبازی کوردایەتی، ئا ئەم حاجییە دەبێ چ هەڵوەستێکی هەبووبێت لە ئاست ئەو براگەورانەدا لە حاڵێکدا ئەو داگیرکەرەکە بە گەورەترین دوشمنی کورد بزانێت؟ کە دوشمنی کورد براگەورەی کورد لەناو ببات حاجی قادر و تۆ و من و هەموو کورد چی بۆ دەمێنێتەوە لەوە بەولاوە کە ئەو کوژراوانە بە گەورە بزانێت و ڕێزیان لێ بنێت و بۆیان بە پەرۆش بێت؟

لەبەر تیشکی حەقیقەتدا لە نوختە نیگای پێکهێنانی هەڵوەستەوە، چ فەرقێک نیە، وەیا فەرقێکی ئەوتۆ نیە، لە نێوان ئەوەی براگەورەیێک، وەک شێخ سەعیدی پیران، بەدوا شۆڕشدا بکوژرێت، لەگەڵ ئەوەی یەکێکی تر بەهۆی کوردبوونیەوە لەلایەن داگیرکەرەوە لەناو ببردرێت با شۆڕشیشی نەکردبێت چونکە کە نرخی براگەورە کوردەکە بەلای داگیرکەرەوە ئەوەندە هەبێت لەناوبردن بێنێت دەبێ بەلای کوردیشەوە ئەوەندە نرخەی پێ بدرێت کە هەڵوەستی دۆستانە و خۆشەویستانەی بۆ ببێت.

بەهەمەحاڵ حاجی قادری صەد ساڵ لەمەوبەر بە دیار ئەم تەرزە لێکدانەوەیە پەنگی بە سۆز و پەرۆشی خۆی نەدەخوارد بۆ ئەو سەرۆکە کوردانەی بە دەست داگیرکەرەوە زەبوون دەبوون چونکە ئەویش وەک خەڵقی تر لە هەستێکی فطری بێ تێکەڵبوونی فەلسەفە دڵی بە میللەتەکەی و قوربانیەکانی دەسووتا، لەسەر ئەوەندەش ڕانەدەوەستا براگەورەکان بکوژرێن ئەوجار هەڵوەستی دۆستانەی بۆیان ببێت چونکە بە شایەدیی شاعیرەکانی خۆی دۆستایەتی لەگەڵ زیندوەکانیان هەبوە، وەک لێرە بە دواوەش ڕوون دەبێتەوە دەبوو ئەو دۆستایەتیەی لەگەڵیاندا هەبێت نەک هەر لەبەر

ئەو هۆیانەی لێرە بە پێشەوە لە باس کردنیان بوومەوە بەڵکوو لەبەر هۆیەکی تری یەکجار تایبەتی و گرنگ و بنجیی لە خەباتی حاجی قادردا کە تا ئێستا سرەی شی کردنەوەی نەگەییشتوەتێ و وا پێ دەچێ دەبێتە دوا ئاڵقەی زنجیرەی ئەم لێکۆڵینەوەیە.

لەیەکتر نەچوونی دەرەبەگایەتیی بەوەلەد نەهاتووی کورد و فیۆداڵی ئەورووپا سەرلەنوێ دوچەندان دەبێتەوە لە لایەنێکی ترەوە کە ئەویش ڕووپەڕەیێکی شیوەنە ئەبەدیەکەی کورد دەنوێنێت. زانیمان براگەورەکانی کورد بە درێژایی ڕۆژگارە ڕەشەکەی خۆیان و میللەتەکەیان ستەمدیدەی دەستی بێگانەی داگیرکەر بوون، لەمەشدا جارێکی تر دەبوونەوە براگەورەی ستەمدیدەیی بەوەدا کە بەشی هەرەزۆری خنکاندن و کوشتن و بڕین بەر ئەوان دەکەوت. بە دوای کوشتن و خنکاندندا دووبارە ناو و ناموسەکەشیان لە سێدارە دەدراوە کە تەمغەی شەقاوەت و خیانەتیان لێ دەدرا...

تا ئێرە زوڵملێکراویی کورد ماوەییک پێش زوڵم لێکرانی میللەتانی تر کەوتۆتەوە چونکە قوربانیی میللەتێکی تری بەردەستی عوسمانلی، با بڵێین بولغار، کە بە لای دەستوور و یاسای عوسمانلییەوە غەیانیش بووبێت بەلای ڕووسیاوە وەیا بەلای دانیشتوانی بالقان و ئیتالیاوە قارەمانی میللی بوون، بەڵام لە سێدارەدراوی کورد بەشەرەفی وەها نەگەییشتوە چونکە هیچ یەکێک لە میللەتانی ڕووی زەمین میللەتی کوردی تێنەخوێندۆتەوە تاکوو ڕێزی لە قوربانیەکانی نابێت. من لە وردبوونەوەی تایبەتی خۆمدا بەوەندە ستەمەش ڕازیم ئەگەر دوو جاری تریش ستەم لەو قوربانیانە نەکرابایە ستەمەکانیش لەوانەن، شێخ ڕەزا گوتەنی: «کامی لێی دەگری دەبێژێ ئەمەیان مونتەخەبە».

ستەمی یەکەم لە تۆمارنووسی مێژووەوەیە. ئەم مێژوە لە ئاست میللەتی بێدەسەڵاتی وەک کورددا هێندە بە دەعیە و لووتبەرزە تەنازول ناکات نووکی قەڵەمە زێڕینەکەی بە خوێنی قوربانیەکانی ئەو میللەتە تەڕ بکات و دوو دێڕی چەوت و چوێڕی ڕووداوە خوێناویەکانی پێ بنووسێت بەڵکوو هەر نەبێ ناو و شوێنەواریان ڕەش نەبێتەوە با لە گۆشەی بەدناویشدا بەدەم نەفرینەوە یاد بکرێنەوە... شەیتان ناوی زڕا بەڵام نەمرد، کەچی خوێنی براگەورەی کورد ڕژایە بیابانی عەدەمەوە... بە فیڕۆ چوو، هیچی لە جێگە شین نەبۆوە. قەڵەمە زێڕینەکەی مێژوو نووکی خۆی بە

خوێنی براگەورەی کورد تەڕ ناکا ئەگەر پایەی لە پایەی حاکمی بابان وەیا میری ڕەواندز وەیا حوکمداری بۆتان نزمتر بێ. قوربانی و خوێنڕژاوی کورد ئەگەر بیەوێ لە دوا کوشتنی ناوی بپارێزرێت دەبێ لە پێشەوە خۆ بکاتە ئەمیر ئەوسا تەمای پاراستنی یادگارەکەی بە دڵدا بێت. خوێنی براگەورەی عادەتیی کورد حەددی نیە بە مەرەکەبی مێژوو بێت.

ئەم ستەم لە دوا ستەمەی کوژران و فەرامۆش کرانی قوربانیەکانی کورد هەر بە جارێ کز دەبێتەوە لە تەک ستەمە بێ ڕەزایە لە حەد بەدەرەکەی تر کە هیچ سنووران ناهێڵێتەوە لە مەیدانی غەدرلێکراوی و خوێن بە هەدەر چوندا. قوربانیەکانی کورد خوێنیان ڕژابایە و لە بیر کرابانایە و ناویان لە پەڕەی وجوود سڕابایەوە صەد جاران چاکتر و بێ سفتوسۆتر دەبوو لەوەی ڕۆشنبیری کورد دوای صەدان ساڵ لە کوژرانیان، ڕوحیان بەبەر بێنێتەوە بایی ئەوەی سەرلەنوێ لە ڕێی تف و لەعنەت لێ کردنەوە بە شێوەی مەعنەویی ئیعدامیان بکاتەوە... کۆڕی حەیا بردن و ڕیسوا کردن و نامووس شکاندنیان جارێکی تر بۆ ببەستێتەوە... لە خۆوە وەکالەتی جەلادە کۆنەکانی کورد بکات.

جاران دەگوترا فلانەکەس شاربەدەر کرا، ئێستا ڕۆشنبیری کوردی وەها هەیە قوربانیەکانی قەسابخانەی مێژووی کورد قەبرستان بەدەر دەکات[134].

---

[134] ئەم قسانەم کە لە زیمنی دەرخستنی ڕاستی بێفێڵدا شیوەن بۆ کورد دەکەن، لە زەرفێکدا دەکەونە ناوەوە باشترین دەرفەت بەو کەسانە دەدەن کە پەکیان لەسەر ڕاست و درۆ و چاکە و خراپە و سود و زەرەری کورد نەکەوتوە، بۆ ئەوەی خراپترین تەئویلیان لێ بدەنەوە و لەسەر منی بە دیفاع کردن لە دەرەبەگ حیساب بکەن. ئەو کەسانە، بەلای باوەڕی منەوە، هەڵپەرکێ لەسەر تەرمی میللەتەکە و مێژوی میللەتەکەیان دەکەن، لە حاڵێکدا قسەکانی من شانازیی دەکەن بە لەسەر کردنەوەی ئەو ڕابردوەی ئەون لێی دەبن بە دۆستی جەلادەکانی قاجاری و عوسمانلی. بە ڕاستیی شەرمم لە خۆم دێتەوە کە ناچاریی ئەم تەرزە قسەیەم پێ دەکات!!

خوێنەری بەڕێز دەبینێ جوداوازیی نێوان فیۆداڵی ئەورووپا و سەرۆک و براگەورە و دەرەبەگی کورد لە چ ڕادەییێکدایە. نە لە ڕابردوو، نە لەم ڕۆژگارەدا... نە بە زیندوویی، نە دوای مردن... نە لەباری ماددی و نە لە باری مەعنەوییەوە... خولاسە لە هیچ ڕوویێک و بە هیچ جۆرێک یەکتر ناگرنەوە، کە ئەمەش شتێکە دەبێ وەک بەدیهیە وەربگیرێت چونکە زەرفی مێژوویی کورد لە هیچ ڕوویێکەوە و بە هیچ جۆرێک لەگەڵ زەرفی مێژوویی ئەورووپای سەردەمی فیۆداڵ یەکتر ناگرنەوە... قیاسی هاوین و زستان لە یەکتر ناکرێ.

ئێمە ئەگەر سەهوو نەکەین وەیاخود خۆمان بە سەهوو نەبەین دەبێ ئەوە لە دڵ و مێشکی خۆمان بنووسین و باوەڕی پێ بهێنین کەوا هەموو ئەو قۆناغە کۆمەڵایەتیانەی لە مێژووی میللەتانی تری خاوەن کیان بە قۆناغی سەردەمی دواکەوتن و کلۆڵی و چارەڕەشی و کاڵوکرچیی دادەنرێن، سەرلەبەریان بە نیسبەت میللەتی کوردەوە ئیستگەی حەسانەوە و بەرەو پێشچوون و گەشە کردن حیساب دەکرێن چونکە هەرگیز ڕێی نەبوو پێیان بگات چ جایی ئەوەی پێیاندا تێپەڕێت. هەڵبەت من مەبەستم ئەوە نیە بڵێم نەگەیشتنی میللەتی کورد بە پلەی ناڕەزامەندیی لە سەرۆک عەشیرەت و براگەوران بەڵگەی پەسەندبوونی ئەو حاڵ و بارە نالەبارەیە کە کوردی تێدا ژیاوە، بە پێچەوانە، من حاڵ و باری مێژوویی کورد گەلێک دواکەوتوتر دەبینم لە بینینی ئەوانەی جنێوی پێ دەدەن چونکە دەزانم کوێرەوەریی کورد لە پلەیێکدا بوە جنێو پێدان هەڵناگرێ.

من دەزانم تۆش دەبێ بزانیت مرۆڤ تاکوو دەگا بەو پلەیەی کردەوەکانی بە خراپە لەسەر حیساب بکری پێویستە لە تەمەندا گەیشتبێتە ڕادەیێک یاسای جەزا بیگرێت. منداڵی ساوا، مرۆڤی ناچارکراو، شێت، سەرخۆشکراو هیچیان لەبری کوشتن، ئیعدام ناکرێن. تۆ سەیری ئەم جیهانە چەند سەیرە. مافی ئیعدام کرانیش ئیمتیازێکە هەلومەرجی خۆی هەیە، بەڵام مێژووی کورد بە دەست هەندێک لە ڕۆشنبیرانی کوردەوە لەسەر پشتی لانکۆڵە ئیعدام کردنی بۆ دەردەچێت. ئەم قسانە زۆر تاڵن بەڵام بە داخەوە ڕاستیی بێ پێچ و پەنان.

لێرەدا دەگەینە دوا قۆناغی نووسینەکەمان کە دەبێتە ئاڵقەی کۆتایی زنجیرەی ئەم سەرەباسەی حاجی قادر و دەرەبەگایەتیی کورد. زانیمان و دیتمان هەڵوەستی حاجی لە ئاست براگەورە کوردەکانی سەردەمی خۆی، بەپێی حوکمی ئەو زەرفە

مێژووییەی تێیدا دەژیا مومکین نەبوو دوشمنانە بێت هەر وەک زانیمان هەڵوەستی شاعیرەکان و ئەدیبەکان و مەلاکانی دوای ئەویش تا ساڵانی 1940 هەڵوەستی دوشمنانە نەبوە.

ئەمە ڕاستییێکە کەمتر دەمەقاڵ هەڵدەگرێ لەوەی بگوترێ بۆرجوازیەتی بە دوا دەرەبەگایەتییدا دێت چونکە ڕاستبوونی قسەکان لە بارەی هەڵوەستی حاجی و شاعیر و ئەدیبەکانی دوای ئەو، هەموو بەرهەمەکان و کردە و گوتەکانیان ئیسپاتی دەکەن، هەر چاوی لێ نەنوقێنن دەچێتە ناو بیبیلەی چاوانەوە بەڵام هاتنی بۆرجوازیەتی بە دوا دەرەبەگایەتییدا ئەو بەرچاو و بەڵگەنەویستە نیە. بە نموونە دەڵێم لەوانەیە وڵاتێک یەکسەر لە پلەی دەرەبەگایەتییەوە بچێتە پلەی سۆشیالیزم وەیاخود بە جۆرە ڕێژیمیکدا تێپەڕێ کە مەخلوقی ئەم سەردەمە بێت و بەر تەعریفی هیچ یەکێک لەو پلانە نەکەوێت...

خولاسە حاجی ناحەزی براگەوران نەبوە، بە پێچەوانە دۆستیان بوە و بەشێکی بەرچاوی شیعرەکانی ڕووی وتووێژی لەوانە، هەندێک لەو بەشەش مەدحیان دەکات. ئەمە ئەلف بێتەکەی حاجی قادر ناسینە بەڵام کە دەڵێم دەمەقاڵ هەڵناگرێ ڕێم نەبڕیوەتەوە لەوەدا کە بڵێم پرسیار هەڵدەگرێ. حاجی دوشمنی براگەوران نەبوە، نەک دوشمن نەبوە دۆستیشیان بوە. تا ئێرە حاجی و شاعیرێکی تری کوردی دوای خۆی وەک یەکترن لەوەدا کە بەپێی زەرفی مێژوویی بە دڵی هیچ کامێکیاندا نەهاتووە دوشمنایەتیی براگەوران بکەن هەروەک بە دڵی شۆڕشگێڕی نیشتمانپەروەر و چینپەروەریشدا نەدەهات دەعیەیان نەهێنێ خۆیان لە ماڵ و دیوەخانە و دێی ئەو برارگەورانەدا بشارنەوە... بەڵام حاجی گەلێک زیاتر لە شاعیرێکی تری کورد بەرەو دۆستایەتیی ئەو گەورەپیاوانە تێهەڵکشیوە چونکە هیچ یەکێک لەو شاعیرانە بەقەدەر دەیێکی حاجیش باسی گەورە پیاوەکان و سەرۆکەکان و ئەمیرەکان و ئەدیبەکان و شێخ و مەلا ناودارەکانی کورد ناکەن. هی وەهاشیان تێدایە ببرِای ببرِای ناوی کەسێکی کورد ناهێنێ مەگەر لە زەمینەی وەرامدانەوەی نامە وەیا هەواڵ پرسی و پیرۆزبایی و پرسە لێ کردن و چشتی ئەوتۆیی بێت کە لەمەدا چ دەلالەتێکی تایبەتی وەیا هەڵوەستێکی ڕاگەیێنەر پەیدا نابێ هەروەک لە عەینی چوونە سەر پرسە و هەڵپەڕکێ و وەرامدانەوەی نامەی عادەتی چ دەلالەت وەرناگیرێ.

هەڵوەستی حاجی لە ئاست گەورەپیاوانی کورددا باسێکە زۆری بە بەرەوە هەیە چونکە بە ئاشکرا دیارە بۆ هەموو چاوێکی نەچوقاو کە ئەم هەڵوەستە تاقانەیە لە نێوان سەرلەبەری ئەدیب و شاعیر و مەلای کورددا ڕێکەوتنێکی کوێرانە نیە، بە تایبەتی کە بێین و لایەنی زێدە قووڵ ڕۆچوونی حاجی لەو هەڵوەستەدا بە بەرچاوی خۆمانەوە بگرین چونکە خەریکبوونی حاجی بە براگەورەکانی کوردەوە بەشێکی هەرە دیاری خەباتەکەی و کوردایەتیەکەی دەگرێتەوە. حاجی لە باس کردنی گەورەپیاوانی کورددا وەک شاعیری موناسەبە نیە بەپێی ڕۆژ و سات و ڕووداو یادی خاوەن موناسەبەکە بکات بەڵکوو لەو باس کردنەدا ئیهتیمامێکی دەروونی ڕەگداکوتاو دەردەبڕێ کە پشتگوێ خستنی لە ئیمکاندا نەبێت هەروەک شاعیری عاشقە سروشت ناتوانێ خۆی لە جوانی و ئاراییشتی بوونەوەر بدزێتەوە.

ئەم دیاردەیە تا ئێستا لە لایەن هیچ نووسەرێکی کوردەوە لێی نەکۆڵراوەتەوە، منیش لە بارێکدا نیم بتوانم بە دوا چەندین صەد لاپەڕەدا درێژە بدەم بە شی کردنەوەی دیاردەکە و لە هەموو ڕوویێک و لایێکەوە لێی بدوێم و دیوانەکەی حاجی بە دیوانی شاعیرەکانی تر بگرم و لە ڕێی نەبوونی ئەم دیاردەیە لە شیعری ئەواندا پتر هەڵوەستی حاجی ڕوون بێتەوە. لێرەدا هەر بایی ئەوەندەی هەڵوەستی حاجی لەم مەسەلەیەدا بچێتە ناو چارچێوەی تابلۆی مەفهوم و ئاشکرای کردار و گوفتار و بیروباوەڕی حاجییەوە بەدوای لێکۆڵینەوە دەکەوم، لەمەشدا پشت ئەستوورم بەوەی کە لێرە بە پێشەوە ڕەنگرێژێکی ئاشکرای تابلۆکە کراوە لەو تابلۆیەشدا بە شێوەیێکی قەناعەت بەخش پارچەکانی Jigsaw کە خراونەتە سەریەک تاکوو ئەگەر شتێکی تازەی نەگونجاوی تێکەڵ بێت بەخۆیەوە نەگرێت. وا دەزانم چی لێرەدا بە کورتی لێی دەدوێم جێگەی لەباری خۆی دەدۆزێتەوە لە تابلۆکە و Jigsaw کەدا و دەشبێتە بەشێکی تەفصیلی لەواندا.

گوتم حاجی لە خەریکبوونی بە براگەورەکانی کوردەوە وەک شاعیری موناسەبە نیە. ئەم ڕاستییە بە چەندین بەڵگە ئیسپات دەبێ، بەڵام تاکە یەک بەڵگەی قەطعی بەسە بۆ ئیسپات کردنی، ئەویش لەوەدایە کەوا حاجی لەو براگەورانە نێزیک نەبوە تاکوو باس کردنیان لە موناسەبەکانی کۆمەڵایەتییدا یەخەی حاجییان گرتبێ سەرەڕای ئەوە کە گەلێک لەوانە دوای مردنیان باسیان کراوە و لە دەست موناسەباندا نەماون. لە شیعری وەکوو:

تا تەعیناتی کۆر و لاڵ[135] مابوو
لە گەڵێ دێیەکان مەلای چا بوو

موناسەبەی بەستەزمان چی بەسەر چییەوە!

وەک من لە حاجی قادر بگەم و هەست بە نیاز و مەبەستەکانی بکەم لەو زەرفە ماددییە و نەفسییەی کە شارەزاییمان پێی هەیە خەریکبوونی حاجی بە براگەورە و ناودارانی کورد، بە تێکڕایی، و خاوەن دەسەڵاتەکانی کورد بە تایبەتی، لە چەند هۆیەکی ئاشکرا و بەهێزەوە سەر دەکات، هۆیەکانیش هەرچەند ژمارە یەک و دویان بۆ دانێین و پێش و پاشیان بخەین لە ڕاستییدا هەموویان تان و پۆی یەک پارچەی هۆنراون وەیاخود ڕەنگە عەکس کراوەکانی یەک تیشکن، پارچەکە و تیشکەکەش نەفس و ویژدانی حاجین کە ئەگەر نەفس و ویژدانی یەکێکی تر بوویایە وەیاخود خۆی جۆرێکی تر بوویایە بە شێوەیێکی زۆر جودا دەنگ و ڕەنگی دەدایەوە:

هۆی یەکەم حەز دەکەی بیکە بە دوەم وەیا سێیەم فەرق ناکات غەریبی و ئاوارەیی حاجی قادرە. هەرچەند ئاوارەیی بە تەنها خۆی نابێتە پێکهێنەری مەیلی بەهێز لای شەخسی ئاوارە بۆ ڕیز کردنی ناوی ناودارانی میللەتەکەی و پاراستنی شوێنەواریان، وەک کە دەبینین نالی ئاوارەش بوو ناوی کەسیشی نەبرد، لەگەڵ ئەمەشدا دەبێ دان بەو ڕاستییەدا بهێنین کە مرۆڤ کەوتە سەر باری یاد کردنی ناودارانی میللەتەکەی، لە غەریبییدا سۆزی بۆ ئەو ناوانە پتر سەر دەکات و بە هەناسەیێکی درێژتر خەریکی بیر کردنەوە و ناو هێنانیان دەبێت. بۆ ڕوون کردنەوەی مەبەست دەڵێم حاجی قادر لە ئاوارەییدا نەک هەر ناوی براگەورەکانی بردوە بەڵکوو یادی چەندین دێ و شاخ و هەوار و شاری کوردیشی کردۆتەوە کە ئەگەر لە کوردستان دوور نەکەوتبایەوە لزوم نەدەبوو یادیان بکاتەوە. لەم لایەنەی یاد کردنەوەی وڵات نالیش وەک حاجی قادر بوە بەڵام لەبەر جوداوازیی جۆری سۆزیان کە هی حاجی

[135] مەبەس لە «کۆر و لاڵ» پاشای ڕەواندز، پاشای کۆرە و ئەحمەد بەگی برایەتی کە هەردویان دەمێک بوو مردبوون.

له کوردایەتییەوە هەڵستاوە و هی نالیش لە یاد کردنەوەی عادەتییەوە، پەراوێزی یاد کردنەوەی حاجی گەلێک، یەکجار گەلێک، لە هینەکەی نالی فرەوانتر بوە چونکە هەموو جێگە مەشوورەکانی کوردستانی عێراق و ئێران و بەشێکی زۆری کوردستانی تورکیاش گرتۆتەوە.

ڕەنگە لێرەدا بتوانم غەریبایەتیی حاجی لە لایەنێکی تریشەوە بکەم بەهۆی نەفەس درێژیی ئەو یاد کردنانەی. حاجی کە دەزانین خۆی دەپارێزێ لەوەی پێی بڵێن خزمەتکار، ئەگەر لە غەریبایەتی نەبوویایە لەوانەبوو ناوی هیچ یەکێک لەو پیاوانە نەبات کە ناوبردنیان بە چوکایەتی لەسەر حیساب بکرێت وەیا بگوترێ بە نیازی وەدەست هێنانی چاکەی ماددی مەدحیان دەکات... هەر ئەم هۆیەی زۆر بەهێزی خۆ لە توهمە بە دوور گرتنە وای کردوە حاجی لە ئەستەمبۆڵ ناوی بەدرخانیان نەبات، لە هەموو دیوانەکەیدا جارێکیان مەدحێکی بەدرخانیانی کردوە[136].

هۆی دوەم نیازی بە ئیسپات گەیاندنی زیرەکی و نەجابەتی میللەتی کوردە. حاجی کە خەریکی کوردایەتی بە مەفهومی صەدەی نۆزدەم بێت زۆر بە ئاسایی و ئاسانی دەکەوێتە سەر هەڵدانەوەی میللەتی کورد، ئیتر لە هەر مەیدانێکی بە بیری مرۆڤدا دێت کوردان بەرەژوور دەبات وەک کە دێت و دەیەوێ هەموو ئادەمیزاد بگێڕێتەوە بۆ سەر ڕەسەن و ڕەگەزی کورد بەهۆی نیشتنەوەی کەشتیەکەی نووح بەسەر «کێوی جوود»ەوە کە مەشوورە یەکێکە لە کێوەکانی کوردستان:

ئەو ڕۆژە بە ئەمری حەیی مەننان
ئەم عالەمە پاکی بوو بە طوفان

تاقێکی نەما لە جینسی ذی ڕوح
غەیری ئەمە هاتە کەشتیەکەی نوح

ئەو ڕۆژە گەییشتە وەقتی مەعهود
وەستاوە لەسەر چیاکەی جود

---

[136] ئەم ڕاستییە لە لاپەڕە 314 ی بەشی یەکەمی ئەم نووسینە باس کراوە.

یا کە دەڵێ:

ئەولادی صەحیحیان بە بورهان
کوردن لە شوێنی جەددی خۆیان

سوککانی بیلادی ڕوبعی مەسکون
سەرپاکی لەمانە مونشەعیب بوون

هەر لەو بابەتە پێش خستەوەی ئەو شتانەی پێوەندییان بە کوردەوە هەیە، حاجی قادر لە بەشێکی بەرچاوی هەڵبەستەکانیدا کوردایەتیەکەی بەلای موبالەغەدا دەشکێنێتەوە وەک کە شاعیرێکی تری سەر بە ئایین دێت و موبالەغە لە شتی سەر بە دیندا دەکات وەیا یەکێکی تری چینپەروەر کرێکار و وەرزێر دەگەیەنێتە ڕیزی پەری و فریشتە و قارەمان.

وا دەزانم ئەگەر مەیلە یەکجار بەهێزەکەی کوردایەتی نەبوویایە، ناوی بەشێک لەوانەی حاجی بە مەدحەوە ناوی بردوون هەر لەگەڵ مردنی خۆیان دەمرد چونکە لەوانە نەبوون کەسی تر ناویان بێنێت. سرنج بگرە چۆن حاجی بە پاڵەپەستۆی تین و تاوی کوردایەتی مەیلی بۆ باس کردنی ئەو ناوانە دەچێت کە خاوەنەکانیان دوو بەیتی شیعریان بە کوردی داناوە. کەچی مەلا و زانای زۆر گەورەی کورد هەن ناویان نابات چونکە شۆرەتیان بە هیچ وێنە کوردایەتییەکەوە نەبەستوە.

من کە ئەمە دەڵێم هەر لە بیرمە حاجی قادر بەهۆی خەریکبوونی بە ناودارانی کوردەوە هەرگیز میللەتی کوردی لەبیر نەچۆتەوە. واتە لە یاد کردنەوەی تاکە بەرچاوەکاندا نەبۆتە تاکپەرستێک کە میللەتەکەی فەرامۆش دەکات. حاجی قادر لە کولانەی بەرژەوەندی کوردەوە و لە ڕووی خۆشویستنی ئەو گەلەوە بەرەو زیندوو کردنەوەی یادی تاکە هەڵکەوتەکانیەوە ڕۆیشتوە، تەنانەت هەر لەو کولانەشەوە خەریکبوونی ئەدیب و زاناکانی کورد بە زمانی بێگانەوە بێ کەڵک دەردەچوێنێت. بەڕاستی باوەڕی حاجی قادر بە گەلی کورد یەکێکە لەو تایبەتیە یەکجار زلانەی کە لەو سەردەمەدا نەک هەر لە ناو کورددا شتێکی دەگمەن بوو بگرە ئەو تەرزە فکرە جارێ لە ناو دراوسێکانی کوردیشدا هەر یەکجار کەم بوو.

ئەم ئیمانەی حاجی بە میللەت کە هەر خۆیەتی سەرچاوەی بیری میللەتپەروەریەکەی و خەباتە سیاسیەکەی، لە زۆر شوێنی دیوانەکەیدا جلوە دەبەستێت، بەڵام ئەم نموونەی وا لێرەدا بە شایەدی قسەکانمی دەگرم یەکێکە لە نموونە هەرە پێشکەوەتوەکانی فەلسەفەی ئیمان بە گەل هێنان کە لەتەک ئەودا وجوودی تاک خۆ نانوێنێت با ئەو تاکە شاهنشاهـ و ئیمپەراتۆریش بێت:

خوسرە و کەیقوباد و ئەسکەندەر
وەکو کیسرا و کاووس و قەیسەر

هەمو تێکچوون و پاکی فەوتاوە
نە سیلاح و نە سککەیان ماوە

واقیعا وایە وەک بەیانم کرد
هەر کەسێ زا بە ناعەلاجی مرد

مەرگ و ژین میسلی سێبەر و تاوە
ئەوی باقی بمێنێ هەر ناوە

چونکە هەرچی لە داری دونیایە
دێت و دەڕوا هەموی وەکو بایە

صەد شەهەنشاهـ و پادشا مردن
سەیری کە کوردی ئێمە هەر کوردن

میللەتە باقی مابەقا فانی
هەر لە جافی هەتا بە گۆرانی

حەسرەتم هەر ئەمە لە دونیادا
حاجی دەمرێ بە دەوریان ناگا

لەم نموونەیەدا حاجی قادر ئیمان هێناوێکی بێسنوورە بە میللەت، کە دەکاتەوە ئیمان هێنان بە میللەتی کورد. حاجی پتر، گەلێک پتر باوەڕی بە میللەت هێناوە، لە موزاهەرەگێڕەکانی تەقلیدیی ئەم ڕۆژگارە کە دێن لە دروشمەکانیاندا بە قەد و

باڵای جەماهیردا هەڵدەڵێن بەڵام ڕازی نابن لەسەر تەختە شڕەیێکی چایخانەکانی سەر ڕەصیف لەگەڵ بۆر و چڵکنێکی هەژاری ئەو جەماهیرە دابنیشن نەکا تۆز لە جلکە پاکە وتودارەکەیان بنیشێت وەیا تەسریحەی قژیان بە پوش و پەڵاشی ئەو ناوە تێک بچێت.

زۆر جاران کردار دەبێتە طقووس و ناوەڕۆکی نامێنێت، بگرە ناوەڕۆک لەبەر شاڵاوی طقووسدا هەر خۆی ناگرێت. بە نموونە دەڵێم وا دەبێ ئەو لایەنەی بۆ مەبەسێکی خۆی موزاهەرە بەرپا دەکات تەنها کاری بە نماییشتەکە و هەرا و هۆریاکەوە هەیە. بە دوا ئەودا ئەگەر دروشمەکانی موزاهەرە بسووتێنندرێن وەیا خەڵقی ناو موزاهەرەکە بگیرێن وەیا هەرچی لە زاهیردا مەطلەبی قیژ و هووڕەکە بوە هەمووی بە پێچەوانەوە بێتە دی، بایی فلسێک تەئسیر لەو لایەنە ناکات. بەڵێ «ازدواجیة»ی ڕواڵەت و واقیع شتێکە لە هەمومان ڕوونە و جارەهای جار پێیدا تێپەڕیووین و لە ئاکار و ئاکامەکانی گەیشتوین[137]. هەر لەم تەجرەبە تاڵەی خۆمانەوە، کە لەیەکتر دووربوونی ڕواڵەتی هەندێ بزووتنەوە سیاسیەکان و مەبەسە ڕاستەقینەکانیان دەردەخات، نرخی بیروباوەڕەکانی حاجیمان باشتر بۆ ڕوون دەبێتەوە کە دەزانین بیروباوەڕی بێفێڵ و بێ «ازدواجیة»ن.

ئەم هۆیەی دوەم، کە کوردایەتی تێدایە زۆری بەبەرەوە هەیە و تا بەدوای کەوین لێی نابینەوە چونکە وەک دەزانین لەوکاتەوە حاجی دەستی دایە خەباتی قەومایەتی هەموو کردە و گوتەیێکی هەر بەرەو ئەو ئامانجە بوە، لەبەر ئەمە پێی ناوێ لێرەدا چیتر لەسەری بڕۆین و بە تایبەتی چونکە هەر لەم ڕیزە هۆیانەدا جارێکی تریش بۆ مەبەستێکی تر و لە ڕوویێکی ترەوە کوردایەتیەکەی دێتەوە ناو حیسابمانەوە.

هۆی سێیەم سروشتە ڕاستگۆیەکەی حاجییە کە بەپێی تێگەییشتن و باوەڕی خۆی چاکەی چاکەکاران و خراپەی خراپەکارانی باس کردوە. دیارە حاجی قادر سەرەڕای کێشانە و پێوانە تەقلیدیەکانی چاکە و خراپەی کۆن، میقیاسێکی تازەی

---

[137] لە گڕ و کڵپەی ڕاپەڕینەکەی ساڵی 1948 دا کە ناوی بە «وثبة» دەرکرد، هەندێ پیاوی شەرم بەخۆ لە سلێمانی کچانیان لە موزاهەرە گێڕایەوە، گورج بەدوا ئەمەدا موزاهەرە دەرچوو لە ژێر دروشمی بمرێ دیکتاتۆریەتی عائیلی...!!

کوردایەتیشی بەکارهێناوە بۆ لەیەکتر هەڵاواردنی چاکان و بەدان هەر بۆیەیشە مەدحی مەلکە قۆڕ و حیماری و کیسەشکەل دەکات و ژورووی خواناسێکی زانای وەک «إبن یمین»یان دەخاتەوە:

به فیدایان دەکەم صەد ابن یمین
چونکە دەربەستی غیرەتی کوردین

کە کوردایەتی و هەستی نیشتمانپەروەری یاریدەدەری مەیلی ڕاستگۆیی حاجی بێت چاوەڕوان دەکرێ هەر ناوێکی، دوور و نزیک، خزمەتێکی کوردایەتیەکە بکات بکەوێتە بەر یادی حاجی و بە مەدحەوە بیهێنێتە ناو هەڵبەستەوە. بەو پێیەش، لە شکلّی پێچەوانەدا، ناوێک کە لەگەڵ مەفهومی کوردایەتی جووت نەڕۆیشتبێ ئەویش لە یاد کردنەوەدا مافی ڕەوای خۆی پێ درابێ، کە بریتییە لە شکاندنەوە و سەرکوت کردن. هەر ئەمەیشە هۆی شکاندنەوەی ئەو بەرەو تاقمانەی هۆشیان بە کوردایەتی نەشکاوە بۆ وەدەستهێنانی مافەکانی کورد نەخەبتاون.

لەم مەیدانەدا حاجی قادر چ گوناهێکی نیە کە ژمارەی مرۆڤی ناوداری نێوان، بە اصطلاح، ڕەشو ڕووت و هەژاران بەقەدەر ژمارەی ئەدیب و ئەمیر و براگەورە و شێخ و مەلایان نابێ. لەگەڵ ئەمەشدا حاجی چ درێغێکی نەکردوە لە پێدا هەڵگوتنی شایەری وەک عەلی حەریری و عەلی بەردەشانی و حیماری و کیسەشەکەل و... هتاد. جگە لەمە، بەشێکی ئەوانەی لە ڕێی مەلایەتی و شاعیرییەتەوە ناودار بوون و حاجی ناوی بردوون خۆیان لە چینی هەژارەوە پێگەیشتون هەرچەند لەقەبەکەشیان هی هەژار نەبێت، وەک ئەوەی سەرۆک دەوڵەتێکی کۆمیونیستی ئەمرۆکە لە جەرگەی پرۆلیتارياوە بەرز بێتەوە هەر پێی دەڵێن پرۆلیتاریی هەرچەند وەک ملیۆنیرێکیش ڕادەبوێرێت، لە حاڵێکدا مەلا و ئەدیبی کورد تەنها ناوەکەیان لە کرێکار و فەلاح جودا بۆتەوە، ئەگەرنا بەزۆری لە هەرە هەژاری میللەت حیساب دەکرێن.

ئەوەندە هەیە کە هەژارێک لە خوێندن و بەهرەدا گەییشتە پایەی مەلایەیی و ئەدەب وەک مێرووڵەی باڵگرتووی لێدێت، کە دەڵێن خوا غەزەبی لێگرتوە، مەلا و ئەدیبەکەش دەکەونە بەر ڕەخنە و تەعنەوە چونکە شیعر و مەلایەتیەکەیان بە

ئارەزووی ڕەخنەگری دواڕۆژ بەکار نەهێناوە وەیاخود وەک بلیمەتێکی سەردەمی خۆیان بیری پێشڕەویان نەبوە، کەچی ئەو گلەییە لە زوربەی خەڵقەکە ناکرێ هەرچەند بیرە پێشڕەوەکە بۆ سوودی ئەوانیش کاری کردوە، مەلا و شاعیرەکەش ئەگەر نەخوێندوو و بێبەهرەبوونایە ئەوانیش وەک فەلاحێکی لادێ و بەقاڵێکی شار کەس گلەیی لێ نەدەکردن... تەنانەت پیاوی نەخوێندوو و بێسامان ئەگەر خراپەش بکات، وەیا دوای تەڵەکەبازان بکەوێت، عوزری بۆ دەدۆزێتەوە و گوناهەکەی دەدرێتەوە بە کۆمەڵ و پلەی گۆڕان و ڕێژیمی دەرەبەگ و هۆی ئەوتۆیی...

بەڵام دەبێ ئەوەندە بڵێم حاجی قادر لە مەدح کردنی شاعیر و زاناکانی کورد ئەو بارە قورسەی فکری پێشڕۆ و گیانی شۆڕشگێڕیی نەخستۆتە سەر شانی ئەدیب و مەلا و شێخی سەردەمی خۆی. بەلای ئەوەوە بەس بوە شاعیر بە کوردی شیعر هەڵبەستێت، شێخ و مەلاش دینەکەی بۆ دنیا نەبووبێت. لە ئاست نەخوێندوو و هەژارانیش ئەوەندە خۆشباوەڕ نەبوە چونکە هەمیشە گلەیی ئەفسانەپەرستن و هەڵخەڵەتان و بێباکی و کەمتەرخەمیی لێکردوون کە بەڕاستی مرۆڤی دڵسۆزیش هەروەها دەبێت. تۆ سرنج بگرە لەو ڕۆشنبیرەی کە عوزری هەموو جۆرە عەیبدارییێک بۆ نەخوێندەوار و هەژاری لێرە بە پێشەوە دەهێنێتەوە، چۆن ئەگەر بەردەستێکی خۆی کەمترین درێغی لێ دەرکەوت عوزری نەخوێندویی لێ ناسەلمێنێت و دەرحاڵ سزای دەدات وەیا تەنبێی دەکات... بێگومان هەڵوەستەکەی حاجی لە هی ڕۆشنبیرەکەی ئەمڕۆکە پتر لەگەڵ داخوازیی ژیربێژییدا ڕێک دەکەوێت.

هۆی چوارەم ئەمەیان لە هەمویان گرنگترە چونکە تێکەڵ بە نیازی هەرە بنجی و ژیوەر و جۆشاو و خرۆشاوە لە خەباتەکەی حاجی قادردا.

لێرە بە پێشەوە بە دەم ڕەخنە گرتن لە هەندێ بیروڕای محەمەدی مەلا کەریم گوتم بەلای باوەڕی خۆمەوە محەمەد بیروڕایەکی تری هەیە جەرگەی نیشانەی تێدا پێکاوە. لێرەدا شایەدێک لە نووسینەکەی دەهێنمەوە بۆ دەرخستنی ئەو نیشانە پێکانەی وا نووسینەکەی منیش دەیەوێ بیپێکێت. لە لاپەڕە 57 ی کتێبەکەی «حاجی قادری کۆیی شاعیری قۆناغێکی نوێیە لە ژیانی نەتەوەی کورد» ئەم چەند دێڕە ڕاست و ڕەوانە دەخوێنیتەوە:

«ئاواتێکی پیرۆزی یەکێتیی کورد و کوردستان بوە. دڵی بۆ ئەو ڕۆژە لێی داوە کە بە چاوی خۆی کوردستانێکی یەکگرتووی یەک پارچە ببینێ کە میللەتی کورد لە چوارچێوەیا بحەسێتەوە و بە کامەرانی و بەختیاری بژی، وە سەروبەری خۆی بۆ لەیەک بکرێتەوە و خۆی بناسێ و بزانێ پایەی لەناو نەتەوەکانی تری گێتیدا چۆنە»[138].

من کە دێم بە دوا ئەو هەموو لێکدانەوە سەربەخۆیانەی خۆمدا هانا دەبەمە بەر بیروڕای نووسەرێکی تر لە پرسیارێکی وەها بنجیدا دوو ئامانجی گەشم بە چاوی خۆمەوەگرتوە: یەکەم، دەسخاوێنی کە قەرزی ئەدەبی ئەبەدییە بەسەر شانی هەموو نووسەرێک، بەڵکوو هەموو مرۆڤێکەوە. هەرچەند من لە ڕێبازی تێفکرینی خۆمەوەش گەیشتبێتم بە هەمان ئاکام و ڕەنگ بێ لە شەقامێکی بەرفرەوانتریشەوە هاتوچۆم بە ماکەکانی لێکدانەوە کردبێت، دیسانەوە بێدەنگبوونم لەو پێشدەستییەی کاک محەمەد دەبێتە دەست بەسەردا گرتنێکی ناڕەوا، وەیا هەر نەبێ دەبێتە خۆ بە سەهوو بردن لە ئاست چاکە و هونەرێکی گەورەی غەیری خۆم. دوەم، کەیفم بەوە دێت ببینم هاوباوەڕم هەیە لە پرسیاری وەها گرنگدا، بە تایبەتی کە هاوباوەڕەکەم کورد بێت و لە پرسیارێکی سەر بە کوردایەتیشەوە بێت.

خوێنەر دەبینێ من بە زۆری کنارەگیرم لە ناو بردنی ئەو نووسەرانەی لە بیروڕادا بە یەکەوە کۆ نابینەوە. مەگەر ناوناوەیێکی یەکجار کەم کە بە ناچاری ناوی نووسەرەکە ببەم، زۆریش ئاشکرایە بۆچوونەکانی من بە دەگمەن نەبێ لەگەڵ ئەو بۆچوونانە ڕێک ناکەوێت کە بوونەتە باوی ئەم سەردەمە و وەک بەڵگەنەویست لە بابەتی سەر بە کوردەوە دەگوترێنەوە، بۆیەشە وەها بە نادریی ناوی نووسەران دێتە ناو نووسینی منەوە.

یەکیەتیی کورد و کوردستان و پێکهاتنی دەوڵەتێکی کوردی لە چارچێوەی کوردستانی گەورەدا نەک هەر ئاواتێکی پیرۆزی حاجییە و بەس، بەڵکوو گەورەترین و پیرۆزترین و ڕووناکترین و پاکترین و چاکترین و ئاسمانیترین ئامانج و ئاوات و

[138] نووسینەکەی ناو ئەو کتێبەم بەو ڕێنووسەی لەوێدا پێی نووسراوە ڕاگوێستەوە ئێرەکانە.

خەون و خەیاڵ و هۆش و گۆشی حاجی بوە… دەزانین کوردستانی خۆشویستووە و بۆی شێت و شەیدا بوە، بەڵام خۆشویستنەکەی لە جۆری صۆفیەتی و دەروێشی و ئەفلاتونی نەبوە، بێ هەدەف، وەیاخود هەر خۆشویستنەکە خۆی هەدەف بێت. هەرچەند دەشزانین پێک نەهاتنی هەدەفەکە پلەی خۆشویستنەکە نزم ناکاتەوە، بە پێچەوانە لە کڵپە و سۆزی زیاد دەکات وەک ئەو عاشقە بێ قەرارەی کە نەگەییشتنی بە مەعشوقە شێت و هاری دەکات.

پاش ئەوەی حاجی گەییشتە پلەی ئیمان هێنان بە مافە نەتەوەییەکانی میللەتی کورد کە دروست کردنی دەوڵەت لە پێش هەموانەوە دێت، هەموو فکر و بیر و لێکدانەوە و گوتە و کردەی بەرەو پێک هێنانی ئەو مافە بنجییە بوە و بایی سەری موییێک لێی لا نەداوە و بایی تۆسقاڵێکیشی بۆ هەدەفێکی تر نەبوە. ئێمە لەم نووسینەی سێ بەرگییەدا گەلێک جار تووشی ئەم باسە بووین و هەر جارە لە گۆشەنیگاییێک و لەبەر ڕۆشنایی مەبەسێکدا لێی دواوین. ئێستا بۆ دوا جار لەم بەرگەدا لە گۆشەنیگای هەڵوەستی حاجی بەرانبەر براگەورە و ناوداران و دەرەبەگانی کوردەوە لێی دەدوێین و لێدوانەکەش دەبێتە تەواوکەری باسەکەی حاجی قادر و دەرەبەگایەتی بەو شێوەیەی کە گەیاندنەوە یەکتری دوو سەری کەوانە جغزی تەواو بە دەوری باسەکەوە دەکێشێت.

ئێمە گوتمان و بە ئیسپاتمان گەیاند، لە ڕێی شیعرەکانی حاجی خۆیەوە، حاجی دژی براگەورەی کورد نەبوە هەر وەک غەیری ئەویش دژیان نەبوون و ئیمکانی میژوویی و کۆمەڵایەتیش نەبوو بۆ ئەو دژایەتییە تا نیوە صەدەییێکیش دوای مەرگی حاجی. ئەوەشمان ڕوون کردەوە کەوا حاجی پتر لە شاعیران و ئەدیبانی تری کورد بەو براگەورانەوە خەریک بوە و ناوی بردوون و لەوەشدا چەند هۆیەکمان کردە جوداکەرەوەی هەڵوەستی حاجی لە هەڵوەستی غەیری خۆی بەرانبەر ئەو براگەورانە. ئێستا وا هۆی هەرە گەورەی ئەو هەڵوەستە تایبەتییە و بێ وێنەیەی حاجی باس دەکەین هۆیەکەش هەوڵ و تەقەڵای حاجییە بۆ هاندانی میللەتی کورد بەرەو وەدەست هێنانی مافە هەرە گەورەکەی نەتەوایەتیی.

پێش ئەوەی بچمە ناوەڕۆکی باسەکەوە دەبێ تێبینیەکی بنجیی دەرببڕم بۆ ئەوەی وەفاکاریمان لەگەڵ حاجی قادردا نەبێتە بێ وەفایی لەگەڵ برایێکی خۆی کە دەشێ بە براگەورەشی حیساب بکەین لەم مەیدانەی هەستی کوردایەتییدا. بەر لە حاجی

بە چەند صەد ساڵێک ئەحمەدی خانی بۆ یەکەم جار لە مێژووی میللەتی کورد و بە شێوەیێکی یەکجار ڕوون و بێ پێچ و پەنا و بە هەستێکی پڕتینی کوردایەتی ئاخ و کەسەری دەروونی خۆی هەڵڕشتوە بۆ نەبوونی دەوڵەتێکی کوردی کە ئەمەش دابڕانی کوردە لە گەلانی تری خاوەن کیان و بەهەدەر چوونی بەهرە و قابیلیەتی کوردەکانە لەو مەیدانانەدا کە ئەگەر خاوەنی چارەنووسی خۆی بوویایە ڕەنج بەخەسار و بێشوێنەوار نەدەبوو...

بەڕاستی دەبێ هەمیشە لە بیرمان بێ سەردەفتەری هەست بە نژادی خۆ کردن لە کوردایەتییدا ئەحمەدی خانییە، حاجی قادرییش ئەم ڕاستییەی لەبەرچاو بوە و لەهەڵبەستدا دانی پێدا هێناوە. بەڵام فەرقێکی بەرهەست هەیە لە نێوان جۆری سکاڵای ئەحمەدی خانی و حاجی قادردا، ئەویش بێگومان بەر لە هەموو شتێک دەگەڕێتەوە بۆ فەرقی نێوان داخوازیەکانی سەردەمی ئەحمەدی خانی و حاجی قادر. فەرقەکە ئەوەیە، حاجی قادر سەرەڕای تیژ کردنەوەی هەستی نەتەوایەتی و بە نژاد نازین و کورد بە مەغدوور زانین و دوشمن نیشانە کردن و ئەو جۆرە فکرانەی دەبنە زەمینەی فەلسەفەی قەومایەتی، بەرنامەیێکی ژیرانەش دادەنێ بۆ هەنگاونان بەرەو دروست کردنی حکومەت لەوەشدا هەر بە ئامۆژگاریە تەقلیدیەکەی «یەکبوون و ڕێک کەوتن و برایەتی و نیفاق بەلاوەنان...» دابین نابێت بەڵکوو لایەنە زۆر گرنگەکەی بوونی ئیمکانی دەوڵەت دانان بەهۆی بێهێزی دوشمنەکانی ئەوسای کورد و هەبوونی زەرفی خۆدانەپاڵ یاریدەدەرێک، لە پێشەوەی هەموو ئامۆژگاریان دەکاتە پەندی بەرەو وەدەست هێنانی مافی نەتەوایەتی کە ئەمە زانین و پیتوڵییێکە گەلێک بەولای ئەو زۆرزانینەوەیە کە دەڵێ «تەماعی گەورەیی بێ چەک نەکەن نەک» چونکە دەوری چەک لە ڕاوەبەرازیشدا شتێکی وەک بەدیهیە وایە.

بەلای منەوە کشانی فکری حاجی بۆ گرنگیی یەکشکڵبوونی جۆری نووسین و ئاخاوتنی کوردی گەلێک هونەرترە لە زانینی دەوری چەک لە بزووتنەوەی قەومیی ئەو سەردەمەدا. بەڕاستی، ئەو تەرزە عومومیاتەی وەک ڕێک کەوتن و بێ نیفاقی و پڕچەکبوون لە پەراوێزی پلانە عەمەلیەکەی کە حاجی نەخشەی دەکێشێت بۆ دەردەست کردنی مافە نەتەوایەتیەکان نرخی ڕاستەقینە وەردەگرن، ئەگەر نا لە

زەمانی باب ئادەمەوە ئەو ئامۆژگاریانە کراون و بیستراون ڕەنگە کەسیش پێڕەویی نەکردبن مەگەر لە خۆوە بێ مامۆستا پێڕەویی کرابن...

کورتەی گوتە لێرە ئەوەیە، هەرچەند مەودای بەراورد کردنی درێژە پێدراو لە نێوان ئەحمەدی خانی و حاجی قادردا ئێستا دەست ناکەوێت، پێویست بوو ئەم دوو تێبینییەی سەرەوە بێنمە بەر چاو و زیهنی خوێنەرەوە، تێبینییەکانیش:

1) یەکەمبوونی ئەحمەدی خانیی لە هەست بە کوردبوون و مەغدوریەتی کورد کردن.
2) تێهەڵکشانی حاجی لە سادە فکرەی کوردایەتی بەرەو تێفکرین لە چۆنیەتیی وەدەستهێنانی مافەکانی نەتەوایەتی و پلاندانان بۆ ئەو وەدەستهێنانە. هەر لەم خاڵەی دوەمیشەوە حاجی قادر، ڕاستەوخۆ، هەڵوەستە بێ وێنەکەی بەرانبەر براگەورەکانی کورد ڕادەوەستێ.

حاجی کە ڕووی بانگەوازی خۆی لە میللەتی کورد بکات بۆ خەبات کردن لە پێناو بنیات نانی دەوڵەتێکی کوردی، چی پێ دەکرا پتر لەوەی کردی؟ چۆنی پێ دەکرا بەشێوەیێکی تر؟

بانگهێشتنی بۆ تێکڕای میللەتی کورد دیاردەیێکی بەرچاوە لە دیوانەکەیدا، بەڵام کە هاتە سەر ناوهێنانی تاکەکانی چی بکا غەیری ئەوەی ناوی کەسانێک بێنێت کە ناوێکیان هەیە؟ بە کێ دەکرێ و لە کێ داوا دەکرێ بچێتە دایەرەی نفوسی شارەکانی کورد وەیا هانا بباتە بەر دایەرەی تەجنید و لیستەی ناوی هەموو پیاوانی کورد وەرگرێت و بە هەڵبەست وەیا بە نامەی تایبەتی داوای خەباتی کوردایەتییان لێ بکات؟ سەیر لەوەدایە، ئەم پلانە خەیاڵییە بە خەیاڵیش پێڕەویی ناکرێ چونکە لە صەدی نەوەدونۆی ئەو خەڵقە نەخوێندەوار بوون و نەیان دەتوانی نامە بخوێننەوە... بڕوا دەکەم هەڵبەستەکانی حاجیشییان بە ئاسانی پێنەدەگەیشت هەرچەند پێشیان گەییشتبایە لێحاڵیبوونیان بە نیسبەت ئەوانەوە ئاسان نەبوو...

کەواتە ناوهێنانی ناودارانی کورد، سەرەڕای نیازی شانازی کردن و خۆهەڵدانەوە لەو ناوهێنانەدا، نیازێکی یەکجار گرنگتر و کاریگەرتر بە حاجی قادری کردوە ئەویش بانگهێشتنی براگەورە و سەرۆکەکانی کوردە بۆ خەباتی قەومایەتی و پێکهێنانی کیانێکی کوردی. لێرەدا ڕێی ڕەخنەگر نیە پێم بڵێ سەرۆکەکانیش وەک زوربەی

میللەت لەوانە بوون قسەکانیان پێ نەگات وەیا تێ نەگەن، چونکە ئەم ڕەخنەیە لە سێ لاوە بەرپەچ دەدرێتەوە:

1) حاجی بانگهێشتنی تێکڕای کوردی کردوە بۆ خەبات، تێبگەن و تێینەگەن، پێبگەن و پێینەگەن، بە ناو بن و بێ ناو بن. لەبەر ئەمە ناوهێنانەکە زەحمەتێکی تازە ناخاتە بەر ئەو بانگهێشتنەوە تاکوو بڵێین بێلزومە، لە حاڵێکدا دەزانین تێگەییشتن و پێگەیشتنەکەی زوربەی میللەت کارێکی زەحمەتتریش بوە.

2) حاجی بە دوای بانگهێشتنەکەدا دەبوو ئەو ناوانە بکاتە هێزپێدەرێکی خەباتەکەی خۆی لەو ڕووەوە کە ئەگەر بانگەوازەکانی بەرەو کەسانی بێ ناو و نیشان و شۆرەت و دەسەڵات بوونایە دەبوونە هاواری دەشت و بیابان کە هاوارکەرەکە بەر لە خەڵقی تر دەزانێ دەنگ ناداتەوە، هەروەک ئەگەر حاجی ببرای ببرای ڕووی وتووێژی لە میللەت نەکردبایە دەبوە پیاوێکی خەیاڵبازی بێ مایە چونکە لەو سەردەمەدا کە حاجی دەنگ و صەدای ئەورووپای دووبارە دەکردەوە ڕووی هەموو بانگەوازێک لە میللەت بوە بە تایبەتی کە بۆ ئامانجێک بێت پەکی لەسەر تێکڕایی میللەت کەوتبێت.

3) لە لایەن تێگەییشتنی قسەکانی حاجیشەوە، بەهەمەحاڵ، بەرەی سەرۆک و براگەورە و مەلا و ئەدیب و تاکە بەرچاوەکان پتر لە زوربەی میللەت چاوەڕوانی تێگەییشتنی قسانیان لێ دەکرێت، هەروەها هەڵبەست و نووسراو و چاپکراویش ئاسانتر بەوان دەگات.

ئەم دەمەتەقەیەی لێرەدا لەگەڵ ڕەخنەیێکی خەیاڵکردی خۆمی دەکەم ئەوەندە سوودەی تێدا هەیە کە ناو بردنی ناوی گەورەپیاو و ناودارانی کورد لە لایەن حاجییەوە بکاتە دیاردەیێکی عادەتی بێ ئەوە هیچ گلەیی بچێتەوە سەر لەوەدا کە هەر ناوی ناودارانی هێناوە. وەک لێرەش بە دواوە، لە کۆتایی هەموو لێکدانەوەکانماندا دەردەکەوێ، ئەم تەرزە سێبەرەی ئیعتیرازان و ڕەخنان هەر بە جارێ دەچێتەوە و تارماییشی لە مێشکاندا نامێنێت مەگەر بە ئانقەست یەکێک خۆی بۆ گلەیی و گازاندەی ناحەزانە و دوشمنانە لە حاجی قادر دانووسێنێت و زێدە لە عالەم یەخەی ئەو بگرێت.

مەبەستی هاندانی کوردان بۆ وەدەستهێنانی مافی نەتەوایەتی پاڵی بە حاجی قادرەوە ناوە کە لە نێوان ناودارانی کوردیشدا بە تایبەتی لە گوێی دەسەڵاتداران بچرپێنێت و غیرەتیان ببزێوێت بۆ دارِنینی بەرگی پڕ عەیب و عاری خزمەتی بێگانە کردن، هەمان مەبەستی بەخەبەر هێنانی هەستی غیرەتکەشی براگەورەکان لە باس کردنی حاکم و میرەکانی کوردی لە حاجی بە پێشەوەش شتێکی ڕوون و ئاشکرایە، هەر نەختێکیش سرنج ڕاگرتن ئەم ڕاستییەت بۆ ئیسپات دەگەیەنێت.

حاجی قادر لە چەندین جێگەدا سەرکەوتنی خەباتی کوردایەتی بۆ وەدەستهێنانی مافە زلەکەی خۆی، کە پێکهێنانی دەوڵەتە، دەبەستێتەوە بە چەند هۆیێکی بنجییەوە کە یەکێک لەوان هێزی چەکدارە. ئەم بەیتانەی خوارەوە نموونەی پێدا هەڵگوتنی چەکە[139] لە لایەن حاجییەوە:

[139] لە هەندێ نوسخەی چاپکراوی «دیوانی حاجی»، کە یەکێکیان دیوانە چاپکراوەکەی ساڵی 1953 یە لە چاپخانەی کوردستان، بەیتێک لە کۆتایی قەصیدەی «لە ڕۆما کەوتە بەرچاوم...» دا بەم شێوەیەی خوارەوە نووسراوە:

هەرچی جێگای ئومێدمانە و ئەوەی دڵ خۆش دەکا ئەمرۆ
چەکە چۆن لەو بەدەر نابێتە غەم خۆری گەلی کوردان

کە بگەڕێیتەوە بۆ دەقی قەصیدەکە دەبینی حاجی ئومێدی کوردان دەداتەوە بە ئەمیرێک پاش ئەوەی کابرای «هایم و حەیران» ی ناو قەصیدەکە لە شێوەن و زاری و بێ ئومێدیی و کەسەر هەڵڕشتن دەبێتەوە. ئەمەش ئەو چەند بەیتەی کۆتایی قەصیدەکەیە کە لێرەدا ئیشمان پێیەتی:

لە پاشی ئەم هەمو گریان و زاریی و ناڵەیە پێم گوت
برادەر غەم مەخۆ هێندە لە سایەی ڕەحمەتی ڕەحمان

ئەمیرێک ماوە پاشایە گوتی کێیە گوتم شێرە
گوتی لێرە؟ گوتم لێرە هەتا تاران و هیندوستان

به شیر و خامه دەوڵەت پایەدارە
ئەمن خامەم هەیە شیر نادیارە

صەلاحی ئێوە ئێستێکە سیلاحە
تەماعی گەورەیی بێچەک نەکەن نەک

قەصری دین بنج و بناغەی مەحکەمی
شیر و تیرە دیرەگ و تاق و خەمی

---

به خۆی شێرە وەکو ناوی لە شەڕدا دوژمن ئەندازە
تەمایان هەر بە ئەو ماوە تەواوی خاکی کوردستان

دەمێنێتەوە بەیتەکەی کۆتایی قەصیدەکە، ئەوە بوو لە پێشەوە نووسیم بەو شێوەیەی لە دیوانەکەی چاپی هەولێردا چاپ کراوە. زۆر ئاشکرایە پێوەندیی ئەم سێ بەیتانە بە تەواویی پچڕاوە لە بەیتەکەی کۆتایی چونکە ئەوان باسی ئەمیرێک دەکەن ئەم بەیتەش باسی چەک دەکات. ڕاستیی بەیتەکە لە نوسخە دەسخەتی تردا هەیە کە هیچ گرفتان ناهێڵێ، وا لێرەدا دەیخەمە بەرچاوان:

هەرچی جێگای ئومێدمانە و ئەوی دڵ خۆش دەکا ئەمرۆ
کەسی دی لەو بەدەر نابێتە غەم خۆری گەلی کوردان

بەمەدا واتای بەیتەکە زۆر ڕوون و مەفهومە. لە لاپەڕە 315 ی بەرگی یەکەمی ئەم نووسینەدا من دەلالەتی ئەو شیعرانەم بۆ «یەزدان شێر» بردۆتەوە چونکە هەر ئەو لەو دەمەدا ناوی «شێر» ی هەبووە و ئەمیریش بووە، بەڵام ساغ کردنەوەی پرسیارەکە بەمەندە قسەیە تەواو نابێ چونکە سەروکاری «یەزدان شێر» ڕوون کردنەوەی دەوێت. بە ئومێدم ئەم لێکۆڵینەوەیە لە بەرگێکی داهاتودا بکرێت کە ئەو سەردەمە دەگەڕێتەوە حاجی لای بەدرخانیەکان، لە ئەستەمبۆڵ، بەسەری بردوە، هەر ئەو کاتەش مناسبی باس و خواسی یەزدان شێرە.

گولسەنی پڕ میوەیی باغی مەعاد
وا لە ژێری سایەیی تیغی جیهاد[140]

کێ گوتی میسواکە تیرم یا عەصا
نێزمە گورزی گرانم مەنتەشا

یا کەمەندم ڕوشتەیە تیغم تەبەر
پۆست و کەشکۆڵ و دەفەم تاج و کەمەر

گەلێک نموونەی تری وەک ئەم بەیتانە لە هەڵبەستەکانی حاجییدا بەسترانەوەی خەبات بە چەکەوە دەڵێنەوە کە لەمەوە بە چاکی ئیمانی حاجی بە دەوری هێز و کاریگەربوونی ئەو دەورە دەردەکەوێت. کە حاڵ ئەمە بێت کام بەرە و تاقم لە نێوان میللەتی کورددا خاوەن چەکە بێجگە لە براگەورەکان و سەرۆک عەشیرەتەکان؟ واتە لە دەستەی دەرەبەگ بەولاوە کێیە لە کوردان چەکی هەبێت؟ بەڵی دەتوانین دەستەی پارەدارانیش لە ڕیزی دەرەبەگان دانێین لە ڕووی دەسەڵاتی چەک پەیدا کردنەوە بەو نامەیەی کە دەوڵەمەند ئەگەر چەکی حازر بەدەستیشی نەبێ دەتوانێ بە پارە پەیدای کات، بەڵام حیسابی هەڵوەستی حاجی لە دەرەبەگ و ناودارانی کورد هەڵناوەشێنێتەوە، بە پێچەوانە، چەسپاوتری دەکات چونکە ئەگەر بەر لەم حیسابە هەر دەرەبەگ و سەرۆک عەشیرەت بهاتبانایە ناو جغزی مەفهومی براگەورەیەتی، ئێستا پارەدار، بۆرجوازیش، دەچێتە ناو جغزەکەوە.

خوێنەر دەبینێ ئەم هەڵوەستەی حاجی لە ئاست دەرەبەگ و براگەورانی کورد بە هەموو لێکدانەوەیێک و لەبەر تیشکی هەموو ڕاستییێکی کە زەرفی ماددی و مێژوویی سەردەمی حاجی قادریان پێکهیناوە لە نوقتەی نەزەری خەباتی قەومایەتییەوە، جار لە جاری لەبەرچاوی حەقیقەتبیندا پتر دەبێتە هەڵوەستی دۆستانەی حەتمی و ناچاریی کە تاکە ڕێگاییێک بێت لەبەر هەنگاوی حاجی قادردا. ئەو لێکدانەوەیەی منیش لێرەد دەیکەم تەنها بۆ دۆزینەوەی سەرچاوە ماددی و فکری و مێژووییەکانی حەتمیبوونی ئەو هەڵوەستەیە نەک دۆزینەوەی هەڵوەستەکە خۆی، چونکە

[140] ئیشارەیە بۆ حەدیسی «الجنة تحت ظلال السيوف».

شیعرەکانی حاجی لەم ڕووەوە پێویست بە لێکدانەوە ناهێڵن، تەنانەت هەموو دادوبڕۆی حاجیش بۆ یەکبوونی کورد و بەلاوە نانی نیفاق، بەر لە هەموو مەردم، ڕوو لەو براگەورانە دەکات کە بە چەک و پارە دەتوانن خەباتی چەکدار بکەن ئەمەش ئاکامێکی ڕاستەوخۆ و یەکسەرەی بەسترانەوەی خەباتەکەیە بە هێزەوە.

جگە لەمە لە واقیعیشدا ئەو کوردانەی کە دەشێ بەر مەفهومی نفاق بکەون هەر ئەوان کەسانەن کە لە ڕێی دەسەڵاتەوە بە بەریانەوە هەیە لە شوێنی خۆیانەوە دوشمنایەتیی دەسەڵاتداری شوێنێکی تر بکەن وەیا لەگەڵ دراوسێی نزیکی خۆیاندا بۆ تەماعی بەرتەسکی ناوچەیی ناکۆکی بنێنەوە، ئەگەرنا فەلاحێکی بێچارەی دەشت و بەقاڵێکی هەناسە ساردی شار کەی توانیوەتی ڕێبازی نفاق بگرێتە بەر. هەموو نیفاق و ناکۆکیی بەقاڵێک لەگەڵ یەکێکی تردا ئەوەیە نرخی کیلۆی تەرۆزی یەک دوو فلس گرانتر یاخود هەرزانتر بکات. خوێنەرێک بەتەما بێ ڕەخنە لەم قسەیەم بگرێت با ئەوە بە بیری خۆی بهێنێتەوە کە وا نەک لە سەردەمی حاجی قادر، بگرە لەم ساڵەی 1972 شدا[141] بەقاڵ و فەلاحی کورد هەر ئەوەندە دەسەڵاتەی چاکە و خراپەی هەیە، مەگەر لەسەر کاغەز بۆی ساز دەین. دەمەوێ لێرەدا ڕاستییێکی گرنگ بهێنمە بەر چاو و مێشک و ویژدانی خوێنەری کوردی سەردەمی ئێستاکە بۆ ئەوەی لە بڕیارەکانی بەرانبەر حاجی قادر دەستووری ئینساف نەبەزێنێت.

حاجی قادر بەر لە صەد ساڵ کە دێت و ڕووی وتوویژ و ئامۆژگاری کوردایەتی لە هەموو کورد، بە تێکڕایی، و لە دەسەڵاتدارانی کورد، بە تایبەتی، دەکات ڕێبازێکی گرتۆتە بەر کە تاکە ڕێباز بوە و هیچی تری لە پێشدا نەبوە و بەپێی بڕیاری مێژوو و کۆمەڵایەتی و بەرژەوەندی کورد و ویژدانی خۆیشی تێیرا ڕۆیشتووە کە ئەگەر لێی لادابایە ئەو حاجی قادرە نەدەبوو پێی بڵێین هەڵگری مەشخەڵی کوردایەتی، بانگەوازەکانیشی چ ڕووی لە هەموو میللەت کردبێت و چ لە بەرەی دەسەڵاتداران، لە چارچێوەی وەدەست هێنانی مافە ڕەواکانی گەلی کورد دەرنەچوە بەرەو دەستدرێژیی کردن لە گەلێکی تر.

---

[141] هەموو جارێک کە بڵێم ئەم ساڵە مەبەست ساڵی دەست پێکردنی ئەم نووسینەیە کە 1972 ە.

جا ئەگەر ڕۆشنبیرێکی ئەم سەردەمە هات و لە حاجی بە عەیب گرت کە ڕووی قسە و ئاواتی خەباتی لە براگەورە و دەسەڵاتدار و دەرەبەگی کورد کردوە با ئەم ڕاستییە بە چاوی خۆیەوە بگرێت کە وا کام حکومەتی شۆڕشگێڕی مرۆڤدۆستی هەژارپەرستی ئەم ڕۆژگارەی ڕۆشنبیرەکە بە نموونەی جەوانمەردی و پێشڕۆیی و پاکی و چاکیی دادەنێت، بۆ بەرژەوەندی خۆی، هەتا سەرەک دەوڵەتی چەنگ بکەوێ قسە لەگەڵ سەرەک وەزیران ناکات، هەتا وەزیر ڕاوەستابێ مەرحەبا لە مودیر عام ناکات، هەتا سەرۆک نەقابە هەبێ خۆ لە سکرتێرەکە ناگەیەنێ... هەرگیزیش سرەی قسە کردن و مەرحەبای ناگاتە کرێکار و فەلاح.

بێگومان ڕۆشنبیرەکە بە دڵیدا نایەت کرداری وەها لە دەوڵەتە باوەڕ پێکراوەکەی خۆی بە عەیب بگرێت لە حاڵێکدا دەوڵەتەکە وەک حاجی قادر ناچاری ئەو کردارە نیە چونکە دەتوانێ نەختێک لە تەماعی کەم کاتەوە و مەرحەباکانی بە هەموو پیاوی چاک و خراپ نەفرۆشێت... وەک حاجی قادریش لە باوەڕی دەروونییەوە ئەو ڕەفتارە ناکات چونکە دەوڵەتەکە بە قسە و پڕۆپاگاندە شتێک دەڵێ چ برادەرایەتی لەگەڵ ڕەفتارەکەی نیە... مەبەستەکەشی وەک مەبەستی حاجی قادر پیرۆز و ڕەوا نیە چونکە حاجی دەستەودامانی براگەورەی کورد دەبێت بۆ ڕزگار کردنی کورد لە عەبدایەتی کەچی دەوڵەتەکە لەوانەیە سیاسەتەکەی بۆ بەرژەوەندێکی ناڕەوا وەیا کەمبایەخ بەکار بهێنێت، وا دەبێ میللەتێکی تریش لەو ماملەتانەدا زەرەرمەند دەبێت.

دەزانم ڕۆشنبیری لایەنگیر ئامادەیە هەموو کردارێکی ناڕەوای لایەنە خۆشەویستەکەی خۆی تەبریر بکات، ئیتر کە ئەو لایەنە لەگەڵ دەوڵەتی «رەجعی»دا دۆستایەتی گرت دەڵێ بۆ بەرژەوەندی هەموو مرۆڤایەتی وای کردوە. خۆ ئەگەر لایەنەکە خۆی کەڕ کرد لە ئاه و نزای میللەتی غەدرلێکراو ئەوسا دەگوترێ پاراستنی ئاشتیی گشتی و سەلامەتیی پەڕە سپیەکانی کۆترەکان وەها داخوازی دەکات...

من ئەو کەسە خەیاڵییە نیم لەو تەرزە ڕۆشنبیرە داوا بکەم شێواز و ڕێبازی بیر کردنەوە و قەناعەتەکانی بگۆڕێت، هێندەش ناواقیعی نیم گلەیی لە دەوڵەتە مرۆڤدۆستەکان بکەم لە گرتنەبەری ئەو سیاسەتەی کە بەلای خۆیانەوە چاکەی خۆیانی تێدایە هەرچەند خراپەی خەڵقی تریشی تێدا بێت، چونکە ئەم تەرزە داوا

کردنە لە ڕۆشنبیری لایەنگیر وەک داوا کردنی گەرمییە لە بەفر، هەروەها گلەیی کردنەکەش خۆ تەفرەدانە بە ئیمکانبوونی لەیەک چوونی قسەی ناو کتێبان و کردەوەی ڕاستەقینە... بەڵێ من لەم گۆشە یەکجار بە تەوازوعەی بیر کردنەوەی خۆمەوە هەرگیز بە باڵی خەیاڵ و بەرەو ئاسۆی وەها بەرزی «توقع» ەوە نافڕم. تەنها «توقع» و تکای یەکجار تەوازوعکارانەم لەو ڕۆشنبیرە کوردە ئەوەیە، کە ئەو هێندە خۆش تەئویل بێ بۆ دەوڵەتی بێگانەی پڕ چەک و دەسەڵات و تەکنیکی ئەم سەردەمە، دەبێ دەیێک و صەدیێکی ئەو چاوپۆشییە لە هاوزمانە هاونیشتمانە هاونژادە هاودەردە یەکجار دڵسۆزەکەی خۆی، حاجی قادر، بکات لە کردەوەیێک کە ئەگەر نەیکردبایە دەبوە ناحەزی میللەتەکەی وەیاخود دەبوە یەکێک لەو ملیۆنانەی بیریان بۆ کوردایەتی نەچوە...

بە پێی بیروباوەڕ و بۆچوونی من، لەبەر تیشکی ئەو لێکدانەوانە و تێبینییانە و ڕاستییە مێژووییانە و باری کۆمەڵایەتی و سەرلەبەری وەزعی میللەتی کورد لە سەردەمی حاجی قادردا هەڵوەستە زۆر دیار و ئاشکراکەی حاجی لە ئاست براگەوران و ئەوانەی ئێستا ناوی دەرەبەگیان لێ دەنێین دەبێ سەیری بکرێت و کێشانە و پێوانەی لەگەڵدا بکرێت وەک کە لەم ڕووپەڕانەی دوایی ئەم نووسینەدا بایی پێویست لەگەڵیدا کرا.

چەند فەرمانێکی گرنگ و بنجی و بنەمایی، لە لێکۆڵینەوەدا سەیر کردنی عاطفی و سەراو و کەفەلوولکاویی وەک میکرۆبی نەخۆشیی لە لەشی ساغ دوور بخرێتەوە، بڕیاری پێشەکی بەلاوە بندرێت، مەیلی شەخسی و لایەنگیریی تاوانبار بکرێت. ئەم جیهانە و ڕووداوەکان و تاکەکان و کۆمەڵەکانی بە خۆیان و هەموو ئەو خەسڵەتانە و تایبەتیانە و هێزی بەرەو پێشبەر و دواخەر و ژیێنەر و مرێنەریانەوە کە لە دیاردە بێ ئەژمارەکانیاندا دەردەکەون بە فەرمانی نەزەریە حازر بەدەستەکانی من و تۆ پەیدا نەبوون، بەپێی بڕیارەکانی ئەو نەزەریانەش بزووتن و وەستان و تەفاعول ناکەن، هیچ زانست و خەیاڵ و نەزەریەی ئامادەکراویش نیە بتوانێ لە پێشەوە قەپێلکی فکری ساز بدات و بۆ تەعلیلی ئەو شتانەی لەم جیهانەدا ڕوو دەدەن بە تایبەتی لە جیهانی زیندواندا کە مرۆڤ پۆپی ئەو جیهانەیە و بە تەنها لە تێکڕایی زیندو و مردووی دەرەوەی خۆی گرێیاویتر و تێک هەڵکێشراوتر و زۆر مەجهولتر و قووڵتر و پانتر و تەڵیسماویترە... هەر لە بیرمە، زانایێکی تەبیعی لە بابەت ڕواڵەتی

زۆر سەرسورِێنی ئیرادەی گیانلەبەرانەوە دەینووسی: زاناکانی فەلەک دەتوانن لە ئێستاوە تا ملیۆن ساڵی تر بە ڕاست و دروستی پێشبینی بکەن لەو هەندە جارەی ڕۆژ و مانگ دەگیرێن، زانای کیمیاش دەزانێ بە ڕاست و دروستی لە تێکەڵبوونی دوو مادده چ تەفاعولێک دەبێ، بەڵام هەرچی زانای جیهان هەیە ناتوانن بەڕاستی پێشبینی بکەن لەوەدا کە ئەگەر مێشێک لە ژوورێکدا بەرِەڵڵا کرا چی دەکا و بۆ کوێ دەفرِێ و لە کوێ دەنیشێتەوە چونکە لە مێشی زیندوودا «ئیرادە - خواز» هەیە بەر هیچ یەکێک لەو دەستووره حازربەدەستانە ناکەوێ کە هەر زانایە لە مەیدانی خۆیدا دۆزیویەتەوە.

کە ئەمە حاڵی مێش بێ ئاخۆ دەبێ ئادەمیزاد چۆن بێ؟ بەڵێ، من ناڵێم مرۆڤ مەخلوقێکی ئەوەندە ڕیزپەرِ «شاذ»ە هی لێ تێگەییشتن نیە، بەڵام کە ئەمە ناڵێم لەوەندەش دڵنیام کە مرۆڤ ئەو مەخلوقە ڕام و کەوی و خۆشجڵەو و سادە و سافیلکەیەش نیە زانا و فەیلەسوفان، بە تایبەتی زانا و فەیلەسوفی نەزەری، لە پشت مێزی لەسەر نووسینەوە خەیاڵاتی خۆیانی لێ بکەن بە لغاو و بەپێی برِیاری خەیاڵەکەیان بێرە و بەوێیدا ببەن و بە درێژایی زەمانە چاکە و خراپەی پێ بکەن. مرۆڤ ئەگەر نەخرێتە بەندیخانەوە، بەپێی تێراخورینەکانی وەرزشی فەلسەفیی «ڕاحەت کە... وریا بە... بۆ چەپ وەرگەرِێ... بۆ پێشەوە برِۆ...» بزووتنەوە ناکات. کە خرایە بەندیخانەشەوە بێ لە کارهێنانی فەلسەفەی ئەم و ئەو، زیندانەوانێک دەتوانێ بە برسی کردن و قەمچی لەسەر هەڵسورِاندن بیکاتە تەربیەلی مەیموون، ئەوساش چ ڕێ نامێنێتەوە بۆ شانازیی کردن بە ڕاستبوونی نەزەریەکان.

لێکۆڵینەوە لە بارەی یەکێکی وەک حاجی قادرەوە بەوە نابێ لە پێشەوە برِیاری نەزەریان بەسەر خۆی و کردەوە و گوتە و ڕۆژگارەکەیدا بهێندرێت و بە دوا ئەوەدا تۆژینەوە لە ڕاستبوونی ئەو برِیارە و ئەو نەزەریەیە بکرێت لە ڕێی تەئویلی بەسەرهاتەکانی حاجی و بژاردە کردنی ئەو گوتە و ڕووداوانەی دەست دەدەن بۆ بەراست گێرِانی نەزەریە و برِیارەکانی. بە نموونەی ڕوون کردنەوە دەڵێم خواپەرستەکان ئەم شێوازەی بە ئیسپات گەیاندنی هەموو پێشبینیەکانی غەیب دەگرنە بەر چونکە لە زیمنی برِوا کردن بە غەیب برِوا کردن بە هەموو شتێکی غەیب بەشێکە لەو برِوایە. بەهەڵە چوونی غەیب «نقیض»ی ئەو برِوایەیە کە غەیب دەپەرستێ. بەڵام نەزەریەکانی جیهانیی چ ماددی بێ چ نامادی Idealism,

Rationalism ... هتاد خۆیان بە بەچکەی ئاسمان دانەناوە تاکوو ئەگەر لە شتێک وەیا لە زۆر شتان سەهویان کردبێ ئیفلاس بکەن. خۆ ئەگەر بێت و پەیڕەویکەرانی ئەو نەزەریانە ڕاستبوونی نەزەریەکان بە ڕاستبوونی هەموو بڕیارەکانیانەوە ببەستنەوە هەر لە پێشەوە ئیعلانی ئیفلاسیان دەکەن چونکە یا دەبێ سروشت درۆزن بێ لەوەدا کە بێ سەروبن و سنوور و پایان و خارج لە وزەی تەقدیراتی لێکدانەوە و نەزەریەی تاکانە، یا دەبێ نەزەریەکان هەڵەیان تێدا بێ... جا ئەگەر سروشت درۆزن بێ نەزەریە بۆچی ڕاست بکا؟

لێکۆڵینەوە دەبێ چ تێبینیی بڕیاری لە خۆی بە پێشەوەی تێدا نەکرێت، وەک ئەوەی کە یەکێک بڕیار بدات لە فلآنە دۆڵی شاخی هەورەمان گەنجینەی حەزرەتی سلێمان شاردراوەتەوە، ئیتر هەر خەریک بێ لە بن هەر بەردە و دارە و لە ژێر هەر ئاوە و ئەشکەفتەی ئەو دۆڵەدا بەڵگەی ڕاستبوونی بۆچوونەکەی بدۆزێتەوە... باشتر ئەوەیە چ بڕیاری پێشەکی بەسەر بوون و نەبوونی ئەو گەنجینەیەدا نەدرێ و بە لێکۆڵینەوە و لێدانەوە و تۆژینەوە مەعلووم بکرێ ئایە گەنجینە هەیە یان نیە؟ لەم نووسینەدا کە دێم دەڵێم حاجی مرۆڤێکی بەخۆ نازیوی ڕێز لەخۆ گرتوو بووە، وەیا ترس و تەماعی نەبوە، لە خۆوە بەپێی بڕیاری پێشەکیی حوکمی وەها نادەم، بەڵکوو لە ڕێی هەڵسەنگاندنی ڕەفتار و کردارەکانی حاجییەوە دان بەو ڕاستییەدا دەهێنم وەیاخود با بڵێم لە ئاکامی تۆژینەوە و لێکدانەوە و لێکۆڵینەوە لە بەسەرهاتی حاجی و دۆزینەوەی کاریگەرە زاتیەکان تێیاندا ڕێ بە خۆم دەدەم بڕیار لە پرسیارەکە بدەم هەر وەک لە سەردەمی خۆماندا کردەوە و ئاکاری زیندوەکان دەبنە بنگەی بڕیاردان بەسەر چاکە و خراپە و ئازایی و ترسنۆکی و ڕاستیی درۆییانەوە. صەد جاران داوای شۆڕشگێڕی و مرۆڤدۆستی و دیمۆکراسی و جانفیدایی لەم و لەوەوە خۆ لەبەر تاکە یەک بەڵگەی وەک پارە کۆ کردنەوەی خاوەن داوایەکە ناگرێ. حاجی قادریش کە دەیگوت:

هەر منم ئێستە وارسی عیسا
بێ ژن و ماڵ و بێ کوڕ و مەئوا

ئەگەر پارەی لای خەڵق بە قازانج گەڕابایە داوایەکەی دەپووچایەوە یاخود هەموو بانگەوازەکانی کوردایەتیەکەی دەبوو بە قەپووچکەی سەر ئاو ئەگەر کرابایە والی ئەدرەنە و خامۆش بوویایە.

خوێنەر دەبینێ لە زۆر جێگەدا من کردەوەی خەڵقی لێرە بە پێشەوە بە هی ئەم سەردەمە دەگرم، لەمەشدا تاکە مەبەستم ئەوەیە بڕیارەکانمان لە بنگەی واقیعەوە هەڵستێنین چونکە کە هاتین و ڕەفتاری خۆمان لە بیر کرد و ڕەفتاری خەڵقی صەد ساڵ و دووصەد ساڵ لەمەوبەرمان بە ڕەفتاری فرشتە و پەرییان گرت وەیاخود لە حوکمە قورسەکانی ناو کتێبانەوە میقیاسمان بۆ کێشانە و پێوانەی ڕابردوو خواستەوە لەوە دەردەچین ببینە حەکەم لە هەڵسەنگاندنی ئاکار و ڕەفتاری غەیری خۆمان، لەوە هەر گەڕێ کەڵکی تۆژینەوە و لێکۆڵینەوەی زانستکارانەمان پێوە بمێنێت لە هەرچی باسێکی سەربە مرۆڤەوە هەیە چونکە زوربەی ئەو باسانە لەوانەن خۆشویستن و ڕق لێبوونەوە هەڵبگرن و بەو پێیە میقیاسی زاتی ئارەزووی ناو دڵی خۆمانیانی بەسەردا بهێنین...

لێرەدا نموونەیێکی ڕاستبوونی قسەکانی خۆم لە شیعری حاجی دەهێنمەوە. حاجی لە نێوان بەیتەکانی قەصیدەی «خاکی جزیر و بۆتان» ئەمەی گوتوە: «ئەگەر هیچ نەبێ بە ئۆیین تابیع بە دەوڵەتێ بن». لەوانەیە هەندێ ڕۆشنبیری حەسایەوەی ئەم ڕۆژگارە بڵێن حاجی قادر چۆن ڕەوای دیتوە داوا لە میللەتەکەی بکات «تابیع بە دەوڵەتێ بن»، گۆیا لەمەدا دەستبەسەری بۆ کورد پەیدا دەبێت.

بەر لەوەی وەرامی بنجیی ئەو ڕەخنەیە بدەمەوە دەبێ بڵێم حاجی لەوەدا گلەیی لێ ناکرێ کە داوا لە کورد دەکات تابیع بە غەیری خۆیان بن چونکە کورد لە کاتی دانانی ئەو هەڵبەستەدا تابیع بە زیاتر لە دەوڵەتێک بوون، دەشهات لە جەرگەی وڵاتەکەیاندا خەتەرێکی تازەی گەورە پەیدا بێت، کەواتە تابیعبوون بە دەوڵەتێک بۆ بەرتەرەف کردنی خەتەری کوشندە هیچی لە کیس کورد نەدەدا.

بە لای منەوە ئەوەی دەبێتە جێگەی پرسیار لە ئاست ئامۆژگارییەکی حاجییدا ئەوەیە ئایا هیچ دەوڵەت هەبوو لەو سەردەمەدا کوردان بە تابیعی خۆی قبووڵ بکات بۆ پاراستنیان لەو خەتەری دووچارییان بووبوو؟ بە نیسبەت کوردەوە، ئایا، خۆدانەپاڵ دەوڵەتێکی وەک ڕووسیا وەیا ئینگلیز وەیا ئەڵمان وەیا فرەنسا کارێکی

ئاسان بوو؟ با نەڵێم ئاسان، مومکین بوو؟ خوێنەر دەبینێ وەزعی کورد ئەوساش لە بارێکدا بوە ئاغاگۆڕیی بە ئاسانیی پێ نەکراوە...

بەهەمەحاڵ ئەمە مەبەستی بنجیی نیە لە هێنانەوەی نیوە بەیتەکە و وەرامدانەوەی ڕەخنەییێکی لێی بگیرێت. من دەمەوێ بەو ڕەخنەگرە بڵێم حاجی قادرێکی لەوپەڕی ناچاری و بێدەسەڵاتی و لێقەوماوییەوە کە دەبینێ خەتەرێکی نوێ هەڕەشە لە میللەتەکەی دەکات، وەک یەکێکی غەرقی دەریا بووبێ و پەلەکوتەی ژیان بکات، بە دڵیدا دێت خۆدانەپاڵ دەوڵەتێکی بەهێز دەفعی ئەو خەتەرە دەکات هەروەک زانیویەتی و دیتویەتی میللەتی تر هەبوون لە لایەن دەوڵەتێکەوە پارێزگارییان لێ کراوە، ئیتر بەو پەڕی دڵسۆزییەوە ئامۆژگارییەکە بە میللەتەکەی ڕادەگەیەنێت و بە دوا چەندین نەصیحەتی تردا پێیان دەڵێت:

حاجی کەسێکە بێکەس بۆ ئێوە قوڕ دەپێوێ
گوێی لێ دەکەن زەریفە نایکەن بەڵا لە خۆتان

قسە لەوەندەش ڕاناوەستێ، دەبێ ئەو ڕۆشنبیرە بە بیر خۆی بهێنێتەوە لە نێوان میللەتی لە کورد بەهێزتریشدا نیشتمانپەروەر و خەباتگێڕی ئەوتۆ هەبوە ویستوەتی خۆ بداتە پاڵ دەوڵەتیک بۆ دەفعی خەتەری دەوڵەتێکی تر لەسەر وڵاتەکەی، وەک کە «ئەحمەد عورابی» لە میصر دەیویست دەفعی خەتەری ئینگلیز بە خۆدانەپاڵ عوسمانلی بکات. دیسانەوە قسە لەوەندەش ڕاناوەستێ، ئەو ڕۆشبیرە با بیر لەوە بکاتەوە دەوڵەتەکانی ڕۆژگاری بەرچاوی خۆشی هەر جارە ڕوو لە لایەک دەکەن بۆ خۆپاراستن وەیا دەفعی زەرەر وەیا جەلبی قازانج. گەورەترین نموونەی ئەم سەردەمە ڕێک کەوتنەکەی یەکیەتی سۆڤیێت بوو لەگەڵ گەورەترین دوشمنی خۆی لە سەرەتای پایزی 1939 کە دەکا ئەڵمانیای هیتلەری، بە هەموی دووساڵیشی پێ نەچوو ناچار بوو لەگەڵ دوشمنەکانی ئەڵمانیا ڕێککەوت.

من لێرەدا نامەوێ ڕەخنە لە یەکیەتی سۆڤیێت بگرم، تەنها مەبەستم ئەوەیە زەینی خوێنەری کورد ڕابکێشم بۆ سەر خوار کردنەوە و سەرەتاتکە کردن بە هەموو لایەکدا بەر لەوەی بەپێی مەیلی خۆی وەیا لە ڕێی باوەڕی سەرپێییەوە بڕیاری یەکجارەکی بدات لەو پرسیارانەدا کە هەڵە کردن تێیاندا سەر دەکێشێتەوە بۆ

هەڵوەستی هەڵە وەیا ستەم کردن لە بێتاوان، بە تایبەتی کە هات و پرسیارەکە پێوەندیی بە میللەتی خۆیەوە هەبوو.

هەرچەند ئەم دەمەتەقە خەیاڵییەی دوایی، ڕاستەوخۆ لەگەڵ باسی «هەڵوەستی حاجی قادر و دەرەبەگایەتی» خزمایەتیشیی نەبوو، بەڵام هەروەک ئاو لە کانی هەڵدەقوڵێ ئەویش لە هەمان سەرچاوەی هەڵوەستەکەی حاجییەوە زنەی کرد، چاریشم ناچارە دەبێ هەر جارە داوا لە خوێنەری کورد بکەم کە دێت و ئەم نووسینە، وەیا هی تریش، دەخوێنێتەوە خۆی لە بڕیاری پێشەکی و مەیلی لایەنگیری و دوشمنایەتی بدزێتەوە دەنا هەر سوودێکی لە خوێندنەوەی گۆشەنیگای جۆرجۆردا هەیە لە کیسی دەچێت و دەمێنێتەوە ئەو تەنها سوودەی کە بریتیە لە دووبارە و سێبارە و صەدبارە ... خوێندنەوەی ئەو گۆشەنیگایەی پێشتر باوەڕی پێ هێناوە کە دەکاتە هیچ، چونکە لە حاڵەتی وەهادا سوودەکە دەبێتە «تحصیل حاصل».

بەڕاستیی کەم وا هەیە خوێنەرانی هیچ میللەتێک بەقەدەر خوێنەرانی میللەتی کورد دووچاری ئەم دەردەی خۆدانەپاڵ یەک گۆشەنیگای قەرارداده بووبێت. شتێکی یەکجار بەرچاوە لە ڕۆشنبیریی کوردییدا، ئەم دیمەنەی یەک شێوە بیر کردنەوە و بڕوا بەیەک فەلسەفە هێنان تا ڕادەی تاوانبار کردنی هەموو جۆرە بیر کردنەوەیێکی تر و فەلسەفەیێکی تر. من لێرە بە پێشەوە دیاردەی لاسایی کردنەوەی غەیر لە فکر و بیروباوەڕی کورددا، هاتە ناو نووسینمەوە و داشم نا بە شتێکی حەتمی. جا کە ئەمە وابێ و من بێم هەڵوەستی حاجی لە نیوە بەیتی «گەر هیچ نەبێ بە ئۆیین تابیع بە دەوڵەتێ بن» بە هەڵوەستی یەکیەتی سۆڤییێت بگرم دەبێ بۆ پاکانەی حاجی و ئەم نووسینەش دە جاران لە خوێنەری کورد بپاڕێمەوە و بڵێم براله لە پشت چاویلکەی نەزەریانەوە سەیری ئەم باسەی حاجی قادر مەکە...

دەبێ ئەوەش بزانین ئەگەر من هاتبام هەڵوەستەکەی حاجی قادرم بە هەڵوەستی غەیری یەکیەتی سۆڤییێت گرتبایە، لەوانە بوو زەرەرم لە حاجی دابایە چونکە ئەوسا دەگوترا چۆن ڕەوایە هەڵوەستی دەوڵەتێکی گومانلێکراو ببێتە پاکانە بۆ حاجی قادر، لە حاڵێکدا ئەگەر دەردی لایەنگیریی فکری و فەلسەفی لە بەیندا نەبووبایە پێویست نەدەبوو بەوەی من یا یەکێکی تر قسەیێکی زۆر دڵسۆزانەی حاجی قادر لە ڕەخنان دەرباز بکەین. عومر باقی بێ لە بەشی چوارەمی ئەم نووسینەدا دەزاندرێ سەرلەبەری قەصیدەکەی «خاکی جزیر و بۆتان» چ پێویستیەکی گەورەی هەیە بە

لەسەر کردنەوە و گومان لێ تەکاندنەوە لەبەر تاکە هۆی شکانەوەی بیروباوەڕی ڕۆشنبیرانی کورد بەلای یەک گۆشەنیگا و یەک فەلسەفەدا. هەر چۆنێک بێ، ئەم نووسینە جارێ هەوراز و نشێوێکی زۆری لە پێشدایە و لە گەلێک حاڵوباردا ناچار دەبێ داوای مەوزوعیەت لە خوێنەری کورد بکات.

لێرەدا بەرگی سێیەم بە پایان دەگات هەرچەند بەشێکی ئەو مسوەدانەی لە ساڵی 1972ەوە ئامادە کرابوون، هەروەها چەند بەڵێنێکی نوێی ناو ئەم بەشەی سێیەمیش بوون بە ماڵی بەشی چوارەم. لە بەڵێنە نوێیەکان، دووی بەرچاویان ئەمانەن:

یەکێکیان ڕوون کردنەوەی دەوری ناکۆکیەکەی نێوان حاجی قادر و شێخ نەبیی ماویلی لە پێک هاتنی فەلسەفەیێکی سەرانسەر و بنجیی لای حاجی دژی شێخایەتیی درۆزن.

دووەمیان هۆی دیاردانی دژایەتیی تەڵەکەبازی و شەعبەدە لە شیعری حاجی و هەندێک لە شاعیرانی دوای حاجی و دیار نەدانی دژایەتیی براگەوران و دەرەبەگ لە شیعری هیچ یەکێک لە شاعیرانی کورد تا ساڵانی 1940. بەڕاستی ڕێم هەبوو هەڵیان بگرم بۆ بەشێکی تر وەک کە کردم. هۆی ئەم بڕیارە هەندێکی دەگەڕێتەوە بۆ ڕێکەوت هەندێکیشی بۆ ڕەچاو کردنی بەرژەوەندی نووسینەکە و خوێنەرانی.

لە کۆتایی ئەم بەشەدا حاجی قادر گەییشت بەو هەنگامەی کە ماڵئاوایی یەکجاریی لە کۆیە و لە هەموو کوردستان کرد، منیش وەک ئەو ماڵئاوایی لە خوێنەرانی کورد دەکەم بەڵام بە ئومێدی سەردانەوەیان لە بەشەکانی داهاتودا، خوا یار و عومر وەفاکار بێ.

**عوزرخوازی**

ئەم بەشەی سێیەمی حاجی قادر یەک ساڵ لە کاتی خۆی دواکەوت، چونکە دەبوو لە ساڵی 1975دا بە چاپ بگات. بەڵام لەبەر هەندێ حاڵوباری تایبەتی و زیدە پڕ ئیشی خۆم و لەو ساڵەدا، بە هیچ کلۆجێک ڕێگەم نەبوو خەریکی چاپ کردنی ئەم بەشەیان ببم.

لەگەڵ ئەمەشدا کە دێم و ورد دەبمەوە لە زێدە زەحمەتیی تۆژینەوەی ئەو ساڵانەی ژیانی حاجی کە لە ئەستەمبۆڵی بەسەر برد، وەخرانی یەک ساڵەی ئەم بەشەیان لەبیر دەکەم ترسێکی تازەشم ڕێ دەنیشێت لە بەیەکتر گرتنی فەرمانی سەخت و دەسەڵاتی کەم.

هەرچۆنێک بێت، درێغی لە ئێستا بە پێشەوە و بێدەسەڵاتیی لێرە بە دواوەش هەر دەخرێنەوە بەر نیگای بەخشندەی خوێنەری کوردەوە.

**مەسعوود محەمەد**

«...»

**لیستەی ناوان**

هەرچەند بە درنگەکاتیشەوە بێت، ئەم لیستەیەی لێرە بەدواوە ناوەکانی ناو هەر سێ بەشی کتێبی *«حاجی قادری کۆیی»* دەخاتە بەر چاوانەوە، خزمەتێکی خوێندەران دەکات. هۆی دواکەوتنی لیستەی بەشی یەکەم و دوەم لەوەوە بوو کە لە سەرەتاوە سەرلەبەری هەر سێ بەشەکان بە یەک بەشی تەواو ژمێردرا. لەو ڕووەوە کە هەموویان خەریکی یەک قۆناغی دیاریکراوی بەسەرهاتی حاجی بوون کەوا گردەبڕ لە قۆناغەکەی تری دوا خۆیەوە دەترازێ و جودا دەبێتەوە، وەک پێشتریش باسم کردوە مسوەدەی هەموو قۆناغەکە بەیەکەوە تۆمار کراوە.

لەم لیستەیەدا هەندێ ناوی زۆر دووبارەکراوەی وەک حاجی قادر، کورد، کوردستان، عەرەب، تورک، فارس، ئێران... هەڵبواردران چونکە پێویست نەدیترا جێگەیان پێ بگیرێت بێ ئەوە خزمەتێکی هیچ کەس و هیچ شتێک بکەن.

«...»

**ببەخشن**

لیستەی ناوەکان لەلایەن چەند فەرمانبەرێکی «کۆڕی زانیاری کورد»ەوە پێک هێنراوە. لە جیاتی ئەوان و لە جیاتی خۆشم داوای بوردن دەکەم لە هەڵە و تێکەڵپێکەڵییێکی لە ناوەڕۆکی لیستەکەدا هەبێت.

وەکیەکبوون و لەیەکترچوونی ناوان (بۆ نموونە: مەلا ئەحمەدی گەورە، مەلا ئەحمەد (باوکی حاجی قادر)، مەلا ئەحمەدی ئۆمەر گونبەدی – کەوا سێ کەسی لەیەکتر جودان –، وەیاخود: حاجی کاک ئەسعەد، حاجی مەلا ئەسعەد، مەلا ئەسعەد – کە هەر سێیان ناوی یەک کەسن) دەشێ ڕێکخەری لیستە بە سەهوو ببات، مەگەر نووسەر خۆی ڕێکخەر بێت. جا کە من لەبەر گەلێک هۆی پەکخەر نەتوانم وردەکاریی لیستەڕێکخستن بکەم، لە هەموو حاڵوباردا قەرزداری ئەو جوامێرانەم کە ئەرکی کارەکەیان لێ وەرگرتوومەوە، هێندەش لەخۆبووردوون نایانەوێ لە ڕێی ناوهێنانیشیانەوە نەختێک قەرزیان بدەمەوە.

**دانەر**

## لیستەی ناوەکان

«...»